بسم الله الرحمن الرحيم

**ناسنامه تفسير**

..........................

- **ناوی تفسیر: تفسير ابن الكثير بەكوردی**
- **وەرگێڕانی: علی حاجی عبدالله پریسی**
- **نۆرەی چاپ: یەكەم ۲۰۱۲**
- **شوێنی چاپ: تاران**
- **هەڵەچنی و دیزاین: ابراهیم معروف**


**بڵاوكار:**

**ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە**

**سلێمانی**

﴿۞ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ
عُتُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٢١﴾ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ﴿٢٢﴾ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ
مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَـٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ﴿٢٤﴾﴾

**باسی لاساری‌و ڕکی خوانەناس**

خوای گەورە باسی لاساری‌و ناڕێکی خوانەناسان دەكات‌و دەفەرموویێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ واتە: ئەوانەی بە هیوای گەیشتن بە دیداری ئێمە نین دەڵێن: بۆچی فریشتەكان نایەنە لای ئێمەش وەك چوونەتە لای پێغەمبەران، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِ﴾[1] واتە: دەڵێن ئێمە هەرگیز باوەڕ ناهێنین هەتا وێنەی ئەوەی بە پێغەمبەرانی خوا دراوە بە ئێمەش نەرێت. لەوانەشە مەبەستیان ئەوەبێت لێرەدا كە ئەڵێن: ﴿لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ﴾ كە فریشتەكان بە چاوی خۆمان ببینین، پێمان بڵێن كە محمد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە وەك دەڵێن: ﴿أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾،[2] واتە: یان خواو فریشتەكان بێنی ڕووبەڕوو (بیان بینین). واتە: یان خودا خۆی‌و چەند فریشتەیەك بێنەو ڕووبەڕووی یەكمان بكەرەوە، بۆیە گوتوویانە: ﴿أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾ واتە: یان خوای خۆمان نابینین؟ خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانەلەدەروونی خۆیاندا خۆیان بەگەورەدەزانی وە سەركەشیەكی گەورەیان كرد. یانی ئەوەندە لە خۆیان گۆڕاون هەر باس ناكرێت.بۆیە دەفەرموویێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ﴾[3]، واتە: وە بێگومان ئەگەر ئێمە فریشتەمان بۆ لای ئەو (بێباوەڕ)انە بناردایەو مردووەكان قسەیان لەگەڵ بكردنایەو هەموو شتێكمان بۆ كۆبكردنایەتەوە ڕووبەڕوو بە پێش چاویانەوە (یان كۆمەڵ كۆمەڵ) بڕوایان نەدەهێنا، مەگەر خوا بیەوێ، بەڵام زۆربەیان نازانن‌و بێئاگان. پاشان خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ ئەوانە لە ڕۆژێكدا چاویان بە فریشتەكان ناكەوێت كە باش‌و

---

[1] الانعام (١٢٤).

[2] الاسراء (٩٢).

[3] الانعام (١١١).

خێر بێت بۆیان، بەڵکو لەو ڕۆژەداکە فریشتەکان دەبینن هیچ مژدەیەکیان پێ نادرێت، ئەم کارەساتە کاتێك ڕوودەدات کە ئەو کەسانە وان لە گیاندانداو خەریکە گیانیان دەردەچێت لەو کاتەدا فریشتەکان پێیان دەڵێن:بڕۆن ون بنو مژدە بێت ئێوە دەچنە ناو ئاگر لەگەڵ تورەیی خودادا ئەو خودایەی کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە. فریشتەکان لە کاتی دەرچوونی گیانی خوانەناساندا ئەڵێن: ئەی گیانی پیسی بۆگەن! برۆ دەرەوە لەو لاشە پیسە، دەرچۆو برۆ بۆ ناو ئاگرە تاودراوەکە کە پڕە لە ئاوی کوڵو سێبەری چڕە دوکەڵ بەسەرتانەوە، نکوڵی دەکەنو نایانەوێ بێنەدەر و بەناو لاشەدا بڵاوە دەکەن، فریشتەکانیش لێیان دەدەنو دەکێشن بە پشتو دەمو چاویاندا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۙ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ﴾،[1] واتە: وە ئەگەر دەتبینی کاتێ فریشتەکان گیانی بێباوەڕان دەکێشن لە دەمو چاوو پاشیان دەدەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ﴾ ئەگەر ئەبینی کاتێك ستەمکاران لەسەرەمەرگدان و فریشتەکان دەستیان بۆ درێژ دەکەن، واتە لێیان دەدەن ﴿أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ﴾،[2] واتە: (پێیان بڵێ) خۆتان دەرباز بکەن (لەم ناڕەحەتی گیان کێشانە) ئەمڕۆ پاداشتی ڕیسواکەر دەدرێتەوە بەهۆی ئەوەی کە قسەی ناڕاستتان هەڵدەبەست بە دەم خواوەو خۆتان بە گەورە دەزانی لە بەرامبەر ئایەتەکانی خوادا. هەر لەبەر ئەوەیە خودای مەزن لێرەدا و لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ لَا بُشْرَىٰ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ ڕۆژێك کەفەریشتەکان دەبینن، هیچ مژدەیەکیان پێنییە بۆ ستەمکاران، ئەم ژیانە بە پێچەوانەی ژیانی خاوەن باوەڕانەوەیە کە لە کاتی گیان دەرچوونیاندا فریشتەکان مژدەی ژیانێکی خۆشو چاکیان دەدەنێ کە بە دەست هێنانی ژیانێکی پڕ بەختەوەریو کامەرانیە، کە هەرگیز نابڕێتەوە، وەك خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾[3]، واتە: بە ڕاستی ئەوانەی وتیان خوا پەروەردگارمانەو لە

---

[1] الانفال (٥٠).

[2] الانعام (٩٣).

[3] فصلت (٣٠-٣٢).

پاشان ڕاست (لەسەر ئایین) بەردەوام بوون فریشتەکان پۆل پۆل دێنە لایان (کاتێ مردن یان زیندووبوونەوە) (پێیان دەڵێن) مەترسن‌و خەفەت مەخۆن وە مژدەبێت لێتان ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ درابوو. ئێمە لە ژیانی دنیاو ڕۆژی دواییدا دۆستی ئێوەین وە لەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بکەی بۆتان ئامادەیە وە هەرچی داوا بکەن لەوێدا لە خزمەتتان دایە ڕێزلێنان‌و میوانداریە لە لایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە بەڕائی کوڕی عازیبەوە (البراء بن عازب) کە فریشتەکان ئەڵێن بە گیانی خاوەن باوەڕ ئەی گیانی پاك لە لاشەی پاکدا، تۆ ئاوەدانت کردووەتەوە، ئەی گیانەکە بێرە دەرەوە بۆ شوێنی حەسانەوەو بەختەوەری‌و بۆ لای پەروەردگارێك کە توڕە نییە[1]. هەندێکیتر وتویانە: بەڵکو مەبەست بەم ئایەتە: ﴿يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەمە قسەی موجاهیدو زەحاك‌و کەسانی تریشە، هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەم قسەیەداو ئەوەیشی لە پێشەوە باسمان کرد، چونکە فریشتەکان لەو دوو ڕۆژەدا واتە لە کاتی مردن‌و ڕۆژی قیامەتیشدا خۆیان پیشانی خاوەن باوەڕان‌و خوانەناسان دەدەن، مژدە ئەدەنە خاوەن باوەڕان بە دلۆڤانی‌و ڕەزامەندی خودا لێیان‌و هەواڵیش دەدەنە خوانەناسان بە ڕەنجەڕۆ بوون‌و هەناسە ساردیان چونکە لەو ڕۆژەدا هیچ مژدەیەك نیە بۆ تاوانباران، ﴿وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ واتە: پێیان ئەڵێن: مژدە لە ئێوە حەرامەو، ئەمڕۆ ڕزگاربوونتان نیە، ئەسڵی (الحجر) واتە: ڕێ پێنەدان. وەك ئەوەی کە ئەوترێ: دادوەر حیجری خستووەتەسەر فلانەکەس، کاتێك کە نەیەڵێت بەسامانەکەی مامەڵەبکات، ئیتر ئەو کەسە موفلیس بووبێت –واتە تێکشکاوە لە کاسپیا– یان سەفیهە واتە: ماڵ و سامان لە دەستیدا ناوەستێ و بە فیڕۆی دەدات، یان منداڵە یان هەر شتێکی تر وەك ئەمانە، بەهەمان شێوە شوێنێك لای کەعبەدا ناوبراوە بە (الحجر)، لەبەر ئەوەی نابێت ئەو کەسانەی تەوافی تێدا دەکەن، لەوێوە دەست بکەن بە تەواف کردن، بەڵکو دەبێت لە پشتەوە دەست بە تەوافکردن بکەن، وە هەرلەبەر ئەمەیە کە بە عەقڵ دەگوترێت حیجر چونکە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لەو شتانەی کە خراپن‌و نابێت بکرێت، مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئەو زەمیرە (الضمير) لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ بۆ فریشتەکان دەگەڕێتەوە، واتە فریشتەکان دەڵێن: مژدە لە ئێوە حەرامە.... ئەمە قسەی موجاهیدو عیکریمەو حەسەن‌و زەحاك‌و قەتادەو عوتبەی عەوفی‌و عەتای خۆراسانی‌و خوصەیف‌و کەسانی تریشە، ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.[2] ئیبنو جەریر

---

[1] مسلم (٤/٢٢٠٢).

[2] الطبري (١٩/٢٥٦)، الدر المنثور (٤/٢٠٦).

دەیگێڕێتەوە لە ئیبنو جورەیجەوە کە دەڵێ: ئەمەقسەی موشریکەکانە[1]. ﴿يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ﴾ واتە: خۆ دەپارێزن لە فریشتەکان. لەبەر ئەوە کاتێك عەرەبەکان کارەساتێکیان توش ببوایە یان توشی ناڕەحەتیەك بهاتنایەدەیان گوت: ﴿حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ ئەم وتەیە هەرچەندە قسەی لەسەرە، بەڵام بەنیسبەتی دەکەقەوە ماناکەی دوورەلێیەوەونایگرێتەوە. ڕای جمهوریش بە پێچەوانەی ئەو ڕایەوەیە. خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ واتە: هاتین هەر کردەوەیەکیان کردبوو هەموویمان وەکو تۆزی پەرشو بڵاو لێ کرد. یانی: هەر کارێکیان کردووە لە دنیادا لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك کە خوای گەورە موحاسەبەی عەبدەکانی دەکات کە چیان کردووە لە چاکەو لە خراپە، دەردەکەوێت کە ئەو موشریکانە هیچ سوودو بەهرەیەك وەرناگرن لەو کردارانەی کە لە دنیا کردوویانەو وایان زانیوە کە دەبێتە هۆی ڕزگاربوونیان لە قیامەتدا، لەبەر ئەوە ئەو کارانەی ئەوانە کردوویانە پاكو بۆ خوا نەبێتو شەرع بڕیاری لەسەر نەدات ئەو کارە بەتاڵەو وەرناگیرێت، کارو فەرمانیی خوانەناسانیش لەوە زیاتر نیە، هیچ کردارێکیان لێ وەرناگیرێت لەو ڕۆژەدا، بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ سوفیانی سەوری دەڵێ: لە ئەبو ئیسحاقەوە لە حاریسەوە ئەویش لە عەلی یەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەمانای ئەم ئایەتەدا ﴿هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ دەڵێ: وەك ئەو ڕۆشناییو تیشکی خۆرەی کە لە کلاوڕۆشنەوە دەچێتە خوارەوە، هەر بەم شێوەیە بە جۆرێکی تر لە عەلیەوە ڕیوایەت کراوە، هەروەك ئەمە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو سەدیو زەحاكو کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە.[2] هەر بەو شێوەیە حەسەنی بەسریش دەڵێ: ئەو تیشكو ڕووناکیەیە کە لە کلاوڕۆشنەی یەکێکەوە دەچێتە خوارەوە، خۆ ئەگەر چوو بیگرێت بۆی ناگیرێت،[3] ئەبولئەحوەص لە ئەبو ئیسحاقەوە ئەویش لە عەلیەوە دەڵێ: ﴿هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ واتە: تۆزی بابردەی چوارپێ –مەڕو ماڵات– هەر بەم شێوەیە لە ئیبنو عەباسو زەحاكو عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە ڕیوایەت کراوە، قەتادە لەم ئایەتەدا ﴿هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ دەڵێ: ئایا گەڵای وشکی درەختت بینیوە کە با دەیبات؟ ﴿هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾ ئەو گەڵایە[4]. لە یەعلای کوڕی عوبەیدەوە دەڵێ: ﴿هَبَآءٗ﴾ ئەو تۆزەیە کە با دەیبات، ئەنجامی ئەم هەموو

---

[1] الطبري (١٩/٢٥٤).

[2] الطبري (١٩/٢٥٧، ٢٥٨).

[3] الطبري (١٩/٢٥٧).

[4] الطبري (١٩/٢٥٨).

قسەیە ئەوە دەگەیەنێت که کرداری خوانەناس وەك شتێکی بێ نرخو بێ بایەخ وایە که خاوەنەکەی هیچ سودێکی لێ وەرناگرێت وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ ﴾[1]، واته: ئەوانەی بێبڕوا بوون به پەروەردگاریان نموونەی کردەوەکانیان وەك خۆڵەمێشێك وایە به توندی با لێی هەڵکردبێت. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًا ۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ﴾[2]، واته: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە خێرو بەخشینەکانتان پوچەڵ مەکەنەوە بە منەت نانو ئازاردانو دڵ ئێشان وەك ئەو کەسەی ماڵو سامانی خۆی بەخت دەکات بۆ ڕووپامایی خەڵك وە باوەڕی نیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، جا وێنەی ئەو ناپاکە وەك بەردێکی لوس وایە کە گڵێکی کەمی بەسەرەوە بێت ئینجا بارانێکی لێزمەی لێ بدات وە بەردەکە بهێڵێتەوە بە ڕووتی، ناتوانن هیچ لەوەی کە کردوویانە دەست بخەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا﴾[3]. واته: وە ئەوانەی کە بێباوەڕن کردەوە (چاکە)کانیان وەك سەرابێك وایە (سەراب تیشکێکە کاتی زۆر گەرما لە بیاباندا وەك ئاو دێتە پێش چاو) لە بیابانێکدا (بریسکە بداتەوە) (کەسێکی) زۆر تینوو بە ئاوی دەزانێ (لە دوورەوە) (بە پەلە دەڕوات بۆی) کاتێك دەگاتە لای هیچ بەدی ناکات.

## شوێنو جێگەی خەڵکی بەهەشت

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا﴾ واته: لە ڕۆژی قیامەتدا جێو شوێنی پشودانی بەهەشتیەکان چاکترین شوێنە. وە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾[4]، واته: دۆزەخیانو بەهەشتیان وەك یەك نین بەهەشتیان ڕزگارو سەرکەوتوون. چونکە خەڵکی بەهەشت بەرەو پلە بەرزەکانو کۆشکە ئارامەکان دەڕۆن، وە لە شوێنێکی زۆر خۆشو جوانو ڕازاوەدان ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا

---

[1] ابراهیم (١٨).

[2] البقرة (٢٦٤).

[3] نور (٣٩).

[4] الحشر (٢٠).

وَمُقَامًا ﴾[١]، واتە: بێ برانەوە تێیدا دەمێننەوە چەن جێگەو شوێن‌و مانەوەیەکی جوان‌و خۆشە. خەڵکی ناو ئاگریش بەرەو قوڵایی ناو ئاگر دەڕۆن‌و هەر هەناسەی سارد هەڵدەکێشن‌و هەموو جۆرە جەربەزەو ئازارو سزایەك دەچێژن ﴿ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾،[٢] واتە: بە هۆی ئەو کردەوەی کە لێیان وەرگیراوە، ئەو شوێنەیان وەرگرتووەو ڕۆیشتوون بۆی، بە پێچەوانەی خەڵکی ناو ئاگر کە هیچ کردارێکی وایان نیە بەرەو بەهەشت بیانبات، وە ڕزگاریان بکات لە ئاگر، خوای گەورە باسی ژیانی بەختەوەران دەکات بۆ ئەوەی چاکتر لە ژیانی بەدبەختان ئاگادار بین کە چەندە ژیانیان خراپە، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: خوای گەورە کە لە لێپرسینەوە دەبێتەوە لە نیوەڕۆدا خەڵکی بەهەشت دەچین بۆ پشوودان لە ناو بەهەشتداو خەڵکی ناو ئاگریش بۆ ناو ئاگر، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴾ عیکریمە دەڵێ: من ئەو کاتە دەزانم کە خەڵکی بەهەشت دەچنە بەهەشت‌و خەڵکی ئاگر دەچنە ناو ئاگر، ئەو کاتەیە کە لە دنیادا خۆر زۆر بەرز دەبێتەوە خەڵکی دەگەڕێنەوە بۆماڵەوەیان بۆ پشوودان، جەهەنەمیەکان دەڕۆن بۆ ناو ئاگرو بەهەشتیەکانیش ڕەوانە دەکرێن بۆ بەهەشت لەوێ دەحەسێنەوەو جگەری نەهەنگیان پێ دەدرێت‌و هەموو تێر دەخۆن. وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ مُّسْتَقَرًّا وَأَحْسَنُ مَقِيلًا ﴾.

﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ
عَسِيرًا ﴿٢٦﴾ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ
فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾

## ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت‌و ناهەقکار خۆزگە دەخوازێت کە بە ڕێی پێغەمبەردا (ﷺ) بڕۆیشتایە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴾ خوای گەورە باسی کارەسات‌و ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت دەکات کە چەندەها بەسەرهاتی گەورەو گرنگ ڕوودەدات تێیدا لەوانە: ئاسمانەکان پارچە پارچە دەبن‌و وەك کۆمەڵە هەورێکی ڕوون بەرچاو دەکەوێت‌و فریشتەکانیش بەرەو سەر زەمین بە کۆمەڵ دێن‌و دەوری ئەو خەڵکە دەدەن لە مەحشەردا – لە

---

[١] الفرقان (٧٦).

[٢] الفرقان (٦٦).

گۆڕەپانی قیامەتدا – پاشان خوای گەورە دێتو موحاسەبەیان تەواو دەبێت، موجاهید دەڵێت: هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە چاوەڕوانن خوایان بۆ بێت لە ناو چەند پارچە هەورێکی سپیدا هەروەها فریشتەکان (یان بۆ بێت) وە کارەکە کۆتایی پێ بێت، وە هەموو کارێك هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە[2]. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَـٰنِ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایەتی تەنها بۆ خوای میهرەبانە. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾[3]، واتە: (خوا دەفەرموێت): ئەمڕۆ پادشایەتیو دەسەلات بۆ کێیە (وەلام نادرێتەوە)، (خۆی دەفەرموێت) هەر بۆ خوای تاكو تەنهایە کە بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە بە دەستی ڕاستی ئاسمانەکانی دەپێچێتەوەو بە دەستەکەی تری زەمینیش دەگرێ)، پاشان دەفەرموێت: (من فەرمانڕەوام، من بەسەر هەموو شتێکدا زاڵم، فەرمانڕەواکانی سەر زەمین لە کوێن؟ ئەوانەی خۆیان بە زاڵ دەزانن لە کوێن؟ ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانن لە کوێن؟)[4]، ﴿وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ عَسِيرًا﴾ واتە: بۆ ئەوانەی کە خوا نەناسن ئەو ڕۆژە زۆر گرانو سەختە، چونکە ڕۆژی دادپەروەرییو موحاسەبەو هەلاوێرانە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ۝٩ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ﴾[5]، واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی سەختو گرانە، لەسەر کافران سوكو ئاسان نیە. ئەمە حاڵو گوزەرانی خەڵکی بێدینە، بەلام خاوەنباوەڕ خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ﴾[6]، واتە: غەمباریان ناکات ترسە هەرە گەورەکە (لە قیامەتدا). پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا﴾خوای گەورە باسی ستەمکاران دەکات کە چەندە پەشیمانو پەنجەی خۆیان دەگەزن کە بۆچی شوێن ڕێگای پێغەمبەر نەکەوتنو ڕێگای تریان گرتەبەر، لەو ڕێگە ڕاستە ڕوونەی خودا

---

[1] البقرة (٢١٠).
[2] الطبري (٢٦٠/١٩).
[3] غافر (١٦).
[4] فتح الباري (٣٧٩/١١)، مسلم (٢١٤٨/٤).
[5] المدثر (٩–١٠).
[6] الانبياء (١٠٣).

لایاندا، لە ڕۆژی قیامەتدا پەشیمانن بەڵام پەشیمانی هیچ سوودێکی نیە بۆیان، پەنجەی خۆی دەگەزێتو لە داخو خەفەتا هەناسە هەڵدەکێشێت، هیچ جیاوازی یەك نییە لەوەدا ئەم ئایەتە لەسەر عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت (عقبة بن أبي معيط) هاتبێتە خوار یان لەسەر هەر کەسێکی تر لەو بەدبەختانە، ئایەتەکە گشتگیرە و هەموو ستەمکارێك دەگرێتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾[1]، واتە: ڕۆژێ کە دەمو چاویان لە ئاگری دۆزەخدا ئەم دیوو ئەودیو دەکرێت دەڵێن: خۆزگە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرمان بکردایە. هەموو ناهەقی کارێك لەو ڕۆژەدا زۆر پەشیمانەو لە داخو خەفەتا پەنجەی خۆی دەبات بە دەماو – دەیگەزێ – ئەڵێ: ﴿يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا﴾ ئای تیاچوون بۆ من خۆزگە فلانە کەسم نەکردبا بە هاوەڵی خۆم. واتە: خۆزگە ئەو کەسەی کە منی لە ڕێی ڕاست لاداو بەرەو ڕێی پڕوپوچ بردمیو بەدبەختی کردم هەر دۆستو هاوەڵم نەبووایە، ئەمەیش هەر یەکسانە بەوەی ئومەیەی کوڕی خەلەفو ئوبەیی کوڕی خەلەفی برایو کەسانی تریش ﴿لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەو لە قورئان منی لادا ﴿بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ﴾ دوای ئەوەی کە قورئانم پێگەیشت. خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا﴾ واتە: شەیتان بەردەوام خەڵکی دوور دەخاتەوە لە قورئانو بەرەڵای دەکاو، لە شتی پڕوپوچدا بەکاری دەهێنێتو لەبەر چاوی شیرینی دەکات.

﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِي ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا ﴿٣١﴾﴾

**پێغەمبەر (ﷺ) نارەزایی خۆی دەردەبڕێت لەو کەسانەی کە دژایەتی دەکەن**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِي ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا﴾ خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی محمد (ﷺ) دەکات کە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم گەلەکەم شوێنی ئەم قورئانە نەکەوتن و گوێیان بۆ نەگرت، چونکە موشریکەکان گوێیان بۆ قورئان نەدەگرتو دەستیان دەکردە قاڵەقاڵ هەتا نەیبیستن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ﴾[2] واتە: وە بێباوەڕان (بە یەکتریان) دەوت گوێ مەگرن بۆ ئەم قورئانەو شتی پڕوپووچی تێکەڵ بکەن. خوانەناسان دەیانگوت گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرنو خۆتان سەرقاڵ بکەنو

[1] الاحزاب (٦٦).

[2] فصلت (٢٦).

قسەی تر بکەن بۆ ئەوەی لێی حاڵی نەبن، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە نەیاندەویست بڕوای پێ بهێنن‌و لێی دووردەکەوتنەوەوپشتیان تێدەکردو شوێنی نەدەکەوتن‌و فەرمانەکانیان بەجێ نەدەهێنا لە جیاتی ئەوەدا خۆیان خەریك دەکرد بە شیعرو گۆرانی وتن‌و قسەی بێ هودەو پڕوپوچ‌و هەر شتێکی تر بۆ ئەوەی کە گوێ لە قورئان نەگرن، داواکارین لە خودای گەورەو خاوەن بەهرەو کە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، لاماندا لەو شتانەی دەبێتە هۆی توڕەبوون‌و ڕەنجانی خۆی بەکارمان بێنێت لەو شتانەی کە خۆی لێی ڕازیەو لە خوێندنی قورئان‌و تێگەیشتن لێی‌و بەجێهێنانی فەرمانەکانی لە شەو ڕۆژدا بەبێوچان بەو شێوەیەی کەخۆی پێی خۆشەو چاکە، چونکە هەر خۆی خاوەن ڕێزو بەخشندەیە.

پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾ واتە: بۆ هەموو پێغەمبەرێك لە پێشەوە دوژمنێکمان لە تاوانباران دانەوە وەك چۆن تۆش دوژمنت بۆ پەیدا بووە لە ناو هۆزەکەتداو پشتیان کردووەتە قورئان، خوای گەورە ئەو نەیارانەی کردووەتە دوژمنی پێغەمبەران‌و خەڵکی بانگ دەکەن‌و هانەهانەی دەدەن بۆ گومڕایی‌و ئەو خوانەناسیەی خۆیان لەسەری بەردەوامن.

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ﴾[1]، واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤو جنۆکە. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا﴾ واتە: خوای تۆ بەسە کە ڕێ نیشاندەرو یارمەتی دەر بێت، بۆ ئەو کەسانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتوون‌و باوەڕیان بە قورئان بووەو شوێنی کەوتوون‌و بە ڕاستیان زانیووە، خودا یارمەتی دەرو ڕێ نیشاندەریانە لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَادِيٗا وَنَصِيرٗا﴾ چونکە موشریکەکان دەبوونە لەمپەر لە ڕێی خەڵکیدا کە شوێنی قورئان بکەون بۆ ئەوەی خەڵکی ڕێی ڕاست نەگرنەبەرو ڕێبازی خۆیان سەرخەن بەسەر ڕێبازی قورئاندا بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا يَأۡتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ وَأَحۡسَنَ تَفۡسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحۡشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٣٤﴾﴾

---

[1] الانعام (١١٢).

## حیکمەتی دابەزاندنی قورئان بە جیاجیاو وەڵام دانەوەی خوانەناسان و ڕوون کردنەوەی چارەنووسی خراپیان

خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات کە چەندە ڕەخنە دەگرن و لاساری و قسەی بێڕێ و بێجێ دەکەن و ئەڵێن: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ﴾، واتە: وە ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەیانگوت بۆچی (موحەمەد (ﷺ)) هەموو قورئانی بە یەك جار بۆ دانەبەزێنراوە. یانی خۆزگە ئەم قورئانە یەك جار بهاتایە بۆ موحەمەد (ﷺ) وەك کتێبە پێشووەکانی تر کە بە جارێك هەمووی هاتووەتە خوارەوە وەك تەورات و ئینجیل و زەبوورو کتێبەکانی تری خودا، خوای گەورە وەڵامیان دەداتەوە کە ئەم قورئانە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا بە پێی ڕووداوو بەسەرهاتەکان هاتووەتە خوارەوە، بە پێی پێویست بون و جێگیرکردنی ئەو فەرمان و ئەرکانەی خودا بڕیاری دەدات بۆ خاوەن باوەڕان، تا دڵیان تەواو دابمەزرێت و ئارامی ڕووی تێ بکات، وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴾[1]، واتە قورئانێکە بە جیاجیا ڕەوانەمان کردووە هەتا بە نەرمی بۆ خەڵکی بخوێنیتەوەو بەپێی پێویست ناردوومانە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴾، واتە: ئا بەو جۆرە (دامانبەزاندووە) بۆ ئەوەی دڵی تۆ (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بەو قورئانە دامەزراوە بەهێز بکەین وە (بەو بۆنەیەوە) ئایەتانی خۆمم بۆ ناردوون سات دوای سات. قەتادە دەڵێ: یانی چاك ڕوونمان کردووەتەوە، عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: چاك ماناکەمان تەفسیر کردووە.[2] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا﴾ واتە: هیچ قسەیەك ناڵێن کە نەیاری هەقی پێ بکەن مەگین ئێمە وەڵاممان داونەتەوە بە نموونەیەکی پڕماناترو ڕوون و ئاشکراو ڕەوانتر لەو قسانەی ئەوان، ئەبو عەبدوڕەحمانی نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: قورئان ڕەوانە کرایە ئاسمانی دنیا بە تێکڕایی لە شەوی قەدردا پاشان دوای ئەوە لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا هاتە خوارەوە.[3] خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴾[4]، واتە: وە قورئانمان بەش بەش بۆت ناردووە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە بەسەر خەڵکیدا بە لەسەرخۆیی و هێواشی وە ئەم

---

[1] الاسراء (١٠٦).

[2] الطبري (١٩/٢٦٦).

[3] النسائي في الكبرى (١٦/٤٢١).

[4] الاسراء (١٠٦).

(قورئانە)مان بەو شێوەیە دابەزاند. پاشان خوای خاوەن دەسەڵات باسی حاڵی خراپی خوانەناسان دەکات لە ڕۆژی قیامەتداو کۆکردنەوەو ڕاپێچکردنیان بۆ ناو ئاگری جەهەنەم، بە شێوەیەکی زۆر خراپو ناشیرینو ڕیسواکەر، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا﴾، واتە: ئەو کەسانەی بەسەر ڕوخسارياندا دەبرێت بۆ دۆزەخ ئەوانە خراپترين جێگايان بۆ هەيەو ڕێگاشيان ون کردووە. لە فەرموودەی سەحيحدا هاتووە لە ئەنەسەوە کە پياوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خوانەناس چۆن لە ڕۆژی قيامەتدا بە دەمو ڕوودا ڕادەکێشرێت -حەشر دەکرێت-؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی کە لەسەر هەردوو قاچی بردوويەتی بەڕێدا هەر ئەو کەسەش توانای هەيە بەسەر دەمو ڕوويدا بيبات -ڕايکێشێت- لە ڕۆژی قيامەتدا)[1].

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾

### ترس وەبەرهێنانی بتپەرستانی قورەيش

خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە بڕوايان نەهێناوە بە پێغەمبەرەکەی کەمحمدە(ﷺ) کە بريتين لە بتپەرستەکانی قورەيشو ئەوانەی دژايەتی دەکەن، ئاگاداريان دەکاتەوەو دەيان ترسێنێت لە سزای بە ژانو جەزرەبەی سەختی خۆی کە هێنای بەسەر ئەو گەلانەی پێشوودا کە بڕوايان بە پێغەمبەرەکان نەدەکرد لە پێغەمبەر موساوە دەست پێدەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا﴾ واتە: بەڕاستی کتێبی دا بە موساو هارونی براشی کردە پشتيوانو يارمەتيدەرو لايەنگيری، بەڵام فيرعەونو لەشکرەکەی بڕوايان پێ نەدەکرد. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴾، واتە: ئينجا وتمان هەردووکتان بڕۆن بۆ سەر ئەو گەلەی باوەڕيان بە ئايەتەکانی ئێمە نيەو بە درۆی دەزانن

[1] احمد (٣/٢٢٩) فەرموودەيەکی سەحيحە.

ئەوسا لەناومان بردن بە لەناوبردنێکی زۆر خراپ. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا﴾،[1] واتە: خوای گەورە پەرتو بڵاوی کردن هەر خوانەناسێکیش ئاوا بێت هەمان شت چاوەڕوانی دەکاتو ئاوای بەسەردێت، وەك هۆزی نوح کە بڕوایان بە پێغەمبەر نوح نەکرد توشی ئەو بەڵایە بوونو هەموو خنکان ئەوانە نەبێت کە لە ناو کەشتییەکەدا بوون، وە هەر کەسێك بڕوای بە پێغەبەرێك نەبێت وەك ئەوە وایە کە بڕوای بە هەموو پێغەمبەرەکان نەبووبێت، چونکە هیچ جیاوازیەك لە نێوان پێغەمبەرێكو پێغەمبەرێکی تردا نیە، خۆ ئەگەر واش دابنرێت کە خودای مەزن هەموو پێغەمبەرانی ڕەوانە بکردایە هەر بڕوایان پێ نەدەکردنو بە درۆیان دەخستنەوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا الرُّسُلَ﴾، واتە: گەلی نوحیش کاتێ پێغەمبەرانیان بە درۆ زانی. گەلی نوح جگە لە نوح پێغەمبەر –سەلامی خوای لێ بێت– هیچ پێغەمبەرێکی تریان بۆ نەهاتووە، کە نۆ سەدو پەنجا ساڵ لە ناویاندا ژیاو بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێگەی خوداو دەیترساندن لە سزاو تۆڵەی خودا، وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی ژمارەیەکی کەم نەبێت بڕوایان پێ نەهێنا ﴿وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ﴾،[2] واتە: وە خەڵکێکی کەم نەبێت بڕوایان نەهێنا لەگەڵیدا. بۆیە نوقمی ناو ئاوی کردن هیچیان دەرنەچوونو هەموو لەناو چوون، لەسەر زەمیندا تەنها کەسێك لە نەوەی ئادەم نەما جگە لەوانەی لەناو کەمیەکەدا مابوونەوە و ڕزگاریان بوو، وە ﴿أَغْرَقْنَاهُمْ وَجَعَلْنَاهُمْ لِلنَّاسِ آيَةً وَأَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ واتە: نوقمی ناو ئاومان کردنو کردمانننە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوەی خەڵکی دەرسی لێ وەرگرن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَى الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَا أُذُنٌ وَاعِيَةٌ﴾[3]، واتە: بە ڕاستی ئێمە: کاتێك کە ئاو (ی تۆفان) سەرکەوت (باپیرەکانی) ئێوەمان هەڵگرت لە کەشتیدا (ئەی بێبڕوایانی مەککە)، تا ئەم کردەوەیە بکەینە بیرهێنەرەوە بۆ ئێوە وە لە گوێی بگرێ گوێگرێکی تێگەیشتوو. واتە: لە شێوەی ئەم کەشتییەمان هێشتەوە کە لەسەری هاتوچۆ بکەن لەناو دەریا پانو بەرینەکاندا بۆ ئەوەی شوکری ئەو بەهرانەی خودا بکەن کە نەجاتی داون لە نقوم بوونو کردوونی بە نەوەی ئەوانەی کە بڕوایان بە نوح پێغەمبەر کردو بە ڕاستیان زانی، پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُونًا بَيْنَ

---

[1] محمد (١٠).

[2] هود (٤٠).

[3] الحاقة (١١–١٢).

ذَٰلِكَ كَثِيرًا﴾ واتە: عادو سەمودو خاوەن چاڵەکانیش قڕبوونو خەڵکێکی تری زۆریش لەو نێوانەدا هەر بەو شێوەیە لەناوچوون، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعَادًا وَثَمُودَا وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ﴾ لە پێشەوە بەسەرهاتەکانیان باس کرا لە سورەتی (الاعراف)و چەند سورەتی تردا پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە، بەڵام ﴿وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ﴾ واتە: خاوەن چاڵەکان -بیرەکان- ئیبنو جورەیج لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خاوەن چاڵەکان خەڵکی دێیەك بوون لە دێهاتەکانی سەموود[1]. سوفیانی سەوری دەڵێ: لە ئەبو بەکرەوە، ئەویش لە عیکریمەوە دەڵێ: ﴿ٱلرَّسِّ﴾ چاڵێك -بیرێك- بووە کە پێغەمبەرەکەیان خستووەتە ناوی واتە: لە ناویا دایان پۆشیوە.[2] ﴿وَقُرُونَۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا﴾ واتە: زۆرێکیش لە بەرەو چینی تریش لە نێوان عادو سەموودا هەر بەو شێوەیە لەناوچوون، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ﴾ واتە: نموونەمان بۆ هەموویان هێناوەتەوە بەڵگەی تەواومان بۆ ڕوون کردوونەتەوە، وەك قەتادە دەڵێ: هیچ بڕوبیانوویەکمان بۆ نەهێشتوونەتەوە.[3] ﴿وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا﴾ واتە: وە هەموویانمان لەناو برد بە لەناوبردنێکی خراپ، یانی هەموومان ونجڕونجڕ کردن، وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ﴾[4]، واتە: وە زۆر (گەلو میللەت)مان لەناوبرد لە چەرخەکانی پاش نوح. (القرن) بریتیە لە کۆمەڵێك خەڵکی، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ﴾[5]، واتە: پاشان لە دوای ئەوان بەدیمان هێنا گەلو نەوەیەکی تر. هەندێ قەڕنیان (القرن) بە سەدو بیست ساڵ داناوە، هەندێکی تر قەڕنیان بە سەد ساڵو هەندێکیش بە هەشتا ساڵو هەندێکی تریش بە چل ساڵ، بەڵام دیاتر ئەوەیە کە قەڕن -چەرخ- ئەو خەڵکە هاوچەرخەن لە زەمانێکدا لەگەڵ یەکتری دەژین. کاتێك کە ڕۆیشتن بەرەیەکی تر بە دوایاندا دێتو جێیان دەگرنەوەو، ئەوانە دەبنە چەرخێکی تر. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (چاکترین چەرخەکان چەرخی منە، پاشان ئەوانەی لە دوای ئەوان

---

[1] الطبري (١٩/٢٦٩).

[2] البغوي (٣/٣٦٩)، القرطبي (١٣/٣٢).

[3] الطبري (١٩/٢٧٢).

[4] الاسراء (١٧).

[5] مؤمنون (٣١).

دێن و پاشان ئەوانەش دوای ئەوانە دێن)[١]، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ وَلَقَدْ أَتَوْا عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ﴾ واتە: سوێند بە خوا ئەوانە ڕابوردن بەو شارانەی کە ئەو بارانە خراپە بەسەریاندا باری واتە: هۆزی لوت (لوط) کە پێی دەڵێن سەدوم کە قڕکران و زەویەکەیان بەسەردا هەڵگەڕێنرایەوە بە کمۆڵە قوڕی وەك بەرد بەردەباران کران، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾[٢]، واتە: وە بارانێکمان (لە بەرد) بەسەریاندا باراند ئینجا ئای چ خراپ بوو بارانی ترسێنراوەکان. وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾[٣]، واتە: بە ڕاستی ئێوە (قورەیشیەکان) دەڕۆن بەسەر (شوێنەکان)یاندا بە بەیانیاندا (بە ڕۆژ)و بە شەودا ئایا ئیتر ژیر نابن؟ وە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ﴾[٤]، واتە: وە بێگومان ئەو (شارە وێران کراوە) لەسەر ڕێگای سەرەکی (کاروانەکان)دایە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ﴾[٥]، واتە: جا بە ڕاستی ئەم دووانە لەسەر ڕێگایەکی ئاشکران. بۆیە لێرەدا دەفەرموویت ﴿أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوەیان بە چاوی خۆیان نەدیوە؟ چیان بەسەردا هاتووەو چۆن تووشی ئەو سزا سەختو گرانە بوون بە هۆی ئەو خوانەناسیو بڕوانەهێنانیانەوە بە پێغەمبەرەکەیان و دژایەتی کردنی خواو پێغەمبەرەکەی، پەندو ئامۆژگاری لەو کارەساتە وەرناگرن ﴿بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا﴾ بەلام ئەوانە چونکە بڕوایان بە زیندووبوونەوە نیە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆیە پەندی لێ وەرناگرن.

﴿ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ ﴾

---

[١] فتح الباري (٥/٣٠٦)، مسلم (٤/١٩٦٣).

[٢] الشعراء (١٧٣).

[٣] الصافات (١٣٧-١٣٨).

[٤] الحجر (٧٦).

[٥] الحجر (٧٩).

**گاڵتەکردنی خوانەناسان بە پێغەمبەر (ﷺ)**

خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات کە کاتێك چاویان بە پێغەمبەر (ﷺ) بکەوتایە، دەیانکردە گاڵتەجاڕی، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا﴾[1] واتە: وە کاتێ (موحەمەد (ﷺ)) دەبینین ئەوانەی بێباوەڕبوون جگە لە گاڵتەو لاقرتی کردن بە تۆ هیچی تر ناکەن.مەبەستیان تیروتوانج لێدانو بە کەم سەیرکردنی بووە، لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا﴾، واتە: وە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) کاتێك تۆ ببینن بەس گاڵتەت پێ دەکەنو دەڵێن ئا ئەمەیە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر؟! خوای گەورەیش دڵخۆشی پێغەمبەر دەداتەوە (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ﴾،[2] واتە: گاڵتەجاڕیش بە پێغەمبەرە پێشووەکانیش کراوە وەك چۆن ئێستا ئەمانە بە تۆی دەکەن، خەم مەخۆو دڵگران مەبە. وەختێ کە تووشی سزا بوون ئەو کاتە دەزانی کێ لەسەر ڕێی ناڕاست بووەو دەفەرموێت: ﴿إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا﴾ دەیانگوت خەریك بوو لە عیبادەتی بتەکانمان هەڵمان گێڕێتەوە ئەگەر خۆگریو لێبڕانو جەربەزەیی خۆمان نەبوایە کە هەر کۆڵیمان نەداو بەردەوام بووین لەسەر بتپەرستی، خوای گەورەش هەڕەشەیان لێ دەکات کە بەو زووانە تۆڵەیان لێ دەکاتەوەو خۆی دەزانێ چیان بەسەر دێنێ ﴿وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ﴾ واتە: لە داهاتوودا دەزانن کاتێك سزای خوا دەبینن کێ ڕێگای ون کردووە.

**خوانەناسان ئارەزووی خۆیان کردبووە پەرستراوی خۆیان و لە چوارپێ ویڵتر بوون**

پاشان خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ئاگادار دەکاتەوە کە هەر کەسێك خودا گومڕاو بەدبەختی کردبێت، هیچ کەسێك ناتوانێ ڕێی نیشان بدات، غەیری خوا خۆی نەبێت، وە دەفەرموێت: ﴿أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾ واتە: تۆ ئەو کەسەت نەدی کە هەرچی ئارەزوو بکاتو دڵی پێی خۆش بێت ئەوە دەکاتو دەیکاتە ئایینو ڕێچکەی خۆی، وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾،[3] واتە: دەی ئایا کەسێك کردەوەی خراپی خۆی بۆ جوان کراوەو جوانی دەبینێت (وەك

---

[1] الانبياء (٣٦).

[2] الرعد (٣٢).

[3] الفاطر (٨).

کەسێکە پێوەری چاکەو خراپەی بریتی بێت لەئایین) وە بە ڕاستی خوا هەر کەسێکی بویێ گومڕای دەکات، وە هەر کەسێکی بویێ ڕێنموونی دەکات دەی کەواتە بە خەفەت خواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە. بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا﴾ واتە: ئایا بۆ ئەمەش هەر تۆ زامنیانی؟ ئیبنو عەباس دەڵێ: لە زەمانی نەفامیدا (جاهیلیەتدا) پیاوی وا هەبوو ماوەیەکی زۆر بەردێکی سپی دەپەرست، ئەگەر بەردێکی جوانتر لەوەی بدیبایە –بە چاکتر بزانیایە– ئەو بەردەی دەپەرستو وازی لە بەردە پێشوەکە دەهێنا.[1] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾ واتە: تۆ وادەزانی ئەوانە زۆربەیان دەبیستنو دەفامنو تێدەگەن، نەخێر ئەوانە لە ئاژەڵێك کە بەڕەڵایەو بەو کێوانەوەیە وێڵترن، چونکە ئەو ئاژەڵانە بە پێی ئەو بەرنامەیەی بۆیان داڕێژراوە هەڵسوکەوت دەکەن، بەڵام ئەمانە بۆ عیبادەتی خودای گەورە دروستکراون کە تەنهایەو هاوەڵی نیە، کەچی دەڕۆن غەیری خودا دەپەرستنو دەیکەنە شەریکی خودا، پاش هێنانەوەی ئەو هەموو بەڵگەیە بۆیان و ڕەوانەکردنی پێغەمبەران بۆیان (سەلامی خوایان لێ بێت).

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾﴾

**چەند بەڵگە لەسەر بوونی خوداو دەسەڵاتی فراوانی**

لێرەدا خوای گەورە دێتە سەر باسو ڕوونکردنەوەی ئەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر بوونی خۆیی‌و تواناو دەسەڵاتی لە وەدیهێنانی ئەو هەموو شتانە لە گیانلەبەرو بێگیانو لە یەك جیاوازو دژ بەیەکە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ﴾، واتە: ئایا نابینی پەروەردگارت چۆن سێبەری درێژکردۆتەوە. ئیبنو عەباسو ئیبنو عومەرو ئەبولعالیە و ئەبو مالیك و مەسروق و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیرو نەخەعی‌و زەماكو حەسەنو قەتادەو سودی‌و کەسانی تریش گوتویانە: ﴿مَدَّ الظِّلَّ﴾ مەبەست پێی ئەو ماوەیە کە لە سپێدەی بەرەبەیانەوە دەست پێدەکات هەتا خۆرهەڵدێت.[2] ﴿وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا﴾ واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە لە جێی خۆی نەدەجوڵا بەردەوام هەر شەو دەبوو یان هەر ڕۆژ دەبوو. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ

---

[1] الدر المنثور (٦/٢٦٠).

[2] الطبري (١٩/٢٧٥)، القرطبي (١٣/٣٧).

عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾[١]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بلّیٚ هەواڵم بدەنیٚ ئەگەر خودا شەوتان بۆ درێژ بکاتەوە (هەر شەو بێت) تا ڕۆژی قیامەت. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾[٢]، واتە بلّیٚ: ئەوە چۆنە ئەگەر خوا بڕیاری ئەوەبدات کەتا ڕۆژی قیامەت هەر ڕۆژ بێت و شەو نەیەت بەدوایدا؟! پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَا ٱلشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا﴾ واتە: خۆریشمان کردووەتە نیشانە بۆی، واتە ئەگەر خۆر هەڵنەهاتایە بەسەر شەودا نەدەزانرا شەو چیەو ڕۆژ چیە، چونکە هەموو شتێك بە دژی خۆی دەناسرێتو چاکتر دەردەکەوێت، قەتادەو سودی دەڵێن: نیشانەیەکە بە دوای شەودا دێتو شوێنی دەکەوێت هەتا هەمووی داگیر دەکات[٣]. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ قَبَضْنَٰهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾ واتە: پاشان ئەو سێبەرە هێدی هێدیو لەسەرخۆ بەرەو خۆمان دەبەینەوەو کەمە کەمە نایهێڵین، سوری دەڵیٚ: (قبضاً خفيّاً) واتە: زۆر بە هێواشی هەتا وای لیٚ دێت هیچ سێبەری نامێنێت مەگەر لە ژێر بانو دارو درەختدا، هەمووی خۆر دەیگرێتەوەو لێی دەدات، ئەیوبی کوڕی موسا دەڵیٚ: ﴿قَبْضًا يَسِيرًا﴾ واتە: کەمە کەمە.[٤] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِبَاسًا﴾ واتە: هەر خودایە کە شەوی وا لێکردووە دنیای داپۆشیوەو لە خۆی پێچاوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾[٥]، واتە: سوێند بەو شەوە کاتێك هەمووشت دادەپۆشێت وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلنَّوْمَ سُبَاتًا﴾ واتە: خەویشی کردووەتە هۆی نەجوڵانو حەسانەوەی لاشە چونکە ئەندامەکانی لەش ماندوو دەبن بە هۆی جمو جوڵو گەڕانەوە لە ڕۆژدا بۆ بژێوی بە دەست هێنان، کاتێك کە شەو دادێت لاشە لە بزوان دەکەوێتو ئارام دەگرێتو دەحەسێتەوە، ئەو خەوەی بەسەردا دێت کە دەبێتە مایەی حەسانەوەی لاشەو دەروون پێکەوە ﴿وَجَعَلَ ٱلنَّهَارَ نُشُورًا﴾ واتە: ڕۆژیشی وا لێکردووە کە خەڵکی هەریەکەو بە لایەکدا دەچنو بە شوێن ڕۆزی خۆیاندا دەگەڕێن بە دەستی بێنن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ

---

[١] القصص (٧١).

[٢] القصص (٧٢).

[٣] الدر المنثور (٢٦٢/٦).

[٤] الدر المنثور (٢٦٢/٦).

[٥] الليل (١).

﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[1]، واتە: لە بەزەیی ئەو (خوایە) کە شەوو ڕۆژی بۆ دروست کردون بۆ ئەوە ئارام بگرن لە (شەو)داو بۆ ئەوەی بگەڕێن بە دوای ڕۆزی‌و بەهرەی خوادا (لە ڕۆژدا) وە بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن (لەسەر ئەو نیعمەتانەی).

﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِّنُحْـِۧىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَـٰمًا وَأَنَاسِىَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَـٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾﴾

هەروەها ئەمەیش هەر لە تواناو دەسەڵاتی خوای گەورەیە کە باکانی ناردووە وەك مزگێنیەك. واتە: بە دوای بادا هەور دێت، بایش چەند جۆری هەیەو بە زۆر شێوە ڕام هێنراوە، نمونە لەو بایانە: بای وا هەیە هەور دەجوڵێنێت یان هەور هەڵدەگرێت‌و دەیبات، بای واش هەیە لەگەڵ هەوردایەو مزگێنی دەرە، هی واش هەیە لە پێش هەوردا دێت زەمین پاك دەکاتەوە، هی واش هەیە هەورەکان دەپیتێنێت تا بارانی لێ ببارێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا﴾، واتە: وە ئەو خوا زاتێکە باکان دەنێرێت بە مژدەدەر پێش ڕەحمەتی خۆی، وە لە ئاسمانەوە باراندوومانە ئاوێکی پاکەوەکەر. یانی ئەو بایە وەك کەرەسەیەك -ئالیەتێك- وایە شتی پێ پاك دەکرێتەوە وەك گسك‌و وزەی گەرمی‌و هاوشێوەی ئەمانە، ئەبو سەعید دەڵێ: گوتویانە: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئایا دەست نوێژبگرین لە بیری بوزاعە (بُضَاعَة)؟ بیرێکە لایەکی بۆگەن‌و سەگی تۆپیوی تێدایە. فەرمووی: (ئاو پاکۆکەرەوەو هیچ شتێك پیسی ناکات) شافیعی‌و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردوەو ئەبو داودو ترمزی بە سەحیحیان داناوەو نەسائیش دەڵێ: فەرموودەیەکی حەسەنە[2]. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّنُحْـِۧىَ بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾، واتە: تا زەوی مردووی پێ ببوژێنێتەوە. یانی زەمینێك کە ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی بارانی کردووە زیندوو کەینەوە، کە وشك‌و بێ گیان بووەو هیچ شتێکی تیانەڕواوە، کاتێك گیانی تێیهاتەوەو نەرم بووەوە، دەژیەتەوەو هەموو جۆرە گوڵێکی هەمەڕەنگی تیایدا دەڕوێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾[3]، واتە: جا کاتێك بارانمان بەسەردا باراند زەوی

---

[1] القصص (٧٣).

[2] مسند للشافعي (٢١/١)، احمد (٣١/٣)، ابو داود (٥٣/١)، تحفة الاحوزي (٢٠٣/١)، النسائي (١٧٤/١)، فەرموودەیەکی باشە (حسن).

[3] الحج (٥).

(ڕووەکی لێ دەڕوێت) و دەجوڵێ زەوی کیف دەکات(بەرز دەبێت). وە دەفەرموێت: ﴿وَنُسْقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقْنَآ أَنْعَٰمًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا﴾ واتە: بۆ ئەوەی کە هەموو گیانەوەرێك تێر ئاو بکەین لە ئاژەڵو ماڵاتو ئەو مەردمەی کە پێویستیان بە ئاو هەیە بۆ خواردنەوەو کشتوکاڵو بەروبوومیان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟﴾[1]، واتە: وە خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ لە پاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون. وە فەرموویەتی: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴾[2]، واتە: ئینجا سەیری ئاسەواری (پەیدابوون بە) بارانی خوا بکە (وەك کشتوکاڵو گژوگیاو درەخست) چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنو وشك بوونی. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە بە چەند جۆر ئەم نیشانەمان گۆڕی لە نێوانیاندا تا بیر بکەنەوە. یانی بارانمان لەم زەمیندا باراندو لەوی تردا نەمانباراند، وە هەورمان نارد دەڕۆیشت بەسەر زەویەکداو تێدەپەڕی لێی دەچووە سەر زەویەکی ترو بارانێکی باشی لێ دەباریو تێر ئاوی دەکرد، کەچی ئەوەی لە دوایەوە بوو تەنها دڵۆپێکی لە باران بەر نەدەکەوت، هەموو کارێکی خودای گەورە پڕە لە نیشانەی مەزنو لە کارزانی تێرو تەواو، ئیبنو عەباسو ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێن: هیچ ساڵێك بارانی لە ساڵێکی تر زیاتر لێ نابارێت، بەڵام خوای گەورە ئەو بارانە دەگێڕێت بۆ هەر شوێنێکی مەیلی لێ بێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَٰهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا۟ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴾،[3] واتە: هەتا پەندو ئامۆژگاری وەربگرن لەوەی کە خودا ئەو زەمینە وشكو مردووەی زیندوو کردەوە هەر بەو جۆرەش دەتوانێت مردووەکان زیندوو بکاتەوەو ئێسکە ڕزاوەکانو لاشەیان گیان تێ بکاتەوە، یان پەندو ئامۆژگاری وەرگرنو بزانن کە گرتنەوەی باران لێیان هۆکارەکەی تاوانو خراپەکاری خۆیانە، تا واز بێنن لە گوناهو تاوان، ﴿ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴾ واتە: بەڵام زۆری ئەم خەڵکە جگە لە سپڵەیی هیچیان ناوێت، هەر فێرن سەرپێچی فەرمانی خوا بکەن، عیکریمە دەڵێ: دەڵێن: بارانمان بۆ باری بە هۆی فڵانە شتو فڵانە شتەوە.[4] وەك لەو فەرموودەیەدا کە هاتووە لە سەحیحی موسلیمدا لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە ڕۆژێك فەرمووی بە هاوەڵەکانی لەو شەوەدا کە باران لێی دابوون: (ئایا

---

[1] شوری (٢٨).

[2] الروم (٥٠).

[3] الطبري (١٩/٢٨٠).

[4] الطبري (١٩/٢٨٠).

دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە؟) گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (فەرموویەتی: هەندێ لە بەندەکانم بەیانی هەڵدەستن بڕوایان بە من هەیەو هەندێکیان بڕوای بە من نیە، ئەو کەسەی دەڵێ: بارانمان بۆ باری بە هۆی فلانەشتو فلانە شتەوە، ئەوە ئەو کەسە بڕوای بە من نیە، بڕوای بە ئەستێرەکان هەیە)[1].

﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ ۞ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾﴾

## گشتگیری پەیامی پێغەمبەرو مانەوەی تادونیادونیایە و باسی بەهرەکانی خوا لەسەر مرۆڤ

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَّذِيرًا﴾ واتە: ئەگەر مەیلمان لێ بوایە بۆ هەموو دێهاتێك ڕاسپاردەیەکمان دەنارد بیانترسێنێتو بانگیان بکات بۆ لای خودای مەزن، بەڵام بە تایبەتی تۆمان ڕەوانە کرد ئەی محمد (ﷺ) بۆ هەموو خەڵکی سەر زەمین، فەرمانمان پێ کردی کە قورئانیان پێ بگەیەنی ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ﴾،[2] واتە: هەتا بەو قورئانە ئاگاداریان بکەم و ئەوانەشی کەپێیان دەگات ئاگادار بکەم. ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ﴾،[3] واتە: وە هەرکەس باوەڕی پێی نەبێت لەو کۆمەڵەو تاقمانە (ئەوانەی کۆبوونەوە لەسەردژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی.وە دەفەرمووێت: ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾[4]، واتە: هەروەها بۆ ئەوەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری ئاگادار کەیتەوەو بیانترسێنی. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾،[5] واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ هەمووتان. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوانە کراوم بۆ سەر سوورپێستو ڕەشپێست) وەدیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە فەرموویەتی: (پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێ بێت- ڕەوانە کراون بۆ سەر هۆزەکانی خۆیان بە تایبەتی، من ڕەوان کراوم بۆ گشت خەڵکی)[6]. بۆیە

---

[1] مسلم (٨٣/١).

[2] الانعام (١٩).

[3] هود (١٧).

[4] الانعام (٩٢).

[5] الاعراف (١٥٨).

[6] مسلم (٣٧٠/١)، فتح الباري (٦٣٤/١).

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدْهُم بِهِۦ جِهَادًا كَبِيرًا﴾ واتە: کەواتە تۆ بە گوێی بێباوەڕان مەکە بە ئەم قورئانە جیهادێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە، ئیبنو عەباس دەڵێ: یانی: بە قورئان(جیهادیان بکەن)[1]. ﴿جِهَادًا كَبِيرًا﴾ واتە: بە هەموو توانایەکەوە بچۆ بە گژیاندا، وەك ئەم ئایەتە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾[2] واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بجەنگە لەگەڵ بێباوەڕانو دووڕوواندا وە توندوتیژ بە لەگەڵیاندا. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە دوو ئاوی دروست کردووە، شیرینو سوێر – شۆر – ئاوە شیرینەکە وەك: ئاوی ڕووبارو کانی و بیر کە ئاوێکی سازگارو شیرینو خۆشە، ئەمە قسەی ئیبنو جورەیجەو ئیبنو جەریریش هەر وای وتووە، ئەم مانایە مانایەکی ڕاستە، چونکە هیچ دەریایەکی ماتو وەستاو نیە لە دنیادا ئاوەکەی شیرینو سازگارو خۆش بێت، خوای گەورە بۆیە باسی ئەم دوو ئاوەی کردووە تا بەندەکانی شوکری بکەن لەسەر بەهرەکانی، چونکە ئاوی شیرین ئەو ئاوەیە کە دەڕوات وەك ڕووبارو کانیو بیر لەناو زەوی دێتە دەرەوەو دابەشی کردووە لە نێوان خەڵکیدا لە هەموو سەر زەمیندا بە پێی پێویست بۆ خۆیانو گیانەوەرو ئاودانی کشتوکاڵ، ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ واتە: ئاوێکی تریان کە تاڵو سوێر –شۆر– ولینجە کە بۆ خواردنەوە ناشێت وەك ئەو دەریایانەی کە لە هەموو دنیادا هەیە لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا، وەك دەریای موحیت (بحر المحيط)و دەریای یەمەنو دەریای قەلزەمو دەریای بەسرەو دەریای فارسو دەریای چینو هیندو دەریای ڕۆمو دەریای خەزەرو چەندەها دەریای تر لەم شێوەو وێنانە کە وەستاوو ناجوڵێن، بەڵام لە زستاندا و لە کاتی ڕەشەبادا شەپۆل دەدەنو بەرز دەبنەوە، هەندێ لەو دەریایانە بەرز دەبنەوەو دادەبەزن – مەدو جەزریان – هەیە، لە سەرەتای هەموو مانگێکدا بەرز دەبینەوە هەڵدەچن، بەڵام لە کاتێکدا مانگ بەرەو کزی و کەمبوونەوە ڕۆیشت ئاوەکە دەگەڕێتەوە شوێنە پێشووەکەی خۆی، کاتێك مانگ دەستی کردەوە بە هەڵهاتن لە یەکەم ڕۆژەوە تا چواردە ڕۆژ ئاوی ئەو دەریایە بەرز دەبێتەوە، پاشان دوای ئەوە کەمە کەمە دادەبەزێت هەتا دەچێتەوە دۆخی جارانی، ئەمەش هەموو دەسەڵاتو توانای خوای گەورە دەردەخات کە بەو شێوەیە دەریاکانی ڕام هێناوە. ئەم هەموو دەریا ماتو وەستاوەی کە خوا دروستی کردووە سوێرو خوێیاویە بۆ ئەوەی هەوا بە هۆی ئەو دەریایانەوە بۆگەن نەبێتو ژیان تێك نەچێتو زەمین پیس نەبێتو هەرچی تێدایە لە

---

[1] الطبري (١٩/٢٨١).

[2] التحريم (٩).

گیانەوەر بمرێت، بەڵام کە ئاوی دەریاکان سوێر بوو هەواکەش پاكو چاکەو مردووەکەشی پاکو خاوێنەو حەڵاڵەو دەخورێت، بۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە پرسیاری لیّ کرا لە ئاوی دەریا ئایا دەست نوێژی لیّ بگرین؟ فەرمووی: (ئاوەکەی پاك کەرەوەیەو مردووەکەشی حەڵاڵە) واتە: خواردنی مردارەوبووەکانی حەڵاڵە. ئیمامی مالیكو شافیعیو زانایانی فەرمووده ڕیوایەتیان کردووە بە سەنەدی حەسەنە[1]. ﴿وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ واتە: لە نێوان ئاوی شیرینو سوێردا لەمپەری زۆر ئەستووری داناوە ﴿بَرْزَخًا﴾ واتە: بەرگر –لەمپەر– لە وشکایی زەمین، ﴿وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾ ڕێگرێك کە ڕێگە نادات ئەو دوو ئاوە بە یەکتری بگەن. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾[2]، واتە: دوو دەریای بەرەڵا کردووە کە دەگەن بە یەك، لە نێوانیان بەربەستێك هەیە تا دەست درێژی بۆ یەك نەکەن (تێکەڵ نەبن) جا بە کام نیعمەتانەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن. وە فەرموویەتی: ﴿أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾[3]، واتە: ئایا زاتێك کە زەوی کردووەتە جێگای ئارامیو نیشتەجێبوون وە لە ناو (زەوی)یدا چەند ڕووباری بەدیهێناوە وە چەند چیای گەورەی بۆ زەوی داناوە وە لە نێوان دوو ئاودا (شیرینو سوێر) بەربەستی داناوە (بۆ ئەوەی تێکەڵ نەبن) ئایا هیچ پەرستراوێکی تر هەیە لەگەڵ خوادا؟ نەخێر نیە، بەڵام زۆربەیان نازانن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا﴾ هەر خودا خۆیەتی کە لە ئاوێکی لاواز مرۆڤی دروست کرد پاشان ڕێکوپێکی کردو بەژنو باڵایەکی چاکی دایەو بە مەیلی خۆی کردیە نێرو مێ. ﴿فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا﴾ واتە: ئینجا ئەو ئاوەیکردووەتە هۆی ڕەچەڵەكو خزم، یانی: لە یەکەم جارەوە کوڕی دایكو باوکیو پاشان بە ژن هێنان لەناو یەکتریداو بوون بە خزمو کەسو کاری یەکتر، هەموو ئەمانە گشتی لەو ئاوە لاوازە وەدی هێناوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾ واتە: وە پەروەردگارت هەمیشە بە دەسەڵاتو توانایە.

---

[1] الموطأ (٢٢/١)، مسند الشافعي (٢٣/١)، أحمد (٣٦١/٢)، أبو داود (٦٤/١)، تحفة الاحوذي (٢٢٤/١)، النسائي (٥٠/١)، ابن ماجه (١٣٦/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الرحمن (١٩-٢١).

[3] النمل (٦١).

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا
مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٥٦﴾ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى
ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا
بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۚ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ
قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ۩ ﴿٦٠﴾ ﴾

## بێ عەقڵیو نەزانی بتپەرستان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ﴾ خوای گەورە باسی بێ عەقڵیو نەزانی بتپەرستان دەکات کە عیبادەتی غەیری خودا دەکەن وەك ئەو بتانەی کە قازانجیان پێ ناگەیەننو ناتوانن توشی زیانیشیان بکەن، بەبێ ئەوەی هیچ شتێکیان بە دەستەوە بێت بیکەنە بەڵگەو لەسەری بڕۆن، و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)و موسڵمانان دەکەن لەبەر خاتری ئەوان، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا﴾ واتە: بێباوەڕان بەردەوام دژی پەروەردگاریان پشتیوانی یەکترن، یانی بوونەتە دۆستو پشتیوانی ئەوانەی دژی خودانو لەسەر ڕێی شەیتان بەرامبەر کۆمەڵی خودا کاردەکەن، بێگومان کۆمەڵی خودا هەمیشەزاڵو سەرکەوتوون، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾[1]، واتە: ئەو شتانەی کە ئەوانە دەیانپەرست هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەننو زیانیشیان لێ نادەن، ئەو نەفامانە ئامادەن لە خزمەت ئەو بتانەدا گیانی خۆیان ببەخشن، بەڵام پاشەڕۆژو سەرکەوتن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و خاوەن باوەڕانە لە دنیاو قیامەتدا. موجاهید دەڵێ: ﴿وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا ﴾ واتە: کافران پشتیوانی شەیتان دەکەنو دەبنە هاوکاریو لەسەر گوناهو خراپەکاری بەردەوامن.

## پێغەمبەر (ﷺ) مزگێنیدەرو ترسێنەرە

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە مژدە بدەی بە خاوەن باوەڕانو خوانەناسانیش بترسێنیت مزگێنی بدەی بەو کەسانەی کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا دەکەن بە بەهەشتو ئەو کەسانەش بترسێنی کە دژایەتی فەرمانەکانی خوا دەکەن بە سزایەکی توند کە تووشیان دێت. وە خوای گەورە دەفەرمووێت:

---

[1] یس (٧٤-٧٥).

﴿قُلْ مَآ أَسْئَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ﴾ واته بڵێ: من هیچ پاداشتێکم ناوێ له ئێوه لەسەر ئەم بانگەوازەو ئەم ئاگادارکردنەوەتان، تەنها لەبەر ڕەزامەندیو خاتری خوا ئەم کاره دەکەم ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ﴾[1]، واته: بۆ ئەو کەسانەی که بیانەوێت بەڕێی ڕاستدا بڕۆن له ئێوه. ﴿إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا﴾ واته: کێ ئارەزووی لێیه با بەرەو پەروەردگاری خۆی ئەو ڕێگەو بەرنامەیه بگرێته بەرو ئەوەی که من بۆی هاتووم بیکاته بەرنامەی ژیانو له سەری بڕواتو بەردەوام بێت لەسەری.

**خوای گەوره فەرمان دەکات به پێغەمبەر(ﷺ) که هەر خۆ ئەدەست خودا بدەو باسی هەندێك له سیفەتەکانی خودا خۆی**

پاشان خودای گەوره دەفەرموێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَىِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ﴾ واته: خۆت بده دەستی خوداو پشت هەر به ئەو ببەسته له هەموو کاروبارێکتدا، ئەو خوایەی که هەر زیندووەو نامرێت ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾[2]، واته: ئەوەل ئەوەو دوایش ئەوەو لەبەر چاوەو نادیارەو له هەموو شت ئاگادارەو پەروەردگارو کاربەدەستو فەرمانڕەوای هەموو شته، بیکەره دۆستو پشتیوانو جێی هانای خۆت، چونکه هەر ئەو پشتیوانو جێی هانایه، هەر ئەو بۆتۆ بەسەو باشترین یارمەتیدەرو لایەنگیره، وەك فەرموویەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾[3] واته: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕایگەیەنه (به خەڵك) ئەوەی هێنراوەته خوارەوه بۆت له لایەن پەروەردگارتەوە، وه ئەگەر وانەکەی ئەوه ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووه بەجێت نەهێناوه وه خوا تۆ دەپارێزێت له خەڵکی (که بتکوژن). ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ﴾ سوپاسی ئەو خودایه بکەو شوکرانەبژێری بەو تەسبیحاتی بکە، بۆیه پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: (سبحانك اللهم ربّنا وبحمدك)[4]، بێگەردی بۆتۆ ئەی خوای خۆشنەویست به سوپاس و ستایشەوە، خوداش دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا﴾[5] واته: هەر ئەو خوایەو تەنها بڕوامان به ئەو هەیەو عیبادەتی بۆ دەکەینو خۆمان دەدەینه دەستی. وەك له ئایەتێکی تردا

---

[1] التكوير (٢٨).

[2] الحديد (٣).

[3] المائدة (٦٧).

[4] فتح الباري (٢/٣٢٨).

[5] الملك (٢٩).

فەرموویەتی: ﴿رَّبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذۡهُ وَكِيلٗا﴾[١]، واتە: ئەو پەروەردگار و دروستکەری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایە هیچ پەرستراوێکی بە ڕاستی نیە تەنها ئەو نەبێت کەوابوو بیکە بە بریکاری خۆت. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا﴾ هەر ئەو بەسە بۆ ئاگادار بوون لە گوناهی بەندەکانی، بەو هەموو زانیارییەی کە هیچی لیّ ون نابێت ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾ واتە: ئەو خودایەکە هەر زیندووەو نامرێت ئاسمانەکانو زەمینیشی وەدی هێناوەو پەروەردگارو فەرمانڕەواشیەتیو بەهێزو تواناو دەسەڵاتی خۆی ئەو حەوت ئاسمانەی بەو بەرزیو فراوانیەوە، هەروەها ئەوزەویە بەوحەوت چینو بارستایەوە چووەتە خوارەوەو دروستی کردووە ﴿فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ واتە: لە شەش ڕۆژداو پاشان لەسەر تەختی فەرمانڕەوای خۆی دامەزراوەو بە کارەکانیادا ڕادەگاتو هەموو شتێك تەواو دەکاتو دەیبڕێتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا﴾ واتە: هەوڵ بدە لەو کەسەوە کە زۆر زانایە لێیەوە فێربەو شوێنی بکەوەو چاوی لیّ بکە، ڕوونو ئاشکرایە کە هیچ کەسێك ئەوەندەی پێغەمبەر (ﷺ) زاناترو ئاگادارتر نیە بە ناسینی خودا کە بەندەو پێغەمبەری خۆیەتی وە گەورەو بەڕێزترین نەوەی ئادەمە لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتداو لە خۆیەوەو بە ئارەزووی خۆی قسە ناکات بەڵکو نیگایەو لە لایەن خوداوە بۆی هاتووە، هەرچی ئەو فەرمووی هەقەو هەرچی ئەو باسی کردووە لە لایەن خواوە ڕاستە، ئەو پێشەوایەکی زۆر بە توانایە کە هەرچی ناکۆکیەكو دووبەرەکیەك ببیّ لە هەر شتێکدا، دەبێت خەڵکی بۆ لای ئەو بگەڕێنەوەو کێشەکانیان لای ئەو چارەسەر بکەن، هەر شتێك ڕێکی کردارو گفتاری ئەو بوو ڕاستەو هەرچیش دژی بوو کاری پیّ ناکرێتو وەرناگیرێت با هەر کەسیّ کردبێتی یان گوتبێتی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾،[٢]واتە: جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (ﷺ).وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾،[٣] واتە: وە هەر شتێك کە تیایدا جیاوازبوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗا﴾،[٤] واتە: قسەکانی پەروەردگارت

---

[١] المزمل (٩).

[٢] النساء (٥٩).

[٣] شوری (١٠).

[٤] الانعام (١١٥).

لەهەواڵ داندا ڕاستەوداپەروەرانەیە لە فەرماندانو ڕێ پێیەداندا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا﴾ واتە: سا تۆ لەوانەش بپرسە کە زۆر زاناو شارەزان.

**باسی خراپی بت پەرستان**

پاشان خوای گەورە بەرپەرچی موشریکەکان دەداتەوە کە کڕنوش بۆ غەیری خوا دەبەن لە بتو ئەو شتانەی کە عیبادەتی بۆ دەکەن ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ واتە: وە کاتێك بەوان بوترێت سوژدە ببەن بۆ خوای میهرەبان دەڵێن ڕەحمان کێیە؟ یانی: ئێمە ڕەحمانو ڕەحیم ناناسینو نازانین کێیەو چیە. بڕوایان نەبوو بەوە کە خودا بە ڕەحمان ناودەبرێت. وەك لە ڕۆژی حودەیبیەدا ئینکاریان کرد کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بە نووسەرەکە (بنوسە بسم الله الرحمن الرحيم) گوتیان: ئێمە ڕەحمانو ڕەحیم نازانین، بەڵکو بنووسە وەك چۆن دەنووسی: -بسمك اللهم-.[1] بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارد: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾،[2] واتە: بڵێ نزاو هاوار لە خوا بکەن یان هاوار لە ڕەحمان بکەن (یەکسانە) بە هەر کامیان نزاو هاواری بکەن چونکە هەر بۆ خوایە هەموو ناوە هەرە جوانەکان. واتە: ئەو خودایە ڕەحمانیشە، لەم ئایەتەشدا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ واتە: ئێمە نازانین ڕەحمان چیەو دانی پێدا نانێین. ﴿أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا﴾ واتە: تۆ دەتەوێت ئەوەی تۆ فەرمانی پێدەکەی بیناسین، ئێمە سوژدەی بۆ بەرین ﴿وَزَادَهُمْ نُفُورًا﴾ واتە: بەڵکو زیاتر دوور دەکەونەوەو تەرە دەبن، بەڵام ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن خودای مەزن دەپەرستن لە ڕحمانو ڕەحیمو هاوەڵی بۆ دانانێنو کڕنوشی بۆ دەبەن، زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەم سوژدەیە لە سورەتی فورقاندا ڕەوایە بۆ ئەو کەسەی دەیخوێنێت یان گوێی لێ بێت سوژدە بەرێت، لەو شوێنەدا (والله سبحانه وتعالى أعلم).

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾﴾

**باسی تواناو مەزنی خودا**

خوای گەورە باسی گەورەییو پاکی و بێعەیبیو دەسەڵاتی خۆی دەکات لەسەر جوانکاری ئەو بوونەوەرە ڕازاوەیە لە ئاسماندا بەو هەموو ئەستێرە گەورەو هەمەجۆرانە، ئەمە قسەی موجاهیدو ئەبو

[1] احمد (٣/٢٦٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الاسراء (١١٠).

صاڵحو حەسەنو قەتادەیە.[١] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾،[٢] واتە: سوێند بێت بێگومان ئاسمانی دنیامان ڕازاندووەتەوە بە چرای زۆر (ئەستێرە). بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا﴾ واتە: ئەو خۆرە ڕووناکە وەك چرا وایە لەم بوونەوەرەدا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا﴾،[٣] واتە: چرای پرشنگدار ﴿وَقَمَرًا مُّنِيرًا﴾ واتە: ئەو مانگەی کە ڕووناك بووەتەوەو تریفەی دێ بە ڕووناکی ترو بە شێوەیەکی تر کە لە تیشکی خۆر ناچێت وەك خودا فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا﴾،[٤] واتە: خوا زاتێکە کە خۆری گێڕاوە بە تیشك مانگیشی گێڕاوە بە ڕووناکی. خوای گەورە باسی نوح دەکات کە گوتی بە هۆزەکەی: ﴿أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا﴾،[٥] واتە: ئایا نابینن کە خوا چۆن حەوت ئاسمانی دروست کردووە نهۆم لەسەر نهۆم، وە مانگی گێڕاوە لەناویاندا بە ڕووناكو ڕۆژیشی گێڕاوە بە چرا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً﴾ واتە: هەر خوایە کە شەو بە دوای ڕۆژداو ڕۆژ بە دوای شەودا دێنێ، بە دوای یەکداو لە یەك ناترازێن، کە ئەو ڕۆیشت ئەوی تر بە دوایدا دێت بە بەردەوامی، وەك فەرموویەتی: ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾،[٦] واتە: ڕۆژە بە شەو دادەپۆشێت، ڕۆژیش شوێنی شەو دەکەوێتو بە دوایدا دەڕوات، وە فەرموویەتی: ﴿لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ﴾،[٧] واتە: خۆر بۆی نیە بگات بە مانگ. پاشان دەفەرمووێت: ﴿لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ واتە: بۆ کەسێك بیەوێت بیر بکاتەوە یان سوپاسی خودا بکات، لەو شەو ڕۆژەدا کە بە دوای یەکتردا دێن، وەختی عیبادەتیش دیاری دەکەن بۆ بەندەکانی خودا، ئەو کەسەی کە بە ڕۆژ کارێکی بۆ نەکرا بە شەو پێی هەستێت و ئەو کەسەش بە شەو بۆی نەکرا بە ڕۆژ بیکات، لە

---

[١] الطبري (٢٨٩/١٩)، البغوي (٣٧٤/٣).
[٢] الملك (٥).
[٣] النبأ (١٣).
[٤] یونس (٥).
[٥] نوح (٥).
[٦] الاعراف (٥٤).
[٧] یس (٤٠).

فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە بە شەو دەستی درێژ دەکات بۆ ئەوەی لە تاوانباری ڕۆژ خۆش ببێت وە بە ڕۆژ دەستی درێژ دەکات بۆ ئەوەی لە تاوانباری یشە خۆش ببێت)،[1] موجاهیدو قەتادە دەڵێن: ﴿خِلْفَةً﴾ واتە: شەو بە و ڕۆژیش بە ڕۆشنایەکەی[2].

﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾

## لە سیفەتەکانی عەبدە ڕاستەکانی خوای ڕەحمان

ئەمە سیفەتی بەندە خاوەنباوەڕەکانی خودایە: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا﴾ واتە: دەڕۆن بە ڕێوە بە ئارامیو زۆر لەسەرخۆ بەبێ ئەوەی فیزیکەنو خۆیان بە زل بزانن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾[3]، واتە: بە لوت بەرزی بەڕێوە مەڕۆ، ئەم عەبدە ڕاستانەی خودای میهرەبان -ڕەحمان- دەڕۆن بەسەر زەویداو فیزناکەنو لوتیان بەرز نیەو منەت ناکەن بەسەریدا، مەبەست ئەوە نیە وەك نەخۆش ڕێدەکەنو ڕیا بازیدەکەن! نا! بەڵکو بەڕێزترین نەوەی ئادەم محمد (ﷺ) وەختێ دەڕۆیشت وەك ئەوەی لە بەرزاییەکەوە بێتە خوارەوەو زەمین بۆی بپێچرێتەوە وابوو، بەڵکو مەبەست بە (هَوْنْ): ئارامیو لەسەرخۆییە، وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێ هاتن بۆ نوێژ بەپەلە مەیەن بۆ نوێژ، بە لەسەرخۆیی بێن بۆ نوێژ، ئەوەی فریای کەوتن بیکەنو ئەوەیش لە دەستتان چوو -فریای نەکەوتن- دوایی تەواوی بکەن)[4]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا﴾ واتە: هەر کاتێك نەفامان قسەی نابەجێیان بەرامبەر کردن وەڵامیان نادەنەوە، بەڵکو لێبوردەو دڵ فراوانن، جگە لە قسەی چاك هیچ شتێکی تر ناڵێن، وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەتا نەزانان زیاترو توندتر قسەی بەرامبەر بکەن ئەو لەسەرخۆترە) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ

[1] مسلم (٢١١٣/٤).

[2] الطبري (٢٩٠،٢٩١/١٩).

[3] الاسراء (٣٧).

[4] فتح الباري (٤٥٣/٢).

﴿أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ﴾،[١] واتە: وە کاتێ قسەی ناپەسەندو هیچ و پوچ ببیستن پشتی تێدەکەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە نوعمانی کوڕی موقرنی موزەنیەوە (نعمان بن مقرن المزني) دەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (پیاوێك قسەی وت بە پیاوێك لە لای ئەودا، گوتی: ئەو پیاوەی کە قسەی پێ وترا دەیوت: (عليك السلام) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: بێگومان فریشتەیەك لە نێوان هەردووکتاندا هەموو بەرگری لە تۆ دەوت، هەر کاتێك ئەو قسە بە تۆ دەوت، فریشتەیەکە پێی ئەوت: نابەڵکوخۆت، وە خۆت شایستەتری بەوقسەیە، وە کاتێ تۆپێت دەوت: -عليك السلام- فریشتەکە ئەیوت: نا بەڵکو خۆت ڕای وە تۆ شایستەتری بەوە) واتە: تۆ شایستەتری بەو سڵاوە و ڕێزە کە لەو پیاوەی دەکەی کاتێك کە قسەت پێ دەڵێت. ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە، بەڵام زانایانی تری فەرموودە ڕیوایەتیان نەکردووە.[٢] پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە(بەندە ڕاستەکانی خوا) شەوەکانیان چاکترین شەوە وەك ئەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا﴾ واتە: ئەو کەسانە، شەو تا بەیان سوژدە دەبەن بۆ خواو وەستاون بە پێوەو عیبادەتی خودا دەکەن‌و فەرمانەکانی بەجێ دەهێنن‌و شەونوێژ دەکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ١٧ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ﴾[٣]، واتە: ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن (ئیتر هەر شەونوێژیان دەکرد) وە لە بەرەبەیاندا داوای لێخۆشبوونیان دەکرد. وە فەرموویەتی: ﴿أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦ﴾[٤]، واتە: (هاوبەش دانەران چاکترن) یا کەسێك ملکەچ‌و پەرستکارە (بۆ خوا) و کاتەکانی شەو بە سوژدە بردن‌و ڕاوەستان (لە شەونوێژدا) بەسەر ئەبات و لە(سزای) دواڕۆژ دەترسێت‌و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی؟ هەر بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾ واتە: ئەوانەی کەدەڵێن ئەی خودایە لامانبدە لەسزای جەهەنەم، چونکەسزای جەهەنەم بەردەوامەو دوایی نایەت، بۆیە حەسەنی بەسری لەم ئایەتەدا ﴿إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا﴾ ئەفەرموێ: هەر شتێك توشی نەوەی ئادەم ببێت لە دنیادا دەڕواو نامێنێت ئەوە پێی ناگوترێت غەرام بەڵام ئەو

---

[١] القصص (٥٥).

[٢] أحمد (٤٤٥/٥)، ئەم فەرموودەیە پیاوەکانی جێی متمانەن.

[٣] الذاريات (١٧-١٨).

[٤] الزمر (٩).

غەرامەی کە هەر بەردەوامەو لاناچێت ئەوەیە کە هەتا ئەرزو ئاسمان بمێنێت دەمێنێت.[1] سولەیمانی تەیمیش (سليمان التّيميّ) هەر وای گوتووە.[2] وە فەرموویێت: ﴿إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ واتە: بەڕاستی جێگاو شوێنێکی زۆر خراپو ناخۆشە. خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَالَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە لە کاتی ماڵ بەخشیندا زۆر دەست بڵاو نینو زیاد لە پێویست خەرج ناکەنو زۆریش چاوچنۆك نین کە سامان لە ماڵ و منداڵیان بگێڕنەوە و پێویستیان دەرنەکەن. بەڵکو بە ڕێکوپێکی مامەڵە لەگەڵیان دەکەن، چاکترین کاریش ئەو کارەیە لەو ناوەندەدا بێت. واتە: نە زۆر دەست بڵاوو نە زۆر دەست قوچاو، ﴿وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا﴾ واتە: بەڵکو مامناوەندیە لەو نێوانەدا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ﴾.[3] واتە: وە دەستت مەکە کۆت بە گەردنتداو کراوەو بەرەڵاشی مەکە بە تەواوی.

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾﴾

**لە سیفەتەکانی عەبدە ڕاستەکانی ڕەحمان دوورکەوتنەوە لە شیركو کوشتنو بەدڕەوشتی -داوێنپیسی-**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێ: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کام گوناه گەورەترە؟ فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوا بڕیاربدەی کە ئەو دروستی کردووی) دەڵێ: پاشان کامە؟ فەرمووی: (داوێنپیسی -زینا- کردن لەگەڵ ژنی دراوسێکەتدا) عەبدوڵا دەڵێ: بۆ پشتگیری ئەم فەرموودەیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارد: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا﴾ واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی ترناپەرستن و هیچ کەسێك ناکوژن کە خوا کوشتنی ئەوی حەرام کردبێت بە هەقو ڕەوا نەبێت وە زیناو داوێنپیسی ناکەن وە هەر کەس ئەو تاوانانە بکات توشی

---

[1] الطبري (١٩/٢٩٧).

[2] عبدالرزاق (٣/٧٢).

[3] الاسراء (٢٩).

تۆڵەکەی دێت،[1] هەر بەم شێوەیە نەسائیش ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە[2]. بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیانکردووە[3]. لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە بیستویەتی لە ئیبنو عەباسەوە فەرموویەتی: هەندێ کەس لە موشریکەکان پیاوی زۆریان کوشتبوو هەروەها داوێنپیسی زۆریان کردبوو، پاش ئەوانە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەوەی تۆ ئیلێیت و بانگی خەڵکی بۆ دەکەیت زۆر چاکە، پێمان بڵێ ئاخۆ ئەوەی کردوومانە کەفارەتی هەیە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾[4]، واتە: بێژە: ئەی بەندەکانی من ئەی ئەوانەی کە بە لادان لە ئەندازە ناهەقیان لە خۆیان کردووە، نابێت ئێوە لە بەزەیی خودا نائومێد بن، چونکە خوا لە هەموو گوناهێ چاوپۆشی دەکات، خودا لێبوردەو دڵۆڤانە، وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا﴾ ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە دەڵێ: ﴿أَثَامًا﴾ شیوێکە لەناو جەهەنەمدا.[5] عیکریمە دەڵێ: ﴿يَلۡقَ أَثَامًا﴾ شیوێکە لەناو جەهەنەمدا داوێنپیسانی تێدا جەزرەبە دەدرێت. هەربەوشێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدەوە[6]. سودی دەڵێ: ﴿يَلۡقَ أَثَامًا﴾ سزای تاوانی خۆی وەردەگرێت، ئەم تەفسیرە دیارو نزیکترە لە ئایەتەکەوە. وەك چۆن ئایەتەکانی دواوە ڕوونیان کردووەتەوە کە دەفەرموێت: ﴿يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا سزای بۆ چەند بارە دەبێتەوەو بەهێزتر دەکرێت، ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ واتە: هەر دەمێنێتەوە لەو سزایەدا بە سوكو ڕیسوایی. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا﴾ واتەك بێجگە لە کەسێك تەوبەی کردبێتو باوەڕی هێنابێت کارو کردەوەی چاکیشی کردبێت. ﴿إِلَّا مَن تَابَ﴾ واتە: مەگین کەسێك لە دنیادا گەڕابێتەوە بۆ لای خواو پەشیمان بوبێتەوە لەو گوناهانەی کە کردوویەتی، بێگومان خوای گەورە لێبوردەیەو لێی خۆش دەبێت، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروستی

---

[1] احمد (١/٣٨٠).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٤٢٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (١٢/١١٦)، مسلم (١/٩٠، ٩١).

[4] الزمر (٥٣).

[5] الطبري (١٩/٣٠٨).

[6] الطبري (١٩/٣٠٨).

تەوبەی پیاوکوژ، وە هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوان ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەی سورەتی (نیساء)دا کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾[1]، واتە: وە هەر کەسێك ئیماندارێك بە دەس ئەنقەس بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە بە هەمیشەیی تیایدا دەبێتو خوا خەشمی لێ گرتووە نەفرینی لێ کردووەو سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە. ئەم ئایەتە هەرچەندە لە مەدینە هاتووە خوارەوە بەڵام ڕەهایەو (مطلقة) ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە پەشیمان نابنەوە –تەوبە ناکەن– چونکە ئەم ئایەتە لێبوردنی بەستووە بە پەشیمان بوونەوەوە لە دنیادا، پاشان خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾[2]، واتە: بە ڕاستی خوا خۆش نابێت لەوەی کە هاوەڵی بۆ دابنرێت بەڵام جگە لەو هەرچی بێت لێی خۆش دەبێت لە هەر کەسێك کە (خوا) بیەوێت. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەشیمان بوونەوەی –تەوبەی– پیاوکوژی بە لاوە دروست بووە، وەك بەسەرهاتی ئەو کەسەی کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە کە سەد پیاوی کوشتووە پاشان گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا –تەوبەی کردووە– خودایش تەوبەکەی لێ قەبووڵ کردووە وە چەند فەرموودەی تریش لەم بارەیەوە هاتووە. ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، واتە: ئا ئەوانە خوا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە وە خوا هەمیشە لێبوردەی بە بەزەییە. ئیمامی ئەحمد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زەڕەوە ڕەزای خوای لێبێت، دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (من ئاگاداری دوایین کەسم لە ناو ئاگر دێتە دەر، وە دوایین کەسیش لە خەڵکی بەهەشت کە دەچێتە بەهەشت، پیاوێك دەهێنرێت دەفەرموێت: گوناهە گەورەکانی بسڕنەوە پرسیاری لە گوناهە بچووکەکان لێ بکەن، دەڵێ: پێی ئەڵێن: فڵانە ڕۆژە ئەوەت کردو ئەوەت کردو ئەوەت کرد وە فڵانە ڕۆژیش ئەوەت کردو ئەوەت کردو ئەوەت کرد، پیاوەکەش ئەڵێ: بەڵێ ناتوانم نکوڵی لە هیچ شتێك لەوانە بکەم، پێی دەگوترێت: بێگومان بۆ هەر تاوانێکت لەو تاوانانە چاکەیەکت بۆ هەیە، پیاوەکە ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم هەندێ شتم کردووە لێرەدا چاوم پێی ناکەوێ) ئەبو زەڕ دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێکەنی هەتا دانی پێرۆزی دەرکەوت.[3] موسلیمیش بە تەنها ڕیوایەتی کردووە.[4] ئیبنو ئەبی حاتەم

---

[1] النساء (٩٣).

[2] النساء (١١٦).

[3] أحمد (١٧٠/٥).

[4] مسلم (١٧٧/١).

ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو جابیرەوە کە گوێی لە مەکحول بوو قسەی دەکرد دەڵێ: پیاوێکی گەورەو بە تەمەن کە برۆکانی کەتبوو بەسەر چاویدا هاتو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پیاوێکی ناپاکو بەدکار کە هیچ تاوانو خراپەیەك نەماوە کە دەستی بۆ نەبردبێت، خۆ ئەگەر تاوانەکانی دابەش بکرێت بەسەر خەڵکی هەموو ئاسمانەکانو زەمیندا بەشیان دەکات ئایا پەشیمان بوونەوە –تەوبەی– بۆ هەیە؟ (واتە: تەوبەی لێ قبوڵ دەکرێت؟) پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو: ( ئایا موسڵمان بوویت –واتا موسڵمان بوونی خۆت ڕاگەیاندووە–؟) پیاوەکە وتی: بە نسیبەت منەوە (أشهد أن لا اله الاّ الله وحده لا شريك له، وأن محمداً عبده ورسوله) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خودا خۆش دەبێت لە تۆ، مادام تۆ ئاوایت، خراپەکانیشت دەگۆڕێ بە چاکە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناپاکیو بەدکاریەکانیشم؟ فەرمووی: (ناپاکیو بەدکاریەکانیشت) پیاکەوە ڕۆیشتو هەر (لا اله الا الله و الله اكبر)ی دەکرد (يُهَلِّل ويُكَبِّر)،[1] پاشان خوای گەورە باسی ڕەحمەتی بێپایانی خۆی دەکات بۆ بەندەکانی، ئەوانەی کە پەشیمان دەبنەوە لە گوناه و لە دنیادا با هەر تاوانێکیان کردبێت، گەورە یان بچووك، زۆر بێت یان کەم. خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾ واتە: هەر کەسێك بە ڕاستی پەشیمان بێتەوەو ئاکاری چاك بکات خودا تەوبەی لێ قەبوڵ دەکاتو دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا بە گەڕانەوەیەکی تەواو، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾[2]، واتە: وە هەر کەس کردەوەیەکی خراپ بکات یان ستەم لە خۆی بکات پاشان داوای لێخۆش بوون لە خوا بکات دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە. وە فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾،[3] واتە: ئایا نەیانزانیووە کە بێگومان هەر خوا تەوبەو پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێت. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾،[4] واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە نائومێد مەبن لە میهرەبانیو بەزەیی خودا (واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە تەوبە دەکەن).

---

[1] الدر المنثور (٦/٢٨١).

[2] النساء (١١٠).

[3] التوبة (١٠٤).

[4] الزمر (٥٣).

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾

**وە هەندێکیتر لە سیفەتەکانی بەندە ڕاستەکانی ڕەحمان**

ئەمەیش یەکێکی ترە لە سیفەتە چاکەکانی بەندەکانی ڕەحمان کە هەرگیز شایەتی درۆ نادەن‌و قسەی ناشیرین‌و خراپ‌و دوور لە دین‌و پڕوپوچ بە دەمیاندا نایەت، عەمری کوڕی قەیس دەڵێ: ﴿لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ﴾ واتە: لە شوێنێ قسەی ناشیرین‌و خراپی تێدا بکرێت دانانیشن، دیسان ئەوەشی وتووە: مەبەست بەو ئایەتەی دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ﴾ ﴿ٱلزُّورَ﴾ واتە: درۆ هەڵبەستن بۆ خەڵکی بە ئارەزوو –بەعەمدی– وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو بەکرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی گەورەترین تاوانی ناو تاوانە مەزنەکان؟) سێ جارئەمەی فەرموو، گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)! فەرمووی: (بابزانن قسەی درۆ هەڵبەستن‌و شایەتیدانی درۆیە) بەردەوام دەیگوتەوە هەتا(لەدڵی خۆماندا) گوتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو[1]. لە ئایەتەکەوە وا دەردەکەوێت کە مەبەست بە ﴿لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ﴾ واتە: ئامادەی شایەتی درۆ نابن، خۆ ئەگەر جارێ ڕێ بکەوێ بەوێدا بڕۆن خۆیانی لێ لادەدەن و خۆیان دەپارێزن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَرُّواْ كِرَامٗا﴾ واتە: تێپەڕ دەکەن بە ڕێزەوە. دیسان خوای گەورە باسی سیفاتی عەبدە ڕاستەکانی ڕەحمان دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا﴾، واتە: وە کەسانێکن کاتێك ئامۆژگاری بکرێن بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان ناکەون بەسەریاندا بە کەڕی‌و کوێری. وە لە ئایەتێکی تردا خودای مەزن هەر باسی عەبدە ڕاستەکانی خودا دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾،[2] واتە: خاوەن باوەڕان ئەوانەن هەر کە ناوی خوا برا دڵیان ترسی لێ دەنیشێت‌و کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێت بڕوایان زیاتر دەبێت‌و هەر خۆیان بە خوا دەسپێرن، بە پێچەوانەی خوانەناسەوە کە وەختێ گوێیان لە قورئان بوو

[1] فتح الباري (٥/٣٠٩)، مسلم (١/٩١).

[2] الانفال (٢).

هیچ کاریان لێ ناکاتو نایانگۆڕێت بەڵکو هەر لەسەر خراپیو لاساریو خوانەناسیو گومڕایی خۆیان بەردەوامن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ﴾[1] واتە: وە کاتێك کە سوڕەتێك بنێردرێتەوە خوارەوە (لە قورئان)، (دووڕووەکان) هی وایان هەیە دەڵێ: کام لە ئێوە بەم (سوڕەتە) باوەڕی زیادی کرد؟ جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەوە ئیمانیان زیاد دەکات (و بەهێزتر دەبێت) وە ئەوان مژدەبەخشنو خۆشحاڵن، بەڵام ئەوانەی لەنێو دڵیاندا نەخۆشی (ناپاکی) هەیە ئەوە ئەو سوڕەتە پیسی و ناپاکی تریان بۆ زیاد دەکات سەرەڕای پیسیو ناپاکی خۆیان. واتە: ئەوانەی کە ناو دڵیان نەخۆشە، زیاتر دەست دەدەنە خوانەناسی. لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ واتە: بە پێچەوانەی خوانەناسەوە کە کاتێ گوێیان لە قورئان بوو کاریان تێناکات، لەسەر بێدینی خۆیان بەردەوامن وەك ئەوەی کەڕو کوێرن هیچ نابیسنو نابینن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾، واتە: ئەوانەی کە داوا دەکەن لە خوای گەورە کە لە پشتو ڕەچەڵکی ئەوانو هاوسەرەکانیان منداڵانێکی وا پەیدا بن کە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بکەنو تەنها ئەو بپەرستنو شەریکی بۆ دانەنێن، ئیبنو عەباس دەڵێ: مەبەستیان ئەوەیە لەو کەسانە بن کە پەیڕەوی فەرمانەکانی خوا دەکەن، وە ببنە مایەی چاوڕۆشنی بۆیان لە دنیاو لە قیامەتدا،[2] ئیمامی ئەحمەد لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: ڕۆژێ لە لای میقدادی کوڕی ئەسوەد دانیشتبووین، پیاوێك بە لایدا تێپەڕی و گوتی: خۆشبەختی بۆ ئەو دوو چاوەی کە پێغەمبەری خوای (ﷺ) بینی، حەزمان دەکرد ئەوەی تۆ چاوت پێی کەوتووەو بینیوتە ئێمەش چاومان پێی بکەوتایەو لەوێ بووینایە، میقداد توڕە بوو، منیش سەرم سوڕما چونکە ئەو پیاوە غەیری قسەی چاك هیچی تری نەگوت، پاشان میقداد ڕووی کردە پیاوەکەو گوتی: چی وا دەکات لە پیاو کە ئاوات بخوازێت کە ئامادەی شتێك بێت کە خوا پیشانی نەداوە، لەکاتێکدا نازانێ ئەگەر ئامادە بووایە چۆن دەبوو لەو کاتەدا، سوێند بە خوا زۆر هۆز لە کاتی پێغەمبەر (ﷺ)دا هەبوونو بڕوایان پێ نەکردو شوێنی نەکەوتن. خوای گەورە بە دەمو چاودا ڕایکێشان بەناو جەهەنەمدا، بۆچی سوپاسی خوای گەورە ناکەن لە سکی دایکتان هێنانیە دنیاوە، غەیری خودا کەسی ترتان نەدەناسیو بڕواتان بەو

---

[1] التوبة (١٢٤-١٢٥).

[2] الطبري (٣١٨/١٩).

پەیامە بوو کە بۆتان هات لە لایەن پێغەمبەرەکەتانەوەو لەو بەڵایە ڕزگارتان بوو کە خەڵکی تر تووشیان هات؟ خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) ڕەوانە کرد لە کاتێکدا کە هیچ پێغەمبەرێك تووشی ئەو نارەحەتیە نەبووە، لەو چەرخی نەفامیدا کە چاکترین ئاین لە لای ئەوانە عیبادەتی ئەو بتانە بووە کە پەرستوویانە، وەختێ پێغەمبەر (ﷺ) هاتو قورئانی هێنا هەقو ناهەقی بەوقورئانە لێك جیاکردەوە، باوكو کوڕیشی لە یەکتری جیاکردەوە، پیاوی وا هەبوو باوكو کوڕ یان برای خوانەناسی هەبوو، خوای گەورە قفڵی دڵی ئەوی کردووەتەوەو شارەزای کردووە بڕوای هێناوە، دەیزانی ئەگەر پێش بڕوا هێنان بمردایە لەناو ئاگردا دەبوو، خۆ ئەگەر بیزانیایە خۆشەویستەکەی لەناو ئاگردایە نەدەبووە مایەی چاوڕۆشنی، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی ڕاستن، بەڵام زانایانی تری فەرموودە نەیان هێناوە.[1] ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ واتە: بمانکە بە پێشەوای خۆپارێزان، ئیبنو عەباسو حەسەنو سودیو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێن: بمانکە بە پێشەوایەك کە خەڵکی شوێنمان بکەوێت لە چاکەدا.[2] ئەوانە شارەزاو ڕێ نیشاندەرنو بانگخوازن بۆ سەر چاکە پێیان خۆشە عیبادەتی خۆیان ببەستن بە عیبادەتیماڵو منداڵو کەسو کاریانەوەو ئەو خێرو چاکەیانە سوودەکەی بگاتە کەسانی تریش، لەبەر ئەوەی زیاتر تووشی خێرو پاداشت بن، بۆیە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێ نەوەی ئادەم -منداڵی ئادەم- مرد کرداری دەوەستێت لە سێ شتدا نەبێت: منداڵێکی چاك کە دوعای بۆ بکات یان زانستێ سوودی لێ وەرگیرێت دوای خۆی یان خێرێکی بەردەوامو نەبڕاوە -صدقة جارية-[3].

﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٧٦﴾ قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾﴾

**پاداشتی عەبدە ڕاستەکانی ڕەحمانو هەڕەشە لە خەڵکی مەککە**

وەختێ خوای گەورە باسی سیفاتی عەبدە خاوەنباوەڕەکانی کرد کە چەند سیفەتی جوانو شیرینیان هەیە لە قسەو هەڵسوکەوتو کردارو ڕەفتاریاندا پاشان ئەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُجْزَوْنَ ٱلْغُرْفَةَ﴾ واتە: ئەوانەی ئەم خورەوشتە جوانانەیان هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا وان لە ناو هۆدەکانی

---

[1] أحمد (٢/٦).

[2] الطبري (١٩/٣١٩).

[3] مسلم (٣/١٢٥٥).

بەهەشتدا ﴿ٱلْغُرْفَةَ﴾ واتە: بەهەشت، ئەبو جەعفەری باقرو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاك و سودی دەڵێن: بەهەشت ناوبراوە بە هۆدە (الغرفة) لەبەر بەرزیەکەی ﴿بِمَا صَبَرُواْ﴾ واتە: بەهۆی ئەو خۆڕاگریانەوە کە گەردنگیرن بەو فەرمانانەوە کە خوای گەورە داوای لێ کردن، ﴿وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَـٰمًا﴾ واتە: لە ناو بەهەشتدا بە سڵاو ڕێز لێگرتنەوە پێشوازیان لێ دەکرێتو قەدرێکی زۆریان لێ دەگیرێت، فریشتەکان لە هەموو دەرگاکانەوە دەچنە لایانو پێیان ئەڵێن: سڵاوتان لێ بێت بە هۆی ئەو خۆڕاگریەتانەوە، پیرۆزتان بێت ئەم شوێنە چاكو پڕ بەختەوەریە، ﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَا﴾ واتە: تا هەتایە تێیدا دەمێننەوەو لێی دەرناچنو ناگوێزرێنەوەو نامرنو لەناو ناچن، خۆشیان نایانەوێ بڕۆنە دەرەوە لێی. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾،[1] واتە: بەڵام ئەوانەی کە بەختەوەر کراون ئەوە لە بەهەشت دان بە هەمیشەیی دەمێننەوە تیایدا تا ئاسمانو زەوی بمێنێت. وە لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾ واتە: جێو شوێنێکی زۆر خۆشو پاكو دڵڕفێنە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُاْ بِكُمْ رَبِّى لَوْلَا دُعَآؤُكُمْ﴾ واتە: خودا هیچ باکی نییە لێتان و لێتان ناپرسێتەوە، ئەگەر نەپەرستنو دوعاو نزاتان نەبێت، چونکە خەڵکی بۆ ئەوە دروست کردووە بیپەرستنو شەریکی بۆ بڕیار نەدەنو بەیانیانو ئێواران هەر باسی پەسەنیو پاکیو بێ عەیبی ئەو بکەن، ﴿فَقَدْ كَذَّبْتُمْ﴾ واتە: بەبێگومان ئەی خوانەناسەکان ئێوە ئیسلام بەدرۆ ئەزانن، ﴿فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا﴾ واتە: بەم زووانە بەهۆی ئەو بێ دینیەتانەوە تووشی سزاو تۆڵەی سەختو قڕبوون دەبن لە دنیاو لە قیامەتدا، لەو سزایانەی کە خوا تووشی خوانەناسانی قوڕەیشی کرد جەنگی بەدر بوو کە زۆرێك لە قوڕەیشیەکان کوژرانو دەست بەسەر کران، وەك عەبدوڵای کوڕی مەسعودو ئوبەیی کوڕی کەعبو موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەزیو موجاهیدو زەححاكو قەتادەو سەدیو کەسانی تریش وتوویانەو ئێمەش وا مانایان لێك داوەتەوە.[2] حەسەنی بەسری دەڵێ: ﴿فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًۢا﴾ واتە: توشی سزا دەبن لە ڕۆژی قیامەتدا بە

[1] هود (١٠٨).

[2] الطبري (٣٢٤/١٩)، وعبدالرزاق (٧٢/٣).

بەردەوامی.[1] هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەم دوو قسەیەدا نیە، كۆتایی تەفسیری سورەتی (الفرقان) سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

**تەفسیری سورەتی (الشعراء) لە مەككە هاتووەتە خوارەوە**

**لە تەفسیری (مالك)دا كە ڕیوایەت كراوە لێیەوە ناوبراوە بە سورەتی جامیعە (الجامعة)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿طسٓمٓ (١) تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ (٢) لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ (٣) إِن نَّشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِم مِّنَ
ٱلسَّمَآءِ ءَايَةً فَظَلَّتْ أَعْنَٰقُهُمْ لَهَا خَٰضِعِينَ (٤) وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ (٥) فَقَدْ
كَذَّبُوا۟ فَسَيَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ (٦) أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلْأَرْضِ كَمْ أَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ (٧) إِنَّ
فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (٨) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ (٩)﴾

قورئان و گوێ پێنەدانی خوانەناس پێی و خودا مەیلی لێبوایە ملی پێ كەچ دەكردن و بڕوایان دەهێنا لە پێشەوە قسەمان لەسەر ئەم پیتانە -ط،س،م- كرد لە سورەتی (البقرة)، پێویست ناكات لێرەدا جارێكی تر باسی بكەینەوە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ واتە: ئەمە ئایەتەكانی قورئانە كە دیارو ڕونن، واتە: زۆر واتاكانی ئاشكراو ڕوونن و هەق و ناهەق و گومڕایی و لە شارەزایی جیادەكاتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ): ﴿لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ﴾ واتە: لەوانەیە خۆت لەناو بەری كە ئەوەندە هەوڵ ئەدەی و خەفەت دەخۆی و دلگران دەبیت، ﴿أَلَّا يَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی ئەوانە بڕوا ناهێنن، ئەمە خۆی دڵ دانەوەیەكی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) بۆ ئەوەی زۆر ناڕەحەت نەبێت لەوەی كە ئەو خوانەناسانە بڕوا ناهێنن وەك لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾،[2] واتە: دەی بە خەفەت خواردن لەبەر (ئیمان نەهێنانی) ئەوان خۆت مەفەوتێنە. وە فەرموویەتی: ﴿فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا﴾،[3] واتە: جا لەوانەیە خۆت لەناوبەری لەبەر كردەوەی ئەوان ئەگەر ئیمان نەهێنن بەم قورئانە لە داخ و خەفەتدا (بمریت). موجاهیدو عیكریمەو قەتادەو عەتیەو زەحاك و حەسەن و كەسانی تریش گوتوویانە: ﴿لَعَلَّكَ

[1] الدر المنثور (٦/٢٨٧).

[2] الفاطر (٨).

[3] الكهف (٦).

بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ﴾ واتە: لەوانەیە خۆت بکوژی.[1] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن نَّشَأۡ نُنَزِّلۡ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ءَايَةٗ فَظَلَّتۡ أَعۡنَٰقُهُمۡ لَهَا خَٰضِعِينَ﴾ واتە: ئێمە ئەگەر مەیلمان لێ بێت بەڵگەیەك لە ئاسمانەوە دەنێرین وایان لێ دەکەین بە زۆر باوەڕی پێ بهێنن، بەڵام ئێمە وا ناکەین، چونکە ئێمە نامانەوێ کەس بە زۆر بڕوا بهێنێت، بۆ ئەوەی خەڵکی بە ئارەزووی خۆی بڕوا بێنێت، وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾[2]، واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەو(خەڵکەی) وا لە زەویدا هەموو تێکڕا بڕوایان دەهێنا دەی ئایا تۆ (ئەی موحەمەد (ﷺ)) زۆر لە خەڵکی دەکەیت هەتا ببنە بڕوادار. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخۡتَلِفِينَ﴾[3]، واتە: گەر پەروەردگارت بیویستایە گشت خەڵکی دەکرد بە(پەیڕەوانی) یەك ئایین بەڵام ئەوان بەردەوام جیاواز دەبن. خوای گەورە بڕیاری خۆی بەجێ هێنا بە کارزانی خۆی وە گەورەترین نیشانەی خۆی پیشانی خەڵکی دا بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران و ناردنی کتێبەکان بۆیان، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن ذِكۡرٖ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ مُحۡدَثٍ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهُ مُعۡرِضِينَ﴾ واتە: هەر کاتێك لە ئاسمانەوە کتێبێکیان بۆ بێت زۆربەی خەڵکی ڕووی لێ وەردەگێڕن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ﴾[4]، واتە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سوور بیت (لەسەر باوەڕهێنانیان) نابنە ئیماندار. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾[5]، واتە: پەشیمانی و داخی سەخت بۆ ئەو بەندانەی (کە بێباوەڕن) هەر پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە تەنها گاڵتەیان پێ دەکردو (هیچی تر). وە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَاۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةٗ رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُۖ﴾[6]، واتە: لە پاشان پێغەمبەرانی خۆمان یەك لە دوای یەك نارد هەر کاتێك ئومەتێك لە خۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ بهاتایە باوەڕیان پێ نەدەهێنا. بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَقَدۡ كَذَّبُواْ فَسَيَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ واتە: ئەوانە بڕوایان بەو

---

[1] الطبري (١٩/٣٣٠)، الدر المنثور (٦/٣٦٠).

[2] يونس (٩٩).

[3] هود (١١٨).

[4] يوسف (١٠٣).

[5] يس (٣٠).

[6] المؤمنون (٤٤).

هەقە نەهێنا کە بۆیان هات، بەو زووانە هەواڵی ئەو باوەڕ نەکردنەیان‌و گاڵتەو لاقرتەیان پێدەگات‌و دەیزانن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾[1]، واتە: وە ئەوانەی ستەمیان کردووە لەمەودوا دەزانن کە چۆن گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە (بۆ لای خوا دوای مردن). پاشان خوای گەورە باسی مەزنی دەسەڵاتی خۆی دەکات کە چەندە خاوەن تواناو هێزو دەسەڵاتە، وە ئەوانەی چەندە نەترسانە دژایەتی پێغەمبەرەکەی دەکەن‌و بڕوا بە کتێبەکەی ناکەن، ئەو خوایەی کە زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو زەوی دروست کردووەو لە هەموو جۆر دروستکراوەکانیدا نێرو مێی وەدی هێناوە لە کشتوکاڵ‌و بەرهەمەکان‌و گشت گیانەوەرەکاندا، سوفیانی سەوری لە پیاوێکەوە ئەگێڕێتەوە و ئەویش لە شەعبیەوە کەدەڵێ: خەڵکی لە ڕووەکی ناو زەمینەوە سەرچاوەی گرتووە و هەر کەسێکیش چووە ناو بەهەشت ئەوە بەڕێزە، ئەو کەسەش چووە ناو ئاگر سووك‌و ڕیسوایە[2]. ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ﴾ واتە: ئایا سەیری زەوی ناکەن چەندمان ڕواندووە تیایدا لە هەموو جۆرێکی چاکی بە کەڵك. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە: لەمەوە نیشانەی توانای خوا دەردەکەوێت بەسەر هەموو شتێکدا، کە زەمینی ڕاخستووەو ئاسمانی بەو بەرزیە ڕاگرتووەو کەچی زۆربەی خەڵکی هەر بڕوا ناهێنن، بەڵکو بە پێچەوانەوە حاشا دەکەن‌و شوێن پێغەمبەرەکانی‌و کتێبەکانی ناکەون کە بۆی ناردوون‌و دژایەتی فەرمانەکانی دەکەن‌و سنوورەکانی خودا دەبەزێنن، ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ﴾ واتە: هەر پەروەردگارتە دەسەڵات دەدات بە هەموو شتێك‌و بەرزی دەکاتەوەو هەر ئەویشە زاڵە‌و سەردەکەوێ بە سەریدا، واتە: هەموو دەسەڵاتێ هەر بۆ خودایە،﴿الرَّحِيمُ﴾ واتە: بەخشندە و دلۆڤانە بەرامبەر دروستکراوەکانی پەلە ناکات لەوانە کە لێی یاخی دەبن‌و بەڵکو مۆڵەتیان دەدات‌و تۆڵە لێسەندنیان دوا دەخات، پاشان زۆر بەتوندی جەربەزەیان دەدات، ئەبول عالیەو و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و ئیبنو ئیسحاق دەڵێن: ﴿الْعَزِيزُ﴾ واتە: خاوەن دەسەڵات لە تۆڵە سەندن‌و زاڵ بەسەر ئەوانەی دژایەتی فەرمانەکانی دەکەن‌و غەیری ئەو دەپەرستن.[3] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: ﴿الرَّحِيمُ﴾ واتە: دلۆڤانە لەگەڵ ئەو کەسانەی دەگەڕێنەوە بۆ لای‌و تەوبە دەکەن.

---

[1] الشعراء (٢٢٧).

[2] الدر المنثور (٦/٢٨٩).

[3] الطبري (٢٣/٣٠٤/٣/٢٦٠/٥/٥١١).

﴿ وَإِذۡ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئۡتِ ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ
﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿١٤﴾ قَالَ
كَلَّاۖ فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴿١٥﴾ فَأۡتِيَا فِرۡعَوۡنَ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ أَنۡ أَرۡسِلۡ مَعَنَا
بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلۡتَ فَعۡلَتَكَ ٱلَّتِي فَعَلۡتَ وَأَنتَ
مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ قَالَ فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرۡتُ مِنكُمۡ لَمَّا خِفۡتُكُمۡ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكۡمٗا وَجَعَلَنِي
مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلۡكَ نِعۡمَةٞ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنۡ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾

**لە نێوان موساو فیرعەوندا**

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەرو هەڵبژاردەی خۆی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەكات كاتێك كە لە لای ڕاستی كێوی تورەوە بانگی كرد و قسەی لەگەڵدا كردو هەڵیبژاردو ڕای سپارد بڕوات بۆ لای فیرعەون و دارودەستەكەی، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذۡ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱئۡتِ ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَۚ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿١٢﴾ وَيَضِيقُ صَدۡرِي وَلَا يَنطَلِقُ لِسَانِي فَأَرۡسِلۡ إِلَىٰ هَٰرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴾، واتە: ئەو كاتەی پەروەردگارت بانگی موسای كرد كە بڕۆ بۆ لای ئەو گەلە ستەمكارە، كە گەلەكەی فیرعەونە ئایائەوان ناترسن (بێ فەرمانی خوا دەكەن)، موسا وتی ئەی پەروەردگارم! بە ڕاستی من دەترسم بڕوام پێ نەكەن وە دڵم تەنگ ببێت وە دەترسم بە چاكی قسەم بۆ نەكرێ و زمانم بەر نەبێت، كەواتە خوایە جوبرەئیل بنێرە بۆ لای هاروون و بیكە بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات، وە گەلی فیرعەون تۆڵەی تاوانێكیان لەسەرمە بۆیە دەترسم كە بمكوژن. ئەمانە چەند كۆسپ و تەگەرەیەك بوون لە ڕێی موسادا دەپاڕایەوە لە خوا لای ببات لە ڕێیداو بۆی ئاسان بكات. وەك خوای گەورە لە سورەتی (طه) فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴾[1]، ﴿ وَلَهُمۡ عَلَيَّ ذَنۢبٌ فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴾ موسا وتی: دەترسم بمكوژن چونكە من قیبتیەكم (القبطي) لەوان كوشتووە، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە میسر ڕای كردو دەرچوو، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿ قَالَ كَلَّاۖ فَٱذۡهَبَا بِـَٔايَٰتِنَآۖ إِنَّا مَعَكُم مُّسۡتَمِعُونَ ﴾ خوای

[1] طه (٢٥-٣٦).

گەورە فەرمووی بە موسا: نەخێر، لە هیچ شتێك لەوانە مەترسە کەواتە هەردووکتان بە موعجیزەکانمانەوە بڕۆن ئێمە لەگەڵتان ئەبیستین، وەك فەرموویەتی: ﴿فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾،[1] واتە: ئەوسا بە هۆی ئایەتەکانی ئێمەوە دەستیان بە ئێوە ناگات تەنها ئێوە (موساو هارون) وە هەر کەس شوێنتان دەکەوێ سەرکەوتوودەبێت. ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا إِنَّا مَعَكُم مُّسْتَمِعُونَ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ﴾،[2] واتە: من لەگەڵتانم دەتانپارێزمو ئەبیستم و چاوم لێتانەو پشتگیریتان لێ دەکەمو سەرتان دەخەم، ﴿فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، واتە: دەسا هەردووکتان بڕۆنە لای فیرعەونو هەردووکتان بڵێن بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانین. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ﴾،[3] واتە: هەریەکێ لە ئێمە ڕاسپێراوی پەروەردگاری تۆین، ﴿أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ موسا وتی: نەوەی ئیسرائیل ئازاد بکەو دەست بەسەریان مەکە، ئەوەندە جەربەزەیان مەدەو مەیان چەوسێنەوە، چونکە ئەوانە لە بەندە خاوەنباوەڕو پاکەکانی خودان کە تۆ سزای توندیان دەدەیو سوکایەتیان پێ دەکەی، کاتێك کە موسا ئەم قسانەی کرد، فیرعەون ئەم قسانەی موسای زۆر بە لاوە گران بوو، سەیرێکی موسای کردو بە چاوێکی بێ ڕێزەوە گوتی: ﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا﴾ واتە: ئایا تۆ ئەو کەسە نیت کە بەخێومان کردی لە ماڵی خۆمانداو لەسەر جێی خۆمانو بە خۆراکی خۆمان گەورەمان کردیو لەو ماوەیەدا ئەو هەموو چاکەمان لەگەڵ کردی، ﴿وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ﴾ واتە: وە تۆ چەندساڵێك لە تەمەنت لەناو ئێمەدا نەمایتەوە. پاش ئەم هەموو پیاوەتیە، پاداشتی چاکەکانمان بەم شێوەیە دەدەیتەوە ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ﴾ واتە: وە ئەو کردەوە خراپەشت کرد کە کردت، کە پیاوێکیشت لێ کوشتین، چاکەکانی ئێمەت هیچ لەبەر چاو نیەو حاشای لێ دەکەی، بۆیە وتی: ﴿وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ واتە: تۆ لەو کەسانەی کە سوپاس گوزار نین –سپڵەن– ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو عبدالرحمن ی کوڕی

---

[1] القصص (٣٥).

[2] طه (٤٦).

[3] طه (٤٧).

زەیدی کوڕی ئەسلەمە و ئیبنو جورەیریش هەر وای گوتووە.[1] ﴿قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا﴾ واتە: وتی: ئەو وەختە من ئەوەم کرد ﴿وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ واتە: گومڕا بووم هێشا نیگام بۆ نەهاتبوو، خوای گەورە ڕێزی لێ گرتم پەیامی خۆی پێدام‌و کردوومی بە پێغەمبەر ﴿فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِى رَبِّى حُكْمًا وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، واتە: ئینجا ڕام کردو هەڵهاتم لە ئێوە کاتێك ترسام لێتان ئەوسا پەروەردگارم حیکمەتی (پێغەمبەرایەتی) پێ بەخشیم منی خستە ڕیزی پێغەمبەرانەوە. واتە: یانی ئەو ژیانەم ڕۆیشت‌و ژیانێکی ترم دەست پێکردووە، خوای گەورە منی ڕاسپاردووە بۆ لای تۆ، ئەگەر فەرمانی خودا بەجێ بێنی ڕزگارت بووە، خۆ ئەگەر لە فەرمانی دەرچی لەناو دەچی، پاشان موسا فەرمووی: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَىَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ واتە: لە باتی ئەو چاکەی کە تۆ لەگەڵ من کردووتە‌و منت بەخێو کردووە، ئەو هەموو خراپەیە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل دەیکەی‌و کردوتن بە ڕەنجبەری خۆت هەرچی کاری گران هەیە بە ئەوانی دەکەی، واتە ئەوەی تۆ کردووتە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل لە چاو ئەو چاکەی لەگەڵ منت کردووە، هەر باس ناکرێت‌و چاکە‌و پیاوەتی نیە.

﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾﴾

خوای گەورە باسی بێدینی فیرعەون‌و یاخیبوون‌و لە ئەندازە دەرچوون‌و حاشاکردنی دەکات لە بوونی خودا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: فیرعەون وتی: پەروەردگاری جیهانیان کێیە؟ چونکە ئەو دەیگوت بە گەلەکەی وەك خوا دەفەرمووێت: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى﴾[2]، واتە: وا نازانم جگە لە من خودایەکتان هەبێت، ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ﴾[3] واتە: گەلەکەی خەڵەتاندو سەری لێشێواندن ئەوانیش شوێنی کەوتن‌و بڕوایان بە وەدیهێنەری جیهان نەبوو حاشایان لێ دەکردو وایان دەزانی غەیری فیرعەون هیچ پەروەردگارێکی تریان نییە، کاتێك کە موسا فەرمووی بە فیرعەون: من ڕاسپێراوم لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە، فیرعەون وتی: ئەو کەسە کێیە کە تۆ بە پەروەردگاری جیهانی دەزانی جگە لە من؟ زانایانی پێشینە‌و

[1] الطبري (١٩/٣٤٠).
[2] القصص (٣٨).
[3] زخرف (٥٤).

پاشینەش (السلف والخلف) هەر وایان مانا کردووە، بەڵکو سودی دەڵێ: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ﴾[1]، واتە: وتی: پەروەردگاری ئێوە کێیە؟، موسا وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو کەسەیە کە هەرچی وەدی هێناوە پێویستی خۆی بە تەواوی پێداوە، ئەو کەسانەی خۆیان بە ئەهلی مەنتیق دەزانن‌و کەسانی تریش، وا دەزانن ئەم پرسیارە باسی ماهیەتی خوا دەکات. ئەوان لەوەدا هەڵەن نەیانپێکاوە، چونکە فیرعەون هەر دانی بە بوونی خودادا نەناوە هەتا باسی چۆنیەتی ئەو خودایە بپرسێت، بەڵکو هەر حاشای لە بوونی خودا کردووە وەك دەردەکەوێت‌و دیارە، هەرچەندە زۆر نیشانەو بەڵگەی بۆ ڕوون کراوەتەوەو پیشانی دراوە، کاتێك فیرعەون پرسیاری لە موسا کرد کە پەروەردگاری جیهان کامەیە، موسا وتی: ﴿قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ﴾ وەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و دەمینەوئەوەش لە نێوانیان دایە، خاوەن و هەڵسوڕێنەریەتی و شەریکی نیە، هەمووی خۆی دروستی کردووە بەو هەموو ئەستێرە وەستاوو گەڕۆك و پڕشنگدارانەوە کە پڕشەیان لێوە دێت، وە ئەو جیهانەی سەر زەوی کە پڕە لە دەریاو دەشت‌و بیابان‌و کێوو گیاندارو ڕووەك‌و هەموو جۆرە میوەیەك‌و کەش‌و هەواو ئەو هەموو گازانە کە تێیدایە، هەموو بە تێکرا کڕنووشی بۆ دەبەن‌و گوێڕایەڵی فەرمانی خودان‌و بەندەی ملکەچی ئەون ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە دڵنیان. یانی ئەگەر ڕاست دەکەن‌و بڕوایەکی تەواوتان هەیە، ئا لەو کاتەدا فیرعەون سەیرێکی وەزیرو کاربەدەست‌و داروودەستەکانی کرد کە بە دەوریا بوون پێی گوتن: بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی‌و سوکایەتیکردن بە موساو بۆ بە درۆخستنەوەی ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ﴾ واتە: وتی بەوانەی دەوروبەری دابوون ئایا گوێتان لێیە؟ یانی ئاخۆ ئەم قسەی موسا دەیکات بە لاتانەوە سەیر نیە، کە دەڵێ جگە لە من ئێوە خودایەکی ترتان هەیە؟ موسا پێی وتن: ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ وەدی هێنەری ئێوەو باب‌و باپیرانیشتانە کە لە پێش زەمانی فیرعەونەوە هاتوون‌و نەماون. ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ﴾ واتە: فیرعەون گوتی بە گەلەکەی خۆی ئەو پێغەمبەرەی کە ڕەوانە کراوە بۆ لای ئێوە شێتەو عەقڵی نیەو درۆ دەکات کە ئێژێ جگە لە من پەروەردگاریەکی ترتان هەیە، موسا گوتی بەو کەسانەی کە دەوری فیرعەونیان دابوو، بە هەموو شێوەیەك هەوڵی دەداو فریوی ئەدان‌و گومانی لە دڵیاندا دروست کردبوو، ﴿قَالَ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ واتە: موسا وتی

---

[1] طه (٤٩-٥٠).

پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەو ڕۆژئاوایەو ئەوەی لە نێوانیاندایە ئەگەر ئێوە بیربکەنەوەو ژیر بن. یانی: ئەو خودایەکە خۆرهەڵاتی کردووە بە خۆرهەڵاتو ئەستێرەکانی لێوە هەڵدێتو خۆرئاوایشی کردووە بە خۆرئاوا کە ئەستێرەکانی تێدا ئاوا دەبێت، چ ئەستێرەی گەڕۆك یان وەستاو، لەگەڵ ئەو وردەکاری‌وڕێکخستنەی کە ڕایهێناوەو دیاری کردووە. ئەگەر ئەو کەسەی –واتە فیرعەون– وا دەزانێ کە پەروەردگارو خوای ئێوەیەو ڕاست دەکات، با پێچەوانەوە خۆرهەڵات بکات بە خۆرئاواو، خۆرئاوایش بکات بە خۆرهەڵات، وەك خوای خاوەن دەسەڵات لە بارەی ئەو کەسەی کە مشتومڕی لەگەڵ ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) کردووە فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ﴾[1]، واتە: ئایا ئاوڕێك نادەیتەوە بە لای ئەو (نەمرود)ەی کە دەمەقاڵێی کرد لەگەڵ ئیبراهیم (پێغەمبەردا (علیه السلام)) دەربەق بە پەروەردگاری لەبەر ئەوەی خوا پادشایی دابویە کاتێ کە ئیبراهیم (لە وەڵامی نەمروددا) وتی: پەروەردگاری من ئەو زاتەیە ژیان دەداو ژیان دەستێنێ (نەمرود) وتی: منیش ژیان دەدەمو ژیان دەستێنم (دوو زیندان کراوی هێنا یەکێکیانی ئازاد کردو ئەویانی کوشت) ئیبراهیم وتی: بێگومان خوا خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵ دێنێ دە (ئەگەر دەتوانیت) تۆ لە ڕۆژئاواوە هەڵی بێنە ئەنجا دەمکوت بوو ئەو بێبڕوایە. بۆیە کاتێك کە فیرعەون تێکشکاو سەرنەکەوتو هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نەما، پەنای بردە بەر دەسەڵاتو هێزو توانای خۆی، وای دەزانی بەکارهێنانی هێز بەسوودترو چاکترین ڕێگایە بۆ ئەوەی موسا ناچار بکات واز بێنێ.

﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَـٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأْتِ بِهِۦٓ
إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾
قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ ﴿٣٥﴾
قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ ﴿٣٧﴾﴾

کاتێك موسا بەڵگەی تەواوی هێنایەوە بۆ فیرعەون بۆی ڕوون کردەوە کە ئەو خودا نیە، خوای گەورە خاوەنی توانایەکی بێ هاوتایە، فیرعەون دەستی دایە بەکارهێنانی هێز بۆ ئەوەی موسا ناچار بکات چۆك دابداتو واز بێنێت، چونکە هاتە سەر ئەو بڕوایە جگە لە زۆر هیچ شتێکی تر سوودی نیە

[1] البقرة (٢٥٨).

لەگەڵ موسادا، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَـٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ﴾ واتە: ئەگەر غەیری من خودایەکی تر بپەرستن لە بەندیخانەت توند دەکەم، بۆیە موسا گوتی: ﴿قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكَ بِشَىْءٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ئەگەر بەڵگەیەکی تەواوو ئاشکرام بۆ هێنای هەر وازم لێ ناهێنیو بەندم دەکەی، ﴿فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: کاتێك کە موسا گۆچانەکەی فڕێ دا بوو بە ئەژدیهایەك هەر بە ئاشکرا هەموو کەسێك دەیبینیو زۆر ترسناك بوو دەمێکی پانو چوارپەلێکی گەورەو هەیکەلێکی زلی هەبوو، ﴿وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ﴾ واتە: دەستی لە باخەڵەکانی دەرهێنا بۆ ئەوانەی سەیریان دەکرد، دەستی وەك مانگ تریفەی دەهاتو دەدرەوشایەوە، فیرعەون گورجو بە پەلە دەستی دایە قسەی خراپو لاساریو بە درۆی دەخستەوەو وتی: بە دارودەستەکەی خۆی -کە دەوریان دابوو-: ﴿قَالَ لِلْمَلَإِ حَوْلَهُۥٓ إِنَّ هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ﴾ واتە: فیرعەون وتی: بەو خەڵکەی لەو ناوەدا کۆبووبوونەوە بە ڕاستی ئەم موسایە جادوگەرێکی زۆر لێزانو بە توانایە، فیرعەون هەوڵی دەدا ئەو خەڵکە قەناعەت پێ بکات کە موسا جادوگەرە، ئەوەی دەیکاتو چاویان پێی دەکەوێت موعجیزە نیە، هەڵی دەنان کە دژایەتی بکەنو بڕوای پێ نەکەنو دەیگوت وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِۦ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ﴾ فیرعەون تی: ئەوسا بزانن موسا دەیەوێ دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ بە هۆی ئەو جادوگەرەیەوە، هەتا دۆستو لایەنگرو پشتیوان بۆ خۆی زیاد بکاتو دەوڵەتی ئێوە لەناوبەرێتو داگیری بکات. سا بزانم ئێوە چی دەڵێنو چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەم؟ ﴿قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ وَٱبْعَثْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴿٣٦﴾ يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ﴾ واتە: موساو براکەی لێوە ڕاگرە هەتا گشت جادوگەری وڵاتەکەت بۆ کۆ دەکەنەوەو دەیهێننە لات، لەو جادوگەرانەی کە زۆر شارەزاو بە توانان، وەك چۆن موسا جادووی کرد ئەوانیش بیکەن، ئەو کاتە تۆ زاڵ دەبیو سەرکەوتن هەر بۆ تۆ دەبێت خەڵکیش پشتیوانی لە تۆ دەکەن، فیرعەون داواکەی قەبوڵ کردنو ئەم شتەش لە خواوە بوو کە ئەو داوایەیان لە فیرعەون کردو فیرعەونیش قبووڵی کرد، بۆ ئەوەی خەڵکێکی زۆر لە شوێنێکدا کۆ بکرێتەوە، هەتا گەورەییو تواناو دەسەڵاتی خودا بە ئاشکرا دەرکەوێت بۆیان لە ڕۆژێکی وادا.

﴿فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَـٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾ لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُوا۟ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا۟ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ

ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾﴾

**لەنێوان موساو (سەلامی خوای لیٚ بێت) جادووگەرەکاندا**

خوای گەورە دەفەرموویٚت: ﴿فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ لِمِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنتُم مُّجْتَمِعُونَ﴾، واتە: ئینجا ئەو جادوگەرانە کۆکرانەوە لە کاتو ڕۆژی دیاری کراودا، وە بە خەڵکیش وترا ئێوەش کۆدەبنەوە؟ خوای گەورە باسی ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیەی موساو قیبتیەکان دەکات کاتێك کە کۆبوونەوە لە ڕۆژێکدا بۆ ئەوەی بە چاوی خۆیان موسا ببینن کە تێکدەشکێتو جادووگەرەکانی فیرعەون سەردەکەون وەك خوای گەورە لە سورەتی ئەعرافو تاها و ئەم سورەتەدا باسی کردووە، چونکە فیرعەونو قیبتیەکان دەیانویست ڕووناکی خودا بە دەم بکوژێننەوەو خوایش ناهێڵێت نووری خۆی بکوژێتەوەو ئەو نوورو پەیامەی خۆی دەگەیەنێتو تەواوی دەکات با خوانەناسانیش زۆر پێیان ناخۆش بێتو لە خەمو خەفەتیشدا بمرن، ئەمەیش سونەتو باوی خودایە هەر کاتێك کوفرو ئیمان ڕووبەڕووی یەکتری وەستابن، باوەڕ سەرکەوتووە بەسەر کوفرو بێباوەڕیدا، ﴿بَلْ نَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَى ٱلْبَٰطِلِ فَيَدْمَغُهُۥ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ وَلَكُمُ ٱلْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ﴾[1]، واتە: (واز لەوە بێنە) بەڵکو حەق دەکێشین بەسەر بەتاڵو ناحەقدا بەوهۆیەوە (بەتاڵ) مێشکی دەپرژێو تێکدەشکیٚ ئینجا دەست بەجیٚ بەتاڵ دەفەوتیٚو لەناو دەچێت، هاوار (سزای بەتین) بۆ ئێوە لەبەر ئەوەی دەیڵێنو ڕەوای دەدەن بۆ خوا (لە هاوسەرو منداڵ). ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾[2]، واتە: وە بڵیٚ ئایینی ڕاست هات وە ئایینی ناهەقو بەتاڵ نەماو ڕۆیشت بە ڕاستی بەتاڵ هەمیشە لەناوچووە. بۆیە کاتێك کە جادوگەرەکان هاتن، کە لە هەموو ناوچەکانی وڵاتەوە هێنرابوونو کۆکرابوونەوە، لەو زەمانەدا جادوگەری زۆر باو بوو جادوگەریی لێزانو زۆر بە توانا هەبوو کە لە ژمارە نەدەهاتن، هەر خوا دەزانیٚ بە ژمارەیان، خەڵکێکی زۆر هاتنو لەو ڕۆژەدا کۆبوونەوە، دەیانگوت ئەگەر ئەو جادوگەرانە سەرکەوتن ئێمەش شوێن ئەو جادوگەرانە دەکەوین وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾، ئەیان وت شوێنی هەق دەکەوین ئیتر کەیفی خۆیەتی جادوگەرەکان لەسەر هەقن یان موسا، سروشتی ژێردەستە هەر وایە زۆربەیان لەسەر ئایینی کاربەدەستن، ﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ واتە:

---

[1] الانبياء (١٨).

[2] الاسراء (٨١).

کاتێك کە جادوگەرەکان هاتن بۆ مەجلیسی فیرعەون، کە شوێنێکی چاکیان بۆ ڕازاندبووەوە هەرچی داروودەستەو خزمەتکارو کاربەدەستو وەزیر هەبوو لە دەوروبەری کۆبوونەوە، لەشکرێکی زۆری وڵاتەکەیشی لێ بوو، جادوگەرەکان هەستانو لەبەردەم فیرعەوندا داوای پاداشتو نزیك بوونەوەی خۆیان کرد لە فیرعەون ئەگەر سەرکەوتنو بردیانەوە لە موسا ﴿قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ﴾ واتە: وتیان بە فیرعەون: ئایا بە ڕاستی پاداشتمان هەیە ئەگەر ئێمە زاڵو سەرکەوتوو بین. ﴿قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾ فیرعەون وتی: بەڵێ پاداشتی چاکترتان دەدەمەوەو دەتانکەمە نزیکترین کەسو لە لای خۆم دەمێننەوەو لەگەڵ خۆم دادەنیشن، ئەوسا گەڕانەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)، وە لە ئایەتی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالُوا يَا مُوسَىٰ إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلْ أَلْقُوا﴾[1] واتە: (ساحیرەکان) وتیان: ئەی موسا یا تۆ (جادووەکەت) فڕێدە یان ئێمە لەسەرەتاوە فڕێی دەدەین، (موسا) فەرمووی: نەخێر ئێوە (لە پێشەوە) فڕێی بدەن. لێرەدا بە کورتی هێناویەتی ﴿أَلْقُوا مَا أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْا حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾، واتە: بیهاوێژن ئەوەی ئێوە هاوێژەریانن، ئەوانیش گوریسو حەبلو داردەستەکانیان فڕێداو وتیان: سوێند بەگەورەیی فیرعەون بە ڕاستی هەر ئێمە زاڵو سەرکەوتووین. ئەمە وەك ئەوە وایە کە هەرزەو نەزان کە خەڵکی بێناوەز کاتێ شتێك دەکەن ئەڵێن: ئەم کارە دەکەین لە باتی فلانە شت کە پێمان بدرێت، خوای گەورە لە سورەتی (الاعراف)دا باسی دەکات کە ئەو جادوگەرانە لەبەر چاوی ئەو خەڵکە هەندێ جادوویان کرد ترسیان وەبەرهێنان، وەك فەرموویەتی: ﴿سَحَرُوا أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ﴾[2] واتە: چاوبەستیان لە خەڵك کردو ترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوە وە جادوویەکی گەورەیان نواند. وە لە سورەتی (طه)یشدا فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾[3]، واتە: (ئەوانیش فڕێیاندا) جا لە ناکاودا گوریسو داردەستەکانیان وا هاتە پێش چاوی (موسا) بەهۆی جادووەکەیانەوە کە بە ڕاستی دەجوڵێنو دەڕۆن جا موسا لە دڵی خۆیدا کەمێ

[1] طه (٦٥).

[2] الاعراف (١١٦).

[3] طه (٦٦-٦٩).

ترسا، وتمان پێی: مەترسەو بێباك بە، بێگومان هەر تۆ سەرکەوتوو دەبی، ئەوەی لە دەستی ڕاستتدایە (کە گۆچانەکەتە) فڕێی بدە هەرچی (جادوویەك) ئەوان کردوویانە قوتی دەدات و هەڵی دەلوشێ بێگومان ئەوەی ئەوانە کردوویانە تەنها فڕوفێڵی جادو بازانە و جادووبازیش سەرکەوتوو نابێ لە هەر کوێوە هاتبێت (هەرچی بکات). وە لێرەیشدا فەرموویەتی: ﴿ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ﴾ واتە: موسا (سەلامی خوای لێ بێت) گۆچانەکەی خۆی فڕێ داو بە زوویی‌و لە پڕ هەموو جادووی جادوگەرانی هەڵوشی‌و هیچی نەهێشتنەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُوا هُنَالِكَ وَانقَلَبُوا صَاغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾[1]، واتە: ئیتر ڕاستی دەرکەوت‌و ڕوون بوویەوە ئەوانیش هەرچی (سیحر)یان کردبوو پوچەڵ بوویەوە هەر لەوێدا (فیرعەون‌و شوێنکەوتووانی) ژێرخران‌و دۆڕان‌و بە ڕیسوایی گەڕانەوە، وە جادوگەران هەموویان سوژدەیان برد (بۆ پەروەردگاریان)، (ساحیرەکان) وتیان: ئێمە بڕوامان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان، کە پەروەردگاری موساو هاروونە. ئەم کارەساتە ڕووداوێکی زۆر گرنگ‌و گەورە بوو، بەڵگەیەکی ئەوەندە گەورەو بەهێز بوو هیچ بڕوبیانوویەکی نەهێشتەوە نە بۆ فیرعەون‌و دارودەستەکەی‌و، نە بۆ جادوگەرەکان. چونکە ئەو جادوگەرانەی کە فیرعەون داوای یارمەتی‌و سەرکەوتنی لێدەکردن بۆ زاڵ بوون بەسەر موسادا دۆڕاندیان، بەڵێ دۆڕاندیان‌و ملیان کەچکرد و بڕوایان هێنا بە موساو لەو کاتە چارەنووس سازەدا سوژدەیان برد بۆ پەروەردگاری جیهان، وەك خودای مەزن لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾ واتە: جادووکەرەکان هەموویان سوژدەیان برد بۆ خوا و وتیان: ئەوا باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری جیهانیان، ئەو خودایەی کە موساو هارونی ڕەوانە کرد بەو ڕاستیەو موعجیزەی خۆی پێدان، بەڵێ فیرعەون شکستی هێنا، شکستێکی وا کە لە جیهاندا هیچ کەس چاوی پێی نەکەوتبێت، ئەم فیرعەونە پیاوێکی زۆر پیس‌و خراپ بوو لەعنەتی خواو فریشتەکان‌و هەموو خەڵکی لێ بێت، وازی نەدەهێنا دایە ملهوڕی‌و لاساری‌و قسەی پڕوپوچ‌و هەڕەشەکردن‌و تۆڵەکردنەوە لەو جادوگەرانە کە بڕوایان هێنا بە خوا دەیگوت: ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾[2]، واتە: بێگومان موسا گەورەتانە کە فێری جادووی کردوون. واتە: هەر موسا گەورەتانەو ئەو فێری

---

[1] الاعراف (١١٨-١٢٢).

[2] طه (٧١).

جادوی کردوون. وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا مِنْهَا أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾.[1] واتە: بە ڕاستی ئەمە فێڵ‌و پیلانێکە (ئێوەو موسا) نەخشەتان بۆ کێشاوە لەم شارەدا تا دانیشتوانەکەی لێ دەربکەن جا لە دواییدا دەزانن (چیتان لێ دەکەم).

﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَافٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ (٤٩) قَالُوا لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ (٥٠) إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَا أَن كُنَّا أَوَّلَ الْمُؤْمِنِينَ (٥١)﴾

**لە نێوان فیرعەون‌و جادوگەرەکاندا**

فیرعەون هەڕەشەی لە جادوگەرەکان دەکرد بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، دەیگوت دەتانکوژم‌و دەست‌و قاچتان دەبڕم‌و هەڵتان دەواسم، ئەوان هەر گوێشیان بۆ نەگرت‌و باوەڕیان زیاتر پتەو دەبوو بە خوای گەورە، چونکە ئەوان چاك دەیانزانی لە خوانەناسی ڕزگاریان بووە، هەقیان بە تەواوی بۆ دەرکەوتووە بە هۆی ئەو شارەزاییەوە کە بوویان‌و گەلەگەیان لێی بێئاگا بوون، ئەیانزانی ئەوەی کە موسا هێناویەتی لە لایەن خوداوە لە توانای مرۆڤدا نیە، بەڵکو بە یارمەتی‌و پشتگیری خودای گەورە، بەو کارە هەڵدەستێ، خوای گەورە کردوویەتی بە بەڵگەو نیشانە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆی هاتووە لە لایەن پەروەردگاریەوە. بۆیە کاتێ فیرعەون پێی گوتن: ﴿قَالَ آمَنتُمْ لَهُ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ﴾ واتە: پێش ئەوەی من ڕێگاتان بدەم، ئێوە بڕواتان بە موسا هێنا؟! دەبوو لە پێشدا بڕیارو فەرمانتان لە من وەربگرتایە، گەر ئیزنم بدانایە بتانکردایەو ئیزنیشم نەدانایە نەتان کردایە، چونکە من خاوەنی دەسەلات‌و بڕیارم نەك ئێوە! ﴿إِنَّهُ لَكَبِيرُكُمُ الَّذِي عَلَّمَكُمُ السِّحْرَ﴾ واتە: فیرعەون وتی: ڕوون‌و ئاشکرایە کە موسا گەورەتانەو ئەو فێری ئەو جادووەی کردوون، ئەمە قسەیەکی پڕوپوچ بوو بۆ فیرعەون هەموو کەسێك لەوانە دەیزانی کە درۆ دەکات‌و خۆی هەڵدەنێ، چونکە ئەو جادوگەرانە هەرگیز لەگەڵ موسادا یەکیان چاوپێ نەکەوتبوو ڕۆژێ بەر لەوە، کەواتە چۆن موسا گەورەکەیانەو فێری جادووی کردوون؟ هیچ پیاوێکی ژیرقسەی وا ناکات، پاشان فیرعەون هیچی بۆ نەمایەوە دەستی دایە هەڕەشەو گوڕەشە گوتی: ﴿فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: جا بێگومان لەمەودوا دەزانن چیتان لێ دەکەم. دەست‌و قاچتان بە ڕاست‌و چەپ دەبڕم‌و بە دارا هەڵتان دەبەسم، ئەوانیش گوتیان: ﴿قَالُوا لَا ضَيْرَ﴾ واتە: هەرچی دەکەیت بیکە ئێمە هیچ گوێمان لێی نیە ﴿إِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ﴾ واتە: ئێمە هەرچیمان لێ

[1] الاعراف (١٢٣).

بەسەر بێت خودا ئاگای لێمانە بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوەو چاکەی چاکەکاران بە فیڕۆ نادات و بەو زووانە پاداشتی تەواومان دەداتەوە لەسەر ئەو خراپەیەی تۆ دەیکەی بەرانبەرمان. بۆیە گوتویانە: ﴿إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَايَانَآ﴾ واتە: ئێمە بە تەماین و ئومێد دەکەین خودا لەو تاوانانەمان دەبورێت کە کردوومانە و لەو جادووەش کە تۆ بە زۆر پێت کردین ﴿أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئێمە لەپێش گەلەکەمان کە قیبتیەکانن هەوڵمان داو بڕوامان هێنا بە خودای مەزن، پاشان فیرعەون هەر هەموویانی کوشت.

﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾﴾

## دەرچوونی ڕۆڵەکانی ئیسرائیل - بەنی ئیسرائیل - لە میسر

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾، واتە: وەحیمان نارد بۆ موسا کە بە شەو بەندە باوەڕدارەکانم ببەو میسر بەجێ بێڵن، بێگومان فیرعەون و کۆمەڵەکەی دواتان دەکەون. ماوەیەکی زۆر موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە وڵاتی میصردا مایەوە، زۆر بەڵگەو نیشانەی پیشانی فیرعەون و داروودەستەکەی دا، کەچی ئەوان زیاتر ملهوڕیان دەنواندو دژایەتی مووسایان دەکرد، غەیری جەربەزەو لەناوبردن هیچ شتێکی تر شایەنیان نەبوو، بۆیە خوای گەورە فەرمانی دا بە موسا کە بە شەو بەنی ئیسرائیلیەکان لە میسر وەدەرخاو ڕووەو ئەو شوێنە وەڕێکەون کە فەرمانیان پێکراوە، موسایش (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمانی خودای بەجێهێناو دوای ئەوەی کە زێڕو زیوێکی زۆریان لە هۆزی فیرعەون خواست. وەك هەندێ لە زانایانی تەفسیر باسیان لێوە کردووە لە وەختێکدا کە مانگ هەڵهات لە شەودا وەڕێ کەوتن، موجاهید دەڵێ: لەو شەوەدا مانگ گیرا.[1] والله أعلم. لەو کاتەدا موسا هەواڵی گۆڕی یوسفی پرسی، پیرەژنێکی بەنی ئیسرائیلی شوێنەکەی پیشانی موسا داو تابلۆکەیشی لەگەڵ هەڵگرتن، گوتراویشە: موسا خۆی تابلۆکەی هەڵگرتووە (سەلامی خوای لێ بێت) یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) وەسیەتی کردبوو کاتێك کە بەنی ئیسرائیلی یەکان لە میصر دەرچوون لەگەڵ خۆیان هەڵی بگرن و بیبەن،[2] کاتێك فیرعەون و شوێنکەوتووانی بەیانی هەڵسان هیچ کەسێك لە یانەکەیاندا نەمابوو دەنگی لێوە بێت، فیرعەون زۆر تووڕە بوو، ئەوەندە تووڕە بوو لە بەنی

---

[1] الطبري (١٩/٣٥٤).

[2] الطبري (١٩/٣٥٤).

ئیسرائیلیەکان ئۆقرەی نەدەگرت، چونکە خوای گەورە بڕیاری دابوو کە لەناوی ببات، ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ ﴾ واتە: فیرعەون پیاوەکانی خۆی نارد، واتە: پیاوکوژو قەمچی وەشێنەکانی خۆی نارد بە شارەکاندا جاڕیان دا گوتیان: بەنی ئیسرائیلیەکان ژمارەیەکی کەمن ﴿ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴾ هەموو کاتێك کە هەواڵی خراپی ئەوانمان پێ دەگات و تووڕەمان دەکەن، بەڵام ئێمە هەمیشە وریاین و ئاگامان لە خۆمانە و مۆڵەتیان نادەین و هەموویان دەکوژین و هەموو ماڵ و سامانیان بە تالانی دەبەین بۆ خۆمان ﴿ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَـٰذِرُونَ ﴾، واتە: وە بە ڕاستی ئەوانە ڕقی ئێمە هەڵ دەسێنن، بێگومان ئێمە کۆمەڵێکین بێدارین و ئاگادرین بە پیلانەکانیان. فیرعەون خۆی و لەشرەکەیشی پاداشتی خۆیان وەرگرت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَأَخْرَجْنَـٰهُم مِّن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾ واتە: لەو هەموو خۆشیەی کە تێیدا بوون: لە باغ و باغات و کانیاوی سازگارو گەنجینەی زۆرو شوێنی خۆش، دەرمان کردن و بەرەو جەهەنەم بەڕێ کەوتن، هەموو ئەو شتانەیان بەجێ هێشت لە دنیادا، ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَـٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتە: ئا بەو جۆرە نەوەکانی یەعقوبمان لە جێگایان دانا. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَـٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَـٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا ﴾،[1] واتە: ئیتر (لە جێگای گەلی فیرعەون) ئەو گەلەمان نیشتەجێ کرد کە هەمیشە دەچەوسێنرانەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەو وڵاتەدا کە پیت و بەرەکەتمان تێخستبوو. وە فەرموویەتی: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾.[2] واتە: وە ئێمە دەمانەوێ (بە چاکەی خۆمان) منەت بکەین بەسەر ئەوانەی کە لاوازو ژێردەست کرابوون لە وڵاتی (میصر)دا وە بیان کەینە پێشەواو بیان کەینە میرات بەر (ی کەلەپوری فیرعەون و شوێنکەوتووانی).

﴿ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَـٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ ﴾

---

[1] الاعراف (١٣٧).

[2] القصص (٥).

## ڕاونانی نەوەی ئیسرائیل و خنکانی فیرعەون و هۆزەکەی

هەندێ لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە فیرعەون بە کۆمەڵێکی زۆر لە دارودەستەکەی کە بریتی بوون لە هەموو کاربەدەستانی ئەو کاتەی وڵاتی میصر کە ڕاوێژکاری فیرعەون بوون لە کاروباری وڵاتدا. لە سەرکردەو وەزیرو پیاوماقوڵانو لەشکرو سەر لەشکرەکانی ﴿فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ﴾ واتە: شوێنیان کەوتن لە بەرەبەیاندا کاتێك خۆر گزنگ ئەداو لە کەل دێتە دەر، ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ﴾ واتە: کاتێك کە هەردوو کۆمەڵەکە یەکتریان چاوپێکەوت، ئالەوکاتەدا هاوەڵەکانی موسا وتیان: ﴿قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ توش بووینو لە دەستیان دەرناچین، چونکە موساو نەوەی ئیسرائیل چوبوونە کەناری دەریاکە کە دەریای قولزوم (بحر القلزم)بوو، بەردەمیان دەریاکە بوو، فیرعەونو لەشکرەکەیشی بە دوایانەوە بوون پێیان گەیشتن بۆیە گوتیان: ﴿إِنَّا لَمُدْرَكُونَ﴾ واتە: ڕزگار بوونمان زۆر ئەستەمە، موساش وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ﴾ واتە: فەرمووی: شتی وانییە ئەوەی ئێوە لێی دەترسن تووشتان نایە، بەڕاستی خودای مەزن فەرمانی بە من داوە کە ئێوە بەرەو ئێرە بێنم، خودایش بەڵێنی خۆی دەباتە سەرو لێی پاشگەز نابێتەوە. هارون لەپێش خەڵکەکەوە بوو یوشەعی کوڕی نونیشی لەگەڵ بوو کە یەکێك بوو لە خاوەن باوەڕەکانی ئالی فیرعەون، موسایش (سەلامی خوای لێ بێت) لە دوای خەڵکەکەوە بوو، هەندێ لە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە کە هەموو ئەو خەڵکە وەستانو نەیاندەزانی چی بکەن، یوشەعی کوڕی نون وتی: بە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەی پێغەمبەری خوا پەروەردگارت فەرمانی پێ کردووی کە بەرەو ئێرە بێیت؟ گوتی: بەڵێ، فیرعەونو لەشکرەکەی هەر نزیك دەبوونەوە زۆر کەمیان مابوو پێیان بگەن، ﴿فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ﴾ واتە: نیگامانکرد بۆ موسا: کەبە دارەکەت بکێشە بەئەو دەریایەدا، ئا لەو کاتەدا خوای گەورە فەرمانی دا بە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) داردەستەکەی بکشێنێ بە دەریاکەدا، موساش عەساکەی کێشا بە دەریاکەدا، فەرمووی: بە ئیزنی خودا لەت ببە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە: دەریاکە قلیشاو هەر لایەکی وەك کێوێکی گەورە بەرز بووەوە، ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباسو موحەمەدی کوڕی کەعبو زەححاكو قەتادەو کەسانی تریش گوتویانە: ﴿كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە: چیای گەورە.[1] عەتای خۆراسانی دەڵێ: ﴿كَٱلطَّوْدِ

---

[1] الطبري (١٩/٣٥٨).

ﭐلْعَظِيمِ ﴾ واتە: وەك ڕێگایەك لە نێوان دوو چیادا، ئیبنو عەباس دەڵێ: دەریاکە دوانزە ڕێگای لێ پەیدا بوو هەر هۆزێك ڕێگایەکی خۆی هەبوو،[1] سودی ئەمەیشی بۆ زیاد کردوو دەڵێ: ڕێگاکان دەلاقەیان تێدابوو لەو دەلاقانەوە سەیری یەکتریان دەکرد، ئاوەکە وەك دیوار بە دەوریاندا وەستابوو.[2] خوای گەورە بایەکی هەڵکرد دای بەناو بنی دەریاکەداو وشکی کردەوە وەك سەر زەمین! خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ﴾،[3] واتە: ڕێیەکی وشکیان بۆ بگرە بەرو هیچ نیگەرانیو ترسێکت نەبێت، خوای گەورە لێرەدا لەم بەسەرهاتەدا فەرموویەتی: ﴿وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْآخَرِينَ﴾ واتە: ئا لێرەدا ئیبنو عەباسو عەتای خۆراسانیو قەتادەو سودی دەڵێن: واتە: فیرعەونو لەشکرەکەیمان هێنایە پاڵ دەریاکەو لێکمان نزیك کردنەوە.[4] ﴿وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْآخَرِينَ﴾ واتە: موساو ئەوەی ئیسرائیلمان ڕزگار کرد، ئەوانەی شوێنی ئایینی موسا کەوتبوون، هیچ کەسێك لەوانە نەخنکا، فیرعەونو لەشکرەکەی هەموو خنکان تەنها یەك کەسیان لێ دەرنەچوو. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە: لەو ڕووداوەدا کە باسمان کرد کە پڕ بوو لە شتی گرنگو سەرسوڕهێنەرو یارمەتیو پشتیوانی خاوەن باوەڕان، هەمووی نیشانەو بەڵگەی بەهێزن لە کارزانیو تواناو دەسەڵاتو دلۆڤانی خودای مەزن بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەهێنا.

﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّيٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾﴾

## ئامۆژگاری ئیبراهیم خەلیلی خودا بۆ هۆزەکەی، کە واز لە بتپەرستی بێنن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَٰهِيمَ﴾ ئەمە باسی بەندەو خەلیلو پێغەمبەری خودا ئیبراهیمە پێشەوای یەکتاپەرستان (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی موحەمەد (ﷺ) کە بەسەرهاتی ئیبراهیم بگێڕێتەوە بۆ ئوممەتەکەی بۆ ئەوەی چاوی

---

[1] الدر المنثور (٦/٢٩٩).

[2] الطبري (١٩/٣٥٧).

[3] طه (٧٧).

[4] الطبري (١٩/٣٥٩).

لێ بکەن لە دڵسۆزیو پشت بە خوا بەستندا و هەر بەندایەتی ئەو بکەنو شەریکی بۆ دانەنێنو دوور بنو نزیکی بتو بتپەرستان نەبنەوە، خوای گەورە هەر لە پێشەوە ئیبراهیمی شارەزا کردبوو، واتە: هەر لە منداڵیەوە وەك لاوێك کە خۆی ناسیووە بەربەرەکانی هۆزەکەی کردووە لەسەر بتپەرستیو داوای لێ کردوون کە هیچ شتێك نەکەنە شەریکی خوداو نەی پەرستن لەگەڵیدا ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا تَعْبُدُونَ﴾ واتە: گوتی بە بابو کەسو کاری خۆی ئەم بتانە چیە ئێوە خەریکن دەیانپەرستنو وازیان لێ ناهێنن ﴿قَالُوا۟ نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَـٰكِفِينَ﴾ واتە: ئێمە بتانێك دەپەرستینو هاناشیان بۆ دەبەین بەردەوام هەر خەریك دەبینو هەرگیز وازیان لێ ناهێنین؟ ﴿قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾، واتە: ئیبراهیم وتی ئایا ئەوانە گوێیان لێتانە کاتێ هاوار و نزایان لێ دەکەن، ئایا ئەوان سوود یان زیانتان پێ دەگەیەنن، وتیان نەخێر بەڵکو ئێمە باوباپیرانمان دیوە ئا بەو شێوەی ئێمەیان کردووە. یانی دان دەنێن بەوەدا کە بتەکانیان هیچ شتێك لەوانە ناتوانن بکەن، بەڵکو ئەوان شوێن بابو باپیرانیان کەوتوون، ئەوانە چیان کردووە ئەمانیش هەروا دەکەن، ڕێو ڕچەی ئەوان دەگرنو لێی لانادەن، ﴿قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ﴾ واتە: وتی ئایا ئێوە دەزانن چی دەپەرستن، ئێوەو باوو باپیرە پێشوەکانتان. ئا لەو کاتەدا ئیبراهیم پێیان ئێژێ: ﴿فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: جا بەڕاستی هەموو ئەوانە دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان. یانی ئەگەر ئەم بتانە شتێکن کە کار لە کەس بکەنو تووشی زیانی بکەن، دەی با من تووشی زیانو گیروگرفت بکەن، چونکە من دوژمنی ئەو بتانەمو بە هیچیشیان نازانمو ڕێزیشیان لێ ناگرم، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿فَأَجْمِعُوٓا۟ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ﴾،[1] واتە: ئێوەش کارو بڕیاری خۆتان کۆکەنەوە لەگەڵ هاوبەشەکانتاندا. وە هود پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾،[2] واتە: جگە لە خوا جا هەمووتان پیلانم لێ بگێڕن لە پاشان مۆڵەتیشم مەدەن (و لێم مەوەستن) بە ڕاستی من پشتم بە خوا بەستووە کە پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەیشە هیچ

---

[1] یونس (٧١).

[2] هود (٥٥-٥٦).

گیانلەبەرێك نیە مەگەر خوا دەسەڵاتدارە بەسەریاندا بە ڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگەیەکی ڕاستە.

هەر بەم شێوەیەش ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) دووره پەرێزی خۆی دەربڕی و تەبەڕای کرد لەو بتانەو فەرمووی: ﴿ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ ﴾[1] واتە: وە من چۆن دەترسم لەو بتانەی کەچی ئێوە کردووتانە بە هاوبەش بۆ خوا کە ئێوە ناترسن کە بێگومان بتانێکتان کردۆتە هاوبەش بۆخوا. خوای گەورەش دەربارەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴾[2] واتە: بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوانو چاك لە ئیبراهیمو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیانپەرستن لە جیاتی خو، ئێمە باوەڕمان نیە بە (ئایینی) ئێوە، وە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتیو کینە بۆ هەمیشە پەیدا بوو تا کاتێك کە بڕوا بە خوای تەنها دەهێنن. وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾[3] واتە: وە کاتێك ئیبراهیم بە باوکیو گەلەکەی وت بێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیپەرستن، جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم چونکە هەر ئەویش ڕێنموونیم دەکات، ئەو (یەکتاپەرستیە)ی لە ناو نەوەکانیدا بەجێ هێشت تا بگەڕێنەوە (سەری). واتە: کارێکی وای کرد کە ئەم وتەی (لا اله الا الله) لە پاش خۆی بۆ نەوەکانی هەر بمێنێتەوە، بەڵکو بگەڕێنەوە.

﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾﴾

**ئیبراهیم( سەلامی خوای لێبێت ) باسی ڕێزلێنانی خودای مەزن و بەسۆزی دەکات بەرامبەرخۆی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ﴾ واتە: من کەسێك ناپەرستم کە ئەم شتانە نەتوانێ بکات ﴿ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴾ خوای گەورە ئەو وەدیهێنەرەیە کە گشت شتێکی بڕیار داوەو تەواوی کردووە، مەیلی خۆیەتی کێ شارەزا دەکاتو کێش

---

[1] الانعام (٨١).

[2] الممتحنة (٤).

[3] زخرف (٢٦-٢٨).

گومڕا دەکات، هەموو شتێك بە پێی فەرمانی ئەو دەڕوات، ﴿ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴾ وە هەر ئەویش دروستی کردووم‌و بژێوی داوم کە ئەو هەموو هۆکارو شتانەی ڕام و موسەخەر کردووە لە ئاسمان‌و زەمیندا هەوری ناردووەو بارانی باراندووەو زەمینی پێ زیندوو کردووەتەوە، لە هەموو جۆرە بەروبووم‌و میوەجاتێکی تیا ڕوواندووە بۆ ئەوەی بەندەکانی پێی بژین، وە ئاوی پاك‌و سازگارو زوڵاڵی باراندووە بۆ ئەوەی هەموو خەڵك‌و گیانەوەرەکان لێی بخۆنەوەو سودی لێ وەرگرن ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾ واتە: کاتێ نەخۆش کەوتم ئەو شیفام دەدات، نەخۆشکەوتنی ناوەتە سەر خۆی، هەرچەندە بڕیارو فەرمانی خودایەو خودا خۆی بەندەکانی نەخۆش دەخات، بەڵام ئەو شەرمی کردووە و نەخۆشیەکەی داوەتە سەرخۆی، وەك خوای گەورە فەرمانی داوە بە نوێژخوێن کاتێ کە نوێژ دەکات بێژێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾بەهرەدان‌و نیشاندانی داوەتە لای خودای گەورەو توڕەیی (الغضب) فاعیلەکەی نەهێناوە وەك ئەدەبێك‌و لاڕێی‌و گومڕابوونیشی خستۆتە سەر عەبدەکانی، وەك جنۆکە وتویانە: ﴿وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا ﴾،[1] واتە: وە بە ڕاستی نازانین ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی کە لەسەر زەوین یان پەروەردگاریان ڕێنموونی ویستووە بۆیان. هەر بەو شێوەیەش ئیبراهیم فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾ واتە: هەر کاتێ کە تووشی نەخۆشی بووم، هیچ کەسێك ناتوانێ چاکم بکاتەوە خودا نەبێت، کە مەیلی لێ بێت هۆکارێك دەنێرێت ﴿ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾ واتە: هەر ئەویش دەمرێنێ‌و زیندوویش دەکاتەوە هیچ کەسێك ناتوانێ ئەو نەبێت، دەیهێنێ‌و دەشباتەوە. ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾ واتە: هیچ کەسێك توانای لێبوردەیی تاوانی نیە غەیری ئەو نەبێت لە دنیاو قیامەتدا. کێیە لە تاوان ببورێت جگە لە خودا؟ هەرچی مەیلی لێبێت دەیکات.

﴿ رَبِّ هَبْ لِى حُكْمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ۝٨٣ وَٱجْعَل لِّى لِسَانَ صِدْقٍ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ۝٨٤ وَٱجْعَلْنِى مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨٥ وَٱغْفِرْ لِأَبِىٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ۝٨٦ وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ يُبْعَثُونَ ۝٨٧ يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ ۝٨٨ إِلَّا مَنْ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ۝٨٩﴾

[1] الجن (١٠).

## پاڕانەوەی ئیبراهیمی خەلیل بۆ خۆی و باوکی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ ئەمە داوایەکی ئیبراهیمی خەلیل بوو لە خودای مەزن کە کارزانی پێ ببەخشێت، ئیبنو عەباس گوتی: یانی: زانیاری.[1] ﴿وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ واتە: هەمیشە لەگەڵ پیاو چاکاندا بم لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا، وەك پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی گیانداندا فەرمووی: (ئەی خودایە بمگەیەنە بە ڕەفیقی ئەعلا) سێ جار ئەم وتەی فەرموو.[2] ﴿وَاجْعَل لِّي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الْآخِرِينَ﴾ واتە: وام لێ بکە لە پاش خۆم ناوم بە چاکە ببرێت و خەڵکی لە خێرو بێردا چاوم لێبکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾،[3] واتە: وە باسکردن بە چاکەی ئیبراهیممان لەناو گەلانی داهاتوودا هێشتەوە، درودو سەلام لەسەر ئیبراهیم، ئا بەو شێوە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە. ﴿وَاجْعَلْنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ﴾ واتە: بەهرەمەندم بکە بەوەی کە لە دنیادا بە چاکی ناوم ببرێت و لە ڕۆژی دوایشدا لەو کەسانە بم کە دەبنە خاوەنی بەهەشتی پڕ لە خۆشی و شادی. پاشان ئیبراهیمی خەلیل داوای لێبوردن بۆ باوکی دەکات وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاغْفِرْ لِأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ﴾ واتە: لە باوکم خۆش ببە کە ڕێگەی ون کردبوو، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ﴾،[4] واتە: ئەی پەروەردگارمان لە منو باوکمو دایکم ببوورەو خۆش ببە. ئەمە ئەو داوایە بوو کە ئیبراهیم لێی پەشیمان بووەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ اسْتِغْفَارُ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَا إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ أَنَّهُ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَأَوَّاهٌ حَلِيمٌ﴾[5]، واتە: وە داوای لێخۆشبوونی ئیبراهیم بۆ باوکی تەنها لەبەر وادەو بەڵێنێك بوو کە بە باوکی دابوو (کە داوای لێبوردنی بۆ بکات) جا کاتێك بۆی ڕوون بوویەوە کە بێگومان باوکی دوژمنی خوایە، خۆی لێ بەری کرد بە ڕاستی ئیبراهیم زۆر لە خوا ترسو لەسەرخۆ بوو. خوای گەورە ڕێگەی بە ئیبراهیم نەدا کە داوای لێخۆش بوون بکات بۆ باوکی کاتێ کە دەرکەوت باوکی ئیبراهیم دوژمنی خوایە، ئیبراهیمیش پەشیمان

---

[1] البغوي (٣/٣٩٠).

[2] فتح الباري (٧/٧٤٣).

[3] الصافات (١٠٨-١١٠).

[4] ابراهيم (٤١).

[5] التوبة (١١٤).

بوویەوەو وازی هێنا لە پاڕانەوە بۆ باوکی، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُوا۟ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُا۟ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ﴾[1] واتە: بە ڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوان و پاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان وت بە ڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیانپەرستن لە جیاتی خوا، ئێمە باوەڕمان نیە بە (ئاینی) ئێوەو دوژمنایەتی و کینە پەیدابوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە خوای تەنها دەهێنن جگە لەو قسەیەی ئیبراهیم کە بە باوکی وت بێگومان داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم وە من هیچم بە دەست نیە لە بەرامبەر خوادا بۆ تۆ. ﴿وَلَا تُخْزِنِى يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خەجاڵەتم مەکە کاتێ کە هەموو خەڵکی لە ئەوەڵەوە هەتا دواین کەس زیندوو دەکەیتەوە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (ئیبراهیم باوکی خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا چاو پێکەوت تۆزێ مەینەتی بەسەریا باریبوو، ڕەشایی و دوکەڵ چاوی داپۆشیبوو).[2] وە لە ڕیوایەتێکی تر هەر لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئیبراهیم دەگات بە باوکی و ئەڵێت: ئەی پەروەردگارم: خۆت بەڵێنت دامێ کە لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا ڕیسوام ناکەی، خوای گەورەش دەفەرموێت: من بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر خوانەناسان).[3] وە لەو فەرموودانەی کە باسی پێغەمبەران دەکات (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (ئیبراهیم لە ڕۆژی قیامەتدا گەیشت بە ئازەری باوکی کە تۆزو دوکەڵ دەم و چاوی داگرتبوو، ئیبراهیم پێی گوت: پێم نەگوتی لە فەرمانی من دەرمەچۆ، باوکی ئەڵێ: ئەمڕۆ بە قسەت دەکەم، ئیبراهیمیش فەرمووی: ئەی خودایە تۆ بەڵێنت پێدام کە ڕیسوام نەکەیت لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا، چ ڕیسواییەك لەوە ڕیسواترە کە باوکم دوورە لە بەزەیی تۆوە، خوای گەورەش دەفەرموێت: من بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر خوانەناسان، پاشان ئەوترێت: ئەی ئیبراهیم سەیری ژێرپات بکە، سەیری کرد

[1] الممتحنة (٤).
[2] فتح الباري (٣٥٨/٨).
[3] فتح الباري (٣٥٧/٨).

کەمتیارێکی خوێناوی چاو پێکەوت بە چوارپەلی هەلگیرابوو فڕێ ئەدرایە ناو ئاگر).[1] ئەم فەرموودەیە نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لە (السنن الكبرى) و لە بەشی تەفسیرەکەیدا،[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ﴾ واتە: ڕۆژێ کە ماڵو سامان ناگەنە فریای هیچ کەسێكو لەسزای خودا ڕزگاری ناکەن، با بەئەندازەی نێوان زەمین زێڕیشی هەبێت لە بارتەقایدا بیدات، ﴿وَلَا بَنُونَ﴾ واتە: با هەرچی لەسەر زەمیندا هەیە هەمووی بدات بە ماڵو منداڵ هیچ سوێکی پێ ناگەیەنێت لەو ڕۆژەدا تەنها باوەڕبوون بە خوداو پەرستنی نەبێت بە دڵی پاكو دوورکەوتنەوە لە بتپەرستیو لە ئەو کەسانەی بت پەرستن، ﴿إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ واتە: مەگین کەسێك بێتە خزمەتی خوا دڵی پاك بێت لە شیركو بتپەرستی. ئیبنو سیرین دەڵێ: دڵی پاك ئەوەیە: کە بزانێ خودا هەقەو ڕۆژی قیامەت دێتو گومانی تێدا نیەو ئەوەش لەناو گۆڕدایە خودا زیندووی دەکاتەوە،[3] سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: دڵی پاك ئەو دڵەیە کە ساغە،[4] بریتیە لە دڵی خاوەن باوەڕ، چونکە دڵی خوانەناس و دووڕوو نەخۆشە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەبو عوسمانی نەیسابوری دەڵێ: ئەو دڵەیە کە پاکەو دوورە لە بیدعە و دامەزراوە لەسەر پەیڕەوی کردنی سونەت.

﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ (٩٠) وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ (٩١) وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ (٩٢) مِن دُونِ اللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ (٩٣) فَكُبْكِبُوا فِيهَا هُمْ وَالْغَاوُونَ (٩٤) وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ (٩٥) قَالُوا وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ (٩٦) تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٩٧) إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ (٩٨) وَمَا أَضَلَّنَا إِلَّا الْمُجْرِمُونَ (٩٩) فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ (١٠٠) وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ (١٠١) فَلَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (١٠٢) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ (١٠٣) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (١٠٤)﴾

---

[1] فتح الباري (٦/٤٤٥). مەبەست ئەوەیە وەك لە حەدیسی تردا هاتووە –باوکی ئیبراهیم مەسخدەکرێت و ئەکرێتە کەمتیارێکی نێر و ئەخرێتە جەهەننەم(النهاية في غريب الحديث و الأثر)– وەرگێڕ.

[2] النسائي في الكبرى (٦/٤٢٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الطبري (١٩/٣٦٦).

[4] الطبري (٣/٣٩٠).

**خۆپارێزان و گومڕایان لە ڕۆژی قیامەتداو کێشەی نێوان گومڕایان و داخ و خەفەت خواردنیان لە نێوان خۆیاندا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: بەهەشت بە جوانی و ڕازاوەیی نزیك خراوەتەوە لە خواترسان، ئەو کەسانەی کە هەوڵیان بۆ داوەو کاری زۆریان بۆ کردووە لە دنیادا ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ واتە: جەهەنەم دەهێنرێت و ئامادە دەکرێت بۆ گومڕایان. ملێك لێی دێتە دەرەوە هەناسەیەك دەدات لە ترسی ئەو هەناسەیە گیان دێتە قوڕقوڕاگە، دەوترێت بەو خەڵکەی ناو ئاگر: ﴿وَقِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلْ يَنصُرُونَكُمْ أَوْ يَنتَصِرُونَ﴾ واتە: کوان ئەو شتانەی ئێوە دەتانپەرستن غەیری خودا لە بت یان هەرشتێکیتر، ئەمڕۆ هیچ قازانجێکتان پێ ناگەیەنن، ناشتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، ئێوەو ئەوانیش ئەمڕۆ دەبنە سووتەمەنی جەهەنەم و لە ناویدا دەمێننەوەو هەرگیز لێی دەرناچن، ﴿فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ﴾ موجاهید دەڵێ: ئەوانیش گومڕاکانیش فڕێ دەدرێن بەسەر یەکدا لەناو جەهەنەمدا.[1] هەندێکی تر دەڵێن: ﴿فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا﴾ کافەکە –ك– دووبارەیە وەك (صَرْصَر) واتەك بەسەر یەکدا دەخرێنە ناو جەهەنەم لە خۆیان و سەرۆکەکانیان ئەوانەی کە بانگیان دەکردن بۆ بت پەرستی و هاوەڵ دانان بۆ خوا، ﴿وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ﴾ واتە: سەربازانی شەیتانیش هەموو دەچنە ناو جەهەنەم هیچ کەسێکیان ڕزگاری نابێت. ﴿قَالُوا۟ وَهُمْ فِيهَا يَخْتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: وەختێ لە ناو جەهەنەمدا دەکەونە کێشە لەگەڵ یەکتر، سوێند دەخۆن و دەڵێن ئێمە بە ئاشکرا گومڕا بووین کە ئێوەمان لەگەڵ خودا وەك یەك دادەنا، ئەدی ئێمە لە دنیادا شوێن ئێوە کەوتین، ئایا دەتوانن کەمێ لەم جەربەزەمان لەسەر لابەن؟ پاشان بیردەکەنەوەو سەرزەنشتی خۆیان دەکەن و دەڵێن: ﴿تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێمە سەرلێشێواو بووین کە وەك کار بۆ خودا بکەین کارمان بۆ ئێوە دەکردو ئێوەمان دەپەرست لەگەڵ خودای گەورەدا. ﴿وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ واتە: هەرئەو تاوانبارانە ئێمەیان بانگ کردو لە ڕێ لایان داین. ﴿فَمَا لَنَا مِن شَـٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ﴾، واتە: وە هیچ تکاکارێك بۆ ئێمە نیە، وە هیچ هاوڕێیەکی دڵسۆزمان نیە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی

[1] الطبري (٣٦٧/١٩).

ئەوانە ئەڵێن: ﴿فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشۡفَعُواْ لَنَآ أَوۡ نُرَدُّ فَنَعۡمَلَ غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُ﴾[1] واتە: ئاخۆ تکاکارێك هەیە تکامان بۆ بکات یان بمانگێڕنەوە بۆ دنیا هەتا ئەو کارەی کە کردوومانە، نەیکەینەوەو هەر خەریکی خواپەرستی ببین، وە لێرەشدا ئەڵێن وەك خوای گەورە فەرموویەتی ئەڵێن: ﴿فَلَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئا لەوێدا ئاواتەخوازن کە بگەڕانایەوە بۆ ژیانی دونیاو هەتا پەروەردگاری خۆیان بپەرستایەو وەك خۆیان دەڵێن خوای گەورە چاکیان دەناسێتو دەزانێ ئەگەر بڕۆنەوە سەر ژیانی دونیاش درۆ دەکەن دەست دەکەنەوە بە خراپەو خوانەناسی. خوای گەورە باسی کێشمەکێشی خەڵکی ناو ئاگر دەکات لە سورەتی (ص)دا پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقّٞ تَخَاصُمُ أَهۡلِ ٱلنَّارِ﴾،[2] واتە: بێگومان ئەوە (کە باسکرا) ئاژاوەو شەڕەقسەی دۆزەخیانە ڕاستەو (دێتەدی). پاشان خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ واتە: ئەو بەڵگەی کە ئیبراهیم بۆی هێنانەوەو پێی سەلماندن کە خوا شەریکی نیەو تاكو تەنهایە نیشانەیەکی ڕوونو ئاشکرایە کە غەیری خودا هیچ خودایەکی تر نیە هەر ئەو خاوەنی دەسەڵاتەو دلۆڤانە بەرامبەر بەندەکانی خۆی بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: بە ڕاستی هەر پەروەردگارتان زاڵو میهرەبانە.

﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾﴾

**باسی نوح و (سەلامی خوای لێ بێت) هەڵسانی بە ئامۆژگاری هۆزەکەیو وەڵامدانەوەیان بۆی**

ئەمە هەواڵێکە خوای گەورە لە نوح پێغەمبەرەوە دەیگێڕێتەوە بۆمان کە یەکەم ڕەسول بووە کە ڕەوانە کراوە بۆ سەر خەڵکی سەر زەمین پاش ئەوەی خەڵك دەستیان دایە بتپەرستیو هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا، خوای گەورە ناردیو داوای لێ کردن کە واز لەو بتپەرستیە بێننو ترساندنی لەوەی کە ئەگەر وازنەهێنن تووشی بەڵای گەورە دەبن، هۆزەکەی بڕوایان پێ نەکردو لەسەر بتپەرستی خۆیان بەردەوام بوون، ئەو بتانەیان کردبووە شەریکی خوداو لەگەڵ خودا دەیانپەرستن، خودای مەزن بڕوا نەکردنیان بە نوح وا حیساب دەکات وەك ئەوەی بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی تریش نەبووبێت، بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ واتە: گەلی نوح پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا، ﴿إِذۡ قَالَ

---

[1] الاعراف (٥٣).

[2] ص (٦٤).

لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾ واتە: نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی بە هۆزەکەی: ئایا لەخوا ناترسن؟ کە غەیری ئەو دەپەرستن، ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾، واتە: بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە، کەواتە لە خوا بترسن‌و گوێڕایەڵی من بکەن. یانی من پێغەمبەرێکم لە لایەن خوداوە ڕەوانە کراوم بۆ ئێوە ئەوەی خودا پێیدا ناردووم بە تەواوی پێتان دەگەیەنم‌و نە زیادی دەخەمە سەرو نە کەمیشی دەکەمەوە، بڕواتان پێم هەبێت کە ناپاکیتان دەرهەق ناکەم، ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ واتە: داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم بەرامبەر بە ئەم ئامۆژگاریەی کە دەتانکەم، بەڵکو داوای پاداشتی خۆم لە خوای گەورە دەکەم، پاداشتی خۆم هەڵدەگرم بۆ لای خودا. ئەو خوایەی کە ڕاستی‌و دروستی منی بۆ باس کردوون‌و ڕوونی کردووەتەوە بۆتان، کە جێی متمانەی ئەوم لە هێنانی ئەو پەیامەدا بۆ ئێوە، کەواتە لە خوا بترسن‌و گوێڕایەڵی من بکەن.

﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿١١٥﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ﴾ واتە: گوتیان: ئێمەبڕوات پێ ناکەین‌و شوێنت ناکەوین کە لەگەڵ ئەو هەژارو لاتو لوتەدا وەك یەك سەیر بکرێین‌و حیسابمان بۆ بکرێت، چونکە ئەو کەسانە بڕوایان بە تۆ هێناوەو شوێنی تۆ کەوتوون، هەژارو نەدارو ڕووتەو پووتەن ﴿قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واتە: فەرمووی: من چی بڵێم‌و دەسەڵاتم چیە کە ئەوانە شوێنی من کەوتوون؟ ئەوانە هەرچیە بوون‌و هەر کارێکیان کردبێت، پێویست ناکات‌و لەسەر من واجب نیە بگەڕێم بە شوێنیانداو بزانم چ کارە بوون، ئەوەی لەسەر منە کە بڕوام پێ دەکەن‌و بە ڕاستم دەزانن منیش وەریان بگرم، ئەوەشی من لێی تێ ناگەم‌و نایزانم لە بارەیانەوە دەگێڕمەوە بۆلای خوا خۆی، ﴿إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ﴾ واتە: پرسینەوەیان تەنها لەسەر پەروەردگارمە ئەگەر ئێوە هەست بکەن. ﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وەك ئەوەی کە داوایان لە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) کردبێت کە ئەو هەژارانە دەرکات و دووریان خاتەوە لە خۆی، لە پاشان ئەوان شوێنی دەکەون، نوحیش (سەلامی خوای لێ بێت) داواکەی قبوڵ نەکردن گوتی: ﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ﴾، واتە: وە من دەرکەری باوەڕداران نیم. ﴿إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ﴾ واتە: من تەنها هەر ترسێنەرێکم‌و ڕوونکەرەوەم. هەر کەسێك بە گوێی کردم‌و شوێنم

کەوتو بڕوای پێ کردم ئەوە لە منەو منیش لە ئەوم، ئیتر ئەو کەسە پیاو ماقوڵو خاوەن دەسەلاتە یان هەژارو نەدارو ڕووتەو پەتەیە، هیچ جیاوازیەکی نیە لە لای من.

﴿قَالُواْ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾﴾

## هەڕەشەکردنی هۆزەکەی لە نوح و نزای نوح لێیان و لەناوچوونیان

ماوەیەکی زۆر نوح (سەلامی خوای لێ بێت) لە ناویاندا مابووەوەو بە شەوو بە ڕۆژ بە نهێنیو بە ئاشکرا بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێی ڕاست، هەتا ئەو هەوڵی بدایە لەگەڵیانو خۆی ماندوو بکردایە لەگەڵیان، ئەوان زیاتر بەردەوام دەبوون لە خوانەناسیو دژایەتی کردنی خۆیان بەرامبەر بە نوح (سەلامی خوای لێ بێت)، لە دواییدا هەڕەشەیان لێ کردو وتیان: ﴿لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمَرْجُومِينَ﴾ واتە: ئەگەر کۆڵ نەدەیو وازمان لێ نەهێنی بەرد بارانت دەکەین، ئا لەو کاتەدا نوح دوعای لێکردنو خوداش دوعاکەی قبوڵ کرد وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوْمِى كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا وَنَجِّنِى وَمَن مَّعِىَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾، واتە: نوح وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەکەم بڕوایان پێ نەکردم، کەواتە لە نێوان منو ئەواندا حوکم بدە بە حوکمدانێکی یەکجاریو منو ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگار بکە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾[1]، واتە: جا (نوح) هاواری کردە پەروەردگاریو (وتی) بە ڕاستی من شکستم خواردووە(بێ دەسەلاتم) دەی تۆ یارمەتیم بدە، ئێمەش هەموو دەرگای ئاسمانمان کردەوە بە ئاوی بارانی لێزمە، وە کانیاوی زۆرمان لە زەویدا هەڵقوڵاند جا ئاوی ئاسمانو زەوی بە یەك گەیشتن بەو ئەندازەی کە بڕیاری لەسەر درابوو، وە نوحمان (لەگەڵ شوێنکەوتووانی) هەڵگرت لەسەر کەشتیەك کە بە چەند پارچە تەختەو بزمار (دروست کرابوو). وە لێرەشدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ ٱلْبَاقِينَ﴾ واتە: نوح و ئەوانەی لەگەڵی بوون لە گەمیە پڕەکەدا ڕزگارمان کردو ئەوانەی کە مانەوەو نەهاتنە ناوی

[1] القمر (١٠-١٤).

خنکان ﴿ٱلْمَشْحُونِ﴾ واتە پڕ لە خواردن‌و پێویستی‌و لە هەر گیانەوەرێکیش جووتەیەکی تێدابوو هەمو ڕزگاریان بوو ئەوانەشی کە خوانەناس بوون‌و سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد هەموو خنکان. ئەم دوو ئایەتەی دواوەوە لەبەر ئەوەی دووبارەن پێویست ناکات لەسەری بڕۆین ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾.

﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُوا ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَٰمٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾﴾

**ئامۆژگاری هود (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ هۆزەکەی - هۆزی عاد -**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: گەلی عاد پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، کاتێ (هود)ی برایان پێی وتن: ئایا خۆتان ناپارێزن لە سزای خودا، بێگومان من پێغەمبەرێکی ئەمینم بۆ ئێوە، کەواتە لە خوا بترسن‌و گوێڕایەڵی من بکەن، وە من هیچ کرێیەك لە ئێوە داوا ناکەم لەسەر گەیاندنی ئەم بانگەوازە پاداشتی من تەنها لای پەروەردگاری جیهانیانە. ئەمە هەواڵێکە خوای گەورە لە بارەی عەبدو پێغەمبەری خۆیەوە هود (سەلامی خوای لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە بانگی هۆزەکەی خۆی کرد، هۆزی عاد کە لە ئەحقاف ژیانیان بەسەر دەبرد، الاحقاف: بریتیە لەو چیا لماویانەی کە لە نزیك ناوچەی حەزرەمەوتن لە تەنیشت وڵاتی یەمەندا. پاش سەردەمی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) هاتوون، وەك خودای گەورە لە سورەتی (الاعراف)دا فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً﴾،[1] واتە: بیر لەو کاتە بکەنەوە کە خودا لە پاش هۆزی نوح ئێوەی لەجێی ئەوان دامەزراند و بەژنو باڵایەکی چاکیشی پێدان، چونکە ئەوانە زۆر بەهێزو بەتوانا بوون‌و بەژنو باڵایەکی بەرزو شەستووریان هەبوو. خاوەنی سامانێکی زۆرو بژێویەکی چاك‌و باغ‌و باغات‌و جۆبارێکی زۆر بوون.

[1] الاعراف (٦٩).

كشتوكاڵو بەروبوومێكی باشیان هەبوو، لەگەڵ وەچەیەكی زۆردا، كەچی لەگەڵ ئەو هەموو خێروبێرە خودا ڕژاندبووی بەسەریاندا بتیان دەپەرستو دەیانكردە شەریكی خوا، خوای گەورەیش (هود)ی بۆ ناردن كە پیاوێك بوو لە خۆیان بە پێغەمبەرایەتی كە ترسیان وەبەر بێنێ لە سزای خوا و مزگێنیشیان بداتێ بە پاداشتی خوا، هودیش داوای لێكردن كە تەنها عەبدایەتی خودا بكەنو ئەیترساندن لە تووڕەبوونو جەریەزەی خودا، ئەگەر لە فەرمانی دەربچنو غەیری خودا بپەرستن و ئەوەی پێی گوتن: كە نوح بە هۆزەكەیی گوت، هەتا دەگاتە ئەم ئایەتەی كە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ﴾ واتە: ئێوە لە هەموو شوێنێكی بەرزدا خانوویەكی گەورەو بڵند دروست دەكەن، بۆ ئەوەی گاڵتەو گەپی تێدا بكەن، بەبێ ئەوەی هیچ پێویستیەكتان پێی هەبێتو سوودێكی لێ وەرگرن، تەنها بۆ دەرخستنی هێزو تواناتانە. بۆیە هود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ناڕەزایی خۆی دەربڕی بەرامبەر ئەو كارەیان، چونكە كات بەفیڕۆدانو خۆماندوو كردنو سەرقاڵیەك نەبێت، هیچێكی تر نەبوو، نە خێری دنیایان دەست دەكەوت نەخێری قیامەت، بۆیە پێی گوتن وەك خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾ شوێنی قایم دروست دەكەن بەهیوای ئەوەی هەرنەمرن! موجاهید دەڵێ: ﴿مَصَانِعَ﴾ واتە: قەڵای قایمو كۆشكی زۆر بتەوو چاك. ﴿تَخْلُدُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی تا هەتایە تیایدا بمێننەوەو لێی دەرنەچن، هەرگیز بۆتان ناچێتە سەر و لە دەستتان دەچێ، وەك چۆن لە دەستی ئەوانەی پێش ئێوە چوو. ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ﴾، واتە: وە هەر كاتێك دەست بوەشێنن ستەمكارانە دەوەشێنن. یانی: بە كۆمەڵێكی زۆردارو بەهێزو ملهوڕ ناویان دەباتو پاشان پێیان دەڵێ: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ واتە: عەبدایەتی پەروەردگارتان بكەنو گوێڕایەڵی پێغەمبەرەكەشی بكەن. پاشان دێتە سەر ئەو بەهرانەی كە خودا پێی بەخشیونو فێری كردوون ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾، واتە: وە لە سزای ئەو خودایە خۆتان بپارێزن كە خۆتان دەزانن چی پێ بە خشیون، ئاژەڵو ماڵاتو منداڵو باخو كانیاوی زۆری پێداون. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: من لە سزای ئەو ڕۆژە گەورەیە دەترسم توشتان دێت، ئەگەر بڕوام پێ نەكەنو دژایەتیم بكەن، هود(سەلامی خوای لێبێت) بە هەموو شێوەیەك هەوڵیدا لەگەڵیان بە مزگێنی پێدان بە بەهەشتو نازونیعمەتەكانیو بە ترساندنیان لە ئاگری بە كڵپەی جەهەنەم. بەڵام هیچ كاری تێنەكردن.

﴿قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾
فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾﴾

**وەڵام دانەوەی هۆزی هودو سزادانیان**

خوای گەورە باسی وەڵام دانەوەی هود دەکات پاش ئەوەی پێغەمبەر هود (سەلامی خوای لێ بێت) ترسی وەبەر هێنان و ئاگاداری کردنەوەو بە تەواوی ڕاستی بۆ ڕوون کردنەوە ﴿قَالُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْنَآ أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ ٱلْوَٰعِظِينَ﴾ واتە: وتیان: بە لامانەوە یەکسانە ئامۆژگاریمان بکەی یان نەیکەی، ئێمە پەشیمان نابینەوە لەوەی کە دەیکەین و پێوەی خەریکین ﴿وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ﴾،[1] واتە: بۆیە ئێمەش واز لە پەرستراوەکانمان ناهێنین لەبەرقسەی تۆوە ئێمەباوەڕت پێ ناکەین. هەر وەهاش بوو، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾،[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون بۆ ئەوان چوونیەکە بیانترسێنیت یان نەیانترسێنیت. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾[3]، واتە: بە ڕاستی ئەوانەی دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت بڕوا ناهێنن. وە گوتویانە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ هەندێ ئەم ئایەتەیان خوێندووەتەوە: ﴿ان هذا الا خَلْقُ الاولين﴾ (خێ)یەکە یان فەتحە داوەتێو لامەکەیان ساکن کردووە. ئیبنو مەسعودو عەوفی بە عبدالله ی کوڕی عەباس و عەلقەمەو موجاهیدیشەوە دەڵێن: مەبەستیان ئەوە بووە، ئەوەی تۆ بۆت هێناوین ئەی هود هەموو قسەی پڕوپوچی پێشینانە.[4] وەك موشریکەکانی قوڕەیش بە پێغەمبەریان (ﷺ) گوت: ﴿وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾،[5] واتە: وە (بێ بڕوایان) دەیان وت (ئەم قورئانە) بەسەرهات و داستانی پێشووەکانە (موحەمەد (ﷺ)) داوای کردووە بۆی بنووسنەوە ئینجا دەخوێندرێتەوە بەسەریدا بە

---

[1] هود (٥٣).
[2] البقرة (٦).
[3] يونس (٩٦).
[4] الطبري (١٩/٣٧٨).
[5] الفرقان (٥).

بەیانیان و ئێواراندا. وە فەرموویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾،[1] واتە: ئەوانەی کە بێبڕوا بوون دەیانگوت بێگومان ئەم (قورئانە) هیچ نیە جگە لە درۆیەکی گەورە کە موحەمەد (ﷺ) هەڵی بەستووە وە کەسانی تر بۆ ئەو (هەڵبەستە) یارمەتیان داوە، بە ڕاستی ئەوانە ستەمو بوختانێکی گەورەیان کردووە، وە (بێبڕوایان) دەیان وت (ئەم قورئانە) بەسەرهاتو داستانی پێشووەکانە. وە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۙ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾،[2] واتە: وە کاتێ بەوانە بوترێت ئایا پەروەردگارتان چی ناردۆتە خوارەوە دەڵێن حیکایەتی پڕوپوچی پێشوەکان. وە هەندێکی تر ئەم ئایەتەیان بەم شێوە خوێندۆتەوە: ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ بە زەمی (ضم) (خێ)یەکە واتە: مەبەستیان ئەو ڕێڕەوەیە —دینە— باوەڕیان پێی هەیە کە لە باب‌وباپیرە پێشینەکانیانەوە بۆیان بەجێ ماوە ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ یانی ئەڵێن: ئێمە شوێنکەوتووی ئەوانین‌و ڕێگای ئەوان دەگرینە بەرو وەك ئەوان دەژین‌و دەشمرین، نە زیندووبوونەوە هەیەو نە ڕۆژی قیامەت، بۆیە گوتویانە: ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾ واتە: هەر بڕوایان بە هود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) نەکردو بەردەوام بوون لەسەر بێدینی‌و دژایەتیکردن‌و لاساری خۆیان، خودای گەورەش قڕی کردن‌و هۆی قڕکردنەکەیشی ئەوە بوو کە گەلێکی زۆر بێدین و ستەمکارو ملهوڕ بوون، وەك لە زۆر شوێندا لە قورئاندا باسیان هاتووە کە خودا بایەکی توندی بەردەوامی بۆ ناردن کە زۆر سارد، بەو بایە بوو هەمووی لەناوبردن، شایەنی ئەو بەڵایە بوون چونکە ئەوان زۆر ملهوڕو ستەمکار بوون، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ ٱلْعِمَادِ ﴾[3]، واتە: ئایا نابینن کە پەروەردگاری تۆ چیکرد بە گەلی عاد(ی)، ئیرەم؟خاوەنی پایە (و دەسەڵات). ئەمە عادی یەکەم بوون وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ﴾،[4] واتە: وە بێگومان هەر ئەو خوا گەلی عادی یەکەمی لەناو برد. کە لە بەنی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوح بوون، ﴿ذَاتِ ٱلْعِمَادِ﴾ واتە: نیشتەجێی خانووی دەواری بە چڵەو هەسون کۆڵەکە دروست کرابوون ئەوەی وا دەزانێ ئیرەم شار بووە بە هەڵەدا چووەو

---

[1] الفرقان (٤-٥).

[2] النحل (٢٤).

[3] الفجر (٦-٧).

[4] النجم (٥٠).

لە چیرۆکە ئیسرائیلیەکانەوە وەری گرتووە، لە قسەی کەعبو وەهەبەوە گواستوویانەتەوە کە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي ٱلْبِلَٰدِ﴾[1] واتە: وێنەی ئەم هۆزە وەدی نەهاتووە لە هێزو توندو تیژیو ملهوڕیدا لەو ولاتانەدا، خۆ ئەگەر مەبەست بەوە شارێك بوایە دەگوترا: لە وێنەی ئەو شارە دروست نەدەکرا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ﴾[2]، واتە: ئەنجا (گەلی) عاد بە ناڕەوا خۆیان بە گەورە زانی لە زەویدا وە وتیان کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ ئایا نەیانزانی بوو بێگومان ئەو خوایەی کە ئەوانی دروست کردووە ئەو لە ئەوان بەهێزترە وە ئەوان دانیان نەدەنا بە بەڵگەکانی ئێمەدا. وە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا﴾[3] واتە: وە (گەلی) عادیش لەناوبران بە بایەکی سەختی ساردی بە تینی بە گرمە، (خوا) زاڵی کرد بە سەریاندا حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەبێووچان (لەناوی بردن). واتە: ماوەی حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەردەوام ناردیە سەریان ﴿فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾ لەو کاتەدا لاشەیان لەو ناوەدا کەوتبوو دەتگوت کۆتەرەی دارخورمای ناو نزاون، سەریان پێوە نەمابوو، چونکە ئەو بایە کە دەهاتو دەیدا لە هەر پیاوێك لەوانە، هەڵی دەگرتو دەیکرد بە هەوادا و بەسەردا دەیکێشا بە زەویدا سەری پان دەبووەوەو دەماغی دەردەهێنا، وەك کۆتەرەی دارخورمای ڕزاوی لێ دەهات، ئەوانە خۆیان خزاندبووە ناو ئەشکەوتو کونە بەردەکانی ناو چیاکانو چاڵیشیان لەناو زەمیندا لێدابوو بەڵام بێ سوود بوو لە سزای خوا ڕزگاری نەکردن! ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ﴾[4] واتە: بێگومان کاتی سزای خوا دێت دوا ناکەوێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾.

﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾﴾

---

[1] الفجر (٨).

[2] فصلت (١٥).

[3] الحاقة (٦-٧).

[4] نوح (٤).

**باسی ساڵح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) و هۆزەکەی - سەمود -**

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی ساڵح دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە ڕەوانەی کردووە بۆ سەر هۆزەکەی، هۆزی سەموود، کە عەرەب بوون لە شاری حیجر نیشتەجێ بوون، کە کەوتبووە نێوان شیوی قیرا و وڵاتی شامەوە، کە شوێنەکەیان زۆر دیارو بەناو بانگە، لە پێشەوە لە سورەتی (الاعراف)دا باسی ئەو فەموودانەمان کرد کە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە تێپەڕی بەوێدا کاتێ ویستی غەزای شام بکات، گەیشتە تەبووك‌و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە، بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەو غەزایە.[1] ئەم هۆزی سەموودە دوای هۆزی عادو پێش ئیبراهیمی خەلیل هاتوون، پێغەمبەرەکەیان– ساڵح – (سەلامی خوای لیبێت) بانگی کردن بۆ لای خوداو داوای لێکردن کە تەنها خودا بپەستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بەڵام ئەوان بڕوایان نەهێناو دژایەتیان کرد، پێغەمبەر ساڵحی براشیان (سەلامی خوای لێ بێت) پێی وتن: من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ، پاداشتی خۆم لە خودای مەزن داوا دەکەم، پاشان باسی ئەو بەهرانەی خوای بۆ کردوون کە پێی بەخشیون.

﴿أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٖ وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ ﴿١٤٨﴾ وَتَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓاْ أَمۡرَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿١٥٢﴾﴾

**وەبیرخستنەوەی ئەو ژیانەی کە تێیدان‌و بەهرەکانی خودا بەسەریانەوە**

پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) ئامۆژگاریان دەکات‌و دەیانترسێنێت لە تووڕەبوونی خودا کە تووشی بەڵایان بکات‌و ئەو هەموو بەهرەی خودایان وەبیر دێنێتەوە کە پێی بەخشیون لە هەموو خۆراکێکی چاك‌و پڕسوود، دڵنیاشی کردوون لە ترس‌و باغاتیشی پێداون لەگەڵ کانیاوی سازگارو شیریندا کە بە ناویاندا دەڕوات، هەموو جۆرە کشتوکاڵ‌و بەرووبوومێك سەوز دەکات بۆیان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَتُتۡرَكُونَ فِي مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ﴾، واتە: وادەزانن وازتان لێدەهێنرێت لە دنیادا بە هێمنی دەژین، لە ناو باخات‌و کانیاوی زۆردا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَنَخۡلٖ طَلۡعُهَا هَضِيمٞ﴾ واتە: وە لە ناو کشتوکاڵی زۆر و دارخورمای مێوە گەیبیودا. عەوفی دەڵێ: لە

---

[1] فتح الباري (٧/٧٣١).

ئیبنو عەباسەوە ﴿هَضِيمٌ﴾واتە: نەرمو پێگەیشتوو.[1] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾ واتە: خاوەن شکۆفەو نەرمو نۆڵ. ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید دەڵێ: لە عەمری کوڕی ئەبو عەمرەوە کە چاوی بە هاوەڵانی پێغەمبەر کەوتووە (ﷺ) لە ئیبنو عەباسەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ﴾ دەڵێ: وەختێ کە تەڕو نەرمە، ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردووەو پاشان دەڵێ: لە ئەبوسالحیشەوە بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە.

﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ﴾، واتە: وە لە چیاکاندا خانوو دەتاشن زۆر بە لێزانانە. ئیبنو عەباسو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿فَٰرِهِينَ﴾ یانی: لێزانن –وەستان–[2]، وە هەر لە ڕیوایەتێکی تر لە ئیبنو عەباسەوە واتە: بە کەیفو خۆشیەوە. موجاهیدو کەسانی تریش هەمان ڕایان هەڵبژاردووە.[3] هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم قسانەدا نیە، چونکە ئەوانە ئەو ماڵانەیان لە کێوەکان دەتاشن بۆ کەیفو خۆشیو هیچ پێویستیەکیان پێی نەبوو کە تێیدا دانیشنو بە کاری بێنن، بەڵکو هەروەك پیشەیەك حەزیان لێی دەکردو زۆر لێزانو وەستا بوون لەو بەرد تاشینەدا، وەك دیارو ئاشکرایە بۆکەسێك چاوی بە شوێنەوارەکانیان کەوتبێت. بۆیە وەك خودای مەزن دەفەرمووێت پێی وتوون: ﴿فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ واتە: ڕوو بکەنە ئەو شتەی کە سودی بۆ دنیاو قیامەتتان هەیە، تەنها خودا بپەرستن کە دروستی کردوونو ڕۆزی داون هەمیشە خودا بناسنو بە پاکیو بێعەیبی ئەودا هەڵدەن بە بەیانیانو ئێواران ﴿وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾، واتە: وە گوێڕایەڵی زیادەڕەوان مەکەن، ئەوانەی خراپەکاری دەکەن لە زەویدا وە کردەوەی چاك ناکەن. یانی: سەرۆكو کاربەدەستەکانیان، ئەوانەی کە بانگیان دەکەن بۆ خوانەناسیو شەریك دانان بۆ خوداو دژایەتی هەق.

﴿قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ
هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا
فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ
ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾﴾

[1] الطبري (١٩/٣٨٠).
[2] الطبري (١٩/٣٨٢).
[3] الطبري (١٩/٣٨٣).

**وەڵام دانەوەی هۆزی سەموودو داواکردنی نیشانە (معجزە) و دابەزینی سزا بۆیان**

خوای گەورە باسی هۆزی سەموود دەکات کە وەڵامی پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) دەدەنەوە کاتێك کە بانگیان دەکات کە عیبادەتی پەروەردگاریان بکەن کەچی ئەڵێن: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ﴾ واتە: تۆ تەنها یەکێکی لە جادولێکراوان. موجاهیدو قەتادە دەڵێن: مەبەستیان ئەوەیە کە جادووی لێ کراوە.[1] پاشان دەڵێن: ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾ واتە: تۆ تەنها مرۆڤێکی وەك ئێمە. یانی چۆن نیگا دێت بۆ تۆ بۆ ئێمە نایەت؟ وەك لە ئایەتێکی تردا دەڵێن: ﴿أَءُلۡقِيَ ٱلذِّكۡرُ عَلَيۡهِ مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ ﴿٢٥﴾ سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ﴾[2]، واتە: چۆن لەناو هەموو ئێمەدا فەرمانی خودا هەر بۆ ئەودێ؟ بەڵکو پیاوێکی درۆزنی خۆپەسەندە –سبەی دەزانن کێ درۆزنو خۆپەسەندە– ﴿فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، واتە: دەی ئایەتو موعجیزەیەکمان بۆ بێنە ئەگەر تۆلە ڕاستگۆیانی. پاشان ڕایان هاتە سەر ئەوە نیشانەیەکی لێ داوا بکەن بۆیان بەجێ بێنێ، بۆ ئەوەی بزانن ڕاستە لە لای خوداوە ڕەوانە کراوە، هەموو کۆبوونەوەو داوایان لێکرد کە هەر ئێستا وشترێکی ئاوس لەم بەردە دەربهێنێت، –ئیشارەتیان کردە لای بەردێك کە لە لایاندا بوو– وە گوتیان لەو شێوەیەو لەو جۆرە بێت، ئا لەو کاتەدا پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) پەیمانی لێ وەرگرتن، ئەگەر ئەوەی ئەوان داوایان کردووە بۆی بەجێ هێنان باوەڕی پێ بکەنو شوێنی بکەون، ئەوانیش پەیمانیان دایە، پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) هەڵساو نوێژی کردو پاشان پاڕایەوە لە خوای گەورە داواکەیان قەبوڵ بکات، خودایش ئەو بەردەی قلیشاند کە ئیشارەتیان بۆ کرد وشترێکی ئاوس بەو شێوەیەو بەو جۆرە کە داوایان کردبوو هاتە دەرەوە لێی. هەندێکیان بڕوایان هێناو زۆربەشیان بڕوایان نەهێنا، ساڵح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وەك خوای گەورە دەفەرمووێت گوتی: ﴿قَالَ هَـٰذِهِۦ نَاقَةٞ لَّهَا شِرۡبٞ وَلَكُمۡ شِرۡبُ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ﴾ واتە: ئەمە وشترێکی مێینەیە، ڕۆژێك ئاوەکەی ئێوە بۆ ئەوەو ڕۆژێکیش بۆ خۆتانەو بۆتان نیە لە ڕۆژی ئەم وشترەدا بچنە سەر ئەو ئاوە ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ واتە: ترساندنیو هەڕەشەی لێکردن کە خوا توشی بەڵایان دەکات ئەگەر زیان بەو وشترە بگەیەنن. وشترەکە ماوەیەك لە نێوانیاندا مایەوەو گیاو گەڵا داری دەخواردو دەچووە سەر ئاوەکەو ئاوی دەخواردەوەو سوودیان لێوەردەگرتو شیرەکەیان دەخوارد، ماوەیەك بەم شێوەیە

---

[1] الطبري (١٩/٣٨٤، ٣٨٥).

[2] القمر (٢٥-٢٦).

تێپەڕی‌و نەگبەتیان هات‌و دایان لەملی وشترەکەو کوشتیان وەك خوای گەورە دەفەرموێت:
﴿ فَعَقَرُوهَا فَأَصۡبَحُواْ نَٰدِمِينَ ﴾، واتە: کەچی سەریان بڕی و یەکسەر پەشیمان بوونەوە. پاشان خوای
گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، واتە: ئینجا
سزای تۆڵە ئەوانی گرت بە ڕاستی لەمەدا نیشانەیەکی گەورە هەیە بەڵام زۆربەیان باوەڕدار نەبوون.
ئەو زەمینەی کە لەسەری بوون لەرزەیەکی زۆر توندی کرد لەگەڵ دەنگێکی بەهێزو گەورەدا دڵی
بچڕین‌و هەموویان لە شوێنی خۆیاندا کەوتن، بە شێوەیەك خودا لەناوی بردن کە هەرگیز بە خەیاڵیاندا
نەدەهات ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، پەروەردگاری تۆ زۆر بەدەستەلات و بەخشندە و بەسۆزە.

﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾﴾

**باسی (لوط) پێغەمبەرو (سەلامی خوای لیٚ بێت) بانگەوازەکەی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي
لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾
خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی لوت دەکات (سەلامی خوای لیٚ بێت) کە ناوی لوتی کوڕی
هارانی کوڕی ئازەرە، واتە: برازای ئیبراهیمی خەلیلە (سەلامی خوای لیٚ بێت) هەر لە زەمانی ئەمدا
خوای گەورە لوتی نارد بۆ ناو هۆزێکی گەورە کە لە سەدوم نیشتەجیٚ بوون. کە بەهۆی ئەو
بێناموسیانەیانەوە کەهەمووکەس ئەیزانێت خودای مەزن قڕی کردن‌و شوێنەکەیانی کردە دەریایەکی
پیسی بۆگەن کە زۆر بەناوبانگە لە وڵاتی غەور—الغور—دا کە ناوچەیەکە لە تەنیشت چیاکانی قودسی
پیرۆز (البيت المقدس) کەوتووەتە نێوان ناوچەی کەرەك و شەوبەکەوە، لوط پێغەمبەر(سەلامی خوای
لێبێت) بانگی کردن بۆ لای خوای گەورە داوای لیٚ کردن کە تەنها ئەو بپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن‌و
گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکانی بکەن کە ڕەوانەی کردوون بۆیان، فەرمانیشی پیٚ کردوون کە خۆیان بپارێزن
لە گوناهو خراپەکاری‌و واز بێنن لەو بێناموسیەی کە هیچ گەلیٚ لەپێش ئەوان پێی هەڵنەساوەو توخنی
نەکەوتووە. لە باتی ژن سواری پیاو دەبوون. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَتَأۡتُونَ ٱلذُّكۡرَانَ مِنَ
ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئایا لەناو خەڵکی هەموو جیهانیاندا تەنیائێوە نێربازی دەکەن.

﴿أَتَأۡتُونَ ٱلذُّكۡرَانَ مِنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّنۡ أَزۡوَٰجِكُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُواْ لَئِن
لَّمۡ تَنتَهِ يَٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُخۡرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلۡقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهۡلِي مِمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٦٩﴾

﴿فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ
ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾﴾

**ناڕەزایی دەربڕینی لووت لەسەر ئەو کارە خراپەی هۆزەکەی، وەلام دانەوەی ئەوان و سزادانیان**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئایا لەناوهەموو خەڵکی گشت جیهانیاندا ئێوە نێربازی دەکەن. ﴿وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾، واتە: وە واز دێنن لەوهاوسەرانەتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون، نەخێر بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی دەرچوون لەسنووری ئارەزوو. کاتێك کە لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێی گوتن کە واز بێنن لە داوێنپیسیو پەلاماری نێر نەدەن لە باتی مێینە، داوای لێ دەکردن کە بچنە لای ژنەکانیانو ئەوەی خودا بۆی حەڵاڵ کردوون بیکەن، بەڵام ئەوان وەڵامیان ئەوە بوو بۆ لووت (سەلامی خوای لێ بێت) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَٰلُوطُ﴾ واتە: ئەگەر کۆڵنەدەی لەوەی کە باسی دەکەیو بۆت هێناوین ﴿لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ﴾ واتە: لەناو خۆماندا دەرت دەکەین، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾[1]، واتە: ئینجا وەڵامی گەلەکەی هیچ نەبوو جگە لەوەی کە وتیان لوتو بنەماڵەکەی (شوێنکەوتووانی) لە شارەکەتان دەرکەن بە ڕاستی ئەوان کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (لەم کردەوەی ئێمە). واتە: دەریان کەن چونکە ئەوانە حەز لە داوێن پاکی دەکەن، کاتێ کە لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بۆی دەرکەوت کە واز ناهێننو لەسەر گومڕایی خۆیان هەر بەردەوامن، ناڕەزایی خۆی دەربڕی لێیان ﴿قَالَ إِنِّى لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ﴾ واتە: گوتی: من زۆر قینم لەم کارەتانە، خۆشیم لێی نایەو پێی ڕازی نیم، هیچ پەیوەندیەکم نیە پێتانەوەو لێتان دوورم، پاشان دوعای لێکردن گوتی: ﴿رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ﴾، واتە: ئەی پەروەردگارم خۆموماڵو خێزانم ڕزگار بکە لە تۆڵەی ئەو کردەوەی ئەوان دەیکەن. خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿فَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: هەموو ڕزگاریان بوو جگە لە ژنەکەی، کە ژنێکی زۆر خراپ بوو مایەوەو لەگەڵ ئەوانەی هۆزەکەی لەناو چوو، خودای گەورە لە چەند سورەتی تردا باسی کردووە، وەك لە سورەتی (الاعراف و هود و حجر)دا کە خوا فەرمانی دا بە لوت کە بە شەو خاوخێزانی لەوێ

[1] النمل (٥٦).

دەرچوون جگە لە ژنەکەی کە دەبێت لەناو ئەوانەدا بمێنێتەوە، وە کاتێ گوێیان لە دەنگی گەورە بوو لانەکەنەوەو نەڕوانن بە دوای خۆیاندا چونکە ئەوە بەڵایە دێت بۆ ئەوانەی هۆزەکەی فەرمانی خودایان بەجێ هێناو خۆیان گرتو بەڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ خوای گەورە سزای سەختی نارد بۆیان‌و هەمووی لەناو بردن‌و پاشان بەردەبارانیشی کردن بە قوڕێ کەوەك بەردی ڕەقی لیێ هاتبووئینجاناى چ خراپ بووبارانی ترسێنراوان. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾.

﴿كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾﴾

**شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لیێ بێت) ئامۆژگاری خاوەن دارستانەکان دەکات**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: خاوەن باخاتە چڕوپڕەکانیش پێغەمبەرانیان بە درۆزن دانا. ئەمانە –واتە خاوەن دارستانەکان– خەڵکی مەدیەن بوون، پێغەمبەر شوعەیبیش (سەلامی خوای لیێ بێت) لە کەسی خۆیان بووە، بۆیە لێرەدا نەگوتراوە: برایان شوعەیب چونکە هۆزەکەی دارستانیان دەپەرست. وە گوتراویشە: (أیکة)درەختێکە .لوول ئەخوات وەك جەنگەڵستان ئەچن بەناو یەکدا کەگەلی شوعەیب دەیان پەرست! هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، نەیفەرموو (اذ قال لهم أخوهم شعيب) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ﴾، واتە: کاتێك شوعەیب (سەلامی خوای لیێ بێت) پێی وتن: ئایا خۆتان ناپارێزن‌و لە خوا ناترسن. یانی پەیوەندی خزمایەتی بڕیوە لە نێوانی شوعەیب‌و ئەواندا، بەهۆی ئەو بت پەرستیەی درابووە پاڵیان، هەرچەندە لە ڕەچەڵەکدا یەك بنەماڵە بوون، هەندێ کەس لەم قسەیە تێنەگەیشتووە، وایانزانیووە خاوەن دارستانەکان ﴿أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ﴾ واتە: جگەلە هۆزی شوعەیب.[1] کەسانی تریش جگە لە جوەیبر –جوێبر– ئەڵێن: خاوەن دارستان‌و مەدیەن هەر یەکێکن.[2] ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەردوویان یەك هۆزن، لە هەر شوێنێکدا بە شتێ ناوبراون، بۆیە پێغەمبەر شوعەیب ئامۆژگاریان دەکات‌و فەرمانیان پێدەکات لە کێشانەو لە پێوانەدا دادپەروەر بن وەك لە

---

[1] الدر المنثور (٦/٣٨١).

[2] الطبري (١٩/٣٩٠).

بەسەرهاتی مەدیەندا بە تەواوی باس کراوە، ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەن دارستان و مەدیەن یەك شتە، شوعەیب پێیان ئەفەرموێ، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٧٨) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٧٩) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾، من پەیامبەرێکی دەستپاکم بۆ ئێوە، لەخوا بترسن و گوێڕایەڵی بکەن، من هیچ کرێیەك لە ئێوەداوا ناکەم و کرێی من تەنیا لای پەروەرگاری جیهانیانە.

﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ (١٨١) وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ (١٨٢) وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ (١٨٣) وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ (١٨٤)﴾

## فەرمان دان بە دادپەروەری لە کێشانەو پێوانەدا

شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێی فەرموون: بە ڕێك و پێکی کێشانەو پێوانە بکەن، داوای لێکردن واز لە کەم فرۆشی (ترازووبازی) بێنن، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ﴾ واتە: وەختێ شتێکتان فرۆشت بە کەسێك بە تەواوی شتێکی بدەنێ و لێی کەم مەکەن وە لە زیاندەران مەبن. وەك چۆن خۆتان دەیکڕن بەو شێوەیەش بیفرۆشن، با زیادو کەمی نەبێت و یەکسان بێ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ﴾ (القسطاس) مانای تەرازووە، واتە: کێشانەتان با بەرامبەر و یەکسان بێ. ﴿وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ واتە: شتی خەلکی کەم مەکەن وە لەزەویدا مەبنە خەلکانی گەندەل. ﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ ڕێگەش مەگرن لە خەلکی و تالانی بکەن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ﴾،[1] واتە: وە لەسەر هەموو ڕێگایەك مەگرن و هەڕەشە بکەن و بەرهەڵستی ڕێگەی خوا بکەن لە و کەسەی باوەڕی پێ ئەهێنێ. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ﴾ شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دەیانترسێنێت لە تۆڵەی خودا. ئەو خودایەی کە ئەوانیش و گەلە پێشوەکانیشی دروست کردووە. وەك موسا (سەلامی خوای لێ بێت) گوتی بە نەوەی ئیسرائیل ﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ﴾،[2] واتە: پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باوك و باپیرە پێشوەکانتانە. ئیبنو عەباس و

---

[1] الاعراف (٨٦).

[2] الشعراء (٢٦).

موجاهیدو سودیو سوفیانی کوڕی عویەینەو عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی ئەسلەم ئەڵێن: ﴿وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واتە: کۆمەڵانی پێشوشی دروست کرد، پاشان ئیبنو زەید ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان (شەیتان) خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕا کرد[1].

﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾﴾

## وەڵام دانەوەی هۆزی شوعەیبو بڕوا نەهێنانیان پێی و سزادانیان

خوای گەورە باسی هۆزی شوعەیب دەکات کە وەڵامەکەیان هەروەك وەڵامی هۆزی سەمود وابوو، چونکە خوانەناسان خاوەنی یەك سروشتو دڵن. بۆیە گوتیان: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ﴾ واتە: بێگومان تۆ جادووت لێکراوە، وەك لە پێشەوە باسکرا، ﴿وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ واتە: وە تۆ تەنها مرۆڤێکی وەك ئێمەو بە ڕاستی ئێمە وا گومانت پێ دەبەین لە درۆزنان بیت. یانی قسەی خۆتەو لە خۆتەوە هەڵی دەبەستیو خودا تۆی ڕەوانە نەکردووە بۆ ئێمە، ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ لەتێك لە ئاسمان بخە بەسەرماندا، زەححاك دەڵێ: ﴿كِسَفًا﴾ واتە: سوچێکی ئاسمان بخە بەسەرماندا.[2] قەتادە دەڵێ: ﴿كِسَفًا﴾ واتە: چەند پارچەیەکی ئاسمان بەسەرماندا دابارێنە.[3] سودی دەڵێ: سزایەکمان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرە، ئەم قسەی ئەمانە لە قسەی هۆزی قورەیش دەچێ، وەك خوای گەورە باسیان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾[4]، واتە: وتیان هەرگیز باوەڕت پێ ناهێنین هەتا لەم زەویەدا کانیاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنی، یان باغێکت ببێ لە دار خورماو

---

[1] الطبري (١٩/٣٩٢).

[2] الطبري (١٩/٣٩٣).

[3] الطبري (٢٢/٤٨٥).

[4] الاسراء (٩٠-٩٢).

تریّو چەند ڕووبارێك هەڵقوڵێنێت لە نێوان درەختەکانیدا بە خوڕ بڕوات، یان ئاسمان بڕوخێنی بەسەرماندا بە پارچە پارچەکراوی هەر چۆن لافت لێداو یان خواو فریشتەکان بێنیّ ڕووبەڕوو (بیان بینین). وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1]، واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك (کە بێبڕواکان) دەیان وت: ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزایەکی سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە. ئەم خوانەناسو نەزانانەی هۆزی شوعەیبیش هەر وایان گوتووە، ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ شوعەیبیش وەڵامی دانەوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: خودا ئاگای لە هەموو کاروبارێکتانەو ئەگەر شایەنی ئەوە بن سزاتان بدات، سزاتان دەداتو ناهەقیتان پیّ ناکات، هەر بەو شێوەیە خودا تۆڵەی لێسەندنو بەو جۆرەی کە خۆیان داوایان دەکرد تووشی سزا بوون، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ ئەم سزایە لەو جۆرە بوو کە خۆیان داوایان دەکرد، کە چەند پارچەیەك لە ئاسمانەوە بەسەریاندا ببارێت، خوای گەورەیش، ئەو بەڵایەی بەو جۆرە بۆناردن، حەوت ڕۆژ ڕەشەبایەکی گەرمی توند لێی هەڵکردن دەرفەتی نەدەدانو نەیدەهێشت چاو بکەنەوەو هەراسانی کردبوون، پاشان هەورێك هاتو سێبەری کرد بەسەریانداو بە پەلە دەرچوون بۆ ئەوەی بچنە سێبەری لەبەر گەرماو فێنکیان بێتەوە کاتیّ کە هەموو کۆبوونەوە لە ژێر هەورەکەدا، خوای گەورە چەخماخەیەکی ئاگرینی بۆ ناردن کە زۆر بریزکەدارو ڕووناك بوو، زەویش لە ژێریاندا لەرزیو دەنگێکی زۆر مەزنیش هاتو گیانی هەموویانی کێشاو لەناوی دان، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ خوای گەورە لە سیّ شوێندا باسی چۆنیەتی لەناوچوونی هۆزی شوعەیبی کردووە، هەر شوێنێك پڕبەپڕی ئەو باسەیە کە هاتووە لە سورەتی (الاعراف)دا باسی ئەوە دەکات کە زەمین لەرزەیەك لە شوێنی خۆیاندا لێی داون هەموو لەناوچوون، چونکە ئەوانە دەیانگوت بە شوعەیب: ﴿لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا﴾[2]، واتە: ئەی شوعەیب بێگومان تۆو ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە لەگەڵ تۆدا لە شارەکەمان دەرتان دەکەین یان دەبێت بگەڕێنەوە سەر ئاینی ئێمە. چونکە ئەمانە جێیان بە شوعەیبو ئەوانەی شوێنی کەوتبوون

---

[1] الانفال (٣٢).

[2] الاعراف (٨٨).

لێژ کردبوو، خودایش زەمینی لەژێریاندا هێنایە لەرزەو لێی تێك دان‌و لەناوی بردن. وە لە سورەتی (هود)یشدا فەرموویەتی: ﴿وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ﴾[1]، واتە: وە ئەوانەی ستەمیان کردبوو نالەو شریخەکە (نەعرەتەکە)گرتنی. چونکەئەوانە گاڵتەیاندەهات بە قسەی شوعەیب دەیانگوت: ﴿أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ﴾[2]، واتە: ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێ دەدات کە ئێمە واز بێنین لەوەی باوو باپیرانمان پەرستوویانە یان واز بێنین لەوەی بە ویستی خۆمان لە ماڵو سامانماندا دەیکەین بە ڕاستی تۆ پیاوێکی بەحەوسەڵە و لێزان و هۆشمەندیت. ئەو گاڵتەجارِیەی ئەوان، جێی خۆیەتی کە دەنگێکی توندو بەهێز خامۆشی بکات‌و سورتەی بچنێ. وە لێرەشدا گوتیان: ﴿فَأَسۡقِطۡ عَلَيۡنَا كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ واتە: ئەوەندە لاسارو بێدین و کەللەڕەق بوون، جێگای خۆیەتی، ئەوەی ئەوان بە دریان دەزانی‌و بڕوایان پێی نەبوو بەسەریاندا بێ‌و لەناویان ببات، ﴿فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾ ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە یەزیدی باهیلیەوە –یزید الباهلی– دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەباس لەم ئایەتە ﴿فَأَخَذَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمِ ٱلظُّلَّةِ﴾، (واتە: بەو هۆیەوە سزای ڕۆژی سێبەر گرتنی). گوتی: خوای گەورە هەورە تریشقەو بایەکی توندی گەرمی بۆ ناردن خەریك بوو هەناسەی دەچنین دەچوونە ژووری ماڵەکانیان لەگەڵیان دەچووە ژوورو خەریك بوو گیانیان دەربێنێ، لە ماڵ ڕایان کردە دەرەوە، خوای گەورە هەورێکی بۆ ناردن بەری خۆری گرت‌و سێبەری بە سەریانەوە کرد، هەستیان بە خۆشی‌و فێنکی کرد، بانگی یەکتریان دەکرد هەتا هەموو لە ژێر ئەو هەورەدا کۆبوونەوە خوای گەورە ئاگرێکی بۆ ناردن، ئیبنو عەباس دەڵێ: ئەوە ئەو گڕە بایە بوو کە لە ڕۆژی هەوردا لێی هەڵکردن، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەو سزایە سزای ڕۆژێکی زۆر گەورە بوو.[3] پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ١٩٠ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾.

---

[1] هود (٩٤).

[2] هود (٨٧).

[3] الطبري (١٩/٣٩٤).

﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾﴾

**ئەم قورئانە خوای گەورە ناردوویەتیە خوارەوە**

خوای گەورە باسی کتێبی خۆی قورئان دەکات کە ڕەوانەی کردووە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەمەد(ﷺ)، ﴿وَإِنَّهُۥ﴾ واتە: ئەو قورئانە، کە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا باسی هاتووە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهُ مُعْرِضِينَ ﴾[1]، واتە: هەر قسەیەکی تازەیان لە لایەن خوداوە بۆ بێت ڕوویانی لێ وەردەگێڕن ﴿لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: خودا بۆی ناردووی‌و نیگای بۆ کردووی، ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴾ واتەك جوبرەئیل (سەلامی خوای لێ بێت) هێناویەتیە خوار. زۆرێك لە زانایانی پێشینە –السلف– وایان گوتووە: وەك ئیبنو عەباس‌و موحەمەدی کوڕی کەعب‌و قەتادەو عەتیەی عەوفی‌و سودی‌و زەححاك‌و زوهری‌و ئیبنو جورەیج[2]. ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە هیچ ناکۆکیەکی لەسەر نیە. زوهری دەڵێ: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾[3]، واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ: هەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیل بێت (ئەوە دوژمنی خوایە) چونکە ئەو بە فەرمانی خوا قورئانی هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ. وە فەرموویەتی: ﴿عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ بۆ سەر دڵی تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) کە زیادو کەمی نیەو دوورە لە هەموو عەیبێك ﴿لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾ تابیتە ئاگادارپیدەر، واتە: بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بڕوایان نیەو دژایەتی ئیسلام دەکەن بترسێنێت لە تۆڵەو سزای خوای گەورە. مزگێنیش بدات بە خاوەن باوەڕان ئەوانەی کە شوێن کەوتووی ئەو پەیامە بوون، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴾ واتە: ئەم قورئانەی کە بۆ تۆمان ناردووە بە زمانێکی عەرەبی ڕێکوپێك‌و ڕەوان، بۆ ئەوەش دیارو ئاشکراو ڕوونە تا بیانوو بڕبێ‌و چاکترین نیشانەش بێ لەسەر ڕاستی‌و بێگەردی ئەم پەیامە پیرۆزە.

---

[1] الشعراء (٥).

[2] الطبري (١٩/٣٩٦).

[3] البقرة (٩٧).

﴿وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾﴾

## قورئان لە کتێبە پێشوەکاندا باسی هەبووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ خوای گەورە دەفەرمووێت باسی ئەم قورئانەو ئیشارەت پێدانی لە کتێبەکانی پێشوودا هەیە، پێغەمبەرەکانی پێشوو مزگێنیان پێداوە هەر لە دێرزەمانەوە تا پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) وەك بەڵێنو پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتووە لەو بارەیەوە، دواین پێغەمبەریان کە عیسای کوڕی مەریەمە، هەڵدەسێ وتارێك دەدات لەناو شوێنکەوتووانیدا مزگێنی هاتنی پێغەمبەریان (ﷺ) پێ دەگەیەنێت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ﴾،[1] واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك کە عیسای کوڕی مەریەم وتی ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە ئەو تەوراتەی کە لە پێش مندا هاتووە بە ڕاستی دادەنێم وە مژدەتان دەدەمێ بە پێغەمبەرێك کە لە دوای من دێتو ناوی ئەحمەدە. ﴿زُبُرِ﴾ لێرەدا واتە: کتێبەکان، کە جەمعی زەبوورە –الزبور– کە کتێبی داودە (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ﴾،[2] واتە: هەرچیان کردووە لە کتێبی فریشتەکاندا لەسەریان نووسراوە، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ واتە: ئایا ئەوە بەس نیە بۆ ئەوان کە زانایانی نەوەی ئیسرائیل شایەتی ڕاستی دەدەن لەسەر ئەوەی کە قورئان باسی هاتووە لەناو کتێبەکانی ئەواندا کە دەیخوێننەوە. مەبەست پێی: ئەو زانایانەی کە بە ئینسافو ڕاستگۆن دانی پێدا دەنێن کە باسی موحەمەد(ﷺ)و سیفەتەکانیو ئومەتەکەیو ڕەوانەکردنی لە کتێبەکانی ئەواندا هاتووە. وەك عبدالله ی کوڕی سەلامو سەلمانی فارسی و هاوشێوەی ئەوان کە پێغەمبەریان بینیوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ﴾.[3] واتە: ئەوانەی شوێن پێغەمبەرو نێردراوی

[1] الصف (٦).
[2] القمر (٥٢).
[3] الاعراف (١٥٧).

نەخوێندەوارق دەکەون (کە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو کەسەی کە (نامەدارەکان) بە نوسراوی لایانە لە تەورات‌و ئینجیلدا و دەیبینن.

## قورەیشیەکان زۆر بێدین بوون

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوۡ نَزَّلۡنَٰهُ عَلَىٰ بَعۡضِ ٱلۡأَعۡجَمِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێمە ئەوەمان بناردایەتە خوارەوە بۆ کەسێکی عەجەمی، ﴿فَقَرَأَهُۥ عَلَيۡهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: ئینجا بخوێنرایەتەوە بەسەریاندا باوەڕیان پێ نەدەهێنا. خوای گەورە زۆر باسی بێدینیو لاساری قورەیش دەکات بەرامبەر ئەم قورئانە کە بۆیان هاتووە، ئەوەندە دوور لە خوان ئەگەر ڕەوانە بکرایە بۆعەرەبی نەزانێك –عەجەمیەك– ئەوانەی لەعەرەبی تێناگەن هەر نزیکی نەدەکەوتنەوە و بڕوایان پێ نەدەهێنا، ئەوەتا ئەم قورئانە بەو هەموو ڕێك‌و پێکیو ڕەوانیەوە و بە زمانی خۆیانە کەچی بڕوای پێ ناهێنن، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ١٤ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا﴾[1] واتە: ئەگەر دەرگایەکیان لە ئاسمانەوە بۆ بکردنایەتەوە و پیایدا بڕۆشتنایەتە سەرەوە ئەوسا دەیانگوت: بێگومان ئێمە چاوبەستمان لێکراوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾[2] واتە: وە بێگومان ئەگەر ئێمە فریشتەمان بۆ لای ئەو (بێباوەڕ)انە بناردایەو مردووەکان قسەیان لەگەڵ بکردنایەو هەموو شتێکمان بۆ کۆبکردنایەتەوە ڕووبەڕوویان دامان بنایە بڕوایان نەدەهێنا مەگەر خوا بیەوێت. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[3]. واتە: بە ڕاستی ئەوانەی بڕیاری پەروەردگارت بۆیان دەرچوو بڕوا ناهێنن، (بڕوا ناهێنن) هەرچەندە بۆیان بێت هەموو بەڵگەو نیشانەیەك، تا سزای سەختی ئازاردەر دەبینن (بە چاوی خۆیان).

﴿كَذَٰلِكَ سَلَكۡنَٰهُ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ٢٠٠ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ٢٠١ فَيَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٢٠٢ فَيَقُولُواْ هَلۡ نَحۡنُ مُنظَرُونَ ٢٠٣ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ٢٠٤ أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ

---

[1] الحجر (١٤–١٥).

[2] الانعام (١١١).

[3] یونس (٩٦–٩٧).

﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾﴾

**خوانەناسان بڕوا ناهێنن هەتا سزای بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە بێباوەڕیو سەرپێچیو لاساریمان خستووەتە دڵی تاوانباران ﴿لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ بڕوا بە هەق ناهێنن ﴿حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾ هەتا سزای بەژان بە چاوی خۆیان دەبینن، ئەو کاتە پەشیمان دەبنەوە بەڵام هیچ بڕوبیانوویەك لە ستەمکاران قبووڵ ناکرێتو سوودێکی نیە بۆ ئەوان، بەر لەعنەتی خودا دەکەونو خراپترین ڕێو شوێنیان هەیە، ﴿فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: لە پڕ سزاو جەزرەبەی خوایان بۆ دێت کە هەر ئاگایشیان لە خۆیان نیەو هەستی پێ ناکەن، ﴿فَيَقُولُواْ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ﴾ واتە: کاتێك ئەو جەزرەبەیە بە چاوی خۆیان دەبینن، ئاواتەخوازن کە ماوەیەکی کەم مۆڵەت بدرێن هەتا -بە خەیاڵی خۆیان- گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بکەنو دەست بدەنە خواناسی، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ أَوَلَمْ تَكُونُوٓاْ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ﴾[١]، واتە: وە (ئەی موحەمەد(ﷺ)) خەڵکی ئاگادار بکەو بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو شوێنی پێغەمبەران بکەوین، ئەی ئەوە ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەرگیز لەناو ناچن. هەموو ناهەقیکارو بەدڕەوشتو خراپەکارێك کاتێ کە تووشی جەزرەبەی خۆی هات، زۆر پەشیمانە، ئەوە فیرعەونی ستەمکار کاتێ کە موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دوعای لێ دەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا﴾[٢] واتە: ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی تۆ بەخشیوتە بە فیرعەونو کۆمەڵەکەی هۆکاری ڕازانەوەو جوانیوماڵو سامانی زۆر لە ژیانی دنیادا ئەی

[١] ابراهيم (٤٤).
[٢] يونس (٨٨-٨٩).

پەروەردگارمان بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا بكەن لە ڕێگای تۆ ئەی پەروەردگارمان لەناوی بەرەو مەیهێڵە ماڵو سامانیان و دڵەكانیان ڕەقو ڕەش بكە چونكە بڕوا ناهێنن تائەوكاتەی سزای سەختی ئازاردەر دەبینن، (خوای گەورە) فەرمووی: بێگومان داوای هەردووكتان وەرگیرا. ئەم دوعایە – نزایە – زۆر كاری لە فیرعەون كرد، بڕوای نەهێنا هەتا بە چاوی خۆی ئازاری بەژانی چەشت. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدۡرَكَهُ ٱلۡغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾[1]، واتە: هەتا ئەو كاتەی خەریك بوو (فیرعەون) بخنكیّ ئەوسا وتی بڕوام هێنا كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت كە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێهێناوە وە منیش لە موسڵمانانم، ئێستا (باوەڕ دێنیت؟) كە بێگومان لەوەوپێش سەرپێچیت كردووە تۆ لە خراپەكارانو تێكدەران بوویت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمۡ يَكُ يَنفَعُهُمۡ إِيمَٰنُهُمۡ لَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا﴾[2] واتە: ئەنجا كاتێك سزای بەتینی ئێمەیان بینی وتیان: باوەڕمان بە خوای تاكو تەنها هێناوە بێباوەڕین بەو شتانەی كردبوومانە هاوبەشی خوا، جا باوەڕهێنانەكەیان هیچ سودی نەبوو بۆیان لە كاتێكدا سزای ئێمەیان دی. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ﴾ واتە: دەی ئایا ئەوان پەلەی سزای ئێمەیانە. ئەمە هەڕەشە لێكردنو ناڕەزایی دەربڕینە، چونكە ئەو خوانەناسانە گاڵتە دەكەن بە پێغەمبەرو (ﷺ) بڕوایان بە قسەی نیەو بە دووری دەزانن توشی بەلا بن، بۆیە ئەڵێن: ﴿ٱئۡتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ﴾[3] واتە: سزای خوامان بۆ بێنە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ﴾ واتە: خۆ ئەگەر مۆڵەتیان بدەینو ماوەیەك دوایان بخەینو وازیان لیّ بێنینو لێیان نەپرسینەوە، هەرچەندە ئەو ماوەیەش زۆر بێت، كاتێك كە خوا تووشی سزای كردن، ئایا ئەو خۆشیو بەهرانە چ سودێكی هەیە بۆیان، ﴿كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا﴾[4] واتە: بێباوەڕەكان كە ئەو ڕۆژە دەبینن وا دەزانن كە نەماونەتەوە ئێوارەیەك یا چێشتەنگاوێكی نەبیّ لە دونیادا. وە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی:

---

[1] یونس (٩٠–٩١).

[2] الغافر (٨٤–٨٥).

[3] العنكبوت (٢٩).

[4] النازعات (٤٦).

﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ﴾[1] واتە: (لەبەر ئەوە) هەر یەکێکیان ئاوات دەخوازێت کە هەزار ساڵ بژیایە وە ئەوتەمەنە(کەبەسەری دەبات) ڕزگاری ناکات لەسزا. ﴿ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ﴾ واتە: لەپاشان ئەوسزایە بێت بۆیان. ﴿وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ﴾،[2] واتە: وە سەروەت و سامانەکەی قازانجی پێ ناگەیەنێ کاتێك کە تیادەچێت. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يُمَتَّعُونَ﴾ واتە: ئەومالّو سامانو خۆشگوزەرانیەی کاتێ کەمرد هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت. لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە دەفەرمووێت: (خوانەناس دەهێنرێت لەناو ئاگردا نوقم دەکرێت یەك جار، پاشان پێی دەبێژرێت: ئایا هەرگیز خێرت بینیووە؟ خوانەناسەکەش ئەڵێ: نەخێر سوێند بە خوا ئەی پەروەردگار. پیاوێکیش دێنن کە تووشی توندترین نارەحەتی -چەرمەسەری- بووە لە دنیادا دەخرێتە ناو بەهەشتەوە بە تێخستنێك پاشان پێی دەبێژرێت: ئایا هەرگیز نارەحەتیت دیوە؟ ئێژێ: نەخێر سوێند بە خودا ئەی پەروەردگار)، واتە: وەك ئەوەی کە هیچی بەسەر نەهاتبێت.[3] پاشان خودای گەورە باسی دادپەروەری خۆی دەکات بەرامبەر بەندەکانی کە هیچ گەلو ئومەتێکی لەناو نەبردووە مەگین ئاگاداری کردوونەتەوەو ترساندوونی بە ناردنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆیان، هەموو شتێکیان بۆ ڕوون کردوونەتەوەو بیانوویان بریون، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ﴾، واتە: هیچ شارێکمان لەناو نەبردووە دڵنیابە ترسێنەرێکی هەبووە. ﴿ذِكْرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی بیربکەنەوە، ئێمە ستەمکار نەبووین لە سزادانیاندا. وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾،[4] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین تا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان). وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى الْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ﴾[5]. واتە: وە پەروەردگارت وێرانکەری هیچ شارێك نەبووە هەتا لە شارە گەورە کە(پایتەختەکە)یاندا پێغەمبەرێکی نەناردبێت کە

---

[1] البقرة (٩٦).

[2] الليل (١١).

[3] أحمد (٢٠٣/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الاسراء (١٥).

[5] القصص (٥٩).

ئایه‌ته‌کانی ئێمه‌یان به‌سه‌ردا بخوێنێته‌وه وه ئێمه وێرانکه‌ری هیچ شارێك نه‌بووین مه‌گه‌ر کاتێ خه‌ڵکه‌که‌ی سته‌مکار بووبن.

﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾﴾

**جوبره‌ئیل قورئانی هێناوه‌ته خوارەوه، شه‌یاتین نه‌یهێناوه**

خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ خوای گه‌وره باسی کتێبه پیرۆزه‌که‌ی ده‌کات که هیچ شتێکی پروپوچی تێکه‌ڵاو نابێت نه له کاتی هاتنه‌خواره‌وه‌یداو نه له دوایشدا، وه هیچ که‌سێکیش ده‌توانێ ده‌ستکاری بکات‌و بیگۆڕێت، چونکه له لایه‌ن خوای کارزان و سوپاس و ستایشکراوه‌وه ڕه‌وانه کراوه‌و جوبره‌ئیل هێناویه‌تی که جێی متمانه‌ی خودایه‌و یارمه‌تی ده‌ریه‌تی ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ﴾ واته: شه‌یاتینه‌کان قورئانیان نه‌هێناوه، هه‌رگیز ناشتوانن، له‌به‌ر سێ هۆکار: یه‌که‌میان ئه‌وه کاری ئه‌وان نیه‌و لێشیان ناوه‌شێته‌وه. چونکه سروشتیان وایه که به‌رده‌وام به شوێن خراپه‌کاری‌و چه‌واشه‌و گومڕاکردنی به‌نده‌کانی خودادا ده‌گه‌ڕێن. ئه‌م کاره‌یش فه‌رمان به چاکه‌و به‌رگری کردنی له خراپه تێدایه‌و پڕه له ڕووناکی‌و شاره‌زایی‌و به‌ڵگه‌ی مه‌زن، له نێوان ئه‌وو شه‌یاتینه‌کاندا دژایه‌تی‌و جیاوازیه‌کی زۆر گه‌وره هه‌یه. بۆیه خوای گه‌وره فه‌رموویه‌تی: ﴿وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ﴾ واته: ئه‌گه‌ر لێشیان بهاتایه نه‌یان ده‌توانی بیکه‌ن، خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾[1] واته: ئه‌گه‌ر ئه‌م قورئانه‌مان دابه‌زاندایه بۆ سه‌ر کێوێ (وه تێگه‌یشتنمان بدایه‌تێ) به ملکه‌چی‌و له‌ت له‌ت بوو له ترسی خوا ده‌تبینی. پاشان خوای گه‌وره ڕوونی کردووه‌ته‌وه‌و فه‌رموویه‌تی: ئه‌گه‌ر شایه‌نی ئه‌وه‌ش بوونایه نه‌یانده‌توانی به‌جێی بێنن‌و خۆیان بگه‌یه‌ننه ئه‌و شوێنه، چونکه ڕێیان پێ نه‌دراوه گوێ بگرن بۆ قورئان کاتێك که دێته خواره‌وه بۆ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له‌و کاته‌دا ئاسمان پڕ ده‌بێت له پاسه‌وان‌و ئه‌ستێره کشاوه‌کان، هیچێك له‌و شه‌یاتینانه ناتوانن خۆیان ده‌رباز بکه‌ن‌و ته‌نها پیتێك له قورئان ببیستن، بۆ ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) لێی تێك نه‌چێت، ئه‌مه‌یش له دلۆڤانی خودای مه‌زنه‌و بۆ به‌نده‌کانی‌و پاراستنی په‌یامه‌که‌یه‌تی‌و پشتگیری کتێبه‌که‌ی‌و پێغه‌مبه‌ره‌که‌یی(ﷺ)تێدایه بۆیه فه‌رموویه‌تی: ﴿إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ﴾ واته: به ڕاستی شه‌یتانه‌کان له گوێگرتن به‌رگری کراون. وه‌ك خوای گه‌وره باسی جنۆکه ده‌کات‌و ده‌فه‌رموێت: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا

---

[1] الحشر (٢١).

شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا﴾[1]. واتە: وە ئێمە دەگەڕاین بە شوێن دەنگو باسی ئاسماندا کەچی دیمان پڕ کراوە لە پاسەوانی بەهێزو تیری ئەستێرەکان، وە بێگومان ئێمە جاران دادەنیشتین لە چەند شوێنێك لە ئاسمان بۆ گوێگرتن بەڵام هەر کەسێك لەئێستا بەدواوە گوێ بگرێت تیرێکی ئەستێرە دەبینێ لە بۆسەی دایە، وە بە ڕاستی نازانین ئایا خراپی ویستراوە بۆئەوانەی کە لەسەر زەمین یان پەروەردگاریان ڕێنموونی ویستووە بۆیان.

﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِى ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾﴾

**فەرماندان بە ترساندنی خزمی نزیك**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خودای گەورە فەرمان دەکات کە هەر خۆی بپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن، هەڕەشەی کردووە لەوانەی کە غەیری ئەو دەپەرستن کە ئازار دەدرێن، پاشان فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە خزمە نزیکەکانی خۆی بترسێنێت، ئەوانەی کە زۆر نزیکن لێیەوە، ئاگاداریان بکات کە تەنها بڕوایان بە خودا دەبێتە هۆی ڕزگاربوون‌و فەرمانیشی پێکردووە کە باڵی بەزەیی‌و نەرمونیانی ڕاخات بۆ خاوەنباوەڕان، ئەوانەی شوێنی دەکەون‌و بە دڵی پاك عیبادەتی خودا دەکەن. ئەو کەسانەش سەرپێچی فەرمانی خودا دەکەن وازیان لێ بێنێ و خۆی بەدوور بگرێت لێیان، ئیتر با ئەو کەسە هەرچیەك هەیەو چۆن کەسێکە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: ئینجا ئەگەر سەرپێچیان کردی بڵێ: من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەن. ئەم ترساندنە تایبەتیەی خزمە نزیکەکانی هیچ دژایەتی‌و نکۆڵیەکی نیە لەگەڵ ترساندنی مەردمی جیهاندا چونکە کەس‌و کارەکەی بەشێکە لەو خەڵکە وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ﴾[2] واتە: بۆ ئەوەی گەلێ بترسێنێت (لە سزا) کە باوو باپیرانیان پێشتر نەترسێنراون بۆیە ئەوان بێ ئاگابوون. وە فەرموویەتی:

---

[1] الجن (٨-١٠).

[2] يس (٦).

﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾[1]، واتە: هەروەها بۆئەوەی دانیشتوانی مەككەودەوروبەری ئاگاداركەیتەوەوبیانترسێنی. وە فەرموویەتی: ﴿وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ﴾[2] واتە: بەم قورئانە بترسێنە ئەوانەی دەترسن (لەوەی كە) ڕۆژێك دێت كۆبكرێنەوە لای پەروەردگاریان. وە فەرموویەتی: ﴿لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا﴾[3]، واتە: تا مژدەی پێ بدەیت بە پارێزكارانو لە خواترسان وە ئەو كەسانەی پێ بترسێنیت كە بە سەختی دژایەتیت دەكەن. وە فەرموویەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[4] واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنمو هەر كەسێكی كەش كە ئەم قورئانەی پێدەگات. وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[5]، واتە: وە هەر كەس باوەڕی پێی نەبێت لەو كۆمەڵو تاقمانە (ئەوانەی كۆبوونەوە لەسەر دژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: (سوێند بە كەسەی گیانی منی بە دەستە هیچ كەسێك نیە لەم ئومەتە گوێ بۆ من نەگرێت جوولەكە بێت یان گاور –نصرانی– و باوەڕم پێ نەهێنێ مەگین چووەتە ناو ئاگر)،[6] لە بارەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە فەرموودەی زۆر هاتووە هەندێكی باس دەكەین. لەو فەرموودانە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: كاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە كێوی سەفاو چووە سەری، پاشان بانگی كرد (یا صَبَاحاه) – وتەیەكە بۆ كارێكی زۆر گرنگ بەكاردەهێنرێت– خەڵكی لێی كۆبوونەوە، پیاوی وا هەبوو خۆی دەهاتو پیاوی واش هەبوو كەسێكی خۆی دەنارد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی نەوەی عەبدولموتەلیب ئەی نەوەی فیهر ئەی نەوەی لوئەی ئەگەر هەواڵتان بدەمێ كە كۆمەڵێك سوار لەودیوی ئەو چیاوە دەیانەوێ لە ناكاو بدەن بەسەرتاندا بڕواتان پێم هەیە؟) گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: (بە ڕاستی من ترسێنەرم بۆ ئێوە دەی دەتانترسێنم لە سزای سەختی خودا)، ئەبو لەهەب وتی: خوا هەر ئەمڕۆ لەناوت ببات – عەمرت نەمێنێ – شتی تر نەبوو بانگمان بكەی بۆی ئەمە نەبێت؟ خوای گەورە

---

[1] الانعام (٩٢).
[2] الانعام (٥١).
[3] مريم (٩٧).
[4] الانعام (١٩).
[5] هود (١٧).
[6] مسلم (١/١٣٤).

ئەم سورەتەی نارده خوارەوە: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ﴾[1] تا كۆتایی سورەتەكە. بوخاریو موسلیمو ترمزیو نەسائیش ڕیوایەتیان كردووە.[2] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لەعائیشەوە(ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ: كاتێك ئەم ئایەتە:﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵساو فەرمووی: (ئەی فاتیمەی كچی موحەمەد، ئەی سەفیەی كچی عەبدول موتەلیب، ئەی نەوەی عەبدول موتەلیب، توانای هیچ شتێكم نیە بۆتان لە لای خودا، داوای ماڵی خۆمم لێ بكەن بە ئارەزووی خۆتان).[3] واتە: هەر شتێكتان لە ماڵی خۆم بوێت پێتان دەدەم ٠ تەنها موسلیم ڕیوایەتی كردووە،[4] جارێكی تریش ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە قوبەیسەی كوڕی موخاریقو زوهەیری كوڕی عەمرەوە دەڵێن: كاتێ ئەم ئایەتە ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾ هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە سەر كۆمەڵە بەردێك، لەسەر چیایەك لە بان بەردێ كە لەسەری هەموو بەردەكانەوە بوو بانگی كرد: (ئەی نەوەی عەبدولمەناف، بەڕاستی من ترسێنەرێكم، نموونەی من لەگەڵ ئێوە وەك پیاوێك وایە، دوژمنی دیوە لە شوێنێكی بەرزەوە هاوار دەكات، دەترسێ ئەوانە پێش ئەو بكەونو كارەساتێ ڕووبدات، بۆیە بانگ دەكاتو هاوار دەكات –یا صباحاه–).[5] موسلیمو نەسائیش ڕیوایەتیان كردووە.[6] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ﴾ واتە: لە هەموو كارو فەرمانێكتدا خۆت بە خودا بسپێرە، چونكە دۆستو پشتیوانو یارمەتی دەرو پارێزەرتەو قسەكانیشت سەردەخات ﴿ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتەك چاوی لێتەو گرنگیت پێدەدات، وەك خوای گەورە لە شوێنێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾،[7] واتە: ئارام بگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت ئەوسا بێگومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمەدایت. ئیبنو عەباس دەڵێ: ﴿ٱلَّذِى يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ ئەو خودایە كە تۆ دەبینێ كاتێك هەڵدەستی بۆ نوێژ[8]. عیكریمە دەڵێ: تۆ دەبینێ لە

---

[1] احمد (٣٠٧/١) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦٠٩/٨)، مسلم (١٩٣/١)، تحفة الأحوزي (٢٩٦/٩)، النسائي في الكبرى (٥٢٦/٦).

[3] احمد (١٨٧/٦) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] مسلم (١٩٢/١).

[5] احمد (٦٠/٥) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[6] مسلم (١٩٣/١)، النسائي في الكبرى (٤٢٣/٦).

[7] طور (٤٨).

[8] القرطبي (١٤٤/١٣).

کاتی هەڵسان و ڕکوع و سوجدە بردندا.[1] حەسەن دەڵێ: ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتە: کاتێ کە بە تەنها خۆت نوێژ دەکەی چاوی لێتە. زەحاك دەڵێ: ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ﴾ واتە: لەناو جێگای خەوتن و لە ناو خەڵکدا چاوی لێتە.[2] قەتادە دەڵێ: ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ﴾ واتە: چاوی لێتە لە هەڵسان و دانیشتن لە هەموو هەڵس و کەوتێکتدا.[3] قەتادە دەڵێ: ﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ﴾ واتە: لە کاتی نوێژدا بە تەنها چاوی لێتە و لەناو کۆمەڵیشدا.[4] عیکریمە و عەتای خۆراسانی و حەسەنی بەسریش هەر وایان گوتووە.[5] ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ واتە: قسەی بەندەکانی دەبیستێ و ئاگای لە هات و چۆیانە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ﴾.[6] واتە: وە (ئەی موحەممەد(ﷺ)) تۆ لە هەر مەبەست و کارێکدا بیت وە هەرچی لە قورئان بخوێنی و (ئێوە) هەر کردەوەیەك بکەن بێگومان ئێمە بەسەرتانەوە شایەتین و ئاگادارین کاتێك دەڕۆنە ناویەوە و پێوەی خەریکن.

﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾

### وەڵامدانەوەی درۆ و دەلەسەی موشریکەکان

خوای گەورە ڕووی قسەی دەکاتە ئەو موشریکانەی کە وا دەزانن ئەو قورئانەی کە هاتووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست نیە و شتێکە هەر خۆی لە خۆیەوە دروستی کردووە و هەڵی بەستووە. یانی جنۆکە هاتووە بۆ لای و فێری کردووە. خوای گەورەیش پاکی و ڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون دەکاتەوە بۆیان و درۆ و فیشاڵی ئەوان بەتاڵ دەکاتەوە و ئاگاداریان دەکات کە ئەوە ئەو هێناویەتی هەقە و لە

[1] الطبري (١٩/٤١٢).
[2] الدر المنثور (٦/٣٣٠).
[3] عبدالرزاق (٣/٧٧).
[4] الدر المنثور (٦/٣٣١).
[5] الطبري (١٩/٤١٣).
[6] يونس (٦١).

لایەن خوداوە بۆی هاتووە. فەرمانی ئەوەو وەحی بۆ کردووە، فریشتەیەکی بەڕێزو ئەمین‌و مەزن بۆی هێناوە، لە وێنەی ئەو شەیاتینانە نیە، چونکە شەیاتین شایەنی ئەوە نین کە قورئانی پیرۆزتان پێدا ڕەوانە بکرێت‌و بۆشیان نیە. بەڵکو شایەنی ئەو فاڵچیە درۆزنانەن کە وەك خۆیانن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾، واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی درۆزنی تاوانبار. ﴿أَفَّاكٍ﴾ یانی درۆزن، ﴿ أَثِيمٍ ﴾ بەدفەڕ لە کردار، ئەو کەسەیە کە شەیاتین دەچنە لایان لە فاڵچیەکان‌و ئەوانەشی ڕێڕەوی ئەو درۆزن‌و بەدخو لادەرانە دەگردنەبەر، چونکە شەیاتینەکان خۆیان درۆزن‌و لەڕێ لادەرن ﴿يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ﴾ واتە: گوێ دەگرن لە ئاسماندا زۆربەیان درۆزنن و وتەیەك دەبیستن لە شتە نادیارەکان‌و سەد درۆی پێوە دەلکێنن، پاشان دەیگەیەننە دۆستەکانیان لە مرۆڤ، ئەوانیش باسی دەکەن‌و خەڵکی بڕوا بە هەموو قسەکانیان دەکەن. بە هۆی ئەو تەنها قسە ڕاستەوە کە وەریان گرتووە لە ئاسمانەوە. فەرموودەی سەحیحیش لەو بارەیەوە هاتووە وەك ئەو فەرموودەی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: خەڵکی لەبارەی فاڵچیەوە لە پێغەمبەر (ﷺ)یان پرسی ئەویش فەرمووی: (ئەوانە هیچ نین) واتە متمانە بە قسەیان ناکرێت. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتی وا ئەڵێن ڕاست دەردەچێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوقسەیە ڕاستە جنۆکە دەیدزێ و دەیدا بە گوێی دۆستەکەیدا وەك ئەو مامرەی –مریشك– گارەگار دەکات –مریشکی تر لە خۆی کۆدەکاتەوە– یان وەك چۆن ئاو دەکرێتە دەفری شوشەو دەنگی دێ، زیاترلە سەد درۆ لەگەڵ ئەو قسە ئاوێتە دەکەن)[1]. دیسان بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێ خودا فەرمانێکی دا لە ئاسماندا فریشتەکان باڵەکانیان لە یەك دەدەن‌و سەر دادەنەوێنن. مل کەچ دەکەن –بۆ فەرمایشتەکانی–، وەك ئەوە وایە کە زنجیرێکی ئاسن لە بەردێکی ساف بدەی –کاتێ کە ترسەکە لە دڵیان دەرچوو–، ئەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ ئەوانیش ئەڵێن: حەقی فەرمووە، هەرخۆی بڵندو مەزنە، ئەوانەی قسە دەدزن گوێیان لێیە. ئەوانەی کە قسە دەبەن، ئا بەم شێوەیە بەسەر یەکترەوەن –سوفیان دەستی لە تەنیشت یەك داناو پەنجەکانی لە یەکتر ترازاند– ئەم قسەیەك ئەبیستێت دەیگەیەنێتە خواری خۆی، پاشان ئەوی تر دەیگەیەنێتە خواری خۆی، هەتا دەیگەیەننە سەر زمانی ئەو جادوگەرە یان ئەوفاڵچیە. لەوانەیە گڕێك پێی بگات پێش ئەوەی بیگەیەنێ، لەوانەشە قسەکە بگەیەنێ پێش ئەوەی گڕەکە پێی بگات، لەگەڵ

[1] فتح الباري (١٣/٥٤٥).

ئەو قسەیەدا سەد درۆ دەکات. دەوترێت ئایا ئەوەی پێ نەگوتین لە فلانە ڕۆژو فلانە ڕۆژدا، ئاوای نەگوت؟ خەڵکی بەهۆی ئەو قسەیەی کە لە ئاسمان گوێی لێ بووە بڕوای پێدەکەن. تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە[١]. بوخاری لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (فریشتەکان لەناو هەوردا لە بارەی شتێکەوە قسە دەکەن لەسەر زەمین ڕوودەدات، شەیاتینەکان ئەو قسەیە دەبیسن، دەیدەن بە گوێی ئەو فاڵچیەدا، وەك چۆن ئاو دەکرێتە ناو دەفرەوە دەنگی دێ، سەد درۆی لەگەڵ هەڵدەبەسن[٢].

## وەڵام دانەوەی ئەوانەی کە ئەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) شاعیرە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە یانی: خوانەناسان (شاعیرەکان) تەنها گومڕایانی مرۆڤو جنۆکە شوێنیان دەکەون.[٣] موجاهیدو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریش هەر وایان گوتوە.[٤] عیکریمە دەڵێ: دوو شاعیر قسەی ناشیرینیان بە یەکتری گوتووە -واتە هەجووی یەکتریان کردووە- کۆمەڵێ خەڵکی یارمەتی ئەمیان داوەو کۆمەڵێکی تر یارمەتی ئەویان داوە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردووە: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾،[٥] پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ﴾، واتە: ئایا نابینی کە ئەوانە بە هەموو دۆڵو شیوێکدا بە سەرلێشێواوی دەڕۆن. عەلی کوڕی ئەبو تەڵحە دەڵێ لە ئیبنو عەباسەوە لە هەموو قسەیەکی بێ هودە دەم دەکوتن -واتە هەرزە بێژی دەکەن-[٦]، زەححاك دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە لە هەموو هونەرێکدا قسە دەکەن.[٧] موجاهیدو کەسانی تریش هەروادەڵێن[٨]. ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾ واتە: وە بە ڕاستی ئەوانە شتێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن. عەوفی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە: دوو پیاو لە زەمانی پێغەمبەردا (ﷺ) یەکێکیان لە ئەنصاریەکان بوو ئەوی تریان لە هۆزێکی تر بوو، قسەیان بە یەکرتی دەگوت، هەجوی یەکتریان

---

[١] فتح الباري (٨/٣٩٨).

[٢] البغوي (٣٢٨٨).

[٣] الطبري (١٩/٤١٦).

[٤] الطبري (١٩/٤١٩/٤٢٠).

[٥] الدر المنثور (٦/٣٢٣).

[٦] الطبري (١٩/٤١٧).

[٧] الدر المنثور (٦/٣٢٤).

[٨] الطبري (١٩/٤١٧).

دەکرد، هەر یەکێکیان کۆمەڵێك گومڕاو نەفامی هۆزەکەی لەگەڵ بوو، خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾[1]، مەبەست بەم ئایەتانە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم قورئانەی بۆ ڕەوانە کراوە نە فاڵچیەو نە شاعیریشە، چونکە ژیانو هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر جیاوازو نەگونجاوە لە ژیانو حاڵی فاڵچیو شاعیر لە گشت ڕوویەکەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ﴾[2]، واتە: ئێمە ئەو (موحەمەد(ﷺ)) مان فێری شیعر نەکردووەو شعر وتن شیاوی ئەو نیەو ئەوەی (موحەمەد (ﷺ)) دەیڵێ پەندو ئامۆژگاریو قورئانی ڕوونکەرەوەی (ڕاستی)یە. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ﴾[3]. واتە: وە ئەم (قورئانە) قسەی شاعیر نیە زۆر کەم بڕوا دەهێنن (بە قورئان)، وە قسەی فاڵچی نیە زۆر کەم بیردەکەنەوە، (ئەم قورئانە) نێردراوەتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە.

### جیاکردنەوەی شاعیرانی ئیسلام

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە یەزیدی کوڕی عبداللە ی کوڕی قوسەیتەوە لە ئەبو حەسەنەوە، سالمی بەڕاد مەولای تەمیمی داری، ئەڵێ: وەختێ ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ﴾ هاتە خوارەوە حەسسانی کوڕی سابتو عبداللە ی کوڕی ڕەواحەو کەعبی کوڕی مالیك هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەگریانو دەیانووت: کاتێك خودا ئەم ئایەتەی ناردووەتە خوار زانیویەتی ئێمە شاعیرین، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی تری خوێندەوە: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ واتە: جگە لەوانەیان بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردووە. فەرمووی: (ئەوە ئێوەن) ﴿وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا﴾ واتە: وە یادو زیکری خوایان زۆر کردووە. فەرمووی: (ئەوە ئێوەن) ﴿وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا﴾، واتە: وە تۆڵەی خۆیانیان کردووەتەوە لە پاش ئەوەی ستەمیان لێ کراوە. فەرمووی: (ئەوە ئێوەن). ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو

[1] الطبري (١٩/٤١٦).

[2] يس (٦٩).

[3] الحاقة (٤١-٤٣).

جەریر ڕیوایەتیان کردووە، لە ڕیوایەتی ئیبنو ئیسحاقەوە.[١] بەڵام ئەم سورەتە لە مەککە هاتووە، چۆن دەبێت هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانەی (الشعراء) ئەنساریەکان بن؟ ئەمە جێی تێڕوانینە فەرموودەکەیش لە فەرموودەی مورسەلە (المرسل) پشتی پێ نابەسترێت، والله أعلم. بەڵام ئەم ئیستسنایە –جیاکردنەوەیە– شاعیرە ئەنساریەکانو شاعیرەکانی تریش دەگرێتەوە کە لە چەرخی نەفامیدا قسەیان بە ئیسلامو موسڵمانان گوتووە، پاشان پەشیمان بوونەتەوەو گەڕاونەتەوەو وازیان هێناوە لەو قسانەو ئاکاری چاکیان کردووەو زۆر یادی خودایان کردووە لە باتی ئەو قسە خراپانەی کە کردوویانە، چونکە چاکەکان خراپەکان لادەباتو دەیشواتەوە، پاشان دەستیانکرد بەپیاهەڵدانی ئیسلام و موسڵماناندا لە جێی ئەو قسانە کە بەرامبەر موسڵمانان کردبوویان، وەك عبدالله ی کوڕی زەبعەری (الزِّبعری) کاتێ کە موسڵمان بوو وتی:

يا رسول المليك إنّ لِساني   راتِق ما فتقتُ إذ أنا بور

إذ أجاري الشيطان في سن الا   سيّ، ومن مال ميله مثبور

وە هەر بەو شێوەیە ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسی کوڕی عبدالمطلب لەو کەسانە بوو کە زۆر دوژمنایەتی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد، کە ئامۆزایشی بوو، زۆر قسەی بەرامبەر پێغەمبەر دەکرد(ﷺ) بەڵام دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو، هیچ کەسێك نەبوو خۆشەویستتر بێت لە لای لە پێغەمبەر (ﷺ) وەسفی پێغەمبەری دەکرد (ﷺ) دوای ئەوەی کە قسەی بەرامبەری کردبوو، بوە دۆستو پشتیوانی پاش ئەوەی کە دوژمنایەتی کردبوو. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت: وەڵامی ئەو خوانەناسانەیان دەدایەوە کە قسەیان بە خاوەن باوەڕان گوتبوو.[٢] موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان گوتووە.[٣] وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی بە حەسان: (قسەیان پێ بێژە –عەیبەکانیان هەڵماڵە–) یان فەرموویەتی: (عەیبەکانیان هەڵماڵە جوبرەئیلت لەگەڵ بێت)،[٤] ئیمامی ئەحمەد لەکەعبی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە کە بە پێغەمبەر(ﷺ) وتووە بە ڕاستی ئەوەی کە خودا ناردوویەتی لەبارەی شاعیرەکانەوە ناردوویەتی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان خاوەن باوەڕ جیهاد دەکات –تێدەکۆشێت– بە شمشێرو بە زمانی، سوێندم بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەوەی

---

[١] الطبري (١٩/٤٢٠).

[٢] الطبري (١٩/٤٢٠).

[٣] الطبري (١٩/٤١٩، ٤٢٠).

[٤] فتح الباري (٦/٣٥١).

ئەوانە –پێیان ئەڵێن– وەك تیرباران وایە).[١] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ واتە: وە ئەوانەی ستەمیان کردووە لەمەودوا دەزانن کە چۆن گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا دوای مردن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ﴾.[٢] واتە: ڕۆژێك پاکانەکردنی بێباوەڕان سوودیان پێ ناگەیەنێ. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (دەتانترسێنم لە ناهەقی کردن، چونکە ناهەقی کردن تاریکستانە لە ڕۆژی قیامەتدا).[٣] قەتادە دەڵێ: لەم ئایەتەدا: ﴿وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ لە ناهەقیکاران شاعیران یان غەیری ئەوان دەگرێتەوە.

## تەفسیری سورەتی (النمل)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿طس تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَالَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ ﴿٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَهُمْ سُوءُ الْعَذَابِ وَهُمْ فِي الْآخِرَةِ هُمُ الْأَخْسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى الْقُرْآنَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾﴾

ئەم قورئانە ڕێنیشاندەرو مزگێنیدەرە بۆ خاوەنباوەڕان ولەلایەن خودای مەزنەوە ڕەوانەکراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿طس﴾ لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا باسی ئەم پیتانەمان کرد، ﴿تِلْكَ آيَاتُ الْقُرْآنِ وَكِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ ئەمانە نیشانەکانی قورئانن و کتێبێکی ڕوونو ئاشکران، ﴿هُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: بەهۆی ئەم قورئانەوە ڕێ نیشان دراوەو مژدەیش دراوە بەوانەی کە بڕوایان پێ هێناوەو شوێنی کەوتوونو بە ڕاستیان زانیووەو کاریان کردووە بەوەی تیایدا هاتووە، ﴿الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە نوێژە فەرزەکان دەکەنو ئەو زەکاتەیش لەسەریان واجبە دەیدەنو بڕوای تەواویان بە ڕۆژی دواییو زیندووبوونەوە هەیە پاش مردنو بە تەمای پاداشتی کردەوەکانیانن لە چاکەو خراپەو باوەڕیشیان بە بەهەشتو جەهەنەم هەیە،

---

[١] أحمد (٦/٣٨٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] الغافر (٥٢).

[٣] أحمد (٢/١٠٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ﴾،[1] واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بلێ: قورئان بۆ کەسانێ باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانە وە ئەوانەی باوەڕی پێ نایەنن لە گوێیاندا گرانیو کەڕی هەیە (لە بیستنی حەق).

وە فەرموویەتی: ﴿بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا﴾،[2] واتە: تا مژدەی پێ بدەین بە پارێزکارانو لە خوا ترسان وە ئەو کەسانەی پێ بترسێنی کە بە سەختی دژایەتی (خوا و پێغەمبەر و دین) دەکەن. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ واتە: ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیەو دەزانن ڕوودەدات، ﴿زَيَّنَّا لَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُمْ يَعْمَهُونَ﴾ واتە: ئەو ژیانو هەڵسوکەوتەیانمان لەبەر چاو شیرین کردوونو بۆیان ڕازاندوونەتەوەو مۆڵەتمان داون هەتا لە گومڕاییو سەرلێ شێواوی خۆیاندا بێنو بچن، ئەمەش پاداشتی ئەو بێباوەڕیەیانە لە ڕۆژی دواییدا، وەك خوای گەورە لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾،[3] واتە: وە(کاتی هاتنی موعجیزەکان) دڵو چاویان وەردەگێڕینو لادەدەین (لە باوەڕهێنان) هەروەك لە سەرەتاوە بڕوایان بە قورئان نەهێنا. ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ﴾ واتە: ئەو کەسانە سزای سەخت دەدرێت لە دنیاو لەڕۆژی قیامەتدا، ﴿وَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ﴾ واتە: جگە لەوانە لە ڕۆژی مەحشەردا خەڵکی تر توشی زیانی ماڵیو گیانی نابن –واتە: لە ڕۆژی دواییدا هەرئەوان ڕەنجەڕۆن– خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ﴾ واتە: تۆئەی موحەمەد(ﷺ) فەتادە دەڵێ: ﴿لَتُلَقَّى﴾ واتە: وەردەگری ﴿ٱلْقُرْءَانَ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ عَلِيمٍ﴾ واتە: ئەم قورئانە لە لایەن کارزانێکی زۆر زاناوە، واتە: کارزانە لە ئەمرو نەهیدا زانیاری تەواوی هەیە لە هەموو شتێکدا گەورەو بچووكو دیارو نادیار، هەرچی ئەو فەرمووی هەر ئەوە ڕاستە، هەر بڕیاری ئەویش ڕێكو ڕاستو تەواوە. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ﴾.[4] واتە: وە فەرمانو وتەی پەروەردگارت تەواو بووەو بە ئەنجام گەیشت بە ڕاستیو دروستی کە هیچ کەس ناتوانێ بڕیارو وتەکانی بگۆڕێ.

---

[1] فصلت (٤٤).

[2] مريم (٩٧).

[3] الانعام (١١٠).

[4] الانعام (١١٥).

﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا
نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلْقِ
عَصَاكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ ۚ يَـٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ
ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١﴾ وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ۖ فِى تِسْعِ ءَايَـٰتٍ إِلَىٰ
فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَـٰتُنَا مُبْصِرَةً قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُوا۟ بِهَا
وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾﴾

**بەسەرهاتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) وپاشەڕۆژی فیرعەون**

خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەرەکەی خۆی موحەمەد(ﷺ) و وەبیری دێنێتەوە کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) چی بەسەرهات کاتێ کە هەڵی بژاردو وتووێژی لەگەڵ کردو ئەو نیشانە مەزنانەشی خەڵات کرد کە زۆر گرنگو دوژمن بەزێن بوو، ناردی بۆ سەر فیرعەون و داروودەستەکەی، بەڵام فیرعەون و شوێنکەوتووانی بڕوایان پێ نەکردو سەرپێچییان کرد، خۆیان بەزل دەزانیو شورەییان لێ دەهات کە شوێنی بکەون و ملی بدەنێ، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهْلِهِۦٓ﴾ واتە: وەبیری خۆتی بێنەوە ئەی موحەمەد (ﷺ) وەختێ موسا بە خۆیی و خێزانەکەیەوە بە شەو کەوتنەڕێ و ڕێیان لێ تێك چوو، لە شەوێکی تاریکی نوتەکا، موسا چاوی کەوت بە ئاگرێك لە تەنیشت کێوی تور، واتە: ئاگرێکی بینی شەوقی دەداو بڵێسەی دەهات گوتی بە خێزانی: ﴿إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا سَـَٔاتِيكُم مِّنْهَا بِخَبَرٍ﴾ واتە: ئاگرێکم لێ دیارە دەچم بەرەو ئەو ئاگرە بەڵکو هەواڵێکتان بۆ بێنم ﴿أَوْ ءَاتِيكُم بِشِهَابٍ قَبَسٍ لَّعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ واتە: یان چلۆسکێکی لێ دێنم خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە، ئەوەی موسا گوتی هەروا دەرچوو هەواڵێکی گرنگو ڕووناکیەکی زۆر مەزنی هێنا، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾، واتە: ئینجا کاتێ موسا گەیشتە لای ئاگرەکە بانگی لێکرا: پیرۆز بووە ئەو کەسەی لەناو ئاگرەکەدایەو ئەوەش بە دەوری دایە. یانی کاتێك موسا هاتو نزیك بووەوە ڕووداوێکی زۆر مەزن و گرنگی بینی، بینی ئاگرێك لە درەختێکی سەوزەوە بەرز دەبێتەوە، هەتا بێت ئاگرەگە زیاتر پەرەدەسێنێت، درەختەکەش هەر زیاتر سەوزو جوان دەبێت، پاشان سەری بەرز کردەوە بینی ڕووناکیەکە خۆی گەیاندبووە ئاسمان، ئیبنو عەباس و کەسانی تریش ئەڵێن: ئەوە ئاگر نەبووە بەڵکو ڕووناکیەك بووە دەدرەوشایەوە، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئیبنو عەباسەوە

دەڵێ: ڕووناکی پەروەردگاری جیهان بووە.[1] موسا (سەلامی خوای لێ بێت) تێراماو سەری سوڕما لەوەی کە چاوی پێی کەوت ﴿نُودِىَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِى ٱلنَّارِ﴾ بانگ کرا ﴿بُورِكَ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ: پیرۆزە ئەوەی کە لەوێدایە.[2] ﴿وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ ئیبنو عەباس‌و عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیروحەسەن‌و قەتادە دەڵێن: واتە: لە فریشتەکانیش.[3] واتە: ئەو فریشتانەش کە لەو دەورەن هەر پیرۆزن ﴿وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: پاك‌و بێعەیبی بۆ پەروەردگاری جیهان، کە هەرچی مەیلی لێ بێ دەیکات، هەرچی دروست کراوەکانی هەیە، هیچی لەو ناچیۆ ناشتوانن پێیدا ڕابگەن، هەر خۆی بڵندو مەزنە، هیچ شتێکی لە وێنەی دروستکراوەکانی ناچێت، ئاسمانەکان‌و زەمینش پێیدا ڕاناگەن، بەڵکو خودایەکی تەنیای جێنیازو بێنیازە پاك‌و بێ عەیبەو هاوێنەی نیە لە بوونەوەردا. ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ خوای گەورە موسای ئاگادار کرد کە ئەو کەسەی وتووێژی لەگەڵ دەکات پەروەردگاری خۆیەتی، ئەو خودایەی کە بە دەسەڵاتە، توانا دەدات بە هەموو شتێك‌و باڵادەست‌و زاڵیشە بەسەریدا، کارزانە لە کردارو گفتاریدا. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ﴾ خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە عەساکەی لە دەستی فڕێدا پیشانی بدا وەك بەڵگەیەکی ڕوون کە هەر خودا خاوەنی دەسەڵاتی تەواوە بەسەر هەموو شتێکدا. کاتێك موسا گاچۆنەکەی فڕێدا بە دەستی خۆی، لە پڕ بووە مارێکی زۆر گەورەی ترسناك‌و توندو تیژ بەسەر زەویدا دەخشا، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنٌّ﴾ واتە: ئینجا کاتێك بینی وەك تیرەمار دەجوڵێت، ﴿جَآنٌّ﴾ جۆرێکە لە مار، کە زۆر خێرایە و زۆریش دەجوڵێت، کاتێك موسا ئەوەی بە چاوی خۆی دی، ﴿وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ ڕای کردو لای نەکردەوە لە ترسا، ﴿يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفْ إِنِّى لَا يَخَافُ لَدَىَّ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ واتە: ئەی موسا لەوە مەترسە کە دەیبینی بێگومان پێغەمبەران لای من ناترسن. من دەمەوێ هەڵتبژێرم‌و بتکەم بە پێغەمبەرێکی ڕێ نیشاندەر. وە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسْنًۢا بَعْدَ سُوٓءٍ فَإِنِّى غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: بێجگە لە کەسێك کە ستەمی کردبێت پاشان خراپەیەکی گۆڕیبێت بە چاکە ئەوە بە ڕاستی من لێبوردەی بە بەزەیم، ئەم ئیستسنای مونقەتیعە (إستثناء منقطع) مزگێنیەکی مەزنی تێدایە بۆ مرۆڤ، ئەگەر کەسێك کارێکی خراپی کردبێت پاشان وازی لێبێنێت و پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لای

[1] الطبري (١٩/٤٢٨).

[2] الطبري (١٩/٤٢٨).

[3] الطبري (١٩/٤٢٩)، والمحرر الوجيز (٤/٢٥٠)، الدر المنثور (٦/٣٤١).

خوای گەورەو تەوبە بکات، خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ دەکات وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴾[1]، واتە: وە بە ڕاستی من زۆر لێبوردووم لەو کەسەی تەوبەی کردبێتو باوەڕی هێنابێتو کردەوەی چاکی کردبێت پاشان بەردەوام بووبێت لەسەر ئەو ڕێبازە. وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾[2]، واتە: وە هەر کەسێك کردەوەیەکی خراپ بکات یان ستەم لە خۆی بکات پاشان داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَدْخِلْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ ئەمەیش بەڵگەیەکی ڕوونو نیشانەیەکی ترە لەسەر توانای مەزنی خوای خاوەن دەسەڵات کە مەیلی لە هەر شتێك بێت دەیکاتو ڕاستی ئەو کەسەی کە موعجیزەکەی بۆ وەدی دەهێنێت – چونکە خوای گەورە فەرمانی بە موسا کرد کە دەستی بخاتە ناو باخەڵی کراسەکەی، کاتێك دەستی دەخاتە باخەڵیو دەری دەهێنێت، سپی دەکاتەوەو پرشەی دێ وەك مانگ دەدرەوشێتەوە وەك هەورە بریسکە شەوق دەداتەوە. ﴿فِي تِسْعِ ءَايَـٰتٍ﴾ واتە ئەمە دوو بەڵگەیە لە نۆ بەڵگەی کە کردوومە بە نیشانەو پێم داوی، ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ﴾ بۆ فیرعەونو دارودەستەکەی، کە ئەوانە گەلێکی بێ گوێی نافەرمانن، ئەمە ئەو نۆ بەڵگەیەیە کە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ﴾[3] واتە: وە سوێند بە خوا بە ڕاستی بەخشیمان بە موسا نۆ موعجیزەی ڕوون ئاشکرا. کە لە پێشەوە باسی لێکرا لە شوێنی خۆیدا ﴿فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ ءَايَـٰتُنَا مُبْصِرَةً﴾ واتە: کاتێك بەڵگە ڕوونو ئاشکراو دیارەکانی ئێمەیان بۆ هات، ﴿قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ گوتیان ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە مەبەستیان ئەوە بوو کە بە جادووەکانی خۆیان بەرامبەری بوەستن، بەڵام بەسەر خۆیاندا شکایەوە، سەرشۆڕ بوونو تێکشکان، ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ﴾ واتە: گومانیان نەبوو کە لە لایەن خوداوەیەو ڕاستە بەڵام ناهەقیو لوت بەرزیان ڕێگەی پێ نەدەدان دانی پێدا بنێن بۆیە حاشایان لێ دەکرد، ﴿ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾ واتە: سروشتی شەیتانی زاڵ بوو بەسەریاندا ستەمکار بوونو خۆیان بە زل دەزانیو شوێنی هەق نەدەکەوتن بۆیە خوای گەورە

---

[1] طه (٨٢).

[2] النساء (١١٠).

[3] الاسراء (١٠١).

دەفەرمووێت: ﴿فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ) بڕوانەو سەیری پاشەڕۆژی ئەوان بکە چۆن خودا قڕی کردن‌و هەمووی خنکاندن لە بەرەبەیانێکدا، مەبەست لەم باسە ئەوەیە خوای گەورە دەفەرمووێت ئەی ئەو کەسانەی بڕوا ناهێنن بە موحەمەد(ﷺ) و حاشا دەکەن لەوەی کە بۆی هێناون لە لایەن خوداوە، بترسن ئەوەی کە بەڵایەکی لەوە خراپترتان بۆ بێت، چونکە موحەمەد (ﷺ) مەزنترو بەڕێزترە لە موساو (سەلامی خوای لێ بێت) بەڵگەکانیشی بەهێزترە لە بەڵگەکانی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)، بە هۆی ئەو بەڵگانەی کە خودا لە بارەیەوە داویەتی کە نیشانەی بوونی خۆیەتی‌و ڕەوشتەکانیەتی‌و ئەو مژدانەش کە پێغەمبەران لە پێشەوە داویانە لە بارەیەوەو وەرگرتنی پەیمان لەسەری بۆی لە لایەن پەروەردگاریەوە.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾ وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ
دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ
لِسُلَيْمَٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ
رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ
فِى عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩﴾ ﴾

خوای گەورە باسی ئەو هەموو بەهرەیە دەکات کە ڕشتویەتی بەسەر بەندەو پێغەمبەری خۆیدا کە داودو سولەیمانی کوڕیەتی (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەو بەهرە چاکو زانیاریە کەم وێنەو ڕەوشتە جوانانەی کە بەختەوەری دنیاو دواڕۆژیشی وەدەست هێنابوو بۆیان، خاوەنی شکۆو دەسەڵاتی تەواو لە دنیاداو پێغەمبەریەتی‌و پەیامیش بۆ ئاین پەروەری‌و ڕەزامەندی خودا لە قیامەتدا بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: سوێند بە خوا زانستمان بە داودو سولەیمان بەخشی هەردووکیان وتیان: هەموو سوپاس‌و سەنایە بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی داوین بەسەر زۆر لە بەندە باوەڕدارەکانیدا. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾ واتە: سولەیمان بووە میراتگری داودی باوکی لە دەسەڵاتو پێغەمبەریشدا، مەبەست پێی میراتگری ماڵ‌و سامان نیە، خۆ ئەگەر وا بووایە ئەم میراتگریە تایبەت نەدەبوو بۆ سولەیمان لە نێوان هەموو کوڕەکانیدا، کە داود سەد خێزانی هەبوو، بەڵکو مەبەست بەو میراتگریە دەسەڵاتی دنیاو پێغەمبەریەتی بوو، چونکە پێغەمبەران ماڵیان بە میرات نابرێت وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێت ئەوەی بەجێی دەهێڵین

سەدەقەیە)،[1] ﴿وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾، واتە: سولەیمان وتی ئەی خەڵکینە فێری زمانی باڵندەکان کراوین وە لە هەموو شتێکمان پێدراوە. یانی سولەیمان باسی ئەو بەهرانە دەکات کە خودا پێی بەخشیوە، لەو هەموو دەسەڵاتو جێنشینە مەزنە، ئەوەبوو مرۆڤو جنۆکەو باڵندەکان ڕام کرابوون بۆیو بەرفەرمانی بوون، زمانی پەلەوەرو (مەل) و گیانەوەرەکان فێر کرابوو کە ئەمە شتێك بوو بە هیچ کەسێك نەدرابوو، ئەوەی کە ئێمە لێی بە ئاگا بین‌و خوای گەورە باسی کردبێت بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، خوای پاكو بێعەیب سولەیمانی فێری ئەوە کردبوو لە زمانی باڵندەکانی ئاسمان بگات، وە فێری زمانی گشت گیانەوەری کردبوو بە جیاوازی هەموو جۆرەکانیەوە بۆیە وەك خوای گەورە دەفەرمووێت ڕایگەیاندووە کە: ﴿عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ﴾ یانی لە ئەو شتانەی کە پێویست بێت بۆ کاری فەرمانڕەوایی ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە: ئەمانە هەمووی ڕێزی خودایە بەسەر ئێمەوەو دیارو ئاشکرایە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحُشِرَ لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ واتە: سولەیمان لەشکرەکەی کۆکردەوە کە پێك هاتبوو لە جنۆکەو مرۆڤو باڵندە بە ڕیز وەستابوون‌و خۆی لە پێش خەڵکەکەوە بوو بە قەدرو ڕێزێکی زۆرەوە، خەڵکەکە لە پشتیەوە بە ڕیز دەچوون‌و جنۆکەش بە دوای ئەواندا بە هەمان شێوە باڵندەکانیش لە لای سەریەوە بوون، لە کاتی گەرمادا بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ دەکرد، ﴿فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ بە ڕێز دەوەستان‌و کەس پێشی کەسی تر نەدەکەوتو هەر کەسەو شوێنی خۆی بۆ دیاری کرابوو، موجاهید دەڵێ: لەسەر هەموو ڕیزێك کەسێك دانرابوو سەرپەرشتی دەکرد، هەتا کەس پێشی کەس نەکەوێت‌و لە ڕیز لانەدەن، وەك چۆن فەرمانڕەوایانی ئەمڕۆ پێی هەڵدەسن[2]. ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ﴾ واتە: وەختێ سولەیمان لەگەڵ لەشکرو سەربازەکانیدا لەبەردەم دۆڵی مێرووولەکاندا دەڕۆیشت‌و تێدەپەڕی ﴿قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟ مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: مێرووولەیەك وتی: ئەی مێرووولەکان بڕۆنە ناو ماڵەکانی خۆتان (کونەکانتان) با سولەیمان‌و لەشکرەکەی نەتاجلیقێنن (لە ژێر پێیاندا) لە کاتێکدا ئەوان هەست ناکەن. سولەیمان گوێی لە قسەکانی بوو (سەلامی خوای لێ بێت)، ﴿فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾، ئینجا سولەیمان زەردەخەنەیەکی کرد لە قسەی ئەو مێرووولەو

---

[1] تحفة الأحوزي (٥/٢٣٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الطبري (١٩/٥٠٠، ٥٠١).

وتی: ئەی پەروەردگارم وام لیٚ بکە سوپاسی ئەو بەهرانەت بکەم کە پێت بەخشیوم لەوانە: فێربوونی زمانی باڵندەو گیانەوەران، وە ئەو بەهرانەی کەبە دایكو بابمت بەخشیوە و بە موسڵمانی وەدی هێناوەو بڕوایان پیٚ هێناوی ﴿وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ﴾ واتە: وابکەئاکارێك کەتۆپێت خۆشەولێی ڕازیت بەجێی بهێنم، ﴿وَأَدۡخِلۡنِي بِرَحۡمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتەك وەختیٚ گیانم دەکێشی بمکەیەنی بە عەبدە چاکەکانت ئەوانەی کە دۆستی خۆتن.

﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابٗا شَدِيدًا أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ أَوۡ لَيَأۡتِيَنِّي بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٢١﴾﴾

### دیارنەبوونی پەپوسولەیمانە

موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش گوتوویانە: لە ئیبنو عەباسو غەیری ئەمیشەوە: پەپوسولەیمانە ئەندازیار بووە -مهندس- ئاوی پیشانی سولەیمان دەدا وەختیٚ لە چۆڵەوانیەکدا بووایە پێویستی بە ئاو بوایە، دەگەڕا بۆ ئاو بۆی لە ژێر زەمیندا، وەك چۆن کەسێك لەسەر زەمیندا شتیٚ دەبینیٚ، دەیزانی ئەو ئاوە چەندیٚ لەسەر زەمینەوە دوورە، شوێنەکەی پیشان دەداو دیاری ئەکرد، سولەیمانیش (سەلامی خوای لیٚ بێت) فەرمانی دەدا بە جنۆکەکان ئەو شوێنە هەڵکۆڵن هەتا ئەو ئاوە لە ناویدا دەردەکەوێت، ڕۆژێك سولەیمان لە چۆڵەوانیەکدا بوو، باڵندەکانی بەسەرکردەوە، پەپوسلێمانەی بەرچاو نەکەوت. ﴿وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ فَقَالَ مَالِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ﴾ واتە: چاوی بە باڵندەکاندا گێڕا فەرمووی: چیە پەپوسلێمانە نابینم، ئایا خۆی شاردۆتەوە؟ ڕۆژیٚ عبدالله ی کوڕی عەباس لە بارەی پەپوسلێمانەوە ئەدوا، لەناو ئەو خەڵکەدا پیاوێکی خەواریجی -ناوی نافیعی کوڕی ئەزرەق بوو- زۆر ڕەخنەی لە ئیبنو عەباس دەگرت، وتی بە ئیبنو عەباس: بوەستە ئەمڕۆ سەرکەوتوو نەبووی - ژێرکەوتوو بووی - گوتی: بۆچی؟ گوتی: تۆ باسی پەپوسلێمانە دەکەی کە لە ژێر زەمیندا ئاو دەبینیٚ کەچی منداڵ دانەوێڵە دەکاتە ناو داوێکەوە و خۆڵی دەکات بەسەرداو پەپوسلێمانە دێت بۆ ئەوەی دانەوێڵەکە بخوات دەکەوێتە داوگەکەوە منداڵەکە دەیگرێت، ئیبنو عەباس گوتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە ئەم پیاوە دەڕواو ئەڵیٚ: ڕەخنەم گرت لە ئیبنوعەباس، منیش وەڵامم نەبووە بۆی وەڵامم نەدەدایەوە. پاشان پێی گوت: (ويحك إنه إذا نزل القدر عمي البصر و ذهب الحذر) واتە: ئەی هاوار بۆ تۆ، کاتیٚ کە بڕیاری خودا دابەزی چاو کوێر دەکاتو خۆ لادانیش نامێنیٚ، نافیع گوتی: سوێند بە خوا هەرگیز جارێکی تر مشتو مڕت لەگەڵ ناکەم

له هیچ شتێکدا لەبارەی قورئانەوە.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ واتە: سوێند بە خوا سزایەکی بە تینی دەدەم، ئەعمەش دەڵێ: لە مینهالی کوڕی عەمرەوە ئەویش لە سەعدەوە و ئەویش لە ئیبنوعەباسەوە ئەگێڕێتەوە: سزادانەکە یانی: پەڕەکەی لێ دەکاتەوە[2]. عبدالله ی کوڕی شەداد دەڵێ: دەرهێنانی پەڕەکانیو لەبەرخۆر دانانی.[3] زۆرێك لە زانایانی پێشینەش ئەڵێن: پەڕ لێکردنەوەو لەبەر خۆردانانی تا مێرووولەی زۆر بچووكو گەورەکانیش بیخۆن، ﴿أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ﴾ یان دەیکوژم ﴿أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ یان نیشانەیەکی دیارو ئاشکرام بۆ بێنێ، سوفیانی کوڕی عویەینەو عبدالله ی کوڕی شەداد، دەڵێن: کاتێك کە پەپوسلێمانە هاتەوە مەلەکان پێیان گوت: چی دوای خستی؟ سولەیمان خوێنی حەڵاڵ کردووی، واتە: دەوکوژێت، پەپوسلێمانە گوتی: ئایا مەرجی دانەناوە، گوتیان: بەڵێ: گوتی: ﴿لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَاْذْبَحَنَّهُۥٓ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ پەپوسلێمانە گوتی: کەواتە ڕزگارم بووە.

﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾﴾

پەپوسلێمانە لەبەر دەست سلێماندا و هەواڵ هێنانی لە بارەی سەبەئەوە خوای گەورە باسی پەپوسلێمانە دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ﴾ واتە: ماوەیەکی کەم دواکەوتو ئامادە نەبوو کاتێك سلێمان سوپاکەی کۆکردەوە پەپوسلێمانەی بەرچاو نەکەوتو هەڕەشەی لێکرد، پاشان هاتو گوتی: بە سلێمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ﴿فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ﴾ واتە: من ئاگاداری هەندێ شتم کە تۆو لەشکرەکەیشت لێی بێ خەبەر بوون، ﴿وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ﴾ واتە: من لە سەبەئەوە هاتووم هەواڵێکی ڕاستو دروستو دڵنیام بۆ هێناوی، (سەبەء) واتە: حیمیریەکان ئەوانەی کە سەرۆکی یەمەن بوون، پاشان پەپوسلێمانە گوتی: ﴿إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً

[1] القرطبي (١٣/١٧٧/١٧٨).
[2] الطبري (١٩/٤٤٣).
[3] الطبري (١٩/٤٤٣).

تَمْلِكُهُمْ﴾ من ژنێکم دی پاشایان بوو، حەسەنی بەسری دەڵێ: ئەو ژنە بەلقیسی کچی شەراحیلی پاشای سەبەئە[1]. ﴿وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ﴾ هەموو شتێکی پێدراوە، واتە: پێویستی بە هەر شتێك هەبێت بۆ دامەزراندنو بەڕێوەبردنی ولاتەکەی هەیەتی، ﴿وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: ئەو تەختەی کە لەسەری دادەنیشێت زۆر گەورەیەو ڕازاوەیە بە زێڕو زیو هەموو جۆرە خشڵو مرواریەکی گران بەها، زانایانی مێژووناس ئەڵێن: ئەو تەختە لەناو کۆشکێکی زۆر گەورەو بەرزدا بوو، زۆر قایم دروست کرابوو، سێ سەدو شەست پەنجەرەی تێدا بوو لە خۆرهەڵاتەوە بەرامبەری ئەو پەنجەرانە سێ سەدو شەست پەنجەرەی لە خۆرئاواشەوە تێدا بوو، بە شێوەیەك ئەو کۆشکە دروست کرابوو کە خۆر هەموو ڕۆژێك لەو پەنجەرانەوە دەچووە ژوورەوە، لە پەنجەرەکانی بەرامبەرەوە خۆر ئاوا دەبوو لەناو کۆشکەوە دیار بوو، ئێواران و بەیانیان سوژدەیان بۆ دەبرد، بۆیە گوتی: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە: دیم کە خۆیو گەلەکەی کڕنووش بۆ خۆر دەبەن لە جیاتی سوژدە بردن بۆ خوا، شەیتان کردارەکانی لەبەرچاو شیرین کردوون و لەڕێی ڕاست ترازاندوونی، ﴿فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ﴾ سەری لێ شێواندوون و سەردەرناکەن ﴿أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ﴾ واتە: ئەو سوژدە بردنە بۆ خۆر وای لێکردوون کە سوژدە بۆ خوای گەورەو تەنیا نەبەن، شەیتان کردارەکانی لەبەرچاو شیرین کردووون و لە ڕێی ڕاست لای داون و ناچنە سەری، شارەزای ڕێی ڕاست نابن و نازانن کە دەبێت تەنها سوژدە بۆ خوا ببەن و وازبێنن لە پەرستنی ئەستێرەکان و هەر شتێکی تر. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾[2]، واتە: لە نیشانەکانی (دەسەڵاتی) خوایە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ سوژدە مەبەن نەبۆ خۆرو نە بۆ مانگ بەڵکو سوژدە بەرن بۆ ئەو خوایەی ئەوانی بەدی هێناوە ئەگەر ئێوە تەنها ئەو دەپەرستن. ﴿ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو خودایەی کەشاراوەکانی ناو ئاسمانەکان و زەوی ئەخاتەسەر. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە: ئاگاداری هەموو نهێنیەکانی ناو ئاسمانەکان و زەمینە[3]. عیکریمەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو کەسانی

[1] الدر المنثور (٦/٣٥١).

[2] فصلت (٣٧).

[3] الدر المنثور (٦/٣٥٢).

تریش هەر وایان گوتووە[1]. ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾ واتە: ئاگای لەو شتانەیە کە عەبدەکانی دەیشارنەوە یان بە ئاشکرا دەیکەن لە کردارو گفتاریاندا، وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ﴾[2]، واتە: یەکسانە (بۆ خوا) ئەوەتان بە نهێنی قسە بکات وە ئەوەتان بە ئاشکرا (قسە) بکاتو وە ئەوەی لە شەودا خۆی دەشارێتەوەو ئەوەی لە ڕۆژدا دەردەکەوێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾ واتە: تەنها هەر هانا بۆ خودا دەبرێتو بانگ لەو دەکرێت غەیری ئەو هیچ کەس بۆ پەرستن نابێ و پەروەرێنی تەختی هەرە گەورەیەو لەناو دروستکراوەکانیدا لە هەموو مەزنترە، لەبەر ئەوەی پەپوسلێمانە بانگخواز بوو بۆ چاکەو پەرستنی خودا بە تەنهاو سوژدە بردن بۆی، ئەو دڵسۆزیەی نەیهێشت بکوژرێت، وەك ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو ئیبنوماجەش ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لە کوشتنی چوار شت لە گیانەوەران مێرووڵەو هەنگو پەپوسلێمانەوصورەد مەلێکی سەر زلی سنگ سپی پشت سەوزە، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی ڕاستە[3].

﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾﴾

### نامەی سولەیمان بۆ بەلقیس

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە سولەیمان چی گوت بە پەپوسلێمانە کاتێ کە هەواڵی خەڵکی سەبەء پاشاکەیانی بۆ هێنا، ﴿قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ واتە: ئێمە لێکۆڵینەوە دەکەین تا بزانین ڕاست بێژی لەم هەواڵەدا هێناوتە، ﴿ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ﴾ یان تۆش هەر لە درۆزنانی دەتەوێ بەو قسەیە خۆت ڕزگار بکەی لەو بەڵێنەی کە پێم داوی (واتە: لە کوشتن)، ﴿ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ﴾، واتە: ئەم نامەی منیان بۆ بەرەو فڕێی دە بۆیان پاشان دوورکەوەرەوە لێیان ئینجا سەرنج بدە چ وەڵامێك دەگەڕێنەوە. چونکە سلێمان

---

[1] الطبري (١٩/٤٤٥)، عبدالرزاق (٣/٨١)، الدر المنثور (٦/٣٥٢)..

[2] الرعد (١٠).

[3] أحمد (١/٣٣٢)، أبو داود (٥/٤١٨)، ابن ماجه (٢/١٠٧٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

نامەیەکی نووسیبوو بۆ بەلقیس و گەلەکەی و نامەکەی دابوو بە پەپوسلێمانە، هەندێ ئەڵێن نامەکەی نابووە ژێر باڵی، هەندێکی تریش ئەڵێن بە دەنووکی هەڵی گرتبوو، بردی بۆ ئەو وڵاتەو چووە کۆشکی بەلقیس، ئەو شوێنەی کە بەلقیس خۆی بە تەنها لەوێ دەمایەوە. لە کلاو ڕۆژنەیەکەوە کە لەوێدا بوو بۆی خستە خوارەوەو نامەکە کەوتە بەردەستی. پاشان پەپوسلێمانە لە لایەکی ترەوە وەك ڕێزلێنانێك بۆ بەلقیس خۆی کەناردا و چاوەڕوانی دەکرد. بەلقیس زۆر سەری سوڕما لەو کارەساتەو ترسی لێ نیشت، پاشان نامەکەی هەڵگرت و کردیەوەو خوێندیەوە ئەمەی تێدا نووسرابوو: ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾ ئەمە لەسولەیمانەوەیە و بەناوی خواوە بڕیار دەردەکات و پێویستە بە موسڵمانی بێنەلام بەلقیس دوای خوێندنەوەی نامەکە وەزیرو کاربەدەست و گەورە پیاوانی کۆکردەوە پێی گوتن: ﴿قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَـٰبٌ كَرِيمٌ﴾ ئەی پیاو ماقوڵەکان! نامەیەکیان بۆ هاوێشتووم زۆر گرنگە – مەبەست لە گرنگی نامەکە ئەوە بوو کە زۆر بە لایەوە سەیر بوو کە مەلێك بۆی هێناوەو خستوویەتیە بەردەمی و بەڕێزێکەوە لە دوورەوە چاوەڕوان دەکات، ئەمە کارێکە هیچ پاشایەك لە دەستی نایە کارێکی وا بکات، پاشان نامەکەی بۆ خوێندنەوە: ﴿إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾ واتە: ئەم نامەیە لە سلێمانەوەیەو بە ناوی خوای بەخشندەو دلۆڤانەوەیە، خۆتان بە زل مەگرن و بێن و خۆتاە بە دەستەوە بدەن – واتە: موسڵمان ببن – بۆیان دەرکەوت کە ئەو نامەیە لە پێغەمبەر سولەیمانەوە بۆیان هاتووەو ناتوانن بچن بە گژیداو شەڕی لەگەڵ بکەن. نامەیەکی زۆر کورت و پڕ مانا بوو، بە جوانی و سوك و ئاسانی مەبەستەکەی بۆ باس کردبوون، ﴿أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ﴾ قەتادە دەڵێ: خۆتان بە گەورە تر مەگرن لەمن و﴿وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾[1] (عبدالرحمن)ی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: جوابم مەکەن و خۆتان بە زلتر مەزانن لە من﴿وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ﴾ وەرن بۆ لام و موسڵمان ببن[2].

﴿قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾

---

[1] الدر المنثور (٦/٣٥٤).

[2] الطبري (١٩/٤٥٣).

## ڕاوێژکردنی بەلقیس لەگەڵ دارودەستەکەیدا

کاتێك بەلقیس نامەکەی خوێندەوەو پرس‌و ڕای کرد بە دارودەستەکەی لەو بارەیەوە کە چی بکەن بۆیە گوتی: ﴿قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ﴾ واتە: بەلقیس وتی: ئەی سەرۆك‌و ئەشرافەکان! دەربارەی ئەم کارە ڕای خۆتانم پێ بڵێن هەتا ئێوە دانەنیشن‌و تووێژ بکەین من هیچ شتێك ناکەم، ﴿قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ﴾ واتە: منەتیان کرد بەسەر بەلقیسداو گوتیان ئێمە خاوەنی هێزێکی زۆرو زۆریش ئازاو بەجەرگین، کارەکەشیان دایە دەستی خۆی کەچی دەکات مەیلی خۆیەتی، ﴿وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ﴾ واتە: وە فەرمان‌و بڕیاریش بە دەستی تۆیە، ئێمە هیچ کێشەیەکمان نیەو بە لامانەوە ئاسانە، دەتەوێ بڕۆی‌و شەڕی لەگەڵ بکەی ئامادەین، ئارەزووی خۆشتە چی دەکەی گوێڕایەڵی فەرمانتین ئیبنو عەباس دەڵێ: بەلقیس گوتی: ﴿قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً﴾ واتە: وتی: بە ڕاستی پاشایان هەر کاتێك بە زۆر چوونە شارێکەوە خراپ‌و وێرانی دەکەن وە دەسەڵاتدارەکانی ئەو شارە ڕیسواو سەرشۆڕ دەکەن. پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ﴾ واتە: وە هەر بەو جۆرە دەکەن،[1] پاشان بەلقیس ڕای هاتە سەر ئەوەی کە ڕێ بکەوێت و بە وتووێژو ئاشتی کێشەکە چارەسەر بکات. بۆیە گوتی: ﴿وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ﴾ واتە: دیاریەکی بۆ دەنێرم کە شایستەی ئەو بێت، تا بزانم وەڵامی چیەو دەیەوێ چی بکات، سا بەڵکو قبوڵی بکات‌و وازمان لێ بێنێ یان باجێکمان لەسەر دابنێت هەموو ساڵێك بۆی بەرین‌و دوانەکەوین، بۆ ئەوەی وازمان لێ بێنێت‌و شەڕمان لەگەڵ نەکات، قەتادە دەڵێ: چەند ئافرەتێکی ژیر بووە لە کاتی موسڵمانیداو لە کاتی موشریکیشدا. دەیزانی کە دیاری ناردن جێی تایبەتی خۆی هەیە لای هەندێ کەس، ئیبنو عەباس‌و کەسانی تریش گوتویانە: بەلقیس گوتی: بە گەلەکەی ئەگەر دیاریەکەی وەرگرت ئەوە پاشایەو شەڕی لەگەڵ بکەن، خۆ ئەگەر قبوڵیشی نەکرد ئەوە پێغەمبەرەو شوێنی کەون.[2]

﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾

---

[1] الطبري (١٩/٤٥٥).

[2] الطبري (١٩/٤٥٥).

**دیاریەکەو وەڵامی سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)**

زۆرێك لە زانا پێشینەکانی تەفسیرو کەسانی تریش باسیان کردووە کە بەلقیس دیاریەکی گەورەی لە زێڕو زیوو شتی گرانبەهای تری نارد بۆ سولەیمان. بەڵام ئەو هەر سەیری دیاریەکانیشی نەکردو هیچ گرنگیەکی پێنەداو پێی ناخۆش بوو، بۆیە ناڕەزایی دەربڕی لەسەر ناردنی ئەو دیاریانە وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ﴾ واتە: ئینجا کاتێك نێردراوەکە هاتە لای سولەیمان، (سولەیمان) گوتی: ئێوە گەرەکتانە بە ماڵ من ڕازی بکەن‌و لەسەر بتپەرستی‌و فەرمانڕەوایی خۆتان بمێننەوەو وازتان لێ بێنم؟ ﴿فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم﴾ واتە: ئەوەی کە خوا بە منی داوە لە دەسەڵات‌و ماڵ‌و لەشکر زۆر چاکترە لەوەی کە ئێوە هەتانە، ﴿بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ﴾ بەڵکو وا دیارە ئێوە زۆر دڵخۆشن بەو دیاریەی خۆتان‌و حەزتان لە دیاریە، بەڵام من ڕازی نابم لێتان یان دەبێ موسڵمان بن یان شمشێر -واتە جەنگ- بۆیە گوتی: وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ﴾ بە دیاریەکەوە بگەڕێنەوە لایان ﴿فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا﴾ واتە: بە لەشکرێکەوە بۆیان دەچین کە ئەوان ناتوانن بەرامبەری بوەستن‌و دژی شەڕ بکەن. ﴿وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً﴾ واتە: لە وڵاتی خۆشیان دەریان دەنێین بە زەلیلی، ﴿وَهُمْ صَـٰغِرُونَ﴾ واتە: سەرشۆڕو زەلیل دەبن، وەختێ نمایندەکەی بەلقیس بە دیاریەکەوە گەڕایەوە بۆ لای، قسەکانی سولەیمانی بۆ گێڕایەوەو قسەکانی بیست خۆشی‌و گەلەکەیشی خۆیان دا بە دەستەوەو ڕازی بوون، لەگەڵ لەشکرەکەیدا بەرەو سولەیمان کەوتەڕێ‌و سەری دانەواندو بڕیاری دا موسڵمان بێت‌و شوێنی سولەیمان بکەوێ، کاتێك سولەیمان بەوەی زانی کە بەڕێوەن‌و دێن بۆ لای ئەو زۆر کەیفی پێهات‌و دڵخۆشی کرد.

﴿قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ
مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا
رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى لِيَبْلُوَنِىٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ
رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾

**ئامادەکردنی تەختی بەلقیس لە چاوتروکانێکدا**

موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە یەزیدی کوڕی ڕومانەوە ئەگێڕنەوە کە وتوویەتی: کاتێك کە نمایندەکانی بەلقیس گەڕانەوە بۆ لای‌و قسەکانی سولەیمانیان بۆ باس کرد، گوتی: سوێند بە خوا خۆم زانیم ئەمە پاشا نیەو ناتوانین بەرامبەری بوەستین‌و هیچ وەختێکیش خۆمان بە زل نازانین بەسەریدا،

ناردوومە بۆ لای کە من دێم بۆ لات بە هەموو سەرکردەکانی هۆزەکەمەوە، تا بزانین فەرمانت چیەو چیمان پێ دەڵێی لە بارەی ئاینەکەتەوە، پاشان فەرمانی دا ئەو تەختەی کە لەسەری دادەنیشت کۆی بکەنەوە کە ئاڵتونی پڕ لە یاقوتو زەبەرجەدو مرواری تێدا بوو، خستیانە حەوت هۆدەوە کە بە دەم یەکەوە بوون دەرگاکانیان قفڵ کردنو پاشان بەو کەسەی ووت کە داینا لەسەرماڵو کۆشکەکەی، ئاگاداری ئەم شتانەبێت کە لێرەیە بە تەختی پاشاکەیشەوە، هیچ کەسێك نەچێت بە دەوریداو پیشانی کەسی نەدەی تا دێمەوە لات، پاشان بەرەو سولەیمان کەوتەڕێ لەگەڵ دوانزە هەزار سەرۆك لە سەرۆکەکانی یەمەن هەریەکە لەوانە بە هەزارەها سەربازی لە ژێر دەستدا بوو، سولەیمانیش بەردەوام هەموو شەوو ڕۆژێك جنۆکەی دەنارد هەواڵی بەلقیسی بۆ بێنێو گەیشتووەتە کوێ، کاتێك کە نزیك بوونەوە، ئەوەی لای بوون لە مرۆو جنۆکە کە لەبەر دەستیدا بوون پێی گوتن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ﴾ واتە: سولەیمان وتی ئەی دەستەی ئەشرافەکان کامتان تەختە پادشایەکەیم بۆ دێنن پێش ئەوەی بە ملکەچی بێن بۆ لام.[1] ﴿قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾ موجاهید دەڵێ: زەبەلاحێك -گەورەو بەهێز- لە جنۆکە. ئەبو سالح دەڵێ: بە ئەندازەی کێوێك دەبوو.[2] ووتی: ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ: من پێش ئەوەی لە جێی خۆت هەڵسی بۆت دەهێنم.[3] سودیو کەسانی تریش دەڵێن: سولەیمان دادەنیشت وەك قازیەك بۆبەڕاگەیشتنی کاروباری خەڵکیو کاری فەرمانڕەوایی و نانخواردن لە بەیانیەوە هەتا خۆر ئاوا دەبووەوە. ﴿وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ:واتە: گوتی: من زۆر بەهێزم بۆ هەڵگرتنی ئەو کۆشکەو دەست پاکێشمو خەیانەت ناکەم لەو خشڵو زیوەی کە تێیدایە، سولەیمان گوتی: دەمەوێ لەوە پەلەتر -زووتر- بێتو ئامادە بکرێت.[4] لێرەدا وادەردەکەوێت سولەیمان دەیەوێ بە ئامادەکردنی ئەو تەختەی بەلقیس، دەسەڵاتی خۆی نیشان بداو دەربخات، لەو دەسەڵاتەی کە خوا پێی بەخشیوەو لەو لەشکرەی کە بۆی ڕام هێناوە کە لە پێشا بە کەسی نەداوەو لەمەودواش بە کەسی تری نادات، بۆ ئەوەی بیکاتە بەڵگەیەك لەسەر پێغەمبەرێتی خۆی لای بەلقیسو هۆزەکەی. چونکە ئەو کارە موعجیزەیەکی زۆر مەزن بوو کە ئەو تەختەی بەلقیس وەك خۆی چۆن بووە لە وڵاتەکەیدا وا بیهێنێ. پێش ئەوەی بگەنەلای سولەیمان. چونکە بەلقیس دەرگای تەختەکەی کشت داخستبوو پاسەوانیشی

---

[1] الطبري (٩/٥٢٠).

[2] الدر المنثور (٦/٣٥٩).

[3] البغوي (٣/٤٢٠).

[4] البغوي (٣/٤٢٠).

بە دیارەوە دانابوو، کاتێك سولەیمان گوتی: دەمەوێ زووتر ئەو تەختە بێت، ﴿قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە: ئەوەی زانستی لە کتێبی ئاسمان لابوو وتی. ئیبنو عەبباس دەڵێ: ئەو کەسە ئاسەفی (آصَف)ی کاتبی سولەیمان بوو، هەر بەو شێوەیەش موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە یەزیدی کوڕی ڕومانەوە کە ئەو کەسە ئاسەفی کوڕی برخیا بوو، ئاصەفی کوڕی بەرخیا پیاوێکی زۆر ڕاستگۆبووە، ئیسمی ئەعزەمی – ناوە هەرە مەزنەکانی خوای – زانیووە.[1] قەتادە دەڵێ: خاوەن باوەڕێك بووە لە مرۆڤ ناوی ئاسەف بووە. ﴿أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾ واتە: چاو بەرز کەرەوەو تەماشاکە بەو ئەندازەی چاوت بڕ دەکات، چاو داخە ئەو تەختە لەبەر دەمتدایە، پاشان ئاسەف هەڵساو دەست نوێژێکی هەڵگرتو لە خوای گەورە پاڕایەوە. موجاهید دەڵێ: ئاسەف گوتی: (یا ذالجلال والاکرام)،[2] ﴿فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ﴾ واتە: کاتێك سولەیمانو ئەو خەڵکەی لە دەوری بوون بە چاوی خۆیان دیان تەختەکە لە لایانە ﴿قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّى﴾ واتە: ئەمەش یەکێکە لە بەهرەکانی خودا بەسەرمەوە، ﴿لِيَبْلُوَنِىٓ﴾ بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە، ﴿ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ واتە: ئایا شوکری دەکەم یان پێ نەزانو سپڵە دەبم وە هەر کەسێك سوپاسی خوا بکات ئەوە بێگومان سوپاس بۆ خۆی دەکات، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾،[3] واتە: هەر کەسێك کاری چاکە بکات (قازانجەکەی) بۆ خۆیەتی هەر کەسیش کاری خراپە بکات (زیانەکەی) بۆ خۆیەتی. وە ئەم ئایەتەیش کە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾،[4] واتە: هەر کەسیش کردەوەی چاکی کردبێت ئەوە شوێن بۆ خۆیان (لە بەهەشتدا) ئامادە دەکەن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّى غَنِىٌّ كَرِيمٌ﴾ واتە: وە هەر کەسیش ناسوپاسی بکات خودا بێنیازە لە بەندەکانیو لە عیبادەت کردنیان بۆی. ﴿كَرِيمٌ﴾ واتە: چونکە خودا خۆی زۆر بەڕێزە با کەسیش عیبادەتی بۆ نەکات، ئەوەندە مەزنە پێویستی بە کەس نیە، موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) گوتی: بە هۆزەکەی، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن

---

[1] البغوي (٣/٤٢٠).

[2] الطبري (١٩/٤٦٦).

[3] فصلت (٤٦).

[4] روم (٤٤).

تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾،[1] واتە: ئەگەر ئێوە ناسوپاسی (بەهرەکانی) خوا بکەن‌و هەموو ئەو کەسانەش لە زەویدان ئەوە بە ڕاستی خوا بێ نیازی سوپاس کراوە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرموویێت: ئەی عەبدەکانم ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە تا ئاخیر کەستان لە مرۆو جنۆکە هەموو لەسەر دڵی خوانەناسترین پیاوێك بن لە خۆتان، هیچ شتێك لە موڵکی من کەمی نەکردووە. ئەی عەبدەکانم بێگومان ئاکارەکانی خۆتان بۆ هەڵدەڕێژم –حیساب دەکەم– پاشان پاداشتتان دەدەمەوە پێی، هەرکەسێك چاکەی بینی لەکارنامەکەیدا با سوپاسی خوا بکات، هەر کەسیش چاکەی نەبوو باسەرزەنشتی خۆی نەبێت هی کەسی تر نەکات[2].

﴿قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾﴾

**تاقی کردنەوەی بەلقیس**

وەختێ کە تەختەکە هێنرایە لای سولەیمان، فەرمانی دا کە گۆڕانکاریەکی تێدا بکرێت بۆ ئەوەی زیرەکی‌و وریایی بەلقیس تاقی بکاتەوە، کاتێك کە چاوی بە تەختەکە دەکەوێ ئەڵێ ئەمە تەختەکەی منە یان هی من نیە، بۆیە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِىٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ﴾ واتە: سولەیمان وتی تەختەکەی بگۆڕن سەرنج دەین دەیناسێتەوە یان نایناسێتەوە. ئیبنو عەباس دەڵێ: هۆدەکانی گۆڕی‌و گەرماوو سەرئاوەکانی لێ جیاکردەوە.[3] موجاهید دەڵێ: سولەیمان بڕیاری دا کە گۆڕانکاریەك بکات لە تەختەکەدا ئەوەی سوور بووە بیکات بە زەردو ئەوەی زەردە بیکات بە سوورو ئەوەی سەوزە بیکات بە سوور هەموو شێوازێکی بگۆڕن. عیکریمە دەڵێ: هەندێ شوێنی زیاد کردو هەندێ شوێنی کەم کردەوە. قەتادە دەڵێ: خوارەکەی خستە سەرەوەو پێشەوەی خستە دواوەو دواوەشی خستە پێشەوەو هۆدەکانیشی زیاو کەم کرد.[4] ﴿فَلَمَّا

---

[1] ابراهيم (٨).

[2] مسلم (٤/١٩٩٤).

[3] الطبري (١٩/٤٦٩).

[4] الطبري (١٩/٤٦٩).

جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ﴾ واتە: ئینجا کاتێك بەلقیس هات پێی وترا تەختەکەی تۆ وەك ئەمە وابوو. یانی تەختەکەی نیشان درا گۆڕانکاری بەسەردا هێنرابوو هەندێکی لێ زیادو کەم کرابوو، بەلقیس زۆر وریاو لەسەرخۆو ئازاو بە جەرگو زیرەك بوو، خێرا نەیگوت ئەوە تەختەکەی منە چونکە تەختەکەی زۆر دوور بوو لەو شوێنەوەو نەشی گوت ئەو نیە کاتێ کە بینی زۆر شتی لە تەختەکەی ئەو دەچوو هەرچەندە هەندێ شتی گۆڕابوو بەڵکو گوتی: ﴿كَأَنَّهُۥ هُوَ﴾ واتە: زۆر لەو دەچێ وەك ئەو وایە، ئەمەیش وریایی‌و زیرەکی تەواوی بەلقیس دەردەخات. ﴿وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ﴾ واتە: (سولەیمان) وتی: پێش ئەم (بەلقیسە) زانستمان پێ درابوو وە ئێمە ملکەچ بووین. موجاهید دەڵێ: ئەم قسەیە، قسەی سولەیمانە.[1] ﴿وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ﴾ ئەمەیش هەر قسەی سولەیمانە، تەواوکەری قسەکەی پێشەوەیەتی. ئەمە ڕای موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) واتە: سولەیمان گوتی: ﴿وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەوەی کە دەیپەرست جگە لە خودا لەمپەر بوو لە ڕێدا بۆ ئەوەی هەر تەنیا خودا بپەرستێ، ﴿مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ﴾ ئەمە قسەی موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرە. ئەمەش قسەیەکی چاکە. ئیبنوجەریریش هەر وای وتووە.[2] پاشان ئبنوجەریر دەڵێ: هەڵدەگرێت لەمەدا کەدەفەرمووێت:﴿وَصَدَّهَا﴾ زەمیرێك هەبێت بگەڕێتەوە بۆ سولەیمان یان بۆ خودای مەزن. لەو حاڵەدا ماناکەی وای لێدێ: ﴿مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ڕێگای پێ نەدابێت عیبادەتی غەیری خودا بکات، ﴿إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ﴾ واتە: بێگومان ئەو لە گەلی کافران بوو، منیش ئەڵێم: ئەم ڕایە پشتگیری قسەکەی موجاهید دەکات، چونکە بەلقیس دوای ئەوەی چووە ناو کۆشکەکە موسڵمانی خۆی ئاشکرا کرد، وەك لە دواوە باسەکەی دێت ﴿قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِى ٱلصَّرْحَ ۖ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا﴾ پێی گوترا وەرە ناو کۆشکەکەوە کاتێك بینی وای دەزانی ئاوێکی زۆر ڕوونە بۆیە هەردوو لاقی هەڵکرد، چونکە سولەیمان فەرمانی دابوو بە شەیاتینەکان کۆشکێکی زۆر مەزنی بۆ دروست بکەن لە شوشەی ڕوون‌و سافو ئاوێکی زۆرو زەبەندە بە ژێریدا بڕوان ئەوەی ئاگادار نەبێت وابزانێت هەر ئاوە، ئەوە بوو شوشە سافەکە کە لە نێوان ئاوەکەو ئەو کەسانە دابوو بەسەریدا دەڕۆیشتن.

---

[1] الطبري (١٩/٤٧١).

[2] الطبري (١٩/٤٧٢).

## گوتی ئەمە كۆشكێكی لە شوشەی ساف دروست كراوە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ﴾ واتە: (سولەیمان) پێی وت ئەوە (تۆ بە دەریای دەزانی) كۆشكێكە. ئەسڵی ﴿الصَّرْحَ﴾ لە زمانی عەرەبیدا واتا كۆشك یان هەموو خانوویەكی بەرز خوای گەورە لە باسی فیرعەوندا (لەعنەتی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: فیرعەون وتی بەهامانی وەزیر ﴿ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ﴾،[1] بچۆ كۆشكێك بۆ من دروست بكە بەڵكو بگەم بەو ئاسۆیانە. ئەو كۆشكەی بەلقیس لە یەمەن بوو، خانوویەكی بەردی لە شوشەی ساف دروست كرابوو، زۆر قایم و مەحكەم بوو، ﴿مِّن قَوَارِيرَ﴾ لە شوشە، –مارد– قەڵایەك بوو لە دەومەتەلو جەندەل، مەبەست لەمەدا ئەوەیە كە سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) كۆشكێكی گەورەی دروست كردبوو بۆ ئەم شاژنە و ڕازاندبوویەوە بە شوشەی ساف بۆ ئەوەی دەری بخات كە چەندە خاوەنی توانای دەسەڵاتێكی مەزنە، كاتێك بەلقیس ئەو هەموو دەسەڵاتو شكۆیەی سولەیمانی چاو پێكەوتو بۆی ڕوون بووەوە و ملی كەچكرد بۆ فەرمانی خوداو زانی كە سولەیمان پێغەمبەرێكی بەڕێزەو پاشایەكی مەزنە، خۆی دایە دەستی خوای گەورەو موسڵمان بوو، گوتی: ﴿قَالَتْ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى﴾ واتە: بەلقیس وتی: ئەی پەروەردگارم من ناهەقیم لە خۆم كرد كە خوانەناسو موشریك بووم لەگەڵ هۆزەكەم كە عیبادەتی خۆرمان دەكردو عیبادەتی خوامان نەدەكرد، ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: شوێنی ئاینی سولەیمان كەوتین كە هەر خودا پەرستیتە بە تەنیا بێ شەریك بۆ دانان، ئەو خودایەی كە هەموو شتێكی دروست كردووەو خاوەنی گشت جیهانیانە.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ۖ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ ۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ ۖ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾﴾

## لە نێوان پێغەمبەر صالح (سەلامی خوای لێ بێت) و سەموودا

خوای گەورە باسی هۆزی سەموود دەكات كە چیان كرد لەگەڵ پێغەمبەر صالح (سەلامی خوای لێ بێت) كاتێك كە خوای گەورە ڕەوانەی كردە سەریانو بانگی كردن بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستنو شەریكی بۆ دانەنێن ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا ناردمان بۆ گەلی سەموود برایان صالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) (پێی

---

[1] الغافر (٣٦).

وتن) کە خوا بپەرستن کەچی ئەوان بوونە دوو کۆمەڵی دژیەك. موجاهید دەڵێ: بوونە دوو دەستەی دژ یەك: خاوەن باوەڕو خوانەناس.[١] وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾[٢]، واتە: دەسەڵاتدارە لووت بەرزەکانی گەلەکەی وتیان بەوانەی لاوازو ژێردەستە کرابوون، ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەناویاندا ئایا دەزانن کە صالح ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگاریەوە؟ وتیان: بێگومان ئێمە بڕوادارین بەوەی صالح پێی ڕەوانەکراوە ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانی وتیان: بە ڕاستی ئێمە بێباوەڕین بەوەی کە ئێوە بڕواتان پێ هێناوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ ﴾ واتە: بۆچی داوای دابەزینی سزا دەکەن‌و داوای بەزەیی‌و عەفووی خوا ناکەن بۆیە فەرموویەتی: ﴿لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ واتە: بۆچی داوای لێخۆشبوون ناکەن لە خوا تا ڕەحمتان پێ بکرێت. پاشان دەفەرمووێت: ﴿قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ﴾ واتە: ئێمە خێروبێرمان لە تۆو دەم‌و چاوی تۆو ئەوانەش شوێنی تۆ کەوتوون نەدیوە، چونکە ئەوانە لە بەدبەختی خۆیان هیچ کاتێك یەکێکیان توشی نارەحەتیەك نەدەبوو، مەگین دەیگوت: ئەوە خەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ صالح‌و هاوەڵەکانی، موجاهید دەڵێ: ڕەشبین بوون پێیان.[٣] ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە باسی هۆزی فیرعەون دەکات: ﴿فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ﴾[٤]، واتە: جا کاتێك چاکەیان بۆ بهاتایە (لە سەروەت‌و بەروبووم) دەیانوت: ئەمە هەر هی ئێمەیە (شایستەی ئێمەیە) بەڵام کاتێك توشی بەڵاو خراپە بوونایە (دەیان وت) بەهۆی شوومی موساو شوێنکەوتووانیەوەیە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾[٥]، واتە: وە ئەگەر (ناپاکان) خۆشی‌و چاکە هاتە ڕێیان دەڵێن ئەمە لە لای خواوەیە وە ئەگەر تووشی ناخۆشی خراپەیەك هاتن

---

[١] الطبري (١٩/٤٧٥).

[٢] الاعراف (٧٥-٧٦).

[٣] الدر المنثور (٦/٣٦٩).

[٤] الاعراف (١٣١).

[٥] النساء (٧٨).

دەڵێن: ئەمە لە لایەن تۆوەیە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ: هەمووی لە لایەن خواوەیە. هەمووی بە بڕیارو فەرمانی خوایە، خوای گەورە باسی خەڵکی ئەو شارە دەکات کاتێك کە پێغەمبەرانیان بۆ دەهات، گوتیان: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ﴾[1] واتە: (خەڵکەکە) وتیان بێگومان ئێمە بەهۆی ئێوەوە دووچاری شوومیو بەدبەختی بووین سوێند بە خوا ئەگەر واز نەهێنن (لەو کارەتان) بەردبارانتان دەکەین و بە ڕاستی لە لایەن ئێمەوە دووچاری سزایەکی پڕئێشو ئازار دەبن، (پێغەمبەران) وتیان شوومی ئێوە بە خۆتانەوەیە. ئەمانیش دەڵێن: ﴿ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتە: پاشەڕۆژی ئێوە لە لای خوایەو پاداشتتان لەسەر ئەوە دەداتەوە، ﴿بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ﴾ واتە: نەخێر بەڵکو ئێوە گەلێکن تاقی دەکرێنەوە. قەتادە دەڵێ: تاقی دەکرێنەوە بە گوێڕایەڵیو –خواپەرستی– بە گوناهکردن[2]. بەڵام وادەردەکەوێت مەبەست بە ﴿تُفۡتَنُونَ﴾ لەم ئایەتەدا واتە: مۆڵەت دەدرێن لەسەر ئەو گومڕاییەی کە ڕۆچوون تێیدا.

﴿وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا وَمَكَرۡنَا مَكۡرٗا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكۡرِهِمۡ أَنَّا دَمَّرۡنَٰهُمۡ وَقَوۡمَهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلۡكَ بُيُوتُهُمۡ خَاوِيَةَۢ بِمَا ظَلَمُوٓاْۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾﴾

### کەتنی کۆمەڵێك خراپەکارانو پاشەڕۆژی هۆزی سەموود

خوای گەورە باسی یاخیەکانی سەموودو سەرکردەکانیان دەکات کە بانگی هۆزەکەیان دەکرد بۆ بێ دینیو گومڕاییو بە درۆخستنەوەی پێغەمبەر سالح (سەلامی خوای لێ بێت) هەتا وایان لێهات وشترەکەیان کوشتو ویستیان سالحیش بکوژن. بە شەو بدەن بەسەریداو لەناوی بەرنو پاشان بڵێن بە خزمەنزیکەکانی ئەوان هیچ ئاگاداری کوشتنی پێغەمبەر سالح نین، ڕاستیش دەکەن، چاویان لێ نەبوو کوژراوە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ﴾ واتە: لەو شارەی سالح دا یانی شاری

---

[1] یس (١٨-١٩).

[2] الدر المنثور (٣٦٩/٦).

سەموود. ﴿تِسۡعَةُ رَهۡطٖ﴾ واتە: نۆ کەس هەبوون. ﴿يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ﴾ واتە: لە زەویدا خراپەکاریان دەکرد بە هیچ جۆر چاکەیان نەدەکرد. یانی ئەوانەی کە خاوەن دەسەلات بوون دەستیان گرتبوو بەسەر کاروباری سەموودا، عەونی دەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە: هەر ئەوانە بوون دایان لە ملی وشترەکەو کوشتیان.[1] واتە: ئەوانەی کە بە پرس و رای ئەوان ئەو کارە کرا لەعنەتیان لێ بێ‌و خوا ڕوویان ڕەشکات. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾،[2] واتە: (گەلەکەی لەم کارە بێزار بوو) جا بانگی هاوڕێ خراپەکەیان کرد (قوداری کوڕی سالیف) ئەویش دەستی دایە شمشێر (وشترەکەی) سەربڕی. وە فەرموویەتی: ﴿إِذِ ٱنۢبَعَثَ أَشۡقَىٰهَا﴾،[3] واتە: کاتێك کە خراپترینیان هەستایەوە (بۆ سەربڕینی وشترەکە). عبدالرزاق دەڵێ: یەحیای کوڕی ڕەبیعەی سەنعانی هەواڵی پێ داین گوتی: بیستم لە عەتای کوڕی ئەبو ڕەباحەوە دەیگوت: ﴿وَكَانَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ تِسۡعَةُ رَهۡطٖ يُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا يُصۡلِحُونَ﴾ ئەوانەی درهەمیان دەبڕی‌و لەتیان دەکرد -دەیان قرتاند-.[4] واتە: لێیان لادەبردو مامەڵەیان پێ دەکرد وەك عەرەبەکان چۆن مامەڵەیان پێ دکرد، ئیمامی مالیك دەڵێ لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ئەویش لە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ئەگوازێتەوە کە فەرمویەتی: قرتاندنی ئەو زێڕ و زیو لە بەدفەڕی بڵاوکردنەوەیە لەناو زەویدا. مەبەست پێی لێرەدا ئەوانەیە کە سروشتیان بەدفەڕیە لەسەر زەمیندا بە هەر شێوەیەك توانایان هەبێت، وەك ئەو شتانەی کە ئەم زانا بەڕێزانە باسیان کردو چەندەها کاری بەدفەڕی تر، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ تَقَاسَمُواْ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥ﴾ واتە: سوێندتان خوارد کە بە پەنهانی بە شەو بدەن بەسەر پێغەمبەر سالحداو (سەلامی خوای لێ بێت) بیکوژن، کەتنی خۆیان کرد -واتە هەوڵی خۆیاندا- بەڵام خوا کەتنەکەی بەسەر خۆیاندا شکاندەوە موجاهید دەڵێ: سوێندیان خواردو پەیمانیان دا بە یەکتری کە پێغەمبەر سالح لەناو بەرن، بەڵام دەستیان پێ نەگەیشت تا خۆیان‌و هۆزەکەیانی هەموو قڕکرد،[5] ﴿ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدۡنَا مَهۡلِكَ أَهۡلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ واتە: لە پاشان دەڵێین بە کەس‌و کاری سالح ئێمە ئاگامان لە کوشتن‌و تیاچوونی خێزانی ئەو نیەو بێگومان ڕاستیش دەکەین. عبدالرحمن ی کوڕی ئەبو

---

[1] الطبري (١٩/٤٧٧).

[2] القمر (٢٩).

[3] الشمس (١٢).

[4] عبدالرزاق (٣/٨٣).

[5] الطبري (١٩/٤٧٨).

حاتەم دەڵێ: کاتێ کە دایان لە ملی وشترەکەو کوشتیان پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) پێی گەوتن: ﴿تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ ۖ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾[1] واتە: لە ماڵی خۆتاندا ڕابوێرن سێ ڕۆژ ئەوە بەڵێنی خودایەو درۆنیە، ئەوانیش گوتیان: ساڵح وادەزانێ لە ماوەی سێ ڕۆژدا لە کۆڵی دەبینەوەو لەناو دەچین، ئێمە کەمتر لە سێ ڕۆژ خۆیو ماڵو منداڵی لەناو دەبەینو ڕزگار دەبین لە دەستی، پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) مزگەوتێکی هەبوو لە حیجردا لە شیوێکدا لەوێ نوێژی دەکرد ئەوانیش چوون بۆ ئەشکەوتەکە بە شەو گوتیان ئەگەر هات بۆ نوێژ دەیکوژینو پاشان دەگەڕێینەوە، کاتێك ئەومان لەناودا دەچین ماڵو منداڵەکەیشی لەناو دەبەین، خوای گەورە بەردێکی بەرەو ڕوویان خستە خوارەوە بۆیان، ئەوانیش بە پەلە خۆیان کرد بە ئەشکەوتەکەداو بەردەکە بەردەمی ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، هۆزەکەیان نەیان دەزانی ئەوان لە کوێنو ئەوانیش نەیان دەزانی هۆزەکەیان چیان بەسەر هاتووە. خوای گەورە سزای ئەمانی لێرەداو سزای ئەوانیشی لەشوێنی خۆیانداو پێغەمبەر ساڵحو ئەوەی لەگەڵی بوون ڕزگار کرد، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: ئەوان نەخشەو پیلانیان دانا بە پیلانێکی خراپ (بۆ کوشتنی صالح) ئێمەش نەخشەمان کێشا (بۆ لەناوبردنیان) بە نەخشەکێشان لە کاتێکدا ئەوان هەستیان نەدەکرد، ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَـٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: ئینجا سەرنج بدە سەر ئەنجامی پیلانی ئەوان چی لێهات بێگومان ئێمە ئەوانو گەلەکەیانمان هەموو پێکەوە لەناو برد، ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئینجا ئەوە (جێ) خانووەکانیانە چۆڵو خاڵی یە لەبەر ئەوەی ستەمیان کرد بە ڕاستی لەو بەسەرهاتەدا پەندو بەڵگە هەیە بۆ کۆمەڵێك کەشت دەزانن. ﴿وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ واتە: وە ئەو کەسانەمان ڕزگار کرد کە بڕوایان هێنا و لە خوا دەترسان.

﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَـٰهَا مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾﴾

---

[1] هود (٦٥).

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی لوت دەکات کە بانگی هۆزەکەی دەکردو دەیترساندن لە غەزەبی خودا لەسەر ئەو کارە خراپەی ـ نێربازییەی ـ دەیان کرد، کە هیچ کەسێك لە تۆرمەی ئادەم لە پێش ئەوانەوە نەیکردووە، لە ژنان وازیان هێنابوو پەلاماری پیاوانیان دەدا، ئەم ئاکارەیشیان بێ ناموسیەکی زۆر گەورە بوو، وەك خوای گەورە لەسەر زمانی لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾ واتە: وە باسی لوت بکە کاتێ وتی بە گەلەکەی ئایا ئێوە ئەو کارە زۆر خراپو ناشیرینە دەکەن کە ئێوە دەبینن‌و دەزانن (چەند پیس‌و ناشیرینە). یانی بە بەرچاوی یەکترەوە کاری داوێن پیسی‌و نارەوا دەکەن. ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ واتە: ئێوە گەلێکی زۆر بێ عەقڵ‌و نەزانن کە ژنان واز لێ دێنن‌و پەلاماری پیاوان دەدەن، لە هیچ شتێك تێناگەن‌و نەفام‌و نەزانن‌و فەرمانی خوداش دەشکێنن، بێ ناموسیەك دەکەن تا ئێستا کەس نەیکردووە. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾،[1] واتە: ئایا لەناو (هەموو خەڵکی) جیهانیاندا ئێوە نێربازی دەکەن، وە واز دێنن لەو هاوسەرانەتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون نەخێر بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن دەرچوو لە سنووری ئارەزوو. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوٓا۟ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ واتە: گوتیان کەس‌و کاری لوت دەرکەن لە ئاواییەکەتان، چونکە ئەوان لەو کارە بێ ناموسیەی ئێوە زۆر نارەحەتن، حەزیان لە داوێن پاکیە لەم وڵاتەی ئێمەدا جێیان نابێتەوە، ویستیان کەس‌و کاری لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وەدەرنێن، خوای گەورەش قڕی کردن هەر خوانەناسێکی تریش وەك ئەوانە سەرپێچی فەرمانی خودا بکات وەك ئەوانی بەسەردێت، ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: خۆی‌و کەس‌و کاریمان ڕزگار کرد تەنها ژنەکەی نەبێت کە لەگەڵ هۆزەکەی لەناو چوون، چونکە ژنەکەی یارمەتیدەرو پشتگیری کەری ئەوانە بوو، خوای نەدەناسی‌و گوێڕایەڵی ئەوانە بوو، هۆزەکەی ئاگادارکرد کە بێن بۆ لای میوانەکانی پێغەمبەر لوت (سەلامی خوای لێ بێت) لەبەر ڕێزو خاتری پێغەمبەر لوت بووە (سەلامی خوای لێ بێت) توشی خراپە نەبووە نەوەك لەبەر خاتری خۆی، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ﴾ واتە: بارانێکی ئەمان باران، زۆر ترسناك‌و ڕەق‌و توند وەك بەرد خودای مەزن باراندی

---

[1] الشعراء (١٦٥ـ١٦٦).

بەسەر ئەو ناهەقیكارو دوور لە خودایانە بۆیە خودا فەرموویەتی: ﴿فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ﴾ واتە: جا چ خراپ بوو بارانی ترسێنراوان. چونكە خودای مەزن پێغەمبەری بۆ ناردن ئاگاداری كردنەوەو داوای لێكردن كە واز لە بێ ناموسی بێننو هەڕەشەی خودای پێ گەیاندن، بەلام ئەوانە هەر دژایەتی لوت پێغەمبەریان كرد (سەلامی خوای لێ بێت)و بڕوایان پێ نەكرد، دەیانویست شار بەدەری بكەن.

﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾﴾

**فەرمان دان بە سوپاس كردنی خوداو درود ناردن بۆ پێغەمبەرەكانی (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ﴾ خوای گەورە فەرمان دەكات بە پێغەمبەرەكەی موحەمەد(ﷺ) كە بێژێت: سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەو بەهرانەی كە داویەتی بە عەبدەكانی، ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەنو باس ناكرێت، وە سوپاس بۆ ئەو خودایە كە هەرچی وەسفو ستایش بكرێت هەر كەمەو زۆر مەزنە خاوەنی ناوە پیرۆزەكانە، وە فەرمانیشی بە پێغەمبەر(ﷺ) كردووە كە درود ڕەوانە بكات بۆ هەموو پێغەمبەرە بەڕێزو هەڵبژێردراوەكانی (سەلامی خوایان لێ بێت) عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەمو كەسانی تریش گوتیان: مەبەست بە عەبدە هەڵبژاردەكانی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك ئەم ئایەتە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾،[1] سەوری (الثوري)و سودی دەڵێن مەبەست پێی: هاوەڵەكانی پێغەمبەرە (ﷺ) ـڕەزای خودا لە هەموو ئەوانیش بێت— وە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە ئیبنو عەباسیشەوە. هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم دوو ڕایەدا نیە، چونكە ئەگەر هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لە عەبدە هەڵبژاردەكانی بن، چاكترو باشتر پێغەمبەران بەری دەكەونو شایستەترن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ ئەمە هەڕەشەیەكی توندە لەو كەسانەی كە شەریك بۆ خودا دادەنێنو وەك ئەو ڕۆدەبیەرستن. واتە: ئاخۆ خودا چاكترە یان ئەوەی دەیكەنە شەریكی؟

[1] الصافات (١٨٠ـ١٨٢).

**چەند بەڵگەیەك لەسەر یەكتا پەرستی (التوحید) خودا**

پاشان خوای گەورە ڕوونی دەكاتەوە كە هەر وەدی هێنەرو ڕۆزی دەرو كاربەدەستەو كەسێكی تر نیە غەیری خۆی، بۆیە دەفەرموویێت: ﴿أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ ئایا زاتێك كە ئاسمانەكان‌و زەوی دروست كردووە، واتە: ئەو ئاسمانانەی بەو شێوەیە لەو بەرزیەوە دروست كردووە كە پڕە لە ئەستێرەی ڕووناك‌و پڕشنگدار كە سوڕ دەخۆن لەو شوێنانەی كە بۆیان دیاری كراوە دێن‌و دەچن، زەمینیشی دروست كردوە بەو تەختەو بەرزی‌و نزمی‌و تۆكمەییە، لە كێوێكی زۆرو دەشتی فراوان‌و دۆڵی قوڵ‌و بیابان‌و چۆڵەوانی دوایی نەهاتوو پێكهاتووە، كە پڕە لە دارو درەخت‌و بەروبووم‌و دانەوێڵەو كشتوكاڵ. ئەو هەموو دەریاو گیاندارو جانەوەرەش هەریەكە لە جۆرێك‌و لە ڕەنگێك‌و لە شكڵێك. وە دەفەرموویێت: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ واتە: لە ئاسمانەوە بارانی باراندووە، بەهۆی ئەو بارانەوە ڕۆزی بەندەكانی داوە،، ﴿فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ﴾ واتە: باخچەی زۆریشی تێدا ڕوواندووە، ﴿ذَاتَ بَهْجَةٍ﴾ كە شێوازێكی جوان‌و دڵگیریان هەیە، ﴿مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ﴾ واتە: كە ئێوە نەتاندەتوانی دارودرەخت‌و بەروبوومی ئەو زەویە سەوز بكەن‌و كەڵكی لێ وەربگرن، بەڵكو خودای خاوەن دەسەڵات‌و وەدیهێنەرو بژێوی دەر هەر خۆی كردوویەتی غەیری ئەو كەس ناتوانێ بیكات، وەك بت‌و ئەو شتانەی كردووتانن بە هاوەڵی خوداو دەیان پەرستن، ئەو موشریكانە خۆشیان چاك دەزانن‌و دانی پێدا دەنێن. وەك خوای گەورەش لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾[1]، واتە: وە ئەگەر پرسیاریان لێ بكەین كێ دروستی كردوون بێگومان دەڵێن خوا. وە دەفەرموویێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾[2]، واتە: وە ئەگەر پرسیاریان لێ بكەین كێ لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێ ئەنجا بەو بارانە زەوی مردووی زیندوو كردەوە بێگومان دەڵێن خوا. واتە: ئەوانە دانی پێدا دەنێن كە وەدیهێنەری هەموو ئەمانە هەموو تەنها خودا خۆیەتی‌و شەریكی نیە، كەچی لەگەڵ ئەوەیشدا شتی تر دەپەرستن‌و چاكیش دەزانن كە ئەوانە هیچیان بەدەست نیەو ناتوانن ژیان‌و ڕۆزی بە كەس بدەن. بەڵكو ئەو كەسەی كە شایەنی پەرستنە خودایە هەر ئەو وەدی هێنەرو ڕۆزی دەرە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا پەرستراوێكی تر لەگەڵ خودا هەیە؟ نەخێر كەسێكی تر

---

[1] زخرف (٨٧).

[2] العنكبوت (٦٣).

غەیری خودا بۆ پەرستن ناشێت، وەك بۆتان دەركەوت، وە هەموو خاوەن عەقڵێك دان بەو ڕاستیە دادەنێ‌و گومانی نیە كە خوا وەدیهێنەرو ڕۆزی دەرە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾ واتە: ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن كۆمەڵێكی لە هەق لادەرن.

﴿أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَإِلَٰهٌ مَّعَ اللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا﴾ واتە: ئەو خودایەی كە زەوی كردووە بە شوێنی حەسانەوە كە ناكشێ‌و لەرزە ناكاتو بە خەڵكەكەیەوە ناجوڵێ، چونكە گەر وابووایە ژیان بەسەریەوە تاڵ‌و ناخۆش دەبوو، بەڵكو بە دڵۆڤانی‌و ڕێزی خۆی لە بەندەكانی وەك فەرشێكی ڕاخراوی لێ كردوە لەرزەلەرزو جموجۆڵ ناكات وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرمووێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾[1]، واتە: خوا زاتێكە كە زەوی بۆ كردوونەتە نیشتەجێ (ئارامگا) وە ئاسمانیشی بۆ كردوون بە سەریان. ﴿وَجَعَلَ خِلَالَهَا أَنْهَارًا﴾ واتە: جۆرباری شیرین‌و زەلاڵی لەناو زەویدا هەڵقوڵاندووەو بە ناویدا دەڕوات هەندێكیان گەورەو هەندێكی تری بچووك بەرەو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو باكوورو باشوور دەچن، بەپێی پێویستی عەبدەكانی لەو وڵاتو هەرێمانەدا ـ پەرش‌و بڵاوی كردوون لە هەموو بەشەكانی زەویدا ـ ڕێویان دەدات. ﴿وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ﴾ واتە: كێوی گەورەو بەرزی دروست كردووە وەك مێخ چووە بەناو زەمیندا تا بوەستێ‌و جوڵەجۆڵ نەكاتو نەڕوات، ﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾ واتە: لە نێوان ئەو دوو دەریایەدا كە یەكێكیان شیرینەو ئەوی تریان تفتو تاڵە بەربەستی داناوە، كە ناهێڵێ تێكەڵاوی یەكتری بن، هەتا بەهۆی یەكتریەوە، پیس‌و خراپ بن‌و تامیان بگۆڕێت، ئەوەش لە كارزانی خودای مەزنە كە هەردوو دەریاكە وەك خۆیان بمێننەوەو سیفاتی خۆیان لە دەست نەدەن، چونكە ئەو دەریانەی كە ئاویان شیرینە ئاوی ئەو ڕووبارانەیە كە بە ناو زەویدا تێدەپەڕن‌و دەچن خەڵكی دەیخۆنەوەو شیرینەو بەكاری دێنن بۆ ئاودێرانی دارودرەختو كشتوكاڵ‌و مەڕو ماڵاتو گیانلەبەرەكانی تریش لێی دەخۆنەوە. دەریا تفتو تاڵەكانیش ـ خوێیاویەكانیش ـ ئەو دەریایانەیە كە دەوری دونیای داوە لە هەموو لایەكەوە، خودای مەزن وای وەدی هێناوە كە ئاوەكەی تفتو تاڵ بێت، هەتا بەهۆی ئەو دەریا گەورانەوە كەش‌و هەوای سەر زەمین پیس نەبێت بە بۆنەكەی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا

[1] الغافر (٦٤).

عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾،[1] واتە: ئەو (زاتە) زاتێکە دوور دەریا (ئاو)ی بەرەڵا کردو لە پاڵ یەکدا ئەمەیان شیرینو سازگارە (ئاوی ڕووبارو کانیاوە) ئەوی تریان زۆر سوێرو تاڵو تفتە (ئاوی دەریاکانە) وە لە نێوان ئەو دوو (ئاو)ەدا بەربەستێکی داناوەو بەرگریکەرێکی ئەستوور (تا ئەو دوو ئاوە تێکەڵ بەیەك نەبن. بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَإِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾؟ واتە: ئاخۆ هیچ خودایەکی تر لەگەڵ خودادا هەیە بتوانێ ئەمە بکات، یا بپەرسترێت؟ نەخێر، کەسێ ناتوانێو کەسیش شایەنی پەرستن نیە غەیری خودا. ئەم دوو قسەیە هەردووکیان ڕاستنو لەیەك جیاناکرێتەوە. ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن بۆیەغەیری خودا دەپەرستن.

﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾﴾

خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە کە هاوار هەر لەو دەکرێت لە کاتی تەنگانەداو پەنا هەر بە ئەو دەبرێت لە کاتی کارەساتو لێ قەوماندا، وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾،[2] واتە: وە کاتێ لە دەریادا تووشی بەڵاو زیان بێن هەموو ئەو (پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن ون دەبن بێجگە لە خوا. وە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ﴾،[3] واتە: پاشان کاتێ دووچاری زیانو ناڕەحەتیەك ببن ئەوە پەناو هاوار هەر بۆ لای ئەو دەبەن. هەر بەو شێوەیەش لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ﴾ واتە: ئەو کەسە کێیە لێقەوماو پەنا بۆ کەس نابات غەیری ئەو، ئەو کەسە کێیە کە زەرەرو زیانو ئێشو ئازار لانابات غەیری ئەو، بێگومان هەر خوای گەورەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە پیاوێکی بەلهوجەیمەوە (بَلْهُجَيم) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا، هاوار لە کێ دەکەی؟ فەرمووی: (تەنها لە خودا دەپاڕێمەوە، ئەو خودایەی کە تووشی ئازار ناڕەحەتی بووی کە لێی پاڕایتەوە، ئەو ئازارو ناڕەحەتیەی لەسەر لابردووی، ئەو خودایەی ئەگەر ڕێگات ون کرد لە زەویەکی چۆڵو بیاباندا، پاڕیتەوە وەڵامت دەداتەوە، ئەو خودایەی کە تووشی قاتو قڕی بوویت، لێی پاڕایتەوە ڕووەکت بۆ دەڕوێنێت) پیاوەکە گوتی: گوتم: ئامۆژگاریەکم بکە، فەرمووی: (قسە ـ جوێن ـ بە هیچ کەسێك مەڵێ، لە چاکەکردن مەوەستە ئەگەر

---

[1] الفرقان (٥٣).

[2] الاسراء (٦٧).

[3] النحل (٥٣).

زەردەخەنەیەکیش بێت کاتێ کە گەیشتی بە برایەکی موسڵمانت، یان: ئەگەر خاڵی کردنی سەڵتە ئاوەکەت بێت لە سەڵتی کەسێك کە پێویستی بە ئاوە، پۆشاکەکەت هەتا نیوەی لاقت شۆڕکەرەوە خۆ ئەگەر نەت توانی با تا پاژنەکانت شۆڕی کەیتەوە، نەکەی پۆشاکەکەت شۆڕکەیتەوە چونکە شۆڕکردنەوەی پۆشاك لە فیزو خۆبەزل زانینەوەیە، بێگومان خودا خۆشی نایە لە خۆبەزلزان.[1]

**بەسەرهاتی موجاهیدێك ــ تێکۆشەرێك ــ لە ڕێی خوادا**

ئیبنو عەساکیر باسی کردووە لە تەرجومەی (في الترجمة) فاتیمەی کچی حەسەنەوە دایکی ئەحمەدی عیجلیەوە (العجلیة) دەڵێ: ڕۆژێك خوانەناسان موسڵمانانیان ڕاونا ــ شکاند ــ لە غەزایەکدا وڵاغێکی ــئەسپ یان ماین ــ چاك کە خاوەنەکەی زۆر لێی ڕازی بوو، کە پیاوێکی دەوڵەمەندو چاك بوو، گوتی: بە وڵاخەکەی چیت بەسەر هاتووە ــ لێ قەومانە ــ؟ هاوار بۆ تۆ! من تۆم بۆ ڕۆژێکی ئاوەها ئامادە کردووە. وڵاخەکە خۆراکێکی · ئالیکێکی ــ کەمم پێ دەدا؟ پیاوەکە وتی: پەیمانت دەدەمێ لەم ڕۆژە بە دواوە ئالیکت پێ نادەم لە لای خۆمەوە نەبێت، وڵاخەکە ڕۆیشتو وڵاخەکەی ڕزگار کرد، ئەو پیاوە لە پاش ئەوە ئالیکی نەدەدا بە وڵاخەکەی لە لای خۆیەوە نەبێت، دەنگو باسی ئەم پیاوە لەناو خەڵکدا بڵاوبووەوە، خەڵکی دەچوون بۆ لای هەتا گوێبیستی ئەو قسانەی بن، ئەو هەواڵە گەیشتە ڕۆمەکان، گوتیان: وڵاتێ پیاوی ئاوای تێدابێت هەرگیز داگیر ناکرێت، ویستی بە فێڵ لەناو وڵاتەکەی خۆیدا بیگرێتو بە دیلی بیبات، پیاوێکی هەڵگەڕاوە لە دینی ــ المرتد ــ ناردە لای، کاتێك کە پیاوەکە چووە لای، خۆی وا نیشان دا کە موسڵمان بووەتەوە بڕیاری داوە کە چاکە بکات لەگەڵ موسڵمانانو گەلەکەی، هەتا وای کرد لە خۆی بووە جێی متمانەی پاشان ڕۆژێك دەرچوون لە کەناری دەریایەکدا دەگەڕان، پیاوە هەڵگەڕاوەکە ــ المرتد ــ لەگەڵ پیاوێکی تردا لە ڕێگای پاشای ڕۆمەوە ئاگادار کرابوو ڕێك کەوتبوون کە هاوکاری یەکتری بکەن، بە دیلی بیگرن، کاتێك کە دەوری پیاوەکەیان داو ویستیان بیگرن، چاوی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو گوتی: ئەی خودایە ئەمانە خۆیان وا نیشان دا کە خاوەن باوەڕن فێڵیان لێ کردم، تۆ ئەدەم بە گژیاندا مەیلی خۆتە چیان بەسەر دێنی، گوتی: جانەوەرێك ــ دڕندەیەك ــ هاتو هەردوو پیاوەکەی گرت ــ برد ــ، پیاو چاکەکەیش بە سەلامەتی گەڕایەوە[2].

---

[1] أحمد (٥/٦٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تأريخ دمشق المخطوط (١٩/٤٨٩).

**باسی جێ نشینی لەم سەر زەمینە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: دەتانكاتە جێنشین لەم سەر زەمینە گەل دوای گەل‌و دەستە دوای دەستە جێی پێشینەكانی خۆتان دەگرنەوە وەك فەرموویەتی: ﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ﴾،[1] واتە: ئەگەر بیەوێت لەناوتان دەبات‌و كێی بوێت دوای ئێوە دەیكاتە جێنشینی(ئێوە) وەك چۆن ئێوەی لە نەوەی كۆمەڵێكی تر بەدی هێنا. وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ﴾،[2] واتە: وە خوا ئەو زاتەیە كە ئێوەی كردووە بە جێنشینانی زەوی (كۆمەڵ لە دوای كۆمەڵ دێن) چەند پلە هەندێكتانی بەرزكردووەتەوە بەسەر هەندێكی ترتاندا. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾[3] واتە: (بیریان بێنەوە) كاتێ پەروەردگاری تۆ بە فریشتەكانی وت بە ڕاستی من جێنشینێك دروست دەكەم لەسەر زەوی. واتە: كۆمەڵێ جێی كۆمەڵێكی تر دەگرێتەوە، ئەم ئایەتەش كە دەفەرموێت: ﴿وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: گەل دوای گەل‌و نەوە دوای نەوەو كۆمەڵ دوای كۆمەڵ، خۆ ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە هەمووی لەیەك كاتدا دروست دەكرد وەك چۆن ئادەمی دروست كرد (سەلامی خوای لێ بێت) نەی دەكردنە نەوەی یەكترو بە دوای یەكدا بێن، خۆ ئەگەر مەیلیشی لێ بووایە هەموویانی یەك لە دوای یەك وەدی دەهێناو گیانیشی نەدەكێشان بە یەكەوە نەبێت، واتە هەموویانی پێكەوە گیان دەكێشا، ئەو كاتە دنیایان لەسەر تەنگ دەبوو ڕۆزیان زۆر بە زەحمەت وەدەست دەهێناو ئازاری یەكتریان ئەداو یەكتریان تووشی زیان دەكرد، بەڵام خوای گەورە بە كلرزانیو بڕیارو دەسەڵاتی خۆی وای بڕیاردا كە لە یەك گیان دروستیان بكات پاشان بەو شێوەیە زۆریان بكات‌و بڵاویان بكاتەوە بەسەر زەمیندا، كۆمەڵ كۆمەڵ‌و تیرە تیرەو گەل گەل هەریەكەو لە شوێنێكدا بە دوای یەكدا، هەتا ئەو كاتەی كە ماوە تەواو دەبێت‌و هەموو گیانی دەكێشرێت‌و سەر زەمین چۆڵ دەبێت، وەك چۆن خوا خۆی بڕیاری داوەو ئەو كاتەی دیاری كردووە، پاشان ڕۆژی قیامەت دێت، هەموو كەسێك پاداشتی كرداری خۆی وەردەگرێت لەو كاتەدا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلۡمُضۡطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكۡشِفُ ٱلسُّوٓءَ

---

[1] الانعام (١٣٣).

[2] الانعام (١٦٥).

[3] البقرة (٣٠).

﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئاخۆ خودایەکی تر هەیە لەگەڵ خوادا ئەم دەسەلاتەی هەبێت؟ یان وەك خوا بپەرسترێت؟ چاکیش زانراوە کە هەر خودا دەتوانێ ئەو کارە بکات کەسی لەگەڵ نیە شەریکی بێت، ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: ئەمانە کەم پەند وەردەگرن کاتێ کە ڕێنموونی دەکرێن بۆ سەر هەق و ڕێگای ڕاست.

﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَـٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ﴾ واتە: یان ئەو کەسەی چاکترە کە لە تاریکی وشکایی و دەریا لەڕێ شارەزاتان دەکات بەهۆی ئەو هەموو نیشانانەوە کە لە ئاسمانەکان و زەمیندا دروستی کردووە وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَعَلَـٰمَـٰتٍ ۚ وَبِٱلنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾[1] واتە: هەروەها نیشانەی زۆری داناوە و بە ئەستێرەش خەڵکی ڕێ دەردەکەن (لە شەودا). وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾[2] واتە: وە هەر خوایە کە ئەستێرەی داناوە بۆتان بۆ ئەوەی ڕێیان پێ دەرکەن لە تاریکیەکانی وشکانی و دەریادا. وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ﴾ واتە: هەر ئەوە ئەو بایانە ڕەوانە دەکات کە هەورەکان بەڕێ دەکات کە بارانی پێوەیە و دەیبارێنێ بەسەر بەندەکانیدا کە وەختە لە بێ بارانی و کەم ئاویدا تووشی ناڕەحەتی و کەم دەرامەتی و برسیەتی و قات و قڕی و بێ هیوایی ببن، ﴿رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَـٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: هیچ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خودا هەیە؟ خودا زۆر لەوە بڵندترە کە شەریکی بۆ دادەنێن.

﴿أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ واتە: ئەو خودایە بە دەسەلات و توانای خۆی ئەم بوونەوەرەی وەدی هێناوە و هەر خۆشی لە پاشەڕۆژدا لە ناوی دەبات و تێکی دەدات وەك لە ئایەتێکی تردا

---

[1] النحل (١٦).

[2] الانعام (٩٧).

فەرموویەتی: ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾،[1] واتە: بێگومان هەڵمەت بردنی پەروەردەت زۆر توندەو ئەو هەر خۆی وەدی دەهێنێ‌و دوبارەشی دەکاتەوە، وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾،[2] واتە: ئەو (خوا) زاتێکە بەدی هێنانی دەست پێکردووە لە پاشان (دوای مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروست کردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتە: کێ لە ئاسمان‌و زەمینەوە ڕۆزیتان دەدات، بەهۆی باران بارینەوە ڕووەکتان بۆ دەڕوێنێ‌و خێروبێری زەویتان دەداتێ، وەك لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَٱلْأَرْضِ ذَاتِ ٱلصَّدْعِ﴾،[3] واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن باران، وە بە زەوی خاوەن درزو قلیش، وە فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَآ﴾،[4] واتە: (خوا) دەزانێ چی دەچێتا بەناو زەویداو چی دەردەچێت‌و چیٙ دێتە خوارەوە لە ئاسمان‌و چی سەردەکەوێت. خودای پاك‌و بێگەرد ئاوێکی پیرۆز لە ئاسمانەوە دەبارێنێ دەچێتە ناو زەمین‌و بە شێوەی کانی دێتە دەرەوەو دەڕوات بەناو زەمیندا، پاشان بەهۆی ئەو ئاوەوە کشتوکاڵ‌و بەروبووم‌و گوڵی جوان‌و ناسك‌و هەمەڕەنگ دەڕوێت، ﴿كُلُواْ وَٱرْعَوْاْ أَنْعَٰمَكُمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ﴾،[5] واتە: (ئەی مرۆڤەکان) بخۆن‌و ئاژەڵ‌و ماڵاتەکانیشتان بلەوەڕێنن بە ڕاستی لەوەدا (کە باسکرا) بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی ژیرین. بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ﴾ ئایا پەرستراوێکی تر لەگەڵ خودا دەپەرستن ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ﴾ واتە: بەڵگەکانتان بێنن نیشانی دەن ئەگەر وا دەزانن قسەکەتان ڕاستەو غەیری خودا کەسێکی تر هەیە هاواری لێ بکەن‌و بیپەرستن. وەك فەرموویەتی: ﴿بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن. خودا خۆی ئاگادارە کە هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان بە دەستەوە نیە وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[6] واتە:

---

[1] البروج (١٢ـ١٣).

[2] الروم (٢٧).

[3] الطارق (١١ـ١٢).

[4] سبأ (٢).

[5] طه (٥٤).

[6] المؤمنون (١١٧).

هەر کەس بپەرستێ پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا کە هیچ بەڵگەیەکی نەبێت لەسەر ئەو (پەرستنە) ئەوە بە ڕاستی لێپرسینەوەی تەنها لای پەروەردگارێتی بێگومان کافران ڕزگار نابن.

﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ﴾ واتە: بڵێ کەسانێ کە لە ئاسمانەکانو زەویدان غەیب نازانن. خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد (ﷺ) کە بێژێ بە هەموو خەڵکیو فێریان بکات کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندا هەیە، نازاننو ئاگاداری نهێنیەکان نین، غەیری خودا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ئەم ڕستەیە ئیستیسنای مونقەتیعە (استثناء منقطع) خودا نەبێ هیچ کەسێك ئاگاداری نهێنیەکان نیە، هەر خۆی دەزانێو شەریکی نیە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾،[1] واتە: وەکیلی هەموو نهێنیەکان هەر لای خوایە کەسی نایانزانێت بێجگە ئەو (خوا). وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴾[2] واتە: بە ڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (کاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی وە هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی لە منداڵدانی (دایکان) دایەو هیچ کەس نازانێ سبەینێ چی دەکات وە هیچ کەس نازانێ لە چ شوێنو زەویەکدا دەمرێت بە ڕاستی خوا زاناو ئاگادارە. ئایەت لەم بارەوە زۆرە، وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ﴾ واتە: ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەمیندان نازانن کەی ڕۆژی قیامەت دێتو زیندوو دەکرێنەوە، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ﴾[3] واتە: گرانە لەسەر ئەوانەی کە لە ئاسمانەکانو زەمیندان کە بزاننو ئاگادار بن کەی دێت، لە ناکاوێك ئەو ڕۆژە دێتو ڕوتان تێدەکات. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: زانیاریان هەر ئەوەندە بڕ دەکاتو ناتوانن کاتەکەی بزانن، هەندێکی تر لە زانایان لەم ئایەتەدا ﴿بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ﴾ واتە: زانیاریان یەکسانە لەو بارەیەوە، وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا- (ﷺ)

[1] الانعام (٥٩).

[2] لقمان (٣٤).

[3] الاعراف (١٨٧).

فەرمووی بە جوبرەئیل کە پرسیاری لێ کرد لە بارەی ڕۆژی قیامەتەوە (ئەوەی پرسیاری لێ دەکرێت شارەزاترنیە لەوەی کەپرسیاردەکات).[1] واتە: وەك یەکێ لەبێ دەسەلاتی‌ونەتوانیدا، پرسیارکەرو پرسیار لێکراو. ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا﴾، ئەو زەمیرە (الضمير) دەگەڕێتەوە بۆ جنسەکە کە مەبەست پێی خوانەناسەکانە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعُرِضُوا عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا﴾[2] واتە: وە هەموو (ئادەمی) لەبەردەم پەروەردگارتدا ڕیز دەکرێن سوێند بە خوا بێگومان هاتنەوە بۆ لامان هەر بەو شێوەیەی کە یەکەم جار دروستمان کردن بەڵام ئێوە گومانتان وابوو کە ئێمە کاتێك دانانێین بۆ (لێپرسینەوە)تان. واتە خوانەناسان لە خۆتان، وە لێرەشدا هەر وای فەرموو، ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ مِّنْهَا﴾ واتە: ئەوانە بە گومان‌و دوو دڵن لە بوونی‌و لە هاتنی‌و ڕوودانی، ﴿بَلْ هُم مِّنْهَا عَمُونَ﴾ واتە: زۆر بێ ئاگاو نەزانن لە کوێر خراپترن لە بارەی هاتنی ڕۆژی قیامەتەوە.

﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ إِنْ
هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحْزَنْ
عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾

### موشریکەکان هاتنی ڕۆژی قیامەت بە درۆ دەزانن‌و وەڵام دانەوەیان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَإِذَا كُنَّا تُرَابًا وَآبَاؤُنَا أَئِنَّا لَمُخْرَجُونَ﴾ خوای گەورە باسی ئەو موشریکانە دەکات کە بڕوایان نیە بە ڕۆژی قیامەت‌و زیندووبوونەوەو ئینکاری دەکەن‌و ئێژن: چۆن ئێمە کاتێ بووین بە خۆڵ‌و ئێسکمان ڕزاو پوتورکاو ورد بوو جارێکی تر گیان دەکرێتەوە بە لاشەماندا. پاشان فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ وُعِدْنَا هَٰذَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا مِن قَبْلُ﴾ واتە: ئەم بەڵێنە بە ئێمەو باب‌و باپیرانیشمان دراوە لە پێشەوە، هەر قسەیەو دەیبیستین، وا نازانین ڕاست بێت‌و ئێژن: ﴿إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئەمەی کە باس دەکرێت کە زیندوو دەکرێنەوە لە بەسەرهاتی پێشینەکان دەکات. ﴿إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ واتە: گەلەکان لە یەکتریان وەرگرتووە لەو کتێبانەی کە لە پێشینەکانیانەوە بە دەستیان گەیشتووە، هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، خوای گەورە وەڵامیان

[1] مسلم (١/٣٦).

[2] الكهف (٤٨).

دەداتەوە کە چۆن ئەوانە وا بیردەکەنەوەو بڕوا بە زیندووبوونەوە ناکەن دەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ بلێ: ئەی موحەممەد (ﷺ) بەو خوانەناسانە: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: با بڕۆن بگەڕێن بەسەر زەمیندا بە چاوی خۆیان ببینن کە چۆن خودای مەزن تۆڵەی لەو خوانەناسانەی پێش ئەوان کردووەتەوەو تەفروتونای کردوون‌و لەناوی بردن‌و پێغەمبەران‌و شوێنکەوتووانی لە خاوەن باوەڕان لەنێوان ئەواندا ڕزگارو سەربەرز کرد، ئەوانە هەموو بەڵگەن لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) هێناویانەو چاکی ئەو پەیامە. پاشان خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: بە باوەڕنەهێنانی ئەو موشریکانە دڵتەنگ مەبە، داخ‌و کەسەریان بۆ هەڵمەکێشە، ﴿وَلَا تَكُن فِي ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ﴾ واتە: لەو فێڵانەی ئەوان دەیکەن‌و دژی ئەو پەیامە دەوەستن کە تۆ بۆت هێناون دڵتەنگ مەبەو خەفەت مەخۆ، خودا پشتگیرو یلرمەتی دەری ئاینەکەتە، سەری دەخات بەسەر ئەوانەدا کە واز ناهێنن‌و دژایەتی دەکەن.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٧١) قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ (٧٢) وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ (٧٣) وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ (٧٤) وَمَا مِنْ غَائِبَةٍ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ (٧٥)﴾

خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات کە هاتنی ڕۆژی قیامەت بە درۆ دەزانن‌و بڕوایان وایە کە هەرگیز ڕوو نادات ئێژن ئەگەر ئەو قسەیە ڕاستە کەی دێتەدی وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ خوای گەورەیش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بێژە: ﴿عَسَىٰ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعْضُ الَّذِي تَسْتَعْجِلُونَ﴾ واتە: لەوانەیە زۆر لێتانەوە نزیك بووبێتەوە هەندێ لەو سزایانەی کە داوای هاتنی دەکەن لابە پەلە. ئیبنو عەباس دەڵێ: لەوانەیە ئەوەی ئێوە پەلەی لێ دەکەن زۆر نزیك بوو بێتەوە یان زۆر نزیك بێت لێتانەوە.[1] موجاهیدو زەحاك‌و عەتای خۆراسانی‌و قەتادەو سودیش هەر وایان وگوتووە.[2] وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَ قُلْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَرِيبًا﴾،[3] واتە: وە دەڵێن ئەوە کەی دەبێت بلێ

[1] الطبري (١٩/٤٩٢).

[2] الطبري (١٩/٤٩٢)، الدر المنثور (٦/٣٧٥).

[3] الاسراء (٥١).

لەوانەیە ئەو (ڕۆژە هاتنی) نزیك بێت، وە دەفەرمووێت: ﴿ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾[١]، واتە: بە پەلە لە تۆ داوای (هێنانی) سزا دەکەن کە بە ڕاستی دۆزەخ دەوری کافرانی داوە. بۆیە ئەو لامە ـ اللام ـ چووەتە سەر ﴿رَدِفَ لَكُم﴾ چونکە مانای (عَجِلَ لَكُم) زۆر نزیکە دەگەیەنێت، وەك لە موجاهیدەوە ڕیوایەت کراوە ﴿عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم﴾ واتە: لەوانەیە زۆر لێتانەوە نزیك بێت.[٢] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: خوای تۆ چاکەی زۆرە بەسەر خەڵکەوە ئەو هەموو بەهرە زۆرەی ڕژاندووە بەسەریاندا کەچی ئەوان هەر ناهەقی لە خۆیان دەکەن، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ﴾ واتە: شوکرانەبژێری ئەو هەموو چاکەیە ناکەن ژمارەیەکی زۆر کەمیان نەبێت. ﴿وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ واتە: خودا چۆن ئاگاداری هەمووشتە ئاشکراکراوەکانیانە هەربەو شێوەیە ئاگاداری گشت شتە شاراوەکانیشیانە. وەك لە چەند ئایەتێ تردا فەرموویەتی: ﴿ سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ﴾،[٣] واتە: یەکسانە (بۆ خوا) ئەوەتان بە نهێنی قسە بکات وە ئەوەتان بە ئاشکرا (قسە) بکات.وە فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى﴾،[٤] واتە: ئەوە بە ڕاستی ئەو (خوا) نهێنیو لە نهێنی شاراوەتریش دەزانێ. وە دەفەرمووێت: ﴿أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾،[٥] واتە: بێدار بن کاتێك ئەوانە خۆیان دادەپۆشن بە پۆشاکەکانیان (خوا) دەزانێ بەوەی دەیشارنەوەو ئەوەی ئاشکرای دەکەن. پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ئاگاداری هەموو نهێنیەکانی ئاسمانەکانو زەمینەو لە دیارو نادیاریش، ئەوەی کە بەندەکانی ئاگاداری نینو نەیان بینیوە، دەفەرمووێت: ﴿وَمَا مِنْ غَآئِبَةٍ فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ: هیچ شتێك نیە لە ئاسمانەکانو زەمیندا،[٦] ﴿إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: هەموو لە کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا نووسراوە، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە

---

[١] العنكبوت (٥٤).

[٢] الطبري (١٩/٤٩٢).

[٣] الرعد (١٠).

[٤] طه (٧).

[٥] هود (٥).

[٦] الطبري (١٩/٤٩٤).

دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾[1]، واتە: ئایا نازانی بە ڕاستی خودا دەزانێ بە هەموو ئەو شتانەی لە ئاسمان‌و زەویدایە بێگومان ئەوەی باسکرا لە کتێبی (لوح المحفوظ) دایە بە ڕاستی ئەم (زانیاریەی باسکرا) بە لای خواوە ئاسانە.

﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾ وَإِنَّهُ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ
﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ بِحُكْمِهِ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۖ إِنَّكَ عَلَى الْحَقِّ الْمُبِينِ ﴿٧٩﴾
إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ الْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ الصُّمَّ الدُّعَاءَ إِذَا وَلَّوْا مُدْبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَا أَنْتَ بِهَادِي الْعُمْيِ عَنْ ضَلَالَتِهِمْ ۖ إِنْ تُسْمِعُ
إِلَّا مَنْ يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا فَهُمْ مُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾﴾

## قورئان باسی ناکۆکی نێوان بەنی ئیسرائیل دەکات کە خودا دادوەری دەکات لە نێوانیاندا

خوای گەورە باسی قورئانی پیرۆز دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: ئەم قورئانە لەگەڵ ئەوەشدا کە پڕە لە ڕێنمایی‌و کتێبێکی ڕوونکەرەوەیە‌و هەق‌و ناهەق لە یەکی جیادەکاتەوە، باسی کێشەی نەوەی ئیسرائیلیش دەکات کە هەڵگری کتێبی ئەوان‌و ئینجیلن. ﴿أَكْثَرَ الَّذِي هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ وەك هەرایان لەسەر عیسا کە زۆر ناکۆکن لەسەری‌و ڕای جیاوازیان هەیە، جولەکە درۆیان هەڵبەستووە‌و گاورەکان زیادەڕەویان کردووە لە ڕێزلێگرتنیدا، قورئان بە شێوەیەکی جوان‌و ڕاست باسی عیسا دەکات کە عەبدێك بووە لە عەبدەکانی خواو پێغەمبەرێکی بەڕێزی خوای گەورەیش بووە (سەلامی خوای لەسەر بێت) وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ﴾[2]، واتە: ئەوە (کە باسکرا) عیسای کوڕی مەریەمە کە وتەیەکی ڕاستە (دەربارەی عیسا) کە ئەوان (گاورو جوولەکەکان) تێیدا دوو دڵن. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُ لَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ڕێنیشاندەرە بۆ دڵی ئەوانەی کە بڕوایان پێی هەیە‌و ڕەحمەتیشە بۆیان لە گشت کاروبارێکیاندا، پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ﴾ واتە: پەروەرندەی تۆ دادوەریان دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿بِحُكْمِهِ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ﴾ واتە: بە بڕیاری خۆی هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە‌و لە تۆڵە سەندندا، تۆڵەی بە زەبرە ﴿الْعَلِيمُ﴾ زۆر چاك ئاگاری کردارو گفتاری بەندەکانیەتی.

---

[1] الحج (٧٠).

[2] مريم (٣٤).

## فەرمان دان بە خۆسپاردن بە خودا لە گەیاندنی بانگەوازدا

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: تۆ خۆت بە خوا بسپێرە لە هەموو ئیش‌و کارێکتداو بانگەوازی پەروەرندەت بە خەڵکی بگەیەنە، ﴿إِنَّكَ عَلَى ٱلْحَقِّ ٱلْمُبِينِ﴾ واتە: بە ڕاستی لەسەر هەقی ئاشکرای، چونکە ئەو کەسەی دژایەتیت دەکات لەوانەن کە بەدبەخت‌و عاقیبەت شەڕن، خودا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، باوەڕناهێنن ئەگەر هەرچی بەڵگەیە بۆیان بێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ واتە: تۆ ناتوانی بە مردووی گۆڕستان ببیسێنی، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی کە خودانەناسن پەردە لەسەر دڵیانەو گوێشیان کەڕەو بێ دینی داگیری کردووە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ﴾ واتە: وە تۆ ناتوانی کوێران ڕزگار کەیت لە گومڕاییەکەیان تەنها ئەوانە وەڵامت دەدەنەوە کە خاوەنی بیستن‌و بینینێکی بە سوودو دڵو دەروونێکی وشیارن‌و گەردنکەچی خوداو ئەو پەیامە بن کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆیان هاتووە.

﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾﴾

## هاتنە دەرەوەی گیانەوەرێك لەناو زەمیندا (دابة الارض)

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا وَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَآبَّةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾ واتە: هەر کاتێك بەڵێنی ئێمە هاتەجێ بۆ ئەو خەڵکە، لە ئاخر زەماندا، گیانەوەرێکیان لەم زەمینە بۆ دەردەهێنین قسەیان لەگەڵ دەکات‌و ئێژێ: خەڵکی باوەڕیان بە نیشانەکانی ئێمە نەکردو بە ڕاستیان نەدەزانی، ئەم گیانەوەرە ـ دەعبایە ـ لە کۆتایی دنیادا لە زەوی دێتە دەر کاتێك کە خەڵکی دەست دەدەنە بێ ناموسی‌و خراپەکاری‌و پشت دەکەنە فەرمانەکانی خوداو دەستکاری دەکەن‌و دەیگۆڕن، هەندێك ئێژن: لە مەککە لە زەمین دێتە دەر، هەندێکی تر ئێژن: لە مەککە نایەتە دەر لە شوێنی لە زەمین دێتە دەر، وەك لەمەودوا بە یارمەتی خوا بە درێژی باسی دەکەین. کە قسە لەگەڵ خەڵکی دەکات لەو بارەیەوە، وەك ئیبنو عەباس‌و حەسەن‌و قەتادە گوتوویانە، ڕیوایەتیش کراوە لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە لەگەڵیان قسە دەکات، واتە: وتووێژیان لەگەڵ دەکات.[1] لە بارەی ئەم گیانەوەرە (الدابة) قسەوباس زۆرە چەندێکی بتوانین بە یارمەتی خوا باسی دەکەین. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاریەوە دەڵێ: ئێمە باسی ڕۆژی قیامەتمان دەکرد پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ژوورێکەوە ـ

---

[1] الطبري (١٩/٥٠٠).

هۆدەیەکەوە ـ ئاگای لێمان بوو، فەرمووی: (قیامەت هەڵناسێت ـ نایەت ـ هەتا دە نیشانە دەبینن: هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، دوکەڵ ـ الدخان ـ، گیانەوەرێکە ـ الدخان ـ، دەرچوونی یەئجوجو مەئجوج، هاتنی ـ دابەزینی ـ عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لێ بێت)، دەجال، وە سێ ڕۆچوونی زەمینیش: ڕۆچوونێك لە خۆرئاواوە، ڕۆچوونێك لە خۆرهەڵاتەوە، ڕۆچوونێکیش لە دوورگەی عەرەبەوە ـجزیرة العربـ، ئاگرێکیش لەناو یەمەندا (الیمن) سەر هەڵدەدا خەڵکی ڕاپێچ دەکات، یان: کۆیان دەکاتەوە، لەگەڵیانە بۆ هەر لایەك بڕۆن بە شەوو بە ڕۆژ لێیان جیانابێتەوە).[١] هەر بەم شێوەیە موسلیمو ئەهلی سوننەکان لە حوزەیفەوە ڕیوایەتیان کردووەبە مەرفوعی (مرفوعاً) تیرمزی دەڵێ: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە.[٢] موسلیمیش بە تەنها ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەوە بە مەرفوعی.[٣] والله أعلم، فەرموودەیەکی تر: موسلیمی کوڕی حەججاج ڕیوایەتی کردووە لەعەبدوڵای کوڕی عەمرەوە ـ عمرو ـ دەڵێ: فەرموودەیەکم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەبەر کردووە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، بیستم لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) فەرمووی: (یەکەم نیشانەیەك کە دەرکەوت، واتە: لە نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، وە دەرکەوتنی گیانەوەرەکەیە (الدابة) لە چێشتەنگادا (الضحی) کە دێتە ناو خەڵکی، هەر یەکێکیان پێش ئەویان هات، ئەوی تریشیان بە دوایدا دێت).[٤] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموویەتی: (لە شەش شت دەستپێشخەری بکەنو کاری چاکەی تێدا بکەن، هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، دوکەڵەکە ـ الدخان ـ، دەجال، دەعباکە (الدابة) مردنی خۆتان، هاتنی ڕۆژی قیامەت) تەنها موسلیم خۆی ڕیوایەتی کردووە.[٥] فەرموودەیەکی تر: ئەبو داودی تەیالیسی (الطیالیسي) ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (گیانەوەرەکەی ناو زەمین (دابة الارض) دێتەدەر، گاچۆنەکەی (عصا) موساو ئەنگوستیلەکەی (خاتم) سولەیمانی لەگەڵ دایە (سەلامی خوایان لێ بێت) بە گاچۆنەکە دەدا لە لوتی خوانەناس (الکافر) وە ڕووی خاوەن باوەڕیش بە ئەنگوستیلەکە ـ بە خاتەمەکەـ دەردەکەوێتو دیاری دەدات، هەتا خەڵکی لەسەر سفرەی نان خواردن ـخوانـ کۆدەبنەوە، خاوەن باوەڕ لە خوانەناس

---

[١] أحمد (٦/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] مسلم (٢٢٢٥/٤)، ابو داود (٤٩١/٤)، تحفة الأحوزي (٤١٣/٦)، النسائي في الکبری (٤٥٦/٦)، ابن ماجه (١٣٤١/٢).

[٣] مسلم (٢٢٢٧/٤).

[٤] مسلم (٢٢٦٠/٤).

[٥] مسلم (٢٢٦٧/٤).

جیادەکرێتەوەو دەناسرێت).[1] ئیبنو جورەیج دەڵێ: لە ئیبنو زوبەیرەوە (ابن زبیر) کە باسی (وەسفی) گیانەوەرەکەی کردووە گوتوویەتی: سەری وەك سەری گایەو (الثور) چاوی وەك چاوی بەرازەو گوێی وەك گوێی فیلەو شاخی وەك حەیوانی کێویەو ملی وەك ملی نەعامەیەو سنگی وەك سنگی شێرەورەنگی وەك رەنگی پڵنگەو کەلەکەی (خاصرة) وەك کەلەکەی پشیلەیەو کلکی (دوگی) وەك کلکی بەران (کبش) وایەو لاقەکانیشی وەك لاقی وشترە، نێوانی هەردوو جومگەیەکی (مُفصلین)دوانزە زیراعە، گۆچانەکەی موساو خاتەمەکەی سولەیمانی لەگەڵدا دەردەکەوێت، هیچ خاوەن باوەڕێ نامێنێ مەگین خاڵێکی سپی دەنرێت بە نێو چاوانیدا بە گاچۆنەکەی موسا، ئەو خاڵە دەگەڕێت هەتا نێوچاوانی سپی دەکاتەوە. وە هیچ کافرێکیش (خوانەناس) نامێنێ مەگین خاڵێکی ڕەش دەنرێت بەنێوچاوانیدا بە خاتەمەکەی سولەیمان، ئەو خاڵە دەگەڕێت هەتا هەموو نێوچاوانی ڕەش دەکات، هەتا خەڵکی کڕین و فرۆش (مامەڵە) دەکەن لەنێو بازاڕدا، کافر ئێژێ بە موسڵمان: ئەمە بە چەند ئەی موسڵمان، موسڵمانیش چێژێت بە کافر: ئەمە بە چەند ئەی کافر؟ هەتا وای لێ دێت خەڵکی ماڵێك لەسەر سفرەی نان خواردن دادەنیشن موسڵمان و کافری تیا جیادەکرێتەوە (دەناسرێت) پاشان دەعباکە (دابة) پێیان ئێژێ: فلانە کەس مژدە بێت تۆ خەڵکی بەهەشتی و ئەی فلانە کەس تۆ خەڵکی ئاگری، بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ﴾،[2] واتە: هەر کاتێك بڕیارمان دەرچوو بۆیان، گیانەوەرێکیان لەم زەمینەدا بۆ دەهێنینە دەرەوە کە وتووێژیان لەگەڵ دەکات و پێیان ئێژێ: خەڵکی لە ناخی دڵیانەوە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە نەدەکرد.

﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِآيَاتِنَا فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوا قَالَ أَكَذَّبْتُم بِآيَاتِي
وَلَمْ تُحِيطُوا بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا
جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٨٦﴾﴾

### کۆکردنەوەی ستەمکاران (زاڵمان) لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە باسی ڕۆژی قیامەت دەکات، کاتێك کە ستەمکاران ئەوانەی کە بڕوایان نەبوو بە نیشانەکانی خوداو پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت) کۆ دەکرێنەوە لەبەردەم خودای گەورەدا پرسیاریان لێ دەکرێت لەو کارانەی کە کردوویانە لە ژیانی دنیادا، بۆ ڕیسواکردن و داخ نان بە دڵیانداو

---

[1] مسند الطياسي (٣٣٤) ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[2] البغوي (٤٢٩/٣).

سوکایەتی پێکردنیان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ نَحْشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ فَوْجًا﴾ واتە: لە هەموو گرۆیەك (کۆمەڵێك) لەوانەی کە بێباوەڕ بوون کۆدەکەینەوە، ﴿مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ لەوانەی باوەڕیان نەبوو بە نیشانەکانی ئێمە، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ﴾،[1] واتە: (خوا بە فریشتەکان دەفەرمووێت) ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە لەگەڵ هاوڕێکانیان (هاووێنەکانیان). وە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ﴾،[2] واتە: وە ساتێك کە هەموو گیانێك جووت کرایەوە (لەگەڵ لاشەدا). ﴿فَهُمْ يُوزَعُونَ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێ: راپێچ دەکرێن.[3] عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: بەڕێ دەکرێن.[4] ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو﴾ واتە: هەر کاتێك دەگەنە بەر بارەگای خوداو دەوەستێنرێن‌و پرسیاریان لێ دەکرێت، ﴿قَالَ أَكَذَّبْتُم بِـَٔايَـٰتِى وَلَمْ تُحِيطُوا۟ بِهَا عِلْمًا أَمَّاذَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: دەفەرمووێت ئایا ئێوە ئایەتەکانی منتان بە درۆ دەزانی لە کاتێکدا هیچ زانیاریەکتان دەربارەیا نەبوو یان ئێوە چیتان دەکرد لە دنیادا. یانی پرسیاریان لێ دەکرێت لە بارەی بیروباوەڕو کردارەکانیانەوە، کاتێك کە لە کۆمەڵی بەختەوەران نەبوون‌و ئاکاری چاکیان نەبووەو نوێژیشیان نەکردووەو خاوەن بڕوایش نەبوون، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ۝٣١ وَلَـٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ﴾،[5] واتە: جا (کافر) نە بڕوای هێناو نە نوێژی کرد، بەڵکو ئاینی بە درۆ دەزانی‌و پشتی تێدەکرد. ئەو کاتە هیچ بڕوبیانوویەکیان بە دەستەوە نامێنێ، هەموو تاوانەکان لەسەریان کەڵەکە دەکات‌و کۆ دەبێتەوەو قسەیان نامێنێ، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَـٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ۝٣٥ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ۝٣٦ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾،[6] واتە: ئەمڕۆ ڕۆژێکە (بێباوەڕان) ناتوانن قسەی تێدا بکەن، وە مۆڵەت نادرێن کە بڕوبیانوو بهێننەوە، وای بۆ بێباوەڕان لەو ڕۆژەدا. هەر بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَوَقَعَ ٱلْقَوْلُ عَلَيْهِم بِمَا ظَلَمُوا۟ فَهُمْ لَا يَنطِقُونَ﴾ واتە: وە بڕیاری

---

[1] الصافات (٢٢).

[2] التكوير (٧).

[3] الطبري (٥٠١/١٩).

[4] الطبري (٤٣٨/١٩).

[5] القيامة (٣١ـ٣٢).

[6] المرسلات (٣٥ـ٣٧).

(سزادانیان) بەسەرا دەسەپێ بە هۆی ستەمكاریانەوە ئینجا ئەوان هیچ قسە ناكەن. یانی دەمكوت كراونو هیچ وەڵامێكیان پێ نەبوو، چونكە ئەوانە لە ژیانی دنیادا ستەمكاربوونو ناهەقیشیان لە خۆیان كرد، گەڕێنرانەوە بۆ لای ئەو خودایەی كە ئاگای لە دیارو نادیارەكانەو هەرگیز هیچی لێ ون نابێت. پاشان خودای گەورە ئاگادارمان دەكاتەوە لەسەر تواناو دەسەڵاتو مەزنی خۆی كە پێویستە هەموو كاتێ فەرمانەكانی بەجێ بهێنرێتو بپەرسترێتوخەڵكی شوێنی ئەوپەیامە بكەوێ كە ڕەوانەی كردووە بۆ پێغەمبەرەكانی، هەر ئەوە هەقەو لێی لانەدەن وەك فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِيَسْكُنُوا۟ فِيهِ﴾ واتە: ئایا ئەوانە نەیان دیووە كە شەومان وا لێكردووە كە لە تاریكیەكەیدا پشوبدەنو دانیشنو دڵیان ئارام بگرێت لەو ماندووبوونو ناڕەحەتی ڕۆژە كە تووشیان بووەو بحەسێنەوەو ماندوویبیان دەربچێت، ﴿وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا﴾ واتە: ڕۆژیشمان وا لێكردووە كە ڕووناكەو پرشەی لێوە دێ بۆ ئەوەی كارو فەرمانی تێدا بكەنو بژێوی خۆیانی تیا پەیدا بكەنو هاتوچۆ بكەن بۆ بازرگانیو هەر شتێكی تر لە پێویستیەكانی ژیانیان، ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: لەمەشدا بەڵگە زۆرن بۆ ئەوانەی كە باوەڕ دێنن.

﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى
ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ مَن جَآءَ
بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ
إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٠﴾﴾

### كارەساتە گرانەكانی ڕۆژی قیامەتو پاداشتی چاكەو خراپە تێیدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خوای گەورە باسی ناڕەحەتیو سامناكی ڕۆژی قیامەت دەكات، ئەو ڕۆژەی كە فو دەكرێت بە كەڵەشاخدا جا هەرچی كەس لە ئاسمانەكانو زەویدایە دەترسێتو ڕادەچڵەكێ (هەموو دەمرن)، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (كەڵەشاخێكە (قرن) فوی پیا دەكرێت) وە لە فەرموودەكەی سوڕا (الصّور) هاتووە: بە فەرمانی خودای مەزن ئیسرافیل فو دەكات بە كەڵەشاخدا، یەكەم جار كە فوی پێدا دەكات، فوە ترسناكەكەیە درێژی دەكاتەوە، ئەمەیش لە كۆتایی (ئاخری) تەمەنی دنیادایە، كاتێ كە قیامەت هەڵدەسێتو دێت بەسەر خراپترین كەسدا لە زیندووەكان، هەر كەسێك لە ئاسمانەكانو زەمیندایە ترسیان لێ دەنیشێت، ﴿إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ واتە: مەگین كەسێك خودا مەیلی لێ بێت، كە

ئەوانەش شەهیدانن بێگومان ئەوانە زیندوون لە لای پەروەرندەیان بژێویان هەیە.[1] ئیمامی موسلیمی کوڕی حەججاج ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە پیاوێك هاتە لای و گوتی: چیە ئەم فەرموودەیەی تۆ دەیڵێی کە قیامەت تا فلانە وەختو فلانە وەخت هەڵدەستێ؟ عەبدولا گوتی: (سبحان الله!) یان گوتی (لا اله الاّ الله). یان قسەیەکی وای گوت، گوتی: نیازم وایە کە لەمەوبەدوا بۆ هیچ کەسێك فەرموودەی وا ڕیوایەت نەکەم. من هەر ئەوەندەم گوتووە کە ئەوەندەی پێ ناچێت ڕووداوێکی ـ ئەمرێکی ـ گەورە ئەبینن، کەعبەی پیرۆز دەسوتێ، ئەوەو ئەوە دەبێت، لە دوایدا گوتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (لەناو ئومەتی مندا دەجال هەڵدەستێ چل ئەوەستێ، نازانم چل ڕۆژ یان چل مانگ یان چل ساڵ، لە پاشان خودا عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت (سەلامی خوای لێ بێت) کە وەك عوروەی کوڕی مەسعود وایە، شوێنی دەکەوێو دەیکوژێت، لە پاشان حەوت ساڵ خەڵك دەمێننەوە، لە نێوان هیچ دوو کەسێکدا دوژمنایەتی نابێت، لە پاشان بایەکی فێنك دەنێرێت لە شامەوە لەسەر ڕووی زەمیندا هیچ کەسێك نامێنێتەوە لەوانەی کە زەڕەیە باوەڕ یان چاکە لە دڵیدا بێت، هەموویان گیان دەکێشێت، هەتا ئەگەر یەکێك لە ئێوە بچێتە ناوجەرگەی شاخێکەوە ئەو بایە دەچێتە ناو شاخەکە هەتا گیانی بکێشێت، عەبدولا دەڵێ: ئەوەم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بیست فەرمووی: (هەر خەڵکی خراپ دەمێننەوە بۆ خراپەکردن، وەك باڵدار وانە ئەوەندە سوك هەڵدەستنە سەر خراپەکردن، لە عەقڵی دڕندەدان نە چاك دەزانن کە بیکەنو نە فەرمانی پێ دەکەن، نە خراپەش دەزانن کە لێی لادەنو یەکێکی تر کردی نەیەڵن بیکات، شەیتان بۆ ئەو کەسانە دەچێتە شێوە مرۆڤەوە پێیان ئێژێت: ئێوە بە گوێم ناکەن؟ ئەوانیش ئێژن: فەرمانت بە چیە؟ فەرمانیان پێ دەکات بە بت پەرستن، ئەو خەڵکە لە بت پەرستندا ڕۆزیان زۆر دەبێتو ژیانیان خۆش دەبێت. لە پاشان فو دەکرێت بە کەڵەشاخدا (الصور) هیچ کەسێك نیە کە بیبیستێت لایەکی ملی لار نەکاتەوەو لایەکی بەرز نەکاتەوە ـبەلادانەبێـ دەڵێ: یەکەم کەس کە دەیبیستێ ئەو پیاوەیە کە حەوزی وشترەکان سواغ دەدات، گوتی: دەمرێتو هەموو خەڵکیش دەمرن، لە دواییدا خوا بارانێك دەبارێنێت وەك پروشەو شەونم، یان وەك سێبەر ـنوعمان کەوتووەتە گومانەوە لە عەبدولا چی گوتووەـ بەو بارانە لاشەی خەڵکی دەڕوێتەوە، لە پاشان جارێکی تر فوو دەکرێت بە کەڵەشاخدا (الصور) هەموو ڕاست دەبنەوەو تەماشا دەکەن. لە پاشان فەرمان دەدرێت، ئەی خەڵکینە بێن بۆ لای پەروەرندەی خۆتان، فەرمان دەدرێت ڕایان بگرنو پرسیاریان لێ دەکرێت، لە دوایدا فەرمان دەکرێت ئەوەی دەچێتە ئاگرەوە جیایان بکەنەوە. دەوترێت: لە چەند چەند؟ دەبێژرێت: لە هەر هەزار کەس نۆ سەدو نەوەدو نۆ،

---

[1] الطبراني في الطوال (٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

دەڵێ: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە منداڵ پیر دەکات، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە لێپرسینەوە قوڵی لێ هەڵدەکرێت – ناڕەحەتی دەست پێدەکان[1]– وە دەفەرموێت: (پاشان فوو دەکرێت بە کەڵەشاخدا هیچ کەسێك نیە کە بیبیستێ مەگین لایەکی ملی لار دەکاتەوەو لایەکی بەرز دەکاتەوە)، (الليت) لا مل، واتە: لار دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە ئاسمانەوە ببیستێ، ئەمە خۆی ترساندنە (نفخة الفزع) پاشان (نفخة الصعق) واتە فووی مردن دێتو پاشانیش فووی هەڵستانەوە دێتو بۆ لای پەروەرندەی هەموو جیهان. کە هاتنە دەرەوەی هەموو خەڵکە لە گۆڕەکانیان. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ﴾ واتە: هەموو بە زەلیلی دێنە بەر بارەگای خودا ﴿أَتَوْهُ﴾ بە مەدیش خوێنراوەتەوەو بە غەیری مەدیش لەسەر فیعلەکە (الفعل) هەردوو یەك مانایان هەیە، ﴿دَاخِرِينَ﴾ واتە: بە زەلیلیو گوێڕایەڵی هیچ کەسێك لە فەرمانی خودای مەزن دوا ناکەوێت وەك فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بنگتان دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) جا ئێوەش دەست بەجێ دێن بە دەم بانگ کردنەکەوە بە سوپاسو سەناکردنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنْتُمْ تَخْرُجُونَ﴾[3] واتە: پاشان کاتێ (لە ڕۆژی دواییدا) لە زەویەوە بانگتان دەکەن یەکسەر ئێوە (لە گۆڕەکانتان) دێنە دەرەوە. وە لە فەرموودەی کەڵەشاخدا (الصور) هاتووە.[4] لە کاتی فووی سێیەمی ئیسرافیلدا خوای گەورە فەرمان دەکات بە گیانەکان (الارواح) لە بۆشاییەکی (کونێکی) ناو کەڵەشاخەکەدا دادەنرێت پاشان ئیسرافیل فووی پیادەکات، دوای ڕوانەوەی (سەوزبوونەوەی) لاشەکان لەشوێنو گۆڕەکانیاندا، وەختێ فوو کرا بە کەڵەشاخدا گیانەکان دەفڕنو گیانی خاوەن بڕواکان پرشەیان لێوەدێ لە ڕووناکیداو گیانی خوانەناسانیش تاریکە، خوای گەورە دەفەرموێت: بە گەورەیو دەسەڵاتی خۆم سوێند بێت، هەموو گیانەکان دەبێت بگەڕێنەوە بۆ لاشەکانیان، گیانەکان دەگەڕێنەوە بۆ لاشەکان دەڕواتو دەگەڕێت بەناو لاشەکاندا وەك چۆن ژەهری مار دەگەڕێ بەناو لەشی مارگەستەدا پاشان هەڵدەسنەوەو خۆڵ لە گۆڕەکانیان لادەدەن، واتە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾،[5] واتە: ئەو

---

[1] مسلم (٤/٢٢٥٨).

[2] الاسراء (٥٢).

[3] الروم (٢٥).

[4] الطبراني في الطوال (٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[5] المعارج (٤٣).

ڕۆژەی کە بە پەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە دەڵێی بۆ لای بتەکانیان ڕادەکەن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ﴾ واتە: کێوەکان وا دەبینی وەك ئەوەی کە ناجوڵێن‌و وەستاون کەچی وەك هەور دەڕۆن‌و لەجێی خۆیان نامێنن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ۝٩ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا﴾،[1] واتە: ڕۆژێك کە ئاسمان زۆر توند دەکەوێتە جووڵەو هاتوچۆ، وە چیاکان (لە جێی خۆیان) دەجوڵێن‌و توند دەڕۆن. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ۝١٠٥ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ۝١٠٦ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا﴾[2]، واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ)) پرسیارت لێ دەکەن سەبارەت بە شاخەکان تۆش بڵێ پەروەردگار لە بێخیان دێنێ‌و وردوخاشیان دەکات ئینجا با پرژو بڵاویان دەکاتەوە، ئینجا ڕێك‌و ساف بێ ئاوو گژوگیا دەیهێڵێتەوە، نابینی تێیدا هیچ جۆرە لاری‌و بەرزی‌و نزمیەك. وە فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً﴾[3] واتە: وە (یادیان خەرەوە) ڕۆژێك کە شاخەکان دەخەینەڕێ‌و ڕووی زەوی بە تەختی‌و ڕوونی دەبینی. وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ واتە: دەستکردی خودایە کە هەموو شتێك بە دەسەڵات‌و توانای مەزنی خۆی وەدی دەهێنێ ﴿ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ﴾ واتە: هەموو دروست کراوەکانی زۆر بە چاکی سازداوەو لە جێگای خۆی وەدی هێناوە بەو شێوەیەی کە پێویستە بە کارزانی خۆی، ﴿إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ واتە: ئەو خودایە ئاگاداری عەبدەکانیەتی کە چی دەکەن لە چاکەو خراپە، بەو زووانە پاداشتی تەواویان دەداتەوە لەسەری. خودای گەورە باسی ژیانی بەختەوەران‌و بەدبەختانی کردووە لەو ڕۆژە فەرموویەتی: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا﴾ قەتادە دەڵێ: هەر کەسێك چاکە بکات بە دڵپاکی.[4] وە خوای گەورە لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی یەك بە دە پاداشتی دەداتەوە، ﴿وَهُم مِّن فَزَعٍ يَوْمَئِذٍ ءَامِنُونَ﴾ واتە: لە ئەو ڕۆژە ئەوانە بێ خەمن. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ﴾،[5] واتە: غەمباریان ناکات

---

[1] الطور (٩_١٠).

[2] طه (١٠٥_١٠٧).

[3] الكهف (٤٧).

[4] الطبراني (١٩/٥٠٨).

[5] الانبياء (١٠٣).

ترسە هەرە گەورەکە (لە قیامەتدا). وە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يُلْقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِيٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾[1] واتە: دەی ئایا کەسێك دەخرێتە ناو ئاگرەوە چاکترە یا ئەو کەسەی لە ڕۆژی قیامەت دابێت ترس دێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَهُمْ فِي ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ﴾،[2] واتە: ئەوان لە کۆشکە بەرزەکانی (بەهەشتدا) لە ئاسایش دان. وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ﴾ واتە: کەسێك بچێتە بەر بارەگای خودا بە تاوانباری‌و چاکەی نەبێت یان کردارە خراپەکانی پارسەنگی هەبێت (قورستر بێت) بەسەر چاکەکانیدا بە ڕوودا دەخرێتە ناو ئاگری جەهەنەم، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئایا زیاتر لە پاداشتی کارەکەیان سزا دەدرێن؟ وە زۆرینەی زانایانی سەلەف گوتویانە: ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ﴾ واتە: بە بت پەرستیەوە.

﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩١﴾
وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ
سَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾﴾

## فەرمان دان بە خوا پەرستی‌و بانگەوازکردن بە قورئان

خوای گەورە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئاگادار دەکاتەوەو فەرمانی پێ دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلْبَلْدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيْءٍ﴾ واتە: فەرمانم پێ دراوە کە خوای ئەم شارە کە خودا خۆی ڕێزی لێناوە بپەرستم، هەموو شتێکیش هەر هی ئەوە. وەك فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمْ﴾،[3] واتە: بڵێ ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە لە گوماندان لە (ڕاستی) ئایینەکەم ئەوە من ناپەرستم ئەوانەی کە ئێوە دەیپەرستن بێجگە لە خوا بەڵکو ئەو خودایە دەپەرستم کە ئێوە دەمرێنێ. دانەپاڵی پەروەرندەی ئەلای ئەو شارە بۆ ڕێزلێنان‌و گرنگی پێدانی وەك خودای مەزن لە سورەتی قورەیشدا فەرموویەتی: ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِيٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ﴾[4]، واتە: دەبا خاوەنی

---

[1] فصلت (٤٠).

[2] سبأ (٣٧).

[3] يونس (١٠٤).

[4] القريش (٣-٤).

ئەم خانە (کەعبە)یە بپەرستن ئەو زاتەی کە لە برسێتیدا (ڕزگاری کردن‌و) خواردەمەنی بۆ ناردن‌و لە ترس‌و بیم (پاراستنی‌و) دڵنیای کردن. وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِى حَرَّمَهَا﴾ واتە: خوای گەورە ڕێزی لێناوە، بۆیە ڕێزی لێ دەگیرێت چونکە خودا فەرمانی داوەو بڕیاری ئەوە. وەك لە هەردووو صەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا فەرمووی: (ئەم شارە خودا ڕێزی لێ گرتووە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کردووە، ئەو ڕێزەی هەر لێ دەگیرێت کە خودا لێی گرتووە هەتا ڕۆژی قیامەت، دارودرەختی نابڕیٚ‌و نێچری ڕاو ناکرێت‌و دۆزراوەی هەڵناگیرێ مەگەر کەسێ کە جاڕی بۆ بدات ـپێناسەی بکات، گیاو گژەشی نابڕیٚ) هەتا کۆتایی فەرموودەکە.[1] وەك دیارو ڕوونە لە کتێبی ئەحکامدا (کتاب الاحکام) لە شوێنی خۆیدا کە لە کتێبە سەحیح‌و چاکەکان‌و موسنەدەکاندا لە چەند ڕێگاوە لە کەسانێکەوە کە زۆر جێگای بڕوان هاتووەو وەرگیراوە.[2] وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُۥ كُلُّ شَىْءٍ﴾ لە بابی عەتفی عامە بۆ سەر عەتفی خاس. واتە: ئەو خودایەی کە پەروەرندەی ئەم شارەیەو پەروەرندەی هەموو شتێکەو خاوەنیەتی هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو ﴿وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ واتە: فەرمانم پێدراوە کە منیش یەکێك بم لە موسڵمانان، واتە: لە یەکتاپەرستی‌و دڵسۆزی‌و گەردنکەچی‌و گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی خودا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنْ أَتْلُوَا۟ ٱلْقُرْءَانَ﴾ واتە: فەرمانم پێدراوە کە قورئان بە خەڵکی ڕابگەیەنم. وەك لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ﴾،[3] واتە: ئەم بەسەرهاتانەی کە دەیان خوێنینەوە بەسەرتدا (ئەی موحەمەد (ﷺ)) لە ئایەتان‌و قورئانی پڕ حیکمەتن. وە دەفەرمووێت: ﴿نَتْلُوا۟ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾[4] واتە: دەخوێنینەوە بەسەرتدا (ئەی موحەمەد (ﷺ)) هەندێ لە هەواڵی موساو فیرعەون بە ڕاستی‌و دروستی بۆ ئەوانەی بڕوا دێنن. واتە: من مزگێنی دەرو ترسێنەرم. ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾ واتە: من لەسەر ڕێگەو ڕەوشتی ئەو پێغەمبەرانەم کە لە پێشی منەوە هاتوون‌و گەلەکانیان ئاگادارکردووەتەوەو ترساندوویان‌و ئەو ئەمانەتەی کە لەسەر شانیان بووە بە چاکی گەیاندوویانە زۆر بە دڵسۆزیەوە، حیسابی ئوممەتەکانیان لە لای خودایە. جا هەر کەس هیدایەتی

[1] فتح الباري (٤/٥٦).

[2] مسلم (٢/٩٨٦)، ابو داود (٢/٥١٨)، النسائي (٥/٢٠٣)، ابن ماجه (٢/١٠٣٨)، أحمد (١/٢٥٣).

[3] ال عمران (٥٨).

[4] القصص (٣).

وەرگرت تەنها بۆ خۆی هیدایەت وەردەگرێتو هەر کەسیش گومڕا بێت زیانی بۆ خۆیەتی، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ﴾،[1] واتە: تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕای بگەیەنی، خودا بینایە بە بەندەکانی. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا أَنتَ نَذِيرٌ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾،[2] واتە: بێگومان تۆ تەنها ترسێنەریو خوا بۆ هەموو شتێك سەرپەرشتی کارو چاودێرە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا﴾ واتە: وە بڵێ هەموو سوپاس بۆ خوایە ئەو خوایەی بە زوویی ئایەتو نیشانەکانی نیشانی ئێوە دەدات ئێوەش دەیانناسن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾،[3] واتە: لەمەودا بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین لە ئاسۆی دونیا وە لە خودی خۆیاندا هەتا بۆیان ڕوون بێتەوە بێگومان ئەم (قورئانە) ڕاستە. وە دەفەرمووێت: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ واتە: پەروەردگارت بێ ئاگا نیە لەو کارانەی کە دەیکەن، بەڵکو شایەتە بەسەر هەموو شتێکەوە، لە ئیمامی ئەحمەدەوە ڕیوایەت کراوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) کە ئەم دوو دێڕە شیعرەی گوتووە: شیعری خۆیەتی یان شیعری کەسێکی ترە:

إذا ما خَلَوتَ الدّهرَ يَوماً فلا تَقُل　　خَلَوتَ ولكن قُل عَليَّ رَقيب

ولا تَحْسَبَنَّ الله يغفل ســـاعةً　　ولا أن ما يغمني عليه يغيب

واتە: ڕۆژێك خۆت بە تەنها بوویتو کەست لەگەڵ نەبوو، نەڵێیت دەورم چۆڵە، بێژە: خودا چاودێرمەو وا وەبان سەرمەوە. وا نەزانی کە خودای مەزن ساتێ لێت بێ ئاگایە، واش نەزانی هەر شتێ خۆی دەشارێتەوە لە خودا ون دەبێت.

---

[1] ال عمران (۲۰).

[2] هود (۱۲).

[3] فصلت (۵۳).

## تەفسیری سورەتی (القصص)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

ئیمامی ئەحمەدڕیوایەتی کردووە لە مەعدی یەکریبەوە(معدیکرب) دەڵێ: هاتین بۆلای عبدالله و داوامان لێ کرد کە ﴿طسٓمٓ﴾ المئتین واتە: (تا سین میم)ی دوو سەد بخوێنێتەوە بۆمان، گوتی: لای من نیە، بەڵام بڕۆن بۆ لای ئەو کەسەی کە لە پێغەمبەری خودای (ﷺ) وەرگرتووە، کە خەبابی کوڕی ئەرەت (خبّاب بن الأرَت) گوتی: چوویت بۆ لای خەبباب خوێندیەوە بۆمان (ڕەزای خوای لێ بێت)[1].

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾﴾

### باسی موساو فیرعەون و خوای گەورە چی بەسەر گەلەکەیان هێناوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿طسٓمٓ﴾ لە پێشەوە باسی ئەم پیتانە کراوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، ﴿تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ﴾ واتە: ئەمانە ئەو نیشانە ئاشکراو ڕوونانەن کە باسی ئەو ڕاستیانە دەکات ڕووی داوەو لەمەودواش ڕوودەدات، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نَتْلُواْ عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: باسی موساو فیرعەونت بۆ دەخوێنینەوە بەڕاستی، وەك لەئایەتێکیتردا دەفەرمووێت: ﴿نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ﴾[2] واتە: ئێمە باسی ئەو ڕووداوەت بۆ دەکەین وەك خۆی چۆن بووە، وەك ئەوەی خۆت لەوێ بوویتو چاوت پێی کەوتبێت، ﴿لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوانەی بڕوا دێنن، پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: فیرعەون خاوەن دەسەڵات بوو لە زەویدا فیزی دەکردو زۆری دەنواندو لەخۆبایی بووبوو، ﴿وَجَعَلَ

---

[1] أحمد (٤١٩)، ئەم فەرموودەیە پیاوەکانی جێی متمانەن.

[2] یوسف (٣).

أَهْلَهَا شِيَعًا ﴾ واتە: خەڵکەکەی بەش بەش (دەستە دەستە) کردبوو، بەکاری دەهێنان بۆ کاروباری وڵاتەکەی بە ئارەزووی خۆی، ﴿شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ﴾ واتە: کۆمەڵێکیانی لاوازو ژێردەستە دەکرد، واتە: تۆرمەی ئیسرائیل، چونکە نەوەی ئیسرائیل چاکترین خەڵکی زەمانی خۆیان بوون لەو کاتەدا، ئەم فیرعەونە زۆرداره کە خاوەن دەسەڵاتێکی زۆر لاسار بوو، زاڵ بوو بەسەریانداو هەرچی کاری گران‌و خراپ بووایە بەوانی دەکرد، نەیدەهێشت بە شەوو بەڕۆژ پشوو بدەن‌و ماندوویان دەرچێت، خزمەتی خۆی‌و دەوروبەری خۆی پێدەکردن، ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ لەگەڵ ئەوەیشدا کوڕەکانی دەکوشتن‌و ژنەکانیشی دەهێشتنەوە بۆ سوکایەتی‌و زەلیل کردنیان‌و لە ترسی ئەوەش کە نەوەك ئەو منداڵە پەیدا بێت ببێتە هۆی لەناوچوونی خۆی‌و دەسەڵاتەکەی فیرعەون زۆر لەوە دەترسا، بە ڕاستی فیرعەون لە خراپەکاران بوو. بۆیە فەرمانی دا کوڕەکانی تۆرمەی ئیسرائیل بکوژێ‌و هەمووی لەناو بەرێ، بەڵام ترسان هیچ شتێك لە قەدەر لانادات، چونکە کاتێك کە بڕیاری خودا هات هەرگیز هیچ شتێك ناگێڕێتەوەو دوای ناخات. هەموو بڕیارێکی خودا کاتەکەدەی دیاری کراوە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ واتە: وە ئێمە دەمانەوێت (بە چاکەی خۆمان) منەت بنێین بەسەر ئەوانەی کە لاوازو ژێردەست کراو بوون لە وڵاتی میسردا، وە بیانکەینە پێشەواو بیانکەینە میرات بەرانـــی کەلەپووری فیرعەون‌و شوێنکەوتووانی۔ ﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنُرِىَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴾ واتە: وە دەسەڵاتداریان بکەین لەو زەویەدا وە نیشانی فیرعەون‌و هامان‌و لەشکری هەردووکیان بدەین لە (ئیسرائیلیەکانەوە) ئەوەی خۆیان لێ دەپاراست. خوای گەورە ئەوەی بڕیاری دابوو بەسەری هێنان، وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُوا۟ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴾،[1] واتە: ئیتر (لە جێگای گەلی فیرعەون) ئەو گەلەمان نیشتەجێ کرد کە هەمیشە دەچەوسێنرانەوە لە ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای ئەو وڵاتەدا کە پیتو بەرەکەتمان تێ خستبوو بەڵێنی هەرەجوانی پەروەردگارت بە تەوا هاتەدی بۆ نەوەی ئیسرائیل بە هۆی ئارامگریانەوە (لەسەر

[1] الاعراف (١٣٧).

ناڕەحەتیەکان) وە ڕووخاندمانو تێکمان دا ئەو کۆشکو تەلارانەی فیرعەونو گەلەکەی دروستیان کردبوو هەروەها ئەو (مێوەو ڕەزو باخانەی) کە کەپریان بۆ کردبوو. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾﴾،[1] واتە: ئا بەو جۆرە (لەناومان بردن) نەوەکانی یەعقوب (جوولەکە)مان لە جێگایان دانا. فیرعەون بە هەموو هێزو توانایەکیەوە ویستی لە دەستی موسا ڕزگاری بێت، بەڵام ئەو هێزو توانایەی هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندو نەیتوانی کە بڕیاری خوای خاوەن دەسەڵاتی مەزن قوتاری بکات، وە هەرگیز هیچ کەسێك ناتوانێ لە بڕیاری ئەو لابدات بەڵکو بڕیاری خودا بەجێ هاتووە، بڕیاریشی دابوو کە فیرعەون بە دەستی موسا لەناو دەچێ، ئەو منداڵەی کە فیرعەون لێی دەترساو بەهۆی ئەوەوە هەزاران کوڕی کوشت، خودا بڕیاری دا کە ئەی فیرعەون دەبێ لە ماڵی تۆدا گەورە ببێو بە خواردنی خۆت بەخێوی بکەیو خۆتو لەشکرەکەیشت بە دەستی موسا لەناو بچێت. بۆ ئەوەی کە بزانی خوای ئاسمانەکانو زەمین هەر ئەو خاوەنی زەبرو دەسەڵاتە، هەرچی ویست دەیکاتو هەرچیشی نەویست نابێت.

﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾﴾

**دایکی موسامان ئاگادار کرد (تێگەیاند) کە چۆن کارەکە ڕێك بخات**

دەگێڕنەوە کاتێك فیرعەون ژمارەیەکی زۆری لە نێرینەی (الذکر) نەوەی ئیسرائیل کوشت، قیبتیەکان ترسان لەوەی کە نەوەی ئیسرائیل بنەبڕبنو هیچیان نەمێنێ، پاش ئەوان هەرچی کاری گرانو قورس هەیە هەمووی بکەوێتە سەرشانی ئەوان، گوتیان بە فیرعەون: لەوانەیە ئەگەر ئەم کارە هەروا درێژە بکێشێت کوڕیان هەموو بکوژێو پیاوە پیرەکانیشیان بمرن، لە ئاکامدا ژنەکان ناتوانن ئەو کارانە بکەن کە پیاوەکان دەیکەن، ئەو کاتە دەبێ ئێمە ئەو کارانە ڕاپەڕێنین، پاشان فیرعەون بڕیاری دا کە ساڵێك کوڕەکان بکوژنو ساڵێك وازیان لێ بێنن، هارون (سەلامی خوای لێ بێت) لەو ساڵەدا لە دایك بوو کە بڕیار بوو کوڕەکان نەکوژرێن، بەڵام موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەو ساڵەدا لە دایك بوو کە کوڕەکانیان تیا دەکوشت. فیرعەون پیاوی تایبەتی خۆی هەبوو کە ئەو کارەیان پێ سپێردرابوو، لەگەڵ مامانی ژنان (قوابل) کە دەگەڕان بەسەر ژناندا، هەر ژنێکی سك پڕیان ببینیایە ناویان تۆمار

[1] الشعراء (٥٩).

دەکرد، وەختی منداڵ بوونیان دەبوو مامانێکی قیبتی (قبط) چاودێری بووایە، خۆ ئەگەر ژنەکە کیژی ببووایە، وازیان لێ دەهێناو دەڕۆیشتن، ئەگەر کوڕیشی ببووایە، جەلادەکانی فیرعەون بە چەقۆکانیان سەریان دەبڕی‌و دەڕۆیشتن، خوا ڕوویان ڕەش کات. کاتێ دایکی موسا سکی پڕ بوو بە موساوە (سەلامی خوای لێ بێت) سك پڕیەکەی پێوە دیار نەبوو، لەبەر ئەوە مامانەکان هەستیان پێ نەدەکرد، بەڵام کاتێ کە کوڕی بوو زۆر ترساو دنیای لێ هاتەیەك زۆر لێی دەترسا. وە زۆریش خۆشی دەویست، موسا (سەلامی خوای لێ بێت) هەر کەسێك چاوی پێی بکەوتایە خۆشی دەویست، خۆش بەختیش ئەو کەسە بوو لە شەرع‌و لە سروشتدا کە موسای خۆش دەویست وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي﴾،[1] واتە: خۆشەویستی خۆم خستە سەر تۆ.

### موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ماڵی فیرعەوندا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: بە دایکی موسامان ڕاگەیاند (خستمانە دڵی) کە شیر بدە بە موسا ئینجا هەر کاتێك ترست لێی هەبوو ئەو کاتە بیخەرە ڕووباری نیلەوە مەترسە (لێی‌و) خەفەتیش مەخۆ (بۆی) بەڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆ لات وە دەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران. کاتێ دایکی موسا ترس‌و خەمی لێ نیشت نیگای بۆ کراو وردوکردی دڵی خۆی کردو بڕیاری خۆی داو خستیە ناو دەریاوە، ماڵی باوکی موسا لە تەنیشتی ڕووباری نیلەوە بوو، تابوتێکی بۆ هێناو شوێنێکی بۆ چاك کردو وەك بێشکەو شیری ئەدایەو، هەر کاتێك کەسێك بهاتایە لێی بترسایە دەچوو دەیخستە تابووتەکەو لەناو نیلدا حەبلێکی (پەتێکی) دەبەست بە تابووتەکەوەو سەرێکی حەبلەکەی (گوریس) لە لای خۆی بوو، ڕۆژێك کەسێکی دی زۆر ترساو موسای خستە ناو تابوتەکەو هۆشی بەخۆیەوە نەبوو پەتەکە بگرێ، ئاوەکە هەڵی گرت‌و بە تەنیشت ماڵی فیرعەوندا بردی، کەنیزەکانی ماڵی فیرعەون تابووتەکەیان گرتەوەو بەبێ ئەوەی بزانن چی تێدایە، ترسان لەوەی ئەگەر بیکەنەوە سزا بدرێن لە لایەن ژنەکەی فیرعەونەوە، کاتێ کە ژنەکەی فیرعەون تابوتەکەی کردەوە (هەڵی پچڕی)و منداڵێکی تێدا بینی کە لە چاکترو جوانترو شیرینترین خەڵکی خودا بوو، خودای مەزن خۆشەویستی ئەو منداڵەی خستە دڵی ژنەکەی فیرعەونەوە کاتێ کە چاوی پێی کەوت، خوای گەورە بە مەیلی خۆی ڕێزی نا لە ژنەکەی فیرعەون‌و مێردەکەیشی بەدبەخت‌و چارەڕەش بوو بەهۆی ئەو منداڵەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا

---

[1] طه (٣٩).

وَحَزَنًا﴾ واتە: ئینجا داروودەستەی فیرعەون هەڵیانگرتەوە بۆ ئەوەی ببێت بە دوژمن و هۆی خەفەت بۆیان. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق و کەسانی تریش گوتویانە: ئەو لامەی ﴿لِيَكُونَ﴾ لامی عاقیبەتە، لامی (التحليل) نیە، چونکە ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبوو ببێتە مەینەت و دوژمن بۆیان، مانای ئایەتەکەیش وەك دیارە هەر ئەوە دەگەیەنێ کە گوتوویانە، بەڵام ئەگەر سەیری شێوازی ئایەتەکە بکرێت دەبینی لامەکە لامی تەعلیلە، بێگومان خودای مەزن وای لێکردوون کە دەری بێنن لەناو دەریاکەدا بۆ ئەوەی ببێتە دوژمن و مەینەتی بۆیان. هەر ئەوە بووە مایەی ئەوە کە هەرچی هەوڵ و خۆماندوو کردنیان بوو بەتاڵ بووەوە لە ترسی ئەو منداڵە کە پەیدا دەبێت. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَٰطِـِٔينَ﴾ واتە: بە ڕاستی فیرعەون و هامان و لەشکرو سەربازەکانیان تاوانبارو هەڵە بوون. وا دیاربوو کاتێ فیرعەون کە چاوی پێی کەوت ویستی بیکوژێت لە ترسی ئەوەی نەك لە تۆرمەی ئیسرائیلیەکان بێ، ژنەکەی ئاسیای کچی موزاحم کەوتە وتوویژ لەگەڵی و هەواڵی دەدا ۆخشەویستی بکات لە لای فیرعەونۆ نەیکوژێت، بۆیە گوتی: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ﴾ واتە: ببێتە مایەی چاوڕۆشنی بۆ من و بۆ تۆش، فیرعەون گوتی: بۆ تۆ بەڵێ، بەڵام بۆ من نەخێر، هەرواش دەرچوو، خوای گەورە بە هۆی موساوە ڕێی بە ئاسیا نیشان داو، فیرعەونیشی لەناودا، وەك لە پێشەوە لە سورەتی (طه) بەدرێژی ئەو بەسەرهاتە باسکراوە لە فەرموودەی فیتنەکاندا (الفتون) کە نەسائی و کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەت کراوە بە مەرفوعی.[1] ﴿لَا تَقْتُلُوهُ﴾ واتە: مەیکوژن، ﴿عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ﴾ ئاسیا گوتی: بەڵکو سودی بۆمان هەبێت، خودای گەورەیش لەبەر ئەوە ڕێی نیشان داو خستیە بەهەشت، ﴿أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ واتە: ویستی بیکاتە کوڕی خۆی، چونکە ئاسیا منداڵی لە فیرعەون نەبوو، وە دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: ئاگایان لەوە نەبوو کە خوای گەورە مەیلی بە چیە لە هەڵگرتنی موسا لە ماڵی فیرعەونداو کە پڕە لە کارزانی و بەڵگەی مەزن لەسەر توانا و دەسەڵاتی خودا.

﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ

[1] الطبري (١٩/٥٢٩).

ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾

**زۆر نیگەرانی دایكی موساو گێڕانەوەی موسا بۆ لای دایكی**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًا﴾ واتە: جا دڵی دایكی موسا خاڵی بوو (لە هەموو شت جگە لە منداڵەكەی)، خوای گەورە باسی دڵی دایكی موسا دەكات كە هیچ هۆشی بە خۆیەوە نەمابوو كاتێك كە كوڕەكەی لە دەریادا ئاو بردی، واتە: هەموو خەمو خەفەتێكی هەر لە لای موسا بوو ئاگای لە هیچ شتێكی دنیا نەمابوو، ئەمە قسەی ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو عیكریمەو سەعیدی كوڕی جوبەیرو ئیبنو عوبەیدەو زەحاك‌و حەسەنی بەسری‌و قەتادەو كەسانی تریشە.[1] ﴿إِن كَادَتْ لَتُبْدِى بِهِۦ﴾ واتە: لەوانە بوو ئەو ڕازە لە دڵی دایە ئاشكرای بكات، بڵێ: كوڕێكم بووەو باسی خەم‌و خەفەت‌و ناڕەحەتی خۆی بكات بۆ لەدەست دەرچوونی، بەڵام خوای گەورە دڵی پتەو كردو ئارامی پێدا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەگەر دڵیمانە نەبەستایەتەوەو بەهێزمان نەكردایە بۆ ئەوەی لە بڕواداران بێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ﴾ واتە: فەرمانی دا بە كچەكەی كە بە تەمەن گەورە بوو، لە قسە تێدەگەیی پێی گوت: ﴿قُصِّيهِ﴾ واتە: شوێنی كەوەو گوێ بگرەو بزانە چی بەسەر دێت لە دەوروبەری شاردا، كچەیەكەیش بە گوێی دایكی كردو ڕۆیشت ﴿فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ﴾ وای كرد هەر لە دەرەوە چاوی لێی بوو، ئیبنو عەباس دەڵێ: لە لاوە سەیری دەكرد.[2] موجاهید دەڵێ: لە دوورەوە چاوی لێی بوو، قەتادە دەڵێ: بە شێوەیەك بۆی دەڕوانی وەك ئەوەی هیچ پەیوەندیەكی پێیەوە نیە.[3] بەو شێوەیە هەتا موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لە ماڵی فیرعەوندا جێگیر بوو، ژنەكەی فیرعەون زۆر خۆشی دەویست‌و لە دەستی فیرعەون ڕزگاری كرد كە بیكوژێت، دایان بەو ژنانەی كە لە ماڵی فیرعەوندا بوون شیری بدەنێ، مەمكی هیچیانی نەگرت، بردیانە ناو بازاڕ بۆ ئەوەی ژنێكیان دەست كەوێ هەتا شیری بداتێ، كاتێك كە خوشكەكەی منداڵەكەی بینی بە دەستیانەوە خۆی نەكردو ئەوانیش پێیان نەزانی، خودای مەزنیش دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: لە كاتێكدا ئەوان

---

[1] الطبري (١٩/٥٢٩).

[2] الطبري (١٩/٥٣٢).

[3] الطبري (١٩/٥٣٢).

(فیرعەون‌و کۆمەڵەکەی) هەستیان نەدەکرد، وە فەرموویەتی: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: لە پێشدا وا بڕیارمان دا کە مەمکی هیچ دایەنێك نەمژێت، ئەوەش بۆ ڕێزلێنان‌و پاراستنی بوو لە لایەن خودای گەورەوەو گەڕانەوەی بۆ لای دایکی بۆ ئەوەی ئەو شیری بداتێ بەبێ هیچ ترسێك پاش ئەو هەموو خەم‌و مەینەتیە، وەختێ خوشکەکەی چاوی لێیان بوو کە سەرگەردان بوون نەیاندەزانی چۆن دایەنێکی بۆ بدۆزنەوە مەمکی بمژێت، ﴿فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ﴾ واتە: ئینجا خوشکەکەی موسا وتی پێیان ئایاماڵێکتان نیشان دەم کە ئەو منداڵە بۆ ئێوە بەخێو بکەن‌و شیری بدەنێ‌و دڵسۆز بن بۆی، ئیبنو عەباس دەڵێ: وەختێ خوشکەکەی موسا ئەمەی گوت: هەڵیان گرت‌و گومانیان هەبوو لە قسەکانی، پێیان گوت: تۆ چۆن دەزانی ئەو ماڵە بەخێوی دەکەن‌و زۆر باشیش پەروەردەی دەکەن‌و ئامۆژگاری چاکیشی دەکەن؟ پێی گوتن: ئامۆژگاری کردن‌و چاك بەخێوکردنی لەبەر خاتری ماڵی پاشاو خۆشی خستنە ناو دڵیان‌و وە بەتەمای سوود وەرگرتنیش لە بەخێوکردنەکەیدا بۆیە ئەمیان ناردووە. وەختێ ئەم قسەی پێ گوتن‌و ڕزگاری بوو لە سزادانیان، لەگەڵی چوون بۆ ماڵیان‌و بردیانە لای دایکی مەمکی دایەو مژی، زۆر کەیف خۆش بوون، مزگێنی درا بە ژنەکەی فیرعەون، ناردی بەشوێن دایکی موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) زۆر ڕێزی لێگرت‌و یارمەتیەکی زۆر باشیشی دا، لە ڕاستیدا ئاسیا نەیدەزانی ئەوە دایکیەتی، هەر لەبەر ئەوە یارمەتی دا چونکە منداڵەکە تەنها مەمکی ئەوی مژی، پاشان داوای لێکرد لە ماڵی ئەوان بمێنێتەوەو شیری بداتێ، دایکی موسا قبوڵی نەکرد، گوتی: من مێردێك‌و چەند منداڵی ترم هەیە ناتوانم لە لای تۆ بمێنمەوە بەڵام ئەگەر پێت خۆشە لە ماڵی خۆم شیری دەدەمێ، ژنەکەی فیرعەون ڕازی بوو، یارمەتی باشی بۆ بڕیەوە لەگەڵ جلوبەرگ، بڕیاریشی دا کە زۆر لەگەڵی چاك بێت، دایکی موسا بە منداڵەکەیەوە گەڕایەوە ماڵ، بە ڕەزامەندی‌و دڵخۆشی زۆرەوە، خوای گەورە ترسەکەی نەهێشت‌و بێ خەمی کردو بەسەربەرزی‌و ڕێزێکی زۆرو بژێویەکی چاك هاتەوە ماڵی خۆی، نێوانی ئەو ترس‌و دەروەی کە خودا لە دایکی موسای کردەوە کەم بوو، لە شەوو ڕۆژێك کەمتر یان زیاتر بوو، والله أعلم، پاکی‌و پەسەندی بۆ ئەو خودایەی هەموو شتێك بە دەستی خۆیەتی، مەیلی لێ بوو دەبێ‌و مەیلی لێ نەبوو نابێ، ئەو خودایەی کە دوای هەموو تەنگانەیەك دەرو لەو کەسانە دەکاتەوە کە لێی دەترسن‌و پاش هەموو دانج‌و مەینەتیەك، دەرگای بەزەیی خۆی دەکاتەوە بۆ خاوەن باوەڕان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا﴾ واتە: گەڕاندمانەوە لای دایکی هەتا چاوی ڕوون بێتەوە پێی، ﴿وَلَا تَحْزَنَ﴾ واتە: خەفەتی بۆ نەخوات، ﴿وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ﴾ واتە: وە چاکیش بزانێ کە بەڵێنی خودا ڕاستە، کە بڕیاری دابوو بۆی بگەڕێنێتەوەو کردیشی بە پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ

بێت) بەو شێوەیە خوای گەورە بەڵێنەکەی هاتەجێ لەو ژنە پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران هاتە دنیاوە، بە پەروەردەیەکی وا پەروەردەی کرد کە شایستەی بوو، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: بڕیاری خوای گەورەو ئاکارو ئاکامە پەسندەکانی کە هەمیشە سوپاسو ستایش دەکرێت لە دنیاو لە قیامەتدا لەسەری، کە لەوانەیە زۆر لەسەر دڵەکان ناخۆشو گران بێت، بەڵام ئاکامەکەی چاکو پەسەندە لە حەقیقەتدا بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی لەم ئایەتانەدا: ﴿وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾[1] واتە: وە دەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێتو باش بێت بۆتان وە دەگونجێت شتێکتان پێ خۆش بێتو خراپ بێ بۆتان.وە فەرموویەتی: ﴿كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾[2] واتە: چونکە لەوانەیە ئێوە حەز نەکەن لە شتێكو خودا لەودا دابنابێت چاکەیەکی زۆر.

﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَىٰ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٤﴾ وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ
مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِ ۖ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِن شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ
عَدُوِّهِ فَوَكَزَهُ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي
فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿١٦﴾ قَالَ رَبِّ بِمَا أَنْعَمْتَ عَلَيَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا
لِّلْمُجْرِمِينَ ﴿١٧﴾﴾

**موسا پیاوێکی لە قیبتیەکان (الأقباط) کوشت:**

کاتێك کە خودای گەورە باسی سەرەتای کاری موسای کرد (سەلامی خوای لێ بێت) ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَىٰ آتَيْنَاهُ حُكْمًا وَعِلْمًا﴾ واتە: کاتێك کە تەمەنی موسا گەیشتە تافی لاویو بووە پیاوێکی تەواو، زانستو کارزانی فێرکرد، موجاهید دەڵێ: یانی: پێغەمبەریەتی.[3] واتە: کردمانە پێغەمبەر ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە پاداشتی لە خواترسان دەدەینەوە. پاشان خوای گەورە باسی ئەو بڕیارەی (قەدەرەی) خۆی دەکات کە چۆن موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆە پێغەمبەرو

[1] البقرة (٢١٦).

[2] النساء (١٩).

[3] الدر المنثور (٢٣١/٥).

چۆن پیاوە قیبتیەکەی کوشتو کە بووە هۆی ئەوەی لە وڵاتی میسر دەرچێتو بڕوات بۆ وڵاتی مەدیەن (مَدیَن) فەرموویەتی: ﴿وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا﴾ واتە: چووە ناو شارەکە بێ ئەوەی خەڵکەکەی پێی بزانن، ئیبنو جورەیج دەڵێ: لە عەتای خۆراسانیەوە ئەویش لە ئیبنو عەباسەوە: لە نێوا مەغریبو عیشادا چووە ناو شارەکە.[1] ئیبنو مونکەدەر (منکدر) دەڵێ لە عەتای کوڕی یەسارەوە (یسار) ئەمیش لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێ: لە نیوەڕۆدا (نصف النهار) چووە ناو شار.[2] سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو سەدیو قەتادەیش هەر وایان گوتووە. ﴿فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ﴾ واتە: دوو پیاوی بینی لە یەکتریان دەداو قاڵەقاڵیان بوو. ﴿هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ﴾ ئەمەیان لە خۆیان بوو ﴿وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ﴾ واتە: ئەوی تریان لە قیبتیەکان بوو.[3] ئیبنو عەباسو قەتادەو سەدیو موحەمەدی کوڕی ئیسحاقیش هەر وایان گوتووە.[4] ئیسرائیلیەکە هاواری کردە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) کە یارمەتی بدات، موساش (سەلامی خوای لێ بێت) بە فرسەتی زانی لەو کاتەدا ناو شار چۆڵ بوو، پەلاماری قیبتیەکەی دا، ﴿فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ﴾ واتە: ئەوەی هاوڕەگەزی خۆی بوو دژی پیاوە نەیارەکە هانای پێبرد. ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ﴾ واتە: موسا مستێکی لێ داو کوشتی، موجاهید دەڵێ: ﴿فَوَكَزَهُۥ﴾ واتە: مستێکی لێ دا.[5] ﴿فَقَضَىٰ عَلَيْهِ﴾ بەو گیانی دەرچوو (کوشتی). خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: موسا گوتی: ئەمە کاری شەیتان بوو پێی کردم، کە دوژمنێکی ئاشکرای گومڕاکەرە. ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: گوتی: ئەی پەروەردەی من، ئەمن ناهەقیم لە خۆم کرد، عەفوم بکە. ئیتر خودا فەتای بەخشی، کە ئەو لە خەتا دەبورێتو دلۆڤانە. ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ﴾ واتە: گوتی: ئەی پەروەردەم لە بەرامبەر ئەو بەهرەو دەسەڵاتو توانایە کە تۆ داوتە بە من ﴿فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا﴾ واتە: هەرگیز نابمە یارمەتی دەری ﴿لِّلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە تۆ نیەو سەرپێچی فەرمانەکانی تۆ دەکەن.

---

[1] الطبري (١٩/٥٣٨).
[2] الطبري (١٩/٥٣٨).
[3] الطبري (١٩/٥٣٩).
[4] الطبري (١٩/٥٣٩_٥٤٠).
[5] الطبري (١٩/٥٤٠).

﴿فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾
فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ
أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٩﴾﴾

**ئاشکرابوونی کوشتنی ئەو کەسەی کە موسا بە پەنهانی کوشتی:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَأَصْبَحَ فِي ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: لەو شارەدا بە ترسەوە شەوی بەڕێکردو چاوەنۆڕ بوو. هەر ئەو کەسەی دوێنی هانای پێ بردبوو، دیسان هاواری بۆ هێنا. موسا گوتی: دیارە تۆ لە ڕێگە دەرچووی. خوای گەورە باسی موسا دەکات کاتێك کە قیبتیەکەی کوشت لەناو ئەو شارەدا بە ترسەوە مابووەوەو چاوەڕوانی دەکرد لەبەر ئەو کارەی کە لە دەستی ڕووی دابوو، ﴿يَتَرَقَّبُ﴾بەم لاولادا سەیری دەکردو لە کاتێکدا کە بە ڕێگادا دەچوو، ئەو کەسەی کە دوێنێ هاواری لێ کرد یارمەتی بدات دژی قیبتیەکە، لەگەڵ یەکێکی تردا شەڕیانە، کاتێ موسا بە لایاندا تێپەڕی هەمیسان داوای یارمەتی لێ کرد، موسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: تۆ پیاوێکی شەڕانیو لەڕێ لادەری، پاشان موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ویستی قیبتیەکەی لە کۆڵ بکاتەوە، ئیسرائیلیەکان وای دەزانی بۆ ئەو دەچێت، چونکە زۆر نەفامو داماوو زەلیل بوو، کاتێك گوێی لە قسەکانی موسا بوو کە پێی گوت: تۆ پیاوێکی شەڕانیو لەڕێ دەرچووی بۆ ئەوەی لە کۆڵی خۆی بکاتەوەو موسا (سەلامی خوای لێ بێت) وازی لێ بێنێت گوتی: وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا﴾ واتە: کاتێك بەرەو ئەو کەسە چوو کە دوژمنی هەردووکیان بوو گوتی: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ﴾ ئیسرائیلیەکە گوتی: بە موسا دەتەوێ منیش بکوژی وەك چۆن دوێنێ یەکێکی ترت کوشت، ﴿إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ﴾ واتە: تۆ هەر دەتەوێ زۆرداری ملهوڕ بیت لە زەویدا وە ناتەوێ لە پیاوچاکان بیت. چونکە هیچ کەسێك نەیدەزانیو ئاگاداری کوشتنی ئەو پیاوە نەبوو موساو ئەو ئیسرائیلیە نەبێت، کاتێ پیاوە قیبتیەکە گوێی لەو قسەیە بوو کە لە دەمی ئەو پیاوە دەرچوو، ڕۆیشت بۆ بەر دەرگای ماڵی فیرعەونو قسەکەی بۆ فیرعەون گێڕایەوە، فیرعەون بەو ڕووداوەی زانی، زیاتر تووڕەی لە موسا هەڵساو بڕیاری دا کە موسا بکوژێت، ناردی بە شوێنیداو داوی کرد بگەڕێن بە دوایداو بۆی بێنن هەتا تۆڵەی لێ بسێنێت.

﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ
ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢٠﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ﴾ واتە: پیاوێك هات، ﴿مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ﴾ واتە: لەوپەڕی شارەوە بە هەڵەداوان پێی گەیشت: خوای گەورە وەسفی دەكات بە پیاوێكی پیاوانە، چونكە ئەو پیاوە كاتێك زانی بە دوای موسادا دەگەڕێن، بە ڕێگەیەكی نزیكتردا خۆی گەیاندە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەو ڕێگاوە نەچوو ئەوان دەڕۆیشتن بە دوایدا، پێی گوت: ﴿إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ﴾ واتە: كاربەدەستان وتووێژ دەكەن لە بارەی تۆوە، ﴿لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ﴾ واتە: دەیانەوێ لەناوت بەرن هەڵسە برۆ لەم شارە، ﴿إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ﴾ واتە: من ئەمەت وەك ئامۆژگاریەك پێ دەڵێم.

﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن
يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدْيَنَ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ وَوَجَدَ مِن
دُونِهِمُ ٱمْرَأَتَيْنِ تَذُودَانِ قَالَ مَا خَطْبُكُمَا قَالَتَا لَا نَسْقِى حَتَّىٰ يُصْدِرَ ٱلرِّعَآءُ وَأَبُونَا شَيْخٌ كَبِيرٌ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ
لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّى لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَىَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾

**موسا لە وڵاتی مەدیەن و (مَدْيَن) ئاودانی مەڕەكانی دوو ژنەكە**

وەختێ كە پیاوەكە هەواڵی دایە كە كاربەدەستان و دەستەزبەستەی فیرعەون خەریكی ڕاوێژن لە بارەی ئەوەوە، بە تەنها خۆی لە وڵاتی میسر دەرچوو، شتی وای بە خۆیەوە نەدیبوو لەسەر دڵی گران بوو، چونكە موسا لە خۆشگوزەرانی و دەستەڵات و ژیانێكی خۆشدا ژیانی بەسەر بردووە، ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ﴾ واتە: ئەویش لە شار دەرچوو بە ترسەوە سەیری ئەملاولای خۆی دەكرد، ﴿قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ واتە: ئەی پەروەرندەم ڕزگارم بكە لە دەست فیرعەون و دەستەو بەستەكەی، دەگێڕنەوە خوای گەورە فریشتەیەكی بەسەر وڵاخێكەوە ـ چارەوێ ـ ئەسپ ـ ناردە لای موساو ڕێگاكەی نیشاندا، والله أعلم. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلْقَآءَ مَدْيَنَ﴾ واتە: كە بەرەو مەدیەن ڕۆیشت ڕێگایەكی تەخت و ڕێكی گرتەبەر زۆر كەیف خۆش بوو پێی، ﴿قَالَ عَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يَهْدِيَنِى سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾ گوتی: بەڵكو پەروەرندەم ڕاستەڕێم نیشاندا، خوای گەورەش شارەزای كردە سەر ڕاستەڕێ لە دنیاداو لە قیامەتدا، خەڵكیشی شارەزا كرد بۆ سەر ڕێی ڕاست. ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ

مَدۡيَنَ﴾ واتە: کاتێك گەیشتە مەدیەن کە ئاوێکی لێوە نزیك بوو، بیرێك بوو شوانەکان دەچوونە سەری ئاویان لێ هەڵدەگوزی، ﴿مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ﴾ کۆمەڵێك لە خەڵکی بینی ئاویان هەڵدەگوزی، ﴿وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ﴾ واتە: وە لە نزیك ئەو خەڵکانەوە دوو ئافرەتی بینی کە پەزەکانی خۆیان لادەداو نەیان دەهێشت لەگەڵ پەزی شوانەکاندا تێکەڵاو ببن هەتا توشی گێروگرفت نەبن، وەختێ موسا (سەلامی خوای لێ بێت) چاوی پێیان کەوت دڵی بۆیان سوتاو بەزەیی هاتەوە پێیاندا، ﴿قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ﴾ واتە: چیتانە بۆچی ئێوەش وەك ئەو خەڵکە مەڕەکانتان ئاو نادەن؟. ﴿قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ﴾ واتە: ئاومان دەست ناکەوێ هەتا ئەوانە پەزەکانیان ئاو نەدەن، ﴿وَأَبُونَا شَيۡخٞ كَبِيرٞ﴾ واتە: بابمان پیاوێکی بە ساڵاچووەو ئێمەش ئەمە حاڵمانە وەك دەبینی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ﴾ واتە: ئەوسا ئاوی بۆ هەڵگوزین، پاشان خۆی گەیاندە سێبەر، گوتی: ئەی پەروەردەی من! من شایەنی ئەم خێرەم کە بۆم دەنێری. ئیبنو عەباس گوتی: موسا کاتێك چوو بۆ مەدیەن خواردنی تەنیا پاقلەو گەڵای دار بوو، پێشی پەتی بوو چونکە کاتێ گەیشتە مەدیەن نەعلەکانیشی دڕاو لە پێی کەوت، ئەم پیاوە کە هەڵبژاردەی خودا بوو لە ناو خەڵکدا لە ژێر سێبەری درەختێکدا دانیشت ورگی بە پشتیەوە لکابوو لە برسانداو هەتا بە لەتە خورمایەکیش ڕازی بوو، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ﴾ ئیبنو عەباسو ئیبنو مەسعودو سودی دەڵێن: ﴿إِلَى ٱلظِّلِّ﴾ واتە: دانیشت لەژێر درەختێکدا.[1] عەتای کوڕی سائیب دەڵێ: کاتێك کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) گوتی: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ﴾ ژنێکیان گوتی لە قسەکانی موسا بوو (سەلامی خوای لێ بێت)[2].

﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ

[1] الطبري (١٩/٥٥٦).
[2] الطبري (١٩/٥٥٧).

ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾﴾

**موسا لەبەردەم باوکی دوو ژنەکەدا (کچەکەدا)و مارەبڕینی یەکێکیان بە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر کرێی شوانیەکەی**

کاتێك دوو ژنەکە بە پەلە بە پەزەکانیانەوە گەڕانەوە لای بابیان، باوکیان سەری سوڕماو بە لایەوە سەیر بوو کە زوو گەڕانەوە بۆ لای. پرسیاری لێ کردن کە چۆن گەڕانەوە، ئەوانیش باسەکەیان بۆ گێڕایەوە کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) چۆن مەڕەکانی بۆ ئاوداون، باوکیان یەکێکیانی نارد بە دوای موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) تا بانگی بکەن بۆ لای، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ واتە: یەکێکیان چوو بۆ لای موسا کە زۆر بە شەرمەوە دەچوو بەڕێداو خۆی داپۆشیبوو، وەك ڕیوایەت کراوە لە گەورەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: بە لایەکی کراسەکەی خۆی داپۆشیبوو،[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە ئەمیش لە عەمری (عمرو) کوڕی مەیمونەوە گوتی: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) گوتی: ﴿تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ﴾ واتە: پۆشاکەکەی دابوو بە ڕووی خۆیدا لەو ژنانە نەبوو کە گرنگی نەدا بە خۆداپۆشین و هەمیشە دەرو ماڵ بکات.[2] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی ڕاستە، جەوهەری دەڵێ: سەلفەج (السَّلْفَج) لە پیاواندا واتە: پیاوێکی کۆڵنەدەر، لە ژناندا واتە: ژنێك کە زۆر شەرم نەکات و ڕوودار بێت (الجريئة) وە لە وشتریشدا توندوتیژ ﴿قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ﴾ ئەم ڕستەیە ئەدەبی تێدایە، بە شێوەیەك بانگی نەکرد کە بڕوا نەکات و گومانی هەبێت، بەڵکو پێی گوت: باوکم بانگت دەکات بۆ ئەوەی کرێی ئەو ئاو هەڵگوزینەت بداتێ، واتە: پاداشتی ئەو ئاو دەرهێنانەت بداتەوەو شتێکت بداتێ، لە باتی ئاودانی پەزەکانمان ﴿فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ﴾ واتە: ئینجا کاتێك موسا هات بۆ لای باوکی کچەکە ئەو ڕووداوەی کە بەسەری هاتبوو بۆی گێڕایەوەو باسی دەرچوونی خۆی کرد کە لەبەر چی وڵاتەکەی بەجێ هێشتووە، ﴿قَالَ لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ پێی گوت: دڵخۆش و چاو ڕوون بە، لە وڵاتی ئەوان دەرچوویت ڕزگارت بووە، ئەوان هیچ دەسەڵاتێکیان بەسەر وڵاتی ئێمەدانیە، بۆیە گوتی: ﴿نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: ڕزگارت بووە لەو گەلە ستەمکارە، ﴿قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا

---

[1] الطبري (١٩/٥٥٨).

[2] الطبري (١٩/٥٥٩).

﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾ واتە: یەکێك لەو دوو کچە بە باوکی گوت ئەی باوە گیان بە کرێی بگرە (بۆ شوانی) چونکە بە ڕاستی چاکترین کەسە کە بە کرێی بگری بەهێزو ئەمینە (دەستو داوێن پاکە)، واتە: یەکێك لە کچەکانی ئەو پیاوە، هەندێ ئێژن: ئەو کچەی کە چوو بە شوێن موسادا گوتی: بە باوکی ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ﴾ ئەم پیاوە بە کرێ بگرە بۆ شوانی پەزەکان. عومەرو ئیبنو عەباسو شورەیحی قازیو ئەبو مالیکو قەتادەو موحەمەدی کوڕی ئیسحاقو کەسانی تریش گوتوویانە: کاتێك کچەکە گوتی: ﴿إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾ باوکی پێی گوت: تۆ چۆن دەزانی؟ کچەکە گوتی بە باوکی: چونکە ئەم پیاوە ئەو بەردەی بەرز کردەوە کە بە دە پیاو نەبێت ئەو بەردە بەرز نابێتەوە. وە من کاتێك لەگەڵی بووم پێشی کەوتم، پێی گوتم: تۆ لە دوامەوە بڕۆ، هەر کاتێك ڕێگەکەم هەڵەکرد بە بەردێکی بچووك ئاگادارم بکە، بەو بەردەدا من دەزانم چۆن ڕێگەکە بگرمەبەرو بڕۆم،[1] لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە گوتی: چاو ڕوونترین کەس، واتە (ئەو کەسانەی فرسەتیان هەبوو لە هەموو کەس زیاتر) سێ کەس بوون: ئەبوبەکر کاتێك عومەری دیاری کردووە بۆ جێ نشین، عەزیزی میسر کاتێك کە گوتی: بە ژنەکەی ﴿أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ﴾ ڕێز لە یوسف بگرە، وە ئەو کچەی لەگەڵ موسا هات بۆ لای باوکی کاتێك گوتی: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾،[2] ﴿قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ﴾ واتە: پیاوە باشە بە تەمەنەکە داوای لێکرد کە ببێتە شوانی مەڕەکانی ئەویش کیژێکی خۆی پێ دەدا لە جیاتی شوانیەکەیدا، ﴿عَلَىٰٓ أَن تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ﴾ واتە: بەو مەرجەی هەشتساڵ مەڕەکانم بۆ بەخێوکەی (بلەوەڕێنی) خۆ ئەگەر بە ئارەزووی خۆت دە ساڵیشت تەواو کرد پیاوەتی خۆتەو، هەشت ساڵیش بەخێویان کەی کاری خۆت تەواو کردووە. ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: نامەوێ نارەحەتت بکەمو ئازارت بدەمو فێڵت لێ بکەم ئەگەر خوا بیەوێت بێگومان دەمبینی لە پیاوچاکان دەبم. خوای گەورە باسی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەکات دەفەرمووێت: ﴿قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ﴾ واتە: موسا گوتی: بە خەزووری، باشە لەسەر ئەو بڕیارەی تۆ کە من دەبمە ڕەنجبەری ــ شوانی ــ تۆ بۆ ماوەی هەشت ساڵ، بەڵام ئەگەر دە ساڵیشم تەواو کرد بە ئارەزووی

[1] الطبري (١٩/٥٦٢/٥٦٤).
[2] إبن أبي شيبة (١٤/٥٧٤).

خۆمە، خۆ ئەگەر کەمترم کرد ئەك کاتە من پەیمانەکەم بەجێ نەهێناوەو ئەو مەرجەم جێبەجێ نەکردووە وە خوا لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین شایەتو چاودێرە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ﴾ واتە: هەر کام لەو دوو ماوەیەم تەواو کرد، نابێت ناهەقیم پێ بکرێت. هەرچەندە تەواوکردنەکە چاکترە رێگای پێدراوە بە بەڵگەی تر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ﴾[1] واتە: هەر کەس پەلە بکات لەو دوو رۆژەدا (شەیتان رەجم بکات) گوناهی ناگات وە هەر کەسیش دوا بکەوێت (سێ رۆژ رەجم بکات) گوناهی لەسەر نیە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر مەیلت لێ بوو بیگرەو ئەگەر مەیلیشت لێ نەبوو بیشکێنە).[2] دیارە رۆژوو گرتنەکە چاکترو راجحترە (بەهێزترە) بە بەڵگەی تر، بەڵگەش هەیە کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) تەواوەکەیانی پەڕاند – بردە سەر – بوخاری ریوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێ: جولەکەیەکی خەڵکی حیرە پرسیاری لێ کردم: موسا (سەلامی خوای لێ بێت) کام ماوەیانی تەواو کرد؟ گوتم: نازانم هەتا نەچمە لای زانای عەرەبو پرسیاری لێ نەکەم، رۆیشتمە لای ئیبنو عەباسو (رەزای خوای لێ بێت) پرسیارم لی کرد، گوتی: چاكو زۆرەکەیانی تەواو کردووە – پەڕاندووە – بێگومان پێغەمبەری خوا کاتێك شتێك فەرموبێتی کردوویەتی. هەر بەم شێوەیە بوخاریش ریوایەتی کردووە.[3]

﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ
ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٢٩ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ
ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٠ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ
فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ٣١ ٱسۡلُكۡ
يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ
إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ٣٢﴾

[1] البقرة (٢٠٣).
[2] أحمد (٣/٤٩٣)، النسائي (٤/١٨٥)، فەرموودەیەکی صەحیحە.
[3] فتح الباري (٥/٣٤٢).

**گەڕانەوەی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ میسرو ڕێزلێنانی لە لایەن خواوە بە پەیامو موعجیزە لە ڕێدا**

لە تەفسیری ئایەتی پێش ئەم ئایەتەوە باسکرا کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) هەردوو ماوەکەی تەواو کرد بە شێوەیەکی زۆر چاك، لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە خوای گەورە کاتێك فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ﴾ واتە: ئینجا کاتێك موسا ماوە شوانیەکەی تەواو کرد، یانی زۆرەکەیانی تەواو کرد، والله أعلم. ﴿وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ﴾ خێزانی لەگەڵ خۆی برد. گوتویانە: موسا زۆر حەزی دەکرد بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەیو کەسو کاری ببینێت، بڕیاری دا کە بە پەنهانی سەریان لێ بدا دەترسا لەوەی فیرعەونو گەلەکەی پێی بزانن، بۆیە بە شەوێکی زۆر تاریكو سارد بارانیش دەباری، لەگەڵ خێزانیو ئەو مەڕو ماڵاتەیش خەزووری پێی دابوو لە کرێی ئەو ماوەیەی کە شوانی بوو، کەوتەڕێو هەرچەندە هەوڵی دەدا بە چەرخەکەی ـ ئەو شتەی ئاگری دروست دەکرد ـ ئاگر بکاتەوە، بۆی نەدەکراو ئاگری نەدەکردەوە، زۆر بە لایەوە سەیر بوو ئا لەو کاتەدا ﴿ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗا﴾ واتە: لە لای کێوی تورەوە (الطور) ئاگرێکی بینی لە دوورەوە دەگڕا ﴿قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا﴾ واتە: ئێوە لێرە بمێنەوە ئاگرێکم بەدی کردووە، ئەچم بۆ لای ئەو ئاگرە ﴿لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ﴾ بەڵکو هەواڵێکتان بۆ بێنم، چونکە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕێگاکەی ون کردبوو ﴿أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: یان چلۆسکێك لەو ئاگرەتان بۆ بێنم، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ﴾ واتە: هەتا خۆتان گەرم کەنەوە لەو سەرمایە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ﴾ واتە: کاتێك گەیشتە لای ئاگرەکە لای دەستی ڕاستی دۆڵەکەوە لەبەردەم کێوەکەوە لە ڕووی خۆرئاواوە، بانگ کرا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلۡغَرۡبِيِّ إِذۡ قَضَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلۡأَمۡرَ﴾[1] واتە: تۆ (ئەی موحەمەد (ﷺ)) لە لای خۆرئاوای (شاخی طور) نەبوویت کاتێك کە فەرمانی پێغەمبەرایەتیمان دا بە موسا. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە موسا بەرەو ئاگرەکە چوو لە ڕووی قیبلەوە کێوی لای خۆرئاوا لە لای ڕاستیەوە بوو، ئاگرەکەی دی دەگڕا لەناو درەختە سەوزەکەدا، لە کێوەکەدا، لە نزیك دۆڵەکەوە، وەستاو نەیدەزانی چی بکات پەروەردگار بانگی کرد ﴿مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ﴾ واتە: لە لای دەستی ڕاستی دۆڵەکەوە لەو شوێنە پیرۆزەی نزیك

[1] القصص (٤٤).

درەختەکەوە، خوای گەورە فەرمووی: ﴿أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّىٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: ئەی موسا ئەوەی بانگت دەکاتو قسەت لەگەڵ دەکات هەر ئەوە وەدی هێنەری جیهانەو هەرچی بۆی دەیکات هیچ پەرستراوو پەروەرندەیەك نیە غەیری ئەو، هەر ئەو پاکو پیرۆزەو زۆر بڵندو مەزنەو هاوتای نیەو هیچ کەسێکیش وەك خودا نیە، نە لە زاتیداو نە لە سیفاتیداو نە لە کردارو گفتاریدا، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنْ أَلْقِ عَصَاكَ﴾ واتە: ئەو گۆچانەی بە دەستەوەیە فڕێی بدە، وەك خوای گەورە باسی کردووە فەرموویەتی لە ئایەتی تر: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِىَ عَصَاىَ أَتَوَكَّؤُا۟ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِى وَلِىَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ﴾[1] واتە: (خوا فەرمووی) ئەی موسا ئەوە چیە بە دەستی ڕاستەوە، گوتی: ئەوە گاچۆنەکەمە خۆم دەدەم بەسەریداو گەڵای بۆ پەزەکانم پێ دەوەرێنمو چەند کاری تریشی پێ دەکەم، واتە: موسا هەر ئەوەی دەزانی لە بارەی گاچۆنەکەیەوە – واتە پێناسەی گاچۆنەکەی خۆی کرد–، ﴿قَالَ أَلْقِهَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ﴾[2] واتە: فەرمووی گاچۆنەکەت فڕێ دە ـ فڕێی دا ـ کاتێك بینی وا مارێکەو هەڵ دەفرێت، ئا لەوێدا زانیو بۆی دەرکەوت ئەو کەسەی قسەی لەگەڵ دەکاتو ئەی دوێنێ ئەو خودایە کە فەرمووی بە هەر شتێك ببە دەبێت وەك لە سورەتی (طه)دا باس کرا لە پێشەوە. لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا رَءَاهَا تَهْتَزُّ﴾ واتە: ئینجا کاتێك موسا بینی جوڵاو هەڵخلیسکا ﴿كَأَنَّهَا جَآنٌّ﴾ وەك مارێك کە چۆن بە توندی دەڕواتو چەندە گەورەو ئەستوورەو دەم فراوانەو کەڵبەو دانەکانی لە یەك دەداو بە لای هەر بەرێکدا دەڕوات، هەڵی دەلوشێت ـ قوتی دەدا ـ دەنگی لێوە دەهات وەك لە شیوێکەوە بەربێتەوە بکەوێتەخوار ئا لەو کاتەدا ﴿وَلَّىٰ مُدْبِرًا وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ واتە: ڕای کردو هیچ ئاوڕێکی نەدایەوە، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە لەو شتانە دەترسێت، کاتێك خوای گەورە فەرمووی: ﴿يَـٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْـَٔامِنِينَ﴾ واتە: ئەی موسا وەرەو مەترسە تۆ پارێزراوی، موسا هاتەوە شوێنی خۆیو وەستا، پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿ٱسْلُكْ يَدَكَ فِى جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ واتە: دەستت بخەرە باخەڵی کراسەکەت پاشان دەری بێنە، کاتێك کە دەری دێنی وەك مانگ دەدرەوشێتەوەو تریفەی دێ بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ﴾ واتە: نەخۆشی بەڵەکی نیە ـ برمی ـ وە دەفەرمووێت:

---

[1] طه (١٧–١٨).

[2] طه (١٩–٢٠).

﴿وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِ﴾ واته: بۆ ئەوەش ترست نەمێنێ دەستت بخەرە ژێر باڵت. موجاهید دەڵێ: وەختێ دڵت کەوتە لەرزە. قەتادە دەڵێ: وەختێ کە ترسای دەستت بخەرە ژێر باڵت.[1] واتە: موسا (سەلامی خوای لێ بێت) فەرمانی پێ کرابوو هەر کاتێك ترسا لە شتێك دەستی بکات بە باڵخەڵیدا، هەر کاتێك وای کرد ئەو ترسەی دەڕوات‌و نامێنێ، وە لەوانەیە هەر کەسێك کە ترسا لەو کاتەدا دەستی خستە سەر دڵی وەك چاولێکەرێك لەو، ئەو نارەحەتیەی لەسەر نامێنێ یان سووك دەبێت لەسەری بە یارمەتی خوای گەورە. ﴿فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ﴾ واتە: فڕێدانی عەساکەی کە وەك مارێك دەجوڵاو دەست خستنە بن باڵی‌و دەرهێنانی بە سپیەتی‌و بێ نەخۆشی هەردووکیان دوو بەڵگەی ڕوون‌و ئاشکران لەسەر توانای ئەو کەسەی ڕێی پێداوە ئەو کارانە بکات هەر کاتێك بیەوێت‌و ڕاستی پێغەمبەریەتی ئەو کەسەی ئەو موعجیزانە لەسەر دەستی ڕوودەدات، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓ﴾ بۆ فیرعەون‌و کاربەدەستانی‌و ڕان‌و دارو دەستەکەی هۆزەکەی. ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ﴾ واتە: چونکە ئەوانە گەلێکی دەرچووبوون لە فەرمانەکانی خوداو دژایەتی خوداو ئاینەکەیان دەکرد.

﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ﴿٣٣﴾ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ
مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا
يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَاۚ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٣٥﴾﴾

**داوای موسا کە هارونی برای بێتە پشتگیری، خودایش داواکەی قبوڵ کرد**

کاتێك خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە بەرەو لای فیرعەون بڕوات، ئەو فیرعەونەی کە موسا لە ترسی ئەو وڵاتی میسری بەجێهێشت‌و ڕای کرد لەوێ، ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا﴾ واتە: موسا گوتی: ئەی خودایە من یەکێکم لەوانە کوشتووە، واتە: قیبتیەکم کوشتووە، ﴿فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ﴾ واتە: دەترسم ئەگەر بمبینن بمکوژن، ﴿وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا﴾ گوتی: هارونی برام زمانی لە من ڕەوانترە، چونکە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) زمانی دەیگرت‌و باش قسەی بۆ نەدەکرا بەهۆی ئەو سکڵەی (جَمرَة) کە خستیە سەر زمانی کاتێك کە ڕێی پێدرا لە نێوان سکڵ‌و دارخورمادا یان شیردا کامیان هەڵدەبژێرێت، سکڵەکەی هەڵگرت‌و نایە سەر زمانی ئەوە بوو نەیدەتوانی بە ابشی قسە بکات‌و

[1] الطبري (١٩/٥٧٥).

زمانی دەیگرت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ٢٩ هَٰرُونَ أَخِي ٣٠ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ٣١ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي﴾[1] واتە: وە گرێی زمانیشم بەرەڵا بکە بۆ ئەوەی لە قسەکانم تێ بگەن، وە لە خزمو کەسی خۆم کەسێك بکەرە پشتیوانم، کە هاروونی برامە، پشتمی پێ قایم بکەو بەهێز بکە، بیکەرە هاوبەشم لە کارەکەمدا (گەیاندنی پەیامی خودا). ﴿وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓ﴾ واتە: هارونی برام لە من زمانی ڕەوانترە لەگەڵم بینێرە یارمەتیم بداتو پشتگیریم لێ بکاتو بریکارو خاوکارم بێ لە ئیشەکەمدا، بڕوام پێ بکاتو ئەویشی بگەیەنێ بە خەڵکی، چونکە قسەی دوو کەس بەهێزترەو زیاتر کاردەکاتە سەر دڵی خەڵکی لە یەك کەس بۆیە گوتی: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ﴾ واتە: دەترسم بڵێن: تۆ درۆزنی. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: ﴿رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓ﴾ واتە: ئەو قسانەی من دەیکەم هارون بۆیان ڕوون بکاتەوە چونکە ئەوەی ئەوان لێم تێ ناگەن ئەو باش تێ دەگات.[2] کاتێك موسا ئەو داوایەی لە خودا کرد، خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾ واتە: بەم زووانە کارەکەت بەهێز دەکەینو براکەت دەکەینە پشتگیرت کە داوات کرد بیکەینە پێغەمبەرو هاوکارت بێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾[3] واتە: ئەی موسا تۆ هەرچیت داوا کرد پێت درا، وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا﴾[4] واتە: وە لە بەزەییو بەخشندەیی خۆمان بەخشیمان بەو (موسا) هارونی برایٚ کە پێغەمبەر بوو. بۆیە هەندێ لە زانایانی پێشینە (السلف) گوتیان: هیچ کەسێك منەتی ئەوەندە گەورەی نیە بەسەر برای خۆیەوە، بە ئەندازەی منەتی موسا بەسەر هاروونەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) چونکە ئەوەندە بۆی پاڕایەوە هەتا خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر لەگەڵ موساداو ڕەوانەی کردنە سەر فیرعەونو دارو دەستەکەی. بۆیە خوای گەورە لە بارەی موساوە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا﴾[5] واتە: (موسا) لای خوا ڕێزو پلەی هەبوو. واتە: موسا لای خودا جێی قەدرو ڕێزە. ﴿وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا﴾ واتە: بە بەڵگە بەهێزەکانی خۆمان

---

[1] طه (٢٧-٣٢).

[2] الطبري (١٩/٥٧٧).

[3] طه (٣٦).

[4] مريم (٥٣).

[5] الاحزاب (٦٩).

دەسەلاتتان دەدەینێ، ﴿فَلَا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا ۚ بِآيَاتِنَا﴾ واتە: ئەو کەسانە بەهۆی ئایەتەکانی ئێمەوە ڕێیان پێ نادرێت کە دەستیان پێتان بگاتو ئازارتان بدەن کاتێك کە ئێوە پەیامی خودایان پێ بگەیەنن، وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿ ۞ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾[1] واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕایگەیەنە (بە خەڵك) ئەوەی هێنراوەتە خوارەوە بۆت لە لایەن پەروەردگارتەوە وە ئەگەر وا نەکەی ئەوە ڕاسپێریەکەی خوات ڕانەگەیاندووەو بەجێت نەهێناوە وە خوا تۆ دەپارێزێت لە خەڵکی (کە بتکوژن). وە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾[2] واتە: کەسانێك کە پەیامەکانی خودا ڕادەگەیەنن وە لە (خودا) دەترسنو بێجگە لە خوا لە کەسی تر ناترسن خوا بەسە بە چاودێر. واتە: شوێنکەوتووی ئەوانن لەدنیاو لەڕۆژی دواییدا. وە دەفەرموێت: ﴿أَنتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾ واتە: تەنها ئێوە (موساو هارون) وهەر کەس شوێنتان دەکەوێ سەرکەوتوون. وەك لە ئایەتی تریشدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾[3] واتە: خودا نووسیویەتی کە بێگومان منو پێغەمبەرانم سەردەکەوین بە ڕاستی خودا توانای بالادەستە.وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾[4] واتە: بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیادا وە لەو ڕۆژەی (قیامەت) کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە، ڕۆژێك پاکانەکردنی بێ باوەڕیان سوودیان پێ ناگەیەنێت هەموویان نەفرەتیان لێکراوەو خراپترین جێگایان هەیە.

﴿فَلَمَّا جَاءَهُم مُّوسَىٰ بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّفْتَرًى وَمَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَن جَاءَ بِالْهُدَىٰ مِنْ عِندِهِ وَمَن تَكُونُ لَهُ عَاقِبَةُ الدَّارِ ۖ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴿٣٧﴾﴾

---

[1] المائدة (٦٧).

[2] الاحزاب (٣٩).

[3] المجادلة (٢١).

[4] الغافر (٥١-٥٢).

**موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەبەردەم فیرعەون و گەلەکەیدا**

خوای گەورە باسی چوونی موساو هارونی برای دەکات (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆ لای فیرعەون‌و دەستەو بەستەکەی‌و نیشاندانی ئەو هەموو موعجیزەو بەڵگە گەورانە کە خوای گەورە پێی داون، ڕاستی ئەوە دەسەلمێنن کە لە لایەن خوداوە ڕەوانە کراون کە فیرعەون‌و شوێنکەوتووەکانی ئاگادار بکەن کە تەنها خودا بپەرستن‌و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بن، کاتێك فیرعەون‌و شوێنکەوتووەکانی ئەو ڕاستیەیان بۆ دەرکەوت‌و بە چاوی خۆیان بینیان‌و گومانیان نەما کە لە لایەن خوداوەیە، کەوتنە لاساری‌و ئەوەندە بێ دین بوون دەستیان دایە خراپەکاری‌و مل وڕی ستەمکاری، پێیان شوورەیی بوو شوێنی حەق بکەون، خۆیان زۆر بە زل دەزانی دەیان وت: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى﴾ واتە: کاتێك کە موسا موعجیزە ڕوونەکانی ئێمەی بۆ هێنان ئەوان وتیان: ئەمە تۆ هێناوتە موسا تەنها جادوویەکی دەست هەڵبەستە، ویستیان بە فێڵ‌و فڕ خەڵکی فریو بدەن، بە شوێن‌و پلەو پایە بیانخەڵەتێنن، بەڵام ئەوەیان بۆ نەچووە سەرو سەرکەوتوو نەبوون دەیان گوت: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ واتە: مەبەستیان ئەوە بوو شتی وایان لە باب‌و باپیرانیان نەبیستووە کە بە تەنها خودا بپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن، کەسیشیان نەدیوە لە باب‌و باپیرانیان تەنها خودایان پەرستبێت‌و لەسەر ئەم دینە بووبن، هەر کەسیشمان بینیبێ هەر شەریکی بۆ خودا داناوەو لەگەڵی پەرستوویەتی موساش (سەلامی خوای لێ بێت) وەڵامی دانەوەو پێی گوتن: وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ﴾ واتە: خودا لە هەموو کەس چاکتر دەزانێت کێ لە لای ئەوەوە ڕێنموونی هێناوە، واتە لە منیش‌و لە ئێوەش چاکتر دەزانێ وە بەم زووانە فەرمانی خۆی دەدا لە نێوان من‌و ئێوەداو لە یەکتری جیامان دەکاتەوە، بۆیە گوتی: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ﴾ واتە: کێ پاشەڕۆژێکی چاك‌و بەختەوەری دەبێت‌و سەرکەوتوو زاڵ دەبێت‌و پشتگیری دەکرێت. ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتە: بێگومان ستەمکاران ڕزگار نابن، واتە: ئەوانەی کە شەریك بۆ خودای مەزن دادەنێن.

﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ

كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا
يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتْبَعْنَٰهُمْ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلْمَقْبُوحِينَ ﴿٤٢﴾﴾

**خۆ بەزلزانینی فیرعەون و پاشەڕۆژی**

خوای گەورە باسی بێ دینیو سەرکەشیو درۆزنیو نەفس پیسی فیرعەون دەکات کە داوای خوایەتی کردووە لەعنەتی خوای لێ بێت. وەك خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ﴾[1] واتە: داوای لە گەلەکەی کردووە کە بیکەنە خودای خۆیان ئەوانیش قەبوڵیان کردووە چونکە گەلێکی بێ عەقڵو دەبەنگ بوون، بۆیە فیرعەون پێی گوتوون وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى﴾ واتە: فیرعەون وتی: ئەی گەورەو ئەشرافەکان وا نازانم جگە لە خۆم هیچ پەرستراوێکی ترتان هەبێت. وە لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾،[2] واتە: گەلەکەی خۆی کۆکردەوەو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد من خودای هەرە بەرزی ئێوەم، ئەوانیش گوێ بیستی بوونو شوێنی کەوتن، بۆیە خوای گەورە تۆڵەی لێ سەندو کردیە پەندی زەمانە بۆ خەڵکی تر لە دنیاو لە قیامەتدا. ئەوەندە لەخۆبایی بوو گوتی بە موساش (سەلامی خوای لێ بێت) کە ئەویش قبووڵی بکاتو بیکاتە خودای خۆی. پاشان فیرعەون گوتی: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ﴾ واتە: فەرمانی دا بە وەزیرەکەی کە ڕاوێژکارو سەرپەرشتی کەری ژێردەستەکانی بوو کە خشتی قوڕی بۆ سوور بکاتەوەو کۆشکێکی زۆر بەرزو گەورەی بۆ دروست بکات. هەتا لەوێوە سەیری خواکەی موسای پێبکات، وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ﴾[3] واتە: فیرعەون وتی ئەی هامان کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە بەڵکو بگەمە ئەو ڕێگایانە، کە ڕێگاکانی (بەرزبوونەوەن بۆ) ئاسمانەکان بۆ ئەوەی (لەوێوە) سەیری خواکەی موسا بکەم وە بە ڕاستی من وا گومان دەبەم ئەو

---

[1] الزخرف (٥٤).

[2] النازعات (٢٣-٢٦).

[3] الغافر (٣٦-٣٧).

(موسا) درۆزنە ئا بەو جۆرە ڕازێنرایەوە بۆ فیرعەون کردەوەی خراپی وە (بە هۆیەوە) بەرگری کرا لە ڕێگای ڕاست وە هەر فێڵ و پلانێکی فیرعەون هەبوو بە فیڕۆچوو. فیرعەون ئەو کۆشکەی کە دروستی کرد لە دنیادا کۆشکێکی تری وا نەبوو، ویستی بەو شێوەیە دەری بخات بۆ ژێردەستەکانی کە هەر ئەو خودایانەو، موسا بە درۆ بخاتەوە کە دەڵێت خودایەکی تر هەیە غەیری فیرعەون بۆیە گوتی: ﴿وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ واتە: من بە درۆزنی دەزانم کە دەڵێت: بێجگە لە من خودایەکی تر هەیە، لەبەر ئەوە نەبوو کە موسا دەیگوت من پێغەمبەرم فیرعەون بڕوای پێ نەدەکرد، بەڵکو هەر دانی بە خودایەتی خوای گەورەدا نەدەنا کە وەدیهێنەرە، چونکە فیرعەون دەیگوت: ﴿وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[1] واتە: پەروەردگاری جیهانیان کێیە. وە دەیگوت: ﴿لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ﴾[2] واتە: سوێند بێت ئەگەر پەرستراوێکی تر جگە لە من دابنێیت بێگومان دەتخەمە ڕیزی بەندکراوانەوەو زیندانیت دەکەم. وە دەیگوت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي﴾ ئەمە قسەی ئیبنو جەریرە.[3] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ﴾ واتە: فیرعەون و سەربازەکانی وایان دەزانی ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە دەستیان دابووە تاوان و خراپەکاری و زۆرداری لەسەر زەمیندا، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَصَبَّ عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ ۝١٣ إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ﴾[4] واتە: خوای گەورە بەر قەمچی ئازاری خۆی دەدان و بێگومان پەروەردگاری تۆ هەمیشە ئاگای لێیانەو چاودێرە بەسەریانەوە، بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ﴾ واتە: جا تۆڵەمان لە ئەو (فیرعەون)و لەشکرو سەربازەکانی سەندو فڕێمان دانە ناو ئاوی نیلەوە ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: ئینجا سەرنج بدە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) سەرەنجامی ستەمکاران چۆن بوو. وە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةً يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ﴾ واتە: ئەوانمان کردە پێشەوایانێك کە خەڵك بانگ دەکەن بۆ ئاگری دۆزەخ وە لە ڕۆژی دواییشدا یارمەتی نادرێن، واتە:

---

[1] الشعراء (٢٣).

[2] الشعراء (٢٩).

[3] الطبري (١٩/٥٨٠).

[4] الفجر (١٣-١٤).

سەرشۆڕی دنیاو قیامەتن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾[1] پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً﴾ واتە: لەم دنیایەدا نەفرینمان نار بە دوایاندا، یانی خوای گەورە ڕێگەی داوە لەعنەت بکرێت لە فیرعەون‌و داروودەستەکەی لەسەر زبانی خاوەن باوەڕان ئەوانەی کە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن. وەك چۆن لەعنەتیان لێ کرا لە لایەن پێغەمبەران‌و شوێنکەوتوانیانەوە. ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُم مِّنَ الْمَقْبُوحِينَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئەوانە لە بێزراوو دوورخراوەکانن. قەتادە دەڵێ: ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەیە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ﴾[2]، [3] واتە: وە لەم (دنیا)دا نەفرینیان بە شوێندا نێردراوە هەروەها لە ڕۆژی قیامەتیشدا ئایا چەند خراپە ئەو بەخشراوەی پێیان بەخشرا.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَىٰ بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾﴾

**باسی بەهرەکانی خودا لەسەر موسا (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای گەورە باسی ئەوبەهرانەدەکات کەدای بەموسا(سەلامی خوای لێ بێت) لە ڕەوانەکردنی تەورات بۆی پاشان لەناوبردنی دارو دەستەی فیرعەون، وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِن بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَىٰ﴾ واتە: پاش ناردنی تەورات بۆ موسا (سەلامی خوای لێ بێت) خودا هیچ گەلێکی بە تەواوی بەرباد ـ قڕ ـ نەکردووە، بەڵکو فەرمانی داوە کە خاوەن باوەڕان بجەنگن دژی موشریك‌و دوژمنانی خودا، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَجَاءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُ وَالْمُؤْتَفِكَاتُ بِالْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾[4] واتە: (هەر بەو ڕەنگە) فیرعەون‌و گەلانی پێش ئەوو (دانیشتوانی دێهاتە) سەرەو ژێربووەکان هاتن بە گوناهو خراپەوە، بێ فەرمانی پێغەمبەری پەروەردگاریان کرد ئەوسا گرتنی بە گرتنێکی زۆر سەخت. وە دەفەرمووێت: ﴿بَصَائِرَ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ واتە: ببێتە هۆی ئاوڕۆشنی‌و شارەزایی بەزەیی لە کوێری‌و سەر لێشێواوی، واتە:

[1] محمد (١٣).

[2] هود (٩٩).

[3] الطبري (١٩/٥٨٣).

[4] الحاقة (٩–١٠).

شارەزاکردنیان بۆ ئاکاری چاك. ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ واتە: بەڵکو هۆشیان بێتەوە سەر خۆیانو دەست کۆتا کەن لە تاوانو خراپەکاری بەهۆی ئەو کتێبەوە.

﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾

**ئاکاری لەسەر سەلماندنی پێغەمبەریەتی موحەمەد (ﷺ)**

خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لەسەر ڕاستی پێغەمبەریەتی موحەمەد (ﷺ)و پێمان دەسەلمێنێت کاتێك کە باسی شاراوەکانی ڕابردوومان بۆ دەکات، بە شێوەیەك کە ئەو کەسەی دەیبیستێ وا دەزانێ چاوی لێی بووەو لەو شوێنە بووە کە ئەو ڕووداوە تیایدا ڕوویداوە، ئەو پێغەمبەرەی (ﷺ) کە پیاوێکی نەخوێندەوار بوو لەناو گەلێکیشدا تەمەنی بەسەر بردووە کە خوێندەواری لەناویاندا نەبووە، لەو شتە نادیارو شاراوانە کە خوای گەورە باسی کردووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) باسی مەریەمو ئەو ڕووداوەی کردووە کە بەسەری هاتووە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴾[1] واتە: تۆ لەوێ نەبووی ئەی موحەمەد (ﷺ) کاتێك کە قەڵەمیان فڕێدا کێ سەرپەرشتی مەریەم بێت، وە لەو کاتەشدا لەناو خۆیاندا کێشەیان بوو تۆ لەوێ نەبووی. بەڵام خوای گەورە تۆی ئاگادار کرد، هەروەها کاتێك کە باسی نوح پێغەمبەری (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ دەکات لەگەڵ هۆزەکەیدا، کە چیان بەسەرهات، وە چۆن نوحو خاوەن باوەڕانی لە خنکان ڕزگارکردو گەلەکەی هەمووی نوقمی ئاوکردو خنکاندنی، پاشان دەفەرموێت: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ ۖ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا ۖ فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾[2] واتە: ئەمانە لەو هەواڵە نادیارانەن کە تۆی لێ ئاگادار دەکەین نە تۆ زانیوتەو نە هۆزەکەشت لەمەوبەر، خۆڕاگر بە پاشەڕۆژ هەر بۆ لە خواترسانە. وە لە کاتی سوڕەتی هودا

---

[1] ال عمران (٤٤).

[2] هود (٤٩).

دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ﴾[1] واتە: ئەمە هەندێ لە دەنگو باسی ئەو شارانەیە کە بۆتی دەگێڕینەوە. وە لێرەشدا دوای ئەوەی کە باسی بەسەرهاتی موسای کرد (سەلامی خوای لێ بێت) لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بەسەرهاتەکەو کە چۆن لە سەرەتاوە ئاگاداری کردو قسەی لەگەڵ کردو دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ﴾ واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) تۆ لە لای خۆرئاوای کێوەکەوە نەبووی کە خودای مەزن قسەی لەگەڵ موسا کرد لە لای ئەو درەختەوە کە لە خۆرهەلاتی کەناری ئەو دۆڵەوە بوو ﴿وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ واتە: تۆ لەوێ ئامادە نەبووی. بەلام خوای گەورە ئاگاداری کردی، لە ژیانی ئەو گەلانە کە چۆن لەناو چوون، پاشان خوای گەورە پێغەمبەرانی ئاگادارکردووەو پەیامی بە ئەو پێغەبەرانەدا (سەلامی خوایان لێ بێت) ڕەوانەکردووە بۆیان. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ واتە: ئێمە خەڵکی زۆرمان وەدی هێناو زۆریش ژیان وە لەناو خەڵکی مەدیەنیش نەبووی کە نیشانەکانی ئێمەیان بۆ بخوێنیتەوە، ئاگاداری پێغەمبەر شوعەیبیش نەبووی (سەلامی خوای لێ بێت) لەناو گەلەکەیدا چی بەسەر هاتو چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد. ﴿وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ واتە: بەلام ئێمە تۆمان ئاگادار کردو کردمانی بە پێغەمبەرو ڕەوانەمان کردی بۆ سەر خەڵکی. قەتادە دەڵێ: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا﴾ واتە: تۆ لە نزیکی کێوی تور نەبووی کە موساسمان بانگ کرد. ئەم والله أعلم هەر لەم ئایەتە دەچێت کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ﴾ پاشان لێرەدا بە شێوەیەکی تر باسی کردووە کە تایبەت ترە لەو ئایەتەی پێشوو کە بانگکردنە، وەك لەم ئایەتەی تریشدا باسی کردووەو فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰٓ﴾[2] واتە: (باسی بکە) ئەو کاتەی پەروەردگارت بانگی موسای کرد. وە فەرموویەتی: ﴿إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى﴾[3] واتە: کاتێك پەروەردگاری بانگی کرد لە شیوی پیرۆزی طووا. وە فەرموویەتی: ﴿وَنَٰدَيْنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَٰهُ نَجِيًّا﴾[4] واتە: وە ئێمە ئەومان بانگ کرد لە لای ڕاستی کێوی طورەوە ئەو (موسا)مان نزیك کردەوە تا قسەی لەگەڵ بکەین.

---

[1] هود (١٠٠).

[2] الشعراء (١٠).

[3] النازعات (١٦).

[4] مريم (٥٢).

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾ واتە: ئەمەیش دڵۆڤانیە لە لایەن پەروەردەتەوە بۆ تۆ کە ئەو شتانەت نەدیووە، بەڵام خوای گەورە ئاگاداری کردوویتو هەواڵی پێداویت، بە بەزەیشەوە بۆ بەندەکانی کە تۆی بۆ ڕەوانەکردن. ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی گەلێك بترسێنێت کە پێش تۆ کەسی وا نەبووە بیانترسێنێت بەڵکو بیر بکەنەوەو شارەزا ببن بەو پەیامەی کە تۆ بۆت هێناون لە لایەن خوداوە. ﴿وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: لەبەر ئەوە نەبووایە تووشی بەڵایەك ببن بە هۆی کرداری خۆتانەوەو پاشان بڵێن: ئەی خودایە بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ نەناردووین، بۆیە ئێمە تۆمان ئەی موحەمەد(ﷺ) ڕەوانەکرد بۆیان هەتا هیچ بیانوویەکیان نەمێنێ بەڵگە بێت بەسەریانەوە کاتێك کە سزای خوایان بۆ دابەزی بە هۆی ئەو خراپەکاریو دوور لە خواییانە، پاشان بیکەنە بیانوو، بڵێن هیچ کەسێك نەهاتووە بمانترسێنێ، نە پێغەمبەرو نە ترسێنەر، بۆ ئەوەی شوێن ئایەتەکانت بکەوتینایە، وە لە بڕواداران بووینایە. وەك خوای گەورە پاش ئەوەی باسی ناردنە خوارەوەی قورئانی کردووە فەرموویەتی: ﴿أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ﴾[1] واتە: لەبەر ئەوەی نەڵێن بێگومان کتێب تەنها بۆ سەر دوو کۆمەڵ (گاورو جوولەکە) نێردراوەتە خوارەوە لە پێش ئێمەدا کە بەڕاستی ئێمە لە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی کتێبەکانیان بێئاگابوون وە بۆ ئەوەی نەڵێن بەڕاستی ئەگەر کتێبی ئاسمانی بۆ ئێمە بهاتبایە ئەوە ئێمە لەوان ڕێنموون تر دەبووین ئەوە بێگومان بەڵگەو نیشانە (قورئان)ی ڕوونتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە ڕێنموونیو میهرەبانیەکی گەورەیە. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾[2] واتە: پێغەمبەران (مان ناردووە) کە مژدەدەرنو ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی نەبێت بەڵگە بەسەر خوداوە دوای (ناردنی) پێغەمبەران. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ﴾.[3] واتە: ئەی نامەدارەکان بێگومان

---

[1] الانعام (١٥٦-١٥٧).

[2] النساء (١٦٥).

[3] المائدة (١٩).

نێردراوەکەمان هات بۆ ناوتان (بەرنامەی خوا) ڕوون دەکاتەوە بۆتان پاش ماوەیەك لە ناردنی پێغەمبەران لەبەر ئەوەی نەڵێن: نەهات بۆ لامان هیچ مژدەدەرو ترسێنەرێك ئەوەتا بێگومان مژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هاتووە.ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە. والله أعلم.

﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن
قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ
إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ
بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ
يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾﴾

### لاساری خوانەناس و وەڵامدانەوەیان

خوای گەورە باسی ئەو گەلانە دەکات ئەو سزای بدانایە پێش ئەوەی بەڵگەی تەواویان بداتێ دەیان کردە بیانو دەیانگوت: ئێمە پێغەمبەرمان بۆ نەهاتووە، کەچی هەر ئەوانە کاتێك بەڵگەی ڕاستیان لە لایەن منەوە بۆ هات لەسەر زمانی موحەمەد (ﷺ) هەر لەسەر لاساریو ڕکیو بێ دینی خۆیان مانەوەو دەیانگوت: وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾ واتە: ئینجا کاتێك ڕاستیان بۆ هات لە لایەن ئێمەوە وتیان بۆچی بەو (موحەمەد) (ﷺ) نەدراوە وێنەی ئەوەی بە موسا دراوە، ئایا ئەوان پێشتر بێ بڕوا نەبوون بەوەی درابوو بە موسا،مەبەستیان لەو موعجیزانەی موسا بوو وەك: عەساکەی دەستیو زریانو لافاوو کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێنو کەمی کشتوکاڵو بەروبووم ـ کە تەنگی بە دوژمنانی خوای گەورە هەڵچنیبوو ـ ئەو موعجیزانەی تریش وەك لەتکردنی دەریاو سێبەرکردنی هەورو باراندنیو ناردنی گەزۆو شەلاقەو ڕیشۆڵە ـ المن السلوی ـ چەندین نیشانەی تری گەورەو بەڵگەی بەهێز کە خودای گەورە لەسەر دەستی موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) وەدی هێنا. کە کردنیە بەڵگە لەسەر فیرعەونو دارو دەستەکەیونەوەی ئیسرائیل، ئەمانەهەمووی کاری نەکردە سەر فیرعەونو شوێنکەوتووەکانی. بەڵکو هەر لەسەر خوانەناسی خۆیان بەردەوام بوونو بڕوایان بە موساو هاروونی برای نەکرد. پێیان دەگوتن: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ﴾[1] واتە: وتیان ئایا هاتووی بۆ لامان بۆ ئەوەی

[1] یونس (٧٨).

لامان دەی لەوەی باووباپیرانمان لەسەری بوون تا بۆ هەردووکتان (موساو هارون) بێت گەورەیی (سەرۆکی) لە زەویدا وە ئێمە هەرگیز باوەڕتان پێ ناکەین. وە فەرموویەتی: ﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا مِنَ الْمُهْلَكِينَ﴾[1] واتە: لەبەر ئەوە باوەڕیان پێ نەهێنان ئەمانیش (وەك گەلانی تر) لەناوبران.

**یاخی بووەکان باوەڕ ناهێنن بە موعجیزەکان**

بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ﴾ واتە: ئایا ئەو خەڵکە دەستیا نەدایە خوانەناسیو ئەوەی بە موسادا ناردمان لێی دوور دەکەوتنەوە. ﴿قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾ واتە: دەیان وت: (قورئانو تەورات) دوو سیحرو جادوون پشتگیری یەکتر دەکەن ﴿وَقَالُوا إِنَّا بِكُلٍّ كَافِرُونَ﴾ واتە: وە دەیان گوت: بێگومان ئێمە بێ بڕواین بە هەموویان (قورئانو تەورات).

**درۆ هەڵبەستن بە دەم موساو هارونەوە کە جادووگەرن**

موجاهیدی کوڕی جەبر - جبر - دەڵێ: جوولەکەکان گوتیان بە قورەیشیەکان کە بێژن بە موحەمەد (ﷺ) بۆچی ئەوەی بۆ موسا هاتووە بۆ تۆ نەهاتووە، واتە: موسا ئەو هەموو موعجیزەی هەبووە تۆ بۆچی موعجیزەت نیە، خوای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَكْفُرُوا بِمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ قَالُوا سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾. موجاهید دەڵێ: گوتیان ئەمانە جادووگەرن پشتی یەکتری دەگرنو یارمەتی یەکتر دەدەنو قسەی یەکتری لە زەوی نادەن.[2] سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو ڕەزین گوتوویانە: ﴿سِحْرَانِ﴾ مەبەستیان موساو هارونە.[3] ئەم قسەیە قسەیەکی چاكو بەهێزە، والله أعلم.

**وەڵام دانەوەی بوختانەکەیان**

بەڵام ئەوانەی خوێندوویانەتەوە بە: ﴿سِحْرَانِ تَظَاهَرَا﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو ع دەڵێن: لە ئیبنو عەباسەوە: مەبەستیان تەوراتو قورئان بووە.[4] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ﴾ واتە: (ئەی موحەمەد (ﷺ)) بڵێ: دەی ئێوە کتێبێك لە لایەن خوداوە بێنن کە ئەو (کتێبە) ڕاستتر بێت لەو دووانە (قورئانو تەورات) من شوێنی دەکەوم. زۆرجار خوای گەورە هاوتایيو نزیکیەکی لە نێوان قورئانو تەوراتدا نیشان داوە. وەك فەرموویەتی:

---

[1] المؤمنون (٤٨).

[2] الطبري (١٩/٥٨٨).

[3] الطبري (١٩/٥٨٩).

[4] الطبري (١٩/٥٩٣).

﴿قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ﴾[1] واته: ؟؟؟؟؟ ئەم قورئانە ناردوومانەتە خوارەوە پیرۆزو فەڕدارە. وە لە کۆتایی ﴿ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَـٰذَا كِتَـٰبٌ أَنزَلْنَـٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[2] واتە: لە پاش ئەوە تەوراتمان بەخشی بە موسا بۆ تەواوکردنی چاکەو بەهرەمان بەرامبەر کەسێك کە بە چاکە پێی هەڵساوە وە ڕوونکەرەوەی هەموو شتێك بێت وە ڕێنیشاندەرو ڕێنموونیو میهرەبانی بێت بۆ ئەوەی باوەڕبهێنن بە گەیشتنیان بە حزووری پەروەردگاریان، وە ئەم قورئانە پیرۆزە بە فەڕەمان ناردۆتە خوارەوە کەواتە ئێوەش شوێنی بکەونو خۆتان بپارێزن (پارێزگار بن) تا ڕەحمتان پیٚ بکرێت. جنۆکەیش گوتوویانە: ﴿يَـٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾[3] واتە: بە ڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین کە لە پاش موسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێت. وەرەقەی کوڕی نەوفەل دەڵێ: ئەمە ئەو ناموسەیە ـ جبریل ـ کە تەوراتی هێنا بۆ موسا. زۆر دیارو ئاشکراشە بۆ کەسێك کە خاوەنی عەقڵو زانست بێت کە خودای گەورە هیچ کتێبێکی لە ئاسمانەوە ڕەوانە نەکردووە لەو کتێبانەی کە ڕەوانەی کردووە بۆ پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لیٚ بێت) تەواوترو ڕەوانترو گەورەترو بەڕێزتر لە قورئانی پیرۆز، کە ناردوویەتی بۆ موحەمەد (ﷺ) دوای قورئان بە ڕێزترینو گەورەترین کتێب تەوراتە کە ناردوویەتی بۆ موسای کوڕی عیمران (سەلامی خوای لیٚ بێت) ئەو کتێبەیە کە خوای گەورە لە بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ﴾[4] واتە: بێگومان ئێمە تەوراتمان ناردە خوارەوە کە ڕێنموونیو ڕووناکی تێدابوو ئەو پێغەمبەرانە حوکمیان پیٚ دەکرد کە موسڵمانو ملکەچ بوون بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون هەروەها زانا خواناسەکانو زانا شەرع زانەکان (حوکمیان پیٚ دەکرد) بە هۆی ئەوەی فەرمانی پارێزگاری کتێبی

---

[1] الانعام (٩٢).

[2] الانعام (١٥٤_١٥٥).

[3] الاحقاف (٣٠).

[4] المائدة (٤٤).

خوا (تەورات)یان پێ کرابوو (لە لایەن پێغەمبەرەکانیانەوە) وە شایەتیش بوون لەسەری. ئینجیلیش هاتووەتە خوار بۆ تەواوکردنی تەوراتو حەڵاڵکردنی هەندێك شت کە حەرام بوو لەسەر نەوەی ئیسرائیل، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِّنْ عِندِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتە: ئەگەر ڕاست ئێژنو دەتانەوێ یارمەتی ڕاستی پێ بدەنو دژایەتی پڕوپووچی پێ بکەن، کتێبێ لە لایەن خوداوە بێنن لەوانە زیاتر ڕێگا نیشان بدات.

### دڵدانەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهان

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ﴾ واتە: ئەگەر ئەوەی تۆ پێیان ئێژی بە گوێیان نەکردیو شوێنی ڕاستی نەکەوتن. ﴿فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ﴾ واتە: بزانە ئەوانە شوێن ئارەزووی خۆیان کەوتوون، بەبێ هیچ بەڵگەو نیشانەیەك، ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ﴾ واتە: کێ لەو کەسە گومڕاترە کە شوێنی ئارەزووی خۆی دەکەوێت بەبێ هیچ بەڵگەیەك کە لە کتێبی خواوە وەرگیرابێت. ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ واتە: بێگومان خودا گەلی ستەمکار شارەزا ناکات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ﴾ واتە: بە بەردەوام ئەو قسانەمان پێ دەگەیاندن، موجاهید دەڵێ: بەردەوام بۆمان شی کردنەوە.[1] سودی دەڵێ: بۆمان ڕوون کردنەوە.[2] قەتادە دەڵێ: خوای گەورە دەفەرموێت: هەواڵی دانێ کە چی بەسەر گەلەکانی تر هێنا. کە ڕابوردن، چۆنی لێ کردن، ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾[3] واتە: بەڵکو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن، موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿وَصَّلْنَا لَهُمُ﴾ واتە: قورەیشیش.[4] واتە: ئەو قسانەشمان بۆ هۆزی قورەیشیش ڕوون کردووەتەوە ـ والله أعلم ـ.

﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ (٥٢) وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ (٥٣) أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ (٥٤) وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ (٥٥)﴾

---

[1] الطبري (١٩/٥٩٣).

[2] ابن ابي حاتم (٩/٢٩٨٧).

[3] الطبري (١٩/٥٩٣).

[4] الطبري (١٩/٥٩٤).

**خاوەن باوەڕانی ئەهلی کتێب**

خوای گەورە باسی زانا خواناسەکان دەکات لە ئەهلی کتێب کە بڕوایان بە قورئان هەیە، وەك دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾[1] واتە: ئەوانە کە نامەمان پێداوون بە ڕاستی دەوری دەکەنەوە ئەوانە بڕوا دەهێنن بە ڕێنموونی خوا (کە ئیسلامە). وە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾[2] واتە: بێگومان لەناو نامەدارەکاندا هەیە کەسانێك کە بڕوا دەهێنن بە خواو ئەو نامەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە وە بەو نامەی کە نێردراوەتە خوارەوە بۆیان ملکەچن بۆ خوا. وە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾[3] واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە زانیاریان پێ بەخشراوە لە پێش ئەم (قورئانە)دا کاتێك (قورئان) بخوێنرێتەوە بە سەریاندا بە چەسپانی دەکەون بە ڕوودا بە سوژدە بردن، وە دەڵێن پاكو بێگەردی بۆ پەروەردگارمان بە ڕاستی هەمیشە بەڵێنی پەروەردگارمان بەدی دێت. وە دەفەرموویێت: ﴿۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾[4] واتە: وە سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لە خۆشەویستی بۆ بڕواداران ئەوانەن کە دەیان وت بێگومان ئێمە گاوریین ئەوەش لەبەر ئەوەیە بێگومان لە ناویاندا قەشەو گۆشەگیرانێك هەن کە بە ڕاستی ئەوان خۆیان بە زلو گەورە دانانێن، هەر کاتێك گوێیان لێ بووایە ئەو قورئانەی کە نێردراوەتەوە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەبینی چاوەکانیان لە فرمێسك (پڕ دەبێتو) دەڕژێت لەبەر ئەو ڕاستیەی کە زانیویانە (و بۆیان دەرکەوتووە) دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا دە تۆش لەگەڵ شایەت دەران بمان نووسە. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ ئەم ئایەتە لەسەر حەفتا قەشە ـ قسیس ـ هاتە خوارەوە کاتێك کە نەجاشی ناردنی

[1] البقرة (١٢١).

[2] ال عمران (١٩٩).

[3] الاسراء (١٠٧ـ١٠٨).

[4] المائدة (٨٢ـ٨٣).

بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك گەیشتنە لای پێغەمبەر(ﷺ) ﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ی بۆ خوێندن هەتا کۆتایی سورەتەکە قەشەکان گریانو موسڵمان بوونو ئەم ئایەتانە لەسەر ئەوان هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت:[1] ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی لە پێشدا کتێبی ئاسمانیان پێ دابوون ئەوانە بڕوا دێنن بە قورئان. وە پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ﴾ واتە: کاتێك بەسەریاندا بخوێنرێتەوە ئێژن: بڕوامان پێی هەبووە کە بێگومان ڕاستەو لە لایەن پەروەردگارمانەوە هاتووە، واتە: ئێمە پێش هاتنی ئەو قورئانە هەر موسڵمان بووینو خودامان بە تەنها ناسیووەو شەریکمان بۆ دانەناوەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بووین، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئەم سیفەتانە بوون کە بڕوایان بووە بە کتێبی یەکەمو پاشانیش بڕوایان هێناوە بە کتێبی دووەمیش (دووجار پاداشت دەدرێنەوە، جارێك لەبەر ئەوەی بڕوایان بووە بە پێغەمبەری یەکەمو جاری دووەمیش کە بڕوایان هێناوە بەم پێغەمبەرە(ﷺ)) بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿بِمَا صَبَرُواْ﴾ واتە: بە هۆی خۆڕاگریانەوە لەسەر هەق چونکە ئەو خۆڕاگریە تا بەو شێوەیە زۆر گرانە لەسەر نەفس. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە عامیری شەعبیەوە - عامر الشعبي - لە ئەبو بوردەوە ئەویش لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کەس دووجار پاداشتیان دەدرێتەوە: پیاوێك لە ئەهلی کتێب کە بڕوای بووە بە پێغەمبەرەکەیو پاشان بڕوای بە منیش هێناوە، وە عەبدێکی کۆیلە کە هەقی خوداو خاوەنەکەی دابێت، وە پیاوێك: کەنیزەیەکی کۆیلەی لابێتو بە چاکی پەروەردەی کردبێتو پاشان ئازادی کردبێتو دوای ئەوەش مارەی کردبێت).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامەوە دەڵێ: من لەبەردەم وشترەکەی پێغەمبەر بووم (ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا قسەیە زۆر چاكو جوانی فەرموو، لەو قسانە فەرمووی: (هەر کەسێك لە ئەهلی کتێب موسڵمان بووبێت دووجار پاداشتی هەیە، ئەوەی بۆ ئێمە هەیە بۆ ئەویش هەیە، ئەوەش لەسەر ئێمەیە لەسەر ئەویشە، وە ئەو کەسەی موشریکەو موسڵمان بووە پاداشتی خۆی هەیە، ئەوەی بۆ ئێمە هەیە، بۆ ئەویش هەیەو ئەوەش لەسەر ئێمەیە لەسەر ئەویشە).[3] ﴿وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ﴾ واتە: وەڵامی خراپە بە خراپە

---

[1] ابن ابي حاتم (٩/٢٩٨٨).

[2] فتح الباري (١/٢٢٩).

[3] أحمد (٥/٢٥٩)، ئەم فەرموودەیە جمهور بە لاوازیان داناوە.

نادەنەوە بەڵکو چاوپۆشی دەکەن لە خراپەو لێبوردەن ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ واتە: ئەو بژێویەی کە خودا پێی داون لە ماڵی حەڵاڵ لە ڕێی خوادا دەیبەخشن بە خەڵکی هەژارو سەرفی دەکەن بۆ ماڵو منداڵو کەسو کاری خۆیان، وەك زەکاتو خێروبێری تر جگە لە ماڵی زەکات. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا۟ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُوا۟ عَنْهُ﴾ واتە: هەر کاتێك گوێیان لە قسەی خراپو بێ سوودی خەڵکی بووایە تێکەڵیان نەدەکردنو لێیان دوور دەکەوتنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا﴾[1] واتە: کاتێك تێپەڕ بن بە لای شتی بێ سوود دا (ئەنجام دبرێت لە لایەن نەفامانەوە) تێپەڕ دەکەن بەڕێزەوە (بێ گوێدانە نەفامان). ﴿وَقَالُوا۟ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ واتە: کاتێك کەسێکی نەفامو هەرزە قسەیەکی ناشیرینی پێ بگوتنایە، شایەنی ئەوە نەبووایە وەڵامیان نەدەدایەوەو گوێیان پێ نەدەداو بەو شێوەیەی ئەوان بە قسەی ناشیرین وەڵامیان نەدەدانەوە، وتەی شیرین نەبێت بە دەمیاندا نەدەهات، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەو پیاو چاکانە گوتیان: ﴿لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِى ٱلْجَٰهِلِينَ﴾ واتە: ئێمە نامانەوێ بە ڕێی نەفاماندا بڕۆینو خۆشیمان لێیان نایە.

﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوٓا۟ إِن نَّتَّبِعِ ٱلْهُدَىٰ
مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَآ ۚ أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا ءَامِنًا يُجْبَىٰٓ إِلَيْهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَىْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾

**خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت شارەزای ڕێگەی دەکات**

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەی موحەمەد: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِى مَنْ أَحْبَبْتَ﴾ واتە: تۆ ناتوانی کەسێك شارەزا بکەی کە خۆشت دەوێت، بەڵکو تۆ هەر کەیاندنت لەسەرە خودا مەیلی خۆیەتی کێ شارەزا دەکات، هەر کارێك خودا بیکات پڕە لە نیشانەی گەورەو لە کارزانی وەك دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾[2] واتە: لەسەر تۆ نیە (ئەی موحەمەد (ﷺ)) ڕێنموونیو موسڵمان کردنی خەڵکی بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێ هیدایەتی دەدات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾[3] واتە: وە زۆربەی خەڵکی

---

[1] الفرقان (٧٢).

[2] البقرة (٢٧٢).

[3] يوسف (١٠٣).

هەرچەندە تۆسووربیت(لەسەر باوەڕهێنانیان) نابنە ئیماندار. ئەم ئایەتە لە هەموو ئایەتەکانی تر تایبەتترە، وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ واتە: بە ڕاستی (ئەی موحەمەد ـ ﷺ ـ) تۆ ناتوانی ئەو کەسەی خۆشی بووێت ڕێنموونی بکەی بەڵام خوا هەر کەسی بووێت هیدایەتی دەدات وە ئەو (خوایە) زاناترە بەوانەی ڕێنمونی وەردەگرن، وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووەتە خوار کە هەمیشە بە دەوری پێغەمبەرەوە بووە (ﷺ) وە یارمەتی داوەو لە ڕێزی ئەوا بووەو زۆر پێغەمبەری خۆش ویستووە، خۆشەویستی سروشتی خۆی نەك لەبەر خاتری خوا، کاتێك مردنی نزیك بووەوە لە گیانداندا بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێ کرد بڕوا بێنێ‌و موسڵمان ببێت، قەدەریش پێش کەوت کەوت‌و لە دەستی فڕاند ئەبو تالیب هەر لەسەر خوانەناسی خۆی بەردەوام بوو، ئیشی خوا پڕە لە حیکمەت. زەهەری ـ الزهري ـ دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەیب بۆی گێڕامەوە لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: کاتێك ئەبو تالیب خەریك بوو دەمرد ـ گیانی دەدا ـ پێغەمبەری خوا هاتە لای، لەو کاتەدا ئەبو جەهل‌و عەبدوڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی موغیرە لە لای ئەبو تالیب بوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی مامە بڵێ ـ لا اله الا الله ـ وتەیەکە هەتا بە هۆی ئەو وتەیەوە بۆت بلاڵێمەوە) ئەبو جەهل‌و عەبدوڵای کوڕی ئومەیە گوتیان: ئەی ئەبو تالیب ئایا پشت لە ئاینی عەبدولموتەلیب ـ عبدالمطلب ـ دەکەی؟ بەردەوام پێغەمبەری خوا داوای لێ دەکردو ئەوانیش ئەو قسەیەی خۆیان بۆ دووبارە دەکردەوە. هەتا ئاخیر قسەی ئەبوتالیب ئەوەبوو گوتی: کە لەسەر ئاینی عەبدولموتەلیبەو نەی گوت: ـ لا اله الا الله ـ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (سوێند بە خوا هەر داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم هەتا لێم قەدەغە نەکرێت) خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ﴾[1] واتە: ڕەواو شایستە نیە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران کە داوای لێبوردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکەران با خزمی نزیکیشیان بن. وە لەسەر ئەوب تالیبیش ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[2] بوخاری‌و موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەکەی ـ زوهەریەوە ـ.[3]

---

[1] التوبة (١١٣).

[2] الطبري (١٩/٥٩٩).

[3] فتح الباري (٨/٣٦٥)، مسلم (١/٥٤).

**بیانو هێنانەوەی خەڵکی مەککەو وەڵامدانەوەیان**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوٓاْ إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ﴾ خوای گەورە باسی هەندێ لە بڕوبیانووی خوانەناسان دەکات کە دەیان گوت بە پێغەمبەر (ﷺ)، ﴿إِن نَّتَّبِعِ ٱلۡهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفۡ مِنۡ أَرۡضِنَآ﴾ واتە: دەترسن ئەگەر شوێنی تۆ بکەوین، دژایەتی ئەو عەرەبانەی دەوری خۆمان بکەین کە موشریکن تووشی ئازارمان بکەنو شەڕمان لەگەڵ بکەنو لە هەر لایەکەوە بڕۆین پەلامارمان بدەنو بمانکوژن، خوای گەورەش وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمۡ نُمَكِّن لَّهُمۡ حَرَمًا ءَامِنًا﴾ واتە: ئەوەی ئەوانە دەیکەنە بیانوو درۆیەکی ئاشکرایە، چونکە خوای گەورە لە وڵاتێکی ئارامو بێ ترسدا جێگیری کردوونو هەر لە دێرزەمانەوە ئەو شوێنە مەزنو پیرۆزو پارێزراو بووە، کەواتە چۆن ئەو شوێنە پیرۆزە کاتێك ئەوان موشریك بن دەبێتە شوێنێکی ئارامو بێ ترس کە موسڵمان ببنو باوەڕ بێننو شوێنی حەق بکەون، ئارامو بێ ترس نابێت؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُجۡبَىٰٓ إِلَيۡهِ ثَمَرَٰتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ واتە: بەروبوومی هەموو لایەکی بۆ دێت، لە تایفو زۆر شوێنی تریشەوە وە ئاڵو وێڵی بازرگانی کە پێیەوە خەریکن، ﴿رِّزۡقًا مِّن لَّدُنَّا﴾ واتە: ئەو بژێویەش هەر لە لای ئێمەوەیە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ واتە: بەڵام زۆربەیان ئەوە نازانن بۆیە ئەو قسانە دەکەن.

﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةِۭ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَاۖ فَتِلۡكَ مَسَٰكِنُهُمۡ لَمۡ تُسۡكَن مِّنۢ بَعۡدِهِمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ وَكُنَّا نَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبۡعَثَ فِيٓ أُمِّهَا رَسُولٗا يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِنَاۚ وَمَا كُنَّا مُهۡلِكِي ٱلۡقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهۡلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾﴾

**ئیشارەتدان بە قڕکردنی زۆر بەڵام هەتا بەڵگەی تەواویان پیشان نەدرابێت قڕ نەکراون**

خوای گەورە خەڵکی مەککە ئاگادار دەکاتەوەو دەفەرمووێت: ﴿وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةِۭ بَطِرَتۡ مَعِيشَتَهَا﴾ واتە: چەند شاری قڕکرد کە خەڵکەکەی خەریکی ڕابواردن بوونو یاخی بووبوونو شوکری بەهرەکانی خودایان نەدەکرد کە پێی دابوون لەو هەموو ڕزقو ڕۆزیە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ

رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ الْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴾[1] واتە: خوا نموونەی هێناوەتەوە بە (خەڵکی) شارێك کە هێمنو دڵنیا بوون ڕزقو ڕۆزی زۆری بۆ دەهات لە هەموو شوێنێکەوە کەچی بەرانبەر چاکەو بەهرەکانی خوا ناسوپاسو سپڵە بوون جا خوا بەو هۆیەوە کردی بەبەر (خەڵکەکە)یدا پۆشاکی برسێتیو ترس لەبەر ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد، سوێند بە خوا بە ڕاستی پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ هات کەچی باوەڕیان پێ نەهێنا جا سزا گرتنی لە کاتێکدا ستەمکار بوون. بۆیە خوای بالادەست دەفەرموێت: ﴿فَتِلْكَ مَسَٰكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّنۢ بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: ئەوە شوێنو ماڵەکانیانە هەتا ئێستەش کەس تێیدا نیشتەجێ نەبووە کەمێك لە خەڵکی نەبێت، کاول بووە بەسەر یەکدا تەنها شوێنەوارەکانیان دیارەو ماوەتەوە، ﴿وَكُنَّا نَحْنُ الْوَٰرِثِينَ﴾ واتە: بە چۆڵی ماوەتەوە بۆ خۆمان. پاشان خوای گەورە باسی عەدالەتی خۆی دەکات کە بەڵگەی تەواویان بۆ هاتووەو بڕوایان بە خوا نەهێناوەو دژایەتی پێغەمبەرەکانیان کردووە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا﴾ واتە: پەروەردەی تۆ هیچ گەلێکی قڕ نەکردووە هەتا پێغەمبەری ڕەوانە نەکردبێتە ناویان. واتە ئەو شوێنە مەککە بووە، ﴿رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾ واتە: کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە موحەمەدە(ﷺ) کە ڕەوانەکراوە لە (أم القرى) واتە مەککە پێغەمبەری هەموو شارو ناوچەکانە لە وڵاتی عەرەبو عەجەم، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾[2] واتە: هەروەها بۆ ئەوەی دانیشتوانی مەککەو دەوروبەری ئاگادار کەیتەوەو بیان ترسێنی. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّى رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[3] واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان. وە فەرموویەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[4] واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنمو هەر کەسێکی کەش کە پێی دەگات. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[5] واتە: وە هەر کەس باوەڕی پێی نەبێت لەو کۆمەڵو تاقمانە (ئەوانەی

---

[1] النحل (١١٢_١١٣).
[2] الانعام (٩٢).
[3] الاعراف (١٥٨).
[4] الانعام (١٩).
[5] هود (١٧).

کۆبوونەوە لەسەر دژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا﴾[1] واتە: وە (خەڵکی) هیچ شارو دێیەك نیە کە ئێمە لە ناویان ببەین پێش (هاتنی) ڕۆژی دوایی یان سزایان بدەین بە سزایەکی سەخت. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[2] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین (بۆیان). خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) نارد بۆ هەموو خەڵکی لەم سەر زەمینەدا وە مەککەیش سەرچاوەی بنەڕەتی هەموو وڵاتی ئەم سەر زەمینەیە، هەموو دەبێت ڕوو بکاتە کەعبەی پیرۆز. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوانە کراوم بۆ سوورو ڕەشیش)[3] بۆیە بە هاتنی ئەو کۆتایی هاتووە بە پێغەمبەرایەتی‌و پەیامی پێغەمبەران. دوای پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەری تر نایەت‌و بەڵکو پەیامەکەی هەر بەردەوام دەبێت‌و دەمێنێتەوە هەتا شەوو ڕۆژ بمێنێ هەتا ڕۆژی قیامەت. وە پاشان دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ﴾ واتە: وە ئێمە وێرانکەری هیچ شارێك نەبووین مەگەر کاتێك خەڵکەکەی ستەمکار بووبن.

﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدْنَاهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَاقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٦١﴾﴾

### ژیانی دونیا دەڕوات‌و خەڵکی دونیا وەك خەڵکی قیامەت نیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَزِينَتُهَا ۚ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ﴾ واتە: خوای گەورە باسی پوچی‌و بێ نرخی دونیا دەکات بەو هەموو جوانی‌و ڕازاوەیەوە کە هەمووی دەڕوات‌و تەواو دەبێت لە چاو ئەوەی کە خودای مەزن دایناوەو ئامادەی کردووە بۆ بەندە چاکەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا لەو هەموو بەهرە گەورە تا هەتاییانە وەك فەرموویەتی: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ ۖ وَمَا عِندَ اللَّهِ بَاقٍ﴾[4] واتە: (چونکە) هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێت‌و نامێنێت بەڵام ئەوەی لای خوایە هەر

---

[1] الاسراء (٥٨).
[2] الاسراء (١٥).
[3] مسلم (١/٣٧٠).
[4] النحل (٩٦).

دەمێنێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ﴾[1] واتە: وە ئەوەی کە لای خوایە چاکترە بۆ پیاوچاکان. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ﴾[2] واتە: لە کاتێکدا ژیانی دونیا هیچ نیە لە چاو ڕۆژی دواییدا بێجگە لە ڕابواردنێکی کەم نەبێت. وە فەرموویەتی: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ﴾[3] واتە: بەڵکو ئێوە ژیانی دنیا هەڵبژێرن، کەچی (ژیانی) دوارۆژ باشترو پایەدارترە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بە خوا ژیانی دونیا لە چاو ژیانی ڕۆژی دواییدا مەگین وەك ئەوە وایە یەکێك لە ئێوە پەنجەی خۆی نوقم بکات لە دەریایەکدا، با سەیری پەنجەی خۆی بکات چەندێ ئاوی هەڵگرتووە بۆی).[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئاخۆ ئەو کەسەی کە دونیا پێش قیامەت دەخات لەوەش تێناگات. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە: ئاخۆ کەسێك کە خاوەن باوەڕ بووەو بڕوای بەو بەڵێنانەی خوای گەورە بووە کە پێی داوەو لەسەر ئاکارە چاکەکانی بە هیوای ئەو پاداشتە بووە کە وەری دەگرێتو هیچ گومانێکی نەبووە، وەك ئەو خوانەناسە وایە کە بڕوای بە ئامادەبوونی خۆی نەبووە لەبەر بارەگای خوداو گوێی نەداوە بەو بەڵێنو هەڕەشانەی خودا لە چەند ڕۆژێکی کەمدا کە تیایدا ژیاوە؟ ﴿ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾ موجاهیدو قەتادە دەڵێن: واتە: پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا لەو کەسانەیە کە جەزرەبە دەدرێن، پاشانایش گوتراوە: لەسەر حەمزەو عەلیو ئەبو جەهل هاتووەتە خوار.[5] هەردوو ڕیوایەتەکە لە موجاهیدەوەیە.[6] وا دەردەکەوێت کە ئایەتەکە گشتگیرە، وەك ئەو ئایەتە وایە کە باسی ئەو خاوەن باوەڕە دەکات وەختێ ئەو لە پلە بەرزەکاندایە کە سەیری هاوەڵەکەیشی دەکات لە خوارترین پلەی جەهەنەمدایە ئێژێ: ﴿وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ﴾[7] واتە: ئەگەر میهرەبانی پەروەردگارم فریام نەکەوتایە منیش لە ئامادەکراوان

---

[1] ال عمران (١٩٨).

[2] الرعد (٢٦).

[3] الاعلى (١٦ـ١٧).

[4] أحمد (٤/٢٣٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] الطبري (١٩/٦٠٤ـ٦٠٥).

[6] الطبري (١٩/٦٠٤ـ٦٠٥).

[7] الصافات (٥٧).

(ی ناو دۆزەخ) دەبووم. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بێگومان جنۆکەکان دەیان زانی کە بە ڕاستی ئەوان ئامادە دەکرێن (لە ڕۆژی دواییدا).

﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ الَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَآءَكُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ وَرَأَوُا الْعَذَابَ لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا يَهْتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ الْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ الْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ الْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾﴾

## حاشاكردنی بتپەرستان و شەریکەکانیان لە یەکتری

خوای گەورە کاتێك کە خوانەناسە بتپەرستەکان بانگ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا بە هەڕەشەو سەرزەنشت کردنیانەوە دەفەرموویت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِيَ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾ واتە: بانگیان دەکاتو پێیان ئەڵێت: لە کوێن ئەو خودایانەی ئێوە دەتانپەرستن لە ژیانی دونیادا لە بتو ئەو شتانەی کردبووتان بە شەریکی خودا، ئایا یارمەتیتان دەدەنو سەرتان دەخەن؟ ئەمەیش وەك ترساندنو هەڕەشە لێکردن. وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ﴾[2] واتە: سوێند بێت ئێوە بە تەنهاو یەك یەك گەڕانەوە بۆ لامان هەروەکو یەکەمجار دروستمان کردنو ئەوەی پێمان دابوون بەجێتان هێشت لە دوای خۆتان وە نابینین لەگەڵتاندا ئەو تکاکارانەی کە لاتان وابوو هاوبەشی خوان لە تکاکردن بۆتان سوێند بە خوا بێگومان پچڕا پەیوەندی نێوانتان وە ئەوەی بە پشتیوانی خۆتان دادەنا ون بوو لێتان. وە دەفەرموویت: ﴿قَالَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ﴾ واتە: ئەوانەی وەبەر بڕیاری ئێمە کەوتوون لە شەیتانەکانو خوانەناسان ئەوانەی بانگی خەڵکی دەکەن بۆ بێ دینی ئێژن: ﴿رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ الَّذِينَ أَغْوَيْنَآ أَغْوَيْنَٰهُمْ كَمَا غَوَيْنَا تَبَرَّأْنَآ إِلَيْكَ مَا كَانُوٓا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ﴾ واتە: شایەتی دەدەن کە ئەوان سەریان لێ شێواندنو لە ڕێگە لایان دانو شوێنیان کەوتن پاشان حاشایان کرد لێیان لە خزمەت خودای

---

[1] الصافات (١٥٨).

[2] الانعام (٩٤).

مەزندا گوتیان: ئەوانە ئێمەیان نەپەرستووە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا (٨١) كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾[1] واتە: ئەوانە بێجگە لە خوا بڕیاریان داوە بۆ خۆیان چەند پەرستراوێك بۆ ئەوەی ئەو پەرستراوانە ببنە یارمەتی دەر (و تكاكار) بۆیان، نەخێر (وا نیە) بەڵكو پەرستراوەكان (لە قیامەتدا) ئینكاری پەرستنەكەی ئەوان دەكەنو دەبنە دژیانو بەرپەرچیان دەدەنەوە. وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ (٥) وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾[2] واتە: كێ گومڕاترە لەو كەسەی كە هاوار لە غەیری خودا بكات كە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دوایی و ئەو (هاوار لێكراو)انە لە هاواری ئەوان بێ ئاگان، كاتێكیش خەڵك كۆدەكرێنەوە (لە قیامەت) پەرستراوەكان دەبنە دوژمنیانو بە پەرستنەكەیان باوەڕ ناكەن. ئیبراهیمی خەلیل گوتی بە گەلەكەی وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾[3] واتە: بێگومان ئەوەی ئێوە هەڵتان بژاردووە لە جیاتی خوا بتانێكن لەبەر خۆشەویستی نێواتناندا لە ژیانی دنیادا (دەیانپەرستن) لە پاشان لە ڕۆژی دواییدا هەندێكتان بێزاری دەردەبڕن لە هەندێكی ترتانو نەفرین لە یەكتری دەكەن. وە فەرموویەتی: ﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ (١٦٦) وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ﴾[4] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقِيلَ ادْعُوا شُرَكَاءَكُمْ﴾ واتە: پێیان دەڵێن: شەریكەكانتان بانگ بكەن بۆ ئەوەی ڕزگارتان بكەن لەو ژیانە ناخۆشەی تێیدان، وەك چۆن لە دنیادا بە هیوای ئەوان بوون یارمەتیتان بدەن، ﴿فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُمْ وَرَأَوُا الْعَذَابَ﴾ واتە: بانگیان دەكەن بەڵام هیچ وەڵامێكیان نادەنەوە، چاك دەزانن كە دەچنە ناو ئاگر هیچ چارەیەكیان نەماوە ﴿لَوْ أَنَّهُمْ كَانُوا يَهْتَدُونَ﴾ واتە: كاتێك كە جەربەزەیان چەشت ئێژن خۆزگە لە شاترەزایان بوینایە. لە ژیانی

[1] مریم (٨١ـ٨٢).

[2] الاحقاف (٥ـ٦).

[3] العنكبوت (٢٥).

[4] البقرة (١٦٦ـ١٦٧).

دونیادا، ﴿ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُواْ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُواْ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ۝٥٢ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴾[1] واتە: ڕۆژێك دەبێت كە خوا دەفەرموێت بانگی ئەو بتانە بكەن كە لاتان وابوو هاوبەشی منن (با یارمەتیتان بدەن) ئەوانیش بانگیان دەكەن بەلام وەلامیان نادەنەوە (و نایەن بە هاواریانەوە) وە ئێمە لە نێوانیاندا شیوێكی پڕ ئازارمان داناوە، وە تاوانباران ئاگری دۆزەخ دەبینن‌و هەموو دەزانن‌و دڵنیان كە دەچنە ناوی‌و تێی دەكەون‌و ڕێگەیەكیان دەست ناكەوێت بۆ گەڕانەوە لەو (ئاگرە).

## هەڵوێستیان بەرامبەر پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ واتە: بیەكەم بانگێك كە دەكرێت پرسیاری یەكتاپەرستیتان لێ دەكرێت ئایا تەنها خوایان پەرستووە؟ ئەم پرسیارە پێغەمبەریەتی ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) دەسەلمێنێت. واتە: وەلامی ئەو پێغەمبەرانەتان چۆن دایەوە كە ڕەوانە كران بۆتان؟ وە ئێوە چۆن بەرخوردتان لەگەڵ كردن؟ ئەمە وەك ئەو پرسیارانە وایە وەختێ پرسیار لەعەبدەكانی خودا دەكرێت لەناو گۆڕدا: كێ پەروەردەت بوو؟ چ ئاینێك ئاینت بوو؟ خاوەن باوەڕ شایەتی دەداو ئێژێ: (أشهد أن لا إله الا الله وأن محمداً عبدُالله ورسوله). بەلام خوانەناس ئێژێ: هاه، هاه، نازانم، بۆیە بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ وەلامێكی نیەو وسكەی لێوە نایات‌و قسە ناكات. چونكەی ئەو كەسەی لە دنیادا كوێر بووبێت لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر كوێرەو سەرگەردانەو ڕێ دەرناكات. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا هاوەڵەكانی خۆشیان بیردەچێتەوەو هۆشی ئەوەیان نیە لە یەكتری بپرسن. موجاهید دەڵێ: هیچ شتێكیان لە یاد نەماوەو[2] یەكتری ناناسن تا پرسیار لە یەكتری بكەن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾ واتە: بەلام ئەوانەی كە خاوەن باوەڕ بوون‌و ئاكاری چاكیان كردووە لە ژیانی دنیادا، ﴿صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴾ واتە: ئەوە بێگومان لە ڕزگاربووان دەبێت لە ڕۆژی قیامەتدا. (عسى) لە لایەن خواوە بە مانای قەبوڵ كردنە. واتە: ئەمە بڕیاری خوایەو دێتەجێ‌و گومانی تێدا نیە، ڕێزو منەتێكە لە لایەن پەروەردگارەوە كە لە كۆمەڵی ڕزگاربووەكانن.

---

[1] الكهف (٥٢ـ٥٣).

[2] الطبري (٦٠٧/١٩).

﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾
وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْأَخِرَةِ
وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾﴾

خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هەر خۆی بە تەنها هەموو شتێك دروست دەکاتو هەڵی دەبژێرێت، هیچ کەس ناتوانێ بەرامبەری بوەستێتو دەست لە کاری خودا بدات وەك فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ واتە: هەرچی مەیلی لێ بوو دەیکات هەرچیش مەیلی لێ نەبوو نابێت، هەموو شتێك بە دەستی خودایە لە خێرو لە شەڕو هەمووی دەگەڕێتەوە لای خۆی ﴿مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ﴾ ئەو ﴿مَا﴾یە بۆ نەفیە لە ڕاسترین قسەکاندا. واتە: هیچ کەسێك هەقی هەڵبژاردنی نیە خوا خۆی نەبێت، وەك لەم ئایەتەشدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾[1] واتە: بۆ هیچ پیاوو ئافرەتانێکی باوەڕدار نیە کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا (بۆیان نیە) کە سەرپشك بن لە کارەکەیاندا. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: خوا پاکەو بەرێزە لەوەی دەیکەنە شەریکی لەو بتو شتانەدا کە توانای دروست کردنی هی شتێکیان نیەو ناتوانن هەڵبژێرن، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَبُّكَ يَعْلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمْ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ واتە: ئاگاداری نهێنیەکانی ناو دڵە لەو شتانەی کە تێیدا دەرناکەوێ وەك چۆن ئاگاداری ئەو شتانەیە کە دەردەکەونو دیارو ئاشکران لە گشت دروستکراوەکانیدا. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿سَوَآءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ ٱلْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍۭ بِٱلَّيْلِ وَسَارِبٌۢ بِٱلنَّهَارِ﴾[2] واتە: یەکسانە (بۆ خوا) ئەوەتا بە نهێنی قسە بکاتو ئەوەی کە لە شەودا خۆی دەشارێتەوە ئەوەی کە لە ڕۆژدا دەردەکەوێت. وە پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: هەر تەنها خودا شایەنی پەرستنەو غەیری ئەو پەرستراوێکی تر نیە، وەك چۆن هەر خودا پەروەرندەیەو مەیلی لە هەر شتێك بێت دروستی دەکاتو هەڵی دەبژێرێت، ﴿لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْأَخِرَةِ﴾ واتە: هەموو سوپاس تەنها بۆ خودا لە دنیاو لە ڕۆژی دواییشدا، یانی هەرچی دەکات هەر لە عەدالەتو لە کارزانی خۆیەتی، ﴿وَلَهُ ٱلْحُكْمُ﴾ واتە:

[1] الاحزاب (٣٦).
[2] الرعد (١٠).

بڕیار هەر بڕیاری خودایە هیچ کەسێك بۆی نیە دەست لە کاری خودا بدات، هەر خودا خاوەنی دەسەلاتوو هێزو کارزانیو دلۆڤانیە. ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: هەموو بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەر کەسەو پاداشتی کرداری خۆی وەردەگرێت، لە چاکەو لە خراپەو خودا هیچی لێ ون نابێت لە هەر کارێکدا دەیکەن.

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾

**شەوو ڕۆژ لە بەهرەکانی خودانو نیشانەشن لەسەر تەنهایی خودا**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ واتە: (ئەی موحەمەد(ﷺ) پێیان) بلێ هەوالم بدەنێ ئەگەر خوا شەوتان بۆ درێژ بکاتەوە (هەر شەو بێت) تا ڕۆژی قیامەت. خوای گەورە منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا لەسەر ئەوەی کە شەوو ڕۆژی بۆ ڕام هێناون خۆ ئەگەر شەوو ڕۆژ نەبێت ناتوانن ژیان بەسەر بەرن لەسەر زەمیندا، وە ئەگەر خوای گەورە شەوتان لێ درێژ بکاتەوە تا ڕۆژی قیامەت گوزەرانتان تێك دەچوو وە لە ژیان بێ هیوا دەبوون. بۆیە دەفەرموویت: ﴿مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ﴾ واتە: چ پەرستراوێکی تربێجگە لەخوا ڕووناکی ڕۆژتان بۆدێنێت. یانی کێ شیاوی پەرستنە کەڕووناکیتان بداتێ، پێی ببینن و ژیانی تیابەرنە سەر ﴿أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾ واتە: ئایا نابیسن؟ پاشان خوای گەورە باسی ڕۆژ دەکات ئەگەر ئەوەندە درێژی بکردایەتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت کێ دەتوانێ شەوتان بۆ بێنێو هیچ کەس ناتوانێ شەویان بۆ بێنێت غەیری خودا کە تێیدا دانیشنو بحەسێنەوەو تووشی زیان نەبنو ناڕەحەتیو ماندوو بوونی ڕۆژیان نەمێنێتو ئارام بگرن، بۆیە دەفەرموویت: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ﴾ واتە: بلێ پێم بلێن ئەگەر خوا ڕۆژ بکاتە هەمیشەیی بۆتان تا ڕۆژی قیامەت کێیە پەرستراوی تر بێجگە لە خودا کە شەوتان بۆ دێنێ ئارامی تیا بگرن، یانی بحەسێنەوە لە شەودا هەتا ئەو جموجۆڵو ناڕەحەتیەتان نەمێنێتو بڕەوێتەوە، ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ واتە: ئایا نابینن؟ پاشان دەفەرموویت: ﴿وَمِن رَّحْمَتِهِۦ﴾ واتە: لە بەزەیی خودا بۆ ئێوە

﴿جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ﴾ كە ئەم شەوو ڕۆژەی بۆ داناون ﴿لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ﴾ واتە: بۆ ئەوەی لە شەوەكەیدا ئارام بگرن‌و بحەسێنەوە ﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ وە لە ڕۆژەكەشیدا بگەڕێن بە دوای ڕزق‌و ڕۆزیداو پەیدای بكەن بە هۆی هاتوچۆو بازرگانی‌و كارو فەرمانی ترەوە، ئەمە لە بابی لەف‌و نەشرە ـ اللف والنشر ـ وەك لە كتێبی ڕەوانبێژیدا ـ البلاغە ـدا هاتووە ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ واتە: بەڵكو شوكرانەی خوا بكەن بە عیبادەت كردن لە شەوو ڕۆژەكاندا، هەتا ئەوەی كە لە دەستتان چووە لە شەودا بە ڕۆژ بیكەنەوەو ئەوەشی بە ڕۆژ فریای نەكەوتوون لە شەودا بەجێی بێنن، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا﴾[1] واتە: وە ئەو (خوایە) زاتێكە كە شەوو ڕۆژی لەجێی یەكتر داناوە (بە دوای یەكتردا دێن‌و شوێنی یەكتر دەگرنەوە) بۆ ئەو كەسەی بیەوێت بیر بكاتەوە (لە دروستكراوەكانی خوا) یان بیەوێت شوكرانەبژێری خوا بكات. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ٧٤ وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٧٥﴾

### هەڕەشە لێكردن‌و سەركوتانەوەی بتپەرستان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ واتە: وە ڕۆژێك كە خودا بانگیان دەكات ئینجا پێیان دەفەرمووێت: لە كوێن هاوبەشەكانی من ئەوانەی كە ئێوە بە هاوبەشی منتان دادەنان، وە پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَنَزَعۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدٗا﴾ واتە: لەناو هەموو گەلێكدا یەكێك لە خۆیان دەكەینە شایەت. موجاهید دەڵێ: ﴿شَهِيدٗا﴾ واتە: پێغەمبەرێك.[2] ﴿شَهِيدٗا فَقُلۡنَا هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ﴾ واتە: دەڵێین ەلگەی خۆتان بێنن لەسەر ڕاستی ئەو قسەی دەیكەن كە دەڵێن خودا شەریكی هەیە، ،﴿فَعَلِمُوٓاْ أَنَّ ٱلۡحَقَّ لِلَّهِ﴾ واتە: بۆیان دەركەوت كە غەیری خودا هیچ خودایەكی تر نیە، ئەو كاتە: قسە ناكەن‌و هیچ وەڵامێكیان بە دەستەوە نیە، ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ واتە: هەرچی درۆیان هەڵبەستووە دەردەكەوێت‌و دەڕوات‌و سوودی لێ وەرناگرن.

---

[1] الفرقان (٦٢).

[2] الطبري (١٩/٦١٤).

﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾﴾

**باسی قارون و ئامۆژگاری گەلەکەی بۆی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: بێگومان قارون لە گەلەکەی موسا بوو (جوولەکە بوو) بەڵام دەست درێژیو ستەمی لێ دەکردن، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: قارون کوڕی مامی موسا بووە (سەلامی خوای لێ بێت).[1] ئیبراهیمی نەخەعیو عەبدوڵای کوڕی حارسی (الحارث) کوڕی نەوفەلو سەماکی کوڕی حەربو قەتادەو مالیکی کوڕی دیناری ئیبنو جورەیجو کەسانی تریش گوتوویانە: قارون کوڕی موسا بووە (سەلامی خوای لێ بێت).[2] ئیبنو جورەیج دەڵێ: قارون کوڕی یەسهەرە ـ يَصْهَر ـ کوڕی قاهیس –قاهث– وە موسا کوڕی عیمرانی کوڕی قاهیسە[3]. ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ﴾ واتە: ئەوەندە سامانمان دابوویە، ﴿مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ﴾ واتە: کە بێگومان هەڵگرتنی کلیلەکانی ئەو گەنجو قاسانە بە زەحمەت هەڵدەگیرا بۆ کۆمەڵێکی بەهێز، ئەعمەش دەڵێ: لە خەیسەمەوە (خَيْثَمَة) کلیلی گەنجینەکانی قارون لە پێستە ـ جلود ـ بوو هەموو کلیلێکی وەك پەنجە وابوو، هەر کلیلێك هی گەنجینەیەك بوو، کاتێك کە باردەکرا دەخرایە سەر پشتی هێستری ـ بغل ـ قاچو ناو چاو سپی.[4] لەم بارەیەوە شتی تریش گوتراوە ـ والله أعلم ـ. ﴿إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ﴾ واتە: پیاو چاکانی هۆزی قارون ئامۆژگاریان دەکردو پێیان دەگوت: لە خۆ مەگۆڕێ بە هۆی ئەوماڵو سامانەوە کە پێت دراوەو خۆ بە زل مەزانە، وەك ئامۆژگاریو ڕێ نیشاندان، چونکە خوا پیاوی لە خۆڕازیو لە ڕێ ترازاوی خۆش ناوێت، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ﴿ٱلْفَرِحِينَ﴾ واتە: لەخۆباییان.[5] موجاهید دەڵێ: ئەوانەی کە خۆیان بە زل دەزانن‌و لە خۆباییو سوپاسی خودا ناکەن لەسەر ئەو هەموو شتانەی کە

---

[1] ابن أبي حاتم (٩/٣٠٠٥).
[2] الطبري (١٩/٦١٦).
[3] الطبري (١٩/٦١٥).
[4] الطبري (١٩/٦١٧).
[5] الطبري (١٩/٦٢٢).

پێی داون.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱبۡتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ واتە: ئەو سامانە زۆر چاکەی کە خودا پێی بەخشیوی لەگەڵ ئەو هەموو بەهرەیەدا لە ڕەزامەندی خودا ببەخشەو بە هەموو شێوەیەك هەوڵ بدە خۆت لە خودا نزیك بخەرەوە بە خێروبێر کردن هەتا تووشی پاداشتی خوای گەورە ببیت لە دنیاو لە قیامەتدا، ﴿وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنۡيَا﴾ واتە: بەشی خۆت لەم دنیایە لەبیر مەکە لەو شتانەی کە خودا بۆی حەڵاڵ کردووی وەك خواردن‌و خواردنەوەو جلوبەرگ‌و ژن هێنان، وە چاکیش بزانە کە خودا هەقی هەیە بەسەرتەوەو هەقی خۆش‌و ماڵ‌و منداڵیشی بەسەرەوەیە ئەوانەشی کە دێن‌و بەسەرت دەکەنەوە. هەقی هەموو خاوەن هەقێك بدەرەوە، ﴿وَأَحۡسِن كَمَآ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ﴾ واتە: چاکە لەگەڵ خەڵکی بکە وەك چۆن خودا چاکەی لەگەڵ تۆ کردووە، ﴿وَلَا تَبۡغِ ٱلۡفَسَادَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ﴾ واتە: لە خۆت مەگۆڕێ وا بزانی کە هەر دنیاو خۆشی دونیا بۆ تۆیە، دەست مەدەرە کاری خراپ‌و بەدفەڕی لەسەر زەمینداو ئازاری بەندەکانی خوا مەدە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ واتە: خودا خۆشی نایە لە پیاوی خراپ‌و بەدفەڕ.

﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةً وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٧٨﴾

خوای گەورە باسی قارون دەکات کاتێك کە هۆزەکەی ئامۆژگاریان دەکردو دەیانویست ڕێی ڕاستی نیشان بدەن ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾ واتە: گوتی: من هیچ پێویستیەکم بە ئامۆژگاری ئێوە نیە، خودا خۆی دەزانیٚ کە من شایەنی ئەم هەموو سامانەم‌و خۆشیشی دەوێت بۆیە پێی داوم، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەیە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلۡنَٰهُ نِعۡمَةٗ مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمِۭۚ﴾[2] واتە: ئینجا کاتێك ئادەمی زیانێکی لێ کەوت هاوارمان بۆ دێنیٚ لە پاشان هەر کاتێك بەهرەیەکمان پێدا دەڵیٚ: بە ڕاستی ئەم بەهرەیەم پیٚ دراوە بە هۆی لێزانی خۆمەوە. خوا خۆی دەزانێت کە من شایەنی ئەو چاکەیەم. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنَّا مِنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي﴾[3] واتە: وە ئەگەر پێمان بەخشی

---

[1] الطبري (١٩/٦٢٣).

[2] الزمر (٤٩).

[3] فصلت (٥٠).

میهرەبانیەك لە لایەن خۆمانەوە لە پاش زیانێك لێی كەوتووە دەڵێت: ئەمە هی خۆمە. واتە: ئێژن: ئەمە هەقی خۆمانە. عبدالرحمن ی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم زۆر جوان تەفسیری ئەم ئایەتەی كردووە فەرموویەتی لەم ئایەتەدا: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ واتە: ئەگەر خودا ڕازی نەبووایە لێم‌و ڕێزی لێم نەنایە ئەم سامانەی پێ نەدەبەخشیم. ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ﴾.[1] هەر بەو شێوەیە ئەوانەی كە زانیاریان كەمە، هەر كاتێك خودا ڕۆزی فراوان كردن لە خۆیان دەگۆڕێن‌و ئێژن: ئەگەر شایەنی ئەم ڕزق‌و ڕۆزیە نەبووینایە خودا پێی نەدەبەخشین. ئاخۆ ئەوانە نەیان زانیووە كە لە پێش ئەوان زۆر چینی قڕ كرد كە لە ئەوان زۆر بەهێزترو خاوەن دەسەڵاتتر بوون.

﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾

**قارون چووە ناو هۆزەكەی بە فیزو كەش‌و فشەوەو هۆزەكەی لەناو خۆیاندا باسیان دەكرد**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ﴾ واتە: خوای گەورە باسی قارون دەكات كە ڕۆژێك هاتە ناو هۆزەكەی‌و خۆی ڕازاندبووەوە كەیفی دەكرد بەسەریاندا لەگەڵ دارودەستەكەیدا بە هەموو جۆرە جلوبەرگێكی جوان‌و گران بەهاوە، كاتێك ئەوانەی زۆر حەزیان لە ژیان‌و ڕابوادنی دنیا دەكرد گوتیان: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ واتە: زاناو پیاو چاكەكانیان گوتیان: هاوار بۆ ئێوە پاداشتی خوای گەورە زۆر چاكترە بۆ بەندە خاوەن باوەڕە چاكەكانی لە ڕۆژی قیامەتدا كە دەیبینن قارون هەیەتی. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوای گەورە دەفەرموێت: ((ئامادەم كردووە بۆ بەندە چاكەكانم ئەوەی كە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە خەیاڵی كەسیشدا نەهاتووە ئەگەر حەزیش دەكەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾[2] واتە: ئینجا كەس نازانێ

[1] الطبري (١٩/٦٢٦).

[2] السجدة (١٧).

چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشتدا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە)).[1] ﴿وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّـٰبِرُونَ﴾ واتە: ئەمەش هەر بەشی خۆڕاگرانە. سودی دەڵێ: ئەو بەهەشتە هەر جێی خۆڕاگرانە. وەك ئەوەی قسەی ئەو زانا پیاوچاکانەی تەواو کردبێت.[2] ئیبنو جەریر دەڵێ: ئەم وتەیە ـ خەلاتە ـ تەنها بەشی خۆڕاگرانە ئەوانەی کە دڵخۆش نەبوون بە ژیانی دونیاو بە هیوای پاداشتی ڕۆژی قیامەتن، وەك ئەوەی ئەم قسەیە قسەی ئەوان بێت‌و تەواویان نەکردبێت خوای گەورە باسی هێناون‌و بۆی تەواو کردوون[3].

﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾﴾

## ڕۆچوونی قارون‌و سامانەکەی بە ناخی زەمیندا

کاتێك خوای گەورە باسی قارونی کرد کە بە عەنعەنەو تەنتەنەوە ـ بە فیزەوە ـ هات بۆ ناو هۆزەکەی‌و خۆی فەرز کردبوو بەسەریاندا ئەوەندەی پێ نەچوو خوای گەورە بە خۆیی‌و ماڵ‌و منداڵ‌و سامانیەوە بە ناخی زەویدا بردنیە خوارەوە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە بوخاریەوە ئەویش لە سالمەوە کە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك پیاوێك جلەکانی شۆڕکردبووەوە ـ واتە فیزی پێوە دەکرد ـ لەپڕ چوو بە ناخی زەویدا، هەتا ڕۆژی قیامەت ئەو کەسە ـ بە ناخی زەویدا دەچێت ـ هەر زرمەی دێت) پاشانیش ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەمیش لە پێغەمبەری خواوە هر بەو شێوەیە.[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (وەختێك کە پیاوێك لەپێش ئێوەوە بوو بە دوو بوردەی ـ پۆشاك ـ سەوزەوە هاتووتە دەرەوەو فیزی پێوە کردوون، خودا فەرمانی داوە بە زەمین بردوویەتی ـ گرتوویەتی ـ بە ناخی خۆیدا، زرمەی ـ دەنگی ـ لێوەدێ لەناو زەمیندا هەتا ڕۆژی قیامەت)[5]. تەنها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە سەنەدەکەی چاکە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ﴾ واتە:

---

[1] فتح الباري (٨/٣٧٥).

[2] ابن أبي حاتم (١٩/٣٠١٦).

[3] الطبري (١٩/١٢٩).

[4] فتح الباري (١٠/٢٦٩).

[5] أحمد (٣/٤٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

ئینجا ئەو (قارون)و كۆشكەكەیمان برد بە ناخی زەویدا هیچ دەستەیەكیشی نەبوو لە بەرامبەری - سزای - خودا یارمەتی بداتو لەو كەسانەش نەبوو بتوانێت خۆی ڕزگار بكات.

## پەندو ئامۆژگاری هۆزەكەی بە ڕۆچوونی قارون بە ناخی زەمیندا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْاْ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ ﴾واتە: ئەوانەی دوێنێ قارونیان بینی بەو عەنعەنەو تەنتەنەوە - خۆڕازاندنەوە - وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾[1] واتە: ئەوانەی ژیانیان دەویست وتیان ئای خۆزگە ئەوەندەی بە قارون دراوە ئێمەش بمان بوایە بە ڕاستی ئەو (قارون) خاوەنی بەختێكی گەورەیە. كاتێك ڕۆژوو بە ناخی زەمیندا ئێژن: ﴿وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ﴾ واتە: ماڵو سامان نیشانەی ڕەزامەندی خودا نیە بۆ خاوەنەكەی لە بەندەكانی خودا، چونكە خودای مەزن سامان دەبەخشێتو دەشی گرێتەوەو كەمی دەكاتەوەو زۆریشی دەكات، هەندێ بەرز دەكاتەوەو هەندێكیش دادەبەزێنێت، كارەكانی پڕە لە كارزانیو بەڵگەی تەواو، وەك لەم فەرمودە مەرفووعەدا - المرفوع - هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە: (بێگومان خودا ڕەوشتی ئێوەی دابەش كردووە وەك چۆن ڕۆزی دابەش كردوون، ماڵ دەبەخشێت بەوەی خۆشی دەوێتو بەوەش كە خۆشی ناوێت، وە باوەڕ نادات بە كەسێك مەگەر خۆشی بوێت)،[2] ﴿لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا﴾ واتە: ئەگەر خودا بە سۆزو بەزەیی‌و چاكی خۆی نەبووایە، ڕۆی دەكردین بە ناخی زەمیندا وەك چۆن قارونی بە ناخی زەمیندا برد. چونكە ئێمە حەزمان دەكرد وەك ئەو بین، ﴿وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ واتە: ئای لەم بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرە، بێگومان ڕزگار نابن ئەوانەی شوكرانە بژێری چاكەی خوا نین (كافرن). مەبەستیان ئەوە بوو كە قارون خوانەناس بووە، خوانەناسیش لای خودا ڕزگاری نابێت نە لە دنیاو نە لە ڕۆژی قیامەتدا. زانایانی زمان ڕایان جیاوازە لێرەدا لەسەر وتەی ﴿وَيْكَأَنَّ﴾ واتە: (أَلَمْ تَرَ أَنَّ) ئەمە ڕای قەتادەیە، وە گوتراوە: (وَي كَأَنَّ) حەرفەكانی جیاكراونەتەوە، حەرفی - وَي - بۆ تەعەجوب یان تەنبیە بەكارهێنراوە، وە - كَأَنَّ - یش بە واتای (أظن وأحسبُ) بەكارهێنراوە.

﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾﴾

---

[1] القصص (٧٩).

[2] احمد (١/٣٨٧)، فەرموودەیەكی لاوازە.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْأَخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ﴾ خوای گەورە دەفەرموویێت: ئێمە ماڵی دوارۆژمان داناوە، ئەو ماڵە پڕ بەهرە نەبڕاوەیە کە گۆڕانی بەسەردا نایەتو لەناو ناچێتو هەر دەمێنێتەوە بۆ ئەو بەندە خاوەن باوەڕانەی کە خۆیان بە کەم دەزانن‌و فیز ناکەن بەسەر بەندەکانی خواداو ئازاریان نادەن‌و بەدفەڕی لەگەڵیان ناکەن، وەك عیکریمە دەڵێ: (العُلُوا) واتە: زۆرداری ــ خۆرفەرزکردن ــ[1] ئیبنو جورەیج دەڵێ: ﴿لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: نایانەوێ خۆ بەزلترو زۆردارتر بزانن ﴿وَلَا فَسَادًا﴾ واتە: کاری خراپ کردن‌و بەدفەڕی.[2] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەلیەوە دەڵێ: پیاو پێی خۆشە سەری نەعلەکانی ــ شراك ــ چاکتر بێت لە قەیتانی نەعلی خەڵکی، بەری ئەم ئایەتە دەکەوێت کە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْأَخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾.[3] ئەوە وەختێك بەری ئەم ئایەتە دەکەوێ کە فیزی پێوە بکاتو خۆی بە زیاتر بزانێت وە ئەمەش کارێکی خراپە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (نیگام ــ وحی ــ بۆ کراوە کە خۆتان بە کەم بزانن هەتا کەس بەسەر کەسی تردا خۆی بە دل نەزانێتو کەسیش دەست درێژی نەکاتە سەر کەسی تر).[4] بەڵام ئەگەر ئەوەی پێخۆش بوو تەنها لەبەر جوانیەکەی، ئەوە هیچی تیا نیەو خراپ نیە. وە لە فەرموودەدا هاتووە کە پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من حەز دەکەم جلەکانم چاك بێتو نەعلەکانم چاك بێت، ئایا ئەوە لە فیزو زلیەوەیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر خودا جوانەو جوانیشی پێ خۆشە).[5] خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا﴾ واتە: هەر کەسێك کارێکی چاکە بکات خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بە چەندجار لەسەر ئەو چاکەیە پاداشتی ئەو بەندەیەی خۆی دەداتەوە، ئەم ڕێزەش لە بەزەیی‌و فەزڵی خوای گەورەوەیە، پاشان دەفەرموویێت: ﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ واتە: هەر کەسیش کاری خراپی کردبێت بە ئەندازەی کارە خراپەکەی سزا دەدرێت. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی:

[1] الطبري (١٩/٦٣٧).
[2] الطبري (١٩/٦٣٧).
[3] الطبري (١٩/٦٣٨).
[4] مسلم (١٤/٢١٩٩).
[5] مسلم (١/٩٣).

﴿وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتْ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[1] واتە: وە هەر کەس خراپەی کردبێت (لە ڕۆژدا) بەسەر ڕووو دەمو چاویاندا دەخرێتە ناو ئاگر (ی دۆزەخ) ئایا سزا دەدرێت جگە لەوەی دەتانکرد. ئەمەیش هەر لە ڕێزو فەزڵی خوداوەیە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ مَن جَآءَ بِٱلْهُدَىٰ وَمَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٨٥﴾
وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا
يَصُدُّنَّكَ عَنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعْدَ إِذْ أُنزِلَتْ إِلَيْكَ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدْعُ مَعَ
ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾﴾

**فەرماندان بە بانگەوازو یەکتا پەرستی**

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە ئەو پەیامەی پێی دراوە ڕای بگەیەنێتو قورئان بخوێنێتەوە بۆ خەڵکی، چونکە خودا پرسیاری لێ دەکات لەسەر ئەو ئەرکە گرانەی کە پێغەمبەریەتیە لە ڕۆژی قیامەتدا. وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ واتە: ئەو کەسەی ئەو ئەرکەی خستووەتە سەر شانت کە بیگەیەنی پرسیارت لێ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا لەو بارەیەوە. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرْسِلَ إِلَيْهِمْ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی پرسیار دەکەین لەوانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ نێردرا (کە چۆن پێشوازیان لێکردن) وە بێگومان پرسیاریش دەکەین لە پێغەمبەران (کە چۆن وەڵام درانەوە). وە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ﴾[3] واتە: لە ڕۆژێك (بترسن) خوا هەموو پێغەمبەران کۆدەکاتەوە ئەوسا پێیان دەفەرمووێت چ وەڵامێکتان درایەوە؟ وە دەفەرمووێت: ﴿وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾[4] واتە: وە پێغەمبەرانو شایەتەکان دەهێنرێن. بزخاری لە تەفسیردا لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ واتە: دەتباتەوە بۆ مەککە.[5] نەسائیش لە تەفسیرەکەیدا هەر وای گوتووە.[1] ئیبنو

---

[1] النمل (٩٠).

[2] الاعراف (٦).

[3] المائدة (١٠٩).

[4] الزمر (٦٩).

[5] فتح الباري (٣٦٩/٨).

جەریریش هەر وای گوتووە.[٢] عەوفیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ واتە: دەتباتەوە بۆ مەککە وەك چۆن دەری کردی لە مەککە.[٣] موخەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە موجاهیدەوە: ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ واتە: بۆ شوێنی لە دایك بوونت لە مەککە.[٤] وە ئیبنو عەباس جارێکی تر مانای ﴿لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ﴾ کردووە بە مردنو جارێکی تر بە ڕۆژی قیامەت کە دوای مردن دێت، وە جارێکی تریش بە بەهەشت کە شوێنی پاداشتدانەوەی ئەو ئەرکەیە کە گەیاندوویەتی بە مرۆڤو جنۆکە. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) تەواوترینو بەڕێزترین خەڵکی خودا هەموویەتی. ﴿قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ مَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ وَمَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ﴾ واتە: بێژە: بەوانەی کە دژایەتیت دەکەنو بڕوات پێ ناکەن لەناو هۆزەکەتدا لەو موشریکانەو ئەو کەسانەش شوێن ئەوان کەوتوون لە دنیاو لە قیامەتدا دەست کێ دەکەوێت.

پاشان خوای گەورە بەهرە مەزنەکانی خۆی وەبەر چاوی پێغەمبەرو (ﷺ) بەندەکانی دێنێتەوە کە بۆی ڕەوانەکردوون دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ﴾ واتە: تۆ لە پێشەوە وات نەدەزانی کە نیگات بۆ دێت ﴿إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ﴾ واتە: بەڵام لە دلۆڤانی خواوەیە بۆ بەندەکانی کە پەیامی بە تۆدا ڕەوانەکردووە بۆیانو ئەو بەهرە مەزنەشی بە تۆ داوە. ﴿فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرٗا لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: سا تۆش پشتیوانی لە خوانەناسان مەکەو دوورکەوەرەوە لێیانو گوێیان پێ مەدەو دژایەتیان بکە. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعۡدَ إِذۡ أُنزِلَتۡ إِلَيۡكَ﴾ واتە: هیچ دلگران مەبە کە ئەوانە دژایەتیت دەکەنو هەوڵ دەدەن خەڵکی لە تۆ دوور بخەنەوەو لە ڕێگا لایاندەن، گوێی مەدەرێو بێ خەم بە، خوای گەورە قسەی تۆ زاڵ دەکاتو پشتگیری ئایینەکەت دەکاتو ئەو پەیامەی خودا بۆی ناردووی سەری دەخات بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾ واتە: بانگی خەڵك بکە بۆ لای پەروەردگارت، یانی تەنها لە پەروەرندەی خۆت بپاڕێرەوە کە شەریکی نیەو ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ واتە: لەگەڵ بت پەرستان مەبە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: غەیری خودا

---

[١] النسائي في الكبرى (٤٢٥/٦).

[٢] الطبري (٦٤١/١٩).

[٣] الطبري (٦٤١/١٩).

[٤] الطبري (٦٤١/١٩).

هیچ شتێك بۆ پەرستن ناشێت. تەنها هانا هەر بۆ ئەو دەبرێت، ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ واتە: هەر بووەو هەر دەمێنێتو هەر ئەو هەمیشە زیندووەو بەسەر هەموو شت ڕادەگات. هەموو خەڵکی دەمرێنێو خۆی نامرێت. وەك خوای گەورە لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾[1] واتە: هەرچی کەس لەسەر زەویدایە نامێنێتو تیادەچێت، وە هەر پەروەردگارت دەمێنێت کە خاوەن شکۆی ڕێزدارە. لە جیاتی (الذات) وتەی (الوجە) هێناوە وەك لەم ئایەتەیشدا فەرموویەتی: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ واتە: غەیری ئەو هەموو شتێك لەناو دەچێت. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ڕێگای ئەبو سەلەمەوە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: (ڕاستترین قسە، قسەی لەبیدی شاعیرە ـ الشاعر لبید ـ کە گوتوویەتی: سا بزانن هەموو شتێك لە غەیری خوا پڕوپوچە ـ باتیلە ـ)[2] ﴿لَهُ الْحُكْمُ﴾ واتە: خاوەنی فەرمانو دەسەڵاتەو هیچ کەسێك ناتوانێت دەست بخاتە کاری. ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتتان دەداتەوە لەسەر کردارەکان چاکە بە چاکەو خراپەیش بە سزادانو تۆڵە لێ سەندن.

## تەفسیری سورەتی (العنکبوت)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الم ۝١ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ۝٣ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ أَن يَسْبِقُونَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ۝٤﴾

### تاقی کردنەوەی خاوەن باوەڕان هەتا دەرکەوێت کێ ڕاست دەکاتو کێ درۆ دەکات

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الم﴾ باسی ئەم پیتانە لە سورەتی بەقەرەدا کراوە، پێویست ناکات لێرەدا باسی بکەینەوە، ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ﴾ ئەمە ئیستیفهامی ئینکارییە، واتە: هەر دەبێت خوای گەورە بەندە خاوەن باوەڕەکانی خۆی تاقی بکاتەوە، هەر کەسەو

[1] الرحمن (٢٦ـ٢٧).

[2] فتح الباري (٧/١٨٣).

بە پێتی ئەو باوەڕەی کە هەیەتی، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (ئەو کەسانەی کە توندتر ـ زیاتر ـ تووشی تاقیکردنەوە دەبن پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێ بێت) پاش ئەوان پیاو چاکان و پاشان چاکەکان و چاکەکانی تریش، هەر پیاوەێ بە پێی دینی خۆی تاقی دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر لەسەر ئاینەکەی توندتر بوو زیاتر تاقی دەکرێتەوە ـ توشی بەلا دەبێت ـ)[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾[2] واتە: ئایائێوەوا گومانتان دەبرد کە دەچنە بەهەشت لە کاتێکدا هێشتا خوا دەری نەخستووە ئەوانەی تێدەکۆشن لە ئێوەو هێشتا دەری نەخستووە خۆڕاگران. نموونەی ئەم ئایەتە لە سورەتی (البراءة)دا هاتووە. وە لە سورەتی (البقرة)دا خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ﴾[3] واتە: بۆیە خوای گەورەلێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ واتە: ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانیشمان تاقی کردەوە هەتا دەرکەوێ کێ ڕاستی کردووەو کێش درۆی کردووە لەوانەی کە خۆیان بە خاوەن باوەڕ زانیووە، چونکە خودای مەزن ئاگاداری ئەوەیە کە بووەو ئەوەیش کە دەبێت، ئەوەیشی کە نەبووەو دەبێت و چۆن پەیدا دەبێت، ئەمە ڕای هەموو پێشەوایانی سونەو جەماعەیە لەسەری کۆن. ئیبنوعەباس و کەسانی تریش هەروا دەڵێن لەوێنەی ئەم ئایەتانە ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ﴾ واتە: مەگین بۆ ئەوەی کە ببینین. چونکە بینینی پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە کە ببێت و دیار بێت. بەلام زانیاری گشتگیرترە لە بینین، پەیوەندی بە بوون و نەبوونیشەوە هەیە.

خراپەکاران لە سزای خوا ڕزگار نابن خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ واتە: یا ئەو کەسانەی کە بڕوا ناهێنن وا دەزانن ڕزگاریان دەبێ لەو تاقیکردنەوەیە، بێگومان سزاو تۆڵەیە دێتە ڕێیان کە زۆر گران و توندترە لە تاقیکردنەوەیە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسْبِقُونَا﴾ واتە: لە دەستمان دەرناچن و جەزرەبەی ئێمە دەچێژن. ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ واتە: خراپیان لێك داوەتەوەو بە هەڵەداچوون.

---

[1] الترمذي (٣٢٩٨) وأحمد (١/١٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] ال عمران (١٤٢).

[3] البقرة (٢١٤).

﴿مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ۝٥ وَمَن جَـٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَـٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ
لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ۝٦ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ۝٧﴾

## خوای گەورە هیوای پیاوچاکان دێنێتەدی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَـَٔاتٍ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ واتە: هەر کەسێك بە هیوای گەیشتن بە خودایە لە ڕۆژی قیامەتداو ئاکاری چاکی کردووەو بە ئومێدی پاداشتی چاکە لە لای خودا، بەو زووانە خوای گەورە ئەو ئاواتەی بۆ وەدی دێنیو پاداشتی تەواوی دەداتەوە بە زیادیشەوە گومانی تێدا نیە چونکە خودا لاڵانەوەی بەندەکانی دەبیستیو چاوی لە هەموویانە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن جَـٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَـٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ واتە: وە هەر کەس جیهاد بکاتو تێ بکۆشێت ئەوە تەنها بۆ خۆی تێ دەکۆشێت بە ڕاستی خوا لە هەموو جیهانیان بێ نیازە. وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿مَّنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ﴾[1] واتە: هەر کەسێك کارێکی چاکە بکات قازانجەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، چونکە خوای گەورە بێ نیازە لە کرداری بەندەکانی، هەموو خەڵکی لەسەر دڵی یەك پیاوی لە خواترسترین کەسیان کۆببێتەوە لە موڵکی خوا هیچ زیاد ناکات. پاشان خوای گەورە لەگەڵ ئەوەی کە بێ نیازە لە هەموو خەڵکی، بە سۆزو بەزەیی خۆی پاداشتی ئەوانەی کە خاوەن باوەڕو ئاکار چاك بوون باشترین پاداشتیان دەداتەوە. لە تاوانیشیان دەبوورێتو لە کردارەکانی خۆیان چاکتر پاداشت وەردەگرن. کەمترین چاکە قەبوڵ دەکاتو پاداشتی لەسەر دەداتەوە لە یەك بەدەوە تا یەك بە حەوت سەد، سزای خراپەش بە ئەندازەی خراپەکە دەبێت یان لێی دەبوورێتو چاوپۆشی لێ دەکرێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَـٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[2] واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناکاتو ئەگەر چاکەیەك هەبێت هەبێت (خودا) چەندانەی دەکاتەوەو دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَحْسَنَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن، خراپەکانیان دەسڕینەوە، باشتر لەوەی کردوویانە پاداشتیان دەدەینەوە.

---

[1] فصلت (٤٦).

[2] النساء (٤٠).

﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَـٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٩﴾﴾

**فەرماندان بە چاكەكردن لەگەڵ دایكو باوك**

خوای گەورە فەرمان دەكات بە بەندەكانی كە چاكە لەگەڵ دایكو باوكیان بكەن پاش ئەوەی كە فەرمانیان پێ دەكات كە تەنها هەر خوا بپەرستن، چونكە بابو دایك هۆی بوونی مرۆڤنو‌پێویستە زۆر بە چاكی مامەڵەیان لەگەڵ بكرێت، یارمەتی باب بدرێت لە بژێویداو هیچ نكوڵیەكی لێ نەكرێتو بە سۆزیشەوە ڕیز لە دایك بگیرێت. بۆیە خوای گەورە لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا﴾[1] واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە كە هیچ شتێك نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایكو باوكتان چاكە بكەن ئەگەر یەكێكیان (باوكتو دایك) یان هەردووكیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت ئۆفیش وە تێیان مەخوڕەو پێیاندا هەڵ مەشاخێ (بەڵكو) وتەی نەرمو شیرینیان (لەگەڵدا) بەكاربێنە، باڵی خۆبەكەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەییو میهرەبانیت پێیان بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بكە هەر چۆنێك ئەوان منیان پەروەردە كرد بە منداڵی. لەگەڵ ئەوەشدا كە خودا ڕاسپێری كردووەو فەرمانی داوە كە بە سۆزو بەزەیی بنو چاكەیان لەگەڵدا بكەن لەسەر ئەو هەموو چاكەیەی كە كردوویانە لەگەڵ منداڵی خۆیاندا، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ۖ وَإِن جَـٰهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَآ ۚ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: وە فەرمانمان داوە بە ئادەمی كە چاكە لەگەڵ دایكو باوكیدا بكات ئەگەر زۆر جەختیان كرد لەسەرت گوتیان دەبێت شوێنیان كەوی لەسەر ئاینی ئەوان بیت ئەگەر بت پەرست بوون بە قسەیان مەكە لەو داوایەیاندا، چونكە هەموو دێنەوە بۆ لای من لە ڕۆژی قیامەتدا، لەسەر ئەوەی كە چاكەت كردووە لەگەڵیانو خۆ ڕاگر بوویت لەسەر ئاینەكەت پاداشتت دەدەمەوە، لە ڕیزی پیاوچاكان داتدەنێم، لە باوكو دایكت دوورت دەخەمەوە، با تۆ نزیكترین كەس بیت بەوان لە دنیادا، چونكە هەموو كەسێك لەگەڵ ئەوانەدا كۆدەكرێنەوە ـ حەشر دەكرێت ـ لە ڕۆژی قیامەتدا كە خۆشی ویستووە، واتە: خۆشەویستی ئاینی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ

---

[1] الاسراء (٢٣ـ٢٤).

لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: وە ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بێگومان دەیانخەینە ڕیزی پیاو چاکانەوە. تیرمزی ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە سەعدەوە دەڵێ: چوار ئایەت لەسەر من هاتووەتە خوارەوە پاشان بەسەرهاتەکەی خۆی گێڕایەوەو گوتی: دایکم گوتی: -أم سعد- بە سەعد: ئایا خوا فەرمانی پێ نەکردووی بە چاکەکردن؟ واتە: بە چاکەکردن لەگەڵ داكو باب؟ سا سوێند بە خوا نە خواردن‌و نە خواردنەوە ناخۆم‌و ناخۆمەوە تا دەمرم یان دەبیتە دوژمنی ئەو ئاینە. گوتی: هەر کاتێك گەر بیانویستایە خواردنی بدەنێ دەمیان دەکردەوە -واتە دەمیان بە زۆر دەکردەوە- لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآ﴾[1] ئەم فەرموودەیەئیمامی ئەحمەدو موسلیم‌و ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە.[2] تیرمزی دەڵێ: فەرموودەیەکی چاك‌و ڕاستە -حسن صحیح-.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِۖ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾﴾

### سروشت‌و خوی دووڕووان‌و یاسای خودا لە تاقی کردنەوەدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ﴾ خوای گەورە باسی سیفاتی کۆمەڵێك لە خەڵکی دەکات کە دەم ئێژن: ئێمە خاوەن باوەڕین بەڵام باوەڕ لە دڵیاندا جێگیر نەبووەو درۆ دەکەن کە ئێژن خاوەن باوەڕین، چونکە کاتێك کە تووشی بەڵایەك یان گرفتێك هاتن، پەشیمان دەبنەوە وا گومان دەبەن بە هۆی ئەوەوە تووشی بەڵایەك بوون کە موسڵمان بوون. ئیبنو عەباس دەڵێ: تاقی کردنەوەکەی ئەوەیە لە ئاینەکەی پەشیمان دەبێتەوە ئەگەر لەبەر خوا سزا درا.[3] زانایانی تری پێشینەش (السلف) هەر وایان گوتووە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾[4] واتە: لەناو

---

[1] تحفة الأحوذي (٩/٤٨).

[2] أحمد (١٨١)، مسلم (٤/١٨٧٧)، أبو داود (٣/١٧٧)، النسائي في الكبرى (٦/٣٤٨).

[3] الطبري (٢٠/١٣).

[4] الحج (١١).

خەڵکدا کەسی وا هەیە خوا دەپەرستێت لە قەراغدا (لە نێواندا) جا ئەگەر تووشی خێرو خۆشی بوو دڵخۆش دەبێت پێی (بەردەوام دەبێت لە خواپەرستی دا) وە ئەگەر تووشی تاقیکردنەوەو بەلا بوو بەرەودوا هەڵدەگەڕێتەوە، پاشگەز دەبێتەوە لە ئایین زەرەرمەندی دنیاو قیامەت بووە تەنها ئەوەیە زیان و خەسارەتمەندی ڕوون و ئاشکرا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ﴾ واتە: ئەگەر یارمەتیەکی نزیکی خودا بێت بۆتان ئەی موحەمەد (ﷺ) ئێژن: ئێمەش لەگەڵتان بووین و برای دینی ئێوەین، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمۡ فَإِن كَانَ لَكُمۡ فَتۡحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ وَإِن كَانَ لِلۡكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ وَنَمۡنَعۡكُم مِّنَ الۡمُؤۡمِنِينَ﴾[1] واتە: (دووڕووەکان) ئەوانەی چاوەڕوانی (سەرەنجامی) ئێوە دەکەم جا ئەگەر بۆ ئێوە بوو سەرکەوتن لە لای خواوە دەڵێن مەگەر ئێمە لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ بەلام ئەگەر بێباوەڕان بەشێکیان (لە سەرکەوتن) هەبوو دەڵێن ئایا ئێمە زاڵمان نەکردن بەسەر ئەواندا؟و ئێوەمان نەپاراست لە ئیمانداران؟ وە فەرموویەتی: ﴿فَعَسَى اللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِالۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٍ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ﴾[2] واتە: دەی نزیکە خوا سەرکەوتن و زاڵکردنی تەواو بنێرێت (بۆ پێغەمبەر ﷺ) یان لە لایەن خۆیەوە کارێکی تر بکات بە هۆی ئەوەوە وایان لێ دێت لەوەی پەنهانیان کردبوو لە دەروونی خۆیاندا پەشیمان دەبنەوە. وە لێرەشدا خوای گەورە باسیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٌ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡ﴾ واتە: ئەگەر یارمەتیەکیش لە لایەن خوداوە بێت، ئێژن: ئێمە لەگەڵ ئێوە بووین، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَيۡسَ اللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ الۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئایا خودا ئاگادارتر نیە لەوەی کە لە دڵی ئەوانە دایەو شاردوویانەتەوە؟ هەرچەندە خۆیان وا دەردەخەن کە هاوڕان لەگەڵ ئێوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَيَعۡلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ الۡمُنَٰفِقِينَ﴾ واتە: خوای باڵادەست خەڵکی تاقی دەکاتەوە بە خۆشی و بە ناخۆشی بۆ ئەوەی خاوەن باوەڕان ئەوانەی کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بوون و دووڕووەکانیش ئەوانەی کە بە گوێی هەواو ئارەزووی خۆیان کردووە لە یەکتری جیابکاتەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ

[1] النساء (١٤١).

[2] المائدة (٥٢).

حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە تا دەری بخەین‌و دیاربێت موجاهیدان‌و خۆڕاگرتنتان‌و تا هەواڵتان چیە ئاشکرای بکەین. خوای گەورە باسی ڕووداوەکەی ئوحود (أحد) دەکات‌و ئەوەی کە ڕوویدا تێیدا لەو تاقیکردنەوەو کارەساتە گرانە کە بەسەر پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانیدا هات، دەفەرمووێت: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ﴾[2] واتە: خوا واز لە بڕواداران ناهێنێت لەسەر ئەو بارەی کە ئێوەی لەسەرن (کە جیانەبوونەوەی موسڵمان دووڕووو کافرە).

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبِعُوا۟ سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ ۖ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْـَٔلُنَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣﴾﴾

## نەترسی خوانەناسان لە هەڵگرتنی تاوانی خەڵکی تر بەو بەرجەی بگەڕێنەوە بۆ بێ دینی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبِعُوا۟ سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ﴾ خوای گەورە باسی خوانەناسەکانی قوڕەیش دەکات کە دەیانگوت بە خاوەن باوەڕەکان ئەوانەی شوێن ڕێی ڕاست کەوتبوون، لە ئاینەکەتان پەشیمان ببنەوە بێنەوە سەر ئاینەکەی ئێمەو بە قسەی ئێمە بکەن. ﴿وَلْنَحْمِلْ خَطَٰيَٰكُمْ﴾ هەرچی تاوان‌و خراپەتان هەیە هەموو بە گەردنی ئێمە، وەك کەسێك بە کەسێکی تر ئێژێت: ئەو کارە بکە ئۆباڵی تاوانەکەت بە ئەستۆی من، خوای گەورەش بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرمووێت: ﴿وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنْ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَىْءٍ ۖ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ واتە: ئەوانە کە گوتوویانە تاوانەکانی ئەوانە دەخەنە ئەستۆی خۆیان، بێگومان کەس تاوانی کەسی تر هەڵناگرێت بە ڕاستی ئەوانە درۆزنن، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾[3] واتە: وە ئەگەر بارگرانێ (گوناهبارێك) بانگی کەسێ تر بکات بۆ هەڵگرتنی (بارە گوناهەکەی) هیچ لەو (بارە گوناهە) هەڵناگرێت هەرچەندە (داوالێکراوەکە) خزمیشی بێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ﴾[4] واتە: وە هیچ کەسێك ناپرسێتەوە لە

---

[1] محمد (٣١).

[2] ال عمران (١٧٩).

[3] فاطر (١٨).

[4] المعارج (١٠ـ١١).

هیچ کەسێکی خۆشەویستی خۆی، کە نیشانی یەکتری دەدرێن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَيَحْمِلُنَّ أَثْقَالَهُمْ وَأَثْقَالًا مَّعَ أَثْقَالِهِمْ ۖ وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێباوەڕان باری گرانی (کوفرو تاوانی) خۆیان هەڵدەگرن‌و باری گرانی (خەڵکانی) تریش لەگەڵ باری گرانی خۆیاندا هەڵدەگرن‌و بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێ دەکرێت لەو درۆو دەلەسانەی لە دنیادا هەڵیاندەبەست. خوای گەورە باسی ئەو خوانەناس‌و گومڕایانە دەکات کە بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ بێ دینی، کە لە ڕۆژی قیامەتدا تاوانی خۆیان‌و تاوانی ئەو کەسانەش وا لە گەردنیاندا کە گومڕایان کردوون بەبێ ئەوەی تاوانی ئەوانیش هیچ کەم بێتەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِيَحْمِلُوا أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ الَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾[1] واتە: بۆ ئەوەی باری گوناهی خۆیان بە تەواوی هەڵبگرن لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ هەندێ لە باری گوناهی ئەوانەی کە ئەوان گومڕایان دەکردن بەبێ زانیاری بێدارین زۆر بەدە ئەوەی کە هەڵیدەگرن (و دەیگرنە ئەستۆ). لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (هەر کەسێك بانگەواز بکات بۆ سەر ڕێی ڕاست، بە ئەندازەی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون‌و پاداشتی دەست دەکەوێ، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوانە هیچ کەم بکرێتەوە، هەر کەسێك بانگەواز بکات بۆ گومڕایی بە ئەندازەی ئەوانەی تاوانەکە دەکەن سزا دەدرێت، بەبێ ئەوەی لە سزای ئەوانە هیچ کەم بکرێتەوە).[2] هەر لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە دەفەرموێت: (هیچ کەسێك ناکوژێت بە ناهەقی مەگین یەکەم کوڕی ئادەم بەشی هەیە لە خوێنەکەی‌و تاوانەکەیدا، چونکە یەکەم کەس بوو یاسای کوشتنی داهێنا).[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَيُسْأَلُنَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَمَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ واتە: پرسیاریان لێ دەکرێت لەسەر ئەو بوختان‌و درۆیانە کە کردوویانە. ئیبنوئەبی حاتەم لێرەدا فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردووە لە ئەبو ئومامەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پەیامەی کە بۆی هاتبوو بە تەواوی گەیاندی، پاشان گوتی: خۆتان لادەن لە ناهەقی (الظلم) چونکە خوای گەورە سوێند دەخوات لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێت: ((بە گەورەیی‌و دەسەڵاتی خۆم سوێند بێت، چاوپۆشی لە ناهەقی‌و تاوان ناکەم، پاشان جارچییەك جاڕ دەدات‌و ئێژێ: فلانی کوڕی فلان لە کوێیە؟ دێت‌و بە ئەندازەی کێو چاکە شوێنی دەکەوێت، خەڵکی هەموو سەیری دەکەن‌و لێی زرد دەبنەوە هەتا لە خزمەت خودای مەزندا دەوەستێت، پاشان فەرمان دەدرێت بە

[1] النحل (٢٥).

[2] مسلم (٢٠٦٠/٤).

[3] فتح الباري (٤١٩/٦).

جارڕدەرەکە، جارڕدەداو ئێژێت: کێ هەقی هەیە لەسەر فلانی کوڕی فلان با بێت، ئەوانیش دێن‌و لە خزمەت خوای گەورەدا کۆدەبنەوەو دەوەستن، خوای گەورە دەفەرمووێت: بە کاری ئەم بەندەی مندا رابگەن‌و حەقی لێ بسێنن، ئەوانیش ئێژن: چۆن بەکاری رابگەین؟ خوای گەورە دەفەرمووێت: لە چاکەکانی هەلگرن بۆ ئەوانە، بەردەوام چاکەکانی هەڵدەگرن هەتا هیچ چاکەی نامێنێ، خاوەن هەقی تر نەماوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: کاری ئەم عەبدەم تەواو بکەن‌و هەقی لێ بستێنن، ئەوانیش ئێژن: هیچ چاکەی نەماوە، دەفەرمووێت: لە خراپەکانی ئەوانە هەڵگرن‌و بیخەنە سەری ئەو))، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەم ئایەتە کۆتایی هێنا: ﴿وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾[1]، ئەم فەرموودەیە نموونەی زۆرە لە کتێبە سەحیحەکاندا لەم بارەیەوە: (پیاوی وا دێت چاکەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا وەك کێوەکان وایە، ناهەقی بەوە کردووەو ماڵی ئەوەی بردووەو قسەی ناشیرینی ئەو گوتووە، فلان لە چاکەکانی دەبات‌و فلانیش لە چاکەکانی دەبات، خۆ ئەگەر چاکەی نەماو تەواو بوو لە خراپەکانی ئەوانە هەڵدەگیرێت‌و دەخرێتە سەری)[2].

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾﴾

### باسی نوح پێغەمبەرو (سەلامی خوای لێ بێت) گەلەکەی

ئەم ئایەتە لێرەدا دڵدانەوەیە لە خوای گەورەوە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەمەد (ﷺ) کە باسی نوح پێغەمبەری (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ دەکات کە ئەو ماوە زۆرە لەناو هۆزەکەیدا مایەوە بە شەوو بە ڕۆژ بانگی دەکردن بۆ لای خواو ڕێی ڕاست بە پەنهانی‌و بە ئاشکرا کەچی هەر دوور دەکەوتنەوەو ڕایان دەکرد لە هەق پشتیان تێ دەکردو باوەڕیان پێ نەدەکرد، خەڵکێکی زۆر کەم نەبێت بڕوایان پێ دەکرد، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ﴾ واتە: پاش ئەو هەموو ماوە زۆرە ئەو بانگەوازی نوحە (سەلامی خوای لێ بێت) هیچ کارێکی تێ نەکردن‌و ئامۆژگاریەکانی نوحیان وەرنەگرت، تۆش ئەی موحەمەد (ﷺ) دڵگران مەبەو خەم مخۆ بۆ هۆزەکەت کە بڕوات پێ ناکەن، چونکە خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت شارەزای دەکات‌و مەیلیشی لە هەر کەسێك بێت گومڕای دەکات، هەموو شتێك بە دەستی خوایەو هەموو کاروبارێك دێتەوە بۆ لای ەو. وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ

---

[1] الدر المنثور (٢٧٢/٥).

[2] مسلم (١٩٩٧/٤).

عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ﴾[1] واتــە: بەڕاسـتی ئەوانــەی دەرچــووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت بڕوا ناهێنن، (بڕوا ناهێنن) هەرچەندە بۆیان بێت هـەموو بەڵگـەو نیشانەیەك. ئیبنوعەباس دەڵێ: نوح (سەلامی خوای لێ بێت) ڕەوانە كرایە سەر هۆزەكەی تەمـەنی چل ساڵ بوو، نۆسەدو پەنجا ساڵ لەناویاندا مایەوە، دوای تۆفان و لافاوەكە شەست ساڵ مایەوە تا خەڵكی زۆربـوون و بڵاوبوونـەوە.[2] خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ﴾ واتـە: ئەوانـەی بڕوایان بە نوح هێنـا (سـەلامی خـوای لێ بێـت) ڕزگارمـان كـردن. بە درێـژی لـە پێـشەوە لـە سـوڕەتی (هـود)دا باسمـان كـردووە پێویـست ناكـات لێـرەدا جـارێكی تـر باسـی بكەینـەوە. خـوای گـەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئەو كەمیـەمان وەك نیـشانەیەك هێـشتەوە یـان هـەر كەمیەكە خۆی مایەوە، وەك قەتادە ئێژێ: ئەو كەمیـە مایـەوە هـەتا سـەرەتای ئـاینی ئیـسلام لەسـەر جودی، یان شێوەی ئەو كەمیەی هێشتەوە هـەتا ببێتـە بیرەوەریـەك بـۆ ئـەو خەڵكـە كـە چـۆن خـوای گەورە ڕزگاری كردن لـەو لافـاوە.[3] وەك خـوای گەورەفەرموویـەتی: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ۝٤١ وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ ۝٤٢ وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ ۝٤٣ إِلَّا رَحۡمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾[4] واتـە: وە بەڵگەیـەكی ئاشـكای تـر بـۆ ئـەوان ئەمەیـە كـە بێگومـان ئێمـە نەوەكانی ئەوانمان لە كەشتی پڕكراو (لـە خۆیـان و كەلوپـەلیان)دا هـەڵگرتووە، وە بـە وێنـەی كەشـتی شتانێكی تریشمان بۆ دروست كردون كە سـواری بن، وە ئەگـەر بمانـەوێت نوقمیـان دەكـەین جا هـیچ كەس نایەت بە هاواریانەوە و ڕزگاریش ناكرێن (لە نوقمبوون)، مەگەر بەزەیی ئێمـە (ڕزگاریـان بكـات)و تا كاتی دیاریكراو بیانـژێنێت. وە فەرموویـەتی: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ۝١١ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ﴾[5] واتـە: بەڕاسـتی ئێمـە: كاتێـك كـەئاو(ی تۆفـان) سـەركەوت (باپیرەكـانی) ئێوەمـان هـەڵگرت لـە كەشـتیدا (ئـەی بێبـاوەڕانی مەككـە) تـا ئـەم كردەوەیـە بكەینـە بیرهێنـەرەوە بـۆ ئێـوەو گـوێگرێكی تێگەیـشتوو. وە لێرەشـدا فەرموویـەتی: ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةً

---

[1] یونس (٩٦ـ٩٧).

[2] الدر المنثور (٥/٢٧٣).

[3] الطبري (٢٠/١٨).

[4] یس (٤١–٤٤).

[5] الحاقة (١١ـ١٢).

لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەمەش لەبابی تەدریجە (التدریج) لە شەخصەوە بۆ جنس (من الشخص الى الجنس) وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾[1] واتە: سوێند بێت بێگومان ئاسمانی دنیامان ڕازاندۆتەوە بە چرای زۆر (ی ئەستێرە)و کێڕاومانن لە ڕەجمی شەیتانەکان. واتە: لە شێوەو بابەتی ئەوە ڕەجمی شەیتانیشی پێ دەکەینو ڕاوی دەنێین، بە ئەستێرە ڕازاوەکان ڕاویان نانێین، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی مرۆڤمان دروست کرد لە خولاسەو پاڵفتەیەك لە قوڕ، لە پاشان ئەومان کردە نوتفەیەك لە ئارامگایەکی قایم (مندالدانی دایك)دا.

﴿وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُوا۟ فَقَدْ كَذَّبَ أُمَمٌ مِّن قَبْلِكُمْ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾﴾

### ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) ئامۆژگاری گەلەکەی دەکات

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەرو خەلیلی خۆیو پێشەوای یەکتاپەرستان ئیبراهیم دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە بانگی هۆزەکەی کرد کە تەنها خوابناسنو هەر ئەو بپەرستن شەریکی بۆ دانەنێنو بە پاکیو دڵسۆزیەوە لە خوا بترسنو داوای ڕۆزیش هەر لەو بکەن لە کەسی تری داوا مەکەن، چونکە هەر خودا شایانی سوپاس کردنە لەسەر ئەو بەهرانەی کە داویەتی بە بەندەکانی، کەسی تر ناتوانێ بیدا. ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ﴾ واتە: گوتی بە هۆزەکەی: خوا بپەرستنو لێی بترسنو خۆتانی لێ بپارێزن، ﴿ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەگەر واتان کرد تووشی خێروبێر دەبن لە دنیاو لە قیامەتدا، وە شەڕو خراپەتان لە کۆڵ دەبێتەوە لە دنیاو لە قیامەتدا، ﴿إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێوە لە جیاتی خوا بتانێك دەپەرستنو درۆیەکی گەورە هەڵدەبەستن بە ڕاستی ئەوانەی کە ئێوە دەیان پەرستن بێجگە لە

---

[1] الملك (٥).

[2] المؤمنون (١٢_١٣).

خوا ناتوانن ڕزق‌و ڕۆزی ئێوە بدەن كەواتە داوای ڕۆزی لە خوا بكەن‌و ئەو بپەرستن‌و هەر سوپاسی ئەویش بكەن تەنها بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە (لە ڕۆژی قیامەتدا)، خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی ئەو بتانە دەكات كە دەیپەرستن توانای هیچ قازانج‌و زەرەرێكیان نیە بە خەڵكی بگەیەنن بەڵكو درۆیەكە خۆیان هەڵیان بەستووە، چەند ناوێكن كە ناوی خودایان لێ ناوە، كە ئەوانیش هەروەك ئەوان دروست كراون، عەوفی هەر بەم شێوەیە لە ئیبنوعەباسەوە ڕیوایەتی كردووە.[1] موجاهیدو سودیش هەر وایان گوتووە، والبیش (الوالبيّ) لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی كردووە ـ وتصنعون إفكاً ـ واتە: دەیانتاشن‌و دەیانكەنە بتگەل.[2] كە ناتوانن بژێویتان بۆ دابین بكەن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا﴾ ئەمەی كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ﴾ بەهێزترو دیارترە لە حەسر (الحصر) وەك دەفەرموێت: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾[3] واتە: (خوایە) تەنها تۆ دەپەرستین‌و تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەكەین. وە دەفەرموێت: ﴿رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾[4] واتە: پەروەردگارم بۆم دروست بكە لای خۆت ماڵێك لە بەهەشتدا. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱبۡتَغُواْ﴾ واتە: داوا بكەن ﴿عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ﴾ واتە: لە ڕۆزی خودا بخۆن‌و هەر ئەو بپەرستن‌و سوپاسیشی بكەن لەسەر ئەو بەهرانەی كە پێی بەخشیون، ﴿إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو هەموو كەسێك پاداشتی كردەوەكانی وەردەگرێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە باوەڕ نەهێنن، ئەوە ئومەتانی پێش ئێوەش باوەڕیان بە پێغەمبەرەكانیان نەهێنا، هەواڵی دانیٚ كە چیان بەسەرهات لە جەربەزەو سزای سەخت لەسەر ئەو دژایەتیەی بەرانبەر پێغەمبەران كردیان، ﴿قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ واتە: ئەوەی لەسەر پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) گەیاندنی ئەو پەیامەیە كە خودا فەرمانی پێ كردوون بۆتان، خودا مەیلی خۆیەتی كێ گومڕا دەكات‌و كێش شارەزا دەكات، كەواتە خۆتان ماندوو بكەن‌و هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی لە بەختەوەران بن، قەتادە دەڵێ: ﴿وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ﴾ واتە: خوای گەورە سەرەخۆشی لە

---

[1] الطبري (٢٠/١٨).

[2] الطبري (٢٠/١٩).

[3] الفاتحة (٥).

[4] التحريم (١١).

پێغەمبەر (ﷺ) دەکات ئەم قسەی قەتادە وا دەگەیەنێت کە قسەی یەکەمجار براوەو ئەم ڕستەیە وەک جومگەیەکی موعتەرزە (معترضة) هاتووەتە نێوان، قەتادە دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ ئیبنو جەریریش بە هەمان دەق گوتوویەتی، بەڵام لە شێوازی ئایەتەکەوە وا دەردەکەوێت ئەم قسانە هەموو قسەی ئیبراهیمی خەلیلە (سەلامی خوای لێ بێت) دەیکاتە بەڵگە لەسەر هۆزەکەی بۆ سەلماندنی ڕۆژی قیامەت پێیان، پاش ئەم قسانە هەمووی: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ﴾ واتە: تەنها وەڵامی هۆزەکەی هەر ئەوە بوو کە بیکوژن یان بیسوتێنن ـ والله أعلم ـ.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١٩﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَآءُ ۖ وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يَئِسُوا۟ مِن رَّحْمَتِى وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٣﴾﴾

### بەڵگەکانی ژیانەوە پاش مردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ كَيْفَ يُبْدِئُ ٱللَّهُ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: ئایا ئەوانە سەرنجیان نەداوە کە چۆن خودا دروستکراوان بەدی دەهێنێت لە پاش نەمان دەیهێنێتەوە بێگومان ئەو زیندوکردنەوە بۆ خوا ئاسانە. خوای گەورە باسی ئیبراهیم خەلیل دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە ڕێی ڕاست نیشانی هۆزەکەی دەداتو پێیان دەسەلمێنێت کە ڕۆژی قیامەت هەیەو دێت کە ئەوان وا دەزانن نیەو نایەت، بە چاوی خۆیان دەبینن کە ئەو خەڵکە نەبووەو خودا وەدی هێناونو چاوو گوێی پێداونو پێی دەبیننو دەبیستن، ئەو خودایەی کە لە نەبوون دروستی کردوون دەتوانێ جارێکی تریش بیانهێنێتەوە، ئەوە بە لای خوداوە زۆر سووکو ئاسانە، پاشان دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ بَدَأَ ٱلْخَلْقَ ۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ پاشان ڕێیان نیشان دەدات کە سەیری ئەم بوونەوەرە بکەنو ئەو هەموو بەڵگەیە ببینن لە دروستکردنی ئاسمانەکانو ئەو هەموو ئەستێرە ڕووناکو وەستاوو گەڕۆکو زەمینو ئەوەی کە تیایاندایە لە دەشتو کێوو دۆڵو چۆڵو بیابانو دارودرەختو ڕووبارو دەریاو بەرهەمی زۆر ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دروستکراونو لە خۆیانەوە نەهاتوون، نیشانەشن لەسەر بوونی

وەدیهێنەرێکی خاوەن دەسەلاتو بە توانا کە مەیلی لە هەر شتێك ببێت فەرمووی ببە دەبێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا كَيْفَ يُبْدِئُ اللَّهُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾ وەك ئەم ئایەتەش وایە کە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: ئەو (خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان (دوای مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە ئەم (دروست کردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. وە پاشان دەفەرمووێت: ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَيَرْحَمُ مَن يَشَاءُ﴾ واتە: خوا سزای هەر کەسێك دەدات بیەوێ وە ڕەحمیش دەکات بە هەر کەسێك کە بیەوێت. خودا خۆی کاربەدەستەو هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات هیچ کەسێك ناتوانێ دەست وە کاریەوە بدات بێژێت ئەوە بۆ. بەلام ئەو خەلکە هەموو پرسینەوەی لێ دەکرێت، کارو فەرمان هی خۆیەتیو هەرچی بکات پڕە لە دادپەروەری چونکە خوا خاوەن دەسەلاتێکی وایە کە بە ئەندازەی گەردیلەیەك (مثقال ذرة) ناهەقی لە بەندەکانی ناکات. وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە هەندێ زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە: (خوای گەورە ئەگەر بیەوێت سزای خەلکی ئاسمانەکانو زەمینی خۆی بدات، سزای دەداتو ناهەقیشی پێ نەکردوون).[2] بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَيْهِ تُقْلَبُونَ﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾ واتە: هیچ کەسێك لەناو ئاسمانەکانو زەمیندا ناتوانێت لە دەستی خودا دەرچێت، بەلکو زاڵە بەسەر بەندەکانیدا، هەموو کەسو هەموو شتێك هەر لە خودا دەترسێتو موحتاجی ئەوەو خودا لە هەموو کەسو هەموو شتێك بێ نیازە، ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ واتە: جگە لە خوا کەس نیە هانای پێ ببەنو یارمەتی دەرتان بێت، ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ وَلِقَائِهِ﴾ واتە: ئەوانەی کە بە نیشانەکانی خوداو دیداری باوەڕیان نیە، ﴿أُولَٰئِكَ يَئِسُوا مِن رَّحْمَتِي﴾ واتە: بێ ئومێدن لە بەزەیی خواو بێ بەشن، ﴿وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: جەربەزەی بە ژانیان هەیە لە دنیاو لە ڕۆژی دوواییدا.

﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا اقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَاهُ اللَّهُ مِنَ النَّارِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

---

[1] الروم (٢٧).

[2] ابوداود (٥/٧٥)، ابن ماجه (١/٣٠)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾

**وەڵامی هۆزی ئیبراهیم بۆ ئیبراهیمو فەرمانی خودا بۆ ئاگر**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوۡمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقۡتُلُوهُ أَوۡ حَرِّقُوهُ﴾ خوای گەورە باسی هۆزەکەی ئیبراهیم دەکات کە چەندە خوانەناسو لاسارو سەربزێونو دەیان ویست بەری هەق بە شتی پڕوپووچ بگرن. تەنها وەڵامیان هەر ئەوە بوو کە ئیبراهیم بکوژن یان بیسوتێنن، دوای ئەو هەموو ئامۆژگاریەی ئیبراهیم کە داوای لێ کردن ڕێی ڕاست بگرنو لێیو لێی لانەدەن، چونکە ئیبراهیم بەڵگەی زۆری بۆ دەهێنانەوەو پێی دەسەلماندن، کەچی ئەوان بە خۆیانوماڵو سامانیاندا دەنازی دەیان گوت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالُواْ ٱبۡنُواْ لَهُۥ بُنۡيَٰنٗا فَأَلۡقُوهُ فِي ٱلۡجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَسۡفَلِينَ﴾[1] واتە: وتیان بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکەن (پڕی بکەن لە ئاگر)و فڕێی بدەنە ناو ئاگرەکەوە، ویستیان (بیکوژن) بە پیلان بەڵام ئێمە ئەوانمان ژێرخست. بۆ ئەو مەبەستە خەڵکێکی زۆریان هێناو دارێکی ئێجگار زۆریان پێ کۆکردنەوە کە ماوەیەکی زۆری پێ خایاند، لە دەوری کۆبوونەوەو پاشان ئاگریان تێ بەردا کڵپەی ئاگرەکە بەرەو ئاسمان بەرزبووەوە، هەرگیز ئاگری وا گەورە نەکرابووەوە، پاشان پەلاماری ئیبراهیمیان داو دەستو پێیان بەستو خستیانە ناو مەنجەنیقو فڕێیان دایە ناو ئاگرەکە. خوای باڵادەستیش ئاگرەکەی ساردو سەلامەت کردەوە، بە ساغو سەلامەتی ئیبراهیم لەناو ئاگرەکە هاتە دەرەوە دوای چەند ڕۆژێك، خوای گەورە ئیبراهیمو ئەوانەی وەك ئیبراهیمی کردە پێشەوای خەڵکی، چونکە گیانی خۆی بەخشی بە خوداو لاشەی خۆی خستە ناو ئاگرو کوڕەکەی خۆی کردە قوربانیو ماڵەکەی کردە شوێنی حەسانەوەی میوان لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە. بۆیە هەموو ئاینەکان ڕێزی لێ دەنێنو حۆشیان دەوێت، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: خوا لە سوتانی ئاگر نەجاتی داو ئاگرەکەی ساردو سەلامەت کرد بۆی، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: ئەمە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕن بەڵگەی زۆری تێدایە.

**ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بێ دەسەڵاتی بتەکانی بۆ هۆزەکەی ڕوون کردەوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لۆمەو سەرزەنشتی هۆزەکەی دەکات لەسەر ئەو بتپەرستیو کارە

---

[1] الصافات (٩٧-٩٨).

خراپەیان کە عیبادەت بۆ بتەکانیان دەکەن پێیان ئێژێ: ئێوە بۆیە هەموو کۆن لەسەر ئەو بت پەرستیە لەبەر خۆشەویستیو خاتری یەکتری لە ژیانی دنیاداو بۆ پاراستنی ئەو تێکەڵاویو برایەتیە کە نێوانتاندا هەیە ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ پاشان لە رۆژی قیامەتدا ئەو خۆشەویستیو برایەتیە دەگۆرێتو دەبێتە رقو کینە لە یەکتری ﴿يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ﴾ واتە: حاشا لە یەکتری دەکەنو ﴿بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا﴾ واتە: ئەوانەی شوێنکەوتوون نەفرین لەوانە دەکەن کە شوێنیان کەوتو ئەوانیش هەر نەفرین لە شوێنکەوتووانی خۆیان دەکەن. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾[1] واتە: هەر جارێك دەستەیەك دەچنە ناویەوە نەفرین لە هاوبیرانی دەکات. وە دەفەرموێت: ﴿ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ﴾[2] واتە: دۆستو خۆشەویستەکان لەو رۆژەدا دوژمنی یەکترن جگە لە پارێزگاران. وە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾ واتە: پاشەرۆژو ئاکامتان دوای وەستان لە رۆژی مەحشەردا (قیامەتدا) هەر ناو ئاگرەو هیچ کەسێك نیە بێت بە هاوارتانەوە یارمەتیان بدات هیچ کەسیش ناتوانێت رزگارتان بکات لە جەزرەبەی خودای گەورە. ئەمە ژیانو گوزەرانی خوانەناسانە لە قیامەتدا، بەڵام خاوەن باوەڕان بە پێچەوانەی خوانەناسانەوەیە.

﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَـٰبَ وَءَاتَيْنَـٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾﴾

**باوەڕهێنانی لووتو کۆچکردنی لەگەڵ ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێ بێت)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾ خوای گەورە باسی ئیبراهیم دەکات کە لوت بڕوای پێ هێنا (سەلامی خوایان لێ بێت) گوتراوە کە لوت برازای ئیبراهیم بووە، واتە: لوتی کوڕی هارانی کوڕی ئازەر، غەیری لوتو سارەی خێزانی ئیبراهیم نەبێت لە هۆزەکەی هیچ کەس بڕوای پێ نەهێنا، بەڵام گوتراوە: کەواتە چۆن تەوافوق (التوافق) دەخرێتە نێوان ئەم ئایەتەو ئەو فەرموودە سەحیحەی کە دەفەرموێت: کاتێك ئیبراهیم رۆیشت بەلای ئەو پاشا ستەمکارەدا، پرسیاری لێ کرد کە سارە چیتە؟ ئیبراهیم گوتی: خوشکمە، پاشان ئیبراهیم هات بۆ لای سارەو پێی گوت: من

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] الزخرف (٦٧).

گوتومە بەو پاشایە کە تۆ خوشکی منی بە درۆم نەخەیتەوە، چونکە لەسەر زەمیندا غەیری منو تۆ هیچ خاوەن باوەڕ نیە، تۆ خوشکی ئاینی منی، مەبەست لەم قسەیە ـ والله أعلم ـ لەسەر زەمیندا جگە لە منو تۆ کە ژنو مێردی یەکترین تۆ خاوەن باوەڕ بێت. لوتیش کە بڕوای پێ هێناوەلە هۆزەکەی خۆیەتیو کۆچی کردووە لەگەڵی بۆ وڵاتی شام، پاشان ڕەوانە کراوە بۆ ئەهلی سەدومو (سدوم) ئەو ناوچەیەو لەوێ ماوەتەوە.[1] وەك لە پێشەوە باسی لوت کراوە لەمەودوایش باسی دەکەین.

﴿وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ﴾ واتە: وە (ئیبراهیم) وتی: بێگومان من کۆچ دەکەم بۆ لای پەروەردگارم (لە بابلەوە بۆ شام). دەگونجێت زەمیری ﴿وَقَالَ إِنِّي مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّيٓ﴾ بگەڕێتەوە بۆ لوت (سەلامی خوای لێ بێت) چونکە لە نزیکترین باسکراوەکانە، لەوانەشە ئەو زەمیرە بگەڕێتەوە بۆ ئیبراهیم، ئیبنو ئیسحاقو زەحاك دەڵێن: مەبەست بەم ئایەتە: ﴿فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ﴾ واتە: لە هۆزەکەی. پاشان باسی ئیبراهیم دەکات کە کۆچ کردنی هەڵبژارد لەناو هۆزەکەیداو سەرکەوتنی بە دەست هێنا لەو کۆچکردنەدا، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ واتە: دەسەڵاتو سەرکەوتن هەر بۆ خواو پێغەمبەرەکەیو خاوەن باوەڕانە. ئەو خودایەی کە لە کردارو گوفتاردو فەرمانی شەرعیو قەدەریدا کارزانە. قەتادە دەڵێ: هەموویان کۆچیان کرد لە کوسیەوە (کوثي) لە ناوچەی کوفەوە (الکوفة) بۆ وڵاتی شام.

**خوای گەورە ئیسحاقو یەعقوبی دا بە ئیبراهیمو لە ناوەکانیشیدا پێغەمبەری هەڵبژارد**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴾[2] واتە: کاتێك کە هۆزەکەی بەجێهێشتو ڕۆیشت خودا چاوی ڕۆشن کردەوە بە کوڕێکی پیاوچاکی پێغەمبەر، ئەویش خودا منداڵێکی پێ بەخشی کە پیاوچاكو پێغەمبەر بوو هەر لە ژیانی باپیریدا، واتە: کوڕو کوڕەزای بوونە پێغەمبەرو ئیبراهیم هەر لە ژیاندا بوو. هەر بۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾[3] واتە: وە بەخشیمان بە ئیبراهیم ئیسحاقو (بە ئیسحاقیشی) یەعقوب بە زیاد (لە داواکەی ئیبراهیم کە داوای منداڵێکی کرد). واتە: زیادە بەشێ بێت. وەك خوای گەورە

---

[1] فتح الباري (٦/٤٤٧).

[2] مريم (٤٩).

[3] الانبياء (٧٢).

فەرموویەتی: ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾[1] واتە: ئێمەش مژدەمان پێ دا بە ئیسحاق (مژدەمان پێدا) بە یەعقوب (کە کوڕی ئیسحاقە). ﴿وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەمەیش ڕێزو قەدرێکی گەورە بوو لەگەڵ ئەو ڕێزەی خوا لە ئیبراهیمی گرتو کردیە خەلیلی خۆیو پێشەوای خەڵکیو لە نەتەوەکەشیدا پێغەمبەری هەڵبژاردو کتێبی بۆ ناردن، هیچ پێغەمبەرێ نەبووە دوای ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) مەگین ئەو پێغەمبەرە لە نەوەی ئیبراهیم بووە. گشت پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل لە بنەماڵەی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە کە دواین پێغەمبەری عیسای کوڕی مەریەمە (سەلامی خوایان لێ بێت). وە هەر لە بنەماڵەی ئیبراهیم خودای گەورە مژدەی بە پێغەمبەرێکی عەرەبی قوڕەیشی هاشمی دا، کە دوایین پێغەمبەرەو دوای ئەو پێغەمبەری تر نایەت هەتا ڕۆژی قیامەتو بە ڕێزترین منداڵی ئادەمە لە دنیاداو لە قیامەتدا، کە خوای گەورە هەڵی بژارد لەناو کوڕۆکی ڕەچەڵەکە عەرەبەکاندا لە بنەماڵەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم (سەلامی خوایان لێ بێت) جگە لە پێغەمبەر (ﷺ) لە بنەماڵەی ئیسماعیلدا پێغەمبەر نەهاتووە (سەلامی خوایان لێ بێت) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ واتە: وە لە دنیا پاداشتمان دایەوەو بە ڕاستی ئەو لە ڕۆژی دوایشدا لە پیاوچاکانە، خوای گەورە خۆشبەختی دنیاو قیامەتی بەست بە یەکەوە بۆیو پێی بەخشی، لە نیادا بژێوی چاکی هەبوو، لەگەڵ شوێنی فراوانو ئاوی سازگارو ژنی باشو خواناسو وەسفی جوانو باسی چاك. هەموو کەسێك خۆشی دەوێتو خۆی بە دۆستی ئەو دەزانێت، وەك ئیبنو عەباسو موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش گوتوویانە: لەگەڵ هەڵسانی بە خواناسی لە هەموو ڕوویەکەوە.[2] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾[3] واتە: ئیبراهیم ئەرکی خۆی بە تەواوی بەجێ هێناو عیبادەتی پەروەرندەی خۆی کرد، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ وەك لەم ئایەتانەی تردا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ

---

[1] هود (٧١).
[2] الطبري (٢٠/٢٧/٢٨).
[3] النجم (٣٧).

ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئیبراهیم ئومەتێك بوو فەرمانبەردار بۆ خوا لادەربوو لە هەموو ئاینێکی ناهەقو هەرگیز لە هاوبەش دانەران نەبووە، شوکرانە بژێوی (خوا) بووە لە بەرامبەر نازونیعمەتەکانیدا ئەویش هەڵی بژاردو ڕێگەی ڕاستی نیشاندا (کە ئیسلامە) وە ئێمە لە دنیادا بەهرەی چاکمان پێ بەخشیو بە ڕاستی ئەو لە ڕۆژی دوایشدا لە ڕیزی چاکاندایە.

﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾﴾

**ئامۆژگاری لوت (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ هۆزەکەی ئەوەی لە نێوان و لوت و ئەواندا باسی لێکرا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ خوای گەورە باسی پێغەمبەری خۆی لوت دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) نارەزایی دەردەبڕێت لەسەر ئەو کارە پیسو خراپو بێ ناموسیەی کە پێی هەڵدەسان (سواری نێرینە دەبوون) کە هیچ کەسێك لە پێش ئەوانەوە بەو کارە ناشیرینە هەڵنەساوە، لەگەڵ ئەوەیشدا بڕوایان بە خودا نەبوو، پێغەمبەرەکەشیان بە درۆزن دەزانیو دژایەتیان دەکردو ڕێیان لە خەڵکی دەگرتو دەیان کوشتو ماڵیان بە تالاّ، دەبردن، لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێی گوتن: وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ﴾ واتە: ئێوە خەریکی بێ ناموسیو نێربازینو ڕێگرو پیاو کوژنو ماڵی مەردم بە ناهەق تالاّن دەکەنو لە دیوەخانەکانتاندا زۆر کاری ناشیرین دەکەنو بە دەم جرت لێ دەدەنو پەلاماری یەکتری دەدەن، کەسێك نیە لە نێوانتاندا نارەزایی دەربڕێت بەرانبەر ئەو هەموو بێ ناموسیە، هەندێ ئێژن: سواری یەکتری دەبوون بەبەر چاوی خەڵکەوە. وەك موجاهید دەڵێ.[2] هەندێکی تر ئێژن: دەترپینو بە یەکتری پێ دەکەنین، وەك قاسمو عائیشە گوتوویانە (ڕەزای خوای لێ بێت).[3] هەندێکی تر گوتوویانە وەك بەرانو کەڵەشێر یەکتریان دەبردو دەهێناو شەرە دەنوکیان بوو. هەرچی کاری خراپە

---

[1] النحل (١٢٠ـ١٢٢).

[2] الطبري (٢٠/٢٩)، البغوي (٣/٤٦٦).

[3] الطبري (٢٠/٣٠).

بوو دەیانکردو لەوەش خراپتر بوون ﴿فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ کەچی وەلامی گەلەکەی تەنها ئەوە بوو کە وتیان سزای خوامان بۆ بێنە ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانی. ئەم وەلامەشیان هەر لە بێ دینیو لاساریو گاڵتەکردنەوە بوو، بۆیە لوت (سەلامی خوای لێ بێت) دوعای لێ کردنو داوای یارمەتی لە خوا کرد کە تۆڵەیان لێ بسێنێ. ﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ واتە: لوت گوتی: ئەی پەروەردەم یارمەتیم بدەو زاڵم بکە بەسەر ئەو گەلە خراپەکارەدا.

﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ ۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾﴾

**ناردنی فریشتەکان بۆ لای ئیبراهیمو پاشانیش بۆ لای لوت (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَآ إِبْرَٰهِيمَ بِٱلْبُشْرَىٰ قَالُوٓا۟ إِنَّا مُهْلِكُوٓا۟ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ۖ إِنَّ أَهْلَهَا كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ﴾ واتە: کاتێك لوت (سەلامی خوای لێ بێت) داوای یارمەتی لە خوای گەورە کرد بۆ هۆزەکەی کە خەریکی کاری بەدفەڕی بوون، خودا فریشتەی نارد بۆ یارمەتی، فریشتەکان پێش ئەوەی بڕۆن بۆ لای لوت، سەریان دا لە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لە شێوەی کۆمەڵێك میواندا، ئیبراهیمیش ئەوەی پێویست بوو لە ڕێز لێگرتن بۆ میوان بەجێی هێنا بۆیان، کاتێك ئیبراهیم سەیری کردن گوێ بە خواردن نادەن. نەی دەناسین بۆیە ترسا لێیان فریشتەکان بە خۆشیەوە بە دەمیەوە چوونو مژدەی منداڵێکی چاكو خواناسیان دایە لە سارای خێزانی، سارەش لەوێدا بوو، زۆر بە لایەوە سەیر بوو، وەك لە پێشەوە لە سورەتی (هودو حجر)دا باسکرا. پاش ئەوەی کە مژدەیان دا بە ئیبراهیم پێیان گوت کە ئەوان هاتوون بۆ لەناودانو قڕکردنی هۆزی لوت. ئیبراهیمیش داوای لێ دەکردن، بەڵکو مۆڵەتیان بدەن، شایەد خوا مەزن ڕێیان نیشان دباتو پەشیمان ببنەوە، کاتێك کە گوتیان ئێمە هاتووین خەڵکی ئەو شارە قڕ بکەین ئیبراهیمیش گوتی: وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ

كَانَتْ مِنَ الْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: ئیبراهیم گوتی: لوت لەوێیە، فریشتەكان گوتیان: ئێمە چاكتر دەزانین كێی لێیە، خۆیی‌و ماڵ‌و منداڵی ڕزگار دەكەین جگە لە ژنەكەی كە ئەو لە بەجێ ماوانەو لەناو دەچێت چونكە ژنەكەی لوت وەك ئەوان خوانەناس بوو هاوكاری دەكردن لەسەر خوانەناسی. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّآ أَن جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالُوا۟ لَا تَخَفْ وَلَا تَحْزَنْ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهْلَكَ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ﴾ واتە: كاتێك نێردراوەكانمان هاتن بۆ لای لوت پێیان تێكچوو زۆر دڵتەنگ‌و ناڕەحەت بوو وتیان مەترسە خەم مەخۆ چونكە ئێمە بێگومان تۆو خێزانەكەت ڕزگار دەكەین جگە لە ژنەكەت كە ئەو لە تیاچوان دەبێت. واتە جگە لە ژنەكەت ڕزگار دەكرێن، چونكە ژنەكەت وەك ئەوان خوانەناس بووەو یارمەتی دەریشیان بووە لەو تاوان‌و خراپەكاریەدا كە پێی هەڵدەسان. فریشتەكان لە لای ئیبراهیم هەڵسان و چوونە لای لوت (سەلامی خوای لێ بێت) لە وێنەی كۆمەڵێك لاوی جوان‌و پێكەوتوودا، كاتێك كە لوت چاوی پێیان كەوت ﴿سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا﴾ واتە: لوت ناڕەحەت بوو خەم‌و خەفەت دایگرت لەبەر ئەوە ئەوانە میوانی ئەو بوون، ترسا لەوەی ئەگەر میوانداریان نەكات هۆزەكەی تەماحیان تێ بكەن، چونكە ئەو لەو كاتەدا نەیدەزانی ئەوانە فریشتەن‌و بۆ قڕكردنی ئەو خراپەكارانە هاتوون. بۆیە فریشتەكان گوتیان: مەترسەو خەم مەخۆ ئێمە تۆو خێزانەكەت ڕزگار دەكەین جگە لە ژنەكەت لەناو ئەو تاوانبارانەدا دەمێنێتەوە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهْلِ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾ بۆیە خوای گەورە بەڵایەكی لە ئاسمانەوە بەسەردا داباراندن، بە هۆی ئەو لادان‌و خراپەكاریەوە، جوبرەئیل شارەكانی لەبن دەرهێنان لەسەر زەمین‌وپاشان بەرزی كردەوە بەرەو ئاسمان‌و بەسەریاندا هەڵی گێڕایەوەو لە دوایشدا خودای مەزن بەردەبارانی كردن‌و شوێنەكەشی كردنە دەریایەكی پیس‌و بۆگەن‌و لە هەموو كەس سزایان سەختترە لە ڕۆژی قیامەتداو هەموو ناهەقی كارێكیش پاشەڕۆژی هەر ئاوایە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا بێگومان لەو شارە (وێرانكراوە)دا نیشانەو پەندێكی دیارمان بەجێ هێشت بۆ گەل‌و كۆمەڵێك كە ژیرن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئێوە (قورەیشیەكان) دەڕۆن بەسەر

[1] الصافات (١٣٧ـ١٣٨).

(شوێنەکان)یاندا بە بەیانیاندا (بە ڕۆژ)، وە بە شەودا ئایا ئیتر ژیر نابن. واتە: ئێوە بەیانیانو شەوان بە لایاندا دێنو دەچن چۆن لێی ورد نابنەوەو باش سەیری ناکەن.

﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾﴾

### باسی شوعەیبو (سەلامی خوای لێ بێت) هۆزەکەی

خوای گەورە باسی پێغەمبەرو بەندەی خۆی شوعەیب دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە هۆزەکەی ترساند لە خەڵکی مەدیەن، داوای لێکردن کە تەنها هەر خوا بپەرستنو شەریکی بۆ دانەنێنو لە تۆڵەو جەربەزەو تورەیی خودا بترسن لە ڕۆژی قیامەتدا وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾ واتە: بۆ خەڵکی مەیەنیش شوعەیبی برایانمان نارد وتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستنو بە هیواو ئومێدی ڕۆژی دوایی بن. ئیبنو جەریر دەڵێ: هەندێ گوتوویانە: ﴿وَٱرْجُوا۟ ٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەت بترسن.[1] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ﴾[2] واتە: بۆ کەسێك بە هیوای (پاداشتی) ڕۆژی دوایی یە. ﴿وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ شوعەیب پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێی دەگوتن کە بەدفەڕیو خراپەکاری لەناو زەویدا بڵاومەکەنەوەو دەستدرێژی مەکەنە سەر خەڵکی چونکە هۆزەکەی خەریکی تەرازووبازیو جەردەیی بوون ڕێیان لە خەڵکی دەگرتو ماڵو سامانیان بە تاڵانی دەبردن لەگەڵ ئەوەیشدا بێدین بوونو بڕوایان بە شوعەیبیش نەدەکرد کە خوا بۆی ڕەوانە کردبوون. خوای گەورە بە زەمین لەرزەیەکی گەورەو دەنگێکی بەرز لەناوی بردنو دڵی دەرهێنان، ئەو سزایەش لە ڕۆژێکی هەوردا بوو کە گیانی هەموویانی لەو ڕۆژەدا کێشا. بە ڕاستی لەو ڕۆژەدا ئەو جەزرەبەیە زۆر گەورە بوو. ئەم بەسەرهاتە بە کورتی لە سورەتی (الاعراف)و (هود)و (الشعراء)دا لە پێشەوە باسکرا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ﴾ واتە: بڕوایان بە شوعەیب نەکرد بە زەمین لەرزە لەناوی دان

---

[1] الطبري (٢٠/٣٤).

[2] الاحزاب (٢١).

لەناوماڵەکانی خۆیاندا. ﴿فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ﴾ قەتادە دەڵێ: مردن.[1] کەسانی تریش گوتوویانە: خزابوون بەسەر یەکتریدا.[2] واتە: مردبوون بەسەر یەکدا کەوتبوون.

﴿وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٤٠﴾﴾

**باسی لەناوچوون و قڕبوونی چەند گەلێك کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ﴾ خوای گەورە باسی ئەو گەلانە دەکات کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد چۆن قڕی کردن و تۆرمەشی نەهێشتن و هەر لەگەو بە جەزرەبەو بەڵایەك لەناوی بردن، عاد کە هۆزی پێغەمبەر هود بوون (سەلامی خوای لێ بێت) کە لە ناوچەیەك دەژیان ئەحقافی پێ دەگوترا، کە لە حەزەرەمەوتەوە (حضرموت) نزیك بوو لە وڵاتی یەمەن. سەمودیش کە هۆزی پێغەمبەر صالح بوو (سەلامی خوای لێ بێت) لە ناوچەیەك بوون پێی دەگوترا حیجر (الحجر) کە لە وادیل قوراوە (وادي القرى) نزیك بوون، عەرەبەکان شوێنەکانیان چاك دەزانین زۆر هاتوچۆیان دەکرد بە لایدا، هەروەها شەیتان کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندبوونەوە بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردن لە ڕێگای ڕاست لە کاتێکدا ئەوان توانای بیرکردنەوەیان هەبووو ژیر بوون، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ﴾ واتە: هەروەها قارون و فیرعەون و هامانیشمان لەناو برد سوێند بە خوا موسا بە ڕاستی هات بۆ ناویان بە چەند موعجیزەیەکەوە بەڵام ئەوان خۆیان بە گەورە زانی لە زەویدا نەشیانتوانی لە دەستمان دەرچن. قارون کە خاوەنی ئەو ماڵ و سامان و گشت کلیلە قورس و گرانە بوو، فیرعەونیش کە پاشان میسر بوو لە زەمانی موساداو هامانیش کە هەردووکیان قیبتی (القبط) بوون، کە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکەی نەبوو، خوای گەورە

---

[1] الطبري (٢٠/٣٤).
[2] الطبري (٢٠/٣٤).

دەفەرموویّت: ﴿فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ﴾ واتە: هەر کەسەو سزاکەی بە پێی تاوان‌و خراپەکەی وەرگرتووە ﴿فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا﴾ واتە: هەندیّ وەك عاد کە دەیان گوت: کیّ لە ئێمە بەهێزترو بە تواناترە؟ بایەکی زۆر توندو بەهێز لێی هەڵکردن، ئەوەندە توندو بەهێز بوو هەرچی بەردو زیخ‌و چەوی سەر زەمین بوو هەڵی دەگرت‌و دەیکرد بە سەرو چاویاندا، ئەو خەڵکەی هەڵدەگرت‌و دەیکرد بە ئاسماندا پاشان بەسەردا دەیدا بە زەویداو وردوخاشی دەکردو سەرەکەی لیّ دەبووەوەو لاشەکەی بەسەر زەمیندا دەکەوت‌و پان دەبووەوە. وەك ڕیشکی خورمای لە بن هەڵکێشراوی کەوتووی لیّ هاتبوو. ﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ﴾ واتە: وە هەندێکی تریان پیاهەڵشاخانێك‌و دەنگێکی گەورە لەناوی بردن. وەك سەمود کە داوای بەڵگەیان کرد لە پێغەمبەر صالح (سەلامی خوای لیّ بێت) ئەویش ئەو بەڵگە ئاشکای نیشان دان کە بەردێك دوولەت بوو وشترێکی لیّ هاتە دەرەوە لەسەر داوای خۆیان، کەچی هەر بڕوایان نەهێناو هەر بەردەوام بوون لەسەر خوانەناسی‌و خراپەکاری. هەڕەشەیان دەکرد لە سالح‌و شوێنکەوتووەکانی‌و دەیان گوت ئەگەر واز نەهێنن دەریان دەکەن‌و بەردەبارانیان دەکەن. دەنگێکی (مێڕەیەکی) توندیان بۆ هات‌و هەموو لە شوێنی خۆیاندا کپ بوونەوە. دەنگیان لیّ بڕا، ﴿وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ﴾ هەندێکیشیان چوون بە ناخی زەویدا. وەك قارون کە لە خۆی بایی بوو دەستی دایە لاساری‌و یاخی بوو سەرپێچی کرد لە فەرمانەکانی خودا، کەیف‌و فیزی دەکرد بەسەر خەڵکیدا، وای دەزانی کە ڕێزدارترە لە خەڵکی‌و منەتی بەسەر زەمیندا دەکرد، خوا خۆی‌و ماڵ‌و سامانی بە ناخی زەمیندا بردە خوارەوە. هەتا ڕۆژی قیامەت بەناو زەمیندا هەر بەرەوە خوار دەچێت. ﴿وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا﴾ وە هەندێکیشیانمان لەئاودا نوقم کردن، وەك فیرعەون‌و هامانی وەزیری‌و لەشکرەکەی هەموو خنکان لە بەرەبەیانێکداو هیچیان لیّ دەرنەچوو، ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ﴾ خوای گەورە کە خنکاندنی ناهەقی لیّ نەکردن. ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ واتە: چونکە خۆیان ناهەقیان لە خۆیان کرد خودایش بەهۆی ئەو بیّ دینی‌و ستەمکاریانەوە جەزرەبەی دان‌و سزاکەیان بەرامبەر بوو لەگەڵ ئەو تاناناەی کە کردیان.

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ
ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ
وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴿

## نموونەی خودایانی بت پەرستان وەك ماڵی كاكڵەمێشان (جاڵجاڵۆكە) وایە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەمە نموونەیەكە خوای گەورە دەیهێنێتەوە بۆ موشریكەكان كە غەیری خودا شتی تریان كردووە بە دۆستی خۆیانو دەیانپەرستنو بە تەمای یارمەتی دانو ڕزقو ڕۆزین لێیانو لە كاتی تەنگانەدا هانایان بۆ دەبەن، ئەو كارەی ئەوانە وەك دەستگرتن بە ماڵی جاڵجاڵۆكەوە وایە كە چەند لاوازو بێهێزە، چونكە ئەو شتانەی ئەو موشریكانە دەستی پێ‌وە دەگرن بە تەمای ئەوەن فریایان بكەون، هیچیان بە دەست نیە بەڵكو وەك ئەوە وایە كەسێك دەست بە خانووی تەنراوی جاڵجاڵۆكەوە بگرێت كە هیچ سودێكی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر ئەوەیان بزانیایە جگە لە خودا كەسی تریان نەدەكردە دۆستی خۆیانو نەیان دەپەرست. ئەمە بە پێچەوانەی موسڵمانی خاوەن باوەڕە كە دڵی لەگەڵ خودای مەزنەو كاری چاكیش دەكات لە سنووری شەرعداو دەستی گرتووە بە ئیسلامەوە كە هەرگیز پسانی بەسەردا نایەت، واتە لەناو ناچێت. لەبەر تواناو خۆگری خۆی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ پاشان خوای گەورە هەڕەشە لەو بتپەرستانە دەكات كە غەیری ئەو دەپەرستن كە خودا خۆی دەزانێ خەریكی چینو چی دەكەنو ئاگای لەوەیە كە ئەوان دەیكەنە شەریكی خوداو دەیپەرستن. بەو زووانە خوای گەورە تۆڵەیان لێ دەسێنێت. لە دوایدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾ واتە: لێی تێناگاتو لێی ورد نابێتەوە ئەوانە نەبێت كە زۆر زاناو شارەزان لەو بارەیەوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە عەمری كوڕی مورە (عمرو بن مُرّة) نەڕۆیشتوومو تێ نەپەڕیووم بە لای هیچ ئایەتێك لە ئایەتەكانی خودای گەورەدا لە قورئانداو لێی تێ نەگەیشتبمو ماناكەیم نەزانیبێت مەگین زۆر دلگرانی كردووم، لەبەر ئەوە كە بیستوومە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾[1].

﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ (٤٤) ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ (٤٥)﴾

[1] الدر المنثور (٦/٤٦٤)، ئەم فەرموودەیە لاوازە لەبەر بوونی ئەبو.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ﴾ خوای گەورە باسی دەسەڵاتو توانای مەزنی خۆی دەكات كە ئاسمانەكانو زەمینی دروست كردووە بە ڕاستی، بەبێ هودە دروستی نەكردووە، بەڵكو بۆ ئەوەی تاقیتان بكاتەوە، ﴿أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ﴾[1] واتە: بۆ ئەوەی پاداشت بدرێتەوە هەموو كەسێك بە گوێرەی ئەو كردەوەی كە دەیكات. وە دەفەرموویت: ﴿لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى﴾[2] واتە: تا سزای ئەوانە بدات كە خراپەیان كردووە بە پێی كردەوەكانیان وە پاداشتی ئەوانە بداتەوە كە چاكەیان كردووە بە چاكەتر (لەوەی كە كردوویانە).

وە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: بەڵگەیەكی ڕوونو ئاشكرایە لەسەر تەنهایی خوداو كە هەر خودا وەدیهێنەرو كاربەدەستوخودایە. غەیری ئەو كەس هیچی بە دەست نیە.

### فەرماندان بە بانگەوازو قورئان خوێندنو نوێژكردن

پاشان خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەرو (ﷺ) موسڵمانان كە قورئان بخوێننو خەڵكی بانگ بكەن بۆ سەر ئاینی خوداو فەرموویەتی: ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ﴾ بێگومان نوێژكردن دوو كاریگەری هەیە، یەكەم: وازهێنانە لە كاری ناشیرینو ناڕەوا، واتە: بەردەوام بوون لەسەر نوێژەكان وا دەكات لە مرۆڤ كە واز لە كاری خراپو ناشیرین بێنێت. دووهەم: یادی خودایە، كە لە هەموو شتێك مەزنترو چاكترە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: فلانەكەس شەونوێژ دەكات بەیانیش هەڵسا دزی دەكات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئەو شەونوێژە بەو زوانە وازی پێ دەهێنێ لەوەی كە تۆ دەیڵێی).[3] واتە: وازی پێ دەهێنێ لە دزی كردن. هەروەها نوێژكردن بریتیە لە یادی خواو پاڕانەوە لێی بە دڵێكی پاكو بەندایەتی بۆی، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُ﴾ واتە: یادی خوا مەزنترە لەوەی یەكەم ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ﴾ واتە: ئاگاداری هەموو كردارو گفتاریكتانە، ئەبول عالیە (ابو العالیة) لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ﴾ دەڵێ: ئەم ئایەتە سێ شتی (وەسفی) تێدایە هەر نوێژێك هەندێك لەم شتانەی تێدا نەبوو بە نوێژ دانانرێت: دڵپاكیو ترسان لە

---

[1] طه (١٥).

[2] النجم (٣١).

[3] أحمد (٢/٤٤٧)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

خوداو یادی خوا، چونکە دڵپاکی (الاخلاص) فەرمانی پێ دەکات بە چاکەکردنو ترسانیش لە خودا لە کاری خراپو ناشیرین دەیگێڕێتەوەو یادی خوداش، واتە: قورئان خوێندن: فەرمانی پێ دەکات بە چاکەو لە خراپ لای دەدات. کوڕی عەوفی ئەنساری (ابن عون الانصاری) دەڵێ: کاتێك کە تۆ لە نوێژ کردندا بووی تۆ لە ناو چاکە دای، ئەو نوێژە تۆی بەندکردووە لە کاری ناشیرینو ناڕەوا، ئەوەیشی کە تۆ پێوەی خەریکی یادی خودایەو لە هەموو شتێك مەزنترە.

﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾﴾

## وتووێژكردن لەگەڵ ئەهلی كتێب

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾ واتە: دەمەقاڵێو موجادەلەمەکەن لەگەڵ خاوەن کتێبە ئاسمانیەکاندا بە جوانترین شێوەنەبێت، واتە: هەر کەسێك دەیەوێت ئەهلی کتێب بەرەو ئاین ڕابکێشێتو ڕێیان نیشاندا با زۆر بە نەرمو نیانیو لەسەرخۆ قسەیان لەگەڵ بکات بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بێت لە کارەکەیدا، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِ﴾[1] واتە:(خەڵکی) بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانیو داناییو ئامۆژگاری چاكو شیرین. وە فەرموویەتی بە موساو هارون(سەلامی خوایان لێ بێت) کاتێك کە ڕەوانەی کردن بۆ لای فیرعەون: ﴿فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ﴾[2] واتە: جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرمو نیانی بەڵکو بیر بکاتەوە یان بترسێت(لە سزای خوا). بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ﴾ واتە: بێجگە لەوانەیان کە ستەمیان کرد، واتە: ئەوانەنەبێت کە دژایەتی هەق دەکەنو کوێرن لە ئاستی ڕێی ڕاستو فیز دەکەنو لاسارن ئەو کاتە وتووێژ دەگۆڕێت بۆ هەڕەشەو شەڕیان لەگەڵ دەکرێت بۆ ئەوەی واز بێننو بترسنو کۆڵ بدەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونەوە وە کتێبی(ئاسمانی)و

[1] النحل(١٢٥).

[2] طه(٤٤).

[3] الحديد(٢٥).

تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن(لەناو خۆیاندا) وە ئاسنمان دروست کرد کە ئەوەی هێزی بە تینی جەنگی هەیە تێیدایە و سودێکی زۆری هەیە بۆ خەڵکی وە تا خوا دەری دەخات چ کەسێك یارمەتی(ئایینی) خواو پێغەمبەرانی دەدات کە پەنهانیشە بێگومان خوا بەهێزو دەسەڵاتە. جابیر دەڵێت: فەرمانمان پێکراوە هەر کەسێك دژایەتی کتێبی خودا بکات بە شمشێر لێی بدەین، وە دەفەرموێت: ﴿وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ﴾ واتە: وە بڵێن باوەڕمان هێنا بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێمەو نێردراوەتە خوارەوە بۆ ئێوە. واتە: کاتێك قسەیەکیان گێڕایەوە نەماندەزانی ڕاستە یان درۆیە، بە درۆیان ناخەینەوە چونکە لەوانەیە ڕاست بێت، بڕواشیان پێ ناکەین، نەکا ڕاست نەبێت، بەڵام بڕوامان هەیە بەوەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێناون بە مەرجێك کە دەستکاری نەکرابێتو نەگۆڕدرابێت، ﴿وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ واتە: وە خوای ئێمەو خوای ئێوە یەکێکە وە ئێمە بۆ(ئەو خوا) گەردنکەچین. بوخاری(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەهلی کتێب خۆیانیان بە زمانی عیبری دەخوێندەوەو بە عەرەبی مانایان دەکرد بۆ موسڵمانەکان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(بڕوا مەکەن بە ئەهلی کتێبو بە درۆشیان مەخەنەوە بەڵکو بڵێن بڕوامان هەیە بە خواو بەوەی بۆمان ڕەوانەکراوە بەوەیشی بۆ ئێوە ڕەوانەکراوە خوای ئێمەو ئێوە یەك خودایەو ئێمە گەردنکەچین بۆی)، ئەم فەرموودەیە تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە[1]. هەروەها بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوەدەڵێت: چۆن شتێك لە ئەهلی کتێب دەپرسن کە ئەو کتێبەی بۆ ئێوە ڕەوانەکراوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) تازەترە، دەیخوێنێتەوە بە چاکیو هیچی تێکەڵاو نەبووە، وە بۆتان باسکراوە کە ئەهلی کتێب دەستکاری کتێبی خودایان کردووەو گۆڕیویانەو بە دەستی خۆیان ئەو کتێبەیان نووسیوەو وتوویانە: ئەوە لە لایەن خوداوە هاتووە، بۆ ئەوەی دەستهاتێکی کەمی بۆ خۆیان تیا وەدەست بێنن، ئاخۆ ئەو زانیاریەی کە بۆتان هاتووە داواتان لێ ناکات کە واز بێنن لە پرسیارکردن لێیان؟ بە خودا هەرگیز پیاوێکمان نەدی لەوان کە پرسیار بکات لە ئێوە لە بارەی ئەوەی کە بۆ ئێوە هاتووەتە خوارەوە.[2] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە کە بیستوویەتی لە موعاویە کە قسەی بۆ کۆمەڵێك لە قورەیشیەکان دەکرد لە شاری مەدینەو باسی کەعبی ئەحباری کرد وتی: هەرچەندە ئەمە ڕاستگۆترین کەسە لەو کەسانەی کە قسە دەگێڕنەوەو لە

[1] فتح الباري(٨/٢٠).

[2] البخاري(٧٦٧٣).

بارەی ئەهلی کتێبەوە لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئێمە قسەی نادروستی لێ دەبینین،[1] منیش دەڵێم: واتە درۆی لێ دەرئەکەوێت بەڵام ئەو بەئەنقەست درۆناکات، چونکە ئەو کە باسی شتێك بکات لەڕووی نووسراوێکەوە باسیدەکات و گومانی باش بەو نوسراوە لەکاتێکدا شتی هەڵبەستراوو درۆی تێدایە، لەبەر ئەوەی لە ناو ئەو گەلانەی ئەواندا کەسانێك نەبوون بە وردی ئەو دەقانە لەبەریکەن وەك ئەم ئوممەتە مەزنە. لەگەڵ ئەوەیشدا کەچەرخەکەش لە چەرخی پێغەمبەرەوە(ﷺ) نزیك بووە کەچی مەگەر خوای خۆی بزانێ چەندە فەرموودە هەڵبەستراوە لەناو ئەم ئوممەتەدا بە دەم پێغەمبەرەوە(ﷺ)، یەکێکیش لە بەخششەکانی خوا ئەوەیە خەڵکانی زۆریشی فێری زانست کردووە هەر کەسە و بەئەندازەی خۆی، سوپاس و ستایش بۆ خوای مەزن.

﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾﴾

### قورئان لە لایەن خواوە هاتووەتە خوارەوە بەڵگەش لەسەرئەمە

ئیبنو جەریر دەڵێت: خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ ئەی موحەممەد وەك چۆن کتێبمان ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکانی پێش تۆ، هەر بە هەمان شێوە ئەم کتێبەشمان بۆ تۆ ناردە خوارەوە.[2] ئەمەی کە وتوویەتی زۆر باشەو بۆگونجاوی و پەیوەندیی بوونی بەئایەتەکەوە زۆرە چاکە، ﴿فَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ واتە: جا ئەو کەسانەی کە کتێبمان پێداون(هەندێکیان) باوەڕ بەو(قورئانە) دێنن. واتە: ئەوانەی کە ئێمە کتێبمان بۆ ناردون وەریانگرتووەو بڕوایان پێ کردووەو زانا هۆشمەندەکانیان وەك عەبدوڵلای کوڕی سەلام و سەلمانی فارسی و هاوێنەیان بە چاکی خوێندوویانەتەوەو دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤْمِنُ بِهِۦ﴾ واتە: لەمانەش کەسانێك بڕوای پێ دێنێت. واتە: لە عەرەبەکانی قورەیش یان غەیری قورەیشی، ﴿يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ واتە: تەنها بێباوەڕان دانانێن بە ئایەتەکانی ئێمەدا. یانی: هیچ کەسێك حاشای لێ ناکات و بێباوەڕ نیە پێی مەگین یەکێك کە ڕاستی بە پڕوپوچ داپۆشێت و بە خەیاڵ بەری

---
[1] فتح الباري(١٣/٣٤٥).

[2] الطبري(٢٠/٥٠).

تیشكی خۆر بگرێت و هەیهو ئەوەشی بۆ بچێتەسەر پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ﴾ واتە: وە تۆ پێش ئەم قورئانە هیچ كتێبێكت نەخوێندووەتەوەو بە دەستت نەتنوسیوە. واتە: تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) ماوەیەكی زۆر لەناو هۆزەكەتدا ژیایت، نەتدەزانی كتێب بخوێنیتەوەو شارەزای نوسینیش نەبووی بەڵكو هەموو كەسێك لە هۆزەكەتو غەیری هۆزەكەت دەزانێت كە تۆ پیاوێكی نەخوێندەوار بووی، نە دەزانی بخوێنیتەوەو نە دەزانی بنووسی، وە لە كتێبە پێشووەكاندا هەر بەو شێوەیە وەسف كراوە وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾[1] واتە: ئەوانەی كە شوێن پێغەمبەرو(ﷺ) نێردراوی نەخوێندەوار دەكەون(كە لە لایەن پەروەردگارەوە هاتووە) ئەو كەسەی كە(نامەدارەكان) دەیبینن بە نووسراوی لایانە لە تەوراتو ئینجیلدا كە فەرمانیان پێدەكات بە چاكەو ڕێگریان لێ دەكات لە خراپە. هەر بەو شێوەیە پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت توانای نووسینی نەبووەو تەنها دێڕێك یان پیتێكی بە دەستی نەنووسیووە، بەڵكو نووسەری هەبووە لە خزمەتیدا نیگایان(الوحی) نووسیوەتەوە نامەكانیشیان نووسیووە بۆ هەرێمەكان، وە دەفەرمووێت: ﴿إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾ واتە: (ئەگەر وانەبوایە) ئەو كاتە ناڕاستەكان دەكەوتنە گومانەوە. واتە: خۆ ئەگەر وابوایە هەندێ نەفامو دڵ پیس گومانی وایان دەبرد. وە ئەڵێن: ئەمە لە كتێبەكانی پێشەوە فێربووە كە لە پێغەمبەرەكانی ترەوە بۆی ماوەتەوە، كە خۆیان چاك دەزانن نەخوێندەوار بووەو نازانێت بنووسێت كەچی ئەو قسەیەش دەكەن، ﴿وَقَالُوٓا۟ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ٱكْتَتَبَهَا فَهِىَ تُمْلَىٰ عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾[2] واتە: وە(بێباوەڕان) دەیانوت(ئەم قورئانە) بەسەرهاتو داستانی پێشووەكانە(موحەممەد(ﷺ)) داوای كردووە بۆی بنووسن ئینجا دەخوێنرێتەوە بەسەریدا بە بەیانیان و ئێوارانـدا. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[3] واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ زاتێك ناردوویەتیە خوارەوە كە هەموو نهێنی ئاسمانەكانو زەوی دەزانێت بە ڕاستی ئەو(خوا) لێبوردەی میهرەبانە. لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿بَلْ هُوَ

---

[1] الاعراف(١٥٧).

[2] الفرقان(٥).

[3] الفرقان(٦).

﴿ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ﴾ واتە: بەڵكو قورئان نیشانەكانی ئاشكران لە دڵو دەروونی كەسانێكدا كە زانستیان پێدراوە. واتە: ئەم قورئانە نیشانەكانی زۆر ئاشكرایەو بەڵگەیە لەسەر ڕاستی هاتنی لە باسكردنی ڕوداوەكانی پێش خۆیو فەرماندان بە چاكەو بەرگریكردن لە خراپە، زانایان دەیپارێزن خوای گەورە خوێندنەوەو لەبەركردنو ڕاڤەكردنو تەفسیرەكەی بۆ ئاسان كردوون وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾[1] واتە: بەدڵنیاییەوە ئێمە قورئانمان ئاسان كردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن جا ئایا پەندوەرگرتنێك هەیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێ: (هیچ پێغەمبەرێك نیە ئەوەندە موعجیزەی پێنەدرابێت كە بە ئەندازەی ئەوە خەڵكی بڕوای پێ بهێنن، بەڵام ئەوەی من پێم دراوە نیگایە خودا بۆی ناردووم داوام وایە كە من شوێنكەوتووەكانم لەوان زیاتر بێت).[2] وە لە فەرموودەكەی عەیازی كوڕی حیماردا لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە خوای مەزن دەفەرموێت:(من تۆ تاقیدەكەمەوە و خەڵكیش بە تۆتاقیدەكەمەوە، كتێبێكم بۆ تۆ ناردووە كە ئاو نایشۆرێتەوە و بە خەوتوویيو بێدرایش دەیخوێنیتەوە)[3]. یانی: ئەگەر ئەو شوێنەی كە تیایدا نووسراوە ئاو شۆردی ناكاتە ئەو شوێنە، چونكە لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە دەفەرموێت:(ئەگەر قورئان لەناو چەرمیشدا بووبێت ئاگرەكە نایسووتێنێت)[4]. چونكە لە سنگەكاندا پارێزراوەو لەسەر زمانەكان ئاسان كراوە، دڵەكانی داگیركردوە و لەڕووی مانای و دەربڕینیشەوە هەر موعجیزەیە لەبەر ئەمەیە لە كتێبە پێشووەكاندا لە وەسفی ئەم ئوممەتەدا هاتووە كە ئەڵێ: (ئینجیلەكانیان لەناو سنگو دڵیاندایە)، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ واتە: تەنها ستەمكاران داننانێن بە نیشانەكانی ئێمەدا. واتە: جگە لە ناهەقیكاران ئەوانەی بڕوای پێ ناكەنو بە كەم سەیری دەكەنو دژی دەوەستن هیچ كەس نیە بڕوای بە نیشانەكانی ئێمە نەبێت، یانی: ئەوانە نەبێت كە فیزیان زلەو ستەمكارن، دەزانن هەقەو خۆیانی لێ دەبوێرن. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ

---

[1] القمر(١٧).

[2] فتح الباري(٨/٦١٩).

[3] مسلم(٤/٢١٩٧).

[4] أحمد(٤/١٥٥)، فەرموودەیەكی حەسەنە یان لە حەسەن دەچێت. ماناكەی -خوا زاناترە- وەك (إبن أثير) لە (النهاية في غريب الحديث)دا ئەفەرموێ ئەوەیە: (قورئان تێكەڵ بە خوێن و گۆشتی هەر كەسێك ببێت ئەوە لەقیامەتدا ئاگر نایسوتێنێت)، هەندێكیش ئەڵێن: ئەوە ڕوداوێك بووە وەك موعجیزە لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕوویداوە و خەڵكی بینیویانە.(وەرگێڕ)

ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[1]

واته: بە ڕاستی ئەوانەی بڕیاری پەروەردگارت دەرچووە بۆیان بڕوا ناهێنن،(بڕوا ناهێنن) هەرچەند بۆیان بێت هەموو بەڵگەو نیشانەیەك هەتا (بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر دەبینن.

﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأَيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةً وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدًاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾﴾

## موشریكەكان داوای چەند نیشانەیەك دەكەن و وەڵامدانەوەیان

خوای مەزن باسی لاساری و داوای نابەجێی موشریكەكان دەكات كە دەیانەوێت وەك چۆن پێغەمبەر ساڵح(سەلامی خوای لێ بێت) وشترێكی بە نیشانە بۆ گەلەكەی هێنا پێغەمبەری خودایش موحەممەد(ﷺ) نیشانەیەكی وایان بۆ بێنێت، خودایش دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأَيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ واته: وە وتیان ئەوە بۆ چەند موعجیزەو بەڵگەیەك دانابەزێنرێت بۆ سەری لە لایەن پەروەردگاریەوە، بڵێ: موعجیزەكان تەنها لە لایەن خواوەیە، واته: ئەوان ئەڵێن بۆچی لە لایەن پەروەردگاریەوە چەند نیشانەیەكی تایبەتی بۆ نایەتەخوار؟ خوای مەزنیش دەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ) پێیان بڵێ: ئەو بڕیارە بە دەستی خوایە چونكە خۆی ئاگادارە ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستتان بگرتایە هەرچیتان داوابكردایە بۆی جێبەجێ دەكردن، ئەویش زۆر سوك و ئاسانە لە لای خودا، بەڵام ئەو دەزانێت كە ئێوە مەبەستتان هەر لاساری و تاقیكردنەوەیە بۆیە داواكانتان وەرناگرێت، وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأَيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةً فَظَلَمُواْ بِهَا﴾[2] واته: وە هیچ شتێك بەرگری ئێمەی نەكردووە كە ئەو موعجیزانە بنێرین جگە لەوەی كە پێشینەكان بە درۆیان دەزانی و بەخشیمان بە(هۆزی) سەمود ئەو حوشترەی كە(موعجیزەیەكی) ئاشكرابوو كەچی(باوەڕیان نەهێناو) ستەمیان لێكرد. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ واته: بە ڕاستی من تەنها ترسێنەرێكی ئاشكرام. واته: تەنها من ڕەوانەكراوم كە ئێوە ئاگادار بكەمەوە بتانترسێنم، ئەوەی لەسەر من بێ گەیاندنی پەیامی خودایە بە ئێوەو هیچی

---

[1] یونس(٩٦-٩٧).

[2] الاسراء(٥٩).

تـر ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾[1] واتـە: هـەر كەسـێك خـودا ڕێنموونی بكات تەنها ئەو كەسە ڕێنموونی كراوەو هەر كەسیش گومڕا بكات ئەوە هیچ پشتیوان‌و ڕێنیشاندەرێكت دەست ناكەوێت بۆی. وە فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ﴾[2] واتە: لەسەر تۆ نیە(ئەی موحەممەد(ﷺ)) ڕێنموونی‌و موسڵمانكردنی خەڵكی بەڵكو خوا هەر كەسێكی بوێت هیدایەتی دەدات. پاشان خوای گەورە ڕوونی دەكاتەوە كە چەندە نەزان‌و بێئاوەزن كە داوای نیشانەی لێ دەكەن، پێیان بسەلمێنێت ئەو پەیامەی بۆی هێناون ڕاستە، كە گەورەترین نیشانە ئەو قورئانەیە كە بۆی هێناون كە لاری‌و پڕوپوچی تێكەڵاو نابێت نە لەو كاتەداو نە لەوەبەدواش، گەورترین موعجیزەیە، ڕەوانبێژان هەموو بێ دەسەڵات‌و دەسەوسان وەستاون بەرامبەری ناتوانن (دە) سورەت وەك قورئان بێنن یان تەنها یەك سورەتیش وەك قورئان بێنن، پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوەیان بەس نیە كە ئەم كتێبە مەزنەمان بۆ تۆ ناردووەتە خوارەوە دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا كە هەواڵی پێشینەكانیانی تێدایەو باسی ئەو شتانەی كە لەمەودوا ڕوو دەدات كردووە، فەرمانی خودایشە لە نێوانیاندا، وە تۆش پیاوێكی نەخوێندەواری‌و نازانی بنووسی و بخوێنیتەوە تێكەڵاوی هیچ كەس لە ئەهلی كتێبت نەكردووە، هەرچی دەنگو باسی نوسراوە پێشووەكان هەیە بۆت هێناون‌و باسی ڕاستی‌و دروستی ئەو شتانەی كە تیایدا ناكۆك بوون ڕاستیكەت بۆ ڕوون كردوونەتەوەو هیچ گومانێكت تیا نەهێشتووەتەوە بۆیان، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُا۟ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾[3] واتە: ئایا ئەمە بەڵگەیەكی ڕوون نەبوو بۆیان(بۆ كافرانی قورەیش) كە زانایانی بەنی ئیسرائیل خۆیان ئەو(دەنگو باسی قورئان)ە دەزانن. وە فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ﴾[4] واتە:(بێباوەڕان) وتیان(ئەگەر ڕاستە پێغەمبەرە) دەی بۆ بۆمان ناهێنێت بەڵگەو موعجیزەیەك لە لایەن پەروەردگاریەوە ئایا ئەوان بەڵگەی ئاشكرایان بۆ نەهاتووە كە لە پەڕاوە پێشووەكاندا هەبوو(وەك تەورات‌و ئینجیل). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ پێغەمبەرێك

[1] الكهف(١٧).

[2] البقرة(٢٧٢).

[3] الشعراء(١٩٧).

[4] طه(١٣٣).

نەبووە پێغەمبەرەكان چەند موعجیزەیەكی پێنەدرابێت كەبەهۆیەوە خەڵكی بڕوایان پێ هێنابێت، بەڵام ئەوەی من پێمدراوە نیگایەكە لە لایەن خوداوە بۆم ڕەوانەكراوە، ئومێد ئەكەم لە ڕۆژی قیامەتدا من شوێنكەوتووانم لەوان زیاتر بێت).[1] بوخاریو موسلیمیش هێناویانە.[2] بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: لەم قورئانەدا بەزەییو دلۆڤانی خودا هەیە بۆ خاوەن باوەڕان كە ڕاستی بۆ ڕوون كردوونەتەوەو پڕوپوچی لێ دوورخستوونەتەوە، وە باسی ئەو ڕووداوو سزاو جەزرەبانەش كە تووشی ئەو خوانەناسو ستەمكارانە بووە دەكات بۆیان تا پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا﴾ واتە: بڵێ خوا بەسە بۆ شایەتیدان لە نێوان منو ئێوەدا. واتە: خودا چاكتر دەزانێت كە ئێوە چەند درۆو تۆمەت هەڵبەسنو ئاگاداری ئەوەشە كە من دەڵێم ئەو ناردوومی خۆ ئەگەر درۆم بە دەم خواوە بكردایە، تۆڵەی لێ دەسەندم، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ﴾[3] واتە: ئەگەر(موحەممەد(ﷺ)) بە دەم ئێمەوە هەندێ وتەی هەڵببەستایە، بێگومان ئێمە بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند، لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی، وە كەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێ بكات. بەڵكو من هەرچیم وتووە پێتان لە لایەن خوداوە ڕاستم كردووە، بۆیە یارمەتی داوم بەو موعجیزە ڕوونو ئاشكرانە، ﴿يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: ئەوەی لە ئاسمانەكانو زەویدایە دەیزانێت. واتە: هیچ شتێكی لێ ون نابێت، ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ واتە: وە كەسانێك كە باوەڕیان هێناوە بە بەتاڵو بێباوەڕبوون بە خوا تەنها ئەوانەن زەرەرمەندان. یانی: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا تۆڵەیان لێ دەسەنێت لەسەر ئەو كردارانەی كە كردوویانە لە بڕوانەكردن بە هەقو شوێنكەوتنی پڕوپوچ، باوەڕیان نەدەهێنا بە پێغەمبەرەكانی خودا(سەلامی خوایان لێ بێت) لەگەڵ نیشاندانی ئەو هەموو بەڵگەیەدا لەسەر ڕاستی هاتنیان، كەچی بڕوایان دەكرد بەو ستەمكارو بتانە بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەكیان بە دەستەوە بێت، بێگومان خودا بەو زووانە تۆڵەیان لێ دەسێنێت لەسەر ئەو كردارانەیان، بە ڕاستی خودا لە كارزانو زانایە.

---

[1] احمد(٢/٣٢١)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري(٨/٦١٩)، مسلم(١/١٣٤).

[3] الحاقة(٤٤ـ٤٧).

﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٥﴾﴾

## موشریکەکان داوا دەکەن کە زوو بەڵایان بۆ بێت

خوای گەورە باسی نەفامیو تێنەگەیشتوویی بتپەرستان دەکات کە چەندە پەلەیانە بەڵایان بەسەربێتو خودا سزایان بدات وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1] واتە: (بیربکەرەوە) کاتێك(کە بێباوەڕەکان) دەیانوت ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزای سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە. وە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَوْلَا أَجَلٌ مُّسَمًّى لَّجَاءَهُمُ الْعَذَابُ﴾ واتە: بە پەلە داوای سزات لێ دەکەن ئەگەر ماوەی دیاریکراو نەبووایە بێگومان سزاکەیان بۆ دەهات. واتە ئەگەر خودا بڕیاری سزای ئەوانی دوا نەخستایە بۆ ڕۆژی قیامەت بەڵاو ئازاری زۆر زوو بۆ دەناردن وەك چۆن خۆیان بە پەلە داوایان دەکرد، ﴿وَلَيَأْتِيَنَّهُم بَغْتَةً﴾ واتە: لە پڕێکدا تووشی سزا دەهاتن، ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتە: ئەوان هەر ئاگاشیان لەخۆ نەدەبوو، ﴿يَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ﴾ واتە: زۆر پەلەیانەو داوات لێ دەکەن کە بەڵایان بۆ بێت کە بە ڕاستی دۆزەخ دەوری کافرانی داوە. گومانی تێدا نیە ئەو سزایەیان هەر تووش دێت لێی دەرباز نابن، پاشان فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَغْشَاهُمُ الْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ﴾ واتە: لە ڕۆژێکدا سزا دایان دەپۆشێت لەلای سەریانەوەو لە ژێر پێیانەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾[2] واتە: ئەوانەی لە دۆزەخدا فەرشو ڕاخەریان(لە ئاگرە) وە لە لای سەورشیانەوە لێفەو داپۆشەریان(لە ئاگرە). وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ النَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾[3] واتە: بۆ ئەوان هەیە لە لای سەریانەوە چەند تەبەقێك(وەك هەوری ڕەش) لە ئاگرو لە ژێریشیانەوە چەند تەبەقێك هەیە. وە لە

---

[1] الانفال(٣٢).

[2] الاعراف(٤١).

[3] الزمر(١٦).

ئایـەتێکی تـردا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿لَوْ يَعْلَمُ الَّذِينَ كَفَرُوا حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ النَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ﴾[1] واتـە: ئەگـەر ئەوانـەی کـە کـافرن بیانزانیایـە(چ سـزایەکی سـەخت لەبەردەمیاندایە) کاتێك ناتوانن دووری بخەنەوە بڵێسەی ئاگر لە دەم‌و چاوو پشتیان. ئەو ئاگرە لە هـەموو لاوە دایاندەپۆشێت، ئەمەش ئەوپەڕی سزادانە لە ڕووی فیزیاییەوە، ﴿وَيَقُولُ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: وە(خوا) دەفەرموێت: بچەژن تۆڵەی ئەو کردەوانەی کە لە دنیا دەتانکرد. واتە: هەڕەشەو ترساندن‌و سوکایەتی پێکردنە پێیان، جگە لە سزای بەدەنی سزای دەروونیش دەچێژن، وەك ئەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ (٤٨) إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾[2] واتە: ئەو ڕۆژەی کە لە ئاگری دۆزەخدا بەسەر ڕووخساریان ڕادەکێشرێن(پێیان دەڵێن) بچەژن ئازاری دۆزەخ، بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروست کردووە. وە دەفـەرموێت: ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا (١٣) هَٰذِهِ النَّارُ الَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ (١٤) أَفَسِحْرٌ هَٰذَا أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ (١٥) اصْلَوْهَا فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[3] واتە: ڕۆژێك پاڵیان پێوە دەنرێت بەرەو ئاگری دۆزەخ چۆن پاڵپێوەنانێك،(پێیان دەوترێت) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دەزانی، ئایا ئەم ئاگرە جادووە یان ئێوە نابینن، بچنە ناویەوە ئینجا ئارام بگرن یان نەیگرن یەکسانە بۆتان بێگومان هەر تۆڵەی ئەو کردەوانەی دەتانکرد لێتان دەسەنرێتەوە.

﴿يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ (٥٦) كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ (٥٧) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ (٥٨) الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٥٩) وَكَأَيِّن مِّن دَابَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا اللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٦٠)﴾

### ئاماژە بۆ کۆچکردن‌و بەڵێندان بە بژێوی و پاداشتی چاك

ئەمە فـەرمانی خوایە بۆ بەنـدە خـاوەن باوەڕەکـانی کـە کـۆچ بکـەن لـەو وڵاتانـەی کـە نـاتوانن خواپەرستی تێدا بکەن بۆ ئەو وڵاتانەی کە ڕێگریان لێ ناکەن‌و دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان دینداری‌و

---

[1] الانبیاء(٣٩).

[2] القمر(٤٨_٤٩).

[3] الطور(١٣_١٦).

خواپەرستی خۆیان بکەن تێیدا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ﴾ واتە: ئەی ئەو بەندانەم کە باوەڕتان هێناوە بێگومان زەوی من پان و فراوانە کەواتە هەر من بپەرستن. بۆیە کاتێك ئەو موسڵمانانەی تەنگیان پێ هەڵچنراو زۆریان پێگەیی لە مەککەدا کۆچیان کرد بۆ وڵاتی حەبەشە هەتا خۆیان و ئایینەکەیان بپارێزن، ڕێیان لە چاکترین شوێن کەوت، لە ژێرسایەی ئەصحەمەی نەجاشیدا کە پاشای حەبەشە بووە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێشوازی لێکردن و یارمەتی دان و پشتگیری لێکردن و بە ئازادی خواپەرستی خۆیان دەکرد لە وڵاتی حەبەشەدا. پاشان دوای ئەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە لە مەککە مابوونەوە کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینەی پیرۆز(یثرب). پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴾ واتە: لە هەر کوێیەك بن مەرگ یەخەتان دەگرێت، کەواتە هەمیشە لە خواپەرستیدا بن گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا بن، هەر ئەوە سودبەخشە بۆ ئێوە، چونکە مردن هەر دێت و ڕزگاربوون نیە لە دەستی، ئاکامەکەی هەر گەڕانەوەیە بۆ لای خودا، هەرکەسێك گوێبیستی فەرمانەکانی خودا بووبێت باشترین و چاکترین پاداشتی دەداتەوە، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ واتە: وە کەسانێك کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە سوێند بە خوا لە کۆشکە بەرزەکانی بەهەشتدا نیشتەجێیان دەکەین کە ڕووبارەکان بە ژێریدا دێن و دەچن. واتە دایاندەنێین لە شوێنێکی زۆر بەرزدا لە بەهەشتدا جۆبار بەبەریاندا دەڕوات هەریەکەو بە ڕەنگێك لە ئاوو بادەو شیرو هەنگوین بە ئارەزووی خۆیان بۆ هەر لایەك بیانەوێت دەیبەن و دەیگێڕن، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ واتە: دەمێننەوە تێیداو هەرگیز لێی دەرناچن، ﴿نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ واتە: ئای چەند چاکە پاداشتی چاکەکاران. ﴿ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾ واتە: ئەوانەی دانیان بەخۆیاندا گرت. واتە ئەوانەی خۆڕاگر بوون لەسەر ئاینەکەیان لەبەر ڕەزامەندی خوا کۆچیان کردو خۆیان نەدا بە دەست دوژمنەوەو خزم و کەس و کاریان بەجێهێشت لەبەر خاتری خواو بە تەمای پاداشتی ئەو بوون لە ڕۆژی قیامەت. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو مەعاویەی ئەشعەریەوە کە ئەبو مالیکی ئەشعەری بۆی باس کردووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆی گێڕاوەتەوە کە لەناو بەهەشتدا ژوورگەلێك هەیە لە دەرەوەی ناوەوەی دەبینرێت وە لە ناوەوەی دەرەوەی دەبینرێت، خوای مەزن ئامادەی کردووە بۆ ئەو کەسانەی خواردنیان بەخشیووەو قسە جوان بوو،

نوێژو ڕۆژوگربوون و شەو هەڵساون بۆ عیبادەت کردن کاتێك کە خەڵکی لەخەودابوون[1]. ﴿وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ واتە: تەنها پشتیان بە پەروەردگاریان ئەبەستن. لە هەموو کاتێکی ژیانیدا خۆیان بە خوا دەسپێرن بۆ کاری دونیاو دینیان، پاشان خوای مەزن ئاگاداریان دەکاتەوە کە بژێوی پەیوەندی نیە بە شوێنێکەوەو پارچە زەویەکەوە، بەڵکو خودا بژێوی هەموو خەڵکی داوەو دیاری کردووە بۆیان لە هەموو کاتێکداو لە هەر شوێنێك بن، بەڵکو بژێوی کۆچەریان کاتێك کۆچیان کرد فراوانترو چاکتر بوو، پاش ماوەیەك بوونە سەرۆکی وڵاتان لە زۆر شوێن و ناوچەدا. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا﴾ واتە: ئەو گیانەوەرانە زۆرن کە ناتوانن ڕۆزی بۆ خۆیان هەڵگرن و پاشەکەوتی بکەن هەتا ڕۆژێکی تر سوودی لێ وەرگرن، ﴿ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡ﴾ واتە: خوای گەورە زۆریان بۆ دابین دەکات و ڕۆزی دەنێرێت بە پێی پێویست بۆ هەموو دروستکراوەکانی لە بچووکترین زیندەوەرەوە لەسەر زەمیندا هەتا باڵندە لە ئاسمانداو ماسی لە دەریادا هیچی بێ بەش ناکات. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[2] واتە: هیچ گیانەوەرێك نیە لە زەویدا مەگەر لەسەر خوایە ڕزق و ڕۆزیەکەی و(خوا) دەزانێت شوێنی مانەوەی و شوێنی لێ دەرچوونی هەمووی نووسراوە لە کتێبی ڕوونکەرەوە(لوح المحفوظ)دایە. وە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ واتە: وە هەر ئەوە بیسەری زانا. واتە ئەو خودایە بیسەری قسەی بەندەکانیەتی و ئاگاداری هەڵسوکەوتیانە.

﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٣﴾﴾

**بەڵگەی یەکخوا پەرستی**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾ واتە: سوێند بە خوا ئەگەر پرسیار لەو بێباوەڕانە بکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووەو ڕایهێناوە؟ بێگومان دەڵێن خوا، دەی کەواتە چۆن لە پەرستنی لادراون. واتە خوای

[1] الطبراني(٣/٣٠١)، فەرموودەیەکی باشە(جید).

[2] هود(٦).

مەزن دەفەرموویت کە هیچ پەرستراویك نیە تەنها ئەو نەبێت، چونکە ئەو موشریکانەی کە لەگەڵ خوادا شتی تر دەپەرستن، دانی پێدا دەنێن کە خودا خۆی ئاسمانەکانو زەمینو خۆرو مانگی دروست کردووەو خۆرو مانگیشی ڕامکردووە، هەر ئەویش ڕۆزیدەرو وەدیهێنەری بەندەکانیەتی ماوەی ژیانیشی لە دنیادا بۆ دیاری کردوون هەر کەسەو بە شێوەیەك، یەکێك دەوڵەمەندو یەکێك هەژارو خۆی باش دەزانێت هەر کەسێك چی بۆ دەشێتو چاکە بۆی. وە دەفەرموویت: ﴿ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾ واتە: خوا ڕۆزی فراوان دەکات بۆ هەر کەس لە بەندەکانی کە بیەوێت یان کەمی دەکات. واتە خودا مەیلی خۆیەتی دەزانێت کێ شایەنی دەوڵەمەندیەو کێش شایەنی هەژاریە، فەرموویەتی کە هەر خۆی وەدیهێنەری هەموو شتێکەو خۆشی کاروباریان بەڕێوە دەبات، کەواتە بۆچی کەسی تری لەگەڵ دەپەرستن؟ وە بۆچی پشت بە غەیری ئەو دەبەستن؟ چۆن هەر خۆی وەیدیهێنەرە، دەی با لە پەرستنیشدا هەر ئەو بپەرستن. ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: وە ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیت کێ لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت ئەنجا بەو بارانە زەوی مردووی زیندووکردەوە بێگومان دەڵێن خوا(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ هەموو سوپاس هەر بۆ خوایە بەڵام زۆربەیان ژیریان بەکار ناهێنن. زۆرجار خوای مەزن تەنهایی خۆی دەسەلمێنێت لە پەرستندا بەوەی کە دان دەنرێت بە تەنیاییدا لە وەدیهێناندا چونکە بتپەرستانو موشریکەکان دان دەنێن بەوەدا کە خودا وەدیهێنەری هەموو شتێکە وەك لە پاڕانەویاندا دەڵێن:(لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ، إلاّ شَرِيكاً هو لك، تملكهُ وما مَلَك).

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ٦٥ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ وَلِيَتَمَتَّعُواْۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ٦٦﴾

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞ﴾ واتە: وە ژیانی ئەم دنیایە تەنها ڕابواردنێکی بێ هودەو یاری مندالانە. خوای مەزن باسی بێنرخیو کەم ئەرزشی دنیا دەکات کە دەڕواتو کۆتایی دێت، هەرچی تیایەتی کاڵتەو کەپەو نامێنێت، ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُ﴾ واتە: ژیانی بەختەوەریو ڕاستەقینە لەو دونیایە کە بەردەوامەو هەرگیز کۆتایی نایەتو تاهەتایە هەر دەمێنێتو لەناو ناچێت، دەفەرموویت: ﴿لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: ئەگەر بزانن و گرنگی بدەن بەوەی کە هەر دەمێنێت بەسەر ئەوەدا لەناو دەچێت، پاشان خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات

کاتێك کە تووشی ناڕەحەتیەك دێنو هیچ پەنایەکیان نامێنێت زۆر بە دڵپاکی لە خودا دەپاڕێنەوە تەنها هەر ئەو دەپەرستنو هاوەڵی بۆ دانانێن، خۆزگە هەموو کاتێك هەر وابوونایە، وە دەفەرموویت: ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ ﴾ واتە: ئەنجا کاتێك ئەو بێباوەڕانە سواری کەشتی دەبن تەنها هاوار لە خوا دەکەن بە دڵسۆزیو گەردنکەچییەوە. ئەم ئایەتە وەك ئەوئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّا إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ﴾[1] واتە: وە کاتێك لە دەریادا تووشی بەڵاو زیان بێن هەموو ئەو(پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن ون دەبن بێجگە لە خوا کەچی کاتێك کە(خوا) ڕزگارتان دەکاتو دەگەنە وشکانی ڕوو وەردەگێڕن. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ واتە: کەچی کاتێك خوا ڕزگاریان دەکاتو دەگەنە وشکانی کتوپڕ ئەوان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لِيَكْفُرُوا بِمَا آتَيْنَاهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا﴾ واتە: با دان نەنێن بەوەی ئێمە پێمان دانو با بەهرەو لەزەت ببەن لە ژیان. ئەو (لام)ە لە لای زۆرینەی زانایانی زمانی عەرەبیو زانایانی تەفسیرو عیلمی ئوسول پێی ئەڵێن لامی عاقیبەت چونکە خوانەناسان مەبەستیان ئەوە نیە، گومانیشی تێدا نیە بە لای ئەوانەوە ئەوشتە هەر وایە بەڵام لەلای خوداو بە پێی بڕیارو فەرمانی خودا شتەکە وا دەردەچێت، بۆیە ئەولامە ئەبێ لامی تەعلیل بێت وەك لە پێشەوە ئەوەمان ڕوون کردووەتەوە لەو ئایەتەدا کە دەفەرموویت: ﴿لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا﴾[2] واتە: بۆ ئەوەی ببێت بە دوژمنو هۆی خەفەت بۆیان. وە پاشان دەفەرموویت: ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: جا لەمەولا دەزانن(ئەنجامی ئەو کردەوە خراپانەیان چی دەبێت).

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾
وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾
وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾

## عیبرەت وەرگرتن و دانانان بەوەدا کە مەککە کراوە بە شوێنێکی هێمن

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا آمِنًا وَيُتَخَطَّفُ النَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ﴾ واتە: ئایا نەیانزانیووەو سەرەنجیان نەداوە کە ئێمە مەککەمان کردووەتە جێگایەکی ڕێزگیراوی بێ ترسو بیم لە

---

[1] الاسراء(٦٧).

[2] القصص(٨).

کاتێکدا لە دەوروبەری ئەوان خەڵك دەفڕێنرێت. خوای گەورە منەت دەکات بەسەر قورەیشیەکاندا کە لە مەککەدا نیشتەجێی کردوون و کردوویەتی بە شوێنی هەموو خەڵکی ج دانیشتوو بێت یان کۆچەری، هەر کەسێك چووە ناوی پارێزراوە، ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾[1] واتە: وە هەر کەس چوویێتە ئەو شوێنە بێ ترس بووە(لە زیان و ئازاردان). بەڵام عەرەبەکانی تر بە دەوریدا یەکتر تالان دەکەن و دەکوژن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ۝١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ۝٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ۝٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ﴾[2] واتە:(لەشکری ئەبرەهەی لەناو برد) لەبەر هۆگری قورەیش، هۆگریان بە هاتوچۆی زستان و هاوینانەوە(تا لێیان تێك نەچێت)، دەبا خاوەنی ئەو خانە(کەعبە)یە بپەرستن، ئەو زاتەی کە لە برسێتیدا(ڕزگاری کردن و) خواردەمەنی بۆ ناردن و لە ترس و بیم(پاراستنی) و دڵنیایی کردن. وە دەفەرمووێت: ﴿أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ﴾ واتە: دەی ئایا باوەڕ بە بەتاڵ دێنن و دان نانێن بە بەهرە و چاکەکانی خودا. واتە شوکرانەبژێریەکەیان لەسەر ئەو بەهرە مەزنە ئەوەیە کە هاوەڵی بۆ قەرار دەدەن و لەگەڵیدا بت و شتی تر دەپەرستن، ﴿بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ﴾[3] واتە: لە جیاتی (سوپاسی) بەهرە و چاکەی خوا، بێباوەڕ و سپڵەبوون و گەلەکەیان بەرەو هەڵدێر برد. بڕوا ناهێنن بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە دەبوو هەر تەنها خودا بپەرسترایە بە دڵپاکی و هاوەڵیان بۆ دانەنایە، بڕوایان بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بهێنایە و زۆر بە ڕێزو قەدرەوە سەیریان بکردایە، کەچی بڕوایان پێی نەکرد و دژی وەستان و دەریان کرد لەناو خۆیاندا، بۆیە خوای گەورە ئەو بەهرانەی کە پێی دابوون لێی سەندنەوە و ئەوانەشیان کە لە بەردا بوون، کوژران و پاشان ئەو وڵاتە بوو بە جێی فەرمانڕەوایی خوداو پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان، خوای مەزن مەککەی ڕزگار کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لووتی ئەوانی دا بە خۆڵەوە و سەرشۆڕی کردن. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ﴾ واتە: کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستێ یا باوەڕ نەهێنێت بە ئایینی ڕاست کاتێك بۆی هات. واتە هیچ کەسێك سزای لەو کەسە توندتر نیە کە درۆ بە دەم خواوە هەڵبەستێ و بڵێ: نیگام بۆ هاتووە، بۆشی نەهاتبێت و کەسێك بڵێ منیش وێنەی ئەوەی خودا ناردوویەتی دەیهێنم. بەوشێوەیە هیچ کەسێك بە ئەندازەی ئەو کەسە سزای سەخت نیە کە هەقی بۆبێت و بڕوای پێ نەکات، چونکە

[1] ال عمران(٩٧).

[2] القريش(١ـ٤).

[3] ابراهيم(٢٨).

یەکەم درۆ هەڵبەسەو دووەمیش بڕوای پێی نیە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ﴾ واتە: ئایا بۆ بێدینان جێ لە جەهەنەم نەماوە؟. وە پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا﴾ واتە: کەسانێك کە لە پێناو ئێمەدا تێکۆشانیان کردووە. واتە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانیو ئەوانەی شوێن پێغەمبەر(ﷺ) دەکەون هەتا ڕۆژی قیامەت ﴿لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ واتە: ڕێگەی خۆمانی نیشان دەدەین لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەباسی هەمدانیەوە ئەبو ئەحمەد(کە خەڵکی عەکایە) لەم ئایەتەدا: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ دەڵێت: ئەوانەی کاردەکەن بەوەی دەیزانن، خودا ڕێیان نیشان دەدات بۆ ئەوەی کە نایزانن. ئەحمەدی کوڕی ئەبولحەواری دەڵێت: ئەم قسەیەم بۆ ئەبو سولەیمانی دارانی گێڕایەوە زۆر بە لایەوە سەیر بوو، فەرمووی: کەسێك خودا شتێکی چاکی فێرکرد بۆی نیە کاری پێ بکات هەتا لە پێشینەکانی نەبیستێ، ئەگەر بیستبووی لە پێشینەکان کاری پێ بکاتو سوپاسی خودا بکات لەسەر ئەوەی کەئەوەی ڕیوایەتکراوە ڕێك کەوتووە لەگەڵ ئەوەی کە خودا خستوویەتیە دڵی ئەم، ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: بێگومان خوا لەگەڵ چاکاندایە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە شەعبیەوە دەڵێت: عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: چاکەکردن ئەوە نیە کە تۆ چاکە بکەی لەگەڵ کەسێك کە چاکەی لەگەڵ کردووی، بەڵکو چاکەکردن ئەوەیە کە تۆ چاکە بکەی لەگەڵ کەسێك کە خراپەی لەگەڵ کردووی، والله أعلم.

## تەفسیری سورەتی(الروم)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الم ﴿١﴾ غُلِبَتِ الرُّومُ ﴿٢﴾ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضْعِ
سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن
يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ
ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴿٧﴾﴾

ئەم ئایەتانە کاتێك هاتنەخوار سابوری پاشای فارس دەستی گرت بەسەر وڵاتی شامو دەوروبەری دوورگەی عەرەبیو هەندێ لە وڵاتی ڕۆمیشدا، لەبەر ئەوە هیرەقل پاشای ڕۆم بە ناچاری پاشەکشەی

کردو چووە قوستەنتینیە و ماوەیەکی زۆر لەوێ فارسەکان دەوریان گرت، پاشان هیرەقل دەسەڵاتی پەیدا کردووە.

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) لەم ئایەتانەدا: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ﴾ دەڵێت: موشریکەکان حەزیان دەکرد فارسەکان سەرکەون بەسەر ڕۆمەکاندا چونکە ئەوانیش خاوەن بت بوون، موسڵمانەکانیش حەزیان دەکرد ڕۆمەکان سەرکەون بەسەر فارسەکاندا لەبەر ئەوەی کە ئەهلی کتێب بوون، ئەم قسەیە لە لای ئەبو بەکر باس کرا ئەبو بەکریش بۆ پێغەمبەری(ﷺ) باس کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئەوانە بەم نزیکانە سەردەکەونەوە) ئەبو بەکر ئەمەی بۆ موشکریکەکان گێڕایەوە، ئەوانیش وتیان: کەواتە ماوەیەك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دیاری بکە، ئەگەر ئێمە سەرکەوتین، فلانە شتو فلانە شتمان بدەنێ، خۆ ئەگەر ئێوەش سەرکەوتن ئێمە فلانە شتو فلانە شتتان دەدەینێ، پێنج ساڵی دانا بەلام ڕۆمەکان سەرنەکەوتن، ئەبو بەکر ئەمەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە فەرمووی: (نەکرا کەمترلە، وا دەزانم فەرمووی: دە ساڵت دابنایە) سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت:(البضع) لە دە کەمترە پاشان دوای ئەوە ڕۆمەکان سەرکەوتنەوە، ئەڵێ: ئەمە ئەوەیە کە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾[1] هەر بەم شێوەیە تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: چاكو غەریبە(حسن غريب).[2] فەرموودەیەکی تر: تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە نەیاری کوڕی موکرەمی ئەسلەمی دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ فارسەکان ڕۆمەکانیان شکاندبوو، موسڵمانەکان حەزیان دەکرد کە ڕۆمەکان سەرکەون بەسەر فارسەکاندا، چونکە ئەمانو ڕۆمەکان ئەهلی کتێب بوون، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: قورەیشیەکانیش حەزیاندەکرد فارسەکان سەرکەون، چونکە ئەوانو فارسەکان ئەهلی کتێب نەبوون، باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نەبوو، کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە،

---

[1] احمد(١/٢٧٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الأحوزي(٩/١٥)، النسائي في الكبرى(٦/٤٢٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

ئەبو بەكر بەناو مەككەدا دەگەڕاو هاواری دەكرد، ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ هەندێ لە قورەیشیەكان وتیان بە ئـەبو بـەكر، دەی با هەردوو لامـان چاوەڕوان بین، هاوەڵەكـەی ئێـوە ئـەڵێ ڕۆمـەكان سـەردەكەون بەسـەر فارسـەكاندا لەماوەی كەمتر لە دە ساڵدا، دەی گرەوئەكەیت لەسەر ئەوە لەگـەڵمان؟ ئـەبو بـەكر وتـی: باشـە. ئـەو گرەوكردنە پێش حەرامكردنی بووە. ئەبو بەكرو موشریكەكان گرەویان كردو دایاننـا. وتیـان: بـە ئـەبو بـەكریان وت: چـەندێ دانێین بـۆ ﴿بِضۡعِ سِنِينَ﴾ كەلـە سـێ ساڵەوە یـەتا نـۆ سـاڵ. با كـاتێكی مامناوەندی لە نێوانماندا دابنێین‌و لە سەری ڕێككەوین؟ ئەڵێت: شەش ساڵیان دانا، دەڵێت شەش ساڵ تێپەڕی پێش ئەوەی ڕۆمـەكان سـەركەون، موشـریكەكان ئـەوەی كـە ئـەبو بـەكر داینـابوو بۆگرەوەكـە هـەڵیان گـرت‌و بردیـان، لـە سـاڵی حەوتەمدا ڕۆمـەكان سـەركەوتن بەسـەر فارسـەكاندا. موسـڵمانەكان ڕەخنەیان لە ئەبو بەكر گرت لەسەر ئەو ماوەی كە داینابوو لەگەڵ موشریكەكان، دەڵێت: چونكە خوای مەزن فەرمووی: ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ ڕوبەكە دەڵێت: خـەڵكێكی زۆر لـەو كاتـەدا موسـڵمان بـوو، هـەر بەم شێوەیە تریمزیش ڕیوایەتی كردووەو دەڵێت: ئەم فەرموودەیە چاك‌و ڕاستە(حسن صحيح).[1]

## ڕۆمەكان كێن

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ واتـە: ڕۆم شـكێنران‌و ژێركـەوتن. ﴿فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ﴾ واتـە: لـە نـزمترین خاكیـان(لـە مەككـەوە یـان لـە وڵاتـی فارسەوە) وە ڕۆمەكان دوای تێكشكانیان لە داهـاتوودا سـەردەكەون(بەسـەر فارسـەكاندا)، ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ واتە: لە ماوەی چەند ساڵێكدا(لـە نێـوان ٣ تـا ٩ سـاڵ). بـا هەنـدێك لەسـەر وشـەكانی ئـەم ئایەتـە بـدوێین. خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ﴾ لـە پێشەوە لەسـەر ئـەم پیتـە پچڕپچڕانە قسەمان كرد لە پێشەكی سورەتی(البقـرة)، سـەبارەت بـەڕۆم بەڕەچـەڵەك دەچنەوە سـەر بنەماڵـەی عەیـصی كـوڕی ئیـسحاقی كـوڕی ئیـبراهیم(سـەلامی خوایـان لـێ بێـت) كـە ئـامۆزای بـەنی ئیسرائیلن پێیشیان ئەوترێت: بـەنو ئەصـفەر. كـە لەسـەر ئـاینی یۆنانیـەكان بـوون، یۆنانیـەكانیش لـە بنەماڵەی یافیسی كوڕی (نوح)ن(سەلامی خوای لێ بێت) كە ئامۆزای توركەكانن، كـە حـەوت ئەسـتێرە گەڕۆكەكانیان دەپەرست، پێیان دەوت: سەرسامەكان، بەرەو قوتبی باكوور نوێژیان دەكرد هەر ئەوانە بوون كە دیمەشقیان دروست كردو پەرستگای شارەكەشیان دروست كردو لە لای باكوریەوە میحرابیـان

[1] تحفة الأحوذي(٩/٥٢)، فەرموودەیەكی حەسەنە

بۆ دانا، ڕۆمەکان لەسەر ئەو ئاینەی خۆیان بوون تا پاش هاتنی مەسیحیش(سەلامی خوای لێ بێت) کە ماوەی سێ سەد ساڵێك ئەبوو، هەرکەس لەناویاندا حوکمی شامو جەزیرەی بکردایە پێیان دەوت: قەیسەر، یەکەمین کەس کە چووە سەر ئاینی مەسیحی ناوی قوستەنتینی کوڕی قستس بوو کە دایکی ناوی مەریەمی هەیلانی شەدەقانیە کە لەسەر زەمینی حەڕاندا بوو، دایکی پێش ئەوە چووبووە سەر ئاینی مەسیحیو داوای لێکرد بچێتە سەر ئەو ئایینە، قوستەنتین فەیلەسوفێك بوو لەناویانداو ئەوەبوو شوێنی دایکی کەوت، ئەڵێن بە(توقیە)[1] شوێنی کەوتووە، گاورەکان بە هۆی ئەوەوە لە دەوری یەك کۆبوونەوەو لە چەرخی ئەودا لەگەڵ عەبدولای کوڕی ئەریوسدا(أریوس) کەوتنە کێشەوە زۆر ناکۆك بوون هەریەکە بۆ خۆی قسەی دەکردو کەس گوێی بۆ کەس نەدەگرت هەتا دوایی لەناو خۆیاندا لەسەر سێ سەدو هەژدە قەشە ڕێکەوتن ئاینێکیان بۆ قوستەنتین دانا کە ناویان لێنا سپاردەی گەورە کە لە ڕاستیدا بریتی بوو لە خەیانەتە پڕوپوچەکە، هاتن چەند یاسایەکیان دانا و ناویان نا یاساکان و دەستیاندایە حەڵاڵ کردنو حەرام کردنو چەندەها شتی تر کەپێویستییان پێیبوو، ئاییني مەسیحیان گۆڕی(سەلامی خوای لێ بێت) بە ئارەزووی خۆیان زیادو کەمیان کرد. پاشان نوێژیان بەرەو ڕۆژهەلات دەکردو شەممەیان گۆڕی بە یەك شەممە، دەستیان دایە سەلیب پەرستنو بەرازیان حەڵاڵ کردو چەند جەژنێکیان داهێنا وەك جەژنی سەلیبو جەژنی قوداس و غەتاس زۆرێکی تر لە جەژنی یەك شەممەو نوێژی دووهەمی فوسح. پاشان پاپایان بۆ دانا کە گەورەیانە پاشان باتریاك و میتەران و ئوسقف و قسیس و شمسیس (البتاركة والمطارنة والاساقفة والقساقسة والشّمامسَة) پاشان ڕهبانییەتیان داهێنا. پاشاش کلێسەو پەرستگای بۆدروستکردن و بناغەی ئەو شارەی بە ناوی خۆیەوە دانا کەقوستەنتینییە یە، وتراوە: لە چەرخی ئەودا دوانزە هەزار کلێسە دروستکراوە (بەیتو لەحم)ی دروستکرد بە سێ میحرابەوە. ئەمانە پێیان دەوتن پاشاییەکان مەبەست بەو کەسانە بوو کە لەسەر ئاییني پاشابوون. دوای ئەمانە یەعقوبیەکان پەیدابوون، شوێنکەوتووی یەعقوبی ئیسکاف بوون، پاشان نەستوریەکان پەیدابوون کە هاوەڵەکانی نەستورا بوون. کە ئەمانەش لە چەند دەستەو تاقمێکی زۆر پێکهاتبوون، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەوانە بەش بەش بوون بە حەفتاو دوو بەش) مەبەست ئەوەیە ئەمانە بەردەوام بوون لەسەر نەصرانییەت. هەر کاتێك یەکێکیان بمردایە یەکێکی تریان دەبووە جێنشینی هەتا دوایین کەسیان کە هیرەقل بوو کە یەکێك بوو لە پیاوە هەرە زیرەکانیانو زۆر لێبڕاوو خۆنەویست بوو لە نێوان پاشاکاندا، زۆر لەسەرخۆو ڕاپەسەند بوو، زۆر خاوەن دەسەڵاتو جێی ڕێز بوو، کیسرای پاشای فارس دژایەتی دەکرد کە دەسەڵاتی هەبوو بەسەر

---

[1] (توقیة) یان (تقیة): یانی لەترساندا شوێنی دایکی کەوتووە تا دەستەڵاتەکەی لەدەست دەرنەچێت (وەرگێڕ).

عێراق و خۆراسان و ڕەیی و هەموو ناوچەکانی عەجەمدا، کە ناوی سابوری چەندشانە(ئەکتاف) بوو، کە وڵاتەکەی زۆر فراوانتر بوو لە وڵاتی قەیسەر، دەستەڵاتی عەجەم و گێلێتی فارسی لەچنگدابوو، هەمووشیان ئاگر پەرست بوون.

## چۆن قەیسەر سەرکەوت بەسەر کیسرادا

لە پێشەوە عیکریمە باسی کرد کە کیسرا بریکارەکانی لەگەڵ سوپاکەیدا نارد بۆ قەیسەرو شەڕی لەگەڵدا کرد، واش مەشهورە کە کیسرا خۆی پەلاماری قەیسەری داوەو سەرکەوتووە بەسەریداو شکاندوویەتی و وڵاتەکەی داگیرکردووە. هیچی بە دەستەوە نەهێشتووە شاری قوستەنتەنیە نەبێت، کە ماوەیەکی زۆر دەوری داوەو تەنگی پێ هەڵچنیوە. گاورەکان قەیسەریان زیاد لە ئەندازە ڕێز لێناوە، کیسرا نەیتوانی دەست بگرێت بەسەر ئەو شارەدا، بۆیشی نەدەکرا چونکە زۆر قایم دەوری گیرابوو، نیوەی ئەو شارە وشکایی و نیوەکەی تری لەسەر دەریا بوو، لە دەریاوە پێویستی و یارمەتیەکانی پێ دەگەیشت کاتێك کە ماوەکە درێژەی کێشا، قەیسەر بیری کردەوە کە فێڵێك بدۆزێتەوە وای بە چاك زانی داوا بکات لە کیسرا واز بێنێت لە داگیرکردنی وڵاتەکەی هەرچی بوویت لە ماڵ و سامان ئامادەیە بیداتێ، کیسرا داواکەی قەبوڵ کردو داوای ماڵ و سامانێکی وای کرد کە لە توانای هیچ کەسێکدا نەبوو لە دنیادا. لە ئاڵتون و زیوو قوماش و کەنیزەك و خزمەتکارو چەندەها شتی تر. قەیسەر داواکەی نەگێڕایەوەو واشی پێگەیاند کە هەموو ئەو شتانە ئامادە دەکات. زۆر چاك دەیزانی کە هەرچی هەیە کۆی بکاتەوە دەیەکی ئەوە ناکات کە کیسرا داوای کردووە بۆیە داوای لە کیسرا کرد کە ڕێی پێ بدات بڕوات بگەڕێ بە وڵاتەکەیدا هەتا ئەوەی کە داوای کردووە بۆی کۆبکاتەوە. کیسرا ڕێی پێدا. کاتێك قەیسەر ویستی لە شاری قوستەنتەنیە دەربچێت، خەڵکی وڵاتەکەی کۆکردەوەو پێی وتن: من بڕیارم داوە بە چەند سەربازێکەوە کە خۆم دیاریم کردووە لە سوپاکەمدا دەرچین بۆ کارێك، ئەگەر پێش ئەو ماوەیەی کە دیاری دەکەین گەڕامەوە، ئەوا من پاشای ئێوەم، خۆ ئەگەر نەگەڕامەوە پێش ئەو کاتە، ئارەزووی خۆتانە، ئەگەر ویستتان لەسەر بەڵێنی خۆتان بمێنن لەگەڵمدا، وە ئەگەر ڕازیش نەبوون یەکێکی تر بکەنە پاشای خۆتان، وتیان: هەتا تۆ زیندوو بی هەر تۆ پاشامانی، با دەساڵیش دیار نەبی، کاتێك لە قوستەنتەنیە دەرچوو سوپایەکی مامناوەندی لەگەڵ کەلوپەل و وڵاغێکی سواری زۆرەوە لەگەڵ خۆی برد، کیسرا خێوەتی بە دەوری قوستەنتەنیەدا هەڵدابوو چاوەڕوانی گەڕانەوەی قەیسەری دەکرد، قەیسەر زۆر بە پەلەو بەبێ دواکەوتن ڕۆیشت و نەوەستا هەتا گەیشتە وڵاتی فارس، کوشتارێکی زۆری کردو هەرچی شەڕی لەگەڵ دەکرد هەمووی یەك لە دوای یەك کوشتن و هەتا گەیشتە مەدائین(المدائن) کە پایتەختی وڵاتی کیسرا بوو، هەرچی تێدا بوو کوشتی و هەرچی ماڵ و سامانی هەبوو بردی و کەس و کارەکەشی بە دیل گرتن، بە ژن و ماڵ و منداڵەوە، سەری کوڕەکەشی تاشی و

سواری کەرێکی خۆی کردو هەرچی شتی بە نرخ بوو لەگەڵی باری کردو زۆر بە سوکیو سەرشۆڕییەوە ڕەوانەی کرد، پاشان نامەیەکی نووسی بۆ کیسرا وتی: ئەمە ئەو شتانەیە کە تۆ داوات کردو ها وەری گرە، کاتێك ئەم هەواڵ گەیشتە کیسرا ئەوەندە خەفەتی خوارد مەگەر هەر خوا بزانێت. زۆر تووڕە بوو زۆر بە توندی دەوری شارەکەی گرت بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵی دا کە داگیری بکات. هەرچەندی کرد نەیتوانی داگیری بکات. کاتێك کە بێ ئومێد بوو ڕۆیشت بۆئەوەی مەخازەی جەیحونی لێبگرێت کە هیچ ڕێگایەك نەبوو قەیسەر لێیەوە بگەڕێتەوە بۆ ناو شاری قوستەنتەنیە لەوێوە نەبێت. کاتێك قەیسەر بەوەی زانی، فێڵێکی وای بەکارهێنا کەس بەکاری نەهێنابوو، سەربازو کەسو کاری خۆیو ئەوەی لەگەڵی بوو ئامادەی کرد لەبەر دەرگای مەخازەدا خۆیو هەندێ لە سوپاکەی ڕۆیشتن فەرمانی دا چەند بارێك لە کاو پشقەڵی وشترو پەین بار بکەنو لەگەڵ خۆی بردی، نزیکەی ڕۆژێك لەناو ئاودا ڕۆیشتو پاشان فەرمانی دا ئەو بارانە بکەنە ناو ڕووبارەکە، کاتێك ئەو پەینو کایە تێپەڕی بە لای کیسرادا خۆیو سەربازەکانی وایانزانی کە قەیسەر دەیەوێت ڕەت بێتو بڕوات لەو شوێنەوە، سوپاکەی کیسرا سواربوونو دوای کەوتن فارسەکان مەخازەیان چۆڵکرد، قەیسەر خۆی گەیاندە ئەوێ فەرمانی دا هەڵسن بڕۆن، بە پەلە ڕۆیشتنو لە دەستی کیسراو سوپاکەی ڕزگاریان بوو، چوونەوە ناو قوستەنتەنیە. ئەو ڕۆژە بووە ڕۆژێکی زۆر گەورە لە لای گاورەکان. کیسراو سوپاکەی سەرگەردان مانەوەو نەیاندەزانی چی بکەن، ولاتی قەیسەریان دەست نەکەوتو ولاتی خۆشیان وێران بوو بە دەست ڕۆمەکانەوە. هەرچی ماڵو سامانو خێزانو کەسو کاریان هەیە بە دیل گیراو ڕۆمەکان بردیان.

ئەمە ڕووداوی سەرکەوتنەکەی ڕۆمەکان بوو بەسەر فارسەکاندا، ئەم ڕووداوە دوای نۆ ساڵ ڕوویدا پاش سەرکەوتنی فارسەکان بەسەر ڕۆمەکاندا، ئەم ڕووداوە ڕووی دا وەختێك کە ڕۆمەکان لە نێوان (ئەزەرعات)و (بوسرا)دا و ئەو سەرکەوتنەیان بەسەر فارسەکاندا دەست کەوت. وەك ئیبنو عەباسو عیکریمەو کەسانی تریش باسیان کردووە. کە لە ناوچەیەکی شامدایە بەرەو ولاتی حیجاز. موجاهید دەڵێت: ئەوشەڕە لە ولاتی جەزیرەدا بووە، چونکە نزیکترین شوێنە لە ولاتی فارسەوە، والله أعلم.

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُ﴾ واتە: هەموو کارێك کاری خودایە پێش ئەو شکانەو دوای ئەو شکانەش (قبلُ) و (بعدُ) مەبینن لەسەر زەممە چونکە ئیزافەکەیان لابراوەو ئیزافەش لابرێ مەبنی ئەبێت[1] ﴿وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەو ڕۆژە موسڵمانان دڵخۆش دەبن بە سەرکەوتنی قەیسەرو هاوەڵەکانی کە پاشای ڕۆمە بەسەر کیسراو

---

[1] یانی لەبناغەدا ڕاستەکەیان (من قبل هذه الغلبة و بعد هذه الغلبة) یان (من قبل كل شيء و من بعد كل شيء) وەك قورتوبی ئەفەرموێت. (وەرگێڕ)

ماوەڵەکانیدا لە فارسەکان کە مەجوسن، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئـەو سـەرکەوتنەی ڕۆمـەکان بەسـەر فارسەکاندا ڕێکەوتی هەمان ڕۆژ دەکات کە موسڵمانەکان سەرکەوتن بەسەر موشریکەکانی قورەیشدا لە ڕۆژی بەدردا وەك ئیبنو عەباسو سەوریو سودیو کەسانی تـریش وتوویانـە، وە لـەو فـەرموودەی کە ترمیزیو ئیبنو جەریرو ئەبی حاتـەمو بـەزار لـە ئـەبو سـەعیدەوە ڕیوایـەتیان کـردووە دەڵێـت: کاتێك جەنگی بەدر ڕوویدا، ئەو ڕۆژەش ڕۆمەکان سـەرکەوتن بەسـەر فارسـەکاندا، موسـڵمانەکان بـە لایانـەوە سـەیر بـوو زۆر پێـی دڵخـۆش بـوون، خـوای مـەزن ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾[1] بـە سەرخـستنی خـوا(بـۆ ڕۆمەکان) خوا هەر کەسی بوێت سەری دەخاتو هەر ئەو زاڵی میهرەبانە. ئیبنو ئەبی حاتـەم ڕیوایـەتی کـردووە لـە زوبـەیری کەلابیـەوە دەڵێـت: سـەرکەوتنی فارسـەکانم بینیـوە بەسـەر ڕۆمەکانـدا پاشـان سەرکەوتنی ڕۆمەکانم بینیوە بەسەر فارسەکاندا، پاشانیش سەرکەوتنی موسـڵمانەکانم بینیـوە بەسـەر فارسو ڕۆمەکاندا، هەموو ئەمانە لە ماوەی یانزە ساڵدا. خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَهُوَ الْعَزِيزُ﴾ (عزیز) واتە: لە سەرکەوتنو تۆڵەسەندنی دوژمنەکانیدا ﴿الرَّحِيمُ﴾ واتە: دلۆڤانیـشە بـۆ بەنـدە خـاوەن باوەڕەکـانی. پاشـان دەفـەرمووێت: ﴿وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ واتـە: ئـەوە بـەڵێنی خودایـە(کـە ڕۆمەکان سەربخات) خوایش پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات. یـانی: ئـەوەی کـە هـەواڵمان پێـدای ئـەی موحەممەد(ﷺ) کە ڕۆمەکان سەردەخەین بەسەر فارسەکاندا بـەڵێنی خوایەو ڕاستو هەقـە خـودا لـە بـەڵێنی خـۆی پەشـیمان نابێتـەوە دەبێـت هـەر بێـتو ڕووبـدات. چـونکە سـوننەتی خـودا وایـە ئـەو دەستەیەی کە لە هەقەوە زیاتر نـزیکترن سـەردەخاتو پاشـەڕۆژیش هـەر بـۆ ئەوانەیـە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتـە: زۆربنـەی خـەڵکی نـازانن کـە خـودا خـۆی کاربەدەسـتی ئـەم بوونەوەرەیـە، هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات بە پێی کارزانیو دادوەری خۆی. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ﴾ واتە: تەنها ڕواڵەتی ئەم ژیانی دنیا دەزانن بەڵام بێئاگـان لە ڕۆژی دوایی. واتە زۆرێك لە خەڵکی تەنها ئاگاداری ژیانی دنیاو ئیشو کـاری مـاڵ پەیـداکردن نـەبێت هیچی تر نازانن و لێی بێئاگان، زۆر وریاو لێهاتوون بۆ خۆ ژیاندنو سامان کۆکردنەوە، بەڵام نازانن چـی بەسوودە بۆ پاشەڕۆژیان لەو دنیادا وەك ئەو کەسـەی خەڵـەفابێتو ئاگـای لـە خـۆی نـەبێت نـەتوانێت بیریکاتـەوە. حەسـەنی بەسـری دەڵێـت: سـوێند بـە خـوا هـی وایـان هەیـە ئەوەنـدە لـە دنیـادا

[1] تحفة الأحوذي(٩/٥٠)، الطبري(٢٠/٧٣)، فەرموودەیەکی لاوازە.

چووەتەخوارەوە پەنجایی بە نینۆکی هەڵدەگێڕێتەوە دەزانێت چەند قورسە، کەچی نازانێت بە چاکی نوێژ بکات. ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا: ﴿ يَعْلَمُونَ ظَٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْءَاخِرَةِ هُمْ غَٰفِلُونَ ﴾ ئەڵێ واتە: خوانەناسان دەزانن چۆن دنیا ئاوەدان بکەنەوە، بەڵام لە کاروباری ئاییندا زۆر بێئاگان[1].

﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا۟ ٱلْأَرْضَ وَعَمَرُوهَآ أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ ﴾

**بەڵگەکانی یەکخواپەرستی(التوحيد)**

خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە بە خۆیاندا بچنەوەو بیر بکەنەوە لەو دروستکراوانە کە بە چاوی خۆیان دەیبینن کە هەموو بەڵگەن لەسەر بوونو تەنهایی ئەو کە هەر خودا شایەنی پەرستنەو هیچ کەسێك جگەلە ئەو شایەنی پەرستن نیەو هەرئەو پەروەرینی ئەوانیشو هەموو بوونەوەرە. ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ﴾ واتە: ئایا ئەوانە لە دەروونی خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە. ﴿ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ واتە: کە خوا ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە دروستی کردووە مەگەر بە ڕاستیو بۆ ماوەیەکی دیاریکراوە. یانی با بە خۆیاندا بچنەوەو بیر بکەنەوە لە وەدیهاتنی ئەم ئاسمانو زەمینەو ئەوەی کە لە نێوانیاندایە لەو دروستکراوە فرەجۆرو ڕەنگەو ڕەگەزە کە بە گاڵتە دروست نەکراوە بەڵکو بە ڕاستی وەدی هێناونو ماوەشی بۆ دیاری کردوون هەتا ڕۆژی قیامەت دێت، هەموو لەناودەچنو نامێنن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴾ واتە: بێگومان زۆرێك لە خەڵك باوەڕیان نیە بە خزمەت پەروەردگاریان بگەن(لە دواڕۆژدا). پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە لەوەی کە ئەو پێغەمبەرانەی کە ڕەوانەی کردووە بۆیان لە لایەن ئەوەوە ئەو پەیامەیان پێدراوەو پشتگیری کردوون بە چەندەها موعجیزەو نیشانەی ڕوونو ئاشکرا کە بوونەتە هۆی قڕکردنو لەناوچوونی ئەوانەی کە بڕوایان پێ نەکردوونو نەجات بوونی ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێناون. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى

[1] الطبري(٢٠/٧٦).

ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئاخۆ نەگەڕاون بەسەر ئەم زەمینەدا هەتا سەیر بکەن‌و بیربکەنەوەو عەقڵیان بخەنە کارو گوێ بگرن لە دەنگوباسی پێشینەکانی خۆیان. بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةً﴾ واتە: بۆ ئەوەی ببینن سەرەنجام ئەو(گەلانەی کافر بوون) لە پێش ئەمان چۆن بوون کە زۆر بەهێزتر بوون لە ئەمان(خەڵکی مەککە)، ﴿وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ﴾ واتە:وە زەویان کێڵا(بۆ کشتوکاڵ)و ئاوەدانیان کردەوە زیاتر لەمان‌و پێغەمبەرانیان بۆ هات بە موعجیزە ڕوونەکانەوە بۆیە خوا ستەمی لێ نەکردن(کە لە ناوی بردون). یانی: ئەی ئەو کەسانەی کە موحەممەدتان بۆ ڕەوانە کراوە چاك بزانن کە گەلە پێشووەکانی پێش ئێوە لە ئێوە زیاتر بە تواناو بەهێزبوون‌و سامان‌و ماڵ‌و منداڵیان لە ئێوە زیاتر بوو. دەیەکی ئەوان ئێوە دەسەڵاتتان پێ نەدراوەو ناشتوانن وەك ئەوان سەر زەمین ئاوەدان بکەنەوەو سودی لێ ببینن‌و لێی بحسێنەوە. کەچی لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵاتەدا بوویان کاتێك کە پێغەمبەرانیان بۆ ڕەوانەکرا زۆر دڵخۆش بوون بەوەی کە پێیان درابوو، شوێن پێغەمبەرەکان نەکەوتن، خوای گەورە بە هۆی تاوانەکانیانەوە لەناو دان‌و هەمووی قڕ کردن کەسێك نەبوو لە سزای خودا ڕزگاریان بکات. سامان‌و ماڵ‌و منداڵ فریایان نەکەوت‌و لە سزای خودا ڕزگاری نەکردن و بە ئەندازەی گەردیلەیەك سودی پێ نەگەیاندن، خوای مەزن ناهەقی پێ نەکردوون کە تووشی ئەو بەڵایەی کردن‌و جەزرەبەی دان، ﴿وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ﴾ واتە: خۆیان ئەو بەڵایان بەسەر خۆیان هێناو ناهەقییان بە خۆیان کرد، بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەکردو گاڵتەیان پێکرد، حاشایان لێ دەکرد دەستیان دابووە تاوانکاری. وە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ واتە: پاشان چارەنووسی ئەوانەی کە تاوان‌و خراپەیان کرد سەختترین سزایە لەبەر ئەوەی باوەڕیان نەهێنا بە ئایەتەکانی خواو هەمیشە گاڵتەیان پێ دەکرد. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[1] واتە: وە(کاتی هاتنی موعجیزەکان) دڵ‌و چاویان وەردەگێڕین‌و لا دەدەین(لە باوەڕهێنان) هەروەك لە سەرەتاوە بڕوایان بە قورئان نەهێناوە لێیان دەگەڕێین لەسەرکەشی خۆیاندا هەر سەرگەردان بن. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ

---

[1] الانعام(١١٠).

قُلُوبَهُمْ﴾[1] واتە: جا كاتێك لایاندا لە هەق خـواش دڵـی وەرگێـڕان. وە لـە ئایـەتێكی تـردا فـەرموویـەتی: ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ﴾[2] واتـە: ئینجـا ئەگـەر ئەوانـە ڕوویـان وەرگێـڕاو سەرپێچیان كرد ئەوە بزانەو دڵنیا بە خوا دەیەوێت بە هۆی هەندێ لـە تاوانەكانیانـەوە سـزایان بـداتو تووشـی زیانیـان بكـات. وە وتـراوە مانـای ئـەم ئایەتـە: ﴿ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ﴾ واتـە: ئاكامی خراپەكاری خۆیان بوو، چونكە باوەڕیان بە نیشانەكانی خوا نەكردو گاڵتەو گەپیان لێ دەهات، ئەمە بۆچوونی ئیبنو جەریرە لـە ئیبنـو عـەباسو هـەر وا دەردەكـەوێت كـە دەفـەرموێت: ﴿وَكَانُواْ بِهَا يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ والله أعلم.

﴿ٱللَّهُ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآئِ ٱلْءَاخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿١٦﴾﴾

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ واتـە: خـوا دروسـتكردنی ئـادەمی دەسـت پێدەكاتو لە پاش كردن دروستی دەكاتەوە. ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ واتە: پاشـانیش هـەر بـۆ لای ئـەوتان دێنینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەموو كەسێك پاداستی كردەوەی خۆی وەردەگرێت. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبْلِسُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ واتـە: ئـەو ڕۆژەی قیامـەت هەڵدەسـێت تاوانبـاران غەمبارو نائومێد دەبن. ئیبنو عەباس دەڵێت: تاوانبـاران بـێ ئومێد دەبـن. موجاهیـد دەڵێـت: تاوانبـاران ئابڕوویان دەچێت. وە لە ڕیوایەتێكدا هـاتووە(يُكْتَـبُ المُجرِمُـون) واتـە: تاوانبـاران دۆڕداماون[3]. ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمْ شُفَعَٰٓؤُاْ﴾ واتـە: بێگومـان لـە پەرسـتراوەكانیاندا تكاكارانێـك نیـە بـۆ ئـەوان، ﴿وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴾ واتە: وە ئەوان بێباوەڕ دەبن بە پەرستراوەكانیان(كە كردوونیـان بە هاوبەشی خودا). واتە ئەو شتانەی ئەوان بـە هـاوەڵی خودایان دەزانینو غـەیری خـوا دەیانپەرستنو سوژدەیان بۆ دەبردن، تكایان بۆ ناكەن، حاشایان لێ دەكەن، خەیانەتیان لێ كردوون لە كاتێكدا كە زۆر

[1] الصف(٥).
[2] المائدة(٤٩).
[3] الطبري(٢٠/٧٩).

پێویستیان بـە یارمـەتی ئەوانـە هەیـە. پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَتَفَرَّقُونَ ﴾ واتە: ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەسێت(خـەڵك) لـەو ڕۆژەدا جیادەبنـەوە لـە یـەكتر. قـەتادە دەڵێت: بەڵێ سوێند بە خوا ئەوە جیابوونەوەیە كە هـەرگیز دوای ئـەوە یـەكتر ناگرنـەوە.[1] واتـە: كاتێك ئەوەی بەرەو سەری سـەرەوە ڕۆیشتو ئەوەیشی بـەرەو خـواری خـوارەوە ڕۆیشت، ئـەوە ئـیتر دوایـن بەیەكگەیـشتنە. بۆیـە خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴾[2] واتە: ئینجا كەسانێك كە باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردووە ئـەوان لـە بەهەشتدا دڵخۆش دەكرێن. موجاهیدو قـەتادە دەڵـێن: خۆشـی دەبەنـە سـەر.[3] پاشـان خـوای مـەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآىِٕ ٱلْـَٔاخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾ واتە: بـەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بوون بە نیشانەكانی ئێمەو گەیشتن بە ڕۆژی دوایی ئا ئەوانە لە سزا(ی دۆزەخ)دا ئامادە دەكرێن.

﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَيُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

**فەرماندان بە پێنج نوێژەكە**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴾ واتـە: ئینجـا پـاكو بێگەردی خوا بڵێن كاتێك ئێوارەتان لێ دێتو كاتێك بـەیانیتان لـێ دێت. خـوای مـەزن لێـرەدا باسـی پاكیو بێ عەیبی خۆی دەكاتو بەندەكانیشی فێردەكات كە چۆن باسـی پـاكیو پەسـەنی ئـەو بدەنو سوپاسی بكەن لەو كاتانەی كە لـە دوای یـەكتری دێـنو نیشانەن لەسـەر تواناو دەسـەڵاتی لـە كـاتی ئێواران كە تاریكی دادێتو لە كاتی بەیانیان كـە دنیـا ڕووناك دەبێت، پاشـان فەرموویـەتی سـوپاسو ستایش جێـی خۆیـەتی بـۆ ئـەو پـاكیو پەسـەنیەی. ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾ واتە: وە سوپاس هەر بۆ خوایە لە ئاسمانـەكانو زەویداو(پـاكیو بێگـەردی خـوا بڵـێن) لـە شەوداو كاتێك نیوەڕۆتان لێ دێت.(العشاء) واتـە: تـاریكی شـەو كـە دادێت.(الاظهار) واتـە: ڕووناكی تەواو(نیوەڕۆ). پاكیو بێگەردی بۆ وەدیهێنـەری ئـەمیشو ئـەویش، كـە بەرەبـەیان دێنێتو شەویشی

---

[1] الطبري(٢٠/٨٠).

[2] الطبري(٢٠/٨١).

[3] الطبري(٢٠/٨٢).

کـردووە بـە هـۆی ئاسـودەیی، وەك فەرموویـەتی: ﴿وَٱلنَّهَارِ إِذَا جَلَّىٰهَا ۝٣ وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰهَا﴾[1] واتـە: وە سوێند بە ڕۆژ کاتێك کە خۆر دەردەخات، وە سوێند بە شەو کـە خـۆر دادەپۆشێت. وە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝١ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ﴾[2] واتـە: سـوێند بـە چێـشتەنگاو، وە سـوێند بـە شـەو کاتێـك کـە ئـارام دەگرێت. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ۝١ وَٱلنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ﴾[3] واتە: سوێد بـە شـەو کاتێـك کـە(زەوی) دادەپۆشێت، وە بە ڕۆژ کاتێك ڕووناك دەبێتەوە. ئایەت لەم بارەوە زۆرە. خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ ﴾ واتـە:(خـوا) زینـدوو لـە مـردوو دەردێنێتو مـردوو لـە زیندوو دەردێنێت. ئەوە ئەو شتانەیە کە ئێمە بـە چـاوی خۆمـان دەیبیـنینو تێیدا دەژین کە چەندە خاوەن تواناو دەسەڵاتە لە دروستکردنی ئەم هەموو شتە لە یەکتری، ئەو ئایەتانەشی کە لەمەودوا دێن هەموو هەر لەم بارەیەوەیە، خوای مەزن باسی وەدیهێنانی ئـەو شـتانە دەکـات لەگـەڵ دژەکانیانـدا بـۆ ئەوەی ببنە بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی تەواوی خۆی. لەوانە دەرهێنانی ڕووەك لە دەنکەکەی(تۆوەکەی)و دەرهێنانی تۆو لە ڕووەك، وە هێلکە لە مریشكو مریشك لە هێلکە، مرۆڤ لە تنۆکە ئاوەو تنۆکـە ئـاو لـە مرۆڤ، خاوەن باوەڕ لە خوانەناسو خوانەناس لـە خـاوەن بـاوەڕ، وە دەفـەرموێت: ﴿وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا﴾ واتە: وە زەوی زیندوو دەکاتەوە لە پاش مردنو وشك بوونی. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتـە وایـە کـە دەفـەرموێت: ﴿ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ۝٣٣ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴾[4] واتە: وە نیشانەو بەڵگەیـەك بـۆ ئـەوان ئـەم زەویە مردووەیە کە زینـدوومان کـردەوەو دانەوێڵـەمان لـێ دەرهێنـاو لـێ ڕوانـد کـە لێـی دەخـۆن، وە لەو(زەویە)دا چەند باخ لە خورماو ترێمان بەدی هێناو چەند کانیاومان تیایدا هەڵقوڵانـدووە. وە خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ۝٥ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝٦ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾[5] واتـە: وە زەوی دەبینـی(لـە زسـتاندا) خامۆشـەو وشـكو بـێ

[1] الشمس(٣ـ٤).

[2] الضحى(١ـ٢).

[3] الليل(١ـ٢).

[4] يس(٣٣ـ٣٤).

[5] الحج(٥ـ٧).

گیانە جا کاتێك بارانمان بەسەردا باراند زەوی(ڕووەکی لێ دەڕوێت) دەجولێت زەوی هەڵ دەدات‌و بەرز دەبێت‌و(زەوی) دەڕوێنێت لە هەموو جۆرە(گیاو گوڵێکی) جوان، ئەوەی(باس کرا) لەبەر ئەوەیە دڵنیا بن کە خوا حەق‌و ڕاستەو بێگومان مردووەکان زیندوو دەکاتەوەو بێگومان ئەو(خوایە) توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، وە بە ڕاستی قیامەت دێت‌و بەرپا دەبێت گومانی تێدا نیەو دڵنیاش بن خوا هەموو ئەو کەسانەی لەناو گۆڕەکاندان زیندووی دەکاتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَىۡ رَحۡمَتِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتۡ سَحَابٗا ثِقَالٗا سُقۡنَٰهُ لِبَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَنزَلۡنَا بِهِ ٱلۡمَآءَ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ كَذَٰلِكَ نُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾[1] واتە: وە ئەو(خوا) زاتێکە بایەکان دەنێرێت بە موژدەدەر پێش(بارانی) ڕەحمەتی پەروەردگار هەتا کاتێك هەوری قورس(ی باراناوی) هەڵدەگرێت دەینێرێت بۆ وڵاتێکی مردوو(وشکی بێ گیا) جا بەو(هەورە) باران دەبارێنین بە هۆی ئەوەوە هەموو جۆرە بەروبووم‌و میوەیەك(دەڕوێنین‌و) دەردەهێنین هەر بەو وێنەیە مردووەکان لە زەوی دەردەهێنین‌و زیندوویان دەکەینەوە تا ئێوە بیربکەنەوە. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ﴾ واتە: وە هەر بەو جۆرە ئێوەش دەردەهێنرێن(لە گۆڕەکانتان).

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ٢٠ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢١﴾

**لە نیشانەکانی خودا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ﴾ واتە: لە نیشانەکەنی ئەو(خودایە) کە ئێوەی لە خاك دروست کردووە. واتە لە نیشانەو دەسەڵاتی خوای مەزن ئەوەیە کە بابتانی ئادەم دروست کردووە لە خۆڵ، ﴿ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴾ واتە: لە پاش(ماوەیەك) کتوپڕ ئێوە ئادەمین‌و بڵاوبوونەتەوە لە زەویدا. لە بنەڕەتدا لە خۆڵ دروست کراون پاشان لە ئاوێکی بێ نرخ‌و پاشانیش لە خوێنێکی بەستوو پاشان لە پارچە گۆشت‌و پاشان بوو بە ئێسك‌و(پێستە) پاشان خوای گەورە گۆشتی دا بەسەر ئێسکەکەدا پاشانیش گیانی کرد بەبەریداو پاشان چاوو گوێی دایە کە ببینێت‌و ببیستێت‌و پاشان لە سکی دایکی هاتە دنیاو زۆر لاوازو بێ هێز پاشان هەتا تەمەنی گەورە دەبوو بەهێزو توانا دەبوو هەتا وای لێهات دنیای ئاوەدان کردەوەو شارو دێهاتی دروست کرد لە وڵاتێکەوە دەچوو بۆ وڵاتێکی ترو سواری کەشتی دەبێت بە دەوری زەویدا دەگەڕێت، سامان

---

[1] الاعراف(٥٧).

کۆدەکاتـەوەو بـژێوی ژیـان بـە دەسـت دێنێـت، توانـای بیرکردنـەوەی هەیـەو زۆر لێـزان و وریایـەو ڕاوبۆچوونی خۆی هەیەو ئاگاداری باشی هەیە لە دنیاو قیامەتدا، هەر کەسـەو بـە پێـی توانـای خـۆی. پاکیو پەسـەنی بۆ ئـەو خوایـەی کـە ئـەو توانـای داوە بـە مـرۆڤ کـە وای لێکـردووە هـەموو هونـەرێك بەکاربێنێت بۆ خۆژیاندنو کارو کاسپی. وە جیاوازی خستووەتە نێوانیان لە بیروبۆچوونو زانستداو لـە چـاکیو خراپیـداو لـە هـەژاریو دەوڵەمەندیـداو لـە بەختـەوەریو بێـچارەییدا. بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴾ واتـە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو موساوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویـەتی:(خـوا ئـادەمی دروست کرد لە مشتێك کە هەڵی گرت لە هەموو زەوی، مرۆڤ لەسـەر ئەنـدازەو شـێوەی زەمـین وەدی هـاتووە، سپیەو سوورەو ڕەشەو لە نێوان ئەو ڕەنگانەدایە، پیسەو پاکەو دڵخـۆشو خـەمگینو لـەو نێوانـەدا).[1] ئەبو داودو تیرمزیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمـزی دەڵێـت: ئەمـە فەرموودەیەکی چاكو ڕاسـتە(حسن صحيح).[2] پاشان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَمِنۡ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾ واتـە: وە لە نیشانەکانی(ئـەوە(خـوا) کـە بـۆی دروسـت کـردوون لـە ڕەگـەزی خۆتـان هاوسـەرانێك. واتـە لـە ڕەگەزی خۆتان مێینەی بـۆ دروسـت کـردوون بـۆ ئـەوەی ببنـە هاوسـەرتان، ﴿لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةً﴾ واتە: بۆ ئەوەی ئارام بگـرن لـە لایانـدا وە خۆشەویستیو بـەزەیی خـستۆتە نێوانتان. واتە لێیان بحەسێنەوە وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَا ﴾[3] واتە:(خوا) ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کـردووە لە یەك کەس(کـە ئادەمـە) هـەر لـە خـۆی هاوسـەری بـەدیهێنا تـا لـە لای بحەسـێتەوە(ئـارام بگرێـت). مەبەست لێرەدا حەوایە کە خوای مەزن دروستی کـرد لـە کـورتترین پەراسـووی لای چـەپی ئـادەم خـۆ ئەگەر خوای گەورە تۆرمەی ئادەمی هەموو بە نێرینـە دروسـت بکردایـەو مێینەشـی لـە ڕەگـەزێکی تـر دروسـت بکردایـە، واتـە: جنۆکـە یـان زینـدەوەرێکی تـر. ئـەم نزیکـیو خۆشەویستیە نـەدەبوو بـەڵکو دوورەپەرێزیو دژایەتی پەیدا دەبوو لە نێوانیاندا. ئەوە لە دلۆڤانیی خودای مەزنە کە نـەوەی ئـادەم و هاوسەرەکانی لـە ڕەگـەزی خۆیـان بـۆ وەدی هێنـاونو بـەزەییو خۆشەویـستی خـستووەتە نێوانیـانو سۆزیان بۆ یەکتری هەیە، چونکە پیاو کە ژن دەهێنێت لەبەر ئەوەیەکە خۆشی دەوێت یان حەز دەکات

---

[1] احمد(٤/٤٠١، ٤٠٦)، فەرموودەیەکی باشە(جيد).

[2] أبو داود(٥/٧٦)، تحفة الأحوزي(٨/٢٩٠)، فەرموودەیەکی باشە.

[3] الاعراف(١٨٩).

منداڵی ببێت لێی‌و سۆزی بۆی هەیە. ژنیش پێویستی بە پیاو هەیە بۆ دابینکردنی بژێوی‌و بە یەکەوەژیان بە خۆشی‌و کامەرانی یان لەبەر زۆر شتی تر. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە. ئەمانە هەموو نیشانەن بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئاوەزن.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ ﴾ واتە: لە نیشانە مەزنەکانی خوای گەورە، ﴿خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ واتە: دروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەمینە بەو بەرزی‌و فراوانەی‌و جوانی‌و ناسکی‌و ڕازاوەیی ئەستێرە گەڕۆك‌و وەستاوەکان‌و لەوانە زەمین بەو نزمی‌و فراوانیە کە پڕە لە کێوو کەژو دۆڵ‌و دەریاو دەشت‌و بیابان‌و زیندەوەرو ڕووەك‌و دارو درەخت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ ﴾ واتە: جیاوازی زمان. یەکێك بە زمانی عەرەبی‌و یەکێك بە زمانی تەتەری و یەکێك بە کەرەجی، یەکێك بە ڕۆمی، یەکێکی تر بە فەرەنجی‌و ئەوی تر بە بەربەری و ئەوە کوردەو ئەوە تەکرورەو ئەوە حەبەشیەو ئەوە هیندیەو ئەوە عەجەمەو ئەوە سەقالیبەیە و ئەوە خەزەرەو ئەوە ئەرمەنە چەندەها زمانی تر کە خودا خۆی نەبێت کەس نازانێت، ﴿وَأَلْوَانِكُمْ﴾ واتە: جیاوازی ڕەنگ‌و ڕوخسارتان، هەموو خەڵکی سەر زەمین لەو ڕۆژەوە خودا ئادەمی دروست کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت ئەو جوانیەی پێ بەخشیون لە دەم‌و چاوو برۆو برژانگ‌و کولم‌و لووت‌و تەوێڵ‌و گوێ. هیچ کەسێك لەوی تر ناچێت. خۆ ئەگەر هەندێ لە جوان‌و ناشیرینیدا لە هەندێ شتدا لە یەکتری بچن بێگومان لە هەندێکی تردا هەر جیاوازیان هەیە. ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْعَالِمِينَ ﴾ واتە: لەم نیشانانەدا بەڵگە زۆرە بۆ زانایان. ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُم بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَاؤُكُم مِّن فَضْلِهِ ﴾ واتە: هەر لە نیشانەکانی خودایە کە لە شەوو ڕۆژدا دەخەون‌و هەوڵدانتان لە ڕۆژدا بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەخشینی ڕۆزی خودا. کە ئەو خەوتنە دەبێتە هۆی حەسانەوەو ئارامی مێشك‌و لەش‌و نەهێشتنی ماندوویەتی‌و لابردنی خەم‌و خەفەت، گەڕان‌و هەوڵدانیشی کردووە بە هۆی وەدەستهێنانی بژێوی ژیان‌و هاتوچۆ لە ڕۆژدا کە ئەمە پێچەوانەی خەوتنە، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ واتە: ئەمەیش لە نیشانەکانی خودایە بۆ ئەو کەسانەی کە دەبیستن‌و تێدەگەن.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ واتە: لەو نیشانانەی کە بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتی مەزنی خودا، ﴿يُرِيكُمُ ٱلْبَرْقَ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ واتە: بروسکەتان پیشان دەدات بۆ ترساندنو ئومێد کە جارێك دەترسن لەوەی بارانو هەورەتریشقەی زۆری لەگەڵدا بێت کە ڕووداوو کارەساتی لیٚ بکەوێتەوە، وە پێشتان خۆشەو بە ئومێدی ئەوەن کە بارانێکی باش ببارێتو کە بۆ پێویستیەکانی خۆتان بەکاری بهێنن. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَيُحْيِۦ بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ﴾ واتە: باران دەبارێنێت لە ئاسمانەوە تا زەوی پیٚ زیندوو بکاتەوە پاش مردنی، کە نە گیاو ڕووەکو هیچ شتێکی تری تیا نەماوە بەڵام کاتێك کە باران باری، ﴿ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾[1] واتە: زەوی(ڕووەکی لیٚ دەڕوێتو) دەجوڵێت زەوی هەڵدەداتو بەرز دەبێتو(زەوی) دەڕوێنێت لە هەموو جۆرە(گیاو گوڵێکی) جوان. ئا ئەمانە هەمووی بەڵگەی ئاشکران لەسەر زیندووبوونەوە لە ڕۆژی قیامەتداو پەندو ئامۆژگارین بۆ کەسێك کە خاوەن ئاوەز بێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ واتە: بە ڕاستی لەوەدا کە باسکرا چەند ڕابەرو نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی ژیریان بەکاردێنن. ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ﴾ واتە: لە نیشانەکانی ئەوە کە ئاسمانو زەوی بە فەرمانی ئەو وەستاون. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ﴾[2] واتە: وە ئاسمانی ڕاگیر کردووە تا نەکەوێت بەسەر زەویدا مەگەر بە فەرمانی ئەو. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾[3] واتە: بە ڕاستی خوا ئاسمانەکانو زەوی ڕاگیر دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێڕەوی خۆیان لانەدەن. عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لیٚ بێت) نارەحەت بووایە دەیوت: نەخێر، سوێند بە کەسەی بە فەرمانی ئەو ڕاوەستاون(واتە: بە فەرمانی خودا ئاسمانو زەمین ڕام هاتوونو وەستاون).

[1] الحج(٥).
[2] الحج(٦٥).
[3] الفاطر(٤١).

وەختێك كە ڕۆژی قیامەت هات ئەم زەمینە دەبێتە زەمینێكی ترو ئاسمانەكانیش هەروەها، مردووەكانیش لە گۆڕەكانیان هاتنەدەر بە فەرمانی خودا بە زیندوویی‌و بانگ دەكرێن بۆ لای خوای گەورە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ الْأَرْضِ إِذَا أَنتُمْ تَخْرُجُونَ﴾ واتە: پاشان كاتێك لە ڕۆژی دواییدا لە زەوییەوە بانگتان دەكەن یەكسەر ئێوە لە گۆڕەكانتان دێنە دەرەوە. واتە یەكجار بانگ دەكرێن بە پەلە دێنە دەرەوە. ئەم ئایەتەوەك ئەو ئایەتانە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَدْعُوكُمْ فَتَسْتَجِيبُونَ بِحَمْدِهِ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی كە بانگتان دەكەن(لە گۆڕەكانتانەوە) جا ئێوەش دەست بەجێ دێن بە دەم بانگكردنەكەوە بە سوپاس‌و سەناكردنەوەو وا دەزانن نەماونەتەوە(لە دنیادا) ماوەیەكی كەم نەبێت. وە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِالسَّاهِرَةِ﴾[2] واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە، ئیتر كتوپڕ وان لە دەشتێكی سپی كاكی بە كاكیدا. وە فەرموویەتی: ﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾[3] واتە: تەنها شریخەو دەنگێكی گەورە دێت ئیتر كتوپڕ هەموویان(بە كۆمەڵی) لای ئێمە ئامادەكراون.

﴿وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ وَلَهُ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾﴾

**دووبارە هێنانەوەی دروستكراوەكان لە(مەردم) ئاسانترە**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ﴾ واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان‌و زەمیندایە خوا خاوەنیەتی‌و بەندەی ئەون، گوێڕایەڵ‌و ملكەچی ئەون پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَبْدَأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ واتە: ئەو(خوا) زاتێكە بەدیهێنانی دەست پێكردووە لە پاشان(دوای مردنی) دووبارە دروستی دەكاتەوە(ئەم دروست كردنەوەی دووەم) لای خوا ئاسانترە. ئیبنو ئەبی تەلحە(طلحة) دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾ واتە: ئاسانترە لای.[4] موجاهید دەڵێت هێنانەوە ئاسانترە لە

[1] الاسراء(٥٢).

[2] النازعات(١٣ـ١٤).

[3] يس(٥٣).

[4] الطبري(٢٠/٩٢).

وەدیهێنان، یەکەم جاریش هەر ئاسانە.[1] عیکریمەو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[2] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لیٚ بێت) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(خـودا فەرموویـەتی بەندەکەم بڕوای پیٚ نەهێنام بۆ ئەو نەدەبوو وابێت، قسەی پـیٚ وتم بـۆ ئـەو نـەدەبوو وابێـت، بـڕوا پـیٚ نەهێنانەکەی بە من ئەوەیە کە ئەڵێ: نامهێنێتەوە جارێکی تر وەك چۆن یەکەمجار دروستـی کـردووم، هەرگیز وەدیهێنانی یەکەمجار ئاسانتر نیە لە لام لە هێنانەوەی(واتە ئاسانو گران لای خـوا نیـە) بـەڵام قسە پیٚ وتنەکەی پێم ئەوەیە کە ئەڵێ: خوا منداڵی بۆ خۆی داناوە، لەکاتێکدا مـن خودایـەکی تـاكو تەنهاو بیٚ نیازم کە کەسی لیٚ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هەرگیز کەسیش نەیتوانیوە هاوتـای بێـت) تەنها بوخـاری هێناویـەتی.[3] ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتـە: وە هـەر بـۆ ئـەوە سیفەتی هەرە بڵند لە ئاسمانەکانو زەویدا. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾[4] قەتادەیش دەڵێت: نموونـەی خـودا، هـیچ پەرستراوێك نیە غەیری خوداو هیچ پەروەردگارێکیش نیە غەیری ئەو.

﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَـٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾

## نموونەیەك كە بەڵگەیە لەسەر تاك و تەنهایی خودا

ئەمە نموونەیەکە خوای مەزن دەیهێنێتەوە بۆ ئەوانەی کە هاوەڵی بۆ دادەنێن و کەسانی تر غـەیری خودا لەگەڵ خوادا دەپەرستنو دەیکەنە شەریکی، زۆر چاکیش دەزانن کە ئەو شەریکانە لە بتو شـتی تر عەبدو موڵکی خودان وەك لە پاڕانەوەکەیاندا ئەڵێن: (لبَّيكَ لا شريكَ لكَ، إلا شريكاً هُوَ لكَ، تملكه وما ملك) خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە: نموونەیـەکی لـە خۆتـان بـۆ هێناونەتـەوە کـە لێـی تێدەگـەنو بـە چاوی خۆتـان دەیبیـنن، ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَـٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ﴾ واتـە: ئایـا ئێـوە ئەوانـەی کـە غوڵامتـانن دەیکەنـە هاوبەشی خۆتان لەو بژێویەی کە پێمان داون؟ وە ئایا وەك یەك دەبن؟ دیارە هـیچ کەسێك لـە ئێوە

---

[1] الطبري(٢٠/٩٢).

[2] الطبري(٢٠/٩٢).

[3] فتح الباري(٨/٦١١/٦١٢).

[4] الشورى(١١).

ڕازی نابێت کە غوڵامەکەی ببێتە هاوبەشی لە ماڵو سامانیدا. وەك یەك بەش ببەن. ﴿تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾ واتە: چۆن لە یەکتری دەترسن هەر بەو شێوەیە لەوانیش دەترسن کە لە ماڵەکانتان لەگەڵدا بەش بکەن. ئەبو میجلەز دەڵێت: تۆ ناترسی کە غوڵامەکەت ماڵەکەت لەگەڵ بەش بکات، وە بۆشی نیە وا بکات. هەر بەو شێوەیە خودایش هاوەڵی نیە.[1] واتە: هەموو کەسێك لە ئێوە پێی قەبوڵ ناکرێت کە غوڵامەکەی ماڵەکەی لەگەڵ بەش بکات، کەواتە چۆن ئێوە شەریك بۆ خوا دادەنێن لە دروستکراوەکانی خۆی؟ تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ئەهلی شیرك دەپاڕانەوە دەیانوت:(لبَّيكَ لا شريكَ لَكَ، إلاّ شَريكاً هو لك، تملِكهُ وما مَلَك). واتە: ئەی خودایە هاتین بۆ لات، هاتین بۆ لات تۆ شەریکت نیە غەیری شەریکێك نەبێت کە تۆ خاوەنیتی خاوەنی ئەو شتانەشی کە ئەو هەیەتی. خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن شُرَكَاءَ فِي مَا رَزَقْنَاكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَاءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ﴾[2]، ئەمە ئاگادارکردنەوەیەك بوو لە لایەن خواوە بەو نموونەیەکە هێنایەوە تا تێیان بگەیەنێت، مادام ئەوان بەوە ڕازی نابن کەواتە خوا باشترو چاکتر لەوە ڕازی نابێت، ﴿كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئێمە نیشانەکان بە جوانیو پاکی شی دەکەینەوە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ئاوەزن. پاشان خوای مەزن باسی موشریکەکان دەکات کە بە نەفامیو نەزانی غەیری ئەو دەپەرستن بەبێ هیچ بەڵگەیەك بەڵکو هەر لە خۆیانەوە. دەفەرمووێت: ﴿بَلِ اتَّبَعَ الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ واتە: بەڵکو ئەوانەی ستەمیان کرد واتە موشریکەکان، ﴿أَهْوَاءَهُم﴾ واتە: شوێن ئارەزووی خۆیان دەکەون لە پەرستنی ئەو بتو شتانەدا ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ واتە: بێ شارەزاییو نەزانانە. هیچ نازانن. ﴿فَمَن يَهْدِي مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ﴾ واتە: ئینجا کێ ڕێنموونی کەسێك بکات کە خوا گومڕای کردبێت. واتە هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێیان نیشان بدات وەختێك خوا ڕێگەیان لێ بگرێتو سەریان لێ بشێوێنێت، ﴿وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ واتە: لە کاتێکدا بۆ ئەوان هیچ یارمەتیدەرێك نیە. واتە هیچ کەسێك ناتوانێت لە دەستی خودا ڕزگاریان بکاتو پەنایان بداتو بێت بە هاواریانەوە، چونکە هەرچی خوا ویستی دەبێتو هەرچیش ئەو نەیەوێت نابێت.

---

[1] الطبري(٢٠/٩٦).

[2] الطبراني(١٢/٢٠)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾

**فەرماندان بە پابەندبوون بە یەکخواپەرستیەوە**

خوای مـەزن دەفـەرموویت: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴾ واتە: کەواتە ڕووی خۆت ڕێك بکەرە ئاییـنی ئیسلام پـاك‌و ڕاست بـۆ خوا(شوێن ئایینی) داهێنراوی خوا بکەوە کە خەڵکی لەسەری دروست کردووە داهێنراوی خـوا بـە هـیچ جۆرێك گۆڕانی بۆنیە، یانی خوای مەزن داوا لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکات‌و دەفـەرمووێت کە تـۆ هـەر ڕوو لەم دینە بکەو لەسەری بەردەوام بەو لێی لامەدە، ئەو ئاینەی کە خـودا بـۆی دانـاوی ئـاینێکی هەقـەو ئایینی ئیبراهیم پێغەمبەریش بووە(سەلامی خوای لـیّ بێـت) کـە خـودا ڕێگـەی نیـشان داوی بـۆی‌و بـە چاکترین شێوە بۆی تەواو کردووی تۆش پابەند بە پێیەوە، ئەو ئاینەی لە سروشتدا خوا ئـەو خەڵکـەی لەسەر دروست کردووە، فەرمانی پێداوە کە هەر ئەو بناسن‌و غەیری ئەو هیچ کەسێك نیـە بپەرسـترێت، وەك لـە پێشەوە لـە ئایەتێکدا فەرموویـەتی: ﴿وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾[1] واتـە: وە کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە(پێی وتن) ئایـا مـن پـەروەردگاری ئێـوە نـیم؟(لـە وەڵامـدا) وتیـان: بەڵێ. وە لەم فەرموودەیەدا هـاتووە:(مـن بەنـدەکانم وەدی هێنـا لەسـەر ڕێکڕاوەسـتان لەسـەر ئـایین، بەڵام شەیتان لە ئاینەکەیان لایدان).[2] وە بەم زووانە ئەو فەرموودانە دێنین کە خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە بەنـدەکانی لەسـەر ئیسلام دروسـت کـردووە پاشان هەندێ لـەو ئاینانـە گـۆڕانی بەسـەردا هاتووەو شتی خراپی تێکەڵ کراوە وەك ئاینی جوولەکەو گاورو مەجوسیەکان خوا دەفـەرمووێت: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ هەندێ وتوویانە: واتە: خەڵکی خودا مەگۆڕن‌و لەسەر ئەوە سروشـتەی کـە دروسـتی کردوون لایان مەدەن. ئەم ڕستە خەبەرییە بە مانای فەرمانکردن هـاتووە. وەك ئـەم ئایەتـەی کـە خـوا دەفـەرمووێت: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾[3] واتـە: هـەر کەسـێك چـووبێتە نـاوی‌و پـەنای پـیّ بردبێـت

[1] الاعراف(١٧٢).

[2] مسلم(٤/٢١٩٧).

[3] ال عمران(٩٧).

نەترساوە. ئەم تێگەیشتنە واتایەکی چاکو ڕاستە. هەندێکی تر وتوویانە: خوای مەزن بە یەکسانیو وەك یەك هەموو بەندەکانی لەسەر ئیسلام وەدیهێناوە هیچ کەس لە دایك نابێت لەسەر ئەو سروشتە نەبێت، هیچ جیاوازیەك لە نیوان خەلکیدا نیە لەو بارەیەوە. بۆیە ئیبنو عەباسو ئیبراهیمی نەخەعیو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موجاهیدو عیکریمەو قەتادەو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ واتە: لە ئاینی خوادا[1]. بوخاری دەڵێت: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ واتە: لە ئاینی خوادا، ﴿خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾[2] یانی: ئایینی پێشینان. ئاینی پێشینەکانیش یانی ئیسلام. ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەوە کە دەڵێت: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ لە دایکبوویەك نابێت لەسەر سروشت لە دایك نەبێت، بەلام دایكو بابی دەیکەنە جوولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست(مەجوسی) وەك چۆن حەیوان(چوارپێ) بەچکەی دەبێت بە ڕێكو پێکیو تەواوی ئاخۆ هیچ گوێبڕاویەکی تێدا دەبینن؟) پاشان دەفەرمووێت: ﴿فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[3] ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ واتە: پابەندبوون بە شەریعەتەوەو سروشتی پاك بریتیە لە ئاینی هەقو ڕاست، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بەلام زۆرینەی خەلکی نازاننو لێی لادەدەن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾[4] واتە: وە زۆرینەی خەلکی هەرچەندە تۆ سووربیت(لەسەر باوەڕهێنانیان) نابنە ئیماندار. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[5] واتە: وە ئەگەر تۆ گوێڕایەلی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خوا گومڕات دەکەن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ﴾ ئیبنو زەیدو ئیبنو جورەیج دەڵێن: دەگەڕێنەوە بۆ لای.[6] ﴿وَٱتَّقُوهُ﴾ واتە: لێی بترسن، ئاگاتان لێی بێت، ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: نوێژ بکەن، نوێژ ئەو خودا پەرستیە گەورەیەکە خودا فەرزی کردووە، ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ واتە: لە هاوبەش بڕیاران مەبن. واتە لەو خواناسانە بن کە هەر تەنهاو بە

---

[1] الطبري(٢٠/٩٩).

[2] الشعراء(١٣٧).

[3] فتح الباري(٨/٣٧٢ و ١١/٥١٢)، ومسلم(٤/٢٠٤٧، ٢٠٤٨).

[4] يوسف(١٠٣).

[5] الانعام(١١٦).

[6] الطبري(٢٠/١٠٠).

دڵسۆزیو پاکی بەندایەتی خودا دەکەنو هیچ مەبەستێکی تریان نیە ئەو نەبێت، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی ئەبو مەریەمەوە دەڵێت: عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) تێپەڕی بە لای مەعازی کوڕی جەبەلدا پێی وت پایەو ڕاگری ئەم ئومەتە کامەیە؟ مەعاز وتی: سێشتە کە مایەی ڕزگارین، دڵسۆزی کە بریتییە لەو سروشت پاکەی کەخوای گەورە مرۆڤی لەسەر دروست کردووە، نوێژ کە بریتییە لەدین، گوێڕایەڵی کە خۆلادانە لە گوناه. عومەر وتی: ڕاست دەکەی.[1] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ واتە: تۆ لەو موشریکانە مەبە کە ئاینەکەیان بەش بەش کردو بوون بە چەند بەشەوە هەر کۆمەڵێك بەو(ئاینەی) خۆیان دڵخۆش بوون. واتە: دەستکاریان کردووەو گۆڕیویانە، بڕوایان بە هەندێکی هەیەو حاشا لە هەندێکی تری دەکەن. هەندێ خوێندوویانەتەوە(فارقوا دینهم) واتە: وازیان لێ هێناوەو پشتگوێیان خستووە. ئەوانەش: وەك جوولەکەو گاورو ئاگرپەرستو بتپەرستەکانو باقی ئاینە پڕوپوچەکان جگە لە موسڵمانان، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی ئاینەکەیان بەش بەش کردو بوون بە چەند دەستەو تاقمێکەوە لە هیچ شتێکدا لە ئەوان ناچن، بێگومان کاری ئەوان تەنها بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. ئەهلی دینەکانی تر پێش ئێمە دەستەدەستە بوون لەناو خۆیاندا لەسەر ڕاوبۆچوونی جیاجیاو ئاینی پڕوپوچ هەریەکێك لەوانە خۆی بە ڕاست دەزانیو ئەم ئومەتەیش بوونە کۆمەڵ کۆمەڵ لەنێوان خۆیاندا، چەندەها ڕاوبۆچوونی جیاواز لە نێوانیاندا پەیدابوو هەمووی گومڕاییو سەرلێتێکچوونە تەنها یەکێکیان نەبێت، کە ئەهلی سونەتو جەماعەتە، ئەوانەی کە پابەند بوون بە قورئانو سونەتی پێغەمبەری خوداوەو(ﷺ) ڕێبازی پێشینەکان کە هاوەڵەکانی پێغەمبەرو شوێنکەوتووەکانی ئەوانو(التابعين) پێشەوایانی موسڵمانان لە دێرزەمانەوە تا ئێستا دەگرێتەوە. وەك حاکم ڕیوایەتی کردووە لە(مستدرك)ە کەیدا کە پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو دەستەیەی کە ڕزگارئەبن فەرموویەتی: (ما أنا عليه وأصحابي) واتە: لەسەر ئەوەن کە منو هاوەڵەکانمی لەسەرە[3].

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ

---

[1] الطبري(٢٠/٩٨).

[2] الانعام(١٥٩).

[3] الحاكم(١/١٢٩)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُواْ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾
أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾﴾

**وەرگەڕانی مرۆڤ لە یەکخواپەرستیەوە بۆ بتپەرستیو لە دڵخۆشیەوە بۆ نائومێدی بە پێی هەل و مەرج**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ﴾ خوای مەزن باس لە کەسانێك دەکات لە کاتی تەنگانەدا تەنها هاوار لە خـودا دەکەنو لێی دەپاڕێنەوەو هاوەڵی بۆ دانانێن، بەڵام کاتێك خودا بەهرەی زۆری پـێ بەخـشینو کەوتنـە خۆشـیو ترسـیان نـەبوو هـاوەڵی بـۆ دادەنـێنو شـتی تـر لەگـەڵی دەپەرسـتن. پاشـان دەفـەرمووێت: ﴿لِيَكْفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيْنَـٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُواْ﴾ واتە: با دان نەنێن بەو چاکانەدا جا بـا ڕابوێرنو بەهرەمەنـد بـن لـە ژیان، ئەو لامە لامی عاقیبەتە لای هەندێك لەزانایان، لای هەندێکی تر (لامی تەعلیلە) بۆیە خوای گەورە خـۆی بڕیـار دەدات لـەو بارەیـەوە بۆیـان پاشـان هەڕەشـەیان لـێ دەکـاتو دەفـەرمووێت: ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئینجا لەمەودوا دەزانن، هەندێك ئـەڵێن: سوێند بـە خـوا ئەگـەر پاسـەوانی کۆڵانێـك هەڕەشەم لێ بکات لێی دەترسم، ئـاخۆ حـاڵ چـۆن دەبێـت ئـەوەی کە لێـرەدا هەڕەشـە دەکـات ئـەو کەسەیە کە دەفەرمووێت بە شتێك ببە یەکسەردەبێت؟ پاشان خوای گەورە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت دەربارەی ئەو موشریکانە کە ناکۆکیو غەیری خوا دەکەنە هـاوەڵی خـوداو لەگـەڵی دەیپەرسـتن بـەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت، ﴿أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَـٰنًا﴾ واتە: ئایا ئێمە بەڵگەیەکمان بـۆ نـاردوون. ﴿فَهُوَ يَتَكَلَّمُ﴾ کـە قـسە ئـەکات، ﴿بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشْرِكُونَ﴾ واتـە:دەربـارەی ئـەوەی ئـەوان کردوویانەتە هاوبەشی خوا. ئەم ڕستەیە ئیستیفهامی ئینکاریە، یانی: لەو بارەیـەوە هیچ بەڵگەیـەکیان بۆ نەهاتووە. پاشـان خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُواْ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ﴾ واتە: وە کاتێك ڕەحمەتو چاکەیەك بـە خـەڵك بـدەین پێـی دڵخـۆش دەبنو ئەگەر زیانێکیان تووش ببێت بەهۆی کردەوەی خراپیانەوە کتـوپڕ بـێ هیـوا دەبـن(لـە بـەزەیی خوا). خوای گەورە باسی سروشتی مـەردم دەکـات وەك ئـەوەی کە مرۆڤـە مەگـەر کەسێك کە خـودا یارمەتی بداتو بیپارێزێت، چونکە مرۆڤ سروشتی وایـە ئەگـەر تووشـی خۆشـگوزەرانیو دەوڵەمەنـدی

بوو لە خۆی دەگۆڕێت وەك خوای گەورە دەفـەرموویت: ﴿ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ﴾[1] واتـە: ئەڵێ: خراپەکانم لەسەر لاچوو زۆر بە کەیفەو خـۆی هەڵدەنێت بەسـەر خەڵکدا، بـەڵام کاتێك تووشـی لێقەمانێك بوو نائومێدو بێ هیوا دەبێـت لـەوەی جارێکی تـر تووشـی خۆشـیو خۆشگوزەرانی ببێـت، خوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾[2] واتـە: مەگـەر ئەوانـەی کـە خـۆڕاگر بـوون لـە کاتێکـدا کـە تووشـی بـەلا بـوونو ئاکـاری چـاکیان کـردووە لـە کـاتی دەوڵەمەنـدیو خۆشگوزەرانیدا، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خـودا(ﷺ) دەفـەرموویت:(خـاوەن باوەڕ جێی سەرنجە، خودا تووشی هیچ شتێکی نەکردووە مەگین ئەو شتە چاكو خێر بووە بۆی، ئەگەر تووشی شادی بووبێت خۆڕاگر بووە هەر چاك بووە بۆی).[3] پاشـان خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ واتە: ئایا ئەوانە نەیانزانیوە خوا خۆی هەموو شتێك دەكـاتو دەبیات بەڕێوە هەموو شـتێك بـە پێـی کـارزانیو دادوەری ئـەوەو مـەیلی لـە هـەر کەسێك ببێت ڕۆزی فـراوان دەکـات مەیلیـشی لـە هـەر کەسـێك ببێـت هـەژارو کـەم ڕۆزی دەکـات، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: بێگومان لەوەدا(باسکرا) چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەوانەی باوەڕ دێنن.

﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٣٨ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ٣٩ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۖ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيۡءٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٤٠ ﴾

**فەرماندان بە بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیو قەدەغەکردنی سوخۆری**

خوای مەزن داوامان لێ دەکات کە هەقی خزمایەتی بدەینو دەفـەرموویت: ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ﴾ واتە: چاکەیان لەگەڵ بکەنو پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنن، ﴿وَٱلۡمِسۡكِينَ﴾ واتە: ئـەو هـەژارەی کـە هیچی نیە لێی ببەخشێت یان هەیەتی بەڵام ئەوەندە نیە کە بـە تـەواوی بەشـی بکـات، ﴿وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە: ئەو ڕێبوارەی کـە نـەدارەو پێویستی بـە یارمـەتی هەیـە لـە سـەفەرەکەیدا، ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ

---

[1] هود(١٠).

[2] هود(١١).

[3] مسلم(٤/٢٢٩٥).

يُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِۖ﴾ واته: ئـەوە زۆر چاكە بۆ ئـەو كەسانەی بە ئـەمان خـوای خۆيان ببينن لـە ڕۆژی قيامەتدا كە گەورەترين ئارەزووە، ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾ واتە: هەر ئەوانەن ڕزگاربووان لـە دنياو لە قيامەتدا، پاشان خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن رِّبٗا لِّيَرۡبُوَاْ فِيٓ أَمۡوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرۡبُواْ عِندَ ٱللَّهِۖ﴾ واتە: كەسێك شـتێك بـدات بـە يـەكێك بيـەوێت زيـاتر لـەوەی كـە پێـی داوە لێـی بسێنێت‌و لێـی وەربگرێت ئەوە ئەو كەسە هيچ پاداشتێكی بۆ نيە لە لای خودا. ئيبنـو عـەباس‌و موجاهيـدو زەححاك‌و قەتادەو عيكريمەو موحەممەدی كوڕی كـەعب‌و شـەعبی بـەو شێوەيە مانايـان كـردووە.[1] بۆيـە خـوای گـەورە فەرموويـەتی: ﴿وَمَآ ءَاتَيۡتُم مِّن زَكَوٰةٖ تُرِيدُونَ وَجۡهَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُضۡعِفُونَ ﴾ واتـە: وە هـەر زەكات‌و خێرێك كە داوتانەو مەبەستتان تەنها ڕەزامەندی خوا بووە ئا ئەوانە(پاداشتيان) دوو چـەندانە دەكەينـەوە. واتـە ئەوانـە پاداشـتی زۆريـان دەدرێتـەوە. وەك لـە فـەرموودەی سـەحيحدا هـاتووە كـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموويـەتی:(هـيچ كەسـێك نيـە كـە مـاڵی بەخـشيبێت بـە ئەنـدازەی دەنكـە خورمايەك لە ماڵی حەڵاڵ خوای بەخشندە لێی وەرنەگرتووبێت بە دەستی ڕاستی‌و زيادی نەكردبێت بۆ خاوەنەكەی، وەك چۆن يەكێك لە ئێوە ماين‌و ڕەشەوڵاغەكانی بەچكەيان دەبێت‌و زيـاد دەكـەن هـەتا وای لیَ دێت دەنكە خورمايەك مەزنتر لە(كێوی) ئوحودی لیَ دێت)[2].

## وەديهێنان‌و ڕۆزيی‌و مردن‌و ژيان بە دەستی خودايە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ثُمَّ رَزَقَكُمۡ﴾ واتە: خودا وەديهێنەرو ڕۆزی دەرە، بە ڕووت‌و قووتی مرۆڤ لـە سـكی دايكـی دەردەهێنێـت‌و زانيـاری نيـەو نابيـسیَ‌و نابينێـت‌و زۆر لاوازو بـیَ توانايە پاشـان هـەموو ئـەو شـتانەی دەداتـیَ لـە دوايشدا جلوبـەرگ‌و مـاڵ‌و سامانی دەداتـیَ‌و فێـری كاروكاسپی دەبێت. ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾ واتـە: دواتـر دەتانمرێنێت، پـاش ئـەم ژيانـە. ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾ واتە: پاشان زيندووتان دەكاتەوە لە ڕۆژی قيامەتـدا. ﴿هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم﴾ واتـە: ئەوانـەی كـە غـەيری خوا دەتانپەرستن. ﴿مَّن يَفۡعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَيۡءٖ﴾ هيچ كەسێك لەوانەی ئێوە دەيكەنـە شـەريكی خـوا ناتوانن ڕۆزی بدەن‌و خەڵكی بمرێنن‌و زيندووی بكەنەوە. بەڵكو ئەو خودا مەزنە پاك‌و بیَ عەيبەو خۆی وەديهێنەرەو خەڵكی ڕۆزی دەدات‌و دەيمرێنێت، لە ڕۆژی قيامەتيشدا هەمووی زيندوو دەكاتەوە، بۆيـە خوای مەزن لە دوای ئەوە دەفەرمووێت: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾ واتە: خوا بـیَ عەيبـەو لـەوە

---

[1] الطبري(٢٠/١٠٤/١٠٥).

[2] مسلم(٢/٧٠٢).

پایەبەرزترە کە بڵێن: شەریکی هەیە، یان کەسێك هەیە وەك ئەو بێت یان باوکی هەیە یان کوڕی هەیە. بەڵکو خودا تاكو تەنهایەو بێ نیازەو جێ نیازەو لە کەس نەبووەو کەسیشی لێ نەبووەو بێ هاوتایە.

﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾

## شوێنەواری تاوانکاری لە دنیادا

ئیبنو عەباسو زەححاكو سودیو کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست بە ﴿ٱلْبَرِّ﴾ چۆڵەوانیەو ﴿وَٱلْبَحْرِ﴾یش شارو لادێکانە.[1] وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت:(البحر) ئەو شارو لادێیانەیە لە کەناری ڕووبارەکاندان[2]. هەندێکی تر دەڵێن: مەبەست بە ﴿ٱلْبَرِّ﴾ یانی وشکاییو(البحر) واتە دەریا. زەیدی کوڕی ڕوفەیع دەڵێت: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ﴾ واتە: بڕانی باران لە وشکایی، (بێ بارانی) یەك کە گرانی بە دوایدا بێت، وە مەبەست بە (فساد)ی دەریاش یانی: لەناوچوونی زیندەوەرەکانی، ئیبنو ئەبی حاتەم ئەمەی ڕیوایەت کردووە. پاشان دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی یەزیدی موقریٔ بۆی گێڕاینەوە لە سوفیانەوە لە موحەممەدی کوڕی قەیسی ئەعرەجەوە ئەویش لە موجاهیدەوە: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ﴾ یانی: خراپەکاری لەسەر زەوی بریتییە لە کوشتنی نەوەی ئادەم، خراپەکاری (دەریا)یش بریتییە لە گرتنی کەشتی و دەست بەسرا گرتنی. لەسەر قسەی یەکەم مانای ئەم ئایەتە: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ﴾ واتە: کەمی بەروبوومو کشتوکاڵ هۆکارەکەی تاوانو گوناهە. ئەبول عالیە دەڵێت: هەر کەسێك سەرپێچی فەرمانی خودا بکات لەسەر زەمیندا ئەوە تاوانو خراپەکاری لەسەر زەمیندا بڵاوکردووەتەوە، چونکە بەرقەرار بوونی چاکسازی سەر زەمینو ئاسمان بە گوێڕایەڵی خودایەو دەرنەچوونە لە فەرمانەکانی. بۆیە لەو فەرموودەیەدا کە ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە هاتووە:(سەندنی تۆڵەیەك بەدڵنیاییەوە لەسەر زەمیندا خۆشەویستترە لە لای خەڵکەکەی لەوەی کە چل (ڕۆژ) بارانیان بەسەردا ببارێت).[3] هۆکەیشی ئەوەیە ئەگەر تۆڵە بسێنرێت لە تاوانبار خەڵکی یان زۆرینەی خەڵك وازدەهێنن لە خراپەکاریو ئەو شتانەی کە خودا قەدەغەی کردوون. خۆ ئەگەر وازهێنرا لە گوناهو تاوانکاری ئەو کاتە خێروبێر لە زەویو ئاسمانەوە دەست دەکەوێتو دادەبارێت، هەر بۆیە کاتێك

---

[1] الطبري(٢٠/١٠٨).

[2] الطبري(٢٠/١٠٨).

[3] النسائي(٨/٧٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوایان لێ بێت) دێتەخوار لە کۆتـایی دنیـادا فـەرمانڕەوایی دەکات بـە شەرعی پیرۆزی خودا لەو کاتەدا بەراز دەکوژێتو خاچ دەشکێنێتو سەرانە لادەبات نایهێڵێت، چونکە غەیری ئیسلام هیچ شتێکی تر لەکەس قەبوڵ ناکرێت، هەر کەسێك موسڵمان نـەبێت لـە ملـی دەدرێت، کاتێك کە خودا دەججال و شوێنکەوتووەکانیو یأجوجو مأجوج لەناو دەبات، دەڵێت: بـە زەوی: خێـرو بەرەکەت بێنە دەرەوە، کۆمەڵێك خەڵکی زۆر لە یەك هەنار دەخۆن، توێکڵەکەی دەکەنـە سێبەرو لـە ژێری دادەنیشنو شیری شیردەرێك بەشی کۆمەڵێك خەڵك دەکات، ئەمانـە هـەموو بـە هۆی بەرەکـەتی بەجێهێنانی شەریعەتی پێغەمبەری خوداوەیە موحەممەد(ﷺ)، تـا دادپـەروەری زیـاتر بێـت خێروبێـر زیاتر دەبێت، بۆیە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە:(کاتێك تاوانکارو لـەڕێ لادەر ئـەمرێت بەنـدەکانی خـواو وڵاتو زینـدەوەرو دارو درەخـت دەحەسێنەوە).[1] ئیمـامی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل ڕیوایـەتی کردووە لە ئەبو قەحزەمەوە کە دەڵێت: پیاوێك لە زەمانی زیاددا یان(کوڕی زیاددا) کیسێکی دۆزییـەوە کە دانەوێڵە یانی: گەنمی تێدابوو لە وێنەی ناوکە خورما یان دەنکە خورما لەسـەر کیسەکە نوسـرابوو: ئەمـە لـە کاتێکـدا سـەوز بـووەو ڕوواوە کـە بـە دادپـەروەری فـەرمانڕەوایی کـراوە.[2] خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟﴾ واتـە: تووشـی بـەلایان دەکـەین، وەك هـەژاریو مـردنو لەناوچوونی بەروبووم بۆ ئـەوەی تاقییـان بکەینـەوە لەتۆڵـەی ئـەو کردارانـەی کـە کردوویانـە: ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ واتـە: بـەڵکو بگەڕێنـەوە لـە گونـاه. وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[3] واتـە: وە تاقیمـان کردنـەوە بـە چـەندەها چاکەو خۆشیو بە چەندەها خراپەو ناخۆشی بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێنەوە(بۆ لای خوا). پاشان فەرموویەتی: ﴿قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ﴾ واتـە:(ئـەی موحەممـەد(ﷺ)) بڵـێ بـە زەویدا بگەڕێن ئینجا سەرنج بدە سەرەنجامی ئەوانەی لە پێش(ئێوەوە) بوون چۆن بـوو. واتـە سـەیری پێشینەکانی خۆتـان بکـەن، ﴿كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ﴾ واتـە: زۆر لەوانـە شـەریکیان بـۆ خـوا دادەنـاو بڕوایان بە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لـێ بێـت) نـەدەکردو شـوکرانەبژێر نـەبوون لەسـەر ئـەو هـەموو بەهرەیە، چیان بەسەرهات؟

[1] البخاري(٦٥١٢).
[2] أحمد(٢/٢٩٦).
[3] الاعراف(١٦٨).

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ ﴿٤٣﴾ مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ
وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ ﴿٤٤﴾ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾

## فەرماندان بە ڕاوەستان لەسەر ڕاستەڕێ پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە فەرمان دەدات بە بەندەکانی کە زۆر پەلە بکەن بۆ خواناسیو چاکەکردن و لەسەر ڕاستەڕێ لانەدەن، وەك دەفەرمووێت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ واتە: کەواتە ڕووی خۆت بکەرە ئایینی ڕاست لە پێش ئەوە ڕۆژێك بێت لە لایەن خواوە کە گێڕانەوەی بۆنییە. واتە: ڕۆژی قیامەت هەرکەی مەیلی لێ بوو بێت دێت، کەس ناتوانێت ڕێی لێ بگرێت. ﴿يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ﴾ واتە: لەو ڕۆژەدا بڵاوە دەکەن دەستەیەك دەچن بۆ بەهەشتو دەستەیەکیش ڕەوانە دەکرێت بۆ جەهەنەم. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾ واتە: هەر کەس بێباوەڕ بوویێت ئەوە(تۆڵەی) بێباوەڕیەکەی لەسەرە هەر کەسیش کردەوەی چاکی کردبێت ئەوە شوێن بۆ خۆیان(لە بەهەشتدا) ئامادە دەکەن. ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ﴾ واتە: بۆ ئەوەی کەسانێك کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە پاداشتیان بداتەوە لە میهرەبانیو چاکەی خۆی. واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوونو ئاکاری چاکیان کردووە خودا پاداشتی چاکیان دەداتەوە هەر چاکەیەك بە دە چاکەو هەتا زیاتر لە حەوت سەد ئەوەندەی چاکەکەیان، بۆ هەر کەسێك مەیلی لێ بێت. ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: خودا خوانەناسانی خۆش ناوێت لەگەڵ ئەوەیشدا بە دادوەری خۆی مامەڵەیان لەگەڵ دەکاتو ستەمیان لێ ناکات.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ
تَشْكُرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا
عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾

## یەکێك لە نیشانەکانی خودا (با)یە

خوای گەورە باسی بەهرەکانی خۆی دەکات لەسەر بەندەکانی کە بای بە مژدە بۆ ناردوون بە میهرەبانی خۆی بەزەیی هاتووەتەوە پیایاندا، بە هۆی (با)وە بارانیان بۆ دەبارێنێت. بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ ﴾ واتە: وە لە نیشانەکانی

ئەو(خوا) کە چەند بایەکی مژدەدەر(بە بارینی باران) دەنێرێت بۆ ئەوە هەندێ لە(بارانی) بەزەیی خۆیتان پێ بچەژێت. واتە: ئەو بارانەی کە ڕەوانەی دەکات، دەڕوات و دەبارێت بەسەر بەندەکانیدا لەو ولاتانەدا کە تیایدا دەژین، ﴿وَلِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ﴾ واتە: کەشتی دێت و دەچێت لە دەریادا بە هۆی باوە. ﴿وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ڕۆزی خۆتان بە دەست بێنن لەناو دەریاکانداو لە هەرێمێکەوە بچن بۆ هەرێمێك و لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تر، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: هەتا سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو بەهرەیەی کە پێی بەخشیون چ دیارو چ نادیار کە لە ژمارە نایەن.

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ﴾ ئەم ئایەتە دڵ دانەوەیەکە لە خوای مەزنەوە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد(ﷺ) کە هەر ئەو نیە زۆرێك لە هۆزەکەی بڕوای پێ ناهێنن، بەڵکو زۆرێکیش لە گەلە پێشووەکان بڕوایان نەهێناوە بە پێغەمبەرەکانیان کە بۆیان ڕەوانە کراوە، بەو هەموو بەڵگە ئاشکرانەوە کە پیشانیان داون، بەڵام خوای خاوەن دەسەڵات تۆڵەی بە زەبری داون بە هۆی ئەو دژایەتیو بڕوا نەهێنانەیان بە پێغەمبەرەکانیان، خاوەن باوەڕانیشی نەجات داوە بە هۆی ئەو پێغەمبەرانەوە(سەلامی خوایان لێ بێت)، ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: خوای مەزن بەڵێنی خۆی داوە بە خاوەن باوەڕان کە یارمەتیان دەدات و ئەم سەرخستنەشی واجب کردووە لەسەر خۆی وەك ڕێزلێنانێك بۆیان. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ﴾[1] واتە: پەروەردگارتان بەزەییو میهرەبانی لەسەر خۆی پێویست کردووە.

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ
خِلَٰلِهِۦ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ
لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ
كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾﴾

**زیندووکردنەوەی زەوی بەڵگەیە لەسەر زیندووبوونەوە**

خوای گەورە باسی هەور دەکات کە چۆن وەدی دەهێنێت و بارانی لێ دەبارێنێت و دێتە خوارەوە دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا﴾ واتە: ئەو خوایەی کە با دەنێرێت و هەور

---

[1] الانعام(٥٤).

دەجولێنێت ئەو بارانە دەبارێنێت یان لە دەریاوە یان هەر چۆنێك خۆی مەیلی لێیەتی. ﴿فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ﴾ واتە: پاشان ئەو هەورە بڵاودەكاتەوە لەناو ئاسماندا كەم كەم زیاد دەكاتو زۆر دەبێت بەری ئاسمان دەگرێتو بە چاوی خۆمان دەیبینین پاشان دەكشێت بەسەر زەمیندا، ئەم هەورە لە ڕووی دەریاوە دێت قورسەو پڕە لە ئاو وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[1] واتە: وە ئەو(خوا) زاتێكە بایەكان دەنێرێت بە مۆژدەدەر پێش(بارانی) ڕەحمەتی پەروەردگار هەتا كاتێك هەوری قورس(ی باراناوی) هەڵدەگرن دەینێرین بۆ وڵاتێكی مردوو(وشكی بێ گیا) جا بەو(هەورە) باران دەبارێنین بە هۆی ئەوەوە هەموو جۆرە بەروبومو میوەیەك(دەڕوێنینو) دەردەهێنین هەر بەو وێنەیە مردووەكان لە زەوی دەردەهێنین(زیندوویان دەكەینەوە) تا ئێوە بیربكەنەوە. بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا﴾ موجاهیدو ئەبو عەمری كوڕی عەلاء دەڵێن: ﴿كِسَفًا﴾ واتە: پەڵەپەڵەی باراناوی، قەتادە دەڵێت: گەواڵ گەواڵ.[2] زەححاك دەڵێت: پەڵە هەوری لەسەر یەك، هەندێكی تر وتوویانە: هەورێك لەزۆری ئەو بارانەی هەڵیگرتووە ڕەش ئەنوێنێ، ئەیبینی زەوی داگیر كردووە و نزیك بوەتەوە لێی. ﴿فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ﴾ واتە: دەبینی لەو هەورانەوە دڵۆپەی باران دێتە خوارەوە. ﴿فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ واتە: بەو بارانە زۆر دڵخۆش دەبن لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیان بە باران بووە كە بۆیان ببارێت، پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ﴾ واتە: ئەو كەسانەی كە ئەم بارانەیان بۆ باری، پێش ئەو باران بارینە زۆر نائومێد بوون، كاتێك كە بارانەكە باری بۆیان لە حاڵێكی زۆر نائومێدی و زەبوونیدا بوون، بۆیە زۆر بە لایانەوە گرنگ بوو، یانی: زۆر پێویستیان بەو بارانە هەبوو، چونكە زۆر چاوەڕوان بوونو ماوەیەكی زۆری بەسەردا چووبوو بارانیان بۆ نەباریبوو، لە كاتی خۆی تێپەڕیبوو، هەر چاوەڕوانیان دەكرد. باران بارین هەر دوادەكەوت، ئەوانیش ماوەیەك تێپەڕیبوو هەر بە تەما بوون، پاشان دوای ئەم هەموو نائومێدیە لە پڕ بارانیان بۆ

---

[1] الاعراف(٥٧).

[2] الطبري(٢٠/١١٤).

باری. دوای ئەوەی گشت زەویەکانیان وشك هەلگەڕاو گیانی تێدا نەما، کەم کەم کەوتـە جوولـەو پـاراو بووەوەو گژوگیاو ڕووەکەکان سەوز بوونەوەو پڕبوونەوە. بۆیە خوای مەزن فەرموویـەتی: ﴿ فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: سەیری دلۆڤانی خودا بکە کە چۆن بـارانی باراند، ﴿كَيۡفَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ ﴾ واتە: ئەو زەویە مردووەی زیندوو کردەوە، دوای ئـەوە کـە هـیچ تەڕیـەکی تێـدا نـەمابوو وشـك هەلگەڕابوو. ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ ﴾ واتە: ئەو کەسەی توانای ئەوەی ببێت چاکتر دەتوانێت مـردوو زینـدوو بکاتـەوە. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ واتـە: وە هـەر ئـەویش بـە دەسـەلاتە بەسەر هەموو شتێکدا. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَئِنۡ أَرۡسَلۡنَا رِيحٗا فَرَأَوۡهُ مُصۡفَرّٗا لَّظَلُّواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ يَكۡفُرُونَ﴾ واتە ئەگەر بایەکی وشك بنێرێت بۆ سەر کشتوکالّەکەیان کە ناشتویانەو سەوز بـووەو لقی لێ داوەو خەریکە بەرهەم دەدات، زەردی بکات، هاواریان لـێ بەرزدەبێتـەوەو ناشـوکری دەکـەن و هیچ چاکەیەکیان لەبیر نامێنێت کە لەوەوپێش لەگەڵیاندا کراوە، وەك ئەم ئایەتـەی کـە خـوای گـەورە فەرموویـــەتی: ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ حُطَٰمٗا فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغۡرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ﴾[1] واتە: جا پێم بلـێن ئـەو تـۆوەی کـە دەیـچێنن، ئایا ئێـوە دەیڕوێنن؟ یا ئێمە دەیـڕوێنین؟، ئەگـەر بمانویـستایە ئـەو(ڕوواوە)مـان دەگێڕا بـە پـووش و کا ئـەنجا دەستتان دەکرد بە قسەی بێ کەڵك،(دەتانوت) بە ڕاستی زەرەر لێ کەوتوو ئێمـەین، بـەڵکو ئێمـە لـە ڕزق بێ بەشین.

﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِ ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡۖ إِن تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسۡلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾

**خوانەناسان مردوون، کەڕن و کوێرن**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ فَإِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ﴾ خـوای مەزن دەفەرمووێت چۆن تۆ نـاتوانی کارێك بکـەی ئەوانـەی وان لـەناو گـۆڕدا گوێـت بـۆ بگـرن وە هـەر چەندە هـاوار بکـەی ئـەوەی کـەڕە قـسەکانت نابیـسێ لەگـەڵ ئەوەیـشدا پـشتت تێدەکـەن هـەر بـەو شێوەیەش تـۆ نـاتوانی ڕێنمـایی کەسـێك بکـەیت بـۆ سـەر هـەق و بیگێڕیتـەوە لـە گـومڕایی کـە دڵـی داخرابێت و کوێر بێت لە ڕاستی هەق. بەڵکو ئەوە بە دەستی خودای گەورەیە. هەر ئەو دەتوانێ قسەی

---

[1] الواقعة(٦٣ـ٦٧).

زیندووەکان بگەیەنێت بە مردووەکان ئەگەر مەیلی لێ بێت، مەیلی لە هەر کەسێك بێت ڕێی نیشان دەداتو مەیلیشی لە هەر کەسێك بێت گومڕای دەکات. ئەمە بۆ غەیری خوای مەزن بۆ کەسی تر نیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ﴾ واتە: وە تۆ ڕێپیشاندەری نابینایان نیت لە گومڕاییان هەر ئەوانە گوێت بۆ دەگرن کە بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە هەیەو لە قسەت دەرناچن وەڵامت دەدەنەوەو فەرمانەکانت جێبەجێ دەکەن. ئەوانە شوێنکەوتووی هەقن، ئەمە حاڵو ژیانی خاوەن باوەڕە، نموونەی یەکەمیش حاڵو ژیانی خوانەناسە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی لە ئایەتێکی تردا: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسْمَعُونَ ۘ وَٱلْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی تەنها ئەوانە وەڵامی تۆ دەدەنەوە کە(بە دڵ) دەبیسن مردووەکانیش(ئەوانەی باوەڕ ناهێنن) خوا زیندوویان دەکاتەوە پاشان هەر بۆ لای خۆی دەگەڕێنەوە.

عائیشەی دایکی موسڵمانان(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی: ﴿فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾ بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی کە عەبدوڵای کوڕی عومەر ڕیوایەتی کردووە، وای زانی کە پێغەمبەر(ﷺ) قسەی لەگەڵ کوژراوەکانی بەدردا کردووەو دوای سێ ڕۆژ لە چاڵاوێکی بەدردا، سەرزەنشتو لۆمەی دەکردن، هەتا عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا قسە لەگەڵ کۆمەڵێکدا دەکەی کە بۆنیان کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەست، ئەوەی من پێیان ئەڵێم ئێوە لەوان چاکتر نابیسن، بەڵام وەڵام نادەنەوە).[2] عائیشە وا مانای کردووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەوانە ئێستا چاك دەزانن ئەوەی کە من پێم وتن هەق بووە).[3] قەتادە دەڵێت: خوای گەورە ئەو بێباوەڕانەی زیندووی کردوونەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ)تا ئەو قسانەی ئەویان بیستووەو گوێیان لێ بووە بۆ سەرزەنشتکردنیانو زیاتر ناڕەحەت بوونو ئازاردانیان[4].

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾﴾

---

[1] الانعام(٣٦).

[2] فتح الباري(٣٥١/٧).

[3] فتح الباري(٣٥١/٧).

[4] فتح الباري(٣٥١/٧).

## باسی ئەو گۆڕانكاریە جیاجیایانەی بەسەر مرۆڤدا دێت

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً﴾ واتە: خوا زاتێكە ئێوەی دروست كردووە لە لاوازی(لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرەخۆر...) پاشان دوای لاوازی بەهێزی كردوون(بوون بە لاو) واتە خوای گەورە مەردم ئاگادار دەكاتەوە لەو گۆڕانكاریانەی كە بەسەریاندا دێت لە پلە جیاجیاكانی وەدیهێنانیاندا، یەك لە دوای یەك، لە بنەڕەتدا لە خۆڵ دروستكراوە پاشان لە تنۆكێك ئاو پاشان لە خوێنی بەستوو و پاشانیش لە پارچە گۆشتێك، گۆشتەكەیشی دەبێت بە ئێسك و لە دوایدا ئێسكەكەشی بە گۆشت دادەپۆشێت و گیانی دەكرێت بەبەرداو پاشان لە سكی دایكی بەبێ هێزی و لاوازی دێتە دەرەوە، پاشان وردەوردە گەورە دەبێت هەتا دەبێتە منداڵێكی بچووك، پاشان پێدەگات و هەست و نیازی بەهێز دەبێت، دەبێتە لاوێك بەهێز دەبێت دوای لاوازی، پاشان كەم كەم بەرەو لاوازبوون دەچێتەوەو دەڕوات بە ساڵاو پیر دەبێت، گشت ئاوات و جوڵەو دەسەڵاتی كەم دەبێتەوە قژو بن جاینی سپی دەبێت، هەموو شێوازێكی دەرەوەو ناوەوەی لەش دەگۆڕێت بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ واتە: لە دوای بەهێزكردنتان لاوازی و پیری بۆ دانان، واتە بە مەیلی خۆی هەرچی بوێت دەبێت هەرچۆنی بوێت لەگەڵ بەندەكانیدا دەیكات. ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾ واتە: زاناو توانا هەرخۆیەتی.

﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟
ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ
﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾﴾

## تێنەگەیشتوویی و بێئاگایی خوانەناسان لە دنیاو قیامەتدا

خوای گەورە باسی نەفامی و نەزانی خوانەناسان دەكات لە دونیاو قیامەتدا، لە دنیادا دەستیان داوەتە بتپەرستی و لە ڕۆژی قیامەتیشدا زۆر بێئاگان، بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾ واتە: وە ڕۆژی قیامەت هەڵدەسێت، (لەو ڕۆژەدا) تاوانباران سوێند دەخۆن كە ماوەیەكی زۆر كەم نەبێت نەژیاون لە دنیادا، مەبەستیان ئەوەیە كە هیچ بەڵگەیەكیان پێ نەدراوە و بیانوویان هەیە كە كافرن! ئەوانە مۆڵەتیان پێ نادرێت كە بروبیانوو بهێننەوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ﴾ واتە: بەو شێوەیە هەر شوێنی درۆ كەوتوون. ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ

أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَـٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ﴾ واتە: زانا خاوەن باوەڕەكان لە ڕۆژی دواییدا وەڵامیان دەدەنەوە، وەك لە دنیا بەڵگەی زۆریان بۆ هێناونەتەوە، كاتێك كە ئەوان سوێند دەخۆن تەنها كەمێك نەبێت لە دنیادا نەژیاون ئەمانیش پێیان دەڵێن: ﴿لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ﴾ واتە: بەدڵنیاییەوە ئێوە وەك لە كتێبی كردارەكانتاندا خودا نووسیوویەتی مانەوە و ژیان تا ڕۆژی زیندووبوونەوە، ﴿فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ﴾ واتە: جا ئەمە ئەو ڕۆژی زیندووبوونەوەیە، ﴿وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ واتە: بەڵام ئێوەنەتازانییوە. ﴿فَيَوْمَئِذٍ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ﴾ واتە: بڕوبیانوویان لێ وەرناگیرێت لەسەر ئەو كردارانەی كە پێی هەڵساون‌و كردوویانە، ﴿وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ واتە: وە ئەوانە جارێكی تر ناگەڕێنەوە بۆ دونیا كە پەشیمان ببنەوەو داوای لێخۆشبوون بكەن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ﴾[1] واتە: داوای لێبوردنیش بكەن هەرگیز لێیان قەبوڵ ناكرێت.

﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾﴾

## هێنانەوەی نموونە لە قورئاندا بۆ خوانەناسان‌و پەند وەرنەگرتنیان لێی

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ﴾ واتە: ئێمە ڕاستیمان ڕوون كردەوە بۆ خەڵكی و ڕێنماییمان كردن‌و نموونەی زۆریشمان هێنایەوە بۆیان، بۆ ئەوەی ڕێی ڕاست بگرنەبەرو شوێنی بكەون، ﴿وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ﴾ واتە: هەر نیشانەیەكیان ببینیایە، بە مەیلی خۆیان بووایە یان بە مەیلی خۆیان نەبووایە، باوەڕیان پێ نەدەهێنا وایاندەزانی جادو و شتی پڕوپوچە، وەك لە لەتبوونی مانگ و چەند نموونەی تری وەك مانگدا دەیانوت. وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتێكی تردت فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[2] واتە: بە ڕاستی

---

[1] فصلت(٢٤).

[2] یونس(٩٦ـ٩٧).

ئەوانەی دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت، بڕواناهێنن هەرچەند بۆیان بێت هەموو بەڵگەو نیشانەیەك هەتا دەبینن(بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: ئا بەو جۆرە خوا مۆر دەنێت بەسەر دڵی کەسانێك کە بێئاگاو نەزانن. ﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ واتە: تۆ خۆڕاگربە لەسەر ئەو دژایەتی‌و لاساری خوانەناسانە، خوای گەورە بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێت‌و سەرت دەخات بەسەریانداو پاشەڕۆژیش هەر بۆ تۆو شوێنکەوتووەکانتە لە دونیاو لە قیامەتدا. ﴿وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾ واتە: با ئەوانەی بێباوەڕن لە ئاینی ڕاست لات نەدەن‌و بێزارت نەکەن. واتە ڕاوەستە لەسەر ئەو پەیامەی کە خودا بە تۆدا ناردوویەتی، چونکە هەر ئەوە هەقەو گومانی تێدا نیە، لێی لامەدە، غەیری ئەو پەیامە هیچ شتێکی تر بۆ ئەوە ناشێت کەس شوێنی کەوێ، چونکە ڕاستی هەمووی لەودا کۆبووەتەوە.

**ئەو فەرموودەی کە ڕیوایەت کراوە لە بارەی ڕێزی سورەتی( الروم )و خێری خوێندنی لە نوێژی بەیانیدا**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە پیاوێکەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی بۆ کردن لە نوێژەکەدا سورەتی(الروم)ی خوێندو لێی تێکچوو، کاتێك کە لە نوێژەکە بوویەوە فەرمووی:(ئەوەی تووشی هەڵەی کردین لە قورئان خوێندنەکەماندا ئەوەبوو لە ڕاستیدا کۆمەڵێك لە ئێوە نوێژ دەکەن لەگەڵماندا بەڵام باش دەستنوێژ ناگرن. جا با چاك دەستنوێژ بگرن).[1] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی چاکن‌و مەتنەکەیشی هەر چاکە، بە ڕاستی نهێنییەکی سەیرو هەواڵێکی گرنگیشی تێیدایە ئەویش ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کەموکوڕی‌و ناتەواوی دەستنوێژی ئەو کەسانەی کە لە دواییەوە نوێژیان دەکرد کاری تێکردووە لە نوێژەکەیدا، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژی ئەو کەسانەی کە لە دوای پێش نوێژەوە نوێژ دەکەن پەیوەستە بە نوێژی پێشنوێژەکەوە.

**تەفسیری سورەتی( لقمان )**

**لە مەککە دا هاتووەتەخوارەوە**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾﴾

---

[1] احمد(٣/٤٧١).

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ واتە: ئەم ئایەتانە لە ئایەتەکانی پڕ لە حیکمەتو داناییە، هۆی ڕێنموونیو بەزەیین بۆ چاکەکاران، ئەوانەی کە نوێژ بەجێ دێننو زەکات دەدەن هەروەها باوەڕی بتەویان بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوانە لەسەر ڕێنموونین لە لایەن پەروەردگاریانەوە. لە پێشەوە لە سەرەتای سورەتی(البقرة)دا بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی پەیوەندی بەم ئایەتانەوە هەیە باسکراوە، کە خودای مەزن ئەم ئایەتانەی کردووەتە شیفاو ڕێنیشاندەرو بەزەیی بۆ ئەو کەسانەی کە چاکەکارنو هۆکاری چاکە دەگرنەبەر لە شوێنکەوتنی ئایینو شەریعەتی خوداو نوێژە فەرزەکانیان ئەکەن لە کاتی خۆیداو سوننەتەکانیشی لەگەڵیدا بەجێ دەهێنن، ئەو زەکاتەیشی کە لەسەریان واجب بووە ئەیدەن بەو کەسانەی کە بۆیان شیاوە، پەیوەندی خزمایەتیشیان بە چاکی بەڕێوەدەبەن و نایپچڕن، بە تەمای پاداشتی ڕۆژی دواین، وە هەر لەبەر ڕەزای خواو پاداشتی ئەو، ئەو کارانە بەجێ ئەهێنن و ڕیاکار نین و بە تەمای هیچ کەسێك نین کە پاداشتیان بداتەوەو سوپاسیان بکات هەر کەسێك بەو شێوەیەی کردبێت، ئەوە لەو کەسانەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ واتە: لە دونیاو قیامەتدا هەر ئەوانە ڕزگارن.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٧﴾﴾

**هەندێ کەسی بەدبەخت هەن خۆیان خەریك دەکەن بە قسەی بێتامەوەو ڕوویان وەردەگێڕن لە نیشانەکانی خودا**

کاتێك خوای گەورە باسی ژیانی خۆشبەختانی کرد، ئەوانەی کە ڕێیان گرتەبەر بەهۆی کتێبی خواوە کە قورئانەو سوودمەندبوون بە گوێگرتن لێی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ﴾[1] واتە: خوا جوانترین فەرمایشی ناردووەتە خوارەوە قورئانێکە (کە ئایەتەکانی) لەیەکچووی دووپاتکراوەن ئەو کەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن، پێستیان تەزووی پێدادێت(بە بیستنی

[1] الزمر(٢٣).

قورئان) پاشان پێستیانو دڵیان نەرم دەبێت بە یادی(قورئانی) خودا. پاشان دێتە سەرباسی ئەو کەسانەی کە بەدبەختنو خۆیان لادەدەنو گوێ ناگرنو بۆ قسەی خواو سودی لێ وەرناگرن، بەڵکو ڕوودەکەنە قسەی خراپو بێتامو گۆرانیو تەپڵو مۆسیقاو دەیکەنە گاڵتەجاری، وەك ئیبنو مەسعود لەم ئایەتانەدا: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ دەڵێت: سوێند بە خوا مەبەست پێی گۆرانی وتنە.[1] قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ بە خوا لەوانەیە ئەو کەسانە ماڵ نەبەخشن لەو ڕێگایەدا، بەڵام ئارەزوویان بۆ ئەو کارە خراپانە وایان لێدەکات کە قسەی پڕوپوچ هەڵبژێرنو قسەی ڕاست واز لێ بێننو ئەوەی زیان بەخشە هەڵی بژێرنو ئەوەیشی بەسوودە وازی لێ بێنن.[2] وتراوە: مەبەست بەم ئایەتە: ﴿يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ واتە: کڕینی گۆرانی بێژان لە ئافرەتانی لاو. ئیبنو جەریر ڕای وایە ﴿لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ﴾ هەموو قسەیەکە ببێتە لەمپەر لە ڕێی ئایەتەکانی خوداو شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی.[3] ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەو کارە لەبەر ئەوە بێت دژایەتی ئیسلامو موسڵمانانی پێ بکات، ﴿وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا﴾ موجاهید دەڵێت: ڕێگەی خودا بکاتە گاڵتەجاڕیو سوکایەتی پێ بکات.[4] ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ واتە: هەرچۆنێك ئەوانە سوکایەتیان کرد بە ئایەتەکانی خوداو ڕێبازەکەی ئەوانیش لە ڕۆژی قیامەتدا سوکایەتیان پێ دەکرێتو لە سزای بەژاندان بەبەردەوامی. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا كَأَنَّ فِيٓ أُذُنَيۡهِ وَقۡرٗا ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە ڕوودەکاتە گاڵتەو گەپو گۆرانیو تەپڵو مۆسیقا، کاتێك کە ئایەتەکانی قورئانی بەسەردا دەخوێنرێت پشتی تێ دەکاتو پێی ناخۆشەو خۆی دەکاتە کەڕ وەکو هەر گوێی لێ نەبێت وایە، پێی ناخۆشەو حەز لە بیستنی ناکات چونکە سودی لێ وەرناگرێتو کاری پێی نیە، ﴿فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ﴾ واتە: مژدەی ئازارێکی ژاناوی بدە بەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا وەك چۆن ئەو دڵتەنگ دەبوو بە بیستنی قورئانو ئایەتەکانی.

---

[1] الطبري(٢٠/١٢٧).

[2] الطبري(٢٠/١٢٧).

[3] الطبري(٢٠/١٣٠).

[4] الطبري(٢٠/١٣١).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾﴾

### باسی پاشەڕۆژی چاکی خاوەنباوەڕان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە. ئەمە باسی پاشەڕۆژو ئاکامی ئەو کەسە چاکو بەختەوەرانەیە کە بڕوایان هێنا بە خواو پێغەمبەرەکانی خوا(سەلامی خوایان لێ بێت) هەڵسان بە پەیڕەوی کردنو بەجێهێنانی بەرنامەی خودا، ﴿لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتە: بەشی ئەوان باغاتی پڕ خێروبێرە کە تێیدا دەژینو ڕادەبوێرن، لە هیچ شتێك کەمیان نیە لە خواردنو خواردنەوەو هۆکاری سواریو خێزانو بینینو بیستنو زۆر شتی تر کە بە دڵی کەسدا نەهاتووە. بە هەمیشەیی لەو باغانەدا دەمێننەوەو لێی دەرناچنو بەجێی ناهێڵن، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا﴾ واتە: هەتاهەتایە دەمێننەوە تیایدا بەڵێنی خوایەو هەر دێتەدی، خوا لە بەڵێنی خۆی پەشیمان نابێتەوە، چونکە خودا زۆر گەورەو بەخشندەیەو هەرچی بوێت دەیکاتو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ﴾ واتە: هەر ئەو دەسەڵاتدارو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، هەموو کەسێك سەری بۆ ئەوی دەکات. ﴿ٱلْحَكِيمُ﴾ لە کردارو گفتاردا کارزانەو قورئانی کردووەتە ڕێنیشاندەر بۆ خاوەن باوەڕان، وەك لەم ئایەتانەدا فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾[1] واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێك باوەڕیان پێ هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانەو ئەوانەی باوەڕی پێ ناهێنن لە گوێیاندا گرانیو کەڕی هەیە(لە بیستنی حەق) هەروەها لە ئاست ئەو قورئانەدا کوێرن. وە فەرموویەتی: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾[2] واتە: وە لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفاو میهرەبانیە بۆ بڕواداران بەڵام(هاتنی ئەم قورئانە) بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات بۆیان خەسارەتمەندی نەبێت.

---

[1] فصلت(٤٤).

[2] الاسراء(٨٢).

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿١١﴾ ﴾

**بەڵگەکانی یەکخواپەرستی**

خوای گەورە بەم شێوەیە تواناو دەسەڵاتی خۆی دەردەخات کە چۆن ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی تێیاندایەو لە نێوانیاندایە دروستکردووە، فەرموویەتی: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴾ حەسەنو قەتادە دەڵێن: نە ئەستونی دیارو نە ئەستونی نادیاری تێدا نیە.[1] ﴿وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ ﴾ واتە: کێوەکانی خستە سەر زەمینو قورسی کرد بۆ ئەوەی جووڵە بە ئێوە نەکات لەسەر دەریاو ئاوەکان. بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَن تَمِيدَ بِكُمۡ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی لەرزە بە ئێوە نەکات. ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖ ﴾ واتە: لە هەموو جۆرە گیانەوەرێکی تێدا بڵاوکردووەتەوە کە هیچ کەسێك ژمارەو شێوەو ڕەنگیان نازانێت غەیری ئەو کەسەی کە دروستی کردووە، بۆیە خوای پاكو بێ عەیب کاتێك فەرموویەتی دروستکەرە، ئاگاداریشی کردووین کە هەر خۆیشی ڕۆزی دەرەو دەفەرمووێت: ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجٖ كَرِيمٍ ﴾ واتە: لە ئاسمانەوە بارانمان باراندووە بە هۆی ئەو بارانەوە لە زەویدا جوتەی هەموو جۆرە ڕووەکێکی ڕواندووە، شەعبی دەڵێت: مەردمیش هەر لە سەوزبووی زەویە، هەر کەسێك چووە بەهەشت ئەو دیارە بەڕێزبووە، هەر کەسیش چووە ناو ئاگر ئەو دیارە سپڵە بووە. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەوەی خودا باسیکرد لەوەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەمین و لەوەی کە لە نێوانیاندایە خودا دروستی کردوون، بە بڕیاری ئەو بووە، هیچ کەسێك شەریکی نەبووە لە دروستکردنیدا بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ﴾ واتە: نیشانم بدەن غەیری خودا لەو شتانەی دەیانپەرستنو هانایان بۆ دەبەن چیان کردووەو چیان دروست کردووە، ﴿بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ واتە: بتپەرستانو ئەوانەی کە هاوەڵیان داناوە بۆ خوداو لەگەڵیدا پەرستوویانە، ﴿فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ واتە: لە گومراییدانو کوێرو نەفامن، ﴿مُّبِينٖ ﴾ واتە: دیارو ئاشکرایەو ئاشارێتەوە.

[1] الطبري(٢٠/١٣٢).

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾﴾

**باسی لوقمان**

زانایانی پێشینە دوو ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر لوقمان، ئاخۆ پێغەمبەر بووە یان بەندەیەکی ساڵحو چاك بووەو پێغەمبەر نەبووە؟ زۆربەیان لەسەر ڕای دووهەمن کە پێغەمبەر نەبووە، سوفیانی سەوری دەڵێت: لە ئەشعەسەوە لە عیکریمەوە، لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: لوقمان بەندەیەکی حەبەشی دارتاش بووە.[1] وە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر دەڵێت: وتم بە جابیری کوڕی عەبدوڵا چی دەزانو بە چی گەیشتوون لە بارەی لوقمانەوە؟ وتی: پیاوێکی کورتەباڵای لوت کوڵ بووە خەڵکی نوبەیە کە ناوچەیەکی فراوانە لە سودان،[2] یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنساری دەڵێت: سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: لوقمان خەڵکی سودانی میسرە، پێڵوی چاوم قایم بووە خوای گەورە کارزانی داوەتێ، پێغەمبەرێتی نەداوەتێ[3]. ئەوزاعی دەڵێت: عەبدوڕەحمانی کوڕی حەرمەلە بۆی گێڕامەوە وتی: پیاوێکی ڕەش هات بۆ لای سەعیدی کوڕی موسەیب پرسیاری لێ بکات، سەعیدی کوڕی موسەیب پێی وت: غەم مەخۆ لەبەر ئەوەی کە ڕەشی، چونکە لە چاکترین خەڵك سێ کەس بوون لە ڕەشەکان، بیلالو مەهجەعی ڕەنجبەری عومەری کوڕی خەتابو لوقمانی حەکیم کە ڕەش بووەو خەڵکی نوبەیە ناوچەیەکی فراوانە لە سودان و پێڵوی چاویشی گەورە بووە[4]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە خالیدی کوڕی ڕەبحیەوە دەڵێت: لوقمان عەبدێکی حەبەشی دارتاش بوو، خاوەنەکەی پێی وت: ئەم مەڕەمان بۆ سەربڕە، سەری بڕی، جا پێی ووت: چاکترین پارچە گۆشتی لێدەربهێنە بۆمان، لوقمانیش دڵو زمانەکەی دەرهێنا، پاشان ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشت، پاشان ئەڵێ: خاوەنەکەی وتی: ئەم مەڕەمان بۆ سەربڕە، ئەویش سەری بڕی، وتی: پیسترینو خراپترین پارچە گۆشتی لێدەربهێنە، لوقمان زمان و دڵەکەی دەرهێنا، خاوەنەکەی پێی وت: فەرمانم پێ کردی کە چاکترین پارچە گۆشتی لێدەربهێنە، زمانو دڵەکەت لێدەرهێنا، وە فەرمانم پێکردلا کە پیسترین پارچە گۆشتی لێدەربهێنە، زمانو دڵەکەتت لێدەرهێنا، لوقمان وتی: چونکە هیچ شتێك نیە لەوانە چاکتر بێت ئەگەر چاك بن، وە هیچ شتێك لەوانە پیستر نیە ئەگەر خراپ بن.[5] شوعبە دەڵێت لە حەکەمەوە لە موجاهیدەوە: لوقمان

---

[1] الطبري(٢٠/١٣٥).

[2] انب أبي حاتم، الدر المنثور(٥/٣١٠).

[3] الطبري(٢٠/١٣٥).

[4] الطبري(٢٠/١٣٥).

[5] الطبري(٢٠/١٣٥).

عەبدێکی چاكو ساڵح بووە، پێغەمبەر نەبووە.[1] ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ﴾ واتە: كارزانیو تێگەیشتنو زانیاریو ڕەوانبێژیمان دا بە لوقمان، ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ﴾ واتە: پێمان وت: كە سوپاسی خوای مەزن بكات لەسەر ئەو شتانەی كە بە تایبەتی بە ئەومان داوە لەناو هاوڕەگەزو خەڵكی زەمانی خۆیدا، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ﴾ واتە: هەر كەسێك سوپاسی خوا بكات سودەكەی هەر بۆ خۆی دەگەڕێتەوە وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ﴾[2] واتە: هەر كەسیش كردەوەی چاكی كردبێت شوێن بۆ خۆیان(لە بەهەشتدا) ئامادە دەكەن. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ واتە: هەر كەسیش بیشارێتەوەو پێی نەزانێت بێگومان خودا بێنیازەو شایانی سوپاسە. وە هیچ زیانێك بە خودا ناگات ئەگەر هەموو خەڵكی سەر زەمین حاشا بكەنو پێی نەزانن، پێویستی بە كەسی نیە، هیچ پەرستراوێك نیە جگەلە ئەو عیبادەتی غەیری ئەو ناكەین.

﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾

### ئامۆژگاریو وەسیەتی لوقمان بۆ كوڕەكەی

خوای گەورە باسی لوقمان دەكات كاتێك كە ئامۆژگاری كوڕەكەی خۆی دەكرد(ناوی لوقمانی كوڕی عەنقای كوڕی سەدونە كوڕەكەی ناوی ساران بووە)، لەو ڕیوایەتەدا كەسوهەیلی گێڕاویەتیەوە. خوای گەورە وەسفێكی زۆر جوانی كردووە، فەرموویەتی لەسەر كارزانی ڕامان هێناوە، ئەوەتا ئامۆژگاری ڕۆڵەكەی دەكات كە خۆشەویسترین كەسە لە لایو فرەبەسۆزە بۆی، زۆری پێخۆشە كە چاكترین شتێك خودا پێی داوە بەشی ڕۆڵەكەیشی لێ بدات، بۆیە ئەكەمجار ئامۆژگاری دەكات كە لە دنیا هەر خودا بپەرستێتو شەریكی بۆ دانەنێت لە هیچ شتێكدا، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: شەریك بۆ خوادانان

---

[1] الطبري(٢٠/١٣٤).

[2] الروم(٤٤).

گەورەترین ناهەقیە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵاوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ﴾[1] واتە: ئەوانەی کە بروایان هێناوەو بڕواکەیان تێکەڵ بە ستەم(هاوەڵ دانان) نەکردووە. زۆر گران بوو لەسەر هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەڵێن: ئاخۆ کێ لە ئێمە ناهەقی نەکردووە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەوە بەو شێوەیە نیە کە ئێوە باسی دەکەن، ئایا گوێ ناگرن بۆ ئامۆژگاریەکەی لوقمان کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[2] پاشان لە ئامۆژگاریەکەیدا چاکەکردنی لەگەڵ بابو دایکدا لە پاڵ شەریك دانەنان بۆ خوا داهێناوە وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾[3] واتە: پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێك نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایکو باوکتان چاکە بکەن. وە لە زۆر شوێندا لە قورئاندا باسی دایكو باوك هاتووە لە پاڵ شەریك دانەنان بۆ خودا، لێرەدا خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ﴾ واتە: وە فەرمانمان داوە (بە چاکی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ) دایكو باوکیدا، دایکی هەڵی دەگرێت بە دووگیانی (پێی لاواز دەبێت) لاوازی لە دوای لاوازی. موجاهید دەڵێت: ناڕەحەتیو گرانی منداڵ بوون[4]. قەتادە دەڵێت: ناڕەحەتی لە دوای ناڕەحەتی.[5] عەتای خۆراسانی دەڵێت: بێهێزی لە دوای بێهێزی، ﴿وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ﴾ واتە: پەروەردەکردنو شیرپێدانی لە ماوەی دوو ساڵدا، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾[6] واتە: دایکان شیر دەدەن بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو(ئەمە) بۆ کەسێکە کە بیەوێت شیری تەواو بدات. ئا لێرەدا ئیبنو عەباسو هەندێ لە پێشەوایانی ئیسلام وەریان گرتووە، ئەڵێن: کەمترین ماوەی سکپڕی شەش مانگە چونکە خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾[7] واتە: ماوەی دووگیان بوون(ی دایك)

---

[1] الانعام(٨٢).
[2] فتح الباري(٨/٣٧٢).
[3] الاسراء(٢٣).
[4] الطبري(٢٠/١٣٧).
[5] الطبري(٢٠/١٣٧).
[6] البقرة(٢٣٣).
[7] الاحقاف(١٥).

پێیەوەو لە شیرین بڕینەوەی سی مانگە. بۆیە خوای گەورە باسی پەروەردەی منداڵو مەینەتیو گرانیو شەونخونیو ماندووبوونی دایك دەكات، تا ڕۆڵەكەی ئەو چاكانەی لە یاد بێت كە لەگەڵی كردوویەتی، وەك لە شوێنێكی تردا لە قورئاندا خودا فەرموویەتی: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴾[1] واتە: بڵێ ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بكە هەرچۆنێك ئەوان منیان پەروەردەكرد بە منالی. بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ إِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتە:سوپاسی من بكەو سوپاسی دایكو باوكیشت بكە، لە ئاكامدا هەر دێنەوە بۆ لای من، بەو زووانە پاداشتت دەدەینەوە بە چاكتر. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَاۖ وَصَاحِبۡهُمَا فِي ٱلدُّنۡيَا مَعۡرُوفٗاۖ﴾ واتە: ئەگەر زۆر هەوڵیان دا كە شوێن ئایینی ئەوان بكەوی، شوێن ئایینی ئەوان مەكەوەو لێیان قەبوڵ مەكە. بەڵام هەر بە چاكە ڕەفتاریان لەگەڵ بكەو باش بە بۆیان لە دونیادا. ﴿وَٱتَّبِعۡ سَبِيلَ مَنۡ أَنَابَ إِلَيَّۚ﴾ واتە: شوێن ئەوانە بكەوە كە بەرەو من هاتوون لە خاوەن باوەڕان، ﴿ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ واتە: لە دوارۆژدا گەڕانەوەتان تەنها بۆ لای منە. پاشان ئاگادارتان دەكەم لەوەی كردووتانە. تەبەرانی ڕیوایەتی كردووە لە (كتاب العشرة)دا كە سەعیدی كوڕی مالك دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر من هاتە خوارەوە، ﴿جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَا﴾ دەڵێت: من پیاوێكی زۆر گوێڕایەڵو چاك بووم لەگەڵ دایكم كاتێك كە موسڵمان بووم، دایكم وتی: ئەی سەعد ئەمە چیە دەتبینم تازە دەستت داوەتێ، ئەگەر واز نەهێنیتو دەست هەڵنەگری لەو دینە نە خواردن دەخۆم نە ئاو دەخۆمەوە، هەتا دەمرم بۆئەوەی خەڵكی قسەت پێ بڵێن و لۆمەت بكەن لەسەر من، بڵێن: ئەی بكوژی دایكی خۆی، منیش پێم وت: دایكە وا مەكە، چونكە من واز لەم دینە ناهێنم بۆ هیچ شتێك، شەوو ڕۆژێك مایەوە خواردنی نەخوارد، بەیانی هەڵسا زۆر ناڕەحەت بوو، شەوو ڕۆژێكی تریش هەر خواردنی نەخوارد، كە بەیانی لێهات زۆر ناڕەحەت بوو، كاتێك ئەوەم پێوە بینی، وتم: ئەی دایكە ! سوێند بە خوا چاك بزانە ئەگەر سەد گیانت پێ بێت یەكە یەكە هەمووی دەرچێت واز لەو ئاینەم ناهێنم بۆ هیچ شتێك، ئارەزووی خۆتە، خواردن دەخۆی یان خواردن ناخۆی، ئەڵێ: دوای ئەوە دەستیكرد بەخواردن[2].

---

[1] الاسراء(٢٤).

[2] ذكره ابن الأثير فس أسد الغابة

﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ
ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَۖ إِنَّ ذَٰلِكَ
مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ ﴿١٨﴾
وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾

ئەمە چەند ئامۆژگاریەکی زۆر بەسوودە کە خوای مەزن لەسەر زمانی لوقمان باسی دەکات بۆ ئەوەی خەڵکی چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون و پێی هەڵسن، دەفەرموێت: ﴿ يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ ﴾ واتە: ئەی کوڕە شیرینەکەم! تاوان با بەئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەکیش بێت، یانی: ئەو ناهەقیە یان ئەو تاوانە بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك بێت، ﴿يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا دەیهێنێت و ئامادەی دەکات کاتێك کە تەرازووی عەدالەت دادەنرێت، هەموو کەسێك پاداشتی خۆی وەردەگرێت، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندن، هەندێ لایان وایە کە ئەو زەمیرە لە ﴿إِنَّهَآ﴾ زەمیری شەئنە بۆیە بە لایانەوە دروستە، ﴿مِثۡقَالَ﴾ مەرفوع بێت لەباتی ئەوەی منصوب بێت، بەڵام ڕای یەکەم چاکترە کە مەنصوبە، وەك لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ ﴾[1] واتە: وە ئێمە تەرازووەکانی دادپەروەری دادەنێین(کە کردەوەی پێ دەکێشرێت) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێت. وە فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾[2] واتە: ئینجا هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، وە هەر کەسێك بە ئەندازەی هەرە وردیلەیەك خراپەی کردبێت دەیبینێتەوە. ﴿فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئیتر با ئەو دەنکە خەرتەلەیە لەناو بەردێکی ڕەقدا بێت و شارابێتەوەو قایم کرابێت، یان چووبێت بەناو ئاسمانەکان و زەمینداو دیار نەبێت، خودا دەیهێنێتەوە، چونکە خودا هیچی لێ بزرنابێت لەناو ئاسمانەکان و زەمیندا با لە ئەندازەی گەردیلەیەك بچوکتریش بێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴾ واتە: زانیاری خودا ئەوەندە وردە هیچی لێ ون نابێت با ئەو شتە هەرچەندە وردو زۆر کەمیش بێت، ﴿خَبِيرٞ ﴾ واتە: ئاگای لە تەپەی پێی مێروولەیە لە

[1] الانبیاء(٤٧).

[2] الزلزلة(٧ـ٨).

شەوی تاریکی نوتەکدا. پاشان فەرموویەتی: ﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە: کوڕی خۆم! نوێژ بکە لە کاتی خۆیدا بەو پێیەی کە لەسەرت فەرزکراوە، ﴿وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ واتە: فەرمان بدە بە چاکەکردن‌و ڕێ بگرە لە خراپە بە پێی تواناو دەسەڵاتی خۆت، ﴿وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ دیارە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تووشی ئازار بێت لە لایەن خەڵکەوە، بۆیە داوای لێکردووە کە خۆڕاگر بێت، وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ﴾ واتە: ئەمە لەو کارە گرنگانەیە کە خودا دەیەوێت‌و پێی خۆشە. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تُصَعِّرۡ خَدَّكَ لِلنَّاسِ ﴾ واتە: ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵکی کاتێك قسەت لەگەڵ کردن یان قسەیان بۆ کردی، خۆت بە زل بزانی‌و فیز بکەی بەسەریانداو بە چاوی سووک سەیریان بکەی. بەڵکو زۆر نەرم‌و ڕووخۆش بە لەگەڵیاندا وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر گەیشتی بە برایەکی موسڵمانت با ڕووت خۆش بێت لەگەڵی، نەکەی پۆشاك‌و کراسەکەت بەردەیتەوەو درێژ بکەیتەوە چونکە ئەوە کاری ئەو کەسانەیە کە خۆیان بە زل دەزانن کەسێکیش خۆی بە زل بزانێت خودا خۆشی ناوێت).[1] ﴿وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًا﴾ واتە: بە فیزو لووت بەرزی‌و لارو لەنجەوە بەڕێدا مەڕۆ، چونکە خودا لێت تووڕە دەبێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٖ﴾ واتە: خودا ئەوانەی خۆش ناوێت بە لارو لەنجە دەچن بە ڕێداو لە خۆیان ڕازین‌و خەڵکی بە چاوی سوك سەیر دەکەن. وەك لە ئایەتێکی تردا خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴾[2] واتە: وە مەڕۆ بە زەویدا بە کەشخەو شانازیەوە(چونکە) بە ڕاستی تۆ نە دەتوانی زەوی کون بکەیت وە نە دەگەیتە شاخەکان لە درێژیدا. لە شوێنی خۆیدا لە پێشەوە لەو بارەیەوە دواین.

### فەرماندان بە لەسەرخۆ ڕۆیشتن لە کاتی ڕۆیشتن بە ڕێگادا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ ﴾ واتە: برۆ بە ڕێدا بە ڕۆیشتنێکی مامناوەندی نە زۆر بە هێواشی وتە بە پەلەپەلیش، واتە بە لەسەرخۆیی‌و شێنەیی لەنێوان ئەو دووەدا، ﴿وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ﴾ واتە: زۆر درێژە مەدە بە قسەکردن‌و دەنگت بەرز مەکەرەوە لە ڕادەی خۆی کە سوودی

---

[1] ابو داود(٣٤٥/٤)، لە پێشەوە پلەی دیاری کراوە.

[2] الاسراء(٣٧).

نەبێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ﴾ موجاهیدو کەسانی تریش ئەڵێن: ناخۆشترین دەنگ دەنگی کەرە. واتە: ئەو کەسەی کە دەنگی بەرز دەکاتەوە، دەنگەکەی لە دەنگی کەر دەچێت، لەگەڵ ئەوەیشدا خودایش خۆشی لێی نایە، ئەم نموونە هێنانەوەیە بە دەنگی کەر، ئەوە دەگەیەنێت کە دەنگ بەرزکردنەوە حەرامەو زۆر بە خراپ باس کراوە، بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(نموونەی خراپ هێنانەوە لای ئێمە نیە، ئەو کەسەی کە پەشیمان دەبێتەوە لەو بەخشینەی کە دەیبەخشێت وەك سەگ وایە کە دەرشێتەوە پاشان دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی).[١] واتە ڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە.

### ئامۆژگاریەکی لوقمان

ئەمانە چەندئامۆژگاریەکی زۆر بەسوودن، لە بارەی لوقمانەوە قورئانی پیرۆز باسی کردوون، زۆد پەندو ئامۆژگاری لە لوقمانەوە ڕیوایەت کراوە ئێمە لێرەدا چەند نموونەیەکی لێ باسدەکەین. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەواڵی داینێ فەرمووی:(لوقمانی حەکیم وتوویەتی: کاتێك خودا شتێکی پێ سپێردرابێت پاراستوویەتی).[٢] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لوقمان ئامۆژگاری ڕۆڵەکەی دەکرد، دەیووت: کوڕەکەم نەکەی لوت بەرزانە بێیت و بچیت چونکە ئەوکارە لە شەودا جێی ترسەو لە ڕۆژدا جێی لۆمەو تیروتوانجە).[٣] ڕیوایەت کراوە لە سەری کوڕی یەحیاوە دەڵێت: لوقمان وتی بە کوڕەکەی، ڕۆڵەکەم! کارزانیو حیکمەت هەژارانی بردووەتە شوێنی پاشایان[٤]. دیسان لە عەونی کوڕی عەبدوڵاوە ڕیوایەت کراوە لوقمان بەکوڕکەی ووت: کوڕی شیرینم! ئەگەر چویتە هەر کۆڕو کومەڵێك ئەوە تیرەکەی ئیسلامیان تێبگرە، یانی سەلامیان لێبکە، پاشان لە تەنیشتیان دانیشە، هیچ قسە مەکە تا دەیانبینی ئەوان چۆن قسە دەکەن، ئەگەر دەستیان کرد بە یادی خوا تۆش تیرەکەی خۆت بە دوایاندا بهاوێژە، خۆ ئەگەر بە شتێکی ترەوە خەریك بوون لایان لاچۆو بڕۆ بۆ لای کەسانێکی تر[٥].

---

[١] تحفة الأحوزي(٤/٥٢٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] احمد(٢/٨٧)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[٣] الحاكم(٢/٤١١)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[٤] الدر المنثور(٥/٣١٦).

[٥] الزهد لابن مبارك(٣٣٢).

﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ السَّعِيرِ ﴿٢١﴾﴾

**وەبیرهێنانەوەی بەهرەو نیعمەتەکان**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ واتە: ئایا نەتانزانیوە کە بە ڕاستی خوا ڕامی هێناوە بۆتان ئەوەی لە ئاسمانەکانو ئەوەی لە زەویدایە وە نیعمەتەکانی بە فراوانی ڕشتووە بەسەرتاندا چ دیارو ئاشکراو چ پەنهانو نادیارو هەندێ لە ئادەمی موجادەلەو دەمەقاڵێ دەکات لە بارەی خواوە بەبێ هیچ زانیاریەك یا ڕێنموونیەك یان کتێبێکی ڕوونکەرەوە. خوای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەسەر ئەو هەموو بەهرانەی کە پێی بەخشیون لە دنیاو قیامەتدا، ئەوەتا دەیبینن کە ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە هەمووی بۆ ڕام هێناونو موسەخەرکردوون وەك ئەستێرەکان کە شەوی تاریکی بۆ ڕۆشن کردوونەتەوە، ڕۆژیش بەو ڕووناکیەو بەفرو بارانو تەرزەیان بۆ دەبارێنێتو ئاسمانی بەبێ هەسون وەستاندووە بەسەریانەوەو سەر زەمینیشی کردووە بە جێی حەوانەوەیانو ئاوو ڕووبارو دارودرەختو میوەو بەروبوومی زۆری تیا دروست کردووە بۆیان، خێروبێری زۆر دیارو نادیاری ڕێژاوە بەسەریاندا لە ناردنی پێغەمبەرانو(سەلامی خوایان لێ بێت) ڕەوانەکردنی کتێبو لابردنی گومانو دەردی دەروونی لە دڵیاندا، کەچی لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگانەدا هەر باوەڕ ناهێننو لاساری دەکەن هەیانە دەمەدەمێ دەکات لە بارەی خوداوەو شەریکی بۆ دادەنێت و بڕوا بە پێغەمبەرانو ئەو کتێبانەی کە بۆیان هێناون ناکات، ئەو کەسانە بەبێ زانیاری هەر قسە دەکەنو هیچ بەڵگەیەکی ڕاستیشیان بە دەستەوە نیە، وە هیچ کتێبێکیش کە جێی بڕوا بێت لایان نیە، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ﴾ واتە: ئەگەر بوترێت بەوانەی کە کێشە دەکەن لەسەر تەنهایی خودا، ﴿اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ یانی: شوێن ئەوە بکەون کە ڕەوانە کراوە بۆ پێغەمبەرەکەی کە بەرنامەو شەریعەتێکی پاکە، ﴿قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾ واتە: هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نییە ئەوەنەبێت کە دەڵێن: نەخێر ئێمە شوێن ڕێی باووباپیرانمان دەکەوین،

خوای گەورەیش دەفەرموویت: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ﴾[1] واتە: ئاخۆ ئێوە چۆن تێدەگەن ئەی ئەو کەسانەی کە کارو کردەوەی باووباپیرانتان کردووەتە بەڵگە کە ئەوان زۆر نەزان و گومڕابوون و ئێوەش بە شوێن کردارەکانی ئەواندا دەڕۆن و بەجێی دێنن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ واتە: هەرچەندە شەیتان بانگیان دەکات بۆ سزای ئەو ئاگرە بە کڵپەیە.

﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ هەرکەسێك ڕووی خۆی بکاتە خوا، باسی ئەو کەسە دەکات کە بە دڵێکی پاك و خاوێن ڕوودەکاتە خوداو ئاکاری چاك دەکات و شوێنی بەرنامەو شەریعەتی ئەو دەکەوێت بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ واتە: بە کرداریش ئەوەی خودا فەرمانی پێکردووە دەیکات و ئەوەیشی ڕێگەی نەداوە وازی لێ دێنێت، ﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ واتە: ئەوە ئەو کەسەیە پەیمانێکی پتەوی لە خوا وەرگرتووە کە سزای نادات، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ واتە: دیارە ئاکامی هەموو شتێکیش بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە. وە پاشان دەفەرموویت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟﴾ واتە: هەر کەسێك خوانەناسە با خوانەناسیەکەی دڵی تۆ غەمگین نەکات ئەی موحەممەد(ﷺ) چونکە بڕیاری خودا لە بارەیانەوە دێتەجێ و دێنەوە لای ئێمەو ئاگاداریان دەکەین لەو کارانەی کە کردوویانەو پاداشتیان دەدەینەوە. واتە: تۆڵەیان لێ دەسێنین. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: خودا هیچی لێ بزر نابێت و ئاگای لە دڵانە، پاشان خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا﴾ واتە: ماوەیەکی کەمیان دەدەینێ ڕابوێرن لە دنیادا، ﴿ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ﴾ واتە: پاشان ناچاریان دەکەین، ﴿إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ واتە: ئازارێکی زۆر ئابڕوبەرو دژوارو گرانیان دەدەین. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا

---

[1] المائدة(١٠٤).

مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە درۆ هەڵدەبەستن بە ناوی خواوە(هەرگیز) ڕزگار نابن،(چونکە) بەهرەو ڕابواردنێکی کەم لە دنیادا(بەسەر دەبەن) پاشان بۆ لای ئێمەیە گەڕانەوەیان ئینجا پێیان دەچێژرێت سزای زۆر توند بە هۆی ئەوەی کە بڕوایان نەهێنا(تا مردن).

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾﴾

## دانپیانانی موشریکەکان بەوەی کە هەر خودا وەدیهێنەرە

خوای گەورە باسی ئەو موشریکانە دەکات کە دان دەنێن بەوەدا کە خودا وەدیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەمینەو تەنهایەو هاوەڵی نیە، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا لە پەرستندا شەریکی بۆ دادەنێن، چاکیش دەزانن کە ئەو شەریکانە خودا دروستکەرو خاوەنیانە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی کێ ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کردووە بەدڵنیاییەوە ئەڵێن: خودا، (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: سوپاس بۆ خوا(کە دان بەو ڕاستیەدا دەنێن). واتە: ئەو دان پیانانەی خۆتان دەبێتە بەڵگە لەسەرتان هیچ بڕوبیانوویەکتان نامێنێت، ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: بەڵام زۆربەیان نازانن. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە هەموو خودا خاوەنیەتی‌و ئەو دروستی کردوون، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ واتە: خودا بێ نیازە لە هەموو شتێک‌و پێویستی بە کەس نیە هەموو نیازیان بەو هەیەو موحتاجی ئەون، شایانی سوپاسە بۆ ئەو هەموو شتەی کە دروستی کردووە لە ئاسمانەکان‌و زەمینداو دایناوە، وە هەمیشەش هەر ئەو سوپاس کراوەو دەکرێت لە هەموو کارەکاندا.

﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾﴾

## قسەکانی خودا لە ژمارە نایەت‌و تەواو نابێت

خوای گەورە باسی مەزنی‌و بڵندی دەسەڵاتی خۆی‌و ناوە جوانەکان‌و سیفەتە بەرزەکانی‌و قسەکانی دەکات کە هەرگیز دوایی نایەن و هیچ کەسیش ناتوانێت لێی ئاگادار بێت‌و بزانێت چۆنەو

---

[1] یونس(٦٩ـ٧٠).

بێژمێرێت وەك مەزنترین کەس‌و دواین پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(من ناتوانم سوپاسی تۆ تەواو بکەم وەك چۆن خۆت وەسفی خۆت کردووە).[1] خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ أَنَّمَا فِي ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ﴾ واتە: هەموو دارو درەختەکان ببنە پێنووس‌و دەریاکانیش ببنە مورەکەب دەریاکانیش ببنە حەوت دەریا، قسەکانی خوای پێ بنووسرێت کە هەمووی نیشانەی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خودان‌و باسی سیفاتە جوانەکانی ئەو بکات پێنووسەکان هەموو دوایی دێن‌و دەشکێن‌و دەریاکان دوایی دێن هێشتا قسەکانی خوا دوایی نایەت. با دەریای تریش وەك ئەوانە لە مورەکەب بە دوایاندا بێت. کە خوای گەورە باسی حەوت دەریا دەکات مەبەست پێی زۆری دەریاکانە، نەك حەوت دەریا، یان وا دەزانرێت کە حەوت دەریا هەیە دەوری دنیای داوە، وەك لە هەندێ ڕیوایەت و ئیسرائیلیەکاندا هاتووە کە بڕوای پێ ناکرێت‌و بە درۆیش ناخرێنەوە، بەڵکو وەك ئەوەی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا﴾[2] واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ ئەگەر(ئاوی) دەریاکان ببوایە بە مورەکەب بۆ(نووسینی) زانیاری پەروەردگارم بێگومان(ئاوی) دەریاکان تەواو دەبوون پێش ئەوەی زانیاری‌و عیلمی پەروەردگارم تەواو ببێت ئەگەر چەند ئەوەندەی دەریاکانیش بێنین(بیکەین بە مورەکەب عیلمی خوا تەواو نابێت). مەبەست بە(مِثْلِهِ) وەك وێنەی ئەو نیە، بەڵکو مەبەست پێی وەك ئەوو پاشان وەك ئەو پاشانیش وەك ئەو هەتا هەتایە چونکە قسەو نیشانەکانی خودا لە ژمارە نایەت، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: خودا خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، زاڵ‌و بە توانایە بەسەریداو تێکی دەشکێنێت، کەس ناتوانێت لەمپەر بێت بۆ هەر شتێك ئەو مەیلی لێ بێت‌و ناتوانێت دەست لە کارو فەرمانی خودا بدات‌و کارزانە لە وەدیهێنان‌و فەرمان‌و گفتارو بەرنامەو شەریعەتیدا وە لە هەموو بڕیارەکانیدا. وە دەفەرمووێت: ﴿ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾ واتە: دروستکردنی هەموو خەڵکی‌و زیندووکردنەوەیان لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ دەسەڵاتی خوای مەزن وەك یەك کەس وایە، هەموو شتێك لای خودا ئاسانە، ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾[3] واتە: بە ڕاستی کاری ئەو(خوا)یە ئەمەیە هەر کاتێك بیەوێت شتێك بەدی بێنێت پێی دەڵێت: ببە

---

[1] مسلم(١/٣٥٢).

[2] الكهف(١٠٩).

[3] يس(٨٢).

دەست بەجێ(ئەو شتە) دەبێت. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۢ بِٱلۡبَصَرِ﴾[1] واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاوتروكانێك(وایە لە خێراییدا)، واتە تەنها یەك جار فەرمان دەدات ئیتر ئەو شتە دەبێت، پێویست بە جەختکردنو دووبارەکردنەوە ناکات. ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ ۝١٣ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾[2] واتە: واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەریەك نەعرەتەیە، ئیتر کتوپڕ وان لە دەشتێکی سپی کاکی بە کاکیدا. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ﴾ واتە: وەك چۆن قسەکانیان دەبیستێ کردارەکانیشیان دەبینێت هەر بەو شێوەیە توانای هەیە بەسەر هەموو کەسێکدا وەك چۆن توانای هەیە بەسەر یەك نەفەردا. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿مَّا خَلۡقُكُمۡ وَلَا بَعۡثُكُمۡ إِلَّا كَنَفۡسٖ وَٰحِدَةٍ﴾.

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ۝٢٩ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ۝٣٠﴾

### باسی توانایی و گەورەیی خودا

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە لە شەو دەخاتە سەر ڕۆژو لە ڕۆژیش دەخاتە سەر شەو. ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾ واتە: لە شەو دەگرێتەوە دەیخاتە سەر ڕۆژ، ڕۆژ درێژ دەبێتەوەو شەو کەم دەکات لە هاویندا، پاشان وردەوردە ڕۆژ کەم دەکاتو شەو درێژ دەبێتەوە لە زستاندا، ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ واتە: خۆرو مانگی ڕام هێناوە هەر یەکە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، هەندێ ئەڵێن هەتا ڕۆژی قیامەت. هەردوو ماناکە ڕاستە، بەڵگە لەسەر ڕای یەکەم ئەو فەرموودەیە کە ئەبو زەڕ(ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەی ئەبو زەڕ ئایا دەزانی ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێت؟) وتم: خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەزانن، فەرمووی:(ئەم خۆرە دەچێت لە ژێر عەرشدا سوژدە دەبات، پاشان مۆڵەت لە پەروەردگاری وەردەگرێت، نزیکە پێی بوترێت: بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووی).[3] ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾ واتە: وە بە ڕاستی خوا بەوەی دەیکەن

---

[1] النازعات(١٣ـ١٤).

[2] القمر(٥٠).

[3] البخاري(٤٨٠٣)، مسلم(١٥٩).

خەبەرداره. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كە خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾[1] واتە: ئایا نازانی بە ڕاستی خوا دەزانێـت بـە هـەموو ئـەو شـتانەی لـە ئاسمـانو زەویدایە. واتە خوای مەزن وەدیهێنەرەو ئاگای لە هەموو شتێكە، وەك ئـەم ئایەتـە كـە دەفـەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾[2] واتە: خوا زاتێكە كە حەوت ئاسمانی دروست كـردووەو بە وێنەی ئـەوان زەویشی دروسـت كـردووە. وە فـەرموویـەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ﴾ واتە: بۆیە خوای گەورە نیشانەكانی دەردەخات بۆ ئێوە هەتا بیكەنە بەڵگە كە هەر ئـەو ڕاستەو هانا هەر بۆ ئەو دەبرێت بە تەنها، غەیری خودا كەس هیچی بە دەست نیە، خودا پێویـستی بـە كەس نیەو هەموو شتێك موحتـاجی ئـەوە، چونكە هەرچـی لـە ئاسمانـانو زەمیندایـە هـەمووی خـودا خاوەنێتیو ئەو دروستی كردوون و عەبدی ئەون، هیچێك لەوانە توانای جوڵانی بچوكترین شتی نیە بـە فەرمانی ئەو نەبێت، خـۆ ئەگـەر هـەموو خـەڵكی سـەر زەمـین كۆببنـەوە كە مێشێك یـان مێشولەیەك دروست بكەن ناتوانن‌و لێیان نایـەت، بۆیـە خـوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ﴾ واتـە: ئەوەنـدە پایـە بـەرزە كـە هـیچ كـەس لـەوا پایەبەرزتر نیەو لە هەموو شتێكیش مەزنترە، هەموو شتێك ملكەچو بێ ئەرزشە بەرامبەر خودا.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِنِعْمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣١﴾
وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ ۚ وَمَا يَجْحَدُ
بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ ﴿٣٢﴾﴾

خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە هەر خۆی دەریای ڕام هێناوە هەتا كەشتیەكان تێدا بێن‌و بچن، بە سۆزو دلۆڤانی خۆی، چونكە ئەگەر خودا ئـەو توانایـەی نەدایـە بـە ئـاو نەیـدەتوانی ئـەو كەشـتیانە هەڵگرێت‌و تێیدا بێن‌و برۆن، بۆیـە فەرموویـەتی: ﴿لِيُرِيَكُم مِّنْ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی نیـشانەكانی دەسەڵاتی خۆیتان پیشان بدات، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ واتە: ئەمانە هـەموو بەڵگـەن بۆ ئەو كەسانەی كە لە كـاتی لێقـەومان‌و تووشـبوونی ئـازاردا خـۆڕاگرن‌و كـە كـاتێكیش لـە خۆشـیدان سوپاسی خودای لەسەر دەكەن. پاشان خوای مەزن فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَٱلظُّلَلِ﴾ واتـە:

---
[1] الحج(٧٠).
[2] الطلاق(١٢).

کاتێك کە ئاو وەك کێو یان هەور دەدات بەسەریاندا، ﴿دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ واتە: لەناخی دڵەوە لە خودا دەپاڕێنەوە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾[1] واتە: وە کاتێك لە دەریادا تووشی بەڵاو زیان بێن هەموو ئەو(پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن ون دەبن بێجگە لە خوا. وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلۡفُلۡكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾[2] واتە: ئەنجا کاتێك ئەو(بێباوەڕانە) سواری کەشتی دەبن(و ترسان لە نوقم بوون بۆدروست ئەبێت) تەنها هاوار لە خوا دەکەن بە دڵسۆزیو گەردنکەچیەوە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ فَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ﴾ واتە: کاتێك کە ڕزگاریان ئەکات و ئەیانگەیەنێتە وشکانی هەندێکیان کافر دەبن. موجاهید دەڵێت: ﴿مُّقۡتَصِدٞ﴾ یانی: خوانەناس. وەك ئەوەی کە ﴿مُّقۡتَصِدٞ﴾ی مانا کردووە بەو کەسەی کە حاشا دەکاتو بێباوەڕ بووە،[3] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ إِذَا هُمۡ يُشۡرِكُونَ ﴾[4] واتە: کەچی کاتێك خوا ڕزگاریان دەکاتو دەگەنە وشکانی کتوپڕ ئەوان هاوبەش بۆ خوا دادەنێن. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ﴾ واتە: کەس نکوڵی لە نیشانەکانی ئێمە ناکات جگە لە پەیمانشکێنانی ناشوکر. ﴿خَتَّارٖ﴾ واتە: فێڵبازو فریودەر، ئەمە قسەی موجاهیدو حەسەنو قەتادەو مالیکە، لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە وەرگیراوە.[5] ئەو کەسەیە کە هەر پەیمانێکی دا پەیمانەکە دەشکێنن، واتە: زۆر فێڵبازو فریودەرە. ﴿كَفُورٖ﴾ واتە: حاشا لەو بەهرانە دەکاتو شوکرانەبژێر نیەو لە بیری خۆی دەباتەوەو باسی ناکات.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡ وَٱخۡشَوۡاْ يَوۡمٗا لَّا يَجۡزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوۡلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿٣٣﴾﴾

---

[1] الاسراء(٦٧).

[2] العنكبوت(٦٥).

[3] الطبري(٢٠/١٥٧).

[4] العنكبوت(٦٥).

[5] الطبري(٢٠/١٥٧).

**فەرماندان بە لە خوا ترسان و ترس و لەرز لە ڕۆژی قیامەت**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ وَٱخْشَوْاْ يَوْمًا ﴾ واتە: ئەی ئادەمی خۆ بپارێزن لە(تۆڵەی) پەروەردگارتان لەو ڕۆژەش بترسن، ﴿لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾ واتە: هیچ باوکێك تاوانی ڕۆڵەکەی هەڵناگرێت و هیچ ڕۆڵەیەکیش شتێك لە تاوانی باوکی هەڵناگرێت بێگومان بەڵێنی خوا هەق و ڕاستە. خوای مەزن ترس وەبەر خەڵکی دێنێت بە هاتنی ڕۆژی قیامەت، بۆیە فەرمانیان پێدەکات کە بیپەرستن و ترسی ئەویان لە دڵدا بێت و لە ڕۆژی قیامەتیش بترسن بۆیە لێرەدا دەفەرموویت: ﴿لَّا يَجْزِى وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ﴾ واتە: ئەگەر باوك بیەوێت گیانی لە باتی کوڕەکەی بدات لێی قەبوڵ ناکرێت، هەروەها ڕۆڵەکەیش بیەوێت گیانی خۆی لە پێناوی باوکیدا ببەخشێن لێی قەبوڵ ناکرێت، پاشان خوای گەورە جارێکی تر ئامۆژگاریان دەکات و دەفەرموویت: ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: نابێت ژیانی دنیاو حەسانەوە تیایدا واتان لێ بکات کە دوارۆژتان لەبیربچێتەوە، ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾ واتە: با شەیتان فریوتان نەدات لەبەر بەخشندەیی و دلۆڤانی خودا، ئەمە قسەی ئیبنو عەباس و موجاهید و زەحاك و قەتادەیە.[1] چونکە شەیتان بەڵێن دەدات بە فەرزندەکانی ئادەم و ئاوات و شتی زۆر دەخاتە دڵیانەوە، بەڵام هیچ نیە هەر فریودانە، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴾[2] واتە:(شەیتان) بەڵێنیان پێ دەدات و ئاوات و ئومێدیان دەخاتە بەر دڵنیا بن شەیتان هیچ بەڵێنێکتان پێ نادات جگە لە خەڵەتاندن نەبێت، وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێت: عوزەیر(سەلامی خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك بەڵای گەلەکەم بینی زۆر غەمگین بووم و دڵم ناڕەحەت بوو و خەوم نەما، لە پەروەردگارم پاڕامەوەو نوێژم کردو ڕۆژوم گرت، ئا لەو کاتەدا کە من دەپاڕامەوەو دەگریام، کاتێکم زانی فریشتەیەك هاتە لام، پێم وت: ئایا گیانی ڕاستگۆیان تکا دەکەن بۆ ناهەقیکاران یان ڕۆڵەکان تکا دەکەن بۆ باوکەکانیان؟ وتی: لە ڕۆژی قیامەتدا فەرمانی هەڵاوێران و جیاکردنەوە دەست پێدەکات و دەسەڵات و گەورەیی دیارە، مۆڵەتی تێدا نیە هیچ کەس قسە بکات بە ئیزنی خودا نەبێت، باوك لە جیاتی کوڕیدا ناگیرێت و کوڕیش لە جێی باوك گیر ناخوات، نە برایش لە جێی برا گیر دەدرێت و نە بەندەیش لە جێی خاوەنەکەی دەگیرێت، هەر کەسە غەمی خۆیەتی و کەس

---

[1] الطبري(٢٠/١٥٩).

[2] النساء(١٢٠).

نایە بە هاواریەوە، کەسیش بۆکەس غەمگین نیە،کەسیش بەزەیی پێیدا نایەتەوە، هەموو کەسێك تەنها بۆ خۆی بە سۆزە، کەس لە بری کەس گیرۆدە نابێت، نەفسی نەفسیە، هەر کەسەو سەرقاڵی کاری خۆیەتی و هەرکەسەو بۆ داماوی خۆی دەگری، کۆڵی خۆی هەڵگرتووە کەس کۆڵی بۆ هەڵناگرێت و یارمەتی نادات، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴿٣٤﴾ ﴾

**زانا بە نادیارەکان هەر خودایە**

ئەمە کلیلی نادیارەکانە، خودا خۆی نەبێت کەس لێی ئاگادار نیەو کەسیش نایزانێت کەسێك نەبێت خودا خۆی ئاگاداری بکات، زانینی هاتنی ڕۆژی قیامەت پێغەمبەران و فریشتە نزیکەکانیش لێی ئاگادار نین، ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾[1] واتە: هیچ کەس(ناتوانێت) کاتەکەی ئاشکرا بکات جگە لە(پەروەردگار). هەروەها باران بارین هیچ کەس نایزانێت خوا نەبێت، بەڵام کاتێك فەرمانی دا بە بارینی ئەو فریشتانەی ئەو کارەیان پێ سپێردراوە دەیزانن، وە هەر کەسێکی تریش خۆی مەیلی لێ بێت ئاگاداری دەکات. وە هیچ کەسێکیش ئاگای لەوە نیە لە ڕەحمدایە کە خودا دەیەوێت وەدی بهێنێت غەیری خودا خۆی، بەڵام کاتێك فەرمانی دا کە نێر بێت یان مێ، بەختەوەر بێت یان بەدبەخت، ئەو فریشتانەی ئەو کارەیان پێ سپێردراوە ئاگادار دەبن و هەر کەسێك خودا خۆی مەیلی لێ بێت لە دروستکراوەکانی ئاگاداری دەکات. هەروەها کەسیش نازانێت کاری سبەی ڕۆژی چیە لە دنیاداو دواڕۆژیشیدا. ﴿وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ﴾ ئایا لە وڵاتی خۆیدا دەمرێت یان لە وڵاتێکی تر کەس ئاگاداری لەو بارەیەوە نیە، ئەم ئایەتە لەو ئایەتە دەچێت کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾[2] واتە: وە کلیلی هەموو نهێنیەکان هەر لای خوایە کەس نایانزانێت بێجگە ئەو(خوا). فەرموودە زۆر هاتووە ناوی ئەم پێنجەی هێناوە بە کلیلەکانی نهێنی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو بورەیدەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی:(پێنج شت هەن خوای گەورە نەبێت کەس نایزانێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ

[1] الاعراف(١٨٧).

[2] الانعام(٥٩).

مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾[1]. ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی ڕاستە. فەرموودەی ئیبنو عومەر، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (كلیلەكانی نهێنی پێنجن، هیچ كەسێك نایانزانێت خودا نەبێت ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾[2]. بە تەنها بوخاری خۆی هێناویەتی لە كتێبی (ئیستیسقا)دا لە سەحیحەكەیدا ڕیوایەتی كردووە.[3] وە لە تەفسیرەكەیشدا بە شێوەیەكی تر دیسان ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(كلیلەكانی نهێنی پێنجن پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾) تا كۆتایی ئایەتەكە هەر بوخاری هێناویەتی.[4] فەرموودەی ئەبو هورەیرە، بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك لەناو خەڵكدا بوو، پیاوێك هات و ڕۆیشتە لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باوەڕ چیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(باوەڕ ئەوەیە بڕوا بكەی بە خوا و بە فریشتەكان و بە كتێبەكانی خودا و بە خزمەت گەیشتنی خودا و پێغەمبەرانی و بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی) پیاوەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیسلام چیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئیسلام ئەوەیە كە عیبادەتی خوا بكەی و شەریكی بۆ دانەنێیت و نوێژی فەرز بكەی و زەكاتی فەرز بدەیت و ڕۆژوی ڕەمەزان بگریت)، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیحسان چیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئیحسان ئەوەیە كە عیبادەتی خودا وا بكەی وەك ئەوەی كە دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی بێگومان خودا تۆ دەبینێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) كەی قیامەت هەڵدەسێت و دێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(پرسیارلێكراو لەوكەسەی كەپرسیاردەكات زاناتر نیە، بەڵام هەواڵت دەدەمێ لە بارەی نیشانەكانی قیامەتەوە: كاتێك كەنیزەك سەرۆكی خۆی لێ بوو، ئەوە لە نیشانەكانی ڕۆژی قیامەتە، وە كاتێك كە پێخاوس و ڕووت و قووت بوون بە گەورەی خەڵك ئەوە لە نیشانەكانی قیامەتە، لەناو پێنج شتدا لە غەیری خوا كەس نایانزانێت: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ ﴾، پاشان پیاوەكە ڕۆیشت.

---

[1] احمد(٥/٣٥٣)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] احمد(٢/٢٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] فتح الباري(٢/٦٠٩).

[4] فتح الباري(٨/٣٧٣).

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (پیاوەکەم بۆ بگێڕنەوە)، چوون بیگێڕنەوە کەسیان نەدی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەوە جوبرەئیل بوو هات بۆ ئەوەی ئاینەکەتان فێر بکات).[1] بوخاری دیسان ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی ئیماندا، موسلیمیش لە چەند ڕێگاوە ڕیوایەتی کردووە.[2] کە لە ئەوەڵی شەرحی بوخاریدا قسەمان لێ کردو باسی ئەو فەرموودەی گەورەی موسڵمانانمان کرد عومەری کوڕی خەتاب لەو بارەیەوە بە درێژی ڕیوایەتی کردووە، کە موسلیم هێناویەتی. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾ قەتادە دەڵێت: چەند شتێکە خوا تایبەتی کردووە بە خۆیەوە، فریشتە نزیکەکانیشی لێی ئاگادار نەکردووە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیشدا (سەلامی خوایان لێ بێت)، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ﴾ بە دڵنیاییەوە خوا زاناو ئاگادارە واتە: هیچ کەسێك لە خەڵك نازانێت کەی قیامەت دێت لە چ ساڵێدا یان چ مانگێکدا یان لە چ شەوو ڕۆژێکدا، ﴿وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ﴾ واتە: هیچ کەس نازانێت کەی باران دەبارێت شەو یان ڕۆژ، ﴿وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ﴾ واتە: کەسیش نازانێت چی لە ڕەحمدایە ئایا نێرە یان مێ، سورە یان ڕەشە، ئەمە چ شتێکە ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ﴾ واتە: هیچ کەسێك نازانێت سبەی ڕۆژ چ کارێك دەکات چاکە دەکات یان خراپە، ئەی نەوەی ئادەم تۆ نازانی کەی دەمری لەوانەیە سبەی توشی لێقەومانێك ببێت، ﴿وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ﴾ یانی: هیچ کەسێك لەخەڵکی نازانێت سبەی لەکوێی ئەم زەویەدا ڕادەکشێ، سبەی بمریو گیانت دەرچێت یان لەوانەیە لە وشکانیدا، لەناو کێودا، یان لەناو دەشتدا.[3] لە فەرموودەیەکدا هاتووە:(خوای گەورە کاتێك بیەوێت گیانی عەبدێکی بکێشێت لەسەر زەمینێکدا پێویستیەکی بۆ وەدی دەهێنێت لەو شوێنەدا).[4] حافیز ئەبول قاسمی تەبەرانی(الحافظ أبو القاسم الطبراني) ڕیوایەتی کردووە لە موعجەمە گەورەکەیدا(المعجم الكبير) لە موسنەدی ئوسامەی کوڕی زەیدا دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(خودا مردنی عەبدێکی بڕیار نەداوە لەسەر زەمینێکدا مەگین پێویستیەکی بۆ وەدی هێناوە لەو سەر زەمینەدا).[5]

---

[1] فتح الباري(٨/٣٧٣).

[2] فتح الباري(١/١٤٠)، مسلم(١/٣٩).

[3] الطبري(٢٠/١٦٠).

[4] الحاكم(١/٤٢).

[5] الطبراني(١/١٧٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

## سورەتی( السجدة )

## له مەککەدا هاتووەته خوارەوه

### ڕێزی سورەتی( الف، لام، میم )ی سەجده

بوخاری ڕیوایەتی کردووه له کتێبی(الجمعة)دا له ئەبو هورەیرەوه دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) له بەیانی ڕۆژی هەینیدا، ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ سەجدەو ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ﴾ دەخوێند،[1] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووه.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووه له جابیرەوه دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) نەدەخەوت تا ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ی سەجدەو ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ی دەخوێند.[3] تەنها ئیمامی ئەحمەد خۆی هێناویەتی.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۚ بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ۝٣﴾

### قورئان کتێبی خودایەو هیچ گومانێکی تێدا نیه

له پێشەوه قسه کرا لەسەر ئەم پیتانه له سورەتی(البقرة)دا پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوه، ﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ واته: ئەم کتێبه ڕەوانه کراوه هیچ گومانێکی تێدا نیه، ﴿مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واته: له لایەن ڕاهێنەری جیهانەوه نێردراوه. پاشان خوای مەزن باسی موشریکەکان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ﴾ واته: بەڵکو دەڵێن: هەڵی بەستووه، واته: خۆی ئەمەی دروست کردووەو قسەی خۆیەتی، ﴿بَلْ هُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾ واته: بەڵکو ئەم قورئانه ڕاستەو له لایەن پەروەردگارتەوه ڕەوانەکراوه، تا به هۆی ئەم قورئانەوه ترس وەبەر گەلێ بێنێت، که له پێش تۆ کەس نەی ترساندوون، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرنەبەر.

---

[1] فتح الباري(٢/٤٣٨).

[2] مسلم(٢/٥٩٩).

[3] أحمد(٢/٣٤٠)، فەرموودەیەکی لاوازه.

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ ۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ﴾

**هەر خودا وەدیهێنەرو بەڕێوەبەری بوونەوەرە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴾ واتە: خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ئەو وەدیهێنەری هەموو شتێکەو ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی لە نێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا دروستی کردووە، پاشان لەسەر تەخت دامەزراوە، لە پێشەوە لەو بارەیەوە دواوین. ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا شَفِيعٍ﴾ واتە: بەڵکو هەر ئەو خاوەن دەسەڵاتەو هەموو شتێك موڵکی ئەوەو ئەو دروستی کردووەو ئەو بەڕێوەی دەباتو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ دۆستو گەورەیەك نیە عەبدەکانی پشتی پێ ببەستنو تکایان بۆ بکات، خۆی نەبێتو بە ئیزنی ئەو نەبێت. ﴿أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی غەیری خوا دەپەرستنو پشت بە غەیری خوا دەبەستن، خودا زۆر پاكو بێ عەیبە دوورە لەوەی کە هاوەڵو هاوێنەی هەبێت، شەریکی نیەو تەنهایە هیچ پەرستراوێك نیە ئەو نەبێتو غەیری ئەو پەروەردگارێکی تر نیە. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ ثُمَّ يَعْرُجُ إِلَيْهِ﴾ واتە: فەرمانی خۆی دادەبەزێنێت لە ئاسمانە هەرەبەرزەکانەوە بۆ نزمترین شوێنی حەوت تەبەقەی زەمین وەك فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ﴾[1] واتە: خوا زاتێکە کە حەوت ئاسمانی دروست کردووەو بە وێنەی ئەوان زەویشی دروست کردووە فەرمانی خوا لە نێوانیاندا دادەبەزێت. کردارەکان بەرز دەکرێتەوە بۆ ئەو بارەگایە لە سەرو ئاسمانی دنیاوە، ماوەی نێوانی ئەو شوێنەو سەر زەمین پێنج سەد ساڵە، بارستایی(سمك) ئەو ئاسمانە پێنج سەد ساڵە، موجاهیدو قەتادەو زەححاك دەڵێن: دابەزینی ئەو فریشتەیە بۆ ماوەی ئەو پێنج سەد ساڵەو بەرزبوونەوەی کە ماوەی پێنج سەد ساڵە، لە چاوتروکانێکدا دەیبڕێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ أَلْفَ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾ واتە: لە ڕۆژێکدا(قیامەتدا) کە ئەندازەکەی هەزار ساڵە لەو ساڵانەی ئێوە دەیژمێرن. پاشان دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ واتە: ئەو(خوا)

---

[1] الطلاق(١٢).

زانایە بە هەموو نهێنیو ئاشکرایەك بە دەسەڵاتو میهرەبانە. واتە هەر خودایە کاروباری هەموو شتەکان بەڕێوە دەباتو شایەتە بەسەر کردەوەی عەبدەکانیەوە هەرچیان کردووە گەورەو بچووك دیارو نادیار بەرزدەکرێتەوە بۆ لای ئەو، خاوەن دەسەڵاتێکی وایە کە ملی دانەواندووە بە هەموو کەسێكو زاڵ بووە بەسەریداو ملی پێ شۆڕکردووە. خاوەنی سۆزو بەزەییە بۆ باوەڕداران، لە کاتی دەسەڵاتیدا هەر بە بەزەییەو لە کاتی دڵۆڤانیشدا هەر خاوەن دەسەڵاتە، ئاخۆ ئەوەیە کەماڵو پاكو بێ عەیبی دەسەڵات لەگەڵ بەزەییدا، بەزەیی لەگەڵ دەسەڵاتدا، خاوەنی بەزەییەو بێ کەمو کوڕییە.

﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ ۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٩﴾﴾

## گۆڕانکاریەکانی خودا لە وەدیهێنانی مرۆڤدا

خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەر خۆی هەموو شتەکانی بە ڕێکوپێکیو تەواوی دروستی کردووە هیچ کەموکوڕیەکیان تێدا نیە، مالیك دەڵێت: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە: ﴿ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ﴾ واتە: بە ڕێکوپێکی هەموو شتێکی دروست کردووە مرۆڤیشی لە هەوەڵەوەو لە دوایشدا هەر بە ڕێکوپێکی دروستی کردووە، پاش ئەوەی خوای گەورە باسی دروستبوونی ئاسمانەکانو زەمینی کردووە، کە دێتە سەر باسی وەدیهێنانی مرۆڤ فەرموویەتی: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ﴾ واتە: ئادەمیشی لە سەرەتادا لە قوڕ دروست کردووە، ﴿ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ﴾ واتە: زاوزێ دەکەن بەهۆی ئەو تنۆکە ئاوە کەم بایەخەوە کە دەردەچێت لە پشتی پیاوو سنگی ژنەوە، ﴿ثُمَّ سَوَّىٰهُ﴾ واتە: پاشان ئادەمی دروست کرد زۆر بە جوانیو ڕێكو پێکی، ﴿وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾ واتە: لە گیانی تایبەتی خۆی کرد بە بەریداو گوێچکەو چاوو دڵیشی پێدا، ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾ واتە: هەندێکی کەمتان سوپاسی خودا دەکەن لەسەر ئەو توانایەی کە خوای گەورە پێی داون، بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لە خواپەرستیو ڕەزامەندی ئەودا بەکاریان دێنێت.

﴿وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا ضَلَلْنَا فِى ٱلْأَرْضِ أَءِنَّا لَفِى خَلْقٍ جَدِيدٍۭ ۚ بَلْ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۞ قُلْ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلْمَوْتِ ٱلَّذِى وُكِّلَ بِكُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١١﴾﴾

## وەڵامی ئەو کەسانەی کە زیندووبوونەوە بە دوور دەزانن

خوای گەورە باسی موشریکەکان دەکات کە چەندە بە دووری دەزانن زیندوو بکرێنەوە کاتێك ئەڵێن وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: کاتێك لاشەمان پارچە پارچە بوو پزاو تواوە لە ناو زەویداو نەماو ڕۆیشت، ﴿أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭ﴾ پاش ئەوە جارێکی تر زیندوودەبینەوەو وەك خۆمان لێ دێتەوە، ئەوەیان بە لاوە زۆر دوورو مەحاڵە، بەڵێ ئەوە بە لای لاوازیو بێهێزی ئەوانەوە دوورە بەڵام بە لای تواناو دەسەڵاتی خوداوە کە یەکەم جار وەدی هێناون لە نەبوونەوە کە مەیلی لە هەر شتێك ببێت دەفەرموێت ببە، دەبێت، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ﴾ واتە: بەڵکو ئەوانە بڕوایان بە ڕووبەڕووبوونەوە نیە لەگەڵ خودا، پاشان فەرموویەتی: ﴿قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ﴾ واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ فریشتەی گیان کێشان کە گیان کێشانی ئێوەی پێ سپێردراوە دەتانمرێنێت. لەم ئایەتەوە وا دەردەکەوێت کە فریشتەی گیان کێشان فریشتەیەکی دیاریکراوە لەناو فریشتەکاندا، وەك چۆن دەردەکەوێت لە فەرموودەکەی بەرائدا کە لە پێشەوە باسکرا لە سورەتی(ابراهیم)دا، وەك لە هەندێ قسەی پێشینەکاندا هاتووە بە عیزرائیل ناوبانگی دەرکردووەو فریشتەی تریشی لەگەڵە، وەك قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[1] وە هەر بەو شێوەیە لە فەرموودەدا هاتووە کە ئەو کۆمەڵەی لەگەڵیەتی گیانەکان لەهەموو بەشەکانی لەشدا دەردەهێنن گیانەکان دەگەنە قورقوڕاگە فریشتەی گیان کێشان لەوێدا وەری دەگرێتو دەیبات، موجاهید دەڵێت: زەمینی بۆ کراوەتەوە لەبەر دەستیدایە وەك تەشتێك(تاسەیەك) هەر کاتێك ئارەزوو بکات دەستی دەیگاتێ.[2] ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ﴾ واتە: پاشان دەبرێنەوە بۆ لای خوا کاتێك کە زیندوو دەکرێنەوەو هەڵدەستن لەناو گۆڕەکانتاندا بۆ پاداشتدانەوە.

﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمۡۖ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾

---

[1] الطبري(٢٠/١٧٥).

[2] الطبري(٢٠/١٧٥).

**باسی خراپی گوزەرانی موشریکەکان لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای گەورە باسی حاڵو گوزەرانی خراپی بتپەرستان دەکات کاتێك بە چاوی خۆیان زیندووبوونەوە دەبینن و لە خزمەتی خودای مەزندا دەوەستن، سەر شۆڕو خەجاڵەتن سەر بەرزناکەنەوە لە شەرماندا وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا﴾ ئەڵێن: ئێستا ئێمە گوێت بۆ دەگرین و فەرمانەکانت بەجێ دێنین، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا﴾[1] واتە: ئای کە چەندە بیسەرو بینەرن ڕۆژێك کە دێنەوە بۆ لامان(لە قیامەتدا). بەم شێوەیە دەچنەوە بە خۆیانداو لۆمەی خۆیان دەکەن کاتێك کە چوونە ناو ئاگر ئەڵێن: ﴿لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[2] واتە: ئەگەر قسەی(پێغەمبەران)مان ببیستایە یان تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین. هەر بەو شێوەیە ئەو کەسانەی کە بتپەرستن ئەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا﴾ واتە: ئەی خودایە بە چاو بینیمان و بە گوێ بیستمان بمانگێڕەوە بۆ ژیانی دنیا، ﴿نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾ واتە: کاری چاك دەکەین چونکە چاك زانیومانەو بۆمان دەرکەوتووە کە بەڵێنی تۆ ڕاستەو هاتن بۆ لات ڕاستە، خوای گەورە خۆی چاکیان دەناسێت و ئاگای لێیانە، ئەگەر بیانگەڕێنێتەوە بۆ ژیانی دنیا دیسان دەچنەوە سەر هەمان و کارو وەك خۆیان لێدێتەوەو دەست دەکەنەوە بە خوانەناسی و بڕوا بە نیشانەکانی خودا ناکەن و دژایەتی پێغەمبەرەکانی دەکەن، وەك خوای گەورە فەرموویەتی لە ئایەتێکی تردا: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا﴾[3] واتە: وە ئەگەر بیانبینیت کاتێك لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن: خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیاو بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانی. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ شِئْنَا لَـَٔاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا﴾ واتە: ئەگەر بمانویستایە ڕێنموونیمان بە هەموو کەسێك دەدا. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَـَٔامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا﴾[4] واتە: وە ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە ئەو(خەڵکەی) وا لە زەویدا هەموو تێکڕا بڕوایان دەهێنا. ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى

---

[1] مریم(٣٨).

[2] الملك(١٠).

[3] الانعام(٢٧).

[4] یونس(٩٩).

﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: لە هەردوو دەستەکە ئاگر دەوری داون و هیچ پەناو شوێنێك نیە ڕووی تێ بکەن و بۆی بچن، پەنا دەگرین بە خواو ناوە جوانەکان و مەزنەکانی لەو ئاگرە، وە دەفەرمووێت: ﴿فَذُوقُواْ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ﴾ واتە: دەڵێت بە خەڵکی ناو ئاگر بە شێوەی سەرزەنشت و تانەو تەشەرلێدان دەی ئەو سزایە بچێژن بە هۆی ئەو بێباوەڕی و بەدوور زانین و لەبیرکردنی ئەو ڕۆژە وەك ئەوەی کە هەرگیز ڕوونادات. ﴿إِنَّا نَسِينَٰكُمْ﴾ واتە: ئێمەش ئێوە لەبیر خۆمان دەبەینەوە، خوای گەورە هیچی لەبیر ناچێت و لێی ون نابێت بەڵکو ئەمە لە شێوەی کردارو مامەڵەی بەرامبەرە وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾[1] واتە: ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین هەرچۆنێك ئێوە ئەم ڕۆژەتان لەبیر چووبوو. وە دەفەرمووێت: ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: تا هەتایە سزا بچێژن بە هۆی ئەو بێباوەڕی و خوانەناسیەتانەوە وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾[2] واتە: تێیدا ناچەژن نە ساردی و فێنکی و نە خواردنەوە، مەگەر ئاوی لە کوڵ و کێم و زووخاو، پاداشت دەدرێنەوە بە پێی کردەوەکانیان، چونکە بێگومان ئەوان بە تەمای لێپرسینەوە نەبوون، وە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دەزانی چۆن بە درۆ زانینێك، لە کاتێکدا هەموو شتێکمان ژماردووە(لەسەریان) بە نووسین، ئینجا بچەژن(سزای خۆتان) هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێت.

﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءً بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾

## ژیان و گوزەرانی خاوەن باوەڕو پاداشتیان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ واتە: ئەی کەسانەی بڕوایان بە نیشانەکانی ئێمە هەیەو بە ڕاستی دەزانن، ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا﴾ واتە: کاتێك کە گوێی بۆ دەگرن بە

---

[1] الجاثیة(٣٤).

[2] النبأ(٢٤ـ٣٠).

کردارو گفتار پێی هەڵدەسن و شوێنی دەکەون، ﴿وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾ واتە: سوپاسی خودا دەکەن و باسی پاک و بێ عەیبی ئەو دەکەن و خۆیان بە زل نازانن و گوێڕایەڵن، بە پێچەوانەی ئەو خۆ بە زلزان و لادەرو خوانەناسانە، وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەوپاش بە سەرشۆڕی دەچنە دۆزەخەوە. پاشان فەرموویەتی: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ مەبەست پێی شەونوێژکردن و وازهێنانە لە خەوتن و پاڵکەوتن لەناو جێگەی گەرم و نەرمدا، موجاهیدو حەسەن لەم ئایەتەدا: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ دەڵێن: مەبەست پێی شەونوێژکردنە.[2] زەححاک دەڵێت: واتە: نوێژی عیشا بە جەماعەت و نوێژی بەیانی بە جەماعەت. ﴿يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ واتە: بە ترس و بە ئومێدەوە لە خوا دەپاڕێنەوەو لە سزای دەترسن و بە تەمای پاداشتی زۆریشن، ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ واتە: لەو سامانەی کە پێمان بەخشیون ئەوەی فەرزە لەسەریان دەیدەن و خێروبێری زۆرتریشی لێ دەکەن، پێشەنگ و مەزن و جێی شانازی هەموان لە بەخشندەییدا لە دنیاو لە دواڕۆژ پێغەمبەری خودایە(ﷺ)، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا بووم(ﷺ) لە سەفەرێکدا ڕۆژێک لێیەوە نزیک بووم هەموو بەڕێوە بووین وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاگادارم بکە لە کارێک کە بمخاتە بەهەشت و لە ئاگر دوورم بخاتەوە فەرمووی:(بە ڕاستی تۆ پرسیارت لە شتێکی زۆر مەزن کردووە، بەڵام ئاسانە بۆ کەسێک کە خوا بۆی ئاسان بکات، عیبادەتی خوا بکەو هاوەڵی لە هیچ شتێکدا بۆ دامەنێ، نوێژ بکەو زەکات بدەو ڕۆژو بگرەو حەج بکە، پاشان فەرمووی: ئایا دەروازەکانی چاکەت پیشان بدەم؟ ڕۆژو قەڵغانە، خێرکردن تاوان دەکوژێنێتەوە، وە نوێژی پیاوێک لە شەودا، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ﴾ تا ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾ پاشان فەرمووی: ئایا خەبەرت بدەمێ بە سەرو ئەستون و لوتکەی بەرزی ئەم کارە؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(سەری ئەم کارە ئیسلامە ئەستونەکەی نوێژە لوتکەی بەرزیشی جیهادکردنە لە ڕێی خودا، پاشان فەرمووی: ئایا هەواڵت بدەمێ بەسەری ئەمانە هەمووی؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، جا پێغەمبەر(ﷺ) زمانی خۆی گرت و

---

[1] الغافر(٦٠).

[2] الطبري(٢٠/١٨٠).

پاشان فەرمووی: (ئەمەی خۆت بگرەو بپارێزە). وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا سزا دەدرێین بەوەی کە بە زمان دەیلێین؟ فەرمووی: (دایکی خۆت رۆڵەرۆت بۆ بکا! ئەی مەعاز، ئایا خەڵکی لەناو ئاگردا لەسەر دەمو چاویان ڕادەکێشرێت هەموو بەرهەمی زمانیان نیە؟)[1] تیرمزیو نەسائیو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمزی دەڵێت: چاکو ڕاستە(حسن صحیح).[2] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾ واتە: هیچ کەسێك نازانێت مەزنی ئەو شتەی کە خودا بۆی شاردوونەتەوە لەو بەهەشتو بەهرە زۆرە نەبڕاوەو هەتاهەتایانەو تامو چێژێکی وەها زۆر کەس نەیدیوەو نەیبیستووەو بە دڵیشیدا نەهاتووە، لەبەر ئەوەی ئەوانە کردەوەکانی خۆیان دەشاردنەوە خوایش ئەم بەهەشتو هەموو بەهرەی پێداون لە بەرامبەر ئەو کارانەیاندا، چونکە پاداشت لە شێوەی کردارە، حەسەنی بەسری دەڵێت: کۆمەڵێك کردارەکانیان شاردەوە، خودایش شتێکی بۆ ئەوان شاردەوە چاو نەیدیوەو بە دڵی کەسیشدا نەهاتووە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. بوخاری دەڵێت خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾ پاشان ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی:(خوای مەزن فەرموویەتی: ئامادەم کردووە بۆ بەندە چاکەکانم شتێك کە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە دڵی کەسیشدا نەهاتووە). ئەبو هورەیرە دەڵێت: ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ﴾.[3] موسلیمو تیرمزیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمزی دەڵێت: فەرموودەیەکی دروستو ڕاستە.[4] وە لە ڕیوایەتێکی تردا لە بوخاریەوە هاتووە:(بە دڵی کەسیشدا نەهاتووە دانراوە(پاشەکەوت کراوە) غەیری ئەوەی ئێوە لێی ئاگادارن).[5] وە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(هەر کەسێك دەچێتە بەهەشت کەیف خۆشەو ڕادەبوێرێتو نائومێد نیەو بێتاقەت نابێت، جلوبەرگی خراپ نابێتو نارزێت گەنجێتیشی لەناو ناچێتو ناڕواتو هەر دەمێنێت، لەناو بەهەشتدا شتی وا هەیە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستووەو بە دڵی

---

[1] احمد(٥/٢٣١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الأحوذي(٧/٣٦٢)، النسائي في الكبرى(٦/٤٣٨)، ابن ماجه(٢/١٣١٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] فتح الباري(٨/٣٧٥).

[4] مسلم(٤/٢١٧٤)، تحفة الأحوذي(٩/٥٦).

[5] فتح الباري(٨/٣٧٥).

کەسیشدا نەهاتووە)، موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[1] ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ واتە: ئەم پاداشتە(دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە.

﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ نُزُلَۢا بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٩ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ٢٠ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ٢١ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ٢٢﴾

### خاوەنباوەڕو لەڕێ دەرچوو وەك یەك نین

خوای گەورە باسی عەدالەتو ڕێزی خۆی دەکات کە ئەوانەی بڕوایان بووە بە نیشانەکانیو شوێنی پێغەمبەرەکانی کەوتوونو ئەوانەی کە لایان داوەو فەرمانەکانی ئەویان بەجێ نەهێناوەو بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی نەهێناوە وەك یەك نین لە لای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بەڵکو هەریەکە بە پێی کرداری خۆی لێی دەپرسێت، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾[2] واتە: ئایا ئەوانەی کە کارەخراپەکانیان کردووە وا گومان دەبەن ئێمە ئەوانە وەکو کەسانێك دادەنێین کە بڕوایان هێناوە و کارە چاکەکانیان کردووە وەکو یەك بێت، چ ژیانیان و چ مردنیان، ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن. وە دەفەرموێت: ﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ﴾[3] واتە: ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دادەنێین(لە دواڕۆژدا، نەخێر وا نیە) یان پارێزکاران وەك بەدکاران لێ دەکەین. وە لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ﴾[4] واتە: دۆزەخیانو بەهەشتیان وەك یەك نین. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ

[1] الطبري(٢٠/١٨٦)، مسلم(٤/٢١٨١).

[2] الجاثية(٢١).

[3] ص(٢٨).

[4] الحشر(٢٠).

فَاسِقًاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خاوەن باوەڕو لە ڕێ لادەر وەك یەك نین، عەتای كوڕی یەسارو سودی‌و كەسانی تریش دەڵێن: ئەم ئایەتە هاتووەتەخوار لەسەر عەلی كوڕی ئەبو تالیب‌و عوقبەی كوڕی ئەبو موعیت[1]. بۆیە خوای مەزن حوكمەكەی جیاكردوونەتەوەو فەرموویەتی: ﴿ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾ واتە: جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردووە واتە بە دڵ بڕوایان بە نیشانەكانی خودا هێناو بەو پێیەش ئاكاریان چاك بووە، ﴿فَلَهُمۡ جَنَّـٰتُ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴾ واتە: شوێنی چاك‌و باغاتی جوان‌و كۆشكی بەرزیان پێدەدرێت، ﴿نُزُلَۢا﴾ واتە: میوانداری‌و ڕێزلێنانێكە بۆیان، ﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ یانی: لە پاداشتی ئەو كردەوانەی كە كردوویانە، ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾ واتە: ئەوانەی كە دەرچوون لە فەرمانی خودا شوێنیان ناو ئاگرە، هەر كاتێك بیانەوێت لێی دەرچن، دەیانخەنەوە ناو ئاگر. وەك ئەم ئایەتەی كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾[2] واتە: هەر كاتێك بیانەوێت كە بێنە دەرەوە لەو(دۆزەخ)ە لەبەر زۆر گەرمی دەگەڕێنرێتەوە بۆ ناوی. فوزەیلی كوڕی عەیاز دەڵێت: سوێند بە خوا دەستیان بەستراوەو شەتەك دراوەو قاچیان زنجیر كراوەو بڵێسەی ئاگر بەرزیان دەكاتەوەو فریشتەكان بەرەو خواریان دەكەنەوە بۆ ناو ئاگرەكە. ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾ واتە: پێیان دەوترێت بچەژن سزای ئەو ئاگرەی كە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەكرد. واتە ئەوەیان پێ ئەڵێن بۆ زیاتر سوكایەتی پێكردن‌و دڵ گران كردنیان، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾ واتە: وە بەڕاستی ئێمە سزای دنیایان پێ دەچێژین جگە لە سزای هەرە گەورە(ی دۆزەخ) تا بگەڕێنەوە بۆ لای خودا. ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە: سزاو ئازاری دنیایان دەدات وەك نەخۆشی‌و بەلا بۆ خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵ‌و سامانیان بەڵكو بە هۆی ئەو تاقی كردنانەوە كە تووشی بەندەكانی خۆی دەكات پەشیمان ببنەوەو تەوبە بكەن.[3] وە هەر بەو شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە ئوبەیی كوڕی كەعب‌و ئەبولعالیە و حەسەن‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و زەححاك‌و عەلقەمەو عەتیە و موجاهید و قەتادەو عەبدولكەریمی

---

[1] الطبري(٢٠/١٨٨).

[2] الحج(٢٢).

[3] الطبري(٢٠/١٨٩).

جەزەری‌و خوسەیف[1]، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآ﴾ واتە: هیچ کەسێك، لەو کەسە ناهەقتر نیە کە خودای مەزن نیشانەکانی خۆی وەبیربێنێتەوەو بۆی ڕوون‌و ئاشکرا بکات لە دواییدا وازی لێ بهێنێت‌و پشتی تێ بکات‌و لە بیری خۆی بباتەوە وەك ئەوەی کە هەر نەیبیستووە، قەتادە دەڵێت: نەکەن پشت هەڵکەن لە نیشانەکانی خودا چونکە لە خۆبایی بوونێکی لە ئەندازە بە دەرە‌و کوێری‌و موزمەعیلیەکی تەواوەو لە گەورەترینی گوناهە، بۆیە خوای مەزن هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کەوا دەکەن وەك دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ﴾ واتە: بەم زووانە تۆڵەی توندو گران لەو تاوانبارانە دەکەینەوە.

﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦۖ وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٣﴾ وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٢٥﴾﴾

### کتێبی موسا‌و ڕابەرایەتی نەوەی ئیسرائیل

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی موسا دەکات(سەلامی خوای لێ بێت) کە کتێبێکی پێداوە کە تەوراتە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە تەوراتمان دا بە موسا ئینجا گومانت نەبێت(ئەی موحەممەد ـ ﷺ ـ) لە گەیشتنت بە موسا(یان گەیشتنی تەورات بە موسا). قەتادە دەڵێت: مەبەست پێی شەوی ئیسرایە[2]. پاشان ڕیوایەت کراوە لە ئەبول عالیەی ڕیاحیەوە دەڵێت: ئامۆزای پێغەمبەرەکەتان واتە: ئیبنو عەباس دەڵێت پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(موسای کوڕی عیمرانم پیشان درا لەو شەوەدا کە شەوڕەویم پێکرا، پیاوێکی گەنم ڕەنگ بوو و بالا بەرزو قژلوول بوو، لە پیاوانی شەنوئە(شَنوءَة) دەچوو، وە عیسام بینی پیاوێکی نە بالا بەرزو نە کورتەبالا بوو ڕەنگی سوورو سپی بوو، موی سەری خاو بوو، وە فریشتەیەکم بینی لێپرسراوی ئاگر بوو دەجالیشم بینی)، لەو نیشانانەی کە خودا پیشانی دا. ﴿فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦ﴾ بێگومان بینی موسای بوو، هەروەها ئەو شەوەی کە شەوڕەوی پێکرا جارێکیتر موستی بینی[3]. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلۡنَٰهُ﴾ واتە: ئەو کتێبەی کە

---

[1] الطبري(٢٠/١٨٩).

[2] الطبري(٢٠/١٩٣).

[3] الطبري(٢٠/١٩٤).

بۆمان نارد. ﴿هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ واتە: کردمانە ڕێنموونی کەری نەوەی ئیسرائیل. وەك خوای گەورە لە سورەتی(الاسراء) فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا﴾[1] واتە: وە تەوراتیشمان بەخشی بە موساو ئەو(تەوراتە)مان کردە هۆی ڕێنموونی بۆ نەوەی ئیسرائیل(پێمان وتن) کە بێجگە لە من کەس مەکەنە پشتیوانی خۆتان. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟ ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی خۆڕاگر بوون لەسەر ئەو فەرمانانەی خودا دەیدات بەسەریانداو وازیان لەو شتانە هێنا کە خودا قەدەغەی کردبوو، وە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی کردو شوێنی ئەو کتێبە کەوتن کە بۆی هێنابوون، لە نێوان ئەواندا هەبوو ڕێی ڕاستیان نیشانی خەڵکی دەدا بە فەرمانی خوداو بانگیان دەکردن بۆ چاکەو داوایان دەکرد لە خەڵکی کە چاکە بکەن‌و واز لە خراپە بێنن، دوای ئەوەی کاتێك دەستیان دایە گۆڕین‌و لابردنی هەندێکی‌و دانانی شتی تر لە جێی بە ئارەزووی خۆیان، ئەو پلەوپایەیان لێ سەنرایەوەو دڵیان ڕەق بوو فەرموودەی خودایان گۆڕی لە شوێنی خۆی نەیانهێشت، کرداری چاك‌و بیروباوەڕی ڕاستیان نەما، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا۟﴾ قەتادەو سوفیان دەڵێن: یانی: کاتێك خۆیان گرت لەسەر دنیاو دنیا نەیخەڵەتاندن، حەسەنی کوڕی ساڵحیش هەر وای وتووە. سوفیان دەڵێت: ئەو کەسانە ئا بەو شێوەیە بوون، ڕەوا نیە بۆ پیاوێك کە خۆی بە پێشەوا بزانێت‌و خەڵکی شوێنی بکەون‌و بڕوای پێ بکەن، خۆی لە دنیا لانەدات‌و نەپارێزێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا بێگومان بە نەوەی ئیسرائیلمان بەخشی پەیام‌و حوکمڕانی‌و پێغەمبەرایەتی‌و ڕۆزیمان دان لە شتە حەڵاڵ‌و پاکەکان ڕێزمان دان بەسەر جیهانیاندا، وە بەڵگە ڕوونەکانمان پێدان لە بارەی شەریعەتەوە.

وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: بێگومان پەروەردگارت بڕیار دەدات لە نێوان بەندەکانیدا لە ڕۆژی قیامەتدا لەوەی ئەوان تیایدا جیاواز بوون. واتە لە بیروڕاو کرداردا.

---

[1] الاسراء(٢).

[2] الجاثية(١٦ـ١٧).

﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ۖ أَفَلَا يَسْمَعُونَ (٢٦) أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ (٢٧)﴾

**پەندو ئامۆژگاری وەرگرن لە پێشینەکان**

خوای گەورە دەفەرموێت ئایا ئەو کەسانەی باوەڕ بە پێغەمبەرەکان ناکەن پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن لەو گەلانەی کە قرکران و لەناوچوون لە پێش خۆیان کە دژایەتی پێغەمبەرەکانیان کردو شوێنی ئەو پەیامانە نەکەوتن کە بۆیان هێنان، لە کوێن و چیان بەسەرهات؟ وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًا﴾[1] واتە: ئایا هەست دەکەیت بە هیچ کەسێك لەوانە مابێت؟ یان هیچ وەرکەو سرتەیەکیان دەبیستی. بۆیە خوای خاوەن دەسەلات فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ﴾ واتە: ئەو بێباوەڕانەی کە دەگەڕێن بەناو ماڵەکانی بێباوەڕەکانی پێش خۆیاندا، هیچ کەسێك لەوانە لەو شوێنەدا نابینن کە تیایدا ژیاون و ئاوەدانیان کردووەتەوە پێش خۆیان هەموو ڕۆیشتن و تیاچوون. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَا﴾[2] واتە:(تیاچوون) وەك ئەوە هەر لەو ماڵانەدا نەبووبن(و تیایدا نەژیابن). وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا﴾[3] واتە: ئینجا ئەوە(جێی) خانووەکانیانە چۆڵ و خالیە لەبەر ئەوەی ستەمیان کرد. وە لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ (٤٥) أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾[4] واتە: ئینجا چەندەها شارو دێمان وێران کرد کە(خەڵکەکەی) ستەمکار بوون ئەو(شارانە دیواری خانووەکانی) کەوتبوون بەسەر سەربانەکانیاندا وە چەندەها بیر بێ خاوەن بوون و (لەکارکەوتبوون)و چەندەها کۆشکی بەرزو بڵند(بێ خاوەن بوون)، دەی ئایا ئەوانە بە زەویدا نەگەڕاون تا دڵیان هەبێت بیری پێ بکەنەوە(لەو

[1] مريم(٩٨).

[2] الاعراف(٩٢).

[3] النمل(٥٢).

[4] الحج(٤٥ـ٤٦).

وێران بوونە) یان گوێیان هەبێت گوێی پێ بگرن(بۆ ڕاستی)، لە ڕاستیدا چاوەکان کوێر نابن بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لە سینەکاندان. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ﴾ واتە: لەناوچوونو قڕبوونی ئەو گەلانە کە بڕوایان نەکرد بە پێغەمبەرەکانیانو ئەوانەی کە بڕوایان هێناو ڕزگاریان بوو هەموو پەندو ئامۆژگارین، ﴿أَفَلَا يَسْمَعُونَ﴾ مەگەر ئێوە دەنگو باسی ئەوانەی ڕۆیشتنو چیان بەسەرهات نابیستن.

## ژیانەوەی زەمین بە ئاو بەڵگەیە لەسەر زیندووبوونەوە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ﴾ خوای گەورە باسی سۆزو بەزەیی‌و چاکەی خۆی دەکات بۆ بەندەکانی کە ئاویان بۆ دەنێرێت لە ئاسمانەوە یان لە چەم‌و ئەمدیوودیوی چیاکانەوە دێتە خوارەوە بۆ سەر ئەو زەویانەی کە پێویستیان بە ئاو هەیە لەو کاتانەدا بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ﴾ واتە: ئەو زەویانەی کە گیاوگژو ڕووەکی تێدا نیەو وشکە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴾[1] واتە زەویەکی وشك‌و برنگ کە هیچی تێدا ناڕوێت، بۆیە خوای گەورەو بە دەسەڵات فەرموویەتی: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴾ واتە: ئایا نابینن‌و نازانن کە ئێمە ئاو دەنێرین بۆ زەوی وشکی بێ ڕووەك ئینجا بە هۆی ئەو ئاوەوە کشتوکاڵ‌و گژوگیا دەڕوێنین کە ئاژەڵیان لێی دەلەوەڕێت‌و خۆشیان لێی دەخۆن دەی ئایا ئەوانە نابینن. وەك ئەم ئایەتەی کە خودا لە سورەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا﴾[2] واتە: دەبا مرۆڤ سەیری خواردنەکەی خۆی بکات، بە ڕاستی ئێمە لە هەورەوە بارانمان داڕژاند چۆن داڕژاندنێك. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴾ واتە: مەگەر نابینن.

﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٨﴾ قُلْ يَوْمَ الْفَتْحِ لَا يَنفَعُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِيمَانُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَانتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴿٣٠﴾﴾

## پەلەکردنی خوانەناسان بۆ سزادانیان‌و وەڵامدانەوەیان

خوای گەورە باسی پەلەکردنی خوانەناسان دەکات بۆ دابەزینی سزا بۆیان، کە داوا دەکەن زوو تۆڵەیان لێ بسەنرێت، ئەگەر قسەکانی ڕاستە ، چونکە ئەو خوانەناسانە بڕوایان بە قسەکانی نیەو بە

---

[1] الكهف(٨).

[2] عبس(٢٤_٢٥).

دووری دەزانن بۆیە ئەڵێن وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْفَتْحُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: دەڵێن: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) کەی سەردەکەوی بەسەرماندا، وەك دەڵێن: ڕۆژێك دێت کە سەردەخرێیت بەسەرمانداو تۆڵەمان لێ دەسەنرێت لەبەر تۆ، ئەو ڕۆژە کەی دێت؟ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن. ئێمە تۆو هاوەڵەکانت دەبینین خۆتان دەشارنەوەو دەترسن‌و هیچ دەسەلاتێکتان نیە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ﴾ واتە: بڵێ: کاتێك سزاو تورەیی خودا دابەزی بەسەرتاندا لە دنیاو قیامەتدا، ﴿لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ واتە: باوەڕیان سوود ناگەیەنێت بەوانەی بێباوەڕبوون لە دنیادا. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾[1] واتە: جا کاتێك پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە هاتنە لایان دڵخۆش بوون بەو زانینەی هەیانبوو ئەو(سزای) گاڵتەیان پێ دەکرد چواردەوری دان. وە هەر کەسێك وا دەزانێت کە مەبەست بەم سەرکەوتنە، فەتحی مەککەیە ئەوە نەیپێکاوەو هەڵەیەکی گەورەی کردووە، چونکە ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەری خودا(ﷺ) موسڵمان بوونی ئازادکراوەکانی قەبوڵ کرد کە نزیکەی دوو هەزار کەس دەبوون، خۆ ئەگەر مەبەست فەتحی مەککە بوایە، پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمانبوونی ئەوانەی قەبوڵ نەدەکرد لەبەر ئەم ئایەتە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَوْمَ ٱلْفَتْحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِيمَٰنُهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ بەڵکو مەبەست بەو فەتح‌و سەرکەوتنە دەرکردنی بڕیاری خودایەو ڕۆژی جیاکردنەوەیە، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿فَٱفْتَحْ بَيْنِى وَبَيْنَهُمْ فَتْحًا﴾[2] واتە: کەواتە لە نێوان من‌و ئەواندا حوکم بدە بە حوکمدانێکی یەکجاری. وە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ﴾[3] واتە: بڵێ پەروەردگارمان ئێمەو ئێوە کۆدەکاتەوە لە پاشان بڕیار دەدات لە نێوانماندا بە هەق‌و ڕاستی. وە فەرموویەتی: ﴿وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾[4] واتە: وە(پێغەمبەران) داوای سەرکەوتن‌و زاڵ بوونیان کرد(لە خوا) هەموو ملهوڕو یاخیەکان بێ هیوا بوون. وە فەرموویەتی: ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ

[1] الغافر(٨٣).

[2] الشعراء(١١٨).

[3] السبأ(٢٦).

[4] ابراهيم(١٥).

كَفَرُوا۟ ﴾[1] واتە: وە ئەوان(جوولەكەكان) لەوەوپێش داوای زاڵبوونیان دەكرد لە خوا بەسەر ئەوانەی كە بێباوەڕ بوون. وە فەرموویەتی: ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ﴾[2] واتە: ئەگەر ئێوە(كافرن) داوای یارمەتیو سەركەوتن دەكەن ئەوە بە ڕاستی سەركەوتنتان بۆ هات(گاڵتەیان پێ دەكات). پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَٱنتَظِرْ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴾ واتە: واز لەو موشریكانە بێنە، ئەوەی لە لای پەروەردگارتەوە بۆت هاتووە بیگەیەنە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ﴾[3] واتە: شوێنی ئەوە بكەوە كە لە لایەن پەروەردگارتەوە سروشت كراوە بۆت هیچ شایستەی پەرستن نیە بێجگە لەو(خوا). سا تۆ چاوەڕوان بە بێگومان خودا ئەو بەڵێنەی كە پێی داوی بەم زووانە بۆت جێبەجێ دەكاتو سەرت دەخات بەسەر ئەوانەی كە نەیارن لەگەڵتو دژایەتیت دەكەن چونكە خودا نكۆڵی ناكات لە بەڵێنیدا، ﴿إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ ﴾ واتە: تۆ چاوەڕوانی دەكەیو ئەوانیش چاوەڕوانی دەكەن هەتا ئێوە شتێكتان بەسەر بێت، ﴿أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ﴾[4] واتە: بەڵكو دەڵێن(موحەممەد(ﷺ)) شاعیرە چاوەڕوانی مردنی دەكەین. تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) بەم زووانە ئاكامی ئەو خۆگریەت دەبینی بە هۆی بەجێهێنانی ئەو پەیامەی كە گەیاندت، خودا یاریدەدەرو پشتیوانتە، ئەوانیش تۆڵەو هەقی ئەو چاوەڕوانی خۆیانە وەردەگرن كە بە تەما بوون تۆو هاوەڵەكانت لەناو بچنو نەمێنن، تووشی سزاو تۆڵەی خودا دەبن، خودامان بەسەو چاكترین فریادڕەسە.

---

[1] البقرة(٨٩).

[2] الانفال(١٩).

[3] الانعام(١٠٦).

[4] الطور(٣٠).

## تەفسیری سورەتی(الاحزاب)

## لە مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ
إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾﴾

**فەرماندان بە نەبەزی بەرامبەر خوانەناس‌و دووڕووان‌و شوێنکەوتنی فەرمانەکانی خوداو خۆسپاردن پێی**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ٱتَّقِ ٱللَّهَ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) لە خوا بترسە. ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە، گومانی تێدا نیە کاتێك خودای گەورە فەرمان دەدات بە بەندەو پێغەمبەر خۆی کە لە خودا بترسێت کەواتە ئەو فەرمانە زیاترو چاکتر ڕوودەکاتە موسڵمانان‌و شوێنکەوتووانی. تەلقی کوڕی حەبیب دەڵێت: لە خواترسان(التقوى) واتە: خواناسی بکەی بەپێی ڕووناکیەك لە لایەن خوداوەو بە ئومێدی پاداشتی ئەو، وە وازبێنی لە تاوانکردن بەپێی ڕووناکیەك لە لایەن خواوەو لە ترسی سزای ئەو، ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾ واتە: گوێ مەگرەو ڕاوێژ مەکە بە خوانەناسان‌و دووڕووان، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ واتە: هەر خودا شایەنی ئەوەیە کە فەرمانی بەجێ بێنی‌و بیپەرستی، چونکە خودا ئاگاداری هەموو کارەکانەو کارزانە لە کردارو گفتاریدا، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ واتە:شوێن ئەوە بکەوە کە فەرمانت پێکراوە لە قورئان‌و سوننەت. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾ واتە: خودا هیچی لێ ون نابێت‌و ئاگاداری هەموو شتە. ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: خۆت بە خودا بسپێرە لە هەموو کارێك‌و لە گشت کاتێکدا. ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ واتە: خودا بەسە بۆ کەسێك خودا بکاتە وەکیلی خۆی‌و بگەڕێتەوە بۆلای.

﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٖ مِّن قَلۡبَيۡنِ فِي جَوۡفِهِۦۚ وَمَا جَعَلَ أَزۡوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنۡهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمۡۚ وَمَا جَعَلَ
أَدۡعِيَآءَكُمۡ أَبۡنَآءَكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ قَوۡلُكُم بِأَفۡوَٰهِكُمۡۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلۡحَقَّ وَهُوَ يَهۡدِي ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ
هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡۚ وَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٞ فِيمَآ
أَخۡطَأۡتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتۡ قُلُوبُكُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾﴾

## پوچەڵکردنەوەی کوڕی خەڵکی بە کوڕی خۆکردن

خوای گەورە ئەیەوێت لە پێش مەبەستە نادیارەکەوە، بەشتێکی ماددی دیار ئەومەبەستە بسەلمێنێ، ئەویش ئەوەیە: چۆن خودا بۆ هیچ کەسێك لە سینەیدا دوو دڵی دادەناوە، هەروەها تەنها هەربەوەی پیاوێك بە ژنەکەی بڵێ: تۆ وەك دایکم وای، نابێتە دایکی، بەو شێوەیە کوڕی خەڵکیش نابێتە کوڕی کەسی تر و وەك کوڕی خۆی بانگی بکات! وەك دەفەرموێت: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔى تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْ ﴾ واتە: خودا داینەناوە بۆ هیچ پیاوێك دوو دڵ لەناو سنگیدا وە خوا ئەو هاوسەرانەتانی نەکردووەتە دایکتان کە(ظهار)یان لەگەڵ دەکەن. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿مَّا هُنَّ أُمَّهَٰتِهِمْ ۖ إِنْ أُمَّهَٰتُهُمْ إِلَّا ٱلَّٰٓـِٔى وَلَدْنَهُمْ ﴾[1] واتە: ئەوانە دایکی ئێوە نین دایکی ئێوە هەر ئەو ژنانەن کە ئەوانیان لێ بووە. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ ﴾ واتە: وە خوا بە کوڕکراوەکانتانی نەکردووە بە کوڕتان. وەك خوای گەورە هەر لەم سورەتەدا لە ئایەتی چلدا فەرموویەتی: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴾ وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْ ﴾ واتە: هەر لە خۆتانەوە بە قسە کردووتانن بە کوڕی خۆتان، لە ڕاستیدا ئەوانە کوڕی ئێوە نین، چونکە لە پشتی پیاوێکی تر وەدی هاتوون، ناگونجێت کوڕێك دوو بابی هەبێت، وەك چۆن نابێت پیاوێك دوو دڵی هەبێت، ﴿وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴾ واتە: خودا ڕاست ئەڵێ. ﴿وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴾ قەتادە دەڵێت: وە هەر خۆی ڕاستەڕێ نیشان دەدات. ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: حەسەن بۆی گێڕاینەوە، زوبەیر بۆی گێڕاینەوە لە قابوسەوە واتە: کوڕی ئەبو زەبیان دەڵێت: باوکی بۆی گێڕاوەتەوە وتوویەتی: وتم بە ئیبنو عەبباس ئەم ئایەتە چۆن دەبینی کە دەفەرموێت: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾ مەبەست چیە بەوە؟ وتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵسا نوێژ بکات شتێك هات بە دڵیدا دووڕووەکان ئەوانەی کە نوێژیان لەگەڵ دەکرد وتیان: ئاخۆ سەیر ناکەن کە دوو دڵی هەیە دڵێکی لەگەڵ ئێوەیەو دڵێکیشی لەگەڵ ئەوانە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِى جَوْفِهِۦ ﴾[2].هەر بەم شێوەیە تیرمزی ڕیوایەتی کردووە.

---

[1] المجادلة(٢).

[2] أحمد(٢٦٧/١)، نەسائی وتوویەتی فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

پاشان دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی چاکە.[1] هەر بەم شێوەیە ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەکەی زوهەیرەوە[2].

## کوڕی خەڵکی هەر بەناوی باوکی ڕاستی خۆیەوە بانگ دەکرێت

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾ واتە:(ئەو بە کوڕ کراوانە) بە ناوی باوکیان بانگیان بکەن ئەوە ڕاسترە بە لای خواوە. ئەمە بڕیارێکە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەو دیاردەی کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا باوبوو کوڕی خەڵکی دەکرا بە کوڕی خۆ، خوای گەورە فەرمانی دا کە هەموو کەسێك بە ناوی باوکی ڕاستی خۆیەوە بانگ بکرێت، بێگومان ئەمە کارێکی چاكو ڕاستو دادپەروەرانەیە، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدولای کوڕی عومەرەوە دەڵێت: زەیدی کوڕی حارسە مەولای پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ) بانگمان نەدەکرد بە زەیدی کوڕی موحەمەد نەبێت، هەتا قورئان هاتە خوارەوە فەرمووی: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ هُوَ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِۚ ﴾.[3] موسلیمو تیرمیزیش هێناویانە.[4] چونکە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن لەناو ماڵو منداڵدا وەك کوڕی خۆیان هیچ جیاوازیەکیان نەبوو بە تەنها لەگەڵ خێزانەکانیاندا دەمانەوە، لەبەر ئەوە سەهلەی کچی سوهەیل ژنی ئەبو حوزەیفە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە سالمان بە کوڕی خۆمان بانگ کردووە، ئەوەتا قورئان لەو بارەیەوە هاتووەتە خوارەوە، کاتێك کە سالم دێتە لای من وا دەبینم حوزەیفە شتێك کەوتبووە دڵی لەو بارەیەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(شیری بدەرێ حەرام دەبێت لێی).[5] بۆیە کاتێك ئەم بڕیارە نەسخ بووەوە خوای گەورە ڕێی والا کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەینەبی کچی جەحشی خواست(مارەکرد) کە زەیدی کوڕی حارسە تەلاقی دابوو، کە بە زەیدی کوڕی موحەممەدیان(ﷺ) بانگ دەکرد. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِكَيۡ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ حَرَجٞ فِيٓ أَزۡوَٰجِ أَدۡعِيَآئِهِمۡ إِذَا قَضَوۡاْ مِنۡهُنَّ وَطَرٗاۚ ﴾[6] واتە: بۆ ئەوە هیچ نارەحەتی(و تاوانێك) نەبێت لەسەر ئیمانداران لە(مارەکردنی) ژنانی بەکوڕکراوەکانیاندا کاتێك پێویستیان پێیان نەماو تەلاقیان دان. وە

---

[1] تحفة الأحوزي(٩/٥٨)، نەسائی وتوویەتی فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

[2] الطبري(٢٠/٢٠٤).

[3] فتح الباري(٨/٣٧٧).

[4] مسلم(٤/١٨٨٤)، تحفة الأحوزي(٩/٧٢)، النسائي(٦/٤٢٩).

[5] مسلم(٢/١٠٧٦).

[6] الاحزاب(٣٧).

خوای گەورە لـە ئایـەتی تەحریمدا فەرموویـەتی: ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ﴾[1] واتـە: وە(حەرامـە بۆتـان) هاوسـەرانی کوڕەکانتـان(بـووك) ئەوانـەی کـە لـە پـشتی خۆتـان. بـۆ جیاکردنەوەی کوڕی ڕاستی لە کوڕی خەڵکی بـەخۆکردن، واتـە: ژنـانی کـوڕی خۆتـان، کـە بـە ڕاستی کوڕتانن، بۆتان ناشێن و لێتان حەرامن، بەڵام کوڕی شیری وەك کوڕی خۆ وایە، لە شەریعەتدا بـە پێـی ئەم فەرموودەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هـاتووە کـە پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویـەتی:(حـەرام کـراوە بەهۆی شیرپێدانەوە ئەوەی کە حەرام دەکرێت بە نەسەب).[2] واتە: ئەوەی بە نەسەب حەرام دەبێت بـە شـیرپێدانیش حـەرام دەبێـت، بـەڵام بـانگکردنی کەسـێك بـە کوڕەکـەم(یـان ڕۆڵـە) بـۆ ڕێزلێنـان و خۆشەویستی ئەوە ئەم ئایەتـە نایگرێتـەوە، بـە پێـی ئـەو فـەرموودەی کـە ئیمـامی ئەحمـەدو خـاوەن سونەنەکان ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی نەبێت. لە ئیبنو عەبباسەوە(ڕەزای خـوای لـێ بێـت) دەڵێـت: کۆمەڵێك لاوی نەوەی عەبدولموتەلیب ڕۆیشتینە لای پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) سـواری وڵاخ بووین، بـۆ شـەیتان ڕەجـم کـردن بـەردمان کۆکردبوویـەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) (بـۆ خۆشـی) ئەیکێـشا بەڕانمانـدا و ئەیفـەرموو: (ڕۆڵـە بچکۆلەکانم! بـەردەکان فـڕێ مـەدەن هـەتا خـۆر دەردەکـەوێت و هەڵدێت).[3] ئـەبو عوبەیدەو کەسـانی تـریش دەڵـێن:(أُبيني) بچووك کـراوەی(بنيّ)، ئەمـە بەڵگەیـەکی ئاشـکرایە، ئـەم ڕووداوەش لە حەجیماڵئاواییدا بـوو لـە سـاڵی دەی کۆچیدا، خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ﴾ ئەم ئایەتە لە بارەی زەیدی کوڕی حارسەوە هاتووەتە خوارەوە(ڕەزای خوای لێ بێـت) کـە لە غەزای موئتەدا شەهیدکرا لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا. دیسان لە سەحیحی موسلیمدا ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەی کوڕم بنيّ).[4] ئـەبو داودو تیرمیـزیش ڕیوایـەتیان کـردووە.[5] خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿فَإِن لَّمۡ تَعۡلَمُوٓاْ ءَابَآءَهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمۡ﴾ واتە: ئینجا ئەگـەر باوکیان نەناسـن ئەوانـە بـرای ئـایینی و دۆستو خۆشەویستانن. خوای گەورە فەرمانی دا بە گەڕانەوەی ئەوانـەی کـە بـە نـاوی کـوڕی خـەڵکی بـانگ دەکـران بـۆ لای بـاوکی خۆیـانو بـە نـاوی بـاوکی خۆیـان بـانگ بکـرێن، خـۆ ئەگـەر بابیـشیان نەدەناسرا، برای موسڵمانانو دۆستی ئێوەنو لە جێی باوكو کەسو کاریـانن، لەبـەر ئـەوە پێغەمبـەری

[1] النساء(٢٣).

[2] فتح الباري(٣٩٢/٢)، مسلم(١٠٦٩/٢).

[3] أحمد(٣٣٤/١)، ابو داود(٤٨٠/٢)، النسائي(٢٧١/٥)، ابن ماجه(١٠٠٧/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] مسلم(١٦٩٣/٣).

[5] أبو داود(٢٤٧/٥)، تحفة الأحوذي(١٢٠/٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

خودا(ﷺ) لە مەککە دەرچوو بۆ عومرەی قەزا کچەکەی حەمزە شوێنیان کەوت(ڕەزای خوای لێ بێت) هاواری کرد مامە، مامە. عەلی(ڕەزای خوای لێ بێت) هەڵی گرتو وتی بە فاتیمە: ئەوەتا ئەوە کچی مامتە، فاتیمە هەڵی گرت. عەلیو زەیدو جەعفەر بووە کێشەیان لەسەری کە کامیان بەخێوی بکاتو لای بێت، هەر کەسەو باسی خۆی دەکردو بەڵگەی دەهێنایەوە، عەلی(ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: من خاوەن هەقترم پێی، ئەو کچی ماممە. زەید وتی: کچی برامە. جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب وتی: کچی مامەو پووریشی خێزانمە. واتە: ژنەکەی کە ئەسمای کچی عەمیس بوو. پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیاری دا بدرێت بە پورەکەی، پاشان فەرمووی:(پوری لە جێی دایکە)! فەرمووی بە عەلی:(تۆ لە منیو منیش لە تۆم) فەرمووی بە جەعفەر(ڕەزای خوای لێ بێت):(ڕەوشتو شێوەت لە من دەچێت) فەرمووی بە زەیدیش:(تۆ براو دۆستمانی).[1] لەم فەرموودەیەوە بڕیار و حوکمی شتی زۆرمان دێتە دەست چاکترینیان ئەوە بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیاری دا بە هەقو ڕاستی هەموو ئەوانەی کە کێشەیان هەبوو ڕازی کردن، ئەوە بوو فەرمووی بە زەید(ڕەزای خوای لێ بێت):(تۆ براو دۆستمانی) وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَمَوَٰلِيكُمْ﴾ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ﴾ واتە: کاتێك ئێوە بە هەڵە هەندێکتان کوڕی مەردمتان کردبێت بە کوڕی ڕاستی خۆتان بە ئەنقەس نەبووبێتو واتان بە چاك زانیبێت خوای گەورە گوناهتان لەسەر نانووسێت لەسەر ئەو هەڵەیە وەك لە ئایەتێکدا ڕێ نیشانی بەندەکانی دەداتو فەرمانیان پێ دەکات کە بڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[2] واتە: ئەی پەروەردگارمان لێمان مەگرە ئەگەر کردەوەیەکی پێویستمان لەبیرچوو یان بە هەڵە گوناهێکمان کرد. لە سەحیحی موسلیمیشدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزن فەرموویەتی: بێگومان منیش وامکردووە)[3]. وە لە سەحیحی بوخاریشدا هاتووە لە عەمری کوڕی عاسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەگەر دادوەرو کاربەدەست ئیجتیهادی کردو پێکای دوو پاداشتی هەیە، وە ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد پاداشتێکی هەیە).[4] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:(بێگومان خوای مەزن چاوپۆشی کردووە لە ئومەتەکەم لە هەڵەو لەبیرچوونو لە شتێك کە بە

---

[1] فتح الباري(٧/٥٧٠).

[2] البقرة(٢٨٦).

[3] مسلم(١/١١٦).

[4] فتح الباري(١٣/٣٣٠).

زۆر پێیان بکرێت).[1] وە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە: بەڵکو کاتێك تاوانە لەسەر ئەو کەسە کە بە ئەنقەس ئەو تاوانە بکات وە خوا لێبوردەی میهرەبانە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾[2] واتە: خوا سوێندی بێ هودە(لە دەم دەرچوون)تان لێ ناگرێت بەڵام سوێندێکتان لێ دەگرێت کە بە دڵ بتانەوێت(ئەو شتە بکەن یان نەیکەن). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەباسەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: خوای مەزن موحەمەدی(ﷺ) بە ڕاستی ناردو کتێبیشی لەگەڵدا ڕەوانەکرد، لەو ئایەتانەی کە بۆی هات، ئایەتی بەردەباران بوو(ڕەجم)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەجمی کرد ئێمەش دوای ئەو ڕەجممان کرد. پاشان وتی: وە ئێمە دەمانخوێندەوە:(ولا تَرغبوا عن آبائكم فإنه كفر بِكم) یان(إنَّ كفراً بكم أن ترغبوا عن آبائكم) واتە: بێگومان سپڵەیی و لاساریە و لادانە لە ڕێی پێشینەکان(باب و باپیر) چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(زۆر وەسفم مەکەن و بەرزم مەکەنەوە وەك چۆن عیسای کوڕی مەریەم وەسف کرا(سەلامی خوای لێ بێت) بەڵکو من عەبدی خوام. بڵێن: عەبدی خواو پێغەمبەری خودایە -ﷺ-) موعەمەر دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:( وەك گاورەکان(مەسیحیەکان) کوڕی مەریەمیان وەسف کرد).[3] وە لە فەرموودەیەکی تردا ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە:(سێ شت لەناو خەڵکیدا خوانەناسی و کوفرە: تانەو تەشەر لە بنەچەی خەڵکی، بە دەنگی بەرز گریان و هاوارکردن بۆ مردوو، داواکردنی باران لە ئەستێرەکان)[4].

﴿ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا ﴿٦﴾﴾

**پێغەمبەر(ﷺ) بۆ موسڵمانان لە خۆیان فەرزترەو ژنەکانیشی دایکی موسڵمانەکانن**

خوای مەزن خۆی ئاگاداری پێغەمبەر بووە(ﷺ) کە چەندە بە سۆز بووە بۆ ئومەتەکەی و چەندە خەریکی ئامۆژگاریان بووە. بۆیە خوای گەورە فەرزتری کردووە لە لایان تەنانەت لە گیانی خۆشیان و

---

[1] تحفة الأحوذي(٦٥٩/١)، فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

[2] البقرة(٢٢٥).

[3] أحمد(٤٧/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم(٩٣٤)، أحمد(٣٤٢/٥).

فەرمانی پێغەمبەری(ﷺ) پێش فەرمانی ئەوان خستووەو نابێت لە قسەی دەرچن وەك دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[1] واتە: نەخێر (وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا لە پاشان هەست نەکەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی تۆ داوتەو ملکەچ نەکەن بە ملکەچیەکی تەواو. وە لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە:(سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە باوەڕی تەواو نابێت هیچ کەسێك لە ئێوە تا من خۆشەویستتر نەبم لە لای لە گیانیو لە ماڵو منداڵیو لە هەموو خەڵکیش)[2]. وە لە فەرموودەیەکی سەحیحی تریشدا هاتووە کە عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێندبە خوا، تۆ لام خۆشەویستتری لە هەموو شتێك لە گیانی خۆم نەبێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(نابێت ئەی عومەر دەبێت لە گیانی خۆشت خۆشەویستتر بم لە لات)، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێند بە خوا تۆ خۆشەویستتری لە لام لە هەموو شتێكو لە گیانی خۆیشم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئێستا ئەی عومەر).[3] بۆیە خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ . بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ خاوەن باوەڕێك نیە من لە لای لە خەڵکی لەپێشتر نەبم لە دنیاو لە قیامەتدا)، ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾ (واتە: پێغەمبەر(ﷺ) لە خودی باوەڕداران لە خۆیان لە پێشترە). جا هەر موسڵمانێك سامانێکی بەجێ هێشت با کەسو کارەکەی هەر کەسێك هەن سامانەکەی بەرن، خۆ ئەگەر قەرزار بوو یان خێزانو منداڵی لێ بەجێ مابوو با بیهێنێت بۆ لای من، خۆم خاوەنیم)، تەنها بوخاری خۆی ڕیوایەتی کردووە. لە باسی قەرزو قوڵەشدا هەر باسی کردووە.[4] ﴿وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ﴾ واتە: ژنەکانیشی دایکی موسڵمانانن لە ڕێزو گەورەییدا و لە بەرز سەیر کردن و (بۆنەشیان)یاندا، بەڵام دروست نیە بە تەنها لەگەڵیان دانیشن، ئەم بۆنەشیانو حەرام بوونە ناچێت بۆ کچو خوشکەکانیان بەکۆ ڕای هەموو زانایان، ﴿وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى

[1] النساء(٦٥).
[2] فتح الباري(١/٧٥).
[3] فتح الباري(١١/٥٣٢).
[4] فتح الباري(٨/٣٧٦ و ٥/٧٥).

كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ واتـه: خزمو كەسوكار بۆ میرات لـه یـەكتری بـردن شـیاوترن لـه لای خـودا، ﴿مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ﴾ واته: له خاوەن باوەڕو كۆچەریەكان، ئەم ئایەته ئەو میرات بردنـەی كه لـه نێوان موسڵمانه كۆچەریو ئەنساریەكاندا هـەبوو، هەڵوەشاندەوەكه بـه هـۆی هاوپـەیمانیو برایـەتی ئیسلامیەوه كه لـه نێوانیانـدا هـەبوو، وەك ئیبنـو عـەباسو كەسانی تـریش وتوویانـه: كۆچـەریەكان میراتیان له ئەنساریەكان دەبرد، له غەیری خزمو كەسو كارەكانی ترشیان به هۆی ئەو برایەتیەوه كه پێغەمبەری خودا(ﷺ) خستبوویه نێوانیان.[1] هەر بەو شێوەیه سەعیدی كوڕی جوبەیرو كەسانی تـریش وتوویانه له پێشینەكانو پاشینەكانیشی. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓاْ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا﴾ واته: میراتی له یەكتری بردن نـەما، بـەڵكو یارمـەتی دانو خێـرو چـاكه كـردن لەگـەڵ یـەكو پەیوەنـدیو ئامۆژگـاری یـەكتری كـردن هـەر دەمێنێـتو شـتێكی چـاكه. ﴿كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَٰبِ مَسْطُورًا﴾ واته: ئەمەیش لەو كتێبەدا نووسراوە، واته: ئەم بڕیاره له لای خـودا نووسـراوه كه خزمو كەسو كار له پێشترن له میراتی له یـەكتر بـەن، بڕیارێكـه دراوەو گـۆڕینی بەسـەردا نایـەتو لانابرێت، ئەمه قسەی موجاهیدو زۆر كەسی تریشه، هەرچەنده خوای مەزن له ماوەیەكدا ڕێگـای دابـوو لەبەر كارزانی خۆیو خۆشی زانیویەتی كه نەسخی دەكاتەوە، هەر ئەو بڕیاره كه داویـەتی لـه ئەزەلـدا دەبیو بەجێ دەهێنرێت، والله أعلم.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾ لِّيَسْـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ ۚ وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٨﴾﴾

**بەڵێنو پەیمان وەرگرتن له پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت)**

خوای گەورە باسی پێنج پێغەمبەره نەبەزەكه(ألوالعزم)و پێغەمبەرەكانی تریش دەكات كه بـەڵێنو پـەیمانی لێ وەرگرتوون ئاینی لەسەر زەمینـدا جـێگیر بكـەنو ئـەو پەیامـەی كه پـێی داون بیگـەیەننو بڵاوی بكەنەوەو یارمەتیو كۆمەكی یەكتری بكەنو یەك دەنگ بن، وەك له ئایەتێكی تردا فەرموویـەتی:

﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّۦنَ لَمَآ ءَاتَيْتُكُم مِّن كِتَٰبٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ ۚ قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى ۖ قَالُوٓاْ أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَٱشْهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾[2] واته:(بهێنەرەوه یادیان) كاتێك كه خوا پەیمانی وەرگرت له پێغەمبەران هەرچیم دانـێ لـه

---

[1] البخاري(٢٢٩٢/٤٥٨٠/٦٧٤٧).

[2] ال عمران(٨١).

نامەو حیکمەت(شەریعەت) لە پاشان پێغەمبەرێکتان بۆ هات بە بڕواهێنەر بەو نامەی کە لە لاتانە دەبێت بڕوای پێ بهێنن‌و یارمەتی بدەن خوا فەرمووی: ئایا دانتان نا بەم پەیمانەدا؟ وە لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت پێغەمبەران وتیان: بەڵێ دانمان پێدا ناو پەیمانمان بەست خوا فەرمووی کەواتە ئێوە بە شاهێد بن‌و منیش لەگەڵ ئێوە یەکێکم لە شاهیدان. ئەم بەڵێن‌و پەیمانەی لێ وەرگرتن دوای ئەوەی کە ڕەوانەی کردوون‌و بە تایبەتی باسی ئەو پێنج پێغەمبەرە نەبەزو لێبڕاوەی کردووە، ئەمەیش لە بابی عەتفی خاسە بۆ سەر عەتفی عام، وە لەم ئایەتەیشدا هەر باسی هێناون دەفەرمووێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَالَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾[1] واتە: ئەو ئایینەی بۆ داناون کە فەرمانی داوە بە نوح‌و ئەوەش نیگامان کردووە بۆ تۆو ئەوەش کە فەرمانمان داوە بە ئیبراهیم‌و موساو عیسا کە لەسەر ئەو ئایینە بن بە ڕێك‌و ڕاستی‌و جیاوازی تێدا مەکەن. خوای گەورە باسی پێغەمبەرە نەبەزو لێبڕاوەکانی کردووەو ئەو پێغەمبەرانەشی لە نێوانیاندا هاتووەو باسی دوایین پێغەمبەریشی کردووە، کە هەموویان بەڵێن‌و پەیمانیان لێ وەرگیراوە کە ئایینی خودا بڵاوبکەنەوەو نکوڵی لێ نەکەن، وەك خوای گەورە لەم ئایەتـــەدا دەفـــەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾ واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ) بیریان بخەرەوە) کاتێك کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران هەروەها تۆو نوح‌و ئیبراهیم‌و موساو عیسای کوڕی مەریەم. لەم ئایەتەدا لە پێغەمبەرەوە موحەممەد(ﷺ) دەستی پێکردووە لەبەر گەورەیی‌و ڕێزی پاشان پێغەمبەرەکانی تریشی(سەلامی خوایان لێ بێت) بە ڕێز هێناوە بە دوای یەکدا لە زەمانی خۆیاندا، ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ واتە: وە لە هەموویان پەیمانی پتەوو بەهێزمان وەرگرت ئیبنو عەباس دەڵێت:(المیثاق الغلیظ) واتە: پەیمان.[2] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِّيَسْـَٔلَ الصَّٰدِقِينَ عَن صِدْقِهِمْ﴾ موجاهید دەڵێت: هەتا پرسیار بکات لەوانەی کە گەیاندوویانەو پشتگیریان کردووە لە پێغەمبەران.[3] ﴿وَأَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئامادەکراوە بۆ ئەو خوانەناسانەی لە ئومەتی ئەو پێغەمبەرانە ﴿عَذَابًا أَلِيمًا﴾ سزایەکی زۆر بە ژان، ئێمە شایەتی دەدەین کە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) پەیامەکانی پەروەردگاری خۆیان گەیاندووەو گەلەکەمانیان ئامۆژگاری کردووەو ڕاستیان بۆ ڕۆشن کردوونەتەوە بە شێوەیەکی زۆر

---

[1] الشوری(١٣).

[2] الطبري(٢٠/٢١٣).

[3] الطبري(٢٠/٢١٤).

ئاشکرا کە هیچ گومانێکیان تێدا نەهێشتووەتەوە. هەرچەندە هەندێ نەزان‌و لاسارو تاوانبارو گومڕا بڕوایان نەهێناوە پێیان. ئەوەی پێغەمبەران پێی هاتوون هەر ئەوە ڕاستە، ئەوانەی دژایەتیان دەکەن خراپەکارو گومڕان. وەك ئەهلی بەهەشت ئەڵێن: ﴿لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ﴾[1].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا ﴿١٠﴾﴾

**باسی شەڕی ئەحزاب**

خوای گەورە باسی چاکەو بەهرەو ڕێزی خۆی دەکات لەگەڵ عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە چۆن لایدان‌و پاراستنی ئەو ساڵەی کە هاودەستەکان هەموو کۆبوونەوەو هاتبوون بدەن بەسەر مەدینەداو پێغەمبەرو موسڵمانان لەناو بەرن، ئەو ساڵە پێی ئەڵێن ساڵی خەندەق لە شەوالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو کەئەمە ڕایەکی ڕاست‌و مەشهورە. موسای کوڕی عوقبەو چەند کەسێکی تریش ئەڵێن: لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا بووە.[2] هۆی هاتنی ئەو هاوپەیمانانە هەندێ لە پیاو ماقوڵانی جولەکەی بەنو نەزیر کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەدینە دەری کردبوون بۆ خەیبەر لەوانە سەلامی کوڕی ئەبو حەقیق‌و سەلامی کوڕی موشکیم و کەنانەی کوڕی ڕەبیع، چوون بۆ مەککەو لەگەڵ پیاوماقوڵانی قورەیش کۆبوونەوەو هەڵیاننان بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر بکەن(ﷺ) بەڵێنیشیان دانێ کە بە گیان‌و ماڵیان هاوکاریان بکەن، قورەیشیەکان داواکەیان قەبوڵ کردن، پاشان ڕۆیشتن بۆ لای تیرەی غەتەفان ئەوانیش داواکەیان قەبوڵ کردن، پاشانیش قورەیش خۆی کۆکردەوە لەگەڵ ئەو تیرانەی کە لەگەڵی هاتن بە سەرۆکایەتی ئەبو سوفیان سەخری کوڕی حەرب، غەتەفانیش بە سەرۆکایەتی عویەینەی کوڕی حیسنی کوڕی بەدر بوو، ژمارەی هەموویان نزیکەی دە هەزار کەس دەبوو، کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیستی بەرەو مەدینە دێن، فەرمانی دا بە موسڵمانان کە چاڵ(خەندەق) بە دەوری مەدینەدا هەڵکەنن لە لای خۆرهەڵاتەوە، ئەم خەندەقەیش لەسەر ڕای سەلمانی فارسی بوو(ڕەزای خوای لێ بێت) موسڵمانەکان ئیشیان تێدا کردو زۆر خۆیان ماندوو کرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی خۆڵی دەگواستەوەو چاڵی هەڵدەکەند، لەو چاڵ هەڵکەندنەی پێغەمبەردا(ﷺ) بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوون دەرکەوتن و ئاشکرا بوون، موشریکەکان هاتن لە باکووری مەدینەوە چادریان هەڵدا لە نزیکی ئوحود، هەندێکی تریان لە بەرزاییەکانی مەدینە باریان خست و دابەزین وەك

---

[1] الاعراف(٤٣).

[2] فتح الباري(٧/٤٥٣).

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾ پێغەمبـەریش(ﷺ) لەگـەڵ موسڵمانەکاندا کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون چوون بۆیان‌و خۆیان ئامادە کرد، هەندێکیش ئەڵێن حەوت سەد کەس بوون، پاڵیان دا بە کێوی سەلحەوە ڕوویان کردە دوژمن، ئەو خەندەقەی هەڵیان کەندبوو ئاوی تێدا نەبوو هەتا سوارو پیادەی دوژمن نەتوانن دەستیان بگاتە موسڵمانان، منداڵ‌و ژنانی موسڵمانان لەناو ماڵەکاندا خۆیان قایم کرد، بەنو قورەیزە کە گرۆیەکی جوولەکە بوون تەلایەکیان هەبوو لە باشووری ڕۆژهەڵاتی مەدینەدا، کە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بەستبوو، هاوکاری یەکتری بکەن، کە نزیکەی هەشت سەد جەنگاوەر دەبوون حویەی کوڕی ئەختەبی نەزری چووە لایان وازی لێ نەهێنان تا پەشیمانی کردنەوە لە پەیمانەکە، هاودەستەکان هەموو کۆبوونەوە لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) کارەساتێکی زۆر گەورەو گران بوو تەنگی بە پێغەمبەر(ﷺ)و موسڵمانان هەڵچنی، موسڵمانان دڵیان کەوتە لەرزە، وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿هُنَالِكَ ٱبْتُلِيَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾[1] واتە: لەوێدا ئیمانداران تاقی کرانەوەو ڕاوەشێنران بە ڕاوەشاندنێکی توند. کۆمەڵی هاودەستەکان(الاحزاب) بۆ ماوەی نزیکی مانگێك دەوری پێغەمبەر(ﷺ)و هاوڕێکانیان دا، بەڵام دەستیان نەگەیشت پێیان‌و جەنگ ڕووی نەدا، عەمری کوڕی عەبدی عامری ودی نەبێت کە یەکێك بوو لە جەنگاوەرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمی نەفامیە، سواری وڵاخەکەی بوو لەگەڵ چەند سوارێکدا خەندەقەکەی شکاندو لە لایەکەوە خۆی گەیاندە ناو موسڵمانەکان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی موسڵمانەکانی کرد کە پەلاماریان بدەن، فەرمانی دا بە عەلی بەرەو ڕووی ڕۆیشت ماوەی کاتژمێرێك شەڕیان کرد لە پاشان عەلی(ڕەزای خوای لێ بێت) عەمری کوشت، ئەو ڕووداوە بووە نیشانەی سەرکەوتن، پاشان خوای گەورە بە دەسەڵات بایەکی زۆر توندی لێ هەڵکردن هەرچی چادرو ئەو شتانەی پێیان بوو هەمووی تێکدا بەیەکداو ئاگرەکانی کوژاندنەوەو هەراسانی کردن، وایان لێهات بە پەلەو بە سەرشۆڕی خۆیان پێچایەوەو گەڕانەوە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بیر لە چاکەو بەهرەی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە کاتێك لەشکرێکی زۆرتان بۆ هات(لە جەنگی خەندەقدا) ئینجا ئێمە بایەکی بەهێزمان بۆ ناردن‌و لەشکری(فریشتەیش) کە ئێوە نەتانبینین‌و خوا بەوەی ئێوە دەیکەن بینایە. موجاهید دەڵێت: ﴿رِيحًا﴾ واتە: بای ڕۆژهەڵات ئەم فەرموودەیەیش پشتگیری دەکات کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)

[1] الاحزاب(١١).

فەرموویەتی:(یارمەتی درام بە بای ڕۆژهەڵات عادیش قڕکرا بە بای ڕۆژئاوا)[١]. ﴿وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾ واتە: ئەو فریشتانەی کە ترس و لەرزیان خستە ناو دڵیانەوە، وایان لێهات هەموو سەرۆک هۆزێك دەیوت ئەی هۆزی فڵانە کەس بگەن پێم، لە دەوری کۆدەبوونەوەو پێی دەوتن: فریای خۆتان بکەون، فریای خۆتان بکەون، بە هۆی ئەو ترس و لەرزەوە کە خوای گەورە خستبوویە دڵیان. موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە ئیبراهیمی تەمیمیەوە ئەویش لە باوکیەوە دەڵێت: لە لای حوزەیفەی یەمانی بووین(ڕەزای خوای لێ بێت) پیاوێك پێی وت: ئەگەر لە خزمەتی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بوومایە لە خزمەتیدا جەنگم دەکردو دوژمنم تارو مار دەکرد حوزەیفە پێی وت: تۆ ئاوات دەکرد؟ ئەگەر ئێمەت دەبینی لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە شەوی هاودەستەکاندا کە شەوێك بوو زۆر بایەکی توندی ناڕەحەتی هەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(چ پیاوێك هەواڵی ئەو کۆمەڵەم بۆ دێنێت لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵم بێ)، هیچ کەس لە ئێمە وەڵامی نەدایەوە، پاشان دووبارەی کردەوە، پاشان سێهەم جاریش هەمان قسەی فەرموو، دوایی فەرمووی:(حوزەیفە هەڵسە! هەواڵێکی ئەو کۆمەڵەمان بۆ بێنە) هیچ چارەیەکم نەما کە هەڵنەسم کاتێك کە بە ناوی خۆم بانگی کردم. فەرمووی:(هەواڵی ئەو کۆمەڵەم بۆ بێنە، نەکەی بیانشلەژێنی لێم، وتی: ڕۆیشتم وەك بەناو گەرماودا بڕۆم وابوو، تا گەیشتمە ناویان، لەو کاتەدا ئەبو سوفیان پشتی کردبوو یەئاگرەکە تیرێکم لە کەوانەکەمدا داناو ویستم لێی بدەم پاشان قسەکەی پێغەمبەری خودام(ﷺ) وەبیرهاتەوە کە فەرمووی:(نەیانشلەژێنی لێم) ئەگەر تیرەکەم تێگرتایە لێم دەدا. دەڵێت: گەڕامەوە وەك ئەوەی بەناو گەرماودا دەگەڕێم، هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پاشان کە گەڕامەوە سەرمام بوو، هەواڵەکەم دا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبایەکی زیادی لابوو نوێژی لەسەر دەکرد بەو عەبایەم داپۆشیم تا بەیانی خەوتم، کاتێك بەیانی بوویەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ)فەرمووی:(هەڵسە ئەی خەوالوو)[٢] پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ﴾ واتە: هاودەستەکان لە سەرەوە بۆتان هاتن، ﴿وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ﴾واتە:وە لە خوارتانەوە، لە پێشەوە حوزەیفە باسی کرد مەبەست بە خوارەوە بەنو قورەیزەیە، ﴿وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ﴾ واتە: دڵتان کەوتە لەرزەو گیان گەیشتە قوڕقوڕاگە ئەوەندە ترسان، ﴿وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠﴾ واتە: وە گومانی جۆربەجۆرتان بە خوا دەبرد. ئیبنو جەریر دەڵێت: هەندێ کەس کە لەگەڵ پێغەمبەردا بوون(ﷺ)

---

[١] فتح الباري(٢/٦٠٤).

[٢] مسلم(٣/١٤١٤).

خەیالاتی زۆریان دەکردو وایان دەزانی موسڵمانان لەناو دەچن، خودایش ئەو کارەساتەیان بەسەر دێنێت، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِذْ زَاغَتِ الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا﴾ دەڵێت: خاوەن باوەڕان هەموو خەیاڵێکیان دەکرد، دووڕوویش وەدەرکەوت هەتا موعتەبی کوڕی قوشەیر برای بەنی عەمری کوڕی عەوف وتی: موحەممەد(ﷺ) بەڵێنی پێ دەداین کە گەنجینەکانی کیسراو قەیسەر دەخۆین، کەچی ئێستا هیچ کەسێك لە ئێمە ناتوانێت بچێت بۆ سەرئاو[1].

حەسەن لەم ئایەتەدا: ﴿وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا﴾ دەڵێت: خەیاڵی زۆر دەکرا، دووڕووەکان وا خەیاڵیان دەکرد کە پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵەکانی قڕ دەبن‌و هیچیان نامێنێت، خاوەن باوەڕانیش بڕوایان وابوو کە بەڵێنی خودا ڕاستە، ئاینەکەی سەردەخات بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا، با موشریکەکانیش پێیان ناخۆش بێت.[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆژی خەندەق وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ شتێك هەیە کە ئێمە بیڵێین، ئەوەتا گیان گەیشتووەتە قوڕقوڕاگەمان؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ، بڵێن:(اللهم استر عوراتنا وآمن روعاتنا) واتە: ئەی خوایە عەیبەکانمان داپۆشەو ترس‌و لەرزیشمان مەهێڵە. دەڵێت: خودا بای دا بە ڕووی دوژمنەکانداو بە با شکستی پێهێنان، هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو عامری عەقەدیەوە.

﴿هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴿١١﴾ وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ النَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾﴾

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالًا شَدِيدًا﴾ واتە: لەو شوێنەدا ئەزموونی خاوەن باوەڕان هاتە گۆڕێ‌و بە لەرزینێکی زۆر بەهێز، دڵی هەموان کەوتە لەرزە، خوای گەورە باسی ئەو کارەساتە دەکات کە هاودەستەکان لە دەوری مەدینە دابەزین، موسڵمانەکان زۆر لە ژیانێکی نارەحەت‌و تەنگانەدا بوون‌و دەوریان گیرابوو، پێغەمبەریشیان(ﷺ) لەگەڵدا بوو، لە تاقیکردنەوەیەکی زۆر گراندا بوون، دڵی هەموو کەوتە لەرزە، کاتێکی زۆر ترسناك بوو هەر کەسەو جۆرێ بیری دەکردەوە، خوای گەورە لە بارەی دووڕووەکانەوە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ

---

[1] ابن هشام(١/٥٢٢).

[2] الطبري(٢٠/١٢١).

﴿وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ إِلَّا غُرُورًا﴾ واتە: کاتێك دووڕووەکانو ئەوانەی نەخۆشی لە دڵیاندا هەبوو وتیان خواو پێغەمبەرەکەی بێجگە لە تەفرەدان هیچ بەڵێنێکیان پێ نەداین. دووڕووەکان دووڕووییەکەیان دەرکەوت، ئەوانەش کە دڵیان خۆشو گومان لە دڵ بوون خەیاڵی زۆر دەهات بە دڵیانداو دڵەچرکەیان بوو لەبەر کزیو لاوازی باوەڕیانو گرانی ئەو بەڵاو تەنگانەی کە تووشی هاتوون، هەندێکی تریشیان دەیانوت وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَت طَّائِفَةٌ مِّنْهُمْ يَا أَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَارْجِعُوا﴾ واتە: وە کاتێك دەستەیەك لەو ناپاکانە وتیان ئەی دانیشتوانی مەدینە ئێرە جێی مانەوەتان نیە دەی بگەڕێنەوە. ﴿يَثْرِبَ﴾ واتە: مەدینە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(شوێنی کۆچ کردنەکەتانم پێشان درا زەویەك بوو لە نێوان دوو کێودا، وای بۆ دەچووم هەجەرە کەچی یەسریب(یثرب) بوو)[1]. لە وتەیەکی تردا هاتووە ئەفەرموێ: کەچی مەدینە بوو. دەڵێن: ناونانی بە یەسریب بە هۆی پیاوێکەوە بووە کە لەوێ دابەزیووە لە عەمالیقەکان بووە ناوی یەسریبی کوڕی عەبیلی کوڕی مەهلائیلی کوڕی عەوزی کوڕی عیملاقی کوڕی لاوزی کوڕی ئیرەمی کوڕی سامی کوڕی نوح بووە، ئەمە قسەی سوهەیلییە، وە دەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە هەندێکیانەوە ئەڵێن: لە تەوراتدا یانزە ناوی هەبووە: مەدینەو تابەو تیبەو میسکینەو جابیرەو مەجبورەو مەحبوبەو قاسمو عەزراو مەرحومە، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَا مُقَامَ لَكُمْ﴾ واتە: ئەی خەڵکی مەدینە ئێرە جێی ئێوە نیە کە بەرامبەر کۆمەڵی ئەحزاب بوەستن لە لای پێغەمبەر(ﷺ)، ﴿فَارْجِعُوا﴾ واتە: بگەڕێنەوە ناو ماڵو منداڵی خۆتان، ﴿وَيَسْتَأْذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ النَّبِيَّ﴾ واتە: وە کۆمەڵێکی تر لەوان مۆڵەتی گەڕانەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) دەخوازن. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەوانە لە هۆزی بەنی حارسە بوون داوای ئیزنیان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، ﴿يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ﴾ واتە: دەیانوت: ترسمان هەیە لە ماڵەکانمان بۆ دزو پیاو خەراپ.[2] زۆر کەسی تریش هەر وایان وتووە. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: ئەوەی ئەو قسەی کردووە ئەوسی کوڕی قەیزی بووە[3] واتە: بیانوویان دەهێنایەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵەکانیان، دەیانوت: کەس نیە ماڵەکانمان بپارێزێت، دەترسین دوژمن بدات بەسەریاندا. خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿وَمَا هِيَ بِعَوْرَةٍ﴾ ماڵەکانیان ڕووت

---

[1] فتح الباري(١٢/٤٣٩).

[2] الطبري(٢٠/٢٢٦).

[3] الطبري(٢٠/٢٢٥).

نین، واتە: ئەوەی ئەوان دەیڵێن وا نیە لە ترسیماڵو منداڵ نیە، ﴿إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ واتە: بەڵکو ئەوانە هەر دەیانەوێت ڕابکەن لە ترسی ئەوەی نەوەك بدەن بەسەریاندا.

﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ ۚ وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولًا ﴿١٥﴾ قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُم مِّنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾﴾

خوای مەزن باسی ئەوانە دەکاتو دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا﴾ واتە: ئەوانە ئەگەر دوژمن دەوری ماڵەکانیان بدایە لە هەموو لایەکەوە، لەو کاتەدا ئەگەر پێیان بوتنایە واز لە ئاینەکەتان بێنن بە زوویی پەشیمان دەبوونەوە، بە لایانەوە گرنگ نەبوو دەست بەرداری باوەڕەکەیان دەبوونو نەیاندەپاراست لە ترساندا، قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدو ئیبنو جەریریش هەر وایان ماناکردووە.[1] ئەمە ئەوپەڕی باسی خراپەی ئەوانەیە، پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَانُوا عَاهَدُوا اللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ الْأَدْبَارَ﴾ پاشان خوای گەورە باسیان دەکات کە لە پێش ئەمە پەیمانیان دا بە خودا کە پشت هەڵناکەنو ڕاناکەن لە دوژمن، ﴿وَكَانَ عَهْدُ اللَّهِ مَسْئُولًا﴾ واتە: وە پەیمانێك درا بە خوا خاوەنەکەی لێپرسراو دەبێت. واتە خوای گەورە هەر پرسیاریان لێ دەکات لەسەر ئەو پەیمانەی کە دابوویانو شکاندیان، ڕاکردن هیچ دادێکیان نادات‌و مردنیان دوا ناخاتو تەمەنیان درێژ ناکات، بەڵکو لەوانەیە خودا زووتر تۆڵەیان لێ بسێنێت، وەك دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يَنفَعَكُمُ الْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ الْمَوْتِ أَوِ الْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: ڕاکردن لە مردن یان کوشتن، هیچ دادێکی ئێوە نادات، ئەوساکەش هەر کەمێکی تر لە دنیادا ڕای دەبوێرن، وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَىٰ﴾[2] واتە: بڵێ خۆشی و لەزەتی دنیا زۆر کەمەو ڕۆژی دوایی باشترە بۆ کەسێك لە خوا بترسێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَن ذَا الَّذِي يَعْصِمُكُم مِّنَ اللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ واتە: بڵێ کێیە ئەو کەسەی ئێوە لە خوا دەپارێزێت ئەگەر

---

[1] الطبري(٢٠/٢٢٧).
[2] النساء(٧٧).

خوازیان‌و خراپە یان بەزەیی‌و ڕەحمەتی بۆ ئێوە بوێت، بێجگە لە خوا هیچ پشتیوان‌و یارمەتی دەرێك بۆ ئەوان نیە. واتە ئەوانیش‌و غەیری ئەوانیش هیچ کەسێك ناتوانێت پەنایان بدات‌و بێت بە هاواریانەوە خودا نەبێت.

﴿قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا (١٨) أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ ۚ أُولَٰئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا (١٩)﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَالْقَائِلِينَ لِإِخْوَانِهِمْ﴾ واتە: بێگومان خوا دەزانێت بەو کەسانەتان کە ساردکەرەوەو گەڕێنەرەوەی(موسڵمانانن لە جیهاد) کە بە برادەرەکانیان دەڵێن. خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات کە دەبوونە گریَ‌و لەمپەرو بانگی هاوەڵ‌و براکانی خۆیان دەکرد کە جەنگ نەکەن‌و واز بێنن‌و بگەڕێنەوە، دەیانوت: ﴿هَلُمَّ إِلَيْنَا﴾ وەرنە لای ئێمەو دانیشن، ﴿وَلَا يَأْتُونَ الْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: زۆر کەمیان لەم شەڕەدا ئامادە دەبن، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ﴾ سودی دەڵێت: لە کاتی دەستکەوتدا زۆر چاوچنۆکن، ﴿فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ﴾ واتە: لە ترس‌و دڵەلەرزەدایەو خەریکە گیانی دەردەچێت، ئەمە کارو پیشەی ترسنۆکانە لە جەنگدا، ﴿فَإِذَا ذَهَبَ الْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ﴾ واتە: کاتێکیش کە ئاشتی بێت‌و شەڕ نەبێت زمان درێژ دەکەن، دەست دەکەن بە قسەی لوس‌و گرمەو گاڵەیان دێت‌و بە تەمای پلەی بەرزو شوێنی چاکن، خۆیان بە ئازاو دلێر دەدەنە قەڵەم بەڵام ئەوانە درۆزن‌و فریودەرن‌و ڕاست ناکەن، ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿سَلَقُوكُم﴾ واتە: پێشوازیتان لێ دەکەن.[1] قەتادە دەڵێت: لە کاتی دەستکەوت‌و تاڵانیدا زۆر چاوچنۆك‌و پیسکەن‌و داوای زۆر دەکەن‌و ئەڵێن بەشمان بدە! خۆ ئێمەیش لەگەڵتان بووین، بەڵام لە کاتی شەڕو تەنگانەدا ترسنۆکترین‌و بێدەسەڵاترین کەسن لەسەر هەق.[2] ﴿أَشِحَّةً عَلَى الْخَيْرِ﴾ واتە: کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا بەخشندە نین‌و زۆر چاو برسین، هیوای خێریان لێ ناکرێت چونکە ترسنۆك‌و پیسکەن بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أُولَٰئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ ۚ وَكَانَ

---

[1] الطبري(٢٠/٢٣٢).

[2] الطبري(٢٠/٢٣٢).

﴿ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: ئا ئەوانە باوەڕیان نەهێنابوو هەموو کارەکانیان لای خودا بە فیڕۆچووەو ئەمەش لای خودا زۆر سووكو ئاسانە.

﴿يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾﴾

ئەمەش یەکێکی ترە لە ڕەوشتە ناشیرینو بەدەکانیان، ئەوەندە ترسنۆكو لێ نەهاتوون، ﴿يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟﴾ وا دەزانن دوژمنە هاودەستەکان نەڕۆیشتوونو زۆر لێیانەوە نزیکنو جارێکی تر دێنەوە سەریان، ﴿وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ﴾ واتە:پێیان خۆشە کاتێك کە هاودەستەکان هاتن لەوێ نەبوونایە لەگەڵتان لە مەدینە، بەڵکو لەناو عەرەبە چۆڵ نشینەکاندا بوونایە، لە دوورەوە هەواڵی ئێوەیان بپرسیایە، نەك لەگەڵ ئێوەدا لەگەڵ دوژمن بەرامبەر بوەستانایە، ﴿وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَـٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: خۆ ئەگەر لە نێوان ئێوەشدا بوونایە، کەمێکیان نەبێت لەو شەڕەدا بەشداریان نەدەکرد، چونکە زۆر ترسنۆكو کەم وورەو باوەڕ لاوازن، خوای پاكو بێ عەیب چاك ئاگای لێیانەو دەیانناسێت.

﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾﴾

**فەرماندان بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ)**

ئەم ئایەتە پیرۆزە بنەمایەکی مەزنە بۆ ئەوەی کە خاوەن باوەڕان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکەنە سەرمەشقی خۆیان، لە کردارو گفتارو هەموو هەڵسوکەتێکیدا، لە ژیانیدا، بۆیە خوای گەورە فەرمان دەدات بەو خەڵکە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەو ڕۆژەدا (ڕۆژی ئەحزاب) بکەنە سەرمەشقی خۆیان، لە خۆڕاگریو نەبەزینو ئازایەتیو وەستان بەرامبەر دوژمنو چاوەڕوانی دەروویەك لە لای خودای گەورەوە کە لێیان بکاتەوە، سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت تا ڕۆژی قیامەت، بۆیە خوای خاوەن دەسەلاتو بە توانا باسی ئەو کەسانە دەکات کە جێ بە خۆیان ناگرنو دڵەتەپەیانەوخەریکن زراویان ئەتۆقێ لەو ڕۆژی هاودەستانەدا وەك دەفەرمووێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ بەبێگومان پێشەوایەتی یەکی چاکتان لە پێغەمبەرەوە بۆ دامەزراوە، واتە: خۆزگە چاوتان لە

پێغەمبەری خودا(ﷺ) بکردایەو بتانکردایەتە سەرمەشقی خۆتان لە چاکەدا. بۆیە دەفەرموویێت: ﴿لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ بۆ هەر کەسێك بە هیوای ڕۆژی دواییەو یادی خودا دەکات.

**هەڵوێستی خاوەن باوەڕان بەرامبەر هاودەستەکان**

پاشان خوای گەورە باسی ئەو عەبدە خاوەن باوەڕانەی دەکات کە بڕوایان بە بەڵێنی خودا هەیەو بە ڕاستی دەزانن، وە بە هیوای پاشەڕۆژێکی چاکن لە دنیاو لە قیامەتداو دەفەرموویێت: ﴿وَلَمَّا رَءَا الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ قَالُوا هَٰذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ واتە: وە کاتێك ئیمانداران ئەو کۆمەڵانەیان دی وتیان ئەمە ئەو بەڵێنەیە خواو پێغەمبەرەکەی بە ئێوەیان دابوو. ئیبنو عەباس‌و قەتادە ئەڵێن: مەبەستیان ئەو ئایەتەیە کە لە سورەتی(البقرة) هاتووە کە دەفەرموویێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ ۗ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾[1] واتە: ئایا واتان زانیوە دەچنە بەهەشت کەچی هێشتا نەهاتووەتە ڕێتان ئەوەی تووشی ئەوانە بوون کە لە پێش ئێوەدا تێپەڕین(کە لە ڕێی خوادا) دووچاری سەختی‌و زەرەرو زیان بوون‌و زۆر بە توندی تەکان دران بە ڕەنگێك کە پێغەمبەرو ئەوانەی کە بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا دەیانوت: سەرکەوتنی خوا کەی دێت؟ ئاگادار بن‌و بە ڕاستی سەرکەوتنی خوا نزیکە.[2] واتە: ئەمە ئەو بەڵێنە بوو کە خودای مەزن‌و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) پێیان داین کە بەلامان بەسەر دێنێت‌و تاقیمان دەکاتەوە لە پاش ئەو بەلاو تاقی کردنەوەیە بە ماوەیەکی کەم یارمەتیمان دەدات‌و سەرمان دەخات، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ﴾ واتە: خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرمووە. وە دەفەرموویێت: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلَّا إِيمَانًا وَتَسْلِيمًا﴾ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر زیادبوونی باوەڕو بەهێزبوونی بە پێی چۆنیەتی ئەو خەڵکەو ئەو حاڵەتەی تێیدا دەژین، وەك زۆرینەی پێشەوایانی ئیسلام ئەڵێن: کە باوەڕ زیادو کەم دەکات وەك چۆن لە سەرەتای شەرحی بوخاریدا وتمان، سوپاس‌و ستایش بۆ خوای مەزن. وە مانای ئەم ئایەتەی کە خوای خاوەن دەسەڵات دەفەرموویێت: ﴿وَمَا زَادَهُمْ﴾ واتە: ئەو ناڕەحەتی‌و تەنگانەو ژیانە سەختە هەر زیاتر بڕوایان بەهێزتر

[1] البقرة(٢١٤).

[2] الطبري(٢٠/٢٣٦).

دەکات، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی دەبن(ﷺ) هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا﴾ واتە: تەنها ئیمانو ملکەچیان پێی زیادی کرد.

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّـٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾﴾

## وەسفی خاوەنباوەڕان لەسەر هەڵوێستیانو دواخستنی سزای دووڕووەکان

کاتێك خوای گەورە باسی دووڕووەکانی کرد کە ئەو پەیمانەی دابوویان بە خودا شکاندیانو پاشەکشەیان لێی کرد، کە دێتە سەر باسی خاوەنباوەڕانو وەسفیان دەکات کە لەسەر پەیمانی خۆیان بەردەوام بوون، دەفەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾ واتە: لە ناو باوەڕداراندا پیاوانێك هەن ڕاستیان کرد لەو پەیمانەی کە دابوویان بە خوا ئینجا هەندێکیان نەزرو بەڵێنی خۆیان بەجێ هێناو(شەهیدبوون). هەندێ ئەڵێن: تەمەنی خۆت بردەسەر. بوخاری دەڵێت: پەیمانی خۆی بردە سەر و ئەمەش هەر بەو مانایەشەوە دەگەڕێتەوە[1]. ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ واتە: هەندێکیشیان چاوەڕوان بوونو پەیمانو بەڵێنی خۆیان نەگۆڕیو لێیان لانەدا، بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی سابتەوە(ثابت) دەڵێت: کاتێك قورئانمان نوسیەوە ئایەتێکم لێ ون بوو لە سورەتی(الاحزاب)دا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووم(ﷺ) گوێم لێ بوو دەیخوێند، بەڵام لای کەسی تر نەمدەبینی لە لای خوزەیمەی کوڕی سابتی ئەنساری نەبێت (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو پیاوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتی ئەوی بە شایەتی دوو پیاو دادەنا، ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾[2] تەنها بوخاری خۆی هێناویەتی موسلیمی لەگەڵ نیە، ئیمامی ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیدا هێناویەتی تیرمیزیو نەسائیش هێناویانە، تیرمزی دەڵێت: حەدیسێکی چاكو ڕاستە(حسن صحيح).[3] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: وا دەبینین کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەنەسی کوڕی نەزر هاتووەتە خوارەوە،

---

[1] فتح الباري(٨/٣٧٧).

[2] فتح الباري(٨/٣٧٧).

[3] أحمد(١٨٨)، تحفة الأحوذي(٨/٥٢٠)، النسائي في الكبرى(٦/٤٣٠٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾[1] تـەنها بوخـاری هێناویـەتی، وە لـە ڕێگـای تـرەوە نموونەی زۆرە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە دەڵێت: وتی مامم ئەنەسی کوڕی نـەزر (ڕەزای خوای لێ بێت) ئامـادەی جـەنگی بـەدر نـەبوو لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) بـەوە نـاوبراوە، چونکە زۆر بە لایانەوە گران بوو کە ئامادە نەبوو، دەڵێـت: یەکـەمجار پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) تووشـی جەنگ بوو من لە خزمەتیدا ئامادە نەبووم، ئەگەر خودا لەمەودوا بۆم ڕێك بخـات لـە جـەنگێکی تـر لـە خزمەت پێغەمبەردا بم(ﷺ) مەگەر خودا خۆی بزانێت چی دەکـەم. دەڵێـت: هـەر کەسـێك ئـەم قسەی بکردایە غەیری ئەو دەترسا، لـە جـەنگی ئوحـوددا ئامـادە بـوو، لەگـەڵ سـەعدی کـوڕی مـەعاز بەیـەك گەیشتن(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەنەس پێی وت: ئەی باوکی عـەمر بـۆ کـوێ؟ سـەرم سـوڕدەمێنێت لـە بۆنی بەهەشت، من بۆنی بەهەشت دەکەم لەبەردەم ئوحوددا دەڵێت: دەستیکردووە شـەڕ کـردن هـەتا شەهیدکرا(ڕەزای خوای لێ بێت) هەشتاو ئەوەنـدە بـرین بـە لاشـەیەوە بـوو لـە بڕینـی شمشێرو تـیر، خوشکی ئەنەس(پـورم ڕەبیـع کـچی نـەزر) دەڵێـت: براکـەی خـۆم نەدەناسـیەوە بەسـەر پەنجەکانیـدا نـەبێت، دەڵێـت: ئـەوەبوو ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا﴾ دەڵێـت: ئـەو خەڵکـە وایـان دەزانـی ئـەم ئایەتـە لەسەر ئەوو هاوەڵـەکانی هاتووەتـەخوارەوە(ڕەزای خوایـان لـێ بێـت).[2] موسـلیمو تیرمیـزیو نەسـائی ڕیوایەتیان کردووە.[3] ئیبنو جـەریر ڕیوایـەتی کـردووە لـە موسـای کـوڕی تەلحـەوە دەڵێـت: مەعاویـەی کوڕی ئەبو سوفیان هەڵساو وتی: من بیستوومە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)دەیفەرموو:(تەلحـە یـەکێك بوو لەو کەسانەی کە گیانی خۆی بەخشیووە). بۆیە موجاهید لـەم ئایەتـەدا: ﴿فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ﴾ دەڵێت: واتە: پەیمانی خۆی بەجێ هێنا، ﴿وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ﴾ دەڵێت: هـەر ڕۆژێـك جـەنگ بێـت هەیانـە بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێـتو بـەرەو ڕووی دوژمـن دەوەسـتێت.[4] وە هەشـیانە چاوەڕوانە گیانی خـۆی ببەخشێت لە ڕێی خوادا، وە هەشیانە هەر لەسەر پەیمانی خۆیەتی هیچ گۆڕانێکی بەسـەر نـەهاتووە.[5] قەتادەو ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە. هەندێك بەردەوامن لەسەر ئەو بەڵێنەی کە بە خودایان داوەو

---

[1] فتح الباري(٨/٣٧٧).

[2] أحمد(٣/١٩٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم(٣/١٥١٢)، تحفة الأحوزي(٩/٦٠).

[4] الطبري(٢٠/٢٣٨).

[5] الطبري(٢٠/٢٣٩).

پاشگەز نەبوونەتەوە وەك ئەو دووڕووانەی كە دەیاوت: ماڵەكانمان كەس نیە بیپارێزێت، ﴿وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا﴾ واتە: خانووەكانمان بێ پارێزەرو ڕوونو كەلێناویە لە كیاتێكدا واش نەبوو(كە دەیانوت)، ئەوان تەنها مەبەستیان هەڵهاتن بوو، ﴿وَلَقَدْ كَانُوا۟ عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ مِن قَبْلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلْأَدْبَٰرَ﴾ واتە: بێگومان ئەوانە لە پێش ئەم(ڕووداوە) پەیمانیان بە خودا دابوو كە(لە غەزادا) پشت هەڵناكەنو ڕاناكەن.[1] پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: بۆیە خوای گەورە بەندەكانی تاقی دەكاتەوە بە ترسو دڵە لەرزەو تەنگانە هەتا خراپ لە چاك جیابكاتەوە بە جوانی دەركەوێت چاك كامەیەو خراپ كامەیە، چونكە خوای گەورە خۆی ئاگای لە هەموو شتێك هەیە پێش ئەوەی ڕووبداتو بێتەجێ، بەڵام خودا سزای كەس نادات هەتا ئەو كارە نەكاتو بەجێی نەهێنێت بۆ ئەوەی بە چاكی بزانن كە خوا ئاگاداری هەموو شتێكە كە دەیكەن. وەك فەرموویەتی: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ﴾[2] واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەكەینەوە تا دەری بخەینو دیار بێت موجاهیدانو خۆڕاگرانتان كامانەن و تا هەواڵتان چییە ئاشكرای بكەن. ئەم ئاگاداربوونە بە شت دوای ڕوودانیەتی هەرچەند خودا ئاگاداری ئەو شتە بووە پێش ڕوودانی، وە هەر بەو شێوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ﴾[3] واتە: خودا هیچ كاتێك باوەڕدارانی لە بارودۆخێكدا(وا ئێوەی تێداهەن) نەهێشتووەتەوە مەگەر لەبەر ئەوەی ناپاكان لە پاكان هەڵاوێرێت، خودا ئێوە لە نادیار ئاگادار ناكات. بۆیە لێرەدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِّيَجْزِىَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ﴾ واتە: تا بە هۆی ئەو خۆگریانەوە لەسەر ئەو پەیمانەی كە بە خودایان داو پێی هەڵسانو پاراستیان خودا پاداشتیان بداتەوە، ﴿وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾ وە ئەو دووڕووانە كە بەڵێنیان دا بە خوداو شكاندیان دژی فەرمانەكانی خودا وەستان بە هۆی ئەو كردارانەیانەوە تووشی سزاو تۆڵەی خودا دەبن ئەگەر بیەوێت،بەڵام ئەوانە لە ژێر

---

[1] الاحزاب(١٣و ١٥).

[2] محمد(٣١).

[3] ال عمران(١٧٩).

دەسەڵاتی ئەودان و لێی دەرناچن لە دنیادا، خودا مەیلی لێ بێت لەسەر ئەو خراپەکاریە هەر دەچن هەتا دەمردن و ئەو کاتە سزایان دەدات، وە ئەگەر مەیلیشی لێ بێت ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ لێیان خۆش دەبێت و ڕێیان نیشان دەدات هەتا لە دووڕوویییەوە بەرەو خواناسی بێن و ئاکاری چاك بکەن پاش ئەو لادان و سەرپێچی کردنە چونکە بەزەیی و سۆزی خودای مەزن بە عەبدەکانی زۆر زیاترە لە تووڕەبوونی بۆیە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە: بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.

﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا ۚ وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ ۚ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا ﴿٢٥﴾﴾

**خوا ئەو هاودەستە خوانەناسانەی گەڕاندەوە بەسەرشۆڕی و ڕەنجەساری**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا ۚ وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ﴾ واتە: وە خوا کافرەکانی گەڕاندەوە بە ڕق و مەراقەوە بۆ وڵاتی خۆیان هیچ خێرو ئاواتێکیان دەست نەکەوت خوا ئیماندارانی لە جەنگ پاراست. خوای گەورە باسی هاودەستەکان دەکات کە وەدەرینان لە مەدینە بە هۆی ئەو بایەی کە بۆی ناردن لەگەڵ سەربازەکانی خۆیدا، خۆ ئەگەر خودای مەزن پێغەمبەرەکەی ڕەوانە نەکردایە بە سۆزو بەزەییەوە بۆ هەموو جیهانیان، ئەم بایە زۆر بەهێزتر دەبوو لەو گڕە بایەی کە ناردی بۆ سەر هۆزی عاد، بەڵام خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ﴾[1] واتە: وە بە ڕاستی خوا سزایان نادات لە کاتێکدا تۆ(ئەی موحەممەد(ﷺ)) لەناویاندا بیت. بۆیە بایەکی بۆ ناردن پەرش و بڵاوی کردن وەك چۆن لەسەر ئارەزوو کۆبووبوونەوە، هەر هۆزە لە لایەکەوە هاتبوون و هەریەکە و هۆکارێك پاڵی پێوەنابوو هاتبوو، خودایش بەو شێوەیە تارومار ی کردن و بە سەرشۆڕی و داماوی و زەلیلی و داخ و خەفەتێکی زۆرەوە پاشەکشەی پێکردن لە دنیادا تووشی شکستی کردن و سەرکەوتنیان بە دەست نەهێنا و هیچ تاڵانیەکیشیان دەست نەکەوت، وە بە کۆڵێك گوناهەوە بەرەو قیامەتیش ڕۆیشتن بە هۆی دوژمنایەتی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و هەوڵدانیان بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) و لەناودانی سوپاو لەشکرەکەی، چونکە هەر کەسێك نیازی شتێکی ببێت و بە کرداریش پێی هەڵسێت، وەك ئەو کارەی کردبێت وایە، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ﴾ واتە: خودا لەگەڵ خاوەن باوەڕاندایە، ئەویان بەسە، پێویستیان نەبوو کە بەرەو ڕوویان بڕۆن و جەنگیان لەگەڵ بکەن، بۆ ئەوەی وەدەریان نێن لە وڵاتەکەیاندا، بەڵکو تەنها خودا خۆی بەس بوو یارمەتی عەبدەکەی خۆی داو سەربازەکانی کردە خاوەن دەسەڵات، هەر بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو:(هیچ پەرستراوێك نیە تەنها خوا نەبێت، بەڵێنی خۆی بەجێ هێناو

---

[1] الانفال(٣٣).

عەبدەكەی یارمەتی داو سەربازەكانی دەسەڵاتدار كردو هەر خۆیشی هاودەستەكانی شكست پێهێنـا، هیچ شتێك دوای خـودا نیـە). [1] واتـە: هـەر خۆی دەمێنێت. وە لـە هـەردوو سـەحیحەكەدا هـاتووە لـە عەبدوڵای كوڕی ئەبو ئەوفاوە(ڕەزای خوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) دوعـای كـرد لـە هاودەستەكان و فەرمووی:(ئـەی خودایـە! تـۆ كتێبـت دەنێری‌و لێپرسینەوەت كتوپڕە، شكست بـە هاودەسـتەكان بێنـە، ئـەی خودایـە تاروماریـان بكـەو دڵیـان بخـەرە لـەرزە). [2] وە ئـەم ئایەتـە كـە دەفەرموێت: ﴿وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَ﴾ هێمایە بۆ نەمانی شەڕ لە نێوان موسڵمانەكان‌و قورەیشدا، هەر وایش بوو موشریكەكان نەهاتنە سەر موسڵمانەكان بەڵكو موسڵمانەكان چوونە سەر ئەوان لە ناوچەكانیاندا، وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە سولەیمانی كوڕی سوردەوە(ڕەزای خـوای لـێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی هاودەستەكاندا فەرمووی:(ئێستا ئێمە دەدەین بەسـەر ئەواندا، ئەوان ئیتر نادەن بەسەر ئێمەدا). [3] بوخـاریش لـە سـەحیحەكەیدا هـەر بـەم شێوەیە ڕیوایـەتی كـردووە. [4] ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ واتــە: خــودا خــاوەن توانـاو بەدەســەڵاتە، بەسەرشـۆڕی گەڕاندنیەوەو هیچیان دەست نەكەوت، ئیسلام‌و موسڵمانانی كردە خاوەنی دەسەڵات، بـەڵێنی خـۆی بەجێ هێناو بەندەو پێغەمبەری خۆی(ﷺ) یاریدەدا، سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە.

﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمۡ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ فَرِيقًا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوۡرَثَكُمۡ أَرۡضَهُمۡ وَدِيَٰرَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُمۡ وَأَرۡضًا لَّمۡ تَطَـُٔوهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ قَدِيرًا ﴿٢٧﴾﴾

### باسی غەزای بەنو قورەیزە

لە پێشەوە باس كرا كە بەنی قورەیزە كاتێك كە هاودەستەكان هـاتن‌و دەوری مەدینـەیان دا، ئـەو پەیمانەی كە لە نێوان ئەوان‌و پێغەمبەردا(ﷺ) بەسترابوو هەڵیان وەشاندەوەو شكاندیان، ئـەوەش بـە هۆی هاتنی حویەی كوڕی ئەختەبـەوە بـوو كە چـووە نـاو قەڵاكەیان وازی نـەهێنا لـە سـەرۆكی بـەنی قورەیزە تا ئەو پەیمانەی هەڵوەشاندەوە، لەو قسانەی كە پێـی دەوت: ئـەی هـاوار بـۆ تـۆ سـەربەرزی هەتاهەتاییم بۆ هێناوی، قورەیش‌و هەموو هۆزەكانی دەوروبەری‌و غەتەفان ئەوانـەی لەگـەڵێنی هـەموو هێناوە بۆت دەمێننەوە هەتا موحەممەدو(ﷺ) هاوەڵەكانی بنەبڕ دەكەن، كەعب پێـی وت: سا بـە خـوا

[1] فتح الباري(٧/٤٦٩)، مسلم(٣/٢٠٨٩).
[2] فتح الباري(٧/٤٦٩)، مسلم(٣/١٣٦٣).
[3] أحمد(٤/١٦٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.
[4] فتح الباري(٧/٤٦٧).

تۆ سەرشۆڕی هەتاهەتاییت بۆ من هێناوە، هاوار بۆ تۆ ئەی حوییەی تۆ زۆر بەوقومی خۆتمان لێ لادەو واز بێنە، کەچی ئەو هەر وازی نەهێنا هەتا خەڵەتاندیو بە گوێی کرد، بەو مەرجەی ئەگەر هاودەستەکان ڕۆیشتنو کشانەوە ئەو لەناو قەڵاکەدا لەگەڵیان دەبێتو بەجێیان ناهێڵێت، کاتێک بەنی قورەیزە پەیمانەکەیان شکاندو هەواڵەکە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ)و هاوەڵەکانی زۆر دڵگران بوون موسڵمانانیش زۆر بە لایانەوە ناخۆش بوو، کاتێک کە خودای مەزن یارمەتی پێغەمبەر(ﷺ) داو سەری خست دوژمن شکاو بەسەرشۆڕیو ڕەنجخەساری یەوە خودای گەورە گەڕاندنیەوە، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەسەرکەوتوویيو سەربەرزی گەڕایەوە ناو مەدینە، خەڵکی چەکەکانیان داناو پێغەمبەری خودایش(ﷺ) خۆی دەشۆردو تەپو تۆزی ئەو ماوەیەی کە لە بەرامبەر دوژمن بوو لە خۆی دەسڕیو لای دەبرد لە ماڵی ئوموسەلەمە(ڕەزای خوای لێ بێت) لەو کاتەدا جوبرەئیل(سەلامی خوای لێ بێت) خۆی نیشانی پێغەمبەر دا(ﷺ) مێزەرەیەکی ئاوریشمی بەسەرەوە بوو سواری ئێسترێك بوو کە پارچە هەوریشمێکی جوانی لەسەر پشت بوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا چەکت داناوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بەڵێ)، جوبرەئیل فەرمووی: بەڵام فریشتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە، وە ئێستا من گەڕاومەتەوە بۆ ئەو گەلە، پاشان فەرمووی: خوای مەزن فەرمانت پێ دەکات کە هەڵسیو بچی بۆ بەنو قورەیزە وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە جوبرەئیل پێی فەرموو: لە شەڕکەرێك لای داویو ڕزگاری کردووی چەکتان داناوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بەڵێ) جوبرەئیل فەرمووی: هێشتا ئێمە چەکمان دانەناوە. هەڵسە بڕۆ بۆ سەر ئەوانە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بۆ کوێ؟) جوبرەئیل فەرمووی: بۆ بەنی قورەیزە خودای گەورە فەرمانی پێکردووم کە بیانخەمە لەرزە، کتوپڕ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵساو فەرمانی دا بەو خەڵکە ڕووەو بەنی قورەیزە بەڕێکەون، چەند میلێك لە مەدینەوە دوور بوو، دوای نوێژی نیوەڕۆ بوو، فەرمووی:(هیچ کەسێك لە ئێوە نوێژی عەسر نەکات لە لای بەنی قورەیزە نەبێت)، خەڵکی کەوتنەڕێو کاتی نوێژی عەسر هات لە ڕێدا، هەندێکیان لە ڕێگادا نوێژیان کردو وتیان مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبوو کە ئێمە پەلە بکەین لە ڕۆیشتنو دوانەکەوین لە ڕێدا، هەندێکی تریان وتیان: نوێژی عەسر ناکەین هەتا نەگەینە بەنی قورەیزە. پێغەمبەر(ﷺ) نارەزایی دەرنەبڕی لە هیچێك لەو دوو کۆمەڵە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە دوایاندا کەوتەڕێ، ئیبنو ئوم مەکتومی لەسەر مەدینە داناو ئاڵاکەیشی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ڕەزای خوای لێ بێت) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەرەو ڕوویان بوویەوە.دەوری دان بۆ ماوەی بیستو پێنج(٢٥) ڕۆژ، کاتێك ماوەکە درێژەی کێشا ڕازی بوون بە بڕیاری سەعدی کوڕی مەعاز سەرۆکی هۆزی ئەوس چونکە لە کاتی نەفامیدا هاوپەیمانی ئەوان بوون، وایان دەزانی بە چاکی مامەڵەیان لەگەڵ دەکات لەو بارەیەوە. وەك چۆن عەبدوڵای کوڕی سەلول لەگەڵ بەنی قەینوقاعی دۆستی کردی، کاتێك داوای ئازادکردنی

کردن لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وایان دەزانی کە سەعدی کوڕی مەعازیش هەمان مامەڵەیان لەگەڵ دەکات وەك چۆن عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لەگەڵ ئەوانە کردی، نەیاندەزانی کە سەعد(ڕەزای خوای لێ بێت) تیرێك دابووی لە باڵی لە ڕۆژی خەندەقدا، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەمارێکی باڵی داخکرد وە لە قوبەی مزگەوتدا داینا بۆ ئەوەی زوو زوو سەری لێ بدات، سەعد(ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو دوعایەی کردو وتی: ئەی خودایە ئەگەر شەڕ لەگەڵ قورەیش ماوە، منیشی بۆ بهێڵەرەوە، وە ئەگەر شەڕیشت لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەڵگرتووە، ئەوا ئەو برینەم بەردەرەوەو بتەقێنەرەوەو نەم مرێنی هەتا چاوم ڕۆشن دەکەیتەوە لەناو بردنی بەنی قورەیزە. خوای مەزن دوعاکەی قەبوڵ کرد، وای کرد کە ڕازیبن بە بڕیاری سەعد بە ئارەزووی خۆیان‌و خۆیان داوایان کرد، ئا لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بە شوێنیدا لە مەدینە بۆ ئەوەی بڕیاریان بۆ بدات، کاتێك کە سەعد بەسواری کەرێك کە بۆیان ئامادە کردبوو گەیشتە ئەوێ، ئەوسیەکان لێی دەپاڕانەوە دەیانوت: ئەی سەعد ئەوانە دۆستی تۆ بوون چاکەیان لەگەڵ بکە. دەیانویست دڵی نەرم بکەن‌و بەزەیی بێتەوە پێیاندا، بەڵام سەعد بێدەنگ بوو وەڵامی نەدانەوە، کاتێك کە زۆریان پێهێنا سەعد(ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: کاتی ئەوەیە کە سەعد لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسێت لە بەرامبەر ڕەزای خوادا، بۆیان دەرکەوت کە سەعد لەناویان دەبات‌و دەیانکوژێت کاتێك کە سەعد لەو چادرەی کە پێغەمبەری خودای(ﷺ) تێدا بوو نزیك کەوتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(هەڵسن لەبەر گەورەکەتان)، موسڵمانان لەبەری هەڵسان، زۆر بە ڕێزو ئیحتیرامەوە لە شوێنی فەرمانداریەکەیدا دایانبەزاند بۆ ئەوەی بە چاکی بڕیارەکەی بەجێ بێنێت بۆیان، کاتێك کە دانیشت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێی:(ئەوانە(ئیشارەتی بۆ کردن) بە بڕیاری تۆ ڕازین، هەر چۆن مەیلت لێیە بڕیاریان بۆ بدە). سەعد وتی: بڕیاری من جێبەجێ دەکرێت لەسەریان؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: بەسەر ئەمانەیشدا کە لەم چادرەدان؟ فەرمووی: (بەڵێ)، وتی: بەسەر ئەمانەیشدا کە ئا لێرەدان؟ ئیشارەتی کرد بۆ ئەو لایەی کە پێغەمبەری(ﷺ) تێدابوو، بەڵام ڕووی نەکردە پێغەمبەر(ﷺ) وەك ڕێزو ئیحتیرامێك بۆی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بەڵێ)، وتی: من بڕیار دەدەم کە شەرکەرەکانیان بکوژرێن و ژن‌و منداڵیان بکرێتە دیل‌و سامانەکانیشیان بکرێتە غەنیمەت، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان تۆ بە بڕیاری خوای مەزن کە لە سەرووی حەوت ئاسمانەوەیە بڕیارت داوە) وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:(بێگومان بە بڕیاری خوا گەورە تۆ بڕیارت داوە) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا کە خەندەق هەڵکەنن، خەندەقیان لە زەوی هەڵکەندو بە دەست بەستراوی لە ملیان درا، ئەوانەی لە ملیان درا لە نێوان

حەوت سەد هەتا هەشت سەد کەسێك دەبوون. ئەوانەی کە موویان دەرنەکردبوو لەگەڵ ژنەکاندا کرانە دیلو سامانیشیان بووە غەنیمەت.[1] ئەمە هەمووی بە درێژی هاتووە بە بەڵگەوە فەرموودەکانیشی لەگەڵ باس کراوە. لە پەڕاوی ژیانی پێغەمبەردا(ﷺ) بە جیا نووسیومانە. سوپاسو ستایش بۆ خوای مەزن. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم﴾ واتە: ئەوانەی هاوکاری هاودەستەکانیان کردو یارمەتیان دان بۆ شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ)، خودا هێنانیە خوارەوە، ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە: بەنی قورەیزە کەلە ئەهلی کتێبن و جوولەکەن. کە بابو باپیرانیان لە کۆنەوە چووبوونە حیجاز بۆ ئەوەی شوێنی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکەون کە لە تەوراتو ئینجیلدا ناوی نوسراوە. ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾[2] واتە: کەچی کاتێك ئەو(پێغەمبەر)ەی دەیانناسی بۆیان هات بێباوەڕ بوون پێی. واتە: کاتێك قورئان هاتو بەوەی پێی ئاگادارکرابوون بڕوایان پێ نەکرد لەعنەتی خوایان لێ بێت. ﴿مِن صَيَاصِيهِمْ﴾ واتە: لە قەڵاکانیاندا. موجاهیدو عیکریمەو عەتاو سودیو زۆرێك لە پێشووەکانیش هەر وایان وتووە[3]. ﴿وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ﴾ واتە: ترسو لەرزی خستە دڵیانەوە، چونکە ئەوەندە هاوکاری موشریکەکانیان کرد لە شەڕ دژی پێغەمبەر(ﷺ)، دیارە ئەوەی ئاگادارە وەك ئەوە نیە کە ئاگای لێ نیە. موسڵمانەکانیان دەترساندو دەیانویست بیانکوژن بۆ ئەوەی لە دنیادا خۆیان خاوەن دەسەڵات بن، کەچی بە پێچەوانەوە بەسەر خۆیاندا شکایەوە موشریکەکان ڕایان کردو ئەمان سەرشۆڕ بوونو دۆڕان، کاتێك ویستیان ببنە خاوەن دەسەڵات بوونە ژێردەستەو دەیانویست موسڵمانەکان ڕیشەکێش بکەن کەچی خۆیان لەناو چوون، با بەدبەختیو سزاو ئازاری ڕۆژی قیامەتیش بوەستێت، ویستیان قازانج بکەن بەڵام دۆڕاندیان بۆیە خوای گەورە فەموویەتی: ﴿فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا﴾ واتە: کۆمەڵێکیان دەکوژنو کۆمەڵێکیان بە دیل دەگرن. ئەوانەی کوژران شەڕکەر بوون، دیلەکانیش منداڵو ژنەکان بوون. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەتیەی قورەزیەوە دەڵێت: پیشانی پێغەمبەر(ﷺ) درام، گومانیان هەبوو کە منداڵ بم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە سەرمدا کە سەیرم بکەن بزانن ئایا موم لێهاتووە یان نەهاتووە، سەیریان کردم بۆیان دەرکەوت کە موم لێ نەهاتووە، وازیان لێ هێنامو

[1] الطبري(٢٠/٢٤٧).

[2] البقرة(٨٩).

[3] الطبري(٢٠/٢٤٩).

خستمیانە ناو دیلەکانەوە.[1] زانایانی تری فەرموودەیش هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و ڕاستە(حسن صحيح).[2] نەسائیش دیسان ڕیوایەتی کردووە لە عەتیەوە بەو شێوەیەی کە هاتووە.[3] پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَـٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ﴾ دوای تیاچوونی ئەوان خوا زەوی‌و خانوو سامانی ئەوانی دا بە ئێوە، ئەو ئەرزەشی کە پێتان تێی نەنابوو. هەندێ ئەڵێن: خەیبەرە. هەندێکی تر ئەڵێن: وڵاتی فارسە، هەندێکی تریش ئەڵێن: وڵاتی ڕۆمە. ئیبنو جەریر دەڵێت: دەبێت مەبەست پێی گشتیان بێت، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴾[4] واتە: وە خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ ﴾

### سەرپشککردنی ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە خێزانەکانت بڵێ ئەگەر ئێوە ژیانی دنیاو ڕازاوەیی ئەوتان دەوێت دەی هەمووتان وەرن موتعەتان پێ بدەم (موتعە پارەو شتومەکێکە دەدرێتەئافرەتی تەڵاق دراو) و تەڵاقتان بدەم بە تەڵاقدانێکی جوان‌و بێزیان. ئەمە فەرمانێکە لە لایەن خودای گەورەوە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) تاژنەکانی سەرپشتك بکات یان لێی جیاببنەوەو بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر کە لە دنیادا خۆشگوزەرانیان بکات‌و بیانکاتە خاوەن خشڵ‌و زێڕ، یان خۆڕاگر بن لەسەر ئەو ژیان‌و حاڵە گران‌و تەنگەڵانەی ئەو، خۆ ئەگەر خۆڕاگر بن خودای مەزن پاداشتی زۆر گەورەی بۆ داناون. ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ژیانەی لای پێغەمبەریان هەڵبژارد، خوای گەورەیش دوای ئەوە بەختەوەری دنیاو قیامەتی پێ بەخشین. بوخاری ڕیوایەتی کردووەلەعائیشەی خێزانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتەلای کاتێك کە خوای

---

[1] أحمد(٤/٣٨٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] ابو داود(٤/٥٦١)، تحفة الأحوزي(٥/٢٠٧)، النسائي في الكبرى(٥/١٨٥)، ابن ماجه(٢/٨٤٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] النسائي في الكبرى(٥/١٨٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الطبري(٢٠/٢٥٠).

مەزن فەرمانی پێدا تاخێزانەکانی سەرپشك بکات، ئەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە منەوە دەستی پێکرد، فەرمووی: (من شتێکت بۆ باس دەکەم پێویست ناکات هیچ پەلەیەکی لێ بکەیت، تا پرس بە بابو دایکت دەکەی)، پێغەمبەر (ﷺ) دەیزانی کە بابو دایکم فەرمانم پێناکەن بە جیابوونەوە لێی، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ﴾ هەتا کۆتایی هەردوو ئایەتەکە. منیش پێم وت: لەسەر کامە پرس بکەم بە دایكو بابم، کە من خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)و دوارۆژم دەوێت؟[1] وە هەر بەو شێوەیە بوخاری ئەم فەرمودەی تری ڕیوایەت کردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت)کە ئەمەیشی لێ زیاد کردووە، (عائیشە دەڵێت: لە پاشان ژنەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) هەر وەکو منیان کرد)[2]، ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەرپشکی کردین، ئێمەش ئەومان هەڵبژارد، وە هیچ شتێکی دانەنا لەسەرمان. واتە: بە تەڵاقدانی حیساب نەکرد.[3] بوخاریو موسلیمیش لە فەرموودەیەکی ئەعمەشەوە (الاعمش)[4]ئەم فەرمودەیان هێناوە. وە دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتو داوای ئیزنی کرد بچێتە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خەڵکی لەبەر دەرگاکەیدا دانیشتبوون، پێغەمبەریش (ﷺ) دانیشتبوو، ڕێگای پێ نەدرا، پاشان عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتو داوای ئیزنی کرد ڕێی پێ نەدرا، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ئیزنی ئەبو بەکرو عومەری دا (ڕەزای خوایان لێ بێت) بچنە ژوورەوە. پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو ژنەکانی بە دەوریدا بوون، پێغەمبەر (ﷺ) قسەی نەدەکرد، عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئێستا قسەیەك دەکەم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو پێبکەنێت، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەگەر چاوت لەکچەکەی زەید دەبینی(ژنەکەی عومەر) ئەبوو داوای بژێوی لێدەکردم کە کەمێك لەمەوپێش منیش چۆن کێشام بە ملیدا. پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنیو پووکی موبارەکی دەرکەوتو فەرمووی: (ئەمانیش بە دەوری مندان داوای بژێویم لێ دەکەن)، ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەڵسا بۆ عائیشە لێی بداو، عومەریش (ڕەزای خوای لێ بێت) هەڵسا بۆ حەفسە، هەردووییان وتیان: داوای شتێك لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە نیەتی؟! پێغەمبەر (ﷺ) نەیهێشت لێیان بدەن، ژنەکانی وتیان: سوێند بە خوا لەمەودوا پاش ئەم مەجلیسە داوای شتێك ناکەین کە پێغەمبەر (ﷺ) لە لای

---

[1] فتح الباري (٣٧٩/٨).

[2] فتح الباري (٣٨٠/٨).

[3] احمد (٤٥/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٢٨٠/٩)، مسلم (١١٠٤/٢).

نەبێت.(جابر) دەڵێت: خوای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو سەرپشکی کردن. پێغەمبەر (ﷺ) لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەستی پێکردو فەرمووی: (من شتێکت بۆ باس دەکەم پێم خۆش نیە پەلەی تێدا بکەیت، تا پرس بە بابو دایکت نەکەی)، عائیشە وتی: ئەو شتە چیە؟ دەڵێت: ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ ﴾ هەتا کۆتایی هەردوو ئایەتەکە. عائیشە وتی: لە بارەی تۆوە پرسیار لە دایكو باوکم بکەم؟ من خواو پێغەمبەرەکەی هەڵدەبژێرمو داوات لێ دەکەم لای هیچ ژنێك لە خێزانەکانت باسی ئەمەمەکە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (خوای مەزن منی بە توندو تیژی ڕەوانە نەکردوە بەڵکو منی بە مامۆستاو ئاسانکەر ڕەوانەکردووە، بەڵکو هەر ژنێکیان پرسیارم لێ بکات لەوەی هەڵت بژاردووە حەتمەن هەواڵی دەدەمێ)[1]، تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردووەو بوخاری لەگەڵ نیە. هەر نەسائیو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە[2]. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ واتە: ئەگەریش خواو پێغەمبەرو ماڵی دواڕۆژتان دەوێت خودا بۆ کارچاکەکانتان پاداشتی گەورەی داناوە. عیکریمە دەڵێت: لەو کاتەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) نۆ ژنی هەبوو، پێنجیان لە قورەیشیەکان بوون: عائیشەو حەفسەو ئوموحەبیبەو سەودەو ئوموسەلەمە (ڕەزای خوایان لێ بێت). وە سەفیەی کچی حویەی نەزەریەو وە مەیمونەی کچی حارسی هیلالیەو زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدیەو جویەیریەی حارسی موستەلەقیە ڕەزای خوای لێ بێتوخوا لە هەموویان خۆش بێت)[3].

﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾ ۞ وَمَن يَقۡنُتۡ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا نُّؤۡتِهَآ أَجۡرَهَا مَرَّتَيۡنِ وَأَعۡتَدۡنَا لَهَا رِزۡقٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾﴾

**هاوسەرانی (ژنانی) پێغەمبەر (ﷺ) وەك ژنانی تر نین**

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴾ واتە: ئەی هاوسـەرانی پێغەمبـەر (ﷺ)! هـەر کەسێك لـە ئێوە خراپەیەکی ئاشکرای لێ ڕوویدات، دوو سەرە سزای دەدرێت، ئەمەش لای خـودا ئاسانە. خـوای گـەورە ئامۆژگـاری هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەکـات ئەوانـەی کـە خـوداو پێغەمبـەر (ﷺ)و دواڕۆژیـان

---

[1] أحمد (٣/٣٢٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٢/١١٠٤)، النسائي (٥/٣٨٣).

[3] الطبري (٢٠/٢٥٢).

هەڵبژاردووە لە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) ماونەتەوە، جێگای خۆیەتی کە ئاگاداریان دەکاتو بە تایبەتی جیایان دەکاتەوە لە ژنانی ترو فەرموویەتی کە هەرکێ لە ئێوە خراپەیەکی ئاشکرای لێ دەرکەوێت زیاتر سزا دەدرێت، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ واتە: لوتبەرزی و خراپەکاری.[١] بە هەر مانایەك بێت ئەمەمەرجێکەو ئەو مەرجەیش، پێویست نیە بێتەدی. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ﴾[٢] واتە: سوێند بە خوا نیگا کراوە بۆ تۆ وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی بە ڕاستی کردەوەت هەڵدەوەشێتەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُوا لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[٣] واتە: ئەگەر هاوبەشیان ڕەوا بدایە بۆ خوا بێگومان ئەو چاکانەی کردبوویان هەمووی بێ پاداشت دەردەچوو. وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾[٤] واتە: بڵێ ئەگەر پەروەردگار کوڕی ببوایە ئەوە من یەکەمین کەس بووم دەمپەرست. وە فەرموویەتی: ﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾[٥] واتە: ئەگەر خوا بیویستایە منداڵێك بۆ خۆی بڕیار بدات ئەوە لەناو دروست کراوەکانیدا کامەی بویستایە هەڵی دەبژارد پاکو بێگەردە، هەر ئەوە خوای تەنیای زاڵو بەدەسەڵات. کاتێك کە ئەو هاوسەرانەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەندە شوێنو پلەیان بەرزە،جێگەی خۆیەتی ئەگەر تاوانێکیان لێوەدەرکەوت سزاکەیان توندتر بێت لەبەر ئەو پلەوپایە بەرزەیان. لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ﴾ مالیك دەڵێت: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە. ﴿يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ﴾ واتە: لە دنیاولە ڕۆژی قیامەتیشدا. ئیبنو ئەبی نەجیح ئەڵێ: لە موجاهیدەوە واتە: دوو ئەوەندەی ئەو سزایە سزا دەدرێت. ﴿ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرًا﴾یانی: هەر کەسێك لە ئێوە گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەری خودا بێتو (ﷺ) بەڵێنی خۆی بباتە سەر. ﴿نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا﴾ واتە: بە زیادەوە بژێوی بۆ ئامادە دەکرێت لە بەهەشتدا چونکە ئەوانە دەچنە ئەو

---

[١] البغوي (٣/٥٢٧).

[٢] الزمر (٦٥).

[٣] الانعام (٨٨).

[٤] الزخرف (٨١).

[٥] الزمر (٤).

شوێنانەی کە پێغەمبەری (ﷺ) تێدایە لە شوێنە هەرە بەرزەکان لە بەهەشتدا. لە سەرووی شوێنەکانی هەموو خەڵکەوە لەو شوێنەی کە پێی دەوترێت (الوسيلة) کە نزیکترین شوێنی بەهەشتە لە(عەرشەوە).

﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾ وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَٱذۡكُرۡنَ مَا يُتۡلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلۡحِكۡمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾

**فەرماندان بە چەند ڕەوشتێك کە دایکی موسڵمانان دەبێت پێشەنگ بن تێیدا**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) ئێوە وەك ژنانی تر نین، ئەگەر خۆتان دەپارێزن، بەناسکی قسە مەکەن نەوەك کەسێك غەرەزێکی لە دڵدا بێت، ئارەزووی خۆش بکات، هەرچۆن پەسەندە بەپەیڤن و قسە بکەن. ئەمە چەند ڕەوشتێکە خوای گەورە فەرمان دەکات بە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕەچاوی بکەن، بێگومان ژنانی تری موسڵمانانیش لەسەریانە شوێنی ئەو ڕەوشتانەی ئەوان بکەون، خوای مەزن ڕووی قسەی کردووەتە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: بە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر دەیانەوێت با خۆ بپارێزن بەو شێوەیەی کە خودا فەرمانی پێکردوون، چونکە ئەوان وەك ژنانی تر نین، ژنانی تر لە ڕێزو پلەدا بەوان ناگەن. وەك فەرموویەتی: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ﴾ سودی و کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست پێی قسە ناسك کردنەوەیە لەگەڵ پیاودا لە کاتی دواندا، لەبەر ئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ﴾ واتە: نەکا کەسێك کە دڵی نەخۆشە، بکەوێتە خولیای شتێك ، ﴿وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ ئیبنو زەید دەڵێت:بەقسەیەکی چاك و بە پەسەندو پرخێر لەگەڵیاندا بدوێن[1]. واتە نابێت ژنان لەگەڵ کەسێکدا بێگانە بێت (مەحرەم نەبێت) بە ناسکی قسە بکات، وەك ئەوەی کە لەگەڵ هاوسەرەکەی قسە دەکات. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ وَأَقِمۡنَ

---

[1] الطبري (٢٠/٢٥٨).

ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذۡهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجۡسَ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِ وَيُطَهِّرَكُمۡ تَطۡهِيرٗا ﴾ واتە: وە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوەو زینەتو جوانی خۆتـان دەرمەخـەن لـەناو خەڵکی نامەحرەمدا وەکو خۆدەرخستنی ئافرەتانی سـەردەمی نـەفامی یەکـەم (پـێش ئیسلام)، نوێژ بکەنو زەکات بدەنو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن بە ڕاستی خوا دەیەوێت ئەی ئالو بـەیتی پێغەمبـەر (ﷺ) هـەر جۆرە پیسیو گوناهێك لـە ئێوە دووربخاتـەوەو پـاكو خاوێنتـان بكاتـەوە بـە تەواوی. ﴿وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ واتە: لە ماڵ بمێننەوە مەیەنە دەرەوە بۆ کارێکی پێویست نـەبێت، لـە پێویستیە شەرعیەکان وەك نوێژ کردن لەناو مزگەوت بەو مەرجانەی بۆی دانراوە، وەك پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (مەبنـە ڕێگـری ژنـە خواناسـەکان لـە ماڵـەکانی خـوادا، بـا ئـەوانیش بـڕۆن بـەبێ بـۆن لـەخۆدان).[1] وە لـە ڕیوایـەتێکی تـردا هـاتووە: (ماڵـەکانیان چـاکترە بۆیـان)[2]. ﴿وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ موجاهیـد دەڵێـت ژنـان دەچـونە دەرەوە لـەناو پیاوانـدا دەگـەڕان، ئـەوە خۆدەرخستنی سەردەمی نەفامی بوو.[3] قـەتادە دەڵێـت: ﴿وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾ واتـە: کاتێ نەزانی پێشوو کە دەردەچوون لە ماڵەکانیان، بە شێوەیەك دەچوون بە ڕێدا سەرنجی ڕادەکێشا، خوای مەزن ئـەوەی قەدەغـە کرد.[4] موقـاتیلی کـوڕی حـەییان دەڵێـت: ﴿وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰ﴾، (التبرج) واتە: ئافرەت سەرپۆشی دەدا بەسەریدا نەیدەبەست.[5] گوارەو ملوانکەو ملی هەموو دەردەخستو دەبینرا ئەم خشڵو زێڕو مـل دەرخـستنە تەبـەڕوج بـوو، پاشـان فەرمانەکـە هـەموو ژنـە خاوەن باوەڕەکانی گرتەوە کە خۆیان بەو شێوەیە نیشان نەدەن. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمۡنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ یەکەم جار داوای لێکردن واز لە خراپە بێنن پاشـان فەرمانی پێکردن کە چاکە بکەن وەك نوێژکردن کە پەرستنی خودای مەزنە بە تەنها کە شـەریکی نیـە، زەکات دات کە ئەویش چاکەکردنە لەگەڵ خـەڵکی، ﴿وَأَطِعۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ﴾ ئەمـەیش لـە بـابی عـەتفی عامە لەسەر عەتفی خاس.

---

[1] ابو داود (٣٨١/١).

[2] ابو داود (٣٨٢/١).

[3] الدر المنثور (٦٠٢/٦).

[4] الطبري (٢٥٩/٢٠).

[5] الدر المنثور (٦٠٢/٦).

**هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) ئالوبەیتن**

خـــوای مــــەزن دەفـــــەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ ئەم ئایەتە لێرەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)چوونەتە ناو ئەو ماڵە، چونکە ئەوان بوونە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە، هۆی هاتنەخوارەوەکە لەناودەقەکەداو هەموو زانایانیش یەك ڕان لەسەرئەمە، جا یان خۆیان بە تەنهائالوبەیتن یان لەگەڵ غەیری خۆیاندا، بە پێی ڕاسترین قسە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عیکریمەوە کە لە ناو بازاڕدا هاواری دەکرد، ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ دەیوت: ئەم ئایەتە تایبەت لەسەر هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووەتەخوارەوە[1]. هەر بەو شێوەیە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾ دەڵێت: بە تایبەتی لەسەر هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووەتە خوارەوە، عیکریمە دەڵێت: کێ حەز دەکات (موباهەلە)ی لەگەڵ دەکەم کە ئەم ئایەتە لە بارەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووەتەخوارەوە.[2] لە ڕاستیدا ئەمان بوونە هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە نەك کەسانی تر ( بەڵام کەسانی تریش دەگرێتەوە، لەبەر ئەوە ئایەتەکە گشتگیرە جێگای کەسانی تریشی تێدا دەبێتەوە) . ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سەفیەی کچی شەیبەوە دەڵێت: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەر لە بەیانیەك لە ماڵ دەرچوو پارچە قوماشێکی دابوو بە خۆیدا لە مووی ڕەش دروستکرابوو، حەسەن هات (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە، پاشان حوسەین هات (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە، پاشان فاتیمە هات (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە، پاشان عەلی هات (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ خۆی هێنایە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[3] دیسان موسلیم ڕوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی حەییانەوە دەڵێت: منو حوصەینی کوڕی سەبرەو عومەری کوڕی موسلیم ڕۆیشتین بۆ لای زەیدی کوڕی ئەرقەم (ڕەزای خوای لێ بێت) لە لای دانیشتین حوسەین پێی وت: ئەی زەید تۆ تووشی خێری زۆر هاتوویت، پێغەمبەری خودات (ﷺ) چاوپێکەوتووەو فەرموودەکانیت گوێ لێ بووەو

---

[1] الطبري (٢٠/٢٦٧).

[2] أخرجه ابن ابي حاتم وابن عساكر، الدر المنثور (٥/٣٧٦).

[3] الطبري (٢٠/٢٦١)، مسلم (٢٠٨١).

غەزات کردووە لەگەڵی و نوێژیشت لە دواوە کردووە، بە ڕاستی ئەی زەیدتۆ تووشی خێری زۆر بوویت، ئەی زەید! شتێکمان بۆ بگێڕەوە لەوەی کە بیستووتە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ)،زەید وتی: ئەی برازای خۆم: بە خوا تەمەنم گەورە بووەو ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشتووەو زەمانەکەم دوورکەوتووەتەوەو هەندێ لەو فەرموودانەی پێغەمبەری خودام (ﷺ) کە بیستبووم لە بیرم نەماوە، ئەوەی بۆم گێڕانەوە وەری بگرن، ئەوەشی باسم نەکرد زۆرم لێ مەکەن بیگێڕمەوە، پاشان وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێك هەڵساو خوتبەیەکی دا بۆمان لە لای ئاوێکدا پێیان دەوت خوم (خُمٌ) لە نێوان مەککەو مەدینەدا، سوپاس و ستایشی خوای کردو ئامۆژگاری کردو یادی خوای وەبیرهێنایەوە، پاشان فەرمووی: (أما بعد، ئەوسا ئەی خەڵکینە من مرۆڤم لەوانەیە ڕەوانەکراوی خوا بێتە لام و وەڵامی بدەمەوە وە من دوو شتی سەنگینتان بۆ بەجێ دەهێڵم: یەکەمیان کتێبی خوای گەورەیە کە ڕێ نیشاندان و ڕووناکی تێدایە، کار بە کتێبی خوا بکەن و دەستی پێوە بگرن)، زۆر جەختی کردەوە لەسەر (قورئان)و شوێنکەوتنی، پاشان فەرمووی: (ئەهلوبەیتی) من، خواتان وەبیردێنمەوە لە خەڵکی ماڵەکەم، خواتان وەبیر دێنمەوە لە خەڵکی ماڵەکەم) سێ جار، واتە: ئاگاداری ئەهل و بەیتی من بن خواتان لە بیربێت بەرامبەریان، حوصەین پێی وت: ئاخۆ کێ ئەهل و بەیتی ئەون ئەی زەید؟ ئایا هاوسەرەکانی ئەهل و بەیتی ئەو نین؟ وتی: هاوسەرەکانی لە ئەهل و بەیتی ئەون. بەڵام ئەهل و بەیتی ئەو، ئەو کەسانەن کە زەکاتیان لێ حەرامە، وتی: سا ئەوانە کێن؟ وتی: ئەوانە ئالی عەلی و ئالی عەقیل و ئالی جەعفەرو ئالی عەباسە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: ئایا هەموو ئەوانە زەکاتیان لێ قەدەغەیە دوای خۆی؟ وتی: بەڵێ.[1] ئەمە تەفسیرێکە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوەو نەیداوەتەپاڵ پێغەمبەر(ﷺ).

**فەرماندان بە کارکردن بە پێی( قورئان )و ( سوننەت )**

پاشان ئەوەی کە گومان هەڵنەگرە بۆ ئەو کەسەی کە بە وردی سەرنجی قورئان بدات بۆی دەردەکەوێت کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتە دەیانگرێتەوەو مەبەستی ئەوانە، کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ دەقی ئایەتە لەگەڵ ئەوانیەتی، بۆیە خوای گەورە دوای ئەمانە هەموو فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ واتە: کار بەوە بکەن کە خوای گەورە ڕەوانەی کردووە بۆ پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە ماڵەکەی خۆتاندا لە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمە قسەی قەتادەو زۆر کەسی تریشە.[2] وە یادی ئەو بەهرەیە بکەن و کە تایبەتە بە

---

[1] مسلم (٤/١٨٧٣).

[2] الطبري (٢٠/٢٦٨).

ئێوەوە لە نێوانی خەڵکیدا، کە فەرمانی (وحی) خودا لە ماڵی ئێوەدا دێتە خوارەوە لە ماڵی کەسی تردا ئەوە نیە، وە عائیشەی سیدیقەی کچی سیدیق (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە پێشترە بۆ ئەو بەهرەیەو شایستەترەو تایبەتترە بۆ ئەم ڕەحمەتە فراوانە. چونکە لەناو جێگەی هیچ هاوسەرێکی پێغەمبەردا (ﷺ)وەحی نەهاتووەتە خوارەوە لە جێگەی ئەودا نەبێت. وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆی فەرموویەتی، هەندێ لە زانایان دەڵێن: بێجگە لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) پێغەمبەری خودا (ﷺ) کچی نەخواستووەو هیچ پیاوێك لەگەڵی نەخەوتووە لە جێگەیدا پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت، جێگای خۆیەتی ئەو پلەو پایەی پێ بدرێتو تەنها ئەو خاوەنی ئەو پایە بەرزە بێت، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەهلو بەیتی ئەون،کەواتە خزمەکانی پێغەمبەریش(ﷺ) شایستەترن بەو ناوە، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو جەمیلەوە دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی (ڕەزای خوایان لێ بێت)بوبەخەلیفە کاتێك عەلی شەهید کرا (ڕەزای خوای لێ بێت). دەڵێت:جاکاتێك حەسەن نوێژی دەکرد، پیاوێك پەلاماری داو خەنجەرێکی لێدا، حوصەین دەڵێت: هەواڵی پێگەیشت ئەو کەسەی کە برینداری کردووە پیاوێکی بنەماڵەی بەنی ئەسەدە، لەو کاتەشداکەلێیدرا حەسەن (ڕەزای خوای لێ بێت) لە سوژدەدا بوو. دەڵێن: خەنجەرەکە لە کوڵۆکی دابوو، مانگێك بە هۆی ئەو برینەوە نەخۆش کەوتو پاشان چاك بووەوە. دوای ئەوە لەسەر دوانگە دانیشتو وتی: ئەی خەڵکی عێراق! لە خوا بترسن بەرامبەر بە ئێمە، ئێمە سەرۆكو میوانی ئێوەین، وە ئێمە ئەو ئەهلو بەیتەین کە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾ حوصەین ئەڵێت:بەردەوام ئەم ئایەتەی ئەوتەوەتا هیچ کەسێك نەما لەو مزگەوتەدا بانگو سەلا لێنەداو نەگری. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ واتە: خودا سۆزی بۆتان هەیە کە ئەو پایە بەرزەی پێداونو خۆی دەزانێت کە ئێوە شایستەی ئەو ڕێزو تایبەتمەندیەن. ئیبنو جەریر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: یادی ئەو بەهرانەی خودای مەزن بکەنەوە کە پێی داون، لە ماڵێکدا داینـاون کە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەری (ﷺ) تێدا دەخوێنرێتەوە. سوپاسو ستایشی خوای لەسەر بکەن. ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ واتە: خودا ڕێزی لێناون لە ماڵێکدا داینـاون کە قورئانو فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) تێدا دەخوێنرێتەوە. ئاگاشی لێتانە کاتێك کە هەڵی بژاردوون ببنە هاوسەری پێغەمبەرەکەی (ﷺ).[1] قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ﴾ دەڵێت: خوای مەزن بەوە منەت

[1] الطبري (٢٠/٢٦٨).

دەكات بەسەریاندا، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە.[1] عەتیەی عەوفی لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا﴾ دەڵێت: خوا هیچی لێ ون نابێتو شوێنەكەشی دەزانێت، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە. پاشان دەڵێت: هەر بەو شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە ڕەبیعی كوڕی ئەنەسەوە لە قەتادەوە.

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾﴾

**باسی هۆكاری هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ واتە: بە ڕاستی پیاوە موسڵمانەكانو ئافرەتە موسڵمانەكانو پیاوە باوەڕدارەكانو ئافرەتە باوەڕدارەكانو پیاوانی هەمیشە گوێڕایەڵو ئافرەتانی هەمیشە گوێڕایەڵو پیاوە ڕاستگۆكانو ئافرەتە ڕاستگۆكانو پیاوانو ئافرەتانی خۆڕاگرو بە ئارامو پیاوانی لەخواترسو ژنانی لەخواترسو پیاوانو ئافرەتانی بەخشندەو پیاوانو ئافرەتانی ڕۆژووەوانو پیاوانو ئافرەتانی داوێن پاك پیاوانێك كە زۆر یادی خوا دەكەنو ئافرەتانێك كە زۆر یادی خوا دەكەن خوا ئامادەی كردووە بۆ هەموویان لێخۆشبوونو پاداشتی گەورە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئوموسەلەمەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت: وتم بە پێغەمبەر (ﷺ) چیمانە و بۆچی باسی ئێمە لەقورئاندا ناكرێت وەك پیاوان باس دەكرێت؟جاتەڵێ: ڕۆژێك تێنەپەڕی بەسەریدا گوێم لێبوو پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرمینبەرەكەی هاواری ئەكرد لەوكاتەدا من قژم دادەهێنا، قژم پێچایەوەو پاشان ڕۆیشتم بۆ ژوورەكەم، ژوورەكەی ماڵی خۆم، گوێم خستە سەر چڵی چیخەكەو لەو كاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) لە مینبەرەكەدا دەیفەرموو: (ئەی خەڵكینە! خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ هەتا كۆتایی ئایەتەكە).[2] هەر

---

[1] الطبري (٢٠/٢٦٨).

[2] أحمد (٦/٣٠٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

بەو شێوەیە نەسائیو ئیبنو جەریریش ڕیوایەتیان کردووە.[1] ئەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوەڕ بوون جیایە لە ئیسلام بوون، چونکە باوەڕ تایبەتی ترە لە ئیسلام وەك لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا قُل لَّمْ تُؤْمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ﴾[2] واتە: عەرەبە دەشتەکیەکان وتیان باوەڕمان هێناوە ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ باوەڕتان نەهێناوە بەڵکو بڵێن موسڵمان بووین چونکە هێشتا باوەڕ نەچووەتە ناو دڵەکانتانەوە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: (داوێنپیس داوێن پیسناکات، لە کاتی داوێنپیسیەکەدا خاوەنی باوەڕ بێت)[3]. باوەڕەکەی لێ دەردەچێتو جیادەبێتەوە لەو کاتەدا، ئەو کەسە لەسەر ئەو کارەی کافر نابێتو نابێتە خوانەناس بە ئیجماعی موسڵمانان. ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوەڕبوون تایبەتترە لە موسڵمان بوون وەك لە سەرەتای شەرحی بوخاریدا وتمان. ﴿وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ﴾، (القنوت) واتە: بەرفەرمان بوونو گوێڕایەڵی بە دڵێکی ئارامەوە. وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتدا فەرموویەتی: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ﴾[4] واتە: هاوبەش دانەران چاکترن یان کەسێك ملکەچو پەرستکارە بۆ خوا لە کاتەکانی شەودا بە سوژدە بردنو ڕاوەستان لە شەودا کە لە سزای دواڕۆژ دەترسێتو بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی. وە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾[5] واتە: ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەویدایە تەنها هی خوایە هەموویان هەر بۆ ئەو ملکەچن. وە فەرموویەتی: ﴿يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾[6] واتە: ئەی مەریەم فەرمانبەری پەروەردگارت بکەو سوژدەو کڕنوش بەرە لەگەڵ ئەوانەی کە سوژدەو کڕنوش دەبەن. وە فەرموویەتی: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾[7] واتە: لە نوێژدا بوەستن بۆ خوا بە گەردنکەچی و بێ قسەکردن. دوای پلەی ئیسلام پلەیەکی تر دێت کە بەندەی خوا بۆی دەچێتو بەرز دەبێتەوە بۆی کە

---

[1] النسائي في الكبرى (٦/٤٣١)، الطبري (٢٠/٢٧٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الحجرات (١٤).

[3] فتح الباري (١٠/٣٣)، مسلم (١/٧٧).

[4] الزمر (٩).

[5] الروم (٢٦).

[6] ال عمران (٤٣).

[7] البقرة (٢٣٨).

ئەویش باوەڕە، پاشان بە هۆی ئەو باوەڕەوە ئارامی دڵ پەیدا دەبێت، ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ﴾ بێگومان ڕاستگۆیی بۆ خۆی ڕەوشتێکی بەرزو جێی ڕێزە، بۆیە هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز درۆیان لێ نەبیستراوە نە لە کاتی نەزانیداو نە لە کاتی ئیسلامەتیشدا، ڕاستگۆیی نیشانەی باوەڕە، وەك چۆن درۆزنی نیشانەی دووڕوویییە، هەر کەسێك ڕاستگۆ بوو بێت سەرفراز بووە، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕاستگۆ بن، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێ نیشان دەدات بۆ چاکە، بە ڕاستی چاکەیش ڕێ نیشان دەدات بۆ بەهەشت، درۆ مەکەن، بێگومان درۆکردن ڕێ نیشان دەدات بۆ لە دین لادانو خراپەکاری خراپەکاریش ڕێ نیشان دەدات بۆ ناو ئاگر، بەردەوام پیاو قسەی ڕاست دەکاتو دەگەڕێت بە دوای قسەی ڕاستدا هەتا لای خودا بە ڕاستگۆ دەنووسرێت ، وە بەردەوام پیاو درۆ دەکاتو دەگەڕێت بە دوای درۆکردندا هەتا لای خودا بە درۆزن دەنووسرێت)[1]. فەرموودە لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە. ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ﴾ ئەمە ڕەوشتی خەڵکی دامەزراوە کە بریتییە لە خۆڕاگری بەرامبەر لێقەوماوان،وئاگاداربوون لەوەی کەخوا هەرچی بڕیاردابێت بێگومان ڕوو دەدات وپێویستەئەمیش خۆی لەبەرانبەردا ڕابگرێ ونەپسێ، خۆڕاگریش لە سەرەتای ناڕەحەتی بەسەرهاتەکەدایە، واتە: زۆر گرانییەکەی لە سەرەتاوەیە، پاشان لە دواییدا بەرەو ئاسانی دەڕواتو ئەم ڕەوشتە نیشانەی ڕاستیو نەبەزینە، ﴿وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ﴾، (الخشوع) واتە: ئارامیو لەسەرخۆییو دەربڕینی خۆشەویستیو ڕێزو خۆ بە کەمزانینە، پاڵپێوەنەرەکەشی ترسان لە خواو لە چاودێری خودایە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (عەبدایەتی خوا بکە وەك ئەوەی کە دەیبینی، خۆ ئەگەر تۆ ئەو نابینی ئەو تۆ دەبینێت)[2]، ﴿وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ﴾ سەدەقەو خێرکردن بریتییە لە چاکەکردن بەو کەسانەی هەژارو نەدارنو هیچ کاسپیەکیان نیەو توانای کارکردنیشیان نیە، لە زیادەی ماڵی خۆیان دەبەخشن لەبەر ڕەزامەندی خواو چاکەکردن لەگەڵ بەندەکانیدا. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: (حەوت کەس هەن خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی لەو ڕۆژەداکە هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری ئەو، باسی یەکێك لەو کەسانەی کردووە: کە پیاوێکە چاکەی کردووە بە شێوەیەك ئەو چاکەی کردووە، شاردوویەتیەوە تا لای چەپی نەزانێت لای ڕاستی چی دەبەخشێت).[3] وە لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: (خێرکرنو سەدەقە گوناه دەکوژێنێتەوە وەك

[1] مسلم (٤/٢٠١٣).
[2] فتح الباري (١/١٤٠).
[3] فتح الباري (٢/١٦٨)، مسلم (٢/٧١٥).

چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە).[١] فەرموودە دەربارەی ماڵبەخشین ئێجگار زۆرە، باسی تایبەتی لەو بارەوە هەیە. ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾ لەو فەرموودەیەی کە ئیبنو جامە ڕیوایەتی کردووە هاتووە: (ڕۆژوو زەکاتی لاشەیە).[٢] واتە: پاکو خاوێنو بێگەردی دەکاتەوە لە هەموو شتێك کە سروشتی پاکو شەرع لای پەسەند نیە. وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: کەسێك مانگی ڕەمەزانو سێ ڕۆژی لە هەموو مانگێك گرت، ئەم فەرموودەی خوای گەورە دەیگرێتەوە. ﴿وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ﴾.[٣] لەبەر ئەوەی کە ڕۆژوو مەزنترین یارمەتیدەرە بۆ شکاندنی ئارەزوو وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی کۆمەڵی لاوان هەر کەسێك لە ئێوە توانای ژنهێنانی هەیە، با ژن بێنێت، چونکە چاکترین پارێزەرە بۆ چاوو باشترین ڕێگرە بۆ شەرمگە و هەر کەسیش توانای نەبوو با ڕۆژو بگرێت، چونکە بەڕۆژو بوون دەیخەسێنێتو ئارەزووی نامێڵێت).[٤] جێی خۆیەتی دوای ئەوە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ﴾ واتە: پیاو ژنێك کە شەرمی خۆیان پاراستووە لە حەرامو گوناهو تاوانو لە حەلاڵدا نەبێت بە کاریان نەهێناوەو نزیکی نەکەوتوونەتەوە. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ۝٥ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۝٦ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ﴾[٥] واتە: وە ئەوانەی کە پارێزەری داوێنیانن مەگەر بۆ خێزانی خۆیان یان بۆ کەنیزەکێك کە بووبن بە خاوەنیان ئەوە بەڕاستی ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن ئەنجا هەر کەسێك نیازی جگە لەو دوو جۆرە ئافرەتە بکاتو ئارەزووی خۆی تێر بکات، ئەوسا ئەوانە دەستدرێژیکەرن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (خُدری) (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك پیاو ژنەکەی خۆی هەڵساندو لە شەوداو دوو ڕکات نوێژیان کرد لەو شەوەدا بۆیان دەنووسرێت کە لەو کەسانەن زۆر یادی خوا دەکەن)، ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو ماجە لە فەرموودەکەی ئەبو سەعیدەوە ئەبو هورەیرەیش

---

[١] تحفة الأحوذي (٣/٢٣٧).

[٢] ابن ماجه (١/٥٥٥)، سەنەدەکانی لاوازە.

[٣] روى ابن ابي حاتم، والدر المنثور (٥/٣٨٠).

[٤] فتح الباري (٩/١٤).

[٥] المؤمنون (٥-٧).

(ڕەزای خـوای لێ بێـت) بـەو شـێوەیە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ڕیوایـەتی کـردووە.[1] ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەناو ڕێـی مەککەدا دەڕۆیشت، کە گەیشتە جومدان فەرمووی: (ئەمە جومدانە، بڕۆن، بە ڕاستی تاقانـەکان پـێش کەوتن)، وتیان: تاقانـەکان کـێن؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (ئـەو ژنو پیاوانـەی کـە زۆر یـادی خـوا دەکەن)، پاشان فـەرمووی: ( ئـەی خودایـە لەوانـەی کـە سـەریان تاشیوە خـۆش ببـە)، وتیـان: ئـەی ئەوانەی قژیان کـورت کردووەتـەوە؟ فـەرمووی: (ئەوانەشـی کـە کورتیـان کردووەتـەوە) بـەم شـێوەیە ئیمامی ئەحمەد تەنها خۆی ڕیوایەتی کردووە[2]. ئەم فەرموودەیـە موسـلیمیش ڕیوایـەتی کـردووە بـەبێ ئەو زیادەیەی کۆتاییەکەی[3]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةً وَأَجۡرًا عَظِيمًا﴾ هەواڵـە لە هەموو ئەوانەی کە باس کران. واتە: بێگومـان خـوای مـەزن لێخۆشـبوونو پاداشـتێکی گـەورەی بـۆ داناون ئەویش بەهەشتە.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا ﴿٣٦﴾﴾

**هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە**

خوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٖ وَلَا مُؤۡمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمۡرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُ مِنۡ أَمۡرِهِمۡۗ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلٗا مُّبِينٗا﴾ واتە: ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی فـەرمانیان بـە هەر کاتێك دا، هیچ پیاوێكو هیچ ژنێك کە خاوەن باوەڕ بن ناتوانن پەسەندی نەکـەن، هـەر کەسـێکیش لە فەرمانی خواو پێغەمبەری دەربچێت، ڕێگەی زۆر هەڵە کردووە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیەوە دەڵێت: جولـەیبیب پیاوێـك بـوو دەچـووە لای ژنـانو بـە لایانـدا تێدەپـەڕی قسەی خۆشی لەگەڵدا دەکردن، منیش وتم بە هاوسەرەکەم: با جولەیبیب نەیەتە لاتان ئەگەر بێتەلاتان ئاواوئاوا دەکەم. ئەو ژنەئەڵێت: ئەنساریەکان هەر کاتێك یەکێکیان بێـوەژنێکی ببوایـە هـەتا پرسـی بـە پێغەمبەر (ﷺ) نەکردایە ئایا پێویستیت پێی هەیە یان نا نەیدەدا بـە شـوو. پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرمووی بە پیاوێکی ئەنساری: (کـچەکەتم پـێ بدە بـە شـو)، پیاوەکـە وتـی: بـەڵێ بەسەرچـاو ئـەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مایەی شانازیەبۆم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من بۆ خۆمم نـاوێ)، وتـی:ئـەی

---

[1] ابو داود (٢/٧٤)، النسائي في الكبرى (٦/٤٣٣)، ابن ماجه (١/٤٢٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٢/٤١١)، موسلیم ڕیوایەتی کردووە جگە لە کۆتاییەکەی.

[3] مسلم (٢/٩٤٦).

بـۆ كێیـە ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ)؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (بـۆ جولـەیبیب)، وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) قسە لەگـەڵ دایكی دەكەم،چـوویەوە بـۆلای دایكی كـچەكە، پیاوەكـە وتـی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای كچەكەت دەكات؟ ژنەكـە وتـی: باشـە بەسەرچاو، وتـی: بـۆ خـۆی داوای ناكات، بەڵكو داوای دەكات بۆ جولەیبیب، ژنەكە وتی: كچی ئێمەو جولەیبیب؟! سا بە خـوا لێـی مـارە ناكەمو نایدەمێ، كاتێك پیاوەكە ویستی هەڵسێتو بچێت بـۆ لای پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) هەواڵەكـەی بداتێ، كە ژنەكەی چی دەڵێت، كچەكەی وتی: كێ داوای من دەكات لە ئێوە؟ دایكی شتەكەی پـێ وت. كچەكە وتی: ئایا ئێوە فەرمانی پێغەمبەری خـودا (ﷺ) دەگێڕنـەوە؟ بمدەنـە دەست پێغەمبـەر(ﷺ) دڵنیابن ئەو هەرگیز زایەم ناكـاتو نامفـەوتێنێت، بـاوكی ڕۆیـشت بـۆ لای پێغەمبـەر(ﷺ) وتـی: چـی لێ دەكەی مەیلی خۆتە، پێغەمبـەر(ﷺ) كـچەكەی مـارە بـڕی لـە جولـەیبیب جانـەڵێ: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) چوو بۆ غەزایەك، كاتێك خوای مەزن سامانێكی باشی خستە دەستی لەو غەزایـەدا فـەرمووی بـە هاوەڵـەكانی (ڕەزای خوایـان لێ بێـت): (ئـاخۆ كەسـێك هەیـە دیـار نـەبێت لـە نێوانتانـدا؟) وتیـان: فلانەكەسو فلانە كەسمان دیار نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سەیر بكەنو بڕوانن ئایا كەسێك هەیە دیار نەبێتو ون بووبێت؟) وتیان: نەخێر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵام من جولـەیبیبم لـە دەست چووەو ون كردووە)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لەناو كوژراوەكاندا بۆی بگەڕێن)، گەڕان بـۆی لـە لای حـەوت كەسـدا دیتیانـەوە ئـەو كوشـتبوونی پاشـان ئـەوانیش ئـەویان شـەهید كردبوو، وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) ئـەوەتا لـە لای حـەوت كەسـدایە كـە ئـەو كوشـتوونی پاشـان كوشـتوویانە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵساو چووە لایو فەرمووی: (حەوت كەسی كوشتو پاشـان كوشـتیان، ئـەو لە منەو منیش لە ئەوم) دووجار هەتا سێ جار ئەمەی فەرموو. پاشان لەسەر باسكەكانی خـۆی دایناو گۆڕیان بۆ هەڵكەند باڵی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت هیچ لـە ژێریـدا نـەبوو پاشـان خـستیە نـاو گۆڕەكـەی، باسی ئـەوە نـەكراوە كـە شـوورابێت، سـابت (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: هـیچ ژنێـك نـەبووە لـەناو ئەنسارییەكاندا بە ئەندازەی ئەو خێروبێركەر بووبێـتو مـاڵ بـەخش بێـت)، ئیـسحاقی كـوڕی عەبدوڵای كوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت بە سابت ئایا دەزانی پێغەمبەری خـودا (ﷺ)چ دوعایـەكی بـۆ كـرد؟ دەڵێـت: فەرمووی: (ئەی خودا خێروبێر بڕژێنە بەسەریداو لـە ژیانیـدا ناڕەحـەتیو كـەم بـژێوی نـەبینێت). هـەر وایش بوو، لەناو ئەنسارییەكاندا ژنێك نەبوو بە ئەندازەی ئەو خێروبێركەر بێت. ئیمامی ئەحمەدیش هـەر بەو شێوەیە بە درێژی هێناویەتی.[1] موسلیمو نەسائیش لە (فضائل)دا ڕووداوی كوشتنەكەیان ریوایـەت كردووە.[2] حافیز ئەبوعەمەر كوڕی عەبدولبەڕ لە كتێبی (الاستیعاب) باسی ئـەوەی كـردووە، كـە كاتێـك

---

[1] أحمد (٤/٤٢٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] مسلم (٢/٢٤)، النسائي في الكبرى (٨٢٤٦).

ئەم کیژە لەژوورەکەی خۆیدا وتی: ئایا فەرمانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕەد دەکەنەوە؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾.[1] تاوس (طاوس) دەڵێت: پرسیار کرا لە ئیبنو عەباس دەربارەی دوو ڕەکاتی دوای عەسرئەویش، نەهی لێکردو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾.[2] ئەم ئایەتە گشتگیرە لە هەموو کارو فەرمانێکدا، لەبەر ئەوەی هەر کاتێك خوداو پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانێکیان دا بە شتێك، هیچ کەسێك بۆی نیە لێی دەربچێتو لابدات، هیچ کەسێك بۆی نیە لێرەدا بە ئارەزوو هیچ بڵێتو هیچ بکات. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾[3] واتە: نەخێر وانیە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن سوێند بە پەروەردگارت بڕوادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکیەکی نێوانیاندا لە پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا بە هیچ بێزاریەك لەو بڕیارەی تۆ داوتەو مل کەچ نەکەن بە ملکەچیەکی تەواو. بۆیە زۆر بە توندی خوای مەزن هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە لاریان لەوە هەیەو فەرموویەتی: ﴿فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[4] واتە: جا با بترسن ئەوانەی کە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە لە دونیادا بەڵاو تاقی کردنەوەیەکیان بێتە ڕێ یان سزایەکی سەختیان تووش ببێت لە دواڕۆژدا.

﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا (٣٧) ﴾

**تەڵاقو ماوەی پاش تەڵاقدات بۆ هەڵوەشاندنەوەی یاسای بەکوڕکردن**

---

[1] الاستعاب (١/٢٥٩).

[2] عبدالرزاق (٢/٤٣٣).

[3] النساء (٦٥).

[4] النور (٦٣).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ واتە: بیربكەرەوە كاتێك دەتوت بە كەسێك(زەیدی كوڕی حاریسە) كە خوا بەهرەی بەسەردا ڕشتبوو تۆیش چاكەت لەگەڵدا كردبوو (بە ئازادكردنیو پەروەردەكردنی) خێزانت (زەینەب) لای خۆت ڕاگرەو بیهێڵەوەو لە خوا بترسە لە دڵی خۆتدا شتێك دەشاریتەوە كە خوا ئاشكرای دەكاتو لە قسەی خەڵك دەترسی لە كاتێكدا خوا شیاوترە كە لێی بترسی ئینجا كاتێك زەید پێویستی بەو (زەینەب) نەماو تەلاقی دا ئێمە ئەو (زەینەبە)مان لێ مارەكردی بۆ ئەوە هیچ نارەحەتیو تاوانێك نەبێت لەسەر ئیمانداران لە مارەكردنی ژنانی بە كوڕكراوەكانیاندا كاتێك پێویستیان پێیان نەماو تەلاقیان دانو فەرمانی خوا بە مارەكردنی زەینەب بۆت دراوەو براوەیە. خوای گەورە باسی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) دەكات، كاتێك كە وتی بە زەیدی كوڕی حارسەی خزمەتكاری (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو زەیدەی كە خوا چاكەی لەگەڵدا كردبوو بووبووە موسڵمانو شوێنی پێغەمبەر (ﷺ) كەوتبوو، ﴿أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ﴾ پێغەمبەریش چاكەی لەگەڵ كردبوو ئازادی كرد لە بەندایەتیو بووە پیاوێكی مەزنو بە ڕێزو خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەوترا خۆشەویستو بە كوڕەكەشی دەوترا ئوسامەی خۆشەویستی كوڕی خۆشەویست، عائیشە ئەڵێت(ڕەزای خوای لێ بێت) : پێغەمبەر(ﷺ) لەهەرمەفرەزەیەكدا زەیدی تێدا بناردایە ئەیكردە فەرماندەی مەفرەزەكە، ئەگەر پاش پێغەمبەر بمایە دەیكردە جێنشین، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە.[1] پێغەمبەری خودا (ﷺ) كچی پوری خۆی لێ مارە كرد كە زەینەبی كچی جەحشی ئەسەدی بوو (ڕەزای خوای لێ بێت) كە دایكی ناوی ئومەیەی كچی عەبدولموتەلیب بوو، دە دینارو شەست درهەمی كردە مارەیی لەگەڵ سەرپۆشو پۆشاكێكو درعێكداو پەنجا مشت لە خواردەمەنیو دە مشت لە خورما. ئەمە قسەی موقاتیلی كوڕی حەییانە، نزیكەی ساڵێك یان زیاتر لەگەڵ زەید مایەوە پاشان نێوانیان تێك چوو، زەید هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) نارەزایی لە بارەیەوە دەربڕیو پێغەمبەری خودایش (ﷺ) پێی فەرموو: (دەست لە ژنی خۆت بەرمەدەو لە خوا بترسە)، خوای مەزنیش فەرمووی: ﴿وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ﴾ ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)

[1] أحمد (٦/٢٢٧/٢٨١)، سەنەدەكانی لاوازە.

دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی بشاردایەتەوە لەو قورئانەی کە بۆی هاتە خوارەوە ئەم ئایەتەی دەشاردەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾.[1] وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا﴾ واتە: کاتێك زەید کاری هاوسەری لەگەڵ زەینەب تەواو کردو تەڵاقی دا، تۆمان کردە هاوسەری زەینەب، (الوطر) واتە: پێویستی، کاری هاوسەری، واتە: کاتێك وازی لێ هێناو تەڵاقی دا زەینەبمان کردە هاوسەری تۆ، ئەو کەسەی بووە وەلی مارەبڕنی زەینەب بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خودا خۆی بوو(جل جلاله)، بەو مانایە خودا فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (ﷺ)کەبچێتەلای زەینەب بەبێ (ولی) و بەبێ (گرێبەست) و (مارەی)و (شایەت) لەمرۆڤەکان! لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ماوەی پاش تەڵاقدانی زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێت) تەواو بوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە زەیدی کوڕی حاریسە: (بڕۆ قسەی لەگەڵ بکە بۆم) زەید ڕۆیشت بۆ لای زەینەب خەریکی هەویر شێلان بوو، زەید وتی: کاتێك چاوم پێی کەوت زۆر لام گەورە بوو نەمتوانی سەیری بکەمو پێی بڵێم کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسی کردوویت، بۆیە پشتم هەڵکردو بەرەودوا گەڕامەوەو وتم: ئەی زەینەب! مژدەت لێ بێت پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناردوومیو باسی تۆ دەکات، زەینەب وتی: من هیچ شتێك ناکەم هەتا ڕاوێژ (ئیستیخارە) لەگەڵ خودای خۆم نەکەم، هەڵساو ڕۆیشت بۆ مزگەوتەکەی خۆییو قورئان هاتەخوارەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتو چووە لاییو ئیزنی وەرنەگرت. ئەگەر چاوت لێمان دەبوو کاتێك چوومە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) نانو گۆشتیان داینیو خواردمان لەو شاییەدا ئەخوارد! خەڵکەکە ڕۆیشتنە دەرەوەو چەند پیاوێك مانەوەو دەمەتەقێیان ئەکرد دوای خواردنەکە لەماڵدا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ماڵ چووە دەرەوەو منیش شوێنی کەوتم، ئەنەس دەڵێت: دەگەڕا بەسەر ماڵی خێزانەکانیداو سڵاوی لێ دەکردن، ئەوانیش دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) تۆ خێزانەکەت لە لا چۆن بوو؟! نازانم لە بیرم نیە من هەواڵم دایە یان هەواڵیان پێدا کە: ئەو خەڵکە ڕۆیشتوون، پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو ماڵ چوو هەتا ڕۆشتە ژوورەوە، منیش ڕۆیشتم لەگەڵی بچمە ژوورەوە، پەردەی لە نێوان منو ئەودا دادایەوەو ئەوەبوو ئایەتی حیجاب هاتەخوارەوەو ئامۆژگاری ئەو خەڵکە کرا بەو شێوەیەی کە پێویست بوو،کەئەفەرموێ: ﴿لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ﴾[2]: هەتا کۆتایی ئایەتەکە. واتە: مەچنە ژوورەوە بۆ ماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) مەگەر ڕێگەتان پێ بدرێت. موسلیمو

---

[1] الطبري (٢/٢٧٤).
[2] الاحزاب (٥٣).

نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە.[1] بوخاری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: زەینەبی کچی جەحش (ڕەزای خوای لێ بێت) شانازی دەکرد بەسەر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەردا (ﷺ) دەیوت: ئێوە کەس‌و کارتان داونی بە شو، بەلام من خودای مەزن لە سەروی حەوت ئاسمانەوە داومی بە شو.[2] لە پێشەوە لە سورەتی (النور) باسمان کرد لە موحەمەدی کوڕی عەبدولای کوڕی جەحشەوە دەڵێت: زەینەب‌و عائیشە شانازیان بەسەر یەکتردا دەکرد، زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیوت: من ئەو کەسەم کە لە ئاسمانەوە فەرمانی مارەبڕینم هاتە خوارەوە. عائیشەیش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیوت: منیش ئەو کەسەم کە لە ئاسمانەوە باسی پاکی من هاتە خوارەوە. زەینەب (ڕەزای خوای لێ بێت) دانی نا بەوەدا بۆی.[3] پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا﴾ واتە: بۆیە پێمان خۆش بوو زەینەب بکەیتە هاوسەری خۆت‌و مارەی بکەی ئەو کارەمان کرد بۆ ئەوەی هیچ کەسێك لە خاوەن باوەڕان بە لایانەوە گران نەبێت‌و لۆمە نەکرێن کاتێك کە ئەو کەسانەی ئەوان کردوویانە بە کوڕی خۆیان ئەگەر ژنەکانیان تەلاق دا، بیانکەنە هاوسەری خۆیان. چونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە پێش پێغەمبەرێتیدا زەیدی کوڕی حارسەی کردبوو بە کوڕی خۆی‌و پێیان دەوت زەیدی کوڕی موحەممەد (ﷺ) کاتێك خوای مەزن ئەو کارەی هەڵوەشاندەوە بەم ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ﴾ هەتا دەگاتە ئەوەی کە دەفەرموێت: ﴿ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ﴾[4] پاشان خوای مەزن زیاتر جەختی کردەوە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کە زینەب (ڕەزای خوای لێ بێت) بخوازێت‌و مارە بکات کاتێك کە زەیدی کوڕی حارسە تەلاقی دا، بۆیە خوای مەزن لە ئایەتی (ژنە حەرامکراوەکاندا) فەرموویەتی: ﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾[5] واتە: وە حەرامە بۆتان هاوسەری کوڕەکانتان ئەوانەی کە لە پشتی خۆتانن. بۆ ئەوەی کوڕی نەسەبی جیابکاتەوە لە وانەی بە کوڕی خۆکراون، چونکە ئەوە زۆر لەناویاندا باوبوو. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا﴾ واتە: ئەمەی کە ڕوویداو هاتە پێش لە لای خودا شتێکی بڕاوە بووە دەبوو هەر ببووایە و خودا خۆی زانیویەتی کە زەینەب لە ئاکامدا دەبێتە هاوسەری پێغەمبەر (ﷺ).

---

[1] أحمد (٣/١٩٥)، مسلم (١٤٢٨)، النسائي (٦/٧٩).

[2] فتح الباري (١٣/٤١٥).

[3] الطبري (١٩/١١٨).

[4] الاحزاب (٤-٥).

[5] النساء (٢٣).

﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنۡ حَرَجٖ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ﴿٣٨﴾ ﴾

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنۡ حَرَجٖ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ﴾ واتـە: کاتێـك کـە خـودا حەلاڵی کردووەو فەرمانی داوە بە پێغەمبەر (ﷺ) کـە زەینـەب بخوازێـت پـاش ئـەوەی زەیـدی کـوڕی حارسە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) کردبووی بە کوڕی خۆی، تـەلاقی دا، ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُ﴾ واتە: ئەمە بڕیاری خوای مەزن بووە، بۆ پێغەمبـەرەکانی تـریش پـێش پێغەمبـەر (ﷺ) هەر کارێك خـودا فـەرمانی پێـداون تـاوانێکی تێـدا نـەبووە کاتێـك کـە بـەجێیان هێنـاوە، ئەمـە وەلامدانەوەیەکە بۆ ئەو دووڕووانەی کە گومانیـان وابـوو کـە ئەمـە کەموکوڕییـە بـۆ پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کە ژنی زەیدی کوڕی حارسەی خزمەتکاری خۆی خواستووە، کە لە پێـشدا کردبـووی بـە کـوڕی خـۆی، ﴿وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا ﴾ واتـە: خـودا فـەرمانی بـە هـەر شـتێك دا دەبێـت بکرێـت گـۆڕانی بەسەردا نایەت، مەیلی هەر شتێکی بوو دەبێت، مەیلیشی لە هەر شتێك نەبێت ڕوونادات.

﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخۡشَوۡنَهُۥ وَلَا يَخۡشَوۡنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٤٠﴾ ﴾

**وەسفی ئەو کەسانەی فەرمانی خودا دەگەیەنن**

خوای گەورە وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە فەرمانی خودا دەگەیـەنن بـە عەبـدەکانی خـوداو ئـەو ئەمانەتەی لەسەر شانیانە جێبـەجێی دەکـەن، دەفـەرمووێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَٰلَٰتِ ٱللَّهِ وَيَخۡشَوۡنَهُۥ وَلَا يَخۡشَوۡنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ واتە: کەسانێك کە پەیامەکانی خودا ڕادەگەیەننو لە خوا دەترسنو بێجگە لە خوا لـە کەسـی تـر ناترسـن، ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴾ واتـە: خـودا بەسـەر بـۆ یارمەتیـدەرو پشتیوان، وە بەڕێزترین مرۆڤ بۆ ئەم پلەوپایە بەرزەو بۆ هەموو کارێك پێغەمبەری خودایـە (ﷺ) چـونکە هەڵسا بـە گەیاندنو بڵاوکردنەوەی ئەم پەیامە پیرۆزە بۆ گەلانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتو بۆ هـەموو نـەوەکانی ئـادەم لە هەر کوێیەك بن، وە خودای گەورە بڕیاری خۆیەتیو بەرنامەو ئاینەکـەی سەرخست بەسـەر هـەموو ئاینو بەرنامەکانی تردا، چونکە پێغەمبەرە پێشووەکان تـەنها بـۆ سـەر گەلـەکانیان ڕەوانـە کرابوون بـەلام پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) ڕەوانـەکرا بـۆ هـەموو خـەڵکی بـە عـەرەبو عەجەمـەوە، ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا

ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵكینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەمووتان. پاشان ئومەتەكەی بوونەتە میراتبەری ئەو پلەوپایەیە دوای خۆی، هاوەڵەكانی هەڵسان بە چاكی بە گەیاندنیو بەو شێوەیەی كە فەرمانی پێدابوون گەیاندیان لە گشت ڕوویەكەوە لە گفتو گۆو هەڵسوكەوتو لە شەوو ڕۆژیداو لە سەفەرداو لە پەنهانیو ئاشكرایدا. خوای مەزن لێیان ڕازی بێتو پاداشتیان بداتەوە دوای ئەوانیش هەموو پاشینەكان ئەو پەیامەیان لە پێشینەكانی خۆیان وەرگرتووە هەتا ئەم زەمانەی ئێمە، داوامان وایە لە خوای گەورە، ئێمەش بكات بە یەكێك لەوانەی كە دەبنە میراتبەری پێشینەكان.

## پێغەمبەر (ﷺ) باوكی هیچ كەسێك لە پیاوانی ئێوە نیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ﴾ واتە: موحەممەد (ﷺ) باوكی هیچ كەسێك لە پیاوانی ئێوە نیە، خوای مەزن قەدەغەی كردووە دوای ئەمە بوترێت ئەوە زەیدی كوڕی موحەممەدە (ﷺ) واتە: باوكیشی نەبووە هەرچەندە لە پێش پێغەمبەریەتیدا كردبووی بە كوڕی خۆی، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ كوڕێكی بۆ نەماوە هەتا گەورە ببێتو بچێتە تەمەنی بلوغەوە، قاسمو تەیبو تاهیری هەبووە لە خەدیجە (ڕەزای خوای لێ بێت) بە منداڵی مردوون، وە ئیبراهیمیش كە لە ماریەی قیبتی بووە ئەمیش شیری دەخوارد مرد. وە لە خەدیجە چوار كچی هەبووە: زەینەبو ڕقیەو ئومو كەلسوم و فاتیمە (خوا لە هەموویان ڕازی بێت) سیانیان هەر لە ژیانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆیدا مردوون، فاتیمە (ڕەزای خوای لێ بێت) مایەوە بە هۆی لە دنیادەرچوونی پێغەمبەرەوە(ﷺ) تووشی نەخۆشی بوو،پاش شەش مانگ ئەویش مرد.

## پێغەمبەر (ﷺ) كۆتایی پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت)

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمًا﴾ واتە: بەڵكو ئەو نێردراوی خواو كۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو خوا بە هەموو شتێك زانایە. وەك ئەم ئایەتەیش وەك ئەو ئایەتوایە كە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾[2] واتە: خوا چاك دەزانێت پەیامو فرستادەی خۆی لە كوێ دادەنێت، ئەم ئایەتە دەقێكە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەری تر دوای ئەو نایەت، كاتێك كە پێغەمبەری تر دوای ئەو نایەت، دیارە ڕەسولیش هەر نایەت، چونكە پلەی ڕەسول لە پلەی نەبی تایبەترە، چونكە هەموو ڕەسولێك نەبیە بەڵام هەموو نەبیەك ڕەسول نیە، لەم بارەیەوە فەرموودەی موتەواتیر زۆرە كە كۆمەڵێك لە هاوەڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەتیان كردووە

---

[1] الاعراف (١٥٨).

[2] الانعام (١٢٤).

(ڕەزای خوایان لێ بێت). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە ئەویش لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (نموونەی من لە ناو پێغەمبەراندا (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك نموونەی پیاوێك وایە کە خانوویەکی دروست کردووە تەواو چاکی کردووە تەنها جێگای یەك خشتی هێشتووەتەوە، خەڵکی بە دەوری خانووەکەدا دەگەڕێن زۆر بە لایانەوەسەیرە دەڵێن: ئەگەر شوێنی ئەم خشتەش تەواو بووایە چاکتر دەبوو، من لەناو ئەو پێغەمبەرانەدا شوێنی ئەو خشتەم.[1] تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: فەرموودەیەکی(حسن صحیح)ە.[2] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: پەیام وپێغەمبەرایەتی بڕاوەتەوەو نەماوە نە سپاردە لەمەودوا دێتو نە پێغەمبەر). دەڵێت: خەڵکی ئەوەیان زۆر بە لاوە قورس بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵام مژدەکان دەمێننو بەردەوام دەبن). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مژدەکان کامەیە؟ فەرمووی: (خەو بینینی پیاوی موسڵمان، کە بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی).[3] هەر بەم شێوەیە تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: فەرموودەیەکی (حسن غریب)ە.[4] فەرموودەیەکی تر: ئەبو داودی تەیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدولاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (نموونەی منو نموونەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك نموونەی پیاوێك وایە خانوویەکی دروست کردووەو تەواو چاکی کردووەو ڕێکوپێکی کردووە تەنها شوێنی یەك خشت نەبێت، من شوێنی ئەو خشتەم، هەر کەسێك چووەتە ناوی کە سەیری کردووە وتوویەتی: چەندە چاكو جوانە تەنها شوێنی ئەم خشتە نەبێت، بە من کۆتایی ئەو پێغەمبەرانە هاتووە -سەلامی خوایان لێ بێت-).[5] بوخاریو موسلیمو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: ڕاستو غەریبە بەم شێوەیە (صحیح غریب).[6] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (نموونەی منو نموونەی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) وەك نموونەی پیاوێك وایە

---

[1] أحمد (١٣٦/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي (٨١/١٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٢٦٣/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الأحوذي (٥٥١/٦).

[5] مسند الطيالسي (٢٤٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] فتح الباري (٦٤٥/٦)، مسلم (١٧٩١/٤)، تحفة الأحوذي (١٥٨/٨).

خانوویەکی دروست کردبێت تەنها یەك خشتی نەبێت، من هاتمو ئەم خشتەم تەواوکرد).[١] تەنها موسلیم خۆی هێناویەتی.[٢] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بە ڕاستی نموونەی منو نموونەی ئەو پێغەمبەرانەی پێش من، وەك نموونەی پیاوێك وایە چەند خانوویەك تەواو بکات، چاكو جوانی بکات تەنها شوێنی یەك خشتی نەبێت لە سوچێك لە سوچەکانیدا خەڵکی بە دەوریدا دەگەڕێنو سەرنجیان ڕادەکێشێتو دەڵێن: خۆزگە خشتێکت ئالێرەدا دادەناو خانووەکەت تەواو دەبوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (من ئەو خشتەم).[٣] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[٤] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ڕێزم لێگیراوە بەسەر پێغەمبەراندا بە شەش شت: جەوامعی کەلیمەم پێدراوەو یارمەتی درامو سەرخرام بە ترسو (واتە: لە دڵی دوژمندا)،دەستکەوتی شەڕم بۆ حەڵاڵەو، زەمینم بۆ کراوە بە مزگەوتو پاککەرەوەو، ڕەوانەکراوم بۆ گشت خەڵکیو پێغەمبەرێتیش بە من کۆتایی هاتووە).[٥] تیرمیزیو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: (حسن صحيح).[٦] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (نموونەی منو نموونەی پێغەمبەرانی پێش من وەك نموونەی پیاوێك وایە خانوویەکی دروست کردبێت تەنها جێگای یەك خشت نەبێت، من هاتمو ئەو خشتەم تەواو کرد).[٧] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[٨] فەرموودەیەکی تر: لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (بە ڕاستی من چەند ناوێکم هەیە من موحەمەدم، من ئەحمەدم، من سڕێنەرەوەم، ئەوەی کە خودا خوانەناسیم پێ دەسڕێتەوەو لەناو دەباتو من دواین کەسم، ئەوەی کە دوای ئەو پێغەمبەر نیە).[٩] بوخاریو

---

[١] أحمد (٩/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] مسلم (١٧٩١/٤).

[٣] أحمد (٣١٢/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٤] البخاري (٣٥٣٥)، مسلم (١٧٩٠/٤).

[٥] مسلم (٣٧١).

[٦] تحفة الأحوذي (١٦٠/٥)، ابن ماجه (١٨٨/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٧] أحمد (٩/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٨] مسلم (١٧٩١/٤).

[٩] أحمد (٨٠/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە هەردوو سەحیحەکەدا.[1] فەرموودەی تر لەم بارەیەوە زۆرە. خوای گەورە لە قورئانداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لـە فـەرموودەی موتـەواتیردا باسیان کـردووە کـە دوای ئـەو (ﷺ) پێغەمبەری تر نایەت بۆ ئەوەی باش بزانن کە هەر کەسێك دوای پێغەمبـەر (ﷺ) وتـی مـن پێغەمبـەرم درۆ دەکاتو دەجالەو گومڕایەو سەر لە خـەڵکی دەشـێوێنێت، بـا ئـەو کـەس شـتی سـەرنج ڕاکێـشیش بکاتو هەموو جۆرە جادوویەك بکاتو فـاڵ بـۆ خـەڵکی بگرێتـەوە، چـونکە ئـەم جـۆرە کارانـە لـە لای خەڵکی خاوەن باوەڕو ئاوەز گومڕاییو سـەر لێ شـێوان زیـاتر هیـچی تـر نیـە، وەك ئـەو خراپانـەی کـە ئەسوەدی عەنسی لە یەمـەنو، موسـەیلەمەی درۆزن لـە یەمامـە کردیـان لـە قـسەی پڕوپـوچو کـرداری ناپەسەند، کە هەموو خاوەن هۆشو دڵێکی وریا دەیانزانی کە زۆر درۆزنو گـومڕان، (لەعنـەتی خوایـان لێ بێت)، هەر بەو شێوەیە کەسێك لافی ئەوە لێ بدات کـە ڕەوانـەکراوی خودایـەو هـەتا ڕۆژی قیامـەتو ئەو ڕۆژەی دەجال دێت، درۆزنـەو درۆ بـە دەمـی خـوداوە هەڵدەبەسـتێت، بـا شـتی واش بکـات جێـی سەرنج ڕاکێشانی خەڵکیش بێت، زانایانی ئیسلامو خاوەن بـاوەڕانیش شـایەتی دەدەن کـە ئـەو شـتانە هەموو جادوو فالگرتنـەوەو درۆیـەو دوورە لـە ڕاستیەوە، ئەمـەیش سـۆزو بـەزەیی خـودای مەزنـە بـە عەبدەکانی کە ئەو درۆزنانە چاك دەناسن کە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە ناکەن مـەگین لەبـەر مەبەستێکی تایبەتی خۆیان و چاوەشە کردنی خەڵکی نەبێت، بـەو فێـڵو جادووگەریـەیان. وەك خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾[2] واتـە: هـەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنـە سـەر هـەموو کەسـێکی زۆر درۆزنـی زۆر تاوانبـار. ئەمە بە پێچەوانەی ژیـانی پێغەمبەرانەوەیـە (سـەلامی خوایـان لێ بێـت) کـە لـە پۆپـەی چاکەخوازیو ڕاستگۆییو ڕێ نیـشاندانی خـەڵکیو خـۆڕاگریو دادپەروەریـدا بـوون لـە کـردارو گفتـاردا لـەوەی کـە دەیانگەیاند بە عەبدەکانی خودا لە فەرمان دان بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە، لەگـەڵ ئـەو هـەموو موعجیزەدا کە خـوای گـەورە لـە ژێـر دەسـتیاندا دەیهێنایـەدی کـە زۆر ئاشـکرا بـوو (سـەلامی خـوای گەورەیان لێ بێت هەموو کاتێكو هەتا هەتایە).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾ تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾﴾

---

[1] فتح الباري (٨/٥٠٩)، مسلم (٤/١٧٢٨).

[2] الشعراء (٢٢١_٢٢٢).

## گەورەیی یادی خودا زۆرکردن

خوای گەورە فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە زۆر یادی خوا بکەن، ئەو خودایەی ئەو هەموو بەهرەیەی پێ بەخشیون لەگەڵ ئەو هەموو چاکەیەدا، چونکە بە هۆی ئەو یادە زۆرەوە کە دەیکەن پاداشت دەدرێنەوەو بەرەو ئاکامێکی چاک دەڕۆن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی بوسرەوە دەڵێت: دوو عەرەبی دەوارنشین هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) یەکێکیان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کام کەسە زۆر چاکە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو کەسەی کە تەمەنی درێژبووەو ئاکاری چاکی کردووە)، ئەوی تریان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کارو فەرمانەکانی ئیسلام زۆر بووە لەسەرمان، کارێکم پێ بفەرموو کە پێیەوە خەریك بم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (با هەمیشە زمانت تەڕ بێت بە یادی خودای مەزنەوە).[1] تیرمیزیو ئیبنو ماجەیش بەشی دووەمی فەرموودەکەیان ڕیوایەت کردووە، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی(حسن غريب)ە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەلێك نیە لە شوێنێك دانیشێتو یادی خوای مەزنی تێدا نەکات مەگین لە ڕۆژی قیامەتدا بە داخو خەفەتەوە دەیانبینی).[3] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە زۆر یادی خودا بکەن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ دەڵێت: خوای مەزن هیچ فەرزێکی لەسەر عەبدەکانی دانەناوە مەگین سنوورێکی بۆ دیاری کردووە، پاشان چاوپۆشی کردووە لەو کەسەی کە ڕێگرێکی بۆ پەیدا بووبێت، غەیری یادی خودا، چونکە خوای گەورە سنوورێکی بۆ یادی خودا دانەناوە کە کۆتایی بهێنرێت، وە چاوپۆشیشی نەکردووە لە کەسێك مەگەر هەر تواناو دەسەڵاتی نەمابێت، پاشان دەڵێت: ﴿فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾[4] واتە: ئەوسا یادی خودا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتانو بە پاڵکەوتنەوە. بە شەوو بە ڕۆژ لە وشکانیو دەریادا، لە سەفەرو لە ماڵەوەدا لە کاتی هەژاریو دەوڵەمەندیدا، وە لە نەخۆشیو ساغیداو لە پەنهانیو ئاشکرایشداو لە هەموو کاتێکی ژیاندا. پاشان

---

[1] أحمد (١٩٠/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الأحوذي (٦٣١/٦)، ابن ماجه (١٢٤٦/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] أحمد (٨٠/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] النساء (١٠٣).

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ واتە: هەر کاتێك ئێوە بەیانیان و ئێواران باسی پاكی و بێعەیبی خوا بكەن، خوداو فریشتەكانیش سەڵەوات دەدەن لەسەر ئێوە.[1] ئایەت و فەرموودەو قسەی زانایان لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە كە جەخت دەكەنەوە لەسەر یادی خوای گەورە، زانایان چەندین كتێبیان داناوە لە بارەی یادی خوداوە (الاذكار) لە شەوو ڕۆژدا وەك نەسائی و موعەمەری و كەسانی تریش. چاكترین كتێبێك لەم بارەیەوە دانرابێت كتێبی(الاذكار)ی ئیمامی نەوەویە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت). وە دەفەرموویێت: ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ واتە: لە بەیانیان و ئێواراندا، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەیە كە خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ﴾[2] واتە: ئەنجا پاك و بێگەردی خوا بڵێن كاتێك ئێوارەتان لێ دێت و كاتێك بەیانیتان لێ دێت و سوپاس هەر بۆ خودایە لە ئاسمانەكان و زەویداو (پاكی بێگەردی خوا بڵێن) لە شەوداو كاتێك نیوەڕۆتان لێ دێت. پاشان خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۚ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾ واتە: ئەو زاتێكە بەزەیی خۆی دەڕژێنێت بەسەرتانداو فریشتەكانی داوای لێبوردنتان بۆ دەكەن بەو هۆیەوە خوا لە تاریكیەكانەوە دەرتان دێنێت بەرەو ڕووناكی (ئیمان و ئیسلام) وە خوا بە بەزەییە بۆ ئیمانداران. ئەمە بۆ ئەوەیە مەردم بە پەرۆشەوە یادی خوا بكەن. واتە: خودای مەزن درود دەنێرێت بۆتان سا ئێوەش یادی ئەو بكەن وەك ئەم ئایەتە كە دەفەرموویێت: ﴿ كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِنْكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُمْ مَا لَمْ تَكُونُوا تَعْلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾[3] واتە: وەك ڕەوانەمان كرد لەناوتاندا پێغەمبەرێك لە خۆتان كە ئایەتەكانی ئێمەتان بەسەردا بخوێنێتەوەو پاكتان بكاتەوەو فێرتان بكات قورئان و دانایی (فەرموودەی خۆی) وە فێرتان بكات ئەو شتانەی كە نەتاندەزانی، كەواتە یادم بكەن تا منیش لەبیرتان نەكەم و سوپاسم بكەن پێ نەزان و ناسوپاسمیم مەكەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزن دەفەرموویێت هەر كەسێك لە دڵی خۆیدا یادی من بكات منیش لای خۆم یادی دەكەم، هەر كەسیش لەناو كۆمەڵێكدا یادم بكات منیش لەناو كۆمەڵێكی چاكتر لە ئەو یادی دەكەم)، سڵاوتی خوا لەسەر

---

[1] الطبري (٢٠/٢٨٠).

[2] الروم (١٧ـ١٨).

[3] البقرة (١٥١ـ١٥٢).

بەندەکەی، واتە: وەسفکردنی لە لای فریشتەکان، بوخاری لە ئەبولعالیەوە گێڕاویەتیەوە.[1] ئەبو جەعفەری ڕازیش ڕیوایەتی کردووە لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە. کەسانی تریش وتوویانە: (الصلاة) لە لایەن خواوە واتە: بەزەیی خودا، وتراوە: کە هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەم دوو قسەیەدا نیە. والله أعلم. بەڵام درود لە لایەن فریشتەوە واتە: دوعاو داوای لێخۆشبوون بۆ کردن وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ۝٧ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝٨ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾[2] واتە: ئەو فریشتانەی هەڵگری عەرشن و ئەوانەش بە دەوری دان بە ستایشی پەروەردگاریان تەسبیحات دەکەن و باوەڕیان بەو هەیەو داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی ئیماندارن، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان میهرەبانی و زانیاریت هەموو شتێکی گرتووەتەوە دەی خۆش ببە لەوانەی تۆبەیان کردووەو شوێنی ڕێگای تۆ کەوتوون و بیانپارێزە لە سزای دۆزەخ، ئەی پەروەردگارمان بیشیانخەرە بەهەشتانێکی هەمیشەیی کە بەڵێنت پێ دابوون ئەو کەسانەش چاکەکار بوون لە باوباپیران و هاوسەران و ڕۆڵەکانیان بە ڕاستی هەر تۆ زاڵی کاردروستی، وە بیانپارێزە لە تۆڵەی تاوانەکان. وە دەفەرمووێت: ﴿لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ واتە: بە هۆی بەزەیی خۆیەوە بۆتان و پاڕانەوەی فریشتەکان، لە تاریکی و نەزانی و گومڕایی دەرتان دێنێت و بەرەو ڕووناکی و ڕێی ڕاست و باوەڕ پتەوی دەتانبات، ﴿وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا﴾ واتە: خودا بۆ خاوەن باوەڕان دلۆڤانە لە دنیاو لە قیامەتدا، لە دنیادا ڕێی هەقی نیشان داون کە خەڵکی تر لێی ئاگادار نین، ڕێگایشی بۆ ڕوون کردوونەتەوە کە خەڵکی تر ونیان کردووەو لایان داوە لێی، وەك بانگخوازانی بێ دینی و ئەو کەسانەی کە بە ئارەزووی خۆیان ڕێگا بۆ شوێنکەوتووانیان دادەنێن لە ستەمکارو خراپەکاران، لە ڕۆژی قیامەتیشدا خاوەنی بەزەییە بۆ خاوەنباوەڕان ولە ڕۆژە ترسناکە مەزنەکە بێ خەمیان دەکات، فەرمانیش دەکات بە فریشتەکان کە مژدەی بەهەشت و سەرکەوتن و ڕزگاربوونیان لە ئاگر بدەنێ ئەمەیش هەمووی لەبەر خۆشەویستی و دلۆڤانی خودایە بۆ بەندە خاوەن باوەڕەکانی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە لای چەند هاوەڵێکیدا تێپەڕی(ڕەزای خوایان لێ بێت) منداڵێك لەناو ڕێگەکەدا بوو، کاتێك دایکی ئەو خەڵکەی

---

[1] البخاري/ تفسير الأحزاب/ باب (١٠).

[2] الغافر (٧ـ٩).

بینی لەوەی کە کوڕەکەی بکەنە ژێر پێوە بە پەلە هاتو دەیوت: کوڕەکەم، کوڕەکەم، ڕێیان بۆ کردەوە کوڕەکەی هەلگرت، خەلکەکە وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ژنە چی دەکات ئەگەر کوڕەکەی فڕێ بدرێتە ناو ئاگر، ئەنەس دەلێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) هێواشی کردنەوەو بێدەنگی کردن، فەرمووی: (نەخێر بە خوا، خودایش خۆشەویستی خۆی ناخاتە ناو ئاگر).[1] سەنەدەکانی لەسەر مەرجی هەردوو سەحیحەکەیە، هیچ کەسێك لە زانایانی شەش کتێبەکە ئەم فەرموودەیان نەهێناوە.

بەلام لە سەحیحی ئیمامی بوخاریدا هاتووە لە گەورەی موسلمانانەوە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەلێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ژنێکی بینی لە ژنە دیلەکان مندالێکی هەلگرتو نای بە سنگیەوەو شیری دایە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئاخۆ دەبینن ئەم ژنە مندالی فڕێ بداتە ناو ئاگرو دەتوانێت شتی وا بکات؟) وتیان: نەخێر. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (سا سوێند بە خوا، خودا بە بەزەیی ترە بۆ عەبدەکانی لەم ژنە بۆ مندالەکەی)[2]. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞ﴾ وا دیارە مەبەست پێی(والله أعلم)، بەخێرهاتنیان لێ دەکرێت لە لایەن خودای مەزنەوە واتە: ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە سەلامیان لێ دەکات. وەك خوای خاوەن دەسەلات لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾[3] واتە: سەلامیان لێ دەکرێت بە وتە لە لایەن پەروەردگاری میهرەبانەوە. قەتادە دەلێت: مەبەست بەو سەلامە ئەوەیە، لە ناو خۆیاندا خاوەن باوەڕان سەلام لە یەکتری دەکەن، ئەو ڕۆژەی کە دێنە بەر بارەگای خودای مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا.[4]

وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[5] واتە: دوعایان تێیدا ئەوەیە کە دەلێن پاکو بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان سلاوکردن لێیان لەو بەهەشتەدا بە وشەی سەلامەو دواهەمین دوعایان ئەوەیە کە دەلێن بێگومان سوپاسو ستایش هەر بۆ خودایە کە پەروەردگاری هەموو جیهانە.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ أَجۡرٗا كَرِيمٗا﴾ واتە: پاداشتێکی زۆر چاکیان بۆ دانراوە لە بەهەشتدا لەو هەموو خواردنو خواردنەوەو جلوبەرگی جوانو شوێنی خۆشو ژن خواستنو ڕابواردن کە هەرگیز چاو نەیبینیونو گوێ نەیبیستوونو بە دلی کەسدا نەهاتووە.

---

[1] أحمد (۳/۱۰٤)، ئەو پیاوانەی ئەم فەرموودەیان هێناوە جێی متمانەن.

[2] فتح الباري (۱۰/٤٤۰).

[3] يس (٥٨).

[4] الطبري (۲۰/۲۸۰).

[5] يونس (۱۰).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَدَعۡ أَذَىٰهُمۡ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿٤٨﴾ ﴾

**ڕەوشتەکانی (سیفەتەکانی) پێغەمبەری خوا (ﷺ)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان ئێمە تۆمان ناردووە بۆ خەڵکی بە شایەتو مزدەدەرو ترسێنەر. ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەتای کوڕی یەسارەوە دەڵێت: گەیشتم بە عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس (ڕەزای خوای لێ بێت) پێم وت:باسی پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆ بکە کە لە تەوراتدا وەسفەکانی هاتووە. وتی: بەڵێ، بە خودا! هەندێ ڕەوشتو سیفەت لە تەوراتدا هاتووە کە لە قورئانیشدا هاتووە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە تۆمان ناردووە کە شایەتو مزگێنی دەرو ترسێنەرو پارێزەری نەخوێندەوارەکان بیت، تۆ عەبدو ڕەوانەکراوی منی، ناوم نای موتەوەکیل و تۆش توندو تیژو دڵ ڕەق نیت، وە لە بازاڕەکاندا دەنگت نایەتو بە خراپە وەڵام نادەیتەوە بەڵکو دڵ فراوانو لێبوردەو چاوپۆشی لە خەڵك دەکەیت، وە خوا نایمرێنێت (گیانی ناکێشێت) هەتا گەلە لارو وێرەکەی پێ ڕاست دەکاتەوە و دەڵێن: (لا إلـه الاّ الله)، چاوی کوێری پێ دەکاتەوەو گوێی کەڕی پێ واڵا دەکاتو دڵی داخراوی پێ دەکاتەوە).[1] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە باسی کڕینو فرۆشتنو تەفسیردا (فی البیوع والتفسیر).[2]

وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێت: خوای مەزن وەحی نارد بۆ لای پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل پێیان دەوت: شەعیاء، هەڵسە بڕۆ بۆ ناو هۆزەکەت، من زمانی تۆم پاراوکردووە بە نیگاو وەحی، نەخوێندەوارێك دەنێرم لە نەخوێندەوارەکان، کە ڕەوانەی دەکەم توندو تیژ نیە، دڵ ڕەق نیە، لەناو بازاڕەکاندا دەنگی نایەت، ئەگەر لە تەنیشت چرایەکەوە بڕوات نایکوژێنێتەوە ئەوەندە لەسەرخۆیە، وە ئەگەر بەسەر قامیشدا بڕوات لە ژێر پێیدا دەنگی نایەت، چاوی کوێرو گوێی کەڕو دڵی داخراوی پێ دەکەمەوە، هەموو کارێکی جوانی بۆ ئاسانو ڕێك دەخەم، هەرچی ڕەوشتی بەرز هەیە پێی دەبەخشم، ئارامیو لەسەرخۆیی دەکەمە پۆشاکیوچاکەکردن ئەکەمە دروشمی لە خواترسان ئەکەمەویردی دڵەکەی، لە گوفتاریدا کارزانە، ڕاستیو بە ئەمەکی سروشتیەتی، لێبوردەیی فەرمان بە چاکە ڕەوشتیەتیو هەق بەرنامەیەتیو دادپەروەری پێشەوایەتی، و ئیسلام ئاینیەتیو ناوی ئەحمەدە، دەیکەمە ڕێ نیشاندەری خەڵکی پاش گومڕایی، بە هۆی ئەوەوە خەڵکی فێری زانیاری دەکەم پاش

---

[1] أحمد (١٧٤/٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤٠٢/٤، ٤٤٩/٨).

نەزانی، بەرزی دەکەمەوە بە ئەو پاش بێ هێزیو بێدەسەلاتی خۆم دەناسێنم بە هۆی ئەوەوە پاش نەناسراویم، شت زۆری دەکەم بە ئەو پاش کەمی، دەوڵەمەندی ئەڕژم بەهۆی ئەوەوە پاش هەژاری، کۆی دەکەمەوە بە ئەو پاش جیابوونەوەو لێك ترازان، بە ئەوتەبایی لەنێوان گەلە پەرتەوازەکانو دڵە جیاوازەکانو ئارەزووە پەرشو بڵاوەکاندا دروست دەکەم، کۆمەڵێك خەڵکی زۆر ڕزگار دەکەم لە تیاچوون بەهۆی ئەوەوە، ئومەتەکەی دەکەمە چاکترین ئوممەت کە هاتبێت بۆ خەڵکی فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، یەکتاپەرستنو خاوەن باوەڕنو دڵسۆزنو باوەڕیان هەیە بەو پەیامەی پێغەمبەرەکانم پێی هاتوون، فێری تەسبیحاتو (الله أكبر و لا إلـه الاّ الله) و سوپاسو یەکخواپەرستیان ئەکەم لە مزگەوتەکانیاندا، وە لە شوێنی دانیشتنو خەوتنو دەرەوەو ماڵیاندا، نوێژم بۆ دەکەن بە هەڵسانو دانیشتن، شەڕ دەکەن لە ڕێی خوادا ڕیز دوای ڕیز وهەڵمەت دوای هەڵمەت، هەزاران کەسیان لە ماڵی خۆیان دەردەچن لەبەر ڕەزامەندی من، دەمو چاوو دەستو قاچیان پاك دەکەنەوەو (دەیشۆرن)، بۆخزمەتکردن قۆڵی لێهەڵدەماڵن[1]، قوربانیان خوێنی خۆیانە، ئینجیلەکانیان لەناو سنگیاندایە، (واتە: قورئانو فەرموودەیان لەبەرە)، بە شەو راهیب وخواناسنو بە ڕۆژیش شێری مەیدانن، و لەناو ماڵو منداڵی ئەو پێغەمبەرەدا (سابتین) و ڕاستگۆیانو شەهیدانو پیاوچاکان وەدی دەهێنم، ئومەتەکەی دوای خۆی ڕێ نیشاندەر دەبن بۆ سەر هەقو بەوهەقەش هەڵدەستن، هەر کەسێك یارمەتیان بدات دەیکەمە خاوەن دەسەڵاتو پشتگیری ئەو کەسەش دەکەم کە بانگەشەیان بۆ دەکەن، ئەو کەسەشی دژایەتیان بکات یان بیەوێت شتێك لە دەستیاندایە لێیان بسێنێت یان دەستدرێژی بکاتە سەریان بازنەی نەگبەتی بەدەوریاندا ئەکێشم. وایان لێ دەکەم ببنە جێنشینی پێغەمبەرەکەیانو بانگخواز هەربۆ لای پەروەردگاریان بکەن، فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، نوێژ دەکەنو زەکات دەدەنو ئەو بەڵێنەی کە دەیدەن بەجێی دێنن، کۆتایی ئەو چاکەیە بەوان دێنم کە لە سەرەتاوە دەستم پێکرد بە یەکەم کەسیان، ئەمە ڕێزی خۆمە ئەیدەم بە هەر کەسێك مەیلم لێ بێت، وە من خاوەن ڕێزی مەزنم.[2] ﴿شَـٰهِدًا﴾ واتە: شایەتی بدە کە خودا تەنهایەو هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا شایەتی کرداری خەڵکیە، وەك خوای مەزن دەفەرموێت لە ئایەتێکی تردا: ﴿وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾[3] واتە: تۆیشمان هێنا ئەی موحەممەد (ﷺ) بە

---

[1] دەقەعەرەبیەکەی ئەڵێ (یشدون الثیاب فی الانصاف)، هەڵیش دەگرێ بەواتای (ناوقەدیان بە پەڕۆ ئەبەستن) بدات ،بەڵام ئەومانایەمان بەنزیکترزانی وەك لەهەندێ کتێبی (لوغە)دا باس کراوە(وەرگێڕ).

[2] فتح الباري (٤٢/٤).

[3] النساء (٤١).

شایەت بەسەر ئەوانەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾[1] واتە: تا ببنە چاودێر بەسەر مەردمەوە، وە پێغەمبەریش (ﷺ) چاودێر بێت بەسەر ئێوەوە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: مزگێنی دەرە بە خاوەن باوەڕان بە پاداشتی زۆر چاكو ترسێنەریشە بۆ خوانەناسان بە سزای سەخت، وە دەفەرمووێت: ﴿وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ﴾ واتە: بانگی خەڵكی دەكەی بۆ خواپەرستی وەك خوا چۆن فەرمانی پێكردوویی، ﴿وَسِرَاجًا مُّنِيرًا﴾ واتە: وە فەرمانی پێداوی بەوەی كە پێی هاتووی بیگەیەنی كە ئەوەندە ئاشكرایە وەك ڕووناكی خۆر وایە هیچ كەسێك دژی ناوەستێت مەگەر زۆر لاسار بێت، پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا﴾ واتە: وە مژدە بدە بە ئیمانداران كە بێگومان بۆ ئەوان هەیە بەهرەو بەخششێكی گەورە لە لایەن خواوە. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُطِعِ ٱلْكَـٰفِرِينَ وَٱلْمُنَـٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ﴾ واتە: بە گوێی خوانەناسانو دووڕووان مەكە هەرچی دەڵێن، ﴿وَدَعْ أَذَىٰهُمْ﴾ واتە: چاوپۆشیان لێ بكەو گوێیان مەدەرێ، بیاندەرە دەستی خودا، ئەویان بەسە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ واتە: وە پشت هەر بە خوا ببەستەو خوا بەسە كە پشتیوان بێت.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾﴾

**بەشی ئەوژنەی پێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاق ئەدرێن و(عدة)شیان چۆنە.**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ واتە: ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە كاتێك ئافرەتانی ئیماندارتان مارە كرد، پاشان لە پێش ئەوەی بچنە لایان تەڵاقتان دان ئەوە لەسەریان نیە بۆ ئێوە هیچ عیددەیەك هەڵژمێرن كەواتە موتعەیان (پۆشاكو نوێن بۆ دڵخۆشیان) بدەنێو تەڵاقیان بدەن بە تەڵاقدانێكی جوانو پیاوانە. ئەم ئایەتە پیرۆزە بڕیاری زۆری تێدایە، لەو بڕیارانە: ناوهێنانی مارەیی لەسەر پەیمان و گرێبەستی هاوسەرگیری هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە ئەوەندەی ئەم ئایەتە بە ڕوونی باسی كردبێت، وە هەروەها بەڵگە لەسەر دروستی

---

[1] البقرة (١٤٣).

تەلاقدانی ژن پێش چوونە لای، خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ ئەم ئایەتە گشتگیرە چونکە جیاوازی نیە لە نێوان ژنی خاوەن باوەڕو ژنی ئەهلی کتێبدا لەو بارەیەوە بە ڕای هەموو زانایان، زۆرێك لە زانایان وەك ئیبنو عەباس و سەعیدی کوڕی موسەیب و حەسەنی بەسری و عەلی کوڕی حوسەینی زەینل عابیدین و کۆمەڵێك لە زانایانی پێشین (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە تەلاق ناکەوێت ئەگەر لە پێشەوە مارەکردن نەبووبێت، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ بە دوای مارەبڕیندا تەلاقدانی هێناوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لە پێش مارەبڕیندا تەلاق ناکەوێت و نابێت.[1] واتە: ئەگەر کەسێك ژنی نەهێنابێت، وتەی تەلاق بێت بە دەمیدا پێش ئەوەی ژن بێنێ تەلاقی ناکەوێت. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: ئەگەرکەسێك بڵێت: هەموو ژنێك کە مارەی دەکەم تەلاقی کەوتبێت، ئەو تەلاقە هیچ نیە، واتە ناکەوێت، بۆیە خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾.[2] ئیبنو عەباس دیسان فەرموویەتی: بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ﴾ ئایا نابینی کە تەلاق پاش مارەکردنە، فەرموودەیەك لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لە بابیەوە بابیشی لە باپیریەوە پێی گەیشتووە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (تەلاق بۆ ئەوەی ئادەم نیە لە شتێکدا خاوەنی نەبێت) ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیزی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی چاکەو چاکترین شتە ڕیوایەت کرابێت لەم بارەیەوە.[3] هەر بەم شێوەیە ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردووە لە عەلی و میسوەری کوڕی مەخرەمەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لە پێش مارە بڕیندا تەلاق نیە).[4] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ واتە: نابێت تا ماوەیەکی دیاریکراو گیریان بدەن، ئەمە بڕیارێکە کۆی دەنگی لەسەرە لە نێوان زانایاندا، کاتێك ژنێك تەلاق درا پێش چوونە لای ماوەی بۆ دیاری ناکرێت، دەڕوات و لەهەر کاتێکدا بیەوێت شوو دەکات، هیچ کەسێك جیاناکرێتەوە لەوە مەگەر کەسێك مێردەکەی بمرێت، ئەو کاتە چوار مانگو دە

---

[1] الطبري (٢٠/٢٨٣).

[2] الدر المنثور (٥/٣٩٢).

[3] أحمد (٢/٢٠٧)، ابو داود (٢/٦٤٠)، تحفة الأحوذي (٤/٣٥٥)، ابن ماجه (١/٦٦٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] ابن ماجه (١/٦٦٠)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە

ڕۆژ دەمێنێتەوە بە ڕای هەموو زانایان ئەگەر مێردەکەی نەچووبێتە لایشی. وە دەفەرمووێت: ﴿فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا﴾ بەشیپێدان(المتعة) لێرەدا گشتگیرترە لە نیوەی مارەیی ناوبراو یان بەشی تایبەتی ئەگەر دیاری نەکرابوو بۆی. خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾[1] واتە: وە ئەگەر ژنانتان تەڵاق دا پێش ئەوەی بچنە لایانو مارەییتان بۆ دانابوون ئەوە نیوەی مارەییەکەتان دەکەوێت. وە فەرموویەتی: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ﴾[2] واتە: گوناهتان لەسەر نیە ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان یان مارەییتان بۆ دانەنابنو بەهرەمەندیان بکەن (شتێکیان لە ماڵی خۆتان بدەنێ) دەوڵەمەند بە پێی خۆیو هەژار بە پێی خۆی بەهرەو یارمەتی دانێك کە باوو نەریت بێت ئەمە پێویستە لەسەر چاکەکاران. وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە سەهلی کوڕی سەعدو ئەبو ئوسەیدەوە دەڵێن: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئومەیمەی کچی شەراحیلی مارە کرد بردیانە لای دەستی بۆ ڕاکێشا، وەك ئەوەی ئومەیمە پێی ناخۆش بێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە ئوسەید بە ڕێی بکاتو بیگێڕێتەوە دوو پارچە پۆشاکی کەتانی سپی بداتێ.[3] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت)فەرموویەتی: ئەگەر ناوی مارەیی هێنرابێت ئەوە ئەو ژنە جگە لە نیوەی مارەیی زیاتری بۆ نیە، وە ئەگەر ناوی مارەیشی لێ نەبرابێت، ئەوا بەشی ئەدات بە پێی بوونو نەبوونی خۆی، ئەمەیە ئازادکردن بەجوانی[4].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾

---

[1] البقرة (٢٣٧).
[2] البقرة (٢٣٦).
[3] فتح الباري (٩/٢٦٩).
[4] الطبري (٢٠/٢٨٣).

**باسی ئەو ژنانەی کە حەڵاڵ بوون بۆ پێغەمبەر (ﷺ) مارەیان بکات**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّـٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّـٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَـٰلَـٰتِكَ ٱلَّـٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بێگومان ئێمە حەڵاڵمانکرد بۆ تۆ ئەو هاوسەرانەت کە مارەییت پێداون هەروەها ئەو کەنیزەکانەی خوا دەست تۆی خست بەهۆی زاڵ بوونت بەسەر کافراندا و بۆمان حەڵاڵ کردوویت کچانی مامت و کچانی پورت و (خوشکی باوکت) و کچانی خاڵت و کچانی پورت (خوشکی دایکت) ئەوانەی کە کۆچیان کرد لەگەڵت هەروەها ئافرەتێکی ئیماندار ئەگەر خۆی ببەخشێت بە پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ مارەیی (ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ)) ویستی مارەی بکات (ئەمەیان) تەنها بۆ تۆ دروستە بە جیا لە ئیماندارانی تر بە ڕاستی ئێمە دەزانین چیمان پێویست کردووە لەسەر ئیمانداران دەربارەی هاوسەرەکانیان و کەنیزەکەکانیان لەبەر ئەوەی هیچ لە لات زەحمەت و گران نەبێت کە شتانێکت بە جیا لە موسڵمانان بۆ دروستە، وە خوا لێبوردەی میهرەبانە. خوای گەورە ڕووی قسەی دەکاتە پێغەمبەرەکەی و دەفەرموێت: کە ئەو ژنانەی بۆ ڕەوا بینیوە و حەڵاڵ کردووە لە هاوسەرەکانی کە مارەیی پێداون، مەبەست لێرەدا هەق پێدانە وەك موجاهید و کەسانی تریش وتوویانە.[1] مارەیی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دوانزە ئەوقیەو نەشێك بووە نەشیش نیوەی ئەوقیەیەکە، هەمووی دەکاتە پێنج سەد درهەم، ئومو حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان نەبێت کە نەجاشی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەجیاتی پێغەمبەر(ﷺ) مارەیەکی دابوو پێ ی کە چوارسەد دینار بوو، وە سەفیەی کچی حویەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە دیلەکانی خەیبەردا هەڵی بژارد، پاشان ئازادی کرد مارەییەکەی کردە بارتەقای ئازادکردنی، وە جوەیریەی کچی حارسی موستەلقیەش ئەو بڕیارەی نووسرابوو کە بیدات بە سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس پێغەمبەر (ﷺ) بۆی داو مارەی کرد(ڕەزای خوا لە هەموویان). خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ﴾ واتە: ئەوانەشمان بۆ ڕەوا بینیوی کە لە دەستکەوتدا دەستت کەوتوون، سەفیەو جوەیریەی لە دەستکەوتدا بەریکەوت، ئازادی کردن و مارەی کردن لە خۆی، وە هەروەها بووە خاوەنی ڕەیحانەی کچی شەمعونی نەزریە و ماریەی قیبتی دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە

---

[1] الطبري (٢٠/٢٨٣).

ئافرەتە دڵخۆشکراوەکان بوون (ڕەزای خوایان لێ بێت)، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ﴾ ئەمەیش دادپەروەریەکی زۆر بەرێو بەجێیە نە زیادەڕەویەو نە کەموکوڕیشی تێدایە، چونکە گاورەکان ژنی خزمیان مارە نەدەکرد هەتا حەوت پشت نەکەوتایەتە نێوانیان‌و زیاتریش دوور نەکەوتایەتەوە، جولەکەیش کچی براو کچی خوشکیان مارە دەکرد، ئەم ئایینە پاک‌و تەواوە پیرۆزە هات ئەو کەمتەرخەمیەی گاورەکانی ڕووخاندو کچی مام‌و کچی خوشکی مام‌و کچی خاڵ‌و کچی خوشکی خاڵی حەلاڵ کرد، وە ئەوزیادەڕەویەش جوولەکە دەیانکرد، قەدەغەی کرد کە کچی خوشك‌و کچی برایان مارە دەکرد، کە کارێکی زۆر ناشیرین‌و بێزراو بوو، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ﴾ وتەی نێرینەی بە تاك هێناوە لەبەر ڕێزی بەڵام مێینەی بە کۆ هێناوە لەبەر کەم‌و کوڕیان، وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ﴾[1] واتە: بە لای ڕاست‌و چەپیاندا. وە دەفەرموێت: ﴿يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾[2] واتە: دەریان دەهێنن لە تاریکستانی بێباوەڕی بۆ ڕووناکی باوەڕو ڕێنموونی. وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾[3] واتە: وە تاریکیەکان‌و ڕووناکی داناوە. وێنەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا زۆرە. وە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّٰتِي هَاجَرۡنَ مَعَكَ﴾ زەحاك خوێندوویەتیەوە: (واللاتي هاجرن معك).[4] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆت ڕەوایە ژنی خاوەن باوەڕ کە خۆی ببەخشێت پێت مارەی بکەی بەبێ مارەیی ئەگەر مەیلت لێ بێت، ئەم ئایەتە دوو مەرجی تێدایە یەکەم خۆبەخشین لە لایەن ئافرەتەکەوە دووەم ڕەزامەندی پێغەمبەر (ﷺ) وەك ئەم ئایەتەی کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ﴿يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ﴾[5] واتە: ئەی گەلەکەم ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خوا هێناوە ئەوە تەنها پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە فەرمانبەرو ملکەچن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیەوە کە

---

[1] النحل (٤٨).

[2] البقرة (٢٥٧).

[3] الانعام (١).

[4] الطبري (٢٠/٢٨٥).

[5] يونس (٨٤).

پێغەمبەری خودا (ﷺ) ژنێك هاتە لای و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من خۆمم بەخشی بە تۆ، ماوەیەكی زۆر چاوەڕوانی كرد، پاشان پیاوێك هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مارەی بكە لە من ئەگەر خۆت پێویستیت پێی نیە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئایا شتێكت هەیە لەسەری مارەی ببڕی؟) پیاوەكە وتی: ئەم پۆشاكەم نەبێت لە بەرمدایە هیچی ترم نیە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئەو پۆشاكەی بدەیتێ خۆت بەبێ پۆشاك دەمێنی شتێك پەیدا بكە) پیاوەكە وتی: هیچ شك نابەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بگەڕێ با ئەنگوستیلەیەكی ئاسنیش بێت بیكەرە مارەیی بۆی؟) گەڕا هیچی دەست نەكەوت، فەرمووی پێی: (ئایا هیچێك لە قورئانت پێیەو لەبەرتە؟) وتی: بەڵێ فلان سورەت و فلان سورەتم لەبەرە (ئەو سورەتانەی كە لەبەری بوو ناوی بردن)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (لێم مارە بڕیت بەو قورئانەی لەگەڵتە).[1] بوخاری و موسلیم هێناویانە لە فەرموودەكەی مالیكەوە.[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە باوكیەوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەو كەسەی كە خۆی بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ) خەولەی كچی حەكیم بوو.[3] بوخاریش ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: زۆر (غیرە)م دەردەبڕی لەو ژنانەی كە خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ)و دەموت: ئایا ژن خۆی دەبەخشێت؟ كە ئەم ئایەتە هاتە خـوارەوە: ﴿تُرۡجِي مَن تَشَآءُ مِنۡهُنَّ وَتُـٔۡوِيٓ إِلَيۡكَ مَن تَشَآءُۖ وَمَنِ ٱبۡتَغَيۡتَ مِمَّنۡ عَزَلۡتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكَ﴾ وتم: وا دەبینم پەروەردگاری تۆ حەزەكانت خێرا بۆ بەدیئەهێنێ.[4] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت هیچ ژنێك لە لای پێغەمبەر (ﷺ) نەماوەتەوە كە خۆی بەخشیبێت پێی. ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی كردووە.[5] واتە: هیچ ژنێك لەوانەی كە خۆی بەخشیوە، پێغەمبەر (ﷺ) قەبوڵی نەكردووە لێی، هەرچەندە بۆ ئەو ڕەوا بووەو حەڵاڵ تایبەت بووە بە ئەوەوەو خۆی سەرپشك بووە واتە مەیلی خۆی بوو قەبوڵی بكات یان قەبوڵی نەكات. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا﴾ واتە: ئەگەر مەیلی لێ بوو. وە دەفەرمووێت: ﴿خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ عیكریمە دەڵێت: ئەوەی خۆی دەبەخشێت بۆ تۆ نەبێت بۆ كەسی تر نابێت،

---

[1] أحمد (٣٣٦/٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٩٧/٩)، مسلم (١٠٤٠/٢).

[3] البيهقي (٥٥/٧)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٣٨٥/٨).

[5] الطبري (٢٨٨/٢٠).

وە ئەگەر ژنێك خۆی ببەخشێت بۆی حەڵاڵ نیە هەتا شتێکی نەداتێ.[1] موجاهیدو شەعبیو کەسانی تریش جگە لەوانە هەر وای وتووە.[2] واتە: کاتێك ژنێك بە ئارەزووی خۆی، خۆی بەخشی بە پیاوێك هەر کاتێك ئەو پیاوە چووە لای مارەیی هاوێنەی خۆی دەبێت بداتێ، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڕیاری دا بۆبەرووعی کچی واشیق کەوەکیلی دانا بۆخۆی مارەیی هاوێنەی خۆی پێبدرێت، کاتێك کە مێردەکەی مردبوو، مردن یان چوونەلا وەك یەکن بۆ بڕیاردانی مارەییو مارەیی هاوێنە، بۆ ژنێك کە خۆی ببەخشێت بە جگەلەپێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام بۆ هەر ژنێك خۆی ببەخشێت بەپێغەمبەر(ﷺ) مارەیی بۆدانانرێ با بچێتە لاشی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هەیە ئەو ژنە مارە بکات بەبێ مارەییو خاوەن (ولي)و شایەت، وەك لە بەسەرهاتی زەینەبی کچی جەحشدا (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی هەڵسا، بۆیە قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ دەڵێت: هیچ ژنێك بۆی نیە خۆی ببەخشێت بە پیاوێك بەبێ خاوەن(ولي)و مارەیی، جگە لە پێغەمبەر(ﷺ)[3]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾ ئوبەیی کوڕی کەعبو موجاهیدو ئیبنو جەریر دەڵێن لەم ئایەتەدا: یانی ئەوانەی کە ڕێیان نەدراوە لە چوار ژنی ئازاد زیاتربخوازن.[4] وە هەرچەندێك لە کەنیزەکانیان مارە دەکەن ئارەزووی خۆیانە، بە مەرجی بوونی مارەییو شایەتو خاوەن (الولي) بەڵام ڕێی تۆمان داوەو هیچ شتێکمان لەسەر تۆ دانەناوە، ﴿لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾.

﴿تُرْجِى مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِىٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾﴾

[1] الدر المنثور (٦/٦٣١).

[2] الطبري (٢٠/٢٨٦/٢٨٧).

[3] الطبري (٢٠/٢٨٦).

[4] الطبري (٢٠/٢٩٠).

**سەرپشك كردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە قەبولكردنی ئەو ژنانەی كە خۆیان بەخشی پێی یان قەبوڵ نەكردنیان**

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) سەرەی هەر كێ لە خێزانەكانت ویست دوای بخەو هەركێ لەئەوانت ویست پێشی بخەو بیهێنە بۆ لای خۆت‌و هەر كامت بوێ بێتە لات لەوانەی وازت لێ هێناون هیچ گوناهێكت لەسەر نیە، ئەو سەرپشك كردنە نزیكترە كە چاوو دڵیانی پێ گەش بێتەوەو خەفەت نەخۆن‌و هەموویان ڕازی بن بەوەی كە پێت داون‌و خوا دەزانێت بەوەی كە لە دڵتاندایەو خواو خوا زانای لەسەرخۆیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) كە لۆمەو توانجی لەو ژنانە دەدا كە خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەیوت: ئایا ئافرەت شەرم ناكات خۆی دەبەخشێت بەبێ مارەیی؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ڕەوانەكرد: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ عائیشەش عەرزی پێغەمبەریكرد(ﷺ): من وا دەبینم كە پەروەردگارت پەلەت بۆ دەكات لە بەجێهێنانی ئارەزووەكانتدا.[1] لە پێشەوە باسمان كرد كە بوخاریش ڕیوایەتی كردووە.[2] ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دەفەرموێت: ﴿تُرْجِي﴾ كە دوادەخەی ﴿مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ﴾ لەوانەی كە مەیلت لێیە لە خۆبەخشەكان، ﴿وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ﴾ مەیلی خۆتە كامیان قەبوڵ دەكەی‌و كامیان قەبوڵ ناكەی. ئەوانەیشی كە قەبوڵیان ناكەی دەتوانی جارێكی تر بانگیان بكەیتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ﴾ هەندێكی تر وتوویانە مەبەستی بەمە كە فەرموویەتی: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ﴾ واتە: لە هاوسەرەكانت، هیچ گوناهێكت نایەتە سەر هەندێكیان واز لێ بێنیت‌و هەندێكیان پێش بخەی هەندێكیان دوا بخەی یان بچیتە لای هەندێكیان‌و نەچیتە لای هەندێكیان كەیفی خۆتە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو حەسەن‌و قەتادەو ئەبو ڕەزین‌و عەبدوڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم‌و كەسانی تریشەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا پێغەمبەر (ﷺ) هەر مانەوەی لە نێوانیاندا دابەش دەكرد، بۆیە هەندێ لە زانایانی فیقهی شافیعی‌و كەسانی تریش ڕایان وایە كە ئەو دابەشكردنی كاتە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) واجب

---

[1] أحمد (٦/١٥٨)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٨/٣٨٥).

نەبووە، ئەم ئایەتە پیرۆزەیان کردووەتە بەڵگە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێـت) کـە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) لەسـەرەی هـەر ژنێکـدا لـە ئێمـە داوای ئیزنـی دەکـرد پـاش هاتنەخوارەوەی ئـەم ئایەتـە: ﴿تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ﴾ دەڵێت: وتم بە عائیشە: تۆ چیت بەپێغەمبەر(ﷺ) دەوت؟ ووتـی: منـیش دەمـوت: ئەگـەر ئەوە بەدەستی منە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) مـن نامـەوێت ڕێـزی کـەس بدەم بەسـەر تـۆدا.[1] ئـەم فەرموودەیە لە عائیشەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست پێی واجب نـەبوونی ئـەو سـەرەیە، بـەڵام فـەرموودەی یەکـەم ئـەوە دەگەیـەنێت کـە ئـەم ئایەتـە هاتووەتـە خـوارەوە بـۆ ئەوانـەی کـە خۆیـان بەخشیوە، ئا لێرەدا ئیبنو جەریر وای بۆ دەچێت کە ئەم ئایەتە گشتگیرە بـۆ ئـەو ژنانـەی کـە خۆیـان بەخشیوەو ئەوانەشی کە هاوسەری پێغەمبەر بوون (ﷺ) کە مەیلی خۆیەتی سـەرەیان بـۆ دابنـێ یـان سەرەیان بۆ دانەنێت.[2] ئا ئەوەی کە حەسەن هـەڵی بژاردووە زۆر چاکو باشو بـەهێزە. نزیکیـەك لـە نێوان فەرموودەکاندا دروست دەکات. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ﴾ واتە: کاتێـك زانیـان کـە خـوای مـەزن هـیچ گوناهـت لەسـەر نانوسێت، ئەگەر مەیلت لێ بوو سەرەیان بۆ دادەنێیتو مەیلیشت لێ نەبوو سەرەیان بۆ دانانێت، کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هەر سەرەیان بۆ دادەنێیت بە ئارەزووی خۆت نەك لەسەرت واجب بێت، کەیف خـۆش دەبن بەوە غەم ناخۆنو پێیان خۆشە. ئەو کارە جوانەی تۆ وایان لێ دەکات کە مەمنونت بـبن بـۆ ئـەو بەش کردنە لە نێوانیاندا بە یەکسانیو بێ جیاوازیو بەو دادپەروەریەی تۆ بەرامبەریان. پاشـان خـوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾ واتە: خودا دەزانێـت ئێـوە چیتـان بـە دڵـدا دێـت کـە مەیلتان بۆ لای هەندێك هەیەو بۆ لای هەندێ نیە کە ناتوانرێت لاببرێت، وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایـەتی کردووە لە عائیشەوە دەڵێت: پێغەمبەری خـودا (ﷺ) سـەرەی دادەنـا لـە نێـوان ژنەکانیـداو جیـاوازی نـەدەکردن، پاشـان دەیفـەرموو: (ئـەی خودایـە ئەمـە کـاری منـە کـە دەسـەڵاتم بەسـەریدا هەیـە، سەرزەنشتو لۆمەم نەکەی لەوەی کە تۆ دەسەڵاتت بەسەریدا هەیەو مـن دەسـەڵاتم نیـە بەسـەریدا).[3] چوار لە زانایانی فـەرموودە ئـەم فـەرموودەیان ڕیوایـەت کـردووە، ئـەبو داود لـە کۆتـایی دا ئەمـەی لێ زیـادکردووە: (سەرزەنـشتم نەکـەی لـەوەی کـە تـۆ دەسـەڵاتت بەسـەریدا هەیـەو مـن دەسـەڵاتم نیـە

---

[1] فتح الباري (٨/٣٨٥).

[2] الطبري (٢٠/٣٠٤).

[3] أحمد (٦/١٤٤)، فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

بەسەریدا) مەبەست پێی دڵە.[١] سەنەدەکانی ڕاستە، پیاوەکانیشی جێی باوەڕن، بۆیە خوای مەزن بەدوای ئەوەدا فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا﴾ واتە: خوا دەزانێت ئێوە چیتان لە دڵدایە لە پەنهانیەکان، ﴿حَلِيمًا﴾ واتە: خودا لەسەرخۆیەو دەبورێت.

﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا ﴿٥٢﴾﴾

**پاداشتدانەوەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەرهەڵبژاردنیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ حُسۡنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ يَمِينُكَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ رَّقِيبٗا﴾ واتە: دوای ئەمانە کە هاوسەرتن هیچ ئافرەتێکت بۆ حەڵاڵ نیەو ناشتوانی بیانگۆڕی بە هاوسەرانی تر مەگەر وەك کەنیزەك ببیتە خاوەنیو خوا بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە. زۆرێك لە زانایان باسیان کردووە وەك ئیبنو عەباسو موجاهیدو زەححاكو قەتادەو ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریرو کەسانی تریش.[٢] کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پاداشتدانەوەو ڕەزادەربڕین لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەو کارە چاکەیان کە خوداو پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ڕۆژی دواییان هەڵبژارد وەك لە ئایەتەکەی پێشودا باس کرا، کاتێك ئەوان کە پێغەمبەریان (ﷺ) هەڵبژارد پاداشتەکەیان ئەوە بوو، خوای مەزن فەرمانی دا کە ژنانی تر بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ناشێتو بۆشی نیە ئەو ژنانە تەڵاق بداتو ژنانی تر لە جێیان بێنێت، با زۆر جوانو دڵگیریش بن مەگەر ئەوانەی لەدەسکەوت بەری دەکەوێت، بەڵام بۆ ئەوانە هیچی لەسەر نیە، پاشان خوای گەورە ئەوەشی لەسەر لابردو حوکمی ئەو ئایەتەی نەسخ کردەوەو ڕێی پێدا ژن بێنێت، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ژنی نەهێنا، بۆ ئەوەی ئەو منەتەی بەسەر هاوسەرەکانیەوە هەر بمێنێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی نەکرد هەتا خوای مەزن ژنی بۆ ڕەوا بینیو حەڵاڵی کرد کە بێنێتی.[٣] تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە لە سونەنەکەیاندا.[٤] هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: مەبەست بە مانای ئەم ئایەتە: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعۡدُ﴾ ئەوەیە کە پاش ئەوەی کە باسو وەسفی ئەو ژنانەمان کرد کە بۆمان

---

[١] ابوداود(٢/٦٠١)، تحفة ألأحوزي (٤/٢٩٤)، النسائي (٧/٦٣)، ابن ماجه (١/٦٣٣)، فەرموودەیەکی بەهێزنیە.

[٢] الطبري (٢٠/٢٩٧/٢٩٩).

[٣] أحمد (٦/٤١)، فەرموودەیەکی مەوقوفە.

[٤] تحفة ألأحوزي (٩/٧٨)، النسائي (٦/٥٦)، فەرموودەیەکی مەوقوفە.

حەڵاڵ کردی لە ژنەکانت ئەوانەی کە مارەییت پێداون و ئەوانەشی کە بە دەستکەوت بەرت کەوتوون و کچی مام و کچی خوشکی مام و کچی خاڵ و کچی خوشکی خاڵ و ئەوانەشی کە خۆیان بەخشی پێت، جگە لەمانە ژنی ترت بۆ حەڵاڵ نیە. ئەم بۆچوونە ڕیوایەت کراوە لە ئوبەیی کوڕی کەعب و موجاهید و کەسانی تریشەوە. تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) نەهی کردووە لەو جۆرە ژنانە، ئەو ژنە خاوەنباوەڕانە نەبێت کە کۆچیان کــــردووە، وەك فەرموویـــەتی: ﴿لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ﴾ خوا ژنە خاوەن باوەڕەکانی حەڵاڵ کردووە لەگەڵ ئەوانەی کە خۆیان بەخشیوە بە پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ئەو ژنانەی کە لەسەر ئایینەکانی ترن حەرامی کردووە جگە لە ئایینی ئیسلام. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾[1] واتە: وە ئەوانەی بێباوەڕ بن بە ئیمان و شەریعەت ئەوە بێگومان کردەوەکانی هەڵدەوەشێتەوە.[2] ئیبنو جەریر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە کە دەڵێت ئەم ئایەتە گشتگیرە بۆ ئەو کۆمەڵە ژنانەی کە باس کران و ئەو ژنانەی کە هاوسەری پێغەمبەر بوون (ﷺ) کە نۆ ژن بوون. ئەم قسەیەش قسەیەکی چاکە و لەوانەیە ڕای زۆرێك لە زانایانی پێشینەش بێت چونکە زۆرێك لە زانایان ئەم ڕیوایەتە و ئەو ڕیوایەتەشیان لێوەکراوە و هیچ دژایەتیەك نیە لەنێوانیاندا (والله أعلم) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ﴾ خوای مەزن ڕێی نەداوە بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر یەکێك لەو ژنانەی تەڵاق دا ژنێکی تر لە جێی بهێنێت، ئەو ژنانە نەبێت کەئەبنە(مەڵی یەمین)ی.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِىِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾﴾

---

[1] المائدة (٥).

[2] تحفة الأحوذي (٩/٧٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

**ئاداب و شێوازی چوونە ناو ماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمان دان بە پەردە گێڕانەوە**

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتـان هێنـاوە مەچنە ژوورەوە بـۆ ماڵـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) مەگـەر ڕێگـەتان پـێ بدرێت بـۆ نـان خواردنێك بـێ ئـەوەی چاوەڕوانی پێگەیشتنی بکەن بەڵام ئەگەر بانگ کران بۆ نان خواردن ئەوسا بڕۆنە ژوورەوە ئینجا ئەگەر خواردنەکـەتان خـوارد بـڵاوەی لێ بکـەن و مەمێننـەوە بـۆ قـسەکردن چـونکە ئـەو مانـەوەتان ئـازاری پێغەمبەر (ﷺ) دەدات ئەویش شەرم دەکات لێتان کە بێ دەنگە بەڵام خوا لە وتنی هەق شەرم ناکـات وە هـەر کاتێك داوای شـتێکی نـاو ماڵتـان کـرد لـە (هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)) ئـەوە لـە پـشتی پەردەوە لێیان داوا بکەن، ئەو شێوە داواکردنەتان خاوێنترە بۆ دڵی ئێوە و ئەوانیش بە هیچ شـێوەیەك بۆ ئێوە دروست نیە ئازاری دڵی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بدەن وە هەرگیز نابێت خێزانەکانی پاش خـۆی مارە بکەن بە ڕاستی ئەو (ئازاردانی دڵ و مارەکردنە)تان بـە لای خـواوە گونـاهێکی زۆر گەورەیـە. ئـەم ئایەتی پەردە گێڕانەوەیە کـە بڕیـار و ئـادابی شـەرعی تێدایـە، ئـەو ئایەتەیـە کـە هاتنـە خوارەوەکـەی هاوئاهـەنگ بـوو لەگـەڵ قـسەی عومـەری کـوڕی خەتابـداو (ڕەزای خـوای لێ بێـت) وەك لـە هـەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە عومەر وتی: موافیق و هاوڕا بووم لەگەڵ پەروەردگارمدا لە سێ شتدا: وتم ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەگەر جێی ئیبراهیمت بکردایەتـە نوێژگـە، خـوای مـەزن ئـەم ئایەتـەی نـاردە خوارەوە: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗى﴾[1] واتە: (پێمان وتن) شوێنی ئیبراهیم بکەنـە جێگـای نوێـژ. وە وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خێزانەکانت پیاوچاك و پیاوخراپ دەچنە لایان ئەگەر پەردەیەکت بۆ دانانایە، خوای مەزن ئایەتی پەردە گێڕانەوەی (حیجاب) ناردە خوارەوە. وە وتم: بە هاوسـەرەکانی پێغەمبەر (ﷺ)کە بەرامبەری وەستان: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ﴾[2] واتـە: دڵنیـا بن ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات پەروەردگاری لە جیاتی ئێوە ژنانێکی باشتر لـە ئێـوەی دەداتـێ. هـەر بـە

[1] البقرة (١٢٥).

[2] التحريم (٥).

هەمان شێوە قورئان هاتە خوارەوە.[١] وە لە ڕیوایەتی موسلیمدا کە باسی دیلەکانی بەدری کردووە ئەمەیش ڕووداوی چوارەمە.[٢] وە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چاکو خراپ دێتە لات، ئەگەر فەرمانت بدایە بە دایکانی موسڵمانان بە پەردە گیرانەوە! خوای مەزن ئایەتی حیجابی ڕەوانە کرد.[٣] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) زەینەبی کچی جەحشی هێنا بانگی خەڵکی کرد نانیان خوارد، پاشان دانیشتن قسەیان دەکرد، کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئامادە کرد هەڵسێت ئەوان هەڵنەسان، کاتێك ئەوەی بینی هەڵساو ئەوەی هەڵسا هەڵساو سێ کەس هەڵنەسان، پێغەمبەر (ﷺ) هات بچێتە ژوورەوە، خەڵکەکە هەر دانیشتبوون، پاشان خەڵکەکە هەڵسانو ڕۆیشتن. منیش هاتمو هەواڵم دا بە پێغەمبەر (ﷺ) کە خەڵکەکە ڕۆیشتن هاتو چووە ژوورەوە. منیش ڕۆیشتم بچمە ژوورەوە. پەردەی لە نێوان منو خۆیدا گیرایەوەو خوای مەزن ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە.[٤] وە لە شوێنێکی تریشدا ڕیوایەتی کردووە.[٥] موسلیمو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە.[٦] پاشانیش بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) (زەینەبی گواستەوە) چووە لای زەینەبی کچی جەحش نانو گۆشتی دا بە خەڵك، منیان نارد خەڵکی بانگ بکەم بۆ سەر نان خواردن، کۆمەڵێك دەهاتنو نانیان دەخواردو دەچوونە دەرەوە، کۆمەڵێکی تر پاشان دەهاتنو نانیان دەخواردو دەچوونە دەرەوە، ئەوەندەم بانگ کرد هەتا کەسێك نەما کە بانگی بکەم، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کەسێك نەماوە بانگی بکەم، فەرمووی: خواردنەکەتان هەڵگرن سێ کۆمەڵ مابوونەوە لە ماڵدا قسەیاندەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوە ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: (السلام عليكم -أهل البيت- ورحمة الله وبركاته) عائیشە وتی: وعليك السلام ورحمة الله، ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەهلەکەت بە لاوە چۆن بوو؟ خودا لێت پیرۆز بکات (بارك الله لك)، پاشان هەموو خێزانەکانی بەسەر کردەوە چی دەوت بە عائیشە بەوانیشی وت، ئەوانیش عائیشە چی بە پێغەمبەر (ﷺ) وت ئەوانیش هەر وایان وت. پاشان

---

[١] فتح الباري (١/٦٠١)، مسلم (٤/١٨٦٥).

[٢] مسلم (٤/١٨٦٥).

[٣] فتح الباري (٨/٣٨٧).

[٤] فتح الباري (٨/٣٨٧).

[٥] فتح الباري (١١/٢٤).

[٦] مسلم (٢/١٠٥٠)، النسائي في الكبرى (٦/٤٣٥).

پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە، ئەو سێ کۆمەڵە هەر قسەیان دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بە شەرم بوو، چووە دەرەوەو بەرەو ژوورەکەی عائیشە ڕۆیشت. نازانمو لە یادم نیە من هەواڵم دایە یان هەواڵیان دایە کە ئەو خەڵکە چوونە دەرەوە، گەڕایەوە هەتا پێیەکی خستە سەر کەمەی دەرگاکە بچێتە ژوورەوەو پێکەی تری لە دەرەوە بوو پەردەی داناو شۆڕیکردەوە لە نێوان منو خۆیداو ئایەتی پەردەگێڕانەوە هاتەخوارەوە.[1] تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە نێوان خاوەنی شەش کتێبەکە جگە لە نەسائی کە ئەویش باسی کردووە.[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ﴾ قەدەغەی کرد لەسەر خاوەنباوەڕان کە بچنە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیزنی خۆی نەبێت. وەك ئەو سەردەمەی زەمانی نەفامیو لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا دەچوونە ماڵی یەکتری، خوای مەزن توندی کرد لەسەر ئەم ئوممەتەو فەرمانی پێکردن بە پەردە گێڕانەوە. ئەمەش لەبەر ڕێزگرتن بۆ ئەم ئوممەتە. هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (دەتانترسێنم لە چونتان بۆ ناو ژنان).[3] پاشان مەرجی داناوە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ﴾ موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە: چاوەڕوانی نەکەن هەتا دەکوڵێتو پێدەگات.[4] واتە: نەوەستن بە دیار خواردنەکەوە هەتا پێدەگاتو کاتێك ئامادەکرا خۆتان بکەن بە ژووردا، چونکە ئەمە کارێکی خراپەو خودا پێی ناخۆشە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە حەرامە چوون بۆ سەر دەعوەتێك کە بانگ نەکرابێت، خەتیبی بەغدادی لەو بارەیەوە کتێبێکی داناوە باسی خراپی ئەو کەسانەی کردووە بەبێ ئەوەی بانگ بکرێن بۆ سەر دەعوەتێك لە خۆیانەوە دەچن بۆ ئەو دەعوەتە. بە درێژی هەندێ ڕووداوی لەو بارەوە گێڕاوەتەوەو باسی کردووە لە کتێبەکەیدا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ﴾ وە لە سەحیحی موسلیمدا لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێك یەکێکتان برایەکی بانگی کرد بۆ نان خواردن بۆ شایی یان هەر شتێك با قەبوڵی بکات).[5] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾ واتە: وەك ئەوەی کە ڕوویدا لەو سێ کەسەو درێژەیان دا بە قسەکردن، خۆیان لەبیرچووەوە هەتا

[1] فتح الباري (٨/٣٨٨).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٧٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (٤/١٧١١).

[4] الطبري (٢٠/٣٠٦).

[5] مسلم (٢/١٠٥٣).

پێغەمبەریان (ﷺ) نارەحەت کرد، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ﴾ وتراوە: مەبەست پێی، چوونتانە بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ ئەوەی ئیزنی لێ بخوازن، کە پێی ناخۆش بووەو دڵگرانی کردووە بەڵام حەزی نەکردووە ڕێگریان لێ بکات لەبەر زۆر بە شەرمی خۆی تا خوای گەورە قورئانی ناردە خوارەوەو قەدەغەی کرد لێیان، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ﴾ واتە: خودا لە قسەی ڕاست وتن شەرم ناکاتو سەرزەنشتی کردنو وانی پێ هێنان. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ﴾ واتە: وەك چۆن قەدەغەم کرد لێتان کە بەبێ ئیزن نەچنە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) هەر بە هەمان شێوە هەرگیز سەیری هاوسەرەکانی مەکەن، با یەکێك لە ئێوە کارێکی زۆر گرنگیشی هەبێت، بیەوێت لێیان وەرگرێت، لە پشت پەردەوە نەبێت داوایان لێ نەکات.

## قەدەغەکردنی ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ)و باسی ڕێزی تایبەتی هاوسەرەکانی لە لای موسڵمانان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا﴾ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ﴾ دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پیاوێك نیازی وابوو دوای پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ لە خێزانەکانی مارە بکات. پیاوێك وتی بە ئەبو سوفیان: ئایا ئەوە عائیشە بوو؟ پیاوەکە وتی: وایان باس کردووە.[1] موقاتیلی کوڕی حەییانو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمیش هەر وایان وتووە.[2] هەر بەو سەنەدەوە باس کراوە لە سودیەوە کە حەرامەو نابێت بیر لە شتی وا بکەنەوە. بۆیە هەموو زانایان بە گشتی کۆن لەسەر ئەوە کە دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) حەرامەو کەس بۆی نیە دوای خۆی هاوسەرەکانی مارە بکات. چونکە ئەوانە لە دنیا قیامەتدا هاوسەری پێغەمبەرنو (ﷺ) دایکی موسڵمانانن وەك لە پێشەوە باسمان کرد. خوای گەورە ئەو نیازەی زۆر بە لاوە گەورەو گران بوو، بۆیە بە توندی هەڕەشەی کردووە لەسەری. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِن تُبْدُوا شَيْئًا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ واتە: ئەگەر هەر شتێك ئاشکرا بکەنو بیڵێن یان بیشارنەوە لە دڵتاندا ئەوە بە ڕاستی خوا

---

[1] الدر المنثور (٦/٦٤٣).

[2] الطبري (٢٠/٣١٦).

زانایە بە هەموو شتێك. وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾[1] واتە: خوا دەزانێت بە ناپاكی چاوانو هەرچی دڵان دەیشارنەوە.

﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ ۗ وَاتَّقِينَ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا (٥٥)﴾

## ئەو كەسانەی كەواجیب نیە ژن ڕوپۆشی بۆ بكات لە كەسو كار

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ ۗ وَاتَّقِينَ اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ واتە: (هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ)) هیچ گوناهێكیان لەسـەر نیـە ئەگـەر بـێ حیجـاب بـن لای باوكیـانو كوڕانیـانو برایـانو برازاكانیـانو خوشـكەزاكانیانو لای ئافرەتـانی هاودینیـانو لای غـولامو كـەنیزانی خۆیانو لە خوا بترسن بە ڕاستی خوا چاودێرو ئاگادارە بەسـەر هـەموو شـتێكدا. كاتێـك خـودای مـەزن فەرمانی بە ڕوپۆشین كرد لە بێگانە پاشان ڕوونـی كردووەتـەوە كە ئـەم كـەسو كارانـە پێویست نیـە ڕوپۆشیان بۆ بپۆشن وەك لە سورەتی (النور)دا جیای كردوونەتەوە لەم ئایەتەدا كە خوا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ﴾[2] واتە: وە جوانی خۆیان دەرنەخەن زیاد لـەوەی كە دەردەكەوێت بۆ مێردەكانیان نەبێت یان باوكیان یان باوكی مێردەكانیان یـان كوڕەكانیـان یـان كـوڕی مێردەكانیان یان براكانیان یان كوڕی براكانیان یان كوڕی خوشكەكانیان یـان ئافرەتـانی ئیمانـدار یـان كەنیزەكەكانیان یان ئـەو شـوێنەكەوتەو پیاوانـەی كە بـێ نیـازن لـە ئـافرەت (وەك خزمـەتكارو پـیرو نەخۆش كە ئارەزووی ژنو مێردایەتیان نیە)، یان ئەو منداڵە كوڕانەی كە ئاگایان لە لەش (عـەورەت)ی ئافرەتان نەبێتو باڵغ نـەبووبن. ئـەم ئایەتـەی سـورەتی (النـور) زیـاتری بـاس كـردووە لـەم ئایەتـەی سورەتی (الاحزاب) لـە پێـشەوە مانامـان كـردو لەسـەری ڕۆیـشتین پێویـست ناكـات لێرەدا دووبارەی بكەینەوە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كـردووە لـە شـەعبیو عیكریمـەوە لـەم ئایەتـەدا: ﴿لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي

---

[1] الغافر (١٩).

[2] النور (٣١).

ءَابَآبِهِنَّ﴾ هەندێ لە پێشینەکان وتوویانە: لەبەرچی مامو خاڵ باس نەکراوە؟ شەعبیو عیکریمە دەڵێن: چونکە خاڵو مام وەسفیان دەکەن بۆ کوڕەکانیان، بۆیە(شەعبی وعەکریمە) لایان مەکروهە کەژن پۆشاك لەسەر خۆی لابەرێت لە لای مامو خاڵدا.[1] وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا نِسَآبِهِنَّ﴾ مەبەست پێی ڕوودانەپۆشینە لە لای ژنانی موسڵمان، ﴿وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَنُهُنَّ﴾ مەبەست پێی کەنیزەکە، سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: تەنها مەبەست پێی کەنیزەکە، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدًا﴾ واتە: لە کاتی تەنهاییو ئاشکرادا لە خوا بترسن چونکە خودا شایەتە لەسەر هەموو شتێك، هیچی لێ ون نابێت، چاودێرەو ئاگای لێیانە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓبِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾

**فەرمان دان بە سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓبِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾ واتە: بەڕاستی خواو فریشتەکانی سەلاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوەش سەلاتو سەلامی زۆری لەسەر بدەن. بوخاری دەڵێت: ئەبولعالیە دەڵێت: (صلاة الله) واتە پەسەنیدانی خودا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە لای فریشتەکان. پەسەنی فریشتەکانی واتە: دوعابۆ کردن، ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿يُصَلُّونَ﴾ واتە: داوای بەرەکەتی بۆ دەکەن.[2] بوخاریش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە لێیان. تیرمیزی دەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە سوفیانی سەوریو هەندێ لە زانایانی تریشەوە وتوویانە: پەسەنی خوا، واتە: بەزەیی خودا، پەسەنی فریشتەیش واتە: داوای لێبوردن بۆ کردن.[3] فەرموودەی موتەواتر لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە فەرمانی داوە بە موسڵمانان سڵاواتی لەسەر بدەنو چۆنیەتی سڵاواتەکەشی فێرکردوونو ئێمەیش هەرچەندە خوا بۆمان ئاسان بکات بە یارمەتی خوا بۆتان باس دەکەین. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە کەعبی کوڕی عوجرەوە (عُجْرَة) دەڵێت: وترا: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە بارەی سەلام کردنەوە ئاگاداری بووین، ئەی سەلاوات دان چۆنە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بڵێن: اللهمّ، صَلِّ على محمد وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم، إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ،

---

[1] الطبري (٢٠/٣١٨).

[2] فتح الباري (٨/٣٩٢).

[3] تحفة الأحوذي (٢/٦١٠).

اللهمّ، بارِك على محمد وعلى آل محمد كما باركتَ على آل إبراهيم، إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ).[1] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو لەیلاوە دەڵێت: کەعبی کوڕی عوجرە پێی گەیشت و وتی: ئایا دیاریەکت پێشکەش بکەم؟ پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتە دەرەوە بۆ لامان وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) زانیمان چۆن سەلامت لێ بکەین، ئەی چۆن سەڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: (بڵێن: اللهمّ، صَلِّ على محمّدٍ وعلى آل محمدٍ كما صليت على آل إبراهيم، إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ، اللهمّ، بارِك على محمد وعلى آل محمد كما باركتَ على آل إبراهيم، إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ).[2] ئەم فەرموودەیە زانایانی فەرموودە لە کتێبەکانیاندا هێناویانە بە چەند ڕێگای جۆراوجۆر. فەرموودەیەکی تر: بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەمە شێوەی سەلام کردنە لێت، ئەی چۆن سڵاوات بدەین لەسەرت؟ فەرمووی: (بڵێن: اللهمّ، صَلِّ على محمد عَبدِكَ ورَسولِك، كما صلّيت على آل إبراهيم، وبارِك على محمد وعلى آل محمد كما باركتَ على آل إبراهيم) ئەبو سالح دەڵێت لە لەیسەوە: (اللهمّ صَلِّ على محمد وعلى آل محمدٍ كما باركتَ على آل إبراهيم). ئیبراهیم بۆی گێڕاینەوە لە حەمزەوە، ئیبنو ئەبی حازم و دەراوەردی بۆیان گێڕاینەوە لە زەیدەوە (واتە ئیبنولهادی) دەڵێت: (كما صليت على إبراهيم، وبارِك على محمد وعلى آل محمد كما باركتَ على إبراهيم آل إبراهيم).[3] نەسائی و ئیبنو ماجەیش هێناویانە.[4] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو حومەیدی ساعیدیەوە کە وتوویانە: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بڵێن: ئەی خودایە بەزەیی خۆت بڕێژە بەسەر موحەممەد (ﷺ) و هاوسەرەکانی و نەوەکانیدا، وەك چۆن بەزەیی خۆت ڕێژاوە بەسەر ئیبراهیمدا، وە خێروبەرەکەت بڕێژە بەسەر موحەممە (ﷺ) و هاوسەرەکانی و نەوەکانی وەك چۆن خێروبەرەکەتی خۆت ڕێژاوە بەسەر ئالی ئیبراهیمدا، تۆ زۆر سوپاسکراوو بەڕێزی).[5] زانایانی فەرموودە هەموو هێناویانە جگە لە تیرمیزی.[6] فەرموودەیەکی تر: موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو مەسعودی ئەنساریەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) هات بۆ لامان، ئێمە لە لای سەعدی کوڕی عوبادەدا دانیشتبووین، بەشیری کوڕی سەعد پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، خودا فەرمانی پێکردووین

---

[1] فتح الباري (٣٩٢/٨).

[2] أحمد (٢٤١/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٣٩٢/٨).

[4] النسائي (٤٩/٣)، ابن ماجه (٢٩٢/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] أحمد (٤٢٤/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] فتح الباري (١٥٧/١١)، مسلم (٣٠٦/١)، أبو داود (٦٠٠/١)، النسائي (٤٩/٣)، ابن ماجه (٢٩٣/١).

که سڵاواتت لەسەر لێ بدەین، چۆن سڵاواتت لەسەر بدەین؟ وتی: پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو هەتا ئاواتەخواز بووین کە ئەو پرسیارەی نەکردایە، پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بڵێن: اللهمّ، صَلِّ على محمد وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم، وبارِك على محمد وعلى آل محمد كما باركتَ على آل إبراهيم، في العالمين، إنَّكَ حميدٌ مجيدٌ، والسلام كما قد عُلِّمتُم).[1] واتە: سەلام کردنیش وەك ئەوەیە کە ئەیزانن ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی (حسن صحيح)ە[2].

## سڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) پێش پاڕانەوە

ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیببان ڕیوایەتیان کردووە لە فەزالەی کوڕی عوبەیدەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) گوێی لێ بوو پیاوێك دەپاڕایەوە لە نوێژەکەیدا سوپاسی خودای نەکردو سڵاواتیشی لەسەر پێغەمبەر نەدا (ﷺ)، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە پەلەی کرد)، پاشان بانگی کردو پێی فەرموو: یان بە غەیری ئەوی فەرموو: (ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد بابە سوپاسو ستایشی خوا دەست پێ بکات، پاشان سڵاوات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات، پاشان دوای ئەوە چۆن حەز دەکات بپاڕێتەوەو دوعا بکات)[3].

## ڕێزی سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)

دیسان تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێك سێیەکی شەو دەڕۆیشت هەڵدەساو ئەیفەرموو: (ئەی خەڵکینە! یادی خوا بکەن، یادی خوا بکەن، زەمین لەرزینەکە هاتو لەرزینەکەی تریشی بەدوادا دێت، مردن هات هاوڕێ لەگەڵ ئەوەی کە تیایەتی، مردن هات هاوڕێ لەگەڵ ئەوەی کە تیایەتی). ئوبەی دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) من زۆر دوعائەکەم، ئایا چەندێك لەو دوعانەدابنێم بۆ سڵاوتدان لەسەرت:فەرمووی: (چەند مەیلت لێیەتی)، وتم: چواریەك باشە؟ فەرمووی: (چەندە مەیلت لێیەتی، ئەگەر زیاترت کرد، ئەوە باشترە بۆت)، وتم: نیوە باشە؟ فەرمووی: (چەندە مەیلت لێیەتی، ئەگەر زیاترت کرد، ئەوە چاکترە بۆت)، وتم: دوو سێ یەك؟ فەرمووی: (چەندێ مەیلت لێیەتی، ئەگەر زیاترت کرد ئەوە باشترە بۆت) وتم: هەموو دوعاکانم سڵاوات بێت لەسەر تۆ. فەرمووی: (کەواتە غەمباریت لێ دوور ئەخرێتەوەو گوناهەکانیشت بۆ

---

[1] مسلم (١/٣-٥).

[2] أبو داود (١/٦٠٠)، تحفة الأحوذي (٩/٨٤)، النسائي في الكبرى (٦/٤٣٦)، الطبري (٢٠/٣٢١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٦/١٨)، أبو داود (٢/١٦٢)، تحفة الأحوذي (٩/٤٥٠)، النسائي (٣/٤٤)، ابن خزيمة (١/٣٥١)، ابن حبان (٣/٣٠٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەسرِێتەوە)، پاشان تیرمیزی دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی چاکە (حدیث حسن).[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو تەلحەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێك هاتو خۆشی لە نێوچاوانیدا بەدی دەکرا. وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئێمە خۆشی لەنێو چاوانتدا بەدی دەکەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە فریشتە هاتە لام وتی: ئەی موحەممەد ئایا ڕازیت دەکات کە پەروەردگاری مەزنت دەفەرموێت بەڕاستی هیچ کەسێك نیە سەڵاوات بدات لەسەرت لە ئومەتەکەت مەگین من (دە) سەڵاواتم داوە لەسەری، وە هیچ کەسێك نیە لە ئومەتەکەت سەلامت لێ بکات مەگین من دە سەلامم لێ کردووە، وتم: بەڵێ).[2] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە.[3] ڕێگایەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو تەلحەی ئەنسارییەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێك بەیانی کردەوە دڵی خۆش بوو مزگێنی لەنێو چاوانیدا بەدی دەکرا. وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەمڕۆ بەیانیت کردووەتەوە دڵخۆش‌و مزگێنی لەنێو چاوانتدا بەدی دەکرێت، فەرمووی: (بەڵێ نێردراوێك هات بۆ لام لە لایەن پەروەردگاری مەزنەوە وتی: کەسێك لە ئومەتەکەت یەك سەڵاواتی دابێت لەسەرت، خوا بە ئەو سەڵاواتە (دە) چاکەی بۆ نووسیوەو (دە) خراپەی لەسەر سڕیوەتەوەو (دە) پلەی بۆ بەرزکردووەتەوەو وەك خۆشی وەڵامی داوەتەوە).[4] ئەم فەرموودەیەش سەنەدەکانی چاکە. بەڵام زانایانی تری فەرموودە نەیانهێناوە. فەرموودەیەکی تر: موسلیم‌و ئەبو داودو تیرمیزی‌و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك یەك سەڵاوات بدات لەسەر من خوای گەورە دە سەڵاوات دەدات لەسەری)، تیرمیزی دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی چاکی ڕاستەو هەر لەم بارەیەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف‌و عامری کوڕی ڕەبیعەو عەممارو ئەبو تەلحەو ئەنەس‌و ئوبەیی کوڕی کەعبەوە ڕیوایەت کراوە.[5] فەرموودەیەکی تر: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوسەینی کوڕی عەلیەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ڕژدو بەخیل ئەو کەسەیە کە باسی منی لە لا کرا پاشان سەڵاواتم

---

[1] تحفة الأحوذي (١٥٢/٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە،ئیبن تەیمیە ئەفەرموێ:مەبەست بە(صلاتی) بریتیەلە(دعائی)چونکەئوبەی دوعایەکی تایبەتی هەبووە بۆخۆیی کردووەو ڕۆژێکیان ئەوپرسیارە ئەکات ..سەیری(جلاوالانهام)ی ئیبنولقەیمی قەتابی بکە(ص٧٩).(وەرگێڕ).

[2] أحمد (٣٠/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] النسائي (٤٤/٣)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] أحمد (٢٩/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] مسلم (٣٠٦/١)، أبو داود (١٨٤/٢)، تحفة الأحوذي (٦/٢-٨)، النسائي (٥٠/٣).

لەسەر نەدات)، ئەبو سەعید دەڵێت: فەرموویەتی: (سڵاواتم لەسەر نەدا).[1] تیرمیزی ڕیوایەتی كردووە پاشان دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەكی چاكی غەریبی ڕاستە.[2] فەرموودەیەكی تر: تیرمیزی ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (داماو لوتی خۆڵاوی بووە پیاوێك كە یادی منی لە لا بكرێتو سەڵاواتم لەسەر نەدات، زەلیلەو لوتی خۆڵاوی بووە پیاوێك مانگی ڕەمەزانی بەسەردا تێپەڕێتو بڕوات، زەلیلو لوتی بە خۆڵا چووە كەسێك كە باوكو دایكی بە ساڵا چووبنو نەیانخستبێتە بەهەشت). پاشان وتی: فەرموودەیەكی حەسەنی سەحیحە[3].

## كاتەكانی سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)

فەرمان دراوە بە سەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە زۆر كاتو شوێندا، لەو كاتانە: دوای بانگدان بۆ نوێژ وەك ئەم فەرموودەی كە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵای كوڕی عەمری كوڕی عاسەوە دەڵێت: كە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (كاتێك گوێتان لە بانگ بێژێكەوە بوو، ئەوەی ئەو دەیڵێ ئێوەش بیڵێن، پاشان سڵاواتم لەسەر بدەن، وە هەر كەسێك سڵاواتم لەسەر بدات خوای گەورە بەو سڵاواتە دە سڵاواتی لەسەر دەدات، پاشان داوای وەسیلەم بۆ بكەن لە خوا، چونكە وەسیلە شوێنێكە لەناو بەهەشتدا، بۆ هیچ كەس نیە بۆ بەندەیەك نەبێت لە بەندەكانی خوا، داوام وایە كە ئەو كەسە من بم، هەر كەسێك داوای وەسیلەم بۆ بكات لالانەوەی منی بۆ خۆی دابین و حەڵاڵ كردووە.[4] موسلیمو ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان كردووە.[5] وە هەر لەو شوێنانەی سڵاواتیان تێدا دەدرێت: چوونە ناو مزگەوتو هاتنە دەرەوە لێی، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە كە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە فاتیمەی كچی پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) كاتێك كە دەڕۆیشتە ناو مزگەوت سڵاواتی دەدا لەسەر موحەممەدو (ﷺ) سڵاویشی لێ دەكرد، پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە لە گوناهەكانم ببوورەو دەرگاكانی بەزەیی خۆتم لێ بكەرەوە، كاتێكیش دەچووە دەرەوە لە مزگەوت سڵاواتی دەدا لەسەر موحەممەدو (ﷺ) سڵاویشی لێ دەكرد) پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە لە گوناهەكانم ببوورەو دەرگاكانی ڕێزی خۆتم لێ بكەرەوە).[6] وە لەو شوێنانەی تر كە سڵاواتی تێدا دەدرێت، لە كاتی نوێژی

---

[1] أحمد (٢٠١/١)، فەرموودەیەكی باشە (جید).

[2] تحفة الأحوذي (٥٣١/٩)، فەرموودەیەكی باشە (جید).

[3] تحفة الأحوذي (٥٣٠/٩)، فەرموودەیەكی حەسەنی غەریبە.

[4] أحمد (١٦٨/٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[5] مسلم (٢٨٨/١)، أبو داود (٣٥٩/١)، تحفة الأحوذي (٨٣/١)، النسائي (٢٥/٢).

[6] أحمد (٢٨٢/٦)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی سەحیحەو پیاوەكانی جێی متمانەن.

مردوودایە کە لە (الله أکبر)ی یەکەمدا سورەتی فاتیحە دەخوێنرێتو لە (الله أکبر)ی دووەمدا سڵاوات دەدرێت لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)و لە (الله أکبر)ی سێهەمدا دوعا دەکرێت بۆ مردووەکە، وە لە (الله أکبر)ی چوارەمدا دەوترێت:ئەی خودایە لە پاداشت بێ بەشمان نەکەی‌و دوای ئەو تووشی فیتنەمان نەکەی. شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیفەوە کە پیاوێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی باس کردووەو هەواڵی داوەتێ کە سونەتە کاتێك نوێژ دەکرێت لەسەر مردوو پێشنوێژ (الله أکبر) بکات، پاشان فاتیحە بخوێنێت بە پەنهانی لە دڵی خۆیدا، پاشان سڵاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) وە بە تایبەتی دوعا دەکات بۆ مردووەکە، وە لە (الله أکبر)ەکاندا هیچ شتێکی تر لەوانە ناخوێنێت، پاشان بە پەنهانی لە دڵی خۆیدا سەلام دەداتەوە.[1] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئومامە خۆیەوە کە دەڵێت: لە سونەتەکانی پێغەمبەرەکە.. پاشان باسی باسی ئەم فەرموودەیەی کردووە.[2] ئەم فەرموودەیە لە هاوەڵەکانەوە حوکمی مەرفوعی هەیە، وە هەر لەو شوێنانەی کە سڵاواتی تێدا دەدرێت، کۆتایی دوعاو پاڕانەوە بە سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت دوعا ڕاگیراوەو وەستاوە لە نێوان ئاسمانو زەمیندا هیچی لێ بەرزنابێتەوە هەتاسڵاوات نەدەی لەسەر پێغەمبەرەکەت(ﷺ)[3]. مەعازی کوڕی حارس ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو قوڕڕەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە لە عومەرەوە بە مەرفوعی.[4] ئەوەی زیاتر جەختی لەسەر کردەوە دوعای قونوتە کە ئیمامی ئەحمەدو زانایانی فەرموودەو ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیببانو حاکیم ڕیوایەتیان کردووە لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) چەند وتەیەکی فێرکردم لە قونوتدا دەیڵێم: (خودایە ڕێم نیشان بدە لەگەڵ ئەوانەی کە ڕێت نیشان داون، لەش ساغ و تەندروستم بکە لەگەڵ ئەوانەی لەش ساغت کردوون، پشتم هەڵگە لەوانەی تۆ لێیان ڕەنجاوی، بیدە بە منیش لەوەی کە بەخشیوتە، لام بدە لەو شەڕانەی کە بڕیارت لەسەر داوە (واتە: لەسەر تاوانباران هەر تۆ خاوەن بڕیاری، بڕیارت بەسەردا نادرێت، بێگومان هەر کەسێك تۆ پەنای بی زەبوون نابێت، هەر کەسێك تۆ دژایەتیت کردبێت خاوەنی دەسەڵات نابێت، پاکیو بێ عەیبیو مەزنی هەر بۆ تۆیە ئەی پەروەردگارمان)، نەسائی لە کتێبەکەیدا ئەمەی زیادکردووە لە کۆتایی دوعاکەدا(سڵاواتی خوا لەسەر

---

[1] مسند الشافعي (٢٠٠)، ئەم فەرموودەیە حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش هاوڕایەتی.

[2] النسائي (٧٥/٤)، ئەم فەرموودەیە حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش هاوڕایەتی.

[3] تحفة الأحوذي (٦٠٠/٢)، فەرموودەیەکی مەوقوفە.

[4] تفريغ الكشاف لابن حجر (١٣٧)،. فەرموودەیەکی مەوقوفە

موحەممەدبێت (ﷺ))[1]. وە هەر لەو کاتانەی کە موستەحەبەو زۆر باشە دوعای تێدا بکرێتو زۆر سڵاواتی تێدا بدرێت ڕۆژی هەینیو شەوی هەینیە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەوسی سەقەفیەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (لە بەڕێزترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی هەینییە لە هەینیدا ئادەم دروست کرا، وە لە هەینیدا گیانی کێشرا، وە لە هەینیدا فوو دەکرێت بە کەڵەشاخداو لە هەینیشدا نوکەگەورەکەش ڕوودەدات لەو ڕۆژەدا زۆر سڵاواتم لەسەر بدەن چونکە سڵاواتەکانتانم پیشان دەدرێو پێم دەگات)، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چۆن سڵاواتەکانت پیشان دەدرێت کە تۆ ڕزاوی. واتە: پوکاویتەوەو نەماوی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوا حەرامی کردووەو قەدەغەی کردووە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخواتو لەناوی بەرێت).[2] ئەبو داودو نەسائیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە، ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حیببانو دارە قوتنی و نەوەوی لە کتێبی(الاذکار)دا بە فەرموودەیەکی ڕاستیان داناوە[3].

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾﴾

**ئەوانەی ئازاری خوداو پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەدان لە دنیاو لە قیامەتیشدا لەعنەتیان لێکراوەو بێ بەش کراون لە بەزەیی خودا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾ واتە: بە ڕاستی کەسانێك کە ئازاری خوداو پێغەمبەرەکەی دەدەن خوا نەفرینی لێ کردوون لە دنیاو لە قیامەتداو سزای ڕیسواکەری بۆ ئامادەکردوون. خوای گەورە هەڕەشە دەکاتو بەڵێنی داوەو دەفەرمووێت ئەو کەسانەی کە ئازاری دەدەن، واتە: دژایەتی فەرمانەکانی دەکەنو خەریکی خراپەکارین بە بەردەوامیو ئازاری پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەدەنو توانجی لێ دەدەنو بە کەم سەیری دەکەن (پەنا بە خوا لەو قسانەیان) کە سزای سەختو گرانیان دەدات. عیکریمە لەم ئایەتەدا: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ دەڵێت: لەسەر وێنەگران هاتووەتەخوارەوە.[4] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا

---

[1] أحمد (١/١٩٩)، أبو داود (٢/١٣٣)، تحفة الأحوذي (٢/٥٦٢)، النسائي (٣/٢٤٨)، ابن ماجه (١/٣٧٢)، ابن خزيمة (٢/١٥١)، ابن حبان (٢/١٤٨)، الحاكم (٣/١٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٤/٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أبو داود (١/٦٣٥)، النسائي (٣/٩١)، ابن ماجه (١/٥٢٤)، ابن خزيمة (٣/١١٨)، ابن حبان (٢/١٣٢)، النووي (٩٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الطبري (٢٠/٣٢٢).

هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (خوای مەزن دەفەرمووێت: ئەوەی ئادەم ئازارم دەدات قسە دەڵێت بە ڕۆژگار کە من ڕۆژگارم، من شەوو ڕۆژ هەڵدەسوڕێنم).[1] ماناکەی ئەوەیە لە کاتی نەفامیدا دەیانوت: ڕووی زەمانە ڕەش بێت ئاواوئاوای بەسەر هێناین، کردارەکانی خودا دەدەنە پاڵ ڕۆژگارو قسەی پێ دەڵێن. بێگومان ئەوەی کە ڕوودەدات خوای گەورە دەیکاتو نەهی کردووە لەو قسانە کە دەوترێت بە ڕۆژگار. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ هاتووەتە خوارەوە لەسەر ئەو کەسانەی کە لۆمەی پێغەمبەریان (ﷺ) دەکرد لەوەی کە سەفیەی کچی حوەیەیی کوڕی ئەختەبی مارە کردووە.[2] لەم ئایەتەدا وا دیارە گشتگیرە هەموو کەسێک دەگرێتەوە کە ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) بدات بە هەر شێوەیەک، هەر کەسێک ئازاری ئەو بدات، ئازاری خودای گەورەی داوە، وەک چۆن کەسێک گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکات، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای کردووە.

## هەڕەشە لەو کەسانەی کە بوختانو تۆمەت هەڵدەبەستن بۆ خاوەنباوەڕان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟﴾ واتە: وە کەسانێک ئازاری پیاوانو ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێت، ﴿فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ واتە: ئەوە بە ڕاستی ئەوانە بوختانو تاوانێکی ئاشکرایان گرتووەتە ئەستۆ. خوای گەورە دەفەرمووێت لەم ئایەتەدا: شتی وایان پێ دەڵێن کە ئەوان زۆر دوور بوون لێیەوەو خاوەنباوەڕان نەیانکردووەو هەرگیز پێی هەڵنەساون، ئەمە لەو جۆرە بوختانە زۆر گەورەانەیە کە خاوەنباوەڕ چ ژن یان پیاو نەیانکردووە، قسەیان بۆ هەڵدەبەستن بۆ ئەوەی لەناو خەڵکیدا عەیبدارو ناشیرینیان بکەن، ئەو کەسانەی کە بەر ئەم هەڕەشەیە دەکەون بە زۆری ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خوداو بە پێغەمبەرەکەی نیە، پاشان ئەو ڕافیزانەی بە بە سووکی سەیری هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، تیرو توانجیان لێ دەدەن کە ئەوان زۆر دوورن لەو بوختانانەوە کە ئەو ڕافیزانە بۆیان هەڵدەبەستن، خوای مەزن باسو وەسفی چاکیان دەکاتو لە کۆچەریو ئەنساریەکان ڕازی بووە، کەچی ئەو نەفامو دەبەنگانە قسەیان پێ دەڵێنو بە خراپ باسیان دەکەن، هیچ شتێک لەوانەی کە ئەوان دەیڵێن، هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز نەیانکردووە، سروشتێکی خراپو جیاوازیان هەیە، ئەوەی جێی وەسفە ئەوان بە خراپ باسی دەکەنو ئەوەشی خراپە ئەوان بە چاکی

---

[1] فتح الباري (٨/٤٣٧)، مسلم (٤/١٧٦٢).

[2] الطبري (٢٠/٣٢٣).

دەزانن‌و وەسفی دەکەن. ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە وتراوە: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)غەیبەت کردن کامەیە؟ فەرمووی: (باس کردنی برایەکتە بە شتێك کە پێی ناخۆشە)، وترا: ئەی ئەوەی کە دەیلێین بینیت تێیدا هەبوو؟ فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی تۆ دەیلێی تێیدا هەبوو ئەوە غەیبەتت کردووە، خۆ ئەگەر ئەوەی تۆ دەیلێی تێیدا نەبوو، ئەوە بوختیانت بۆ هەڵبەستووە)[1]. هەر بەم شێوەیە تیرمیزی ڕیوایەتی کردووەو پاشان دەڵێت: فەرموودەیەکی چاك‌و ڕاستە[2].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٠﴾ مَّلۡعُونِينَۖ أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٦٢﴾﴾

**فەرمان دان بە خۆدا پۆشین**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ بە هاوسەرانت‌و بە کچانت‌و بە ئافرەتانی بڕواداران با عاباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا (خۆیان‌و جوانیانی پێ دابپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێنپاك) تا بە هۆیەوە ئازار نەدرێن‌و خوا لێخۆشبووی میهرەبانە. خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە فەرمان بکات بە ژنانی خاوەن باوەڕ بە تایبەتی هاوسەرەکانی‌و کچەکانی لەبەر ڕێزو حورمەتیان بە پۆشاکەکانیان خۆیان داپۆشن بۆ ئەوەی جیا بکرێنەوە لە ژنانی کاتی نەفامی‌و کەنیزەکەکان، (جلباب) پۆشاکێکە لەسەر سەرپۆشەوە، ئەمە قسەی ئیبنو مەسعودو عوبەیدەو قەتادەو حەسەنی بەسری‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئیبراهیمی نەخەعی‌و عەتای خۆراسانی‌و کەسانی تریشە لە جێی پۆشاکی (عابای) ئەمڕۆیە. جەوهەری دەڵێت: (الجلباب) واتە: داپۆشەر، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) خوای گەورە فەرمانی داوە بە ژنانی خاوەن باوەڕان کاتێك لە ماڵ دەرچوون بۆ پێویستیەك با دەم‌و چاویان داپۆشن لەسەر سەریانەوە بە پۆشاکێك کە تەنها چاوێکیان دەربخەن.[3] واتە: بە چاوێکیان بڕوانن، موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێت: پرسیارم کرد لە عوبەیدەی سەلمانی لە بارەی ئەم ئایەتەوە

---

[1] ابو داود (١٩٢/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي (٦٣/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الطبري (٣٢٤/٢٠).

کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ﴾ دەڵێت: سەرو دەمو چاوی دادەپۆشێت تەنها چاوی چەپی دەردەخات.[1] وە دەفەرموویت: ﴿ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ﴾ واتە: ئەمە باشترە بۆ ئەوان ئەگەر وایان کرد باش دەناسرێنو دەزانرێت کەنیزەك نینو لە ژنانی کاتی نەفامی جیادەکرێنەوە، پاشان خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە: خودا لە تاوان خۆش دەبێتو دلۆڤانە لەوەی کە کردوویانە لە کاتی نەفامیداو هیچ شارەزاییەکیان نەبووە لەو بارەیەوە.

## ئاگاداریو هەڕەشەکردن لە دوو ڕووە خراپەکارەکان

پاشان خوای گەورە هەڕەشە لە دووڕووەکان دەکات ئەوانەی کە خۆیان بە موسڵمان دەردەخەنو لە دڵدا خوانەناسن دەفەرموویت: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەگەر کۆتایی نەهێنن دووڕووانو کەسانێك لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە، عیکریمەو کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست بە﴿وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ لێرەدا داوێنپیسەکانە.[2] ﴿وَٱلْمُرْجِفُونَ فِى ٱلْمَدِينَةِ﴾ پڕوپاگەندەچیەکان لە مەدینەدا، واتە: ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئەوا دوژمن هات،ئەوەجەنگ هەڵگیرسا !ئەوقسانە، درۆنو لە خۆیانەوە هەڵی دەبەستن، ئەگەر واز نەهێنن لەو قسانەو نەگەڕێتەوە بۆ سەر هەق، ﴿لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ﴾ واتە: ئێمە تۆ هان دەدەین بە جەنگ کردن لە دژیان، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لە ئاکامدا تۆ زاڵ دەکەین بەسەریاندا،[3] قەتادە دەڵێت: لە ئاکامدا تۆ زۆریان پێ بێنیو لەناویان ببەی.[4] سودی دەڵێت: بە تۆ دەرسیان دادەدەین، ﴿ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ﴾ واتە: پاشان لەو شارەدا ناتوانن ببنە هاوسێت، ﴿إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: ماوەیەکی کەم نەبێت. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوٓا۟ أُخِذُوا۟ وَقُتِّلُوا۟ تَقْتِيلًا﴾ واتە: ئەوانە نەفرین لێکراون لە هەرکوێ بەردەست کەوتن بە دیل دەگیرێنو هەر بە کوشتن دەکوژرێت. پاشان خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ﴾ واتە: شێوەی کاری خودا بۆ دووڕووەکان کاتێك کە یاخی بوونو دەستیان دابێتە خوانەناسیو

---

[1] الطبري (٢٠/٣٢٥).

[2] الطبري (٢٠/٣٢٦).

[3] الطبري (٢٠/٣٢٨).

[4] الطبري (٢٠/٣٢٨).

پەشیمان نەبووبنەوە، خاوەن باوەڕانی زاڵ کردووە بەسەریانداو تەفروتونایان کردوونو لەناویان داون، ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا﴾ واتە: شێوازی کاروباری خودا گۆڕانی بەسەردا نایەتو هەر بەردەوامە.

﴿يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾﴾

## کەس نازانێت ڕۆژی قیامەت کەی دێت خودای مەزن نەبێت

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) خەڵك پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت بڵێ زانینی ئەو ڕۆژە تەنها لای خودایە، وەك خودای گەورە فەرموویەتی لە سورەتی (الاعراف)دا کە سورەتێکە لە مەککە هاتووەتە خوارەوە، بەڵام ئەم سورەتە لە مەدینە هاتە خوارەوە. بەردەوام پێغەمبەر (ﷺ) هەر بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە کە هەر خودا دەزانێت کەی ڕۆژی قیامەت دێت، بەڵام خوای گەورە هەواڵی داوەتێ کە نزیکەو لەوانەیە بەم زووانە بێت، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾[1] واتە: وە ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوەو مانگ لەت بوو، وە فەرموویەتی: ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ﴾[2] واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بووەتەوە بەڵام ئەوان لە بێ ئاگاییو غەفڵەتدا پشت تێکەرو ڕوو وەرگێڕن لە ئایینی خوا، وە فەرموویەتی: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسۡتَعۡجِلُوهُ﴾[3] واتە: ئەوا فەرمانی خوا بە سزادانیان هات بۆیە پەلە مەکەن لە هاتنی.

## نەفرینکردن لە خوانەناسانو مانەوەیان لەناو ئاگردا تاهەتایەو هاوارو داخو خەفەتباریان لە دۆزەخدا

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: بە ڕاستی خودا نەفرینی لە بێباوەڕان کردووە، ﴿وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا ئاگری بە کڵپەی بۆ ئامادە کردوون، پاشان

---

[1] القمر (١).

[2] الانبياء (١).

[3] النحل (١).

دەفەرموویێت: ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ واتە: تێیدا دەمێننەوە بە بەردەوامی تاهەتایە، هەرگیز لێی نایەنە دەرەوەو کۆتایش بە ژیانیان نایەت لەناویدا، ﴿لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ واتە: هیچ کەسیش نایەت بە هاواریانەوە یارمەتیان بداتو ڕزگاریان بکات لەو ئازارو ناڕەحەتیەی کە تێیدا دەژین، پاشان دەفەرموویێت: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴾ واتە: کاتێک بەسەر دەمو چاویاندا بەناو ئاگردا ڕادەکێشرێنو ئەم دیو ئەودیویان پێدەکرێت، ئا بەو حاڵەوە ئەڵێن: خۆزگە لە دنیادا گوێڕایەڵی خوداو بەرفەرمانی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بوینایە. وەك خودای گەورە باسی ژیانیان دەکات کاتێك لە گۆڕەپانی قیامەتدا ئامادە دەکرێنو دەوەستێنرێن دەفەرموویێت:

﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴾[1] واتە: وە ڕۆژێکە کە ستەمکار قەپ دەکات بە هەردوو دەستی خۆیداو دەڵێت کاشکای لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) ڕێگای ڕاستم بگرتایەتە بەر، ئای تیاچوون بۆمن، خۆزگە فلان کەسم نەکردایە بە هاوەڵو خۆشەویستی خۆم، بە ڕاستی ئەو کەسەی کردم بە هاوەڵ منی لە قورئان وێڵ کرد دوای ئەوەی قورئانم پێ گەیشت باوەڕم پێ نەهێنا وە شەیتان هەمیشە پشت تێکەرو پشت بەردەرە بۆ ئادەمیزاد.ئەم ئایەتەوەك ئەونایەتەیەکەدەفەرموویێت: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾[2] واتە: ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون زۆر جار ئاوات دەخوازن کاشکای موسڵمان بوونایە. هەر بەم شێوەیە لەم ئایەتەدا خوای گەورە باسی کردوون کە خۆزگەیان دەخواست کە لە فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەرنەچوونایە لە ژیانی دنیادا. پاشان دەفەرموویێت: ﴿ وَقَالُوا۟ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴾ واتە: وە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بە ڕاستی ئێمە بە گوێی سەرانو گەورەکانمان کرد ئیتر لە ڕێگای ڕاست گومڕایان کردین. (تاوس) دەڵێت: ﴿سَادَتَنَا﴾ واتە: پیاوماقولان. ﴿وَكُبَرَآءَنَا﴾ واتە: زانایان، واتە: شوێنی پیاوماقوڵانو زانایانی خۆمان کەوتینو سەریان لێمان شێواند. پاشان دەفەرموویێت: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ ٱلْعَذَابِ وَٱلْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴾ واتە: ئەی پەروەردگارمان! دوو بەرامبەر سزایان بدەو بەر نەفرینی گەورەی خۆتیان بخە. تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ڕافیعەوەلە باسی ئەوانەی کە لەگەڵ عەلیدا (ڕەزای خوای لێ بێت) بوون لەشەڕەکانیدا کەیەکێکیان حەجاجی کوڕی عەمری کوڕی

---

[1] الفرقان (٢٧ـ٢٩).

[2] الحجر (٢).

غەزییەیە، لەوکاتەی ڕووبەڕوو ئەبوونەوە دەیوت: ئەی کۆمەڵی ئەنسارییەکان! دەتانەوێت کاتێك کە چوونە بەر بارەگای خوای گەورە بڵێن: ﴿رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا﴾[1].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾﴾

**جوولەکەکان بوختانیان (درۆیان) بۆ مووسا هەڵدەبەست**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە وەك ئەو کەسانە مەبن کە موسایان ئازاردا جا خوا موسای پاك کردەوە لەوەی دەیانوت موسای لای خوا ڕێزو پلەی هەبوو. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە(أحاديث الأنبياء)دا، لە ئەبو هورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (موسا(سەلامی خوای لێ بێت) پیاوێکی زۆر بە شەرم بوو هەمیشە خۆی دادەپۆشیو هیچ شوێنێك لە لەشی نەدەبینراو دەرنەدەکەوت لەبەر زۆر بە شەرمی خۆی، هەندێ لە جوولەکەکان ئازاریان دەداو دەیانوت: ئەم پیاوە بۆیە ئەوەندە خۆی دادەپۆشێت چونکە پێستی عەیبدارەو ناشیرینە: یان بەڵەکی بە پێستیەوەیە یان قۆڕە یان دەردو نەخۆشیەکی تریەتی، خوای مەزنیش ویستی بۆ خەڵکەکەی دەرخات کە موسا هیچ ناتەواویەکی نیەو دوورە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن: ڕۆژێك موسا خۆی بە تەنها بوو، پۆشاکەکانی لە خۆی کردەوەو لەسەر بەردێك داینان، پاشان دەستی کرد بە خۆشۆردن، کاتێك خۆی شۆرد ڕۆیشت بۆ لای جلەکانی بۆ ئەوەی هەڵی بگرێتو لەبەری بکات بەردەکە جلەکانی بردو ڕفاندی موسا گاچۆنەکەی هەڵگرتو کەوتە شوێن بەردەکەو دەیوت: ئەی بەردەکە جلەکانم، ئەی بەردەکە جلەکانم تا گەیشتە کۆمەڵێك لە جوولەکەکان، چاویان پێکەوت بە ڕووتی کە جوانترین کەسێك بوو کە خودا دروستی کردبوو، خودا پاکانەی بۆ کرد لەوەی کە هەڵیانبەستبوو، بەردەکە ڕاست بووەوەو موسا جلەکانی لێ وەرگرتەوەو بە گاچۆنەکەی کێشای بە بەردەکەدا، بە هۆی ئەو لێدانەی موساوە لە سێ یان چوار یان پێنج شوێن بەردەکە پێیەوە دیار بوو، بۆیە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا﴾.[2] ئەم فەرموودەیە بوخاری هێناویەتی موسلیمی لەگەڵ نیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێك دەستکەوتێکی دابەش دەکرد، پیاوێکی

---

[1] المعجم الكبير للطبراني (٣/٢٢٣).

[2] فتح الباري (٦/٥٠٢).

ئەنساری وتی: ئەم دابەش کردنە لەبەر خاتری خودا نیە، وتی: پێم وت: ئەی بەندەی خوا ئەوەی کە وتت دەیگەیەنم بە پێغەمبەری خودا (ﷺ)، ئەوەی کە وتی بۆ پێغەمبەرم (ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی سوور هەڵگەڕاو پاشان فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لە موسا) زیاتر لەمە ئازار دراو ئارامی گرت)، بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە لە سەحیحەکەیاندا.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهًا﴾ واتە: موساله لای خودا زۆر بەڕێزو قەدرە، حەسەنی بەسری دەڵێت: دوعای لای خودا گیرا بووەو قەبوڵ بووە.[2] هەندێ لە زانایان وتوویانە: لەبەر ئەو ڕێزە مەزنەی تکای کرد بۆ هارونی برای کە خودا لەگەڵی ڕەوانەی بکات، خوای گەورە دوعاکەی قەبوڵ کردو فەرمووی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾﴾[3] واتە: وە لە بەزەییو بەخشندەیی خۆمان بەخشیمان بە(موسا) هارونی برای وەك پێغەمبەرێك.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾.

## خوای مەزن فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە لە خوا بترسنو ڕاستگۆ بن

خوای گەورە فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە لێی بترسنو عیبادەتێکی چاكو پاکی بکەن وەك ئەوەی کە دەیبینن دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا﴾ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسنو پارێزگار بنو قسەی ڕاستو دروست بکەن، ئەگەر وایان کرد خودا بەڵێنی داوە پێیان پاداشتی چاکیان دەداتەوەو کار ئاسانیان بۆ دەکات بۆ کاری چاك کردنو لە تاوانە پێشووەکانیشیان خۆش دەبێت، ئەو شتانەشی کە لێیان ڕوو دەدات لەمەودوا یارمەتیان دەدات کە پەشیمان ببنەوەو وازی لێ بێنن. وە دەفەرمووێت: ﴿يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ واتە: کردەوەکانتان چاك دەکاتو لە تاوانەکانتان خۆش دەبێتو هەر کەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکات ئەوە بە ڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێناوە.

---

[1] أحمد (٣٨٠/١)، البخاري (٣٤٠٥)، مسلم (١٠٦٢).

[2] البغوي (٥٤٥/٣).

[3] مريم (٥٣).

﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٣﴾ ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ واتە: بێگومان ئێمە سپاردەمان نیشانی ئاسمانەکانو زەوی‌و چیاکاندا هەڵگرتنی ئەمانەتی دینداریمان پێشنیار کرد بۆیان بەڵام هیچیان ڕازی نەبوون کە هەڵی بگرن‌و ترسان لەو ئەمانەتە کەچی ئادەمی ئەو سپاردەکەی هەڵگرت بە ڕاستی ئەو زۆر ستەمکارو نەزانە. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە مەبەست بە ئەمانەت واتە: بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوداو وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان، ئەم ئەمانەتە دەخرایە بەردەم ئاسمانەکان‌و زەمین‌و گشت کێوەکان لە پێش ئادەم(سەلامی خوای لێ بێت) نەیاندەتوانی هەڵی بگرن، فەرمووی بە ئادەم: من ئەم ئەمانەتەم خستە بەردەم ئاسمانەکان‌و زەمین‌و هەموو کێوەکان‌و نەیانتوانی وەری بگرن ئایا تۆ وەری دەگری بەوەیشەوە کە لە ناویەتی؟ ئادەم وتی: ئەی پەروەردگارم چی تێدایە؟ فەرمووی: ئەگەر چاکەت کرد پاداشتەکەی وەردەگری خۆ ئەگەر خراپەیشت کرد تۆڵەت لێ دەسێنرێت، ئادەم وەری گرت‌و خستیە ئەستۆی خۆی، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾.[1] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: ئەمانەت واتە: فەرزەکان، خوای مەزن خستیە بەر دەست ئاسمانەکان‌و زەمین‌و هەموو کێوەکان ئەگەر جێبەجێیان کرد خوا پاداشتیان دەداتەوە، خۆ ئەگەر فەوتاندیشیان‌و لەناویان دا سزایان دەدات، بە لایانەوە گران بوو، لێی ترسان نەك وەك سەرپێچی کردن، بەڵکو لەبەر زۆر گەورەیی دینی خوا، نەوەك نەتوانن پێی هەڵسن، پاشان خرایە بەردەم ئادەم قەبوڵی کردو چووە ژێری بەو هەموو فەرمانەی کە تیایەتی وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴾ واتە: لەبەر نەزانی‌و بێئەزموونی دەربارەی فەرمانی خودا.[2] موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاك‌و حەسەنی بەسری‌و کەسانی تریش وتوویانە: مەبەست بە ئەمانەت فەرزەکانە[3]. هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: ئەمانەت واتە: گوێڕایەڵی، ئەعمەش دەڵێت: لە ئەبو زوحاوە لە مەسروقەوە دەڵێت: ئوبەی کوڕی کەعب وتی: بەشێك

---

[1] الطبري (٢٠/٣٣٨).

[2] الطبري (٢٠/٣٣٧).

[3] الطبري (٢٠/٣٣٧).

لە ئەمانەت ئەوەیە کە ژن شەرمگەی بپارێزێت[1]. قەتادە دەڵێت: ئەمانەت بریتیە لە ئایین و فەرزەکان و سنوورەکانی خوا[2]. مالك دەڵێت لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە: ئەمانەت سێ شتە: نوێژ، ڕۆژوو خۆشۆردن لە لەش پیسی، هەموو ئەم قسانە دژایەتی نیە لە نێوانیاندا بەڵکو هەموویان ڕێکن و هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ بەجێهێنان و قەبوڵکردنی فەرمان و وازهێنانە لە قەدەغەکراوەکان بە مەرجی خۆی، چونکە ئەگەر هەڵسا بەو فەرمانانە پاداشتی دەدرێتەوە، ئەگەر وازیشی لێ هێنا سزا دەدرێت، مرۆڤ قەبوڵی ئەم ئەمانەتەی کرد لەبەر لاوازی و نەزانی وغەدری لە خۆی کرد، کەسێك نەبێت کە خودا یاریدەدەری بێت و هەر خواش یارمەتی دەرەو جێی پەنایە. وە لەو فەرموودانەی پەیوەندی بە ئەمانەتەوە هەیە، ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوو فەرموودەی بۆ باس کردین، فەرموودەیەکیانم بینی و چاوەڕوانی دووهەمیشیان دەکەم، بۆی گێڕاینەوە کە ئەمانەت لە قوڵایی دڵی مرۆڤدایە، پاشان قورئان هات و زانیاریان لە قورئان پەیدا کردو لە فەرموودەش ئاگادار بوون، پاشان باسی بەرزبوونەوەو نەمانی ئەمانەتی بۆ کردین و فەرمووی: (مرۆڤ جاری واهەیە دەنوێ ئەمانەت لە دڵی لادەبرێت، جێ شوێنی ئەمانەتەکە خاڵ خاڵ دەبێت، لە پاشان جارێکی تر دەنوێ ئەمانەت لە دڵی دەردەهێنرێت، شوێنی ئەمانەتەکە وەك بلۆقی لێ دێت. وەك چۆن پشکۆیەك لە ئاگر بەسەر پێتدا بتلێتەوەو بلۆق بکات، دەیبینی شوێنی ئاگرەکە بەرز بووەتەوەو هیچی تێدا نیە). دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بەردێکی بچووکی هەڵگرت و بەسەر پێی موبارەکیدا خلی کردەوەو وتی: ئەوکاتانە خەڵکی وای لێ دێت مامەڵە لەگەڵ یەکتری دەکەن و ئەمانەت لەناویاندا نامێنێت بە شێوەیەکی وەها کە ئەڵێن: لە فلانە هۆزدا پیاوێکی ئەمین هەیە، تا وای لێ دێت ئەڵێن بە پیاوێك: ئەوپیاوە چەندە ژیرە، چەندە پیاوی چاکە، چەندە ئازایە! کەچی بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕ لە دڵیدا نیە! حوزەیفە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: من زەمانێکم بەسەردا هات گوێم لێ نەبوو لەگەڵ کامتان مامەڵە بکەم، ئەگەر موسڵمان بووایە دینەکەی ئەوی دەگێڕایەوە کە ناپاکیم بەرانبەر بکات، خۆ ئەگەر گاورو جوولەکەیش بووایە، بەرپرسیاری ئەو کارە نەیدەهێشت خیانەتم لێ بکات، بەڵام ئەمڕۆ وام لێهاتووە لەگەڵ فلان و فلاندا نەبێت، لەگەڵ کەس مامەڵە ناکەم.[3] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەکەی ئەعمەشەوە بەو شێوەیە.[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە

---

[1] الطبري (٢٠/٣٣٨).

[2] الطبري (٢٠/٣٣٩).

[3] أحمد (٥/٣٨٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (١١/٣٤١)، مسلم (١/١٢٦).

پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر چوار شتت تێدا بێت، لەوەی کە لە دنیا لە دەستت چووە بێخەمبە، پاراستنی ئەمانەتو ڕاستگۆیی‌و ڕەوشت جوانی‌و حەلاڵ خۆری)[1].

**سەرئەنجامی لە ئەستۆگرتنی ئەمانەت**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ ﴾ واتە: بۆیە ئەوەی ئادەم ئەم ئەمانەتەی خستە ئەستۆی خۆی تا خودا سزای ئەو کەسانە بدات لە دووڕووان، واتە: ئەوانەی کە خۆیان بە خاوەن باوەڕ دەردەخەن لە ترسی موسڵمانان کەچی لە دڵدا شوێنکەوتووی خوانەناسانن، ﴿وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ﴾ واتە: ئەو کەسانەن کە بە ئاشکراو لە دڵیشدا شەریکیان بۆ خوا داناوەو دژایەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکەن، ﴿وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ڕەحم بکات بەو خاوەن باوەڕانەی کە بڕوایان هێناوە بە خوداو بە فریشتەکان‌و کتێبەکان‌و پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت) وە هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًۢا ﴾ واتە: خودا لە تاوان خۆش دەبێت‌و دلۆڤانە.

## تەفسیری سورەتی ( سبأ )

### لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾

**سوپاس‌و پەسەنی هەر بۆ خوایەو پەنهانیەکانیش هەر ئەو دەیزانێت**

خوای گەورە باسی مەزنی‌و پەسەنی خۆی دەکات، وە هەر خۆی جێی پەسەنی‌و ستایشە لەم دنیاو لەو دنیاش، لەبەر ئەوەی کە هەر خۆی خاوەن چاکەیەو گەورەیە بەسەر هەموو خەڵکی دنیاو قیامەتدا، وە خاوەنی گشت شتێکەو کاربەدەستیانە وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾[2] واتە: وە ئەو خوایە کە هیچ پەرستراوێکی تر نیە جگە لەو، هەموو سوپاس تەنها بۆ خوایە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا وە بڕیارو حوکم هەر بۆ ئەوەو هەمووتان بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە. بۆیە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ

---

[1] أحمد (٢/١٧٧)، فەرموودەیەکی لاوازە سەنەدەکانی حەسەنە.

[2] القصص (٧٠).

ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: هەموو حەمدو سوپاس بۆ خوا کە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەویدایە تەنها هی ئەوە، هەموو شتێك ئـەو خاوەنیـەتی‌و عەبدی ئـەوەو لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئەودایـەو ملکەچی فەرمانی ئەون، وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ لَنَا لَلْءَاخِرَةَ وَٱلْأُولَىٰ﴾[1] واتە: وە هـەردوو جیهان هی ئێمەیە. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ واتە: هەر ئـەو پەرستراوە تاهەتایـەو ستایش دەکرێـت بـە بـەردەوامی، ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ﴾ واتـە: وە هـەر خۆشـی کارزانـە لـە کـردارو گفتـارو بەرنامـەو بڕیاریـدا، ﴿ٱلْخَبِيرُ﴾ واتـە: هـیچ شـتێکی لێ ون نابێـت‌و ناشـارێتەوە. مالیـك لـە زوهەریـەوە دەڵێت:ئاگادارە بەسەر دروستکراوەکانیداو کارزانە لە فەرمانەکانیدا. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا﴾ واتە: ئاگاداری بارینی دەنکە دەنکەی دڵۆپەی بارانـە کـە دێتـە خوارەوە، دەچێتە ناو زەوی‌و ئەو دانەوێڵانەشی کە لەناو زەویدان‌و دێنـە دەرەوەو ژمارەیـان چـەندەو لە چ جۆرێکن. ﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: وە چی دێتـە خـوارەوە لـە ئاسمـان. ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ واتە: لەوەشی کە بەرز دەبێتەوە لە ئاکارە چاکەکان‌و هەر شـتێکی تـر. ﴿وَهُوَ ٱلرَّحِيمُ ٱلْغَفُورُ ﴾ واتـە: دلۆڤانە بەرامبەر بەندەکانی، پەلـە ناکات لـە یاخی‌و تاوانبارەکـان لـە تۆڵەسـەندن لێیـان، لـە تـاوان‌و خەتای ئەو کەسانەش دەبورێت کە پەشیمان دەبنەوەو تۆبە دەکەن‌و کارەکانیان بە خودا دەسپێرن.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَأْتِينَا ٱلسَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّى لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَآ أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرُ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾

**بێگومان ڕۆژی قیامەت دێت بۆ ئەوەی هەموو کەسێك بە پێی کرداری خۆی پاداشت بدرێتەوە**

ئەم ئایەتە یەکێکە لەو سێ ئایەتەی کە چوارەمیان نیەو تێیدا خـوای مـەزن فـەرمان دەکـات بـە پێغەمبەر (ﷺ) کە سوێند بخوات بەپـەروەردگاری گـەورەی لەسـەر ئـەوەی کـە ڕۆژی قیامـەت دێـت‌و ڕوودەدات، کاتێك کە هەنـدێ لـە بێدینـەکان بڕوایان پـێ نـەدەکردو بـە دووریـان دەزانـی، یـەکێك لـەو ئایەتانـە لـە سـورەتی (یـونس)دایـە (سـەلامی خـوای لێ بێـت) کـە خـوای گـەورە دەفـەرموێت:

[1] اللیل (١٣).

﴿وَيَسْتَنْبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ﴾[1] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) لێت دەپرسن ئایا ئەو سزایە ڕاستە وبەدی دێت؟ پێیان بڵێ: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارم بێگومان ئەوە ڕاستەو ئێوە ناتوانن خۆتانی لێ قوتار بکەن. وە ئایەتی دووهەم لە سورەتی (التغابن)دایە کە دەفەرمووێت: ﴿زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ﴾[2] واتە: بێباوەڕان وایاندەزانی کە لە ڕۆژی دواییدا زیندووناکرێنەوە ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ بەڕێ وەڵلا سوێند بە پەروەردگارم بێگومان زیندوودەکرێنەوە دڵنیا بن پاشان هەواڵتان پێ دەدرێت بەوەی کە کردووتانەو ئەمە بۆ خوا ئاسانە. ئایەتی سێهەمیش ئەمەیە کە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ ﴾ واتە: بێباوەڕان وتیان: ڕۆژی دواییمان بەسەردا نایەت، ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ (وانیە) سوێند بە پەروەردگارم ئەو قیامەتەتان بۆ دێت. پاشان خوا باسی دەسەڵاتی خۆی کردووە کە بەڵگەیە لەسەر هاتنو ڕوودانی ڕۆژی قیامەتو فەرموویەتی: ﴿عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: خوا زانای هەموو پەنهانەکانە لە خوا ون نابێت قورسایی گەردیلەیەك لە ئاسمانەکانو زەویداو بچووکترو گەورەتر لەوە نیە لە کتێبێکی ئاشکراو ڕووندا نەبێت. موجاهیدو قەتادە دەڵێن: ﴿لَا يَعْزُبُ عَنْهُ﴾ واتە: هیچی لێ ون نابێت.[3] هەموو شتێك لە ژێر چاودێری خوای مەزندایەو ئاگای لێیەتیو هیچی لێ ون نابێت، ئەو ئێسکانەی کە وردو خاش دەبنو دەڕزێنو دەپوکێنەوەو بڵاودەبنەوە بەناو زەویدا خوای گەورە دەزانێت بۆ کوێ ڕۆیشتووەو بە چ لایەکدا چووە پاشان وەدی دەهێنێتەوە وەك چۆن وەدی هێناوەو ئاگاداری هەموو شتێکە. پاشان باس لە کارزانی خۆی دەکات لە وەدیهێنانەوەی هەموو ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ و ڕۆژی قیامەتو دەفەرمووێت: ﴿ لِّيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَٰئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە بداتەوە بۆ ئەوانەهەیە پاداشتو لێبوردنو ڕۆزیەکی چاك. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ وَالَّذِينَ سَعَوْا فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ ﴾ واتە:ئەو کەسانەی هەوڵ دەدەن بۆ ڕێگرتن لە ڕێی خودای گەورەو باوەڕ ناهێنن بە پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت) وا دەزانن دەرباز دەبن

---

[1] یونس (٥٣).

[2] التغابن (٧).

[3] الطبري (٢٠/٣٥٠).

له سزای خودا، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مِّن رِّجۡزٍ أَلِيمٞ﴾ئەوانەسزایەکی پیسی بەژانیان پیٚ ئەدریٚت، یانی تا ئەوانەی کە بەختەوەرن لە خاوەنباوەڕان بەهرەمەند ببن و ئەوانەشی بەدبەختن لە خوانەناسان جەزرەبەی بە ژان بچێژن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ﴾[1] واتە: دۆزەخیەکان و بەهەشتیەکان وەك یەك نین، بەهەشتیەکان ڕزگارو سەرکەوتوون. وە فەرموویەتی: ﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ﴾[2] واتە: ئایا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە لەگەڵ خراپەکاران لە زەویدا وەك یەکیان دادەنێین (لە دواڕۆژدا، نەخێر وا نیە) یان پارێزگاران وەك بەدکاران لێ دەکەین. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ﴾ ئەمەش کارزانیەکی ترە دەچێتە سەر ئەوەی پێش خۆی، کاتێك کە خاوەن باوەڕان ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بە پێغەمبەران و (سەلامی خوایان لێ بێت) بە چاوی خۆیان ڕۆژی قیامەتیان بینی و ئاکارچاکان و پیاوخراپان پاداشتی کردەوەی خۆیان وەرگرت کە لە دنیادا لە کتێبی خودا لەسەریان نووسرابوو، ئالەوکاتەیشدا دووبارە ئەڵێن: ﴿لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا بێگومان نێردراوەکانی پەروەردگارمان ڕاستییان هێنا. جارێکی تریش پێیان ئەڵێن: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾[4] واتە: ئەمە ئەو بەڵێنەیە خوای میهرەبان پێی داین و پێغەمبەرەکانی ڕاستیان کرد، ﴿لَقَدۡ لَبِثۡتُمۡ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡبَعۡثِۖ فَهَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡبَعۡثِ﴾[5] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێوە لە بەرزەخدا بە پێی بڕیار و نووسراوی خوا تا ڕۆژی زیندووبوونەوە ماونەتەوە ئینجا ئەمە ڕۆژی زیندووبوونەوەیە. وە لێرەیشدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلۡحَقَّ وَيَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ واتە: ئەوانەی زانیاریان پێدراوە دەزانن ئەوەی لە پەروەردگارتەوە هاتووە تەنها ئەوە ڕاستە و ڕێنموونی خەڵك دەکات بۆ ڕێگای خوای زاڵی ستایشکراو، ﴿ٱلۡحَمِيدِ﴾ سوپاس و ستایش کراوە لە هەموو گفتارو کردارو بەرنامەو بڕیارێکدا، وە لە

---

[1] الحشر (٢٠).

[2] ص (٢٨).

[3] الاعراف (٤٣).

[4] يس (٥٢).

[5] الروم (٥٦).

هەموو شتێکدا، ﴿ٱلۡعَزِيزِ﴾ واتە: ئەوەندە خاوەن دەسەلاتە، هیچ شتێك نابێتە ڕێگرو کۆسپ لە ڕێیداو بەڵکو ئەو زاڵ بووە بەسەر هەموو شتێکداو تێکی شکاندووە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ ﴿٧﴾ أَفۡتَرَىٰ عَلَى
ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ
وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ إِنَّ فِي
ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٩﴾ ﴾

## بڕوانەکردنی خوانەناسان بە زیندووبوونەوە پاش مردنو وەڵام دانەوەیان

خوای مەزن باسی خوانەناسان وبێدینان دەکات کە هاتنی ڕۆژی قیامەت بە دوور دەزانن و گاڵتە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە باسی ڕۆژی قیامەتیان بۆ دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هَلۡ نَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ يُنَبِّئُكُمۡ إِذَا مُزِّقۡتُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ واتە: وە ئەوانەی بێباوەڕ بوون دەیانوت: ئایا پیاوێکتان نیشان بدەین کە هەواڵتان پێ دەدات کاتێك مردن و بە تەواوی ڕزین و پارەپارە بوون ﴿إِنَّكُمۡ لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێوە دروست دەکرێنەوە بە دروست کردنێکی تازە. ئەم هەواڵە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە: یان درۆی بە ئەنقەسی بە دەم خواوە هەڵبەسیوە، یان بە ئەنقەس نەبووەو لێی شێواوە وەك خەڵەفاوو شێت. بۆیە وتوویانە: ﴿أَفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةُۢۗ﴾ واتە: ئایا ئەو پێغەمبەر (ﷺ) بە دەم خواوە درۆ دەکات یا شێتە، خوای گەورەیش وەڵامیان دەداتەوە دەفەرمووێت: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ فِي ٱلۡعَذَابِ وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ﴾ واتە: بەو شێوەیە نیە ئەوانە وا دەزانن و بۆی چوون بەڵکو موحەممەد (ﷺ) زۆر چاك و ڕاستگۆیەو لەسەر هەقە، ئەوانن درۆزن و نەفام. ﴿فِي ٱلۡعَذَابِ﴾ واتە: ئەو خوانەناسیەیان بووەتە هۆی ئەوەی تووشی سزای خودای گەورە ببن و ﴿وَٱلضَّلَٰلِ ٱلۡبَعِيدِ﴾ واتە: زۆر دوورکەوتنەوە لە هەق لە دنیادا. پاشان خوای مەزن ئاگاداریان دەکاتەوە لە تواناو دەسەڵاتی خۆی لە وەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی و دەفەرمووێت: ﴿ أَفَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ﴾ واتە: ئەگەر سەیری بەروودوای خۆیان بکەن بۆ هەر شوێنێك بڕۆن و بڕوانن ئاسمان وا بەسەریانەوەو زەمینیش لە ژێریانەوەیە، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا

دەفەرمووێت: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ﴾[1] واتە: وە ئاسمانمان بە دەستی خۆمان دروست کردووەو فراوانکەری ئاسمانین، وە زەویمان ڕاخستووە جا چ ڕاخەرێکی چاکین، ﴿إِن نَّشَأۡ نَخۡسِفۡ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ نُسۡقِطۡ عَلَيۡهِمۡ كِسَفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: مەیلمان لێی بێ بەناو زەمیندا نوقمیان دەکەین‌و زەوی قوتیان بدات یان پارچەیەك لە ئاسمان دەخەینە خوارەوە بەسەریاندا بە هۆی ئەو ناهەقیانەوە کە دەیکەن، تواناشمان هەیە بەسەریاندا بەڵام ئەو سزاو تۆڵەیان بۆ دوا دەخەین چونکە زۆر خۆگرو لێبوردەین. پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ﴾ واتە: بە ڕاستی لەوەدا بەڵگەو پەند هەیە بۆ هەر بەندەیەکی ڕوو لە خوا. موعەمەر دەڵێت لە قەتادەوە ﴿مُّنِيبٖ﴾ واتە: کە پەشیمان بێتەوە.[2] سوفیانیش دەڵێت لە قەتادەوە ﴿مُّنِيبٖ﴾ واتە: بەرەو لای خودا بگەڕێتەوە.[3] واتە: کە وردبوونەوە لە دروستبوونی ئاسمانەکان‌و زەمین هەموو بەڵگەن بە گشت کەسێك کە خاوەن هۆش‌و دڵ کراوە بێت‌و ئاوەز بکات بگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە، لەسەر تواناو دەسەڵاتی خوای مەزن بۆ زیندووکردنەوەی ئێسك‌و پروسکە ڕزیوەکان لەناو زەویداو هاتنی ڕۆژی قیامەت. چونکە خودایەك توانای ئەوەی هەبێت ئەم ئاسمانە بەو بەرزی‌و فراوانیەو ئەم زەمینە بەو هەموو بەرزی‌و نزمی‌و پانی دووروو درێژیەیدا دروست بکات، چاکتر دەتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوەو ئەو ئێسکە ڕزیوانە وەك خۆی لێ بکاتەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ بَلَىٰ﴾[4] واتە: ئایا زاتێك کە ئاسمانەکان‌و زەمینی بەدی هێناوە ناتوانێت وێنەیان دروست بکات؟ بەڵێ دەتوانێت. وە فەرموویەتی: ﴿لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[5] واتە: بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان‌و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی بەڵام زۆرینەی خەڵك ئەمە نازانن.

﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضۡلٗاۖ يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلۡحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعۡمَلۡ سَٰبِغَٰتٖ وَقَدِّرۡ فِي ٱلسَّرۡدِۖ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١﴾﴾

---

[1] الذاريات (٤٧ـ٤٨).

[2] عبدالرزاق (١٢٦/٣).

[3] الطبري (٢٥٦/٢٠).

[4] يس (٨١).

[5] الغافر (٥٧).

## باسی ڕێزگرتنی خودای مەزن لە داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی لە لایەن خۆمانەوە بەهرەیەکی گەورەمان بە داود بەخشیبوو ئەی چیاکانو باڵندەکان لەگەڵ داود زیکرو تەسبیح بڵێنەوە. خوای گەورە باسی عەبدو پێغەمبەری خۆی داود دەکات کە چەندە ڕێزی لێناوە، کردووشیەتی بە فەرمانڕەواو خاوەن دەسەڵاتو لەشکرێکی زۆریشی پێداوە بە هەموو پێویستیەکی جەنگەوە، وە دەنگێکی گەورەو فرەخۆشی پێ بەخشی کە هەر کاتێك تەسبیحاتی بکردایە کێوەکانیش لەگەڵی تەسبیحاتیان دەکرد، باڵندەکان لە ئاسماندا کاتێك هاتوچۆیان دەکرد کە گوێیان لێ دەبوو دەوەستانو لەگەڵ داود پێغەمبەر (ﷺ) بە دەنگەکانی خۆیان ئەوانیش دەیانگووتەوە لەگەڵیدا. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) گوێی لە دەنگی ئەبو موسای ئەشعەری بوو (ڕەزای خوای لێ بێت) لە شەودا قورئانی بە دەنگی بەرز دەخوێند وەستاو گوێی لێ گرتو پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەمە نەغمەیەکی پێدراوە لە نەغمەکانی ئالی داود).[1] ئەبو عوسمانی نەهدی دەڵێت: گوێم نەبووە لە دەنگی هیچ سەرنج و (دوو دەوری خڕە دەدرێت بەیەکدا) عودو کەمانچەیەك خۆشتر بێت لە دەنگی ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێت).[2]

﴿أَوِّبِى﴾ واتە: پەسەنیو پاکی خوا بدە، ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو موجاهیدو کەسانی تریشە.[3] (التأويب) لە زمانەوانیدا، واتە: وتنەوە، خودا فەرمانی کرد بە کێوەکانو باڵندەکان لەگەڵ داوددا تەسبیحاتەکان بڵێنەوە بە دەنگی خۆیان. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ﴾ واتە: وە ئاسنمان بۆ نەرم کردبوو، قەتادەو حەسەنی بەسریو کەسانی تریش وتوویانە: پێغەمبەر داود(سەلامی خوای لێ بێت) پێویستی بەوە نەبوو کە ئاسن بخاتە ناو ئاگرو بە چەکوش لێی بدات بەڵکو وەك دەزوو لوولی ئەدا![4] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَنِ ٱعْمَلْ سَٰبِغَٰتٍ ﴾ واتە: پۆشاکی ئاسن(زرێپۆش) دروست بکە، ئەمە ڕێڕوونیەکە لەخواوە بۆداود پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ تافێری بکات چۆن زرێپۆش دروست بکات موجاهید ئەڵێت: قەتادە دەڵێت: ئەوە یەکەمجار بووە کە خەڵکی دروستی بکات، چونکە لەپێش ئەودا تەنیاقەڵغان هەبوو.[5] ﴿وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ﴾ واتە: بزمار مەکوتە

---

[1] مسلم (١/٥٤٦).

[2] فضائل الترعان لأبي عبيد (٧٩).

[3] الطبري (٢٠/٣٥٧).

[4] الطبري (٢٠/٣٥٩).

[5] الطبري (٢٠/٣٥٩).

بەزرێپۆشەکەدا تاهاتوچۆ بکات، ئەوەندەش قایم دروستی مەکە نەجولێت‌و بشکێت بەڵکو بە ئەندازەی خۆی.[1] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ﴿ٱلسَّرۡدِ﴾ واتە: بازنەی ئاسن، هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: بازنەی بزماراوی (بە بزمار داکوتراو) شیعری ئەم شاعیرەیان کردووەتە بەڵگە:

وعليهما مَسرودتان قَضاهما داودُ، أو صَنَعَ السَّوابغ تُبَع

﴿وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا﴾ واتە: کاری چاك بکەن لە باتی ئەو بەهرانەی کە خودا پێی داون، ﴿إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ﴾ واتە: من خۆم کارەکانی ئێوە دەبینم‌و چاودێرم بەسەرتانەوە ئاگاداری کردارو گفتارتانم‌و هیچم لێ ون نابێت.

﴿ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِۖ وَمِنَ ٱلۡجِنِّ مَن يَعۡمَلُ بَيۡنَ يَدَيۡهِ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَمَن يَزِغۡ مِنۡهُمۡ عَنۡ أَمۡرِنَا نُذِقۡهُ مِنۡ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعۡمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ وَجِفَانٖ كَٱلۡجَوَابِ وَقُدُورٖ رَّاسِيَٰتٍۚ ٱعۡمَلُوٓاْ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكۡرٗاۚ وَقَلِيلٞ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾﴾

**ڕێزگرتنی خودای مەزن لە سولەیمان پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)**

کاتێك خوای گەورە باسی ئەو هەموو بەهرەیەی کرد کە دابووی بە داود دێتە سەر باسی کوڕەکەی سولەیمان(سەلامی خوایان لێ بێت) کە بای بۆ ڕام هێنا کە بەڕەکەی هەڵدەگرت، تەنها سەرلەبەیانی سێ ڕۆژەڕێ‌و سەرلە ئێوارەش سێ ڕۆژەڕێگەی دەبڕی. حەسەنی بەسری دەڵێت: سەر لە بەیانی دەچووە سەر بەڕەکەی لە دیمەشقەوە دەچوو بۆ ئیستەخر لەوێ نانی بەیانی دەخوارد، پاشان لە ئیستەخرەوە دەچوو بۆ کابول‌و لەوێ دەمایەوە.[2] نێوانی دیمەشق‌و ئیستەخر بە ئەندازەی ڕۆیشتنی مانگێك ڕێگە بوو بە پەلە‌و نێوانی ئیستەخرو کابولیش هەروەها. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهۡرٞ وَرَوَاحُهَا شَهۡرٞۖ وَأَسَلۡنَا لَهُۥ عَيۡنَ ٱلۡقِطۡرِ﴾ واتە: وە بۆ سولەیمان (با) مان ڕام هێنا بەیانیان تا نیوەڕۆ ڕێگای مانگێنی دەبڕی‌و نیوەڕوان تا ئێوارانیش مانگێك ڕێگەی دەبڕی‌و مسمان بۆ تواندەوە وەك کانیاو دەڕۆیی، ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو عیکریمەو عەتای خۆراسانی‌و قەتادەو سودی‌و مالیك دەڵێن: لە زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و کەسانی تریشەوە ﴿ٱلۡقِطۡرِ﴾ واتە: مس.[3] قەتادە دەڵێت: ئەو مسە لە یەمەن بووە.[1] هەر شتێك مەردم دروستی

---

[1] الطبري (٢٠/٣٦١).

[2] الطبري (٢٠/٣٦٢).

[3] الطبري (٢٠/٣٦٣/٣٦٤).

دەكات، خوای گەورە بۆ سولەیمانی دەرهێنا (سەلامی خوای لێ بێت)، وە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ﴾ واتە: جنۆكەشمان بۆ ڕام هێنا كە لەبەر دەستیدا كاریان دەكرد بە فەرمانی خودای مەزن، سولەیمان بە ئارەزووی خۆی كۆشكو هەر شتێكی تری بویستایە پەریەكان بۆیان دروستی دەكرد. ﴿وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا﴾ واتە: هەر كەسێك لەوانە خۆی لادایەو لە فەرمانی ئێمە دەرچوونایە، ﴿نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾ واتە: ئازاری توندی ئاگرمان پێ دەچەشت. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَٰرِيبَ وَتَمَٰثِيلَ﴾ واتە: سولەیمان هەرچی بویستایە بۆیان دروست دەكرد لە پەرستگاو پەیكەر. ﴿مَّحَٰرِيبَ﴾ واتە: كۆشكو تەلاری چاك، كە باشترین شوێنی كۆشكە لە پێشەوە، ئیبنو زەید دەڵێت: شوێنی حەوانەوەو ئیسراحەت.[2] ﴿وَتَمَٰثِيلَ﴾ عەتیەی عەوفیو زەححاكو سودی دەڵێن: وێنەی پەیكەریی.[3] ﴿وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَٰتٍ﴾(جواب) جەمعی جابیەیە، واتە: حەوزێك كە ئاوی تێدا بێت، چەندین قاپی نان خواردن وەك حەوزی گەورەو چەند قازانو مەنجەڵی دامەزراو (نەجوڵاو لەبەر گەورەییان)، ﴿ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا﴾ واتە: ئەی ماڵو كەسو كاری داود شوكری خودا بكەن لەسەر ئەو بەهرانەی كە خودا پێی داون لە دنیاو لە قیامەتدا. وشەی (شكر) چاوگە (مصدر) یان (مەفعول لە) لە هەردوو شێوەكەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە شوكر بە كردارو بە گفتارو بە دڵیش دەبێت وەك ئەم شاعیرە وتوویەتی:

أفادَتْكُمَ النُعماء منّي ثلاثة　　　　يدي، ولساني، والضّميرَ المُعجباً

ئەبو عەبدوڕەحمانی سوللەمی دەڵێت: نوێژ كردن شوكرە، ڕۆژو گرتن شوكرە، هەموو چاكەیەك كە دەیكەی شوكرە، وە مەزنترین شوكریش سوپاسو پەسەنی خودایە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە.[4] وە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆشەویسترین نوێژ لەلای خودا نوێژی داودە،[5] چونكە داود نیوەشەو دەخەوت پاشان سێ یەكی هەڵدەساو شەش یەكیش دەخەوتەوە. وە خۆشەویسترین ڕۆژوش ڕۆژوی داود بو لەلای خودا، لەبەر ئەوە ڕۆژێك بەڕۆژو دەبو

---

[1] الطبري (٢٠/٣٦٣).

[2] الطبري (٢٠/٣٦٥).

[3] الطبري (٢٠/٣٦٦).

[4] الطبري (٢٠/٣٦٧).

[5] الطبري (٢٠/٣٦٩).

ڕۆژێکیش بە ڕۆژوو نەدەبوو، وەکاتێ ڕووبەڕووی دوژمن ببوایەتەوە ڕای نەدەکرد)[1]، ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە فوزەیلەوە لەم ئایەتەدا ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا﴾ دەڵێت: داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) گوتویەتی: ئەی پەروەردگارم چۆن سوپاست بکەم، کە سوپاس کردن بەهرەیەکە لە خۆتەوە؟ خودای مەزنیش فەرموویەتی: ئا ئێستا سوپاسی منت کردوە کاتێ کەزانیوتە بەهرەهەرلەمنەوەیە[2]، ﴿وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾ بەڵام کەمێ لە بەندەکانم (بۆخوا) سوپاس گوزارن ئەمەش هەواڵدانێکە لەو واقیعەی خەڵکی تێدا ئەژی .

﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴿١٤﴾ ﴾

**مردنی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی چۆنیەتی مردنی سولەیمان دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) کە چۆن مردنەکەی لەو جنۆکانە شاردەوە کە لە کاری گراندا بەکاری دەهێنان و نەیاندەتوانی لە فەرمانی دەربچن، چونکە سولەیمان ماوەیەکی زۆر بوو خۆی دابوو بەسەر گاچۆنەکەیدا وەك ئیبنو عەباس و موجاهیدو حەسەن و قەتادەو زۆرێکی تریش لە زانایان وتوویانە.[3] ماوەیەکی زۆر، واتە: نزیکی ساڵێك بەسەر عاساکەیەوە مایەوە، کاتێك کە مۆریانە دای لە عەساکەی و خواردی، ڕزاو کەوتە سەر زەوی، زانیان کە ماوەیەکی زۆرە مردووە، جنۆکەو مەردوم بۆیان دەرکەوت کە جنۆکە ئاگای لە شتی نادیار نیە، وەك خۆیان دەیانوت و خەڵکیشیان وا تێدەگەیان. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾ واتە: ئینجا کاتێك سولەیمانمان مراند هیچ شتێك مردنی ئەوی نیشان نەدان بێجگە لە خۆرەو موریانەی زەوی کە داردەستەکەی (سولەیمان)یان دەخوارد(کە سولەیمان خۆی دابوو بەسەریدا)، ئینجا کاتێك (سولەیمان) کەوت بۆ پەریەکان ڕوون بوویەوە کە ئەگەر غەیبیان بزانیبایە لەو سزا ڕیسواکەرە نەدەمانەوە.

[1] فتح الباري (٦/٥٢٥)، مسلم (٢/٨١٦).

[2] الدر المنثور (٦/٦٨٠).

[3] الطبري (٢٠/٣٧٠).

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾﴾

**پیٚ نەزانینی خەڵكی سەبەء بە بەهرەكانی خوداو سزادانیان**

خوای مەزن دەفـەرمووێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ واتە: سوێند بـە خـوا بـە ڕاستی بۆ خـەڵكی سـەبەء لـەو شـوێنی ژیانیانـدا نیـشانەیەك لەسـەر دەسـەڵاتی خـودا هـەبوو دوو باخـات لای ڕاسـتو لای چـەپی شوێنەكەیەوە هەبوو پێیان دەوترا لە ڕۆزی پەروەردگارتان بخۆنو سوپاسی ئەو بكەن ولاتێكی پـاكو خۆشو پەروەردگارێكی لێبوردەیان هەیە. سەبەء ولاتێكە كەوتووەتـە باشووری خۆرئاوای دوورگـەی عەرەبیـەوە (واتـە: یەمـەن)، سـەبەء ناوێكـە بـۆ سـەركردەكانو پاشـاكانی خـەڵكی ئـەو هەرێمـە (توببەعیـەكان)یـش هەریەمـەنی بـوون، بـەلقیس كـە هاوسـەری سـولەیمان بـوو یـەكێك بـووە لـەو سەركردانەی سەبەء. ئەو خەڵكەزۆر لە خۆشـیو خۆشگوزەرانی بوون لـەو ولاتـەدا، كشتوكاڵو بـاغو باغاتێكی زۆریان هەبوو، بژێویان زۆر چاك بوو، خوای مەزن پێغەمبەرانی بۆ ناردن فەرمانیان پیٚ كردن كە لە ڕۆزی خودا بخۆنو شوكرانەبژێر بن و بە تەنها خودا بپەرستنو عیبادەتی بۆ بكەن، بـەو شێوەیە هەتا ماوەیەكی زۆر مانەوە بە ویستی خودا، پاشان سەرپێچیان كرد لەوەی كە فەرمانیان پـیٚ كرابوو، خودایش سزای دان بە لافاوو زریان لەو هەرێمی سەبەئەدا بلاوەی پێكردن هەریەكی بـە لایەكدا بـردنو پەرتەوازە بوون، وەك لە دواوە بە درێژی بەم زووانە باسی دەكـەین (بەیارمـەتی خـوای مـەزن). ئیبنـو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە فەروەی كوڕی موسەیكی غەتەفیەوە(ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: پیاوێـك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسی سەبەئم بۆ بكە كامەیە؟ ئایا نـاوی زەویەكەیـە یان ژنێكـە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نە زەویەو نە ژنە، بەڵكو پیاوێك بـووە دە كـوڕی هـەبووە، شـەش كوڕیـان ڕووەو یەمەن ڕۆیشتنو چوار كوڕیشیان بەرەو شام ڕۆیـشتن، ئەوانـەی كـە بـەرەو شـام چـوون لـەخمو جوزامو عامیلەو غەسسان بوون، ئەوانەی بەرەو مەیەن چوون كەندەو ئەشعەریەكانو ئەزدو مـەزحیجو حیمیـەرو ئـەنمار بـووە). پیاوێـك وتـی: ئـەنمار كامانـەن؟ پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: (ئەوانـەن كـە خەسحەمو بەجیلەش لەوانن).[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی كردووە، پاشـان دەڵێـت: ئـەم فەرموودەیـە چاكو

[1] الطبري (٢٠/٢٧٥).

غەریبە (حسن غریب)[1]. زانایانی ڕەچەڵەك ناس لەوانە موحەممەدی كوڕی ئیسحاق دەڵێت: ناوی سەبەء عەبدوشەمسی كوڕی یەشجوبی كوڕی یەعروبی كوڕی قەحتانە بۆیە ناوی نراوە بە سەبەء چونكە یەكەم كەس بووە لەناو عەرەبدا كە(سەبایا) دیلی گرتووە پێیان وتووە رائیش لەبەر ئەوە كە یەكەم كەس بووە لەناو عەرەبەكاندا تالانی كردووەو دابەشی كردووە بەسەر هۆزەكەیدا،بۆیە پێیوتراوە: (رائش)، عەرەبەكان سامانیان بە (ریشاً ورياشاً) ناو هێناوە. زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر قەحتانیەكان، سێ ڕایان هەیە، ڕای یەكەم: كە لە ڕەچەڵەكی ئیرەمی كوڕی سامی كوڕی نوحە، وە ناكۆكیشن لەسەر چۆنیەتی پەیوەندی ڕەچەڵەكی قەحتان بە ئیرەمی كوڕی سامی كوڕی نوحەوە بەسەر سێ(ڕا) دا. ڕای دووەم: لە ڕەچەڵەكی عابیرن كە هود پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێت) دیسان ڕایان جیاوازە لەسەر چۆنیەتی پەیوەندی قەحتان بە هودەوە بەسەر سێ(ڕا) دا. ڕای سێیەم: لە ڕەچەڵەكی ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیمی خەلیلن (سەلامی خوای لێ بێت) وەدیسان ڕایان جیاوازە لەسەر چۆنیەتی پەیوەندی قەحتان بە ئیسماعیلەوە بەسەر سێ (ڕا) دا. ئەبو عومەری كوڕی عەبدولبەڕی نەمری(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) باسی كردووە لە كتێبەكەیدا بە ناوی (ألأنباه على ذِكرِ أصولِ القبائل الرواة). مانای ئەم فەرموودەی پێغەمبەریش (ﷺ)كە ئەفەرموێ: (كان رجلاً منَ العرب) واتە: عەرەبی عاریبەن ئەوانەی لە پێش ئیبراهیمی خەلیلەوە(سەلامی خوای لێ بێت) لە ڕەچەڵەكی سامی كوڕی نوح بوون . وە لەسەر ڕای سێهەمیش دەگەڕێنەوە سەر ڕەچەڵەكی ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لێ بێت) بەڵام ئەم ڕایە مەشهور نیە لای زانایان (والله أعلم) بەڵام لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە لای كۆمەڵێك لە ئەسلەمیەكاندا تێپەڕی ڕمبازیان دەكرد، فەرمووی: (تیر بگرن نەوەی ئیسماعیل چونكە باوكیشتان هەر تیر وەشێن بووە)[2]. (ئەسلەم) یش هۆزێكی ئەنساری موسڵمان بوون (ئەنساریەكان بەئەوس و خەزرەجیشەوە لە غەسانیەكان بوون كەلە عەرەبەكانی یەمەنن لە وڵاتی سەبەء) كاتێك كە بڵاوبوونەوە بە وڵاتاندا هاتنە مەدینە لە دوای لافاوەكەی سەبەء كە خوای مەزن بۆی ناردن ئەمان هاتنە مەدینەوجێگیر بوون و، هەندێكیشیان چوونە شام، بۆیە پێیان دەوتن غەسسان بە هۆی ئاوێكەوە بوو كە دابەزین لەسەری. هەندێكیش ئەڵێن:ئەو ئاوە لە یەمەن بووە، هەندێكی تریش ئەڵێن: نزیك بووە لە موشەلەلەوە وەك حەسانی كوڕی سابت دەڵێت:

إمَّا سألتَ فَإنَّا مَعْشَرُ نُجُبُ     الأزدُ نِسبَتُنا، والماءُ غَسّانُ

---

[1] تحفة الأحوذي (٨٨/٩٠)، فەرموودەیەكی حەسەنی غەریبە.

[2] فتح الباري (٦٢١/٦).

وە مانای ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (ولَدَ له عشرة من العَرَب) واتە: لە ڕەچەڵەکی ئـەم دە کوڕە کە سەرچاوەی هۆزەکانی عەرەب دەگەڕێنەوە بۆیان، نەك هەر لە پشتی ئەوانن بـەڵکو لـە نێـوان ئەو هۆزانەی ئەواندا چەند پشتێك (بابێ، بـاپیرێ) لـە نێوانیانـدا هـەبووە وەك لـە کتێبـی ڕەگەزەکانـدا دیارەو دەسنیشان کراوە. وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (فتيامن منهم ستة، وتشاءم منهم أربعة) واتە: دوای ئەوەی کە خوای گەورە لافاوەکەی (سيل العرم) بۆ نـاردن، هەنـدێکیان لـە وڵاتـی خۆیانـدا مانەوە، هەندێکی تریان بڵاوەی کرد بە وڵاتانی تردا.

**بەنداوی مەئرەب ولافاوەکەی ( عەریم )**

بـە هـۆی ئـەو بەنـداوەوە کـە دروسـتیان کردبـوو هەرچـی ئـاوی نێـوان ئـەو دوو کێـوە هـەبوو کۆدەبوویەوەو هەرچی ئـاوی بـاران و لافـاوی دۆڵـەکانی هـەبوو دەهاتـە نـاوی، لەبـەر ئـەوە یـەکێك لـە پاشـاکانی سـەبەء هەڵـسا بـە دروسـتکردنی بەنـداوێکی زۆر مـەزن و قـایم هـەتا وای لێ هـات ئاوەکـەی ئەوەندە سەرکەوت دەگەیشتە هەموو زەویـەکانی دەوروبـەری ئـەو دوو کێـوە بـە ئاسـانی هـەموو ئـەو زەویانەیان چاند بە درختی بەردار پڕبوو لـە هـەموو جـۆرە میوەیـەکی چـاك و بەسـوود وەك زۆرێـك لـە زانایانی پێشینە باسیان کردووە، لەوانـە قـەتادە دەڵێـت: ژنـان دەڕۆیـشتن بـە ژێـر ئـەو درەختانـەدا زەمبیلەیان لەسەر سەریان دادەنا، بەبێ ئەوەی دەست بـدەن بـە درەختێکـەوەو میـوەی لێ بکەنـەوە میوەکان دەبارینە خوارو دەکەوتنە ناو زەمبیلەکەوە بەسەریانەوەو پڕ دەبوو، ئەوەندە میوەکان گەیو بوون و پێگەیشتبوون.[1] ئەم بەنداوەش لە مەئرەبدا بوو، شارێك بـوو کـە سـێ وچـان لـە سـەنعاوە دوور بوو، ناسرابوو بە بەنداوی مەئرەب، هەندێکی تر وتوویانە: ئەو وڵاتـەی ئـەوان مێش و مێـشوولە و کێچ و ئەسپێی نەبووە، چونکە ئاوو هەوایەکی سازگارو زۆر خۆشـی هـەبوو، هـەموو لـەش سـاغ و تەندروسـت بوون و خودایش یارمەتی دەدان، چونکە خواناس و یەکتاپەرست بوون وەك خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ﴾ پاشـان تەفـسیری دەکـات و دەفــەرمووێت: ﴿جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ﴾ واتە: لە هەردوو لای کێوەکان دوو ڕیز بـاغ کـە شـارەکە لـە نێوانیانـدا بـوو، ﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ واتە: پەروەردگار لێتان دەبووورێت هەتا ئێوە بەردەوام بن لەسـەر خواناسـی و یەکتاپەرستی. پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ واتــە: ئینجـا ڕوویـان وەرگێڕابەو هۆیەوە لافاوی وێرانکارمان بۆ ناردن دووباخـاتی چـاکی بەروبوومـداری ئـەوانمان گـۆڕی بـە

[1] الطبري (٢٠/٣٧٦).

دوو باخاتی خراپی خاوەن بەرێکی تفتو تاڵو دار گەزو کەمێك لە داری نەبگ(سیدر)، ﴿ فَأَعْرَضُواْ ﴾ واتە: نافەرمانی خودایان کرد لە عیبادەتو یەکتاپەرستیداو شوکری ئەو هەموو بەهرەیان نەکرد کە خودا پێی بەخشیبوون، دەستیان دایە خۆر پەرستی وەك پەپوسلیمانەکە وتی بە سولەیمان: ﴿وَجِئۡتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ٢٢ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ٢٣ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴾[1] واتە: لە وڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاستەقینەم بۆ هێناوی، بە ڕاستی من دیم ئافرەتێك پادشای ئەوانە (بە ناوی بەلقیس) کە هەموو شتێکی پێدراوەو تەختێکی پادشایەتی زۆر گەورەی هەیە، خۆی وگەلەکەیم دی لە جیاتی خوا سوژدە بۆ ڕۆژ دەبەنو شەیتان کردەوە خراپە کانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە بەو هۆیەوە بەرگری کردوون لە ڕێگەی ڕاست بۆیە ئەوان ڕێگەی ڕاست نادۆزنەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ﴾ مەبەست بە: ﴿ٱلۡعَرِمِ﴾ ناوە. واتە ئیزافەی ناوە بۆ ئاوەڵناوەکەی خۆی (من باب الإضافة الاسم الی صفته)یە وەك (مسجد الجامع) یان (سعیدکرز) ئەم قسە سوهەیلی ئەیگێڕێتەوە. وە زۆر کەسی تر وتوویانە لەوانە ئیبنو عەباسو وەهەبی کوڕی مونەبیە و قەتادەو زەحاك، کاتێك کە خودا ویستی سزایان بدات بە ڕەوانەکردنی لافاو بۆیان، جۆرە گیانەوەرێکی نارد بۆ بەنداوەکە پێیان دەوت جرجە کوێرە بەنداوەکەی کون کون کرد.[2] وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێت: لە ناو کتێبەکانیاندا بینراوە هۆی ڕووخانو کاول بوونی بەنداوەکەیان جرج بووە ماوەیەکی زۆر پشیلەیان دانابوو لەسەر بەنداوەکە بۆ لەناوبردنی جرجەکان کە بڕیاری خودا هات جرجەکان زاڵ بوون بەسەر پشیلەکانو چوونە ناو بەنداوەکەوەو کونیان تێکردو هەرەسی کردو ڕوخا بەسەریاندا.[3] قەتادەو کەسانی تریش دەڵێ (جرز) یانی: مشکە کوێرە، چوونە ژێری بەنداوەکەو کون کونیان کردو لە کاتی وەرزی باراندا لافاو هەڵی کردو هات بەنداوەکەی هەرەس پێ هێناو ڕووخاندی، ئاوەکە بەو دۆڵو شیوەدا هاتە خوارەوەو بەری هەرچی دەکەوت وێرانی دەکرد لە کۆشكو تەلارو دارو درەختو هەر شتێکی تر.[4] ئاوەکە نەماو وشکی کردو درەختەکان لە تینواندا وشك بوون کە دوو ڕیزە باغ بوون بە لای ڕاستو لای چەپی ئەو شارەدا هەمووی فەوتاو لەناو چوو، لە جێی ئەو درەختە

[1] النمل (٢٢ـ٢٤).

[2] الطبري (٢٠/٢٧٨/٣٨٠).

[3] الطبري (٢٠/٣٨١).

[4] الطبري (٢٠/٣٨١).

جوان‌و پڕ بەرهەمانە درەختی بێ بەرو دڕکاوی سەوز بوو، وەك خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ﴾ ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو عیکریمەو عەتای خۆراسانی‌و حەسـەن‌و قەتادەو سودی دەڵێن: ﴿خَمْطٍ﴾ دار سیواك‌و وشـتر خـۆرە (گیایـەكی دڕكاویـە)[1]. ﴿وَأَثْلٍ﴾ عـەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: واتە: درەختی تەرفا هەندێكیش وتوویانە: درەختێكە لـە(تـەرفا) دەچێت، وە هەندێكی تریش وتوویانـە: درەختـی مـۆزە. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾ واتـە: لـە جێی ئەو هەموو درەختە جوان‌و پڕ بەهرانە درەختی دار سیواك‌و نەبەگمان بۆ هێشتنەوە ﴿وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ﴾یانی: بە هۆی ئەو سەرپێچیانەوە كە كردیان وایان بەسەرهات لە جێـی ئـەو بـاغ‌و باغاتـە جوان‌و پڕ بەرهەم‌و خاوەن سـێبەرە زۆرەدا، ئـەو هـەموو ئـاوە كـە بـە دەوریانـدا دەڕۆیـشت درەختـی دڕكاوی وەك دار سیواك‌و نەبەگـو دار گەزو وشترخۆری دڕكاوی كەم بەرهەممان بۆ هێشتنەوە، تووشـی ئەو سزا گرانە بوون بەهۆی ئەو بێ دینی‌و دژایەتی كردنی هەق‌و بەردەوام بوون لەسەر ڕێگـەی خـراپ‌و پڕوپوچ. بۆیە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا۟ وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ﴾ واتە: ئەوانە سپڵەی پێ نەزان بوون بە هۆی ئەو سپڵەییانەوە سزامان دان. موجاهید دەڵێت: كەسـێك سپڵە نـەبێت خودا سزای نادات.[2] حەسەنی بەسری دەڵێت: خوای گەورە ڕاستی فـەرمووە هـیچ كەسـێك بـەو وێنەیـە سزا نادات مەگین سپڵە و نەزان نەبێت.

﴿وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ ٱلْقُرَى ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَٰهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا ٱلسَّيْرَ سِيرُوا۟ فِيهَا لَيَالِىَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا۟ رَبَّنَا بَٰعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَٰهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾﴾

### بازرگانی سەبەء و هاتوچۆیان

خـوای گـەورە باسـی ئـەو هـەموو خۆشـگوزەرانی‌و ژیانـە خۆشـەیان دەكـات كـە چـەند دڵخـۆش‌و بەهرەمەند بوون، هەرێمێكی زۆر فراوان‌و باغ‌و باغات‌و سـەیرانگاو دێهـاتی نزیـك‌و لـە تەنیـشت یـەكترو قەرەباڵغ‌و پڕ دارو درەختی بەرهەمدارو كشتوكاڵێكی زۆر كە پێویستیان بەوە نەبوو كە خـواردن‌و ئـاو لەگەڵ خۆیان هەڵگرن. بەڵكو لە هەر شـوێنێك دابـەزیبن خـواردن‌و ئـاوو میـوە هـەبووەو لـە دێیەكـەوە چوونەتە دێیەكی ترو ڕێزیان لێ گـیراوە. ئـەوەی پێویـستیان بـووە لـەو گوندانـەدا هـەڵیان گرتـووە بـۆ

[1] الطبري (٢٠/٣٨٢/٣٨٣).

[2] البغوي (٣/٥٥٥).

ڕێگەیان. بۆیە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمۡ وَبَيۡنَ ٱلۡقُرَى ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَا﴾ واتە: وە لـە نێوان ئـەوان‌و ئـەو شـارانەی پیـت‌و بەرەکـەتمان تـێ‌ خـستبوون لـە شـام سـازاندبوومان، موجاهیـدو حەسەن‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو مالیك لە زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و قەتادەو زەححاك‌و سودی‌و ئیبنـو زەیدو کەسانی تریش دەڵێن: واتە: گوندەکانی شام، مەبەستیان ئەوەیە کە خەڵکی سـەبەء دەچـوون‌و سەفەریان دەکرد لە یەمەنەوە بۆ شام بـەناو ئـەو گوندانـەدا کـە نزیـك لـە پـاڵ یـەکتر بـوون.[1] عـەوفی دەڵێت: لـە ئیبنـو عەباسـەوە مەبەسـت بـە ئـەو گوندانـە کـە بەرەکـەتی خۆمـان تێخـستووە: قودسـی پیرۆزە.[2] ﴿قُرٗى ظَٰهِرَةٗ﴾ واتە: چەند دێیەکی ئاشکراو دیارن لـە هەندێکیانـدا ئیـسراحەت دەکـەن‌و لـە هەندێکیاندا دەمێننەوە هیچ کاروانچیەك لێی تێك ناچێت، بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَقَدَّرۡنَا فِيهَا ٱلسَّيۡرَ﴾ واتە: ماوەکەمان دیـاری کـردووە، کاروانـچی دەزانێـت چـی پێویـستە لەگـەڵ خـۆی هـەڵ گرێت، ﴿سِيرُواْ فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا ءَامِنِينَ﴾ واتە: ترسیان نیە بـە شـەوو بـە ڕۆژ لـەو گوندانـەدا دێن‌و دەچـن. پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرموویت: ﴿فَقَالُواْ رَبَّنَا بَٰعِدۡ بَيۡنَ أَسۡفَارِنَا وَظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ واتـە: وتیان: ئەی خوایە سەفەرەکەمان زیاتر بۆ دوور بخەرەوە! کە ناهەقییان لە خۆیـان کـرد، هەنـدێ ئـەم ئایەتەیان خوێندووەتەوە بەم شێوەیە: (بَعَّد بين أسفارنا) چونکە ئەمانە ئەم بەهرەیان بە کەم دەزانـی وەك ئیبنو عەباس‌و موجاهیـدو حەسـەن‌و کەسـانی تـریش وتوویانـە. حـەزیان لـە ڕێگـای دووروودرێـژو چۆڵی‌و بیابان دەکرد بۆ ئەوەی توێشووی زۆر لەگـەڵ خۆیـان هـەڵگرن‌و ماوەیـەکی زۆر بـە چۆڵەوانی‌و ترسدا ڕێگە ببڕن‌و بـڕۆن. ﴿فَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَ وَمَزَّقۡنَٰهُمۡ كُلَّ مُمَزَّقٍ﴾ واتـە: وامـان لێ کـردن بـوونـە جێـی قسەی خەڵکی وپەندی زەمانـە. بـە هـۆی ئـەو ناشـوکریەیانەوە چـۆن خـوای گـەورە لـەو هـەموو نـازو نیعمەتەدا کە تێیدا بوون لە هیچ شتێك کەمیان نەبوو هەرچیان ئـارەزوو بکردایـە دەسـتیان دەکـەوت، بەڵای بەسەردا هێنان‌و پەرش‌و بڵاوی کردن‌و کردنیە پووشی بنی دڕك هەر کەسەو بە لایەکدا چوو بـە وڵاتاندا، بۆیە عەرەبەکان: کاتێك کە هۆزێك لێی قەوما، پێی ئەڵێن: (تفرَّقوا أيدي سبا، وأيادي سبا، تفرق شَذَرَ مَذَر) واتـە: پـەرش‌و بڵاوبـوون وەك هێزەکـانی سـەبەء، تـەفروتونا بـوون. خـوای مـەزن دەفەرموویت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ﴾ واتە: بە ڕاستی لەو بەسەرهاتەدا چەند نیشانە هەیە بۆ کەسی زۆر خـۆگری شـوکرانەبژێر، ئـەو ڕووداوەو ئـەو سزاو ئـەو نـەمانی هـەموو نیعمەتـە کـە

---

[1] الطبري (٢٠/٣٨٦/٣٨٧).

[2] الطبري (٢٠/٣٨٦).

بەسەر ئەواندا هات گشتی بە هۆی ئەو خوانەناسیو سپڵەییو تاوانەیانەوە بوو کە پێی هەڵسان، پەندو ئامۆژگاریشە بۆ هەموو عەبدێکی خۆڕاگرو سوپاسگوزار لەسەر ئەو بەهرانەی کە خودا پێی داون. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (سەرم سوڕماوە لە بڕیاری قەزای خوا بۆ خاوەنباوەڕ، ئەگەر تووشی چاکەیەك بووبێت سوپاسو ستایشی پەروەردگاری کردووە، وە ئەگەر تووشی بەڵایەکیش بووبێت سوپاسی خودای کردووەو ئارامی گرتووە، خاوەن باوەڕ پاداشتی دەدرێتەوە لەسەر هەموو شتێك هەتا لەسەر تیکەیەك کە هەڵی دەگرێتو دەیکات بە دەم ژنەیەکەیەوە).[1] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لە (اليوم والیلة)دا.[2] نموونەی ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەی ئەبو هورەیرەدا (ڕەزای خوای لێ بێت): (جێی تێڕوانینە فەرمانو کاری خاوەن باوەڕ، خودا هیچ بڕیارێکی بۆ نادات چاکەو خێری ئەوی تێدایە نەبێت، ئەگەر تووشی خۆشی بووبێت سوپاسی خودای کردووە کە زۆر چاك بووە بۆی وە ئەگەر تووشی ئازارێکیش بووبێت خۆی ڕاگرتووە، کە زۆر چاك بووە بۆی، وە ئەمە بۆ هیچ کەسێك نیە بۆ خاوەن باوەڕ نەبێت).[3] لە قەتادەوە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ﴾ دەڵێت: موتەڕیف دەڵێت: عەبدێکی زۆر چاکە بەندەی خۆڕاگری سوپاسگوزار ئەگەر شتێکی پێدرا سوپاسی خوا ئەکات و ئەگەر تووشی بەڵایەکیش بوو خۆی ئەگرێت[4].

﴿ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيۡهِم مِّن سُلۡطَٰنٍ
إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يُؤۡمِنُ بِٱلۡأٓخِرَةِ مِمَّنۡ هُوَ مِنۡهَا فِي شَكّٖۗ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٍ حَفِيظٞ ﴿٢١﴾ ﴾

**گومانی شەیتان بە ڕاست دەرچوو لەسەر خوانەناسان**

پاش ئەوەی کە خوای مەزن باسی بەسەرهاتی گەلی سەبەئی کرد کە شوێن هەواو ئارەزووی خۆیانو شەیتان کەوتنو چیان بەسەر هات، لێرەشدا هەر دێتەوە سەر باسی ئەوانو ئەوانەشی کە وەك ئەوان شوێنی شەیتان کەوتوونو دژایەتی ڕێی ڕاستو دروست دەکەن دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدۡ صَدَّقَ عَلَيۡهِمۡ إِبۡلِيسُ ظَنَّهُۥ ﴾ ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) کەسانی تریش وتوویانە.[5] ئەم ئایەتە

---

[1] أحمد (١٧٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] النسائي في الكبرى (٦/٢٦٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە

[3] فتح الباري (١٠/١٠٧).

[4] مسلم (٤/١٩٩٢).

[5] الطبري (٢٠/٣٩٢).

وەك ئەو ئایەتە وایە كە باسی شەیتان دەكات كاتێك سوژدە نابات بۆ ئادەم (سەلامی خوای لێ بێت) ئەڵێ: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1] واتە: (ئیبلیس) وتی: پێم بڵێ‌و هەواڵم بدەرێ لە بارەی ئەمەوە كە ڕێزی ئەوت داوە بەسەر مندا؟! سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی دوایی و نەمرم، بە ڕاستی زاڵ دەبم بەسەر نەوەكانیدا بە گومڕاكردنیان تەنیاكەمێك لەوان نەبێت(كە بەندە تایبەتیەكانی خوان)، وە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ﴾[2] واتە: ئینجا سوێند بێت بێگومان بۆیان دەچم لە پێشیانەوەو لە دوایانەوەو لای ڕاستیان‌و لای چەپیانەوە ئەوسا نابیی زۆربەیان سوپاسگوزار بن. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرن. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ﴾ واتە: وە شەیتان هیچ دەسەلاتی بەسەر ئیمانداراندا نەبوو، ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە: لە بەلگەیەك. ﴿إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ﴾ واتە: بەڵكو توانای لەسەریان بۆ ئەوە بوو كە كرداری ئەوانە دەركەوێت كە بڕوایان هەیە بە لێپرسینەوەو پاداشت لە ڕۆژی قیامەتدا، هەتا بە چاكی عەبدایەتی پەروەردگار یان بكەن لە دنیادا، كێش دوو دڵەو گومانی هەیە لە ڕۆژی قیامەت. ﴿وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ﴾ واتە: وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد(ﷺ)) چاودێرە بەسەر هەموو شتێكوە . واتە: لەگەڵ چاودێریەكەیشیدا ئەوەی گومڕای كردووە گومڕای كردووە لە شوێنكەوتووانی شەیتان، وە بە چاودێری خۆیشی ئەوانەشی پاراستووە لە خاوەن باوەڕان لە شوێنكەوتووانی پێغەمبەران.

﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾﴾

**ناتەواوی خودایانی بتپەرستان**

خوای گەورە ڕوونی كردووەتەوە كە هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو نەبێت كە تاك‌و بێ هاوتایە، هاوێنەو شەریكی نیە، بەڵكو هەر خۆیەتی هەر كارێكی بوێت دەیكات‌و كەس ناتوانێت دەست وە كاری وەربدات‌و بەرامبەری بوەستێت، وەك دەفەرمووێت: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن

---

[1] الاسراء (٦٢).

[2] الاعراف (١٧).

دُونِ ٱللَّهِ﴾ واتەئەوانە بانگ بکەن کەجگە لەخوان، یانی: لەو خودایانەی کە غەیری خـودا پەرستوویانە، ﴿لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ واتـە: توانـاو دەسـەلاتی مێرووله وردیلەیەکیان نیە وەدی بهێنن نە لـە ئاسمانو نـە لـە زەویدا، وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾[1] واتـە: وە ئەوانـەی ئێـوە هاواریان لێ دەکەن بێجگە لە خودا خاوەنی توێکڵە سپیەکی نـاوکی خورمـایش نـین. وە دەفـەرموێت: ﴿وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٖ﴾ واتە: توانای هیچ شتێکیان نیە نە بە تەنها خۆیانو نە هاوکـاری یـەکتریش، ﴿وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٖ﴾ واتە: خودا پێویستی بە یارمەتی دانی ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن نـەبووە لە هیچ کارێکدا، بەڵکو هەموو دروستکراوەکان پێویستیان بە ئەوەو عەبدی ئەون. پاشان خـوای مـەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ﴾ واتە: لەبـەر گـەورەیی‌و خـاوەن دەسـەلاتی‌و بێ هاوتایی هیچ کەس زات ناکات تکای هیچ شتێکی لێ بکات بە ئیزنی خۆی نەبێت، وەك لـە ئایـەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾[2] واتە: کێیە ئەو کەسەی بتوانێت لـەو ڕۆژەدا تکـای لـە لا بکـات مەگـەر بـە ڕێپێـدانی خـۆی، وە دەفـەرموێت: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾[3] واتە: وە چەندەها فریشتە کە لە ئاسمانەکانـدا هەن تکاو شەفاعەتیان هیچ سوودی نیە مەگەر دوای ئەوەی کە خوا مۆڵەت بدات بۆ کەسێك کـە خـۆی بیـەوێت‌و ڕازی بێـت. وە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ﴾[4] واتە: وە فریشتەکان تکا ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت خوا ڕازی بێت تکای بۆ بکرێت، وە ئەوان لـە تـرس و هەیبـەتی خـوا زۆر دەترسـن. بۆیـە لـە چـەندرێگاوە هـاتووە لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا لـە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە ئەو بەڕێزترینی نەوەی ئادەمەو مەزنترین تکاکاریشە لە لای خوای گـەورە کاتێك کە مەقامی مـەحمودی پـێ دەدرێت کـە تکـا بکـات بـۆ هـەموو خـەڵکی‌و خـوای مـەزن دێـت بـە کارەکاندا دەکات‌و دادگایی بەندەکانی دەکات. پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمووی: (سـوژدە دەبـەم بـۆ خـوای مەزن، هەرچەندێ خوا مەیلی لێ بێت بمهێڵێتـەوە، دەمهێڵێتـەوەو فێـری سـوپاس‌و ستایـشێکم دەکـات

---

[1] الفاطر (١٣).

[2] البقرة (٢٥٥).

[3] النجم (٢٦).

[4] الانبياء (٢٨).

ئێستە ناتوانم بیڵێم پاشان دەوترێت: ئەی موحەممەد (ﷺ) سەر بەرز بکەرەوە، بڵێ گوێت لێ دەگیرێت، داوا بکەیت پێت دەدرێت، تکا بکە، تکات لێ وەردەگیرێت)[١]، هەتا کۆتایی فەرموودەکە، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ﴾ واتە: هەتا کاتێك ترس و بیم لە دڵی تکاکاران لادەبرێت بە هۆی ڕێگەپێدانی شەفاعەت، بە یەکتر دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێکی فەرموو دەڵێن: وتە ڕاستەکەی فەرموو کە ڕێگەدانە بە تکاکردن، ئەمەیش شوێن و مەقامێکی بەرزە لە مەزنیدا، کە خوای گەورە کاتێك قسەی کردووەو فەرمانی داوە، خەڵکی ئاسمانەکان گوێیان لێ بووە، ترس و لەرزیان لێ هاتووەو وەك ئەوەی لە هۆش خۆیان بچن، ئەمە قسەی ئیبنو مەسعودو مەسروق و کەسانی تریشە.[٢] ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ﴾ واتە: کاتێك کە ترس لە دڵیان دادەمرکێت، ئیبنو عەباس و ئیبنو عومەرو (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەبو عەبدوڕحمانی سولەمی و شەعبی و ئیبراهیمی نەخەعی و زەححاك و حەسەن و قەتادە دەڵێن لەم ئایەتەدا: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ﴾ واتە: کاتێك کە ترس لە دڵیاندا نەما، پرسیاریان لە یەکتری کرد ئایا پەروەردگاری ئێوە چی وت؟ فریشتەکانی هەڵگری عەرش هەواڵیان دا بە خواری خۆیان، ئەوانیش هەواڵیان دا بە خوارتری خۆیان هەتا هەواڵەکە گەیشتە خەڵکی ئاسمانەکانی دنیا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ﴾ واتە: هەواڵیان دا بەوەی خوای مەزن فەرموویەتی بەبێ کەم و زیاد. ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾ واتە: هەر خودایە هەرە پایەبەرزی مەزن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا لە سەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك خودا لە ئاسمانەکاندا بڕیارێکی دا بە فەرمانێك لە فەرمانەکانی فریشتەکان باڵەکانیان دەدەن لە یەك لە ترساندا، ئەو وتانەی خودا وەك دەنگی ئاسن وایە لە بەردێکی ڕەق بدات، کاتێك کە ترسەکە لە دڵیان دەرچوو، بە یەکتری دەڵێن: پەروەردگاری ئێوە چی وت؟ ئەڵێن بە یەکتری: ڕاستە و هەر ئەویشە هەرە پایەبەرزی مەزن، ئەوانەش کە قسە دەدزن و دەیبیسن وئابەم شێوەیە کەڵەکەنەکەن لەسەریەکتری، سوفیان باسی کرد دەستی بەلا گرت و پەنجەکانی لەسەر یەك بە بڵاوی داناو وتی: بەم شێوەیە بەسەر یەکەوەن، یەکێکیان قسەیەك دەبیستێ دەیدات بە خوارەوەی خۆی، ئەوەی تریش وەری دەگرێت و دەیدات بە خواری خۆی، هەتا دەیگەیەنێتە سەر زمانی جادوگەر یان فاڵچیەك، لەوانەیە بروسکێکی ئاگر لێی بدات و نەتوانێت بیگەیەنێت، وە لەوانەشە بیگەیەنێت پێش

[١] فتح الباري (٨/٢٤٨)، مسلم (١/١٨٥).

[٢] الطبري (٢٠/٣٩٦).

ئەوەی بروسکەکە لێی بدات، لەگەڵ ئەو قسەیەدا سەد درۆی پێوە دەلکێنێت‌و زیادی دەکات، پاشان دەوترێت: ئاخۆ فلانە ڕۆژو فلانە ڕۆژ وای نەوت؟ بڕوای پێ دەکرێت بەو قسەیە کە بیسرا لە ئاسمانەوە) تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە موسلیمی لەگەڵ نیە.[1] ئەبو داودو تیرمیزی‌و ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە[2].

﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٢٤) قُل لَّا تُسْأَلُونَ عَمَّا أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْأَلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٢٥) قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ (٢٦) قُلْ أَرُونِيَ الَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِ شُرَكَاءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٢٧)﴾

**هیچ کەسێك شەریکی خودا نیە لە هیچ فەرمانێکدا**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: بڵێ کێ ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمانەکان‌و زەویدا بڵێ خوا ڕۆزیمان دەدات بێگومان ئێمە یان ئێوە لەسەر ڕێنموونین یان لە گومڕاییەکی ئاشکرا داین، خوای گەورە باسی بێ هاوتایی خۆی دەکات لە دروستکردن‌و ڕۆزی داندا‌و لە پەرستن‌و هاوارلێکردن‌و داواکاریشدا، وەك چۆن موشریکەکان دانی پێدا دەنێن کە هیچ کەسێك ڕۆزیان لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا نادات، واتە: کەس بارانیان بۆ نابارێنێت‌و کشتوکاڵیان بۆ ناڕوێنێت تەنها خوا نەبێت. بە هەمان شێوەش دەبێت بزانن کە پەرستراویش هەر خوایە‌و هیچ کەسێکی تر نیە بپەرسترێت جگە لە ئەو. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ ئەمە لە (بابی لەف‌و نەشرە) لە ڕەوانبێژیدا واتە: یەکێك لەم دوو دەستەیە لەسەر بەتاڵی‌و ئەوی تریان لەسەر هەقە، چونکە ناگونجێت ئێمە‌و ئێوە هەردوو لەسەر هەق بین یان هەردوو لەسەر بەتاڵ بین، بەڵکو یەکێکمان لەسەر ڕێی ڕاستە‌و ئەوی ترمان لەسەر ڕێی بەتاڵی‌و گومڕاییە، وە ئێمە سەلماندوومانە‌و بەڵگەمان هێناوەتەوە لەسەر یەکخواپەرستی، ئەوە نیشانەیە لەسەر بەتاڵی پوچەڵ کردنەوەی ئەوەی کە ئێوەی لەسەرن کە هاوەڵتان بۆ خودای گەورە داناوە. بۆیە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ قەتادە دەڵێت: هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بێگومان ئەمەیان بە موشریکەکان وتووە: کە سوێند بە خودا هەردوو لامان لەسەر یەك ڕێگا نین، تەنها یەك دەستەمان لەسەر ڕێیە‌و

---

[1] فتح الباري (٣٩٨/٨).

[2] ابو داود (٢٨٨/٤)، تحفة الأحوذي (٩٠/٩)، ابن ماجه (٦٩/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

شارەزایە.[1] عیکریمەو زیادی کوڕی ئەبو مەریەم دەڵێن: واتە: ئێمە لەسەر ڕێین‌و شارەزاین‌و ئێوە بە ئاشکرا لەسەر بەتاڵ‌و پڕوپوچن[2]. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: بڵـێ پرسـیارتان لێ ناكرێـت لەسـەر تاوانێـك كـە ئێمـە كردوومانـە ئێمـەش پرسیارمان لێ ناكرێت لەوەی كە ئێوە دەیكەن. واتە دوورەپـەرێزبوون لـە خوانەناسـان، واتـە: هـەرگیز ئێمە پەیوەندیمان بە ئێوەوە نیەو ئێوەش هیچ پەیوەندیتان بە ئێمەوە نیە، بـەڵكو ئێمـە بـانگی ئێـوە دەكەین بۆ لای خودای گەورە كە تەنها ئەو بناسن‌و عیبادەتی ئەو بكەن، ئەگەر بە گوێتان كردین ئـەوا ئێوە لە ئێمەن‌و ئێمەش لە ئێوەین. خۆ ئەگەر بە گوێتان نەكردین‌و بڕواتان نەهێنا، ئەوا ئێمە حاشاتان لێ دەكەین‌و ئێـوەش هـیچ پەیوەندیـەكتان بـە ئێمـەوە نیـە، وەك خـوای گـەورە فـەرموویـەتی: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾[3] واتە: ئەگـەر بڕوایـان پێ نەهێنای ئەوە پێیان بڵێ (پاداشتی) كـردەوەی خـۆم بـۆ خـۆم‌و (پاداشـتی) كـردەوەی خۆتـان بـۆ خۆتان ئێوە بەرین‌و بەرپرسیار نین لەوەی من دەیكەم منیش بەرپرسیار نیم لەوەی ئێوە دەیكـەن. وە فەرموویـــەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴾[4] واتـــە بڵـــێ: ئـــەی بێباوەڕان، وە ئەو بتانە ناپەرستم كە ئێوە دەیپەرستن، وە ئێـوەش ئـەو خوایـە ناپەرسـتن كـە من دەیپەرستم، وە من ئەو خواپەرستیە ناكەم كە ئێوە دەیكەن، وە ئێوەش ئەو خواپەرسـتیە ناكـەن كـە من دەیكەم، ئایینی خۆتان بۆ خۆتان‌و ئایینی خۆم بۆ خۆم. پاشان خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا هـەموو خـەڵكی لـە یـەك شـوێندا بـەبێ جیاوازی كۆدەكاتەوەو بە كاری هەمووانـدا دەگـات هـەر چۆنێك پێویست بكات. واتـە: فـەرمانڕەوایی دەكات لە نێوانماندا بە دادپەروەری خۆی تـا هـەر كەسـە پاداشـتی خـۆی وەرگرێـت چاكە بـە چـاكەو خراپەكاریش بە تۆڵەسەندن لێی، وە بـەم زووانـە دەزانـن كـە لـەو ڕۆژەدا كـێ سـەركەوتووەو خـاوەن دەسـەڵات‌و خۆشـبەختی هەتاهەتایـە، وەك خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ

---

[1] الطبري (٢٠/٤٠١).

[2] الطبري (٢٠/٤٠١).

[3] يونس (٤١).

[4] الكافرون (١ـ٦).

يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمْ فِى رَوْضَةٍ يُحْبَرُونَ ﴿١٥﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآئِ ٱلْـَٔاخِرَةِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ فِى ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی قیامەت هەڵدەسێت خەڵك لەو ڕۆژەدا جیادەبنەوە لە یەكتر، ئینجا كەسانێك كە باوەڕیان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردووە ئەوان لە بەهەشتدا دڵخۆش دەكرێن، بەڵام ئەوانەی بێباوەڕ بوون بە نیشانەكانی ئێمەو گەیشتن بە ڕۆژی دوایی ئا ئەوانە لەناو سزای دۆزەخدا ئامادە دەكرێن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ واتە: هەر ئەو زاناو كاربەدەستو دادپەروەرەو ئاگاداری ڕاستی هەموو كارەكانە. وە پاشان دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ﴾ واتە: ئەم كەسانەم نیشان بدەن كە ئێوە بە خوداتان دەزانیو كردبووتان بە شەریكی خوداو لە جێی خودا دەتانپەرستن، ﴿كَلَّا﴾ واتە: هەرگیز خودا هاوەڵو شەریكو هاوتای نەبووە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿بَلْ هُوَ ٱللَّهُ﴾ واتە: بەڵكو خودایەكی تاكو تەنهایەو شەریكی نیە، ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ واتە: خاوەنی دەسەڵاتێكی وایە هەموو شتێكی شكست پێ هێناوەو زاڵ بووە بەسەریداو لە كارزانیشە لە كردارو گفتارو بەرنامەو بڕیاریدا، پاكو بێگەردە لەو شتانەی كە خوانەناسان دەیدەنە پاڵیو زۆر مەزنە.

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

### پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانەكراوە بۆ هەموو خەڵكی بە گشتی

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴾ واتە: ئێمە تۆمان ڕەوانەكردووە بۆ هەموو خەڵكی لەوانەی كە موكەلەفنو خاوەنی عەقڵن، وەك ئەم ئایەتانە كە خودا دەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾[2] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵكینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەمووتان. وە دەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾[3] واتە: گەورەو پیرۆزە ئەو

---

[1] الروم (١٤ـ١٦).

[2] الاعراف (١٥٨).

[3] الفرقان (١).

زاتەی کە فورقان (قورئان)ی بۆ سەر بەندەی خۆی ناردووەتـە خـوارەوە تـا ترسـێنەر بێت بۆ هـەموو جیهانیان. ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: مژدە بدە بەوانەی کە گوێڕایـەڵیت دەکـەن بـە بەهەشـت، ئەوانـەش بترسێنە کە سەرپێچیت دەکـەن بـە ئـاگری جەهەنـەم. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتـە: بەڵام زۆربەی ئادەمی نازانن. وەك ئەم ئایەتانـە وایـە کـە خـودا دەفـەرمووێت: ﴿وَمَآ أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ﴾[1] واتە: وە زۆربەی خەڵکی هەرچەند تۆ سووربیت لەسەر باوەڕهێنانیـان نابنـە ئیمانـدار. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾[2] واتـە: وە ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خودا گومڕات دەکـەن. موحەممـەدی کوڕی کەعب لەم ئایەتەدا: ﴿أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ﴾ دەڵێت: واتە: بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی. قـەتادە لـەم ئایەتـەدا دەڵێـت: خـوای مـەزن موحەممـەدی (ﷺ) ڕەوانـەکرد بـۆ عـەرەبو عەجـەم، بەڕێزترینی مـەردم لـە لای خـودا خواناسـترین کەسیانە[3]. وە لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێن: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فـەرمووی: (پێـنج شـتم پێـدراوە کـە بـە هیچ کەسێك لە پێغەمبەرەکانی پێشم نەدراوە: یارمەتی دراوم بە ترس بە ئەندازەی ڕۆیشتنی مانگێك بـە ڕێدا، وە سەر زەمینم بۆ کراوە بە مزگەوتو پاکو خاوێنە، هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم کاتی نوێـژی هـات با نوێژ بکات، دەستکەوتی شەڕیشم بۆ حەڵاڵ کراوە بـۆ هـیچ کەسێکی تـری پـێش مـن حـەڵاڵ نـەکراوە، شەفاعەتیشم پێدراوە، پێغەمبەران کاتێك کە ڕەوانەکراون تـەنها بـۆ گەلەکـەی خۆیـان بـووە، مـن ڕەوانـە کراوم بۆ هەموو خەڵکی بە گشتی)،[4] وە هەر لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕەوانەکراوم بۆ ڕەشو سپی)، موجاهید دەڵێت: واتە: جنۆکەو مرۆڤ.[5] کەسانی تریش جگـە لە موجاهید دەڵێن: واتە: بۆ عەرەبو عەجەم. ئەم مانایانە هەمووی ڕاستە.

## پرسیارکردنی خوانەناسان لە کاتی هاتنی قیامەتو وەڵام دانەوەیان

پاشان خوای گەورە باسی ئەو خوانەناسانە دەکات کە ڕۆژی قیامەت بـە دوور دەزانـنو بـڕوای پـێ ناکـەن، دەفـەرمووێت: ﴿وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتـە: وە دەڵـێن ئـەم

---

[1] يوسف (١٠٣).

[2] الانعام (١١٦).

[3] الطبري (٢٠/٤٠٥).

[4] فتح الباري (١/٥١٩)، مسلم (١/٣٧٠).

[5] أحمد (٥/١٤٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

بەڵێنی ڕۆژی دواییە کەی دێت ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرموویت: ﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ﴾[1] واتــــه: ئەوانەی باوەڕیان پێی نیە پەلەی هاتنی دەکەن بەڵام ئەوانەی باوەڕیان پێی هەیە دەترسن لێی و دەزانن ڕۆژی دوایی ڕاستە. پاشان خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ﴾ واتە: کاتو شوێنیان بۆ دیاری کراوە هیچ کەمو زیادی نیەو ئامادە کراوە وەختێك هات نە دوا دەخرێنو نە زووش دەبرێن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُ﴾[2] واتە: بێگومان کاتی سزای خوا کە هات دواناکەوێت. وە دەفەرموویت: ﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴾[3] واتــه: وە ئێمە دوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێك دیارو بەرچاو، ئەو ڕۆژە کە دێت هیچ کەس قسە ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خوا ئەوسا لەناویاندا هەیە بێ بەختو نەگبەتو هەیە بەختەوەرو ئاسوودە.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَـٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

## ڕێکەوتنی خوانەناسان لە دنیادا لەسەر دژایەتی هەقو مشتو مڕیان لەگەڵ یەکتری لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ واتە: خوای گەورە باسی لاساری و سەرکەشی و ڕکی و بەردەوامبوونی خوانەناسان دەکات کە بڕوا ناهێنن بە قورئانی پیرۆز چ مشتو مڕێکیانە لە ڕۆژی

---

[1] الشورى (١٨).

[2] نوح (٤).

[3] هود (١٠٤ـ١٠٥).

قیامەتداو خوای گەورەش هەڕەشەیان لێ دەکاتو باسی ئەو حاڵەیان بۆ دەکات کە دەوەستێنرێن لەبەر دەمیدا کە چەندە سەرشۆڕو داماون لە کاتی گفتوگۆیاندا لەگەڵ یەکتری، ﴿يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ الْقَوْلَ يَقُولُ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا﴾ واتە: قسەو تاوان ئاراستەی یەکتری دەکەن ئەوانەی کە بێ دەسەڵاتن ئەڵێن: ﴿لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا﴾ واتە: بەوانەی کە خاوەن دەسەڵات بوون لە دنیادا لە ئاغاو کاربەدەستەکانیان، ﴿لَوْلَا أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێوە نەبوونایەتە ڕێگرمان ئێمە شوێنی پێغەمبەران دەکەوتینو بڕوامان دەهێنا بەوەی کە بۆی دەهێنایین، پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا أَنَحْنُ صَدَدْنَاكُمْ عَنِ الْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَاءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ﴾ واتە: کاربەدەستەکانیان ئەڵێن: ئایا ئێمە بووینە ڕێگرتان کە بە ڕێی ڕاستدا بڕۆن، نەخێر نەبووین بەڵکو ئێمە تەنها هەر ئێوەمان بانگ کرد، ئێوەش بەبێ بەڵگە شوێن ئێمە کەوتن، دژایەتی ئەو هەموو بەڵگانەتان کرد کە پێغەمبەران هێنایان لەبەر ئارەزوویەکی دنیایی خۆتان شوێن ئێمە دەکەوتن بۆیە پێیان ئەڵێن: ﴿بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ﴾ واتە: ئێوە خۆتان تاوانبارن. پاشان بێ دەسەڵاتان ئەڵێن بە خاوەن دەسەڵاتان وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ واتە: بە شەوو بە ڕۆژ هەر خەریکی فریودانی ئێمە بوونو تەماحتان دەخستە بەر دەمانو دەتانوت: ئێمە لەسەر ڕێی ڕاستین، کەچی ئەو هەموو بەڵێنانە گشت درۆ بوون بە قسەی پڕوپوچ دەرچوون. قەتادەو ئیبنو زەید لەم ئایەتەدا: ﴿بَلْ مَكْرُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾ دەڵێن: واتە: بە شەوو بە ڕۆژ هەر وازتان لێ نەدەهێناین فێڵتان لێ دەکردین،[1] مالیك لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هەر بەو شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[2] ﴿إِذْ تَأْمُرُونَنَا أَن نَّكْفُرَ بِاللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُ أَندَادًا﴾ واتە: فەرمانتان پێ دەکردین کە خوا نەناسینو چەندین هاوەڵی بۆ دابنێین، بە فێڵو تەڵەکەی خۆتان بۆ ئەوەی لە ڕێگە لامان بدەن. ﴿وَأَسَرُّوا النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ﴾ واتە: خاوەن دەسەڵاتو بێ دەسەڵات هەموو پەشیمان بوون لە دڵدا لەوەی کردوویانە، ﴿وَجَعَلْنَا الْأَغْلَالَ فِي أَعْنَاقِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ واتە: کاتێك کە زنجیر لە ملیان کراو ڕاکێشران بۆ سزادان، ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واتە: هەر کەسە بە پێی خۆی، خاوەن دەسەڵاتو بێ دەسەڵات، پاداشتی خۆی وەردەگرێت لەسەر ئەو کارانەی کە کردوویانە، ﴿قَالَ

---

[1] الطبري (٢٠/٤٠٨).
[2] الطبري (٢٠/٤٠٨).

لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴾[1] واتە: (پەروەردگار) دەفەرموویت بۆ هەر کامتان سزا دوو بەرامبەرە بەلام ئێوە نازانن‌و بێ ئاگان. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێن: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (جەهەنەم کاتێك خەڵکی جەهەنەمی بۆ ڕەوانە دەکرێت گڕەکەی دەچێت بە پیریانەوە، پاشان دایاندەپۆشێت بە داپۆشینێك کە هەرچی گۆشتیان هەیە دەکەوێتە خوارەوە بەسەر ڕەگی پاژنەیاندا)[2].

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا
وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾
وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا
عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِي ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ ﴿٣٨﴾
قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ
ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾

## باوەڕنەهێنانی خۆشگوزەرانان بە پێغەمبەران‌و لە خۆبایی بوونیان بە هۆی زۆری ماڵ‌و منداڵەوە

خوای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەداتەوەو فەرمانی پێ دەکات کە چاو لە پێغەمبەرە پێشووەکانی خۆی بکات، هەواڵی دەداتێ کە هیچ پێغەمبەرێك لە پێش ئەو ڕەوانە نەکراوە بۆ هیچ دێیەك مەگین ژیانخۆشەکان بڕوایان پێ نەهێناوە، بەڵکو خەڵکە هەژارو بێدەسەڵاتەکانی شوێنی کەوتوون، وەك گەلەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دەیانوت: ﴿أَنُؤْمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلْأَرْذَلُونَ ﴾[3] واتە: وتیان ئایا چۆن باوەڕ بە تۆ بێنین لە کاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتوون داماوترین کەسن، یان دەیانوت: ﴿وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِىَ ٱلرَّأْيِ ﴾[4] واتە: وە نابینین تۆ هیچ کەسێك شوێنت کەوتبێت جگە لەوانەی کە هەژارو داماوەکانمانن بێ ئاوەزو ساویلکەن، وە گەورە پیاوانی گەلی پێغەمبەر ساڵحیش (سەلامی خوای لێ بێت) دەیانوت بە بێ دەسەڵاتەکان: ﴿لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] الحلية (٣٦٣/٤)، فەرموودەیەکی زۆر لاوازە.

[3] الشعراء (١١١).

[4] هود (٢٧).

مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا بِالَّذِي آمَنتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴾[١] واتــە: بەوانــەی لاوازو ژێردەستە کرابوون ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لە ناویاندا ئایا دەزانن کە ساڵح ڕەوانە کراوە لە لایەن پەروەردگاریەوە وتیان بێگومان ئێمە بڕوادارین بەوەی کە ساڵح پێی ڕەوانە کراوە، ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانی وتیان بە ڕاستی ئێمە بێباوەڕین بەوەی کە ئێوە باوەڕتان پیێ هێناوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ ﴾[٢] واتە: وە بەو جۆرە هەندێکیانمان بە هەندێکی تریان تاقی کردەوە بۆ ئەوەی بڵێن ئایا ئەوانە خوا ڕێزو بەهرەی پێ بەخشیون لەناو ئێمەدا؟ ئایا خودا لە هەموو کەس زاناتر نیە بەوانەی شوکرانەبژێرین؟ وە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا ﴾[٣] واتە: بەو شێوەیە لە هەموو شارێکدا گەورەترین تاوانبارانمان کرد بە دەسەڵاتدار بۆ ئەوەی پیلانو فێڵ بکەن لەو شارانەدا، وە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴾[٤] واتە: وە کاتێك بمانەوێت دانیشتوانی شارو وڵاتانێك لەناو ببەین فەرمان دەدەین بە دەوڵەمەندە خراپەکارو زۆردارەکانی تاگوێڕایەڵیو کردەوەی چاك بکەن، کەچی ئەوان یاخی دەبنو لە فەرمان دەردەچن جا بڕیاری سزادان پێویست دەبێت بۆ دانیشتوانی ئەو شارانە، ئیتر ئەو شارانە وێران دەکەین بە وێرانکردنێکی تەواو. وە خوای گەورەیش لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ ﴾ واتــە: هیچ پێغەمبەرو فرستادەیەکمان ڕەوانە نەکردووەتە سەر هیچ ئاوەدانیەك، ﴿إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا﴾ واتە: خاوەن بەهرەو دەسەڵاتو ساماندارو کاربەدەستانی ئەوشارە، قەتادە دەڵێت: زۆردارو خاوەن دەسەڵاتو سەرۆکە خراپەکانیان.[٥] وتوویانە: ﴿إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴾ واتە: ئەو شتانەی ئێوە پێی ڕەوانە کراون باوەڕمان پێیان نیە. دیسان خوای مەزن باسی ئەو خوانەناسانە دەکات کە لەوپەڕی خۆشیدا ژیاون فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالًا وَأَوْلَادًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾ واتــە: وە وتیـان ئێمـە سامانو منداڵمان زۆرترە وە ئێمـە قـەت سزا نادرێین.

---

[١] الاعراف (٧٥_٧٦).

[٢] الانعام (٥٣).

[٣] الانعام (١٢٣).

[٤] الاسراء (١٦).

[٥] الطبري (٢٠/٤٠٩).

بتپەرستەکان زۆر شانازیان دەکرد بە زۆری سامانو منداڵەوە وایان دەزانی کە ئەوە نیشانەی خۆشەویستی خودایە بۆیان، چونکەبڕوایان وابووکە خودا ئەوماڵو منداڵەکە پێی داون لەدونیادا بۆ ئەوە پێی نەداون لە ڕۆژی قیامەتدا سزایان بدات پێیان، چەندە ئەم بۆچوونەیان لە ڕاستیەوە دوورە، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە وا دەزانن ئەوەی پێیان دەبەخشین لە سامانو منداڵان بە هۆی شیاویانەوە، چەسپانیمان کردووە بۆیان لە خێرو خۆشەویستیەکاندا بەڵام هەستیپێناکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴾[2] واتە: جا سەرنجت ڕانەکێشێتو سەرسامت نەکات، زۆری ماڵو دارایىو منداڵیان، بێگومان خوا دەیەوێت سزایان بدات بە هۆی ئەو ماڵو منداڵەوە لەم ژیانی دنیایەدا وە بە سەختی گیانیان دەربچێت لە کاتێکدا کە ئەوان بێباوەڕن. وە دەفەرمووێت: ﴿ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِءَايَٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴾[3] واتە: واز لە منو ئەو کەسە بێنە کە دروستم کردووە بە تەنها، وە دارایی زۆرو زەوەندم پێداوە، وە کوڕانی ئامادەو بەردەست، وە هۆی ژیانم بۆ ڕاخستووە بە چۆن ڕەخساندنێك، دوای ئەمانەش هێشتا بە تەمایە زیاتری بدەمێ، نەخێر، بە ڕاستی ئەو دەربارەی ئایەتەکانی ئێمە بێباوەڕێکی کەللە ڕەقە، بەم زووانە سزای سەختی پێ دەچەژم. پاشان خوای گەورە باسی خاوەنی دوو باغەکە دەکات کە سامانو منداڵو بەروبوومێکی زۆری پێ بەخشی کە هەر لە دنیادا خودا تۆڵەی لێ سەندو لەناوی دا بۆی پێش سزای ڕۆژی قیامەتی، بۆیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ واتە: بڵێ: پەروەردگاری من بە مەیلی خۆیەتی ڕۆزی دەدات بەوەی خۆشی دەوێتو بەوەشی خۆشی لێی نایەت، مەیلی لە هەر کەسێك ببێت هەژاری دەکاتو مەیلیشی لە هەر کەسێك ببێت دەوڵەمەندی دەکات، ئەو کارەی پڕە لە کارزانی، هەر خۆی دەزانێت چۆن بە کارەکانیدا دەکات، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: بەڵام زۆرینەی ئەو خەڵکە ئەمە نازانن. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ ﴾ واتە: ماڵو منداڵ

[1] المؤمنون (٥٥ـ٥٦).

[2] التوبة (٥٥).

[3] المدثر (١١ـ١٧).

پێدان پێیان نیشانەی خۆشەویستی ئێمەو گرنگیدان نیە بە ئێوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن سەیری وێنەو سامانتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکانتانو کردارەکانتان دەکات).[1] موسلیمو ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە.[2] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾ واتە:ئەوەی لە ئێمە نزیکتان دەکاتەوە باوەڕو ئاکاری چاکتانە. ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُواْ﴾ واتە: لە جێی ئاکارە چاکەکانیان پاداشت دەدرێنەوە چەندبارە، یەك بە دە تا یەك بە حەوت سەد، ﴿وَهُمْ فِي ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ﴾ واتە: لە شوێنە بەرزو بڵندەکان دەحەسێنەوە بە ئارامیو هیچ ترسو زیانو ئازارو ناڕەحەتیەك نابینن، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا چەند هۆدەو ژوورێك هەیە لە ناوەوەی دەرەوەی دەبینرێتو لە دەرەوەی ناوەوەی دەبینرێت)، عەرەبێکی کۆچەری وتی: ئەوە بۆ کێیە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بۆ کەسێکە گوفتار شیرینو خۆراك بەخشو بەردەوام بوو بێت لەسەر ڕۆژوگرتنو شەونوێژی کردبێت کاتێك کە خەڵکی خەوتوون)[3]. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَسْعَوْنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ﴾ واتە: هەوڵ دەدەن ببنە ڕێگر لە ڕێی خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەرانو بڕواهێنان بە نیشانەکانی خودا، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلْعَذَابِ مُحْضَرُونَ﴾ واتە: وە ئەوانە هەموو پاداشتی کردارەکانیان وەردەگرنو هەر کەسە بە پێی کرداری خۆی لەناو ئاگردا دەتلێتەوە. پاشان دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ رَبِّي يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ لَهُۥ﴾ واتە: بڵێ: پەروەردگاری من بژێوی بەندەکانی دەدات بە فراوانی بۆ کەسێك مەیلی لێ بێتو کەمی دەکاتەوە بۆ کەسێك کە خۆی مەیلی لێ بێت، ئەوەیش لە کارزانی خۆیەتیو کەسی تر نازانێتو لێی تێناگات، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا﴾[4] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) سەرنج بدە چۆن لە دنیادا باوی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیانداو بێگومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە هەروەها باودانەکانیش گەورەترە. وەك لە دنیادا جیاوازن لە ڕۆژیدا یەکێك فەقیرەو یەکێك دەوڵەمەندەو سامانێکی زۆری بەسەردا ڕژاوە، هەر بەو شێوەیە لە ڕۆژی

---

[1] أحمد (٢/٥٣٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٤/١٩٨٧)، ابن ماجه (٢/١٣٨٨).

[3] ابن أبي شيبة (٨/٤٣٧)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[4] الاسراء (٢١).

دوایشدا هەندێ لە هۆدەی زۆر چاکو بەرزداو هەندێکی تریش وان لە چاڵی زۆر قوڵی بێ بندا، وە چاکترین‌و بەختەوەرترین کەس لە دنیادا ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕزگار بووە کەسێك کە موسڵمان بووبێت‌و بەشی خۆی بژێوی‌و ڕۆزی درابێت‌و خودا قەناعەتی دابێتێ بەوەی کە پێی داوە)، موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾ واتە: هەرچەندە ببەخشن لەو شتانەی کە خودا پێی داون فەرمانی داوەو ڕێگای داون لە بەخشینیدا، هەر لە دنیادا پاداشتتان دەداتەوە لەسەری‌و لە ڕۆژی دوایشدا پاداشتی چاکترتان دەداتەوەو خوا چاکترینی ڕۆزی دەرانە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (خوای مەزن دەفەرموێت ببەخشە منیش پێت دەبەخشم).[2] وە لە فەرموودەیەکی تری سەحیحدا هاتووە دوو فریشتە هەموو بەیانیەك کە ڕۆژ دەکەنەوە یەکێکیان ئەڵێ: ئەی خودایە ئەوەی دەستی دەگرێتەوەو دەگوشێت لەناوی بدەی بڕی،ئەوی تریان ئەڵێ: ئەی خوایە ببەخشە بەوەی کە ماڵ دەبەخشێت لە باتی ئەوەی کە بەخشیویەتی[3] . پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ماڵ ببەخشە بە زۆری، مەترسە لە خاوەنی(العرش) کەمی بکاتەوە)[4].

﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾﴾

## بێزاری دەربڕینی فریشتەکان لە پەرستنیان لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ واتە: خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا موشریکەکان دەهێنێت لەناو ئەو هەموو خەڵکەداو پرسیار لەو فریشتانە دەکات کە موشریکەکان کردبوویانن بە هاوەڵی خوداو وێنەیان کێشابوون لە شێوەی فریشتەکان‌و وایان دەزانی کە لە خودا نزیکیان دەخەنەوە، خوای گەورەیش دەفەرموێت بە فریشتەکان: ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ﴾ واتە: ئاخۆ ئەمانە ئێوەیان پەرستووە؟ ئایا ئێوە فەرمانتان پێداون کە

---

[1] مسلم (٢/٧٣٠).

[2] مسلم (١/٦٩١).

[3] مسلم (١/٧٠٠).

[4] الطبراني (١٠/١٩١)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

بتانپەرستن؟ وەك لە سورەتی (الفرقان)دا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ءَأَنتُمْ أَضْلَلْتُمْ عِبَادِى هَٰٓؤُلَآءِ أَمْ هُمْ ضَلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴾[1] واتە: ئینجا خوا (بە پەرستراوەكان) دەڵێت ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا كرد یان خۆیان ڕێگای ڕاستیان ونكردو گومڕابوون. وەك فەرموویەتی بە عیسا(سەلامی خوای لێ بێت): ﴿ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ﴾[2] واتە: ئایا تۆ وتووتە بە خەڵكی كە منو دایكم بە دوو پەرستراو دابنێن لە جیاتی خوا؟ عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) ئەڵێ: پاكو بێگەردی بۆ تۆ ئەی خودایە نابێتو ناگونجێت بۆ من شتێك بڵێم كە بە هیچ شێوەیەك مافی من نیە. هەر بەو شێوەیەش فریشتەكان ئەڵێن: ﴿سُبْحَٰنَكَ ﴾ واتە: پاكیو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە ئەی خودایە، هەرگیز تۆ هاوەڵت نەبووە، وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ﴾ واتە: پاكو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە ئەی خودایە، تۆ گەورەمانیو ئێمە عەبدی تۆینو بێزارین لەوانە، ﴿بَلْ كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ﴾ واتە: مەبەستیان شەیتانەكانە چونكە ئەو جنۆكانە پەرستنی ئەو بتانەیان لەبەر چاو شیرین كردبوونو گومڕایان كردن، ﴿أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴾ واتە: زۆریان باوەڕیان بەو جنۆكانە هێنابوو، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴾[3] واتە: جگە لە خوا نزاو هاوار ناكەن تەنها لە چەند (بتێكی ناولێنراوی) مێینە نەبێت وە نایپەرستن جگە لە شەیتانی یاخیو سەركەش نەبێت. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا يَمْلِكُ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ نَّفْعًا وَلَا ضَرًّا ﴾ واتە: ئەوانەی كە ئێوە بە تەما بوون سودتان پێ بگەیەنن (لەو بتو هاوەڵانەی كە كردبووتان بە شەریكی خودا) لە ڕۆژی قیامەتدا، دەتانپەرستنو بە فریادرەستن دانابوو لەم ڕۆژەدا كە ڕۆژی سەختیو ناڕەحەتیە فریاتان بكەوێت، توانای هیچ سوودو زیانێكیان نیە، ﴿وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ﴾ واتە: ئەڵێین بە موشریكەكان، ﴿ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾ واتە: بچێژن سزای ئاگر كە بڕواتان پێی نەدەكردو بە درۆتان دەزانی بۆ زیاتر ئازاردانیانو سوكایەتی پێ كردنیان لەناو جەهەنەمدا.

---

[1] الفرقان (١٧).

[2] المائدة (١١٦).

[3] النساء (١١٧).

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ فَكَذَّبُواْ رُسُلِى ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ﴾

## قسەی خوانەناسان بەرامبەر پێغەمبەران و وەڵام دانەوەیان

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾ واتە: کاتێك بخوێنرێتەوە بەسەریاندا نیشانە ڕوونەکانی ئێمە، خوای مەزن باسی خوانەناسانی قورەیش دەکات کە حەقی خۆیانە تووشی سزا بن لە لایەن خوداوە جەزرەبەی توندو بە ژانیان بدات چونکە کاتێك بەڵگەی ئاشکرایان بۆ دەخوێنرایەوە لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) زۆر بە ڕەوان و بە ئاسانی کە گوێیان لێ دەگرت دەیانوت: ﴿قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٌ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمْ عَمَّا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُكُمْ﴾ واتە: ئەم پیاوە دەیەوێت ببێتە ڕێگرتان لەوەی کە باب و باپیرانتان پەرستوویانە، مەبەستیان ئەوە بوو کە هەر ئایینی باب و باپیرانیان ڕاستە، ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون ڕاست نیەو پڕوپوچە!(لەعنەتی خوا لە خۆیان و باب و باپیرانیان). ﴿وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ مُّفْتَرًى ﴾ واتە: دەیانوت: ئەمە درۆیەو هەڵبەستراوە، مەبەستیان قورئان بوو، ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: ئەوانەی کە خودایان نەدەناسی کاتێك ئەم حەقەیان بۆ هات وتیان ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە، پاشان خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ وَمَآ ءَاتَيْنَٰهُم مِّن كُتُبٍ يَدْرُسُونَهَا ۖ وَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ قَبْلَكَ مِن نَّذِيرٍ ﴾ واتە: خوای گەورە هیچ کتێبێکی لە پێش قورئانەوە بۆ عەرەبەکان نەناردووە، وە لە پێش پێغەمبەریش (ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە نەکردوون، کە زۆر حەزیان دەکرد پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە بکرایە، دەیانوت ئەگەر پێغەمبەرمان بۆ بهاتایەو ترسی وەبەر بهێنایناية، ئێمە لە خەڵکی چاکتر ڕێی ڕاستمان دەگرت، کاتێك خوای گەورە ئەو ڕێزە مەزنەی لێ گرتن و قورئانی بۆ ناردن و پێغەمبەری بۆ ڕەوانە کردن، بڕوایان پێ نەکرد دژایەتیان کردو بە ڕوویدا وەستان و دەستیان دایە لاساری، پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واتە: گەلە پێشووەکانی پێش ئەوانە وەك ئەمانە بێباوەڕ بوون، ﴿وَمَا بَلَغُواْ مِعْشَارَ مَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ﴾ واتە: کە ئەمان دەیەکی ئەوانەی پێشوویان پێ نەدراوە، لە

دنیادا، ئیبنو عەباس دەڵێت: لە هێزو توانا لە دنیادا.[1] قەتادەو سودیو ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە.[2] وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا ئەوەی بەوان(گەلی عاد)مان دابوو (لە سامانو دەسەلات) بە ئێوەمان نەدابوو وە گوێو چاوو دڵمان پێدابوون بەلام هیچ سوودو کەڵکی پێ نەگەیاندن نە گوێو نە چاوو نەدڵیان، چونکە ئەوان باوەڕیان بە نیشانەکانی خوا نەبوو وە دەوری دان ئەو سزای گاڵتەیان پێ دەکرد. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً﴾[4] واتە: دەی ئایا بە زەویدا نەگەڕاون تا ببینن سەرەنجامی کەسانێك کە بەر لەوان بوون چۆن بووە کە لەمان زۆرترو بەهێزتریش بوون. واتە: ئەو هەموو هێزو توانایانە سزاو جەزرەبەی لێ نەگێڕانەوەو لێی لانەدان، بەڵکو خوای گەورە قڕی کردنو هەموویانی لەناو برد بە هۆی باوەڕنەهێنانیان بە پێغەمبەرەکانی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿فَكَذَّبُوا رُسُلِي ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ واتە: چۆن تۆڵەم لێ سەندنو سوكو ڕیسوام کردنو پێغەمبەرانم زاڵ کرد بەسەریاندا.

﴿قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ ۖ أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٤٦﴾﴾

**شێوازی بڕیاردان دەربارەی ئەوەی دابویانە پاڵی پێغەمبەر (ﷺ) گوایەکەسێکی شێتە.**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەی موحەمەد (ﷺ) بڵێ بەو خوانەناسانەی کە وادەزانن تۆ شێتی ﴿إِنَّمَا أَعِظُكُم بِوَاحِدَةٍ﴾ واتە: فەرمانتان پێدەکەم بەیەك شت لەبەر خودا ﴿أَن تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَادَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا ۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ واتە: هەڵسن یەکەیەکەو دوو دوو پاشان بیربکەنەوە بەبێ دەمارگیریو هەوەسبازیو پرسیار لە یەکتری بکەن ئاخۆ موحەمەد(ﷺ) شێتەو جنۆکە دەستی لێ وەشاندوە؟! باش یەکتری ئاگاداربکەن ﴿ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا﴾ واتە: پاشانیش بچنەوە بە خۆتانداو لە خەڵکی تریش بپرسن ئەگەر گومانتان هەیە لەوەی کە موحەمەد (ﷺ) شێت بووە، بۆیە خودای گەورە

---

[1] الطبري (٢٠/٤١٦).

[2] الطبري (٢٠/٤١٦ـ٤١٧).

[3] الاحقاف (٢٦).

[4] الغافر (٨٢).

فەرمویـەتی: ﴿أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ ئەمە ئەو تەفسیرەیە کە موجاهیدو موحەمەدی کوڕی کەعبو سودیو قەتادەو کەسانی تریش باسیان کردوە.[1]

وە ئەم ئایەتەش هەر ئەم مەبەستە دەگەیەنێ ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ لَّكُم بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ﴾ واتە ئەو (پێغەمبەر (ﷺ)) تەنیا ترسێنەرە بۆ ئێوە لە پێش هاتنی سزای سەختی قیامەت، بوخاری ئەم فەرمودەیەی لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەت کردوە( ڕەزای خوای لێبێ) کە دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێك چووە سەر سەفا پاشان فەرمووی: (یاصباحاه) قورەیش کۆبونەوەلەلای پێغەمبەرو (ﷺ) گوتیان: چیتە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چۆنە بەلاتانەوە ئەگەر هەواڵتان بدەمێ دوژمن لە بەیانیاندا یان لە ئێواراندا دەدات بەسەرتاندا ئاخۆ ئێوە بەڕاستم دەزانن؟ گوتیان: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من ترس وەبەر هێنەرێکم بۆ ئێوە لە پێش دابەزینی ئەو سزا مەزنە) واتە: ئەگەر بڕوام پێ نەکەن بەم زوانە خودا ئازارێکی توندتان ئەدات ئەبو لەهەب گوتی: عەمرت نەمێنێ ئابۆ ئەمەت کۆکردوینەتەوە، خوای گەورە ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝٣ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾[2] واتە: لەناوچێت هەردوو دەستی ئەبو لەهەبو لەناویش چوو، سودی پێ نەگەیاند داراییەکەیو ئەوەی کە کردی لە دوژمنایەتی پێغەمبەردا (ﷺ)، بێگومان لەمەولا دەچێتە ناو ئاگری بڵێسەدار، لەگەڵ ژنەکەیدا، کە هەڵگری دارو چاووگەیە بۆ نانەوەی ئاژاوە، هەمیشە گوریسێکی بادراو لە پەلی خورمای ئاگرین وا لە گەردنیدا. لە پێشەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[3] باس کرا[4]. واتە: خزمو کەسە زۆر نزیکەکانت بترسێنە.

﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ۝٤٧ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِٱلْحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ۝٤٨ قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ۝٤٩ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِي وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَيَّ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ۝٥٠﴾

---

[1] الطبري (٢٠/٤١٨).

[2] المسد (١ـ٥).

[3] الشعراء (٢١٤).

[4] فتح الباري (٨/٤٠٠).

**هیچ پاداشتێکم ناوێ لەسەر ئاگادارکردنەوەتان**

خوای گەورە فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە بڵێ بە موشریکەکان: ﴿قُلْ مَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ فَهُوَ لَكُمْ﴾ واتە: بڵێ: من هیچ خێرو پاداشتێك لە ئێوە داوا ناکەم لەسەر بەجێهێنان و گەیاندنی ئەم پەیامەی خوای گەورە، بەڵکو ئامۆژگاریو داوام ئەوەیە لە ئێوە کە عەبدایەتی خودا بکەن، ﴿إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ﴾ واتە: بەڵکو پاداشتی خۆم لە خوای گەورە داوا دەکەمو لە لای ئەوە، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ واتە: خودا ئاگاداری هەموو شتەو ئاگاشی لە منەو خۆی ئەم پەیامەی پێم داوە کە بە ئێوەی ڕابگەیەنمو دەزانێ ئێوەش چی دەکەن. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّ رَبِّي يَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾ واتە: بڵێ بەڕاستی پەروەردگارم بەتوندی هەق دەدات بەسەر بەتاڵدا خوا زانایە بە نهێنیو ئاشکراکان. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ﴾[1] واتە: بەفەرمانی خۆی سروش دەنێرێ بۆ هەر کەس لە بەندەکان کە بیبەوێ. واتە فریشتە دەنێرێ بۆ هەر کەسێ لە بەندەکانی لە ناو خەڵکی سەرزەمیندا، خودا خۆی زۆر چاك ئاگاداری هەموو نهێنیەکانەو هیچ شتێکی لە ئاسمانەکانو زەمیندا لێ ون نابی. وە پاشان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ واتە: بڵێ: ڕاستیو پەیامی مەزنی خودا هاتو پڕوپوچ ڕۆشت ناگەڕێتەوە. وەك ئەم ئایەتەی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ﴾[2] واتە: (واز لەوە بێنە) بەڵکو حەق ئەکێشن بەسەر بەتاڵو ناحەقداو بەهۆیەوە مێشکی دەپرژێو تێکدەشکێ ئینجا دەست بەجێ بەتاڵ دەفەوتێو لەناو دەچێت. هەر بۆیە کاتێ کە پێغەمبەری خودا ناو کەعبەی پیرۆز لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا، ئەو بتانەی بینی بە چواردەوریدا بوون، بەسەری کەوانەکەی بە بتێکیانیدا کێشاو ئەم ئایەتانەی خوێند ﴿ وَقُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾[3] واتە: وەبڵێ ئاینی ڕاست هاتو ئاینی ناحەقو بەتاڵ نەماو ڕۆشت بەڕاستی بەتاڵ هەمیشە لەناو چوە، ﴿قُلْ جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ﴾ بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە،

---

[1] الغافر (١٥).

[2] الانبياء (١٨).

[3] الاسراء (٨١).

ئەسائیش خۆی بە تەنیا ڕیوایەتی کردوە، لەسەر ئەم ئایەتە[1]. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ﴾ واتە: بڵێ ئەگەر من گومڕا بم ئەوە زیانەکەی تەنیا بۆ خۆمە وە ئەگەر ڕێنمون بم ئەوە بەهۆی ئەو قورئانە وەیە کە پەروەردگارم بۆی ناردوم. واتە: خێروبێر هەموو لەلای خودایەو ئەو پەیامە ڕاستو ڕەوانو ئاشکرایە کە ئەو ناردویەتی، چونکە پڕە لە شارەزاییو شتی زۆر ڕوونو ئاشکراو هەر کەسیش گومڕا بووە خۆی سەری لە خۆی شێواندوە، وەك عەبدوڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ پرسیاریان لێ کرد لە بارەی ئەهلی تەفویزەوە گوتی: من بە بۆچوونی خۆم قسەی تێدا دەکەم، ئەگەر پێکام ئەوە بە یارمەتی خودایە، خۆ ئەگەریش هەڵەم کرد، لە خۆمو لە شەیتانەوەیە، خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لێی دوورنو قسەی خۆمە[2]. ﴿إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴾ واتە: خودا قسەی بەندەکانی دەبیسێو نزیکە لێیانەوە، دەچێ بەهاواری ئەوکەسانەوە لێی دەپاڕێنەوە ئەسائی تا لێرەدا فەرموودەکەی ئەبو مووسا دەهێنێ کە لە هەردوو سەحیحەکەدا ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێوە هاوار) لە کەسێ ناکەن کە نەبیسێ یان ئاگای لێتان نەبێ بەڵکوبانگی کەسێ دەکەن کە دەبیسێو نزیکەو دێت بەدەم هاوارەوە[3].

﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ۝٥١ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ۝٥٢ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ۝٥٣ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ۝٥٤ ﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ ﴾ واتە: خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەی موحەمەد ئەگەر ئەو خوانەناسانەت دەدی لە ڕۆژی قیامەتدا کە هیچ دەرەتانێکیان نەماوەو نازانن ڕوو لەکوێ بکەن لە ترساندا ﴿وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴾ واتە: هەر لە یەکەم جارەوە کە گیرانو بەندکران ناتوانن بۆ هیچ کوێ بڕۆن، حەسەنی بەسری گوتی، کاتێ لە گۆڕەکانیان هاتنە دەرەوە[4]. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەڵێن بڕوامان هێنا بە خواو فریشتەکانیو بە کتێبەکانیو بە پێغەمبەرەکانی خودا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ

---

[1] فتح الباري (٨/٢٥٢)، مسلم (٣/١٤٠٩)، تحفة الأحوذي (٨/٥٧٣)، النسائي في الكبرى (٦/٤٨٣).

[2] ابو داود (٣/٥٨٩).

[3] النسائي في الكبرى (٦/٤٣٨)، فتح الباري (٩/١٥٧)، مسلم (٤/٢٠٧٦).

[4] الطبري (٢٠/٤٢٣).

ٱلۡمُجۡرِمُونَ نَاكِسُواْ رُءُوسِهِمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ رَبَّنَآ أَبۡصَرۡنَا وَسَمِعۡنَا فَٱرۡجِعۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾[1] واتە ئەگەر دەبینی کاتێ تاوانباران لە حزوری پەروەردگاریاندا لە خەجاڵەتیدا سەریان داخستوە، دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە ئەوەی بەڵێنت پێ دابوین دیمانو بیستمان دەی بمانگێڕەوە بۆ دنیا تاکردەوەی چاك بکەین بەڕاستی ئێمە دڵنیاین لەقیامەت بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ﴾ چۆن ئێستا دەبنە خاوەن باوەڕ کە زۆر دورکەوتوونەتەوە لەو شوێنەی کە دەبوو باوەڕی تێدا بێنن، کە دەرچوون لە دنیاو بەرەو ڕۆژی دوایی ڕۆشتوون کە شوێنی پاداشتی وەرگرتنە، کە شوێنی تاقی کردنەوە لە دونیادابو، خۆ ئەگەر لەژیانی دنیادا بڕوایان بهێنایە، ئێستا لە ڕۆژی قیامەت سودیان لێ وەردەگرت، بەڵام تازە لە دەستیان چوە باوەڕهێنانیان هیچ سودێکی نیە بۆیان، وەك چۆن کەسێ بە هیوای شتێ نیە لە شوێنێکی زۆر دورەوە بگاتە دەستی. موجاهید گوتی: ﴿وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ﴾ کەی تازە ئەوشتە وەدەست دێنن[2]. زوهری گوتی: ﴿ٱلتَّنَاوُشُ﴾ بەهیوای باوەڕهێنان کاتێ کە ئەوان وان لە قیامەتداو دەستیان لە دنیا بڕاوە. حەسەنی بەسری گوتی: داوای شتێکیان کردوە لە شوێنێکدا کە بەدەست نایەت، کەی تازە فریایی ئەو باوەڕهێنانە دەکەون لەو دوورەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَدۡ كَفَرُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُ﴾ واتە: چۆن تازە باوەڕ بەدەست دێنن لە ڕۆژی قیامەتدا، کە لە دنیادا بڕوایان نەهێناوە بەو پەیامە هەقەو پێغەمبەرەکانیان بەدرۆ خستۆتەوە. ﴿وَيَقۡذِفُونَ بِٱلۡغَيۡبِ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٍ﴾ واتە: وە بە نەزانی قسەیان لە پەنهنیەکان دەکرد لە شوێنێکی دورەوە(کە دنیایە)، مالك دەڵێت: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە، واتە: هەر بە گومان. منیش ئەڵێم: وەك خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿رَجۡمَۢا بِٱلۡغَيۡبِ﴾[3] واتە: لە نەدیوخەیاڵاتی دەکەن. جارێ ئەڵێن: شاعیرە، جارێ ئەڵێن فاڵچیە، جارێ ئەڵێن جادوگەرەو جارێکی تریش ئەڵێن شێتە، ئا لەم قسە پڕوپوچانە، بڕواناهێنن بەزیندوبونەوەی ڕۆژی مەحشەرو قیامەت. وەئەڵێن: ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ﴾[4] واتە: بەلامانەوە خەیاڵێکی خاوە دڵمان پێی ئاو ناخواتەوە. قەتادەو موجاهید دەڵێن: لە نەدیو بەخەیاڵی خۆیان ئەڵێن نە زیندووبونەوە هەیەو نەبەهەشتو نە ئاگر[5]. پاشان

---

[1] السجدة (١٢).

[2] الدر المنثور (٦/٧١٤).

[3] الكهف (٢٢).

[4] الجاثية (٣٢).

[5] الطبري (٢٠/٤٢٩).

ئەفـەرموێت: ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ واتـە: ئـەوان دوور دەخرێنـەوە لـەوەی کـە بـەهیواین، حەسەنی بەسریو زەححاكو کەسانی تریش ئەڵێن، یانی: لە باوەڕهێنانیان.[1] سودی دەڵێت، یانی: لە تەوبەکردن.[2] ئیبنو جەریریش هەر وای گوتوە، موجاهید گوتی: ﴿وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ﴾ واتـە: لەم دنیایەدا دووردەخرێنەوە لە ماڵو کەسو کارو ئەو شتانەی کە زۆر لایان خۆشەویستە.[3] وە هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعومەرو ئیبنو عـەباسو ڕەبیعـی کـوڕی ئەنـەس(ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەمە قسەی بوخاریو کەسانی تریشە، لە ڕاستیدا هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم دوو قسەدا نیە، واتـەبێ بەش دەبن لە دنیادا لەوەی کە ئارەزووی دەکەن، وەهەروەها لە ئەوەیشی کە لـەڕۆژی دواییدا دەیان ویست وەدەستی بێنن،﴿كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ﴾ ئەوەی بەسەری پێشوەکانیان هات لە پێشەوە، لە گەلەکانی تر کە بڕوایان بە پێغەمەرەکانیان نەهێنا، کاتێ کە سزای خـودا دابەزیـە سـەریان، خۆزگە دەخوازن کە خاوەنباوەڕبوونایە بەڵام لێیان قەبوڵ ناکرێ، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ﴾[4] واتە: ئینجا کـاتێ سـزای بـەتینی ئێمـەیان بینـی وەتیان: باوەڕمان بەخوای تاكو تەنیا هێناوە بێباوەڕین بـەو شـتانەی کردومانـە هاوبەشـی خـودا، جا باوەڕهێنانەکەیان هیچ سودی نەبو بۆیان لە کاتێکدا سزای ئێمەیان دی باوو سوننەتی خـوا هـەر وابـوە پێـشتر لـە بەنـدەکانی دا وە لەوێـدا بێبـاوەڕان زەرەرمەنـدبون. وەئەفـەرموێت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا فِي شَكٍّ مُّرِيبٍ﴾ واتە: ئەوان لەدونیادا هـەر لـەگومانو دوو دڵیـدا ژیـاون، لەبـەر ئـەوە بـڕوا هێنانیـان لێ قـەبوڵ ناکرێ کاتێ کـە تووشـی سـزا دەبـن. قەتادەئـەڵێ: نەکـەن بـەگومانو دوو دڵبن، چـونکە هـەر کەسـێ بەگومانەوە بمرێ هەر بەوشێوەیە زیندوو دەکرێتەوە، هەرکەسیش لەسەر بڕواپتەوی بمرێ لەسـەر ئـەو بڕوا پتەوییە زیندودەکرێتەوە.

---

[1] الطبري (٢٠/٤٣٠).

[2] الدر المنثور (٦/٧١٥).

[3] الطبري (٢٠/٤٣١).

[4] الغافر (٨٥).

## تەفسیری سورەتی ( فاطر )

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ ۚ يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١)﴾

**باسی دەسەڵات و توانای خودا**

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: هەموو ستایش بۆ خوایەکە بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێ ) دەڵێت: من نەمئەزانی ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ مانای چیە هەتا دوو عەرەبی کۆچەری هاتنە لام لەسەر بیرێك کێشەیان هەبوو، یەکێکیان گوتی بەهاوەڵەکەی (أنا فطرتُها) واتە: من یەکەم جار دەستم پێ کردوە[1]، ئیبنو عەباس دیسان دەڵێت: ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: داهێنەرەکانی ئاسمانەکان و زەمین.[2] زەححاك دەڵێت: هەموو شتێ لە قورئاندا هەیە ﴿فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ واتە: خودا دروستکەری ئاسمانەکان و زەمینە.[3] وە ئەفەرموێ: ﴿جَاعِلِ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا﴾ واتە: فریشتەکانی کردۆتە ڕاسپاردە لە نێوان خۆی و پێغەمبەرەکانیدا (سەلامی خوایان لێ بێ). ﴿أُولِي أَجْنِحَةٍ﴾ واتە: خاوەن باڵن، بەو باڵانە دەفڕن بۆ ئەو شوێنانەی کە فەرمانیان پێ دەکرێت بە پەلە ﴿مَّثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾ واتە: فریشتەی وایان هەیە دوو باڵە، هەیانە سێ باڵە و هەیانە چوار باڵە و هەشیانە باڵی زیاترە. وەك لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) جوبرەئیلی بینیوە(سەلامی خوای لێ بێ) لە شەوی ئیسرادا کە شەش سەد باڵی هەبووە، لە نێوان هەردوو باڵیدا وەك نێوانی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا بوە.[4] بۆیە خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَزِيدُ فِي الْخَلْقِ مَا يَشَاءُ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ واتە: هەرچی چۆنێ مەیلی لێ بێ لێی زیاد دەکات خودا

---

[1] الدر المنثور (٣/٧).

[2] الدر المنثور (٣/٧).

[3] الدر المنثور (٣/٧).

[4] فتح الباري (٣٦١).

توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، سودی دەڵێت: خودا باڵەکانی فریشتە زیادەکاتو بەمەیلی خۆی دروستی دەکات[1].

﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾

**کەس ناتوانێ دەروی خێری خودا بگرێ**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ واتە: خوا هەر بەهرەو چاکەیەك بۆ خەڵك بەرەڵا بکاتو بیکاتەوە ئیتر بەرگریکەرێکی بۆ نیە وە خوا لەهەر یەك بگرێتەوە ئیتر لە پاش گرتنەوەی خوا بەرەڵاکەرو نێرەری بۆ نیە وەخوا زاڵی کاردروستە. خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە هەر شتێ مەیلی لێ بێ دەبێو هەرشتێکیش مەیلی لێ نەبێ نابێت، ئەوەی دەی بەخشێ کەس ناتوانێ ببێتە ڕێگری، وە هیچ کەسیش ناتوانێ ببەخشێ یان نەبەخشێو بیگێڕێتەوە بە مەیلی ئەونەبێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە وەڕادی کاتبی موغەیرەی کوڕی شوعبەوە دەڵێت: مەعاویە نامەیەکی نووسی بۆ شوعبە، ئەوەی لە پێغەمبەری خودات (ﷺ) بیستووە بۆم بنووسە، گوتی: موغەیرە منی بانگ کردو بۆم نووسی، موغەیرە گوتی: گوێم لێ بوو لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کاتێ کە لە نوێژ لێ دەبووەوە ئەی فەرموو: (لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد، وهو على كل شيء قدير، اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت، ولا ينفع ذا الجد منك الجد) واتە: (هیچ پەرستراوێك نیە جگەلەخودا خۆی نەبێ، شەریکیشی نیە، هەر خۆی خاوەنی دەسەڵاتەو سوپاسی هەر بۆ ئەوە، هەر ئەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەی خودایە، ئەوەی تۆ دەی بەخشی ڕێگری نیە، ئەوەیشی تۆ دەیگێڕیتەوە، کەس توانای بەخشینی نیە، هیچ کەسێ بەکرداری خۆی سودمەند نیە، بەهرەمەندی هەر بەفەزڵی تۆیە) موغیرە دەڵێت: گوێم لێ بو نەهی دەکرد لە قسەهێنانو بردن پرسیار زۆرکردنو ماڵ بەفیڕۆدانو کچ زیندە بەچاڵ کردنو ئازاردانی دایکانو خواردن نەدان بەخەڵکیو ئەنجام نەدانی ئەرکی سەر شانو وەرگرتنی شتی بەناحەق[2] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردوە لە چەند ڕێگاوە،[3] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبو سەعدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوعدا ئەی فەرموو: (سمع الله لمن حمده اللهم ربّنا ولك الحمد، مِلءُ السموات والارض، وملء ما شئت من شيء بعد، اللهم أهل الثناء والمجد، أحق ما قال العبد وكلنا

---

[1] الدر المنثور (٤/٧).

[2] أحمد (٤/٢٥٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٢/٣٧٨)، (١١/١٣٧، ٥٢١)، ومسلم (١/٤١٤/٤١٥).

لك عبد، اللهم لا مانع لما أعطيت ولا معطي لما منعت، ولا ينفع ذا الجد منك الجد).[1] ئەم ئایەتە وەك ئەوئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[2] واتە: وە ئەگەر خودا دوچاری بەڵاو زیانێکت بکات ئەوە جگە ئەوکەس نیە بتوانێ لایبات وە ئەگەر خێرو خۆشیەکت پێ بگەیەنێت ئەوە خوا دەسەڵاتدارە بەسەر هەمووشتێکدا. لە وێنەی ئەم ئایەتە زۆرە لەقورئاندا.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾ ﴾

**بەڵگەی یەکخوا پەرستی**

خودای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوەو ڕێیان نیشان ئەدات کە چۆن بەتەنیا هەر ئەو بپەرستن‌و غەیری ئەو نەپەرستن، وەك چۆن خودا خۆی وەدی هێناون‌و بژێوی داون بەتەنیا، بەو شێوەیەش دەبێ بیپەرستن‌و شەریکی بۆ دانەنێن‌و بت پەرستی نەکەن‌و ئەو چاکانەی خودای مەزنیان لە بیر نەچێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە بیربکەنەوە لە بەهرەی خوا بەسەرتانەوە ئایا بێجگە لە خوا دروستکەرێکی تر هەیە کە ڕۆزیتان بدات لە ئاسمان‌و زەویدا هیچ پەرسراوێك نیە بێجگە لە خوا، دەی چۆن وا ڕو وەردەگێڕن.

﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾

**دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) بەوەی کە پێغەمبەرانی پێشوش زۆربەی خەڵکی بڕوایان پێ نەهێناون‌و وەبیرهێنانەوەی ڕۆژی قیامەت**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ واتە: ئەگەر باوەڕیان پێ نەهێنایت دلگران مەبە چونکە بەڕاستی پێغەمبەرانی پێش تۆش باوەڕیان پێ نەهێنرا. خودای گەورە ئەفەرموێت: خۆ ئەگەر ئەوانەی کە موشریکن ئەی موحەمەد (ﷺ) بڕوا بە تۆ ناکەن‌و دژایەتیت دەکەن

---

[1] مسلم (١/٣٤٧).

[2] الانعام (١٧).

لەسـەر ئـەو پەیامـەی بـۆت هێنـاون کـە داوایـان لێ دەکـات تـەنیا هـەر خـوا بپەرسـتن، پێغەمبـەرە پێشینەکان، چاکترین نمونەن بۆت، هەروەك تۆ پەیامی ئاشکراو ڕونیان هێنا بۆ گەلەکانیانو داوایان لێ کردن کەتەنیا هـەر خـودا بپەرسـتن، بڕوایـان پـێ نـەهێناونو دژایەتیان کـردن ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ واتە: هەموو کارێ هـەر بـۆلای خـودا دەگەڕێتـەوەو بـەم زوانـە پاداشتی تـەواویان دەداتـەوە، پاشـان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە بەڵێنی خودا ڕاستە ڕۆژی قیامەت دێتو هیچ گومانێکی تێدا نیـە ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾ واتـە: دنیـا لەچاو ئـەو شـتانەی خـودا بـۆ دۆسـتەکانو ئەوانـەی کـە شـوێنکەوتووی پێغەمبـەرانن زۆر بـێ نرخـە، پاداشـتی قیامـەت زۆر مەزنـە نەکـەن لـە دەسـتی خۆتـانی بـدەن بـەو ژیانـە کەمـە ﴿وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێ (الغرور): واتە: شەیتان.[1] یانی: شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێو لاتان نەدا لە شوێن کەوتنی پێغەمبەرانو پەیامەکانی خودا، چونکە شەیتان زۆر فریودەرو درۆزنـە ئـەم ئایەتـە وەك ئـەو ئایەتـە وایـە لـە سـورەتی(لقمـان)دا کـە خـوا ئەفـەرموێت: ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴾[2] پاشـان خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ واتە: شەیتان دوژمنتانەو هەوڵ ئەدات سەرکەوێت بەسەرتاندا ئێوەش توندتر دوژمنایەتی بکـەن ویـچن بەگژیداو بڕوا بەو درۆو فریودانەی مەکـەن ﴿إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ واتـە: دەیـەوێ هەڵتان خەڵەتێنێو گومڕاتان بکاتو لەگەڵ خۆی بـەرەو نـاو ئـاگر بتانبـات، چـونکە شـەیتان دوژمنێکـی هەرە گەورەو ئاشکرامانە. داواکارین لە خودای خاوەن دەسەلات کە لـە دوژمنـانی شـەیتان حسابمان بکاتو بمانکاتە شوێن کەوتوانی قورئانی پـیرۆزو پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) چـونکە خـودای مـەزن مـەیلی هەرشتێکی هەبێ دەیکاتو وە هەر ئەویشە پاڕانەوە قبوڵ دەکات. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا ﴾[3] واتـــە: کـــاتێ بەفریشتەکانمان ووت سوژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوانیش سوژدەیان برد جگـە لـە ئیبلیس نـەبێت کـە لـە پێڕی پەرییەکان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگار دەرچوو دەی ئایـە ئێـوە ئـەوو نـەوەی دەیکـەن بـە

[1] الطبري (٢٠/٤٣٨).

[2] لقمان (٣٣).

[3] الكهف (٥٠).

دۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران.

﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ ﴾

**پاداشتی خوانەناس و باوەڕدار لە ڕۆژی قیامەتدا**

خودای گەورە لە پێشەوە باسی شوێن کەوتوانی کرد کە پاشەڕۆژیان هەر ئاگری بەکڵپەیەو پاشانیش ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ واتە: ئەوانەی خوانەناسن سزای توندیان ئەدرێت، چونکە گوێڕایەڵی شەیتان بون و لە خوا یاخی بون، ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾ واتە: ئەوانەش کە خاوەن باوەڕن و ئاکاری چاکیان کردوەو بڕوایان بەخودای مەزن و پێغەمبەرەکانی هەبوە، هەر تاوانێکیان بووە عەفو دەکرێن و پاداشتی گەورە وەردەگرن لەسەر ئەو کردارە چاکانەیان. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴾ واتە: خوانەناس و بەدکاران کاری خراپ دەکەن بەخەیاڵی خۆیان وادەزانن چاك هەڵساون و لە بەر چاویان جوان کراوە، واتە: ئەوانەی ئا بەو شێوەیە بیر دەکەنەوە، ئاخۆ هیچ پەیوەندیەکی بەتۆوە هەیە؟ نەخێر هیچ پەیوەندیەکی بەتۆوە نیە، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ﴾ واتە: بەمەیلی خودا خۆیەتی، هەرچی بڕیاردا هەر ئەوەیە، ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾ واتە: خۆت توشی خەفەت و ناڕەحەتی مەکەو خەمیان مەخۆ، چونکە خودا کارزانە لە بڕیارەکانیدا، هەرکەسێ گومڕا دەکا دەیکاو هەرکەسیش شارەزا دەکات دەیکات، ئەو کارانەی خودا دەیکات پڕە لە حیکمەت و زانیاری تەواوی پێی هەیە. بۆیە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ واتە: بەڕاستی خودا بەوەی کە ئەوان دەیکەن ئاگادارە.

﴿ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُو۟لَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ

مِن أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ

يَسِيرٌ ﴿١١﴾

**بەڵگە لە سەر ژیان پاش مردن**

خـودای مـەزن ئەفـەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ﴾ خوا زاتێکە بارانی ناردوە بۆ ئەوەی هەورەکان بگەڕێنێ ئینجا ئەو هەورانە دەنێرێت بۆ سەر وڵاتێکی مردو و بارانی لێ دەبارێ و زەوی پێ زیندو دەکەینەوە لە پاش ووشك بـون و مردنـی، زیندوکردنـەوەی مرۆڤـی مـردویش هەریـەو شێوەیەیە. زۆر جـار خـودای گـەورە بەڵگـە بـۆ زیندوبونەوەو هاتنی ڕۆژی قیامەت دەهێنێتـەوە، بەزیندوکردنـەوەی پـاش مردنـی، وەك لـە سـەرەتای سورەتی (الحج)دا عەبدەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە بیر لـە زیندوبوونـەوەی ئـەو زەمینـە بکەنـەوە، تـا پەندو ئامۆژگاری وەرگـرن لـەوەوە بـۆ زیندووبوونـەوەی ڕۆژی قیامـەت، وەك دەبینـن زەمـین بەچـاوی خۆیان کە زەوی مردوەو وشك هەڵگەڕاوەو هیچ گژوگیایەکی تێدا نیە، کاتێ کـە هـەور دێـتو ئـاوی هەڵگرتوەو دەیڕێژێ بەسـەریاندا ﴿وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ﴾[1] واتە: ئەم زەمینـە دەبینـی (بـێ هەسـتو نەسـتە) کـاتێ بارانمان لێ باراند، بەخۆ دادێو گەشە دەکاتو بەرز دەبێتەوەو، ڕووەك لـە خۆیـدا دەڕوێنـێ، هـەر بەوشێوەیە لاشـەکان کاتێ کە خودا مەیلی لێ بوو زینـدوی دەکاتـەوە، خـودای گـەورە بارانێـك دەبـارێنێ لـە ژێـر عەرشـەوە هەموو زەمین دەگرێتەوە، هەموو لاشەکان دەڕوێنەوەلە گۆڕەکانیانەوە دێنەدەرەوە، وەك چۆن ڕووەك دەڕوێنەوە لە ناو زەمیندا، بۆیە لە فـەرموودەی سـەحیحدا هـاتووە: (هـەموو لەشـی ئـادەمیزاد دەڕزێ عەجەبوزەنب (عجب الذنب) نەبێت کەمرۆڤ لـەوە دروسـت کـراوەو لـەوەش پێـك دەهێنرێتـەوە)[2]، بۆیـە حودای گەورە فەرمویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ﴾ واتە: ژیاندنی ڕۆژی قیامەتیش هەروایە. لە فەرمودەکـەی ئەبو ڕەزینیشدا هاتوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خودا چۆن مردو زیندوو دەکاتەوە؟ نیشانەی ئەوە چۆنە لە دروستکراوەکانیدا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئـەبوڕەزین ئایـا تـێ نەپـەڕیوی بـە شـیوی هۆزەکەتـدا کـە وشك هەڵگـەڕابێ، پاشـان تـێ پـەڕیی پێیـدا سـەوز هەڵگـەڕابێ گـوتم: بـەڵێ، فەرمووی: (ئابەوشێوەیە خودا مردوو زیندودەکاتەوە)[3].

---

[1] الحج (٥).

[2] مسلم (٤/٢٢٧).

[3] أحمد (٤/١٢)، لە پێشەوە لە سورەتی (الحج)دا پلەی ئەم فەرمودەیە دیاری کراوە.

## قەدرو ڕێز لە گوێڕایەڵی خودای مەزندایە لە د نیاو قیامەتدا

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ واتە: هەر کەسێ پێی خۆشە بە قەدرو ڕێزبێ لە دنیاو لە قیامەتدا با هەمیشە پابەند بێت بە گوێڕایەڵی خودای گەورە، چونکە ئەوەی ئارەزووی دەکات دەستی دەکەوێ لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا، هەموو شتێ هەر بەدەستی خودایە هیچ شتێ بەبێ ئیزنی ئەو نەبێ نابێ، وەك فەرموویەتی:﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾[١] واتە ئەوانەی کە بێباوەڕان بەدۆستو خۆشەویستی خۆیان دادەنێن بێجگە لە ئیمانداران ئایا بەتەمان سەربەرزییان لای ئەوان دەست کەوێت؟ (بۆ چونێکی هەڵەیە) چونکە بەڕاستی سەر بەرزیو باڵادەستی هەر بۆ خوایە. وەفەرمویەتی: ﴿ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾[٢] واتە: با غەمبارت نەکات وتەی ئەوان، چونکە بەڕاستی هێزو دەسەڵات هەمووی بۆ خوایە. وە فەرمویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾[٣] واتە: ڕێزو گەورەیی تەنها بۆ خواو پێغەمبەری خواو بڕواداران بەڵام دووڕووان نازانن. موجاهیدئەڵێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ﴾ هەر کەسێ دەیەوێ ڕێزو قەدری دەست کەوێ بەبتپەرستی دەستی ناکەوێ ﴿فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾[٤] قەتادەش ئەڵێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ واتە: کەسێ دەیەوێت بەقەدرو ڕێزبێت با هەر شانازی بەپەرستنی خودای مەزنەوە بکات[٥].

## ئاکاری چاك بەرەو خودا بەرز دەبێتەوە

خودای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ واتە: یادی خواو قورئان خوێندنو دوعاکردن بۆ لای خودا بەرز دەبێتەوە، ئەمە قسەی زۆرێك لە زایانانی سەلەفە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە موخاریقی کوڕی سولەیمەوەئەڵێ: عەبدوڵای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێ) پێی گوتین: ئەگەر قسەیەکتان بۆ بکەین، بۆ ڕاستی قسەکەمان بەڵگەیەك ئەهێننەوە بۆتان لە قورئاندا، کاتێ عەبدی خاوەنباوەڕئەڵێت: (سبحان الله وبحمده، والحمدلله، ولا إلـه إلاالله، والله أكبر، تبارك الله)

[١] النساء (١٣٩).

[٢] يونس (٦٥).

[٣] المنافقون (٨).

[٤] الطبري (٢٠/٤٤٣).

[٥] الطبري (٢٠/٤٤٤).

فریشتەیەك هەڵیان دەگرێو دەیخاتە ژێر باڵی پاشان بەرەو ئاسمان بەرزی دەكاتەوە، تێ ناپەڕێ بەلای هیچ كۆمەڵە فریشتەیەكدا مەگین داوای لێ خۆشبوون دەكەن بۆ ئەو كەسەی كە وتویەتی، هەتا دەیانباتە خزمەت خودای مەزن. پاشان عەبدوللا (ڕەزای خوای لێ بێ ) ئەم ئایەتەی خوێند ﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە نوعمانی كوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەو كەسانەی یادی خوداو گەورەیی خوداو، سبحان الله والحمدلله ولا إله إلاالله والله أكبر دەكەن، ئەو پاڕانەوەیانە بەدەوری تەختدا عەرشدا دەسوڕێنەوە دەنگێكیان لێوە دێت وەك دەنگی هەنگ وایە، یادی خاوەنەكەیان دەكەن، ئاخۆ كەسێ لە ئێوە پێی خۆش نیە كە بەبەردەوامی لەلای خودا شتێكی هەبێ، یادی بكات)[2]، ئیبنو ماجەش ڕیوایەتی كردوە[3]. وەئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾ واتە: وە كردەوەی چاك بەرزی دەكاتەوە، عەلی كوڕی ئەبوتەڵحەئەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێ): (الكلم الطيب)یانی قسەی چاكو بەسود بریتیەلە یادی خوای مەزن، بەرزئەكرێتەوە بۆلای خوا، ئاكاری چاكیش بەجێ هێنانی فەرزەكانە، هەر كەسێ یادی خودای مەزنی كردبێ لە فەرزەكاندا ئاكارە چاكەكانی ئەو یادە هەڵدەگرێت و بەرزی دەكاتەوە بۆ لای خودای گەورە، بەلام كەسێ یادی خودای كردبێو فەرزەكانی بەجێ نەهێنابێ، زیكرەكەی ئەدرێتەوەبەسەركردارەكەیدا، هەرشایستەشە بەئەوە.[4] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: ئەو كەسانەی فێڵ بۆ خراپە دەكەن. موجاهیدو سەعیدی كوڕی جوبەیرو شەهری كوڕی حەوشەب دەڵێن: ئەوكەسانەن كە ڕیابازی دەكەن بە كردەوەكانیان[5] واتە: فێڵ لە خەڵكی دەكەن خۆیان وا پیشان ئەدەن كە خەریكی خوداپەرستین، ئەو كەسانە خودای گەورە زۆر ڕقی لێیانە چونكە ڕیابازی دەكەن بەكردەوەكانیان بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾ واتە: فێڵەكانیان بەدرۆ دەرئەچێت هەر بەو زووانە لەلای خواناسانو لە خوانزیكان ئاشكرا دەبێت. چونكە هیچ كەسێ نیە كەشتێ پەنهان بكاتو دەری نەخات مەگین خودا لە دەمو چاوو قسە كردنیدا ئاشكرای دەكات، وە هیچ كەسێ نیە كە شتێ بشارێتەوە مەگین خودا پۆشاكەكەی دەكات بەبەریدا ئەگەر چاك بو بەچاكیو

---

[1] الطبري (٢٠/٤٤٤).

[2] أحمد (٤/٢٦٨)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەكانی سەحیحەو پیاوەكانی جێی متمانەن.

[3] ابن ماجه (٢/١٢٥٢)، سەنەدەكانی سەحیحەو پیاوەكانی جێی متمانەن.

[4] الطبري (٢٠/٤٤٥).

[5] الطبري (٢٠/٤٤٧).

ئەگەریش خراپ بوو بەخراپی، چونکە ڕیاباز کارەکەی ڕەواجی نابێ مەگەر لای کەسێ نەبێ کە گێژو حۆل بێ، بەڵام خاوەنباوەڕو لە خوداوەنزیک کاری ئەوانە هیچ نرخێکی نیە لایان، بەڵکو زوو دەردەکەون لەلایان‌و خودای ئاگادار لە شاراوەکانیش هیچی لێ وون نابێت.

**خودا وەدی هێنەرەو ئاگاداری شاراوەو نەدیارەکانە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ﴾ واتە: خودای گەورە لە سەرەتاوە ئادەمی بابتانی لە گڵ وەدی هێناوە، پاشان نەوەکانی لە ئاوێکی بێزراو دروست کردوە، ﴿ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾ واتە: پاشانیش کردنیە جوتەی نێرو مێ، ئەوەیش ڕێزو لوتفی بوو لەلایەن خودای مەزنەوە سەبارەت بە عەبدەکانی کەهەر لە خۆیان جوتەی لێ پێک هێنان هەتا لەگەڵی بحەسێنەوە. وەفەرمویەتی: ﴿ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ ﴾ واتە: خودا دەزانێ چی لە ناو سکی مێینە دایەو وەبە ئاگاداری ئەویش نەبێت هیچ مێینەیەکیش مندالّی نابێت، هیچ شتێ لە لای خودا شاراوە نیەو ئاگاداریەتی، بەڵکو ﴿ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾[1] واتە: وە هەر گەڵایەك بكەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێ‌و هەر دانەوێڵەیەك لە تاریکیەکانی زەویدا بێت‌و هەر تەڕو وشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبێکی ئاشکرادان، وە لە پێشەوە قسە کرا لەسەر ئەم ئایەتەی خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ۝٨ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ ﴾[2] واتە خوا دەزانێ هەموو مێینەیەك لە سکیدا چی هەلگرتوە (کوڕ یان کچ) وە هەروەها دەزانێ مندالّدانەکان چی لێ کەم دەبێتەوەو چی زیاد دەکات وە هەموو شتێ لای ئەو ئەندازەی دیاریکراوی هەیە، خوا زانایە بە هەموو دیارو نادیارێك گەورەو بەرزە، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ ﴾ واتە: ئەوەی کە هەندێ کەس خودا تەمەنی درێژی پێ دەبەخشێ، خۆی دەزانێ‌و لە دەفتەری یەکەمدایە ﴿ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ ﴾ ئەم زەمیرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جنسە (ناگەڕێتەوە بۆئەو ناوبراوە بەتەنیا)، چونکە تەمەن درێژی لە دەفتەرەکەداو لەزانیاری خودا دیاری کراوە، ولە تەمەنی کەم نابێتەوە. وە لە ڕێگای عەوفیەوە

[1] الانعام (٥٩).

[2] الرعد (٨ـ٩).

ڕیوایەت کراوەلە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) لەم ئایەتەدا ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ئەڵێ: هیچ کەسێ نیە کە بڕیاری تەمەن درێژی بۆ بدرێت وئەو تەمەنە نەباتە سەرو تەواوی نەکات کە بۆی دیاری کراوە، بەڵکو تەمەنی دەگاتە ئەو کاتەی کە لەو دەفتەرەدا نوسراوەو دیاری کراوە لێی زیاد ناکرێ، وە بۆ هیچ کەسێکیش نیە کە بڕیاری تەمەن کورتی بۆ بدرێت ولەسنوری خۆی زیاتر بژیو تەمەن بەسەر بەرێ، بەڵکو دەگاتە ئەو تەمەنەی کە بۆی دیاری کراوە، وەك ئەم ئایەتەی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ ئیبنو عەباس ئەڵێت: هەموو ئەوانە لە دەفتەرێك دایە لەلای خودا خۆی.[1] زەححاکیش هەروای وتوە. هەندێکی تر لە زانایان وتویانە: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ﴾ یانی: ئەوەی کە دەنوسرێ ﴿وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ﴾ کەم کەم تەمەنی دەڕوات بەرەو تەواو بون، هەمووی لای خودا زانراوە، ساڵ دوای ساڵو مانگ دوای مانگو هەفتە دوای هەفتەو ڕۆژ دوای ڕۆژو سەعات دوای سەعات، لە لای خودا لە دەفتەرەکەیدا نوسراوە، ئیبنو جەریر لە ئەبو مالیکەو وەری گرتووە.[2] سودیو عەتای خۆراسانیش هەروا ئەڵێن. نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەیفەرموو: (کەسێك ئەگەر پێی خۆشە کە بژێوی فراوان بێتو تەمەنیشی درێژ بێت با سەر لە خزمو کەسو کاری بدات)[3]. بوخاریو موسلیمو ئەبو داودیش ڕیوایەتیان کردووە[4]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾ واتە: ئەمە بۆ خودا زۆر ئاسانەو ئاگادارە لەمانە هەموویو دەزانێت چیان بەسەر دێت، چونکە زانیاری خودا هەموو شتێك دەگرێتەوەو هیچی لێ ون نابێت.

﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾﴾

---

[1] الطبري (٢٠/٤٤٧).

[2] لطبري (٢٠/٤٤٧).

[3] النسائي في الکبرى (٦/٤٣٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٤/٥٥٣)، مسلم (٤/١٩٨٢)، ابو داود (٢/٣٢١).

**لە بەهرەو نیشانەکانی خوای گەورە**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ﴾ واتە: ئەو دوو جۆرە دەریایە وەك یەك نین، ئەمەیان سازگارو شیرینەو خواردنەوەی ئاسانەو خۆشە. خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە لەسەر تواناو دەسەڵاتی مەزنی خۆی لە وەدیهێنانی زۆر شت، وەك دوو دەریا، یەکێکیان شیرینو تینو شکێنە، کە بریتیە لەو ڕووبارە زۆرانەی بەناو خەڵکدا دەڕوات لە گەورەو لە بچووك، بە پێی پێویستی خەڵکی، لە وڵاتو هەرێمو شارو دێهاتو دەشتو بیابانەکاندا کە ئاوێکی پاكو شیرینو بەسوودە بۆ کەسێك کە بیخواتەوە، ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ واتە: ئەمەی تریشیان تاڵو تفتو سوێرو لینجەو وەستاوە کەشتیەگەورەکان تێیدا دێنو دەچن، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ واتە: تاڵەو پڕ لە خوێیە. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾ واتە: لەناو هەموویاندا گۆشتی تەڕو ناسکی ماسی دەخۆن، ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾ واتە: خشڵی لێ دەردەهێننو دەیدەن لە خۆتانو خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾[1] واتە: لەو دوو دەریایە مروارىو مەرجان دەردەهێنن، جا بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾ واتە: کەشتیەکان دەبینی دەریاکات لەت دەکات کە پێشەکەی لە سنگی باڵندە دەچێت. موجاهید دەڵێت: گەمیەکان هەوا لەت دەکەن، بێگومان گەمیەی گەورە نەبێت هەوا نابڕێتو لەتی ناکات. ﴿لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ﴾ واتە: هەتا ئێوە لەو بەهرانەی خودا داویەتێ بژێوی بۆ خۆتان دابین بکەن، لە هاتوچۆکردنتان بۆ بازرگانی لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێكو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێكو لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی تر. ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی سوپاسی خوای گەورە بکەن لەسەر ئەو دروستکراوە مەزنەی کە ڕامی هێناوە بۆتان کە دەریایە، بە ئارەزووی خۆتان بەکاری دێنن هەرچۆنێك بتانەوێت، وە بۆ هەر شوێنێك بتانەوێت دەچن، هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لە ڕێتاندا، بەڵکو بە تواناو دەسەڵاتی خۆی، خوای مەزن ئەوەی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە بۆی ڕام هێناون بە فەزڵو بەزەیی خۆی.

﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ

---

[1] الرحمن (٢٢_٢٣).

لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ﴾

**پەرستراوی موشریکەکان توانای وەدیهێنانی توێکڵی تەنکی دەوری دەنکە خورما یەکیان نیە**

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ﴾ واتە: خوا شەو دەکات بەناو ڕۆژداو ڕۆژ دەکات بەناو شەودا، دیسان خوای گەورە بە تواناو دەسەڵاتی خۆی شەوو ڕۆژی ڕام هێناوە، شەو بە تاریکیەکەیی‌و ڕۆژ بە ڕووناکیەکەی، جارێك لە درێژی شەو کەم دەکاتەوەو دەیخاتە سەر ڕۆژ جارێکیش لە درێژی ڕۆژ کەم دەکاتەوەو دەیخاتە سەر شەوو بەرامبەریان دەکات، هەروەها بە پێچەوانەشەوە وەك لە هاوین‌و زستاندا لە یەکتری کەم دەکەنەوە، ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ﴾ واتە: خۆرو مانگی ڕام هێناوە. خۆرو مانگ‌و ئەستێرە وەستاوەکان‌و ئەستێرە گەڕۆکەکان‌و ئەستێرەکانی تریش لە ئاسماندا بریسکەیان دێت‌و دنیا ڕووناك دەکەنەوە گشت بە پێی ئەو ئەندازەیەی کە بۆیان دیاری کراوە دێن‌و دەچن لەسەر بەرنامەیەکی زۆر وردو پتەو، بە فەرمانی خوای زاناو خاوەن دەسەڵات. ﴿كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾ واتە: هەموو دێن‌و دەچن هەتا ڕۆژی قیامەت. ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ﴾ واتە: ئەوەی ئەم کارە دەکات پەروەردگارێکی زۆر مەزنە کە هیچ کەسێك شایانی پەرستن نیە تەنها ئەو شایانی پەرستنە پادشایەتی تەنها بۆ ئەوە. ﴿وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ واتە: ئەوەی ئێوە هاواری لێ دەکەن لەو بت‌و ئەو شتانەی کە دەیپەرستن وا دەزانن کە لە شێوەی فریشتە نزیکەکانن ﴿مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ﴾ واتە: توانای توێکڵی تەنکی دەنکە خورمایەکیان نیە. ئیبنو عەباس‌و (ڕەزای خوای لێ بێت) موجاهیدو عیکریمەو عەتاو عەتیەو عەوفی‌و حەسەن‌و قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە: (القطمير) ئەو توێکڵە تەنکەیە کە بەدەوری ناوکی خورماوەیە.[1] واتە: هیچیان بە دەست نیە لەناو ئەم ئاسمان‌و زەمینەدا تەنانەت بە ئەندازەی توێکڵی تەنکی دەنکە خورمایەکیش. پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ ﴾ واتە: ئەوانەی کە پەرستوویانن ئەگەر هاواریان لێ بکەن هاوارەکەتان نابیستن، چونکە ئەوان بێ گیان‌و دارو بەردن، ﴿وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ﴾ واتە: خۆ ئەگەریش ببیستن توانای جێبەجێ کردنی داواکانتانیان نیە، ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ﴾ واتە: وە لە ڕۆژی قیامەتدا لا لە ئێوە ناکەنەوە

[1] الطبري (٢٠/٤٥٣).

هەر ناشتانناسن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَـٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴾[1] واتە: کێ گومڕاترە لەو کەسەی هاوار لە غەیری خوا بکات کە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دوایی و ئەو (هاوارلێکراو)انە لە هاواری ئەوان بێ ئاگان. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ۝٨١ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴾[2] واتە: ئەوان بێجگە لە خوا بڕیاریان داوە بۆ خۆیان چەند پەرستراوێك بۆ ئەوەی ئەو پەرستراوانە ببنە یارمەتیدەر و تکاکار بۆیان، نەخێر وا نیە بەڵکو پەرستراوەکان لە قیامەتدا ئینکاری پەرستنەکەی ئەوان دەکەن و دەبنە دژیان و بەرپەرچیان دەدەنەوە. ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ﴾ واتە: هیچ کەسێك وەك خوای مەزن ناتوانێت لە پاشەڕۆژی کارەکان ئاگادارت بکات، بزانێت چارەنووست بە چی دەگات. قەتادە دەڵێت: واتە: خوای مەزن خۆی باسی ئەو ڕووداوانەی کردووە هەر ڕوو دەدات و گومانی تێدا نیە[3].

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ۝١٥ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ۝١٦ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ۝١٧ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ۝١٨﴾

**هەموو خەڵکی بە تەمای بەزەیی خودان و هەژارن و هەر کەسە توێشووی خۆی بە کۆڵی خۆیەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا**

خوای گەورە باسی بێنیازی خۆی دەکات لە گشت دروستکراوەکانی، بەڵکو هەموو دروستکراوەکانی بێ دەسەڵات و هەژارو ملکەچن و سەر نەوی دەکەن لە خزمەتیدا وە دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەی خەڵکینە هەموو پێویستتان بە خوا هەیە لە هەڵسان و دانیشتندا، ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ واتە: هەر خودایە کە بێنیازە و خاوەنی هەموو شتێکە و تەنهایە و هاوەڵی نیە و زۆر مەزنە و پەسەنی هەر بۆ ئەوە لەوەی کە دەیکات و دەفەرموێت و بڕیار دەدات و دەیکاتە بەرنامە. وە دەفەرموێت: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ واتە: ئەگەر خوا مەیلی لێ

---

[1] الاحقاف (٥ـ٦).

[2] مريم (٨١ـ٨٢).

[3] الطبري (٢٠/٤٥٤).

بێت هەمووتان لەناو دەبات و خەڵکێکی تر دێنێت و لە جێی ئێوە دایدەنێت، ﴿وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ﴾ واتە: ئەمەش لای خوا گران نیە و زۆر ئاسانە هیچ لەمپەرێك نیە لە ڕێیدا، ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، ﴿وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا﴾ واتە: ئەگەر کەسێکی بارگران هاوار بکات کە بێن بە هاواریەوە هیچ کەسێك یارمەتی نادات کە تۆزێك لەو بارەی بۆ هەڵگرێت، ﴿لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ﴾ واتە: با زۆر خزمی نزیکیشی بێت وەك باب و دایك و منداڵی خۆشی، هەموو سەرگەرمی خۆیەتی و ناپەرژێتە سەر کەس. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: بەڵكو ئەوانەی لە خواترسن و خاوەنی دڵێکی ڕووناك و چاکن پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن لەو پەیامەی کە بۆت هێناون و فەرمانەکانی خودا بەجێ دێنن و نوێژەکانیان بە ڕێکی بەجێ دێنن، ﴿وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ﴾ واتە: هەر کەسێك ئاکاری چاك بکات سوودەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ واتە: هەموو بۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو دەچێتەوە بەردەستی ئەو، لێپرسینەوەشی زۆر بە پەلەیەو دوای ناخات، هەموو کەسێك بە پێی کرداری خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، ئەگەر کارەکانی چاك بوو بە چاکە پاداشتی دەداتەوە، خۆ ئەگەر کارەکانیشی خراپ بوو تۆڵەی لێ دەسێنێت لەسەر ئەو کارە خراپانەی.

﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِى
ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ
أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ
جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾﴾

**خواناس و خوانەناس وەك یەك نین**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ﴾ واتە: وەك چۆن ئەم شتانە وەك یەك نین و زۆر دوورن لە یەکەوە وەك چاو ساغ و نابینا کە جیاوازیەکی ئێجگار زۆر لە نێوانیاندایە، وە تاریکی و ڕووناکی و سێبەر و بەر هەتاو، هەر بەو شێوەیەش گیانلەبەرو بێگیان وەك یەك نین. ئەمە نموونەیەکە خوای مەزن دەیهێنێتەوە بۆ خاوەنباوەڕ کە ئەوان زیندوون و خوانەناسان وەك مردوو بێگیان وان، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى

ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَا﴾[1] واتە: ئایا کەسێك کە مردو (بێباوەڕ) بێتو ئێمە زیندوومان کردەوەو ڕووناکیەکمان بۆ فەراهەم هێنا (کە قورئانە) بە هۆی ئەوەوە لەناو خەڵکیدا دەگەڕێتو دەڕوات ئایا وەك ئەوە وایە کە لە ناو تاریکستانێکدا بێت کە بە هیچ جۆرێك دەرچوونی نیە لێی. وە فەرموویەتی: ﴿مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًا﴾[2] واتە: وێنەی ئەو دوو دەستەیە وەك کوێرو کەڕو بیسەرو بینا وان ئایا ئەو دوو دەستەیە یەکسانن. خاوەنباوەڕ دڵی ڕۆشنەو دەبیسیٚ لەناو ڕووناکیدا دەڕوات بەسەر ڕێی ڕاستدا لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا دەچێتە ئەو شوێنەی کە بۆی دیاری کراوە لەناو بەهەشتدا کە سێبەری پڕو کانیاوی زۆری شیرینو بە تامی تێدایە. بەڵام خوانەناس کوێرو کەڕەو لەناو تاریکیدا دێتو دەچێت هەرگیز لێی دەرناچێت لە گومڕاییو سەر لێشێواوی خۆیدا نازانێت چی دەکات، هەتا کاتێك دەزانێت بە هیلاکدا دەچێتو بەرەو ئاگری جەهەنەم دەڕواتو دەسوتێتو سزا دەدرێت لەناو تاریکایی ئاگردا سوڕ دەخوات زۆر بێ ڕێزەو ئاوەکوڵی دەرخوارد دەدرێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُ﴾ واتە: خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت ڕێی ڕاستی نیشان دەداتو شوێنی پەیامەکەی دەکەوێتو قەبوڵی دەکات، ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾ واتە: وەك چۆن تۆ ناتوانی ئەوانەی کە خوانەناس بوونو مردوون بانگیان بکەیو کەڵك وەرگرن هەر بە هەمان شێوە ئەم موشریکانەش کە بەدبەختن تۆ ناتوانی سودیان پیٚ بگەیەنیو ڕێیان نیشان بدەی، پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ﴾ واتە: تۆ تەنها هەر ترساندنو ئاگادارکردنەوەت لەسەرە، خودا مەیلی هەر کەسی بێت ڕێی نیشان دەداتو مەیلی لە هەر کەسێکیش بێت گومڕای دەکات. پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾ واتە: ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بە ڕاستی کە مژدە بدەی بە خاوەن باوەڕانو ترسێنەر بیت بۆ خوانەناسان، ﴿وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ﴾ واتە: هیچ گەلێك لە پێشەوە نەهاتووە لە تۆرمەی ئادەم خودا ترسێنەری بۆ نەناردبن هیچ بیانوویەکی بۆ نەهێشتوونەتەوە وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞۖ وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ﴾[3] واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) تۆ هەر ترسێنەری و بۆ هەموو گەلێك ڕێنیشاندەرێك هەیە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ

---

[1] الانعام (١٢٢).

[2] هود (٢٤).

[3] الرعد (٧).

حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و ئوممەتێكدا پێغەمبەرێكمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن و دوور بكەونەوە لە هەر پەرستراوێكی تر، جا خوا هەندێكی لەو ئوممەتانە ڕێنمونی كردو هەندێكیشیان گومڕایی یەخەی گرتن. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ واتە: ئەگەر ئەمانە باوەڕ بە تۆ ناكەن گەلە پێشووەكانیش پێغەمبەرەكانی خۆیان بە درۆزن دەزانی كاتێك بە نیشانەی گەورەوە هاتنە لایان، ﴿وَبِٱلزُّبُرِ﴾ واتە: كتێبی بچووك، ﴿وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾ واتە: وە بە كتێبی زۆر ڕوون و ئاشكراوە، وە پاشان دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ واتە: لەگەڵ ئەو هەموو نیشانەیەدا كە پێغەمبەرەكانیان بۆیان ڕوون كردنەوە، بڕوایان پێ نەكردن، ئێمەش سزایەكی زۆر گران و بە ژانمان دان، ﴿فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾ واتە: تۆ بە چاوی خۆت دیت كە چۆن سزایەكی گەورەو توندم دان.

﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٖ مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهَاۚ وَمِنَ ٱلۡجِبَالِ جُدَدُۢ بِيضٞ وَحُمۡرٞ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٞ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾

### باسی توانای بێپایان و تەواوی خوای گەورە

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٖ مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهَا﴾ واتە: خوای گەورە لە توانای بێپایانی خۆی ئاگادارمان دەكات لە وەدیهێنانی ئەو هەموو شتە جۆراوجۆرو جیاوازە لە یەك شتدا، ئەویش ئاوە كە لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت كە چەندەها میوەی جیاواز كە -ڕەنگیان وەك یەك نیە- دەڕوێنێت لە زەردو سەوزو سورو سپی و چەندەها ڕەنگی تر لە میوە، وەك بە چاو دەبینرێت لە هەموو ڕەنگ و تام و بۆنێك، وەك خوای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾[2] واتە: وە لە زەویدا چەند پارچەی لە پاڵ یەكتریدا هەن هەروەها باخاتی تری و ڕەز و كشتوكاڵ و باخاتی دارخورمای دوو قەدی یەك بنج و یەك قەد هەموویان بەیەك ئاو ئاو دەدرێن كەچی باوی هەندێكیمان داوە بەسەر

---

[1] النحل (٣٦).

[2] الرعد (٤).

هەندێکی تریاندا لە خواردندا بە ڕاستی لەوانەدا چەند نیشانەی ڕوون هەیە بۆ ئەوانەی تێدەگەن‌و بیردەکەنەوە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە کێوەکانیشی دروست کردووە لە ڕەنگیان جیاوازە وەك بە چاو دەبینرێن دیسان، کە ڕەنگیان سپیەو سوورەو هەشیانە ڕەشێکی تۆخە، لە هەندێ کێودا چەند ڕێگایەك هەیە:ـ (الجُدَد) جەمعی (جُدَّة) ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: (الجُدَد) واتە: چەند ڕێگا، ئەبو مالیك‌و حەسەن‌و قەتادەو سودیش هەر وایان وتووە. ڕێگای وایان هەیە ڕەشە وەك قەلەڕەش. عیکریمە دەڵێت: واتە کێوی درێژی ڕەش، ئەبو مالیك وعەتای خۆراسانی‌و قەتادەیش هەر وایان وتووە.[1] ئیبنو جەریر دەڵێت: کاتێك کە عەرەبەکان شتێکی زۆر ڕەشیان وەسف کردبێت وتوویانە: (أسود غربيب) واتە: ڕەشێکی قەترانیە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ﴾ واتە: هەر بەو شێوەیە گیانلەبەران لە مرۆڤو جانەوەرو مەڕو مالاتیش هەمەجۆرو هەمەڕەنگن. (الدّواب) واتە: هەرچی بە زەویدا بڕوات بە قاچ، لە بابی عەتفی خاسە لەسەر عەتفی عام هەندێ لە مەردم زۆر ڕەشن وەك بەربەرو تۆتمیەکان کەچی سەقالیبەکان و ڕۆمیەکان زۆر سپین، عەرەبیش لە نێوان سپی‌و ڕەشدایەو هیندیش لە عەرەب بۆرترن، بۆیە خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَٱخْتِلَٰفُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَٰنِكُمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْعَٰلِمِينَ﴾[2] واتە: وە جیاوازی زمان‌و ڕەنگتان بە ڕاستی لەوەدا (باسکرا) بەڵگەی زۆر هەیە بۆ زانایان. هەر بەو شێوەیە جانەوەرو مەڕو مالاتیش هەمەڕەنگن بەڵکو لە یەك ڕەگەزدا لە گیانەوەر، چەند ڕەنگی جیاواز هەیە، پاکی‌و بێ گەردی بۆ ئەو خودایەی کە دروست کراوەکانی لە ڕێکترین شێوەدا وەدی هێناوە. بۆیە خوای مەزن پاش ئەمانە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ واتە: ئەوانەی کە زۆر زانان بە ڕاستی لە خوا دەترسن‌و باش دەیناسن، واتە: ئەوانەی زۆر شارەزاترن لە گەورەیی‌و توانا‌و دەسەڵات‌و زانیاری ئەو خودایە کە هەرچی سیفەتی تێرو تەواوە تیایەتی‌و بە ناوە پیرۆزەکانی وەسف کراوە، زۆرترو زیاتر لێی دەترسن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ دەڵێت: ئەوانەی کە دەزانن خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.[3] وە هەر لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: زاناو شارەزا

---

[1] لطبري (٢٠/٤٦١).

[2] الروم (٢٢).

[3] لطبري (٢٠/٤٦٢).

لە عەبدەكانی خودا ئەوانەن كە هەرگیز شەریكیان بۆ خودا دانەناوەو حەڵاڵی خودایان بە حەڵاڵ زانیوەو حەرامی خودایان بە حەرام زانیوەو ئامۆژگاریەكانی ئەویان لە گوێ گرتووەو پاراستوویانەو باوەڕی تەواویان بووە كە دەچنەوە لای خوداو پرسیاریان لێ دەكرێت لەسەر كردارەكانیان، سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: ترسان لە خودا ئەو ترسەیە كە دەبێتە ڕێگر لە نێوان تۆو نافەرمانیو بێ گوێیی خودادا. حەسەنی بەسری دەڵێت: زانا ئەو كەسەیە كە لە خوای دلۆڤانی خۆی دەترسێت بەپەنهانیو هەر شتێك خودا پێی خۆش بێت ئەویش پێی خۆشە، وە خۆی دەپارێزێت لەوەی كە خودا پێی ناخۆشە، پاشان حەسەن ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾ سوفیانی سەوری دەڵێت لە ئەبو حەیانی تەمیمیەوە لە پیاوێكەوە كە دەڵێت: وتراوە زانایان سێ جۆرن: زانا بە خواو، زانا بە فەرمانی خوا، زانا بە خوا بەڵام زانانیە بە فەرمانی خوا ، وە زانا بە فەرمانی خوا بەڵام زانانیە بە خوا ، زانا بە خوداو فەرمانی خودا ئەوەیە كە لە خودا دەترسێتو ئاگاداری سنوورو فەرزەكانیەتی، ئەوەی زانایە بە خواو زانا نیە بە فەرمانی خودا، ئەو كەسەیە كە لە خودا دەترسێت بەڵام شارەزای سنووروو فەرزەكانی نیە. ئەوەی زانایە بە فەرمانەكانی خوداو زانا نیە بە خودا، ئەو كەسەیە كە سنووروو فەرزەكانی خودا دەزانێت بەڵام لە خوای مەزن ناترسێت.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ ﴾

### تەنها موسڵمان بازرگانی ڕۆژی دواییە

خوای مەزن باسی عەبدە خاوەن باوەڕەكانی دەكاتو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾ واتە: ئەوانەی كە كتێبی خودا دەخوێننەوەو باوەڕیان پێی هەیەو كار بەو فەرمانانە دەكەن كە پێیان ڕادەگەیەنرێت، وەك نوێژو ئەوەی كە خودا پێی داون لە ڕێی خودا دەیبەخشن لە ماڵی حەڵاڵ لە جێی خۆیدا بە شەوو بە ڕۆژ بە نهێنیو ئاشكرا، ﴿يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾ واتە: بە هیوای پاداشتێكن لە لای خودا كە هەرگیز زەرەر ناكات بەرهەمەكەی وەدەست دێنن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ﴾ واتە: پاداشتی چاكەیان دەداتەوە بە چەندجار زیاتر لەوەی خۆیان كە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە، ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٌ﴾ واتە: لە خەتاكان دەبووریت، ﴿شَكُورٌ﴾ واتە: بە كردەوەی كەمیشیان دەزانێتو پاداشتیان لەسەری دەداتەوە.

﴿وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾﴾

**ئەم قورئانە ڕاستەو کتێبی خودایە**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ﴾ واتە: ئەوەی کە بۆ تۆمان ناردووە ئەی موحەممەد(ﷺ) لەم کتێبەدا کە قورئانە، ﴿هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ واتە: ڕاستەو کتێبە پێشووەکانیش بە ڕاست دەزانێتو بڕوای پێیانە، ئەو کتێبانەش شایەتیان داوە کە ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە ڕەوانەکراوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ﴾ واتە: خودا خۆی ئاگادارەو چاودێرە بەسەر عەبدەکانیەوە دەزانێت کێ شایەنی ئەوەیە کە ڕێزدارتر بێت بەسەر ئەوی تردا لە مەردم. هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕێزی پێغەمبەرانی داوە بەسەری هەموو خەڵکدا، وە ڕێزی هەندێ لە پێغەمبەری داوە بەسەر هەندێکی تریدا، پلەی زیاتر بەرز کردوونەتەوە، وە پلەی پێغەمبەری موحەممەد (ﷺ) زیاتر بەرزکردووەتەوە بەسەر هەموو پێغەمبەراندا(درودو سەلامی خوا لەسەر هەموویان).

﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾﴾

**میراتگرانی قورئان سێ بەشن**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ واتە: لە پاشان ئەم قورئانەمان بەخشی بە کەسانێك کە لەناو بەندەکانماندا هەڵمانبژاردن، پاشان کردوونی بە سێ بەشەوەو فەرموویەتی: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ﴾ واتە: هەندێکیاە غەدریان لە خۆیان کردووە لە واجیباتەکاندا بە چاکی بەجێیان نەهێناوەو هەندێ تاوانو کاری دوور لە خوایان کردووە، ﴿وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ﴾ واتە: هەندێکی تریان واجیباتەکان بەجێ دێننو کاری حەرامو ناڕەوا ناکەن، وە هەندێ لە کارە چاکەکان واز لێ دێنێتو کاری مەکروهیش دەکات، ﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ واتە: هەندێکیشیان پێشبڕکێ دەکەن لە کاری خێرو واجیبەکان بەجێ دێننو کاری چاکیش زۆر دەکەنو کاری حەرامو مەکروهیش ناکەن واز لە هەندێ شتی مەباحیش (حەڵاڵیش) دێنن. ﴿ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ واتە: ئەم (قورئان پێدانە) لە خۆیدا بەهرەیەکی گەورەیە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾ دەڵێت:

ئەوانە ئوممەتی موحەممەدن (ﷺ) کردوونی بە میراتگری هەموو ئەو کتێبانەی کە ناردوویەتی، دەبووریت لەوانەی کە غەدریان لە خۆ کردووە، مامناوەندیەکانیش پرسیاری کەم و ئاسانیان لێ دەکرێت، ئەوانەشی پێشبڕکێیان کردووە بۆ چاکەکردن دەچنە بەهەشت بێ لێپرسینەوە.[1] ئەبو قاسمی تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە ڕۆژێك فەرموویەتی: (شەفاعەتی من بۆ ئەوانەیە کە گوناهی گەورەیان کردووە لە ئوممەتەکەم). ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت ئەوەی پێشبڕکێی کردبێت لە چاکەکردندا بەبێ لێپرسینەوە دەچێتە بەهەشت، مامناوەنجیش بە ڕەحمی خوا دەچێتە بەهەشت، ستەم لە خۆ کەریش هاوەڵانی ئەعرافن و بە شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەچنە بەهەشت.[2] وە ڕیوایەت کراوە لە زۆرێك لە زانایانی پێشینەوە ئەوەی کە ستەمی لە خۆی کردووە لە خەڵکی ئەم ئوممەتە لەو کەسانەن کە هەڵبژاردەن با هەندێ کەم و کوڕی و لار و وێریشیان هەبێت. هەندێکی تر لە زانایان وتوویانە: ئەوەی کە غەدری لەخۆی کردووە خەڵکی ئەم ئوممەتە نیە لە هەڵبژاردەکانیش نیە، کە میراتبەری ئەم قورئانەن، بەلام ڕاست وایە کە ئەمانەش لە خەڵکی ئەم ئوممەتەن.

## ڕێزو قەدری زانایان

زانایان دڵخۆشترین کەسن بەم بەهرەیەو شایستەترین کەسن بەم ڕەحمەتە چونکە ئەمانە وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە قەیسی کوڕی کەسیرەوە دەڵێت: پیاوێك لە خەڵکی مەدینە هات بۆ لای ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەبو دەرداء پێی وت: چی تۆی گەیاندووەتە ئێرە ئەی برای خۆم؟ پیاوەکە وتی: فەرموودەیەك منی گەیاندووە کە تۆ وتووتەو باست کردووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەبو دەرداء وتی: بۆ بازرگانی نەهاتووی؟ وتی: نەخێر، وتی: بۆ پێویستیەك نەهاتووی؟ وتی: نەخێر. ئەبو دەرداء وتی: ئایا تەنها بە دوای ئەم فەرموودەیەدا هاتووی؟ وتی: بەڵێ، ئەبو دەرداء (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: من بیستوومە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەرو بە دوای زانیاریەکدا بگەڕێت، خوای مەزن بە هۆی ئەوەوە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات و فریشتەکان باڵەکانیان دادەنێن بۆ ڕازی کردنی زانستخواز، وە بێگومان ئەوانەی لەناو ئاسمان و زەمیندان داوای لێبوردن دەکەن لە خودا بۆکەسی زانا، تا ماسیەکانیش لەناو ئاودا، وە ڕێزو قەدری زانا بەسەر خواپەرستدا وەك ڕێزی مانگ وایە بەسەر ئەستێرەکانی ترەوە. بە ڕاستی زانایان میراتبەری پێغەمبەرانن (سەلامی خوایان لێ بێت) پێغەمبەرانیش دینارو درهەمیان بە

---

[1] لطبري (٢٠/٤٦٥).

[2] الطبراني (١١/١٨٩).

میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانیاریان بەجێهێشتووە. هەر کەسێك دەستی کەوتبێت بەشێکی تەواوی وەرگرتووە).[١] ئەبو داودو تیرمیزیو ئیبنو ماجەیش هێناویانە[٢].

﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ ﴾

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾ واتە: ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتانی جێی مانەوە، خودای گەورە باسی ئەو هەڵبژاردنە دەکات لەو عەبدانەی کە بوونە میراتبەری ئەو کتێبەی کە لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە هاتە خوار کە حاڵیان چۆنە لە ڕۆژی قیامەتدا کە شوێنیان باغاتێکە هەرگیز لەناو ناچێتو تێك ناچێت، واتە: بەهەشتێکی تاهەتایە دەچنە ناوی لەو ڕۆژەداو دەگەنە بەر بارەگای خودای مەزن، ﴿يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗا﴾ واتە: خۆیان دەڕازێننەوە بە بازنی زێڕو مرواری لەوێدا. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (دەستبەندی خاوەنباوەڕ دەڕوات تا ئەو شوێنەی دەستنوێژ پێی گەیشتووە).[٣] ﴿وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ﴾ واتە: پۆشاکیشیان لەناو بەهەشتدا ئاوریشمە، بۆیە لە دنیادا لێیان قەدەغە بووە، لە ڕۆژی دواییدا خودای گەورە بۆیان حەلاڵ دەکات. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك ئاوریشم لە دنیادا بپۆشێت لە ڕۆژی قیامەتدا نایپۆشێتو لەبەری ناکات).[٤] وە فەرموویەتی: (ئەو ئاوریشمە لە دنیادا بۆ ئەوانەو لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئێوەیە).[٥] پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴾ واتە: دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە خەمو خەفەتی لە دڵمان دەرکردو لەو ناڕەحەتیو ترسو گیرو گرفتانەی دنیاو قیامەت ڕزگاری کردین بە ڕاستی پەروەردگارمان لێبوردەی شایانی سوپاسە. ئیبنو عەباسو کەسانی تریش وتوویانە: لە زۆر خەتایان دەبوورێتو بە چاکەکانیشیان دەزانرێت هەرچەندە کەمیش بێت ڕێزیان لێ دەگیرێت. پاشان خوای

---

[١] أحمد (١٩٦/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[٢] أبو داود (١٥٧/٤)، تحفة الأحوذي (٤٥٠/٧)، ابن ماجه (٨١/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[٣] مسلم (٢١٩/١).

[٤] فتح الباري (٢٩٦/١٠).

[٥] فتح الباري (٢٩٦/١٠).

مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ واتە: ئەو خودایەی کە ئەم شوێنەو ئەم پلەیەی پێ بەخشین بە فەزڵو کەرەمو بەزەیی خۆی بووە، کە کردارەکانمان بەرامبەر ئەم پێزە نەبووە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك لە ئێوە کردارەکانی نایخاتە بەهەشت)، وتیان: نە تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: (نە منیش تەنها بە فەزڵو کەرەمی ئەو نەبێت).[1] ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴾ واتە: تووشی ماندووبوونو نارەحەتی نابین. (النَّصَب واللُّغُوب) هەردوو وشەکە بۆ ماندووبوون بەکاردەهێنرێت، وەك ئەوەی کە ڕەنجو ماندووبوون ناچەژنو لاشەو گیانیان نارەحەت نابێت، والله أعلم. چونکە لە دنیادا خۆیان ڕاهێنابوو لەسەر عیبادەت، بە چوونە ناو بەهەشت هەموو تەکلیفێکیان لەسەر نامێنێتو لە ئیسراحەتێکی بەردەوامو تاهەتاییدا ژیان بەسەر دەبەن، وەك خوای مەزن لە ئایەتێکدا فەرموویەتی: ﴿كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ﴾[2] واتە: (پێیان دەوترێت) بخۆنو بخۆنەوە، نۆشتان بێت بە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە ڕۆژانی ڕابردوودا کردووتانە.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ٣٦ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ٣٧ ﴾

**پاداشتی خوانەناسو ژیانیان لەناو جەهەنەمدا**

خوای مەزن باسی ژیانی بەختەوەرانی کرد، دێتە سەر باسی بەدبەختان کە چیان بەسەر دێت لەناو جەهەنەمدا، دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ ﴾ واتە: ئەوانەی خوانەناسن دەچنە ناو ئاگری جەهەنەمو هەر دەمێننەوە تێیداو نامرن، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ﴾[3] واتە: نە دەمرێت تیایدا تا ڕزگاری بێت وە نە دەژی تیایدا بە ئاسایی، وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوانە کە ئەهلی ناو ئاگرنو خەڵکی ئەوێن، نە دەمرنو نە زیندووشن).[4] وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ

[1] فتح الباري (١٠/١٣٢).

[2] الحاقة (٢٤).

[3] الاعلى (١٣).

[4] مسلم (١/١٧٢).

لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴾[1] واتە: وە هاوار دەکەن ئەی مالیك (سەرپەرشتیاری دۆزەخ) با پەروەردگارت بمانمرێنێت تا ڕزگار ببین، ئەویش دەڵێت: بێگومان ئێوە دەمێننەوە. ئەمانە ئا لەو ژیانەدا بەردەوام دەمێننەوە حەز دەکەن بمرن بۆ ئەوەی ئیسراحەت بکەن بەڵام نامرن، خوای گەورەش دەفەرموویت: ﴿لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ﴾ واتە: بڕیاری مردن نادرێت بەسەریاندا تا بمرن هەروەها هەندێ لە سزای (دۆزەخ)یان لێ سوك ناکرێت، وەك خوای مەزن لە چەند ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾[2] واتە: بە ڕاستی تاوانباران لە سزای دۆزەخدا بە هەمیشەیی دەمێننەوە، سزایان لەسەر سوك ناکرێتو ئەوان لەناو ئەو سزایەدا نائومێدن. وە دەفەرموویت: ﴿كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا ﴾[3] واتە: هەر جارێك دۆزەخ بڵێسەی بنیشێتەوەو دامرکێتەوە بڵێسەی ئاگرەکەیان بۆ زیاد دەکەین. وە دەفەرموویت: ﴿فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾[4] واتە: ئینجا بچەژن سزای خۆتان هیچتان بۆ زیاد ناکەین سزا نەبێت. پاشان فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ﴾ واتە: ئەمە پاداشتی هەر کەسێکە کە بڕوای بە پەروەردگار نەهێناوەو ئەم جەهەنەمەی بە درۆ زانیوە. پاشان خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا ﴾ واتە: دەگرینو هاوار دەکەنو لە خوا دەپاڕێنەوە بە دەنگی بەرز ئەڵێن: ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ﴾ واتە: ئەی خودایە لەناو ئاگر دەرمان بێنەو بمانگێڕەوە بۆ ناو دنیا، ئەم جارە وەك جاری پێشوو ناکەین، کاری چاك دەکەین، خوای گەورە خۆی چاك دەزانێت ئەگەر جارێکی تریش بگەڕێنەوە سەر دنیا دەچنەوە سەر کارە خراپەکەی خۆیان، چونکە ئەمانە درۆزنن، بۆیە خوای گەورە وەڵامیان ناداتەوە، وەك لەم ئایەتەدا باسیان دەکات کە ئەڵێن: ﴿فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا ﴾[5] واتە: ئایا ڕێگایەك هەیە لێرە دەرباز بین، خوای گەورەش دەفەرموویت: ئەمەتان بۆیە بەسەر دێت، چونکە هەر کاتێك مەردم تەنها خودایان بپەرستایە، ئێوە حاشاتان دەکردو

[1] الزخرف (٧٧).
[2] الزخرف (٧٤_٧٥).
[3] الاسراء (٩٧).
[4] النبأ (٣٠).
[5] الغافر (١١_١٢).

دووردەکەوتنەوە، بەڵام کاتێك شەریکیان بۆ دادەنا ئێوە بڕواتـان دەهێنـا، بۆیـە لێرەدا خـوای گـەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ واتە: ئایا تەمەنێکی درێـژمان نەدا بە ئێـوە لـە دنیـادا ئەگـەر ئارەزووتـان لێ بووایـە بـەرەو ڕاسـتی بێن‌و سـوود لـەو ژیانـە وەرگـرن بەڕادەیەك لەو ماوە درێـژەدا سـودتان لێ وەربگرتایەو ئایا ترسێنەرتان بـۆ نـەهات، ئیمامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) ئـەویش لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کـە فەرموویەتی: (بێگومان خوای گەورە مۆڵەتی بەندەی خۆی داوە کە گیانی کردووە بە بەریدا هـەتا ئـەو کاتەی کە تەمەنی گەیشتووە بە شەست یان حەفتا ساڵ، خودا ئەوەی کردووە بە مۆڵـەت بـۆی، خـودا ئەوەی کردووە بە مۆڵەت بۆی)[1]. هەر بەم شێوەیە بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە کتێبـی (الرقـائق) لـە سەحیحەکەیدا لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا هیچ بڕوبیانوویەکی نەهێشتووەتەوە بۆ کەسێك کەتەمـەنی پێدابێت، تـا گەیشتووەتە شەسـت سـاڵ).[2] ئیبنـو جـەریریش ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەر کەسێك خودا تەمەنی درێژ بکات شەسـت سـاڵ ئـەوە خـودا بیانووی بۆ نەهێشتووەتەوە لەو ژیانەیدا کە بەسەری بردووە).[3] ئیمامی ئەحمەدو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە لە (الرقاق)دا.[4] کاتێك کە خوای گەورە ئەم تەمەنەی کردووە بـە مۆڵـەت بـۆ عەبـدەکانی‌و هـیچ بڕوبیانوویەکی بـۆ نەهێـشتوونەتەوە، ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێت کـە تەمـەنی زۆربـەی ئـەم ئومەتـە لـەو نێوانەدایە، وەك ئەم فەرموودەیە لـەم بارەیـەوە هـاتووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (تەمەنی مرۆڤی ئوممەتی من لە نێوانی شەسـت‌و حـەفتا ساڵ دایە، کەمیان لەو تەمەنە تێدەپەڕێت). هـەر بـەم شـێوەیە تیرمیـزی‌و ئیبنـو ماجـەش ڕیوایـەتیان کردووە لە کتێبی (الزهـد)دا.[5] خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ واتـە: ترسێنەریـشتان هاتە لا. ڕیوایەت کـراوە لـە ئیبنـو عـەباس‌و (ڕەزای خـوای لێ بێـت) عیکریمـەو ئـەبو جەعفـەری باقرو قەتادەو سوفیانی کوڕی عویەینەوە، دەڵێن: مەبەست بە(﴿وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ﴾ مـووی سپیە[6]! سـودی‌و

---

[1] أحمد (٢/٢٧٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١١/٢٤٣).

[3] لطبري (٢٠/٤٧٨).

[4] أحمد (٢/٤١٧)، تحفة الإشاف (٩/٤٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] الترمذي (٣٥٥٠)، ابن ماجە (٤٢٣٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[6] البغوي (٣/٥٧٣).

عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن: مەبەست پێی پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، ئیبنو زەید ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ﴾[1] واتە: ئەم پێغەمبەرە ترسێنەرێکە لە ترسێنەرەکانی پێشوو.[2] ئەمە شەیبان ڕیوایەتی کردووە لە قەتادەوە کە دەڵێت: خوای گەورە تەمەن و پێغەمبەرانی کردووەتە بەڵگە بەسەریانەوە،[3] ئەمە ڕای ئیبنو جەریریشە، کە ئەمەیان ڕۆشنترە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾[4] واتە: وە هاوار دەکەن ئەی مالیك با پەروەردگارت بمانمرێنێت، ئەویش دەڵێت بێگومان ئێوە دەمێننەوە، سوێند بە خوا بە ڕاستی ئایینی هەقمان بۆ هێناون بەڵام زۆربەیان ڕاستیان پێ ناخۆشە. وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[5] واتە: ئێمە هەرگیز سزای (بەندەکانمان) نادەین هەتا پێغەمبەر نەنێرین بۆیان. وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ﴾[6] واتە: هەرچەند دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوە دەرگاوانەکانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەکەن ئایا پێغەمبەرێکی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە لە دنیادا، وتیان: بەڵێ بۆمان هاتووە بەڵام بە درۆمان زانی و دەمانوت پێی خوا هیچی نەناردووەتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەکی گەورەدان. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾ واتە: بچێژن ئەو سزای ئاگرە لە پاداشتی ئەوەی کە دژایەتی پێغەمبەرانتان دەکرد لە هەموو کردارێکدا لە ماوەی ژیانتاندا، هیچ کەسێك نیە بێت بە هاوارتانەوە لەو سزا سەخت و زنجیرکراوی و بەدبەختیە ڕزگارتان بکات.

[1] النجم (٥٦).

[2] لطبري (٤٧٨/٢٠).

[3] الدر المنثور (٣٢/٧).

[4] الزخرف (٧٧-٧٨).

[5] الاسراء (١٥).

[6] الملك (٨-٩).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَـٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (٣٨) هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَـٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَـٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ إِلَّا مَقۡتٗاۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَـٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ إِلَّا خَسَارٗا (٣٩) ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَـٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: خودا ئاگای لە هەموو نهێنیەکانی ئاسمانو زەمین هەیەو ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتە: دەزانێت چی لەناو دڵاندایەو هیچی لێ ون نابێت لەوەی کە تیایدا شاراوەتەوە. وە پاشان دەفەرمووێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَـٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: ئەو خودایەی کە ئێوەی لە جێی پێشینەکان لەسەر زەمیندا داناوە، گەل دوای گەلو نەوە دوای نەوەی کردووە بە جێنشین بەر لە خۆی، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَيَجۡعَلُكُمۡ خُلَفَآءَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾[1] واتە: وە دەتانکاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی. وە دەفەرمووێت: ﴿ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥ ﴾ واتە: هەر کەسێك ناشوکرە، ناشوکریەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی، بۆ کەسی تر ناگەڕێتەوە، ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَـٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ إِلَّا مَقۡتٗا ﴾ واتە: هەتا بەردەوام بن لەسەر ئەو خوانەناسیە خودا زیاتر لێیان تووڕە دەبێت، ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَـٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ إِلَّا خَسَارٗا ﴾ واتە: وە هەتا بەردەوام بن لەسەر خوانەناسی زیاتر زیان لە خۆیانو کەسو کاریان دەدەن لە ڕۆژی قیامەتدا بە پێچەوانەی خاوەن باوەڕەوە، کە هەتا تەمەنیان درێژ بێتو ئاکاری چاك دەکەن شوێنو پلەیان بەرز دەبێتەوە لەناو بەهەشتداو لە لای خودا خۆشەویست دەبنو پیرۆزباییان لێ دەکات.

﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَـٰهُمۡ كِتَـٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّـٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا (٤٠) ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا (٤١) ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت بە پێغەمبەر (ﷺ) کە بڵێ بە موشریکەکان: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَـٰهُمۡ كِتَـٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ بَلۡ إِن يَعِدُ ٱلظَّـٰلِمُونَ بَعۡضُهُم بَعۡضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەو هاوبەشانەی لە جیاتی خودا دەتانپەرستنو هاوارتان لێ دەکردن نیشانم بدەن لە زەویدا چیان دروست

---

[1] النمل (٦٢).

کردووە؟ یان لە بەدیهێنانی ئاسمانەکاندا بەشداری یان کردووە؟ یان کتێبێکمان پێداون جا بەڵگەیان لەو کتێبەدا هەیە کە بتەکان هاوبەشی خودان، نەخێر وانیە، بەڵکو ستەمکاران هیچ بەڵێنێك بە یەکتری نادەن جگە لە فریودانو هەڵخەڵەتاندن، پاشان خوای گەورە باسی مەزنی دەسەڵاتی خۆی دەکات کە بە هۆی ئەو تواناو دەسەڵاتەیەوە ئاسمانەکانو زەمین ڕاوەستاوەو بەو شێوەیە دروستی کردوون کە پێکەوە بنو نەکەون وە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ﴾ واتە: خوا ئاسمانەکانو زەمینی ڕاگرتووە کە نەلەرزن لە شوێنی خۆیاندا، وەك لە ئایەتی تردا فەرموویەتی: ﴿وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ﴾[1] واتە: وە ئاسمانی ڕاگیر کردووە تا نەکەوێت بەسەر زەویدا مەگەر بە فەرمانی ئەو، وە فەرموویەتی: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ بِأَمۡرِهِۦۚ﴾[2] واتە: لە نیشانەکانی ئەوە کە ئاسمانو زەوی بە فەرمانی ئەو وەستاون. وە پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ﴾ واتە: ئەگەر کەوتن کەسێکی تر نیە غەیری خودا ڕایان بگرێت، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾ واتە: لەگەڵ ئەوەیشدا خوای گەورە زۆر بە لەسەرخۆیی کارەکانی دەکاتو خەتا پۆشیشە، واتە: بەندەکانی دەبینێت کە بڕوای پێ ناکەنو لە فەرمانی دەردەچن، پەلەیان لێ ناکاتو دوایان دەخاتو بە شێنەیی لەگەڵیان دەجوڵێتەوەو چاوپۆشیان لێ دەکاتو لە گوناهیان دەبوورێت، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾.

﴿ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِن جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ لَّيَكُونُنَّ أَهۡدَىٰ مِنۡ إِحۡدَى ٱلۡأُمَمِۖ فَلَمَّا جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ مَّا زَادَهُمۡ إِلَّا نُفُورًا ٤٢ ٱسۡتِكۡبَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَكۡرَ ٱلسَّيِّيِٕۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلۡأَوَّلِينَۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ٤٣﴾

خوای گەورە باسی قورەیشو عەرەبەکان دەکات کە بە توندی سوێندیان دەخوارد پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِن جَآءَهُمۡ نَذِيرٞ لَّيَكُونُنَّ أَهۡدَىٰ مِنۡ إِحۡدَى ٱلۡأُمَمِۖ﴾ واتە: بتپەرستان بە سوێندی هەرە گەورەیان دەخوارد بە خوا (دەیانوت) ئەگەر پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ بێت بە ڕاستی ئەوان لە هەر یەك لە ئوممەتانی تر ڕێنموونتر دەبن. زەححاكو کەسانی تریش ئەڵێن: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَن

[1] الحج (٦٥).

[2] الروم (٢٥).

تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُواْ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا﴾[1] واتە: لەبەر ئەوەی نەڵێن بێگومان کتێب بۆ سەر دوو کۆمەڵی گاورو جوولەکە نێردراوەتە خوارەوە لە پێش ئێمەدا کە بە ڕاستی ئێمە لە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی کتێبەکانین بێ ئاگا بووین، وە بۆ ئەوەش نەڵێن بە ڕاستی ئەگەر کتێبی ئاسمانی بۆ ئێمە بهاتایە ئەوە ئێمە لەوان ڕێنموونی تر دەبووین ئەوە بێگومان بەڵگەو نیشانە (قورئان)ی ڕوونتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە ڕێنموونیو میهرەبانیەکی گەورەیە کەواتە کێ ستەمکارترە لەو کەسەی بێباوەڕ بێت بە ئایەتەکانی خوداو بە درۆی بزانێتو ڕووی لێ وەربگێڕێت. وەك ئەم ئایەتانەش کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُواْ بِهِۦ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾[2] واتە: بێگومان هەرچەندە بتپەرستان دەیانوت بە ڕاستی ئەگەر کتێبێکی ئاسمانی وەك کتێبی پێشینەکانمان هەبووایە، بە ڕاستی ئێمە لە بەندە پاكو خاوێنەکان دەبووین، ئینجا کە کتێبێکیان بۆ هات باوەڕیان پێ نەهێناو بە زوویی دەزانن (سەرەنجامی بێباوەڕیەکەیان چۆن دەبێت). پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ﴾ واتە: کاتێك ترسێنەریان بۆ هات کە (پێغەمبەر (ﷺ)یان بۆ هات) لەگەڵ خۆی قورئانی پیرۆزی بۆ هێنان کە هەموو شتێکی تێدا ڕوون کرابووەوە، ﴿مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾ واتە: زیاتر لە خودا دوورکەوتنەوەو دەستیان دایە خوانەناسی! پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: خۆیان لەوە بە زلتر دەزانی شوێنی نیشانەکانی خودا بکەون لەسەر زەویدا، ﴿وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ﴾ واتە: وە فێڵیان دەکرد لە خەڵکی بۆ ئەوەی لە ڕێگەی خودا لایان بدەنو بیانترازێنن، ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾ واتە: ئەو فرووفێڵە خراپەیان هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، زیانی بۆ کەسی تر نیە، ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ واتە: ئایا چاوەڕوانی سزای خودا دەکەن کە بڕوا ناهێنن بە پێغەمبەرەکەیو فەرمانەکانی پشتگوێ دەخەن وەك پێشینەکان، ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ واتە: هیچ گۆڕانکاریەكو دەستکاریەك بەسەر بڕیارەکانی خودای مەزندا نایەت، بەڵکو جێبەجێ دەکرێت بەسەر هەموو خوانەناسو

[1] الانعام (١٥٦_١٥٧).

[2] الصافات (١٦٧_١٧٠).

خراپەکارێکدا، ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا﴾ واتە: خوا مەیلی لە هەر کەسێك بێت لەناوی دا، هیچ کەسێك ناتوانێت ببێتە ڕێگری، ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ﴾[1] واتە: وە کاتێك خوا بیەوێت هۆزێك تووشی بەلا بن هیچ بەرگرێکی بۆ نیە.

﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعۡجِزَهُۥ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمٗا قَدِيرٗا ﴿٤٤﴾ وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا ﴿٤٥﴾ ﴾

**سەرەنجامی خراپەکاری ئەوانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەران نەکرد لە یاد مەکەن**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعۡجِزَهُۥ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: بلێ بەو خوانەناسانەی کە قورئانت بۆ هێناون، بڕۆن و بگەڕێن بەسەر زەمیندا بڕوانن و بزانن پێشینەکان ئەوانەی کە لە ئێوە بەهێزتر بوون چارەنووسیان بە چی گەیشت، چۆن خودا قڕی کردن، هەموو خوانەناسێك هەر وای بەسەر دێت، ماڵەکانیان چۆڵ بوو، هەرچیان بە دەست هێنابوو لە سامان و ماڵ و منداڵ و توانا و دەسەلات، هیچی فریایان نەکەوت و لە سزای خودا ڕزگاری نەکردن، کاتێك کە خودای مەزن فەرمانی قڕکردنی دان، چونکە هیچ شتێك ناتوانێت ببێتە ڕێگر لەبەر فەرمانی خودا، کاتێك کە بڕیاری دابێ ببێت لە ئاسمانەکان و زەمیندا، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمٗا قَدِيرٗا ﴾ واتە: ئاگاداری هەموو بوونەوەرە و توانای هەیە بەسەریدا.

**( حیکمەت ) لە دواخستنی تۆڵە**

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ ﴾ واتە: ئەگەرخوا بەهۆی گوناهەکانیانەوە بیگرتنایە و تۆڵەی لێ بسەندنایە هەموو خەڵکی سەر زەمین لەناو دەچوون و هیچ شتێکیشیان بۆ نەدەمایەوە لە ڕۆزی و مەڕو ماڵات. سەعیدی کوڕی جوبەیرو سودی لەم ئایەتەدا: ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ ﴾ دەڵێن: کاتێك کە بارانیان لە ئاسمانەوە بۆ نەبارییایە گشت مەڕوماڵاتیان لەناو دەچوو، ﴿وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾

---

[1] الرعد (١١).

واتە: بەڵام خوای مەزن مۆڵەتیان دەدات هەتا ڕۆژی قیامەت لەو کاتەدا موحاسەبەیان دەکات، هەر کەسەو پاداشتی کرداری خۆی وەردەگرێت، ئەوەی خواناس بووە پاداشتی چاکەی وەردەگرێتو ئەوەشی خوانەناسو خراپەکار بووە تۆڵەی لێ دەسێنرێت، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا﴾ واتە: هەر کاتێك ئەو ماوەیە بەسەرچوو خودا خۆی دەزانێت بەندەکانی چیان کردووە.

## تەفسیری سورەتی (یس)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾
لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾﴾

**پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانەکراوە کە خەڵکی بترسێنێتو ئاگاداریان بکاتەوە**

﴿يسٓ﴾ باسی ئەم پیتانە لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا کرا، ﴿وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ﴾ سوێند بە قورئان کە سەر لەبەر کارزانیە. ﴿وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ﴾ واتە سوێند بەو قورئانە کە پڕە لە کارزانیو پڕوپوچی هەرگیز تێکەڵاو نابێت نە لەم کاتەداو نە لەمەوداش ﴿إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: تۆ یەك لە پێغەمبەرانی، واتە: تۆ ئەی موحەمەد (ﷺ) یەکێکی لە پێغەمبەران، ﴿عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتە: کەوتوویتە سەر ڕاستە ڕێگە، یانی لەسەر بەرنامەو ئاینو ڕێبازێکی ڕێكو ڕاستی، ﴿تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئەم قورئانە هەرە خاوەن دەسەڵاتی دلۆڤان ناردوویەتە خوار، واتە: ئەو ڕێگەو ئاینو بەرنامەی کە تۆ پێی هاتووی لە لایەن خودای خاوەن دەسەڵاتو دلۆڤان بۆ بەندە خاوەن باوەڕەکانی هاتووەتە خوارەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾[1] واتە: وە بە ڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنموونی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست، ڕێگەی ئەو خودایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکانو هەرچی لە زەویدایە هی ئەوە، بێداربن! هەموو کارەکان هەر بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ

---

[1] الشورى (٥٢-٥٣).

ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴾ تا بە هۆی ئەوەوە ترس وەبەر گەلێك بێنێت كە باب‌و باپیرانی پێشوویان كەس لە خوا نەیترساندوون‌و بێ ئاگا بوون. واتە: بۆ ئەوەی گەلێك بترسێن كە لە پێشەوە باب‌و باپیرانی ئەوانە هیچ كەسێك نەیترساندون‌و بێ ئاگا بوون، مەبەست پێی لێرە عەرەبەكانە. چونكە پێش پێغەمبەر(ﷺ) كەسێك نەهاتووە ئاگاداریان بكاتەوە. وە باسی عەرەبەكان دەكات مانای وا نیە جگە لەوان ناگرێتەوە. هەروەها باسی هەندێ كەس دەكات مانای وا نیە گشتگیر نیە بەڵكو بۆ هەموو خەڵكییە لە پێشەوە باسی ئەو ئایەت‌و فەرمووده موتەواترانەمان كردووە كە باسی هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) دەكات بۆ خەڵكی بەبێ جیاوازی وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ خەڵكینە بە ڕاستی من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەمووتان. وە دەفەرمووێت: ﴿ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ بەڵێنی خوا زۆرینەیان دەگرێتەوە سا ئەوان بڕوا ناهێنن. واتە: بەڵێن‌و جەزرەبەی خودا زۆرینەیان دەگرێتەوە كە بڕوا ناهێنن. ئیبنو جەریر دەڵێت: خودا جەزرەبەی خۆی بۆ داناون. وە لە دایكی كتێبەكان (أم الكتاب)دا بڕاوەتەوە كە ئەوانە باوەڕ ناهێنن ﴿فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: باوەڕ ناهێنن بە خوداو بە پێغەمبەرەكانی (سەلامی خوایان لێ بێت)[2].

﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ ۖ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾﴾

### ژیانی ئەو كەسانەی كە بە بەدبەخت نووسراون

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴾ واتە: ئێمە ملیان دەخەینە ناو زنجیرەوە تا چەناگە شەتەكیان دەدەین، كە ناتوانن بۆ هیچ لایەك سەر بجوڵێنن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ئێمە ئەوانەی كە بڕیاری چارەڕەشیان لەسەر دراوەو بەدبەختن وێنەیان بۆ گەیشتن بۆ سەر ڕاستەڕێ وەك ئەو كەسانەیە كە زنجیر لە ملی كراوەو هەردوو دەستی لە گەردنی ئاڵاوە لە ژێر چەناكەیدا، سەری بەرز كردووەتەوە بە هیچ لایەكدا ناجوڵێتەوە. بۆیە خوای

---

[1] الاعراف (١٥٨).

[2] الطبري (٢٠/٤٩٢).

مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَـٰقِهِمْ أَغْلَـٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴾، (المقمح) واتە: سەری بەرز کردووەتەوە. وەك ئومو زەرع دەڵێت: لە قسەکانیدا (واشرب فأتقمّح).[1] واتە: دەخۆمەوەو تینویەتیم دەشکێتو سەرم بەرز دەکەمەوە تینویەتیم ئەشکێنێت و تێراو ئەبم. وە هەر باسی زنجیری ملی کردووە باسی زنجیری دەستی نەکردووە هەرچەندە هەدوویان مەبەست بووە. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَـٰقِهِمْ أَغْلَـٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ﴾[2] واتە: وە دەستت مەکە کۆت بە گەردنتدا. واتە: دەستیان بەستراوە بە ملیانەوە ناتوانن بۆ هیچ چاکەیەك بیکەنەوە.[3] موجاهید دەڵێت: ﴿فَهُم مُّقْمَحُونَ﴾ واتە: سەریان بەرز کردووەتەوەو دەستیان لەسەر دەمیان داناوە.[4] دەستیان لە هەموو چاکەیەك بەستراوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَـٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ واتە: لەمپەرێکمان لە پێشیانەوە داناوەو لەمپەرێك لە پشتیانەوە، تارمایشمان هاویشتە سەر گلێنەیان بۆهیچ نابینن. ﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا﴾ واتە: ڕێگرێکمان لەبەردەم دانان لە ڕاستی لایاندا ﴿وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا﴾ واتە: بەر بەستێکیش لە پشتیشیانەوە، ئیتر هەر ئەمبەر و ئەوبەریانە[5]. قەتادە دەڵێت: لە ناو گومڕایی و سەرلێشێواویدا ئەمبەر و ئەوبەریانە[6]. ﴿فَأَغْشَيْنَـٰهُمْ﴾ چاومان کوێر کردن ڕاستییان نەدەبینی ﴿فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ واتە: سود لە چاکە وەرناگرنو شوێنی ناکەون. ئیبنو جەریر دەڵێت: ڕیوایەت کراوەو لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿فَأَغْشَيْنَـٰهُمْ﴾ بە بە عەینی موهمەلە (واتەعەینی بێ خاڵ) کە لە (العشا)وە هاتووە کە بریتیە لە نەخۆشیەك لە چاودا.[7] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: خوای گەورە ئەم دیوارەی

---

[1] البخاري (٥١٨٩)، مسلم (٢٤٤٨).

[2] الاسراء (٢٩).

[3] الطبري (٢٠/٤٩٤).

[4] الطبري (٢٠/٤٩٤).

[5] الطبري (٢٠/٤٩٥).

[6] الطبري (٢٠/٤٩٥).

[7] الطبري (٢٠/٤٩٦).

لە نێوان ئەوان و ئیسلام و باوەڕدا داناوە و ناتوانن زیان بەئیسلام بگەیەنن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند:
﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت بڕوا ناهێنن، هەرچەند هەموو بەڵگەو نیشانەیەکیشیان بێت هەتا (بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر ئەبینن. پاشان دەڵێت: هەر کەسێك خودا ڕێی نەدات توانای نیە زەرەر لەئیسلام بدات[2]، عیکریمە ووتی: ئەبو جەهل دەڵێت: ئەگەر موحەمەدم بینی وا دەکەم و وا دەکەم. ئەوەبوو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾ دەڵێت: پێیان دەوت ئەوە موحەممەدە. دەیوت: لە کوێیە؟ لە کوێیە؟ نەیدەبینی! ئیبنو جەریر ئەمەی ڕیوایەت کردووە.[3]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ بۆ ئەوانە چ ترسیان وەبەر بهێنی، چ نەهێنی، وەك یەکە، هەر نابن بە خاوەن باوەڕ. واتە: خوا عاقیبەت شەڕی کردوون و ترساندن و ئاگادارکردنەوە کاریان تێناکات و لە سەرەتای سورەتی (البقرة)دا نمونەی ئەم ئایەتانە هاتووە. وەك خوای مەزن لەم ئایەتانەشدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[4]، واتە: بە ڕاستی ئەوانەی دەرچووەو چەسپاوە بۆیان بڕیاری پەروەردگارت بڕوا ناهێنن، هەرچەند هەموو بەڵگەو نیشانەیەکیش بۆیان بێت هەتا (بە چاوی خۆیان) سزای سەختی ئازاردەر دەبینن. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴾ واتە: ترس وەبەرهێنانەکەت هەر بۆ کەسێك باوی هەیە. پەیڕەوکەری ئەم قورئانەیەو لە نەدیتە ترسی خودای لە دڵدایە. سا تۆ مزگێنی پێبدە کەچاو پۆشی لێدەکرێت و پاداشتی باشیشی هەیە. ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ ﴾ واتە: ئاگادارکردنەوەکەت تەنها خاوەن باوەڕان کەڵکی لێ وەردەگرن، ئەوانەی کە شوێن ئەم قورئانە پیرۆزە کەوتوون، ﴿وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾ واتە: لە پەنهانیدا ترسی خودای لە دڵدایە لە کاتێکدا کە کەس نایبینێت غەیری خودای گەورە کە ئاگای لێیەتی و هەرچی دەکات ئەو دەیزانێت، ﴿فَبَشِّرۡهُ

[1] یونس (٩٦_٩٧).
[2] الطبري (٢٠/٤٩٥).
[3] الطبري (٢٠/٤٩٥).
[4] یونس (٩٦_٩٧).

بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴾ واته: مژدەی بدەرێ کە لـە گوناهـەکانی دەبوورێـتو پاداشـتی زۆر فـراوانو چـاكو باشـی دەدرێتـەوە. وەك خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾[1] واته: ئەوانەی لە پەنهانیدا لە خوای خۆیان دەترسن لێخۆشبوونو پاداشتی گـەورەیان بـۆ هەیـە. پاشـان خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ﴾ واتـە: ئێمـە خۆمـان مـردووان زینـدوو دەکەینـەوەو هـەر کـارێکی بـە زینـدوویی کردوویانـەو شـوێنەواریان، گـشت دەنووسـین هـەموو شـتمان لـە کتێبێکـی پێـشەنگدا هـەژمارکردووە. ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾ واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئێمـە خۆمـان مـردووان زینـدوو دەکەینەوە. لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە خودای گەورە مەیلی لێ بێت دڵـی هەنـدێ لـە خوانەناسـان زیندوو دەکاتەوە ئەوانەی کە دڵیان مردووەو گومڕابوون. ڕێیان نیشان دەدات بۆ سەر ڕاستی دوای ئەو گومڕاییە. وەك خوای مەزن دوای باسی ڕەقبوونی دڵەکان فەرموویـەتی: ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾[2]، واته: بێگومان بزانن کە خودا زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنـی بێگومـان نیـشانەو بەڵگـەکانمان بـۆ ڕوون کردوونەتـەوە تـا بـیر بکەنـەوە. وە دەفـەرموێت: ﴿وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾ واتـە: هەرچیان کـردووەو شوێنەوارەکانیـشیان ئـەوەی دوای خۆیـان بەجێیان هێشتووە هەموو دەنووسینو پاداشتیان دەدەینەوە لەسەری ئەگەر چاك بوو بە چاکەو ئەگەر خراپیش بوو بە خراپە وەك پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (هەر کەسێك کارێکی چاكو جـوان بکـات لـە ئیسلامدا پاداشتەکەی وەردەگرێتو پاداشـتی ئـەو کەسـەش وەردەگرێـت کـە بـەو کـارە جوانـەی ئـەو هەڵدەسێت دوای خۆی بەبێ ئەوەی هـیچ لـە پاداشـتی ئـەو کەسـانە کـەم ببێتـەوە. وە هـەر کەسـیش کارێکی خراپو ناشیرین بکات لە ئیسلامدا تاوانەکـەی دەکەوێتـە سـەر شـانیو تـاوانی ئـەو کەسـانەش هەڵدەگرێت لە دوای خۆی دەیکەنو پێی هەڵدەسن بەبێ ئەوەی لە تاوانی ئەو کەسانە کـەم ببێتـەوە). موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە جەریری کوڕی عبدالله ی بەجەلیـەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) کـە چـیرۆکی ئەو مۆزەرڕێیانەش باس ئەکات ئەو جلوبەرگی خوری تەختەتیان لەبـەردابوو[3]، ئیبنـو ئـەبی حاتـەمیش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە بەدرێژی لە جەریری کوڕی عەبدوڵاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) پاشان

[1] الملك (١٢).
[2] الحديد (١٧).
[3] مسلم (٢/٧٠٤).

ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾، موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگایەکی ترەوە.[1] وەهەروەها ئەو فەرموودەیەی کە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك تۆرمەی ئادەم مرد کردەوەی دەبڕێتەوە مەگین لە سێ شتدا نەبێت: لەزانیاریەکەوە کە سوودی لێ وەربگیرێت، یان لە منداڵێکی چاکەوە کە بۆی بپاڕێتەوەو دوعای بۆبکات، یان لە خێروبێرێکی بەردەوامەوە کە لە دوای خۆی جێی دەهێڵێ)[2]. سوفیانی سەوری دەڵێت: لە ئەبو سەعیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە موجاهید لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾ دەیوت: ئەو شوێنەوارانەی کە لە کاتی گومڕاییدا کردوویانەو بەجێیان هێشتووە بۆیان ئەنووسین. ئیبنو ئەبی نوجەییج و کەسانی تریش وتوویانە لە موجاهیدەوە ﴿مَا قَدَّمُواْ﴾ کردەکانیان کە کردوویانە ﴿وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾ ئەو هەنگاوانەی بە قاچیان ناویانە.[3] حەسەن‌و قەتادەیش هەر وایان وتووە، ﴿وَءَاثَٰرَهُمۡ﴾ واتە: هەنگاوەکانیان.[4] قەتادە دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر خودای گەورە شتێکی تۆی لە بیر نەمایە. ئەوەی ڕەشەبا کوێری دەکردەوەو دەیسڕیەوە لە بیری دەکرد لەو شوێنەوارانە.[5] بەڵام خوای گەورە هەمووی ژمارە کردووە لەسەر نەوەی ئادەم لەو شوێنەوارو ئەوانەش کە لە سەرپێچی‌و تاواندا بە کاری هێناوە. هەر کەسێك پێی خۆشەو حەز دەکات با شوێنەوار لە ڕەزامەندی خودادا بەجێ بهێڵێ. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابری کوڕی عەبدوڵاوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: زەوی دەوری مزگەوت چەند شوێنی چۆڵ بوو، بەنی (سەلیمە) ویستیان بگوێزنەوەو بچنە پاڵ مزگەوت، ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێیان: (بیستوومە کە ئێوە دەتانەوێت بچنە نزیك مزگەوت؟) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وامان نیاز بووە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی بەنی سەلیمە لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە با شوێنەوارەکانتان بنووسرێت. لەماڵەکانی خۆتان بمێننەوە با شوێنەوارەکانتان بۆ بنووسرێت).[6] هەر بەو شێوەیە

---

[1] مسلم (٢/٧٠٦).

[2] مسلم (٣/١٢٥٥).

[3] الطبري (٢٠/٤٩٧).

[4] الطبري (٢٠/٤٩٩).

[5] الطبري (٢٠/٤٩٩).

[6] أحمد (٣/٣٣٢).

موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت)[1] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پیاوێك لەم مەدینە مرد پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی لەسەر کردو فەرمووی: (خۆزگە لە شوێنێکدا بمردایە کە تیایدا لە دایك نەبووە)! پیاوێك لەو خەڵکە وتی: لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وەختێك پیاو لە شوێنێ کە تێیدا لە دایك نەبووە بمرێت. ئەو ماوەیەی کە لێی لەدایك بووە هەتا ئەو شوێنەوارەی کە تێیدا ئەمرێت، هەمووی بۆحیساب دەکرێت لە بەهەشتدا).[2] نەسائیو ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە.[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سابتەوە دەڵێت: لەگەڵ ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕۆیشتین، وەختێك نوێژمان تەواو کرد ئەنەس وتی: لەگەڵ زەیدی کوڕی سابت دەچووم بە ڕێدا، بە پەلە دەڕۆیشتم. وتی: ئەی ئەنەس: ئایا ئاگاداری کە شوێنەوار دەنوسرێت؟).[4] ئەم قسەیەو قسەی پێشوو هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوانیاندا. بەڵکو بێدارکردنەوەیەکی زیاترو چاکترە. چونکە کاتێك ئەو کەسە شوێنەوارەکانی دەنووسرێت. کەواتە ئەو کارانەی کە دەیکات لە چاکەو خراپە چاکترو باشتر دەنووسرێت، والله أعلم. هەروەها خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: هەرچی بوونەوەر هەیە هەموومان لە کتێبێکی ڕوونکەرەوەدا ژماردووەو نووسیوە لە (لوح المحفوظ)دا ، ﴿إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾ لێرەدا مەبەست پێی (أم الكتاب)ە ئەمە قسەی موجاهیدو قەتادەو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمە.[5] وە هەر بەو شێوەیە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ ﴾[6] واتە: لەو ڕۆژەدا هەموو خەڵك بانگ دەکەین لەگەڵ نامەی کردەوەیان کە دەبێتە شایەت لەسەر کردارەکانیان لە چاکەو خراپە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِا۟ىٓءَ بِٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلشُّهَدَآءِ ﴾[7] واتە: وە نامەی کردەوە لەبەر دەمیاندا دادەنرێتو پێغەمبەرەکانو شایەتەکان دەهێنرێن. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ

---

[1] مسلم (٤٦٢/١).

[2] احمد (١٧٧/٢)، فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

[3] النسائي (٧/٤)، ابن ماجه (٥١٥/١)، فەرموودەیەکی بەهێز نیە.

[4] الطبري (٤٩٨/٢٠).

[5] الطبري (٤٩٩/٢٠).

[6] الاسراء (٧١).

[7] الزمر (٦٩).

مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴾[1] واتە: نامەی کردەوەکان دابەش دەکرێت (دەدرێتە دەستی ڕاستی چاکانو دەستی چەپی تاوانباران) ئینجا تاوانباران دەبینی زۆر دەترسن لەو (هەموو تاوانو خراپە)ی کە تێیدایەو دەڵێن: ئای هاوار بۆئێمە ئەم نامەو دەفتەرە چیە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووكو گەورەی بەجێ نەهێشتووەو تۆماری نەکردبێت، هەر کردەوەیەکیان کردبێت( تیایدا) ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات.

﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ
فَقَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ
﴿١٥﴾ قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾﴾

**بەسەرهاتی خەڵکی ناو ئاوابیەکە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا کەوا دەگەیەنێت درۆزنەکان هەموویان تیاچوون**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ واتە: بەسەرهاتی خەڵکی ناو ئاوابیەکەیان بۆ نمونە بۆ بگێڕەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) چوونە لایان. ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بەسەرهاتی خەڵکی ئەو ئاوابیە بگێڕەوە بۆ هۆزەکەی خۆت کە باوەڕت پێ ناکەن، ﴿مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) دەڕۆیشتنە لایان. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: پێی گەیشتووە لە ئیبنو عەباسو کەعبی ئەحبارو وەهبی کوڕی مونەبیهەوە کە ئەو ئاوابیە شاری ئەنتاکیە بووە پادشایەکی تێدا بووە ناوی ئەنتخسی کوڕی ئەنتخسی کوڕی ئەنتیخس بووە کە پادشایەکی بتپەرست بووە. خوای گەورە سێ پێغەمبەری (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆ ناردن کە ناویان سادقو سەدوقو شەلوم بووە. باوەڕی پێ نەکردوون.[2] هەروەها ڕیوایەت کراوە لە بورەیدەی کوڕی خوسەیب و عیکریمەو قەتادەو زوهەریشەوە کە ئەو ئاوابیە ئەنتاکیە بووە.[3] هەندێ لە زانایان گومانیان بۆدروست بووە کە ئەو ئاوابیە ئەنتاکیە بووبێت إن شاء الله ئێمەش پاش باسکردنی بەسەرهاتەکە باسی دەکەین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا

---

[1] الكهف (٤٩).

[2] الطبري (٢٠/٥٠٠).

[3] الطبري (٢٠/٥٠٠).

فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴾ واتە: ئەو دەمەی کە دوو کەسمان بۆ بەڕێ کردن. کەسیان بڕوایان پێ نەکردن. پێغەمبەری سێهەمیشمان ناردە لایان. یارمەتی ئەو دووانە بدات. وتیان: ئێمە بێگومان، بۆ لای ئێوە ناردراوین. ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ ﴾ کاتێك کە دوو پێغەمبەرمان بۆ ناردن باوەڕیان پێ نەکردن، ﴿فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ ﴾ بۆ پشتگیریو یارمەتی دانی ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) پێغەمبەری سێهەمیشمان بۆ ڕەوانە کردن. ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە وەهەبی کوڕی سولەیمانەوە، لە شوعەیبی جوبەئیەوە وتوویەتی: ناوی ئەو دوو پێغەمبەری پێشوو شەمعونو یوحەنا بووە سێهەمیش ناوی بۆڵس بووە. ئاواییەکەیش ئەنتاکیە بووە. ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴾ وتیان بە خەڵکی ئەو ئاواییە بەدڵنیاییەوە ئێمە لە لایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوین بۆ لای ئێوە. ئەو خودایەی کە ئێوەی دروست کردووەو فەرمانی پێداون کە تەنها ئەو بپەرستنو هاوەڵی بۆ دانەنێن. ئەبولعالیە دەڵێت: قەتادەی کوڕی دیعامە لای وابوو کە ئەوانە سێ نوێنەری عیسای کوڕی مەریەم بوون (سەلامی خوایان لێ بێت) نێردران بۆ لای خەڵکی ئەنتاکیە، ﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴾ وتیان: ئێوە هەر مرۆڤێکن وەك خۆمان. خودا هیچی نەناردووەتە خوارەوە، ئێوە کارتان درۆکردنە، ﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾ واتە: ئێوە هەروەك ئێمە ئادەمین، چۆن کتێب هاتووە بۆ ئێوەو بۆ ئێمەش نەهاتووە کە ئێوە مرۆڤنو ئێمەش هەر مرۆڤین. بۆچی نیگاش بۆ ئێمە نایەت وەکو ئێوە. خۆ ئەگەر ئێوە پێغەمبەر بوونایە، دەبوو فریشتە بوونایە. لە وێنەی ئەم قسانە زۆرە لەناو ئەو گەلانەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەهێناوە وەك خوای گەورە بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا ﴾[1] واتە:ئەو (سزایە) بێگومان بە هۆی ئەوەوە بوو کە پێغەمبەرانیان بۆ هات بە بەڵگەی ئاشکراوە کەچی دەیانوت چۆن دەبێت ئادەمییەك لە خۆمان ڕێنموونیمان بکات. بە لایانەوە جێگای سەرسوڕمان بووەو باوەڕیان پێ نەکردووە. ﴿قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾[2] واتە: وتیان ئێوەش هەر ئادەمیەکی وەك ئێمەن دەتانەوێت بەرگری ئێمە بکەنو لامان بدەن لە (پەرستنی) ئەوەی کە باووباپیرانمان دەیانپەرست دەی نیشانەو بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن. وە خوای گەورە قسەی ئەوانە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

---

[1] التغابن (٦).

[2] ابراهيم (١٠).

﴿ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَاسِرُونَ ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی بەشەرێکی وەك خۆتان بکەن بێگومان ئێوە ڕەنجەسار دەبن. وە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَن يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَىٰ إِلَّا أَن قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴾[2] واتە: هیچ شتێك بـەرگری خـەڵکی نـەکرد لەوەی کە باوەڕ بێنن کاتێك کە ڕێنموونی ئاییـنی حەقیان بۆ هات بێجگە لـەوەی دەیـانوت: چۆن خـوا ئادەمیەك بە پێغەمبەر دەنێرێت. بۆیە ئەمانە لێرەدا وتوویانە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَا أَنزَلَ الرَّحْمَٰنُ مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُوا رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴾ وتیان: پەروەردگاری ئێمە خۆی دەزانێـت کـە بـۆ لای ئێـوە ڕاسـپێردراوین. یـانی: هەرسـێ پێغەمبەرەکە وەڵامیان دانەوەو وتیان: خوای خۆی دەزانێت کە ئێمە ڕاسـپێراوی ئـەوین بـۆ لای ئێـوە. خۆ ئەگەر درۆیەك بە ناوی ئەوەوە بکەین. خودا خـۆی سـزامان دەداتو تۆڵـەمان لێ دەسـێنێت. بـەڵام خوای گەورە یارمەتیمان دەداتو سەرمان دەخات بەسەر ئێوەداو بەم زووانە دەزانـن کـە پاشـەڕۆژ بـۆ کێ دەبێتو کێش شەرمەزار دەبێت. وەك خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿ قُلْ كَفَىٰ بِاللَّهِ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ شَهِيدًا ۖ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾[3] واتە: بڵێ (پێیان) خوا بەسە بۆ شایەتی دان لە نێوان منو ئێوەدا ئەوەی لە ئاسمانـەکانو زەویدایە دەیزانێتو کەسانێك کـە باوەڕیـان هێنـاوە بـە بـەتاڵو بێبـاوەڕ بـوون بـە خـوا تـەنها ئەوانـەن زەرەرمەندان. خوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَا عَلَيْنَا إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾ واتـە: ئێمە هـەر ئـەوەمان لەسەرە، پەیامی ئەو بە ئاشکرا بە ئێوە بڵێین، نە هیچی تر. دەڵێن: ئەوەی لەسـەر ئێمە بێت گەیانـدنی پەیامی خودایە کە بە ئێوە بگەیـەنین. خـۆ ئەگـەر شـوێنی کـەوتنو بـە گوێتـان کـرد لـە دنیـاو قیامەتـدا بەختەوەر دەبن. ئەگەر شوێنیشی نەکەوتن بەم زووانە دەزانن‌و ئاکامەکەی وەردەگرن. والله أعلم.

﴿ قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُوا طَائِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

---

[1] المؤمنون (٣٤).

[2] الاسراء (٩٤).

[3] العنكبوت (٥٢).

خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ واتە: وتیان: پێ‌و قەدەمی ئێوە بۆ ئێمە شوومە، دەست هەڵنەگرن، بەردەبارانتان دەکەین‌و سەخت جەزرەبەتان دەدەین. وەختێك پێغەمبەرەکان وتیان: ئێمە هەر گەیاندنی ئەو پەیامەمان لەسەرە کە پێتان بگەیەنین. خەڵکی ئاواییەکە وتیان ﴿إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡ﴾ ئێمە هیچ خێروبێرێك بە ناوچاوانی ئێوەوە نابینین کە سودی ببێت بۆ ژیانمان. وە ئەگەر تووشی خراپەیەکیش بووین بەهۆی ئێوەوە بەسەرمان دێت.[1] موجاهید دەڵێت: ئەیانووت: هیچ کەسێکی وەك ئێوە نەچووەتە ئاواییەك مەگین خەڵکەکەی تووشی سزاو ئازار هاتوون، ﴿لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ﴾ ئەگەر واز نەهێنن بەردەبارانتان دەکەین، قەتادە وتوویەتی.[2] ﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ جەزرەبەی سەختتان دەدەین. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ﴾ واتە: وتیان: شومیتان لە خۆتانە، ئاخۆ ئەگەر ئامۆژگاری بکرێن (ئاوا دەکەن)؟ بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکن لە ئەندازەی خۆتان دەرچوون، ﴿قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ﴾ پێغەمبەرەکانیان (سەلامی خوایان لێ بێت) پێیان وتن: شومی پێ‌و قەدەم شومی لە خۆتانەوەیە. وەك خوای گەورە لە بارەی هۆزی فیرعەونەوە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾[3] واتە: جا کاتێك چاکەیان بۆ بهاتایە (لە سەروەت‌و بەروبووم) دەیانوت: ئەمە شایستەی ئێمەیە بەڵام کاتێك تووشی بەڵاو خراپە بوونایە (دەیانوت) بە هۆی شومی موساو شوێنکەوتووانیەوەیە ! بێداربن! بێگومان ئەو (ناخۆشیانە)ی بە لایانەوە شوم‌و خراپە لە لایەن خواوەیە (نەك موساو ئیمانداران). چارەنووستان لای خودایە، هۆزی پێغەمبەر ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) وتیان وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ﴾[4] واتە: ئێمە تووشی شومی‌و نەگبەتی بووین بە هۆی تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆدان، (صالح) فەرمووی: هۆی ئەو نەگبەتیەی ئێوە لە لای خودایە (کە بێباوەڕیتانە). لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلۡقَوۡمِ لَا

---

[1] الطبري (٢٠/٥٠٢).

[2] الطبري (٢٠/٥٠٢).

[3] الاعراف (١٣١).

[4] النمل (٤٧).

يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾[1] واتە: وە ئەگەر (ناپاکان) خۆشی‌و چاکە هاتە ڕێیان دەڵێن ئەمە لە لایەن خواوەیەو ئەگەر تووشی ناخۆشی‌و خراپەیەك هاتن دەڵێن ئەمە لە لایەن تۆوەیە، (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: هەمووی لە لایەن خواوەیە ئەوە ئەو خەڵکە چیانە وەکو لە هیچ قسەیەك تێ نەگەن وایە.

وە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿أَئِن ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی کە ئێمە ئامۆژگاریمان کردن‌و داوامان لێکردن کە بە تەنها خودا بپەرستن شتی تری لەگەڵ مەپەرستن کەچی ئێوە ئا بەو شێوەیە وەڵاممان دەدەنەوە هەڕەشەمان لێ دەکەن‌و دەمانترسێنن. قەتادە دەڵێت: واتە: ئەگەر ئامۆژگاریمان بکردنایە کە فەرمانی خودا بەجێ بێنن. ئێوە بە شوم سەیری ئێمەتان دەکرد بەڵکو ئێوە گەلێکی لە ئەندازەی خۆتان دەرچوون[2].

﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَا الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ اتَّبِعُوا مَن لَّا يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّي إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّي آمَنتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَا الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: پیاوێك لەوسەری شارەوە بە غار دەهات. وتی: کەسەکانم! بکەونە شوێن ئەو کەسانە ڕاسپێردراون. ئیبنو ئیسحاق وەك لە ئیبنو عەباس‌و کەعبی ئەحبارو وەهەبی کوڕی مونەبیهەوە پێی گەیشتووە دەڵێت: خەڵکی ئەو ئاواییە ویستیان ئەو کەسانە بکوژن کە نێردرابوون بۆ لایان، پیاوێك لە سەری شارەوە بە ڕاکردن هات بۆ لایان، بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات نەهێڵێت هۆزەکەی ئازاریان بدەن. وتراوە: ئەو کەسە حەبیب (حبیب) بووە خەریکی دروستکردنی تۆڕی ماسی بووە، کابرایەکی نەخۆش بووە، گولی زۆر بەخێرایی لەشی داگرتووە، زۆر بەخشندە بووە، نیوەی ئەو پارەیەی دەستی دەکەوت لە ڕێی خوادا ئەیبەخشی‌و پیاوێکی زۆر ڕاستو پاك بووە.[3] شەبیبی کوڕی بیشر دەڵێت: لە عیکریمەوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ناوی هاوەڵەکەی (یس) حەبیبی نەجار بووە کە هۆزەکەی کوشتیان. ﴿قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ وتی: خەڵکینە شوێنی ئەوانە بکەون ڕاسپێردراون بۆ

---

[1] النساء (٧٨).

[2] الطبري (٢٠/٥٠٤).

[3] الطبري (٢٠/٥٠٤).

لاتان. داوای کردووە لە هۆزەکەی کە شوێنی ئەو پێغەمبەرانە بکەون کە هاتوون بۆ لایان، ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴾ واتـە: پـەیڕەوی ئەمانـە بکـەن کـە بـۆ خۆیـان شـارەزای ڕێگـەی خودانو هیچ پاداشتیان لێتان ناوێت! واتە: شوێنی ئەوانە بکەون کە هیچ پاداشتێکیان لە ئێوە ناوێت لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامەی کـە بۆیـان هێنـاونو شـارەزای ئـەو ڕێگەیـەن کـە ئێـوەی بـۆ بـانگ دەکەن کە بریتیە لە ناسینی خـودای گـەورە بـە تـەنهاو هـاوەڵ دانەنانـە بـۆی. ﴿وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ واتە: من بۆ دەبێت ئەو کەسەی دروستی کردووم نەیپەرستم، هـەمووومان هـەر بـۆ لای ئـەو دەگەڕێینـەوە! ﴿وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي ﴾ واتـە: مـن بۆچـی بـە تـاکو تـەنها ئـەو خودایەی منی وەدی هێناوەو شەریکی نیە نەپەرستم ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ وە لە ڕۆژی قیامەتدا هـەر بـۆ لای ئەو دەڕۆنەوە پاداشتی کردەوەکانتان دەداتەوە، ئەگەر چاك بوو بە چاکە ئەگەر خراپیش بـوو بـە سـزادان. ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ﴾ واتە: چۆن من دەچم (غەیری خودا) ئەو شتانە دەپەرستم هەر کاتێك خودا بیەوێت بەڵایەکم بەسـەر بێـت، تکـای ئـەوان هـیچ بەهرەیـەکم بـۆ نـاداتو نـاتوانن ڕزگـارم بکـەن. ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾ ئەمە ئیستیفهامێکی ئینکاریە. سەرزەنشتو نـاڕەزایی دەربڕینـە واتـە هـەرگیز کـاری وەهـا ناکەم، ﴿إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ﴾ واتە: ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە خودا هیچ دەسەڵاتێکیان نیەو خۆ ئەگـەر خـودا بەڵایـەکم بەسـەر بێنێـت خـۆی نەبێت کەس ناتوانێت لەسەرم لابـەرێتو تکام بـۆ بکـاتو ڕزگـارم بکـات. ﴿فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ﴾[1] واتە: غەیری خودا کەس لەسەرم لاینابات. ﴿ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾ واتە: ئەگەر وابێت، ئەوساکە من بە ئاشکرا گومڕا بووم. واتە: ئەگەر غەیری خودا کەسێکی تر بپەرستم من بە ئاشکرا سەرم لێ شێواوە، ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴾ واتە: من بە پەروەردگاری ئێوە بڕوام هێناوە سـا ئێـوەش گـوێم بۆبگرن. ئیبنو ئیسحاق وەك پێی گەیشتووە لە ئیبنو عەباسو کەعبو وەهەبەوە دەڵێت: بە هۆزەکەی ووت: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴾ من بڕوام هێنا بـە پـەروەردگاری ئێوە دە گـوێ بگـرن لـە قسەکانم.[2] وە هەڵیش دەگرێت ئەو قسانەی لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا کردبێت (سـەلامی خوایـان لێ بێـت)

---

[1] الانعام (١٧).

[2] الطبري (٢٠/٥٠٧).

کە پێی وتوون: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ ﴾ من باوەڕ هێنا بەو خوایەی کە ئێوەی ڕەوانە کردووە ﴿فَٱسۡمَعُونِ ﴾ واتە: ئێوە شایەتیم بۆ بدەن لای خودا. ئیبنو جەریر ئەمەی گێڕاوەتەوەو دەڵێت: کەسانی تریش وتوویانە: ئەو پیاوە بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ پێغەمبەرەکان کردووەو پێیان دەڵێت: گوێتان لە قسەکانم بێت بۆ ئەوەی شایەتیم بۆ بدەن لە لای پەروەردگارم کە من بڕوام بە پەروەردگاری ئێوە هێناوەو شوێنی ئێوە کەوتووم. ئەم قسەیە کە ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە لەو کەسانەوە ماناکەی ڕوونو ئاشکراترە والله أعلم. ئیبنو ئیسحاق لەوەی کە پێی گەیشتووە لە ئیبنو عەباسو کەعبو وەهەبەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت)دەڵێت: کاتێك پیاوەکە ئەو قسانەی کرد هەموو بە یەکەوە پەلاماریان دایەو کوشتیان. هیچ کەسێکی نەبوو بەرگری لێ بکات.[1] قەتادە دەڵێت: هەموو خەڵکەکە بەردەبارانیان دەکرد ئەویش دەیوت: خوایە ڕێ نیشانی هۆزەکەم بدە چونکە ئەوانە نازانن‌و تێناگەن. بەردەوام لێیان دەداو ئەویش هەر ئەو دوعایەی بۆ دەکردن هەتا کوشتیان خوا لێی ڕازی بێت[2]!

﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾ ۞ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: وترا: وەرە بەهەشتەوە، وتی: بریا هۆزەکەیشم بیانزانیایە. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق گێڕاویەتەوە لە هەندێ لە هاوەڵەکانیەوە ئەوانیش لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەوەندەیان لێداو خستیانە ژێر لەقە هەتا ڕیخۆڵەکانی لە دوایەوە هاتنە دەرەوە. خوای گەورە فەرمووی: ﴿ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ﴾ بڕۆرە بەهەشتەوە. چووە بەهەشتەوەو لەوێ ژیانی هەتاهەتایی دەست پێکردو خوای گەورە ئێش‌و ئازارو دڵگرانی‌و نەخۆشیەکەی دنیای نەهێشت.[3] موجاهید دەڵێت: وترا بە حەبیبی نەججار: وەرە بەهەشتەوە. یانی کاتێك کە شەهیدکرا خوای مەزن خستیە بەهەشتەوە. وەختێك ئەو پاداشتەی بینی وتی: خۆزگە هۆزەکەم ئەمەیان بزانیایە، ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴾.[4] قەتادە دەڵێت: خاوەن

[1] الطبري (٢٠/٥٠٨).
[2] الطبري (٢٠/٥٠٨).
[3] الطبري (٢٠/٥٠١).
[4] الطبري (٢٠/٥٠٩).

باوەڕ هەمیشە دڵسۆزی و ئامۆژگاری لـێ چـاوەڕوان ئـەکرێت، هـەرگیز نـابینی خەیانـەتکار بێت. بۆیـە کاتێك بەچاوی خۆی ئەوهەمووە ڕێزەی بینی کە خـودا پێـی بەخـشیوە ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ واتـە: وتـی: بریـا هۆزەکـەم بیانزانیبـا، کـە ئـەو کەسـەی منـی پـەروەردە کـرد، لـێم خـۆش بـووەو خـستوومیەتیە ڕێـزی بـەڕێزان. ئـاواتی دەخواست کـە هۆزەکـەی ئەمەیان بزانیبا کە خودا چۆن ئاوا ڕێزی لێنـاوە و لـە بەهەشـتدا داینـاوە[1]. ئیبنـو عـەباس دەڵێت: لـە ژیانیدا ئامۆژگاری هۆزەکەی کردو پێی وتن: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ وە پـاش مـردنیش وتـی: ﴿يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ ئیبنـــو ئـــەبی حاتـــەم ڕیوایـــەتی کردووە. سوفیانی سەوری دەڵێت: لە عاسمی ئەحوەلەوە لە ئەبو میجلـەزەوە کـەماناى: ﴿بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ ئەوەیـە: بـە هـۆی بڕوابـوونم بـە خـواو بـە ڕاسـت زانینـیو شـوێنکەوتنی پێغەمبەرەکانیەوە(سەلامی خوایان لێ بێت)ئەم ڕێزەم دەست کـەوتووە، وە مەبەستیـشی ئـەوەبوو کـە ئەگەر هۆزەکەی ئاگاداری ئەو هەموو پاداشتە بوونایە کە خوای گەورە پێـی بەخـشیووە لـە بەهەشـتدا بەبێ کۆتایی، هانی دەدانو داوای لێ دەکردن کە شوێنی ئەو پێغەمبەرانە بکـەون. بـە ڕەحمـەت بێـتو خوا لێی ڕازی بێت، زۆر هـەوڵی دەدا کـە هۆزەکـەی شـوێنی ڕێـی ڕاسـت بکـەون. ئیبنـو ئـەبی حاتـەم ڕیوایەتی کردووە لە (عبدالملك)ەوە واتە: عومەیر کە وتوویەتی: عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بـە پێغەمبەر(ﷺ)ی ووت: ڕەوانـەم بکـەو بمنێـرە بـۆ نـاو هۆزەکـەم تـا بانگیـان بکـەم بـۆ سـەر ئیسلام. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من دەترسم بتکوژن) وتـی: ئەگـەر چـاویان پـێم بکـەوێت خـەوتووم خەبەرم ناکەنەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: بچۆ، ئەویش ڕۆیشت. بە لای لاتو عوزادا تێپـەڕی وتی: مەرجە بەیانی کارێکتان بەسـەر بێـنم دلگـران بـن. سـەقیفیەکان تووڕەبـون. عـوروە پێـی وتـن: خەڵکی سەقیف نە لات لاتەو نە عوزایش عوزایە موسڵمان ببن. هەتا پارێزراو و ڕزگار بن. ئـەی خـەڵکی ئەحلاف نە عوزا عوزایەو نە لاتیش لاتە. موسڵمان ببن هەتا پارێزراو و ڕزگار بن. ئەم قسەی سێ جار وت: پیاوێـك بـەردێکی گرتـە چـاوی و دای بەگلێنەکەیدا وکوشـتی، ئـەم هەواڵـە گـەیشتە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نموونەی ئەم پیاوە وەك هاوەڵەکەی یاسینە کە وتی: ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾.[2] خــوای گــەورە دەفــەرمووێت: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ

---

[1] الطبري (٢٠/٥٠٩).

[2] الحاكم (٣/٦١٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

بَعۡدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ واتە: دوای ئەو ئێمە هیچ لەشکرمان (لە ئاسماندا) نەناردە سەر هۆزەکەی ئەو، (بەر لەمەش) هەر نەماندەنارد. خوای گەورە باسی تۆڵە سەندنی خۆی دەکات لە هۆزی حەبیبی نەججاڕ دوای ئەوەی کە کوشتیان خوای مەزن لێیان توڕە بوو لەبەر ئەوەی کە باوەڕیان بە پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێت) نەکردو ئەو دۆستەی خودایان کوشت. پاشان دەفەرموێت: بۆ لەناودان و قڕکردنی ئەوانە پێویست بە لەشکری فریشتە نەبووە بۆیان دابەزێت بەڵکو کارەکە زۆر لەوە ئاسانتربوو. ئیبنو ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە هەندێ لە هاوەڵەکانیەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ دەڵێت: واتە: فریشتەی زۆرمان نەنارد بۆیان. کارەکە زۆر لەوە ئاسانتر بوو بە نیسبەت ئێمەوە، ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾ هەر تەنها نەعرەتەیەك بوو. کە لەناکاو کش دامرکان. دەڵێت پاشان خوای گەورە ئەو پاشا زۆردارەی لەناو بردو خەڵکی ئەنتاکیەشی قڕ تێخستو لەسەر زەمیندا تۆرمەی نەهێشتن و هیچ کەسیان نەما.[1] وتراوە: ﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾ واتە: ئێمە فریشتەکانمان نەناردووە بۆ سەر ئەو گەلانەی کەئەمانەوێ لەناویان ببەین بەڵکو سزایەکیان بۆ دەنێرێت کە قڕیان بکات. موجاهیدو قەتادە دەڵێن: مانای ئەم ئایەتە: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾ واتە: پەیامێکی ترمان بۆ ڕەوانە نەکردوون دوای ئەو.[2] قەتادە دەڵێت: نەخێر، سوێند بە خوا، خوای گەورە دوای کوشتنی ئەو ئیتر سەرزەنشتی هۆزەکەی نەکرد، ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾.[3] بەڵکو هەر تەنها یەك دەنگی بەهێز بوو هەموو لەناکاو دامرکانەوە. ئیبنو جەریر دەڵێت: ڕای یەکەم ڕاستترە چونکە پەیام (رسالة) پێی ناوترێت لەشکر (جند).[4] زانایانی تەفسیر دەڵێن: خوای مەزن جبرائیلی نارد (سەلامی خوای لێ بێت) بەر دەرگای ئاواییەکەیانی (شارەکەیانی) لێ گرتن و بە نەعرەتەیەك هەمووی دامرکاندنەوە و گشتیان لەناوچوون و گیانلەبەرێکیان لێ دەرنەچوو. زۆر لە زانایانی پێشینە وەك لە پێشەوە باسکراوە دەڵێن: ئەو ئاواییە ئەنتاکیە بووە. ئەو سێ ڕاسپێراوە لە لایەن مەسیح عیسای کوڕی مەریەمەوە نێردراون (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك

---

[1] الطبري (٢٠/٥١٠).

[2] الطبري (٢٠/٥١٠/٥١١).

[3] الطبري (٢٠/٥١٠).

[4] الطبري (٢٠/٥١١).

قەتادەو چەند کەسی تریش وتوویانە. وە ئەم قسەیە لە هیچ کەس لە زانایانی پاشینەی تەفسیر باس نەکراوە بێجگە لە ئەوبەلاّم لە چەند ڕوویەکەوە تێبینی لەسەر ئەم قسەیەهەیە:

**یەکەم:** دیارە بەسەرهاتەکە نیشانەیە لەسەر ئەوە کە ئەو کەسانە پێغەمبەری خودا بوون (سەلامی خوایان لێ بێت) نەك لە لایەن عیسای کوڕی مەریەمەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) ڕاسپێراون. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ
﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ
إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ﴾ خۆ ئەگەر ئەوانە لە یارە حەواریەکان بوونایە بە شێوەیەك دەدوان کە دەرکەوتایە لە لایەن عیسای کوڕی مەریەمەوە ڕاسپێراون والله أعلم. وە ئەگەر ڕاسپێراوی ئەو بوونایە خەڵکەکە پێیان نەدەوتن: ﴿مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا﴾.

**دووهەم:** خەڵکی ئەنتاکیە بڕوایان بە ڕاسپێراوەکانی مەسیح هێنا کە چوون بۆ لایان. وە ئەنتاکیە یەکەم شار بوو باوەڕیان بە عیسای کوڕی مەریەم کرد (سەلامی خوایان لێ بێت) لەبەر ئەوەیە کە لە لای گاورەکان یەکێکە لەو چوار شارەی کە (بە تریاکەکانی) تێدا بووە. ئەو شارانەش بریتیە لە قودس کە شاری مەسیح خۆیەتی‌و ئەنتاکیە کە هەموو خەڵکەکەی بڕوایان هێنا بە مەسیح کەس نەما تێیدا بڕوای پێ نەهێنێت. ئەسکەندەریەش چونکە لەم شارەدا. زاراوەو پلە ئاینیەکانیا دائەنا. وەك بەتریاك و مەتران و ئوسقوف و قەسیس(کەشیش) و شایس و ڕاهیب و.... هەروەها شاری ڕومیەش لەبەر ئەوەی شاری پاشا قوستەنتین بووە کە پشتگیری ئاینەکەی کردن‌و یارمەتیدان. کاتێك قوستەنتینیەیان دروستکرد و بەتریاکیان لە ڕومیەوە گواستەوە ئەوێ، ئەمە چەند کەسێ باسیان کردووە لەوانەی کە مێژووی ئەوانی باس کردووە. وەك سەعیدی کوڕی بتریق‌و کەسانی تریش لە ئەهلی کتێب‌و لە موسڵمانیش، وە ئەگەر وابێت کە خەڵکی ئەنتاکیە یەکەم شارە بڕوای هێناوە. خۆ ئەم ئاواییەی کە خوای گەورە باسی کردووە بڕوایان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانی‌و بە فەرمانی خوای گەورە بە نەعرەتەیەك بەرباد بوون‌و دامرکانەوە و لەناوچوون والله أعلم.

سێهەم: بەسەرهاتی ئەنتاکیە لەگەڵ حەواریەکان و هاوەڵەکانی مەسیح دوای هاتنە خوارەوەی تەورات بووە. ئەبو سەعیدی خودری‌و کەسانی تریش لە پێشینان وتوویانە: پاش هاتنە خوارەوەی تەورات خوای مەزن هیچ گەلێکی لە گەلەکان لەناو نەبردووە بە ناردنی سزا بۆیان. بەڵکو فەرمانی داوە بە خاوەن باوەڕان کە بجەنگن‌و شەڕ بکەن دژی بتپەرستان‌و خوانەناسان وەك خوای گەورە لەم

ئایەتـەدا فەرموویـەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ ٱلْأُولَىٰ﴾[1] واتـە: سوێد بە خوا بێگومان تەوراتمان بەخشی بە موسا لە پاش ئەوەی خەڵكی چەرخە پێشووەكانمان لەناو برد. بەم ئایەتە بۆمان دەردەكەوێت كە ئەو ئلوابیەی كە قورئان باسی كردووە ئاواییەكی ترەو ئەنتاكیە نیە. وەك هەندێ لە زانایانی پێشین دەڵێن. یان ئەو ئەنتاكیە كە ناوی هاتووە لەو بەسەرهاتەدا. شارێكی ترەو ئەم ئەنتاكیە بەناوبانگو ناسراوە نیە. چونكە ئەو ئەنتاكیە بەناوبانگە هەرگیز نەبیسراوە كە قڕبووبن نە لە كاتی نەسرانیەكانداو نە لە پێش ئەوانیش والله سبحانه وتعالى أعلم.

﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾﴾

**هاوارو حەیف بۆ بێباوەڕان**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ واتە: مەخابن بۆ ئەو عەبدانە، هەر پێغەمبەرێكیان بۆ هات، هەر گاڵتەو گەپیان پێ كردوون. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە كە خوای گەورە دەڵێت: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ﴾ واتە: هاوارو مەخابن بۆ ئەو بەندانە.[2] قەتادە دەڵێت: ﴿يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ﴾ واتە: هاوار بۆ ئەو بەندانە كە چیان بە خۆیان كردو چەندە فەرمانی خودایان پشتگوێ خستووەو دوور كەوتوونەتەوە لە خودا. وە لە هەندێ لە خوێندنەوەكاندا بە(يا حسرة العباد على أنفسها) ئەخوێنرێتەوە[3]. واتە: هاوار دەكەنو پەشیمان دەردەبڕنو هەناسە بۆخۆیان هەڵدەكێشن لە ڕۆژی قیامەتدا. وەختێك ئەو جەزرەبەیە دەبینن و دەچەژن. كە چۆن بڕوایان نەكرد بەو پێغەمبەرانەی خودا (سەلامی خوایان لێ بێت) گوێبیستی فەرمانی خودا نەبوون لە ژیانی دنیادا دژایەتیان كردنو بە ڕاستیان نەدەزانین ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ واتە: بڕوایان پێ نەدەكردو گاڵتەیان دەكردو لاریان بوو لەو ڕاستیەی كە پێی هاتووەو بۆی ڕەوانە كراوە لە لایەن خوای مەزنەوە.

---

[1] القصص (٤٣).

[2] الطبري (٥١٢/٢٠).

[3] الطبري (٥١٢/٢٠).

**وەڵامدانەوەی ئەوانەی کە باوەڕیان وایە دوای مردن جارێکی تر دەگەڕێنەوە بۆ سەر دنیا ( الرد على عقيدة التناسخ )**

پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾ واتە: چۆن ئەمانە نەیاندیووە کە چەندین چینمان لە مرۆڤ (لە پێش ئەمان) قڕکردووەو تازە نایەنەوە لایان؟. واتە: ئاخۆ پەندو ئامۆژگاریان وەرنەگرت لەوانەی پێش خۆیان کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردو قڕمان کردن کە چۆن جارێکی تر نەگەڕانەوە بۆ سەر دنیا. وە پرسەکەش بەو شێوەیەش نیە کە زۆرێك لە نەفامو لە دین لادەرەکانیان گومان دەبەنو دەڵێن: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾[1] واتە: ژیان نیە تەنها ژیانی ئەم دنیایەمان نەبێت، دەمرینو دەژیینەوە. ئەم بیرو رایە بیر و رای ئەو کەسانەیە کە بڕوایان بە سوڕانەوەی بەردەوام هەیە لە دنیادا کە دەهریەکانیان پێی ئەوترێت، ئەوان باوەڕیان وایە (بە نەزانی) پاش مردن جارێکیتر دەگەڕێنەوە بۆ ژیانی دنیا، وەك چۆن یەکەم جار تێیدا ژیاون. خوای گەورەیش وەڵامی ئەو قسە پڕوپوچەیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ﴾ بێگومان هەموو یەکیشیان، هەر دەهێنینەوە لای خۆمان. واتە: هەموو گەلە پێشووەکان و ئەوەیش لەمەودوا دێت بەم زووانە هەموو لە ڕۆژی قیامەتدا ئامادە دەکرێن بۆ لێپرسینەوە لە خزمەت خوای گەورەداو پاداشتیان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانیان، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵەو جەزرەبەدان. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾[2] واتە: بێگومان هەموو (ئەوانەی جیاوازن) پەروەردگارت (پاداشتی) کردەوەکانیان بە تەواوی پێ دەدات.

﴿ وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾﴾

---

[1] المؤمنون (٣٧).

[2] هود (١١١).

**سەلماندنی وەدیهێنەر بۆ بوونەوەرو ژیانیش لە پاش مردن**

خـوای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴾ واتە: هەر لە زەوی ڕامێنن، نیشانەی بۆ ئەوان تێدایە، کە بە مردوویی ئێمە زیندوومان کردەوەو دەنکمان لێ بەرهەم هێنا، کە خۆراکە بۆ ئەمان. ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ﴾ واتە: هەر لە زەویدا نیشانە هەیە لەسەر بوونی وەدیهێنەر کە خودایەو لەسەر توانای بێ پایانیو زیندووکردنەوەی مردوو ﴿ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ ﴾ واتە: وەختێك کە زەوی مردووەو گیانی تێدا نیەو هیچ ڕووەکیشی تێدا نەڕواوە.. لەو کاتەدا خوای مەزن بارانی بەسەردا دەبارێنێتو زەوی دەجولێنێتو نەرم دەبێتەوەو هەموو جۆرە ڕووەکێکی جوانو درەوشاوەی تیا دەڕوێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ٣٣ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴾ هەر لە زەویش چەندین خورماو ڕەزی زۆرمان وەدی هێناو چەند کانیاومان لێ هەڵقولاند. واتە: هەر لەو زەمینە باغی دارخورماو ڕەزو ڕووباری زۆرمان وەدی هێنا بۆ ئەو شوێنانەی کە پێویستیان پێیەتی بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی بخۆن. وەختێك خوای گەورە منەتی خۆی دەکات بەسەر خەڵکدا کە کشتوکاڵی بۆ وەدی هێناون بە دوایدا باسی میوەو جۆرەو شێوەکانیشی کردووە. وە دەفەرموویێت: ﴿ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴾ واتە: تاکو لە میوەی خوداو لە دەسڕەنجی خۆیان بخۆن، ئاخۆ هێشتا شوکرانە ناکەن. واتە: هەتا لەو بەرهەمەی کە خودا پێی داون بخۆن، ئەمەش هەموو سۆزو بەزەیی خودایە بۆ بەندەکانی. نەك بە هەوڵو تێکۆشانو ماندووبوونی خۆیان دەستیان دەوتبێت. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت)و قەتادە دەڵێن بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴾ واتە: ئایا هێشتا سوپاسی خوا ناکەن لەسەر ئەو هەموو بەهرەیەی کە خودا پێی داونو لە ژمارە نایەت؟ ئیبنو جەریر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە (قەناعەتی بووە بە ڕاکەی خۆی)و لە هیچ کەسیش نەبیستراوە کە (ما) مانای تریش هەڵدەگرێت بەگریمان نەبێت، لەم فەرموودەی خوای گەورەدا: ﴿وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡ﴾ بە مانای (الذي) هاتووە. بەم شێوەیە واتە: هەتا لە میوەی خوداو بەرهەمی دەستی خۆیان بخۆن واتە: کە ناشتوویانەو دایانناوە، دەڵێت: لە خوێندنەوەی ئیبنو مەسعودیشدا بە هەمان شێوە هاتووە (ڕەزای خوای لێ بێت): ﴿ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴾. پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: هەر خودا پاکو بێ عەیبە کە جوتەی لە هەموو شتێك وەدی هێنا، چ لەوانەی لەم سەر زەمینە

دەڕوێن‌و چ لە خۆیان‌و چ لەوانەش کە نایزانن. واتە: پاکی‌و بێ عەیبی بۆ ئەو خوایەی کە جوتـەی لـە هەموو شتێك دروست کردووە لە کشتوکاڵ‌و میوەو گژوگیادا ﴿وَمِنْ أَنفُسِهِمْ﴾ لـە خۆشـیان نێـرو مێـی دروست کردووە ﴿وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾ وە لە وەدیهێنراوەکـانی تریـشدا کـە ئـەوان نـایزانن. وەك خـوای مەزن فەرموویەتی لە ئایەتێکی تردا: ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾[1] واتە: وە لە هـەموو شتێك جووت (نێرو مێ)مان دروست کردووە بۆ ئەوەی بیربکەنەوەو پەندی لێ وەر بگرن.

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾

## هەندێك لە دەسەڵات‌و نیشانە گەورەکانی خودای گەورە، شەوو ڕۆژو خۆرو مانگە

خوای گەورە دەفەرموێت لە نیشانەکانی دەسەڵات‌و توانای خودا، دروستکردنی شەوو ڕۆژە، شـەو بە تاریکی‌و ڕۆژیش بە ڕووناکیەکەی. بە شێوەیەك وەدی هێناون کە بـە دوای یەکدا بێن‌و شـەو دێـت‌و ڕۆژ دەڕوات‌و ڕۆژ دێـت‌و شـەو دەڕوات. وەك خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾[2] واتە: ڕۆژ بە شەو دادەپۆشێت‌و ڕۆژیش بە پەلە دەکەوێتـە شـوێنی شـەو. بۆیـە خـوای مـەزن لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴾ بۆ ئەوانە، شەویش یەك لە نیشانانە، ئێمە ڕۆژی لێ دادەڕنـین‌و لـە ناکـاو تاریکانیـان بەسـەردادێت. ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ﴾ واتە: لە نیشانەکانی ئێمە بۆیـان، کـە شـەو ڕۆژی لێ دەکەینـەوەو دەڕوات‌و لـەناکاو تاریکـایی دایاندەپۆشێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾، وەك لە فـەرموودەی سـەحیحدا هاتووە: وەختێك کە شەو ئالێرەوە هات ڕۆژیش پـشتی هـەڵکرد لێـرەوە و خـۆریش نیشت، ڕۆژوەوان ڕۆژو دەشـکێنێت. وەك لـە ئایەتەکـەوە بـەڕوونی دەردەکـەوێت.[3] پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾ خـۆریش بـەرەو بنـەی خـۆی لـە گەڕانەوەدایە، کە لە خاوەن دەسەڵاتی زاناوەیە، ئـەو فەرمانـەی پێداوە. ﴿ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ

---

[1] الذاريات (٤٩).

[2] الاعراف (٥٤).

[3] فتح الباري (٢٣١/٤).

لَهَا﴾ دوو بۆچوون هەیە: بۆچوونی یەکەم: (ئارامگای مەکانی) مەبەست پێی شوێن‌و جێگەی ڕۆژە کە تێیدا ئارام دەگرێت. کە لە ژێر عەرشدایە کە زەمینیش دەکەوێتە ئەوێ لەو لایەوە. خۆر بۆ هەر شوێنێك بڕوات هەر لە ژێر عەرشدایەو لێی دەرناچێت‌و هەموو دروستکراوەکانی تریش هەموو لە ژێر عەرشدان کەئاسمانی سەر هەموو بونەوەرانە. عەرش بازنەیی نییە وەك زۆرێك لەزانایانی گەردوونناسی بڕوایان وایە، بەڵکو عەرش گومەزەیەکە و قاچی هەیە و فریشتە هەڵیدەگرن و لەسەروو بونەوەرو مرۆڤەکانەوەیە،ڕۆژ کەئەچێتە ناوەڕاستی ئەو گومەزەیەوە لەکاتی نیوەڕۆدا نزیکترین شوێنیتی لەعەرشەوە، کە ئەشسوڕێتەوەو ئەگاتە خولگەی چوارەم و بەرانبەر ئەوەستێت لەگەڵ ئەم شوێنەدا کە بریتییە لەنیوەی شەو ئەو شوێنە دوورترین شوێنیەتی لەعەرشەوە، ئالەو کاتەدا خۆر سوژدە بۆ خوا دەبات و مۆڵەتی هەڵاتن وەردەگرێتەوە وەك چۆن فەرموودەی زۆر لەو بارەیەوە هاتووە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: من لەگەڵ پێغەمبەردا بووم (ﷺ) لەناو مزگەوتدا لە کاتی ڕۆژئاوابووندا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەی ئەبو زەڕ ئایا دەزانی ڕۆژ لە کوێ ئاوا دەبێت؟) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەزانن. فەرمووی: (ئەو دەڕوات هەتا لە ژێر عەرشدا سوژدە دەبات، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾)[1]. دیسان لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَا﴾ فەرمووی (ﷺ): (شوێنی ئارامگرتنی خۆر لە ژێر عەرشدایە)[2].

بۆچوونی دووەم: مەبەست بە شوێن‌و ئارامگای خۆر خاڵی کۆتایی یەتی کەلە ڕۆشتنندا پێی دەگات، کە بریتییە لە ڕۆژی قیامەت، دوای ئەوە ئیتر گەڕانی نامێنێت‌و لە جووڵە دەکەوێت و دەپێچرێتەوە، ئەم دنیایەش کۆتایی پێ دێت و ئەگاتە خاڵی کۆتایی. ئەمە شوێن‌و جێ کاتیەکەیە یانی(ئارامگای زەمانی)، قەتادە دەڵێت: ﴿لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَا﴾ واتە: بەرەو ئارامگای زەمانی خۆی کە تەمەنی کۆتایی پێدێت و زیاتر ناڕوات[3]! لەوەوە وتراویشە: مەبەست پێی بەردەوام دەگەڕێت لە شوێنی هەڵاتنیەوە لە کاتی هاویندا هەتا ئەو کاتەی بۆی دیاری کراوە و زیاتر ناڕوات. پاشان دەگەڕێت لەو شوێنەی لە کاتی زستاندا کە لێی هەڵدێت هەتا ئەو کاتەی بۆی دیاری کراوە وزیاتر ناڕوات. ئەمە لە عبدالله ی کوڕی

---

[1] فتح الباري (٤٠٢/٨).

[2] فتح الباري (٤٠٢/٨).

[3] الطبري (٥١٧/٢٠).

عەمرەوە ڕیوایەت کراوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەیان بەم شێوەیە خوێندووەتەوە: ﴿وَ الشَّمْسُ تَجْرِي مُسْتَقَرِّلَها﴾ واتە: ناوەستێ‌و لە جوڵە ناکەوێت بەڵکو بەردەوام دەگەڕێت بە شەوو بە ڕۆژ و یەکی ناکەوێت‌و ناوەستێت. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ دَآئِبَيْنِ ﴾[1] واتە: وە هەروەها ڕامی هێناوە بۆتان ڕۆژو مانگ بە هەمیشەیی. واتە: وەستان‌و وچانیان نیە هەتا ڕۆژی قیامەت. ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ واتە: ئەمە بڕیاری خوای خاوەن دەسەڵاتە کەس ناتوانێت لێی لابدات‌و ببێتە لەمپەر لە ڕێیدا ﴿ٱلْعَلِيمِ﴾ ئاگاداری هەموو جموجوڵ‌و وەستانێکە‌و بڕیاری داوە‌و کاتەکەیشی بۆ دیاری کردووە بەشێوەیەك هیچ گۆڕانکاریەکی بەسەردا نایەت‌و پێچەوانە نابێتەوە. وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾[2] واتە: (خوا) بەدیهێنەری شەبەق‌و ڕووناکی ڕۆژبوونەوەیە‌و شەوی کردووە بە کات‌و هۆی ئارامگرتن‌و خۆرو مانگی کردووەتە هۆی حیساب دیاری کردن‌و زانینی کات ئەوەش ئەندازەگرتنی خوای بە دەسەڵاتی زانایە. هەر بەم شێوەیە ئایەتی (١٢) حامیمی (حم) سوژدە کۆتایی هاتووە ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴾ مانگیش ئێمە بۆمان دانا بە چەند قۆناغدا تێپەڕێت، تا وای لێ دێت وەك پەلی وشکەڵی دارخورما، دێتە بەرچاو. ﴿ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ﴾ مانگیشمان وا دانا کە بە چەند قۆناغدا دەڕوات بە شێوەیەکی وا تا مانگەکانی پێ دیاری بکرێت. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴾[3] واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نوێبوونەوەی مانگە نوێیەکان بڵێ ئەمانە نیشانەی کاتەکانن بۆ خەڵکی‌و بۆ حەج. وە دەفەرمووێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ﴾[4] واتە: خوا زاتێکە وەهایە خۆری گێڕاوە بە تیشك، مانگیشی گێڕاوە بە ڕووناکی بۆ (گەڕانی) مانگ چەند قۆناغێکی دیاری کردووە بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان‌و حیسابی (مانگ‌و ڕۆژی

---

[1] ابراهيم (٣٣).

[2] الانعام (٩٦).

[3] البقرة (١٨٩).

[4] يونس (٥).

پـێ بـزانن). وە دەفـەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا﴾[1] واتــە: شــەوو ڕۆژمان کرد بە دوو نیشانە ئینجا نیشانەی شەومان تاریك کرد (یان سڕیەوە)و بەلگەو نیشانەی ڕۆژمان ڕووناك کرد بۆ ئەوەی بە شوێن ڕۆزی پەروەردگارتاندا بگەڕێن‌و بۆ ئەوەی ژمارەی ساڵەکان‌و حیسابی (مانگ‌و شەوو ڕۆژەکان) بزانن وە ئێمە هەموو شتێکمان بە ڕوون‌و ڕەوانی باس کردووە (بۆتان). خوای گەورە ڕۆژی وا وەدی هێناوە کە ڕووناکیەکی تایبەتی خۆی هەیەو مانگیشی وا وەدی هێناوە کە ڕووناکیەکی تایبەتی خۆی هەیە. جیاوازی لە نێوان ڕۆشتنی ڕۆژ جۆرێکەو هی مانگ جۆرێکی تر. ڕۆژ هەموو ڕۆژێك هەڵدێت‌و ئاوا دەبێت بە هەمان ڕووناکی. بەڵام لە هاوین‌و زستاندا شوێنی هەڵاتنەکەی دەگۆڕێت. بەو هۆیەوە ڕۆژ درێژ دەبێت‌و شەو کورت دەبێتەوەو پاشانیش شەو درێژ دەبێت‌و ڕۆژ کورت دەبێتەوە. بەو شێوەیە خۆر فەرمانەکەی لە ڕۆژدایەو ئەستێرەیەکە لە ڕۆژدا هەڵدێت. بەڵام مانگ خوای مەزن بۆی داناوە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕێت. لەئەوەڵی هەموو مانگێکەوە هەڵدێت‌و دەردەکەوێت زۆر بە بچووکی‌و کەم ڕووناکی. پاشان ڕووناکیەکەی زیاد دەکات‌و لە شەوی دووەمدا قۆناغەکەشی بەرزتر دەبێت، پاشان هەتا بەرز بێتەوە ڕووناکیەکەی زیاد دەکات. هەرچەندە ڕۆشناییەکەی لە خۆرەوە وەردەگرێت. هەتا ڕۆشنایەکەی پڕو تەواو دەبێت لە شەوی چواردەهەمدا. پاشان دەست دەکاتەوە بە کەم بوونەوە لە کۆتایی مانگدا هەتا وەك پەلی کۆنی وشکەڵاتی دارخورمای لێ دێت. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ﴾ واتە: چڵی هێشوە دارخورما کاتێك وشك دەبێت‌و دەچەمێتەوە.[2] عەرەبەکان هەموو سێ شەوێکیان لە مانگدا بە جۆرێك ناوبردووە لە بارەی مانگەوە سێی یەکەمیان ناوبردووە بە غورەر (غُرَر) سێی دوای ئەویان ناوبردووە بە نوقەل (نُفَل) سێی دوای ئەمیشیان ناوبردووە بە توسەع (تُسَع) چونکە کۆتاییەکەی نۆ یە. دوای ئەمیش بە عوشەر (عُشَر) چونکە لە دەوە دەست پێدەکات. وە سێی دوای ئەمە پێی دەڵێن سپی (البيض) چونکە ڕووناکی مانگ تیایاندا بە تەواوی دەردەکەوێت. وە دوای ئەمانە پێی دەڵێن دورەع (دُرَع) جەمعی دەرعانە چونکە ئەوەڵەکەی تاریکە لەبەر ئەوەی مانگ درەنگ هەڵدێت. وەك عەرەب دەڵێت (الشاة الدَّرعاء) واتە: ئەو مەڕانەی کە سەریان ڕەشە. دوای ئەمانە سیانەکەی تر پێی دەڵێن زولەم (ظُلَم) دوای ئەمانەش پێی دەڵێن حەنادیس سیانی تریش ناویان دەنادیە دواین سێی مانگ پێی دەڵێت حەحاق چونکە مانگ زۆر بە کزی‌و لاوازی دەبینرێت تیایدا پاشان نامێنێت. ئەبو عوبەید ڕەزای

---

[1] الاسراء (١٢).

[2] الطبري (٢٠/٥١٨).

خوای لێبێت، نکوڵی لە (تُسع، عُشر)ئەکات وەك لە کتێبی (غریب المنصف)دا وتوویەتی. خوای گەورە دەفــــەرمووێت: ﴿ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ واتە: نە خۆر توانای هێندەی هەیە بگات بە مانگ، نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێتو سەر لەبەریش لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. موجاهید دەڵێت: هەر یەکێك لە مانگو خۆر سنووری خۆی هەیەو نە زیاد دەڕۆنو نە کەم. هەر کاتێك دەسەڵاتی ئەم هات. ئەوی تریان دەڕواتو کاتێك دەسەڵاتی ئەم نەما دەسەڵاتی ئەوی تر دێت.[1] عیکریمە لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ ﴾ ئەڵێت واتە: هەر یەکێك لە خۆرو مانگ سنوورێك بۆ دەستەڵاتی هەیە. خۆر بۆی نیە لە شەودا هەڵبێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ﴾ واتە: هەروەها شەو بۆی نیە دووجار بە شەوی بمێنێت هەتا ڕۆژ بە دوایدا نەیەت. دەسەڵاتی خۆر لە ڕۆژدایەو دەسەڵاتی مانگیش لە شەودایە. زەححاك دەڵێت: شەو ناچێت ئا لێرەوە هەتا ڕۆژ نەیەت ئا لێرەوە دەستی ڕاکێشا بۆ ڕۆژهەڵات.[2] موجاهید دەڵێت: ﴿وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ﴾ دەگەڕێن بە دوا یەکداو یەکتری دادەڕنن.[3]مانای ئەمە وا دەگەیەنێت کە وەستان لە نێوان شەوو ڕۆژدا نیە بەڵکو هەریەکەیان بە دوای ئەوی تردا دێت. بەبێ وەستانو دواکەوتن. چونکە هەردووکیان ڕام هێنراون کە بە دوای یەکتریدا بگەڕێن بە بەردەوامیو بێ وچان. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴾ واتە: شەوو ڕۆژ، مانگو خۆر هەموو بە دوای یەکدا دەسوڕێنەوەو دەگەڕێنو لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو عیکریمەو زەححاكو حەسەنو قەتادەو عەتای خۆراسانیە[4]. ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) زۆرێك لە زانایانی سەلەف وتوویانە: لە بازنەیەکدان وەك بازنەی تەشی دەسوڕێنەوە.

﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾﴾

---

[1] الطبري (٢٠/٥٢٠).

[2] الطبري (٢٠/٥٢٠).

[3] الطبري (٢٠/٥١٩).

[4] الطبري (٢٠/٥٢٠).

**یەکێك لە نیشانەکانی دەستەڵاتی خودا هەڵگرتنی مرۆڤە لە کەشتی جەنجاڵدا**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ ئەمە بۆئەوان نیشانەیە، هاوڕەگەزانی ئەوانمان لە کەشتی پڕکراودا هەڵگرتووە. یانی یەکێکی تر لە نیشانەکانی توانا‌و دەسەڵاتی خوای گەورە ڕامهێنانی دەریایە کە گەمیەکانی ناوی هەڵدەگرێت. لەوانە کە یەکەم گەمی گەمیەکەی نوح پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێت) کە خودا لەو گەمیەدا خۆیو ئەوانەش کە لەگەڵی بوون ڕزگاری کردن لە خاوەنباوەڕان کە هیچ کەس لەسەر زەمیندا نەما لە نەوەی ئادەم جگەلەئەوان، بۆیەخوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ﴾ واتە: یەکێك لە نیشانەکانی ئێمە هەڵگرتنی هاوڕەگەزانی (بابو باپیرانی) ئەوان بوو ﴿فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ واتە: کەشتی پڕ لە شتومەكو زیندەوەران کە خودای بەدەستەڵات فەرمانی دا کە لە هەموو توخمێك جوتەیەك هەڵگرن تێیدا. ئیبنو عەباس دەڵێت: ﴿ٱلۡمَشۡحُونِ﴾ واتە: بارقورسو گران.[1] سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبیو قەتادەو سودیش هەر وایان وتووە.[2] زەححاكو قەتادەو ئیبنو زەید دەڵێن: واتە: کەشتیەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت).[3] وە دەفەرمووێت: ﴿وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ﴾ وێنەی ئەویشمان داهێنا. کە دەتوانن سواری بن. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) مەبەست پێی وشترە. چونکە وشتر کەشتی وشکانیە باری پێ هەڵدەگرنو سواری دەبن.[4] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: ئایا تێدەگەن مەبەست لەوە چییە کە خوا ئەفەرموێ: ﴿وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ﴾، وتمان: نەخێر. وتی: ئەو گەمییانەن کە وەك گەمیەکەی نوح دروست کران پاش گەمیەکەی ئەو.[5] هەر بەو شێوەیە ئەبو مالكو زەححاكو قەتادەو ئەبو سالحو سودیش وتوویانە: مەبەست بەم فەرموودەی خودا: ﴿وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ﴾ واتە: کەشتیەکان[6]. پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ﴾ واتە: ئەگەر حەزکەین نوقمی بن ئاویان دەکەینو ئەوساکە هیچ فریادڕەسێکیان نابێتو ڕزگار ناکرێن. ﴿وَإِن

---

[1] الطبري (٢٠/٥٢٠/٥٢٢).

[2] الطبري (٢٠/٥٢٠/٥٢٢).

[3] الطبري (٢٠/٥٢٠/٥٢٢/٥٢٣).

[4] الطبري (٢٠/٥٢٤).

[5] الطبري (٢٠/٥٢٣).

[6] الطبري (٢٠/٥٢٢/٥٢٤).

نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ﴾ واتە: ئەگەر حەز بکەین ئەوانەی کە لەناو گەمیەکەدان نوقمیان دەکەین، ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ﴾ واتە: کەس بە هاواریانەوە نایەت لەو کاتەدا کە نوقم دەبن. ﴿وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾ واتە: ڕزگار ناکرێن لەوەی کە توشیان بووە. ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ مەگین بەزەیی ئێمەیان بەفریا بێتو تا ماوەیەك بەرخوردار بن. ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا﴾ واتە: بەڵکو بە سۆزو بەزەیی ئێمە دەتانگێڕین بەناو زەوىو دەریادا تا ماوەیەکی دیاریکراو دەتانهێڵینەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: تا ماوەیەکی دیاریکراو لە لای خودای گەورە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (٤٥) وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ (٤٦) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ (٤٧)﴾

**باسی گومڕایی بتپەرستان**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ هەر کاتێکیش پێیان بوترێت: لەوی کە ڕووبەڕووتانەو لەوەش لە پشتەسەرتانە، خۆ بپارێزن، بەشکو بەر بەزەیی خودا بکەون، (کەچی ئەوان خۆ دەبوێرن). خوای مەزن باسی بتپەرستان دەکات کە چەندە ڕۆچوون لە خراپەکاریو گومڕاییدا، وە گوێ بەو تاوانو گوناهانەی خۆیان نادەن کە کردوویانەو ئەوەیش کە تووشیان دێت لە ڕۆژی قیامەتداو دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ﴾ واتە: هەر کاتێك پێیان بوترێت خۆتان بپارێزن لە گوناهو لە سزای ڕۆژی قیامەت. موجاهید دەڵێت: مەبەست: گوناهە. کەسانی تریش وتوویانە: واتە: بە چاکەکردن خۆتان بپارێزن. ﴿لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ بەڵکو بە هۆی خۆپارێزیتانەوە بەر بەزەیی خودا بکەون لە جەزرەبەی ڕزگارتان بێت. دەقی فەرموودەکە وا دەگەیەنێت کە نەك هەر گوێ نادەنە فەرمانی خودا بەڵکو پشتیشی تێدەکەنو دژی دەوەستن بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ واتە: هەر نیشانەیەکیان بۆ بێت لە لای پەروەردگاریانەوە ئیلا دەبێت ڕووی تێ نەکەن. واتە: هەر بەڵگەیەکیان بۆ بێت لە لایەن خوداوە لەسەر تاكو تەنهایی خوداو بە ڕاستی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ﴿إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ﴾ واتە: تێ ڕانامێننو پێشوازی لێ

ناکەن‌و بەهرەی لێ وەرناگرن. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ واتە: کاتێکیش پێیان بوترێت: لەو بژێوەی خوا پێی داون خێرێ بکەن. خوانەناسان بە خاوەن باوەڕان دەڵێن: ئاخۆ ئێمە خۆراك بە کەسێك ببەخشین ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە بژێوی بۆ دابین دەکرد؟ ئێوە هەر لە گومڕایی دان. ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ﴾ وەختێك فەرمانیان پێ بکرێت کە لەو سامانەی خودا پێی داون خێرو بێر بکەن‌و لە ڕێی خودا بیدەن بە هەژاران‌و لێقەوماوانی موسڵمانان ﴿قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا﴾ خوانەناسان دەڵێن بەو خاوەن باوەڕانەی کە فەرمانیان پێ دەکەن خۆراك ببەخشن بەو کەسانەی کە خاوەن باوەڕن. وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن: ﴿أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ﴾ واتە: ئەوانەی کە ئێوە پێمان دەڵێن خێریان پێ بکەن. خودا مەیلی لێ بووایە دەوڵەمەندی دەکردن‌و لە خۆراکی خۆی تێری دەکردن. ئێمەیش هاوڕاین بۆ ئەوەی کە خودا مەیلی لێیەتی. واتە: کەسێك خودا بژێوی نەدا بۆچی ئێمە بژێوی بدەین ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ ئێوە مەگین سەرتان لێ شێواوە کە بە ئێمە دەڵێن خێر بکەن بە هەژاران.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (٤٨) مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ (٤٩)
فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَىٰ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ (٥٠) ﴾

**خوانەناسان زیندووبوونەوە بە دوور دەزانن**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ واتە: دەشڵێن ئەگەر قسە ڕاستن ئەو بەڵێنە کەی بەجێ دێت؟ خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات کە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نیەو بە دووری دەزانن کە بێت‌و دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ﴾ دەڵێن: ئەو بەڵێنە کەی دێتەدی؟ خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ﴾[1] واتە: ئەوانەی باوەڕیان بەو ڕۆژە نیە کە دێت، پەلە لە هاتنی دەکەن. خوای مەزنیش دەفەرموێت: ﴿مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ﴾ واتە: ئەوانە هەر چاوەڕوانی یەك نەعرەتەن کە لە کاتێکدا خەریکی هەراو کێشەی خۆیانن دەیانگرێت. واتە: ئەوانە هەر بە تەمای یەك نەعرەتەن والله أعلم. ئەمەیش فووە گەورە ترسناکەکەیە، کە فو دەکرێت بە کەڵەشاخدا خەڵکی لە بازاڕدان‌و خەریکی

---

[1] الشورى (١٨).

کاسپی خۆیانن‌و لە هەراو کێشەن وەك ڕۆژەکانی ڕابوردو. ئا لەو کاتەدا خوای مەزن فەرمان دەدا بە ئیسرافیل کە فوو دەکات بە کەڵەشاخداو درێژەی پێدەدات هەتا کەس نامێنێت لەسەر زەمینداو لە ئاسمانەوە پێی دەگات‌و دەیبیستێ‌و دەکێشێت بە لا ملیدا. پاشان ئەو خەڵکە هەموو بەڕێ دەکرێت بۆ کۆبوونەوەی ڕۆژی قیامەت کە ئاگر دەوری داون لە هەموو لایەکەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ واتە: ناتوانن وەسیەتیش بکەن، ڕێشیان نابێت بچنەوە ناو کەس‌و کاریان. واتە: ناتوانن وەسیەت بکەن بەودێ کە بە دەستیان هێناوەو هەیانە. کارەکە زۆر لەوە گرنگترە. ﴿وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ ناشتوانن بگەڕێنەوە ناو کەس‌و کاریان. فەرموودەو قسەی زانایان زۆرە لەم بارەیەوە کە باسمان کردووە لە شوێنی تردا. پاشان دوای ئەمە فووی بێهۆش بوونە (نفخة الصعق) هەرچی گیانلەبەرە هەمووی دەمرێت غەیری خوای گەورە. پاشان دوای ئەمەش فووی زیندووبوونەوە دەست پێدەکات.

﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَـٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَـٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾﴾

**فوو (نفخة)ی زیندووبوونەوە**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾ واتە: فوش بە کەڵەشاخدا دەکرێت لە ناکاو گشت لە گۆڕەکانەوە دێنە دەرو بەرەو پەروەردگاری خۆیان بە پەلە دەڕۆن. ئەمە فووی دووهەمە بە کەڵەشاخدا دەکرێت کە بریتیە لە فووی زیندووبوونەوەو هەموو لە گۆڕ هەڵدەسن‌و دێنە دەرەوە. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ﴾، (النَّسلان) واتە: ڕۆیشتنی بە پەلە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَىٰ نُصُبٍ يُوفِضُونَ﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بە پەلە لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە دەڵێی بۆ لای بتەکانیان ڕا دەکەن. ﴿قَالُوا۟ يَـٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَـٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ واتە: دەڵێن ئەی هاوار بەماڵمان! کێ لەناو پێخەفەکەمان (گۆڕەکەمان) ڕای پەراندین؟ ئەمە هەر ئەو بەڵێنەیە خودا دای‌و پێغەمبەرەکان ڕاستیان وت. ﴿قَالُوا۟ يَـٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن

---

[1] المعارج (٤٣).

﴿مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ واتە: مەبەست بە (مرقد) ئەو گۆڕانەیە کە لە دنیادا بڕوایان وابوو کە جارێکی تر تێیدا زیندوو ناکرێنەوە. وەختێك کۆکرانەوەو ئەوەی کە بڕوایان پێ نەبوو بە چاوی خۆیان دیان ﴿قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜ﴾ ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت جەزرەبە نەدراون لە گۆڕدا. چونکە ناو گۆڕ لە چاو ئەو سزایەی لە دواوە دێت وەك ناو پێخەف وایە. ئوبەیی کوڕی کەعب دەڵێت: موجاهیدو حەسەنو قەتادە دەڵێن: پێش زیندووبوونەوە جارێك دەخەون.[1] قەتادە دەڵێت لە نێوان دوو فووەکەدا دەخەون بۆیە دەڵێن کێ لەناو گۆڕەکەمان ڕای پەڕاندین.[2] وەختێك ئەمەیان وت، خاوەنباوەڕان وەڵامیان دەدەنەوە ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾ ئەمە قسەی زۆرێك لە زانایانی سەلەفە. حەسەن دەڵێت: فریشتەکان وەڵامیان دەدەنەوە. هیچ دژایەتیەك لەنێوان ئەم دوو قسەدا نییەو هەردووکیان دەبێت. خوای مەزنیش خۆی دەزانێت. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ﴾ تەنها هەر یەك نەعرەتەیەو لە ناکاو هەموو لای ئێمە کۆدەکرێنەوە. وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٌ وَٰحِدَةٌ (١٣) فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾[3] واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە، ئیتر کوتوپڕ وان لە دەشتێکی سپی کاکی بە کاکیدا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُ﴾[4] واتە: وە هاتنی ڕۆژی دوایش (بە لای خواوە) هەروەکو چاو تروکانێك وایە یان نزیکتر لەوەش. وە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا﴾[5] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بانگتان دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) جا ئێوەش دەستبەجێ دێن بە دەم بانگکردنەکەوە بە سوپاسو سەناکردنەوەو وا دەزانن (لە دنیادا)ماوەیەکی کەم نەبێت نەماونەتەوە. واتە: تەنها جارێکی فەرمانیان پێ دەکرێت هەموو ئامادە دەبن. ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ واتە: ئەو ڕۆژە ناهەقی لە کەس ناکرێتو هەر بەرامبەر بەو کردەوەی کردووتانە سزا دەدرێن. ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ

---

[1] الطبري (٢٠/٥٣٣).

[2] الطبري (٢٠/٥٣٢).

[3] النازعات (١٣ـ١٤).

[4] النحل (٧٧).

[5] الاسراء (٥٢).

﴿نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا﴾ واتـە: ئـەمڕۆ هـیچ کـەس ناهـەقی لێ ناکرێـت، ﴿وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ واتە: تەنها بەرامبەر ئەو کردەوانەی کردووتانە سزا دەدرێن.

﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ (٥٥) هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ (٥٦) لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ (٥٧) سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ (٥٨)﴾

## باسی خۆشگوزەرانی خەڵکی بەهەشت

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ واتـە: ئەوانـەی ئـەهلی بەهەشتن، ئەو ڕۆژە سەریان گەرمەو لە خۆشیدان. خوای گەورە باسی ئەهلی بەهەشت دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ساحەی مەحشەردا دەڕۆن و دەچنە ناو ئەو نازو نیعمەتە لەناو باغەکانی بەهەشتداو سەریان قاڵە هەموو شتێکیان لە یاد دەچێت بە هۆی ئەو هەموو خۆشیو بەختەوەریەوە کە تێیدان کە هـەرگیز نابڕێتـەوەو هەتاهەتاییـە سـەرفرازن. حەسـەنی بەسـریو ئیسماعیلی کـوڕی خالیـد دەڵـێن: سەرقاڵن و ئاگایان لە ئەهلی جەهەنەم نیـە کـە چ جەزرەبەیـەك دەچـێژن. موجاهیـد دەڵێـت: ﴿فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ﴾ واتە: سەرسامن لەو خۆشیەی کە تێیدان.[1] قەتادەیش هەر وای وتووە. ئیبنو عەباس دەڵێت ﴿فَٰكِهُونَ﴾ واتـە: دڵخۆشـن. وە دەفـەرمووێت: ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ واتـە: خۆیان لەگەڵ ژنەکانیان لەبەر سێبەر، لەسەر تـەخت، پـاڵ کـەوتوون. ﴿هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ﴾ واتـە: خۆیـان و خێزانـەکانیان ﴿فِي ظِلَٰلٍ﴾ واتـە: لـە ژێـر سـێبەری درەختەکانـدا.[2] ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ ئیبنـو عەعەباس و موجاهیـدو عیکریمـەو موحەممـەدی کـوڕی کـەعب و حەسـەن و قـەتادەو سـودی و خەسـیف دەڵـێن: ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾ واتـە: لەسـەر تـەختی ژێـر پـەردە(ی ئامـادەکراو بـۆ بـووك)دا پـاڵ کەوتوون.[3] وە دەفەرمووێت: ﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ واتە: لە بەهەشتدا هەر میوەیەك و هـەر شتێك داوای بکەن، ئامادەیە. ﴿لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ﴾ واتە: هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە بۆیـان. ﴿وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ﴾ واتـە: هەرچـی ئـارەزوو بکـەن ئامادەیـە بۆیـان دەسـتیان دەکـەوێت. خـوای گـەورە دەفەرمووێت: ﴿سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ﴾ واتە: پەروەردگاری دلۆڤـانیش هـەرخوی سـەلام و ئاشتییە

---

[1] الطبري (٢٠/٥٣٥).

[2] الطبري (٢٠/٥٣٨).

[3] الطبري (٢٠/٥٣٩/٥٤٠).

بۆیان. ئیبنو جورەیج دەڵێت: ئیبنو عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: لەم ئایەتەدا: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾ خودایش سەلامیان لێ دەکات. چونکە خوای گەورە خۆی ئاشتی و سەلامە بۆ ئەهلی بەهەشت. ئەمەی کە ئیبنو عەباس وتی. وەك ئەم ئایەتە وا کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَحِيَّتُهُمۡ يَوۡمَ يَلۡقَوۡنَهُۥ سَلَٰمٞۚ ﴾[1] واتە. ڕۆژێکباوەڕداران دەگەنەوە خوا بەخێرهاتنیان بە وشەی سەلامە.

﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾

**شوێنی خوانەناسان لە مەحشەردا و هەڕەشەو سەرزەنشت کردنیان**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی تاوانبارن، ئێوەش ئەمڕۆ دەبێت خۆتان جیابکەنەوە. خوای گەورە باسی بەسەرهاتو پاشەڕۆژی خوانەناسانمان بۆ دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کە چیان بەسەردێنێتو چۆن جیایان دەکاتەوە لە خاوەنباوەڕان وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ ﴾[2] واتە:لەو ڕۆژەدا کە هەمووان کۆدەکەینەوە پاشان بەو کەسانە دەڵێین کە شەریکیان بۆ خوا دادەنا ئێوە لەگەڵ شەریکەکانتاندا ڕاوەستن ئەوسا لێکیان جیادەکەینەوە، وە دەفەرمووێت: ﴿ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴾[3] واتە: ڕۆژێ کە قیامەت هاتە ڕوو، ئەو ڕۆژە بەش بەش دەبنەوە، وە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَصَّدَّعُونَ ﴾[4] واتە: لەو ڕۆژەدا بلاوە دەکەن. واتە: جیادەبنەوەو دەبن بە دوو بەشەوە. وە دەفـــەرمووێت: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾[5] واتە: ئەوانە لێك کۆبکەنەوە کە ناهەقی پیشە بوونو هاوجووتی ئەوانو ئەوانەش کە دەیانپەرست (غەیری خودا). ئەوسا ڕێگەی جەهەنەمیان پێ نیشان دەن، پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ

[1] الاحزاب (٤٤).

[2] یونس (٢٨).

[3] الروم (١٤).

[4] الروم (٤٣).

[5] الصافات (٢٢ـ٢٣).

أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ واتە: ئاخر ئەی تۆرمەی ئادەم، من لە پێشدا پەیمانم لەگەڵ نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن؟ ئەو ئاشکرا دوژمنتانە. لێرەدا خوای گەورە لۆمەو سەرزەنشتی خوانەناسان دەکات لە نەوەی ئادەم کە شوێن شەیتان کەوتن‌و گوێبیستی بوون کە شەیتان بە ئاشکرا دوژمنیانە کەچی ئەوان تەرە بوون‌وبە فەرمانی ئەو خودایەیان نەکرد کە دروستی کردوون‌و بژێوی داون. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ واتە: هەر تەنها خۆم بپەرستن، کە ڕێگەی ڕاست هەر ئەمەیە. واتە: لە ژیانی دنیادا فەرمانم پێ کردن کە گوێبیستی شەیتان مەبن. فەرمانم پێدان کە عیبادەتی من بکەن کە ڕێی ڕاست هەر ئەمەیە کەچی ئێوە ڕێیەکی ترتان گرتەبەرو شوێنی شەیتان کەوتن‌و بە قسەی ئەوتان کرد. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ﴾ واتە: کۆمەڵێکی زۆری لە ئێوە لە ڕێ لادا، ئاخۆ هێشتا هەر تێناگەن. ﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا﴾ واتە: خەڵکێکی زۆری لە ئێوە گومڕا کردو لە ڕێ لادا. ئەمە قسەی موجاهیدو قەتادەو سودی‌و سوفیانی کوڕی عویەینە وە دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ﴾ واتە: هێشتا هەر تێناگەن شوێنی شەیتان دەکەون‌و گوێبیستی خودای گەورە نابن کە فەرمانتان پێدەکات کە تەنها عیبادەتی ئەو بکەن کە شەریکی نیە.

﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾﴾

ڕۆژی قیامەت دەوترێت بەو خوانەناسانەی تۆرمەی ئادەم کاتێك کە جەهەنەم خۆی دەردەخات بۆیان دەیبینن بۆ ترساندن‌و سەرزەنشتکردنیان ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾ واتە: ئەمە ئەو جەهەنەمەیە، کەوا بەڵێنتان پێدەدرا. واتە: ئەمە ئەو جەهەنەمەیە کە پێغەمبەران (سەلامی خوای لێ بێت) ئێوەیان لێ دەترساندو ئاگادار دەکردەوە. کەچی ئێوە بڕواتان پێ نەدەکردن، ﴿ٱصْلَوْهَا ٱلْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ واتە: بە هۆی پێ نەزانینەکەتان، ئەمڕۆ دەبێت بچنە ناوی. وەك خوای مەزن لە چەند ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا

تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴾[1] واتـه: ڕۆژێـك پاڵـیـان پێـوه دهنرێـت بـهرهو ئـاگری دۆزهخ چۆن پاڵ پێوهنانێك، (پێیان دهوترێت) ئهمه ئهو ئاگرهیه كه ئێوه به درۆتان دهزانی، ئایا ئـهم ئاگره جادووه یان ئێوه نابینن.

## مۆر بەسەر دەمی تاوانباراندا ئەنرێت لە ڕۆژی قیامەتدا

خـوای گـهوره دهفـهرموێت: ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ واته: ئهمڕۆ مۆر دهخهینه سهردهمیانو دهستیان لهگهڵمان (قسه دهكهن) پاكانیشیان دهبنه شایهت كه كردهوهكانیان چی بووه. ئهمه ژیانو گوزهرانی بێ دینانو دووڕووانه له ڕۆژی قیامهتدا كاتێك كه دان نانێن بهو تاوانانهی كه له دنیا كردوویانهو سوێند دهخۆن كه شتی وایان نهكردووه. ئا لهو كاتهدا خودا مۆر دهنێت بهسهر دهمیانداو ئهندامهكانی لهشیان قسه دهكهنو ئهوهی كردوویانه ئاشكرای دهكهن. ئیبنو ئهبی حاتهم ڕیوایهتی كردووه له ئهنهسی كوڕی مالیكهوه (ڕهزای خوایان لێ بێت) دهڵێت: له خزمهت پێغهمبهردا بووین (ﷺ) پێكهنی ههتا دانی موبارهكی دهركهوت فهرمووی: ئهزانن بهچی پێكهنیم؟ ووتمان: خوا و پێغهمبهر ئهزانن، فهرمووی: بهموناقهشهی عهبدێك لهگهڵ پهروهردگاری خۆیدا له ڕۆژی قیامهتدا پێكهنیم، عهبدهكه دهڵێت: ئهی پهروهردگارم! ئایا پهیمانت نهداوه ناههقیم پێنهكرێت؟ دهفهرموێت: با!. دهڵێت: كهس قهبوڵ ناكهم شایهتیم لێ بدات مهگین شایهتێك له نهفسی خۆم. خودایش دهفهرموێت: ئهمڕۆ نفسی خۆت بهسه كه حیسابت لهسهر بكات (واته: تاوانهكانت بژمێری) ههروهها فریشته خاوهن ڕێزهكانیش كه كردهوهكانیان بۆ نوسیویت وشایهتن لهسهرت. جا مۆر دهخرێته سهر دهمیو دهوترێت به ئهندامهكانی لهش (قسهٔ بكهن) و ئهوانیش كردارهكانی باس دهكهن. پاشان ماوه دهدرێت له نێوان ئهوو ئهندامهكانی لهشیدا تا پێكهوه قسهبكهن. دهڵێت: دهك دوور بن له بهزهیی خوداوهو لهناو بچن خۆ من لهبهر ئێوه ههوڵ دهدهمو تێدهكۆشم)، موسلیمو نهسائیش ڕیوایهتیان كردووه.[2] ئیبنو جهریر ڕیوایهتی كردووه له ئهبو موسای ئهشعهریهوه (ڕهزای خوای لێ بێت) دهڵێت: له ڕۆژی قیامهتدا خاوهن باوهڕ بانگ دهكرێت بۆ لێپرسینهوه، پهروهردگاری ئهو كردارانهی له نێوان ئهوو بهندهكهیدایه نیشانی دهدرێتو دانی پێدا دهنێت دهڵێت: بهڵێ ئهی پهروهردگارم. كردوومه، كردوومه، كردوومه. دهڵێت: خوا له تاوانهكانی دهبوورێتو بۆی دادهپۆشێت. هیچ دروستكراوێك لهسهر زهمیندا هیچێك لهو تاوانانه نابینێت. چاكهكانی دهخرێته ڕوو پێی خۆشه خهڵكی ههموو چاكهكانی ببینن. خوانهناسو دووڕوویش بانگ

---

[1] الطور (١٣ـ١٥).

[2] مسلم (٤/٢٢٨٠)، النسائي في الكبرى (٦/٥٠٨).

دەکرێن بۆ لێپرسینەوە. پەروەردگاری کردەوەکانی دەخاتە بەر دەستی، ئینکاری دەکات و دەڵێت: ئەی پەروەردگارم سوێند بە گەورەیی تۆ ئەوەی ئەم فریشتەیە نووسیویەتی لەسەرم نەمکردووە! فریشتەکەیش پێی دەڵێت: تۆ ئەوەت لە فلانە ڕۆژو فلانە شوێندا نەکرد؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر سوێند بە گەورەیی تۆ ئەی پەروەردگارم من ئەو کارەم نەکردووە. خۆ ئەگەر ئەو کارەی کردبێت مۆر دەخرێتە سەر دەمی. ئەبو موسای ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: من وادەزانم و وای دادەنێم کە یەکەم شتێك لە مرۆڤدا قسە دەکات ڕانی لای ڕاستە پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ﴾ واتە: ئەگەر حەز بکەین، چاوەکانیشیان کوێر دەکەین بەرەو ڕێگا پێشبڕکێ دەکەن سا کوا سۆمای دیتنیان هەیە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە مانای ئەم ئایەتەدا. ئەگەر حەز بکەین لە ڕێ لایان دەدەین. ئاخۆ چۆن ڕێگا دەردەکەن؟ جارێکیان وتوویەتی: کوێریان دەکەین.[2] حەسەنی بەسری دەڵێت: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت سۆمای دیتنیان ناهێڵێت و کوێریان دەکات و هەر دێن و دەچن. موجاهیدو ئەبو سالح و قەتادەو سودی دەڵێن: ﴿فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ﴾ واتە: ڕێگا. ئیبنو زەید دەڵێت: ﴿ٱلصِّرَٰطَ﴾ لێرەدا واتە: ڕاستی، ﴿فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ﴾ واتە: چۆن دەبینن کاتێك کە چاوەکانیان کوێر دەکەین. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) واتە: ڕاستی نابینن.[3] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ﴾ واتە: ئەگەر حەزیشمان کردبووایە هەر لە جێگەکەی خۆیاندا دەمانکردنە شتێکی تر ئەوساکە نەیانتوانیبا بێنە پێش و بەرەو دواش نەگەڕێنەوە. ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ﴾ عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت): ئەگەر مەیلمان لێ بووایە قڕمان دەکردن لە شوێنی خۆیاندا.[4] سودی دەڵێت: واتە: شێوەمان دەگۆڕین. ئەبو سوالح دەڵێت: دەمانکردن بە بەرد. حەسەنی بەسری و قەتادە دەڵێن: واتە: لەسەر پێکانیان دامان دەنیشاندن.[5] بۆیە

---

[1] الطبري (٢٠/٥٤٤).

[2] الطبري (٢٠/٥٤٥).

[3] الطبري (٢٠/٥٤٧).

[4] الطبري (٢٠/٥٤٧).

[5] الطبري (٢٠/٥٤٧).

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا﴾ واتە: نەیاندەتوانی بڕۆن بۆ پێشەوەو ﴿وَلَا يَرۡجِعُونَ﴾ نەشیاندەتوانی بەرەو دواش بگەڕێنەوە بەڵکو هەر بەو شێوەیە دەمانەوەو نەدەڕۆیشتن بۆ پێشەوە نە بۆ دواوە.

﴿ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ٦٨ وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ٦٩ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧٠ ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: هەر کەسێکیش تەمەنی زۆر بدەینێ، شێوەو بچمیشی دەگۆڕین. بۆچی نایانەوێت تێبگەن. خوای گەورە باسی ئەوەی ئادەم دەکات هەتا تەمەنی درێژ بێتو بەرەو ژوور بڕوات، زیاتر بەرەو کزیو لاوازی دەچێت، توانای نامێنێتو جموجوڵی کەم دەبێتەوە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ﴾[1] واتە: خوا زاتێکە ئێوەی دروست کردووە لە لاوازی (لاوازی نوتفەو بێچوو منداڵی شیرەخۆر..) پاشان دوای لاوازی بەهێزی کردوون (بوون بە لاو) لە دوای بەهێزکردنتان لاوازیو پیری بۆ دانان خوا هەرچی بوێ دروستی دەکاتو هەر ئەوە زانای بە دەسەلات. ﴿وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗا﴾[2] واتە: وە هەندێکتان دەگەیەنرێنە ئەوپەڕی پیری، بێ کەڵکترینی تەمەن بۆ ئەوەی نەزانێتو لە بیری نەمێنێت هەرچی کە دەیزانێت. مەبەست لەم ئایەتە (والله أعلم) باسی ئەم دنیایە کە شوێنی مانەوەو بەردەوامی ژیان نیەو دەڕواتو نامێنێت و دەبێت هەر بەجێ بهێڵرێتو ژیان کۆتایی بێت تێیدا، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَعۡقِلُونَ﴾ واتە: بۆچی بیر ناکەنەوە چاك وردنابنەوە کە چۆن وەدی هاتوونو پاشان بوون بە لاو دوایش چۆن ئا بەو شێوەیە کە دەیبینن پیرو کزو لاواز بوون. هەتا تێبگەنو باش بزانن کە بۆ جێگایەکی تر دروست کراون کە هەرگیز کۆتایی نایەتو لێی دەرناچنو هەر دەمێننەوە تێیدا. ئەو جێگایەش ژیانەکەی ترە کە هەرگیز دوایی نایەت.

## خوای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) فێری شیعر نەکردووە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ﴾ واتە: ئێمە ئەومان فێری شیعر نەکردووەو هیچ پێویستیشی پێی نیە، ئەمە تەنها بۆ یاد لە خوا کردنەوەو

---

[1] الروم (٥٤).

[2] الحج (٥).

قورئانێکـه شـێوەی ژیـان نیـشان دەدات. ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ﴾ خـوای مـەزن باسـی پێغەمبـەر دەکـات (ﷺ) کـە فێـری شـیعر وتنـی نـەکردووەو ﴿وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ﴾ واتـە: سروشـتی پێغەمبەر(ﷺ) وابووە کە حەزی لە شیعر نەبووەو خۆشی لێی نەهاتووەو نەیزانیووە شیعر بڵێت‌و بۆی نەهاتووە، بۆیە دەگێڕنەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) توانای شیعر لەبەرکردنی نەبووە لەسەر وەزنێکی تـەواو بەڵکو شیعری کەسێکیشی بووتایە تەواوی نەدەکرد. تێکی دەداو دەیگۆڕی. هەر بەو شێوەیە بەیهەقی لە (الدلائل)دا ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی بـە عەباسـی کـوڕی مورداسـی سولەمی(ڕەزای خوای لێ بێت) تۆ ئەمەت وتووە: (أنجعل نهبي ونَهْبَ العُبَيد بين الاقرع وعُيينـة) عـەباس وتی: بەڵکو ئەوە (عُيينة والاقـرع). پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: (هـەمووی وەك یـەكن) واتـە: لـە مانـادا یەکن.[1] والله أعلم. چونکە خودای مەزن فێـری قورئـانی کـردووە ئـەو قورئانـەی ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾[2] واتە: بە تاڵ ڕووی تێناکات نە لە ئێستاو لە نە دواڕۆژدا (نـە بـە لێ کـەمکردن‌و نـە بـە لێ زیـادکردن) چـونکە نێردراوەتـە خـوارەوە لـە لایـەن (خـوای) کاردروسـتی ستایشکراوەوە. ئەو قورئانە شیعر نیە وەك گرۆیەك لە خوانەناسە نەفامەکانی قورەیش وایان دەزانـی. نە جادووەو نە قسەی فالگرەوەیەو نە دروستکراویشە وەك هەندێ سەرلێشێواوو نـەزان دەیڵـێن بـەڵکو تایبەتمەندی خۆی وای لێ کردووە کە حـەزی لـە شـیعر وتـن نـەبووەو ڕێگاشـی پـێ نـەدراوەو فێـری نەبووە. ﴿إِنْ هُوَ﴾ واتـە: ئـەوەی کـە فێرمـان کـردووە ﴿إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ﴾ واتـە: ئاشـکراو ڕوونو دیارە بۆ کەسێك کە بیری لێ بکاتەوەو وردبێتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: تـا ئەوانـەی بـە دڵ زینـدوون لـە خودایـان بترسـێن‌و قـسەی خـودا دەربـارەی خودانەناسـان بـەجێ بگـات. ﴿ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی ئـەم قورئانـە ڕوونو ئاشکرایە ئەوانەی دڵ زیندوون بیانترسێنێت. وەك لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[3] واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم‌و هـەر کەسـێکی کـەش کـە پێـی دەگـات. وە فەرموویـەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[4] واتە: وە هەر کـەس بـاوەڕی پێـی نـەبێت لـەو کۆمـەڵ‌و

[1] دلائل النبوة (۵/۱۸۱)، فەرموودەیەکی مورسەلە.
[2] فصلت (۴۲).
[3] الانعام (۱۹).
[4] هود (۱۷).

تاقمانە (ئەوانەی کۆبوونەوە لەسەر دژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی. کەسێك لەم ترساندنو ئاگادارکردنەوەیە سوود وەردەگرێت کە دڵی زیندوو بێت چاوی دڵی ڕووناك بوو بێتەوە. وەك قەتادە دەڵێت: دڵو چاو زیندوو.[1] زەححاك دەڵێت: واتە: ژیر بێت.[2] ﴿وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئەم قورئانە ڕەحمەتە بۆ خاوەن باوەڕانو بەڵگەو نیشانەشە بەسەر خوانەناسانەوە....

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾

**مەڕوماڵات نیشانەو بەهرەشە (لەسەر دەسەڵاتی خودا)**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ﴾ واتە: ئاخۆ هێشتا نەیاندیوە ئێمە بە دەستی خۆمان مەڕوماڵاتمان بۆ بەرهەم هێنان ئەوان بوونەتە خاوەنیان؟ خوای مەزن باسی ئەو هەموو بەهرەیە دەکات کە داویەتی بە بەندەکانی لەو هەموو مەڕوماڵاتەی کە ژێرباری کردووە بۆیان، ﴿فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ﴾ واتە: کە ئەوان بوونەتە خاوەنی. قەتادە دەڵێت: توانایان هەیە بەسەریانداو بە کاریان دێنن و بوونەتە خزمەتکارو ژێردەستەیانو سەرپێچیان ناکەن، خۆ ئەگەر منداڵێك بێت بۆ لای وشترێك بەسەر چۆکدا دەیخات، خۆ ئەگەر مەیلیشی لێ بێت هەڵی دەسێنێتو لێی دەخوڕێت ئەو وشترەی لەبەر دەستدایەو بۆ کوێ بیانەوێت دەیانبات. وە دەفەرموێت: ﴿وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ واتە: وا بۆشمان دەستەمۆ کردوون، کە دەتوانن سواریان ببنو لێیان بخۆن. واتە: بە شێوەیەك دەستەمۆیان کردوون. هەیانە کە لە سەفەری درێژخایەندا سواریان دەبنو باریشیان لێ دەنێن بۆ هەموو شوێنو وڵاتێك ﴿وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾ واتە: هەر کاتێکیش ئارەزوو بکەن لە ملیان دەدەن یان سەریان دەبڕن. ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾ واتە: هەر لەوانیش گەلێك جۆرە بەهرە دەبەن، زۆر شتی خواردنەوەشیان لێ وەردەگرن. هێشتا هەر شوکرانە ناکەن. ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ﴾ واتە: هەر لەو مەڕوماڵاتانە سوود لە خوریو مووی توکەکەی وەردەگرن بۆ پێویستی ناو ماڵو زۆر شتی تر هەتا ماوەیەك ﴿وَمَشَارِبُ﴾ واتە: سوود لە شیرەکەیانو هەتا لە میزی وشترەکانیش وەردەگرن بۆ خواردنەوەو چارەسەری نەخۆشی، ﴿أَفَلَا

---

[1] الطبري (٢٠/٥٥٠).

[2] الطبري (٢٠/٥٥٠).

يَشْكُرُونَ ﴾ واتە: هێشتا هەر سوپاسی خوا ناکەن‌و بە تاك‌و تەنهای نازانن کە ئەو دروستکەرو ڕامهێنەری‌و دەستەمۆکەری هەموو ئەمانەیە و شەریکی بۆ دادەنێن؟

﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾

## خودایانی بتپەرستان ناتوانن بە هانای بتپەرستانەوە بێن

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾ واتە: غەیری خودا شتگەلێکی تریان پەرست، بەڵکو بە هانایانەوە بێن. خوای گەورە ڕەدی ئەو بتپەرستانە دەداتەوە کە غەیری خودا شتی تر دەپەرستن‌و دەیکەنە شەریکی خودا. بە تەمای ئەوەن کە بە هانایانەوە بێن‌و بژێویان بدەن‌و نزیکیان بخەنەوە لە خوداوە، خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾ واتە: ناشتوانن بە هانایانەوە بێن، بەڵام ئەمان لە خزمەتیاندان، بۆ پێشمەرگەیی ئامادەن. واتە: ئەو کەسانە ناتوانن بێن بە هاواری ئەوانەوە کە دەیانپەرستن. وە زۆر لەوە لاوازترو بێ دەسەڵاتو زەبوونترن. بەڵکو ئەوانە ناتوانن بە هانای خۆشیانەوە بێن. ئیتر چۆن دەتوانن زیان بە کەس بگەیەنن یان سودمەندی بکەن. چونکە ئەوانە بێ گیانن نە دەبیسن‌و نە ئاوەزیشیان هەیە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾ واتە: لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا لە لایاندا ئامادەن.[1] واتە: هەموو ئەو کەسانە کە ئەو بتانەیان پەرستووە دەهێنرێن و کۆدەکرێنەوەو ئامادە دەکرێت لە لای بتەکاندا. چونکە ئەوە دەبێتە هۆی زیاتر دڵ گران بوون‌و بەڵگەی تەواو لەسەریان. قەتادە دەڵێت: ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ﴾ واتە: ئەوانەی کە دەیانپەرستن، ناتوانن بە هانایانەوە بێن. ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾ بتپەرستان زۆر تووڕەو دڵگران دەبن کە لە دنیا ئەوانەیان پەرستووە کەچی ناتوانن چاکەیەکیان لەگەڵ بکەن‌و خراپەیەکیان لێ لادەن. چونکە ئەوانە بتن‌و بی[2] هەستو ئاوەزن. حەسەنی بەسریش هەر وای وتووە. قسەیەکی جوانە، ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

[1] الطبري (٢٠/٥٥٠).

**دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ)**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ وتاریان دڵتەنگت نەکات، هەر شتێك بشارنەوەو هەر شتێك بیدرکێنن ئێمە لێیان ئاگادارین. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾ واتە: دلگران مەبە کە بڕوات پێ ناکەن و خودا ناناسن. ﴿إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ واتە: هەرچی دەکەن ئێمە ئاگامان لێیانە بەم زووانە هەقیان لێ دەستێنین و بەرخوردیان لەگەڵ دەکەین لەسەر ئەو ناوو ناتۆرانەی کە ئەبنخستە شوێن تۆ لەو ڕۆژەدا کە هەرچی لە دنیادا کردوویانە لێمان برز نابێت و گەورەو بچووك بە ئەرزش یان بێ ئەرزش بەڵکو هەموو ئەو کردارانەی کردوویانە نیشانیان دەدرێت. زوو کردوویانە یان درەنگ.

﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾﴾

**نکوڵی کردنی زیندووبوونەوە پاش مردن و وەڵامدانەوەیان**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: مرۆڤ چۆن هێندە نازانێت، کە ئێمە لە تنۆکێکمان ئافراندووە، کەچی ئێستا دوژمنێکی ئاشکرایە. موجاهیدو عیکریمەو عوروەی کوڕی زوبەیرو سودی و قەتادە دەڵێن: ئوبەی کوڕی خەلەف (لەعنەتی خوای لێ بێت) هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێسکێکی ڕزیو بە دەستیەوە بوو بە دەستی دەیولی و وردی دەکرد فڕێی دەداو بڵاودەبووەوە بە دەم هەواوە دەکەوتە سەر زەوی دەیوت: ئەی موحەممەد ئایا وا دەزانی خودا ئەم ئێسکە ڕزیوە زیندوو دەکاتەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ خوای گەورە دەتمرێنێت و پاشان زیندووت دەکاتەوەو پاشان دەتخاتە ناو ئاگر). پاشان ئەم ئایەتانەی کۆتایی سورەتی (یس) هاتووەتە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکان.[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: عاسی کوڕی وائل لە بەتحا ئێسکێکی هەڵگرت و بە دەست وردی کردو ولیی، پاشان وتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ): ئایا خودا ئەم ئێسکە زیندوو دەکاتەوە پاش ئەوەی وای لێ دێت کە دەیبینم؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ خودا دەتمرێنێت و پاشان زیندووت دەکاتەوەو

[1] الطبري (٢٠/٥٥٤).

پاشانیش دەتخاتە ناو جەهەنەم). جا ئەڵێ: پاشان ئەم ئایەتانەی کۆتایی (یس) هاتە خوارەوە، ئیبنو جەریریش ئەمەی ڕیوایەت کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە.[1] ئەم ئایەتانە لەسەر ئوبەیی کوڕی سەلول یان عاصی کوڕی وائل هاتبێتە خوارەوە گشتگیرەو وەك یەكە. هەموو كەسێك دەگرێتەوە كە باوەڕی بە زیندووبوونەوە نیە. ئەلیفو لامەكە (الف واللام) بۆ جنسە لەم ئایەتەدا كە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ واتە: ئایا ئەوانەی كە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە. ئایا دروست بوونیان بەڵگە نیە لەسەر زیندووبوونەوەیان باوەڕی پێ ناكەن. كە خوای مەزن لە تنۆكێك ئاوی بێزلێكراو بێ ئەرزش وەدی هێناون. وەك خوای گەورە لە چەند ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّاءٍ مَّهِينٍ (٢٠) فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ (٢١) إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ﴾[2] واتە: ئایا ئێوەمان دروست نەكردووە لە ئاوێكی بێ نرخ؟، ئینجا خستمانە جێگایەكی پتەوەوە، تا ماوەیەكی دیاری كراو. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ﴾[3] واتە: بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست كرد لە دڵۆپێك ئاوی تێكەڵ لەگەڵ توخم تا تاقی بكەینەوە. واتە: لە تنۆكێكی ئاوێتە كە تاقی دەكەینەوە. ئەو خودایەی كە مرۆڤی دروست كردووە لە تنۆكە ئاوێكی لاواز، ئایا ناتوانێت جارێكی تر دروستی بكاتەوە پاش مردن. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە موسنەدەكەیدا لە بوسری كوڕی جەحاشەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك تفی كردە ناو لەپیەوە پەنجەی پیا دەنا. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خوای مەزن فەرموویەتی ئەی نەوەی ئادەم چۆن لە دەستم قوتار دەبیو دەردەچی كە من تۆم وەدی هێناوە لە وێنەی ئەمە هەتا كاتێك ڕێكوپێكم كردی بە جلوبەرگەوە گەڕایت. وە چارەنووسیشت هەر لەناو زەمینەو لەناو دەچی، هەر كۆت كردووەتەوەو خێرت لێ نەكردووە، تا گیانت گەیشتە شادەمارت وتت: خێروبێر دەكەم. ئاخۆ ئێستە كاتی خێركردنە؟).[4] ئیبنو ماجەش ڕیوایەتی كردووە.[5] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ واتە: ئەو نموونەیەكی بۆ ئێمە هێنایەوەو ئافراندنی خۆی لەبیر كرد، دەڵێت ئێسك لە پاش پوان، كێ زیندوو دەكاتەوە؟ واتە: ئەو خودا خاوەن دەسەڵاتە مەزنەی كە ئاسمانەكانو زەمینی وەدی هێناوە، بە دووری دەزانن كە ئەو

---

[1] الطبري (٢٠/٥٥٤).

[2] المرسلات (٢٠ـ٢٢).

[3] الانسان (٢).

[4] احمد (٢١٠/٤)، ئەلبانی دەڵێت ئەم فەرموودەیە سەحیحە.

[5] ابن ماجه (٩٠٣/٢)، ئەلبانی دەڵێت ئەم فەرموودەیە سەحیحە.

ئێسکە پواوە (ڕزاوە) زیندوو بکاتەوە جارێکی تر. بە تەواوی خۆی لەبیر کردووە کە خودا لە نەبوون هێناویەتی‌و خودا خۆی چاکتر ئاگاداری ئەوانەیە کە باوەڕ ناکەن‌و ئینکاری دەکەن‌و بە دووری دەزانن. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ واتە: بڵێ: کەسێك یەکەمجار دروستی کردوون، ئەو زیندوویان دەکاتەوە، بۆ هەموو دروستکردنێك خۆی زانایە. واتە: ئاگاداری ئەو ئێسکانەیە لە هەموو ناوچەکانی سەر زەمیندا و لە هەر شوێنێکدا بێت. بۆ کوێ چووەو بە کوێدا پەرش‌و بڵاوبووەتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ڕیبعیەوە دەڵێت: عوقبەی کوڕی عەمر وتی بە جوزەیفە (ڕەزای خوایان لێ بێت): ئاخۆ شتێکمان بۆباس ناکەی لەوەی کە لە پێغەمبەری خودات (ﷺ) بیستووە؟ وتی: گوێبیستی پێغەمبەر(ﷺ) بووم دەیفەرموو: (پیاوێك مردن یەخەی گرت، کاتێك بێ هیوا بوو لە ژیان وەسیەتی کرد بۆ کەس‌و کاری‌و وتی: کاتێك مردم دارێکی زۆرو وشکم لەسەر کۆبکەنەوە. پاشان ئاگری تێ بەردەن هەتا گۆشتەکەم دەخوات‌و ئێسکەکەم بە تەواوی دەسوتێت، جا هەڵیگرن‌و بیهاڕن، پاشان فڕێی بدەنە ناو دەریا. ئەوانیش وایانکرد. خوای گەورە لای خۆی کۆی کردەوەو پاشان پێی فەرموو: بۆچی ئەوەت کرد؟ وتی: لە ترسی تۆ؟ لەبەر ئەوە خوای گەورەش لێی خۆش بوو)! عوقبەی کوڕی عەمر دەڵێت: منیش گوێم لە پێغەمبەر بووە (ﷺ) ئەمەی فەرموو (ئەو کابرایە گۆڕی خەڵکی هەڵئەدایەوە)[1]! وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە بە چەند دەستە واژەیتر. یەکێك لەو دەستە واژانە ئەوەیە کابرا فەرمان بە کوڕەکانی دەکات کە بیسوتێنن‌و پاشان بیهاڕن‌و وردی بکەن پاشان نیوەی بوەشێنن بە وشکانیدا نیوەکەی تری بکەنە دەریا لە ڕۆژێکی ڕەشەبادا، ئەوانیش وایان کرد خوای مەزن فەرمانی دا بە دەریا، هەرچی تیابوو کۆی کردەوە، فەرمانیشیدا بە وشکانی هەرچی تیابوو کۆی کردەوە، پاشان فەرمووی پێی: پەیدا ببە، بووە پیاوێك وەستا بە پێوە، خوای گەورە پێی فەرموو: چی وای لە تۆ کرد، کە ئەوەت بەسەر خۆت هێنا؟ وتی: ترساندن لە تۆ خۆت چاکتر دەزانی. لە ناوی نەداو نەیمراند هەتا لێی خۆش بوو.[2] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ﴾ ئەو کەسێکە لە داری سەوز ئاگری بۆ پەیدا کردوون، ئێوەش هەر لەوە ئاگر دەکەنەوە. واتە: ئەو خودایەی کە ئەم دارەی لە ئەوەڵەوە لە ئاو دروست کردووە هەتا سەوزو جوان بووەو بەرهەمی پێگەیووە، پاشان وای لێکردووە کە بووە بە دارێکی وشك‌و ئاگری پێ هەڵگیرساوە. هەر بە هەمان شێوە هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات.توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکداو هیچ شتێك ڕێی لێ ناگرێت. قەتادە دەڵێت: ئەو

[1] احمد (٥/٣٩٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٦/٥٩٤)، مسلم (٤/٢١١٠).

کەسەی ئەم ئاگرەی لەم دارە دەرهێنا. تواناشی هەیە کە زیندووی بکاتەوە. وتراوە: مەبەست پێی داری مەرخو عەفارە کە لەناو زەوی حیجازدا دەڕوێت. کە هەر کەسێك بیەوێت ئاگر بکاتەوە و چەرخی پێ نەبێت دوو شوڵی سەوزی لێ دەکاتەوە و دەیاندات لەیەك، ئاگریان لێ پەیدا دەبێت. هەر وەك چەرخ وایە. ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە پەندی پێشینانداهاتووە: ئەڵێ: (لكل شجر نار و استمجد المرخ و العفار)، واتە:هەموو دارێك ئاگری هەیە بەڵام مەرخو عەففار ناوبانگیان دەرکردووە. داناکان وتوویانە: لە هەموو دارێکدا ئاگر هەیە تەنیا دارستان نەبێت.

﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾ واتە: ئاخۆ کەسێك توانای هەبێت ئەم ئاسمانانو زەمینەی داهێنابێت، توانای نیە وێنەیان دروست بکاتەوە؟ بەڵێ لە وزەیدا هەیەو وەدیهێنی فرە زانا هەر خۆیەتی. خوای گەورە باسی توانای خۆی دەکاتو ئاگادارمان دەکات کە چەندە خاوەن دەسەڵاتە، ئەم حەوت ئاسمانەی دروست کردووە کە پڕە لە ئەستێرەی گەڕۆكو وەستاو لەگەڵ حەوت زەمین کە پێك هاتووە لە کەژو کێوو خۆڵو لمو دەریاو بیابانی چۆڵو چەندین شتی تریش کە ئەمانە هەمووی ڕێنیشاندەرو بەڵگەن لەسەر زیندووبوونەوەی لاشەکان. وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ﴾[1] واتە: بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی. وە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم﴾ واتە: دەتوانێت وێنەیان دروست بکاتەوە وەك چۆن لە هەوەڵ جارەوە دروستی کردوون. ئیبنو جەریر دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتانە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[2] واتە: ئایا ئەوانەیان زانیوە بە ڕاستی ئەو خودایەی ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووەو لە دروستکردنیدا ناتەوانو دەستەپاچە نەبووە بە توانایە مردوانیش زیندوو بکاتەوە بەڵێ بێگومان خوا

[1] الغافر (٥٧).

[2] الاحقاف (٣٣).

بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. وە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: هەر کاتێك هەر شتێکی بوێت پەیدا ببێت، بە فەرمان پێی دەڵێ: ببە هەر دەستبەجێ پەیدا دەبێت. واتە: هەر کاتێك خوای گەورە فەرمان بدات بە شتێك یەك جار فەرمانی پێدەکات و پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات دەستبەجێ پەیدا دەبێت.

إذا ما أرادَ الله أمراً فإنَّما يقول له (كُن) قولةً فيكونُ

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی بەندەکانم! هەمووتان تاوانکارن مەگین کەسێك خۆم بیپارێزم‌و لایدەم داوای لێبوردنم لێ بکەن لێتان خۆش دەبم، هەمووتان هەژارن مەگین کەسێك خۆم دەوڵەمەندی بکەم. من بەخشندەی بە دەستەڵاتی پەیدا کەرم، هەر شتێکم ویستنەیکەم، بەقسەیەك شت ئەبەخشم و بەقسەیەکیش سزا ئەنێرم، کەشتێکم ویست هەرئەوەندە پێی دەڵێم ببە، دەستبەجێ پەیدا دەبێت.[1] پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ پاکی‌و بێ عەیبی بۆ کەسێك کە هەموو شت لە ژێر فەرمانی ئەودایەو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە. واتە: پاکی‌و بێ عەیبی هەر بۆ خودای گەورە کە هەموو شت لە ژێر فەرمان‌و دەسەڵاتی ئەودایە لە ئاسمانەکان‌و زەمینداو هەموو فەرمانێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو، دروست کردن‌و بڕیاردان بە دەستی ئەوەو بەندەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا دێنەوە لای. هەر کەسەو بە کردەوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکات. خودایەکی عادیل‌و خاوەن بەهرەو بەخشندەیە. ﴿فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾[2] واتە: گەورەیە ئەو زاتەی کە هەرچی دەسەڵات‌و پاشایی هەیە بە دەستی ئەوە. وتەی (الملك)و (الملكوت) یەك مانایان هەیە وەك (رَحْمَة)، (رَحمُوت)، (رَهْبَة)، (رَهَبوت)، (جَبْـر)، (جَبَـروت). هەندێ کەس دەڵێن ﴿ٱلۡمُلۡكُ﴾ مەبەست پێی عالەمی جەستەیەو (ملكوت)یش عالەمی ئەرواحە، ڕای یەکەم ڕاستە و کۆمەڵی زانایانی تەفسیرو کەسانی تریش ڕایان لەسەریەتی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵسام حەوتە درێژەکەی خوێند (مەبەست حەوت سورەتی ئەوەڵی قورئانە) لە حەوت ڕکاتدا، کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرزکردەوە لە رکوعدا فەرمووی: (سمع الله لمن حمده)، پاشان فەرمووی: (الحمد لله ذي

---

[1] أحمد (٥/١٥٤)، لە تەفسیری سورەتی (الانفال)دا پلەکەی دیاری کراوە.

[2] أحمد (٥/٣٩٦).

الملكوت والجبروت والكبرياء والعظمة) ركوعەكانی وەك وەستانەكانی وابوو، سوژدەكانیشی وەك ڕەكوعەكانی وابوو، پاشان لێ بوویەوە وەخت بوو هەردوو پام بشكێت.[1] ئەبو داودیش ڕیوایەتی كردووە لە عەوفی كوڕی مالكی ئەشجەعیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا هەڵسام (واتە بۆ شەونوێژ) هەڵسا سورەتی (البقرة)ی خوێند تێنەدەپەڕی بە لای ئایەتێكی بەزەییدا (آية الرّحمة) مەگین ئەوەستاو داوای بەزەیی دەكرد. وە تێنەدەپەڕی بە لای ئایەتێكی عەزابدا مەگین پەنای دەگرت بە خوا، ئەڵێ: پاشان ڕەكوعی دەبرد بە ئەندازەی وەستانەكەی لە ڕەعوعەكەیدا دەیفەرموو: (سبحان ذي الجبروت والملكوت والكبرياء والعظمة) پاشان سوژدەیشی دەبرد بە ئەندازەی وەستانەكەی دەمایەوە، پاشان لە سوژدەكەیدا هەروەكو ئەوەی دەوت. پاشان هەڵساو (ال عمران)ی خوێند، پاشان سورەت سورەت دەیخوێند.[2] تیرمیزی ڕیوایەتی كردووە لە كتێبی (الشمائل)دا نەسائیش ڕیوایەتی كردووە[3].

## تەفسیری سورەتی (الصافات)

## لە مەككەدا هاتووەتەخوارەوە

### ڕێزی سورەتی (الصافات)

نەسائی ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا فەرمانی پێ دەكردین بە ئاسانكاریو پێشنوێژی بۆ دەكردین بە (الصافّات) واتە: خوێندنی سورەتی (الصافّات).[4] تەنها نەسائی ڕیوایەتی كردووە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ ﴿٥﴾﴾

### شایەتیدانی فریشتەكان بە تەنهایی خودا

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾ واتە: سوێند بەوانەی بۆ ڕیزبەستن لە لای یەكتر ڕادەوەستن. لە عەبدوڵلای كوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا﴾ واتە:

[1] الملك (١).

[2] ابو داود (١/٥٤٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] شمائل للترمذي (١٦٤)، النسائي (٢/٢٢٣)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] النسائي (٢/٩٥)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

فریشتەکان. ئەوانەی بە ڕیز ڕادەوەستن لە تەنیشت یەکتری. ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾ واتە: سوێند بەوانەی لە ناڕەوا پێش دەگرن. واتە: فریشتەکان. ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾ واتە: سوێند بەوانەی قورئان دەخوێنن. واتە: فریشتەکان.[1] قەتادە دەڵێت: فریشتەکان چەندین ڕیزن لە ئاسماندا.[2] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕێزمان لەسەر خەڵکی بە سێ شتە: ڕیزەکانمان وەك ڕیزی فریشتەکانەو زەمین هەمووی کراوە بە مزگەوت بۆمان و خۆڵەکەشی پاککەرەوەیە بۆمان وەختێك ئاومان دەست نەکەوێت).[3] دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردووە. ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە لە جابیری کوڕی سەمورەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ئایا ڕیز نابەستن وەك ئەو فریشتانەی ڕێز دەبەستن لە لای پەروەردگاریان؟ وتمان: فریشتەکان چۆن ڕیز دەبەستن لە لای پەروەردگاریان؟) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ڕیزەکانی پێشەوە تەواو دەکەن و پاڵ ئەدەن بە یەکەوە لە ڕیزدا).[4] سودی و کەسانی تریش دەڵێن: مانای ئەم ئایەتە ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾ واتە: ئەو فریشتانەی کە هەور دەردەکەن ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾ سودی دەڵێت: ئەو فریشتانەی کتێبەکان و قورئان دەهێنن لە لایەن خوداوە بۆ ئادەمیزاد.

## پەرستراوی ڕاست هەر خودایە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ﴾ واتە: خوای ئێوە هەر یەکە. ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ﴾ واتە: پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەمینە و هەرچی لەناویاندا هەیەو پەروەرێنی ڕۆژهەڵاتانیشە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ یانی: سوێند بەوانە خوای ئێوە هەر یەکێکە. کە پەروەرێنی ئاسمانەکان و زەمینە. ﴿وَمَا بَيۡنَهُمَا﴾ واتە: ئەوانەش لە نێوانیاندا هەیە ﴿وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ﴾ واتە: هەر ئەوە خاوەنی دەسەڵات و کاربەدەست و وەدیهێنەرو ڕامهێنەری هەموو ئەستێرەکان بە ئەستێرەی گەڕۆك و وەستاوەوە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەردەکەون و لە ڕۆژئاواوە ئاوا دەبن. لێرەدا بە باسی ڕۆژهەڵات وازی لە باسی ڕۆژئاوا هێناوە. چونکە

---

[1] الطبري (٢١/٧).

[2] القرطبي (١٥/٦١/٦٢).

[3] مسلم (١/٣٧١).

[4] مسلم (١/٢٢٣)، ابو داود (١/٤٣١)، النسائي (٢/٩٢)، ابو داود (١/٣١٧).

بەڵکە ئەویستە بە هاتنی ڕۆژهەڵات ڕۆژئاوا بە دوایدا دێت. وەك لە چەند شوێنێ تردا لە قورئاندا خوای گەورە بە دوای یەکدا هێناونی‌و دەفەرموێت: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ﴾[1] واتە: جا سوێند بە پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکان‌و ڕۆژئاواکان بێگومان ئێمە بە دەسەڵاتین. وە دەفەرموێت: ﴿رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ﴾[2] واتە: هەردوو شوێنی ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوای ڕاهێناوە کەزستان‌و هاوینە بۆ خۆرومانگ.

﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾﴾

**ڕازاندنەوەی ئاسمان‌و پاراستنی لە لایەن خواوە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ﴾ واتە: ئێمە ئاسمانی نزیکمان بە ئەستێران ڕازاندەوە. خوای مەزن باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە خۆی ئاسمانی دنیای ڕازاندووەتەوە بۆ ئەو خەڵکەی سەر زەمین بە ئەستێرە بۆ ئەوەی سەیر بکەن‌و لێی ورد ببنەوە ﴿بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ﴾ بە ئیزافەو بەدەلیش (بالإضافة والبدل) خوێنراوەتەوە هەردووکیان یەك مانایان هەیە. ئەستێرە گەڕۆك‌و وەستاوەکان ئاسمان ڕووناك دەکەنەوە بۆ خەڵکی سەر زەمین وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾[3] واتە: سوێد بێت بێگومان ئاسمانی دنیامان ڕازاندووەتەوە بە چرای زۆر (ی ئەستێرە) وە گێڕاومانن بە ڕەجمی شەیتانەکان‌و ئامادەمان کردووە بۆ ئەوان (لە قیامەتدا) سزای ئاگری هەڵگیرساو. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾[4] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە دروستمان کردووە چەند بورجێك لە ئاسماندا ئەو (ئاسمانە)مان ڕازاندووەتەوە بۆ سەرنجدەران، وە ەو (ئاسمانە)مان پاراستووە لە هەموو شەیتانێکی دەرکراو لە بەزەیی خوا، مەگەر ئەوانەی کە بە دزیەوە گوێ دەگرن یەکسەر گڕو ئاگرێکی دیار دوای

---

[1] المعارج (٤٠).

[2] الرحمن (١٧).

[3] الملك (٥).

[4] الحجر (١٦ـ١٨).

دەکەوێتو ڕاوی دەنێت. لێرەشدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ﴾ واتە: لە هەموو شەیتانێکی نافەرمانیش پاراستمان. ﴿وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ﴾ واتە: پاراستوومانە لە هەموو شەیتانێکی بێ گوێی نافەرمان کە بە پەنهانی گوێ لە قسە دەگرێت گڕێکی ڕووناکو تیژ ڕاوی دەنێتو دەیسوتێنێت. بۆیە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ﴾ (ئیتر) لە بالآنشینان گوێ نەگرن لەوانەی سەرەوە (بالآنشینان) لە ئاسمانەکانن کە قسە دەکەن لەبارەی ئەو شتانەی کە خودا فەرمانیان پێ دەکات بۆ گەیاندنو بەجێهێنانی وەك لە پێشەوە باسکران لەو فەرمودانەدا کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا هێنامانن کەدەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمۡ قَالُواْ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمۡۖ قَالُواْ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾[1] واتە: هەتا کاتێك ترسو بیم لە دڵی (تکاکاران) لادەبرێت (بە هۆی ڕێگە پێدانی شەفاعەت) (بە یەکتر) دەڵێن: پەروەردگارتان چی بڕیارێکی فەرموو دەڵێن: وتە ڕاستەکەی فەرموو (کە ڕێگەدانە بە تکاکردن) وە تەنها (خوا) بەرزو بڵندو گەورەیە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُقۡذَفُونَ﴾ واتە: ڕاودەنرێن ﴿مِن كُلِّ جَانِبٖ﴾ واتە: لە هەر لایەکەوە بیانەوێت بە پەنهانی گوێ لە قسە بگرن لە ئاسماندا. ﴿دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ﴾ هەتا دووریان بخەنەوەو هەمیشەش ئازارییان هەیە. ﴿دُحُورٗا﴾ واتە: لێیان دەدرێتو کرۆ دەکرێن ڕێیان لێ دەگیرێتو دوور دەخرێنەوە بۆ ئەوەی نەگەنە ئەو شوێنەی کە بە پەنهانی گوێی تیادەگرن ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ﴾ واتە: لە ڕۆژی دوایشدا سزای بەردەوامو نەبڕاوەیان هەیە وەك خوای بالآدەست دەفەرمووێت: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾[2] واتە: ئامادەمان کردووە بۆ ئەوان (لە قیامەتدا) سزای ئاگری هەڵگیرساو. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ﴾ واتە: مەگین ئەوەی (هەر لە پڕ) شتێك برفێنێت ئەویش بڵێسەی گڕێك شوێنی دەکەوێت. ﴿إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ﴾ واتە: مەگەر ئەوەی لە پڕ شتێك برفێنێت لە شەیتانەکان بیدا بەوەی خواری خۆی ئەویش بیدا بە خواتری خۆی ئیتر لەوانەیە پێش ئەوەی ئەو شەیتانە بیدا بە خواری خۆی گڕێك شوێنی کەوێتو بیسوتێنێت. یان پێش ئەوەی گڕەکە پێی بگات بە قەدەری خوا بیگەیەنێت بە یەکێکی ترو ئەویش بیدا بەو فالچییەك وەك لە فەرموودەیەکی تردا لە پێشەوە باسمان کرد. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی:

---

[1] سبأ (۲۳).

[2] الملك (٥).

﴿ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴾ واتە: بلێسەیەکی ڕووناك دوای دەکەوێت. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: شەیتانەکان لە ئاسماندا چەند شوێنێکیان هەبووە گوێبیستی نیگا بوون‌و ئەستێرەکان نەگەڕاون بە گڕی ئاگر دوایان کەون لێیان بدرێت، وەختێك گوێیان لە نیگا بووە دابەزیون بۆ سەر زەمین هەر قسەیەك نۆ قسەیان لێ زیاد کردووە کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕەوانە کرا. ئەگەر شەیتانەکان بیانویستایە لە شوێنەکانی خۆیانەوە گوێ بگرن بلێسەی گڕێك شوێنیان دەکەوت‌و هەتا نەیسوتاندایە لە کۆڵی نەدەبووەوە. بۆیە چوونە لای شەیتان (لەعنەتی خوای لێ بێت) بۆیان باس کرد ئەویش وتی: حەتمەن شتێك ڕوویداوە، سەربازەکانی نارد، کاتێکیان زانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە پێوە نوێژ دەکات لە نێوان دووچیاکەی (نەخلە)دا و وەکیع ئەڵێ: واتە: ناوشیوی نەخلە. دەستبەجێ گەڕانەوە بۆ لای شەیتان هەواڵەکەیان دایەو شەیتان وتی: ئەمە ئەوەیە کە ڕوویداوە[1].

﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾ بَلۡ عَجِبۡتَ وَيَسۡخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا
ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ يَسۡتَسۡخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا
لَمَبۡعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾

## سەلماندنی ژیان پاش مردن

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴾ واتە: ساتۆ لەوانە بپرسە: ئاخۆ ئافراندنی ئەوان گرنگترە، یان ئەوانەی ئێمە وەدیمان هێناون؟ ئێمە ماکی ئەوانیشمان لە قوڕێکی (کزری) پێکەوەلکاو داڕژتووە. خوای گەورە دەفەرمووێت پرسیار لەوانە بکەن کە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە، ئایا دروستکردنی ئەوان گرنگترە یان دروستکردنی ئاسمانەکان‌و زەمین‌و ئەوانەی لە نێوانیاندایە لە فریشتەکان‌و شەیتانەکان‌و دروستکراوە گەورەکانی تر؟ ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) خوێندوویەتیەوە بە (أَمْ مَّنْ عَدَدْنا) لە باتی ﴿أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآ﴾ هەموو دانی پیادەنێن‌و دەڵێن کە ئەم دروستکراوانە گرنگترن لە ئەوان.[2] باشە کە ئاوەهایە بۆچی باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە؟ کە بە چاوی خۆیان دەبینن ئەم شتانە گەورەترن لەوەی کە ئەوان بڕوای پێ ناکەن وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ

---

[1] الطبري (١٢/٢١).

[2] الطبري (١٩/٢١).

وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1] بە ڕاستی بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە بەدیهێنانی خەڵکی بەڵام زۆربەی مەردوم ئەمە نازانن. پاشان ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوانە وەدی هاتوون لە شتێکی لاوازو دەفەرموێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴾، موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاك دەڵێن: لە قوڕێکی چاکی پێکەوەلکاو.[2] ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) و عیکریمە دەڵێن: قوڕێکی باش(ترشاو)، پاشان قەتادە دەڵێت: واتە: قوڕێك کە بە دەستەوە دەلکێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴾ واتە: تۆ لەوەدا سەیر ماوی ئەوان گاڵتەوگەپی خۆ دەکەن: واتە: تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) بە لاتەوە سەیرە کە ئەوانە باوەڕ ناهێنن و ئینکاری زیندووبوونەوە دەکەن، تۆش زۆرچاك بڕوات هەیە بەوەی کە خوای گەورە پێی گەیاندووی لەو کارە سەیرە کە زیندووبوونەوەی لاشەیە دوای لەناوچوون، پێچەوانەی ئەوانەی کە بڕوایان پێی نیەو ئەوەندە بێباوەڕن کە گاڵتەو گەپ دەکەن بەوەی کە تۆ بۆیان باس دەکەی لەو بارەیەوە. قەتادە دەڵێت: موحەممەد (ﷺ) سەیر ماوەو هەندێ سەرلێشێواوو گومڕایی نەوەی ئادەم گاڵتەوکەپ دەکەن.[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴾ واتە: ئەگەر نەسیحەتیش بکرێن، نەسیحەت لە گوێ ناگرن. واتە: سود لەو نەسیحەتە وەرناگرن، ﴿ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴾ واتە: هەر نیشانەیەك دەبینن دەخوازن گەمەی پێ بدرێت. ﴿ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً﴾ واتە: هەر نیشانەیەکی ئاشکراش بە چاو ببینن ﴿يَسْتَسْخِرُونَ ﴾ موجاهیدو قەتادە دەڵێن: گەمەی پێ دەکەن.[4] ﴿ وَقَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: دەڵێن ئەمە جادووەو هیچی تر نیە. واتە: دەڵێن ئەمەی کە تۆ پێی هاتووی مەگین بە ئاشکرا دیارە جادووە، ﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾ واتە: ئاخۆ ئێمە کە مردین و بووینە خۆڵ و چەند پێشەیەك دووبارە زیندوو دەکرێینەوە؟ ﴿ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴾ واتە: وێڕای باب و باپیرانمان. واتە: ئێمەو باب و باپیرانمانشیمان دوای ئەوەی کە مردین دیسان زیندوو دەکرێینەوە؟ بە دووری دەزانن و باوەڕ ناکەن، زیندوو دەکرێنەوە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴾ واتە: بڵێ: بەڵێ و ئێوە ملکەچ و زەبوونن. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: بەڵێ ئێوە زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژی

---

[1] الغافر (٥٧).

[2] القرطبي (١٥/٦٩)، الطبري (٢١/٢٢).

[3] الطبري (٢١/٢٣).

[4] الطبري (٢١/٢٤).

قیامەتدا دوای ئەوەی کە دەبن بە خۆڵ و ئێسك بە داماوی و زەبوونی و بێ نرخی لە ژێر دەسەڵاتی گەورەو بەهێزی خوای مەزندا، وەك دەفەرموێت: ﴿وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ﴾[1] واتە: وە هەموو بە ملکەچی و سەرشۆڕی دێنەوە لای خوا. وە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بە گەورە دەزانن کە بمپەرستن لەمەودا بەسەرشۆڕی دەچنە دۆزەخەوە. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ﴾ واتە: تەنها تێ ڕاخوڕینێکەو ئەوسا هەر خۆیان دەڕوانن. واتە: تەنها یەك بڕیارە لە لایەن خوای گەورەوە جارێك بانگ دەکرێن کە بێنە دەرەوە لەناو زەمیندا، دەستبەجێ هەڵدەسن و لەبەردەم خوای مەزندا سەیری ئەو کارەساتە گران و ناڕەحەتەی ڕۆژی قیامەت دەکەن، والله أعلم.

﴿وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾﴾

## ژیان و گوزەرانی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ واتە: دەڵێن: هەی ماڵ وێران خۆمان! ئەمە ڕۆژی قیامەتە. خوای مەزن باسی خوانەناسان دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك دەچنەوە بە خۆیاندا سەرزەنشت و لۆمەی خۆیان دەکەن و دانی پێدادەنێن کە چەندە ناهەقیان لە خۆیان کردووە لە ژیانی دنیادا. پەشیمانی دەردەبڕن کە ناڕەحەتی ڕۆژی قیامەت دەبینن بەڵام ئەو پەشیمانیە هیچ بەهرەیەکیان پێ نادات. ﴿وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ الدِّينِ﴾ واتە: فریشتەکان و خاوەن باوەڕان پێیان دەڵێن ﴿هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ﴾ واتە: بەڵێ ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە پاك و پیس جیادەکرێنەوە ئێوە بڕواتان نەدەکرد. ئەمەیان پێ دەڵێن بە تانەو تەشەرەوەو خودایش فەرمان دەدات بە فریشتەکان کە کۆیان بکەنەوەو خوانەناسان لە خاوەن باوەڕان جیا بکەنەوە بۆیە خوای گەورەفەرموویەتی: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ﴾ واتە: ئەوانە لێك کۆبکەنەوە کە ناهەقی پیشەبوون و جووتی ئەوان و ئەوانەشی کە دەیانپەرست. نوعمانی کوڕی بەشیر دەڵێت:

---

[1] النمل (٨٧).

[2] الغافر (٦٠).

مەبەست بە ﴿وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ هاووێنەو نموونەکانیان.[١] ئیبنو عەباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکریمەو موجاهیدو سودی‌و ئەبو سالح‌و ئەبو عالیەو زەیدی ئەسلەمیش هەر وایان وتووە.[٢] شەریك دەڵێت لە سیماکەوە و ئەویش لە نوعمانەوە دەڵێت: گوێم لە عومەر بوو دەیوت: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ واتە: هاووێنەیان. واتە: زیناکەرلەگەڵ زیناکەردا، سوخۆر لەگەڵ سوخۆرداو عارەق خۆر لەگەڵ عارەق خۆردا. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ واتە: هاوڕێکانیان. ﴿وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ﴾ ئەوانەش کە دەیانپەرست لە بت‌و شەریك کۆدەکرێنەوە لەگەڵیان لەو شوێنەی ئەواندا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: غەیری خودا ئەوسا ڕێگەی جەهەنەمیان پێ نیشان دەدەن. واتە: بەرەو جەهەنەم بەڕێیان بکەن ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗاۖ مَّأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرٗا﴾[٣] واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا حەشریان دەکەین بەسەر ڕووو دەم‌و چاویاندا کە کوێرو لاڵ‌و کەڕن شوێنی نیشتەجێیان دۆزەخە هەر جارێك (دۆزەخ) بڵێسەی بنیشێتەوە بڵێسەی ئاگرەکەیان بۆ زیاد دەکەین. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ﴾ واتە: ڕاشیان بگرن! دەبێت پرسیاریان لێ بکرێت. واتە: بیانوەستێنن هەتا پرسیاریان لێ دەکرێت چیان کردووەو چیان وتووە لە ژیانی دنیادا وەك زەححاك وتوویەتی لە ئیبنو عەباسەوە واتە: بیانگرن‌و بەندیان بکەن دەبێت موحاسەبە بکرێن. عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەڵێت: گوێم لە عوسمانی کوڕی زائیدە بوو دەیوت: یەکەم شتێك کە مرۆڤ پرسیاری لێ دەکرێت هاوەڵەکانیەتی، پاشان پێیان دەوترێت: بە شێوەی گاڵتەو سوکایەتی پێکردن: ﴿مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ واتە: چیتانە، بۆچی بە هانای یەکترەوە نایەن؟ واتە: خۆ ئێوە واتان دەزانی هەموو پێکەوەن‌و یەکرێزن‌و سەرکەوتوون. ﴿بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ﴾ واتە: ئەمڕۆ هەموو بێدەنگ‌و ملکەچ‌و وێستاون. واتە: کەچی ئێستا گوێڕایەڵی فەرمانی خودان‌و سەرپێچی ناکەن‌و سنوورەکانی نابەزێنن‌و لێی دەرناچن، والله أعلم.

[١] الطبري (٢١/٢٧).

[٢] الطبري (٢١/٢٧/٢٨).

[٣] الاسراء (٩٧).

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ بَل لَّمْ تَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍۭ ۖ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَـٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ ۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَـٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَـٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾﴾

## دژایەتی کردنی بتپەرستان بۆ یەکتری لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتە: هێندێ لەوان ڕوو لە هێنێکیان دەکەن‌و لێك دەپرسن. خوای مەزن باسی خوانەناسان دەکات کە لە گۆڕەپانی قیامەتدا سەرزەنشتی یەکتری دەکەن‌و کێشەیانەو یەکتری تاوانبار دەکەن لە قولآیەکانی ئاگر لە ناو جەهەنەمدا، ﴿فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ﴾[1] واتە: لاوازەکان دەڵێن بەوانەی خۆبەزلزان بوون: بە ڕاستی ئێمە شوێنکەوتووی ئێوە بووین دەی ئایا ئێوە لە جیاتی ئێمە لە ئەستۆی دەگرن بەشێك لەم ئاگرە، ئەوانەی خۆبەزلزان بوون‌و زۆرداربوون دەڵێن بە ڕاستی هەموومان لە ئاگرداین، بێگومان خودا لە نێوان بەندەکانیدا دادوەری کردووە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓا۟ أَنَحْنُ صَدَدْنَـٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَـٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾[2] واتە: خۆزگە دەتدی کاتێك ئەو ستەمکارانە ڕادەگیرێن لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا قسەو تاوان ئاراستەی یەکتر دەکەن لاوازو ژێردەستەکراوان دەڵێن بەوانەی خۆیان بە گەورە دەزانی: ئەگەر ئێوە نەبوونایە بێگومان ئێمە باوەڕدار دەبووین، ئەوانەی خۆیان بە گەورە دادەنا دەڵێن بەوانەی ژێردەستەو لاوازکرابوون: ئایا ئێمە بەرگریمان کردن لە ڕێنموونی دوای ئەوە بۆتان هات (نەخێر وا نیە) بەڵکو خۆتان تاوانباربوون، ژێردەستەو چەوساوەکان

---

[1] الغافر (٤٧ـ٤٨).

[2] سبأ (٣١ـ٣٣).

دەڵێن بەوانەی خۆبەزلزان بوون: (نەخێر وانیە) بەڵکو پیلانی (ئێوە) بە شەوو بە ڕۆژ (چەواشەی کردین) کاتێك فەرمانتان پێ دەداین کە بێباوەڕ بین بە خواو وێنەو هاوبەشانی بۆ دابنێین هەموویان پەشیمانی دەشارنەوە کاتێك کە سزای دۆزەخ دەبینن و زنجیرو تەوقمان کردە گەردنی بێباوەڕان، ئایا تۆڵەیان لێ دەسەنرێت جگە لەوەی دەیانکرد؟ هەر بەو شێوەیەش لێرەدا پێیان دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾ واتە: دەڵێن: بە ناوی خێرخوازی، ئێمەتان لە ڕێگە لادا. زەحاك دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: دەڵێن ئێوە ئێمەتان ئاوا لێکرد بە هۆی ئەو دەسەڵاتەوە کە بووتان بەسەرماندا چونکە ئێمە بێ دەسەڵاتو لاواز بووین و ئێوە خاوەن دەسەڵاتو زۆردار. قەتادە دەڵێت: مرۆڤەکان دەڵێن بە جنۆکەکان ئێوە بە ناوی خێرخوازیەوە ئێمەتان خەڵەتاند نەتانهێشتو هیواداریتان کردین. سودی دەڵێت: دەڵێن: ئێوە بە ناوی چاکەو چاکەخوازیەوە شتی پڕوپوچتان بۆ دەڕازاندینەوە دەبوونە لەمپەرو لە ڕێ لاتان دەداین.[1] ئیبنو زەید دەڵێت: واتە: دەبوونە لەمپەر لە نێوان ئێمەو ڕێی ڕاستداو لە ئیسلامو باوەڕ بە خواو کاری چاکەکردن پەشیمانتان دەکردینەوە کە فەرمانمان پێ کرابوو بیکەن.[2] ئەزیدی ڕەشك دەڵێت: واتە: بە ناوی یەکتاپەرستیەوە (لا إله الاّ الله) دەهاتنە لامان. ئەوەش کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ﴾ واتە: دەڵێن: نەخێر، هەر خۆتان بڕواتان نەبوو. سەرۆکی جنۆکەو مرۆڤەکان دەیانوت بەو کەسانەی کە شوێنیان کەوتبوون، بەو شێوەیە نیە ئێوە دەیلێن بەڵکو دڵتان پێوە نەبوو باوەڕ بێنن حەزتان لە بێ دینیو لە ڕێ لادان بوو، ﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ﴾ واتە: زۆرێکمان لەسەرتان نەبووە، بەڵکو خۆتان کۆمەڵێکی سەربزێو بوون. ﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ﴾ واتە: ئێمە هیچ بەڵگەیەکی ڕاستمان بە دەستەوە نەبوو لەسەر ئەو شتەی کە ئێوەمان بۆ بانگ دەکرد، ﴿بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ﴾ بەڵکو ئێوە خۆتان حەزتان لە سەرپێچیو لادان لە ڕێی حەق بوو. بۆیە وەڵامتان داینەوەو شوێنمان کەوتن و وازتان لە ڕێی ڕاست هێنا. کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) پێی هاتن و بەڵگەی زۆرو ڕاستیان هێنایەوە لەسەر ئەو ئاینەی کە بۆیان هێنابوون بە گوێتان نەکردن و شوێنیان نەکەوتن، ﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ ۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ﴾ واتە: وا گفتی پەروەردگارمان لەسەر ئێمە وەڕاست گەڕا، دیارە دەبێت بیشی چێژین. ﴿فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ﴾ واتە: ئێمە ئێوەمان گومڕا کرد خۆشمان هەر ئەوسا گومڕا بووین. خاوەن دەسەڵاتە

[1] الطبري (٢١/٣٢).

[2] الطبري (٢١/٣٢).

زۆردارەکان دەڵێن بە ژێردەستەو لاوازەکان خوای مەزن ڕاستی فەرموو کە ئێمە لە بەدبەختانین و دەبێت جەزرەبەیش بچەژن لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿فَأَغْوَيْنَٰكُمْ﴾ واتە: ئێوەمان بانگ کردو گومڕاشمان کردن ﴿إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ﴾ واتە: ئێمە خۆمان گومڕا بووین، بانگی ئێوەشمان کرد بۆ گومڕایی. وەڵامتان داینەوەو شوێنمان کەوتن. خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ﴾ هەموو ئەمانە (لەو ڕۆژەدا) بۆ جەزرەبەدان هاوبەشن. واتە: هەموو لەناو ئاگردا بوون هەر کەسەو بە پێی تاوانی خۆی. ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: ئێمە ئاوا سزای تاوانباران دەدەین. واتە: هەر لە دنیاشدا تۆڵە لە تاوانباران دەسێنین. ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴾ واتە: ئەگەر بەوانە دەوترا غەیری خودا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێت، خۆیان زۆر بە زل دەزانی. واتە: خۆیان بە زل دەزانی پێیانِ گران بوو وەك خاوەن باوەڕان بڵێن: (لا إله الاّ الله)، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (فەرمانم پێکراوە بچم بەگژ ئەو خەڵەدا هەتا دەڵێن: (لا إله إلاّ الله) هەرکەسێ وتی: (لا إله إلاّ الله) لە لای منەوە ماڵوگیانیان پارێزراوە مەگەر بە هەقی خۆی، حیسابیشی لە لای خوای گەورەیە.[1] خوای مەزن لە قورئانە پیرۆزەکەیدا باسی ئەو گەلانەی کردووە کە خۆیان بە زل زانیووە و ئایەتی ناردووەتە خوارەوە دەربارەیان کە دەفەرموویت: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ﴾ دەشیان درکاند: ئێمە بۆ شاعیرێکی شێت چۆن واز دێنین لەوانەی پەرستوومانن. واتە: ئێمە واز لە پەرستنی ئەو خودایانەو خوای باب و باپیرانمان دێنین بۆ قسەی ئەم شاعیرە شێتە؟ مەبەستیان پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) خوای گەورەش بۆ وەڵامدانەوەو بە درۆخستنەوەیان فەرموویەتی: ﴿بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: بەڵکو هەرچی ئەو هاوردی، هەمووی ڕاستەو بڕواشی کردووە بە پێغەمبەرانی خودا. ﴿بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەرچی هێناوە لە بەرنامەی خودا لە هەواڵ یان داواکاری هەمووی ڕاستەقینەیە، ﴿وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: بڕوای کردووە بەو پێغەمبەرانەی کە باسی ئەو ڕەوشتە چاکانەو ئەو بەرنامە ڕێکوپێکانەی ئەویان کردووەو باسی ئەو بەرنامەو فەرمانەی خواشی کردووە کە پێی سپاردووە وەك چۆن ئەوان

[1] مسلم (٥٢/١).

باسیان کردووە. ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ﴾[1] واتە: ئەوانەی کە بە تۆی دەڵێن، بە پێغەمبەرەکانی پێش تۆش هەر وتراوە.

﴿إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾﴾

## پاداشتی بتپەرستان و بەندە ڕاست و پاکەکان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ﴾ واتە: ئێوە بێ شک ئازاری بە ژان دەچێژن. خوای گەورە ڕووی قسەکانی دەکاتە ئادەمیزادو دەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ هەر لە باتی کاری خۆتان سزا دەدرێن. پاشان بەندە چاک و پاکەکانی جیاکردووەتەوە. وەک فەرموویەتی: ﴿وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾[2] واتە: سوێند بە کات، بێگومان هەموو خەڵکی لە زیاندایە، مەگەر ئەوانەی کە بڕوایان هێنابێت و کردەوە چاکەکانیان کردبێت. وە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئینسانمان دروست کرد لە جوانترین شێوەدا، لە پاشان (ئەگەر بێباوەڕ بێت) دەیکەین بە پەستترینی هەموو پەستێک، مەگەر ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە. وە فەرموویەتی: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴾[4] واتە: کەس نیە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا (ئەو تێپەڕینە) بڕیارێکی براوەیە لە پەروەردگارتەوە، دواتر ئەوانە ڕزگار دەکەین خواناس و پارێزگار بوون و ستەمکاران بە چۆکاهاتوویی

[1] فصلت (٤٣).

[2] العصر (١-٣).

[3] التين (٤-٦).

[4] المدثر (٣٨-٣٩).

لەناو (دۆزەخ)دا دەهێڵینەوە. وە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ۝٣٨ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ﴾[1] واتە: هەموو کەسێك بارمتەی کردەوەی خۆیەتی، مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست (چاکەکاران). بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ مەگین عەبدە ڕاستو پاکەکانی خودا. واتە: بەندە پاكو ڕاستەکان ئەو ئازارە بە ژانە ناچەژنو لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا پرسیاریان لێ ناکرێت بەڵکو چاوپۆشی لە تاوانەکانیان دەکرێت ئەگەر تاوانیان هەبوو وە پاداشتی چاکەکانیشیان یەك بە دە چاکە وەردەگرن هەتا یەك بە حەوت سەد چاکەو زیاتریش هەتا خودا حەز لە زیادکردنی بکات. وە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ﴾ بژێوی باش بۆ ئەوان دیاریکراوە. قەتادەو سودی دەڵێن: واتە: بەهەشت.[2] پاشان باسی ژیانیان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾ واتە: میوەجاتەو زۆریشیان ڕێز لێ دەگیرێت. واتە: میوەی هەمەڕەنگ لایانەو زۆریش ڕێزیان لێ دەگیرێتو خۆشگوزەرانن و ژیان زۆر بە خۆشی دەبەنەسەر ﴿فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ واتە: لە باغاتی بڕ لە هەموو خێرو بێرێك. ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ واتە: لە بەرامبەر یەك لەسەر تەختدان دادەنیشن. موجاهید دەڵێت: سەیری پشتملی یەکتری ناکەن.[3] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ لەو بادەیەی کە لە چاوەی ڕەوان ڕادێت پیاڵەیان پێدا دەگێڕن. ﴿بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ واتە: زۆر سپیەو بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە بە لەزەتە. ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ واتە: هیچ سەرئێشەی تێدا نیەو ئاوەزیشیان لەبەر مەستی لە دەست نادەن. وەك خوای خاوەن دەسەڵات لە ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ۝١٧ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ۝١٨ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾[4] واتە: تازە لاوی هەمیشەیی بەسەریاندا دەگەڕێن، پەرداخو سوراحیو گەلاسی پڕ لە شەرابی سەرچاوەی ڕەوان، نە سەریان پێی دێشێت نە سەرخۆش دەبن پێی. خوای مەزن بادەی بەهەشتی پاكو جیاکردووەتەوە لە بادەی دنیا کە سەرئێشەو ناوسك ئێشەی تیانیەو عەقڵیشیان بە هۆی سەرخۆشیەوە لە دەست نادەن بۆیە ئا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ واتە: بادەیەك لە چەند ڕووباری بەردەوام ڕۆیشتوو کەترسیان نیە وشك بکات یان تەواو ببێت. مالك لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەڵێت: بادەیەکی سپی

---

[1] مريم (٧١ـ٧٢).

[2] القرطبي (٢١/٧٧).

[3] الطبري (٢١/٣٨).

[4] الواقعة (١٧ـ١٩).

بە بەردەوام ڕۆیشتووە ڕەنگێکی درەوشاوەو جوان‌و دڵگیر نەك وەك بادەی (عارەقی) دنیا لە شێوە ناشیرین‌و پیس‌و خراپیدا سورو ڕەش‌و لیڵ‌و زەرد هەڵگەڕابێت کە مرۆڤی سروشت پاك بێزی لێ دەکاتەوە. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾ واتە: تامی خۆشەو ڕەنگی جوانەو تامی خۆشیش نیشانەیە لەسەر بۆن خۆشی. بە پێچەوانەی بادەی دنیاوە لە هەموو ئەو ڕوانەوە کە باسمانکردن. وە دەفەرموویت: ﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ﴾ واتە: نابێتە هۆی (غەول) دروستکردن، واتە: سك ئێشە. ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو قەتادەو ئیبنو زەید وایان وتووە.[1] وەك بادەی دنیا کە پێچ دێنێت بە سکداو بای پێدەکات لەبەر زۆری ئاوەکەی. وە دەفەرموویت: ﴿وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ﴾ موجاهید دەڵێت: ئاوەزیان لە دەست نادەن.[2] ئیبنو عەباس‌و محمدی کوڕی کەعب‌و حەسەن‌و عەتای کوڕی ئەبو موسلمی خۆراسانی‌و سودی و کەسانی تریش هەر وایان وتووە. زەححاك دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە لە بادەدا چوار تایبەتمەندی هەیە مەستی‌و سەرئێشەو ڕشانەوەو میزکردن.[3] خوای گەورە باسی بادەی بەهەشتی کردووە کە پاکەو ئەم شتانەی تێدا نیە، وەك لە سورەتی(الصافات)دا باسی کردووە. وە دەفەرموویت: ﴿وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ﴾ واتە: ژنگەلێکی چاو گەورەیان لە لا هەیە، لە ڕووی نامۆدا چاو دادەخەن. واتە: ژنانێکی داوێن پاکیان لایە جگە لە مێردەکانیان ناڕوانن بۆ کەسی ترو سەیری ناکەن، ئیبنو عەباس‌و موجاهیدو زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و قەتادەو سودی‌و کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[4] خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿عِينٌ﴾ واتە: چاوجوانەکان، وتراویشە: واتە: چاو گەورەکان. چاو جوان شیاوترە. وەسف کراون بە چاو جوان‌و داوێن پاك بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ لووس‌و پاکژ وەکو هێلکەی ناو هێلانە. وەسفی بەژن‌و باڵای کردوون بە چاکترین شێوە کە زۆر ناسك‌و دڵگیرن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت:: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ واتە: مرواری ناو سەدەف.[5] حەسەن دەڵێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ﴾ واتە: پاك‌و خاوێن‌و پارێزراو دەستیان لێ نەکەوتووە. سودی دەڵێت: وەك هێلکەی ناو هێلانە. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ

---

[1] الطبري (٣٥/٢١).
[2] الطبري (٤٠/٢١).
[3] القرطبي (٧٩/٢١).
[4] الطبري (٤١/٢١/٤٢).
[5] الطبري (٤٣/٢١).

مَّكۡنُونٞ﴾ واتە: وەك ناوی هێلكە. عەتای خۆراسانی دەڵێت: وەك توێكڵە تەنكەكەی نێوان توێكڵی هێلكەو ناوەكەی. سودی دەڵێت: ﴿كَأَنَّهُنَّ بَيۡضٞ مَّكۡنُونٞ﴾ وەك سپێنەی هێلكە كاتێك كە توێكڵی لێ دەكەیتەوە. ئیبنو جەریریش هەمان مانای كردووە چونكە توێكڵی هێلكە باڵی باڵندەو هێلانەكەی و دەستی بەردەكەوێت بە پێچەوانەی ناوەكەی دەستی بەرناكەوێت، والله أعلم.

﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٞ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾
أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ
تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحۡنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوۡتَتَنَا ٱلۡأُولَىٰ
وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثۡلِ هَٰذَا فَلۡيَعۡمَلِ ٱلۡعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾﴾

### كۆبوونەوەی خەڵكی بەهەشت و وتووێژی یەكێكیان لەگەڵ هاوەڵێكی لە دنیادا كە لە جەهەنەمدایە و ئەم سوپاسی خوا دەكات لەسەر ئەو چاكەیەی لەگەڵی كردووە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ﴾ واتە: بۆ وتووێژ ڕوویان دەكەنە یەكتری. خوای گەورە باسی ئەهلی بەهەشت دەكات كە ڕوو دەكەنە یەكتری باسی ژیانی دنیا دەكەن كە چۆنیان بەسەر بردووەو چیان بەسەرهاتووە چیان خواردووەو خواردووەتەوە كاتێك كە دانیشتوون. ئێستاش لەسەر قەنەفە ڕووبەڕوو دانیشتوون و خزمەتكار لەبەر دەستیاندایەو دێت و دەچێت هەر شتێك چاك و خۆش بێت لە خواردن و خواردنەوەو جلوبەرگی جوان زۆر شتی تریش كە نە چاو بینیویەتی و نە گوێ بیستوویەتی و نە بە خەیاڵیش بە دڵی كەسدا هاتووە بۆیان دێنن، ئا لەو كاتەدا خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٞ﴾ واتە: یەكێك لەو ناوەدا دەڵێت: من هاوەڵێكم هەبوو. عەوفی دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەو كەسەی كە دەڵێت من هاوەڵێكم هەبوو پیاوێكی بتپەرستە كە هاوەڵێكی خاوەن باوەڕی هەبووە لە ژیانی دنیادا.[1]

﴿يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُصَدِّقِينَ﴾ واتە: لێی دەپرسیم: تۆش لەوانەی كە باوەڕیان بە خودا هەیە. واتە: ئایا تۆ لەو كەسانەی كە بڕوایان بە زیندووبوونەوەو كۆبوونەوەو لێپرسینەوەو پاداشت هەیە؟ واتە: ئەم قسانە دەكات، بە لایەوە سەیرەو باوەڕی پێی نیەو زۆر بە دووری دەزانێ ئەوەندە بێ دین و كەللە ڕەقە. دەڵێت: ﴿أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾ واتە: ئاخۆ ئەگەر ئێمە مردین، بووینە خاك و چەند ئێسكێك هەر حیسابمان لەگەڵ دەكەن؟ واتە: ئەگەر ئێمە مردین و بووینە خۆڵ و پێشە ئایا لێمان

---

[1] الطبري (٢١/٤٥).

دەپرسنەوە؟ موجاهیدو سودی وتوویانە.[١] ئیبنو عەباس‌و موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی دەڵێن: ئایا تۆڵەمان لێ دەسێنرێت لەسەر کارو کردەوەکانمان.[٢] هەردوو قسەکە ڕاستن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ﴾ پرسی: ئاخۆ هیچ ئاگایەکتان لێ هەیە؟ واتە: خاوەن باوەڕەکە دەپرسێت لە هاوەڵەکانی لە ئەهلی بەهەشت ئاخۆ ئێوە هیچ هەواڵێکتان لێی هەیە؟ ﴿فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ﴾ واتە: ئەوسا خۆشی چاوی دەگێڕێت و لە ناوەڕاستی جەهەنەمدا دەیبینێ. ئیبنو عەباس‌و (ڕەزای خوای لێ بێت) سەعیدی کوڕی جوبەیرو خولەیدی عەسەری‌و قەتادەو سودی‌و عەتای خۆراسانی دەڵێن: واتە: ناوەڕاستی جەهەنەم.[٣] حەسەنی بەسری دەڵێت: لە ناوەڕاستی جەهەنەمدا وەك چلۆسك دەگڕێ‌و داگیرساوە.[٤] ﴿قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ﴾ واتە: وتی: بە خوا هەر وەخت بوو لە بەینم بەری. واتە: خاوەن باوەڕەکە دەڵێت بە خوانەناسەکە: بە خوا ئەگەر بە گوێم بکردیتایە لە ناوت دەدام. ﴿وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ﴾ واتە: ئەگەر چاکەی پەروەردگاری من نەبووایە، ئێستا منیش لە لای تۆ بووم. واتە: ئەگەر سۆزو بەزەیی خودا نەبووایە منیش ئێستا وەك تۆ وابووم‌و لە ناوەڕاستی جەهەنەمدا پێکەوە جەزرەبە دەدراین. بەڵام خوای گەورە چاکەی لەگەڵ کردم‌و بەزەیی پێمدا هاتەوەو ڕێگای نیشاندام‌و خستمیە سەر ڕێی یەکتاپەرستی. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ﴾[٥] واتە: کە ئێمە هەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین ئەگەر خودا ڕێنموونی نەکردینایە. وە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾ واتە: ئایا وایە کەئێمە هەریەکجاردەمرین کە مردنی یەکەمجارە و هیچ ئازاردانیشمان نیە پاش ئەو مردنە. ئەمە قسەی خاوەن باوەڕەکەیە کە زۆر دڵخۆشە بەوەی کە خودا پێی بەخشیوە لە ژیانی هەتاهەتایی لە بەهەشتدا کە مردن‌و سزای تێدا نیە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ واتە: کە ئەمەش بەختەوەریەکی زۆر مەزنە. حەسەنی بەسری دەڵێت: زانیویەتی کە هەموو خۆشیەك مردن کۆتایی پێ دێنێت‌و دیبڕێت بۆیە دەڵێت ﴿أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾

---

[١] الطبري (٢١/٤٧).
[٢] الطبري (٢١/٤٧).
[٣] الطبري (٢١/٤٨).
[٤] الطبري (٢١/٤٨).
[٥] الاعراف (٤٣).

ئەڵێن: نەخێر، ئەوانیش دەڵێن: ﴿إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾[1] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِمِثْلِ هَـٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَـٰمِلُونَ﴾ واتە: دەشێت بۆ پاداشت وەها خەبات بکەن، ئەو کەسانەی خەباتکارن. ئیبنو جەریر دەڵێت: ئەمە قسەی خوای گەورەیە، واتە: دەبێت بۆ ئەم بەهرەیەو ئەم بەختەوەریە زۆر مەزنە هەوڵ بدەن ئەو کەسانەی کە تێکۆشەرن لە ژیانی دنیادا هەتا دەگەنە ئەو بەهەشتە لە ڕۆژی دوایدا.[2]

## چیرۆکی دوو پیاوەکەی نەوەی ئیسرائیل

باسی ژیانی دوو پیاو لە نەوەی ئیسرائیل کراوە کە لە کاسپیدا (مامەڵەدا) شەریك بوون کە دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەیانگرێتەوە. ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر لە فوراتی کوڕی سەعلەبەی نەهرانیەوە ڕیوایەتی کردووە لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ﴾ واتە: من هاوەڵێکم هەبووە. دەڵێت: دوو پیاو شەریك بوون‌و هەشت هەزار دیناریان کۆکردەوە یەکێکیان خاوەن پیشە بوو، ئەوی تریان هیچ پیشەیەکی نەدەزانی. ئەوەیان کە خاوەن پیشە بوو وتی بە شەریکەکەی تۆ هیچ پیشە نازانی، ناچارم لێت جیا ببمەوەو پارەکە بەش بکەین. بەشی کردو جیابووەوە لێی، پاشان پیاوەکە خانوویەکی کڕی بە هەزار دینار،ماڵی پادشایەك بوو مردبوو هاوەڵەکەی بانگ کرد پێی وت: ئایا ئەمە چۆن خانوویەکە کڕیومە بە هەزار دینار؟ هاوەڵەکەی وتی: چ خانوویەکی چاکە، کاتێك ڕۆیشتەدەرەوە وتی: ئەی خودایە ئەم هاوەڵەم ئەم خانووەی کڕیوە بە هەزار دیناروو منیش داوای خانوویەکت لێ دەکەم لە خانووەکانی بەهەشت، جا هەزار دیناری کرد بە خێرو بەخشی، پاش ماوەیەك خودا دەزانێ چەندە مایەوە دوای ئەوە ژنێکی هێنا بە هەزار دیناروو بانگی هاوەڵەکەی کردو داوەتێکی بۆ کرد (خواردنێکی بۆ دروست کرد)، کاتێك هات وتی: من ئەم ژنەم مارە کردووە بە هەزار دینار، ئەمیش وتی: چ ئافرەتێکی چاکە، کاتێك کە چووە دەرەوە، وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم هاوەڵەم ژنێکی مارە کردووە بە هەزار دینار، من داوای ئافرەتێکت لێ دەکەم لە سپیە چاو جوانەکانی بەهەشت، جا هەزار دیناری کرد بە خێرو بەخشی. پاشان ماوەیەکی تری پێ چوو کە خوا دەزانێ، دوای ئەمانە دوو باغی کڕی بە دوو هەزار دینار دیسان هاوەڵەکەی بانگ کردو نیشانیداو وتی: من ئەم دوو باغەم کڕیووە بە دوو هەزار دینار، هاوەڵەکەی وتی: چەندە باغێکی چاکن، وەختێك کە ڕۆیشت وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم هاوەڵەم ئەم دوو باغەی کڕی بە دوو هەزار دینار، من داوای دوو باغت لێ دەکەم لە بەهەشتدا، دوو هەزار دیناری کرد بە خێرو لە ڕێی خودا بەخشی، پاشان فریشتەی گیان کێشان هات بۆیان‌و گیانی کێشان‌و پاشان پیاوە خێرخوازەکەیان بردو خستیانە ناو ماڵێکەوە زۆر بە لایەوە سەیر

---

[1] الدر المنثور (٧/٩٥).

[2] الطبري (٢١/٥٢).

بوو هەر لەو کاتـەدا ژنێك خۆی نیشاندا لـە جوانیـدا بـەژن‌و بـاڵای (هـەموو گیـانی) لـە ژێـر پۆشـامدا دەدرەوشایەوە، پاشان بردیانە ناو دوو باغ و شتی تریکی تریش کەهەر خوا ئەزانێ چۆنە، لەوێدا وتـی: ئەمە زۆر لە کاری ئەو پیاوە دەچێت کە ئاواو ئاوای کرد. وتی: ئەمە هەر ئەوەیـەو ئـەم ماڵـەیش‌و ئـەم دوو باغەو ئەم ژنەش بۆ تۆیە. پیاوەکە وتی: بە ڕاستی من هاوەڵێکم هەبوو دەیوت: ئایا تۆش لەوانەی کە باوەڕیان بە خودا هەیە؟ پێیان وت: ئەو هاوەڵەت ئێستا لە ناوەڕاستی جەهەنەمدایـە. وتـی: ئـاخۆ ئێوە ئاگاتان لێیەتی؟ ئەمیش چاوی گێڕا لـە ناوەڕاسـتی جەهەنەمـدا بینـی. ئا لەوێـدا وتـی: ﴿تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ﴾[1].

﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءَهُمْ ضَالِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰ آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾﴾

**باسی داری ژەقنەمووت‌و ئەوانەی لە جێی خواردن بەری ئەوداره دەخۆن**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ﴾ واتە: ئاخۆ ئـەم میوانداریيـە باشترە- یاخۆ دارەکەی ژەقنەمووت؟ خوای گەورە دەفەرمووێت ئایا ئەو بەهرەو چاکانەی بەهەشت باشترە کە پڕە لە خواردن‌و خواردنەوەو ژیان بردنەسەر بە خۆشی‌و ژنی جوان‌و زۆر شتی تریش لەگەڵ میوانـداری لێکردن‌و ڕێزلێنـان یان ئـەو داری ژەقنەمووتـە کە لـەناو جەهەنەمدایـە، مەبەست بەودرەختـە جـۆری دارێکە کە پێی دەوترێت: ﴿الزَّقُّومِ﴾ وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾[2] واتە: هەروەها (ڕواندوومانە) جۆرە دارێك (زەیتون) کە لە توری سینا دەڕوێت کە ڕۆن‌و پێخۆرێك دەگرێت بۆ ئەوانـەی دەیخۆن. مەبەسـت بەمـە داری زەیتونـە. وەك ئەم ئایەتـەش کـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾[3] واتـە: پاشـان ئێـوە ئـەی گومڕایـانی بێبـاوەڕان، بێگومـان لـە (بـەری) درەختـی ژەقنـەمووت (دەخۆن). وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ﴾ واتە: ئەوەمان کردووەتە بەڵایەك، بۆ گـرۆی ناهەقیکاران. قەتادە دەڵێت کە باسی داری زەقنەمووت ئەو خەڵکە گومڕایە تووشی بەڵاو تاقیکردنـەوە

---

[1] الطبري (٢١/٤٥).

[2] المؤمنون (٢٠).

[3] الواقعة (٥١-٥٢).

بوون و دەیانوت: هاوەڵەکەتان هەواڵتان دەداتێ کە لەناو ئاگردا درەخت هەیە، کەچی ئاگر دار دەسوتێنێت، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِيٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئەوە دارێکە لە ناوەڕاست و تەختی دۆزەخەوە دێتەدەرێ. خۆراکی لەناو ئاگرەوە وەردەگرێت و لە ئاگریش دروست کراوە.[1] موجاهید دەڵێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ﴾ ئەبو جەهل لەعنەتی خوای لێ بێت وتی: زەقنەمووت واتە: خورماو زەیت من دەیخۆم.[2] من دەڵێم مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) هەواڵی داری ژەقنەمووتمان دایتێ تاقی کردنەوەیەك بوو خەڵكمان پێ تاقی کردەوە بۆ ئەوەی دەردەکەوێت کێیان باوەڕ دەکاتو کێشیان باوەڕ ناکات. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەیترە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيْنَٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِي ٱلْقُرْءَانِ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَٰنًا كَبِيرًا﴾[3] واتە: کاتێك پێیان وتی بە ڕاستی پەروەردگارت دەوری هەموو خەڵكی داوە (دەسەڵاتی هەیە بەسەریاندا) وە ئەو خەو بینینەی کە پێشانی تۆماندا (لەو شەوڕەوییەدا) هەر لەبەر تاقی کردنەوەی خەڵكی بوو هەروەها ئەو درەختە نەفرین لێکراوەش لە قورئاندا باسمان کردووەو ئێمە (بەو بەڵگانە) ئەوانە دەترسێنین کەچی ئەو ترساندنە هیچیان بۆ زیاد ناکات جگە لە یاخیبوونو سەرکەشی. واتە: خەونێکیش کە پێمان دیتیو ئەو دارە نەعلەتیە کە لە قورئاندا باس کراوە، هەموو بۆ تاقیکردنەوەی خەڵكی بوو. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِيٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: لە ناوەڕاستی جەهەنەم ئاگر دەڕوێتو سەوز دەبێت، ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ واتە: بەرێك دەدات لە بیچمی کەللە سەرانی شەیتانەکان. لە ناشیرینیو بەدتەشکیو خراپیدا کە باس دەکرێت. خوای گەورەش بۆیە نموونەی بە کەللە سەری شەیتانەکان ﴿رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾ هێناوەتەوە هەرچەندە نەناسراوە لە لای خەڵكی بەڵام لە ئەندێشەی هەموو کەسێکدا ئەوە هەیە کە شەیتان شتێکی ناشیرین و ناحەزە. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّهُمْ لَأَكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾ واتە: دۆزەخیەکان لەو دەخۆنو ورگیانی (پێ پڕ دەکەن). خودای گەورە دەفەرمووێت ئەو جەهەنەمیانە سکیان لەو زەژنەمووتە پڕدەکەن کە خواردنی لەوە خراپترو ناشیرینتر نیەو تامو بۆنێکی پیسی هەیەو ناچارن هەر دەبێت لێی بخۆن جگە لەوە هیچ خواردنێکیان دەست

---

[1] الطبري (٢١/٥٢).

[2] الطبري (٢١/٥٣).

[3] الاسراء (٦٠).

ناکەوێت. خوای گەورە هەر لەم مانایەدا لە ئایەتی تدا فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ﴾[1] واتە: خۆراکیان هەر درکی حوشترخۆر (ی ئاگرین)ە، نە قەڵەوی دەدات نە برسێتی لا دەبات. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾ واتە: پاشان لەسەر ئەو خواردنە لیخناوێکی (لێڵاوێکی) هەرە گەرم دەخۆنەوە، ئیبنو عەباس دەڵێت: خواردنەوەی ئاوەکوڵ بەسەر زەقنەمووتدا.[2] وە لە ڕیوایەتێکی تری ئیبنو عەباسدا هاتووە دەڵێت: ﴿لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ﴾ واتە: زەقنەمووتی تێکەڵاو بە ئاوەکوڵەو بە چڵکاو.[3] کەسانی تریش وتوویانە: واتە: لێخناویان بۆ تێکەڵ دەکەن لەگەڵ ئەو کێمو زوخانەی کە لە چاوو شوێنی میزیانەوە دێتە دەرەوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: کاتێك خەڵکی ناو ئاگر برسیان دەبێت. داوای داری زەقنەمووت دەکەن دەستبەجێ پێستی دەمو چاویان دادەڕزێتو دەوەرێت خۆ ئەگەر کەسێك بە لایاندا بڕوات بەو دومەڵانەدا کە کێمی لێ دێت دەیانناسێت، پاشان تینوویان دەبێت داوای ئاو دەکەن، ئاوەکوڵێکیان دەدەنێ ئەوەندە گەرمە کە نزیکی دەکەنەوە لە دەمیان گۆشتی دەمو چاویان دەبرژێنێتو پێستەکەی دەکەوێتە خوارەوە، هەرچیش لەناو سکیاندایە دەتوێتەوە ڕیخۆڵەکانیان دێتە دەرەوە لەگەڵ پێستی دەمو چاویاندا. دەکەونە خوار. بە ئاسن لێیان دەدرێت هەر پارچەیەکی بە لایەکدا دەکەوێت هاوار دەکات کە بمرێتو نەمێنێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ﴾ واتە: پاشان گەڕانەوەیان بۆ ناو دۆزەخە. واتە: چارەنووسیان دوای جیاکردنەوە بۆ ناو ئاگری بڵێسەدارو جەهەنەمی هەڵگیرساو کڵپەدارە. وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ﴾[4] واتە: هاتوچۆ دەکەن لە نێوان ئەو (دۆزەخە)و ئاوی زۆر گەرمدا. هەر بەم شێوەیە قەتادە کاتێك ئەم ئایەتەی خوێندەوە ئەم ئایەتەیشی لەگەڵدا خوێندەوە[5]. ئەم تەفسیرە چاكو بەهێزە. سودی دەڵێت: عەبدوڵلا ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە خوێندووەتەوە: (ثم إنَّ مقيلَهم لَإلى الجَحيم) یانی لەناو جەهەنەمدا قەیلولە ئەکەن، هەروەها عەبدوڵلا دەڵێت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژ نیوە نابێت لە ڕۆژی قیامەتدا هەتا ئەهلی

---

[1] الغاشية (٦ـ٧).

[2] الطبري (٢١/٥٥).

[3] الطبري (٢١/٥٢).

[4] الرحمن (٤٤).

[5] الطبري (٢١/٥٦).

بەهەشت نەچنە شوێنی خۆیان لە بەهەشتداو ئەهلی جەهەنەمیش نەچنە ئاو ئاگر پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا﴾[1] واتە: بەهەشتیەکان لەو ڕۆژەدا لە چاکترین جێگادان و لە باشترین شوێنی حەسانەوە (ی نیوەڕوان) دان.[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُمۡ أَلۡفَوۡاْ ءَابَآءَهُمۡ ضَآلِّينَ﴾ واتە: ئەوان دیتیان کە باب و باپیرانیان گومڕان. واتە: باب و باپیرانیان گومڕابوون هەر ئەوە بووە هۆی ئەوە کە شوێنیان بکەون و بە ڕێی ئەواندا بڕۆن بەبێ هیچ بەڵگەیەك، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَهُمۡ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ يُهۡرَعُونَ﴾ واتە: بۆیە وا (بە هەڵەداوان) بە شوێنی ئەواندا پەلە دەبن. موجاهید دەڵێت ﴿يُهۡرَعُونَ﴾ واتە: وەك (هەروەلە) و بە پەلە ڕۆیشتن وایە[3].

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: ﴿يُهۡرَعُونَ﴾ واتە: خۆیان گێل دەکەن.

﴿وَلَقَدۡ ضَلَّ قَبۡلَهُمۡ أَكۡثَرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٧٤﴾﴾

خوای گەورە باسی گەلە پێشووەکان دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ ضَلَّ قَبۡلَهُمۡ أَكۡثَرُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ واتە: بەر لەوانیش زۆربەی زۆری پێشینەکانیان گومڕابوون. واتە: ئەوەندە سەرلێشێواو بوون شتی تریان لەگەڵ خودا پەرستووە و کردوویانە بە هاوەڵی خودا. پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە زۆرێك لە پێغەمبەرانی بۆ ناردوون (سەلامی خوایان لێ بێت) کە ئەو کەسانەی خوایان نەناسیووە و هاوەڵیان بۆ داناوە بیانترسێنێت لە سزاو تۆڵەی گرانی خودا. دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ﴾ واتە: زۆریشمان ترس وەبەرهێن نارده ناویان. کەچی ئەوان هەر لەسەر گومڕایی خۆیان بەردەوام بوون و شوێنی پێغەمبەرەکانیان نەکەوتن و باوەڕیان پێ نەهێنان هەتا خودا قڕی کردن و خاوەن باوەڕانی ڕزگار کردو یارمەتی دان و سەری خستن بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ﴾ واتە: دە بڕوانە (لە دواجارا) ئەوانەی ترسێنران چیان بەسەرهات.

﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ واتە: جیا لەوانەی بە دڵپاکی خوایان پەرست.

---

[1] الفرقان (٢٤).

[2] الطبري (٢١/٥٦).

[3] الطبري (٢١/٥٧).

﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾

### باسی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێ بێت) و گەلەکەی

کاتێك خوای گەورە باسی زۆرێك لە گەلە پێشووەکانی کرد کە گومڕا بوون و لە ڕێگەی ڕاست لایاندا لێرەدا باسی ئەو گەلانە دەکات بە درێژی لە پێغەمبەر نوحەوە (سەلامی خوای لێ بێت) دەست پێدەکات کە تووشی چەند ناڕەحەتی بووە بە دەست گەلەکەیەوە و کەسێکی زۆر کەم نەبێت بڕوایان پێ نەکردووە، لەگەڵ ئەو ژیانەزۆرەی لەگەڵیاندا گوزەراندی کە بریتیبوو لە نۆسەدو پەنجا ساڵ، کە ئەو ماوە زۆرەی لەگەڵدا بەسەربردن و ئەوان هەر خراپتر دەبوون، پاڕایەوە لە خوا مەزن و فەرمووی من سەرکەوتووە نەبووم خودایە پەنام گرتووە بەتۆ یارمەتیم بدە. کاتێك کە نوح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) دلگران و تووڕە بوو لە هۆزەکەی خودایش لێیان تووڕە بوو بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴾ واتە: نوحیش هاواری بۆ هێناین، زۆر باشی فریای کەوتین. یانی: زۆر چاك وەڵاممان دایەوە، ﴿وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە: خۆی و کەس و کارەکەیمان لە خەمی گەورە ڕزگار کرد. واتە: لە ئەزیەتدان و باوەڕ پێنەکردنی ڕزگارکرد، ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ واتە: تەنها بەرەو تۆرمەی ئەومان هێشتەوە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: هیچ کەسێك نەما تەنها نەوەو تۆرمەی نوح مایەوە (سەلامی خوای لێ بێت).[1] سەعیدی کوڕی ئەبو عورووبە دەڵێت: لە قەتادەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ دەڵێت: هەموو خەڵکی لە بەرەو تۆرمەی نوحە (سەلامی خوای لێ بێت).[2] تیرمزی و ئیبنو جەریرو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە لە سەمورەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەم ئایەتەدا: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ﴾ فەرموویەتی: (بریتین لە)سام و حام و یافیس[3]. ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لە سەمورەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] الطبري (٢١/٥٩).

[2] الطبري (٢١/٥٩).

[3] تحفة الأحوذي (٥/٣٦٥)، الطبري (٢١/٥٩).

فەرموویەتی: (سام باوکی عەرەبەکانەو حام باوکی حەبەشەکانەو یافسیش باوکی ڕۆمەکانە).[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووە.[2] مەبەست بە ڕۆم لێرەدا، ڕۆمە پێشووەکانە کە بریتیە لە ئەو یۆنانیانەی کە لە نەوەی ڕۆمای کوڕی لیتی کوڕی یۆنانی کوڕی یافسی کوڕی نوح (سەلامی خوای لێ بێت). خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ واتە: وامان کرد بەرەی دوای ئەویش هەر ناوی بە چاکە بەرن. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: واتە: بە چاکە ناوی بەرن.[3] موجاهید دەڵێت: واتە: شایەنی ڕێزو ستایشە لە لای هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت).[4] قەتادەو سودی دەڵێن: خوای گەورە وای لێکرد نەوەکانی دوای خۆی هەر ناوی بە چاکە بەرن.[5] زەححاك دەڵێت: سڵاو لێکردنیان وو ناوبردنیانە بە چاکە. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿سَلَامٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِي الْعَالَمِينَ﴾ واتە: سڵاو لە نوح لە سەرانسەری دنیادا. واتە: ئەوەندە جێی ڕێزو ستایشە لە سەرانسەری دنیادا هەموو گرۆو تیرەیەك سڵاوی بۆ دەنێرێت، ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ واتە: ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەینەوە. واتە: ئا بەو شێوەیە پاداشتی ئەو کەسانە دەدەینەوە کە کاری چاکە دەکەن‌و خەریکی خواناسین، وایان لێ دەکەین کە دوای خۆیان باسیان بە چاکە بکرێت هەر کەسەو بەپێی پلەی خۆی لە خواناسیدا، پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ئەو یەکێك بوو لەو عەبدانەم کە بڕوایان پێ هێناوم. واتە: بە ڕاستی بڕوایان پێ هێناوم‌و یەکتاپەرست‌و دڵ دامەزراو بوون. ﴿ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ﴾ واتە: پاشان ئەوانی ترمان وەبن ئاودا. واتە: قڕمان کردن‌و هیچ کەسیان لێ دەرنەچوو کە چاو بتروکێنێت‌و باس‌و خواسیان نەما. ناویشیان نیە مەگەر بەو ڕەوشتە ناشیرینەی کە بوویانە.

﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَاءَ رَبَّهُ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا آلِهَةً دُونَ اللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾﴾

### باس‌و سەرگوزشتەی ئیبراهیم‌و گەلەکەی

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ لَإِبْرَاهِيمَ﴾ واتە: ئیبراهیم لە شوێنکەوتووانی ئەو بوو. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِ

---

[1] أحمد (٥/٩)، حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش قسەکەی ئەسەلمێنێت.

[2] تحفة الأحوذي (٩/٩٨)، حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش پشتگیری دەکات.

[3] الطبري (٢١/٦٠).

[4] الطبري (٢١/٦٠).

[5] الطبري (٢١/٦٠).

﴿لَإِبْرَٰهِيمَ﴾ دەڵێت: ئیبراهیمیش لەسەر ئایینی ئەوە.[١] موجاهید دەڵێت: واتە: لەسەر بەرنامەو ڕێگای ئەوە.[٢] ﴿إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ﴾ واتە: ئەوسا بە دڵی پاکەوە هاتە لای پەروەردگاری خۆی. ئیبنو عەبباس دەڵێت: واتە: شایەتی دانە بە (لا إله إلاّ الله).[٣] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەوفەوە دەڵێت: وتم بە موحەممەدی کوڕی سیرین دڵی پاک کامەیە؟ وتی: کەسێك دەزانێت خودا هەقەو ڕۆژی قیامەتیش دێتو گومانی تێدا نیەو ئەوانەی لەناو گۆڕدان خودا زیندوویان دەکاتەوە.[٤] حەسەن دەڵێت: پاك بێت لە بتپەرستی.[٥] عوروە دەڵێت: نەفرین لە خەڵك ناکات[٦]. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ﴾ واتە: بە بابیو هۆزەکەی خۆی وت: ئەوە چین دەیانپەرستن؟ واتە: نارەزایی دەربڕی بەرامبەریان لەسەر ئەو بتپەرستیو هاوەڵ دانانەیان بۆ خودا. بۆیە خوا دەفەرموێت: ﴿أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ﴾ واتە: دەتانەوێت لە بری خوا پەرستن، ئەو شتانە بپەرستن؟ ﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئاخۆ ئێوە سەبارەت بە پەروەرێنی هەموو دنیا بیروبڕواتان چۆنە؟ قەتادە دەڵێت: واتە: کاتێك کە چوونە بەر بارەگای خودا ڕاتان چۆنە ئەبێ خودا چیتان بەسەر بێنێت کە ئێوە لە دنیادا هاوەڵتان بۆ داناوەو شتی ترتان لەگەڵدا پەرستووە[٧].

﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ﴾ واتە: ئەوسا ئیبراهیم چاوی خۆی لە ئەستێرەکان هەڵڕوانی. کاتێك ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) سەیری ئەستێرەکانی کرد وتی بە

[١] الطبري (٢١/٦١).
[٢] الطبري (٢١/٦١).
[٣] القرطبي (١٥/٩١).
[٤] القرطبي (١٥/٩١).
[٥] الطبري (٢١/٦٢).
[٦] الطبري (٢١/٦٢).
[٧] الطبري (٢١/٦٣).

هۆزەکەی: من ناتوانم بێم لەگەڵتان، ئەمەشی بۆیەووت بۆ ئەوەی وەختێك ئەوان دەچن بۆ جەژنەکەیان ئەم بمێنێتەوە لە شاردا حەزی دەکرد زووتر بڕۆن هەتا ئەو بە تەنها خۆی بمێنێتەوە لەگەڵ بتەکانداو بیانشکێنێت. قسەیەکی پێ وتن کە قسەکە خۆی لەبنەڕەتدا ڕاستە، ئەوان وایان دەزانی کە نەخۆشە بە پێی ڕاوبۆچوونی خۆیان، ﴿ فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴾ واتە: سا ئەوان لێی تەکینەوەو پشتیان تێکرد. قەتادە دەڵێت: عەرەب بە کەسێك کە سەیری ئەستێرەکان بکاتو تێ ڕابمێنێتو بیر بکاتەوە دەڵێن (نظرا في النجوم).[1] قەتادە دەڵێت: ئیبراهیم سەیری ئاسمانی کردو بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بیانخلافێنێ، بۆیە وتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ یانی: بێهێزم. بەڵام ئەو فەرموودەی کە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لێرەدا لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئیبراهیم درۆی نەکردووە (سەلامی خوای لێ بێت) تەنها سێ درۆ نەبێت دوانیان لەبەر زاتی خودای گەورەبووە، کەوتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ وە وتی: ﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا﴾ وە لە بارەی سارەیشەوە (کە خێزانی بوو) وتی: ئەوە خوشکمە). فەرموودەیەکە لە کتێبە سەحیحەکانو سونەنەکانیشدا هاتووە لە چەند ڕێگاوە.[2] بەڵام ئەم قسانەی ئیبراهیم لەو قسە درۆیانەیەنیە کە هەر کەسێك کردی شایستەی زەمکردن بێت نەخێرو حاشا شتی وا نیە. بەڵکو ئەو بە شێوەیەك ئەو درۆی کردووە کە گوناه نەبێتو درست بێت. بەڵکو ئەو قسەی ئیبراهیمە قسەی بەتوێکڵە واتە مەبەست بەو قسەیە خودی قسەکە نییە بەڵکوقسەیەکی ترە کە مەبەستێکی شەرعیو ئاینی تێدایە. وتراوە: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ واتە: دڵی بێزارو نەخۆشە لەسەر ئەوەی کە ئەوان ئەو بتانە دەپەرستنو دەیکەنە هاوەڵی خودای گەورە. حەسەنی بەسری دەڵێت: هۆزەکەی ئیبراهیم چوونە دەرەوە بۆ جەژنەکەیان ویستیان کە ئیبراهیمیش لەگەڵ خۆیان بەرن ئەمیش لەسەر پشت پاڵکەوتو وتی: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾ لەو کاتەدا هەر سەیری ئاسمانی دەکرد کاتێك کە ئەوان چوون، ئیبراهیم ڕۆیشت بۆ ناو بتەکانیانو شکاندنی.[3] ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردووە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ﴾ واتە: پشتیان تێکردو وازیان لێ هێناو ڕۆیشتن بۆ جەژنەکەیان، ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰ آلِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ واتە: بە پەنامەکی خۆی گەیاندە بتەکانیان، لێی پرسین، ئێوە بۆ ناخۆن؟ واتە: بە پەنامەکی دوای ئەوان کە ڕۆیشتن بە پەلە خۆی گەیاندە بتەکانو ﴿فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ﴾ چونکە بتپەرستەکان پێش ئەوەی بچن

---

[1] الدر المنثور (١٠٠/٧).

[2] فتح الباري (٤٤٧/٦)، مسلم (١٨٤٠/٤)، أبو داود (٦٥٩/٢)، تحفة الأحوذي (٥/٩)، النسائي في الكبرى (٤٤٠/٦).

[3] الطبري (٦٣/٢١).

خواردنیان دانابوو لەبەردەم بتەکاندا بۆ ئەوەی ببێتە (تەبەرك) زیاتر لێیان نزیك ببنەوە. کاتێك ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) سەیری ئەو خواردنانەی کرد کە لەبەر دەستیاندایە وتی: ﴿أَلَا تَأْكُلُونَ ۝٩١ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ﴾ چیتانە بۆ قسە ناکەن. ﴿فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ﴾ بە پەنامەکی بە دەستی ڕاست مشتێکی تێسرەواندن. (الفراء) دەڵێت: لێیان ڕاستبویەوە و بە دەستی ڕاست زلەیەکی لێدان. قەتادەو جەوهەری دەڵێن: بەرەو ڕووی بتەکان ڕۆیشت بە دەستی ڕاست مشتێکی تێ سرەواندن.[1] بۆیە بە دەستی ڕاست لێدان چونکە دەستی ڕاست بەهێزترو چاکترە بۆ لێدان، هەموو بتەکانی شکاندو پارچەپارچەی کردن بتە مەزنەکەیان نەبێت بەڵکو بێنەوە بۆ لای، وەك لە سورەتی (الانبیاء)دا لە پێشەوە تەفسیر کرا. لێرەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ﴾ واتە: هۆزەکەی بە هەڵەداوان لێی کۆبوونەوە. موجاهیدو کەسانی تریش وتوویانە: بە پەلەو هەڵەداوان. ئەم چیرۆکە لێرەدا بە کورتی هاتووە، لە سورەتی (الانبیاء)دا بە درێژی باس کراوە. کاتێك کە گەڕانەوە لە هەوەڵەوە نەیاندەزانی کێ ئەمەی کردووە هەتا پرسیویانەو بۆیان دەرکەوتووە کە ئیبراهیم بووە وای کردووە بە بتەکان کاتێك چوون بۆ لای ئیبراهیم کە پێی بڵێن بۆچی وای کردووەو سەرزەنشتی بکەن ئیبراهیم دەستی کرد بە باسی بتەکانیان کە ئەوانە خوا نین و هیچ تواناو دەسەڵاتیکیان نیە. ﴿قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ﴾ واتە: ئاخۆ ئێوە شتێك دەپەرستن، کە هەر خۆتان دای دەتاشن؟ واتە: بێجگە لە خودا ئەو بتانە دەپەرستن کە بە دەستی خۆتان دەیانتاشن. ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: کە هەر خودایە ئێوەش و کردەوەکانیشی وەدی هێناوە. لەوانەیە ئەو (ما)یە مەسدەریی بێت ئەو کاتە ماناکەی بەم شێوەیەی لێدێت: ئێوەو کردەوەکانتانی وەدی هێناوە. وە لەوانەشە بە مانای (الذي) هاتبێت واتە: خودا ئێوەی دروست کردووەو ئەو شتانەش کە دەیکەن هەر خودا دروستی کردووە، هەردوو ماناکە هەر یەك مانا دەگەیەنێت بەڵام مانای یەکەم شیاوترە کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (أفعال العباد)دا لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) بە مەرفوعی کە فەرموویەتی: (خوای گەورە هەموو دروستکەرو دەستکردەکانیشی وەدی هێناوە).[2] هەندێك ئەم ئایەتەیان: وا خوێندووەتەوە(والله خلقکم وما تعبدون). کاتێك کە ئیبراهیم بەڵگەی بۆ هێناونەوە کە ئەو بتانە هیچ شتێکیان لە دەست نایە.پەلاماریان داو گرتیان و دەستیان دایە سزادانیو وتیان: شوورەو دیوارێکی بۆ هەڵچنن، ئەوسا فڕێی بدەنە ناو ئاگر. وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا

---

[1] الطبري (٢١/٦٧).

[2] السنة (١/١٥٨).

﴿فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ﴾ ئەوەبوو خستیانە ناو ئاگر وەك لە سورەتی (الانبیاء)دا لە پێشەوە باس كرا. خوای مەزن ڕزگاری كردو سەركەوتووی كردو نیشانەی گەورەی خۆی نیشان دانو سەری خست بەسەریاندا. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ﴾ واتە: ویستیان گەڕێكی تێ بئاڵێنن، ئێمە پتر ئەوانمان ژێر خست.

﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٩٩) رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠٠) فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ (١٠١) فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ
السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن
شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (١٠٢) فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣) وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ (١٠٤) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ
نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (١٠٨)
سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ (١٠٩) كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١١٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١١١) وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ
الصَّالِحِينَ (١١٢) وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ إِسْحَاقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ مُبِينٌ (١١٣)﴾

## كۆچكردنی ئیبراهیمو تاقیكردنەی بە سەربڕینی ئیسماعیلو ئەو بەهرانەی كە خودا پێی دا لە دواییدا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ واتە: وتی: وا من ڕوو دەكەمە پەروەردگارم، بەم زووانە بەرەو خۆی شارەزام دەكات، خوای گەورە باسی ئیبراهیمی خەلیل دەكات (سەلامی خوای لێ بێت) پاش ئەوەی كە خودا سەری خست بەسەر هۆزەكەیداو نائومێد بوو لێیان دوای ئەو هەموو نیشانە گەورانەی كە بینیان، كۆچی كردو بەجێی هێشتن. وتی: من دەڕۆم بۆ لای خوای خۆم بەم زووانە ڕێم نیشان دەداتو دەروویەكم لێ دەكاتەوە پاشان وتی: ﴿رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ﴾پەروەردگارم! فەرزندێكی ئاكارچاكم پێ ببەخشە. واتە: داوای كرد لە خوا لە باتی گەلو هۆزەكەی كە بەجێی هێشتن منداڵی ئاكار چاكو گوێڕایەڵی پێ ببەخشێت. خوای گەورەیش فەرمووی: ﴿فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ﴾ واتە: ئەوسا ئێمە بە لاوێكی لەسەرخۆ مژدەمان پێدا. ئەو لاوەیش ئیسماعیل بوو (سەلامی خوای لێ بێت) كە یەكەم منداڵ بوو ئیبراهیم مژدەی پێدرا، ئیسماعیل گەورەتر بوو لە ئیسحاق بە ڕای هەموو موسڵمانانو ئەهلی كتێب كە لە دەقی كتێبەكانیاندا هاتووە كاتێك ئیسماعیل لە دایك بوو ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا بوو. كاتێكیش كە ئیسحاق لە دایك بوو لە تەمەنی نەوەو نۆ ساڵیدا بوو. وە لە لای ئەهلی كتێبیش هەر بەو شێوەیە بووە كە خوای گەورە فەرمانی كرد بە ئیبراهیم كە ئەو تەنها منداڵەی خۆی سەربڕێت. وە لە نوسخەیەكی تردا

هاتووه تەنها کوڕەکەی کەچی لە هەندێ شوێندا بە نەزانیو بە درۆو قسەی هەڵبەستراو دەڵێن: ئەو سەربڕاوە ئیسحاق بووە ئەم قسەیە هەرگیز ڕاست نیەو پێچەوانەی دەقی کتێبەکانی خۆشیانە. بۆیە وا دەڵێن چونکە ئیسحاق بابی ئەوانەو ئیسماعیلیش بابی عەرەبەکانە. حەسودیان بە عەرەب بردووە جا هاتوون ئەم قسەیان دروست کردووە گوایە مەبەست بە (تەنها منداڵەکەی) واتە: کەسی تری لە لانیە ئیسحاق نەبێت. چونکە لەو کاتەدا ئیبراهیم ئیسماعیلو دایکی بردووە بۆ مەککە! ئەمەش قسەیەکی دروستکراوو چەوتو پڕوپوچە. چونکە بەکەس ناوترێت (تەنها کوڕەکەت) ئەو کەسە نەبێت کە تەنیا یەك منداڵی هەیە. لەبەر ئەوەش یەکەم منداڵ زیاتر گرنگی پێدەدرێت لە چاو منداڵەکانی تردا کە دوای ئەو دێت، بڕیاردان بە سەربڕینی ئەو منداڵی یەکەمە تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەورەو گرنگترە لە منداڵەکانیتر. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ واتە: کاتێك گەیشتە تەمەنێك کە لەگەڵی ئەو ئیشو کار بکات، وتی: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! من لە خەونمدا وام دیوە تۆ سەر دەبڕم، خۆت چۆن لێکی دەدەیەوە؟ وتی: بابە! هەر شتێك پێت سپێردراوە بەجێی بێنە. خودا حەز بکات، بەم زووانە تێدەگەی کە منیش لە خۆڕاگرانم. ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ﴾ واتە: کاتێك کە ئیسماعیل گەورە بوو پێکەیی لەگەڵ باوکیدا دەڕۆیشتو دەگەڕا. باوکیشی هەموو کاتێك ئیسماعیلو دایکی بەسەر دەکردەوە لە وڵاتی (فاران) تا بزانێت چیان پێویستە. وا باسکراوە کە ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێت) بۆ ئەم سەردانانەی بە سواری بوراق بە پەلەسەردانی دەکردن، والله أعلم. لە ئیبنو عەباسەو (ڕەزای خوای لێ بێت)موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتای خۆراسانیو زەیدی کوڕی ئەسلەمو کەسانی تریشەوە وتوویانە: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ﴾ واتە: کاتێك کەوتە پێو بووە لاو دەیتوانی ئەو کارانەی کە باوکی دەیکرد بیکاتو پێی هەڵسێت.[1] عوبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێت خەونی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) نیگایە (وەحیە) پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ﴾.[2] ئیبراهیم بۆیە کوڕەکەی ئاگادار کرد لە کارەکە هەتا زۆر گران نەبێت لە لایو تاقیشی بکاتەوە هەتا چەندێ خۆڕاگرو بە تواناو لێبڕاوە بۆ گوێڕایەڵی فەرمانی خوای مەزنو فەرمانی بابی. ﴿قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ﴾ واتە: ئەوەی خودا فەرمانی پێداوی بەجێی بێنەو سەرم ببڕە. ﴿سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ واتە: بەو زووانە خوا مەیلی لێ

[1] الطبري (٢١/٧٢/٧٣).

[2] الطبري (٢١/٧٥).

بێت بۆت دەردەکەوێت کە منیش لە خۆڕاگرانمو بە تەمای پاداشتی خودام لەسەری. ئیسماعیل (سەلامی خوای لێ بێت) ڕاستی کردو پەیمانەکەی بەجێ هێنا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا﴾[1] واتە: وە لە قورئاندا باسی ئیسماعیل بکە بێگومان ئەو لە پەیمانو بەڵێنەکانیدا ڕاستگۆ بوو وە نێرراوو پێغەمبەری خوا بوو، وە هەمیشە فەرمانی دەدا بە خێزانو کەسو کاری بە نوێژکردنو زەکاتدانو هەمیشە لای پەروەردگاری جێگەی ڕەزامەندی بوو. پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ﴾ واتە :کاتێك هەردوو بڕیاری خۆیان سەلماندو لەسەر تەوێڵ درێژی کرد. واتە: کاتێك شایەتومانیان هێناو یادی خوایان کرد باوکی ویستی سەری بڕێتو ئیسماعیلیش ئامادە بوو بۆ مردن. وتراویشە: ﴿أَسۡلَمَا﴾ واتە: خۆیان دا بە دەستەوەو گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بوون. ئیبراهیم فەرمانی خودای بەجێ هێناو ئیسماعیل بەرفەرمانی خوداو باوکی بوو. ئەمە قسەی موجاهیدو عیکریمەو قەتادەو سودیو ئیبنوئیسحاقە.[2] کەسانی تریش وتوویانە: مانای: ﴿وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ﴾ بە دەما خستیو بۆ ئەوەی لە پشتی ملیەوە سەری بڕێ هەتا لە کاتی سەربڕینیدا دەمو چاوی نەبینێت بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانتر سەری ببڕێ. ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەححاکو قەتادە دەڵێن: ﴿وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ﴾ واتە: لەسەر تەوێڵ درێژی کرد بەسەر زەویدا.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ئیبراهیم فەرمانی پێکرا کە مەناسیکەکانی حەج جێبەجێبکات شەیتان هاتە ڕێی لە کاتی سەعی سەفاو مەروەدا، شەیتان ویستی پێشی لێ بگرێت بەڵام ئیبراهیم پێش کەوت (سەلامی خوای لێ بێت) پاشان جوبرەئیل بردی بۆ لای جەمرەی عەقەبە، شەیتان هاتەڕێی و ئیبراهیم حەوت بەردی تێگرت هەتا ڕۆیشت، پاشان هاتە ڕێی لە جەمرەی ناوەڕاستدا حەوت بەردی تری تێگرت. پاشان ئیسماعیلی بە دەمدا ڕاخست، ئیسماعیل کراسێکی سپی لەبەردا بوو وتی: ئەی بابە هیچ جلوبەرگێکی ترم نیە جگە لەم کراسەی لەبەرم دایە کە بیکەیتە کفنم، بۆیە لەبەرمی داکەنە بۆ ئەوەی بیکەیتە کفنم، ئیبراهیم خەریك بوو کراسەکەی لەبەر لادەبرد لەو کاتەدا لە دواییەوە بانگ کرا: ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ﴾ واتە: ئێمەش بانگمان کرد: ئەی

---

[1] مريم (٥٤_٥٥).

[2] الطبري (٢١/٧٧).

[3] الطبري (٢١/٧٧/٧٨).

ئیبراهیم. ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ واتە: ئەوا خەونەکەوت وەدی هات، ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەین. ئیبراهیم لای کردەوە بەرانێکی سپی شاخداری چاوگەورەی بینی. ئیبنو عەباس دەڵێت: گەر ئەتبینین لەبەران کرپیندا هەموومان هەر بەشوێن بەرانی وادا ئەگەڕاین[1]. پاشان بە درێژی فەرموودەکەی لە مەناسیکدا (المناسك) باس کردووە. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ١٠٤ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآ﴾ واتە: ئەوەی لە خەونەکەتدا بینیت هاتەدی‌و کوڕەکەت بە تەوێڵدا ڕاخست بۆ سەربڕین. (سودی)و کەسانی تریش دەڵێن: چەقۆکەی دەهێنا بە ملیدا هیچی نەدەبڕی بەڵکو پارچە مسێك (النحاس) بووبووە ڕێگر لە بەینی چەقۆکەو ملی ئیسماعیلدا (سەلامی خوای لێ بێت) لەو کاتەدا ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بانگ کرا: ﴿قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآ﴾.[2] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئا بەو شێوەیە ئێمە نارەحەتی‌و قورسی لەسەر ئەو کەسانە لادەبەین کە گوێڕایەڵمانن ودەرگای خێریان لێ ئاوەڵا دەکەین‌و ڕزگاریان دەکەین وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا﴾[3] واتە: وە هەر کەسێك خواناس بێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، وە ڕزق‌و ڕۆزی دەدات لە شوێنێکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتووەو هەر کەسێك پشت بە خوا ببەستێت ئەوە خوای بەسە بە ڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە. کۆمەڵێك لە زانایانی ئوسول ئەم ئایەتەو چیرۆکەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر ڕاستی نەسخ پێش بەجێهێنانی ئەو کارە بە پێچەوانەی ڕای کۆمەڵی موعتەزیلەوە بەڵگەکانیش لێرەدا ئاشکرایە. چونکە خودای مەزن فەرمانی دا بە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بە سەربڕینی کوڕەکەی، پاشان (نەسخی کردەوە)و قوربانیەکی لە جێی داناو نەیهێشت سەری بڕێت. مەبەستی خوای گەورە لەو کارەی یەکەم: ئەوەبوو پاداشتی ئیبراهیم بداتەوە لەسەر ئەو خۆڕاگریەی لە سەربڕینی کوڕەکەی‌و لێبڕانی ئیبراهیم لەسەر بەجێهێنانی ئەو کارە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ﴾ دیارە ئەمە ئەزموونێکی ئاشکرابوو. واتە: ئەمە تاقی کردنەوەیەکی ئاشکراو دیار بوو کاتێك خوای مەزن فەرمانی دا بە ئیبراهیم کە کوڕەکەی خۆی سەر ببڕێت ئەویش بە پەلە هەڵسا بەو کارەو فەرمانی خوای بەجێهێنا زۆر بە

[1] أحمد (١/٢٩٧).

[2] الطبري (٢١/٧٤).

[3] الطلاق (٢ـ٣).

دڵسۆزییەوە لەبەر ڕەزای خوا. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾[1] واتە: واتە: ئەو ئیبراهیمەی کە ئەرکی خۆی بە تەواوی بەجێ هێنا. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴾ واتە: ئێمە ئەومان بە قوربانیەکی هەرە گەورە کڕیەوە. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بەرانێك بوو کە چل پایز لە بەهەشتدا لەوەڕێنرابوو[2]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەفیەی کچی شەیبەوە دەڵێت: ئافرەتێکی بەنی سولەیم کە دایکی زۆربەی ئەم ماڵەی ئێمەیە هەواڵی ئەوەی پێدام کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردی بۆ لای عوسمانی کوڕی تەلحە، ئەو ژنە جارێکیشیان وتی: کە خۆی پرسیاری کردووە لە عوسمان: بۆچی پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بە شوێنتدا؟. وتی: فەرمووی: (کاتێك هاتمە ئەم ماڵە دوو شاخی بەرانم بینی لە یادم چوو پێت بڵێم، دایپۆشی، دایپۆشە نابێت شتێك لە ماڵدا بێت نوێژ خوێن سەرقاڵ بکات). سوفیان وتی: ئەو دوو شاخی بەرانە هەر لەو ماڵەدا هەڵواسرابوو هەتا ئەو ماڵە سوتا، دوو شاخەکەیشی سوتا.[3] ئەمە بەڵگەیەکی سەربەخۆیە لەسەر ئەوەی کە ئەوکەسە ئیسماعیل بووە(سەلامی خوای لێ بێت) و قورەیشیەکانیش ئەوە پاش ئەوە ئەو دوو شاخی بەرانەیان بۆ مابووەوەو هەڵیان گرتبوو، کە ئیبراهیم کردی بە قوربانی هەتا ئەو کاتەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕەوانە کرا، والله أعلم.

## باسی ئەو ڕیوایەت و شوێنەوارانەی هاتووە کە ئەیسەلمێنێت ئیسماعیل (سەلامی خوای لێ بێت) کەسە سەربڕاوەکە بووە، کە هەر ئەوەش ڕاستەو دانی پیانراوە

سەعیدی کوڕی جوبەیرو عامری شەعبی و یوسفی کوڕی مەهران و موجاهیدو عەتاو کەسانی تریش دەڵێن: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەو کەسە ئیسماعیل بووە (سەلامی خوای لێ بێت).[4] ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە دەڵێت: ئەو قوربانیە ئیسماعیل بووە (سەلامی خوای لێ بێت) جوولەکە ئەڵێن: ئەو کەسە ئیسحاق بووە. جوولەکە لەمەدا درۆیان کردووە.[5] ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: سەربڕاوەکە ئیسماعیلە (سەلامی خوای لێ بێت).[6] ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت: لە موجاهیدەوە. ئەو کەسە ئیسماعیلە (سەلامی خوای لێ بێت).[7] یوسفی کوڕی

---

[1] النجم (٣٧).
[2] الطبري (٢١/٩٠).
[3] أحمد (٤/٦٨)، پیاوەکانی جێی متمانەن.
[4] الطبري (٢١/٨٣).
[5] الطبري (٢١/٨٣).
[6] الطبري (٢١/٨٢).
[7] الطبري (٢١/٨٤).

مەهرانیش هەر وای وتووە.[1] شەعبی دەڵێت: ئەو کەسە ئیسماعیلە (سەلامی خوای لێ بێت) وە من دوو شاخی ئەو بەرانەم بینیووە لەناو کەعبەدا.[2] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: لە حەسەنی کوڕی دینارو عەمری کوڕی عوبەیدەوە لە حەسەنی بەسریەوە دەڵێت: هیچ گومان نەبووە لەوەدا کە ئەوەی فەرمان دراوە بە سەربڕینی لەو دوو کوڕەی ئیبراهیم ئیسماعیل بووە (سەلامی خوای لێ بێت).[3] دیسان ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: بیستم لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە دەیوت: ئەو کەسەی کە خودا فەرمانی دا بە ئیبراهیم لەو دوو کوڕەی کە سەری بڕێت ئیسماعیل بوو. وە ئێمە ئەوەمان لە کتێبی خوای گەورەدا وەدی کردووە، چونکە خوای مەزن کاتێك کۆتایی بە چیرۆکی سەربڕاوەکە هێناوە لە دوو کوڕەکەی ئیبراهیم فەرموویەتی: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ وە دەفەرمووێت: ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾[4] واتە: مزگێنیمان پێدا بە ئیسحاق و سەرەڕای ئیسحاق بە یەعقوب. خوا مژدەی کوڕو کوڕەزایشی پێدەدات، بۆیە ناکرێ ئەمریکات بەسەربڕینی ئیسحاق کەهێشتا ئەو وادەیەی کەبە ئیبراهیمی داوە نەهاتووەتەدی، کەواتە ئەوەی فەرمانکراوە سەر ببڕێت هەر ئیسماعیلە[5]. ئیبنو ئیسحاق دەڵێت ئەم قسەیەم زۆرجار لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە بیستووە.[6] دیسان ئیبنو ئیسحاق دەڵێت: لە بورەیدەی کوڕی سوفیانی کوڕی فەروەی ئەسلەمیەوە لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە کە بۆی باس کردوون کە وتوویەتی بە عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەزای خوای لێ بێت) کە خەلیفە بووە لەو کاتەدا و لەگەڵی بووە لە شامدا، عومەر پێی وتووە: بەم باسە خۆی بۆ خۆی شتێکە دەمەوێت بزانم چیەو چۆنە، وە منیش هەمان ڕام هەیە کە تۆ بووتە. پاشان ناردی بۆ لای پیاوێك کە لە شام لەگەڵی بوو. جوولەکە بوو و موسڵمان بووبوو و موسڵمانێکی باشیش بوو، بە یەکێك لە زاناکانی ئەوان دەبینرا، عومەری کوڕی عبدالعزیز (ڕەزای خوای لێ بێت) لەو بارەیەوە پر سیاری لێکرد، موحەممەدی کوڕی کەعب وتی من لە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز بووم، عومەر پێی وت: کام کوڕی ئیبراهیم فەرمان درا بە سەربڕینی؟ وتی: ئیسماعیل، سوێند بە خوا ئەی گەورەی موسڵمانان جوولەکەکان ئەوە دەزانن، بەڵام حەسوودی بە ئێوەی عەرەب دەبەن کە ئیسماعیل باوکی ئێوەیە کە خودا فەرمانی دا بە سەربڕینی و ئەو ڕێزەی کە خودا پێی بەخشی بە هۆی

---

[1] الطبري (٢١/٨٤).

[2] الطبري (٢١/٨٤).

[3] الطبري (٢١/٨٥).

[4] هود (٧١).

[5] الطبري (٢١/٨٤).

[6] الطبري (٢١/٨٥).

ئەو خۆڕاگریەوە بوو لەبەرامبەر فەرمانی خودای مەزندا، ئەوانە نکوڵی لە ئەوە دەکەن دەڵێن ئەو سەبڕاوە ئیسحاقە. لەبەر ئەوەی ئیسحاق بابی ئەوانە. خودا خۆشی دەزانێ کامەیانە. هەموو چاكو پاكو گوێڕایەڵی خوای گەورەش بوون.[1] عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: پرسیارم کرد لە بابم لەو سەربڕاوە؟ ئاخۆ ئیسماعیل بووە یان ئیسحاق؟ وتی: ئیسماعیل بووە. عبدالله لە کتێبی زوهددا باسی کردووە.[2] ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێت بیستم لە باوکم دەیوت: ڕاست ئەوەیە کە ئیسماعیل (سەلامی خوای لێ بێت) سەربڕاوەکەیە. دەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە عەلیو ئیبنو عومەرو ئەبو هورەیرەوەو ئەبو توفەیل و سەعیدی کوڕی موسەیبو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو موجاهیدو شەعبیو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیو ئەبو جەعفەر موحەممەدی کوڕی عەلیو ئەبو سالحو (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەموو وتوویانە: ئەو سەربڕاوە ئیسماعیلە.[3] بەغەوی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو سەعیدی کوڕی موسەیبو سودیو حەسەنی بەسریو موجاهیدو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزیو کەلبی هەمان ڕاوبۆچوونیان هەبووە.[4] ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە، وە ڕیوایەتیش کراوە لە ئەبو عومەری کوڕی عەلائەوە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سونابیحیەوە دەڵێت: ئێمە لە لای موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بووین. باسی سەربڕاوەکە کرا ئیسماعیلە یان ئیسحاق؟ موعاویە وتی: هاتنە لای کەسێك زۆر چاك دەزانێ، وتی: لە خزمەت پێغەمبەردا بووین (ﷺ) پیاوێك هات بۆ لای وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو شتانەم بۆ باس بکە کە خودا پێی بەخشیوی، ئەی کوڕی دوو سەربڕاوەکە (ابن الذبیحین)، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێکەنی، وترا پێی ئەی گەورەی موسڵمانان: ئەو دوو سەربڕاوە کێن؟ وتی: کاتێك عەبدول موتەلیب فەرمانی پێکرا کە بیری زەمزەم هەڵکەنێت نزریکرد گەر خوای گەورە کارەکەی بۆ ئاسان بکات یەکێك لە کوڕەکانی سەربڕێت، پشکیان بۆکردن، پشکەکە کەوتە سەر عبدالله، خاڵەکانی نەیانهێشت سەری بڕێت، وتیان: سەد وشتر لە جێی سەربڕە، عەبدول موتەلیب سەد وشتری لە جێی عبدالله سەربڕی. دووهەمیش ئیسماعیلە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ کاتێك کە مژدە درا لە پێشەوە بە سەربڕاوەکە کە ئیسماعیلە. پاشان بە دوایدا باسی مژدەی هاتنی براکەشی ئیسحاق هاتووە. کە لە سورەتی (هودو الحجر)دا

---

[1] الطبري (٢١/٩٨٥).

[2] الزهد لعبدالله بن أحمد (٨٠).

[3] الطبري (٢١/٨٢/٨٤).

[4] البغوي (٤/٣٢).

هاتووە. وە دەفەرموویت: ﴿نَبِيًّا﴾ حالێکی موقەدەرە (حال مقدر) واتە: بەم زووانە پێغەمبەرێکی شیاوو لایەقی دەبێت، وە دەفەرموویت: ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ﴾ واتە: وایشمان کرد بەرەی دوای ئەویش هەر ناوی بە چاکە بەرن. ﴿سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ﴾ سڵاو لەسەر ئیبراهیم بێت. ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە ئاوا پاداشتی کارچاکان دەدەین. ﴿إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ بە ڕاستی ئەو یەکێك بوو لە عەبدە بڕوادارەکانمان. ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ﴾ مژدەی ئیسحاقیشمان پێدا کە دەبێتە پێغەمبەرێکی چاکەخواز. ﴿وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ إِسْحَاقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾ واتە: بەرەکەتمان دا بە خۆیو بە ئیسحاقیش لەناو تۆرمەکەیاندا هەندێکیان ئاکار چاك بوونو تێشیاندا بوون بە ئاشکرا غەدریان لە خۆیان دەکرد. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤٨)﴾[1] واتە: وترا ئەی نوح دابەزە (لە کەشتیەکە) بە هێمنیو بێوەی لە لایەن ئێمەوەو بە پیتو فەڕی زۆر بەسەر خۆتەوەو بەسەر گەلانێك کە پەیدا دەبن لەوانەی کە لەگەڵ تۆدان (یان بەسەر ئەو خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان) چەند نەتەوەو گەل دواتر دێن خۆشیو نازو نیعمەتیان پێ دەدەین پاشان لە لایەن ئێمەوە سزای سەختی ئازاردەر دووچاریان دەبێت.

﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَارُونَ (١١٤) وَنَجَّيْنَاهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ (١١٥) وَنَصَرْنَاهُمْ فَكَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ (١١٦) وَآتَيْنَاهُمَا الْكِتَابَ الْمُسْتَبِينَ (١١٧) وَهَدَيْنَاهُمَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ (١١٨) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِي الْآخِرِينَ (١١٩) سَلَامٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَارُونَ (١٢٠) إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٢١) إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١٢٢)﴾

**باسی موساو هارون**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَارُونَ﴾ دەربارەی موساو هارونیش چاکەمان کرد. ﴿وَنَجَّيْنَاهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ﴾ واتە: خۆیانو هۆزەکەیانمان لە نارەحەتی گەورە ڕزگار کرد. ﴿وَنَصَرْنَاهُمْ فَكَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾ واتە: بۆ خۆیان یاریدەمان دان کە سەرکەوتن. خوای گەورە باسی ئەو بەهرانە دەکات کە دای بە موساو هارون لە پێغەمبەریەتیو ڕزگارکردنیان بە

[1] هود (٤٨).

خۆیان‌و ئەو خاوەن باوەڕانەی کە لەگەڵیان بوون لە ستەم‌و دەستدرێژی فیرعەون کە ئەو هەموو خراپەکاریەی لەگەڵ دەکردن لە کوشتن‌و بڕینی منداڵەکانیان‌و هێشتنەوەی ژنەکانیان‌و بەکارهێنانیان لە خراپترین شتدا. دوای ئەو هەموو تاوان‌و خراپەکاریەی کە فیرعەون کردی لەگەڵیان خوای گەورە یارمەتی دان‌و سەری خستن بەسەر فیرعەوندا. شادو دڵخۆشی کردن هەرچی سامان‌و زەوی فیرعەون و دارو دەستەکەی هەبوو هەموویان برد بۆ خۆیان کە لە درێژایی تەمەنیاندا کۆیان کردبووەوە، پاشان خوای گەورە ئەو کتێبە زۆر مەزنە دیارو ئاشکراو ڕوونکەرەوەی ڕەوانەکرد بۆ موسا کە تەوراتی پیرۆزە وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی بەخشیمانە موساو هارون تەورات (کە جیاکەرەوەی حەق‌و بەتاڵە)و ڕوونکەرەوەو یادخەرەوەشە. وە لێرەشدا خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ﴾ واتە: ئەو کتێبەشمان بەوان دا کە هەموو شت دیاری دەکات. ﴿وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ واتە: ڕێگەی ڕاستیشمان نیشان دان. لە کردارو گفتاردا. ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ﴾ واتە: وامان کرد لە دواڕۆژیشدا هەر ناویان بە چاکە ببرێت. واتە لە دوای خۆیان ناومان هێشتنەوە هەر بە چاکی باسیان بکرێت‌و وەسف بکرێن پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾ سڵاو لە موساو هارون. ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئێمە ئاوا چاکەکاران پاداشت دەدەین. ﴿إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: هەردووکیان لەو عەبدانەم بوون، کە باوەڕیان پێ هێنام.

﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾﴾

**باسی ئیلیاس پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: بێگومان کە ئەلیاسیش یەکێك لە پێغەمبەرانە. قەتادەو موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێن: وتراوە: ئەلیاس ئیدریس پێغەمبەرە

[1] الانبياء (٤٨).

(سەلامی خوای لێ بێت).[1] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ئەلیاس ئیدریس پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێت).[2] زەححاکیش هەروای وتووە.[3] وەهەبی کوڕی مونەبیە دەڵێت: ئەلیاس کوڕی یاسینی کوڕی فیحاسی کوڕی عیزاری کوڕی هارونی کوڕی عیمرانە.[4] خوای گەورە ڕەوانەی کرد بۆ سەر نەوەی ئیسرائیل دوای حیزقیل (سەلامی خوای لێ بێت) کە بتێکیان دەپەرست پێیان دەوت: بەعل، ئیلیاس داوای لێکرن کە خودا بپەرستن و واز لە پەرستنی غەیری خودا بێنن. پاشاکەیان باوەڕی پێ هێنا. لە دواییدا پەشیمان بووەوە. لەسەر گومڕایی خۆیان بەردەوام بوون و هیچ کەس باوەڕی پێ نەهێنا. نزای لێ کردن خوای گەورەش سێ ساڵ دڵۆپێك بارانی بۆ نەباراندن. پاشان داوایان لێ کرد کە بپاڕێتەوە لە خوداو ئەو بێ بارانیەیان لەسەر لاببات، هەموو باوەڕی پێ دێنن ئەلیاسیش لە خودا پاڕایەوە کە بارانیان بۆ ببارێنێت، خودایش بارانی بۆ باراندن کەچی هەر لەسەر خوانەناسی و پیسی خۆیان بەردەوام بوون. پاشان داوای کرد لە خوا کە بیباتەوە بۆ لای خۆی، یەسەعی کوڕی ئوختوب (سەلامی خوای لێ بێت) لە ژێر دەستی ئەودا نەشونمای کردو پێگەیشت. فەرمان درا بە ئیلیاس کە بڕوات بۆ فلانە شوێن و فلانەشوێن هەرچی هاتە لای سواری بێت و گوێی نەداتێ، ئەسپێك لە ئاگر بەرەو ڕووی هات و ئەمیش سواری بوو. خودا نوری کرد بەبەریدا و بە پەڕیش دایپۆشی، لەگەڵ فریشتەکاندا دەفڕی وەك فریشتەیەکی ئادەمی ئاسمانی و زەمینی. ئا بەم شێوەیە وەهەبی کوڕی مونەبیە لە ئەهلی کیتابەوە ڕیوایەتی کردووە. خودا خۆی دەزانێ چەندە ڕاستە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ﴾ واتە: ئەوسا بە هۆزەکەی خۆی وت: بۆچی شەرم لە خوا ناکەن؟ واتە: ئایا لە خوا ناترسن کە غەیری ئەو دەپەرستن؟ ﴿أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ﴾ بەعلی (بت) دەپەرستن، لە چاکترین وەدیهێنەر دەتەکنەوە؟ ئیبنو عەباس و (ڕەزای خوای لێ بێت) موجاهیدو عیکریمەو قەتادەو سودی دەڵێن: بەعل واتە: پەروەردگار. عیکریمەو قەتادە دەڵێن: بەعل زمانی خەڵکی یەمەنە. لە ڕیوایەتێکدا لە قەتادەوە هاتووە دەڵێت: زمانی ئەزدشەنوئەتە (أزد شَنوءة). عەبدوڕڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: لە باوکیەوە (بەعل) ناوی بتێکە خەڵکی شارێك دەیانپەرست پێی دەوترا: (بعلبك) لە خۆرئاوای دیمەشق. زەححاك دەڵێت: (بەعل) بتێك بووە کە دەیانپەرست. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ

---

[1] الطبري (٢١/٩٥).

[2] القرطبي (١٥/١١٥).

[3] الطبري (٢١/٩٧).

[4] الطبري (٢١/٩٧).

﴿ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ واتە: کە خودا پەروەردگارتانەو پەروەردگاری بابەکانی پێشووشتانە. واتـە: هـەر خـودا شایستەی پەرستنە بـە تـەنها کـەهاوەڵی نیـە. خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ﴾ واتە: سا باوەڕیان پێ نەکردو بێگومان دێنە بەر لێپرسینەوە. واتە: ئامـادە دەکـرێن بـۆ جەزرەبـەدان‌و لێپرسینەوە. ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ واتە: مـەگین عەبدە ڕاسـت‌و پاکـەکانی خـودا. واتـە: مـەگین ئەوانەی کە یەکتاپەرستەکانیان. ئەمە ئیستیسنای مونقەتیعە لە موسبەتدا وە دەفـەرمووێت: ﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ واتە: وامان کرد لە دواڕۆژیشدا هەر ناوی بە چاکە ببرێت. ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلۡ يَاسِينَ﴾ واتـە: سڵاوی ئێمە لە ئیلیاس. وەك چۆن وتراوە بە ئیسماعیل، ئیسماعیل کە ئەمە زمانی بەنی ئەسـەدە. وە وتراوە بە میکائیل میکال‌و ئیبراهیم ئیبراهام‌و ئیرائیل ئیرائین‌و طور سیناء طور سینین، هەر یەك شتەو هەمووی هاتووە. وە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ واتـە: ئێمـە ئـاوا پاداشـتی کارچـاکان دەدەینەوە. ﴿إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: ئەو یەکێك بوو لەو عەبدانەم کە باوەڕی پێ هێنام.

﴿وَإِنَّ لُوطٗا لَّمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذۡ نَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزٗا فِي ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ
﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمۡ لَتَمُرُّونَ عَلَيۡهِم مُّصۡبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيۡلِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٣٨﴾﴾

**باسی قڕکردنی هۆزی لوت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ لُوطٗا لَّمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ واتە: لوتیش لە پێغەمبـەران بـوو. ﴿إِذۡ نَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ﴾ واتە: خۆی‌و کەس‌و کاریشیمان بە یەکەوە ڕزگار کرد. ﴿إِلَّا عَجُوزٗا فِي ٱلۡغَٰبِرِينَ﴾ واتـە: مەگین تەنها پیرەژنێك لە لای بـەجێ ماوەکـان مایـەوە. ﴿ثُمَّ دَمَّرۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ﴾ واتـە: پاشـان هـەموومان قڕکردن. خوای گەورە باسی عەبدو پێغەمبەری خۆی دەکـات کـە لـوت پێغەمبـەرە (سـەلامی خـوای لێ بێت) کە ناردی بۆ سەر هۆزەکەی، هۆزەکەی باوەڕیان پێ نەکرد، خوایش ڕزگاری کـرد لـە ناویانـدا بـە خۆیی‌و کەس‌و کاریەوە ژنەکەی نەبێت لەگەڵ ئەوانەدا کە قڕبوون ئەویش تیاچوو. خوای گەورە لەناوی بردن بە چەند سزاو جەزرەبە و شوێنەکەی کردن بە دەریایـەکی بـۆن پـیس‌و تـام نـاخۆش‌و شـوێنێکی ترسناك‌و سەرەڕێگەیەکی بەردەوام کە کاروانیان بە شەوو بە ڕۆژ بە لایدا تێپـەڕن. بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكُمۡ لَتَمُرُّونَ عَلَيۡهِم مُّصۡبِحِينَ﴾ واتە: بێگومـان ئێـوە لای بـەیانی بـە لایانـدا ڕادەبوورن. ﴿وَبِٱلَّيۡلِۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ واتە: شەوانەش، چۆن لەو ڕووداوە تێناگەن؟ واتە: ئـاخۆ ئێـوە چـۆن پەنـدو

ئامۆژگاری لەو کارەساتە وەرناگرن کە خوای مەزن ئا بەو شێوەیە ئەوانەی قڕ کرد، چاك بزانن کە هەموو خوانەناسێك هەر ئەوە چارەنووسیەتی.

﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ
ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ
بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾﴾

**باسی بەسەرهاتی یونس (سەلامی خوای لێ بێت)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: یونسیش هەر یەکێك بوو لە پێغەمبەران. لە پێشەوە لە سورەتی (الانبیاء)دا بەسەرهاتی یونس پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) باس کرا. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك بۆی نیە بڵێ من لە یونسی کوڕی (متی) چاکترم).[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾ واتە: کە ڕای کردە ناو گەمی پڕ. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿ٱلْمَشْحُونِ﴾ واتە: قورس و پڕ لە شتومەك. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ﴾ واتە: لە پشك خستن بەشدار بووو ئەو دۆڕاندی. ﴿فَسَاهَمَ﴾ بەشدار بوو لە پشك خستندا (لە قورعەدا).[2] ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ﴾ واتە: لەوانە بوو کە نەیبردەوەو دۆڕاندی. چونکە ئەو گەمییە کەوتە بەر شەپۆلی ئاو لە هەموو لایەکەوە نزیك بوو نوقم ببێت پشکیان خست بڕیاریاندا بەری هەر کەسێك کەوت فڕێی بدەنە ناو دەریا بۆ ئەوەی گەمیەکە باری سوك ببێت، پشکەکەش سێ جار کەوتە سەر یونس (سەلامی خوای لێ بێت) وایان بە چاك دەزانی کە فڕێی بدەنە ناو دەریاکە جلەکانی لەبەر داکەنن بەڵام وایان نەکرد، خودای گەورە فەرمانی دا بە ماسیەکی گەورە لە دەریای سەوزەوە کە دەریاکان ببڕێت و بچێت یونس هەڵلوشێت و قوتی بدات، گۆشتی نەکوتێ و ئێسکیشی نەشکێنێت، ئەو ماسیە ڕۆیشت یونس (سەلامی خوای لێ بێت) خۆی فڕێ دایە ناو دەریاکەو ماسیەکە قوتی داو بردی گەڕانی بە هەموو دەریاکاندا یونس بە تەواوی جێگیر بوو لەناو سکی ماسیەکەدا وای دەزانی مردووە، پاشان سەرو هەردوو پێ و دەستی جوڵاند. سەیری کرد زیندووە لە سکی ماسیەکەدا نوێژی کرد، کە

[1] فتح الباري (٤/١٩٣)، مسلم (٤/١٨٤٦).

[2] الطبري (٢١/١٠٦).

یەکێك لە دوعاکانی ئەوە بوو دەیوت: ئەی خودایە شوێنێکم کردووە بە مزگەوت هیچ کەس لە بەندەکانی تۆ هێشتا نەیتوانیوە بیگاتیّو بیکات بە مزگەوت، ڕای جیاواز زۆرە لە بارەی ئەو ئەندازەی کە یونس لە سکی ماسیەکەدا ماوەتەوە چەند بووە. قەتادە دەڵێت: سیّ ڕۆژ بووە. جەعفەری سادق دەڵێت: حەوت ڕۆژ بووە. ئەبو مالك دەڵێت: چل ڕۆژ بووە.[1] موجاهید دەڵێت لە شەعبیەوە چێشتەنگا قوتی داوەو هەڵی لوشیوە، ئێوارە هەڵی هێناوەتەوە. خوای مەزن خۆی دەزانێت ئەو ئەندازەیە چەند بووە. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ﴾ ئەوسا ماسیەکی گەورە، هەڵی لوشیو بۆ خۆی سەرکۆنەی خۆی دەکرد. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ﴾ واتە: سا ئەگەر ئەو پاکی خودای نەوتایە. ﴿لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ واتە: تا ڕۆژی قیامەت هەڵدەسا لە ورگیدا دەمایەوە. وتراوە: ئەگەر لە کاتی خۆشیو دەست والاییدا کرداری چاکی نەکردایەو پاکی خودای نەگرتایە دەمایەوە لە ورگی ماسیەکەدا. ئەمە قسەی زەحاکی کوڕی قەیسو ئەبول عالیەو وەهەبی کوڕی مونەببیهە قەتادەو کەسانی تریش ئەمەیان وتووە.[2] ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[3] لەو فەرموودەی کە لە دواوە دێت خوا حەز بکات بەم زووانە باسی دەکەین کە بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕووداوە، ئەگەر هەواڵەکە ڕاست بێت. وە لە فەرموودەیەکدا لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (لە کاتی خۆشیدا خودا بناسە خوایش لە کاتی نارەحەتیدا ئاگای لێتە).[4] ئەڵێن: مەبەست بە: ﴿فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ﴾ ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾[5] واتە: جا لە تاریکیەکاندا (تاریکی شەوو دەریاو ناو سکی نەهەنگ) هاواری کرد (ئەی خوا) بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆ پاکیو بێگەردی بۆ تۆ بێگومان من لە ستەمکاران بووم، ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکردو لەو خەمو خەفەتە ڕزگارمان کرد هەروەها ئیمانداران ڕزگار دەکەین. ئەمە قسەی سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریشە.[6] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لیّ بێت) ئەشڵیّ: من نازانم

---

[1] الطبري (٢١/١١١).

[2] الطبري (٢١/١٠٨/١٠٩).

[3] الطبري (٢١/١٠٨).

[4] أحمد (١/٣٠٧)، لە پێشەوە پلەکەی دیاری کراوە.

[5] الانبیاء (٨٧ـ٨٨).

[6] الطبري (٢١/١١٠).

ئەنەس بەبێگومان ئەم فەرموودەی بەرزکردووەتەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ): کە یونس پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك بڕیدەرکەوت کە بپاڕێتەوە بەم وتانە کە لە ورگی ماسیەکەدابوو بۆیە ووتی: (اللهم لا إله إلاّ أنت سبحانك إني كنت من الظالمين) واتە: ئەی خودایە لە غەیری تۆ هیچ پەرستراوێك شك نابەم، پاکیو بێ عەیبی بۆ تۆیە، من لە ڕیزی ناهەقان بووم. دوعاکەی ڕوویکردە عەرش وبەدەوریدا ئەهات و ئەڕۆیشت فریشتەکان وتیان: ئەی خودایە ئەمە دەنگێکی لاوازی ناسراوە لە ولاتێکی دووری نامۆوە هاتووە، خوای مەزنیش فەرمووی: ئایا ئەوە ناناسن؟ وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئەوە کێیە؟ خوای مەزن فەرمووی: بەندەی من یونسە، وتیان: ئەو بەندەی تۆ یونس کە هەتا ئێستاش هەر کرداری چاکی بەرز دەبێتەوەو وەردەگیرێتو دوعای قەبوڵ دەکرێت، فریشتەکان وتیان: ئەی خودایە ئایا ڕەحم ناکەی بەوکەسەی چاکە دەکات لە خۆشیداو لە ناڕەحەتیدا ڕزگاری بکەی؟ خوای مەزن فەرمووی: بەڵێ. فەرمانی دا بە ماسیەکە لەو چۆڵەوانیەدا فڕێی دا.[1] بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴾ واتە: فڕێمان دایە دەشتێکی چۆڵو قاقڕ، نەخۆشیش بوو. ﴿فَنَبَذْنَٰهُ﴾ واتە: فڕێماندا ﴿بِٱلْعَرَآءِ﴾ ئیبنو عەبباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) کەسانی تریش دەڵێن: زەویەك دارو درەختو خانووی تێدا نەبوو، ﴿وَهُوَ سَقِيمٌ﴾ واتە: لەشی لاوازو بێهێز بوو. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ﴾ واتە: ئەوسا ڕووەکێکی کولەکەمان لە لایدا سەوز کرد. ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) موجاهیدو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو وەهەبی کوڕی مونەبیهو هیلالی کوڕی یەسافو عبدالله ی کوڕی تاوس و سودیو قەتادەو زەححاکو عەتای خۆراسانیو کەسێانێکی تری زۆریش ئەڵێن: (الیقطین) واتە: کولەکە.[2] هەندێ وتوویانە: کوولەکە کەڵکی زۆرە لەوانە زوو سەوز دەبێتو گەڵاکەی سێبەری گەورەیەو ناسکیشەو مێشوولە نزیکی ناکەوێتەوەو خواردنیشی زۆر بەسوودو چاکە بە کاڵیو کوڵاویو بە توێکڵو ناوکیشەوە دەخورێت. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کوولەکەی (خواردنی کولەکەی) بە لاوە خۆش بووە لەناو دەفردا بۆی دەگەڕا.[3] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ واتە: ناردمانە ناو سەد هەزاران یان زێدەتر. دەشێتو بۆی هەیە ئەو خەڵکەی یەکەمجار یونس پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) ڕەوانەکرا بۆ لایان

---

[1] الطبري (٢١/١٠٩).

[2] الطبري (٢١/١١٣/١١٤)، الدر المنثور (٧/١٣٠/١٣١).

[3] البخاري (٢٠٩٢).

هەر ئەوانە بن کە فەرمان درا جارێکی تر بگەڕێتەوە ناویان دوای هاتنە دەرەوەی لە ورگی ماسیەکە کە سەد هەزار کەس بوون یان زیاتر. خوا دەفەرمووێت: ﴿أَوْ يَزِيدُونَ﴾ مەکحول دەڵێت: سەدو بیست هەزار کەس بوون. ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردووە. ئیبنو جەریر دەڵێت: هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبی لە خەڵکی بەسرە لەو بارەیەوە دەڵێن: واتە: هەتا سەد هەزار کەس بوون، یان ئەوان لەنەزەری ئێوەدا لەوەش زیاتر بوون، ئەڵێ: ئەوەندە بوون لەلای ئێوە[1]. بۆیە ئیبنو جەریر لێرەدا هەمان ڕێگەی گرتووەتە بەر کە لەسەری بووە بۆتەفسیری ئەم ئایەتانە کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾[2] واتە: لە پاشان دڵتان ڕەق بوو دوای ئەم (هەموو) موعجیزانە دڵتان وەك بەردە بەڵکو زۆر ڕەقترە. یان دەفەرمووێت: ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾[3] واتە: یەکسەر دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان. یان دەفەرمووێت: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾[4] واتە: جا بە ئەندازەی دوو کەوان یان کەمتر (ی مابوو لەگەڵ موحەممەدا (ﷺ)). مەبەست لێرەدا واتە: کەمتر نەبوو لەوە بەڵکو زیاتر بوو. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ واتە: هەموو بڕوایان پێ هێناو تا ماوەیەك ژیانێکی خۆشمان پێدان. واتە: خەڵکەی کە یونس پێغەمبەر ڕەوانەکرا بۆیان هەموو بڕوایان هێنا، ﴿فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ هەتا ئەو کاتەی بۆیان دانرابوو. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا۟ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾[5] واتە: جا با (خەڵکی) شارێك (لەو شارانەی کە هەڕەشەیان لێکرا) بڕوایان بهێنایەو بڕواکەیان سودی بۆیان هەبووایە بەڵام گەلی یونس (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك هەموو بڕوایان هێنا (پێش هاتنی سزاکە) لامان برد لە سەریان سزای سەرشۆڕیو ڕیسوایی لە ژیانی دنیاداو بەهرەو خۆشیمان پێدان تا ماوەیەك (کاتی مردنیان).

---

[1] الطبري (٢١/١١٦).

[2] البقرة (٧٤).

[3] النساء (٧٧).

[4] النجم (٩).

[5] يونس (٩٨).

﴿ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ (١٤٩) أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ (١٥٠)
أَلَا إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ (١٥١) وَلَدَ اللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ (١٥٢) أَصْطَفَى الْبَنَاتِ عَلَى الْبَنِينَ (١٥٣) مَا لَكُمْ
كَيْفَ تَحْكُمُونَ (١٥٤) أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (١٥٥) أَمْ لَكُمْ سُلْطَانٌ مُّبِينٌ (١٥٦) فَأْتُوا بِكِتَابِكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ (١٥٧) وَجَعَلُوا بَيْنَهُ
وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ (١٥٨) سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ (١٥٩) إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ
الْمُخْلَصِينَ (١٦٠) ﴾

**وەڵامدانەوەی ئەوانەی کە منداڵ بۆ خودا دادەنێن و فریشتەکانیان بە کچی خودا داناوە**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَاسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴾ واتە: دەسا تۆ لەوانە بپرسە: تۆ بڵێی پەروەردگاری تۆ کیژی هەبێت و هی ئەوان کوڕ بێت؟ خوای گەورە وەڵامی ئەو بتپەرستانەی داوەتەوە و نکوڵی دەربڕیوە لەوەی ئەوان کیژیان داناوە بۆخوا و خۆشیان حەزیان لەچییە بۆیان بڕیارداوە، واتە: حەز لە کوڕی باش دەکەن بۆ خۆیان. خواش ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾[1] واتە: هەر کاتێك یەکێك لەوانە مزگێنی کچی پێ بدرێت ڕووی ڕەش دادەگەڕێت و بۆ خۆی پیش دەخواتەوە. واتە: ئەوەی بۆ خودای داناوە بۆ خۆی پێی ناخۆشە. کوڕ نەبێت بۆ خۆی دانانێت و هەڵی نابژێرێت، خوای مەزنیش دەفەرموێت: ئایا چۆن ئەو بەشەی بۆ خودایان بە ڕەوا داناوە بۆ خۆیانی دانانێن و پێی ڕازی نین، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَاسْتَفْتِهِمْ ﴾ ئادەی لەوانە بپرسە چۆن قسەی وا دەکەن، ﴿أَلِرَبِّكَ الْبَنَاتُ وَلَهُمُ الْبَنُونَ ﴾ باشە بۆئەوەی خوا کچی هەبێت و کەچی خۆیان کوڕیان هەبێت! وەك ئەم ئایەتانەی تریش کە خودا دەفەرموێت: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ (٢١) تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴾[2] واتە: ئایا ڕاستە ئێوە کوڕتان ببێت و خوا کچ؟، ئەگەر وابێت دابەشکردنێکی نادروست دەبێت. وە دەفەرموێت: ﴿ أَمْ خَلَقْنَا الْمَلَائِكَةَ إِنَاثًا وَهُمْ شَاهِدُونَ ﴾ واتە: یان لەوێ بوون کە ئێمە فریشتەکانمان بە مێ دروست کرد؟ واتە: چۆن بڕیاریان دا فریشتەکان کیژن کە چاویان لێ نەبووە دروست کراون؟ وەك ئەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ

[1] النحل (٥٨).

[2] النجم (٢١_٢٢).

وَيُسْـَٔلُونَ﴾[1] واتە: وە ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بە مێینەیان دادەنان ئایا ئەوان بە دیاری دروستکردنیانەوە بوون بێگومان ئەو شایەتیانەی دەنوسرێت‌و پرسیاریان لێ دەکرێت. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری ئەوەیان لێ دەکرێت، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ﴾ واتە: باش بزانە هەرچی دەیلێن هەر درۆیان هەڵدەبەست. ﴿وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ واتە: کە خودا منداڵی بووە، بێگومان درۆزنن. خوای گەورە باسی کردووە کە ئەوانە لە بارەی فریشتەکانەوە سێ درۆی زۆر گەورەیان کردووە، درۆی یەکەم بە کیژی خودایان داناون، دووەم کردوویانن بە منداڵی خودا کە خودا پاک‌و بێ عەیبە لەو قسانەی ئەوان دەیکەن، پاش ئەوەش کە بە مێ دایان ناون پەرستوویانن، هەریەکی لەمانە بەسە بۆ ئەوەی هەتاهەتایە لەناو ئاگردا بمێنێتەوە، پاشان خوای مەزن نارەزایی دەردەبڕێت لێیان دەفەرموێت: ﴿أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ﴾ واتە: ئاخۆ ئەو بە جێی کوڕ، کچی هەڵبژاردووە؟ واتە: چی پاڵی پێوە ناوە کە کچ هەڵبژێرێت‌و کوڕ واز لێ بێنێت‌و هەڵی نەبژێرێت. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا﴾[2] واتە: ئایا پەروەردگارتان کوڕانی تایبەت کردووە بە ئێوەوە لە فریشتەکانیشیدا کچانی بۆ خۆی هەڵبژاردووە بە ڕاستی ئێوە وتەیەکی زۆر گەورە (و نابەجێ) دەڵێن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾ واتە: چیتانە، چۆن پێ ڕادەگەن. واتە: ئاوەزتان نیە بیربکەنەوە پێی کەچی دەڵێن، ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: ئاخۆ هیچ بیرناکەنەوە. ﴿أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ﴾ یان بەڵگەیەکی پتەوتان لەلا هەیە؟ واتە: چ بەڵگەیەکتان بە دەستەوەیە لەسەر ئەو قسانەی دەیکەن، ﴿فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ واتە: ئەگەر قسەی ئێوە ڕاستە، سا کتێبی خۆتان بێنن. واتە: بەڵگەی خۆتان بێنن لەسەر ئەو قسەی کە دەیکەن کە پشت ببەستێت بە کتێبێکەوە لە ئاسمانەوە هاتبێتەخوار لە لایەن خواوە. کە ئەوەی بۆ خۆی هەڵبژاردبێت کە ئێوە دەیڵێن، چونکە ئەوەی ئێوە دەیلێن هیچ عەقڵێك نایسەلمێنێت‌و بڕوای پێ ناکات، وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾ واتە: جنۆکە لەگەڵ خودا دەکەنە خزم، جنۆکەکانیش باش دەزانن کە ئەوان ئامادە دەکرێن. ﴿وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا﴾ واتە:

---

[1] الزخرف (١٩).

[2] الاسراء (٤٠).

موجاهید دەڵێت: بتپەرستان وتیان: فریشتەکان کیژی خوای گەورەن، ئەبو بەکر دەڵێت: کەواتە دایکیان کێیە؟ وتیان: کیژانێکی خانەدانی ناو جنۆکەن[1]! قەتادەو ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ عَلِمَتِ ٱلۡجِنَّةُ﴾ واتە: ئەوانەی ئەو قسەیان دابووە پاڵ جنۆکەکان ﴿إِنَّهُمۡ لَمُحۡضَرُونَ﴾ دەهێنرێن و ئامادە دەکرێن بۆ جەزرەبەدان و لێپرسینەوە لەسەر ئەو درۆی کە کردوویانەو هەڵیانبەستووە لە خۆیانەوە بەبێ زانیاری. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: خودا دوورە لەو باسانەی ئەوان دەیکەن. واتە: خوای گەورە پاک و بێ عەیبە لەو قسانەی ئەو خوانەناس و بێ دین و ستەمکارانە دەیکەن و دەڵێن: خودا منداڵی بووە. ﴿إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ واتە: مەگین ئەوەی بە دڵپاکی عەبدایەتی خودا دەکەن. ئەمە لێرەدا ئیستیسنای مونقەتیعە لە ڕستەی موسبەتدا دەبێ ئەو زەمیرەی (الضمير) لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێت: ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ بگەڕێتەوە بۆ هەموو خەڵکی، پاشان دڵپاکانی ﴿ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ لێ جیاکرابێتەوە ئەوانەی کە شوێنکەوتووی ئەو هەقەن کە هاتووەتە خوارەوە بۆ هەموو پێغەمبەرێك کە ڕەوانەکراوە.

﴿فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُواْ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوۡ أَنَّ عِندَنَا ذِكۡرٗا مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿١٧٠﴾﴾

## کەسێك لە خەڵکی بتپەرست گومڕاتر نەبێت بە قسەیان ناکات

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ﴾ واتە: سا وا ئێوەو ئەوانەی دەیانپەرستن. ﴿مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ بِفَٰتِنِينَ﴾ واتە: ئێوە ناتوانن لە بەرامبەر خودا گومڕاکەری (کەس) بن. ﴿إِلَّا مَنۡ هُوَ صَالِ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: مەگین ئەوەی دەچێتە نێو دۆزەخەوە. واتە: کەسێك شوێن قسەکانتان دەکەوێت و باوەڕ بەو سەرلێشێواوی عیبادەتە پڕوپوچەتان دەکات لە خۆتان گومڕاتر بێت و بۆ ناو ئاگر دروست کرابێت، ﴿لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾[2] واتە: دڵیان هەیە بەڵام پێی تێناگەن (لە ڕاستی)و چاویان هەیە (هەقی) پێ نابینن و گوێیان هەیە (هەقی پێ) نابیستن ئەوانە وەك ئاژەڵ و (چوارپێ) وان بگرە خراپترو گومڕاترن

---

[1] الطبري (٢١/١٢١).

[2] الاعراف (١٧٩).

(لە ئاژەڵ) هەر ئەوانەن بێ ئاگایان. تا ئەم کۆمەڵە خەڵکەن کە شوێنی ئایینی بتپەرستو خوانەناسو گومڕایان دەکەون وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّكُمْ لَفِى قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ ۝ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾[1] واتە: بێگومان ئێوە لە قسەی جیاوازدان، ئەو کەسە لادەدرێت لە ئیمان کە لادراوە (چونکە خۆی گومڕایە).

## جێگای فریشتەکانو ڕیزبەستنیان بۆ خواپەرستی

پاشان خوای گەورە باسی فریشتەکان دەکات کە پاكو دوورن لەو قسانەی کە ئەو بتپەرستانە داویانەتە پاڵیانو درۆیان کردووەو وتوویانە فریشتەکان کیژی خودان، دەفەرمووێت: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ﴾ واتە: لەناو ئێمە هەر کامێکمان جێگەی بۆ دیاری کراوە. واتە: هەر یەکێك لە ئێمە شوێنی تایبەتی خۆی بۆ دیاری کراوە لە ئاسمانەکانداو جێگای عیبادەتیشی دیاری کراوە، لێی دەرناچێتو دوورناکەوێتەوە. زەححاك لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ﴾ مەسروق ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ جێگەیەك نیە لە ئاسمانەکانی دنیادا مەگین فریشتەیەك لە سوژدەدایە لەسەری یان وەستاوە). بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت لە زمانی فریشتەکانەوە: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ﴾.[2] لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لەناو ئاسمانەکاندا ئاسمانێك هەیە جێگەی بستێك نیە مەگین تەوێڵی یان پێی فریشتەیەکی لەسەرە پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ﴾[3] سەعیدی کوڕی جوبەیریش هەر وای وتووە. ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ﴾ ئێمەین کە بۆ خواپەرستی ڕیز دەبەستین. واتە: بەڕیز وەستاوین بۆ خواپەرستی وەك لە پێشەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا﴾ ئەبو نەزیرە دەڵێت: عومەر کاتێك قامەتی نوێژ دەکرا، ڕووی دەکردە خەڵکەکە پاشان دەیوت: ڕێز بنو ڕێك بوەستن خوای مەزن دەیەوێت فێرتان بکات وەك فریشتەکان بن، پاشان دەیفەرموو: ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ﴾، جا دەیفەرموو: فلانە کەس بێرە پێشو فلانە کەس بچۆ دواوە پاشان (الله أکبر)ی دەکرد (واتە: نوێژی دادەبەست). ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردووە.[4] وە لە سەحیحی موسلیمدا ڕیوایەت کراوە لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] الذاريات (٨ـ٩).

[2] الطبري (٢١/١٢٧).

[3] الطبري (٢١/١٢٧).

[4] الطبري (٢١/١٢٨).

فەرموویەتی: (ڕێزمان لێ نراوە بە سێ شت بەسەر خەڵکیدا، ڕیزەکانمان کراوە بە ڕیزی فریشتەکانو زەویشمان بۆ کراوە بە مزگەوتو خۆڵەکەیشی کراوە بە پاککەرەوە بۆمان).[1] ﴿وَإِنَّا لَنَحْنُ الْمُسَبِّحُونَ﴾ واتە: ئێمەین هەرگیز لە تاریفی ڕاناوەستین. واتە: ئێمە ڕیز دەبەستینو لە وەسفی خودا ڕاناوەستینو سوپاسی دەکەینو باسی پاکیو بێ عەیبی ئەو دەکەینو عەبدێکی هەژارو گوێڕایەڵی ئەوین.

## خۆزگەی قورەیشیەکان کە بریا ئەوانیش لە ناو پێشینانندا کتێبی خۆیان هەبووایە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَانُوا لَيَقُولُونَ﴾ واتە: ئەوانیش خۆ هەر دەیانوت. ﴿لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ الْأَوَّلِينَ﴾ واتە: ئەگەر ئێمەش لە لایەن پێشینانەوە کتێبی خۆمان هەبووایە. ﴿لَكُنَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ﴾ ئێستا لە عەبدە دڵپاکەکانی خودا دەبووین. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەوانە ئارەزوومەند بوون پێش ئەوەی تۆ ڕەوانە بکرێیت بۆ لایان کتێبی خۆیان بوایە، باسی فەرمانەکانی خودای بۆ بکردنایەو بەسەرهاتی گەلە پێشووەکانی بگێڕایەتەوە بۆیان. وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا﴾[2] واتە: (بتپەرستان) بە سویندی هەرە گەورەیان سوێندیان دەخوارد بە خوا (دەیانوت) ئەگەر پێغەمبەرێکی ترسێنەریان بۆ بێت بە ڕاستی ئەوان لە هەریەك لە ئوممەتانی تر بەرچاو ڕوونتر دەبن ئێنجا کاتێك پێغەمبەری ترسێنەریان بۆ هات زیاتر دوورکەوتنەوە (لە ڕێگەی ڕاست). وە فەرموویەتی: ﴿أَن تَقُولُوا إِنَّمَا أُنزِلَ الْكِتَابُ عَلَىٰ طَائِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَاءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِي الَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ آيَاتِنَا سُوءَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يَصْدِفُونَ﴾[3] واتە: لەبەر ئەوەی نەڵێن بێگومان تەنها بۆ سەر دوو کۆمەڵی (گاورو جوولەکە) نێردراوەتە خوارەوە لە پێش ئێمەدا کە بە ڕاستی ئێمە لە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی کتێبەکان بێ ئاگا بووین، وە بۆ ئەوەی نەڵێن بە ڕاستی ئەگەر کتێبی ئاسمانی بۆ ئێمە بهاتایە ئەوە ئێمە لەوان بەرچاو ڕوونتر دەبووین ئەوە بێگومان بەڵگەو نیشانە (قورئان)ی ڕوونتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە کە بەرچاو ڕوونیو میهرەبانیەکی گەورەیە کەواتە کێ ستەمکارترە لەو

---

[1] مسلم (٣٧١).

[2] الفاطر (٤٢).

[3] الانعام (١٥٦_١٥٧).

کەسەی بێباوەڕ بێت بە ئایەتەکانی خواو بە درۆی بزانێت‌و ڕوویان لێ وەرگێڕێت لەمەودوا بە زوویی تۆڵە دەسێنین لەوانەی سەرپێچی دەکەن لە ئایەتەکانی ئێمە بە سزایەکی بەدو سەخت بە هۆی ئەو لادانەوە کە دەیانکرد. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَكَفَرُواْ بِهِۦۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾ واتە: لە کتێبی خوا حاشایان کرد زۆر ناخایەنێت دەزانن. ئەمە بێگومان بەڵێنی خودایەو هەڕەشەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر ئەو بێباوەڕییەیان بە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

﴿وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمۡ لَهُمُ ٱلۡمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿١٧٤﴾ وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿١٧٨﴾﴾

## بەڵێندان بە سەرکەوتن‌و فەرماندان بە وازهێنان لە قورەیشییەکان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾ واتە: بێگومان لە پێشیش قسەکانی ئێمە (سەبارەت بە عەبدە ناردراوەکانمان) بە مەردم ڕاگەیەنراوە. واتە: لە کتێبی یەکەمدا لە لای خودا هەموو شتێك براوەتەوە کە پاشەڕۆژ هەر بۆ پێغەمبەران‌و (سەلامی خوایان لێ بێت) شوێنکەوتووەکانیانە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ﴾[1] واتە: خوا نووسیویەتی کە بێگومان من‌و پێغەمبەرانم سەردەکەوین بە ڕاستی خوا توانای باڵادەستە. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژەی (قیامەت)دا کە شایەتەکان هەڵدەسنەوە. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ سَبَقَتۡ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمۡ لَهُمُ ٱلۡمَنصُورُونَ﴾ کە هەر ئەوان یاریدە دەدرێن. لە دنیاو لە دوارۆژدا، وەك لە پێشەوە باس کرا کە چۆن سەری خستن بەسەر گەلەکانیاندا ئەوانەی کە بڕوایان پێ نەکردن‌و دژایەتیان دەکردن. چۆنیش خوانەناسانی قڕ کردو عەبدە خاوەن باوەڕەکانی ڕزگار کرد. ﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ﴾ واتە: دیاریشە هەر سوپای ئێمە سەردەکەوێت. واتە: پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوانە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ﴾ واتە: سا تۆ وازیان لێ بێنە هەتا ماوەیەك.

---

[1] المجادلة (٢١).

[2] الغافر (٥١).

واتە: خۆت بگرە لەسەر ئەو ئازارەی کە تووشت دەبێت لێیانەوە هەتا ماوەیەك وازیان لێ بێنە ئێمە سەرکەوتن‌و زاڵبوون‌و پاشەڕۆژ دەدەین بە تۆ. وە دەفەرموێت: ﴿وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ واتە: جا بیانبینە، ئەوانیش خۆ دەبیننەوە. واتە: چاوەڕوانیان بەو سەیریان بکە چۆن تووشی جەزرەبەو مەینەت‌و ناڕەحەتی دەبن لەسەر دژایەتی‌و باوەڕ پێ نەکردنت، بۆیە خوای گەورە هەڕەشەیان لێدەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾، پاشان دەفەرمووێت: ﴿أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ﴾ واتە: دەیانەوێت زووتر ئازاریان بدەین؟ واتە: ئەوانە بۆیە پەلە دەکەن چونکە بڕوات پێ ناکەن‌و خوانەناسن خوای گەورەیش تووڕە بووە لێیان‌و تۆڵەیان زوو لێ دەسێنێت‌و خۆشیان هەر پەلەیانە کە زوو تۆڵەو سزایان بۆ بێت چونکە ئەوە خوانەناس‌و بێباوەڕن. خوای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ﴾ واتە: هەر کاتێك بێتەخوارو بەری دەرگایان لێ بگرێت ئەوسا ترسێنراوان چ ڕۆژێکی خراپ‌و تەنگیان دەبێت. واتە: کاتێك سزا دادەبەزێتە سەریان‌و دەوری گرتن ئەو ڕۆژە چ ڕۆژێکی خراپ‌و گرانە کە کاتێك قڕ دەبن‌و شوێنەواریان نامێنێت. سودی دەڵێت: ﴿فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ﴾ واتە: کاتێك بەرماڵی پێ گرتن، ﴿فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ﴾ بەیانیەکی ناخۆش دەبەنە سەر. واتە: ئەو بەیانیە بەیانیەکی زۆر خراپە بۆیان. بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەیانی زوو دای بەسەر خەیبەردا وەختێك کە تەورو بێڵەکانیانەوە چوونە دەرەوە ئەو سوپایان بینی گەڕانەوەو دەیانوت: بە خوا موحەممەد هات موحەممەدو سوپاپێنج قۆڵییەکەی، پێغەمبەر فەرمووی: (الله أكبر خەیبەر وێران بوو ئێمە کاتێك دابەزینە خوار چوینە بەر دەرگای هەر گەلێك بەیانی ترسێنراوان زۆر خراپ دەبێت).[1] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ﴾ واتە: تۆ هەتا ماوەیەك واز لەوانەش بێنە. ﴿وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ﴾ جا ببینە ئەوانیش خۆ دەبیننەوە. تەئکیدکردنەوەی ئەو فەرمانانەیە کە لە پێشەوە باس کرا لەو بارەیەوە والله أعلم.

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٢﴾﴾

خوای مەزن باسی پاکی‌و بێ عەیبی خۆی دەکات لە هەموو ئەو شتانەی کە خوانەناسان‌و ناهەقیکاران‌و بێباوەڕان دەیڵێن لە بارەیەوە کە چەندە دوورە لەو قسانەوە ئەوان دەیکەن‌و دەفەرمووێت: ﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ واتە: پاکی بۆ پەروەردگاری تۆ، هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتە و لەو قسانەی ئەوان دەربارەی دەکەن گەلێك دوورە. واتە: خاوەنی دەسەڵاتێکی

---

[1] فتح الباري (٢/١٠٧)، مسلم (٢/١٠٤٣).

دوایی نەهاتووە، ﴿عَمَّا يَصِفُونَ﴾ کەلێك دوورە لەو قسانەی ئەو خوانەناسو بێباوەڕو تاوانبارانە دەیکەن. ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ واتە: سڵاویش لە پێغەمبەران. واتە: سڵاوی خوای مەزن لە پێغەمبەران لە دنیاو لە قیامەتدا لەبەر ئەوەی کە لە دنیا بە ڕاستو ڕێکی باسی پاکیو بێ عەیبی خودایان کردووە، ﴿وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: سوپاسیش بۆ ڕاهێنەری هەموو دنیا. واتە: سوپاس بۆ خودا لە دنیاو لە قیامەتداو لە هەموو کاتێکدا لەبەر ئەوەی تەسبیح کردن پاکیو بێ عەیبی خودا دەگەیەنێت بۆیە لێرەداو لە زۆر شوێنی تردا لە قورئاندا هاتووە وەك خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾

سەعیدی کوڕی ئەبو عوروبە دەڵێت: لە قەتادەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەختێك سڵاوتان کرد لە من سڵاویش لە هەموو پێغەمبەران بکەن چونکە منیش یەکێکم لەو پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێ بێت). هەر بەم شێوەیە ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەمیش ڕیوایەتیان کردووە.[1] ئەبو موحەممەدی بەغەوی ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیرەکەیدا لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: هەر کەسێك پێی خۆشە پێوانەی بۆ بکرێت بە پێوانەی تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا با کۆتا قسەی لە دانیشتنیدا بریتی بێت لە﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[2]. چەند فەرموودە هاتووە لە بارەی کەفارەتی مەجلیسەوە (لەوانە): (سبحانك اللهم وبحمدك لا إلە إلاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك) منیش(جزئێکی) سەربەخۆ و تایبەتم نوسیوە لەسەر ئەو فەرموودانە.

## تەفسیری سورەتی (ص)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾﴾

قسەکردن لەسەر ئەم پیتانە لە پێشەکی سورەتی (البقرة)دا کراوە کە پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿صٓ ۚ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ﴾ واتە: صاد، بەم قورئانەی کە

---

[1] الطبري (٢١/١٣٢).

[2] البغوي (٤/١٤٦).

پڕ لە ئامۆژگاریە. (دەبێت پەندی لێ وەربگیرێت). واتە: سوێند بەم قورئانەی کە پڕە لە پەندو ئامۆژگاریو سودمەندە بۆیان لە ژیانی دنیاو ڕۆژی قیامەتدا. زەححاك لەم ئایەتەدا ﴿ذِى ٱلذِّكْرِ﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ﴾[1] واتە: ئێمە کتێبێکمان بۆ ئێوە ناردووەتە خوار باسی ئێوەشی تێدایە یان یادخستنەوەی ئێوەی تێدایە[2]. قەتادەو ئیبنو جەریریش هەر وایان وتووە.[3] ئیبنو عەباسو سەعیدی جوبەیرو ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالدو ئیبنو عویەینەو ئەبو حوسەیْنو (حُصين) ئەبو سالحو سودی دەڵێن: ﴿ذِى ٱلذِّكْرِ﴾ واتە: زۆر بەڕێزە، یانی: خاوەن پلەو ڕێزە.[4] هیچ دژایەتیەك لە نێوان ئەم دوو ڕایەدا نیە. چونکەئەم قورئانە کتێبێکی زۆر بە ڕێزە و پڕیشە لە پەندو ئامۆژگاریو ترساندن، لە وەڵامی ئەم سوێندەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾[5] واتە: هەر هەموویان باوەڕیان بە پێغەمبەران نەهێنا بۆیە سزای منیان بەسەردا چەسپا (و لەناوچوون). قەتادە دەڵێت: وەڵامەکەی ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾[6]. ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[7] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ﴾ واتە: بەڵام خوانەناسەکان، خۆیان بە زل دەزاننو هەر خەریکی دژایەتین. واتە: لەناو ئەم قورئانەدا ئامۆژگاری زۆرە بۆ کەسێك کە ئامۆژگاری وەربگرێتو پەندیشە بۆ کەسێك ئەگەر دەرسی لێ وەربگرێت بەڵام خوانەناس هیچ سودێکی لێ وەرناگرێت چونکە ئەوانە ﴿فِى عِزَّةٍ﴾ زۆر خۆیان بە زل دەزاننو نەفامانە بیردەکەنەوە ﴿وَشِقَاقٍ﴾ واتە: دژایەتی دەکەنو لاسارنو دوور دەکەونەوە لێی. پاشان خوای مەزن دەیانترسێنێت بەوەی کە گەلەکانی پێش ئەوان بە هۆی خوانەناسیو دژایەتی پێغەمبەرانو باوەڕنەکردن بەو کتێبانەی کە لە ئاسمانەوە هاتوون لەناوچوون دەفەرموێت: ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾ واتە: پێش ئەمانەش زۆر بەرەمان لەناو بردن، جا ئەوانە کاتێك هاواریانکرد، دەرفەت لە دەست چووبوو. ﴿كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم﴾

---

[1] الانبياء (١٠).
[2] الطبري (٢١/١٤٠).
[3] الطبري (٢١/١٤٠).
[4] الطبري (٢١/١٣٩/١٤٠).
[5] ص (١٤).
[6] الطبري (٢١/١٤٠).
[7] الطبري (٢١/١٤١).

واتە: زۆرێك لەو گەلانەی کە بێباوەڕ بوون لەناومانبردن لە پێش ئەمان ﴿فَنَادَوا﴾ واتە: کاتێك کە سزایان بۆ دێت هاوار دەکەنو دەپاڕێنەوە لە خودا کە هیچ سوودێکی لێ وەرناگرن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأۡسَنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ﴾[1] واتە: جا وەختێك (بێباوەڕان) هەستیان کرد بە سزاو تۆڵەی ئێمە دەستبەجێ ئەوان لەو شارانە بە چەسپانی ڕایانکرد، (فریشتەکان بە گاڵتەوە پێیان دەڵێن) ڕامەکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو نازو نیعمەتانەی کە ڕۆچوون تێیداو (بگەڕێنەوە) بۆ سەر خانوو ماڵەکانتان بەڵکو پرسیارتان لێ بکرێت (لەوەی بەسەرتان هاتووە). ئەبو داودی تەیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە تەمیمیەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) لەمانای ئەم ئایەتە کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ﴾ دەڵێت: وەختی پاڕانەوەو داواکردنو ڕاکردن نیەو کاتی بەسەرچووە. موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێت: ﴿فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ﴾ واتە: کاتێك دنیایان لە دەستچوو هاوار دەکەنو شایەتومان دێننو دەپاڕێنەوەو پەشیمان دەبنەوە.[2] قەتادە دەڵێت: کاتێك جەزرەبەیان بینی دەیانەوێت پەشیمان ببنەوەو هاوار دەکەن کە کاتی هاوارکردن نەماوە. موجاهید دەڵێت: ﴿فَنَادَواْ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٖ﴾ واتە: ئەو کاتە کاتی ڕاکردنو ڕۆیشت نیە، خواش(سبحانه وتعالى) یارمەتیدەرە بۆ ڕاست وتن و ڕاست کردن.

﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلۡمَلَأُ مِنۡهُمۡ أَنِ ٱمۡشُواْ وَٱصۡبِرُواْ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٞ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٞ مَّا هُنَالِكَ مَهۡزُومٞ مِّنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿١١﴾﴾

### سەرسامی بتپەرستان بەم پەیامو قورئانو یەکخوا پەرستینە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَعَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡۖ وَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٞ كَذَّابٌ﴾ واتە: ئەمەیان پێ سەیر بووە کە پێغەمبەرێکیان لە خۆیان بۆ هاتووەو ترسی خوایان وەبەر دەنێت

---

[1] الانبياء (١٢ـ١٣).

[2] الدر المنثور (١٤٥/٧).

خوانەناسەکان وتیان: ببیّ نەبیّ، ئەم کابرایە جادووگەرێکی درۆزنە. خوای گەورە باسی سەرسوڕمانی بتپەرستەکان دەکات لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە خۆیان کە مژدەدەرو ترسێنەروە بۆیان وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ الْكَافِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَاحِرٌ مُّبِينٌ ﴾[1] واتە: ئایا بە لای خەڵکەوە سەیرە کە ئێمە نیگامان کردووە بۆ پیاوێك لە خۆیان (پێمان وتووە) کە ئادەمی بترسێنەو مژدە بدە بەوانەی باوەڕیان هێناوە کە بە بێگومان پلەو پایەی بەرزیان بۆهەیە لای پەروەردگاریان بەڵام بێباوەڕان وتیان بێگومان ئەم (پیاوە) جادوبازێکی ئاشکرایە. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَعَجِبُوا أَن جَاءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ﴾ واتە: مرۆڤێك لە خۆیان. خوانەناسەکانی وتیان: ﴿هَٰذَا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴾ ئەمە جادوگەرێکی درۆزنە. ئاخۆ وادەزانیّ کە خودا یەکەو هیچ کەس خودا نیە ئەو نەبێت؟ بتپەرستان نکوڵیان لەو بیرو باوەڕە کردووە –خودا ڕوویان ڕەش بکات–. وە زۆر بە لایانەو سەیر بوو کە واز لە بتپەرستن بێنن، چونکە ئەوان لە باب و باپیرانیانەوە ئەو بتپەرتیەیان بۆ مابووەوە. خۆشەویستی ئەو بتانە لەناو دڵیاندا جێگیر بووبوو. کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێ کردن کە واز لەو بتپەرستیە بێنن و لە دڵی دەرکەن و تەنها خوا بپەرستن زۆر بە لایانەوە گران بوو سەریان سوڕدەماو دەیانوت: ﴿ أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ ﴾ چۆن دەیەوێت لە جێی ئەو هەموو بتانەی دەتانپەرست هەر خودایەك بپەرستن؟ ئەمە زۆر شتێکی سەیرە. ﴿وَانطَلَقَ الْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴾ کەڵەپیاوانیان کەوتنەڕێ (وتیان پێیان) بڕۆن و لەسەر ئەوانەی تا ئێستا پەرستووتانن، لامەدەن و خۆڕاگر بن، بێگومان ئەمە ویستی ئێوەیە. ﴿الْمَلَأُ مِنْهُمْ ﴾ واتە: پیاوماقوڵ و سەرۆك و پێشەواو گەورەکانیان دەیانوت: ﴿امْشُوا ﴾ واتە: بەردەوام بن لەسەر ئایینی خۆتان، ﴿امْشُوا وَاصْبِرُوا عَلَىٰ آلِهَتِكُمْ ﴾ وەلامی ئەو قسانەی موحەممەد مەدەنەوە کە بانگتان دەکات بۆ خواپەرستی بە تەنها، ﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴾ ئەمە مەبەستێکی تری لەپشتەوەیە! ئیبنو جەریر دەڵێت: دەڵێن ئەوەی کە موحەممەد بانگمان دەکات بۆی شتێکە دەیەوێت خۆی پێ گەورە بکات بەسەر ئێوەداو ببێتە خاوەن دەسەلات. هەندیّ لە ئێوە شوێنی بکەون. ئێمە هیچ وەختێك لەگەڵی نین و وەلامیشی نادەینەوە.[2]

---

[1] یونس (٢).

[2] الطبري (٢١/١٥٢).

**باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزانە**

ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ئەبو تالیب نەخۆش کەوت کۆمەڵێك لە قورەیشیەکان چوونە لای. ئەبو جەهلیشیان لەگەڵ بوو وتیان: برازاکەت قسە بە خواکانمان دەڵێت وا دەکاتو وا دەکات، وا دەڵێتو وا دەڵێت. خۆ ئەگەر بانگت بکردایەو ئاگادارت بکردایە شتێکی باش بوو. ئەبو تالیب ناردی بە شوێنیدا، پێغەمبەر(ﷺ) هاتو چووە ژوور لە نێوان ئەو خەڵکەو ئەبو تالیبدا شوێنی نەفەرێك چۆڵ بوو، دەڵێت: ئەبو جەهل (نەعلەتی خوای لێ بێت) ترسا لەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە تەنیشتی ئەبو تالیب دانیشێتو دڵی پێی بسوتێ هەڵسا ڕۆیشت لەو شوێنە دانیشت. پێغەمبەر(ﷺ) شوێنی نەما لە تەنیشك مامی دانیشێت. لە لای دەرگاکە دانیشت. ئەبو تالیب پێی وت: ئەی برازای خۆم! بۆچی ئەم خزمانەت شکاتت لێ دەکەن دەڵێن: تۆ قسە بە خوداکانیان دەڵێی. ئاواوئاوا دەڵێت؟ قورەیشیەکان زۆریان وت لە بارەی پێغەمبەرەوە (ﷺ)،پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (ئەی مامە من تەنها یەك وتەم لەوان دەوێت بیڵێن بەو وتەیە هەموو عەرەب شوێنیان دەکەوێتو هەر بەو وتەیە عەجەمیش سەرانەیان بۆ دێنن). ڕاچڵەکان لەم قسەیەی پێغەمبەر و هەموو وتیان: تەنها یەك وتە. بە گیانی باوکت دە وتەیش هەر باشە. وتیان ئەو وتەیە کامەیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لا إلە إلاّ الله) هەڵسان تێکچوونو جلەکانیان دەتەکاندو دەیانوت: ﴿ أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ﴾ دەڵێت: لەسەر ئەم باسە ئەم ئایەتانە تا: ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾ هاتنە خوارەوە. ئەمە قسەی ئەبو کورەیبە[1]. ئیمامی ئەحمەدو نەسائیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.[2] خوای گەورە دەفەرموێت ئەوانە دەڵێن: ﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ﴾ واتە: ئێمە لە دینەکەی تردا شتی وامان نەبیستووە، ئەمە ڕاستی تێدا نیەو هەڵبەستەیە. ﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: ئەم ئاینەی موحەممەد (ﷺ) ئێمەی بۆ بانگ دەکات کە بە تەنها خودا بپەرستین لە ئاینەکەی تردا نەمانبیستووە. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە(ڕەزای خوا لەهەردووکیان بێت) ﴿مَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِي ٱلۡمِلَّةِ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ واتە: ئاینی مەسیحی، وتیان: ئەگەر ئەم قورئانە ڕاست بووایە مەسیحیەکان هەواڵیان دەداینێ.[3] ﴿إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا ٱخۡتِلَٰقٌ ﴾

---

[1] الطبري (١٤٩/٢١).

[2] احمد (٣٦٢/١)، النسائي في الكبرى (٤٤٢/٦)، تحفة الأحوذي (٩٩/٩)، ڕێگەی ئەم فەرموودە لاوازە.

[3] الطبري (١٥٢/٢١).

قەتادەو موجاهید دەڵێن: واتە: درۆیە.[1] ئیبنو عەباس دەڵێت: واتە: هەڵبەستراوە.[2] ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَاۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّن ذِكۡرِيۚ بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾ واتە: چۆن لەناو هەموومانـدا قورئـان هـەر بـۆ ئـەو هاتووە؟ دوو دڵیشن کە قورئـان مـن ناردبێتم، هێشتا ئازاری ئێمـەیان نەچەشتووە. ئەمانـە دەڵێن: ﴿ أَءُنزِلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ مِنۢ بَيۡنِنَا﴾ ئایا لەناو ئێمەدا قورئان هەر بۆ ئـەو هـاتووە؟ زۆر بـە دووری دەزانـن کـە قورئان تەنها بۆ ئەو بێتە خـوارەوە لـەناو ئـەو هـەموو خەڵکـەدا وەك خـوای مـەزن لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ﴾[3] واتـە: وە وتيـان بۆچـی ئـەم قورئانە نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ پیاوێکی گـەورەی (نـاودارو دارا) لـەم دوو شـارە (مەککـەو طـائف). خـــوایش دەفـــەرمووێت: ﴿ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ﴾[4] واتە: ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگارت دابەش دەکەن لە کاتێکدا ئێمە لە نێوانیاندا دابەشمان کردووە هۆی گوزەرانیان لە ژیانی ئەم دونیایەداو هەندێکیانمان چەند پلـە بـەرز کردووەتەوە بەسەر هەندێکی تریاندا. بۆیە کاتێك کە وا دەڵێن: قسەکەیان بەڵگەیە لەسەر نـەزانیو بـێ ئاوەزیان کە بە لایانەوە دوورە پێغەمبەرێك لەناو خۆیاندا ڕەوانە بکرێت. خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿بَل لَّمَّا يَذُوقُواْ عَذَابِ﴾ واتە: بۆیە ئەو قسانە دەکەن چونکە هەتا ئەو کاتەی کە ئەوقسەیەی تێدا ئەکـەن سزای ئێمەیان نەچەشتووە. بەم زووانە باجی ئـەو قـسانەو ئـەو بێباوەڕیـەیان ئـەدەن لـە ڕۆژێکدا کـە هەموو بانگ دەکرێن بۆ ناو ئاگری جەهەنەم. پاشان خوای مەزن ڕوونی دەکاتەوە کە هەر خۆی هـەموو شتێکی بە دەستەو خاوەنیەتی. هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکات مەیلی هەر کەس بێت پێی دەبەخشێت مەیلی لێ بێت هەر کەسێك بکاتە خاوەن دەسەڵات دەیکاتو مەیلیشی لە هەر کەسێك بێت سەرشۆڕی بکات دەیکات، مەیلی لێ بێت ڕێگا نیشانی کەسێك بدات دەیداتو هـەر کەسیش گومڕا بکـات گومڕای دەکات، جوبرەئیل بە فەرمانی خۆی بـۆ هـەر کەسێك مـەیلی لێ بێـت ڕەوانـە دەکـات لـە عەبدەکانیو مۆریش دەنێت بەسەر دڵی هەر کەسێکدا خۆی مەیلی لێ بێت کەسیش ناتوانێت لـە پـاش خـودا ڕێـی نیشان بـدات. چـونکە عەرەبـەکان خـاوەنی هـیچ شـتێك نـینو هیـچیان بـە دەسـت نیـە ئـەو شـتەیش هەرچەندە بێ نرخ بێت. وەك پێستی ناوکی خورما یان مێروولە لە هەرە وردیلەکان. بۆیـە خـوای مـەزن

[1] الطبري (٢١/١٥٥).
[2] الطبري (٢١/١٥٤).
[3] الزخرف (٣١).
[4] الزخرف (٣٢).

سەرزەنشتیان دەکات دەفەرمووێت: ﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوان گەنجینەکانی بەزەیی پەروەردگاری بە دەسەڵاتو بەخشندەی تۆیان لایە؟ ﴿ٱلۡعَزِيزِ﴾ واتە: خاوەن دەسەڵاتی هەتاهەتایی، ﴿ٱلۡوَهَّابِ﴾ زۆر بەخشندە، بۆ هەر کەسێك مەیلی لێ بێت، ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿(٥٢) أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذٗا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا (٥٣) أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمٗا (٥٤) فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە (جوولەکەکان) بەشیان هەیە لە دەسەڵاتی پاشایەتی (خاوەنێتی بوونەوەر)؟ (جا ئەگەر بیانبووایە) ئەو کاتە بە خەڵکیان نەدەبەخشی (بە ئەندازەی) توێکڵی دەنکە خورمایەك، یان ئێرەیی دەبەن بە خەڵکی؟ لەسەر ئەوەی خوا پێی بەخشیون (کە پێغەمبەرێتیە) لە فەزڵو بەهرەی خۆی ئەوە بێگومان داومانە بە نەوەی ئیبراهیم کتێبو پێغەمبەرێتی هەروەها پێمان بەخشین دەسەڵاتێکی گەورە، جا لەو خەڵکەدا هەبوو بڕوایان بە (موحەممەد (ﷺ)) هێنا هەشیانبوو بەرگری لێ کردووەو دۆزەخ بەسە (بۆیان) کە ئاگرێکی هەڵگیرساوە. وە دەفەرمووێت: ﴿قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذٗا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورٗا﴾[2] واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە خاوەنی خەزنەو نیعمەتەکانی پەروەردگارم بن ئەو کاتە دەتانگرتەوە (لە بەخشین) لە ترسی خەرج بوونو تەواو بوونو ئادەمی هەمیشە ڕژدەو چروکە. ئەمە دوای ئەو بەسەرهاتەیە لەو خوانەناسانەوە کە بڕوایان نەدەکرد بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) کە مرۆڤ بێت. وەك خوای مەزن باسی هۆزی پێغەمبەر سالحی کردووە (سەلامی خوای لێ بێت)کاتێك وتوویانە: ﴿أَءُلۡقِيَ ٱلذِّكۡرُ عَلَيۡهِ مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ (٢٥) سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ﴾[3] واتە: ئایا لەناو هەمووماندا سروش هەر بۆ ئەو کراوە بە تەنها؟ (نەخێر) بەڵکو ئەو (صالح) پیاوێکی زۆر درۆزنی خودپەسەندو لووت بەرزە، سبەی دەزانن کە کێ زۆر درۆزنی خودپەسەندە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَحۡمَةِ رَبِّكَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡوَهَّابِ﴾ واتە: ئەگەر گەنجینەکانی بەزەیی خوای تۆیان لایە ﴿أَمۡ لَهُم مُّلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ فَلۡيَرۡتَقُواْ فِي ٱلۡأَسۡبَٰبِ﴾ یان ئاسمانانو زەمینو هەرچی لەناویاندا هەیە لەبەر دەستی ئەواندایە؟ دەسا با پەیژە دانێنو بێنە سەری. واتە: ئەگەر

---

[1] النساء (٥٣_٥٥).

[2] الاسراء (١٠٠).

[3] القمر (٢٥_٢٦).

ئەوەندە خاوەن دەسەلاتن با ڕێگاکانی ئاسمان بگرنەبەرو سەرکەون. ئیبنو عەباس‌و (ڕەزای خوایان لێ بێت) موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو کەسانی تریش دەڵێن: واتە: ڕێگاکانی ئاسمان.[1] زەحاك دەڵێت: با سەرکەون بۆ ئاسمانی حەوتەم.[2] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ الْأَحْزَابِ﴾ واتە: ئەوانە لەشکرێکن لە کۆمەڵەکان کە لەوێ تێکدەشکێن. واتە: ئەو لەشکرە بێباوەڕانە کە زۆر خۆیان بە زل دەزانن‌و دژایەتیان دەکرد بەم زووانە تێکدەشکێن‌و ژێردەکەون وەك ئەوانەی کە پێش ئەوان چارەڕەش بوون لە گەلە بێباوەڕەکانی تر. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ (٤٤) سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ (٤٥) بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾[3] واتە: یان دەڵێن ئێمە کۆمەڵێکی سەرکەوتووین‌و نابەزین، بێگومان کۆمەڵەکەیان دەشکێنرێت‌و هەڵدێن، بەڵکو بەڵێنیان ڕۆژی دواییەو (سزای) ئەو ڕۆژە زۆر سەختترو تاڵترە.

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو الْأَوْتَادِ (١٢) وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ لْئَيْكَةِ ۚ أُولَٰئِكَ الْأَحْزَابُ (١٣) إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ (١٤) وَمَا يَنظُرُ هَٰؤُلَاءِ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ (١٥) وَقَالُوا رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ الْحِسَابِ (١٦)﴾

**یادخستنەوەی ئەو گەلە پێشووانەی کە قڕکران**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو الْأَوْتَادِ﴾ واتە: بەر لەمانەش هۆزی نوح‌و هۆزی عادو فیرعەونی خاوەن مێخەکان هەر بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێنا. ﴿وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ لْئَيْكَةِ ۚ أُولَٰئِكَ الْأَحْزَابُ﴾ واتە: هۆزی سەمودو هۆزی لوت‌و خەڵکی ناو دارستانەکەش هەر لەو بێباوەڕانە بوون. خوای گەورە باسی ئەو گەلە پێشووانە دەکات کە چی بەسەر هێنان لە سزاو ئازارو جەزرەبەدان لەسەر بێ گوێی کردنی پێغەمبەران‌و دژایەتی کردن‌و باوەڕ پێ نەهێنایان کە بەسەرهاتەکانیان لە پێشەوە لە زۆر شوێندا باس کراوە، ﴿أُولَٰئِكَ الْأَحْزَابُ﴾ واتە: ئەوانەش هەر لەو بێباوەڕانە بوون. کە لە ئێوە بە تواناو خاوەن دەسەلاتتر بوون‌و ماڵ‌و منداڵیان لە ئێوە زۆرتر بوو، ئەو دەسەلات‌و ماڵ‌و منداڵە هیچ سزایەکی لێ نەگێڕانەوە کاتێك خودا فەرمانی دا بە سزادانیان. بۆیە خوای

[1] الطبري (٢١/١٥٦).
[2] الطبري (٢١/١٥٧).
[3] القمر (٤٤ـ٤٦).

گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ﴾ واتە: گشت ئەوانە پێغەمبەرەکانی خۆیان بە لاوە درۆزن بووەو شایانی تۆڵەسەندن بوون. خوای مەزن دەفەرموێت هۆکاری قڕکردنیان باوەڕنەکردنیان بە پێغەمبەرەکانیان بووە، کەوایە با ئەمانیش بترسن لەو تۆڵەیەی کە خودا لەوانی سەند، هەتا وەك ئەوانیان بەسەر نەیەت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ﴾ واتە: ئەوانە هەر چاوەڕوانن تا لە ناکاو قیڕەیەك پەیدا دەبێت، کە تەنانەت بەشی هەنسك دانێکیش وچان نادات، مالك دەڵێت: لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە واتە: هیچ مۆڵەتێکی تێدا نیە.[1] چاوەڕوانن لە ناکاو قیامەت دێتو نیشانەکانی هاتووەو زۆر نزیکە لە ئانو ساتدایە، ئەو (قیڕەیە) فوە ترسناکەکەیە خوای گەورە فەرمان دەدات بە ئیسرافیل کە فوو بکات بە کەڵەشاخدا، هیچ کەس نامێنێت لە خەڵکی ئاسمانانو زەمین ڕانەچڵەکێت مەگەر کەسێك خودا خۆی جیای کردبێتەوە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ واتە: هەر دەڵێن: ئەی پەروەرێنمان! بەر لەوە ڕۆژی قیامەت بێت، پسولەی خۆمان بدەرێ. خوای مەزن نارەزایی خۆی بەرامبەر بتپەرستان دەردەبڕێت کاتێك کە نزا لە خۆیان دەکەنو داوا دەکەن کە زوو سزایان بۆ دابەزێت (القط) واتە: نامەی کردار، وتراوە: (القط) واتە: بەش، بەهرە، ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) موجاهیدو زەحاكو حەسەنو کەسانی تریش دەڵێن: داوایان کردووە زوو سزایان بۆ بێت.[2] قەتادە ئەمەیشی بۆ زیاد کردووە وەك خۆیان وتوویانە: ﴿ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[3] واتە: ئەی پەروەردگار ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو لە لایەن تۆوە هاتووە دەی بەرد بەسەرماندا ببارێنە لە ئاسمانەوە یان سزایەکی سەختی پڕ ئازارمان بۆ بنێرە.[4] وتراویشە داوایان کردووە کە زوو بەشی بەهەشتی خۆیان بدرێتێ ئەگەر بەهەشت ڕاستەو هەیە. بۆ ئەوەی لە دنیا بەشی خۆیان دەستکەوێت، ئەم قسەیان بە شێوەیەك کردووە کە بڕوایان پێی نەبووەو بە تەمای نەبوون، ئیبنو جەریر دەڵێت: داوای ئەو شتانەیان کردووە لە دنیادا بیاندرێتێو وەری بگرن لە خێرو لە شەڕ.[5] ئەم قسەیە ئیبنوجەریر دەڵێت قسەیەکی چاکە زەحاكو

---

[1] عبدالرزاق (٣/١٦١).

[2] الطبري (٢١/١٦٤)، الدر المنثور (٧/١٤٨).

[3] الطبري (٢١/١٦٤).

[4] الانفال (٣٢).

[5] الطبري (٢١/١٦٥).

ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالدیش هەروا دەڵێن والله أعلم.[١] لەبەر ئەوەی قسەی ئەم خوانەناسانە لە گاڵتەوگەپ دەچوو بە ڕاستیان نەدەزانی کە قیامەت دێت، خوای گەورە فەرمان دەدات بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆڕاگر بێت لەسەر ئازاریان، مژدەیشی دەداتێ کە پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوەو زاڵو سەرکەوتوو دەبێت. دەفەرمووێت: ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ﴾ واتە: تۆ خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیڵێن.

﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً ۖ كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٩﴾ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُۥ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾﴾

**باسی داود پێغەمبەر( سەلامی خوای لێ بێت )**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ واتە: هەرچی دەیڵێن، تۆ هەر خۆڕاگر بەو داود وەبیر خۆت بێنەوە، کە عەبدێکی بە دەسەلاتی ئێمە بوو، لە هەر کارێك پەشیمانی ڕووی تێدەکرد هەر پەنای بە ئێمە دەهێنا. خوای گەورە باسی عەبدو پێغەمبەری خۆی داود دەکات کە چەند خاوەن دەسەلات بووە ﴿ٱلْأَيْدِ﴾ واتە: بە توانا لە زانستو کرداردا. ئیبنو عەباسو سودیو ئیبنو زەید دەڵێن: واتە: هێز.[٢] موجاهید دەڵێت: ﴿ٱلْأَيْدِ﴾ واتە: هێز لە خواپەرستیدا.[٣] قەتادە دەڵێت: داود (سەلامی خوای لێ بێت) هێزی پێ درابوو لە خواناسیوتێگەیشتن لە ئیسلامدا.[٤] بۆیان باس کردووین کە داود (سەلامی خوای لێ بێت) سێیەکی شەو شەونوێژی دەکرد، نیو ساڵیش لە ساڵدا بەڕۆژوو دەبوو، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆشەویسترین نوێژ لە لای خوای مەزن نوێژی داود بووە (سەلامی خوای لێ بێت) وە خۆشەویسترین ڕۆژوویش لای خودای مەزن ڕۆژوی داود بووە، کە نیوەی شەو دەنوستو سێیەکی شەو شەونوێژی دەکردو شەش یەکیش دەنووست ڕۆژێك بە ڕۆژو دەبوو ڕۆژێکیش ڕۆژی نەدەگرتو دەیشکاند، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەدا هەڵنەدەهاتو ڕای نەدەکرد بەردەوام دەگەڕایەوە بۆ لای خودا).[٥] هەمیشە لە هەموو کاروبارێکدا دەگەڕایەوە بۆ لای خودا. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ﴾ واتە: کێوانیشمان ڕام هێنابوو کە تەسبیحاتی خوایان

---

[١] الطبري (٢١/١٩٥).
[٢] الطبري (٢١/١٦٦/١٦٧).
[٣] الطبري (٢١/١٦٦).
[٤] الطبري (٢١/١٦٧).
[٥] فتح الباري (٣/٢٠)، مسلم (٢/٨١٦).

دەكرد لەگەڵ ئەو (داود) بە ئێواران و بە بەیانیاندا. واتە: خوای مەزن كێوەكانی ڕامهێنـاوە لەگـەڵ داود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) تەسـبیحاتی خـوا دەكـەن لـە كـاتی خۆرهـەڵاتن و ئێواراندا وەك خـوا فەرموویەتی: ﴿يَٰجِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُۥ وَٱلطَّيۡرَ﴾[1] واتە: ئەی چیاكان و باڵندەكان لەگەڵ داود زیكرو تەسـبیح بڵێنەوە. هەروەها باڵندەیش بە تاریفی ئەو ئەوانیش هەر تاریفی خوا دەكەن و پەنا هەر بۆ ئەو دەبەن و لێی دەپاڕێنەوە. كاتێك كە باڵندەكان لە هەوادا دەگەڕێن گوێیان لە دەنگی داودە زەبـور دەخوێنێت و دەیلەرێنێتەوە ناتوانن بڕۆن لەگەڵیدا تەسبیحاتی خوا دەكەن و كێوەكانیش دەیڵێنەوە و دەپاڕێنەوە بە دوای ئەودا. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵڵای كوڕی حارسـی كـوڕی نەوفەلـەوە كـە ئیبنـو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) نوێژی چێشتەنگای نـەدەكرد، بردمـە لای ئومـو هـانیء (ڕەزای خـوای لێ بێت) پێم وت: ئەوەی باست كرد بۆ من بۆ ئەمیشی باس بكە، ئومو هانیء وتی: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا هاتە ماڵەكەم، پاشان فەرمانی دا ئاو بكرێتە دەفرێكەوە، پاشـان فـەرمانی دا پارچە قوماشێكیان لە نێوان من و ئەودا گرت و خۆی شۆرد پاشان دەرماڵەكەی ئـاوڕژێن كـرد لـە دوایدا هەشت ڕەكات نوێژی كرد. ئەو نوێژە كاتی ئێشتەنگا بـوو هەڵسان و ڕكوع و سـوژدەو دانیـشتنی وەك یەك بوون و نزیك بوون لە یەكەوە. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) چووە دەرەوە دەیوت: هەرچـی لـە نێـوان هـەردوو بەرگەكـەدا هەیـە هـەموم خوێندووەتـەوە و ئێـستا نـەبێت نـەمزانیوە نوێـژی چێشتەنگاهەیە، ﴿يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ﴾ وە هەمیشە دەموت: نوێژی هـەتاو هـەڵاتن كامەیـە (صلاة الإشراق) پاشان لە دوای ئەوە دەیوت ئەمەیە نوێژی هەتاو هەڵاتن.[2] بۆیـە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ واتـە: مـەلانیش كۆمـەڵ دەبـوون و گـشتیان بـەرەو ئـەو دەهـاتن. واتـە: باڵنـدەكان لـە هـەوادا دەوەسـتان ﴿كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ هـەموو گوێڕایـەڵ بـوون تـاریفی خودایـان دەكـرد لەگەڵیدا. سەعیدی كوڕی جوبەیرو قەتادەو مالكی كوڕی زەیدی كـوڕی ئەسلەم و ئیبنـو زەید دەڵێن: گوێڕایەڵ بـوون.[3] خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ﴾ واتـە: ئێمە فەرمانڕەواییمان بۆ پتەو كرد، لە كارزانیدا بەشمان داو بە قسەی ئەو هەموو كێشە كۆتا دەبوون.

﴿وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ﴾ واتـە: دەسـەڵاتی تـەواومان دایـە لـەوەی فـەرمانڕەوا پێویـستی پێـی بـو لـە هـەموو بارەیەكەوە، ئیبنو ئەبی نەجیح دەڵێت لە موجاهیدەوە: بەهێزترین خەڵكی دنیا بوو لە فەرمانڕەواییدا،

---

[1] سبأ (١٠).

[2] الطبري (٢١/١٦٩).

[3] الطبري (٢١/١٦٩).

﴿وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْحِكْمَةَ﴾ موجاهید دەڵێت: واتە: لە تێگەیشتن‌و ئاوەزو زیرەکیدا، قەتادە دەڵێت: لە کتێبی خوداو بەجێهێنانی ئەوەی کە تێیدا بوو. سودی دەڵێت: ﴿ٱلْحِكْمَةَ﴾ واتە: پێغەمبەرێتی.[1] ﴿وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ واتە: شورەیحی قازی و شەعبی دەڵێن: شایەتیدان و سوێندخواردن[2]. قەتادە دەڵێت: ﴿وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ واتە: دوو شایەت لەسەر داواکەرو سوێند لەسەر داوالێکراو. کەئەوە بریتی یە لە چارەسەرکردنی کێشەکان بە تەواوی[3]. ئەم کارە ئەو کارەیە کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) پێی هەڵدەسان. وە دەڵێت: هەروەها خاوەن باوەڕان‌و پیاوچاکان ئەمە بڕیارو کاری ئەم ئوممەتەیە هەتا ڕۆژی قیامەت. ئەبو عەبدوڕڕەحمانی سەلەمیش هەر وای وتووە. موجاهیدو سودی دەڵێن: ﴿وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ﴾ بریتیە لە بڕیاری ڕاست‌و تێگەیشتن‌و پێکان لەو بڕیارەدا[4]. دیسان موجاهید دەڵێت: (هو الفصل في الكلام و الحكم) یانی: جیاکاری و بڕینەوەیە لە قسەو لە بڕیارە کاندا. ئەمە هەموو شتێك دەگرێتەوە مەبەستیش هەر ئەوشتەیە، ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە[5].

﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَـٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّـٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٢٥﴾﴾.

**بەسەرهاتی دوو دادبەرەکە (الخصمين)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ﴾ واتە: ئەتۆ دەنگوباسی ئەو دادبەرانەت بیست، کە لە شوورەی نوێژگەکەیەوە سەرکەوتن؟ ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ﴾ واتە: کە چوونە ژوورەوە بۆ لای داود، لێیان ترساو ئەوانیش وتیان: نیگەرانیت نەبێت، دوو دادبەرین، یەك لە ئێمە

---

[1] الطبري (٢١/١٧١).
[2] الطبري (٢١/١٧٣).
[3] الطبري (٢١/١٧٣).
[4] الطبري (٢١/١٧٢).
[5] الطبري (٢١/١٧٣).

غەدری لەوی تر کردووە، کە چۆن ڕەوایە ئاوا لە نێوانماندا بڕیار بدەو لە دەستووری خودا لامەدەو ڕاستیمان نیشان بدە. زانایانی تەفسیر لێرەدا ڕووداوێکیان باس کردووە کە پڕە لە قسەی جوولەکەکان، هیچ فەرمووودەیەك لە لایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەگەیشتووەتە ئێمە لەو بارەیەوە کە پێویست بێ بڕوای پێ بکەین، بەڵام ئیبنو ئەبی حاتەم فەرموودەیەکی ڕیوایەت کردووە کە سەنەدەکەی بە ڕاست نازانرێت چونکە یەزیدی ڕەقاش ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هەرچەندە یەزید لە پیاوچاکان بووە بەڵام فەرموودەی ئەم یەزیدە لاوازە لە لای زانایانی فەرموودە. باشترین شت ئەوەیە کە تەنها متمانە بکرێتە سەر دەقی قورئان لەم ڕووداوەدا. زانینی ڕاستیەکەی بگێڕینەوە بۆ لای خودا خۆی. چونکە قورئان ڕاستەو ئەوەیشی باسی کردووە هەر ڕاستە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ﴾ کاتێك چوونە لای داود لێیان ترسا. چونکە ئەو میحرابەکەیدا بوو کە بەرزترین شوێن بوو لە ماڵەکەیدا. فەرمانیشی دابوو کە هیچ کەسێك ئەو ڕۆژە نەچێتە لای، ئاگای لە خۆی نەبوو لە ناکاو دوو کەس لە دیواری میحرابەکەیەوە سەرکەوتن و چوونە لای. لە بارەی خۆیانەوە پرسیاریان لێ کرد. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ﴾ واتە: ئەم برای منە نەوەدو نۆ مەڕی هەیەو من تەنها مەڕێکم هەیە، وتی بە منی بسپێرەو لە کێشەکەدا من دەرەقەتی ئەو نەهاتم. ﴿وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ﴾ لە کێشەکەدا سەرکەوت بەسەرمدا. وتراوە: (عَزَّ يَعِزُّ) کاتێك سەرکەوتو زاڵ بوو. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ واتە: وتی: کە مەڕەکەی تۆ دەخاتە ناو مەڕەکانی خۆی غەدر دەکات، بێگومان زۆر لە شەریك و هاوبەشان ستەم لە یەکتری دەکەن مەگین ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هەیەو ئاکار چاکن، ئەویش کەمن. داود زانی تاقی کردواتەوە، ئیتر تووشی پەشیمانی هات، سوژدەی بردو لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە بیبەخشێت. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ﴿فَتَنَّٰهُ﴾ واتە: تاقیمان کردووەتەوە.[1] ﴿وَخَرَّ رَاكِعًا﴾ واتە: سوژدەی برد. ﴿وَأَنَابَ﴾ واتە: پاڕایەوە کە بیبەخشێت.

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ واتە: ئێمە لەو هەڵەی

---

[1] الطبري (٢١/١٨١).

بەخشیمان و ئەولە نزیکانی خۆمانەو گەڕانەوەی چاکی هەیە. واتە: ئەوەی کە داود کردی لەو شتانەیە کە دەوترێت: چاکەی پیاوچاکان گوناهی نزیکەکانی خودایە.

### سوژدەی ناو سورەتی صاد (ص)

سوژدەی صاد لە سوژدە پێویستەکان (واجبەکان) نیە، بەڵکو سەژدەی شوکرە، بەڵگەیش لەسەری ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: سوژدەی (ص) لە سوژدە پێویستەکان نیەو من پێغەمبەری خودام بینیوە سوژدەی تیا دەبرد.[1] بوخاریو ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائی لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاکو ڕاستە.[2] وە دیسان نەسائی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) سوژدەی لە (ص)دا بردووەو فەرموویەتی: (داود سوژدەی تیابردووە (سەلامی خوای لێ بێت) داوای لێبوردنی کردووە ئێمەش سوژدەی تیا دەبەین، سوپاسی خودا دەکەین) تەنها نەسائی ڕیوایەتی کردووە.[3] سەنەدەکانی جێی بروان. بوخاریش لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە دیسان لە عەووامەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە موجاهید لە سوژدەی (ص) ئەویش وتی: پرسیارم کردووە لە ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کوێدا سوژدەت بردووە. وتی: (ئایا تۆ ئەم ئایەتەت نەخوێندووەتەوە: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ﴾[4] واتە: وە لە نەوەکانی نوحو داودو سولەیمانمان (ڕێنموونی کرد). ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ﴾[5] واتە: ئەوانە (ئەو پێغەمبەرانەی باسکران) کەسانێك بوون خوا ڕێنموونی کردن دەی پەیڕەوی ڕێگاو ڕێبازی ئەوان بکە (ئەی موحەممەد (ﷺ)). داود یەکێك بووە لەو کەسانەی کە فەرمان دراوە بە پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) کە شوێن ڕچەی ئەو بکەوێت. داود سوژدەی تیابردووە (سەلامی خوای لێ بێت) پێغەمبەری خودایش (ﷺ) سوژدەی تیابردووە.[6] ئەبو داودیش ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر مینبەر سورەتی صادی خوێند کاتێك گەیشتە سوژدە هاتە خوارو سوژدەی برد خەڵکیش لەگەڵی

---

[1] أحمد (١/٣٩٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٢/٦٤٣)، أبو داود (٢/١٢٣)، تحفة الأحوذي (٣/١٧٦)، النسائي في الكبرى (٦/٣٤٢).

[3] النسائي (٢/١٥٩)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[4] الانعام (٨٤).

[5] الانعام (٩٠).

[6] فتح الباري (٨/٤٠٥).

سوژدەیانبرد، لە ڕۆژێکی تردا خوێندی کاتێك گەیشتە سوژدە خۆیان بۆسوژدە بردن ئامادەکرد، سوژدە ببەن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان ئەو سوژدەیە سوژدەی پەشیمانیو گەڕانەوەی پێغەمبەرێکە بەڵام من ئێوەم دی خۆتان ئامادەکرد بۆی). هاتە خوارەوەو سوژدەی برد.[1] تەنها ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە، سەنەدەکەی لەسەر مەرجی هەردوو سەحیحەکەیە. ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ﴾ واتە: داود لە ڕۆژی قیامەتدا لە بەندە نزیکەکانی خودایە لەبەر ئەوەی کە زۆر دەگەڕایەوە بۆ لای خوداو دادپەروەریش بوو لەگەڵ ئەوانەی کە لە ژێر دەستیدا بوون پلەی بەرزیشی هەیە لە بەهەشتدا. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: (دادپەروەران لەسەر ئەو مینبەرانەن کە لە نورن لە لای ڕاستی خوداوەو هەردوو دەستی پەروەردگاریش هەر ڕاستن ئەو کەسانەی کە دادپەروەرن لەناو کەس و کاریاندا لەناو ئەوانەیشدا کە لە ژێر دەسەلاتیاندان).[2]

﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾

### ئامۆژگاری بۆ کاربەدەست و فەرمانڕەواکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ واتە: ئەی داود! جێنشینمان لەسەر زەوی داوە بە تۆ، بە تەرزێکی خودا پەسەند، بە کاری مەردم ڕابگەو شوێن ئارەزووی خۆت مەکەوە، کە لە ڕێی خودا لات بدات. ئەو کەسانەی لە ڕێی خودا لادەدەن، چونکە قیامەتیان لەبیر چووە، جەزرەبەی توندو تیژیان هەیە. ئەمە ئامۆژگاری خودای گەورەیە بۆ کاربەدەستان کە بڕیاری دادپەروەرانە لە نێوان خەڵکیدا بەجێ بێنن. بەو شێوەی کە خودا فەرمانی پێداون لە لایەن خۆیەوە هەرگیز لێی لانەدەن. هەر کەسێك لە ڕێی ئەو لابدات و ڕۆژی قیامەت لەبیر خۆی بباتەوە ئەبێ چاوەڕوانی بەڵێنو سزای توندوتیژی خودا بکات. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبراهیمی ئەبو زورعەوە کە کتێبەکانی خوای خوێندبووەوە. وەلیدی کوڕی عبدالملك پێی وت: تۆ کتێبی سەردەمی پێشووت خوێندووەتەوەو قورئانیشت خوێندووەتەوەو لێی تێگەیشتووی، ئایا خەلیفەکان لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت؟ وتم ئەی گەورەی موسڵمانان بیڵێم؟ وتی: بیڵێ، لە ئەمانی خودادای. وتم: ئەی گەورەی موسڵمانان! تۆ لەلای خودا بەڕێزتری یان داود(سەلامی خوای لێ

---

[1] أبو داود (١٤١٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (١٤٥٨/٣).

بێت) کە خودای مەزن پێغەمبەرایەتی و فەرمانڕەوایشی پێکەوەپێدابوو، پاشان لە کتێبەکەیدا مەڕەشەی لێکردووەو فەرموویەتی: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾! عیکریمە دەڵێت: ﴿لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ﴾ ئەمە پێش و پاش خستنە یانی(لهم عذاب شديد يوم الحساب بما نسوا) واتە: جەزرەبەی توندو تیژ دەدرێن لە ڕۆژی قیامەتیدا بەهۆی ئەو لەبیر کردنەوەیانەوە[1]. سودیش دەڵێت: یانی (لهم عذاب شديد بما تركوا أن يعملوا ليوم الحساب) واتە: جەزرەبەی توندو تیژ دەدرێن لەبەر ئەوەی وازیان هێناو کاریان بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە نەکرد.[2] ئەم قسەیە زیاتر لەگەڵ دەقی ئایەتەکەدا گونجاوە و خوای سبحانە وتعالاش هاوکارە بۆ گەیشتن بەڕاستی یەکان.

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾﴾

**مەبەست لە وەدیهێنانی دنیا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: ئێمە ئاسمانو زەویمان و ئەوەش کە لە بەینیاندایە بە خۆڕایی دروست نەکرد، ئەو کەسانەی وا بیردەبەن خوانەناسن. های بۆئەوانەی خوانەناسن، بۆ ئەو ئاگرەی دەچنە ناوی. خوای مەزن باسی ئەوە دەکات کە ئەم مەردمەی بە خۆڕایی دروست نەکردووە بەڵکو بە تەنها بۆ خواناسی دروستی کردوون پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا کۆیان دەکاتەوە پاداشتی گوێڕایەڵان دەداتەوەو سزای خوانەناسانیش دەدات. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ واتە: ئەوانەی کە چاوەڕوانی زیندووبوونەوەو ئامادەبوونی ڕۆژی قیامەت ناکەنو وا دەزانن هەر ژیانی دنیایەو بەس. ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: هاوار بۆ ئەو کەسانە لە ڕۆژی زیندووبوونەوەو کۆبوونەوەیان لەوێدا لەو ئاگرەی کە بۆیان سازدراوە پاشان خوای گەورە ڕوونی کردووەتەوە بۆیان کە لە دادوەریو کارزانی خۆیەتی کە وەك یەك سەیری خواناسو خوانەناس ناکاتو فەرموویەتی: ﴿أَمْ

---

[1] الطبري (٢١/١٨٩).

[2] الطبري (٢١/١٨٩).

نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ﴾ واتە: ئاخۆ ئێمە ئەوانەی خاوەن باوەڕن و ئاکار چاکن، هەروەك ئەوانە دادەنێین کە لەم زەویەدا بەدفەڕن، یاخۆ ئێمە خۆپارێزان وەك گوناهباران دەژمێردرین؟ واتە: شتی وا ناکات و لە لای خوا وەك یەك نین. کەوایە دەبێت ژیانێکی ترو جێگایەکی تر هەبێت گوێڕایەڵ پاداشتی خۆی وەردەگرێت و بەدکاریش سزا بدرێت. ئەم ڕوونکردنەوەیە بەڵگەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ئاوەزن و سروشتێکی پاکیان هەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێت ڕۆژێك ببێت هەق و ناهەقی تێدا جیابکرێتەوە چونکە ئێمە ستەمکارو لاساری زۆر دەبینین کە ماڵ و منداڵی زۆرو ژیان بە خۆشی لە دنیادا دەباتەسەر لە دوایشدا دەمرێت تووشی هیچ ئازارێك نابێت. خواناس و ستەم لێکراویش دەبینین بەو ئازارەوە سەردەنێتەوەو دەمرێت، دەبێت خوای گەورە و کارزان و زانا بە کارزانی دادوەری خۆی کە بە ئەندازەی مێروله هەرە وردیلەکان ناهەقی بە هیچ کەس ناکات ئەم هەق و ناهەقە لە یەك جیا بکاتەوە، خۆ ئەگەر لە دنیا جیای نەکاتەوە دەبێت ڕۆژێکی تر جیا بکاتەوە پاداشتی خوانەناس بداتەوەو جەزرەبەی ناهەقیکاریش بدات. لەبەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز ئەو شوێن و ڕێگا ڕاستەمان بۆ دیاری دەکات و داوامان لێدەکات بە ئاوەزەوە بیر لە نیشانەکانی بکەینەوەو ئامۆژگاری لێ وەردەگرین و خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ واتە: ئەم قورئانە پڕ لە پیت و پیرۆزەمان بە خەڵات بۆ تۆ ناردەخوار تا لەسەر نیشانەکانی ڕابمێنن و خاوەن دڵان ئامۆژگاری لێ وەرگرن. واتە: خاوەن دڵان، ﴿ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ کۆی (لُب) واتە: عەقڵ و ئاوەز.

﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذْ عُرِضَ عَلَيْهِ بِٱلْعَشِىِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلْجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّىٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّى حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَىَّ ۖ فَطَفِقَ مَسْحًۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلْأَعْنَاقِ ﴿٣٣﴾﴾

**باسی سولەیمانی کوڕی داوود (سەلامی خوایان لێ بێت)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيْمَٰنَ ۚ نِعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ واتە: سولەیمانمان بە خەڵات بەخشی بە داود ئای کە چەند عەبدێکی باش بوو، هەمیشە ڕووی لە ئێمە بوو. خوای گەورە باسی پێغەمبەر داود دەکات کە سولەیمانی بە خەڵات پێ بەخشی و کردی بە پێغەمبەر(سەلامی خوایان لێ بێت) وەك لە ئایەتێکی تریشدا فەرمووێتی: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَٰنُ دَاوُۥدَ﴾[1] سولەیمان بووە میراتگری

[1] النمل (١٦).

داوود، واتە: جێنشینی لە پێغەمبەرێتیدا. چونکە پێغەمبەر داود (سەلامی خوای لێ بێت) کوڕو کاڵی زۆری تری هەبوو جگە لە سولەیمان لەبەر ئەوەی کە سەد ژنی ئازادی هەبوو. ﴿نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ سولەیمان عەبدێکی زۆر چاك بوو هەمیشە دەپاڕایەوە لە خوداو عیبادەتی دەکردو ڕوو لە خودا بوو، ﴿ إِذۡ عُرِضَ عَلَيۡهِ بِٱلۡعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴾ واتە: سەر لە ئێوارە وەختێك ئەسپانی ڕەسەنیان نیشان دا. واتە: کاتێك بووە سەرۆكو خاوەنی دەسەلاتو ئەسپانی ڕەسەن، سەر لە ئێوارە ئەسپە ڕەسەنەکانیان بە بەرچاویدا تێپەڕاند، موجاهید دەڵێت: ئەو ئەسپانەی کە لەسەر سێ پەل دەوەستن‌و پەلی چوارەم بەرز دەکەنەوە، ﴿ٱلۡجِيَادُ﴾ بە هەڵمەتن‌و توند غار دەدەن.[1] زۆرێك لە زانایانی پێشینەش هەر وایان وتووە. ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە غەزای تەبوك یان خەیبەر گەڕایەوە پەردەیەك بە تاقی ماڵەکەیانەوە بوو هەوا لێی دا هەندێ لە پەردەکەی لادا بوکڵە یاریەکانی عائیشە دەرکەوتن (ڕەزای خوای لێ بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائیشە ئەمانە چیە؟) وتی: بوکڵەکانمە لە نێوانیاندا ئەسپێکی باڵداری بینی لە پارچەیەکدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە چیە کە لە ناویاندا دەیبینم؟) عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەسپە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەسپێك کە دوو باڵی هەیە؟) عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: (دەی نەتبیستووە کە سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) ئەسپی هەبووە(باڵدار بووە) عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێکەنی (بە زەردەخەنەوە) هەتا من چاوم بە دانەکانی کەوت[2]. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَقَالَ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ عَن ذِكۡرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴾ واتە: وتی: ئەوینی ڕەوەکەم (کۆمەڵی ئەسپو ماین) یادی خودای لەبیر بردم، هەتا لە چاو ون بوو. زۆرێك لە زانایانی پێشینە باسیان کردووە کە بینینی ئەسپەکان سەرقاڵی کرد تا کاتی نوێژی عەسر بەسەرچوو. گومانی تێدا نیە کە بە ئارەزوو وازی لێ نەهێنا، بەڵکو لە بیری چوو وەك چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی خەندەقدا لە سەرقاڵیدا نوێژی عەسری لەبیرچوو دوای مەغریب کردی. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە بەچەند شێوەی تر لەوانە. لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەگێڕێتەوە کە عومەر(ڕەزای خوای لێ بێت) لە ڕۆژی خەندەقدا دوای خۆرئاوا هاتو قسەی بە خوانەناسانی قورەیش دەوت. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی عەسرم نەکرد هەتا وای لێ هات خۆر ئاوا بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بە خوا منیش نوێژم نەکردووە). دەڵێت: چووین بۆ

---

[1] الطبري (٢١/١٩٢/١٩٣).

[2] أبو داود (٥/٢٢٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

بوتحان پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستنوێژی گرت بۆ نوێژو ئێمەش دەستنوێژمان گرت بۆ نوێژ، نوێژی عەسری کرد دوای ئەوەی کە خۆر ئاوا بوو پاش نوێژی عەسر نوێژی مەغریبیشی کرد[1]. ﴿رُدُّوهَا عَلَيَّ فَطَفِقَ مَسْحًا بِالسُّوقِ وَالْأَعْنَاقِ﴾ واتە: بیانگێڕنەوە، ئەوسا بە تیغ، دەستو پێو ملیان پەڕاندن (و کرانە خێر). حەسەنی بەسری دەڵێت: نەخێر وتی: بە خوا (ئەمانە) سەرقاڵم ناکات لە بەندایەتی خوای خۆم و ئەمە دوایین جارە. پاشان فەرمانی دا دایان لە ملیان.[2] قەتادەیش هەر وای وتووە. سودی دەڵێت: بە شمشێر دای لە ملو دەستو پێیان.[3] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەستی دەهێنا بە باڵو (موی سەر ملی ئەسپو ماین) پشتیاندا لە خۆشەویستیاندا.[4] ئیبنو جەریریش ئەم قسەی هەڵبژاردووەو دەڵێت: نابێت ئەو سزای گیانداران بداتو دەستو پێیان ببڕێتو ماڵی بە فیڕۆ بدات بەبێ هۆکارێك. کاتێك ئەو مەشغوڵ بووەو نوێژی عەسری لەبیرچووە ئەوانە هیچ تاوانێکیان نەبووە.[5] ئەوەی ئیبنو جەریر بە لایەوە پەسەندە جێی تێڕوانینە، لەوانەیە لە شەرعی ئەواندا ئەم کارانە دروست بووبێت بە تایبەتی لە کاتێکدا لەبەر ڕەزامەندی خودا تووڕە بووبێت کە هۆکار بوو بۆ سەرقاڵبوونی هەتا کاتی نوێژەکە بەسەرچووە. بۆیە کاتێك کە ئەوانەی داپاچیوەو کردوونی بە خێر، خودایش پاداشتی داوەتەوە بە چاکتر لەوانە کە (هەوا)ی ژێربار کرد بۆی بە ئاسانی بۆ هەر شوێنی مەیلی لێ بووایە لە فەرمانیدا بوو، بەیانیان بە ئەندازەی مانگێكو ئێوارانیش بە ئەندازەی مانگێك دەڕۆیشت. کە ئەمە چاکترو خێراتر بوو لە ئەسپەکان. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو قەتادەو ئەبو دەهمائەوە کە هەردووکیان زۆر هاتوچۆی بەیتیان دەکرد وتیان: چووینە لای پیاوێکی خەڵکی بادیە. پیاوە لادێییەکە پێی وتین: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی گرتم ئەوەی خودا فێری کردبوو منی لێ فێرکردو فەرمووی: (بێگومان تۆ شتێك واز لێ ناهێنی لە بەر خوای گەورە مەگین خوای گەورەش لەوە چاکتر دەبەخشێت بە تۆ)[6].

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكًا لَّا يَنبَغِي لِأَحَدٍ مِّن بَعْدِي إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ ﴿٣٧﴾

---

[1] فتح الباري (٢/٨٢)، مسلم (١/٤٣٨).
[2] الطبري (٢١/١٩٥).
[3] الطبري (٢١/١٩٥).
[4] الطبري (٢١/١٩٦).
[5] الطبري (٢١/١٩٦).
[6] أحمد (٥/٧٨)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی سەحیحە.

وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلْأَصْفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴿٤٠﴾ ﴾

## تاقیکردنەوەی سولەیمان و ڕێزلێنانی لە دوایدا

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَٰنَ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ثُمَّ أَنَابَ ﴾ واتـە: ئێمـە سولەیمانیشمان تاقی کردەوەو لاشەیەکمان هاوێشتە بان کورسیەکەی‌و دیسان هەر ڕووی کردە ئێمە. خوای گەورە باسی چۆنیەتی ئەو لاشەیەی نەکردووە کە خراوەتە سەر کورسیەکەی سولەیمان نازانین ئەو لاشەیە چیەو چۆن بووە؟ بەڵام ئێمە باوەڕمان وایە کە خودا تاقی کردەوە بەو لاشەیە کە فڕێ درایە سەر کورسیەکەی. هەرچی لەو بارەیەوە وتراوە هەموو لە جوولەکەکانەوە وەرگیراوە ڕاست‌و درۆیمان بۆ جیاناکرێتەوە خودا خۆی دەزانێت، ﴿ثُمَّ أَنَابَ ﴾ واتە: پاش ئەو تاقی کردنەوەیە هەر ڕووی کردە خواو پاڕایەوەو داوای لێبوردنی لێ کردو پاشان داوای دەسەڵاتێکی لێ کرد کە دوای ئەو نەکەوێتە دەستی هیچ کەسێکی تر ﴿قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ﴾ واتـە: وتی: ئەی پەروەردگارکەم! عافووم بکەو سامانێکی وام بدەیە کە لە دوای من گیری هیچ کەسی تر نەکەوێت، بەخشندەی هەرە گەورە تۆی. ﴿لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ﴾ واتـە: سولەیمان داوای کرد لە خودا کە دەسەڵاتێکی بداتێ هیچ کەسێك دوای ئەو ئەو دەسەڵاتەی پێ نەدرێت لە ئادەمیزاد. دەقی ئایەتەکەش هەر وا دەگەیەنێت‌و فەرموودەی سەحیحیش هاتووە لەو بارەیەوە لە چەند ڕێگاوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: عفریتێك لە جنۆکە دوێنی لە ناکاو هاتە بەر دەمم بۆ ئەوەی نوێژەکەم پێ ببڕێت. خوای گەورە زاڵی کردم بەسەریدا ویستم بیبەستمەوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە هەتا بەیانی هەمووتان سەیری بکەن قسەکەی برام سولەیمان پێغەمبەرم (سەلامی خوای لێ بێت) هاتەوە یاد کە وتی: ﴿رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ﴾ (روح)دەڵێت: بۆیە پێغەمبەریش(ﷺ) بەسەرشۆڕی دەری کرد.[1] هەر بەم شێوەیە موسلیم‌و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە.[2] دیسان موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو دەردائەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵسا نوێژ بکات گوێمان لێ بوو

[1] فتح الباري (١/٦٦٠).

[2] مسلم (١/٣٨٤)، النسائي في الكبرى (٦/٤٤٣).

دەیفەرموو: (پەنا دەگرم بە خودا لە تۆ (پاشان فەرمووی) لەعنەتت لێ دەکەم بەو لەعنەتەی کە خوا لێی کردووی سێ جار، دەستی ڕاکێشا وەك ئەوەی دەست بۆ شتێك بەرێت، کاتێك نوێژەکەی تەواو کرد، وتمان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێمان لێت بوو لە نوێژەکەتدا شتێکت دەفەرموو، لێمان نەبیستبووی لەمەوپێش، وەچاومان لێت بوو دەستت ڕاکێشا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (دوژمنی خوا شەیتان بە گڕێك لە ئاگرەوە هات و ویستی بیدا بە ڕومدا منیش وتم: پەنا دەگرم و خۆم دەپارێزم بە خودا لە تۆ. سێ جار. پاشان وتم: لەعنەتت لێ دەکەم بەو لەعنەتە تەواوەی خوا لێی کرد. هەر نەچووە دوا. سێ جار پاشان ویستم بیگرم سوێند بەخوا ئەگەر دوعاکەی برامان سولەیمان نەبووایە. دەبووایە بە شەتەکدراوی و بەستراوی بمایەتەوە تابەیانی منداڵانی خەڵکی مەدینە یاریان پێ بکردایە).[1]

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجْرِى بِأَمْرِهِۦ رُخَآءً حَيْثُ أَصَابَ﴾ واتە: ئێمە بامان بۆ ڕام هێنا (بە فەرمانی ئەو) بە نەرمی بۆ هەر کوێیەك بیویستایە دەکەوتەڕێ. حەسەنی بەسری دەڵێت: کاتێك سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) لەبەر خاتری خودا تووڕە بوو دای لە ملی ئەسپەکان خوای گەورە پاداشتی داوە بە چاکترو تیژتر لەوانە بە (هەوا) کە بەیانیان بە ئەندازەی ڕۆیشتنی مانگێك ئەڕۆیشت و ئێوارانیش هەروەها.[2] ﴿حَيْثُ أَصَابَ﴾ واتە: بۆ هەر کوێ بیویستایە دەڕۆیشت لە وڵاتدا. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٍ وَغَوَّاصٍ﴾ واتە: وە هەموو شەیتانەکانمان بۆ ڕام هێنابوو کە بیناسازو مەلەوانی ژێردەریا بوون. واتە: هەندێ لەو شەیتانانەی بەکاردەهێنرا بۆ دروستکردنی کۆشك و تەلارو پەیکەر، دەفری گەورە لە وێنەی حەوزو مەنجەڵی زل فراوان چەندین کاری تری گران کە لە توانای مرۆڤدا نیە. هەندێکی تریان مەلەوانی ژێردەریا بوون مرواری و شتی بەنرخیان دەردەهێنا لە ژێردەریا نەبووایە دەست نەدەکەوت، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ﴾ واتە: هێندێکی تریش زنجیر لە مل هاتبوونە بەرفەرمانی. واتە: بە زنجیری ئاسن بەسترابوونەوە لەوانەی کە سەرپێیان دەکردو نەیاندەویست کار بکەن، یان بە چاکی کاریان نەدەکرد تەمەڵی دەکرد. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: سامانێکمان پێ بەخشیوی کە لە ژمارە دەرچووە؟ سا تۆ یان چاکەی لێ بکە، یان ڕای بگرە. واتە: ئەوەی کە بە تۆمان بەخشیوە لە سامان و دەسەڵاتی تەواو وەك خۆت داوات لێ کردین بە ئارەزووی خۆت بە کێی دەدەی بیدەو بە کێشی نادەی مەیدە بۆت ڕەوایە و چاکە، لەسەرت نانوسرێت. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کاتێك پێغەمبەری

[1] مسلم (١/٣٨٥).

[2] الطبري (٢١/٢٠١).

خودا(ﷺ) سەرپشك كراو ڕێی پێدرا لە نێوان ئەوەی كە پێغەمبەرێكی فرستادە بێت یان پێغەمبەرێكی خاوەن سامانو دەسەلات بێت، بە مەیلی خۆی ئەوەی خودا پێی داوە بیدا بە هەر كەسێكو نەیدات بە هەر كەسێك. پرسیاری لێ نەكرێتو گوناهیش نەكات. پلەی یەكەمی هەڵبژارد دوای وتوویژ لەگەڵ جوبەرئیلدا (سەلامی خوای لێ بێت) پێی وت: ملكەچ بەو تەوازوعت هەبێت، بۆیە یەكەمی هەڵبژارد چونكە پلەی بەرزتر دەبوو لە لای خودای گەورە. وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا ڕێزدارترە. هەرچەندە ئەو پلەی دووهەمەش هەر پێغەمبەرێتیە لەگەڵ ئەو هەموو دەسەلاتە گەورەیە لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا. بۆیە خوای بالادەست كاتێك ئەو دەسەلاتەی داوە بە سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) لە دنیادا فەرمووشیەتی كە لە دواڕۆژدا دیسان خاوەن بەشە، فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ سولەیمانیش لە نزیكەكانی خۆمانەو گەڕانەوەی چاكی هەیە. واتە: لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا.

﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾﴾

**باسی ئەیوب پێغەمبەر( سەلامی خوای لێ بێت )**

خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) دەكات كە تاقی كردووەتەوەو تووشی ئازارو مەینەتی كرد لە سامانو منداڵو لاشەدا هەتا وای لێ هات بە ئەندازەی سەرە دەرزیەك لە لاشەیدا نەما ساغ بێت تەنها دڵی نەبێت. هیچ شتێكی نەما كە سوودی لێ وەربگرێت لەو نەخۆشیەدا كە تووشی بووە. خێزانەكەی نەبێت هەر خۆشی دەویست چونكە باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەكەی بەهێز بوو. دەچوو ئیشی دەكرد بۆ خەڵكی بە كرێ دەیدایە خواردەمەنیو دەرخواردی دەداو خزمەتی دەكرد ماوەی هەژدە ساڵ. ئەیوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) لە پێش ئەم نەخۆشیەداماڵو منداڵێكی چاكی هەبوو ژیانی زۆر بە خۆشی لە دنیادا دەبردەسەر. هیچی نەما تا وای لێهات لە شوێنێكدا دوور لە خەڵك مایەوە لەو ماوەیەدا كەس نزیكی نەدەكەوتەوە لە كەسوكاری دوورو نزیك تەنها ژنەكەی نەبێت (ڕەزای خوای لێ بێت) شەوو ڕۆژ لە لای بوو ئەو كاتانە نەبێت كە ئیشی بۆ خەڵكی دەكرد بە پەلە دەگەڕایەوە بۆ لایو هەرگیز لێی دوورنەدەكەوتەوە. ئەم ئازارە درێژەی كێشاو حاڵی زۆر خراپ بوو هەتا ئەم مەینەتو ئازارە بە فەرمانی خودا كۆتایی هات ماوەكەی تەواو بوو، ئەیوب بەكوڵ پاڕایەوە لە خودای هەموو جیهانیانو پەروەردگاری پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ

بێت) ووتی: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾[1] واتـە: بـە ڕاستی من زیان‌و ئازارو نەخۆشی دووچارم بووەو تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی. لەئایەتێکی پیرۆزی تردا ئەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ﴾ واتـە: لـە ئـەیوبیش کـە لـە عەبدانی ئێمـە بـوو بیربکەوە لەو کاتەدا هاواری بۆ پەروەردگاری هێنا: ئەوا شەیتان منی تووشی ئازارو لەش بەباری کرد. وتراوە: (نُصْب)بە لەش بەباریو (عذاب)بە ئازار چەشتن‌و بە لەناوچوونی ماڵ‌و منداڵ. ئا لەو کاتەدا خوای زۆر بە بەزەیی‌و دلۆڤان بـە هانایەوە هـات‌و پاڕانەوەکەی لێ وەرگرت. فـەرمانی پێکرد کە لـە شوێنەکەی خۆی هەڵسێت‌و پای خۆی بکوتێ بە زەمیندا، ئەیوب هەڵساو پای خۆی کوتا بـە زەویدا. خوای مەزن سەرچاوەیەکی ئاوی لە ژێر پێیدا هەڵقوڵاند فـەرمانی پێکرد کە خـۆی لەناویدا بشۆرێت هەرچی ئێش‌و ئازار بوو لە لەشیدا نەماو ڕۆیشت، پاشان داوای لێکرد کە جارێکی تر لە شوێنێکی تردا پێی بدا بە زەمینداو کانیەکی تری هەڵقوڵاند فەرمانی دایە کە لێی بخواتەوە. هەرچی نەخۆشی هـەبوو لەناو سکیدا نەماو ڕۆیشت‌و لەشی لـە ڕووی دەرەوەو ناوەوە بـە تـەواوی چاك بووەوە. بۆیـە خـوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ﴾ واتە: پای خۆت بکوتە بە زەمیندا، کە ئەمە سەرچاوەیەکە بۆ مەلەکردن دەست دەدات‌و سارده دەشکرێت لێی بخۆیەوە. ئیبنو جەریرو ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پێغەمبەری خـوا ئـەیوب (سـەلامی خـوای لێ بێـت) هـەژدە سـاڵ بـەو (تـاقی کردنەوەیەوە) مایەوە کەس نزیکی نەدەکەوتەوە لە دوورو نزیك تەنها دوو پیـاو نـەبێت لـە هاوەڵـە زۆر چاکەکانی کە هاتوچۆیان دەکرد، یەکێکیان وتی بە هاوەڵەکەی: بە خوا لەوانەیە ئـەیوب تـاوانێکی وای کردبێت هیچ کەسێك لە جیهانـدا تـاوانی وای نـەکردبێت. هاوەڵەکەی پێـی وت: کامەیـە ئـەو تاوانـەی؟ وتـی: لـە مـاوەی هـەژدە ساڵدا خـوا بـەزەیی پێیـدا نەهاتووەتـەوەو ئـەوەی تووشـی بـووە سـاڕێژی نەکردووەو لەسەری لانەبردووە، ئێوارەیەك هەردووکیان چوونە لای ئەیوب، پیاوەکە خـۆی بـۆ نـەگیراو ڕای هاوەڵەکەیی پێ وت. ئەیوبیش (سەلامی خوای لێ بێت) وتی: هیچ ئاگام لەوە نیە تۆ دەیڵێی ئـەوە نەبێت کە خودا خۆی دەزانێ، مـن (تێئەپـەڕیم) بـە لای دوو پیـاودا کـە مشـت‌و مڕیـان ئـەکرد و نـاوی خودایان دەبرد، منیش ئەگەڕامەوە ماڵەوە و لەجیاتی ئەوان کەفارەتی سوێنەکانیانم ئـەدا چونکە پـێم ناخۆشبوو کە باسی خوا بە ناهەقی بکەن، جا دەڵێ: ئەیوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) دەچـوو بۆ پێویستی دەرکردنی خۆی کاتێك تەواوی دەکرد خێزانی دەستی دەگرت هـەتا دەیگەیانـدە شـوێنی

---

[1] الانبياء (٨٣).

خۆی. ڕۆژێك خێزانی دواكەوت خوای مەزن وەحی نارد بۆ ئەیوب تا پێی بكوتێ بە زەمیندا كە ئەمە سەرچاوەیەكە بۆ خۆشۆردن و ساردیشەو بۆ خواردنەوەش دەشێت، ﴿ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ﴾ خێزانی كە دواكەوت لای كردەوەو سەیری كرد بەرەو ڕووی هات خوای مەزن چاكی كردبووەوە نەخۆشی پێوە دیار نەمابوو، چاكتریش لە یەكەم جاری كاتێك خێزانی چاوی پێكەوت وتی: ئەرێ خودا چاكت بۆ بكات، ئایا ئەو پێغەمبەرەی خودا كە تووشی تاقی كردنەوە بوو نەتبینیوە؟ سوێند بە خوا كەسم نەبینیوە كە وەك تۆ لەو بچێت لە كاتی لەش ساغیدا، ئەیوب وتی: بێگومان من ئەوم. وتی: دوو پەڵەكشتوكاڵی هەبوو یەكێكیان گەنم بوو ئەوی تریان جۆ بوو. خوای گەورە دوو پەڵە هەوری نارد ئەوەندە ئاڵتونی باراند بەسەر مەڵۆ گەنمەكەدا هەتا لافاویكرد. پەڵەهەورەكەی تریش ئەوەندە ئاڵتونی باراند بەسەر جۆیەكەدا هەتا لافاوی هەستا. ئەمە قسەی ئیبنو جەریرە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (كاتێك ئەیوب پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) خۆی دەشۆرد بە ڕووتی كوللەی لە زێڕ ئەكەوت بەسەریدا ئەویش دەیخستنە ناو جلەكەی، خوای مەزن بانگی كرد: ئەی ئەیوب! ئایا بێ نیازم نەكردی لەو شتانەیكە بە چاوی خۆت دەیبینی؟ ئەیوب وتی: بەڵێ. بەڵام بێ نیاز نیم لە خێرو بێری تۆ). ئەم حەدیسە بوخاری بە تەنها هێناویەتی.[2] هەر بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ واتە: لە بەزەیی خۆمانەوە وردو درشتی خێزانیو هێندەی تریشمان پێ بەخشی، تا ببێتە بیرەوەری بۆ هەموو خاوەن ئاوەزان. حەسەنو قەتادە دەڵێن: خوای گەورە هەموو خێزانەكەی بۆ زیندووكردەوە ئەوەندەی تریشی لەگەڵ ئەوان پێ بەخشی.[3] وە دەفەرموێت: ﴿رَحۡمَةٗ مِّنَّا﴾ واتە: لە بەزەیی خۆمانەوە بۆ ئەیوب لەسەر ئەو خۆڕاگریو نەپساویەیو گەڕانەوەو خۆ بە كەم زانینیو پاڕانەوەی لێمان، ﴿وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ وە بۆ ئەوانەش كە خاوەن ئاوەزن هەتا بزانن كە پاشەڕۆژی خۆڕاگری ڕزگاربوونو خۆشی ئازادبوونەوە. خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ﴾ واتە: چەپكێك شوڵی وردو لقی تازەدەركردوو بگرە دەستتو پێی لێدە، با سوێندەكەت لێ نەكەوێت. ئێمە ئەومان بە پیاوێكی بە حەوسەڵە هاتە بەرچاو، عەبدی چاك بوو، بە ڕاستی ئەو تۆبەكار

---

[1] الطبري (٢١/٢١١).

[2] البخاري (٢٧٩/٣٣٩١/٧٤٩٣).

[3] الطبري (٢١/٢١٢).

بوو. چونکە ئەیوب تووڕە بووبوو لە ژنەکەی لەسەر کارێك کە کردبووی، سوێندی خوارد کە خوا شیفای داو چاکی کردەوە سەد داری لێ بدا کاتێك خودای مەزن چاکی کردەوەو شیفای بۆ نارد پاداشتی ئەو ژنەی کە ئەو خزمەتە زۆرەی کردو زۆر بە سۆزو بەزەیی‌و چاکەخواز بوو لەگەڵی ئەوە نەبوو کە سەد داری لێ بدا. بۆیە خوای مەزن فەرمووی: کە چەپکێك شوڵی وردو ناسك هەڵگرێت بە ئەندازەی سوێندەکەی کە سەد دار بوو لێی بدات بە یەك جار. تا سوێندەکەی نەکەوێت‌و ڕزگاری ببێت‌و نەزەرکەیشی بەجێ بێنێت. ئەمەش هۆکاری ڕزگاری‌و دەروویەکە بۆ ئەو کەسانەی لەخواترس‌و تۆبەکارن‌و دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا ۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ ۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾ خوای گەورە وەسفی دەکات کە بەندەیەکی چاك‌و هەمیشە گەڕاوە بووە بۆ لای. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا﴾[1] واتە: وە هەر کەسێك خواناس بێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، وە ڕزق‌و ڕۆزی دەدات لە لایەکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتووەو هەر کەسێك پشت بە خوا ببەستێ ئەوە خوای بەسە بە ڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کردووە.

﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ۝٤٥ إِنَّآ أَخْلَصْنَٰهُم بِخَالِصَةٍ ذِكْرَى ٱلدَّارِ ۝٤٦ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ۝٤٧ وَٱذْكُرْ إِسْمَٰعِيلَ وَٱلْيَسَعَ وَذَا ٱلْكِفْلِ ۖ وَكُلٌّ مِّنَ ٱلْأَخْيَارِ ۝٤٨ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَـَٔابٍ ۝٤٩﴾

## باسی ئەو پێغەمبەرانەی لە هەڵبژاردە چاکەکانن

خوای گەورە باسی چاکە و چاکی پێغەمبەرەکانی دەکات (سەلامی خوایان لێ بێت) دەفەرموێت:

﴿وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ﴾ واتە: عەبدەکانمان ئیبراهیم‌و ئیسحاق‌و یەعقوبیش وەبیر بێنەرەوە، کە هەموویان خاوەن دەست‌و دڵ ڕۆشن بوون. مەبەستی: بەو ئاکارە چاك‌و زانستە بەسوودەیان هەروەها ئەو هەموو عیبادەتە زۆرو چاوو دڵ ڕۆشنییانە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ﴿أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى﴾ واتە: خاوەن توانا و بە عیبادەت. ﴿وَٱلْأَبْصَٰرِ﴾ واتە: تێگەیشتوو لە دیندا.[2] قەتادەو سوودی دەڵێن: توانایان پێدرا لە

---

[1] الطلاق (٢-٣).

[2] الطبري (٢١/٢١٥).

خواناسیو دڵ ڕۆشنی لە دیندا. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ﴾ چونکە هەمیشە قیامەتیان وەبیر خەڵك دەهێنایەوە، بوونە دۆستی تایبەتیمان. موجاهید دەڵێت: واتە: وامان لێ کردن هەمیشە کاریان بۆ ڕۆژی قیامەت دەکردو بیریان لە هیچی تر نەدەکردەوە.[1] سودی دەڵێت: هەمیشە باسی ڕۆژی دواییو کاریان هەر بۆ ڕۆژی دوایی بوو.[2] مالکی کوڕی دینار دەڵێت: خوای مەزن خۆشەویستیو باسی دنیای لە دڵ لابردبوونو تەنها خۆشەویستیو باسی ڕۆژی دوایی لە دڵدا جێگیرکردبوو لایان. قەتادە دەڵێت: خەڵکیان ئاگاداردەکردەوە لە ڕۆژی قیامەتو داوایان لێ دەکردن کە کار بۆ قیامەت بکەن.[3] خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ واتە: ئەوان بە لای ئێمەوە لە هەڵبژاردە چاکەکانن. واتە: لە بەندە هەڵبژاردەو دیارو دەستنیشانکراوو چاکەکانی ئێمەن. وە دەفەرموویت: ﴿وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ﴾ واتە: ئیسماعیلو ئەلیەسەعو زەلکیفلیشت لەبیر نەچێت. هەموویان لە پیاوچاکانن. باسو بەسەرهاتیان بە تەواوی لە سورەتی (الانبیاء)دا کراوە پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، ﴿هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ﴾ واتە: ئەمە بۆ بیرەوەریەکەو ئەوانەی لە خواترس بوون لەو دنیا جێگەیان خۆشە. واتە: ئەمە ئامۆژگاریەك بوو بۆ کەسێك دەرسی لێ وەربگرێت. سودی دەڵێت: واتە: ئەم قورئانە پیرۆزە[4].

﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾﴾

## باسی پاشەڕۆژی خۆشبەختان

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ﴾ واتە: باغاتێکە نەمانی بەسەردا نایەتو دەرگایان بۆ کراوەتەوە. خوای مەزن باسی بەندە خاوەن باوەڕو بەختەوەرەکانی دەکات لە ڕۆژی دوایدا چەندە جێگەیان خۆشەو بەختەوەرن دەفەرموویت: ﴿جَنَّٰتِ عَدۡنٖ﴾ بەهەشتێك کە هەتاهەتایە بەردەوامە، ﴿مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ﴾ واتە: ئەم ئەلفو لامە لێرەدا بە مانای ئیزافەیە واتە دەرگاکانی

---

[1] الطبري (٢١/٢١٨).
[2] الطبري (٢١/٢١٨).
[3] الطبري (٢١/٢١٧).
[4] الطبري (٢١/٢٢٠).

بەهەشتیان بۆ کراوەتەوە ، هەر کاتێك هاتن دەرگا لەسەر پشتە بۆیان. ﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴾ واتە: لەوێ پاڵیان داوەتەوە. هەر کاتێك هاتن دەرگای لەسەر پشتە بۆیان، هەر میوەو خواردنەوەیەك ئارەزوو بکەن و داوای دەکەن. ﴿ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا ﴾ واتە: پاڵیان داوەتەوە تیایدا لە ژێر پەردەدا. ﴿يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ﴾ واتە: هەرچی ئارەزوو بکەن تیایەتیو ئامادەکراوە بۆیان، ﴿وَشَرَابٖ ﴾ لە هەر جۆرو ڕەنگێك بەردەستو خزمەتکارەکان بۆیان دێنن. ﴿وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ ﴾ زۆر ئافرەتی هاوتەمەنیان لە لا هەیە، لە ڕووی نامۆ چاو دادەخەن. بۆ مێردەکانیان نەبێت ناڕوانن و لا ناکەنەوە بەلای کەسێکی تردا، ﴿أَتۡرَابٌ ﴾ واتە: هاوتەمەنن، ئەمە مانای قسەکەی ئیبنو عەباس و (ڕەزای خوای لێ بێت) موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەمەدی کوڕی کەعبو سودیە.[1] ﴿ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾ ئەمانە هەر ئەو شتانەن کە بەڵێنتان پێدرابوو، ڕۆژی قیامەت دەودەنێ. واتە: ئەمەی کە باسمان کرد لە وەسفی بەهەشت کە خوای مەزن بەڵێنی داوە بە بەندە خۆپارێزەکانی کە بچنە ناوی دوای زیندووبوونەوەو هاتنەدەرەوەیان لە گۆڕەکانیان و ڕزگاربوونیان لە ئاگر. پاشان خوای مەزن باسی ئەو بەهەشتە دەکات کە هەرگیز لێی دەرناچن و تەواو نابێت و هەتاهەتاییە هەر بەردەوامە و دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴾ واتە: ئەمە بژێوی ئێمەیەو هەرگیز وشکایشی نایەت. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖ ﴾[2] واتە: هەرچی لای ئێوەیە تەواو دەبێت و نامێنێت بەڵام ئەوەی لای خوایە هەر دەمێنێت. وە دەفەرمووێت: ﴿عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ﴾[3] واتە: ئەوە بەخشینێکە بێ برانەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ﴾[4] واتە: بۆ ئەوان هەیە پاداشتی بێ برانەوە. واتە: هەرگیز دوایی نایەت. وە دەفەرمووێت: ﴿أُكُلُهَا دَآئِمٞ وَظِلُّهَاۚ تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْۖ وَّعُقۡبَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾[5] واتە: میوەو سێبەرەکانی (بەهەشت) هەمیشەین ئەو

---

[1] الطبري (٢١/٢٢٣).

[2] النحل (٩٦).

[3] هود (١٠٨).

[4] الانشقاق (٢٥).

[5] الرعد (٣٥).

(بەهەشتە) ئاکامی ئەوانەیە کە خۆیان پاراست (لە دنیادا)و ئاکامی بێباوەڕانیش هەر ئاگرە. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە.

﴿ هَـٰذَا وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَـٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَـٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِهِمْ إِنَّهُمْ صَالُوا۟ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُوا۟ بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًۢا بِكُمْ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا فَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَـٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِى ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾ وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَـٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ ﴾

**باسی دوارۆژی بەدبەختان**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ هَـٰذَا وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴾ واتە: ئەمە ئاوا، ئەو کەسانەش کە لە ڕێی ئێمە لادەدەن، دێنەوە شوێنی زۆر خراپ. وەختێك خوای بالادەست باسی پاشەڕۆژی ئەو کەسانەی کرد کە بەختەوەرن دەچێتە سەر باسی بەدبەختایش کە چیان بەسەردێتو دەچنە چ شوێنێکی زۆر خراپ کاتێ زیندوودەکرێنەوەو پرسیاریان لێ دەکرێتو فەرموویەتی: ﴿ هَـٰذَا وَإِنَّ لِلطَّـٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴾ ئەوانە کە لە فەرمانی خودا دەرچوونو دژایەتی پێغەمبەرەکانیان کرد (سەلامی خوایان لێ بێت) ﴿لَشَرَّ مَـَٔابٍ ﴾ واتە: دەڕۆنە شوێنی زۆر خراپ. پاشان دەفەرموویێت: ﴿ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا فَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴾ واتە: ناوەڕاستی دۆزەخەو شوێنێکی زۆر نالەبارە. واتە: دەچنە ناو جەهەنەمەوە لە هەموو لایەکەوە دایاندەپۆشێت، ﴿ هَـٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴾ واتە: با لەوێدا ئاوەکوڵو کێمو زووخاو بخۆنەوە. ﴿حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴾ حەمیم واتە: ئاوێك کە لەوە زیاتر گەرم نابێت، غەساقیش بە پێچەوانەوە ئەوەندە ساردە لەبەر ساردی زۆر بە ژانەو ناخورێتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴾ واتە: هەر لەو جۆرە جەزرەبانە، چەندین وێنەی تریش هەیە. واتە: چەندین نموونەی تریش لەمانە کە پێی سزا دەدرێن. حەسەنی بەسری لەمانای ئەم ئایەتەدا: ﴿وَءَاخَرُ مِن شَكْلِهِۦٓ أَزْوَٰجٌ ﴾ ئەفەرموێ: یانی چەند جۆر لە سزا.[1] کەسانی تریش وتوویانە: وەك زەمهەریرو گرەباو خواردنەوەی

[1] الطبري (٢١/٢٣٠).

ئاوەکوڵو خواردنی ژەقنەموتو بەرزبوونەوەو کەوتنەخوارەوە لەناو جەهەنەمداو چەندەهاشتی تری دژبەیەك ، هەموو ئەم شتانەش کەرەسەی سزادان وسوکایەتی کردنە پێیان.

## کێشمەکێشمی خەڵکی ناو ئاگر

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿هَٰذَا فَوْجٌ مُّقْتَحِمٌ مَّعَكُمْ ۖ لَا مَرْحَبًا بِهِمْ ۚ إِنَّهُمْ صَالُوا النَّارِ﴾ واتـە: ئـەم گرۆیەش کە هەر بە زۆر لەگەڵ ئێوە دێنە ناوی، ئای بەخێر نەیەن. ئەوانیش دەشێت هەر لەو ئاگرەدا بن. ئەمە گفتوگۆی خەڵکی ئاگرە لەگەڵ یەکتری خوای گەورە بۆمان باس دەکات وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا﴾[1] واتە:هەر کاتێك گروپێك بڕواتە ناو ئاگر دوعا لە هاوڕەوشتەکانی دەکات لە باتی سڵاولێکردن. ئەو کۆمەڵەش پێش ئەمانە چوونەتە ناو ئاگر دەڵێن بەوانەی دوای خۆیان کە گزیرانی (خەزەنەی) جەهەنەم دەیانهێنن بۆ ناو جەهەنەم پێیان دەڵێن: ئەی بەخێرنەیەن ئەوانیش دەبێت هەر لەناو ئاگردابن، ئەوانەیش کە دێن بۆ ناو ئاگر دەڵێن: ﴿قَالُوا بَلْ أَنتُمْ لَا مَرْحَبًا بِكُمْ ۖ أَنتُمْ قَدَّمْتُمُوهُ لَنَا ۖ فَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ واتـە: دەڵێن: خۆتـان بـەخێر نەیـەن! ئێـوە ئـەم شـوێنە خراپەتان لە پێشدا بۆ ئێمە ڕەچاو کرد جێگەیەکی زۆر خراپە. واتە: ئێمەتان بانگ کرد هەتا ئا بەم شێوەیەمان بەسەر هاتو دووچاری ئەم مەینەتیە بووین ﴿فَبِئْسَ الْقَرَارُ﴾ واتـە: شـوێنێکی زۆر خراپو ناڵەبارە. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قَالُوا رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدْهُ عَذَابًا ضِعْفًا فِي النَّارِ﴾ واتـە: دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان کێ پێشەکی ئەمەی بۆ ئێمە سازداوە، تـۆ دووسـەرە بـە ئـاگر جەزرەبەی بدە. وەك خـوای مـەزن لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿قَالَتْ أُخْرَاهُمْ لِأُولَاهُمْ رَبَّنَا هَٰؤُلَاءِ أَضَلُّونَا فَآتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ النَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ﴾[2] واتە: دواییەکانیان (کـە شـوێنکەوتوبوون) دەربارەی پێشووەکانیان (کە پێشەوابوون) دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوانە ئێمـەیان گومڕا کـرد دە تۆش لە ئاگردا دووقات سزایان بدە (پـەروەردگار) دەفـەرموێت بـۆ هـەرکامتان (سـزا) دوو بەرامبـەرە بەڵام ئێوە نازانن و بێ ئاگان. هەموو یەکێك لـە ئێـوە بـە پێـی خـۆی سزای هەیـە. ﴿وَقَالُوا مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ﴾ واتـە: دەشـڵێن: ئـاخۆ ئـەو پیاوانـەی بـە پیاوخراپمـان دەژمـاردن، بۆچی نایانبینین؟ ﴿أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ﴾ واتـە: کـە گاڵتـەمان پـێ دەکـردن، یان چاو لـە دیتنیان کوێرە. ئەمە باسی ئەو خوانەناسانەیە کە ئەو کەسانە نابینن بە خەیاڵی خۆیان وایاندەزانی کە

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] الاعراف (٣٨).

سەریان لێ شێواوە لە خاوەن باوەڕان. دەڵێن: بۆچی ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا لەناو ئاگردا نین‌و چاومان پێیان ناکەوێت. موجاهید دەڵێت: ئەمە قسەی ئەبو جەهلە کە دەڵێت: لەبەرچی من بیلال‌و عەمارو سوهەیب‌و فلان‌و فلان نابینم؟[1] بەڵام ئەمە تەنیا نموونەیەکەو هێنراوەتەوە، ئەگینا هەموو خوانەناسێك هەروا دەڵێت‌و بڕوایان وایە کە خاوەن باوەڕانیش هەر لەناو ئاگردان. بەڵام کاتێك چوونە ناو ئاگرەوەو خاوەن باوەڕانیان نەبینی لەوێ دەڵێن: ﴿مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ الْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَاهُمْ سِخْرِيًّا﴾ واتە: لە ژیانی دنیادا گاڵتەمان پێئەکردن. ﴿أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ الْأَبْصَارُ﴾ شتی مەحاڵ ئەدەنە پاڵ خۆیان لە خۆیان دەپرسن و دەڵێن: لەوانەیە لەگەڵ ئێمە بن لە جەهەنەمدا بەڵام ئێمە چاومان پێیان نەکەوتووە! ئا لەو کاتەدا بۆیان دەردەکەوێت کە ئەوانە پلەی بەرزو زۆر بڵندیان هەیەو بەڵێنی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُوا نَعَمْ ۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿٤٤﴾ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِالْآخِرَةِ كَافِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ ۚ وَعَلَى الْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ ۚ وَنَادَوْا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ أَن سَلَامٌ عَلَيْكُمْ ۚ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتْ أَبْصَارُهُمْ تِلْقَاءَ أَصْحَابِ النَّارِ قَالُوا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْأَعْرَافِ رِجَالًا يَعْرِفُونَهُم بِسِيمَاهُمْ قَالُوا مَا أَغْنَىٰ عَنكُمْ جَمْعُكُمْ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰؤُلَاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لَا يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ ۚ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ﴾[2] واتە: وە بەهەشتیەکان بانگ دەکەن لە دۆزەخیەکان بێگومان ئێمە ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابوین ڕاست بوو پێی گەیشتین جا ئایا ئێوەش ئەوەی کە پەروەردگارتان بەڵێنی پێدان ڕاست بوو پێی گەیشتن؟ دەڵێن بەڵێ پاشان جارچییەك جاڕی دا لە نێوانیاندا کە نەفرینی خوا لە ستەمکاران بێت، ئەوانەی بەرهەڵستی لە ڕێی خوا دەکەن‌و دەیانویست ئەو (ڕێگایە) بە خوارو نارێك نیشان بدەن لە کاتێکدا ئەوان بێباوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی، وە لە نێوانیاندا پەردەو جیاکەرەوەیەك هەیە بەسەر ئەعرافەوە (کە بەرزاییەکە لە نێوان بەهەشت‌و دۆزەخدا) پیاوانێك هەن هەریەکە لە بەهەشتی‌و دۆزەخیەکان دەناسنەوە بە هۆی نیشانە (و شێوەی تایبەت)یانەوە جا بەهەشتیەکان بانگ دەکەن‌و دەڵێن: سەلامتان لێ بێت هێشتا نەچوونەتە ناویەوە بەڵام ئومێدیان هەیە و بە تەمان بچنە ناوی، هەر کاتێك ڕوویان لادرێت‌و وەرگێڕدرێت بەرەو لای دۆزەخیەکان دەڵێن ئەی پەروەردگارمان مەمانخەرە

---

[1] الطبري (٢١/٢٣٢).

[2] الاعراف (٤٤ـ٤٩).

ڕیزی ستەمکاران، وە ئەوانەی وان بەسەر ئەعرافەوە پیاوانێك بانگ دەکەن کە بە نیشانەی تایبەتیاندا دەیانناسن دەڵێن کۆمەڵەکەتان سوودی پێ نەگەیاندن هەروەها خۆبەزلزانین و لەخۆبایی بونتان بە کەڵکتان نەهات، ئایا ئەوانە (هەژارە باوەڕدارەکان) هەر ئەوانە نین کە ئێوە (لە دنیادا) سوێندتان دەخوارد کە خوا بەر میهرەبانی خۆیان ناخات (خوا بە هەژارە باوەڕدارەکان دەڵێت) بچنە بەهەشت هیچ مەترسیەکتان لەسەر نیەو ئێوە خەم ناخۆن. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ النَّارِ﴾ واتە: ئەمە کێشەی ئەهلی دۆزەخە ڕاستەو دەشێ هەر وەدی بێت. واتە: ئەمەی کە ئێمە بۆمان باس کردی ئەی موحەممەد (ﷺ) کێشەی خەڵکی ناو ئاگرەکە قسە بە یەکتری دەڵێن و دوعای شەڕ لە یەکتری دەکەن ڕاستەو گومانی تێدا نیە.

﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٦٦﴾ قُلْ
هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰ إِلَيَّ إِلَّا أَنَّمَا أَنَا
نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾﴾

## پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵێکی زۆر گرنگ و گەورەیە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ واتە: بڵێ: من خۆم هەر تەنها ترسێنەرێکم، غەیری خوای تاك و تەنهای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ شت بۆ پەرستن ناشێت. خوای مەزن فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە بڵێ بە خوانەناسان ئەوانەی کە شەریکی بۆ دادەنێن و باوەڕ بە پێغەمبەرەکانی ناکەن (سەلامی خوایان لێ بێت) کە من تەنها ترسێنەرم بۆیان. وە من بەو شێوەیە نیم کە ئێوە وا دەزانن: ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ واتە: هەر خودا بە تەنها خۆی خاوەن دەسەڵات و زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ واتە: پەروەرێنی ئاسمانەکان و زەمینەو هەرچی لە نێوانیاندایە، کۆڵنەدەرو لێبوردەیە. ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ خاوەنی ئاسمانەکان و زەمین و ئەوەی لە نێوانیاندایە پارێزەریشیانە، ﴿الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ لێبوردەیە لەگەڵ ئەو هەموو مەزنی و دەسەڵاتەدا. وە دەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ نَبَأٌ عَظِيمٌ﴾ واتە: بڵێ: ئەمە خەبەرێکی زۆر گەورە و گرنگە. واتە: ڕەوانەکردنی من بۆ لای ئێوە لە لایەن خوداوە هەواڵێکی زۆر گەورەو گرنگە. ﴿أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ﴾ واتە: کە ئێوە خۆی لێ دەبوێرن. واتە: ئێوە لێی بێ ئاگان خۆتانی لێ لادەدەن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ لِيَ مِنْ عِلْمٍ بِالْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ إِذْ

يَخۡتَصِمُونَ ﴾ واتە: کاتێ بالآنشینەکان کێشەیان لەناو پەیدا بوو، من هیچم لێ نەزانیووە. خۆ ئەگەر (وەحی) نەبووایە لە کوێ من بە کێشەی بالآنشینەکانم دەزانی؟ واتە: کە لە بارەی دروستبوونی ئادەمو (سەلامی خوای لێ بێت) ملنەدانی شەیتان کە سوژدەی بۆ بەرێت گفتوگۆی شەیتان لەگەڵ خوای مەزن لەو بارەیەوەو خۆ بەزلزانینو لەخۆبایی بوونی. وە دەفەرمووێت: ﴿إِن يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ واتە: بۆیە پێم ڕادەگەیەنرێت، چونکە دەبێت ترس وەبەر ئێوە بێنم.

﴿إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾
فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن
تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿٧٦﴾
قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ
فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ
ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٨٣﴾ قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾﴾

**بەسەرهاتی ئادەمو شەیتان (ئیبلیس)**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن طِينٖ﴾ واتە: کاتێك کە پەروەرێنی تۆ بە فریشتەکانی ڕاگەیاند: وا خەریکم مرۆڤێك لە قوڕ دروست بکەم. ﴿فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ﴾ واتە: هەر کاتێك لەشیم تەواو کردو لە گیانی خۆم فووم پێداکرد هەمووتان سوژدەی بۆ بەرن. ﴿فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ﴾ واتە: ئەوسا فریشتەکان گشتیان سوژدەیان برد. ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ ٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئیبلیس نەبێت، خۆی بە زل دیو سپڵەیی کرد. ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ﴾ واتە: وتی: ئەی ئیبلیس! چی نەیهێشت سوژدە بەری بۆ ئەوەی دەستکردی خۆمە؟ ئاخۆ فیزت ڕێگەی نەدای یان لە پایەبەرزانی؟ ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾ واتە: دیارە من خۆم لەو چاکتر دەزانم، من لە ئاگرو ئەوت لە قوڕ وەدی هێنا. ﴿قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ﴾ واتە: وتی: لێرە بڕۆ دەری، لە ئێستەوە دەرکراوی. ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكَ لَعۡنَتِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ واتە: نەفرینی منت لەسەر بێت، تا ڕۆژی قیامەت ڕادەبێت. ﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾ واتە: ئەی پەروەردگاری من دەرفەتم بدە تا ئەو

ڕۆژەی هەموو زیندوو دەبنەوە. ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴾ واتە: وتی: تۆ یەکێك لەوانەی کە مەودایان پێدراوە. ﴿ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴾ واتە: هەتا ئەو ڕۆژەو ئەو کاتەی دیاری کراوە. ئەم بەسەرهاتە خوای گەورە لە سورەتی (البقرة)و سەرەتای سورەتی (الاعراف)و (سورەتی (الحجر)و (سبحان)و (الکهف)و لێرەشدا باسی کردووە کە خوای مەزن بە فریشتەکانی ڕاگەیاند لە پێش دروستکردنی ئادەمدا کە دەمەوێ مرۆڤێك دروست بکەم لە قوڕەڕەشەی ترشاوی وشکەڵاتوو وە داوای لێکردن کاتێك لاشەی تەواو دروست کرد با بۆ ڕێزلێنانو حورمەت سەیرکردنو لەبەر فەرمانو ڕەزامەندی خودا سوژدەی بۆ بەرن. هەموو فریشتەکان فەرمانی خودایان بەجێ هێنا غەیری شەیتان کە لە ڕەگەزی فریشتەکان نەبوو. بەڵکو لە ڕەگەزی جنۆکە بوو. دەینازی بە سروشتو وەدیهاتنی خۆیدا کەچی ئەو زیاتر پێویستی بەوەبوو کە ئەو فەرمانە بەجێ بێنێت. فیزکردن ڕێگای نەدا کە سوژدە ببات بۆ ئادەم. دەستی کردە قسەکردن لەگەڵ خودای گەورەدا. دەیوت کە ئەو چاکترە لە ئادەم چونکە ئەو لە ئاگر وەدی هاتووەو ئادەم لە قوڕ. وایدەزانی ئاگر لە قوڕ چاکترە. قسەیەکی هەڵە و بێ جێی کرد. فەرمانی خودای مەزنی شکاندو سەرپێچی کرد خوای گەورەش: نەفرینی لێکردو لوتی دا بە خۆڵەوە لە بەزەیی خۆی بێ بەشی کردو دووری خستەوە لە خۆیو ناوی نا ئیبلیس (واتە: بێئومێد) و بێ ئومێدی کرد لە بەزەیی خۆی. وە لە ئاسمان دەری کرد بە سەرشۆڕیو داماوی بۆ سەر زەوی. ئیبلیس داوایکرد لە خودا هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوە مۆڵەتی بدات. ئەو خودا دەروون گەورەو بێ باکە کە سەرپێچی سەرپێچیکەران پەلەی لێ ناکات مۆڵەتی دایە. کاتێك شەیتان دڵنیا بوو لەوە کە تا ڕۆژی قیامەت مۆڵەت دراوەو ئیتر نامرێت، دەستی دایە لاساری و یاخیبوون. وتی: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ واتە: وتی: دەسا سوێند بە دەسەڵاتی تۆ. سەر لە بەریان گومڕا دەکەم. ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾ واتە: مەگین ئەوانەی بە پاکی دەتپەرستن. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴾[1] واتە: (ئیبلیس) وتی پێم بڵێو هەواڵم بدەرێ لە بارەی ئەمەوە کە ڕێزی ئەوت داوە بەسەر مندا؟ سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی دوایی و (نەمرم) تۆڵەی خۆم لەنەوەکانی دەکەمەوە و کەمێك لەوان نەبێت (کە بەندە تایبەتیەکانی خوان). بەڵام ئا ئەوانەی کە جیاکراونەتەوە شەیتان زاڵ نابێت بەسەریاندا وەك لە ئایەتێکی تردا خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ

[1] الاسراء (٦٢).

وَكِيلًا ﴾[1] واتە: بێگومان بەندەکانی من دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە (و ناتوانی گومڕایان بکەیت)و پەروەردگارت بەسەر پارێزەرو چاودێر بێت. وە دەفەرموێت: ﴿قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ﴾ واتە: وتی: سا ڕاست هەر ئەمەیەو هەرچی من بیڵێم ڕاستە. ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: دڵنیابە، تۆش و ئەو کەسانەی شوێن تۆ کەوتوون جەهەنەمیان لێ پڕ دەکەم. هەندێ لە زانایان وایان خوێندووەتەوە: بە ڕەفعی (الحَق)ی یەکەم، لەوانە موجاهید بەم شێوەیە لێکی داوەتەوە واتە: (أنا الحَقُّ والحقَّ أقول) وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە موجاهیدەوە (الحَقُّ مني وأقول الحقَ)[2] ئەوەی لەمنەوە دەربچێت ڕاسەقینەیە و منیش ڕاستەقینە دەڵێم. هەندێ لە زانایانی تریش بە مەنصوبی هەردوو(الحق)ە کەیان خوێندووەتەوە. سودی دەڵێت: ئەوە سوێندێکە خودا سوێندی پێ خواردووە[3].

منیش دەڵێم: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنْ حَقَّ الْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾[4] واتە:بەلام بەڵێنی من چەسپاوەو جێگیر بووە کە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە پەریو ئادەمی تێکڕا. ئەو ئایەتەش کە دەفەرموێت: ﴿ قَالَ اذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَاؤُكُمْ جَزَاءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾﴾[5] واتە: (خوا بە شەیتانی) فەرموو برۆ سا هەر کەس لەوان شوێنی تۆ کەوت ئەوە بە ڕاستی تۆڵەی هەمووتان دۆزەخە کە تۆڵەیەکی پڕبەپڕە.

﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ ﴿٨٨﴾﴾

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ واتە: بڵێ من هیچ پاداشتێکم لێتان ناوێ، لەوانەش نیم کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن. خوای مەزن دەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەی موحەممەد بڵێ بەو خوانەناسانە من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ لەباتی ئەو ئامۆژگاریو ڕێ نیشاندرانە پێم بدەن لە ماڵی دنیا، ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾ یانی: من هیچم ناوێ لەپاداشتی ئەوەدا کە خوا ناردویەتییەسەرم و نامەوێ زیادەشی بخەمەسەر، ئەوەیش خوای مەزن منی بۆ ڕەوانە کردووە هەر ئەوە دەگەیەنم هیچی لێ زیاد ناکەم و لێشی کەم ناکەم. بەڵکو هەر بە تەمای

[1] الاسراء (٦٥).

[2] الطبري (٢١/٢٤٢).

[3] الطبري (٢١/٢٤٢).

[4] السجدة (١٣).

[5] الاسراء (٦٣).

ڕەزامەندی خودام لە دنیاو ڕۆژی قیامەتدا. سوفیانی سەوری دەڵێت لە ئەعمەش و مەنسوریش لە ئەبو زوحاوە لە مەسروقەوە دەڵێت: هاتین بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئەی خەڵکینە. هەر کەسێك شتێك دەزانێ با بیڵێت، هەر کەسێکیش نازانێ با بڵێ خوا دەزانێ. چونکە ئەوە بەڵگەی زانایییە ئەگەر کەسێك شتێك نەزانێ بڵێ خوا باشتر دەزانێ.[1] چونکە خوای مەزن فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەتان(ﷺ): ﴿وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ﴾ موسلیمو بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.[2]

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئەم بیرەوەریو پەندە بۆ هەموو خەڵکی دنیایە. واتە: ئەم قورئانە پەندو ئامۆژگاریە بۆ هەموو ئەو کەسانەی درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن لە مرۆڤو جنۆکە، ئەمە قسەی ئیبنو عەباسە (ڕەزای خوای لێ بێت) وە ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتانە وایە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[3] واتە: بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنمو هەر کەسێکی کەش کە ئەم قورئانەی پێ دەگات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ﴾[4] واتە: وە هەر کەس باوەڕی پێی نەبێت لەو کۆمەڵو تاقمانە (ئەوانەی کۆبوونەوە لەسەر دژایەتی ئیسلام) ئەوە ئاگر جێگایەتی. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ﴾ واتە: بێگومان پاش ماوەیەکیتر دەنگوباسی ئەوتان بە لاوە ڕوون دەبێتەوە. ﴿وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ﴾ واتە: هەواڵی قیامەتو ڕاستیەکەیتان بۆ دەردەکەوێت، ﴿بَعْدَ حِينٍۭ﴾ واتە: بەم زووانە. قەتادە دەڵێت: واتە: دوای مردن. عیکریمە دەڵێت: واتە: ڕۆژی قیامەت. هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەم دوو قسەیەدا نیە. چونکە هەر کەسێك مرد وەك ئەوە وایە کە ڕۆیشتبێتە قیامەت.

---

[1] القرطبي (١٥/٢٣٠).

[2] فتح الباري (٨/٤٠٩)، مسلم (٢/٢١٥٥).

[3] الانعام (١٩).

[4] هود (١٧).

## تەفسیری سورەتی (الزمر)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

**ڕێزی سورەتی (الزمر)**

نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژوی دەگرت هەتا دەمانوت: نایەوێت ڕۆژو بشکێنێت. ڕۆژوشی نەدەگرت هەتا دەمانوت: نایەوێت ڕۆژوو بگرێت. وە پێغەمبەر(ﷺ) هەموو شەوێك سورەتی بەنی ئیسرائیلو زومەری دەخوێند[1].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ۚ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ ﴿٤﴾﴾

**فەرماندان بە یەکتاپەرستیو پوچەڵکردنەوەی بتپەرستی**

خوای مەزن هەواڵمان دەداتێ کە ڕەوانەکردنی ئەم کتێبە واتە قورئان لە لایەن خۆیەوە کە ڕاستەو هیچ گومانێکی تێدا نیە وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە، جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە، بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی، بە زمانێکی عەرەبی ڕوونو ڕەوان. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[3] واتە: کە بە ڕاستی کتێبێکی زۆر بەرزو بەرێزو جێگەی ڕێزە، بەتاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دواڕۆژدا (نە بە لێ کەمکردن نە بە لێ زیادکردن) چونکە نێردراوەتەوە خوارەوە لە لایەن (خوای) کاردروستی ستایش کراوەوە. وە لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ واتە: ئەم کتێبە لە خوای خاوەن دەسەڵاتو لە کارزانەوە هاتووەتە خوار. واتە: پارێزراوەو لەناو ناچێت. ﴿الْحَكِيمِ﴾ واتە: کارزان لە کردارو گفتارو بڕیارو

---

[1] النسائي في الكبرى (٦/٤٤٤)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] الشعراء (١٩٢ـ١٩٥).

[3] فصلت (٤١ـ٤٢).

بەرنامەیــدا. ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ﴾ ئێمــە ئــەم کتێبــەمان بەڕاستی بۆ تۆ نارد، سا تۆ هەر خوا بپەرستەو بە دڵپاکی هەر لەسەر دینەکەی ئەو بـە. واتـە: هـەر بـە تەنها خوا بپەرستەو خەڵکیش بانگ بکە بـۆ پەرستنیو ئاگاداریـان بکـە کـە بەندایـەتی تـەنها بـۆ خـوا نەبێت نابێتو هیچ سوودێکی نیە. چونکە خودا هاوەڵو بریکارو یاریدەدەری نیـە. بۆیـە فەرموویـەتی: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ واتە: تۆ بزانـە دینـی پاکژ هەر هی خودایەو ئەو کەسانەی کە بە جێـی ئـەو گەورەگەلێکیان بـۆ خۆیـان دیوەتـەوە، دەڵێن: ئێمە هەر بۆیە دەیانپەرستین، لە خوا نزیکمان بکەنەوە، خوا بەو دووبەرەکایەتیە ڕادەگات، کە لـەناو ئەواندا هەیە. دیارە خودا مرۆڤی درۆزنی سپڵە بەرەو خۆی شارەزا ناکات. واتـە: هـەر کارێك تـەنها بـۆ خـوا خـۆیو بـە دڵپـاکی نـەبێت وەرناگیرێـت. پاشـان خـوای مـەزن باسـی ئـەو کەسـانە دەکـات لـە موشـریکەکان کـە بـت دەپەرسـتنو دەڵـێن: ﴿مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ﴾ واتـە: تـا ببنـە تکاکارمانو لە خوداوە نزیکمان بخەنـەوە.[1] بۆیـە ئەوانـە لـە داواو پاڕانەوەکانیانـدا لـە کـاتی نەفامیدا دەیانوت : (لبيك لا شريك لك إلا شريكا هو لك تملكه وما ملك) ئەم هەڵەیەش هەر لە دێرزەمانەوە هـەتا ئەو کاتە موشریکەکان دووبارەیان دەکردەوەو پێی هەڵدەسان هـەتا پێغەمبـەران (سـەلامی خوایـان لێ بێت) ڕەوانە کران بۆیان داوایان لێ کردن کە وازی لێ بێننو خودای تـاكو تـەنها بپەرسـتن کـە هـاوەڵی نیە. ئەو شتەش بتپەرستان بۆ خۆیان دایانهێنابوو لە ئارەزووی خۆیانو خودا پێی ناخۆش بوو، ڕێگای پێ نەدابوون، بـەڵکو کـارێکی خراپو قەدەغـە بـوو لـە لای خـودا وەك دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[2] واتـە: سـوێند بـە خـوا لـەناو هـەموو گەلو ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تـەنها خـوا بپەرسـتنو دوور بکەونـەوە لـە (پەرستنی) هـەر پەرستراوێکی تـر. وە دەفـەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ﴾[3] واتە: وە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك نەناردووە مەگـەر نیگامـان بـۆ نـاردووە (بـەوەی کە) بێگومان جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە کەواتە تەنها مـن بپەرسـتن. وە فەرموویـەتی کـە هـەموو ئەو فریشتانەی کە لە ئاسمانـدان بـە فریشـتە زۆر نزیکەکانیـشەوە هـەموو عەبـدی ملکەچو گوێڕایـەڵی

[1] الطبري (٢١/٢٥١/٢٥٢).

[2] النحل (٣٦).

[3] الانبياء (٢٥).

خودای مەزنن. بە ئیزنو ڕەزامەندی ئەو نەبێت تکا بۆ کەس ناکەن ئەو فریشتانە لە لای خودا وەك کاربەدەستو فەرمانڕەوایانی دنیا نین کە بە ئارەزووی خۆیان تکا بکەن بۆ هەر کەسێك بیانەوێت با سەرۆکەکەیان پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت، ﴿فَلَا تَضْرِبُوا لِلَّهِ الْأَمْثَالَ﴾[1] واتە: ئێوە مەسەل (نموونە) بۆ خودا مەهێننەوە خودا بەرزو بڵندە زۆر دوورە لەو شتانەوە، ﴿إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ﴾ خودا دادوەری دەکات لە نێوانیاندا لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: بەم زووانە خودا کێشەکانیان بۆ یەکلا دەکاتەوە کاتێك کە زیندوو دەکرێنەوە لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسەو پاداشتی کردەوەی خۆی وەردەگرێت. ﴿وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾[2] واتە: وە ڕۆژێك (خوا) هەموویان کۆدەکاتەوە پاشان بە فریشتەکان دەفەرموێت ئایا ئەوانە (لە دنیادا) ئێوەیان دەپەرست، (فریشتەکان) دەڵێن پاکو بێگەردی بۆ تۆ تەنها تۆ گەورەی ئێمەی نەك ئەوان بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست زۆربەیان باوەڕیان بەوان (جنۆکە) هەبوو. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ واتە: خودا ڕێی نیشانی کەس نادات کە درۆو بوختان بە دەمیەوە هەڵبەستێتو بە دڵ باوەڕی نەبێت بە نیشانەکانی ئینکاری بکات. پاشان خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە منداڵی نیەو وەك هەندێ لە بتپەرستەکان وا دەزانن کە فریشەکان کیژی خودانو هەندێ لە گاورو جوولەکە لاسارەکانیش وا دەزانن عوزەیرو عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوایان لێ بێت) کوڕی خودان. خوای مەزنیش دەفەرموێت: ﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ واتە: ئەگەر خودا بیویستایە فەرزندێ بۆ خۆی پەیدا بکات، لەو خەڵکەی دروستیان دەکات بە مەیلی خۆی کوڕی لێدەبژاردن، پاکیو بێ عەیبی بۆ ئەوە، هەر ئەوە خوای تاکو تەنهای زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئەوان وا دەزانن بڕیاری دەدا، ئەمە مەرجێکە پێویست ناکات بێتەدی بەڵکو مەحاڵیشەو نابێت. مەبەست لێرەدا نەفامیو بێ ئاوەزی ئەوانە دەردەخات کە چۆن وا بیردەکەنەوەو دەڵێن. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ﴾[3] واتە: ئەگەر

---

[1] النحل (٧٤).

[2] سبأ (٤٠-٤١).

[3] الانبياء (١٧).

بمانویستایە سەرقاڵی بۆ خۆمان هەڵبژێرین (وەك هاوسەرو منداڵ) لە لایەن خۆمانەوە هەڵماندەبژارد.

وە دەفـەرمووێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾[1] واتـە: بڵـێ ئەگـەر پـەروەردگاری ببوایـە ئەوە من یەکەمین کەس دەمپەرست. ئەمانە هەموو لە بابی مەرجە (بـاب الـشرط) و دروستیشە مـەرج ببەسـترێت بـە مەحاڵـەوە کـە نابێـتو ڕوونـادات لەبـەر مەبەسـتێکی تایبـەتی بێـژەر (المـتکلم) وە دەفەرمووێت: ﴿سُبْحَانَهُ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾ واتە: خودا پـاكو بـێ عەیبەو دوورە لـەوەی کە فەرزندەی هەبێت. چونکە خودا تاكو تەنهایەو هاوەڵی نیە، بێ نیازە لە هـەموو شـتێك، هـەموو شـتێك بەندەو دروستکراوی ئەوەو پێویستی بەوە، خودا پێویستی بە کەس نیەو زاڵە بەسەر هەموو شـتێکداو هـەموو دەسـتەوخوارو ملکـەچو فەرمانبـەری ئـەون. خـوای مـەزن پـاكو بـێ عەیبـە لـەو شـتانەی کە ستەمکارو بێباوەڕان دەیڵێن.

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ

وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ ﴿٥﴾ خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا

زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ

ثَلَاثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾﴾

### بەڵگەهێنانەوە لەسەر تواناو تەنهایی خودا

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ۖ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ﴾ واتـە: ئاسمانەکانو زەمینی بە ڕاست وەدی هێناوەو شەو لە ڕۆژ دەپێـچێتو ڕۆژ لـە شـەو، خۆرو مانگیشی ڕام کرد، هەر کامیان تا کاتی دیاریکراو دێنو دەچن، باش بزانن بە دەسەڵاتو خەتاپۆش هەر خۆیـەتی. خـوای گـەورە باسـی ئـەوە دەکـات کـە هـەر خـۆی وەدیهێنـەری ئاسمانـەکانو زەمـینو ئـەوەی لـە نێوانیاندایە لە هـەر شـتێكو خـاوەن دەسـەڵاتو کاربەدەسـتیەتیو شـەوو ڕۆژی تیا هەڵدەسـوڕێنێت، ﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ واتـە: ڕامـی هێنـاونو بـە دوای یەکدا دێن بـەبێ وچان (وەستان) هەر یەکەیان بە دوای ئەوی تردا بە پەلـە دەچێت وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾[2] واتـە: بـە (تاریکـایی) شـەو (ڕۆشـنایی) ڕۆژ دادەپۆشـێت (بـە

---

[1] الزخرف (٨١).

[2] الاعراف (٥٤).

پێچەوانەشەوە)، (ڕۆژ بە شوێن شەوەوەیە بە خێراییو) شەو بە شوێن ڕۆژەوەیە بە خێرایی. ئا بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو قەتادەو سودیو کەسانی تریشەوە.[1] وە دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّى﴾ واتە: دێنو دەچن هەتا مەودایەکی دیاریکراو لە لای خودا پاشان کە قیامەت هات کۆتایی دێتو نامێنێت، ﴿أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ﴾ واتە: لەگەڵ ئەو زاڵی خاوەنی دەسەڵاتو گەورەییەدا هەر خۆی خەتاپۆشە لەگەڵ ئەوانەدا کە بێ فەرمانی دەکەن لە پاشان پەشیمان دەبنەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای. خوای مەزن دەفەرموێت:

﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۚ يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴾

واتە: ئێوەی هەر لە تاکە کەسێك هێنایەدیو ژنەکەش هەر لە ماکی ئەو دروستی کرد، هەشت جوتیشی لە ئاژەڵ بۆ وەدی هێنان. ئێوە ئاوا دروست دەکات. لە سکی دایکتاندا لە سێ قۆناغی تاریکدا، هەڵگێڕو وەرگێڕیان پێدەکات. ئەوە خوا پەروەردگارتان، فەرمان هەر لە دەستی ئەودایەو لە غەیری ئەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێت. جا کەوایە بەرەو کوێتان وەردەگێڕن. ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ واتە: لەگەڵ جیاوازی ڕەگەزو تیرەو زمانو ڕەنگدا لە یەك کەس وەدی هێناون ئەویش ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێت)، ﴿ثُمَّ جَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا﴾ پاشانیش حەوای لە ماکی ئەو دروست کرد (سەلامی خوای لێ بێت). وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾[2] واتە: ئەی خەڵکینە خۆتان بپارێزن لە (سزای) پەروەردگارتان ئەوەی کە دروستی کردوون لە یەك کەسەوە (کە ئادەمە) وە هەر لە ئەویش هاوسەرەکەی دروست کردووە و لەو دووانە پیاوانێکی زۆر و ئافرەتانێکی زۆری خستۆتەوە. وە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖ﴾ واتە: لە مەڕو ماڵاتیش هەشت جووتی بۆ دروست کردوون کە لە سورەتی (الانعام)دا باسی هاتووە. هەشت سەر ماڵاتی دروست کردووە مەڕو بەرانو سابرین و بزنو وشتری نێرو مێو گا و مانگا. پاشان دەفەرموێت: ﴿يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ﴾ واتە: ئێوەش بەو شێوەیە لە سکی دایکدا دروست دەکات، ﴿خَلۡقٗا مِّنۢ

---

[1] القرطبي (١٥/٢٣٥).

[2] النساء (١).

بَعۡدِ خَلۡقٍ﴾ واتە: لە هەوەڵەوە تنۆکێك ئاو بوون پاشان بوونە خوێنێکی توندەوەبووی شل پاشان بوونە پارچە گۆشتێكو پاشانیش بوونە گۆشتو ئێسكو دەمارو گیانی کرا بەبەرداو کردمانە دروستکراوێکی تر. ﴿فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ﴾[1] واتە: جا گەورەو پیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترینی بەدیهێنەرانە. واتە: دەست ڕەنگینی هەر بۆ خودایە کە هیچ وەستایەك پێی ناگات. ﴿فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖ﴾ واتە: لە سێ قۆناغی تاریکدا، تاریکایی ناو ڕەحمو تاریکایی مەشیمە، (پەردەیەکە پارێزەری منداڵەکەیە) تاریکایی ورگ (سك)، ئیبنو عەباسو موجاهیدو عیکریمەو ئەبو مالكو زەححاكو قەتادەو سودیو ئیبنو زەیدیش هەر وایان وتووە.[2] وە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ﴾ واتە: ئەو کەسەی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی لە نێوانیاندایەو ئێوەشو بابو باپیرانیشتانی دروست کردووە هەر ئەو پەروەردگاریە کە خاوەنی دەسەڵاتو کاربەدەستە لە گشت ئەمانەدا، ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: ئەو خودایەی کە عیبادەت تەنها هەر بۆ ئەو دەکرێتو شەریکی نیە. ﴿فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴾ واتە: چۆن کەسێکی تر لەگەڵی دەپەرستن؟ کەواتە بەرەو کوێ دەتانبەنو سەرتان لێ دەشێوێنن؟

﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ⑦ ۞ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًاۖ إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ⑧ ﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡۖ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَۖ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: ئەگەر بە چاکە نازانن، خودا لە ئێوە بێ نیازەو بەپێی نەزانی عەبدانی ڕازی نابێت. ئەگەر چاکەو لە چاو دابێت، لێو ڕازیە. کەسیش باری گرانی کەس لە ئەستۆ ناگرێت، لەمەولامەوو لاتان بۆ لای پەروەردگاری خۆتان دەهێننەوەو پێتان دەڵێت چیتان دەکرد. لە نهێنی ناو دڵانیش ئاگادارە. خوای گەورە باسی خۆی دەکات کە بێ نیازە لە هەموو شتێكو پێویستی بە هیچ کەسێك نیە وەك موسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) وتی: ﴿إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ

---

[1] المؤمنون (١٤).

[2] الطبري (٢١/٢٥٨/٢٥٩)، الدر المنثور (٧/٢٣٦).

حَمِيدٌ ﴾[1] واتە: ئەگەر ئێوە ناسوپاسی (بەهرەکانی خوا) بکەن و هەموو ئەو کەسانەش لە زەویدان ئەوە بە ڕاستی خوا بێ نیازی سوپاسکراوە. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: (ئەی عەبدەکانم ئەگەر هەوەڵتان و دوایینتان و مرۆڤتان و جنۆکەتان گشت لە سەردڵی خراپترین پیاوێك لە خۆتاندا بێت، لە موڵکی من هیچ کەم ناکات).[2] ﴿وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ﴾ ڕازی نییە لەوە بەندەکانی کافر و سپڵە بن، واتە: پێی خۆش نیەو فەرمانی پێ ناکات. ﴿وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾ واتە: ئەگەر شوکرانەبژێر بن لێتان ڕازیەو پێی خۆشەو زیاترتان دەداتێ، ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ﴾ واتە: کەس باری گوناهی کەس هەڵناگرێت بەڵکو هەرکەسەو پرسیاری خۆی لێ دەکرێت، ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: هەمووتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو پێتان دەڵێت چیتان کردووە، بێگومان ئەو ئاگاداری نهێنیەکانی ناودڵانەو هیچی لێ بزرنابێت.

**لە سپڵەیی مرۆڤ کاتێك کە تووشی تەنگانەیەك هات لە خودا دەپاڕێتەوە بەڵام کە خۆشیەکی تووش هات شەریکی بۆ دادەنێ لەگەڵ خودا دەیپەرستێت**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾ واتە: ئەم مرۆڤە کە تەنگانێکی دەگاتێ، ڕوو هەر لە خودا دەکات و لەبەری دەپاڕێتەوە، هەر کاتێکیش لە خۆیەوە بەهرەیەکی بە ئەو گەیاند، لەبیری دەکات کە لە پێشدا لەبەری پاڕاوەتەوەو شەریکانێك بۆ خودا دەدۆزێتەوە، تا خەڵکی پێ گومڕا بکات. بڵێ: بەو سپڵەییتەوە، کەمێکی تریش ڕابوێرە، بێگومان تۆ لە یارانی ئاگری. ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ﴾ واتە: لە کاتی پێویستیدا دەپاڕێتەوەو تەنها هاوار لە خودا دەکات لە کەسی تر ناپاڕێتەوە. وەك خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ أَعۡرَضۡتُمۡۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾[3] واتە: وە کاتێك لە دەریادا تووشی بەڵاو زیان بێت هەموو ئەو (پەرستراوانە)ی هاواریان لێ دەکەن ون دەبن بێجگە لە خوا کەچی کاتێك کە (خودا) ڕزگارتان دەکات و دەگەنە وشکانی ڕوو وەردەگێڕن (چونکە) ئادەمی هەمیشە سپڵەو ناسوپاسە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةٗ مِّنۡهُ نَسِيَ مَا

---

[1] ابراهيم (٨).

[2] مسلم (٤/١٩٩٤).

[3] الاسراء (٦٧).

كَانَ يَدْعُوٓاْ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ﴾ یانی: لە كاتی خۆشگوزەرانیدا ئەو هاوارو پاڕانەوەی لە یاد دەچێت وەك خودای مەزن لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ﴾[1] واتە: وە كاتێك ئادەمی زیانێكی لێ بكەوێت بە ڕاكشان یان بە دانیشتن یان بە پێوە لێمان دەپاڕێتەوە ئینجا كاتێك لامان برد زیانەكەیو نەمانهێشت دەڕوات (دەچێتە سەر حاڵی پێشووی) وەك هاوارو دوعای نەكردبێت لێمان بۆ لابردنی زیانێك كە دووچاری بووە. وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾ واتە: لە كاتی خۆشیو خۆشگوزەرانیدا شەریك بۆ خودا پەیدا دەكاتو لەگەڵی دەیپەرستێت، ﴿قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ﴾ واتە: بڵێ بەوەی كە ئا ئەوە خوو پیشەیەتیو ڕێگای وەها دەگرێتەبەرو لەسەری دەڕوات. ماوەیەكی تریش ڕابوێرێت بەو لاساریەوە بە ڕاستی تۆ لەو كەسانەی كە دەچنە ناو ئاگر. ئەمە هەڕەشەیەكی توندەو جەختی لەسەر كراوە. ﴿قُلْ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ﴾[2] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بەوانە ڕابوێرن چونكە بێگومان چارەنوستان دۆزەخ دەبێت. وە دەفەرموێت: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾[3] واتە: كەمێك نازو نیعمەتیان پێ دەدەین (لە دونیادا) لە پاشان ناچاریان دەكەین كە بڕۆنە ناو سزای سەختەوە.

﴿ أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٩﴾﴾

**مەردمی گوێڕایەڵو مەردمی لاسارو بێ گوێ وەك یەك نین**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾ واتە: ئاخۆ ئەمە لەگەڵ كەسێكدا كە شەوگاران ڕوو بە خوا ڕاوەستاوەو سوژدە دەباتو بەرفەرمانەو لە ڕۆژی قیامەت دەترسێتو هیوای وایە بەر بەزەیی پەروەردگاری خۆی بكەوێت، وەكو یەكە؟ بڵێ ئاخۆ زاناو نەزان بەرانبەرن؟ هەر ئەوانەی كە بەدڵ زیندون، دەتوانن بیربكەنەوە. خوای مەزن دەفەرموێت: ئایا ئەوانەی ئا ئەمە ڕەوشتیانە بە شەو سوژدە بۆ خوا دەبەنو ڕوو دەكەنە بارەگاكەیو لێی دەپاڕێنەوەو لە ڕۆژی قیامەت

---

[1] یونس (١٢).
[2] ابراهیم (٣٠).
[3] لقمان (٢٤).

دەترسن وەك ئەو كەسانە وان كە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن هەرگیز وەك یەك نین، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾[1] واتە: هەموو (نامەدارەكان) چوونیەك نین لەناو خاوەن نامەكاندا دەستەیەكی ڕاستو ڕێك هەن ئایەتەكانی خودا دەخوێنن لە (كاتەكانی) شەوداو لە (كاتەكانی) كڕنوش بردنیاندا. لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا﴾ واتە: گەردنكەچو لەخواترسان كاتێك ڕوو بە خودا دەوەستنو سوژدەی بۆ دەبەن. ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: (القانت) واتە: گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودان(ﷺ)[2]. ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) حەسەنوسودیو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿آنَاءَ اللَّيْلِ﴾ لە كاتی شەودا.[3] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ واتە: لەو كاتی خوا پەرستیەدا لە خودا دەترسێتو بێ هیواش نیە لە بەزەیی خودا. كە هەردوو حاڵەتەكە پێویستەو هەمیشە دەبێت ترسی خودا لە دڵدا بێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ﴾ خۆ ئەگەر موسڵمان لە حاڵەتی مردندا بێت دەبێت هیوای بەزەیی زیاتر بێت. وەك ئیمام عەبدی كوڕی حومەید لە موسنەدەكەیدا ڕیوایەتی كردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە لای پیاوێك لە كاتی مردندا پێی وت: (لە چ حاڵەتێكدای؟) وتی: بە هیوای بەزەیی خودامو لێشی دەترسم. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەم دوو شتە كۆنابنەوە لە دڵی هیچ عەبدێكدا تا لەم كاتەدا مەگین ئەوەی هیوای هەیە پێی خودا پێی دەداتو دڵنیاشی دەكات لەوەی كە لێی دەترسێت).[4] تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان كردووە لە (في اليوم والليلة)دا ئیبنو ماجەش ڕیوایەتی كردووە لە فەرموودەكەی سەیاری (سیّار) كوڕی حاتەمەوە لە جەعفەری كوڕی سولەیمانەوە بەم شێوەیە. تیرمیزی دەڵێت فەرموودەیەكی غەریبە (حديث غريب).[5] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی كردووە لە تەمیمی داریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر كەسێك سەد ئایەت بخوێنێت لە شەوێكدا عیبادەتی شەوێكی بۆ دەنووسرێت) هەر بەم شێوەیە نەسائی ڕیوایەتی كردووە (في اليوم والليلة) خوای مەزن

---

[1] ال عمران (١١٣).

[2] القرطبي (١٥/٢٣٩).

[3] القرطبي (١٥/٢٣٩).

[4] مسند عبد بن حميد (٤٠٤)، فەرموودەیەكی باشە (جيد).

[5] تحفة الأحوذي (٧/٥٧)، النسائي في الكبرى (٦/٢٦٢)، ابن ماجه (٢/١٤٢٣)، فەرموودەیەكی باشە.

دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئاخۆ ئەوانەی خواناسن لەگەڵ ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن بۆ ئەوەی لە ڕێی خودا خەڵکی لابدەن وەك یەکن؟ نەخێر، ﴿إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا الْأَلْبَابِ﴾ واتە: بەڵکو کەسێك هەست بەو جیاوازیە دەکات کە دڵی زیندووەو خاوەن هۆشە، والله أعلم.

﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ (١٠) قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ (١١) وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ (١٢)﴾

## فەرماندان بە خۆپاراستن و کۆچکردن لەبەر ڕەزامەندی خودا و خواپەرستی بە دڵی پاك

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: بێژە: ئەی عەبدەکانی من! ئەی ئەوانەی خاوەن بڕوان! لە پەروەردگارتان بترسن، بۆ ئەوانەی لە ژیانی ئەم دنیایەدا چاکەیان کرد، چاکە هەیەو زەمینی خودا بەربڵاوە بێگومان ئەو کەسانەی خۆڕاگرن بە تەواوی‌و بەبێ حیساب پاداشتی خۆیان وەردەگرن. خوای گەورە فەرمان دەدات بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی کە بەردەوام خەریکی بەجێهێنانی فەرمانەکانی خودا بن‌و لێی بترسن دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ﴾ واتە: بۆ ئەو کەسانەی کە لەم دنیا چاکەیان کرد، بۆ دنیاو بۆ ڕۆژی دواییان ﴿وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ﴾ موجاهید دەڵێت زەمینی خودا ئاوەڵایە کۆچی تیا بکەن‌و غەزا بکەن و دوور بکەونەوەو نزیك نەبنەوە لە بتەکان.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەوزاعی دەڵێت: کێشانەو پێوانەیان بۆ ناکرێت بەڵکو هەربۆیان تێدەکرێت. سودی دەڵێت: ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واتە: لەناو بەهەشتدا.[2] خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنِّي أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ مُخْلِصًا لَهُ الدِّينَ﴾ واتە: بڵێ من پێم سپێراوە هەریەك خودا بپەرستم‌و بە پاکژی هەر لەسەر دینەکەی ئەو بم. واتە: فەرمانم پێدراوە کە بە پاکی تەنها هەر خودا بپەرستم‌و هاوەڵی بۆ دانەنێم، ﴿وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ الْمُسْلِمِينَ﴾ واتە: فەرمانیشم پێدراوە کە یەکەمین موسڵمان بم.

---

[1] الطبري (٢١/٢٦٩).

[2] الطبري (٢١/٢٧٠).

﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ
ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ
ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَـٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾﴾

## ترسان له جەزرەبەی خودا

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: بلّێ: ئەگەر لە فەرمانی پەروەردگاری خۆم دەربچم، لە جەزرەبەی ڕۆژێکی گەورە دەترسم. خوای گەورە دەفەرموویت بە پێغەمبەر(ﷺ) تۆ بلّێ من لە سزای ڕۆژێکی گەورە دەترسم ئەگەر لە فەرمانی خودا دەربچم کە ڕۆژی قیامەتە ئەمە شەرتەو مانای وایە بۆ کەسانی تر زیاتر جێی ترسەو چاوەڕوان کراوە، ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي﴾ واتە: بلّێ: هەر خودا پەرستمو بە پاکژی لەسەر دینەکەی ئەو دەبم. ﴿فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە: ئەوسا ئێوەش (غەیری خودا) چیتان پەرست، بە ئارەزووی خۆتان بکەن. تۆ بلّێ: هەر ئەوانە زیانبارن کە لە ڕۆژی قیامەتدا، خۆشیانو کەسو کاریشیان دەدۆڕێنن، دیارە ئەمە زیانێکی ئاشکرایە. ﴿فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ﴾ ئەمە دیسان لێرەدا هەڕەشەیەو خۆوەدوورگرتنە لە بتپەرستان، ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ واتە: بێگومان هەر ئەو دۆڕاوانە بە تەواوی زەرەرمەندن، ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ یانی: جیادەبنەوە لە یەك هەرگیز بە یەك ناگەنەوە با کەسو کاریشیان بڕۆن بۆ بەهەشت، ئەوان دەچن بۆ جەهەنەم یان هەموو دەچن بۆ ناو ئاگر بەلاّم پێکەوە کۆنابنەوەو خۆشی نابینن، ﴿أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾ واتە:ئا ئەوەیە زیانی تەواو ڕەنجەڕۆیی ئاشکرا. پاشان خوای مەزن باسی ژیانو گوزەرانیان دەکات لەناو ئاگرو دەفەرموویت: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَـٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾ واتە:توێ لەسەر توێ کلّپەی ئاگر (وێنەی چەتر) لەسەر ئەمان ڕاوەستاوە، لە ژێریشیان هەر بەم تەرزە. خودا بەمە عەبدانی خۆی دەترسێنێت. ئەی عەبدانم! لێم بترسن. ئایەتی: ﴿لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ﴾ وەك ئەم ئایەتەیە کە فەرموویەتی: ﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾[1] واتە: ئەوانەی لە دۆزەخدا فەرشو ڕاخەریان

[1] الاعراف (٤١).

(لە ئاگرە)و لە لای سەروشیانەوە لێفەو داپۆشەریان (لە ئاگرە) ئا بەو جۆرە تۆڵە لە ستەمکاران دەستێنین. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ يَوْمَ يَغْشَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ وَيَقُولُ ذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾[1] واتە: لە ڕۆژێکدا سزا دایاندەپۆشێت لە لای سەریانەوەو لە ژێر پێیانەوەو (خوا) دەفەرمووێت: بچەژن تۆڵەی ئەو کردەوانەی کە لە دنیادا دەتانکرد. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ﴾ واتە: خوای گەورە بۆیە لێرەدا باسی ئەم ڕووداوە دەکات کە گومان نیە لە هاتنی تا عەبدەکانی خۆی بترسێنێت کە واز بێنن لە خراپەو تاوانکردنو دەفەرمووێت: ﴿يَـٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ﴾ واتە: بترسن لە سزاو تۆڵەو جەزرەبەو تورەیی من.

﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾﴾

## مژدە بۆ پیاوچاکان

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴾ واتە: ئەو کەسانەی لە پەرستنی بتەکان تەکیونەتەوەو بەرەو خوا گەڕانەوە، خۆشی لەوان. سا تۆش بە عەبدەکانی من مژدە بدە. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: لە باوکیەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّـٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا﴾ دەڵێت: ئەم ئایەتە هاتەخوار لەسەر زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلو ئەبو زەڕو سەلمانی فارسی (ڕەزای خوایان لێ بێت).[2] بێگومان ئەم ئایەتە گشتگیرەو بۆ ئەوانەو بۆ کەسانی تریشە کە واز لە بتپەرستی دێننو ڕوو دەکەنە خواو هەر خوای خاوەن دەسەڵات دەپەرستن، ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە مژدەیان پێدراوە لە دنیاو قیامەتدا، پاشان خوای دلۆڤان فەرموویەتی: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾ واتە: ئەو کەسانەی گوێ لە قسان ڕادەدێرنو بە شوێن چاکترییاندا دەچن، ئەوان خودا ڕێی بەرەو خۆی نیشان داون، ئەوانە خاوەن ئاوەزن. واتە: ئەوانە کە گوێ دەگرن بۆ قسەکانو چاکترینیان وەردەگرنو لێی تێدەگەنو کاری پێ دەکەن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مەزن فەرموویەتی بە موسا کاتێك تەوراتی بۆ هات: ﴿فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا۟ بِأَحْسَنِهَا﴾[3] واتە:

---

[1] العنكبوت (٥٥).

[2] الطبري (٢١/٢٧٤).

[3] الاعراف (١٤٥).

کەواتە (موسا) بە توندی بیانگرەو ئاگاداریان بەو فەرمان بە گەلەکەت بکە تـا دەست بگرن‌و ڕەفتار بکەن بە جوانترو چاکترینیان. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ﴾ واتە: ئەوانەی کە ئـەم سیفەتانەیان تێدایە خودا ڕێی نیشان داون لە دنیاو لە ڕۆژی دواییدا. ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ واتـە: خـاوەنی ئـاوەزی تەواون‌و سروشتی ڕاستن.

﴿أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٢٠﴾﴾

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَفَمَنۡ حَقَّ عَلَيۡهِ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ﴾ واتـە: ئـاخۆ کەسێك ئازاری بۆ بڕیار درا، تۆ دەتوانی (کەسێك لەناو ئاگردا بێت) ڕزگاری بکەی. یانی: ئایا کەسێك کە بەدبەخت بێت تۆ دەتوانی ڕزگاری بکەی لەو گومڕایی‌و سەرلێشێواویە؟ نەخێر هـەر کەسێك خـودا سەری لێ تێکدا هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێی نیشان بدات. پاشان خـودای گـەورە باسـی عەبـدە خوانـاس بەختـەوەرەکان دەکـات کـە چـەندە بەختـەوەرن‌و وان لـەناو کۆشـکە بەرزەکانـدا لـە بەهەشـتداو دەفـەرموێت: ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ واتە: بەڵام ئەوانەی ترسی پەروەردگاریان لـە دڵدایە وان لـەناو چـەند هۆدەیەکدا، چین لەسەر چین سازکراون، جۆباریان بەبەردەمدا دەڕوات، ئەمە بەڵێنی خودایە، خودا هەر بەڵێنێ بیدا لێـی پەشیمان نابێتەوە. واتە: لە خواترسەکان وان لەناو ژووری یەك لەسەر یەکدا زۆر جوان‌و ڕازاوەو قـایم‌و بەرز دروست کراون. عەبدوڵای کوڕی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کـردووە لـە عالیەوە (ڕەزای خـوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەناو بەهەشتدا ژووری زۆری هەیـە کـە لـە دەرەوە ناوی دەبینرێت‌و لە ناوەوەش دەرەوەی دەبینرێت)، عەرەبێکی دەشتەکی وتی: ئەو ژوورانـە بـۆ کێیـە ئەی پێغەمبەری خـودا(ﷺ)؟ فـەرمووی: (بـۆ ئەوانەیە قـسەی چاکیان کـردووەو خواردنیـان داوە بـە خەڵکی و بە شەو نوێژیان کردووە کاتێ خەڵکی لە خەودا بوون).[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی کـردووە دەڵێـت فەرموودەیەکی چاك‌و غەریبە (حسن غريب).[2] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کـردووە لـە سـەهلی کـوڕی سـەعدەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (ئـەهلی بەهەشـت یەکتری دەبینن لەناو بەهەشـتدا لـەناو ژووردا وەك چـۆن ئەسـتێرەکان دەبیـنن لـە کـەناری ئاسمانـدا) دەڵێـت: باسـم کـرد بـۆ نعمـانی کـوڕی ئـەبو عـەیاش، ئـەویش دەڵێـت: بیـستم لـە ئـەبو سـەعیدی

---

[1] أحمد (١/١٥٥)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[2] تحفة الأحوذي (٢٣١/٧)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

خودریەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (وەك چۆن ئێوە ئەستێرە دەبینن لە کەناری ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوادا).[1] بوخاریو موسلیم لە هەردووسەحیحەکەدا هێناویانە.[2] ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: فەزارە بۆی باس کردین وتیو فولەییج هەواڵی داینێ لە هیلالی کوڕی عالیەوە لە عەتای کوڕی یەسارەوە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (خەڵکی بەهەشت ئەهلی ژوورەکان دەبینن وەك چۆن ئێوە ئەستێرەی ترووسکەدار دەبینن کە لە ئاسۆوە ئاوا دەبێتو دەڕواتو هەڵدێت بە پێی بەرزیو نزمی پلەیان) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە پێغەمبەرانن؟ فەرمووی: (بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەوان و دەستەیەکیش کە بڕوایان بە خوا هێناوە و پێغەمبەرانیشیان بە ڕاست زانیوە).[3] تیرمزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێتحسن و صحیحە[4]. خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ جۆبار بەناویدا تێدەپەڕێتو دەڕوات چۆن ئارەزوو بکەن و بۆ کوێیان بوێت ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەوەی باسمان کرد بەڵێنی خودایە کە داویەتی بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی، ﴿لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ خودا لە بەڵێنی خۆی پەشیمان نابێتەوە.

﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ حُطَٰمًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢١﴾ أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ﴾

**نموونەی ژیانی دونیا**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا مُّخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ حُطَٰمًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ واتە: ئەدی نەتدی، خودا لەو بڵندابیەوە ئاو دەنێرێتو لە زەمیندا لە سەرچاوەکانەوە ڕەوانەی دەکات کشتوکاڵی هەمەڕەنگەی پێ دەڕوێنێتو پاش ماوەیەك زەردو وشك هەڵدێتو ئەوسا دەیکاتە پوشو پەڵا؟ ئەوانەی خاوەن ئاوەزن، دیارە لەمە پەند وەردەگرن. خوای مەزن بۆمان باس دەکات کە

---

[1] احمد (٥/٣٤٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١١/٤٢٤)، مسلم (٤/٢١٧٧).

[3] احمد (٢/٣٣٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الأحوذي (٧/٢٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

سەرچاوەی (بنەڕەتی) ئاو لە ئاسمانەوەیە وەك فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾[1] واتە: وە لە ئاسمانەوە باراندومانە ئاوێکی پاکەوەکەر. وەختێك لە ئاسمانەوە ئاو دەهێنرێتە خوارەوە وەك ئەو ئاوانەی کە لەناو زەمیندایە پاشان خوای خاوەن دەسەڵات دەیگێڕێت بەناو هەموو بەشەکانی زەمیندا هەرچۆنێك خۆی مەیلی لێ بێت. لە سەرچاوەکانەوە دەینێرێت بە پێی پێویستی سەرچاوەی وا هەیە زۆری لێ دەردەچێتو هی واش هەیە کەمی لێ دەڕوات. بۆیە خوای باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیرو عامیری شەعبی دەڵێن: هەموو ئاوێك لەسەر زەمیندا سەرچاوەکەی لە ئاسمانەوەیە.[2] سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: سەرچاوەی ئاو لە بەفرە، واتە: بەفر کۆمەڵە دەکات لەسەر کێوەکانو دەچێتە ناو زەمینەوە سەرچاوەکانیش لە دامێن کێوەکانەوە دێنە دەرەوە. دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ واتە: پاشا بە هۆی ئەو باران بارینو ئەو سەرچاوانەوە لە زەمیندا کشتوکاڵی هەمەڕەنگ دەڕوێنێت، هەریەکەو جۆرە تامو ڕەنگو بۆنو شێوەیەکی هەیە و سوودی تایبەتی خۆی هەیە. ﴿ثُمَّ يَهِيجُ﴾ واتە: دوای ئەو جوانیو قەشەنگیە پیر دەبێتو وشكو زەرد هەڵدەگەڕێت و دەپوکێتەوەو دەڕزێت. ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا﴾ واتە: دەبێتە پوشو پەڵاش و ورد دەبێت، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾ واتە: ئا ئەم باسە پەندو ئامۆژگاریە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەن ئاوەزن. چونکە ئەم ژیانەش خۆشو ڕازاوەیە هەروەك ئەو کشتوکاڵە هەمەڕەنگە پاش ماوەیەك پیری دێتو لەشولار تێك دەداتو ئەو لاویەی نامێنێتو دەبێتە پیاوێکی بە ساڵاچووی کەم هێزو تواناو پاش ئەمانەش هەمووی مردنە. بەختەوەر ئەو کەسەیە دوای ئەم ژیانە حاڵی باشەو خودا لێی ڕازیە. زۆرجار خوای گەورە نموونەی ژیانی دنیا بەو بارانە دێنێتەوە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنێتە خوارەوە، کە کشتوکاڵو بەروبوم دەڕوێنێتو لە پاشان زەردو وشك دەبێتو دەڕزێتو ورد دەبێت. وەك خوای دلۆڤان فەرموویەتی: ﴿وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا﴾[3] واتە: (ئەی موحەممەد ـ ﷺ ـ)بێنەرەوە بۆ ئەو (بێباوەڕ)انە نموونەی ژیانی دنیا کە وەك بارانێك وایە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین ئەوسا جۆرەها ڕواوی زەوی (پێ دەڕوێتو) دەڕۆن بەناو یەکدا

[1] الفرقان (٤٨).

[2] الدر المنثور (٧/٢١٩).

[3] الكهف (٤٥).

ئینجا دەبێتە پوش‌و پەلاش‌و با پرش‌و بلاوی دەکاتەوەو خوا هەمیشە بە توانـاو دەسـەلاتدارە بەسـەر هەموو شتێکدا.

## ئەوانەی هەقن و ئەوانەی گومڕان وەك یەك نین

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ئاخۆ کەسێك خودا دڵی بۆ ئیسلام گوشاد کردووەو دیارە بەر تیشکی بەزەیی پەروەردگاری خۆی کەوتووە، کەی دەبێت وەك ئەوانە بێت کە دڵڕەقن؟ هاوار بۆ ئەو کەسانە دڵڕەقن لە یادی خوا، کە ئەمانە بە ئاشکرا ڕێگەی خودایان گوم کردووە. واتە: ئەوانەی کە خودا سینە فراوانی کردوون‌و بەر تیشکی بەزەیی خودا کەوتوون وەك ئەو کەسانە وان کە دوورن لە ڕاستیەوەو دڵڕەقن؟ نەخێر. وەك خودای دلۆڤان دەفەرمووێت: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾[1] واتە: ئایا کەسێك مردوو (بێباوەڕ) بێت‌و ئێمە زیندوومان کردەوەو ڕووناکیەکمان بۆ فەراهەم هێنا (کە قورئانە) بە هۆی ئەوەوە لەناو خەڵکیدا دەگەڕێت‌و دەڕوات ئایا وەك ئەوە وایە کە لە ناو تاریکستانێکدا بێت کە بە هیچ جۆرێك دەرچوونی نیە لێی. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾ واتە:هاوار بۆ ئەو دڵڕەقانەی کە دڵیان نەرم نابێت‌و ترسی نایانگرێت‌و بیرناکەنەوەو ئاوەزیان نیە، ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: ئەوانە دیارە سەریان لێ شێواوە.

﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾﴾

## وەسفی قورئانی پیرۆز

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ واتە: خوا چاکترین قسەی ناردووەتـە خـوارێ: کتێبێك کـە (قسەکانی لـە جوانیدا) وەکو یەکن‌و هەر دووپاتیش دەکرێنەوە. ئەو کەسانەی ترسی پەروەردگاری خۆیان لە دڵدایە، لە بیستنی موچڕکیان بـە لەشـدا دێت‌و پاشـان دڵ‌و لەشیان (بـە یـادی خـوا) ئۆقرە دەگرێت، ئەمـە

[1] الانعام (١٢٢).

ڕێنموونی خودایە، کێی پێ خۆش بێت، بەرەو خۆی شارەزای دەکات، هەر کەسیش خوا گومڕای بکات، کەسی تر شارەزای ناکات. خوای مەزن وەسفی کتێبەکەی خۆی (قورئانی پیرۆز) دەکات کە ڕەوانەی کردووە بۆ پێغەمبەرە بەڕێزەکەی (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ﴾ موجاهید دەڵێت: واتە: ئەم قورئانە هەمووی وەك یەكەو لە یەك دەچێتو دووبارەش دەبێتەوە.[1] قەتادە دەڵێت: ئایەت لە ئایەت دەچێتو پیتەكانیش هەر لە یەك دەچنو وەك یەكن.[2] زەححاك دەڵێت: دووپاتكردنەوەی قسەیە بۆ ئەوەی بەندەكان لە پەروەردگاریان تێبگەن. عیكریمەو حەسەن دەڵێن: خوای گەورە بڕیارەكانی خۆی دووپات دەكاتەوە. حەسەن ئەمەیشی بۆ زیاد كردووە دەڵێت: لە سورەتێكدا ئایەتێك هاتووە لە سورەتێكی تردا دیسان ئایەتێكی تر هاتووە لە یەك دەچن. سەعیدی كوڕی جوبەیر دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: ﴿مَّثَانِيَ﴾ ئەم قورئانە قسەكانی لە یەكتری دەچنو دووپاتیش بوونەتەوە.[3] هەندێ لە زانایانیش هەر وایان وتووە. لە سوفیانی كوڕی عویەینەوە ڕیوایەت كراوە لە مانای ئەم ئایەتەدا: ﴿مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ﴾ واتە: دەقەكانی ئەم قورئانە هەندێ جار ماناكانیان لە یەك دەچنو هەندێ جاریش باسی شتێك دەكات دژەكەشی بە دوایدا باس دەكات. وەك باسی خاوەن باوەڕ بە دوایدا خوانەناس باسی بەهەشت بە دوایدا باسی دۆزەخ تا لەم نموونانە بە زۆری لە قورئاندا هاتووەو دووبارەبووەتەوە. وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ﴾[4] واتە: بە ڕاستی چاكان لەناو نازو نیعمەت دان، بێگومان بەدكاران لە دۆزەخدان. وە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡفُجَّارِ لَفِي سِجِّينٖ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سِجِّينٞ ﴿٨﴾ كِتَٰبٞ مَّرۡقُومٞ ﴿٩﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمۡ لَصَالُواْ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلۡأَبۡرَارِ لَفِي عِلِّيِّينَ﴾[5] واتە: با پەشیمان ببنەوە چونكە بە ڕاستی نامەی تاوانباران لەناو دەفتەرێكی پەستی ڕەشدایە، تۆ چوزانیت ئەو دەفتەرە چییە، دەفتەرێكی نووسراوە، هاوار لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان، ئەوانەی كە بڕوا ناكەن بە

---

[1] الطبري (٢١/٢٧٩).

[2] الطبري (٢١/٢٧٩).

[3] الطبري (٢١/٢٧٩).

[4] الانفطار (١٣ـ١٤).

[5] المطففين (٧ـ٨).

ڕۆژی پاداشت دانەوە، کەس ئەو ڕۆژە بە درۆ نازانێت مەگەر هەموو ستەمکارێکی گوناهبار، هەر کاتێك کە ئایەتەکانی ئێمەی بۆ بخوێنرێتەوە دەڵێت (ئەمانە) ئەفسانەی پێشینانن، نەخێر وا نیە بەڵکو ژەنگی ئەو (خراپانەی) کە دەیانکرد پەردەی هێناوە بەسەر دڵیاندا، نەخێر بە ڕاستی ئەوان لەو ڕۆژەدا بێ بەشن لە بینینی پەروەردگار لە پاشان بێگومان ئەوان دەچنە دۆزەخەوە، ئینجا پێیان دەوترێت ئەمە ئەوەیە کە بڕواتان پێ نەدەکرد. وە دەفەرمووێت: ﴿ هَٰذَا ذِكْرٌ ۚ وَإِنَّ لِلْمُتَّقِينَ لَحُسْنَ مَآبٍ ﴿٤٩﴾ جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِئِينَ فِيهَا يَدْعُونَ فِيهَا بِفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ وَشَرَابٍ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ أَتْرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَا ۚ وَإِنَّ لِلطَّاغِينَ لَشَرَّ مَآبٍ ﴾[1] واتە: ئەم (باسی پێغەمبەرانە) باسو ناوبانگی چاکیانە لە دنیاداو بێگومان پارێزکاران سەرئەنجامێکی چاکیان هەیە (کە بریتیە لە) بەهەشتانی جێی دانیشتنی ئێجگاری کە دەرگاکانی کراوەتەوە بۆیان، لەوێدا (لەسەر کورسی ڕازاوە) پاڵیان داوەتەوە تێیدا داوای میوەهاتی زۆرو جۆرەها خواردنەوە دەکەن، وە حۆریانی هاوتەمەنیان لایە (خێزانیانن) کە چاویان بڕیوەتە مێردەکانیان، ئەمە ئەو (نازو نیعمەتانە)یە کە بەڵێنتان پێدرابوو بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە (ی قیامەت)، بە ڕاستی ئەمە ڕزقو ڕۆزی ئێمەیە هەرگیز تەواوبوونی بۆ نیە، ئا ئەمە (پاداشتی پارێزکارانە)و بێگومان سەرکەشانیش خراپترین پاشەڕۆژیان هەیە. وە چەندە نموونەی تر لەم دەقانە هەموو دووپات بوونەتەوە واتە لە دوو مانادا بە باسی شتێكو دژەکەی. بەڵام ئەگەر دەقەکە هەمووی یەك مانای دەگەیاندو وەك یەك بوون ئەوە پێیان دەڵێن لە یەك دەچن، (المتشابه) بەڵام ئەم لەیەکچوونە وەك ئەو لەیەکچوونانە نیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوەو خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ ﴾[2] واتە: هەندێکی ئایەتی ڕۆشنن ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن‌و ئەوانی تر (ئایەتانێکن کە مەبەستەکانیان) ڕۆشن نین. ئەوە شتێکی ترەو مانایەکی تری هەیە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ واتە: ئەمە سیفەتو ڕەوشتی پیاوچاکانە کاتێك گوێیان لە فەرموودەی خوای خاوەن دەسەڵاتو زاڵو ئاگاداری هەموو شتێکەو زۆر لێبوردەیە. کاتێك تێدەگەن لە مژدەو تۆڵەو بەڵێن‌و هەڕەشەکانی خوای مەزن تەزوو (موچڕکە) بە لەشیاندا دێت لە ترسی خودا، ﴿ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾

[1] ص (٤٩_٥٥).

[2] ال عمران (٧).

واتە: پاشان بە هیوای بەزەیی‌و سۆزی خودان‌و دڵیان ئاسودەو ئۆقرە دەگرێت بە یادی خودا.
خواناسان جیاوازیان هەیە لەگەڵ خواناس‌و بەدبەختاندا لە چەند ڕوویەکەوە.

**یەکەم:** خاوەن باوەڕان گوێ لە قورئان‌و ئایەتەکانی قورئان دەگرن بەڵام خوانەناسان گوێ لە سرودو دەنگی گۆرانی بێژان دەگرن.

**دووهەم:** خاوەن باوەڕان کاتێك قورئان بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە بە ئەژنۆدا دەکەون‌و سوژدە بۆ خودا دەبەن بە ڕێزەوەو دەترسن‌و دەگرین بە هیوای بەزەیی خودان‌و بە دڵەوە بیری لێ دەکەنەوەو فێری دەبن. وەك خوای دلۆڤان فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾[1] واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك باسی خوا کراو ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت‌و ترسی لێ دەنیشێت کاتێکیش ئایەتەکانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایان زیاد دەبێت‌و هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن، ئەوانەن کە بە ڕاستی نوێژەکانیان بەجێ دەهێنن‌و لەو ڕزق‌و ڕۆزییەی پێمان داون (لە پێناوی خوادا) دەیبەخشن، هەر ئەوانە بڕوادارانی ڕاستەقینەن پلەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان‌و لێخۆشبوونی (تاوانەکانیان)و ڕۆزی پەسەندو چاکیان بۆ هەیە. وە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾[2] واتە: کەسانێکن کاتێك ئامۆژگاری بکرێت بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان ناکەون بەسەریاندا بە کەڕی‌و کوێری. واتە: لە کاتی گوێگرتن بۆ ئایەتەکانی قورئان دڵی بۆ دەکەنەوەو بە هیچ شتێکی ترەوە خۆیان سەرقاڵ ناکەن‌و بیر لە مانای دەکەنەوەو وەری دەگرن‌و سوپاسی خوا دەکەن‌و سوژدەی شوکری بۆ دەبەن‌و دڵیان لایەتی‌و فەرمانەکانی بەجێ دێنن‌و هۆشیان لای هیچ شتێکی تر نیە.

**سێهەم:** زۆر بە ئەدەب‌و گەردنکەچیەوە گوێ بۆ قورئان دەگرن وەك هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك گوێیان لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرت موچڕکە دەهات بە لەشیاندا و دڵیان ڕادەچڵەکاو پاشان ئارام دەبووەوە بە یادی خودا. زیادەڕەویان نەدەکرد بەڵکو بە لەسەرخۆیی‌و ئەدەب‌و ترس‌و لەرزەوە لێی دەپاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونیان لێ دەکرد، کەس پێیان ناگات لەو بارەیەوە بۆیە خوای مەزن وەسفیان دەکات‌و ڕێزداری کردوون لە دنیاو قیامەتدا. عبدالرزاق دەڵێت: موعەممەر بۆی

---

[1] الانفال (٢ـ٤).

[2] الفرقان (٧٣).

گێڕاینەوە وتی: قەتادە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ وتی: ئەمە وەسفی دۆستەکانی خودایە خوای دلۆڤان وەسفیان دەکات کە بە یادی خودا لەشیان کرژ دەبێتو موچرکەی پیا دێت و ئاو بە چاویاندا دێتە خوارو دڵیان بە زیکری خودا ئارام دەبێتەوەو ئۆقرە دەگرێت، خوای گەورە وەسفی نەکردوون کە لە هۆشی خۆیان دەچنو ئاوەز لە دەست دەدەن. بەڵکو ئەو جۆرە هەڵسوکەوتە لە ڕەوشتی بیدعەچیەکانەو لە شەیتانەوەیە. وە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاءُ﴾ واتە: ئەمە سیفەتی ئەو کەسانەیە کە خودا ڕێی نیشان داون هەر کەسێك بەو شێوەیە نەبێت گومڕا بووەو ڕێی ون کردووە، ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ﴾ واتە: هەر کەسێش خودا گومڕای بکات کەسی تر ناتوانێت شارەزای بکات.

﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ اللَّهُ الْخِزْيَ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾

### پاشەڕۆژی بێباوەڕان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ۚ وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ واتە: دەی ئایا کەسێك بە دەموچاوی خۆی بپارێزێت لە سزای سەختی ڕۆژی دوایی (وەك کەسێکە لە بەهەشت دابێت)؟ بە ناهەقانیش دەوترێت: دە بچێژن سزای کردەوەکانی خۆتان! واتە: کەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا بە دەموچاوی خۆی بپارێزێت لە سزا دەبێت حاڵی چۆن بێت؟ سوکایەتیان پێ دەکرێتو لێیان دەدرێتو بەوانو هاوێنەیان دەوترێت لە ناهەقی کاران: ﴿ذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ﴾ دە بچێژن سزای کردەوەکانی خۆتان. ئاخۆ ئەمانە وەك ئەو کەسانە وان کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێن هیچ ترسێکیان نییە؟ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِ أَهْدَىٰ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1] واتە: ئەو کەسەی بڕواتو بە دەمدا بکەوێت باشتر ڕێ دەردەکات؟ یان یەکێك قنجو قیت بڕوات بەسەر ڕێگایەکی ڕاستو ڕەواندا. وە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ

---

[1] الملك (٢٢).

وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴾[1] واتە: ئەو ڕۆژەی لە ئاگری دۆزەخدا لەسەر ڕوخساریان ڕادەکێشرێن (پێیـان دەڵێن) بچەژن ئازاری دۆزەخ. وە دەفـەرمووێت: ﴿أَفَمَن يُلْقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِيٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾[2] واتە: دەی ئایا کەسێك دەخرێتە ناو ئاگرەوە چاکترە یان ئەو کەسەی لە ڕۆژی قیامەتدا بێ ترس دێت. خوای خاوەن دەسەڵات دەفەرمووێت: ﴿كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ واتە: پێشینەکانی ئەمانیش بڕوایان بە خودا نەهێنا، لە شوێنێکەوە ئازاریان بۆ داباری کە هەستیشیان پێ نەکرد. واتە: گەلەکانی پێش ئەمان کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد خوای مەزن بە هۆی تاوانەکانیانەوە قڕی تێخستن کەسێکیان نەبوو لە سزای خودا بیانپارێزێت، ﴿فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلْخِزْيَ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: خوا دەردی سوکایەتی لەم دنیادا پێ چەشتن گەر بزانن، دیارە ئازاری ئەو دنیا مەزنترە. واتە: کارێکی وەهای بەسەرهێنان و جەزرەبەیەکی وای دان لە دنیادا موسڵمانی پێ دڵخۆش کرد. دەی با ئەو کەسانەی کە دژایەتی بەڕێزترین پێغەمبەر دەکەن کە دوایین پێغەمبەر(ﷺ)و باوەڕیان پێی نیە. ئەو سزایەی کە خودا بۆی ئامادەکردوون زۆر گەورەترە لەوەی کە لە دنیادا تووشیان هاتووە. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴾.

﴿ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ
يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ
أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴿٣١﴾ ﴾

**نموونەی هاوەڵ دانان بۆ خودا**

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ واتە: وا ئێمە لەم قورئانەدا بۆ ئەم خەڵکە هەموو جۆرە نموونەیەکمان هێنایەوە، شایەت پەندی لێ وەرگرن. واتە: بێگومان ئێمە نموونەی زۆرمان هێناوەتەوە لە قورئاندا ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾ بۆئەوەی پەندی لێوەر بگرن چونکە نموونە هێنانەوە باشتر دەچێتە دڵەوە هەتا پەندی لێ وەرگرن. وەك

[1] القمر (٤٨).

[2] فصلت (٤٠).

دەفەرموویت: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ﴾[1] واتە:نموونەیەکی لە خۆتان بۆ هێناونەوە هەتا بزانن. وە دەفەرموویت: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴾[2] واتە: ئەو وێنەو نموونانە بۆ خەڵکی دێنینەوە تەنها زانایان لەوانە تێدەگەن. لێرەدا خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِى عِوَجٍ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ واتە: قورئانێکە بە عەرەبی‌و هیچ خوارو خێچی تێدا نیە، بەڵکو لە خوا بترسن. واتە: ئەو قورئانە بە زمانی عەرەبیەو ڕوون‌و ئاشکرایە هیچ خواروخێچی‌و ناتەواویەکی تێدا نیە بەڵکو پڕە لە بەڵگەی دیارو بەهێز. بۆیە خوای دلۆڤان بەو شێوەیە ڕەوانەی کردووە، ﴿لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴾ واتە: هەتا بترسن لەو هەڕەشانەی کە تیایەتی‌و هەوڵیش بدەن بۆ ئەو شتانەش کە خودا بەڵێنی داوە پێتان بدات، پاشان فەرموویەتی: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: خودا دوو نموونە دێنێتەوە: یەکێك بەندەی چەند کەسێکی دژ بە یەکترە ئەوی تریان بەندەی تاکە کەسێکە، ئاخۆ ئەم دووانە وەك یەکن؟ سوپاس بۆ خوایە، بەڵام زۆربەیان نەزانن. واتە: خودا نموونەی پیاوێك دێنێتەوە کە بەندەی چەند کەسێکە لەسەری ناکۆکن‌و هەریەکە بۆ خۆی بانگی دەکات ﴿وَرَجُلًا سَلَمًا ﴾ واتە: پیاوێکی تریش بەندەی یەك کەسە، هیچ کەسی تر خاوەنی نیە ئەو نەبێت، ﴿هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا﴾ واتە: ئەم دوانە وەك یەك نین. هەر بەو شێوەیە ئەو کەسەی کە موشریکەو چەند شتێك دەپەرستێت لەگەڵ خوادا ئەوەیش خاوەنی باوەڕەو تەنها هەر خودا دەپەرستێت ئەم دووانە هەرگیز وەك یەك نین. ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت)و موجاهیدو کەسانی تریش وتوویانە: ئەم ئایەتە هێنراوەتەوە بە نموونە بۆ ئەوانەی تەنها خودا دەپەرستن‌و ئەوانەی کە شەریکی بۆ دادەنێن.[3] لەبەر ئەوەی کە ئەم نموونە زۆر دیارو ئاشکرایەو ڕوونە. خودای دلۆڤان فەرموویەتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ واتە: کەواتە سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە، کە بەڵگەی بۆ هێناونەتەوەو بیانووی نەهێشتوون، ﴿بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: بەڵام زۆربەیان نازانن بۆیە شەریکی بۆ دادەنێن.

---

[1] الروم (٢٨).

[2] العنكبوت (٤٣).

[3] الطبري (٢١/٢٨٥).

## مردنی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هەڵوێستی قورەیش و کێشمەکێشیان لەبەردەم خوادا

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ واتە: تۆش دەمریو ئەوانیش دەمرن. ئەم ئایەتە یەکێکە لەو ئایەتانەی کە ئەبو بەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) کردیە بەڵگە لەسەر مردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە کاتی مردنیدا. خەڵکی قەناعەتیان کرد کە مردووە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا کە خوای بالادەست دەفەرموویێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾[1] واتە: موحەممەد(ﷺ) تەنها پێغەمبەرێکە (نەمر نیە) بێگومان لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان (پاشگەزدەبنەوە) هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی (بتپەرستی) ئەوە هەرگیز (ئەو کەسە) هیچ زیانێك ناگەیەنێت بە خواو بە زوویی خودا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە. یانی: بێگومانە هەموو دەمرن ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵنو بەم زووانە هەموو کۆدەبنەوە لە ڕۆژی دواییداو دێنە بەردەستی خوداو کێشە دەکەن لە نێوان خۆتاندا لەسەر ناسینی خودا بە تەنهاو هاوەڵ بۆ دانانی وەك چۆن لە دنیادا کێشەتان بوو، خوای مەزن فەرمانڕەوایی خۆی دەکات لە نێوانتانداو ڕاستیشتان نیشان دەداتو هەقی هەموو کەسێك دەداتو تۆڵەش لە موشریكو تاوانبار دەسێنێت و موسڵمانە خاوەن باوەڕەکان ئەوانە کە تەنها خودایان پەرستووە ڕزگار دەکاتو جەزرەبەی بێ دینو سپڵەو لاسارو موشریکەکان دەدات ئەوانەی کە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکانی نەدەکرد. ئەم ئایەتە هەرچەندە باسی خاوەن باوەڕو بتپەرستان دەکات لە کێشە دەکەن لە نێوان یەکتریدا لە ڕۆژی قیامەتدا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ئایەتە گشتگیرە ئەو خەڵکەش دەگرێتەوە کە لە ژیانی دنیادا دژایەتی یەکتری دەکەن. ئەو کێشەو دژایەتیەیان لە ڕۆژی قیامەتدا جارێکی تر دووبارە دەبێتەوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو زوبەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾ هاتەخوارەوە. ئیبنو زوبەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ ئەم کێشەیەمان دووبارە دەبێتەوە؟ فەرمووی: (بەڵێ)، ئیبنو زوبەیر وتی: سوێند بە خوا ڕووداوەکە زۆر ناڕەحەتە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زوبەیری کوڕی عەوامەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ): ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ۝٣٠ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ﴾

---

[1] ال عمران (١٤٤).

[2] الدر المنثور (٥).

زوبەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاخۆ ئەو گوناهە تایبەتیانەی کە لە نێوانی خۆماندا ڕوویداوە لە دنیادا بۆمان دووبارە دەکرێتەوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ بێگومان دووبارە دەکرێتەوە لەسەرتان بۆ ئەوەی هەموو خاوەن هەقێك، هەقی خۆی پێ بدرێتەوە).ئیبنو زوبەیر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: سا بە خوا ڕووداوەکە زۆر نارەحەتو ترسناکە.[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو دەڵێت چاكو ڕاستە (حسن صحيح).[2] عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ واتە: ڕاستگۆ کێشەیەتی لەگەڵ درۆزنو ناهەقی پێکراو لەگەڵ ناهەقیکەرو ڕێنیشاندەر لەگەڵ گومڕاو بێدەسەڵات لەگەڵ خۆبەزلزان. ئیبنو مەندە ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (الروح)دا لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێت: خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا کێشەیانە. هەتا گیان لەگەڵ جەستەی خۆیاندا کێشەیانە گیان دەڵێت بە لاشە تۆ ئەوەت کرد، لاشەش دەڵێت بە گیان تۆ فەرمانت داو ڕازاندتەوە خوای مەزن فریشتەیەك دەنێرێت بۆ ئەوەی کێشەکەیان بڕێتەوە لە نێوانیاندا پێیان دەڵێت: نموونەی ئێوە وەك نموونەی پیاوێکی چاوساغو یەکێکی کوێرە چوونەتە باغێك پیاوە چاوساغەکە دەڵێت بە کوێرەکە من لێرەدا میوەی زۆر دەبینم بەڵام دەستم پێی ناگات. پیاوە کوێرەکە پێی وت: هەڵم بگرە دەستم پێی بگات، هەڵی گرتو دەستی پێی گەیشت ئاخۆ کامیان دەستدرێژی کەرن. دەڵێن هەردووکیان. فریشتەکە پێیان دەڵێن: ئێوە خۆتان بڕیارتان (حوکمتان) بەسەر خۆتاندا داوە. واتە: لاشە وەك باربەر (چوارپێ) وایە گیان سواری بووە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: ئەم ئایەتە هاتە خوار بەڵام نازانین لەسەر چ شتێك هاتە خوارەوە: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ ﴾ دەڵێت: وتمان: لەگەڵ کێ کێشە بکەین؟ لە نێوان ئێمەو ئەهلی کتێبدا کێشەیەکمان نیە کەواتە لەگەڵ کێ کێشە بکەین؟ هەتا کەوتینە سەردەمی فیتنە. ئیبنو عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: ئەمە ئەوەیە کە خوای مەزن بەڵێنی پێدان کێشەی لەسەر دەکەین. نەسائیش ڕیوایەتی کردووە[3].

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴿٣٢﴾
وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَاءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَاءُ

---

[1] أحمد (١٦٤/١)، فەرمووودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي (٢٨٩/٩)، فەرمووودەیەکی سەحیحە.

[3] النسائي في الكبرى (١١٤٤٧).

ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ أَسۡوَأَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٥﴾﴾

**پاداشتی خەڵکی درۆزن وبوختانچی وپیاوی ڕاستگۆو بائیمان**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدۡقِ إِذۡ جَآءَهُۥٓۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: سا كێ لەوە ناهەقترە درۆ بۆ خوا هەڵببەستێتو ئەم ڕاستەی كە بۆی هاتووە نەیسەلمێنێت؟ ئاخۆ بۆ خوانەناسان لە دۆزەخدا جێگە نیە؟ خوای گەورە ڕووی قسە دەكاتە موشریكەكانو ئەوانەی كە درۆیان بە دەمەوە هەڵبەستووەو هاوەڵیان بۆ داناوەو وتوویانە فریشتەكان كیژی خودانو فەرزندەیان بۆ ڕەوا بینیوە، خودا پاكو بێعەیبەو دوورە لەو قسانەی ئەو خوانەناسانە دەیڵێن. كەچی لەگەڵ ئەوەیشدا بڕوایان نەهێناوە بەو ڕاستەی كە بۆیان هاتووە لەسەر زمانی ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت)، بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدۡقِ إِذۡ جَآءَهُۥٓ ﴾ واتە: هیچ كەسێك لەو كەسە ناهەقتر نیە كە درۆ بۆ خودا هەڵبەستێتو ڕاستیش نەسەلمێنێت. دووجار تاوانە، جارێك درۆ بۆ خودا هەڵبەستێو جارێكی تر بڕوا بە پێغەمبەر(ﷺ) ناكات. قسەی ناڕەوا بكاتو دژی ڕاستیش بوەستێت، بۆیە خوای گەورە هەڕەشەی لێ كردوونو فەرموویەتی: ﴿أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: ئایا جێگە لە جەهەنەمدا بۆ خوانەناسان نیە؟ واتە جێگە زۆرە بۆیان. پاشان فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾ واتە: ئەو كەسەی(بەرنامە) ڕاستەكەی هێناو ڕاستی سەلماند، ئەوانە لەخواترسن. موجاهیدو قەتادەو ڕەبیعی كوڕی ئەنەسو ئیبنو زەید دەڵێن: ئەوەی ڕاستی هێناوە پێغەمبەرە(ﷺ).[1] عەبدوڕڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێت: ﴿ وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ﴾ پێغەمبەری خودایە (ﷺ)، ﴿وَصَدَّقَ بِهِۦٓ﴾ موسڵمانانە.[2] ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ﴾ ئیبنو عەباس دەڵێت: لە شیرك خۆتان بپارێزن.[3] ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ واتە: هەرچی خۆیان ئارەزوو بكەن، پەروەردگاریان دەیانداتێ، پاداشتی هەموو كارچاكان هەر وا

---

[1] الطبري (٢١/٢٨٩)، القرطبي (١٥/٢٥٦).

[2] الطبري (٢١/٢٩٠).

[3] الطبري (٢١/٢٩٢).

دەبێت، ﴿لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ واتە: هەرچی لە بەهەشتدا ئارەزوو بکەن پێیان دەدرێت. ﴿ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ئەوەیە پاداشتی چاکەخوازان. وە خوای هێژا دەفەرموێت: ﴿لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ واتە: هەتا خودا بیانبەخشێت لە خراپترین کارێك کە کردوویانە و باشتر لەوەی کاری چاکیان پێك هێناوە پاداشتی خۆیان بداتێ. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ﴾[1] واتە: ئەوانە کەسانێکن کە ئێمە کردەوە چاکەکانیان لێ وەردەگرین‌و چاوپۆشی دەکەین لە خراپەکانیان لە ڕیزی بەهەشتیەکاندان ئەمە ئەو بەڵێنە ڕاستەیە کە بەڵێنتان پێدرابوو لە دنیادا.

﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾

**خوا بەسە بۆ عەبدەکانی خۆی**

خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ تۆ بەوانەی جگە لە خوان دەترسێنن، مەگەر هەر خوا بەس نیە کە ئاگای لە عەبدی خۆی بێت؟ هەر کەسێك خودا ڕێگەی لێ بگۆڕێت، کەس ناتوانێت ڕێبەری بێت. هەندێ خوێندوویانەتەوە بە (عِبَادَهُ) واتە: خودا بەسە بۆ ئەوانەی پەرستوویانەو هانایان هەر بۆ ئەو بردووەو پشت ئەستوور بوون پێی. ﴿وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ﴾ واتە: بتپەرستەکان پێغەمبەریان دەترساندو هەڕەشەیان لێ دەکرد بەوەی کە بتەکانیان (ئەوانەی کەلە غەیری خودا دەیانپەرستن‌و لێیان دەپاڕانەوە بە نەزانی‌و سەرلێشێواوی) تۆڵەی لێ دەسێنن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی:

[1] الاحقاف (١٦).

﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٦ وَمَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٖ ذِي ٱنتِقَامٖ﴾
واتە: هەر کەسێکیش خودا شارەزای کردبێت، کەس ناتوانێت لە ڕێگەی خودا لای بدات، بۆچی نازانن خودا خاوەن دەسەلاتو تۆلەسێنە؟ واتە: جێی پەنایە هەر کەسێك خۆی بە خودا بسپێرێتو ڕوو بکاتە قاپی خودا ستەمی لێ ناکرێت. چونکە خاوەنی دەسەلاتێکە کەس نیەتیو تۆلەی زۆر بە زەبرە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕی پێ ناکەنو شەریکی بۆ دادەنێنو لاساری دەکەن بەرانبەر پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

**دانپیانەنانی بتپەرستەکان کەتەنیا خودا بوونەوەری وەدی هێناوە، چونکەبتەکانی ئەوان توانای شتی وایان نیە.**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ﴾ واتە: ئەگەر تۆ لەوانە بپرسی: کێ ئەم ئاسمانانەو زەمینی وەدی هێنا؟ بێگومان هەر دەلێن خودا. بلێ: ئێوە ئەو شتانەی (غەیری خودا) دەپەرستن چۆن دەبینن؟ ئەگەر خودا بیەوێت تووشی بەلایەکم بکات، ئاخۆ ئەوان بەلا لەسەر من لادەبەن؟ یان ئەگەر خودا بەر بەزەیی خۆیم بخات، ئەوان پێش لەو بەزەییە دەگرن؟ من هەر خودام بەسەو خۆسپێران، خۆیان هەر بە ئەو دەسپێرن. واتە: موشریکەکان دان دەنێن بەوەدا کە هەر خودا وەدیهێنەری گشت شتێکە لەگەلّ ئەوەشدا لەگەلّ خودادا شتی تریش دەپەرستن کە ناتوانن سودیان پێ بگەیەنن یان زیانیشیان لێ بدەن بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنۡ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلۡ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦ﴾ واتە: هیچ کارێکیان لە دەست نایەت.
ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) بە مەرفوعی: (ئاگات لە خودا بێت[1] خودا تۆ دەپارێزێت[2] خودات لە یاد بێت خودایش هەمیشە لەگەلّتدایە ئاگای لێتەو یارمەتیت دەدات لە هەر شوێنێکدا بیت، خودات لەبیر نەچێت لەکاتی خۆشگوزەرانیدا خودایش تۆی لە یادە لە کاتی ناڕەحەتیدا. کاتێك داوات کرد هەر لە خودا داوا بکە. وە کاتێکیش داوای پشتگیریت کرد هەر لە خودا داوای پشتگیری بکە. وە باش بزانە کەئەگەر هەموو خەلّکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی تووشی

---

[1] واتە: فەرزەکان بەجێ بێنەو قەدەغەکانی مەشکێنەو لە خوا بترسەو دوورکەوە لەو شانەی کە خوا پێی ناخۆشە(وەرگێڕ).

[2] ئاگای لە خۆتو مالّو مندالّتە لە دنیاو قیامەتدا (وەرگێڕ).

زیانت بکەن کە خودا لەسەری نەنووسیبی تووشی زیانێکت ناکەن. وە ئەگەر هەموو خەڵکی کۆببنەوە بۆ ئەوەی سودی شتێکت پێ بگەیەنن کە خودا لەسەری نەنوسیبی سودت پێ ناگەیەنن. پەڕاوەکان وشك بوونەتەوەو پێنووسەکانیش هەڵگیراون کار بکەو شوکرانەبژێری خودا بە بە دڵپاکی.وە بزانە کە خۆڕاگری لەسەر شتێك کە پێت گرانە زۆر خێردارە. بێگومان سەرکەوتن لەگەڵ خۆگریدایەو لە کاتی ناخۆشیو دڵ گرانیدا دەرو دەکرێتەوەو بێگومان لە پاش تەنگانە فەرحانیە).[1] ﴿قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ﴾ واتە: خودام بەسەو خۆم بە ئەو سپاردووەو خۆسپێرانیش خۆیان هەر بە ئەو دەسپێرن. وەك هود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك بە هۆزەکەی وت: ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا اعْتَرَاكَ بَعْضُ آلِهَتِنَا بِسُوءٍ قَالَ إِنِّي أُشْهِدُ اللَّهَ وَاشْهَدُوا أَنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[2] واتە: تەنها (ئەوە بە تۆ) دەڵێین هەندێ لە پەرستراوەکانمان تووشی شێتییان کردووی وتی بە ڕاستی من خوا دەکەم بە شایەتو ئێوەش شایەت بن کە بە ڕاستی من بەریمو دوورم لەوەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا(جگە لە خودا) جا هەمووتان پیلانم لێ بگێڕن لە پاشان مۆڵەتیشم مەدەن (و لێم مەوەستن)، بە ڕاستی من پشتم بە خودا بەستووە کە پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەیشە هیچ گیانلەبەرێك نیە مەگەر خودا دەسەڵاتدارە بەسەریدا، بە ڕاستی پەروەردگارم لەسەر ڕێگایەکی ڕاستە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ يَٰقَوْمِ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: بڵێ: گەلەکەم ئێوە کاری خۆتان بکەن، منیش وا کاری خۆم دەکەم، ئا بەم زووانەش تێدەگەن. واتە: ئێوە لەسەر ڕێی خۆتان کاری خۆتان بکەن کە ئەمە هەڕەشەو ترساندنە، ﴿إِنِّي عَامِلٌ﴾ واتە: منیش لەسەر ڕێگاو بەرنامەی خۆم کاری خۆم دەکەم، ﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: بەم زووانە ئاکامو بەرهەمی کارەکانتان وەردەگرن، ﴿مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ واتە: کێیە تووشی سزای ئابڕووبەرە دێتو جەزرەبەی لە بن نەهاتووی بەسەردادێت. ﴿مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ﴾ واتە: کێ تووشی ئازاری ئابڕووبەر دێت لە دنیادا، ﴿وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ واتە: وە کێیەئەوکەسەی تووشی سزای هەتاهەتایی دێت و هەرگیز ڕزگاری نابێت لە ڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە بمانپارێزێت بە بەزەیی خۆی لەو جەزرەبەیە لەو ڕۆژەدا هەیە پەنا دەگرین بە خودا لێی.

---

[1] احمد (١/٣٠٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] هود (٥٤_٥٦).

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾﴾

خـوای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ واتە: ئێمەین کە ئەم کتێبەمان بە ڕاستی بۆ تۆ ڕەوانە کردووە، کە مەردم لە سۆنگەی ئەودا شارەزا بن. هەر کەسێك شارەزابێت، قازانجی هەر بە خۆی دەگاتو هەر کەسێکیش لە ڕێ لا بدات، دژی خۆی جوڵاوەتەوەو تۆ بریکاری ئەوان نیت. خوای مەزن ڕووی گوفتـار دەکاتـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەدو (ﷺ) دەفـەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ واتە:ئەم قورئانە ﴿لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: بۆ هەموو خەڵکی لە مەردمو جنۆکە ئاگاداریان دەکاتـەوەو دەیانترسێنێت پێـی، ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ﴾ واتـە: هـەر کەسێك شـارەزا بێـت قازانجەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتـەوە، ﴿وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ واتـە: هـەر کەسێش ڕێـی ون بکات ئاکامەکەی هەر بۆ خۆی دەگەڕێتـەوە، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ واتـە: تـۆ بریکـاری ئەوانـە نیت کە ڕێیـان نیشان بدەی. وە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموویێت: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ﴾[1] واتە: بێگومان تۆ تەنها ترسێنەریو خوا بۆ هەموو شتێك سەرپەرشتیکارو چاودێرە. وە دەفـەرموویێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَـٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾[2] واتـە: بێگومـان تـۆ ڕاگەیانـدنت لەسـەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە.

**هەر خودایە خولقاوەکان دەمرێنێتو زیندووشیان دەکاتەوە**

پاشان خوای گەورە باسی خۆی دەکات کە هەر ئەوە گشت کارەکانی بە دەستە لـەم بوونەوەرەدا هەموو شتێك بە مەیلی ئەوە ئەوانەی کە بڕیاری مەرگیان دراوە فریشتەکان دەچن گیانیان دەکێشن کە مردنە گەورەکەیەو ئەوانەش لە کاتی خەونان مردنە بچکۆلەکە دەکەن وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰٓ أَجَلٌ مُّسَمًّى ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۖ وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ

---

[1] هود (١٢).

[2] الرعد (٤٠).

أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾[1] واتـە: وە هـەر ئـەو خودایەیـە کـە دەتانخـەوێنێت (دەتانمرێنێت) لە شـەوداو دەشـزانێت (لـە ڕۆژدا) چ کارێکتـان ئـەنجام داوە پاشـان لـە ڕۆژدا لـە خـەو بێدارتان دەکاتەوە بۆ ئەوەی تەواو ببێت ماوەی دیاریکراو (ی هەموو کەسێك) ئەوسا هەر بۆ لای ئـەوە گەڕانـەوەتان پاشـان هـەواڵتان پـێ دەدات بـە هـەر کردەوەیـەك کـە کردووتانـە، ئـەو (خـودا) زاڵو دەسـەڵاتدارە بەسـەر بەندەکانیـداو فرشـتانێکتان بـۆ دەنێرێـت (کـە چـاودێرو پـارێزەرو نووسـەری کردەوەکانتانن) تـا کـاتی مردنـی یەکێکتان دێت نێردراوەکانمـان گیـانی دەکێـشن کـە هـیچ سـستیو کەمتەرخەمیەك ناکەن (لـە کارەکانیانـدا). باسـی هـەردوو مردنەکـەی کـردووە، لێـرەدا باسـی مردنـە بچووکەکەو پاشان گەورەکە دەکات، بەڵام لەم ئایەتەدا گەورەکەی باس کردووە لە پاشان باسی مردنە بچووکەکەی کردووە. بۆیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە دێنـە مـردن، ئەوانـەش کـە لـە خەوڕاچـوونو نەمردوون،ئەوە خودایە کە گیانیان ڕادەگرێت، جا ئەو گیانانە (وا مەرگی بڕیـار دراون) هـەر ڕادەگرێت ئەوی دیکەش تا وەختێکی دیاریکراو دێڵێتەوە. لەمەدا نیشانە هەن بۆ ئەوانەی ڕادەمێنن. ئـەم ئایەتـە ئەوە دەگەیەنێتو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گیانەکان هەموو کۆدەبنـەوە لـە لای باڵانیـشینان ( الملأ الأعلى)وەك لە فەرموودەیەکی مەرفوعدا لـەو بارەیـەوە هـاتووە کـە ئیبنـو مەنـدەی و کەسـانی تـریش ڕیوایەتیان کردووە لە هەردوو سەحیحەکەی بوخاریو موسلیمدا لە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك هەر کەسێکتان چووە ناو جێگەی خـەوتنی، با چمکی ئەو شتەی لە بەریدایە بیتەکێنێت چونکە نازانێت لە دوای خۆی چی چووەتەناویەوە. پاشان بڵـێ: پـەروەردگارم! بـە نـاوی تـۆوە لام دادەنـێمو پـاڵ دەکـەوم وە هـەر بـە نـاوی تۆشـەوە بـەرزی دەکەمەوە. ئەگـەر گیانمـت ڕاگرت ڕەحمـم پـێ بکەو ئەگـەر بەرەڵاشـت کـردەوە (جـارێکی تـر)ئـەوە بیپارێزە بەوەی کە عەبدە چاکەکانتی پـێ دەپارێزیت).[2] ﴿فَيُمْسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ﴾ واتـە: ئەوانەی کە بڕیار دراوە بمرن ڕادەگرێن و ئەوانـەی تـریش تـا کـاتێکی دیـاریکراو دەهێڵێتـەوە. سـودی دەڵێت: هـەتا ئـەو کاتـەی بـۆی دیـاریکراوە.[3] ئیبنـو عـەباس (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێت: گیـانی

---

[1] الانعام (٦٠ـ٦١).

[2] فتح الباري (١١/١٣٠)، مسلم (٤/٢٠٨٤).

[3] الطبري (٢١/٢٩٨).

مردووەکان ڕادەگرێتو گیانی زیندووەکانیش بەرەڵا دەکاتو لێی تێك ناچێت، ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ واتە: ئا لەمەدا بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی کە بیر دەکەنەوە.

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ شُفَعَاءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُلْ لِلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا ۖ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾

**هەموو تکایەك هەر بۆ خودایە، دڵگرانیو بێتاقەت بوونی بتپەرستان بەناوهێنانی خودای تاکو تەنها**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ شُفَعَاءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئاخۆ غەیری خودا تکاکارگەلێکیان بۆ خودا پەیدا کردووە؟ بەڵێ گەرچی هیچ شتێکیان بە دەستەوە نیەو تێش ناگەن. خوای گەورە باسی خراپی موشریکەکان دەکات کە جگە لە خوا تکاکاری تریان بۆ خۆیان داناوە کە بریتیە لە بتو چەندەها شتی تر کە بە ئارەزووی خۆیان بەبێ هیچ بەڵگەیەك. خودایش دەفەرموێت ئەو کارەیان ڕاست نیە. چونکە ئەوانە توانای هیچیان نیەو بێ ئاوەزنو نە دەبیستنو نە دەبینن بەڵکو کۆمەڵێك دارو بەردنو بێ گیانن زۆر حاڵیان لە زیندەوەران خراپترە. پاشان دەفەرموێت: ﴿قُلْ لِلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا ۖ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: بڵێ: تکا (سەر لەبەر) هەر بۆ خودایە، ئاسمانەکانو زەمینیش هەر سەر بەون، لە ئاکامدا هەر بۆ لای ئەو دەبرێنەوە. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ بەوانەی کەجگە لەخوایان کردووەبە تکاکار و وا دەزانن لە لای خوداکەڵکیان دەگرن! هەواڵیان بدەرێ کە تکاکردن هیچ سودێك ناگەیەنێت مەگەر بۆ کەسێك کە خودا خۆی پێی خۆش بێت و ئیزنی پێ دابێت، لە دوایدا هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو. وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾[1] واتە: کێیە ئەو کەسەی لەو ڕۆژەدا بتوانێت تکا لە لای خوا بکات مەگەر بە ڕێپێدانی خۆی. ﴿لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ ئەو خاوەنو فەرمانڕەوای هەموویەتی، ﴿ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا خۆی دادوەری دەکات لە نێوانتاندا بە عەدالەتی خۆی،پاداشتی هەموو کەسێك دەداتەوە بە پێی کردەوەی. پاشان خوای گەورە دیسان باسی خراپی موشریکەکان دەکات و

[1] البقرة (٢٥٥).

دەفـــەرموویێت: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ واتە: هەر كاتێك ناوی خودای تاقانە بە یاد بكرێت، ئەو كەسانەی باوەڕیان بەو دنیا نیە، دڵیان بەو ناوە دەشێوێتو تێك دەچێت، ئەگەر باسی غەیری خودایان لا دەڵێن دەڵخۆش دەبن! واتە: كاتێك بوترێت (لا إلە إلاّ الله) بە تـەنها، ﴿ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ﴾ موجاهید دەڵێت: ﴿ٱشْمَأَزَّتْ﴾ واتە: دڵیان كرژ دەبێت.[1] وەك خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴾[2] واتە: بە ڕاستی هەر كاتێك بەوانە بوترایە هـیچ پەرستراوێك نیـە بێجگە لـە خـوا، خۆیـان بـە گـەورە دەزانـی (و ملكەچـی نـەدەبوون). خۆیـان بـە زل دەزانـنو شـوێنی ناكەونو گوێڕایەڵی ناكەن. چونكە دڵیـان هـەقو چاكە وەرناگرێت هـەر كەسیش چاكەی وەرنـەگرت. شوێنی خراپە.دەكەوێت بۆیـە خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ﴾ واتـە: ئەگـەر باسی غەیری خودایان بۆ بكرێت لەو شتانە وەك بتو ئەو هاوەڵانـە كـە بـۆ خودایـان دانـاوە، ﴿إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ واتە: زۆر دڵخۆش دەبنو پێیان خۆشە.

﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾﴾

**شێوازی پاڕانەوە (دوعاكردن)**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ واتـە: تـۆ بڵـێ ئـەی خـوای مـەزن؛ ئـەی داهێنـەری ئاسمانـەكانو زەمین! زانا بە نادیارو دیاران! تۆ بە كاری عەبدانی خۆت ڕادەگەیو ئەو كێشەی كـە لـە ناویاندا بـوو كۆتای دەكەی. خوای گەورە دوای ئەوەی باسی ئەو كەسانەی كرد كە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو باسی خراپیـان دەكـات كـە چـەند ئارەزوومەنـدی پەرسـتنی غـەیری خـودانو ڕادەكـەن لـە یەكتاپەرستی. دەفـــەرموویێت: ﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾ واتـــە: تـــۆ ئـــەی

[1] الطبري (٢١/٣٠١).

[2] الصافات (٣٥).

موحەممەد(ﷺ) تەنها هاوار لەخوا بکە کەشەریکی نیەوئەو خودایەی کە داهێنەری ئاسمانەکانو زەمینە، کە لە پێشدا نەبوون، ﴿عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾ واتە: ئاگای لە پەنهانیو ئاشکرایە، ﴿أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: تۆ بە کاری عەبدانی خۆت ڕادەگەی لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا کاتێك زیندوو دەکرێنەوەو لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوەو کۆدەکرێنەوە ئەو کێشانەی لە نێوانیاندا بوو کۆتاییت پێ هێناو هەر کەسەو هەقی خۆیت دایە بە تەواوی. موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بە چی شتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی بە نوێژ دەکرد کاتێك هەڵدەسا بۆ شەونوێژ؟ عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت)فەرموی: کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵدەسا بۆ شەونوێژ. نوێژی بەم پاڕانەوەیە دەست پێدەکرد: (ئەی خودایە! پەروەردگاری جوبەرەئیلو میکائیلو ئیسرافیل! داهێنەری ئاسمانەکانو زەمینو زانا بە نادیارو دیار!. تۆ بە کاری عەبدانی خۆت ڕادەگەیو ئەو کێشەی لەناویاندا هەیە کۆتای دەکەی. شارەزام بکە لەوهەقەداکەخەڵکی تێیدا ناکۆکن بە ئیزنی خۆت. بێگومان تۆ بۆ هەر کەسێك مەیلت لێ بێت ڕاستەڕێی نیشان دەدەی)[1].

### لە ڕۆژی قیامەتدا ( فیدیە ) قەبوڵ ناکرێت

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی پیشەیان ناهەقی بووە، ئەگەر هەرچی لەم سەر زەمینەدا هەیەو هێندەی تریش هی ئەوان بێت، دەیکەنە فیدیەی خۆیان،بۆئەوەی لە جەزرەبەی خراپی ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان بکات، ئەوسا شتێکی وەهایان (لە خواوە) دێتەبەرچاو، کە هەرگیز بیریشیان بۆی نەچووە. ﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ واتە:ئەگەر ئەوانەی کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، ﴿مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ واتە: هەرچی لەسەر زەمیندا هەیە ئەوەندەی تریشان هەبێت، ﴿لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ واتە: ئەیکەنە فیدیەی ئەوەی کەڕزگاریان ببێت لەو جەزرەبەو ناڕەحەتەی ڕۆژی قیامەت کە خودا بۆی داناون، لێشیان قەبوڵ ناکرێت با پڕی ئەم سەر زەمینەش بێت لە زێڕ، وەك خوای گەورە لەم ئایەتەی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ﴾ پاشان سزاو خراپەیەکی وایان لە لایەن خوداوە بۆ دێت لە ڕۆژی قیامەتدا کە هەرگیز چاوەڕوانیان نەکردووەو بە تەمای نەبوون. ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟

[1] مسلم (٢/٥٣٤).

وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ ئەمەشیان بۆ ئاشکرا بوو کە چەندە خراپەیان کردووە، ئەو شتانەی ئەوان گاڵتەیان پێدەکرد چوار دەوریان دەگرن. ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟﴾ واتە: تۆڵەی ئەو خراپانەی کە لە دنیا کردبوویان بۆیان دەرکەوت، ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾ واتە: ئەو جەزرەبەو نارەحەتیەش کە لە دنیا گاڵتەیان پێدەکردو بڕوایان پێی نەبوو دەوری گرتوون.

﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَـٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾﴾

## مرۆڤ کاتێك تووشی خۆشیەك دەبێت دوای ناخۆشی لەخۆی دەگۆڕێت

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَـٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: سا هەر وەختێك مرۆڤ تووشی بەڵایەك دێت، لەبەرمان دەپاڕێتەوە، پاشان ئەگەر بەهرەیەکمان پێبگەیاند. دەڵێن: هونەری خۆمانە. هیچ نازانن ئەمە ئەزموونە بۆ ئەوان، بەڵام دیارە زۆربەیان لە نەزانانن. خوای مەزن باسی مرۆڤ دەکات کە کاتێك تووشی بەڵایەك دەبێت لە خودا دەپاڕێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ لای‌و هاواری لێ دەکات. پاشان ئەگەر بەهرەیەکی پێبگەیاند لە خۆباییەو یاخی دەبێت‌و دەڵێت: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ﴾[1] واتە: بێگومان ئەم سامانەم پێ دراوە بە هۆی زانیاریەکەوە کە هەمە. هونەری خۆمە خودا پێی داوم‌و شایستەی ئەوەم‌و ئەگەر من شایەنی ئەو بەهرەیە نەبم پێی نەدەدام. قەتادە دەڵێت: ﴿عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ﴾ واتە: لە زانستی خۆمەوەیە.[2] خوای مەزنیش دەفەرمووێت: ﴿بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ﴾ واتە: بەو شێوەیە نیە کە ئەوان دەزانن بەڵکو ئێمە ئەو بەهرەیەمان پێ بەخشی تا تاقی بکەینەوە ئایا گوێڕایەڵ دەبێت یان سەرپێچی دەکات. هەرچەندە ئێمە پێشتر دەمانزانی. بەڵام ئەمە بەڵایەکە (ئەزمونێکە) بۆیان. ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ هەرچەندە زۆربەیان حاڵی نابن بۆیە هەر لە خۆیانەوە قسە دەکەن‌وئەوەمووەلافەش لێدەدەن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ ئەوانەی پێش

---

[1] القصص (٧٨).

[2] الطبري (٣٠١/٢١).

ئەوانیش بوون هەر ئەو قسانەیان کرد، بەڵام هەرچی ئەوان کردیان، هیچ بەهرەیەکی پـیٚ نـەدان. ﴿قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ واتە: زۆرێك لەو کەسانەی پێش ئـەمان ئـەم قـسانەی ئـەمانیان دەکـردو وایـان دەزانیو بە هەمان شێوە بیریان دەکردەوە، لە گەڵـە پێشینەکان، ﴿فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ واتە: قسەکانیان بە ڕاست دەرنەچوو، نە ماڵو نە دەستو پێوەندو کەسو کاریان هیچ بەهرەیەکی پیٚ نـەدانو فریایـان نەکـەوت. ﴿فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ واتە: ئەوسا سزای کاری خۆیان دی، ئەو کەسانەش کە لەناو ئەم مەردمـەدا غەدر دەکەن، پاداشتی خراپـەی خۆیـان دەدرێتـەوەو نـاتوانن خـۆ ڕزگـار بکـەن. واتـە: ئەوانـەش کـە خراپەکارنو ئەو کەسانەش کـە ناهـەقی بـە خـەڵکی دەکـەن پاداشـتی کـردەوەی خۆیـان دەدرێتـەوە، ﴿وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ﴾ ناتوانن خۆ دەرباز بکەن وەك خوای گەورە باسـی قـارون دەکـات کـە هۆزەکـەی پێیان ووتـوە : ﴿وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾[1] واتە: وە لەو (گەنجو سامان)ەی خوا پێی داوی ئەو دنیای پـیٚ بەدەسـت بێنـەو بەشـی خۆیشت لەم دنیایە لەبیر نەچێتو چاکە بکە (لەگەڵ خەڵکدا) هـەر چۆنێك خـوا چاکەی لەگـەڵ تـۆدا کردووەو لەسەر زەویدا بە شوێن خراپەدا مەگەڕیٚ ، بـە ڕاسـتی خـوا خراپـەکارانی خـۆش ناوێت،ئـەریٚ (قـارون)ئـەوەی نـەیزانیوە کـە بـە ڕاسـتی خـوا لـە چـەرخەکانی پـێش ئەمـدا چـەندین کەسـانی وای لەناوبردووە کە لەو بەهێزتربوون و کۆبو کۆمەڵیشیان لەو زۆرتر بوو، (کاتێك سزای خـوا هـات) پرسـیار ناکرێت لە تاوانەکانی ئەم تاوانبارانە. وە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ﴾[2] واتە: وە وتیان ئێمە سامانو منداڵمان زۆرترە (لە ئێوە)و ئێمە هەرگیز سزا نادرێین. خوای مەزن و باڵادەست دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ واتـە: چـۆن هێشتا نـەیانزانیوە کـە بـژێوی بـە دەسـت خودایـە، بـە هێندێکیان زۆر دەداتو بە هێندێکیان کەم. زۆر نیشانە لەمەدا هەن بۆ گەلێك کە بـڕوای هـەبێت. واتـە:

[1] القصص (٧٧_٧٨).

[2] سبأ (٣٥).

پەندو ئامۆژگاری‌و بەڵگە زۆرە لەسەر ئەمەی کە هەندێ کەس خودا بـژێوی زۆری پێداوەو هەندێکیش بژێوی کەمی پێداوە.

﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ
ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟
أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن
تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى
لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾﴾

## بانگهێشت بۆ گەڕانەوەو تەوبەکردن پێش هاتنی سزا

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە: بڵێ: ئەی عەبدەکانی من! ئەی ئەوانەی کە بە لادان لە ئەندازە، ناهەقیتان لە خۆتان کردووە! نابێت ئێوە لە بەزەیی خوا نائومێد بن، چونکە خوا لە هەموو گوناهێك چاو دەپۆشێت، ئەو لێبوردەو دلۆڤانە. ئەم ئایەتە پیرۆزە بانگی گشت یاخی‌و لادەرەکان دەکات لە خوانەناس‌و کەسانی تریش کە پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە، هەواڵیان دەداتێ کە خوای مەزن لە هەموو تاوانێك دەبورێت لە هەر کەسێك کە پەشیمان بێتەوەو لە گوناه وازبێنێت جا ئیتر ئەو گوناهو تاوانە هەر چۆنێك بووبێت‌و هەرچەندە زۆر بێت وەك کەف‌و خۆڵ وخاشاکی دەریا. ئەم ئایەتە ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە تەوبە ناکەن. چونکە هاوەڵ دانان بۆ خودا لێخۆشبوونی نیە بەو مەرجە نەبێت، دەبێت ئەو کەسە تەوبەی لێ بکات‌و پەشیمان ببێتەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: خەڵکێکی زۆر لەو کەسانەی کە هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا خەڵکێکی زۆریان کوشت بوو زۆر داوێن پیس بوون هاتن بۆ لای موحەممەد (ﷺ) وتیان: ئەمەی تۆ بانگی بۆ دەکەیت‌و دەیڵێی شتێکی زۆر چاکە ئەگەر هەواڵمان بدەیتێ کەفارەتی ئەوگوناهانە هەیە!.ئەوەبوو ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ﴾[1] واتە: وە کەسانێکن لەگەڵ خوادا ناپەرستن هیچ پەرستراوێکی ترو ناکوژن هیچ کەسێك کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ‌و حەرام کردووە بە هەق‌و ڕەوا

[1] الفرقان (٦٨).

نەبێتو زیناو داوێن پیسی ناکەن. ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە کە دەفـەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ﴾ هـەر بـەم شـێوەیە موسـلیمو ئـەبو داودو نەسـائیش ڕیوایەتیان کردووە.[1] مەبەست لە ئایەتی یەکەم، ئەم ئایەتەیە کە دەفـەرموێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا﴾[2] واتە: مەگین ئەوەی تەوبە دەکاتو باوەڕ دێنێتو ئاکاری چاك ڕەچاو دەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لـە سەوبانەوە کە خزمەتچی پێغەمبەر بـوو (ﷺ) دەڵێت: بیستم پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) دەیفـەرموو: (دنیـاو ئـەوەی کـە تیایـەتی بـە ئەنـدازەی ئـەم ئایەتـە لام خۆشەویـستتر نیـە کـە خـودا دەفـەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ تـا کۆتـایی ئایەتەکە). پیاوێك وتی: ئەی ئەو کەسەی شەریك بۆ خودا دادەنێ؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو پاشان فەرمووی: (مەگین ئەو کەسە نەبێت کە شەریکی بۆ خودا داناوە). سێ جار فـەرمووی.[3] تـەنها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کـردووە. دیسان ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەسمای کـچی یەزیـدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتـەی دەخوێنـد: ﴿إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖ﴾ واتە: ئەو کاری ناپەسەندی هەیە. وە گوێم لێبوو دەیفەرموو: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾.[4] ئـــەبو داودو تیرمیـــزیش ڕیوایەتیان کردووە.[5] ئەم فەرموودانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوە کە گشت گوناهێك ڕەش دەکرێتـەوە، لەگەڵ تەوبەکردن دا هیچ عەبدێك نائومێد نابێت لە بـەزەیی خـودا بـا هەرچـەندە گوناهەکـەی گـەورەو زۆریش بێت چونکە دەرگای بەزەییو لێبووردنی خـودا زۆر فراوانـە، خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ﴾[6] واتـە: ئایـا نـەیانزانیوە کـە بێگومـان هـەر خـودا تەوبـەو پەشیمانی لە بەندەکانی وەردەگرێت. وە فەرموویـەتی: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ

[1] فتح الباري (٤١١/٨)، مسلم (١١٣/١)، أبو داود (١٦٦/٤)، النسائي في الكبرى (٤٤٦).

[2] الفرقان (٧).

[3] أحمد (٢٧٥/٥)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] أحمد (٤٥٤/٦)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[5] أبو داود (٢٨٥/٤)، تحفة الأحوذي (١١١/٩)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[6] التوبة (١٠٤).

ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾[1] واتە: وە هەر کەس کردەوەیەکی خراپ بکات یان ستەم لە خۆی بکات پاشان داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات دەبینێت خوا لێبووردەی میهرەبانە. وە خوای گەورەو بالادەست لە بارەی دووڕووەکانەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ ﴾[2] واتە: (با بزانن) بە ڕاستی دووڕووەکان لە خانەو تەبەقەی هەرە ژێرەوەی ئاگردانو هەرگیز ڕزگارکەرێکت بۆ ئەوان دەست ناکەوێت، جگە لەوانەی دەگەڕێنەوەو خۆیان چاك دەکەن. وە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی بێباوەڕ بوون ئەوانەی کە وتیان بێگومان خودا یەکێکە لەو سێ خودا (کە بریتین لە پەروەردگارو عیساو دایکی)، (لە کاتێکدا) هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە تەنها خودایەكو ئەگەر واز نەهێنن لەو وتە ناڕەواو بەدانە سوێند بە خوا سزایەکی بە ئازارو سەخت دووچاری ئەوانەیان دەبێت کە بێباوەڕ بوون ، پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[3] واتە: دەی بۆ تەوبە ناکەنو ناگەڕێنەوە بۆ لای خودا؟و داوای لێبوردنی لێ ناکەن؟ لە کاتێکدا خودا لێبووردەی میهرەبانە. خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُوا۟ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُوا۟ ﴾[4] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە ئازاری پیاوو ژنە بڕوادارەکانیانداو لە پاشان پەشیمان نەبوونەوە. حەسەنی بەسری دەڵێت: سەیری ئەم هەموو ڕێزو بەخشندەییەی خودا بکەن دۆستی خودایان کوشتووە کەچی خودای گەورە بانگیان دەکات کە تەوبە بکەن هەتا لێیان ببورێت. ئایەت لەم بارەیەوە فرە زۆرە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو سەعیدەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) لە باسی ئەو پیاوە کە نەوەدو نۆ (٩٩) کەسی کوشت، پاشان پەشیمان بووەوە پرسیاری لە خواناسێکی بەنی ئیسرائیل (جوولەکە) کرد ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات، خواناسەکە وتی: نەخێر. ئەویشی کوشت. بەوەوە سەد کەسی تەواو کرد. پاشان پرسیاری لە زانایەك لە زاناکانی بەنی ئیسرائیل کرد ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات. زاناکە وتی: کێ دەبێتە ڕێگر لە نێوان تۆو تەوبەکردندا. پاشان فەرمانی پێکرد کە بڕوات بۆ

---

[1] النساء (١١٠).

[2] النساء (١٤٥ـ١٤٦).

[3] المائدة (٧٣ـ٧٤).

[4] البروج (١٠).

گوندێك لەو گوندانە خواپەرستی بكات بەرەو گوندەكە كەوتەڕێ لە ڕێگەدا مردن یەخـەی گـرتو گیـانی دەرچوو فریشتەی بەزەیی‌و فریشتەی سزادان بووە كێشەیان لەسەری. خـوای دلۆڤـان فـەرمانی دا كـە نێوانی هەردوو زەویەكە بپێون بۆ هەر كام زەمینیان نزیكتر بوو ئەمە لەوێیە، پێوایان بۆیـان دەركـەوت كە لەو زەمینەوە نزیكە كە كۆچی كردووە بۆی، فریشتەی بـەزەیی هـەڵیگرتو بـردی. ئـەڵێن لـە كـاتی مردندا بە سنگی خۆی نزیك كردووەتەوە. خوای مەزنیش فەرمانی كردووە بەو وڵاتە پڕخێـرە كـە نزیـك بێتەوەو فەرمانیشی دا بەو وڵاتەكەی تر كە دووركەوێتەوە.[1] ئەمە مانـای فەرموودەكەیـە لـە شـوێنێكی تردا وەك خۆی چۆن نووسراوە نوسیومانە. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم ئایەتـەدا: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ هـەتا كۆتـایی ئایەتەكـە. دەڵێـت: خـوای مـەزن داوای كـردووە لـەو كەسـانەی كـە وایانزانیوە (مەسیح عیسا) (سەلامی خوای لێ بێت) خودایە. وە ئەوانەش وایـان زانیـوە خـودا هـەژارە، وە ئەوانەش وایانزانیوە (مەسیح عیسا) كوڕی خودایە، وە ئەو كەسانەش وایان زانیـوە عـوزەیر كـوڕی خودایە. وە ئەوانەش وایانزانیوە كە خودا دەستی بەستراوە. وە ئەوانەش وایانزانیوە كە خودا یەكێكـە لە سێ خوداكە. تا پەشیمان ببنـەوەو بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوداو تەوبـە بكـەن. دەفـەرموێت پێیـان: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[2] واتـە: دەی بـۆ تەوبـە ناكـەن‌و ناگەڕێنەوە بۆ لای خودا؟و داوای لێبوردنی لێ ناكەن؟ لە كاتێكدا خـودا لێبـوردەی میهرەبانـە. پاشـان داوای تەوبە دەكات لەو كەسەی كە قسەكەی زۆر لە قسەی ئەوان گەورترە، ئەو كەسەی كە دەڵێت من خودا هەرە پایەبەرزەكـەی ئێـوەم فەرموویـەتی: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرِى﴾ ئیبنـو عـەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: هەر كەسێك لە عەبدەكانی خودا نائومێد بێت لـە پەشـیمانبوونەوە دوای ئەم فەرموودەی خوای گەورەیە ئەوە ئینكاری كتێبی خودا دەكات. بەڵام عەبد توانای تەوبەكردنی نیە هەتا خودا تەوبەی لێ وەردەگرێت‌و لێی دەبورێت.[3] تەبەرانی ڕیوایەتی كردووە لە ڕێگەی شەعبیەوە لـە شوتەری كوڕی شەكەلەوە دەڵێت: بیستم لە ئیبنو مەسعودەوە دەیوت: گەورەترین ئایەت لە لە كتێبی خوادا: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾[4] واتە: خوا ئەو خوایەیە كە هـیچ پەرسـتراوێكی (ڕاسـت) نیـە بێجگە لەو هەمیشە زیندووی تەدبیركەرو ڕاگر(ی بوونەوەر)ە. وە گشتگیرترین ئایەت بۆ چـاكەو خراپـە

[1] فتح الباري (٦/٥٩١).

[2] المائدة (٧٤).

[3] اخرجه ابن جرير وابن المنذر الدر المنثور (٥/٦٢١).

[4] البقرة (٢٥٥).

لە قورئاندا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ﴾[1] واتە: بە ڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادگەریو بە چاکە(تاکۆتایی ئایەتەکە) . وە زۆرترین ئایەت لە قورئاندا دڵخۆشکەر بێت لە سورەتی (الزُّمر)دایە: ﴿قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِ﴾ وە بەهێزترینو توندترین ئایەت لە کتێبی خوادا کە دەروکەرەوەیە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ﴾[2] واتە: وە هەر کەسێك خواناس بێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە، وە ڕزقو ڕۆزی دەدات لە لایەکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتووە.مەسروق وتی: ڕاست دەکەی[3].

**باسی ئەو فەرموودانەی کە نەفی نائومێدی دەکات**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) دەیفەرموو: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەوەندە گوناهتان کردبێت، گوناهەکانتان نێوانی ئاسمانو زەمین پڕ بکات. پاشان داوای لێخۆشبوونتان کردبێت لە خودا، خودا لێتان خۆش بووە. وە سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی(ﷺ) بە دەستە ئەگەر گوناهتان نەکردایە خودا گەلێکی دەهێنا گوناهیان بکردایە پاشان داوای لێخۆشبوونیان لە خودا بکردایە، تا لێیان خۆش بێت).[4] تەنها ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە. وە دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو ئەیوبی ئەنساریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کاتی مردنیدا دەڵێت: من شتێکم لە ئێوە شاردبووەوە کە بیستبووم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەیفەرموو: (خۆ ئەگەر ئێوە گوناهتان نەکردایە خودا گەلێکی دروست دەکرد گوناه بکەن هەتا لێیان خۆش بێت). هەر بەم شێوەیە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووەو موسلیم هێناویەتی لە سەحیحەکەیداو تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووە.[5] پاشان خوای مەزن عەبدەکانی هەڵدەنێ کە پێشبڕکێ بکەن لە تەوبەکردنداو فەرموویەتی: ﴿وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ﴾ واتە: بگەڕێنەوە لای پەروەردگاری خۆتانو خۆتان هەر بەو بسپێرن، بەر لەوە ئازارتان بۆ بێتو کەسیش بە هاناتان نەیەت. واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای خوداو خۆتان بدەنە دەستی ئەو، ﴿قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا

---

[1] النحل (٩٠).

[2] الطلاق (٢ـ٣).

[3] الطبراني (١٤٢/٩).

[4] أحمد (٢٣٨/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] أحمد (٤١٤/٥)، مسلم (٢١٠٥/٤)، تحفة الأحوذي (٢٢٣/٩).

تُنصَرُونَ ﴾ واتە: پەلە بکەن لە تەوبەکردنداو مەوەستن لـە کـاری چاکەکردن پـێش ئـەوەی تووشی نارەحـەتیو مـردن بـبن. پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ بَغۡتَةً وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾ واتـە: بکەونـە شـوێن ئـەو دەستوورەی پەروەردگارتان بۆتانی ناردووە لە هەموو شت باشترە، بـەر لـەوە ئازارتـان بـۆ بێـت (لـە ناکاوێك) کە هەر هەستیشی پێ ناکەن. واتە: شوێنی قورئانی پیرۆز بکەون کە لە هەموو شتێك باشترە پێش ئەوەی لە کتوپڕێکدا سزاتان بۆ بێت کە نـازانن‌و هەستیشی پـێ ناکـەن. پاشـان خـوای مـەزن دەفەرمووێت: ﴿أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾ واتە: نەکا ئەوسا کەسێك بڵێ: ئەی مخابن من لە فەرمانبەری خودا درێغیم کرد، بە ڕاستی من لە گاڵتەچیان بووم. واتە: نەکا ئەوسا کەسێك لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێ بە داخەوە من نکۆڵیم کرد لـە پەشیمان بوونـەوەو زوو نەگەڕامەوەو ئاواتەخوازە کە یەکێك بووایە لە ئاکارچاك‌و دڵپاك‌و گوێڕایەڵانی خوای گەورە. ﴿وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴾ واتە: کارو فەرمانی من گاڵتەکردن‌و لاساری بوو بڕوام نەدەکردو بـە ڕاسـتم نـەدەزانی، ﴿أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ واتە: یـان بڵـێ ئەگـەر خـودا بـەرەو خـۆی ڕێـی نیشان دابام، منیش لە پارێزگاران دەبووم. ﴿أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ واتـە: یـان وەختێـك کە ئـازار دەبـینێ بڵـێ بریـا بگەڕامایەتـەوەو بـچوومایەتە ڕیـزی ئاکارچاکانەوە. واتە: خۆزگە جارێکی تر دەگەڕامەوە بۆ نـاو دنیـا هـەتا کرداری چـاکم بکردایـە. عـەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) خوای خاوەن دەسەڵات باسی ئەو عەبدانەمان بۆ دەکات کە چی دەڵێن لە پێش ئەوەی بیڵێن‌وباسـی ئـەو کردارانـەیان دەکـات بۆمـان لـە پێش ئەوەی کە پێی هەڵسن. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثۡلُ خَبِيرٖ ﴾[1] واتە: غەیری خـودا (کە هەموو شتێك دەزانێت) کەس ناتوانێت (لەوانە) ئاگادارت بکات کەڕوو دەدەن بۆ نمونـە ﴿أَن تَقُولَ نَفۡسٞ يَٰحَسۡرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ٥٦ أَوۡ تَقُولَ لَوۡ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٥٧ أَوۡ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلۡعَذَابَ لَوۡ أَنَّ لِي كَرَّةٗ فَأَكُونَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾[2].

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری

---

[1] الفاطر (١٤).

[2] الطبري (٢١/٣١٦).

خودا(ﷺ) فەرمووی: (گشت خەڵکی ناو ئاگر شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێتو دەڵێت: ئەگەر خودا بەرەو خۆی ڕێی نیشان دابام ئاوام بەسەر نەدەهات، (ئەوەدەبێتە داخو خەفەت بۆی). وە فەرمووی گشت خەڵکی بەهەشت شوێنی خۆی لەناو ئاگردائەبینێ و دەڵێت: ئەگەر خودا بەرەو خۆی ڕێی نیشان نەدابام (ئێستا ناو ئاگر جێم بوو) فەرمووی: سوپاسی خوای لەسەر دەکات).[1] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە.[2] کاتێك تاوانکاران ئاوات دەخوازن جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ دنیاو ئاخو داخ دەخۆن کە بۆچی بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەکردو شوێنی پێغەمبەرەکانی (سەلامی خوایان لێ بێت) نەکەوتن، خوای مەزنیش دەفەرموێت: ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: خۆ گەلێکت لە نیشانەکانی من بۆ هات، باوەڕت پێیان نەهاتو بەهۆی خۆبەزلزانینی خۆتەوە، چوویتە ڕیزی پێ نەزانان. واتە: ئەی ئەو عەبدەی پەشیمانی لەوەی کە بڕوات نەکرد بە نیشانەکانی من لە ژیانی دنیادا ئەو هەموو بەڵگەی منت بینیو بڕوات پێ نەکرد خۆت بە زل زانیو شوێنی نەکەوتی. چویتە پاڵ ئەوانەی کە لاسارو پێ نەزانو بەدنەمەك بوون.

﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ﴾

**پاشەڕۆژی ئەوانەی کە درۆیان بۆ خودا هەڵدەبەستو پاشەڕۆژی ئەوانەش کە خۆیان لە پاراست**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت تۆ دەبینی ئەو کەسانەی درۆیان بۆ خوا هەڵدەبەست ڕوویان ڕەشە، ئاخۆ بۆ خۆ بەزلزانان شوێنێك لە دۆزەخدا نیە؟ خوای گەورە باسی ڕۆژی قیامەت دەکات کە لەو ڕۆژەدا هەندێ ڕووڕەشنو هەندێکیش ڕووسپین. ئەوانەی خەریکی دووبەرەکیو ئاژاوە بوون ڕوویان ڕەشەو ئەهلی سونەو جەماعەش ڕوویان سپیە بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەوانەی کە وادەزانن خودا شەریکی هەیەو فەرزندەی بۆ دادەنێن ﴿ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾ ڕوویان ڕەش دەبێت بە هۆی ئەو درۆیەی بۆ خوای هەڵدەبەستن خودایش دەفەرموێت: ﴿ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ واتە: ئایا جەهەنەم بەس نیە بۆ ئەوانە کە ببێتە بەندیخانەو شوێنیان هەتا ئابڕویان بچێتو سەرشۆڕو داماو بن تێیدا بە هۆی ئەو لوتبەرزیەیانو

[1] أحمد (٥١٢/١)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە.

[2] النسائي في الكبرى (٤٤٧/٦).

مل نەدانەیان بۆ ڕاستی، پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ بِمَفَازَتِهِمۡ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ واتە: ئەو کەسانەی خۆیان پاراست (لەبەر ئەوەی بە ڕێگەی ڕزگاریدا چوون) خودا خۆی ڕزگاریان دەکات، نە تووشی ناخۆشی دەبن‌و نە خەم دەخۆن. ﴿ وَيُنَجِّي ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ بِمَفَازَتِهِمۡ ﴾ واتە: ئەوانەی کە بە ڕێگەی بەختەوەریدا چوون‌و ڕوو سوورو سەرفراز بوون لە لای خودا، ﴿لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ﴾ تووشی ئازار نابن لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ واتە: لەو ڕۆژە زۆر ترسناکەدا خەم ناخۆن بەڵکو پارێزراون لە هەموو ناخۆشیەک‌و لە هەموو خراپەیەک دوورن‌و زۆر بەختەوەرن.

﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلۡ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَأۡمُرُوٓنِّيٓ أَعۡبُدُ أَيُّهَا ٱلۡجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾

**خودا خۆی خاوەن دەسەڵات‌و وەدیهێنەرەو شەریک دانان بۆی هەموو کردەوەیەک لەناو دەبات**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ﴾ واتە: هەرچی هەیە هەموو دەستکاری خودایەو ئاگای لە هەموو شت هەیە. ﴿لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ واتە: کلیلەکانی ئاسمانەکان‌و زەمین بە دەست ئەوە. هەر ئەوانە زیانبارن کە لە نیشانەکانی خودا حاشایان کرد. خوای گەورە دەفەرمووێت کە هەر خۆی وەدیهێنەری هەموو شتێکەو پەروەرندەو خاوەن‌و کاربەدەستیەتی‌و هەموو شتێك لە ژێر فەرمان‌و دەسەلات‌و چاودێری ئەودایە، ﴿لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ موجاهید دەڵێت: ﴿مَقَالِيدُ﴾ واتە: کلیلەکان بەزمانی فارسی. قەتادەو ئیبنو زەیدو سوفیانی کوڕی عویەینەش (عُیَینة) هەر وایان وتووە.[1] سودی دەڵێت: ﴿لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: گەنجینەکانی ئاسمانەکان‌و زەمین بە دەستی ئەوە.[2] ماناکە لە هەردوو حالەتەکەدا وەك یەکن واتە هەموو کارو فەرمانێك بە دەستی خوای گەورەیە. هەر ئەو خاوەن دەسەڵات‌و جێی سوپاسەو ئاگای لە هەموو شت هەیە بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی:

---

[1] الدر المنثور (٧/٢٤٣)، الطبري (٢١/٣٢١).

[2] الطبري (٢١/٣٢١).

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ واتە: هەر ئەوانە زەرەرمەندن کە بڕوایان بە نیـشانەکانی خـودا نیـە. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّيٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴾ واتە: بڵێ: ئاخۆ لە منتان دەوێ غەیری خودا شتێکی تر بپەرستم؟ ئەی نەزانان. لـە بـارەی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە ڕیوایەت کراوە لـە ئـەبو حاتـەمو کەسـانی تریشەوە لـە ئیبنـو عەباسـەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێـت: موشـریکەکان لـە نەزانیانـەوە داوایان لـە پێغەمبـەر(ﷺ) دەکرد کـە عیبادەتی خوداکانی ئەوان بکات ئەوانیش لەگەڵ ئەو عیبادەتی خوداکەی ئەو دەکـەن ، ئـەوەبوو ئـەم ئایەتــە هاتــەخوارەوە: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّيٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ ئێمە بە تۆو ئەوانـەش کە بـەر لـە تـۆ بـوون، ڕامانگەیاند، هەر کەسێکی تر بپەرستی، بێگومان کارەکەت لێ پوچـەڵ دەبێـتو لـە ڕێـزی زیانبـارانی.[1] ئـەم ئایەتــە وەك ئـەو ئایەتـە وایـە کـە خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾[2] واتە: وە ئەگەر هاوبەشیان ڕەوا بدایە بۆ خوا بێگومان ئەو چاکانەی کردبوویان هەمووی بـێ پاداشت دەردەچوو. وە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ واتە: تـەنها خودا بپەرستەو لەگەڵ شوکرانەبژێران بە. واتە: بە دڵی پاك عیبادەتی خودا بکە بە تەنهاو هـاوەڵی بـۆ دامەنێو خۆشتو ئەوانەش کە بڕوایان پێ کردووەو شوێنت کەوتوون.

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾

### موشریکەکان وەك پێویست خودایان نەناسیووە

خــوای مــەزن دەفــەرموویت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ واتــە: خودایــان (وەکــو پێویــست) نەناسـیووە، ڕۆژی قیامـەت زەمـین هـەموو وا لـەناو مـشتی ئەودایـەو ئاسمانـانیش بـە دەسـتی ئـەو پێچراونەتەوە خودا پاكو بـەڕێزە لـەو شـتانەی ئـەوان دەیکەنـە شـەریکی. ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ﴾ واتە: ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن وەك پێویستە خودایان نەناسیووە کاتێك کە کەسانی تر غەیری

[1] الطبري، تفسير سورة الكافرون.
[2] الانعام (٨٨).

خودا لەگەڵی دەپەرستن. ئەو خودایەی هیچ کەس لەو مەزنتر نیەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو شتێك لە ژێر تواناو دەسەڵاتی ئەودایە. موجاهید دەڵێت: ئـەم ئایەتـە لەسەر قورەیش هاتووەتەخوار. سودی دەڵێت: بەو شێوەیەی کە پێویستە ڕێزیان لە خودا نـەگرتووە.[1] موحەممەدی کوڕی کەعب دەڵێت: ئەگەر خودایان وەك پێویستە بناسیایە بێباوەڕ نـەدەبوون. عـەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێـت): ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ﴾ ئـەو خوانەناسانە بڕوایان نەدەکرد کە خودا دەسەڵاتی هەیە بەسەریاندا. چونکە هـەر کەسێك بڕوای ببێت کە خودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، وەك ئەوەی کە پێویستە دەیناسن هەر کەسیش بـاوەڕی وا نەبێت خودای نەناسیووە بەو شێوەیەی کە پێویستە.[2] فەرموودەی زۆر هـاتووە کـە پەیوەنـدی بـەم ئایەتە پیرۆزەوە هەیە. ڕێگەش بۆ تەفسیرکردنی ئـەم ئایەتـەو نموونـەی ئـەم ئایەتـە ڕێگـەی زانایـانی پێشینە ئەوتەفسیرەش هێنانیان وماناکردنیانـە وەك خـۆی بـەبێ گـۆڕینو ئـەملاولا پێکردن. بوخـاری ڕیوایەتی کردووە لەم ئایەتـەدا: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ﴾ لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: یـەکێك لـە زانایـانی جوولەکـە هـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) وتـی: ئـەی موحەممەد (ﷺ) ئێمە بە لامانەوە وایە کە خـودا ئاسمانـەکان دەگێڕێت لەسـەر پەنجەیـەکو زەمـین لەسەر پەنجەیەکو ڕووەك لەسەر پەنجەیەکو ئاوو خۆڵیش لەسەر پەنجەیـەکو بـاقی دروسـتکراوەکانی تریش لەسەر پەنجەیەك ودوای ئەوە دەفەرموێت: مـن فـەرمانڕەوام، پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پێکـەنی هەتا دانی پیرۆزی دەرکەوت. بۆ تەئکیدی ڕاستی قسەی زاناکە پاشـان پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) ئـەم ئایەتـــەی خوێنـــد: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾،[3] هەمیـــسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە جگە لەم باسەدا لە سـەحیحەکەیداو ئیمـامی ئەحمـەدو موسـلیمو تیرمیـزیو نەسائیش ڕیوایـەتیان کـردووە.[4] وە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت: بیـستم لـە پێغەمبەری خودا(ﷺ)دەیفەرموو: (خوای مەزن زەمین دەگرێـتو ئاسمـانیش بـە ڕاسـتی دەپێـچێتەوە پاشان دەفەرموێت: من فەرمانڕەوام فـەرمانڕەواکانی زەمـین لـە کوێن) بـەم شـێوەیە تـەنها بوخـاری

---

[1] الطبري (٢١/٣٢١).

[2] الطبري (٢١/٣٢١).

[3] فتح الباري (٨/٤١٢).

[4] فـتح البـاري (١٣/٤٠٤)، مـسلم (٤/٢١٤٧)، أحمـد (١/٤٢٩، تحفـة الأحـوذي (٩/١١٢/١١٣)، النـسائي في الكـبرى (٦/٤٤٦).

ڕیوایەتی کردووە. موسلیم بە شێوەیەکی تر ڕیوایەتی کردووە.[١] وە بوخاری لە شوێنێکی تردا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە– (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزنو پایەبەرز لە ڕۆژی قیامەتدا زەمین دەگرێت لەسەر پەنجەیەکو ئاسمانەکانیش بە دەستیەوە، پاشان دەفەرمووێت: من فەرمانڕەوام).[٢] هەر بوخاری بە شێوەیەکی تریش ڕیوایەتی کردووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە هەر بەم شێوەیەو درێژتریش لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی لەسەرمینبەرەکەی خوێند: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾، پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو: ئا بەو شێوەیە دەستی دەجوڵاند بەملاولادا دەستی هەڵدەگێڕایەوە (پەروەردگار باسی مەزنی خۆی دەکاتو دەفەرمووێت: من بەسەر هەموو شتێکدا زاڵم، من هیچ شتێك دەرەقەتم نایەتو من فەرمانڕەوام. من خاوەن دەسەڵاتم، من بەخشندەم)، مینبەرەکە لەرزیو جوڵا بە پێغەمبەرەوە. هەتا وتمان لەوانەیە بە پێغەمبەرەوە بکەوێتە خوارەوە)[٣]. موسلیمو نەسائیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە[٤].

﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَـٰبُ وَجِا۟ىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾﴾

### فوکردن بە کەڵەشاخداو داوەریکردنو پاداشتدانەوە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ﴾ واتە: کاتێك فوو کرا بە کەرەنادا، ئەوسا هەرکێ لە ئاسمانانو زەمین، بێ هۆش دەبێت، مەگین کەسێك خوا نەیەوێت، جارێکی تر فووی پێدا کرا، کەچی لە پڕ هەموویان ڕاست دەبنەوەو بە چاوی خۆیان دەبینن. خوای گەورە باسی ناڕەحەتیو گرانی ڕۆژی قیامەت دەکاتو ئەو شتانەی کە تیایدا ڕوو دەدات لە بومەلەرزەی گەورەو بەهێزو مردنی گشت خەڵكو پاشان زیندووکردنەوەیان، کە دەفەرمووێت: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ

---

[١] مسلم (٤/٢١٤٨).

[٢] فتح الباري (١٣/٤٠٤).

[٣] أحمد (٢/٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٤] النسائي في الكبرى (٤/٤٠٠)، إبن ماجه (٢/١٤٢٩)، سەحیحە.

﴿إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ﴾ ئەم فووە بە کەڵەشاخدا فووی دووەمە. ئەو فووەیە کە هەموو زیندەوەرێك بە هۆیەوە دەمرێت لە خەڵکی ئاسمانەکانو سەر زەمین مەگین کەسێك خودا خۆی مەیلی لێ بێت نەمرێت. وەك چۆن باسکراوە لە فەرموودە بەناوبانگەکەی (صور)دا. پاشان گیانی ئەوانەش کە ماوە دەکێشرێت، تەنها فریشتەی گیان کێشان دەمێنێت ئەویش دەمرێت. تەنها خوای گەورەنەبێت کە هەرگیز نامرێتو هەبووەو هەر دەشمێنێت دەفەرمووێت: ئەمڕۆ دەسەلات بۆ کێیە؟ سێ جار دەفەرمووێت. پاشان خۆی وەلامی خۆی دەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ﴾[1] واتە: هەر بۆ خوای تاكو تەنهای بەسەر هەموو شتدا زاڵە. من ئەو کەسەم کە هەموو شتێکم تێکشکاندو زاڵ بووم بەسەریداو بڕیاری لەناودانی هەموو شتێکم دا. پاشان یەکەم کەسێك کە زیندووی دەکاتەوە، ئیسرافیلەو فەرمانی پێدەکات جارێکی تر فو بکاتەوە بە کەڵەشاخدا کە فوی سێهەمە واتە فوی زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ﴾ واتە: زیندوو دەبنەوە پاش ئەوەی کە بوونە ئێسكو ڕزان، بە چاوی خۆیان ئەو نارەحەتی ڕۆژی قیامەتە دەبینن. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ﴾[2] واتە: بێگومان ئەو زیندووبوونەوەیە هەر یەك نەعرەتەیە، ئیتر کوتوپڕ وان لە دەشتێکی سپی کاکی بەکاکیدا. وە دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا﴾[3] واتە: ئەو ڕۆژەی کە بانگتان دەکەن (لە گۆڕەکانتانەوە) جا ئێوەش دەست بەجێ دێن بە دەم بانگکردنەکەوە بە سوپاسو سەناکردنەوەو وا دەزانن نەماونەتەوە (لە دنیادا) ماوەیەکی کەم نەبێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ بِأَمۡرِهِۦۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمۡ دَعۡوَةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ إِذَآ أَنتُمۡ تَخۡرُجُونَ﴾[4] واتە: وە لە نیشانەکانی ئەوە کە ئاسمانو زەوی بە فەرمانی ئەو وەستاون پاشان کاتێك (لە ڕۆژی دواییدا) لە زەویەوە بانگتان دەکەن یەکسەر ئێوە (لە گۆڕەکانتان) دێنە دەرەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە کە پیاوێك وتی بە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خوایان لێ بێت) چیە ئەم قسەی تۆ دەیڵێی، کە قیامەت فلانەو فلانە کات هەڵدەسێت؟ عبدالله وتی: نیازم وایە کە لەمەولا هیچ فەرموودەیەك بۆ کەس باس نەکەم. من هەر ئەمەم وتووە کە ئەوەندەی پێ ناچێت

---

[1] الغافر (١٦).

[2] النازعات (١٣ـ١٤).

[3] الاسراء (٥٢).

[4] الروم (٢٥).

کارەساتێکی گەورە دەبینن. لە پاشان وتی: پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی: (لـەناو ئوممـەتی منـدا دەججال هەڵدەسێت، چل دەمێنێتەوە، نازانم چل ڕۆژ یان چل ساڵ یان چل مانگ، یـان چـل شـەو، لـە دواییدا خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خـوای لێ بێـت) دەنێرێـت کـە لـە عـوروەی کـوڕی مەسعودی سـەقەفی دەچێت،عیسادێت و خوادەججال لـەناو دەبات لـە دواییـدا خـەڵکی حـەوت سـاڵ دەمێننەوە لـە نێوان هـیچ دوو کەسێکدا دوژمنایـەتی نابێت، لـە پاشـان خـودا بایـەکی فێنـكو سـارد دەنێرێت لە ڕووی شامەوە لەسەر زەمیندا هیچ کەس نامێنێت بە ئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕ لـە دڵیـدا بێت، گیانی هەمووی دەکێشێت. هەتا ئەگەر یەکێك لە ئێوە بچێتە ناوجەرگـەی شـاخێکەوە، ئـەو بایـە دەچێتە ناو ئەو شاخە بۆی هەتا گیانی دەکێشێت. عەبدوڵڵا دەڵێت: ئەم فەرموودەیەم لـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) بیستووە کە فەرمووی: (هەر خـەڵکی خـراپ دەمێننـەوە ، وەك باڵنـدە وانـە[1]، وە عـەقڵیان وەك عەقڵی دڕندەوایە، نە چاك دەزانن کە بیکەنو نە خراپیش دەزانن کە خۆی لێ لابدەنو یەکێکی تـر کردی نەهێڵێت بیکات، شەیتان دەچێتە شکڵی مرۆڤەوە بۆیان پێیـان دەڵێـت: ئێـوە بـە گـوێم ناکـەن؟ فەرمانیان پێدەکات کە بت بپەرستن، ئـەو خەڵکـە دەسـت دەدەنـە بتپەرسـتنو بـژێویان زۆر دەبێـتو ژیانیان خۆش دەبێت، پاشان فو بە کەڵەشاخدا دەکرێت ، مەردم هەموو گوێی لێیەتی. یەکـەم کەسێك کە دەیبیستێ پیاوێکە کە حەوزی وشترەکانی سواغ دەدات کە لێی ئاو بدات. لە هۆش خۆی دەچێتو خەڵکیش هەموو لە هۆش دەچنو دەمرن لە دوایدا خوای مەزن بارانێك دەبارێنێت وەك پروشەی شەونم وایە یان وەك سێبەر (نوعمان گومانی هەبوو کە عەبدوڵڵا کامیـانی وتـووە). ئـەو بارانـە لەشـی مـەردم دەڕوێنێتەوە، جارێکی تر فوو دەکرێت بە کەڵەشاخدا مەردم هەموو ڕاست دەبنـەوەو تەماشـا دەکـەن، پاشان فەرمان دەدرێت: ئەی خەڵکینـە! وەرن بـۆ لای پـەروەردگارتان ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾[2] ڕایـان بگرن دەبێت پرسیاریان لێ بکرێت، دەڵێت: لـە پاشـان دەڵـێن: ئـەوەی دەچێتـە نـاو ئـاگرەوە جیایـان بکەنەوە دەڵێت: پاشان: دەوترێت: لە چەند چەند؟ دەوترێت لە هـەر هـەزاری نـۆ سـەدو نـەوەدو نـۆ، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە منداڵ پیر دەکات، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کـە بـۆ لێپرسینەوە قاچـی لێ هەڵدەکرێت).[3] تەنها موسلیم ڕیوایەتی کردووە لـە سـەحیحەکەیدا.[4] بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) گێڕاویەتیـەوە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) فەرموویـەتی: (نێـوانی هـەردوو فووەکـە چلە) وتیان: ئەی ئەبو هورەیرەوە ئایا چل ڕۆژە؟ ئەبو هورەیرە وتی: نازانم، وتیان: چـل سـاڵ. وتـی:

---

[1] ئەوەندە سوك هەڵدەسنە سەر خراپەکردن(وەرگێڕ)

[2] الصافات (٢٤).

[3] أحمد (٢/١٦٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/٢٢٥٨).

نازانم، وتیان: چل مانگە؟ وتی: نازانم، وتی: هەموو شتێك لە مرۆڤدا دەڕزێت کلێنچکی نەبێت[1] ، مەردم لەو ئێسکەوە پێك دێتەوە.[2] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ واتە: ئەو زەمینەش بە تیشکی پەروەرێنی خۆی ڕووناکایی تێ دەکەوێت و کتێبی خوا دێتە گۆڕو پێغەمبەرو ئاگاداران دێنە بەرێو چۆن ڕاستە، بە کاری هەمووان ڕادەگەن و غەدر لە هیچ کەس ناکرێت. ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾ واتە: زەمین ڕۆشن دەبێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێك خودا خۆی نیشانی دروستکراوەکانی دەدات و کاری هەموو تەواو دەکات و جیای دەکاتەوە، ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ﴾ قەتادە دەڵێت: کتێبی کردەوەکان.[3] ﴿وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەران دەهێنرێن و شایەتی لەسەر گەلەکانیان دەدەن کە ئەوان پەیامی خودایان پێگەیاندوون.[4] ﴿وَٱلشُّهَدَآءِ﴾ واتە:شایەت لە فریشتەکان ئەوانەی کە کرداری عەبدەکانیان پاراستووەو هەڵیان گرتووە لە چاکەو لە خراپە، ﴿وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: بە ڕاستی کاری هەمووان تەواو دەکەن، ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ناهەقی لە هیچ کەس ناکرێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾[5] واتە:وە ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپەروەری (کە کردەوەی پێ جەکێشرێت) لە ڕۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێت با قورسی (کردەوەکەی) بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین و بەسە کە ئێمە ژمێریاری (کردەوەی بەندەکان) بین. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾[6] واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناکات وە ئەگەر چاکەیەك هەبێت (خودا) چەندانەی دەکاتەوەو دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە. بۆیە خوای خاوەن دەسەڵات فەرموویەتی: ﴿وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ واتە: هەر

---

[1] ئێسکێکە لە کۆتایی پشتدایە لە خوارەوە

[2] فتح الباري (٨/٤١٤).

[3] الطبري (٢١/٣٣٥).

[4] الطبري (٢١/٣٣٦).

[5] الانبياء (٤٧).

[6] النساء (٤٠).

کەسێك هەرچی کردووە (بە تەواوی) پاداشتی پێ دەکاتەوە. خودا هەر خۆی لە هەموو کردەوەکانیان ئاگادارە.

﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٧١ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٢﴾

**خوانەناسان ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو جەهەنەم**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئەو کەسانەی حاشایان لە خوا کردووە، بۆ جەهەنەم بە کۆمەڵ ڕاپێچ دەکرێن، هەر کە لێی نزیك بوونەوە، (فریشتە) دەرگاکانی بۆ دەکەنەوە، گزیرەکانی جەهەنەم پێیان دەڵێن: ئاخۆ ئێوە پێغەمبەرتان (لە خۆتان) بۆ نەهاتبوو، نیشانانی پەروەرێنتان بۆ بخوێنێننەوەو ترسی توشبوونی ئەمڕۆتان وەبەربێنێت؟ دەڵێن: بەڵێ، بەڵێنی ئازاردان بۆ ئێمە کە خوانەناسان بووین جێی خۆیەتی. خوای گەورە باسی ژیانی بەدبەختان دەکات لە خوانەناسان کە چۆن ڕاپێچ دەکرێت بۆ ناو ئاگر بە توندی دەیانبەن‌و هەڕەشەیان لێ دەکرێت‌و زۆر سووك‌و ڕیسوان وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا﴾[1] واتە: ڕۆژێك پاڵیان پێوە دەنرێت بەرەو ئاگری دۆزەخ چۆن پاڵ پێوەنانێك. واتە: بە پاڵ دەیاندەنە بەر بۆ ناو ئاگری جەهەنەم زۆر تینوو برسین، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ٨٥ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا﴾[2] واتە: باسی ئەو ڕۆژە بکە کە پارێزکاران کۆدەکەینەوە بە شێوەی(شاندێك)بەڕێزەوە لای خوای میهرەبان کۆدەکرێنەوەو تاوانبارانیش دەدەینە بەر بۆ دۆزەخ بە وێنەی گەلە ئاژەڵ. ئا لەو کاتەدا کوێرو کەڕو لاڵن هەیانە بە ڕوودا ڕادەکێشرێت بۆجەهەنەم ﴿وَنَحۡشُرُهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ عُمۡيٗا وَبُكۡمٗا وَصُمّٗاۖ مَّأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ كُلَّمَا خَبَتۡ زِدۡنَٰهُمۡ سَعِيرٗا﴾[3] واتە: وە لە ڕۆژی دواییدا حەشریان دەکەین بەسەرڕوو دەم‌و چاویاندا کە کوێرو لاڵ‌و کەڕن

[1] الطور (١٣).

[2] مريم (٨٥ـ٨٦).

[3] الاسراء (٩٧).

شوێنی نیشتەجێیان دۆزەخە هەر جارێك دۆزەخ بڵێسەی بنیشێتەوەو دامركێتەوەجارێكی تر بڵێسەی ئاگرەكەیان بۆ زیاد دەكەین. لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا﴾ واتە: كاتێك ڕاپێچ دەكرێت بۆ ناو جەهەنەم هەر بە نزیكبوونەوەیان بە پەلە دەرگاكانیان بۆ دەكرێتەوە بۆ ئەوەی زوو سزا بدرێن پاشان گزیرەكانی جەهەنەم كە زۆر دڵڕەق و توندو تیژن بۆ زیاتر ناڕەحەت كردنیان بە شێوەیەكی خراپەو سەرزەنشتكردنیان پێیان دەڵێن: ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ ئایالەهاوڕەگەزی خۆتان پێغەمبەرتان بۆ نەهات واتە: لە هاوڕەگەزی خۆتان كە دەتانتوانی قسەیان لەگەڵ بكەن و ئەوەی بۆیان هێنان لێیان وەرگرن، ﴿يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ رَبِّكُمْ﴾ واتە:نیشانەكانی پەروەردگارتان بۆ نەخوێندنەوە لەسەر ڕاستی ئەوەی بانگیان دەكردن بۆی، ﴿وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا﴾ واتە: بتانترسێنن لە خراپی ئەم ڕۆژە، خوانەناسانیش دەڵێن: ﴿بَلَىٰ﴾ واتە: بەڵێ پێغەمبەران هاتن بۆ لامان ئاگاداریان كردین و بەڵگەی زۆریان نیشان داین، ﴿وَلَـٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ واتە: بڕوامان پێ نەكردوون و دژیان وەستاین بە هۆی ئەو گومڕایی و بەدبەختیەمانەوە هەقی خۆیەتی كە سزا بدرێین چونكە لە ڕێی ڕاست لاماندا بۆ ڕێی پڕوپوچ. وەك خوای مەزن باسیان دەكات لە چەند ئایەتێكی تردا كە دەفەرمووێت:

﴿كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ۝٨ قَالُواْ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ۝٩ وَقَالُواْ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] واتە: هەرچەند دەستەیەك فڕێ بدرێنە ناویەوە دەرگاوانەكانی دۆزەخ پرسیاریان لێ دەكەن ئایا پێغەمبەرێكی ترسێنەرتان بۆ نەهاتووە، ئەڵێن: بەڵێ بۆمان هاتووە بەڵام بە درۆمان دەزانی و دەمانوت (پێی) خوا هیچی نەناردووەتە خوارەوە ئێوە بەس لە گومڕاییەكی گەورەدان، وە وتیان ئەگەر قسەی (پێغەمبەران)مان ببیستایە یان تێبگەیشتینایە ئەمڕۆ لە هاوڕێیانی دۆزەخ نەدەبووین. واتە: ئەچنەوە بە خۆیانداو لۆمەی خۆیانیان دەكەن و پەشیمانی دەردەبڕن، ﴿فَٱعْتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[2] واتە: ئیتر پێیان نا لە گوناهەكەیان كەوابوو دووری لە میهرەبانی خوا بۆ هاوڕێیانی دۆزەخ. واتە: هەر لە ئارادا نەمێنێت ئەی هاوەڵانی ئاگر. خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ

---

[1] الملك (٨ـ١٠).

[2] الملك (١١).

فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ واتە: دەڵێن: لە دەرگای جەهەنەم بچنە ژوورێو تاهەتایە هەر لەوێدا بن، جێگەی ئەوانەی بەفیزن، چەند خراپە. ﴿ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ واتە: هەر کەسێك چاوی پێیان کەوتبێتو شارەزای حاڵیان بووبێت شایەتی دەدات کە جێی خۆیەتی سزا بدرێن. بۆیە ئەم قسەیە نەدراوەتە پاڵ کەسێکی تایبەت. چونکە هەموو بوونەوەر شایەتە لەسەریان کە هەقی خۆیەتی ئاوایان بەسەربێت لەسەر ئەو بڕیارەی کە خودای دادپەروەر داویەتی بەسەریاندا. چونکە زۆر زانایە بەو کارانەی کە کردوویانە. بۆیە خوای بالادەست فەرموویەتی: ﴿ قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ واتە: دەمێننەوە تێیداو هەرگیز لێی دەرناچنو لەناو ناچن لەناو جەهەنەمدا ﴿فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ واتە: چ پاشەڕۆژو شوێنێکی خراپە تێی کەوتوون بە هۆی فیزلێتان لە دنیاداو دوورەپەرێزیتان لە شوێنکەوتنی حەق. ئەوەبوو ئاوای لێ کردن کە تووشی ئەم چارەڕەشیە بن، کە چەندە ژیانێکی خراپو پاشەڕۆژێکی سەختە.

﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾

**خاوەن باوەڕان بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە هەر لە پەروەردگاریان ترسیان بووە، دەستەدەستە بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێنو دەرگایان بۆ دەکرێتەوەو کاریەدەستانی بەهەشت پێیان دەڵێن: درووود لە ئێوە، بەخێرهاتن، بچنە ژوورێو هەتاهەتایە لەوێ بن. ئەمە باسی ژیانی موسڵمانە بەختەوەرەکانە کە کاتێك بەڕێزەوە دەستەدەستە بەڕێ دەکرێن بەرەو بەهەشت. واتە: کۆمەڵ دوای کۆمەڵ. لە پێشەوە نزیکەکان لە خوداوە، دوای ئەوان ئاکار چاکان، پاشان ئەوانەی دوای ئەوانو کۆمەڵێکی دوای ئەمانیش. هەموو دەستەیەك لەگەڵ ئەوانەی کە لە یەکەوە نزیکن. پێغەمبەران لەگەڵ یەكو ڕاستگۆیان لەگەڵ هاوشێوەی خۆیانو شەهیدان لەگەڵ هاوەڵەکانیانداو زانایانیش لەگەڵ زانایاندا. هەر کەسەو لەگەڵ دەستەی خۆیو بە پێی نزیکیان لە یەکتری. ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە لە خودا ترساون بەڕێ دەکرێن بەرەو بەهەشت کاتێك گەیشتنە دەرگای بەهەشت دوای تێپەڕبوونیان لەو

ڕێگەیە (پردی سیرات) وەستێنراونو بەندکراون لەسەر پردێك لە نێوان بەهەشتو جەهەنەمداو ئەو هەقانەی کە هەیانبووە بەسەر یەکتریەوە لە دنیاداجێبەجێ دەکرێت هەتا کاتێك پاكو خاوێن بوونەوە ڕێیان پێدەدرێت بچنە ناو بەهەشت. لە فەرموودەی (الصور)دا هاتووە: کاتێك خاوەنباوەڕان گەیشتنە بەر دەرگای بەهەشت لەناو خۆیاندا پرس بە یەکتری دەکەن لە کێ داوا بکەن کە مۆڵەتیان بۆ وەرگرێت کە بچنە ناو بەهەشت. دەچن بۆ لای پێغەمبەران: لە پێشەوە بۆ لای ئادەمو پاشان بۆ لای نوحو دوایی بۆ لای ئیبراهیمو موساو عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوایان لێ بێت) هەتا دەگەنە موحەممەد (ﷺ) وەك چۆن لە ڕۆژی حەشردا لە کاتی داواکردنیان بۆ لاڵانەوە بۆیان لە لای خودای دلۆڤان کە بێتو دادگاییان بکرێتو خوای گەورە بڕیاری خۆی بدات بۆیان لێپرسینەوە دەست پێدەکاتو هەر کەسە هەقی خۆی وەردەگرێتو ڕێزی پێغەمبەر(ﷺ) دەردەکەوێت بۆ گشت مرۆڤ لە هەموو شوێنێکدا کە بووە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من یەکەم تکاکەرم لە بەهەشتدا).[1] واتە: بۆ چوونە ناو بەهەشت. وە لە وتەیەکدا لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وە من یەکەم کەسم کە لە دەرگای بەهەشت دەدات).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەتدا دێمە بەر دەرگای بەهەشت داوای کردنەوەی دەکەم، (دەرگاوانی) بەهەشت دەڵێت: تۆ کێی؟ منیش دەڵێم: موحەممەدم. دەفەرموێت: ئەویش دەڵێت: تەنها فەرمانم پێدراوە بۆ تۆی بکەمەوە، بۆ هیچ کەسی تری نەکەمەوە پێش تۆ).[3] موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یەکەم دەستەیەك دەچنە ناو بەهەشت وێنەیان وەك وێنەی مانگی چواردە وایە لە بەهەشتدا نە تفیان هەیەو نە چڵمیان هەیە نە پیسی تیا دەکەن دەفرو شانەکانیان لە زێڕو زیوەو ناو ئاگردانەکانیان داری بۆن خۆشەو ئارەقیان میسکە، هەرکێ لەوانە دوو ژنی هەیە کە مۆخی ناو لاقیان لە ژێر گۆشتەوە دەبینرێت لە جوانیدا، ناکۆکیو کینە لە نێوانیاندا نیە. دڵەکانیان لەسەر یەك دڵ دانراوە هەر بە پاکیو بێ عەیبی خوادا هەڵدەڵێنو تەسبیحاتی خودا دەکەن بەیانیانو ئێواران).[5] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[1] حافیز ئەبو یەعلا ڕیوایەتی کردووە لە

---

[1] مسلم (١/١٨٨).

[2] مسلم (١/١٨٨).

[3] أحمد (٣/١٣٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (١/١٨٨).

[5] أحمد (٢/٣١٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (یەکەم کۆمەڵێك دەچنە بەهەشت لە وێنەی مانگی چواردە دان، ئەوانەی دوای ئەوان دێن وەك ڕووناکی بەهێزترین ئەستێرە کە تروسکەی بێت لەناو ئاسماندا. میز ناکەن پیسی ناکەنو تف ناکەنەوەو چڵم فڕێ نادەن، شانەکانیان زێڕە،ئارەقیان میسکە، ناو ئاگردانەکانیان داری بۆن خۆشە، ژنەکانیان کیژی سپی چاوگەورەن. ڕەوشتیان لەسەر ڕەوشتی یەك کەسە، لەسەر وێنەی باوکەئادەمیانن (سەلامی خوای لیٚ بێت) کە شەست باڵە لە ئاسماندا).[1] موسلیمو بوخاریش ڕیوایەتیان کردووە[2]. لەئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لیٚ بێت) ئەویش لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمووی: (دەستەیەك لە ئوممەتی من دەچنە بەهەشت کە حەفتا هەزار کەسن ڕوویان دەدرەوشێتەوە وەك ڕووناکی مانگی چواردە)، عوکاشەی کوڕی میحسەن هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعام بۆ بکە لای خودا کە من یەکێك بم لەئەو کەسانە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودایە بە یەکێك لەوانەی دابنێ) پاشان پیاوێك لە ئەنساریەکان هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوعام بۆمنیش بکە لای خودا کە من یەکێك بم لەو کەسانە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (عوکاشە پێشت کەوت بەوە)[4]. موسلیمو بوخاری ڕیوایەتیان کردووە.[5] دیسان بوخاریو موسلیم ئەم فەرموودەیان ڕیوایەت کردووە (کە حەفتا هەزار کەس دەچنە بەهەشت بەبیٚ حیساب) لە ئیبنو عەباسو جابیری کوڕی عەبدوڵلاو عیمرانی کوڕی حوصەین و ئیبنو مەسعودو ڕیفاعەی کوڕی عەرابەی جوهەنی و ئومو قەیسی کچی میحصەنە وە هەر لە بوخاریو موسلیمەوە (ڕەزای خوایان لیٚ بێت) لە ئەبو حازمەوە لە سەحلی کوڕی سەعدەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان لە ئوممەتی من حەفتا هەزار (یان حەوت سەد هەزارکەس) دەچنە بەهەشت یەکتریان گرتووە[6]، هەتا ئەوەڵو ئاخیر کەسیان دەچێتە بەهەشت. ڕوویان لە وێنەی مانگی چواردە دایە).[7] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ وەڵامەکەی لێرەدا باس نەکردووە. وادادەنرێت کاتێك کە بەرەو بەهەشت بەڕیٚ دەکرێن. ئەو شتانەش وەك کردنەوەی دەرگا بۆیان

---

[1] فتح الباري (٦/٣٦٧)، مسلم (٤/٢١٨٠).

[2] مسند أبي يعلى (١٠/٤٧٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٤/٤١٧)، مسلم (٤/٢١٧٩).

[4] واتە: بەو دوعایە. یان بەو داوایە

[5] فتح الباري (١١/٤١٣)، مسلم (١/١٩٧).

[6] واتە دەستیان بە یەکەوەیە

[7] فتح الباري (١١/٤١٣)، مسلم (١/١٩٧).

ڕێزلێنانـەو کاربەدەسـتانی بەهەشـت دێـن بـۆ لایـانو مـژدەیان دەدەنـیو سوپاسو بـەخێرهاتنیان لێ دەکەن. نەك وەکو کاربەدەستانی جەهەنەم کە دەگەنە خوانەناسـان گوناهـەکانیان ئەدەنەوەبـەڕوودا و هەڕەشەیان لێ دەکەنو سەرزەنشتیان دەکەن. ئەو کەسانەی وا دەزانن کـە ئـەو (واوە) لـەم ئایەتـەدا: ﴿وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا﴾ واوی هەشتەو (واو الثمانية) دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کـە دەرگاکـانی بەهەشـت هەشت دەرگان، هەڵەیان کردووەو لایانداوەو نەیانپێکاوە، بەڵکو بۆ زانـینی هەشـت دەرگـای بەهەشـت سود لەو فەرموودانـە وەردەگیرێـت کـە دەڵـێن دەرگـای بەهەشـت هەشـت دەرگایـە. ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی: (هەر کەسێك جووتێك شت (هەرچێی ببێت، کەم یان زۆر) ببەخشێت لە ڕێی خودا لە هەموو قاپیـەکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێت، بەهەشت چەند دەرگای هەیە، هەر کەسێك لە ئەهلی نوێژ بێـت لـە دەرگـای نوێژەوە بانگ دەکرێت، هەر کەسێك لە ئەهلی سەدەقە بێت لە دەرگای سەدەقەوە بـانگ دەکرێـت، وە هەر کەسێك لە ئەهلی جیهاد بێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێت، وە هەر کەسێك لـە ئـەهلی ڕۆژو بێت لە دەرگای ڕەیانەوە بانگ دەکرێـت)، ئـەبو بـەکر (ڕەزای خـوای لێ بێـت) وتـی: ئـەی پێغەمبـەری خودا(ﷺ)کەسێك کە لە هەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێت هیچی لەسەرە؟ ئایا کـەس لـە هەموویانـەوە بانگ دەکرێت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ ئومێدم هەیە تـۆ لەوانـە بـی).[1] بوخـاریو موسـلیمیش بەم شێوەیە ڕیوایـەتیان کـردووە.[2] لـە سـەهلی کـوڕی سـەعدەوە ڕیوایـەتیان کـردووە کـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان لەناو بەهەشتدا هەشت دەرگا هەیە دەرگایەکیان ناودەبرێت بە ڕەییـان ڕۆژووەوانان نەبێت کەس لەوێوە ناچێتە ناوی).[3] وە لە سەحیحی موسلیمدا هـاتووە لـە عومـەری کـوڕی خەتتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هیچ کەسێك لە ئێوە نیـە کە دەستنوێژێکی ڕێك یـان دەسـتنوێژێکی تەواوچـاك بگرێـت پاشـان بڵـێ: أشـهد أن لا إلـه إلاّ الله وأن محمداً عبده ورسوله، مەگین دەرگاکانی بەهەشت کە هەشت دەرگان هەموویانی بۆ کراوەتەوە لـە هـەر کامیانەوە ئارەزوو بکات دەچێتە ژوورەوە)[4].

---

[1] أحمد (٢/٢٦٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٤/١٣٣)، مسلم (٢/٧١١).

[3] فتح الباري (٦/٣٧٨)، مسلم (٢/٨٠٨).

[4] مسلم (٢٠٩).

**باسی فراوانی دەرگاکانی بەهەشت (داواکارین لە خوای گەورە بە دلۆڤانی خۆی بمانخاتە ئەو بەهەشتە)**

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە فەرموودەی (الشفاعة)دا کە فەرموودەیەکی درێژە: (خوای مەزن دەفەرموویێت: ئەی موحەممەد (ﷺ)! ئەو کەسانەی کە حیسابیان لەسەر نیە لە ئوممەتەکەت ببە ژوورەوە لە دەرگای لای ڕاستەوە، کەئەوانە شەریکی خەڵکیشن لە دەرگاکانی تردا، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بە دەستە. نێوان ئەملاولای بەهەشت (نێوان ئەملاولای دەرگای) بە ئەندازەی نێوان مەککەو هەجەرە یان هەجەرو مەککە) وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە: (نێوان مەککەو بوسرایە).[١] وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عوتبەی کوڕی غەزوانەوە کە وتارێکی بۆ دان لە وتارەکەدا وتی: بۆمان باسکراوە کە نێوان ئەم لاو لایەکی بەهەشت لە چەندین ئەملاولای، بە ئەندازەی ڕۆیشتنی چل ساڵە، وە ڕۆژێکی وای بەسەردا دێت کە لێوانە لە قەرەباڵغیدا.[٢] خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ﴾ واتە: کردارو گفتارو هەوڵو تێکۆشانتان لێ پیرۆز بێتو پاداشتیشتان هەر پیرۆز بێت، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا لە هەندێ لە غەزاکاندا لە نێوان موسڵماناندا بانگ بکرێت: (کەس ناچێتەبەهەشت خەڵکی موسڵمان نەبێت)و لە ڕیوایەتێکی تردا: (خاوەن باوەڕنەبێت).[٣] ﴿فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ﴾ واتە: تاهەتایە تێیدا دەمێنەوەو لێی دەرناچن، ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ﴾ واتە: دەڵێن: شوکرانە بۆ خوا، کە بەڵێنی بە ئێمەدا، وە ڕاست گەڕاو ئەو زەمینەی دا بە ئێمەو لەلەو بەهەشتەدا، کوێ ئارەزوو بکەین لێی دەبین، ئەو پاداشتەی دراوە بە خەباتکاران چەندە باشە. ﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ﴾ واتە: کاتێك خاوەن باوەڕان ئەو هەموو پاداشتە زۆرو بەخششە گەورەو بەهەشتە هەتاهەتاییەو سامانە هێندە زۆرە دەبینن دەڵێن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ﴾ واتە: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەو بەڵێنەی بە ئێمەی دا بە ڕاست دەرچوو لەسەر زمانی پێغەمبەرە بەڕێزەکانەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) کە لە دنیادا فەرموویان: ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ

---

[١] فتح الباري (٨/٢٤٧)، مسلم (١/١٨٤).

[٢] مسلم (٤/٢٢٧٨).

[٣] فتح الباري (١١/٣٨٥).

ٱلْقِيَٰمَةِۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ﴾[1] واتـە: ئـەی پـەروەردگارمان پێمـان ببەخـشە (لـە پـاش مـردن) ئـەوەی بەڵێنت پێ داین لەسەر زوبانی پێغەمبەرەکانت‌و ریسوامان مەکـە لـە رۆژی دواییـدا بێگومـان تـۆ بـەڵێن ناشـــــکێنیت. ﴿وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ﴾[2] واتە: وە دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنموونی کردین بـۆ ئـەم ڕێگایـە کـە ئێمـە هـەرگیز ڕێبازی ڕاست شارەزا نەدەبووین ئەگەر خودا ڕێنموونی نەکردینایە سوێند بە خـوا بێگومـان نێردراوەکـانی پـــەروەردگارمان ڕاســتیان هێنــا. ﴿وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِىٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾[3] واتــە: وە ئـــەوان دەڵـــێن هەموو سوپاس بۆ ئەو خوایە کـە خەفـەتی لا بردین‌و نەیهێشت، بـە ڕاسـتی پـەروەردگارمان لێبوردەی شایستەی سوپاسە، ئەو (خوایە) کە بە چاکەو بـەهرەی خـۆی نیشتەجێی کـردین لـە مـاڵی هەمیـشەییدا (بەهەشتدا) لەوێدا نە هیچ ماندووبوونێکمان تووش دەبێـت‌و نـە هـیچ زەحمـەتێکمان دووچـار دەبێت. وە دەفـــەرمووێت: ﴿وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ﴾ ئەبولعالیــەو ئـــەبو صالح‌و قەتادەو سودی‌و ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ﴾ واتە: زەمینی بەهەشت.[4] ئـەم ئایەتـە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾[5] واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە نووسیومانە لـە زەبوردا لـە دوانوسـینی لـە (لوح المحفوظ)دا بە ڕاستی سەر زەوی (بەهەشت) بەندە چاك‌و پاکەکانم دەبنە میراتگری. بۆیە وتوویانـە: ﴿نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ﴾لە هەر کوێ ئارەزوو بکەین لێی دەبین چاکترین پاداشت ئەو پاداشـتەیە کە پێمان دراوە لەسەر کردارەکانمان. لە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە ئەنەسـەوە (ڕەزای خـوای لێ بێت) لە بەسەرهاتی (المعراج)دا کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بردمیانە ناوبەهەشت کە گومـەزی مـرواری تیابوو‌خۆڵەکەشی میسك بوو[6].

---

[1] ال عمران (١٩٤).
[2] الاعراف (٤٣).
[3] الفاطر (٣٤_٣٥).
[4] القرطبي (٢٨٧/١٥).
[5] الانبياء (١٠٥).
[6] فتح الباري (٥٤٧/١)، مسلم (١٤٨/١).

﴿وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۚ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٧٥)﴾

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۚ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: فریشتەکانیش دەبینن، لە دەوری تـەخت خول دەخۆنو پەسەندیو پاکی پەروەردگاری خۆیان دەدەن، هـەر چۆن ڕاستە، وا بـەناویان ڕاگەیشتوونو دەڵێن: سوپاس بۆ پـەروەردگاری گشت جیهـان. کاتێك خـوای گـەورە باسـی بڕیـاری خـۆی کـرد بـۆ خـەڵکی بەهەشتو جەهەنەمو جیای کردنەوە هەرکەسە شیاوی کامیـان بـوو بـۆی ڕەوانـەکرا، هـەر ئـەو خـودا دادپەروەرە لە بڕیارەکانیداو ناهـەقی بە هیچ کەسێك ناکات. پاشـان باسـی فریـشتەکان دەکـات کـە دەوری تەختی پیرۆزیان داوەو پەسەنیو پاکی پەروەردگاریان دەدەنو بە پاکیو بێعەیبیو گەورەییو مەزنی خودا هەڵدەدەن کە دوورە لە ستەمەوەو ناهەقی بە کەس ناکات. کارەکانی بـۆ تـەواو کـردوونو فەرمانیان بۆ دەرکراوەو لێبووەتەوە بە ڕێکی بۆیە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ﴾ واتە: خوابڕیاری بەڕاستی داوە لەنێوانیاندا، پاشـان فەرموویەتی: ﴿وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتـە: گشت بوونەوەر بە زمانـدارو بـێ زمانـەوە دەڵێن: سـوپاس بـۆ خـوای مـەزن بـۆ ئـەو بڕیـارەیو بۆئـەو دادپەروەریەی، بۆیە لێرەدا قورئان ئەم قسەی نەداوەتـە پـاڵ کەسـێك بـەڵکو بـەڕەهایی فەرموویـەتی. ئەمەیش نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو دروستکراوەکان شایەتی دەدەن لەسەر دەسـەڵاتی خـوداو سوپاسی دەکەن. قەتادە دەڵێت: دروستکراوەکان بە سوپاسی خودا دەستیان پێکردووە وەك خـوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾[1]. وە لێرەشدا کۆتاییـان هێناوە بە سوپاس کردنی خودا، وەك دەفەرمووێت: ﴿وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[2].

[1] الانعام (١).

[2] الطبري (٢١/٣٤٤).

## تەفسیری سورەتی (الغافر)، (المؤمن)

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

### ڕێزوگەورەیی حامیمەکان

ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بێگومان هەموو شتێك ناوکرۆکێکی هەیە ناوکرۆکی قورئانیش بنەماڵەی حامیمەکانە (آل حم) یان وتی: (حامیمەکانە).[1] میسعەری کوڕی کیدام دەڵێت: بە حامیمەکان دەوترێت: بوکەکان.[2] ئەمانە هەموو لە پێشەوای زاناو دیار ئەبو عوبەید قاسمی کوڕی سەلام (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ڕیوایەت کراوە لە کتێبی (فضائل القرآن)دا.[3] وە حومەیدی کوڕی زەنجەویهی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: نموونەی قورئان وەك نموونەی پیاوێکە کە زۆر دەگەڕێت تاجێگەیەك بدۆزێتەوەبۆ کەسوکارو ماڵو منداڵی، تێپەڕی بەسەر شوێنێکدا بارانێ باشی لێ باریبوو لەو کاتەدا کە دەچوو بە ناویدا شوێنەکەسەرنجی زۆر ڕاکێشا. لە ناکاو چووە چەند باغێك کە زەمینەکەی زۆر نەرمو لماوی بوو. وتی: من لە بارانی یەکەم سەرسام بووم کەچی ئەمە زیاتر جێی سەرسوڕمانە. پێی وترا: بێگومان نموونەی بارانی یەکەم نموونەی گەورەیی قورئانە. نموونەی ئەو باغە لماویەش وەك ئالی حامیمەکانە لە قورئاندا. بەغەوی هێناویەتی.[4] ئیبنو مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: کاتێك کە ئەچمە سەر ئالی حامیمەکان (آل حم) وا دەزانم کە چوومەتە ناو چەند باخچەیەك کە زۆر بەکەیفم لەناویاندا[5].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾﴾

لە پێشەوە قسە لەسەر ئەم پیتانە کراوە لە ئەوەڵی سورەتی (البقرة)دا کە جارێکی تر لێرەدا پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات، لەم فەرموودەی کە ئەبو داودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە هاتووە لەو کەسانەی کە لە پێغەمبەریان (ﷺ) بیستووە فەرموویەتی: (ئەگەر ئەمشەو درا بەسەرتاندا

---

[1] الدر المنثور (٧/٢٦٨).

[2] القرطبي (١٥/٢٨٨).

[3] فضائل القران (١٣٧/١٣٨).

[4] البغوي (٤/٩٠).

[5] البغوي (٤/٩٠).

بلێن:(حم ،لاینصرون))[1]. واتە:حامیم، زاڵ ناکرێن بەسەرتاندا. ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی ڕاستە.
خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەم کتێبە لە لایەن خوای خاوەن دەسەڵاتی داناوە نێردراوە. واتە: ناردنی ئەم کتێبە کە قورئانە لە لایەن خوای خاوەن دەسەلاتو زاناوەیە، کە ئاگاداری گشت شتێکەو گەردیلەی لێ ون نابێت لە تاریکاییدا، ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتە: کە لە گوناهەکان دەبوورێتو پەشیمانی قەبوڵ دەکاتو لە جەزرەبەدا توندوتیژە، چاکە هەر بە دەستی خۆیەتیو جگە لە خۆی هیچ شت بۆ پەرستن نابێتو هەموو شت دێتەوە لای ئەو. ﴿غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ﴾ واتە: لەو گوناهانەی لە پێشینە کراون دەبورێتو پەشیمانیش قەبوڵ دەکات لەمەولا بۆ هەر کەسێك بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ لایو گەردنی کۆچ بکات بۆی، ﴿شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ﴾ تۆڵەی زۆر توندوتیژە بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی دەکەنو یاخی دەبنو ڕێزی ژیانی دنیا دەدەن بەسەر قیامەتداو لە فەرمانی خودا لادەدەنو ناهەقیکارن، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ﴾[2] واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە بە ڕاستی هەر من میهرەبانم ، وە بێگومان هەر سزای منە سزای سەخت. خوای مەزن ئەم دوو سیفەتە دێنێت لە زۆر شوێندا لە قورئانی پیرۆزدت بۆ ئەوەی عەبدەکانی هەمیشە لە نێوان ترسو هیوادا بژین وە دەفەرمووێت: ﴿ذِي ٱلطَّوۡلِ﴾ ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: واتە: خاوەنی چاکەیەو دەوڵەمەندە.[3] واتە: چاکەی زۆرە بەسەر بەندەکانیەوە کە لە ژمارە نایەتو ناتوانن شوکرانەبژێری تەنها چاکەیەکی خودا بن وەك دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ﴾[4] واتە: خۆ ئەگەر بەهرەو نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان ناژمێردرێن. وە دەفەرمووێت: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ غەیری خۆی هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێت، لە هەموو سیفەتەکانیدا بێ وێنەیەو هەر ئەو پەروەردگاری بەندەکانیەتی، ﴿إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتە: هەموو شت دێتەوە بۆ لای ئەو پاداشتی هەموو کەسێك

[1] ابو داود (٣/٧٤)، تحفة الأحوذي (٥/٣٢٩)، سەنەدەکانی سەحیحە.
[2] الحجر (٤٩ـ٥٠).
[3] الطبري (٢١/٣٥١).
[4] ابراهيم (٣٤).

دەداتەوە بە پێی کردەوەی‌و دوای ناخات وەك دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾[1] واتە: وە ئەو (خوا) لێپرسینەوەی خێرایە.

﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي ٱلْبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُواْ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾﴾

**لە ڕەوشتە خراپەکانی خوانەناسان دەمەدەمێکردنیانە دەربارەی سیفەتەکانی خوا، ئاکامی ئەو دەمەدەمێ‌و لاساریەیان ڕوون دەکاتەوە**

خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي ٱلْبِلَٰدِ﴾ واتـە: غـەیری خوانەناسـەکان، هـیچ کەسـێك لەسـەر نیشانەکانی خـودا کێشە ناکـات، گـوێڕ خولیـان بەولاتاندا، نەکا تۆ هەڵخەڵەتێنن. ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، خوای مەزن دەفەرموێت : خوانەناسـان نـەبێت کـەس کێشەو ململانـێ ناکـات لەسـەر نیـشانەکانی خـودا دوای ڕوونکردنـەوەو بەڵگەهێنانەوە، ﴿فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي ٱلْبِلَٰدِ﴾ واتە: هاتوچۆو گەڕانیان بـە ولاتانـدا بـە شـوێن سامان‌و خۆشی دنیادا وا نەکات لە تۆ کارت تێ بکات‌و لە خشتەت بەرن وەك خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾[2] واتـە: لـە خـشتەت نـەبات‌و فریـوت نـەدات هاتوچـۆی ئەوانـەی بێبـاوەڕن (بـە خۆشـی‌و ئاسودەییەوە) لە ولاتدا، (ئەو ئاسودەییەی ئەوان) خۆشیەکی کەمە پاشان جێ‌و شوێنیان دۆزەخـە، ئـای چ شـوێنێکی بـەدە! وە فەرموویـەتی: ﴿نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾[3] واتـە: کەمێك ناز‌و نیعمـەتیان پـێ دەدەیـن (لـە دنیـادا) لـە پاشان ناچاریان دەکـەین کـە بڕۆنـە نـاو سزای سەختەوە. پاشان خوای دڵۆڤان دڵخۆشی پێغەمبـەر(ﷺ) دەداتـەوە کاتێـك کـە بێبـاوەڕان بـڕوای پـێ ناکەن لە هۆزی قورەیش. کە پێغەمبەرە پێشینەکان (سەلامی خوایـان لێ بێـت) نموونـەی باشـن بـۆت، چونکە ئەوانیش گەلەکانیان باوەڕیان پـێ نـەکردن‌و دژیـان وەسـتان چـەند کەسـێکی کـەمیان نـەبێت. دەفــەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُۖ

---

[1] الرعد (٤١).

[2] ال عمران (١٩٦-١٩٧).

[3] لقمان (٢٤).

وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ﴾ واتە: هۆزی نوحیش پێش ئەمانەش چەند کۆمەڵیش دوای ئەوان، بڕوایان بە خوا نەهێنا، هەر کۆمەڵێك پەلاماری پێغەمبەرەکەی خۆی داوە تا بیگرن‌و ئازاری بدەن، بە قسەی هیچیش ویستوویانە جێ بۆ ڕاستی نەهێڵنەوە. ئیتر بە غەزەب گرتوومن. دەسا سزای من چۆن بوو. ﴿كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ﴾ واتە: گەلی نوحیش بڕوایان بە خوا نەهێنا پێش ئەمانە. نوح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) یەکەم پێغەمبەر بووە کە خوا ڕەوانەی کردووە، داوای کردووە لە هۆزەکەی واز بێنن لە بتپەرستی، ﴿وَٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ﴾ واتە: کۆمەڵەکانی تریش دوای ئەوان لە هەموو گەلەکان، ﴿وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۭ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ﴾ واتە: هەموو گەلێك هەوڵی داوە کە پێغەمبەرەکەی خۆی بکوژێت‌و لەناو بەرێت بە هەر شێوەیەك بۆی بلوێ، وە هەندێکیان پێغەمبەرەکەی خۆیان کوشتووە، ﴿وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ﴾ واتە: بە قسەی پڕوپوچ ویستوویانە ببنە لەمپەر لە جێی ڕاستیەك کە لە خۆر ئاشکراتر بووە. ﴿فَأَخَذۡتُهُمۡۖ﴾ واتە: لەناوم داون‌و قڕم کردوون بە هۆی ئەو تاوانە گەورەو خراپانەی کە کردوویانە ﴿فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ﴾ واتە: ئایا دەزانی کە جەزرەبەی من چۆن بووە بۆیان‌و چیم بەسەر هێناون. بێگومان تۆڵەیەکی زۆر توندوتیژو بە ژان‌و گورچك بڕم لێ سەندوون. قەتادە دەڵێت: سوێند بە خوا زۆر توندوتیژ بووە.[1] پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ واتە: بەڵێنی پەروەردگاری تۆ لەسەر هەموو ئەوانەی خوانەناس بوون، وا هاتەجێ کە ئەوان جەهەنەمین. واتە: وەك چۆن بەڵێنی خوای تۆ هاتەدی، کە سزای ئەو خوانەناسانەی دا کە گەلە پێشووەکان هەر بەو جۆرەش بەڵێنی خوداباشتروچاکتر دێتەدی بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوا بە تۆ ناکەن و دژت ئەوەستن ئەی موحەممەد (ﷺ)! چونکە ئەوەی بڕوا بە تۆ نەکات‌ویی تێناچێت کە بڕوا بە غەیری تۆبهێنێت (والله أعلم).

﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمۡتَهُۥۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٩﴾﴾

---

[1] الطبري (٢١/٣٥٣).

## هەڵگرانی (عەرش) سوپاسی خوا دەکەن و داوای لێبوردن بۆ خاوەن باوەڕان دەکەن

خـــوای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: ئەو کەسانەی تەختی خوایان هەڵگرتووەو ئەوانەی بە دەوری ئەودان، بە سوپاسی پەروەردگاریان خەریکن و بڕوایان هەر بەو هەیەو داوای لێبوردن بۆ خاوەنباوەڕان دەکەن: ئەی پەروەردگاری هەمووان! دیارە بەزەیی و زانینت هەموو شتی داگرتووە، ئەوانەی دەگەڕێنەوەو پەیڕەوی ڕێگەی تۆ دەبن لە گوناهەکانیان ببوورەو لە ئازاری بە ئاگریان بپارێزە. خوای مەزن باسی ئەو چوار فریشتە نزیکانەی خۆی دەکات کە عەرشیان هەڵگرتووەو ئەو فریشتە نزیکانەش بە دەوری تەختدان کە سوپاسی پەروەردگاریان دەکەن. واتە: تەسبیحات و حەمدوسەنا پێکەوە دەکەن یانی بەپاکی و بێ عەیبی خوای مەزندا هەڵدەدەن وباسی ئەوسیفەتانە ئەکەن کەدورە لە هەموو نوقسانیەك وە ستایشی دەکەن بەو سیفەتانەی کەهەموو وەسفێك هەڵدەگرێت، ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ﴾، پاشان دەفەرموێت: ﴿وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ﴾ واتە: گوێڕایەڵ و گەردنکەچن لەبەر دەستیدا، ﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ داوای لێبوردن دەکەن بۆ خەڵکی سەر زەمین ئەوانەی بڕوایان بە شتە نادیارەکان هەیە، خوای گەورە فریشتە نزیکەکانی وا دروست کردووە کە لە پاشملە داوای لێبوردن بکەن بۆ خاوەنباوەڕان. کاتێك ئەمە ڕەوشتی فریشتەکان بێت (سەلامی خوایان لێ بێت) بێگومان (ئامین)یش ئەکەن لەسەر ئەودوعایانەی خاوەن باوەڕان کردوویانە بۆ برا موسڵمانەکانیان. وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك موسڵمان دوعا بۆ برای موسڵمانی خۆی دەکات لە پاش ملە، فریشتە دەڵێن: (ئامین) بۆ تۆش هەیە بە ئەندازەی ئەوەی تۆ داوای دەکەی بۆ برا موسڵمانەکەت).[1] شەهری کوڕی حەوشەب دەڵێت: هەڵگرانی(العرش) هەشتن، چواریان دەڵێن: ئەی خودایە پاکی و بێ عەیبی و ستایش بۆ تۆ، سوپاس بۆ تۆ لەسەر خۆگریت پاش ئاگاداریت چوارەکەی تریان دەڵێن: ئەی خودایە پاکی و بێ عەیبی و ستایش بۆ تۆ، سوپاس بۆ تۆ لەسەر لێبوردنت دوای دەسەڵاتت، بۆیە کاتێك داوای لێبوردن دەکەن بۆ خاوەن باوەڕان، دەڵێن: ﴿وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا﴾ واتە: بەزەیت هەموو گوناهو تاوانەکانی داگرتووەو

[1] مسلم (٤/٢٠٩٤).

ئاگاداریشت هەیە بەسەر هەموو کردارو گفتارو جموجلێکیاندا، ﴿فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ﴾[1] واتە: ببوورە لەو تاوانبارانەی پەشیمان بوونەتەوەو گەڕاونەتەوەو وازیان هێناوە لەو کارە خراپانەی کە کردوویانەو هەڵساون بەو کارە چاکانەی تۆ فەرمانت پێ کردوون‌و وازیان هێناوە لە خراپەکاری، ﴿وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتە: لایان بدە لە ئاگری جەهەنەم کە جەزرەبەیەکی پڕ ئێش‌و ژانە، ﴿رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ واتە: ئەی پەروەردگاری هەمووما! بیشیان نێرە ناو باغاتی هەمیشەیی، کە خۆت بەڵێنت پێداون، ئەو کەسانەش لە باوان‌و خێزانەکانیان‌و بەرەو تۆرمەی ئەوانن و (ئاکاری چاکیان بووە لەگەڵ) ئەوان بن، هەر خۆت خاوەن دەسەڵات‌و کارزانی. ﴿رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ﴾ واتە: خودایە بیانخەیتە ناو باغاتێك کە هەمیشەیی بێت کە خۆت بەڵێنت پێداون‌و لەگەڵ کەسوکار وەك باوان‌و خێزان‌و نەوەکانیان کۆیان بکەرەوە هەتا چاوو دڵیان پێیان ڕۆشن بێتەوە لە شوێنێ نزیك لە یەکتری. وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٍ﴾[2] واتە: وە ئەوانەی بڕوایان هێناوەو نەوەکانیشیان دوایان کەوتوون بە باوەڕداریتی نەوەکانیان دەگەیەنین پێیان (لە پلەی بەهەشتدا) وە هیچ لە کردەوەی باوکەکانیان کەم ناکەینەوە. واتە: هەمووما وەك یەك لێکردن لە پلەدا بۆ ئەوەی چاویان بە یەکتری ڕوو بێتەوە. پلەی ئەوانە کە بەرزتر بووە کەممان نەکردووەتەوە تا بچنە ڕیزی پلە نزمەکان، بەڵکو پلەی ئەو کەسانەی کە کرداریان کەم بووە بەرزمان کردووەتەوە هەتا وەك یەك بن لەگەڵ پلە بەرزەکاندا بۆ ڕێزلێنان‌و منەتکردن بەسەریاندا. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: خاوەن باوەڕ کاتێك دەچێتە بەهەشت هەواڵی باب‌و کوڕو برای خۆی دەپرسێت کە لە کوێن؟ پێی دەڵێن: ئەوانە نەگەیشتوونەتە پلەی تۆ لە کرداردا، ئەمیش دەڵێت: من بۆ خۆم‌و ئەوانیش کارم کردووە،بۆیە دەیانگەیەنن بەو کەسە لەو پلەیەدا، پاشان سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾[3] موتەڕڕەفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شوخەیر دەڵێت: چاکترین ئامۆژگاریکەر لە

---

[1] البغوي (٤/٩٣).

[2] الطور (٢١).

[3] الطبري (٢١/٣٥٧).

عەبدەکانی خودا بۆ خاوەن باوەڕان، فریشتەکانن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُمْ﴾ وە خەیانەتکارترین بەندەکانی خودا بۆخاوەن باوەڕان شەیتانەکانن.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە ڕێی لێ ناگیرێتو کەس ناتوانێت بەرەو ڕووی بوەستێت هەرچی مەیلی لێ بێت دەیکاتو هەرچیش مەیلی لێ نەبێت ڕوونادات، لە کارزانی لە گفتارو کردارەکانیداو لە بڕیارو فەرمانەکانیدا، ﴿وَقِهِمُ السَّيِّـَٔاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ لە خراپەش بیانپارێزە، هەر کەسێك لە خراپە بپارێزرێت، لەو ڕۆژەدا بەر بەزەیی تۆ دەکەوێت، کە ئەمەش سەرکەوتنێکی زۆر مەزنە. ﴿وَقِهِمُ السَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە تووشی خراپە دەبن بیانپارێزە لێی، ﴿وَمَن تَقِ السَّيِّـَٔاتِ يَوْمَئِذٍ﴾ واتە: هەر کەسێك تۆ بیپارێزیت لە ڕۆژی قیامەتدا، ﴿فَقَدْ رَحِمْتَهُ﴾ واتە: بەزەییت پێیدا هاتووەتەوەو ڕزگارت کردووە لە تۆڵەو سزادان. ﴿وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ ئەوەش سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾﴾

**پەشیمانی دەربڕینی خوانەناسان پاش چوونە ناو ئاگر**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ﴾ واتە: هاوار لەو کەسانە دەکرێت کە خودایان نەناسیووە، بێگومان تووڕەیی خودا لەو ڕقەی خۆتان هەتانە، گەورەترە، چونکە ئێوە کاتێك کە بانگ دەکرێن باوەڕتان بە خودا هەبێت، کەچی ئێوە حاشا دەکەن. خوای گەورە باسی خوانەناسان دەکات، کاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو بڵێسەی ئاگردانو دەست دەکرێت بە جەزرەبەدانیانو هیچ

[1] القرطبي (١٥/٢٩٥).

کەسێك نایەت بە هاواریانەوەو نەفرین لـە خۆیان دەکەنو زۆر ڕقیان لـە خۆیانـە لەبـەر ئـەو کردەوە خراپانەی کە بوونە هۆی ئەوەی بچنە ناو ئاگر. ئا لـەو وەختـەدا فریشتەکان بانگیـان دەکـەنو پێیـان دەڵێن: بێگومان خودا لە خۆتان زیاتر لێتـان توڕەیـە. چونکە خـوای مـەزن کاتێك لـە دنیـادا داوای لێ دەکردن کە بڕوا بێنن ئێوە حاشاتان دەکردو دووردەکەوتنەوە ئەی ئەو کەسانەی کە ئێستا لە خۆتـان بێـزارنو خۆتـان تووشـی سـزا کـردووە. قـەتادە لـەم ئایەتـەدا: ﴿لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ﴾ دەڵێت: توڕەیی خودا بۆ خـەڵکی گومڕا کاتێك کە داوای بڕواهێنانی لێ کـردوون لـە دنیـاداو حاشـایان لێ کردو قـەبوڵیان نـەکردووە مـەزنترە لـە تـوڕەیی خۆیـان کاتێـك بـە چـاوی خۆیـان جەزرەبـەی خـودا دەبیـنن لـە ڕۆژی قیامەتـدا.[1] حەسـەنی بەسـریو موجاهیدو سودیو زوهری کوڕی کوڕی عەبدوڵلای هەمەدانی وعەبدوڕەحمانی کوڕی زەیـدی کـوڕی ئەسلەمو ئیبنـو جـەریری تەبـەریش هـەر وایـان وتـووە (ڕەحمـەتی خـوا لـە هـەموویان بێـت).[2] خـوای گـەورە دەفـــەرمووێت: ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا ٱثْنَتَيْنِ فَٱعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ﴾ دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! تۆ دوو جارئێمەت مراندو، دوو جاریش ژیانت بەبـەردا کـردووین، پـێ لـە گوناهی خۆ دەنێن، ئاخۆ دەرەتانێك هەیە؟ سەوری دەڵێت لە ئەبو ئیسحاقەوە لە ئەبو ئەحوەسەوە لە ئیبنو مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێن: ئەم ئایەتە: ﴿قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا الاثنتين﴾ وەك ئـەم ئایەتـە وایـە کـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[3] واتە: چۆن بێبـاوەڕ دەبن بـە خـودا!؟ لـە کاتێکدا کە ئێوە بێ گیان بوونو گیانی بەبەردا کـردن لـە پاشـان دەتانمرێنێت دوای ئـەوە زینـدووتان دەکاتەوە ئینجا بۆ لای خۆی دەگەڕێنرێنەوە.[4] ئیبنو عەباسو زەححاكو قـەتادەو ئـەبو مـالکیش هـەر وایان وتووە.[5] ئەمە قسەیەکی ڕاستەو هیچ گومانو دوو دڵی تیا نیە. مەبەست لەمانە هـەمووی ئەوەیـە کە خوانەناسان داوای گەڕانەوە دەکەن کاتێك لـە خزمـەت خـوای گـەورەدا دەوەسـتێنرێن لـە ساحەی مەحـشەردا لـە ڕۆژی قیامەتـدا. وەك خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟

---

[1] الطبري (٢١/٣٥٩).

[2] الطبري (٢١/٣٥٨/٣٥٩).

[3] البقرة (٢٨).

[4] الطبري (٢١/٣٦٠).

[5] الطبري (٢١/٣٦٠).

رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر دەبینی کاتێك (لە قیامەتدا) تاوانباران لە حوزووری پەروەردگاریاندا (لە خەجاڵەتیدا) سەریان داخستووە (دەڵێن) ئەی پەروەردگاری ئێمە (ئەوەی بەڵێنت پێ دابووین) دیمان‌و بیستمان دەی بمانگێڕەرەوە (بۆ دنیا تا) کردەوەی باش بکەین، بە ڕاستی ئێمە دڵنیاین (لە قیامەت). وەڵام نادرێنەوە. پاشان کاتێك بە چاوی خۆیان ئاگریان بینی لەسەر کەناری ئاگر وەستان‌و سەیری ئەو هەموو ئازارو جەزرەبە سەختەیان کرد داوای گەڕانەوە دەکەن زۆر زیاتر لەوەی کە لە پێشتر داوایان دەکرد بەلام وەلام نادرێنەوە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا۟ يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا۟ لَعَادُوا۟ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾[2] واتە: وە ئەگەر بیانبینیت کاتێك کە لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیاو بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانی وە لە بڕواداران دەبووین، (نەخێر بە ڕاستیان نیە) بەڵکو ئەوەی کە لەوەو پێش دەیانشاردەوە بۆیان دەرکەوتووەو ئەگەر بگەڕێنرێنەوە (بۆ دنیا) بێگومانئەگەڕێنەوە سەرهەمان شتی پێشویان وئەوانە خەڵکێکی درۆزنن.ئەم بێبڕوانە کاتێك کە چوونە ناو ئاگرو ئەو ئازارو نارەحەتیەی جەهەنەمیان چەشت‌و زنجیرەی ئاگرین کرایە دەست‌و قاچیان‌و زەبوون بوون لەناویدا ئا لەوێدا زیاترو زیاتر داوا دەکەن کە بگەڕێنەوە بۆ دنیا بۆ ئەوەی کاری چاکە بکەن، بۆیە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾[3] واتە: وە ئەوانە لە دۆزەخدا هاوار دەکەن (دەڵێن) ئەی پەروەردگارمان (لە دۆزەخ) دەرمان بێنە تا کردەوەی چاك بکەین جیاواز لەوەی دەمانکرد (وەڵام دەدرێنەوە) ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێت بیربکاتەوە تیایدا بیربکاتەوەو ترسێنەرتان بۆ نەهات دەی (سزا) بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێك بۆ (بێباوەڕە) ستەمکارەکان نیە. وە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ﴾[4] واتە: ئەی پەروەردگارمان لەم (دۆزەخە) دەرمان بێنە جا ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ بێباوەڕی) ئەوە بە ڕاستی ئێمە ستەمکارین، وە

---

[1] السجدة (١٢).

[2] الانعام (٢٧ـ٢٨).

[3] الفاطر (٣٧).

[4] المؤمنون (١٠٧ـ١٠٨).

(خوا) دەفەرموویێت: بەبێ نرخیو ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخداو قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن. لەم ئایەتەدا زۆر بە ڕێزەوە پرسیار دەکەنو بە پێشەکیەك دەست پێدەکەن پڕە لە دەربڕینی سۆزو خۆبەکەمزانین کە دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ واتە: تۆ زۆر مەزنو خاوەن دەسەڵاتی. وەختێك ئێمە مردووبووین زیندووت کردینەوە دوای ئەوە ئێمەت مراندو پاشانیش زیندووت کردینەوە. تۆ هەرچی مەیلت لێ بێت دەیکەی. وە ئێمە دان بە تاوانی خۆماندا دەنێین کە لە دنیادا ناهەقیمان لە خۆمان کردوە، ﴿رَبَّنَآ أَمَتَّنَا ٱثۡنَتَيۡنِ وَأَحۡيَيۡتَنَا ٱثۡنَتَيۡنِ﴾ واتە: ئا خۆ تۆ لێمان قەبوڵ دەکەی کە جارێکی تر بمانگێڕیتەوە بۆ ژیانی دنیا، بێگومان تۆ توانای ئەوەت هەیە، بۆ ئەوەی کارێك بکەین پێچەوانەی ئەوەی کردمان لە دنیادا. ئەگەر دەستمان دایەوە بە خراپەکاری جارێکی تر ئێمە تاوانبارو ستەمکارین. وەڵام دەدرێنەوە کە ڕێگا نیە جارێکی تر ئێوە بگەڕێنەوە بۆ دنیا، پاشان هۆی نەگەڕانەوەیان بۆ دنیا ڕوون دەکاتەوە کە ئێوە سروشتتان وایە ڕاستی قەبوڵ ناکەنو وەری ناگرن بەڵکو دژی هەق دەوەستنو بڕوای پێ ناکەن، بۆیە خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّهُۥٓ إِذَا دُعِيَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُۥ كَفَرۡتُمۡ وَإِن يُشۡرَكۡ بِهِۦ تُؤۡمِنُواْۚ فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ﴾ واتە: ئەمەتان بۆیە بەسەردێ، چونکە هەر کاتێك مەردم تەنیا خوایان دەپەرستو هیچی تر نا، حاشاتان دەکرد، بەڵام کاتێك شەریکیان بۆ ئەو دادەنا، ئێوە باوەڕتان دەهێنا، فەرمان تەنها بۆ خودای بەرزو مەزنە. واتە: ئێوە هەروا دەبن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ژیانی دنیاش. خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ﴾ واتە: هەر ئەو فەرمانڕەوایە لەسەر دروستکراوەکانی دادوەرێکی وایە کە ستەم لە هیچ کەس ناکات. بۆ هەر کەسێك مەیلی لێ بێت ڕێی نیشان دەداتو هەر کەسیش مەیلی لێ بێت گومڕای دەکات. بەزەیی دێتەوە بە کەسێکدا کە مەیلی لێ بێتو جەزرەبەی کەسێکیش دەدات کە مەیلی لێ بێت. هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو. وە دەفەرموویێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزۡقٗاۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ هەر ئەو نیشانانی خۆیتان بۆ دەنوێنێتو لەو هەوایە بژێوتان بۆ بەرێ دەکات. تەنها کەسێك لەو ئامۆژگاریە تێدەگات، کە ڕووی هەر بەرەو خودا بێت. واتە: خودا نیشانەکانی دەسەڵاتی خۆی بۆ ئێوە دەردەخات کە بە چاو دەیبینن لە ئاسمانەکانو زەمیندا کە ئەو نیشانە گەورانە هەموو بەڵگەن لەسەر تواناو دەسەڵاتی تەواوی دروستکەرو وەدیهێنەری کە خۆیەتی. ﴿وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ رِزۡقٗا﴾ واتە: بارانتان لە ئاسمانەوە بۆ دەبارێنێت بە هۆی ئەو بارانەوە کشتوکاڵو بەروبوومتان بۆ دەڕوێنن بە چاوی خۆتان دەیبینن کە هەر یەکە تامو بۆنو ڕەنگو شێوەیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە گشت بە یەك ئاو دەڕوێنن کەچی بە دەسەڵاتی خودای مەزن هەر

یەکەیان جیاوازترە لەوی تر. ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ﴾ واتە: کەسێك پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێت لەم شتانەو بە بەڵگە دەیهێنێتەوە لەسەر گەورەیی وەدیهێنەیان، ﴿إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ واتە: مەگین ڕووی دڵی بەرەو خودای مەزن بێت.

## فەرمان دان بە خاوەن باوەڕان هەر چۆن بووە تەنها عیبادەتی خودا بکەن

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ واتە: دەسا ئێوە بە دڵپاکی هەر هانا بۆ خودا بەرن و دینی پاکژتان بۆ ئەو بێت، جا با خوانەناسانیش پێی تورە بن. واتە: ئێوە تەنها بە دڵپاکی هەر عبادەت بۆ خودا بکەن و لێی بپارێنەوە بە ڕێگەی موشریکەکاندا مەچن و شوێن ڕچەی ئەوان مەکەون. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە کەعەبدوڵلای کوڕی زوبەیر دوای هەموو نوێژێك سەلامی دەدایەوە دەیوت: (لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له، ولا نعبد إلا إياه له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن، لا إله إلاّ الله مخلصين له الدين ولو كره الكافرون). دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوای هەموو نوێژێك بە دەنگی بەرز ئەمانەی فەرمووە.[1] موسلیم و ئەبو داودو نەسائیش بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە.[2] وە لە فەرموودەی سەحیحدا ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوای نوێژە فەرزەکان دەیفەرموو: (لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا حول ولا قوة إلاّ بالله، لا إله إلاّ الله، ولا نعبد إلا إياه له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن، لا إله إلاّ الله مخلصين له الدين ولو كره الكافرون).[3]

﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿١٦﴾ الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٧﴾﴾

## نێگای خودا بۆئەوەیە بەندەکانی لەو ڕۆژە بترسن کە توشیان دێت

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ﴾ واتە: پلەی بەرز هەرلە لای ئەوە، خاوەن تەختە، بە فریشتەی تایبەتیدا وەلامی خۆی بۆ هەر کەسێك لە عەبدانی خۆی حەز بکات، بەڕێ دەکات، تا لە ڕۆژێك (کە تووشیان دێت)

---

[1] احمد (٤/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٤١٦/١)، ابوداود (١٧٣/٢)، النسائي (٧٩/٧٨/٣).

[3] مسلم (٤١٥/١).

بیانترسێنێت. خوای گەورە باسی مەزنیو پایەبەرزی خۆیو بڵندی تەختەکەی دەکات کە بەرزترە بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا وەك بان (السقف)، بۆیە دەفەرموویێت: ﴿مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾[1] واتە: فریشتەو جوبرەئیل سەردەکەون بۆ لای خودا لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە. وە بەم زووانە خوا مەیلی لێ بێت باسی ئەو مەودایە دەکەین کە لە نێوان عەرش و زەمینی حەوتەمدایە لەسەر ڕاوبۆچوونی زانایانی پێشینەو پاشینە (السلف والخلف)، زۆرێك لە زانایان وتوویانە کە تەخت یاقوتێکی سوورە فراوانی نێوان تیرەکانی و ماوەی ڕۆیشتن (تێپەڕبوون) بەناویاندا پەنجا هەزار ساڵە. وە بەرزیەکەی لە زەمینی حەوتەمەوە ماوەی ڕۆیشتنی پەنجا هەزار ساڵە، خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرموویێت: ﴿يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ﴾[2] واتە: فریشتە دەنێرێتە خوارەوە بە وەحی بە فەرمانی خۆی بۆ هەر کەسێك لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێت بەوەی کە خەڵکی بترسێنن کە بە ڕاستی بێجگە لە من هیچ پەرستراوێکی تر نیە کەواتە هەر لە من بترسن. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾[3] واتە: وە بە ڕاستی ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە، بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی. بۆیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿لِيُنذِرَ يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە ﴿يَوْمَ ٱلتَّلَاقِ﴾ ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت خوای مەزن بەندەکانی لێ ترساندووە.[4] چونکە هەموو کەسێك تووشی کردەوەی خۆی دەبێت لەو ڕۆژەدا لە چاکەو لە خراپە. پاشان خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿يَوْمَ هُم بَـٰرِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ ئەو ڕۆژە کە هەموویان دێنەوە دەر هیچ شتێکیان لە خودا نهێنی نیە. لەو ڕۆژەدا فەرمانڕەوایی بۆ کێیە؟ هەر بۆ خوای تاکو تەنهایەکە بەسەر هەموو شتدا زاڵە. واتە: دەهێنرێنە دەرەوە، هەموو دەردەکەون هیچ شوێنێك نیە خۆیانی تیا بشارنەوەو خۆیانی تیا پەنا بدەن، بۆیە

---

[1] المعارج (٣ـ٤).

[2] النحل (٢).

[3] الشعراء (١٩٢ـ١٩٣).

[4] الطبري (٢١/٣٦٤).

خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ﴾ واتـە: هـەموو لـە لای خـودا یەکسانن‌و ئاگـای لێیانـە. وە دەفـەرموێت: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾ لـە پێـشەوە لـە فەرموودەکەی ئیبنو عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێت) باسمان کرد کە خوای گـەورە ئاسمانـەکان‌و زەمـین دەپێچێتەوە بە دەستی خۆی پاشان دەفەرموێت: من فەرمانڕەوام، من زاڵـم بەسـەر هـەموو شـتێکداو من خۆم بە مەزنتر دەزانم لە هەموو کەسێك فـەرمانڕەواکانی سـەر زەمـین لـە کوێن؟ ئەوانـەی بەسـەر خەڵکدا زاڵ بوون لە کوێن؟ ئەوانەی خۆیان بە زل دەزانی بەسەر خەڵکدا لە کوێن؟[1] وە لە فـەرموودەی کەڵەشاخدا هاتووە کاتێك خوای مەزن گیانی هەموو خەڵك دەکێشێت کەس نامێنێـت خـۆی نـەبێت کە تاك‌و تەنهایە‌و هاوەڵی نیە دەفەرموێت لەم ڕۆژدا فـەرمانڕەوایی بـۆ کێیـە؟ سـێ جـار، پاشـان وەڵامـی خۆی دەداتەوە‌و دەفەرموێت: ﴿لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾.[2] واتە: ئەو کەسەی کە هـەر خـۆی بەسـەر هـەموو شتدا زاڵـە‌و هەمووشـتێکی بەزاندووە. پاشـان خـوای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْۚ لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ لەم ڕۆژەدا هەر کەس هەرچی کردوویـەتی، سزای کاری خۆی دەبینێت، ئەم ڕۆژە هیچ غەدرێك نیە. خـودا بـە پەلـە بـە کاروبـاران دەگـات. خـوای مـەزن باسی دادپەروەری خۆی دەکات لە نێوان مەردمدا کە بە ئەندازەی بچووکترین گەردیلە ناهەقی بە کەس ناکرێت. لە چاکە‌و لە خراپە. بەڵکو پاداشتی چاکە بە دەقات دەدرێتەوە. پاداشتی خراپەش تـەنها بـە یەك خراپـە حیساب دەکرێت. بۆیـە خـوای مـەزن فەرموویـەتی: ﴿لَا ظُلْمَ ٱلْيَوْمَ﴾ وەك لـە سـەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەویش لە پێغەمبـەری خـوداوە (ﷺ) کـە لـە خـوای مەزنـەوە دەیگێڕێتـەوە کـە فەرموویـەتی: (ئـەی عەبدەکانم مـن ناهـەقیم لەسـەر خـۆم حـەرام کردووە‌و لـەناو ئێوەشـدا هـەر حـەرامم کـردووە ناهـەقی بـە یـەکتری مەکـەن (هـەتا گەیـشتە ئـەوەی فـەرمووی) ئـەی عەبـدەکانم. ئەوسا کردەوەکانتـان لەسـەر دەژمێـرم پاشـان هـەقی کردەوەکانتـان دەدەمێ، هەر کەسێك چاکەی بینی با سوپاسی خودای گەورە بکات، وە هەر کەسیش چاکەی نـەبینی با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات).[3] خوای مەزن دەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ﴾ واتـە: لـە هەموو خەڵك دەپرسێتەوە وەك چۆن لە تاکەکەسێك دەپرسێتەوە، وەك فەرموویەتی: ﴿مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا

---

[1] الطبري (٢١/٣٢٧).

[2] الطبراني في الطوال (٢٧٠)، لە پێشەوە پلەکەی دیاری کراوە.

[3] مسلم (٤/١٩٩٤).

بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ ﴾[1] واتە: دروستکردنی هەمووتان (لە سەرەتاوە)و زیندووکردنەوەتان وەك (دروستکردن‌و زیندووکردنەوەی)وەك هی تەنها کەسێك وایە. وە فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴾[2] واتە: وە فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاوترووکاندنێك (وایە لە خێراییدا).

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَاللَّهُ يَقْضِي بِالْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ واتە: تۆ لەو ڕۆژە بیانترسێنە کە لە ناکاو تووش دەبن، لەو دەمەی کە هەموو دڵێك لە قوڕگ نزیك دەبنەوەو هەموو هەر پێش دەخۆنەوە. ئەوانەی ناهەقیکارن نە هیچ دۆستیان دەست دەکەوێت. نە کەسێك کە تکای وەر بگیرێت. ﴿يَوْمَ الْآزِفَةِ﴾ ناوێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت. لەبەر نزیکی بەو ناوەوە ناو نراوە وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿أَزِفَتِ الْآزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴾[3] واتە: ڕۆژی دوایی زۆر نزیك بووەتەوە، بێجگە لە خوای گەورە کەس نیە ئاشکرای بکات. وە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾[4] واتە:ڕۆژی دوایی نزیك بووەوەو مانگ لەت بوو. وە دەفەرمووێت: ﴿اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ ﴾[5] واتە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بووەتەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿أَتَىٰ أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ﴾[6] واتە: ئەوا فەرمانی خوا (بە سزادانیان) هات بۆیە پەلە مەکەن (لە هاتنی). وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيئَتْ وُجُوهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾[7] واتە:کاتێك بێباوەڕان ئەو سزایەیان بەدی کرد لە نزیك خۆیانەوە، ڕووخساری ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون

---

[1] لقمان (٢٨).

[2] القمر (٥٠).

[3] النجم (٥٧ـ٥٨).

[4] القمر (١).

[5] الانبياء (١).

[6] النحل (١).

[7] الملك (٢٧).

تاڵ دەبێت. پاشان دەفەرموویت: ﴿إِذِ ٱلْقُلُوبُ لَدَى ٱلْحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَ﴾ واتە: قەتادە دەڵێت: کە دڵ لە قوڕگدا وەستا لە ترساندا نە ئەوەیە بێتە دەرەوە نە ئەوەشە بگەڕێتەوە شوێنی خۆی.[1] عیکریمەو سودیو کەسانی تریش هەر وایان وتووە. ﴿كَٰظِمِينَ﴾ واتە: بێدەنگن کەس ناتوانێت قسە بکات بە ئیزنی خودا نەبێت، ﴿يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا ۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾[2] واتە: لە ڕۆژێکدا کە جوبرەئیلو فریشتەکان بە ڕیز دەوەستن کەسیان قسە ناکەن مەگەر کە خوا ڕێی بداتو قسەی بەڕێو جێ بکات. ئیبنو جورەیج دەڵێت: ﴿كَٰظِمِينَ﴾ واتە: دەگرین.[3] وە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ﴾ واتە: ئەوانەی کە ناهەقیان لە خۆیان کردووەو هاوەڵیان بۆ خوا داناوە نە دۆستی نزیك هەیە نە تکاکارێك کە بتوانێت تکایان بۆ بکات. بەڵکو دەستیان لە هەموو چاکەیەك براوەو چاریان نەماوە. خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ﴾ واتە: خودا دەزانێت کێ چاوی غایەنی هەیەو چیان لە دڵدا شاردووەتەوە. خوای مەزن باسی ئەوە دەکات کە ئاگاداری تەواوی هەیە بەسەر هەموو شتێکدا دیار یان نادیار، گەورە یان بچووك بۆ ئەوەی کە مەردم زۆر ئاگاداری خۆیان بنو بترسن لەوەی کە خودا هەمیشە دەزانێت چی دەکەنو خەریکی چین هەتا شەرمی لێ بکەنو بە ڕاستی لێی بترسنو خۆ بپارێزن. وە بزانن کە خودا دەیانبینێت بۆ ئەوەی خودایان لە یاد نەچێت. چونکە خودا ئەو کەسانەی بە چاوی خیانەت دەڕوانن دەناسێت با خۆشیان وەها نیشان نەدەنو ئاگاداری ئەو شتانەیە کە لە ناو دڵدا شاراوەتەوەو دەرناخرێت. زەححاك دەڵێت: ﴿خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ﴾ واتە: چاوداگرتن (ئیشارەت بە چاوو برۆ)و پیاوێك بڵێ: بینیم کەچی نەیبینێت، یان نەمبینی کەچی بینیویەتی.[4] ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: خودا دەزانێت بەو چاوانە لە کاتی سەیرکردندا ئایا دەیەوێت خەیانەت بکات یان نایەوێت؟[5] موجاهیدو قەتادەش هەر وایان وتووە.[6] ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا تُخْفِى

---

[1] الطبري (٢١/٣٦٨).

[2] النبأ (٣٨).

[3] الدر المنثور (٧/٢٨١).

[4] القرطبي (١٥/٣٠٣).

[5] الطبري (٢١/٣٦٩).

[6] الطبري (٢١/٣٧٠).

﴿ٱلصُّدُورُ﴾ دەڵێت: دەزانێت کە تۆ نیازت هێناوە بە چاوت. ئایا دەتەوێت داوێن پیسی (زینا) بکەی یان ناتەوێت؟[1] سودی دەڵێت: ﴿وَمَا تُخْفِي ٱلصُّدُورُ﴾ ئەوەی لە دڵدا شاراوەتەوە لە وەسوەسە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ يَقْضِي بِٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ خودا بە ڕاستی پێ ڕادەگات، ئەوانەی ئەوان هانایان دەبەنە بەر هیچ کارێکیان لە دەست نایەت، هەر خودایە کە بیسەرو بینایە. ﴿وَٱللَّهُ يَقْضِي بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: خودا فەرمان دەدات بە دادپەروەری. ئەعمەش دەڵێت: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت): ﴿وَٱللَّهُ يَقْضِي بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: خودا توانای هەیە کە پاداشتی چاکە بە چاکە بداتەوەو پاداشتی خراپەش بە تۆڵە لێ سەندن.[2] ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ ئەم ئایەتە ئیبنو عەباس تەفسیری کردووە بەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى﴾[3] واتە: تا سزای ئەوانە بدات کە خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەکانیان‌و پاداشتی ئەوانە بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە چاکتر (لەوەی کە کردوویانە). وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾ ئەو کەسانە پەنا دەبەنە بەر جگە لە خوداو وەك بتو دارو بەردو ئەو شتانەی دەیکەنە هاوەڵ بۆ خودا، ﴿لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ﴾ ناتوانن بڕیاری هیچ شتێك بدەن‌و توانای هیچ شتێکیان نیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ واتە: قسەی مەردم ئەبیسێت‌و دەشیانبینێت. ڕێ نیشانی کەسێك دەدات کە مەیلی لێ بێت، ڕێ ون دەکات لە کەسێك کە مەیلی لێ بێت‌و هەر خۆی فەرمانڕەوای دادپەروەرە لە هەموو شتێکدا.

﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا۟ هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ (٢١) ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (٢٢)﴾

---

[1] الطبري (٢١/٣٦٩).

[2] الطبري (٢١/٣٦٩).

[3] النجم (٣١).

**چارەنووسی خراپی خوانەناسان**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوان بە زەمیندا نەگەڕاون، تا بزانن چارەنووسی پێشینەکانی ئەوانە چۆن بووە؟ لەوانە بەهێزتر بوونو لەو زەمینە شوێنەواریشیان زۆرترە، لە تۆڵەی گوناهەکانیان خوا گرتنیو کەس لە خودای نەپاراستن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا﴾ واتە: ئەوانەی کە بروایان نەکرد بە پەیامەکەت ئەی موحەممەد (ﷺ) ئایا نەگەڕاون؟ ﴿فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ﴾ بەسەر زەمیندا هەتا بە چاوی خۆیان ببینن کە خودا چی بەسەر گەلە پێشووەکان هێناوەو چ سزاو ئازارێکی داون، کە ئەوانە زۆر لەمانە بە تواناو بەهێزتر بوون، ﴿وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ﴾ واتە: شوێنەواری وایان لەم سەر زەمینەدا بەجێ هێشتووە لە ڕووەکو پاشماوەی زۆر لە کۆشکو خانوبەرە کە ئەمانە ناتوانن وەك ئەوان ئاوەدانی بکەنەوە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا ئەوەی بەوان (گەلی عاد)مان دابوو (لە سامانو دەسەلات) بە ئێوەمان نەدابوو. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا﴾[2] واتە: وە زەوییان کێڵا (بۆ کشتوکاڵ)و ئاوەدانیان کردەوە زیاتر لەمان. واتە: لەگەڵ ئەو هەموو دەسەلاتە زۆرو زەبەنو توندوتیژەدا نواندوویانە بە هۆی گوناهەکانیانەوەو باوەڕنەهێنانیان بە پێغەمبەرەکانیان خوای گەورە قڕی کردوون، ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ﴾ واتە: کەس نەیتوانی لە جەزرەبەی خودا ڕزگاریان بکاتو لایان بداتو بیانپارێزێت. پاشان خوای گەورە هۆکاری لەناوبردنەکەیانی باس کردووەو فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ کە ئەوانە پێغەمبەریان بە نیشانەی ئاشکراوە بۆ هاتبووبە لام ئەوان بروایان پێ نەکردوون، ئینجا خوا قاری لێ گرتن. خوا بە توانایەو سزادانی توندوتیژە. واتە: لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەرەکانیان بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان بۆ هێناون ئەوان باوەڕیان نەهێناو لە تاوانکاری خۆیان دەستیان هەڵنەگرت، ﴿فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ﴾ خوای خاوەن دەسەلات قڕی کردن وەك چۆن خوانەناسانی تری قڕ کردووە. ﴿إِنَّهُ

[1] الاحقاف (٢٦).

[2] الروم (٩).

قَوِيٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ واته: تۆڵەی خودا زۆر توندو تیژو به ژانو سەختە. خوای گەورە بە بەزەیی خۆی بمانپارێزێت لێی.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَٰحِرٌ
كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟
نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ
أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم
مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾﴾

**بەسەرهاتی موساو فیرعەون**

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ واتە: (لەو بارەوە) بە چەند نیشانەی خۆمانو بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە، موسامان نارد. خوای گەورە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەداتەوە لەسەر باوەڕنەهێنانی ئەو کەسانەی لە هۆزەکەیو مژدەپێدانی کە سەرکەوتنو پاشەڕۆژ لە دنیاو قیامەتدا هەر بۆ ئەوە. وەك چۆن موسای کوڕی عیمرانی (سەلامی خوای لێ بێت) زاڵو سەرکەوتوو کرد. ڕەوانەی کرد بە بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوونو ئاشکراوە بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ﴾ مەبەست بە (السلطان) بەڵگەو نیشانەیە. ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾ بۆ لای فیرعەونو هامانو بۆ لای قارون، هەموو وتیان: جادوگەرێکی درۆزنە. ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ﴾ کە فەرمانڕەوای قیبتەکان بووە لە وڵاتی میسردا ﴿وَهَٰمَٰنَ﴾ وەزیری فیرعەون بووە لەو وڵاتەی فیرعەوندا، ﴿وَقَٰرُونَ﴾ قارون دەوڵەمەندترین کەسو بەناوبانگترین بازرگانی ئەو سەردەمە بووە، ﴿فَقَالُوا۟ سَٰحِرٌ كَذَّابٌ﴾ واتە: بڕوایان پێ نەکردو وتیان: جادووگەرو شێتو درۆزنەو خەڵکی دەخەڵەتێنێت بە ناوی خوداو، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوْا۟ بِهِۦ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾[1] واتە: بەم شێوەیە بۆ لای ئوممەتانی پێش ئەمان هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە مەگەر وتوویانە (بەو پێغەمبەرە) جادوگەر یان شێت، ئایا (ئەمانو ئەوان) ڕاسپاردەیان بۆ یەکتری کردووە؟

[1] الذاريات (٥٢ـ٥٣).

(نەخێر) بەڵکو ئەمان هەموو گەلێکی سەرکەش و یاخین. خوای گەورەدەفەرموویت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴾ وەختێك لە لایەن ئێمەوە دینی ڕاستی بۆ دەرخستن، وتیان: ئەوانەی لەگەڵ ئەو بڕوایان هێناوەکوڕەکانیان لەناوبەرن و ژنەکانیان بە زیندوویی بهێڵنەوە، بەڵام فێڵی خوانەناسان هەرگیز سەری نەگرتووە. ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ عِندِنَا ﴾ واتە: کاتێك لە لایەن ئێمەوە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکراوە پێغەمبەران ڕەوانەکران بۆ لایان، ﴿قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟ نِسَآءَهُمْ ﴾ ئەوە بڕیاری دووهەمی فیرعەونە کە کوڕانی نەوەی ئیسرائیل بکوژن. بڕیاری یەکەم لەبەر ئەوەی کە ڕزگاری بێت لە موساو لەناوی بەرێت یان ئەو گەلە سەرشۆڕو کزۆڵ بکات و ژمارەیان کەم بێتەوە یان بۆ هەردوو مەبەستەکە بوو. بەڵام بڕیاری دووهەم بۆ سوك و ڕیسواکردنی ئەو گەلە بوو هەتا گەلەکەی شومیەکە بدەنە پاڵ موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆیە وتیان: ﴿أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾[1] واتە: پێش هاتنی تۆ بۆ ناومان ئازار دراین هەروەها پاش هاتنی تۆ بۆ ناومان (بە پێغەمبەرایەتی)، (موسا) فەرمووی: بەڵکو پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو بەرێت و ئێوە بکات بە جێنشین (ی دوژمنەکانتان) لەسەر زەوی جا تەماشا دەکات ئێوە چۆن کار دەکەن. قەتادە دەڵێت: ئەمە بڕیارێکی ترە دوایی بڕیارێکی تر.[2] خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴾ واتە: ئەم فێڵ و نیازە خراپەیان هەر بۆ کەمکردنەوەی بەنی ئیسرائیل بووە تا بەنی ئیسرائیل زاڵ نەبن بەڵام فێڵ و تەڵەکەی خوانەناسان هەرگیز سەری نەگرتووە و بەسەر خۆیاندا شکاوەتەوە و خۆیان لەناوچوون. ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴾ فیرعەون وتی: لێم گەڕێن موسا بکوژم، با ئەو هاوار بۆ پەروەردگاری خۆی بەرێت، من دەترسم دینەکەتان بگۆڕێت و (ئاژاوە) لەم سەر زەمینە بنێتەوە. ئەمە نیازی فیرعەون بوو (لەعنەتی خوای لێ بێت) کە موسا بکوژێت (سەلامی خوای لێ بێت) وتی: لێم گەڕێن با من موسا بکوژم ﴿وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ﴾ واتە: گوێم لێ نیە با موسا هانا بۆ خودای خۆی ببات. ئەمە بە

---

[1] الاعراف (١٢٩).

[2] الطبري (٢١/٣٧٣).

تەواوی بێدینی‌و گومڕایی‌و لاساری فیرعەون دەگەیەنێت کە دەڵێت: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ واتە: فیرعەون دەترسێت کە موسا خەڵکی گومڕا بکات‌و داب‌و نەریتی ئەو خەڵکە بگۆڕێت. ئەمە وەك ئەو نوکتەیە وایە کە باوە بۆ پیاوی خراپ بەکار دەهێنرێت (فیرعەون وای لێ هاتووە ئامۆژگاری خەڵکی دەکات) واتە: بووەتە ئامۆژگاریکەری مەردم‌و بەزەیی پیایاندا دێتەوە نەوەك موسا گیرۆدەیان بکات! زۆرێك ئەم ئایەتەیان وا خوێندووەتەوە: (أن يبدل دينكم وأن يُظهر في الارض الفساد) هەندێکی تریش خوێندوویانەتەوە: ﴿ان يبدل دينكم أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ﴾ وە هەندێکی تریش خوێندوویانەتەوە: (يَظْهَرُ في الأرض الفساد) بە(بۆر)دانان لەسەر(يظهرُ))، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ موسا وتی: هانا دەبەمە بەر کەسێك (کە منیش‌و ئێوەشی خولقاندووە) بمپارێزێت لە هەموو خۆبەزلزانێك کە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت نیە. واتە: کاتێك موسا ئەو هەواڵەی فیرعەونی پێگەیشت کە فیرعەون وتوویەتی: ﴿ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ﴾، موسا وتی: من پەنا دەگرم بە خوای مەزن لە شەڕی فیرعەون‌و وێنەی فیرعەون بۆیە وتی ئەی خەڵکینە، ﴿إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ﴾ واتە: لە هەموو خۆبەزلزانێکی تاوانبار، ﴿لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ﴾ بۆیە لە فەرموودەیەکدا هاتووە لە ئەبو موساوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کاتێك لەشەڕوناپاکی قەومێك ترسابێت فەرموویەتی: (ئەی خودایە هانات پێ دەبەم لە خراپەیان)، وە ترسی بووبێت لە کۆمەڵێك (گەلێك) فەرموویەتی: (ئەی خودایە هانات پێ دەهێنم لە خراپەکارییان‌و تۆ ئەدەم بە گژیاندا بۆ لەناودان‌و قرکردنیان)[1].

﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾

[1] النسائي في الكبرى (١٨٨/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

**پشتیوانیکردن لەموسالەلایەن کەسێکەوە کەلەبنەماڵەی فیرعەونە،قسەکانی ئەوپیاوەش**

وا مەشهورە ئەو پیاوە خاوەن باوەڕە قیبتی بووەو خزمی فیرعەونیش بووە، سودی دەڵێت: کوڕی مامی فیرعەون بووە. وە وتراویشە: ئەو کەسە بوو کە لەگەڵ موسا ڕزگاری بوو (سەلامی خوای لێ بێت).[1] ئیبنو جورەیج دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت): هیچ کەس بڕوای نەهێنا لە کەسوکاری فیرعەون جگە لەو پیاوە، وتی: ﴿يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ﴾[2] واتە: ئەی موسا (ئاگادار بە) سەرگەورەکان کۆبوونەتەوە لە بارەی تۆوە (قسە دەکەن) بۆ ئەوەی بتکوژن. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە.[3] ئەم پیاوە باوەڕەکەی ئاشکرا نەدەکرد لە لای گەلەکەی کە قیبتیەکان بوو بۆ ئەو ڕۆژە نەبێت کە فیرعەون وتی: ﴿ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ﴾[4] واتە: لێم گەڕێن با موسا بکوژم.ئەوساتەوەختە زۆر تووڕە بوو لەبەر ڕەزامەندی خودا ئاشکرایشەکە گەورەترین جیهادکردنی قسەی هەقە لە لای خاوەن دەسەڵاتێکی زۆردار ، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە.[5] وە لەو قسەیش کە ئەو پیاوە لای فیرعەون کری:قسەیەکی گەورەتر نیەکە وتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ﴾کەسێك دەکوژن هەرلەبەرئەوەی ئەڵێ پەروەردگاری من خوایە مەگین ئەوقسەیی کە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: وتم بە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاس (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەواڵم بدەرێ بە توندو تیژترین کارێك کە موشریکەکان کردوویانە لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی: کاتێك کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە تەنیشت کەعبەدا نوێژی دەکرد عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت هاتو دەستەیەخەی پێغەمبەر بوو (ﷺ) جلەکانی لە ملی پێغەمبەر(ﷺ) پێچاو زۆر بە توندی لە ملی توندکردو تاسانی لەو کاتەدا ئەبو بەکر دەستەیەخەی بوو لە پێغەمبەری (ﷺ) دوورخستەوەو وتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾ تەنها بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[6] خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن

---

[1] الطبري (٢١/٣٧٥).

[2] القصص (٢٠).

[3] القرطبي (١٥/٣٠٦).

[4] الغافر (٢٦).

[5] تحفة الأحوذي (٦/٣٩٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] فتح الباري (٨/٤١٦).

رَبِّكُمْ وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ پیاوێك لە خزمانی فیرعەون کە باوەڕی بە خودا هەبوو، بەڵام باوەڕەکەی خۆی دەشاردەوەو وتی: ئێوە چۆن پیاوێکی وەها دەکوژن، دەڵێت: خودا پەروەردگارمەو لە پەروەردگاری خۆشیەوە چەندە نیشانەی زۆر ئاشکرای بۆ هێناوون؟، ئەگەر دەڵێن: درۆ دەکات ئۆباڵی درۆی بە ئەستۆی خۆی. ئەگەریش قسەی ڕاست دەکات، لەوانەی ئەو پێتان دەڵێت هێندێکیانتان هەر بەسەر دێت، چونکە خودا مرۆڤی لە ڕادە لادەری درۆزن شارەزا ناکات. ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمْ﴾ واتە: چۆن پیاوێك دەکوژن هەر لەبەر ئەوەی دەڵێت پەروەردگاری من خودایەو بەڵگەی زۆریشی بۆ هاوردوونەتەوە لەسەر ڕاستی قسەکەی؟ پاشان کەوتووەتە گفتوگۆ لەگەڵیان و پێی وتوون: ﴿وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى يَعِدُكُمْ﴾یانی: ئەگەر ڕاستی ئەو پەیامەتان بۆ دەرنەکەوت کە ئەو بۆی هێناون چاکتر وایە وازی لێ بێننو ئازاری مەدەن خۆییو خوای خۆی ئەگەر ڕاستی نەکرد خودا تۆڵەی لێ دەکاتەوە لەسەر ئەو درۆی کە کردوویەتی لە دنیاو قیامەتدا. خۆ ئەگەر ڕاستیشی کرد ئێوە ئازاری بدەن لەسەر ئەوەی کە وتیو دژایەتی بکەن لە دنیاو قیامەتدا خودا تۆڵەی لە ئێوە دەسێنێت. خۆ ئەگەر ڕاستشیی کرد بە لای ئێوەشەوە ڕەوایەو پێویستە نەبنە لەمپەر لە ڕێیدا بەڵکو وازی لێ بێنن چی دەکات لەگەڵ هۆزەکەی بیکات، با ئەو بانگیان بکاتو ئەوانیش شوێنی بکەون. هەر بەو شێوەیە خوای گەورەباسی فیرعەونمان بۆ دەکات کە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) داوای کردووە لە فیرعەونو هۆزەکەی کە وازی لێ بێنن وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی لە پێش ئەمان گەلی فیرعەونمان تاقی کردەوە پێغەمبەرێکی بەڕێزیان بۆ هات، (پێی وتن) کە بەندەکانی خودا (بەنی ئیسرائیل) بە من بسپێرن چونکە بە ڕاستی من پێغەمبەرێکی ئەمینو باوەڕپێکراوم بۆ ناو ئێوەو خۆتان بە بەرزو گەورە مەزانن لە بەرامبەر خوادا بێگومان من بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرام بۆ هێناون، وە بێگومان من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆمو پەروەردگاری ئێوە لەوەی کە ئێوە بەردبارانم بکەن، وە ئەگەر باوەڕم پێ ناهێنن ئەوە وازم لێ بێنن (و خراپەم دەربارە مەکەن) پێغەمبەری خودایش حەزرەتی محمد(ﷺ)

---

[1] الدخان (١٧_٢١).

هەر وای فەرموو بە قورەیشیەکان کە وازی لێ بێنن با عەبدەکانی خودا بانگ بکات‌و ئازاری نەدەن‌و ئەو خزمایەتیەی کە لە نێوانیاندایە با بمێنێت دەست درێژی نەکەنە سەری. خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) بلێ داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری مەگەر خۆشویستنی خزمایەتی. واتە: ئازارم مەدەن ئەو خزمایەتیە با لە نێوانماندا بمێنێت من لەگەڵ خەڵکی تردا خۆم خەریك دەکەم‌و بانگی خەڵکی تر دەکەم. هەر لەسەر ئەو مەبەستە ئاشتینامەی ڕۆژی حودەیبیە ڕوویداو هاتە کایەوە ئەو سەرکەوتنە گەورەو بەرچاوە ڕوویدا. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ﴾ واتە:بەدڵنیاییەوە خوائەوکەسە ناخاتە سەر ڕێگەی هیدایەت کە زیادەڕۆو درۆزنە،یانی: ئەوەی وای دەزانی کە ئەو کەسەی خودا ڕەوانەی کردووە درۆزنەو ئێوەش هەر وا دەڵێن. لە قسەو هەڵسوکەوتیدا بۆ هەموو کەسێك دەردەکەوت، قسەی بێ ڕێ‌وجێ‌و کرداری ناڕەوای دەکرد. کەچی بە چاوی خۆمان دەبینین قسەکانی زۆر چاکەو بەرنامەکەی ڕێکوپێکە خۆ ئەگەر مرۆڤێکی خراپ‌و لە ڕادە لادەرو درۆزن بووایە خودا ڕێی نیشان نەدەداو شارەزای نەدەکردو ئەو کردارو گفتارە جوانانەی لێ نەدەوەشایەوە. پاشان پیاوە خاوەن باوەڕەکە هۆزەکەی دەترسێنێت لەوەی کە خودا ئەو هەموو نازو نیعمەتەی کە پێی داون لێیان بسێنێتەوەو وەری بگرێتەوە، خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ واتە: کەسەکانم ! ئەمڕۆش فەرمانڕەوایی بۆ ئێوە، لەم زەویەشدا ئێوە زاڵن، ئەگەر خودا بە گژماندا بێت، ئەوسا کێ هاریکاریمان دەکات؟ فیرعەون وتی: چی خۆم بە چاکی دەبینم، هەر ئەوەتان پیشان دەدەم، هەر ئەو ڕێگەی کە من نیشانتانی دەدەم ڕاستەڕێیە. ﴿يَٰقَوْمِ لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: خودا ئەم هەموو نازو نیعمەتەی پێ داون‌و زاڵی کردوون‌و قسەتان ڕەوایەو خاوەنی دەسەلاتی مەزنن لە یادی مەکەن‌و شوکرانەبژێری خودا بن‌و بڕوا بهێنن بە پێغەمبەرەکەی‌و بترسن لە خودا کە تۆڵەتان لێ بسێنێت ئەگەر بڕوا بە پێغەمبەرەکەی نەکەن، ﴿فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا﴾ واتە: ئەو هەموو لەشکرە ناگاتە فریادمان لە تۆڵەی خودا ڕزگارمان ناکات ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ سزامان بدات. فیرعەون بەرپەرچی قسەکانی ئەو پیاوەڕەشیدو چاك وچاکەکارەی دایەوە، ئەو پیاوەی کەئەو شایەنتر بوو لە فیرعەون بۆ فەرمانڕەوایی. وتی: ﴿مَآ أُرِيكُمْ

---

[1] الشورى (٢٣).

إِلَّا مَآ أَرَىٰ﴾ واتە: ئەوەی کە من پێتان دەڵێم ، زۆر بە باشی دەزانم بۆ خۆم و ئێوەش، فیرعەون درۆی دەکرد چونکە ئەو زۆر چاك دەیزانی موسا ڕاست دەکات (سەلامی خوای لێ بێت) لەو پەیامەیدا کە هێناویەتی. ﴿ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ﴾[1] واتە :(موسا –سەلامی خوای لێ بێت–) فەرمووی سوێند بە خوا بێگومان تۆ دەزانی هیچ کەس ئەم موعجیزانەی نەناردووەتە خوارەوە بێجگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی کە ڕوونکەرەوەن. خوای مەزن فەرمووی: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾[2] واتە: لەبەر ستەمکاری و خۆبەزلزانین (یان)دانیان نەئەنابە ئەو موعجیزانەدا لەکاتێکدا کە لە دڵی خۆیاندا ئەو (موعجیزانە)یان بە ڕاست دەزانی. وە دەفەرموێت: ﴿مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ﴾ واتە: چی خۆم بە چاکی دەزانم هەر ئەوەتان پێ دەڵێم. فیرعەون درۆی کرد کە وای وت و خەیانەتی لە خوداو پێغەمبەری خودا کردو خەیانەتی لەو کەسانەش کرد کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ئەودا بوون، خێری ئەوانی نەویست. وە ئەم قسەیش کە خوای گەورە دەفەرموێت هەر هەمان قسەیە، ﴿وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾ واتە: ئەم ڕێگەی کە من نیشانی ئێوەی دەدەم و ئێوەی بۆ بانگ دەکەم زۆر هەق و چاکە و ڕاستەڕێیە. وە دیسان فیرعەون لەوەشدا درۆی کردووە هەرچەندە گەلەکەیش شوێنی کەوتبوون و لە قسەی دەرنەدەچوون. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ فِرْعَوْنَ ۖ وَمَآ أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ﴾[3] واتە: بەڵام ئەوان شوێن فەرمانی فیرعەون کەوتن لە کاتێکدا فەرمانی فیرعەون ڕاست و ڕەوا نەبوو. وە دەفەرموێت: ﴿ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ﴾[4] واتە: فیرعەون گەلەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێنموونی نەکردن. وە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: (هیچ پێشەوایەك نیە کە دەمرێت، ئەو ڕۆژەی کە دەمرێت خەیانەتی لە ژێردەستەکانی کردبێت بۆنی بەهەشت بکات، کە بۆنی بەهەشت لە مەودای ڕۆیشتنی پێنج سەد ساڵ ڕێدا دەکرێت)[5].

---

[1] الاسراء (١٠٢).
[2] النمل (١٤).
[3] هود (٩٧).
[4] طه (٧٩).
[5] فتح الباري (١٣٦/١٣).

﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ مُّرۡتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ﴿٣٥﴾﴾

خـوای مـەزن دەفـەرموویّت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ﴾ واتـە: کابرای خاوەن باوەڕ وتی: کەسەکانم! من لەوە نیگەرانم ئەو بەڵایەی بەسەر خەڵکی تر هاتووە، بەسەرئێوەشدا بێت. لێرەدا خوای گەورە باسی ئەو پیاوچاکە خاوەن باوەڕە دەکات لە خزمەکانی فیرعەون کە هۆزەکەی ترساندووە لە تۆڵەو سزای خودا لە دونیاو قیامەتدا، پێی ووتن _وەك خوای مەزن دەفەرموویّت_ ﴿يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ﴾یانی: ئەو گەلانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان نەکرد چیان بەسەرهات خودا چۆن سزای دان وەك گەلی نوحو عادو سەمودو ئەوانەی دوای ئەوانیش لەو گەلانە کە چۆن خودا قڕی کردن، هیچ کەسێك نەیتوانی بڕوات بە هانایانەوەو بەرگریان لێ بکات، ﴿مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ﴾ وەك ڕووداوی هۆزی نوحو عادو سەمودو ئەوانەی پاش ئەوان هاتن، خودا نایەوێت ناهەقی لە عەبدەکانی بکات. واتە: خودا قڕی کردوون لەبەر ئەوەی بڕوایان بە پێغەمبەرەکانی خودا نەدەهێناو خەریکی تاوان کردن بوون گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرەکانیان نەبوون. پاشان دەڵێت: ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ﴾ کەسەکانم! لێتان نیگەرانم لەو ڕۆژەدا لێتان بقەومێ کە دەبێتە هاوارهاوار. واتە: (ڕۆژی قیامەت)، ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ﴾ ئەو ڕۆژەی کە هەمووتان بەرەو پاش دەگەڕێنەوەو هەر ڕا دەکەن، کەس ناتوانێت لە خودا ڕزگارتان بکات، هەر کەسێکیش خودا ڕێگەی لێ بکوڕێت، هیچ کەس نایخاتەوە سەر ڕێ. ﴿يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ﴾ واتە: دەڕۆنو ڕادەکەن ﴿كَلَّا لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ﴾[1] واتە: نەخێر هیچ پەناگەیەك نیە، لەو ڕۆژەدا ئارامگا

[1] القیامة (١١_١٢).

هەر لای پەروەردگاری تۆیە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ﴾ واتە: هیچ شتێك نابێتە ڕێگر لە تۆڵەو سزای خودا ڕزگارتان بکات، ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ﴾ واتە: هەر کەسێك خودا گومڕای کرد غەیری خودا هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێی نیشان بدات. خوای مەزن دەفـــــەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾

لەمەوپێشیش یوسف بە چەندین بەڵگەوە هاتە ناوتان، کەچی ئێوە لە بەڵگەکانی دوو دڵ بوون، باوەڕتان پێ نەهێنا. وەختێك کە مرد، وتتان: ئیتر پاش ئەو خودا هیچ پێغەمبەرێك نانێرێت، دەسا ئاوا هەر کەسێك دوو دڵی بکاتو لە ئەندازەی خۆی دەربچێت، خودا ڕێگەی لێ دەگۆڕێت. ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ﴾ واتە: ئەی خەڵکی میسر لە پێش موسا، خوای مەزن پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردن کە یوسف بوو، کە عەزیزی خەڵکی میسر بوو بانگی دەکردن بۆ خواناسیو دادپەروەری، لەبەر ئەوەی بە گوێیان دەکرد خاوەنی دەسەڵاتو پلەوپایەی دنیایی بوو. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾ واتە: دوو دڵو بێ هیوا بوون کە جارێکی تر پێغەمبەرتان بۆ بێت وتتان: ﴿لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا﴾هەرگیز خواپێغەمبەرمان بۆ نانێرێ دوای ئەو واتە: ئەوەندە خوانەناسو بێباوەڕ بوون، ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾ واتە: هەر کەسێك وەك ئێوە دوودڵی بکاتو لە ئەندازە دەربچێت ڕێگەی لێ دەگۆڕێتو گومڕا دەبێت. پاشان خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت، لەمەڕ نیشانەکانی خودا کێشە دەکەن، لە لای خوداو باوەڕداران کاری زۆر نابەجێ دەکەن. خودا دڵی هەر خۆبەزلزانێکی زۆردار ئاوەها مۆر دەکات. ﴿ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَـٰنٍ أَتَىٰهُمْ﴾ واتە: ئەو کەسانەی کە بەرگری دەکەن لە هەق بە شتی پڕوپوچ بەبێ ئەوەی کە بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێو کێشە دەکەن. خوای مەزن زۆر لێیان تووڕەیە لەسەر ئەو کردارەیان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ واتە: خاوەن باوەڕانیش ئەو کەسانەیان خۆش ناوێ کە ئەوە ڕەوشتیانە چونکە ئەو کەسانەی سیفەتو ڕەوشتیان وایە خودا مۆر دەنێت بەسەر دڵیاندا، ئەو

کاتە نە دەزانێت چاکی چیەو خراپە چیە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ﴾ واتە: خودا دڵی هەموو خۆبەزلزانێکی زۆردار کە شوێن هەق ناکەوێت ئا بەو شێوەیە مۆر دەکات.

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِي صَرْحٗا لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ٣٦ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ ٣٧﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِي صَرْحٗا لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ﴾ واتە: فیرعەون وتی: ئەی هامان! بچۆ قەڵایەك ساز بکە، بەشکو بگەم بەو ئاسۆ دووردەستانە. خودای گەورە باسی فیرعەون دەکات، کە چەندە لاسارو سەرکەش‌و درۆهەڵبەست بووەو بڕوای بە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) نەدەکرد، بۆیە فەرمانی دا بە هامانی وەزیری کە شوێنێکی بەرزی بۆ دروست بکات، وەك کۆشکی زۆر بەرزو گەورە کە لە گەچ دروست دەکرێت (واتە خۆڵی سورەوەکراو) وەك خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَأَوْقِدْ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّي صَرْحٗا﴾[1] واتە: جا (بۆ زیاتر دڵنیابوون) ئەی هامان! کورەی ئاگر تاودەو خشتی سوورەوەکراوی لێ دروست بکە بۆم ئینجا (لەو خشتە) کۆشکێکی بەرزم بۆ دروست بکە. وە دەفەرمووێت: ﴿لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ٣٦ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗاۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٖ﴾تابگەمە ئاسۆکانی ئاسمانەکان، بڕوانمە خوداکەی موسا، من دەڵێم ئەو درۆ دەکات، ئا بەم جۆرە فیرعەون کاری گەندەی خۆی بە جوان دەزانی‌و بوویە لەمپەری سەر ڕێگەی، هەر فێڵێکی فیرعەون بۆ خۆی دۆزیەوە بە فیڕۆچوو. خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّعَلِّيٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ٣٦ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سالح دەڵێن: دەرگاکانی ئاسمان.[2] وتراویشە: ڕێگاکانی ئاسمانەکان، ﴿فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبٗا﴾ ئەمەیش هەر لە بێدینی‌و یاخیبوونیەوەیە کە بڕوا بە موسا ناکات کە خودا ڕەوانەی کردووە بۆیان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ واتە: بە هۆی ئەو کارەی کە

---

[1] القصص (٣٨).

[2] القرطبي (١٥/٣١٤).

دەیویست بیکات ژێردەستەکانی هەڵخەڵەتێنێت پێی، کە دەیەوێت شتێك دروست بکات بە هۆی ئەو شتەوە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بە درۆ بخاتەوە. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾ ئیبنو عەباسو موجاهید دەڵێن : ( الاني تباب)یانی(الاني خسار)واتە مەگین بە خەسار چوو هەموو فێڵەکانی فیرعەون.[1]

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ (٣٨) يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ (٣٩) مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ (٤٠)﴾

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ واتە: ئەو کەسەی خاوەن بڕوا بوو وتی: کەسەکانم! شوێنم بکەون، من ڕاستەڕێتان نیشان دەدەم. خاوەن باوەڕەکە بەو گەلە یاخیو سەربزێوو دنیاویستەی وت کە خودای مەزنو خاوەن دەسەڵاتیان لە یاد کرد، ﴿يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ واتە: من ڕێگەی ڕاست نیشانی ئێوە دەدەم. بە پێچەوانەی قسەکەی فیرعەون وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ پاشان پیاوە خواناسەکە داوایان لێ دەکات کە زۆر بە ژیانی دنیاوە خۆ خەریك نەکەن ڕێزی نەدەن بەسەر ڕۆژی دواییدا وایان لێ بێت ببنە لەمپەر لە ڕێی خوداو بڕوا بە موسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) نەکەن. پاشان دەڵێت: وەك خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ ﴾ کەسەکانم ئەو ژیانی دنیایە هەر کەمێکەو دەبڕێتەوەو بەم زووانەدەپوکێتەوە، ﴿وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی هەرگیز نابڕێتەوەو جێگۆڕکێی تیا ناکرێتو هیچ ئەملاولاکردنی تیا نیە ، یان خۆشیو خۆشگوزەرانیە یان دۆزەخو ئاگرە. بۆیە خوای مەزنی خاوەن دەسەلات دەفەرمووێت: ﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ هەر کەسێك خراپە بکات، هەر بە ئەندازەی خراپەی سزا دەدرێت. هەر کەسیش ئاکاری چاك بن (چ نێر چ مێ)و باوەڕی بە خودا هەبێت، ئەوانە دەچنە بەهەشتو بێ ژمارە هەموو بژێویکیان هەیە. ﴿ مَنْ عَمِلَ

[1] الطبري (٢١/٣٨٨).

سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا﴾ واته: تەنها گوناهێكی بۆ دەنووسرێت. ﴿وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ واته: تەنها پاداشت نادرێتەوە بەڵكو خودای مەزن پاداشتی زۆری دەداتەوە كە هەر لە ژمارە نایەتو تەواو نابێت.

﴿وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٤٣﴾ فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِيٓ إِلَى ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾

## كۆتایی قسەی پیاوچاكەكەو پاشەڕۆژی هەردوو دەستەكە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ واتە: كەسەكانم چیە من دەمەوێت ڕزگارتان بكەم، ئێوە دەتانەوێت من بچمە ئاگر. پیاوە خاوەن باوەڕەكە وتی: بە لامەوە سەیرە من بانگی ئێوە دەكەم بۆ ڕزگاریو سەرفرازی كە بریتیە لە خواناسی بە تەنهاو هاوەڵی بۆ دامەنێنو بڕواهێنان بەو پێغەمبەرەی كە ڕەوانەی كردووە بۆتان، ﴿وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ كەچی ئێوە دەتانەوێت بڕۆمە ناو ئاگر هەر بە نەزانیو بەبێ ئەوەی بەڵگەیەكتان بە دەستەوە بێت، ﴿تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ﴾ دەتانەیت لە خودا حاشا بكەمو شتی وا بپەرستمو بیانكەم بە شەریكی خودا، كە هیچ زانینم پێ نیە، كەچی من دەمەوێت ئێوە ڕوو بكەنە لای هەرە بە دەسەڵاتی گوناه بەخش. واتە: ئەو خودایەی كە لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵاتو مەزنیەدا خۆش دەبێت لە گوناهی ئەو كەسانەی كە دەگەڕێنەوە بۆ لای ﴿لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ بێگومان ئێوە دەخوازن من شتێك بپەرستم كە لە دنیاو قیامەتدا هیچ كارێكی لە دەست نایەت. هەموومان دەگەڕێینەوە بۆ لای خوداو ئەوانەی لە ئەندازەوە دەردەچن، هەر تووشی جەهەنەم دەبن. پیاوە خاوەن باوەڕەكە دەڵێت: بێگومان. سودیو ئیبنو جەریر دەڵێن: ﴿لَا جَرَمَ﴾ یانی: لە ڕاستیدا. زەحجاك دەڵێت:یانی: درۆ نیە. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت لە ئیبنو

عەباسەوە ﴿لَا جَرَمَ﴾ واتە: بەڵێ ئەوەی کە ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن لە بتو دارو بەردپەرستی، ﴿لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَلَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ موجاهد دەڵێت: ئەو بتانە هیچ شتێکیان لە دەست نایەت.[1] قەتادە دەڵێت: ئەو بتانە نە زیان دەدەن لە کەسو نە قازانجیش دەگەیەنن. سودی دەڵێت: نایەن بە هانای کەسەوە نە لە دنیاو نە لە قیامەتدا.[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مەزن دەفــــەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ﴾[3] واتە: کێ گومراترە لەو کەسەی کە هاوار لە غەیری خودا بکات کە وەڵامی ناداتەوە تا ڕۆژی دواییو ئەو (هاوارلێکراو)انە لە هاواری ئەوان بێ ئاگان، کاتێکیش خەڵك کۆدەکرێنەوە (لە قیامەت) پەرستراوەکان دەبنە دوژمنیانو (پەرستراوەکان) بە پەرستنەکەیان باوەڕ ناکەن. ﴿إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ﴾[4] واتە: (بتەکان) ئەگەر نزاو هاواریان لێ بکەن هاوارەکەتان نابیستنو ئەگەر بیشی بیستن وەڵامتان نادەنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: دەگەڕێینەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژی دواییدا هەر کەسەو پاداشتی کردەوەی خۆی وەردەگرێت. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ واتە: ئەوانەی لە ئەندازە دەردەچن لەناو ئاگردا هەر دەمێننەوەو لێی دەرناچن بە هۆی ئەو شەریك دانانەیان بۆ خودا. ﴿فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ ۚ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾جا ئەو دەمە ئائەم قسانەی منتان دێتەوە بیرو منیش کاری خۆم بە خودا دەسپێرم، خودا چاوی لە عەبدانی خۆی هەیە. واتە: بەم زووانە ڕاستی قسەکانی منتان بۆ دەردەکەوێت کە داوام لێ دەکردن تەنها خودا بپەرستنو دوورکەونەوە لەو شتانەی کە خودا پێی ناخۆشە، ئامۆژگاریم کردنو زۆر شتم بۆ ڕوون کردنەوە، دێتەوە بیرتانو پەشیمان دەبنەوە، کە پەشیمانی لەوێدا هیچ سوودێکی نیە. ﴿وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: خۆم بە خودا دەسپێرم هانا هەر بەو دەبەم دوورم لە ئێوەو هیچ پەیوەندیەکم پێتانەوە نیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ واتە: خودا چاوی لە بەندەکانیەتی هەر کەسێك شایەنی ئەوە بێت ڕێی نیشان بدرێت خودا ڕێی نیشان دەداتو هەر کەسیش شایەنی ئەوە بێت

---

[1] الطبري (٢١/٣٩٢).

[2] الطبري (٢١/٣٩٢).

[3] الاحقاف (٥-٦).

[4] الفاطر (١٤).

گومڕا بکرێت، سەری لێ دەشێوێت. خوای گەورە لە هەموو شتێکدا زۆر کارزانە، هەرچی دەکات لە جێی خۆیدایەو فەرمانی ڕەوایە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ﴾ خودا ئەو پیاوەی لە ئاکامی خراپی ئەو فێڵەی دەیانکرد ڕزگار کردو هەرچی سەر بە فیرعەون بوون سزای سەخت هاتو گرتنیەوە. واتە: خودا پاراستی لەو هەموو فێڵەی کە دەیانکرد لەگەڵی لە دنیاو لە قیامەتدا. لە دنیادا لەگەڵ موسا خودا ڕزگاری کردن و لە قیامەتیشدا خستنیە بەهەشت.

## سەلماندنی سزای ناو گۆڕ

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴾ هەموو سپێدەو ئێواران دەیانبەنە سەر ئاگروکە ڕۆژی قیامەتیش ڕادەبێ (فەرمان دەدرێت): سا دەستەو بەستەی فیرعەون، زۆر بە توندی ئازار بدەن. ﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ﴾ واتە: نوقم بوون لە ئازارو ژاندا پاشان ئەگوازرێنەوە بۆ ناو جەهەنەم. شوێنکەوتووانی فیرعەون بەیانیان و ئێواران گیانیان دەخرێتە سەر ئاگر هەتا ڕۆژی قیامەت. وەختێک ڕۆژی قیامەتیش هات گیان و لاشەیان یەك دەگرێتەوە لەناو ئاگردا بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ﴾ واتە: ئازارێکی زۆر توندو زۆر گران، ئەم ئایەتە بەلگەیەکی گەورەو زۆر بەهێزە لە لای ئەهلی سونەو جەماعە کە دەیکەنە بەلگە لەسەر سزای ناو گۆڕ لە بەرزەخدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗا﴾ بەلام لێرەدا پرسیارێك دروست ئەبێت ئەویش ئەوەیە گومانی تێدا نیە کە ئەم ئایەتە لە مەککەدا هاتووە کە کردوویانە بە بەلگە لەسەر سزای ناو گۆڕ لە بەرزەخدا.ئەی ئەم حەدیسەچیەکە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە ژنێکی جوولەکە (یهودیە) خزمەتی دەکرد، عائیشە هەر کارێکی چاکەی لەگەلدا بکردایە. ئافرەتە جوولەکەکە پێی دەوت: خودا لە سزای گۆڕ بتپارێزێت، عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە ژوورەوە بۆ لام وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناو گۆڕ سزای هەیە پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نەخێر کێ وادەڵێت؟) وتی: ئەو ئافرەتە جوولەکەیە هەر چاکەیەکی لەگەلدا ناکەم مەگین دەڵێت: خودا لە سزای گۆڕ بتپارێزێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (جوولەکە درۆیان کردوو لەوە داو ئەوان بە ناوی خوداوە درۆی زیاتریش دەکەن، غەیری ڕۆژی قیامەت سزا نیە). پاشان ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشت ئەوەندەی کە خودا مەیلی لی بێت، ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نیوەڕۆدا دەرچوو خۆی پێچابووەوە بە

لباسەکانی و چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوو بە دەنگی بەرز بانگی دەکرد دەیفەرموو: (گۆڕ وەك پارچەیەك لە شەوێکی تاریك وایە ئەی خەڵکینە! ئەگەر ئەوەیٚ من دەیزانم ئێوە بتانزانیبا زۆر دەگریان‌و کەم پێدەکەنین، ئەی خەڵکینە هانا بەرن بۆ خودا لە سزای گۆڕ. چونکە سزای گۆڕ هەقەو هەیە).[1] ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی ڕاستە لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیم، بەڵام ئەوان نەیانهێناوە، ئەوتریٚ: باشە کەواتە چۆن ئەم فەرموودەیەو ئەم ئایەتە یەك بخەین کە لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە کە بووەتە بەڵگە لەسەر سزای گۆڕ؟ ئەمە وەڵامەکەیەتی، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر سزادانی گیان (الروح) بە ئاگر لە بەیانیان‌و ئێواراندا لە بەرزەخدا، بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە لاشەی لەگەڵدایە لە ئازاری ناو گۆڕدا. لەوانەیە ئەو ئازارە هەر پەیوەندی بە گیانەوە بێت (الروح)، بەڵام سزای ناو گۆڕ بە لاشە لە بەرزەخدا هیچ بەڵگەیەك نیە لە قورئاندا لەسەری، لەو فەرموودانەی پێغەمبەردا نەبێت (ﷺ) کە لە دواوە باسی دەکەین. وتراویشە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر سزای خوانەناس لە گۆڕداو لە بەرزەخدا، نابێتە بەڵگە لەسەر سزای خاوەن باوەڕ لە ناو گۆڕدا لەسەر گوناه. بەڵگە لەسەر سزای ناو گۆڕ ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە لای عائیشە ئافرەتێکی جوولەکە لە لای بوو وتی بە عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) ئایا دەزانی کە ئێوە تاقی دەکرێنەوەو سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکانتاندا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕاچڵەکی و فەرمووی: (بێگومان جوولەکە تاقی دەکرێنەوە) عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: چەند شەوێکمان بەسەر تێپەڕی. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هۆشیار بن بێگومان ئێوە ئەکەونە بەر تاقیکردنەوە لەنێو گۆڕەکانتاندا). عائیشە (ڕەزای خوای لیٚ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای ئەوە بەردەوام هانای دەبرد بۆ خودا لە تاو سزای گۆڕ.[2] موسلیمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە.[3] هەندێکی تریش دەڵێن: کە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر سزای گیان لە بەرزەخداو مەرج نیە ئەو سزایە تووشی لاشەکانیش ببێت لە گۆڕەکانیاندا. بەڵام کاتێك کە نیگا (وەحی) هات بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەو بارەیەوە، پەنای دەبرد بۆ خودا لە سزای گۆڕ (والله أعلم). فەرموودە لە بارەی سزای گۆڕەوە ئێجگار زۆرە. قەتادە دەڵێت: ﴿غُدُوًّا وَعَشِيًّا﴾ واتە: بەیانیان‌و ئێواران هەتا دنیا بەردەوامەو دەمێنێت دەوترێت بە ئالی فیرعەون ئەمە شوێنتانە بۆ سوکایەتی پێکردن‌و خەفەت پێدان‌و زیاتر جەزرەبەدانیان.[4] ئیبنو زەید دەڵێت: ئەوانە ئەمڕۆ لەناو

---

[1] أحمد (٦/٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٦/٢٤٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم (١/٤١٠).

[4] الطبري (٢١/٣٩٦).

سزادان بە بەیانیان‌و ئێواران دەبرێنە سەر ئاگر هەتا ڕۆژی قیامەت دێت، ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ﴾ ئالی فیرعەون وەك وشتری بەرەلا لەناو جەهەنمدا لەدارو بەرد هەڵدەکەون وعەقڵیان بەوە ناشکێ خۆیانی لێ لابدەن! ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەر کەسێك لە ئێوە مرد شوێنی خۆی نیشان دەدرێت لە کاتی بەیانی‌و ئێوارە، ئەگەر لە ئەهلی بەهەشت بووبێت، ئەوا ئەهلی بەهەشتە، وە ئەگەر لە ئەهلی جەهەنەمیش بووبێت، ئەوا لە ئەهلی جەهەنەم، پێی دەڵێن: ئەمە شوێنی تۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت خودا زیندووت دەکاتەوە بۆ لای خۆی.[1] بوخاری‌و موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەدا هێناویانە[2].

﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُواْ بَلَىٰ ۚ قَالُواْ فَٱدْعُواْ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾﴾

### کێشەی خەڵکی ناو ئاگر

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: کە ئەو کەسانە لەناو ئاگردا کێشە لەگەڵ یەکتر دەکەن. بێهێزەکان بە خاوەنهێزەکان دەڵێن: ئێمە شوێن ئێوە کەوتبووین ئاخۆ ئێوە پێتان دەکرێت لە جێی ئێمە لەو ئاگرە، بەشێك بۆ خۆتان هەڵگرن؟ خوای گەورە باسی کێشەی خەڵکی ناو ئاگرو مشتومڕیبان دەکات. فیرعەون‌و هۆزەکەی یەکێکن لەوانە، بێهێزەکان کە شوێنکەوتووی بەهێزەکان بوون، دەڵێن پێیان: ﴿إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا﴾ واتە: ئێمە کوێرایەڵو شوێنکەوتووی ئێوە بووین‌و لە قسەی ئێوە دەرنەدەچووین بۆ هەر شتێك داواتان بکردایە لێمان لە خوانەناسی‌و خراپەکاریەنەمانکرد ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ﴾ واتە: هەندێ لەو

---

[1] أحمد (٢/١١٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٣/٢٨٦)، مسلم (٤/٢١٩٩).

ئاگرە لە باتی ئێمە هەڵگرن و لە کۆڵی ئێمەی بکەنەوە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ ٱلْعِبَادِ ﴾ بەهێزە لەخۆباییەکان دەڵێن: هەموو لە ئاگرداین. خودا بە کاری عەبدانی ڕادەکات. ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ ﴾ واتە: سزا لە نێوانماندا دابەش کراوە هەر کەسەو بە پێی تاوانی خۆی سزا دەدرێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴾[1] واتە: بۆ هەر کامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن و بێئاگان.

وە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: ئەو کەسانەش کە چوونە ناو ئاگرەوە، لە گزیرەکانی ناو ئاگر داوا دەکەن، لەبەر پەروەردگاری خۆتان بۆمان بپاڕێنەوە، ڕۆژێکمان لەو ئازارە بۆ کەم بکاتەوە. واتە کاتێك بۆیان دەرکەوت کە وەڵام نادرێنەوەو کەس گوێ بۆ قسەیان ناگرێت، بەڵکو خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾[2] واتە: بەبێ نرخی و ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخداو هیچ قسەیەکم لەگەڵدا مەکەن. واتە: قسە نەکەن و فزەتان لێوە نەیەت. پاشان دەڵێن بە پاسەوانەکانی جەهەنەم کە داوایان بۆ بکەن لە لای خودا کە هەندێ ئازاریان لەسەر کەم بکاتەوە. پاسەوانەکانی جەهەنەمیش وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن: ﴿قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَـٰٓؤُا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ﴾ واتە: دەڵێن: ئاخۆ ئێوە پێغەمبەرانتان بە نیشانەی ئاشکراوە نەهاتە لا؟ دەڵێن: بەڵێ. دەڵێن: دەی خۆتان بپاڕێنەوە دیارە نزای خوانەناسان بەشی هەر بەفیڕۆچوونە. ﴿قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ واتە: ئایا نیشانەو بەڵگەی ئاشکراتان لە لایەن پێغەمبەرەکانەوە بۆ نەهات لە دنیادا، ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟﴾ واتە: خۆتان بۆ خۆتان بپاڕێنەوە، ئێمە کارمان بەسەرتانەوە نیەو گوێشتان بۆ ناگرین، هیچ دەسەڵاتێکمان نیە ناتوانین ڕزگارتان بکەین، ئەوسا پێتان دەڵێین: هاوار بکەن یان هاوار نەکەن وەڵام نادرێنەوەو ئازاریشتان لەسەر سووك ناکرێت، ﴿وَمَا دُعَـٰٓؤُا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ﴾ واتە: هەرچی بڵێن سودی نیەو بەفیڕۆ دەچێت لێتان وەرناگیرێت و وەڵام نادرێنەوە.

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] المؤمنون (١٠٨).

﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ
مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْهُدَى وَأَوْرَثْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ
الْكِتَابَ ﴿٥٣﴾ هُدًى وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٥٤﴾ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ
وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ
أَتَاهُمْ إِن فِي صُدُورِهِمْ إِلَّا كِبْرٌ مَّا هُم بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ
الْبَصِيرُ ﴿٥٦﴾﴾

**یاریدەدانی پێغەمبەران و (سەلامی خوایان لێ بێت) خاوەن باوەڕان**

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ﴾ بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەو کەسانەی کەوا بڕوایان هێناوە لە ژیانی ئەم دنیایەداو لەو ڕۆژەشدا کە شایەتەکان ڕاست دەبنەوە،سەریان دەخەین. ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ سودی دەڵێت: خوای مەزن هەرگیز پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردووە بۆ ناو گەلێك کاتێك کە شەڕیان لەگەڵ کردووە یان کوشتوویانە یان گەلێکی خاوەن باوەڕ بانگی خەڵکی کردبێت شەڕیان لەگەڵدا کرابێت و کوژرابن ئەو چەرخە کۆتایی نەهاتووەو تەواو نەبووە هەتا خوای خاوەن دەسەڵات کۆمەڵێکی ناردووە یارمەتی داون و داوای خوێنی ئەو کەسانەیان کردووە لەوانەی کە کوشتونیان هەر لە دنیاداخوای هەقی بۆ کردوونەتەوە، سودی دەڵێت: ئەو پێغەمبەرو خاوەن باوەڕانەی کە شەڕیان لەگەڵدا کراوەو کوژران هەر لە دنیادا یارمەتی دراون.[1] وە هەر بەو شێوەیەش خوای مەزن یاریدەی پێغەمبەرەکەی موحەممەدو(ﷺ) هاوەڵەکانی داوە بەسەر ئەوانەی کە دژایەتیان کردووەو بڕوایان نەهێناوەو شەڕیان لەگەڵدا کردووە. خوای گەورە قسەی خۆی بەرزو بڵند ڕاگرتووەو سەری خستووە بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا. وە فەرمانی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) کە کۆچ بکات لە نێوان هۆزەکەیداو بچێت بۆ (مەدینە) واتە شاری پێغەمبەر(ﷺ) و لەوێدا یارمەتیدەرو پشتیوانی بۆ پەیدا کرد، پاشان زاڵی کرد بەسەر خوانەناساندا لە ڕۆژی (بەدر)داو سەری خست بەسەریانداو سەرشۆڕی کردن و پیاوە ستەمکارو ملهوڕەکانی کوشتن و پیاوە ناودارەکانی بە دیل گرتن و بە دەست و پێ بەستراوی بردنی، پاشان منەتی کرد بەسەیاندا فیدیەی لێ وەرگرتن و ئازادی کردن، پاش ماوەیەکی کەم مەککەیشی بۆ ڕزگار کرا، چاوی ڕووناك بووەوە بە شارەکەی خۆی. کە ئەو شارە مەزن و ڕێزلێگیراوو پارێزراوەیە کە

---

[1] الطبري (٢١/٤٠١).

خودا ڕزگاری کرد بە هۆی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەو شیرك و بێدینیە کە تێیدا دەکرا. وڵاتی یەمەنی خستە ژێر دەستیو هەموو خەڵکی دورگەی عەرەبی خۆیان دا بە دەستەوەو پۆل پۆل دەچوونە ناو ئاینی ئیسلام. پاشان خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی، بەو هەموو ڕێزو حورمەتەوە کە لە لای خودا هەیبوو. پاشان خوای گەورە هاوەڵەکانی داناو کردنیە خەلیفەو جێنشینی دوای پێغەمبەر(ﷺ) لە باتی پێغەمبەر(ﷺ) دەستیان کرد بە گەیاندنی ئاینی خوداو بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ لای خودا. زۆر وڵاتو ناوچەو شارو دێهاتو دڵانی ڕزگار کرد هەتا وای لێهات ئەم بانگی خودایە کە موحەممەد (ﷺ) هێنای بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا بڵاوەی کرد، ئەوەتا ئەم ئاینە تائێستاش هەر بە بەردەوامی ماوەتەوەو سەرکەوتوو بەردەوامیش دەبێت هەتا ڕۆژی قیامەت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ ءَامَنُوا فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَـٰدُ﴾ یانی: لە ڕۆژی قیامەتیشدا. سەرکەوتنەکە زیاترو گەورەترە. موجاهید دەڵێت ﴿الْأَشْهَـٰدُ﴾ واتە: فریشتەکان.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ الدَّارِ﴾ ئەو ڕۆژەی کە ناهەقان پاکانەکان یان سوودێکیان پێ ناگەیەنێتو گشتیان بە لەعنەت کراونو نالەبارترینماڵیان هەیە. ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ﴾ بەدەلە لەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَـٰدُ﴾[2]، هەندێ خوێندوویانەتەوە (یومُ) بە ڕەفعە وەك ئەوەی ماناکەی بەو سیفەتە تەفسیر کردبێت، ﴿وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَـٰدُ ۝٥١ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّـٰلِمِينَ﴾ واتە: موشریکەکان ﴿مَعْذِرَتُهُمْ﴾ واتە: پاکانەو فیدیەیان لێ وەرناگیرێت، ﴿وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ الدَّارِ﴾ واتە: لەعنەتیان لێ کراوەو دەرکراونو دوورخراونەتەوە لە بەزەیی خودا. شوێنیان ناو ئاگرە، سودی ئەمە دەڵێت،ئای چەندە شوێنو جێگایەکی خراپە!

**خوای مەزن ئاماژە بۆ سەرکەوتنی پێغەمبەرو موسڵمانان دمکات بەوەی کە چۆن موساو ئەوەی ئیسرائیلی سەرکەوتوو کرد هەر بەو شێوەیە ئەوانیش سەرکەوتوو دمکات**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى الْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ الْكِتَـٰبَ﴾ واتە: ئێمە هۆی ڕێنموونیمان دا بە موساو کارێکمان کرد کتێبەکە (بە کەلەپور) لەناو تۆرمەی ئیسرائیلدا بمێنێتەوە. ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى الْهُدَىٰ﴾ واتە: ئەوەی ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ موسا لە ڕێنمایی‌و

[1] الطبري (٢١/٤٠٢).

[2] یانی ئەوڕۆژەی کەفریشتەکان شایەتی ئەدەن لەسەرخەڵکی،پاکانەکردنی زاڵمەکان هیچ سودێکی نابێ بۆیان(وەرگێڕ).

ڕووناکی ﴿وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ یانی: دواڕۆژێکی خۆش و کەلەپورێکی چاکمان دانێ، لە وڵات و سامان و هەموو دەسهاتێك کە فیرعەون لە وڵاتدا بە دەستی هێنابوو. بە هۆی خۆڕاگری و گوێڕایەڵیان بۆ خوداو شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) پێڕەویکردن لەو کتێبەی بۆی هاتبوو کە تەوراتە، ﴿هُدٗى وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ کە ڕێگەنیشاندەرو بیرەوەریە بۆ کەسانی خاوەن ئاوەز.(اولوالاباب) یانی: خاوەن ئاوەزی ڕاست و ساغ، ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ﴾ خۆڕاگر بە، بەڵێنی خودا دێتەجێ، بۆ گوناهت داوای لێبوردن بکەو هەموو بەیانی و ئێواران (بە شوکرەوە) هەر پەسەندیدەی پاکی پەروەرندەی خۆت بە. ﴿فَٱصۡبِرۡ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) خۆڕاگر بە، ﴿إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ﴾ واتە: بەڵێنمان پێدای کە قسەی تۆ بەم زووانە بەرز دەکەینەوەو پاشەڕۆژ هەر بۆ تۆو شوێنکەوتووانتە، خوا بەڵێنی خۆی بەجێ دێنێت و ئەو هەواڵەش کە پێمان گەیاندووی ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە، ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ﴾ داوای لێبوردن بکە لە گوناهەکانت، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە ئوممەتەکەی بە پەلەو بێ وەستان داوای لێبوردنی گوناهیان بکەن لەخودای گەورەو دلۆڤان. ﴿وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ﴾ واتە: لە کۆتایی ڕۆژو هەوەڵی شەودا هەر باسی پاکی و بێ عەیبی خودا بکە، ﴿وَٱلۡإِبۡكَٰرِ﴾ واتە: لە هەوەڵی ڕۆژو کۆتایی شەویشدا هەر پەسەنی پەروەردگاری خۆت بدە.

پاشان خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ ئەو کەسانەی لە مەڕ نیشانەکانی خوادا کێشە دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیان بۆ هاتبێت جگە لە فیزکردن، هیچ شتێکیان لە دڵدا نیەو هەرگیز بەو ئارەزووە ناگەن. سا تۆ: پەنا بە خوا ببە، هەر خۆی بیسەرو بینایە. واتە: ئەوانەی کە پاڵ بە حەقەوە دەنێن بە شتی پڕوپوچ و دژی نیشانەکانی خودا دەوەستن بە بەڵگەی خراپ و ناپەسەند بەبێ ئەوەی هیچ شتێکیان بە دەستەوە بێت لە لایەن خوداوە، ﴿إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِ﴾ یانی: هەر فیزو خۆبەزلزانینە وای لێ کردوون کە شوێنی هەق نەکەون و ئەو کەسەی کە بۆیان ڕەوانە کراوە بەو پەیامەوە کە بۆی هێناون بە سوك سەیری بکەن و ئەوەی کە نیازیانەو وا لە دڵیاندا نایەتەدی بۆیان هەق لەناو ناچێت و پڕوپوچیش هەرگیز سەرناکەوێت هەموو کاتێك کە ئا بەو شێوەیە بیردەکەنەوە، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ واتە: خودا بیسەرو

بینایە بۆ تاوانی ئەو کەسانەی کە دەمەدەمێ دەکەن دەربارەی نیشانەکانی خودا بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێت.

﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا
يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾
إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾

**ژیانی پاش مردن**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ واتە: داهێنانی ئەم ئاسمانو زەمینە، لە وەدیهێنانی مەردم گرنگترە، بەڵام مەردم زۆربەیان ئەمە نازانن. خوای مەزن مەردم ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم خەڵکە زیندوونەکاتەوە جارێکی تر لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەمە لە لای خودا زۆر سوکو ئاسانە، چونکە ئەو خودایە ئاسمانەکانو زەمینی وەدیهێناوە کە دروستکردنی ئەوان زۆر گرنگترە لە دروستکردنی مەردم لە هەوەڵەوەو لە دوایشدا، خودایەك کە توانای دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمینی هەبێت بە تواناترە بۆ شتەکانی تر. وەك خۆی فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[1] واتە: ئایا ئەوانە نەیانزانیووە بە ڕاستی ئەو خوایەی ئاسمانەکانو زەوی دروست کردووەو لە دروست کردنیاندا ناتەوانو دەستەپاچە نەبووە بە توانایە مردوانیش زیندوو بکاتەوە، بەڵێ بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە. وە لێرەشدا دەفەرموویت: ﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ هەر لەبەر ئەوەیە کە بیر ناکەنەوە لەو نیشانانەو تێڕانامێنن وەك چۆن زۆرێك لە عەرەبەکان دانیان پێدا ناوە کە خودا داهێنەری ئاسمانەکانو زەمینە کەچی بڕوایان بە زیندووبوونەوە نەبووەو بە دووریان زانیووە بە هۆی لاساریو بێ دینیانەوە. پاشان خوای مەزن ئەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ کوێرو چاوساغ وەك یەك نین، ئەو کەسانەش کە بوونە خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن، لەگەڵ خراپەکاراندا نابن بە یەك، زۆر کەم بیر دەکەنەوە. واتە: وەك چۆن کوێرێك کە هیچ نابینێتو چاوساغێك کە چاوی بڕ

---

[1] الاحقاف (٣٣).

بکات وببینێت وەك یەك نین، بەڵکو جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا، هەر بەو شێوەیەش خاوەن باوەڕی ئاکار چاك لەگەڵ خوانەناسی لە ئەندازە دەرچوویش وەك یەك نین، ﴿قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ﴾ یانی: دەسا بۆچی ئەو خەڵکە کەمێك بیر ناکەنەوە، پاشان خوای مەزن ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ ماتنی ڕۆژی قیامەت هیچ گومانی تێدا نیە، بەلام زۆرینەی ئەم خەلکە بڕوا ناکەن. ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت هەر دێتو هیچ گومانی تێدا نیە، ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ واتە: بەلام زۆریەی ئەم مەردمە بە ڕاستی نازانن‌و بڕوای پێ ناکەن‌و نکولی لێ دەکەن.

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾

### فەرماندان بە پاڕانەوە

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ واتە: پەروەردگارتان وتوویەتی: لە بەرم بپاڕێنەوە، ئەوسا بە دەنگتانەوە دێم، ئەو کەسانەی (هەر لەبەر خۆبەزلزانین) نایانەوێت بمپەرستن، بە زەبوونی دەچنە ناو جەهەنەمەوە. ئەمە لە ڕێزو کەرەمی خوای مەزنەوەیە کە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە لێی بپاڕێنەوە، بەڵێنیشی پێداون کە وەلامیان بداتەوە وەك سوفیانی سەوری دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی کە زۆر پێی خۆشە عەبدەکانی زۆر داوای لێ بکەن‌و لێی بپاڕێنەوە، وە ئەی ئەو کەسەی کە زۆر توورەی لەو عەبدانەی کە داوای لێ ناکەن‌و لێی ناپاڕێنەوە.کەس ئەمەی لێ ناوەشێتەوە غەیری تۆ ئەی پەروەردگار!، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. وە هەر لەم واتایەدا ئەم شاعیرە دەڵێت:

اللهُ يغضبُ إن تركت سُؤالَهُ وبُنيُّ آدم حين يُسال يَغضَبُ

واتە: خودا توورە دەبێت ئەگەر داوای لێ نەکەی، کەچی نەوەی ئادەم کاتێك پرسیاری لێ دەکرێت توورە دەبێت! قەتادە دەڵێت: کەعبی ئەحبار دەڵێت: سێ شت دەبەخشرێت بەئەم ئوممەتە کە نەدراوە بە هیچ گەلو پێغەمبەرێك لە پێشتردا: کاتێك کە پێغەمبەرێك ڕەوانە بکرایە پێی دەوترا تۆ شایەتی لەسەر ئوممەتەکەت.کەچی خوا ئێوەی کردووە بە شایەت بەسەرهەموو خەڵکیەوە! وەبەو پێغەمبەرەی ئەوت: هیچ گرانیەکت لەسەردانانرێ لە ئاینەکەتدا، کەچی خوا بە ئەم ئوممەتە

ئەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ﴾[1] واتە: وە لە ئاییندا هیچ کارێکی قورس و گرانی لەسەر دانەناون. وە وتراوە بەو پێغەمبەرە بپاڕێرەوە هەتا وەڵامت بدەمەوە. کەچی بەم ئومەتە وتراوە: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ﴾! ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان پاڕانەوە خواناسیو عیبادەتە) پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾.[3] هەر بەم شێوەیە زانایانی فەرموودە وەك تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو ماجەو ئیبنو ئەبی حاتەمو ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاكو ڕاستە (حسن صحيح).[4] وە دیسان ئەبو داودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو جەریرئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە لە ڕێگایەکی ترەوە.[5] خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي﴾ واتە: ئەوانەی خۆ بە زل دەگرن لە پاڕانەوەو ناسینی من بە تەنها، ﴿سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ واتە: بەم زووانە دەخرێنە ناو جەهەنەم بەسەرشۆڕیو زەبوونی وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە ئەویش لە باپیرەوەوئەویش لە باپیرەیەوەوئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمووی: (خۆ بەزل زانان لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکرێنەوە وەك مێروو لەو لە شکلی مەردمدا، هەموو شتێك دەکەوێتە سەریانەوە ئەمان لەخوار هەموو شتێکەوەن بەهۆی ڕیسواییانەوە تا دەچنە ناو بەنداخانەیەك لە جەهەنەمدا پێی دەوترێت (بولس) بڵێسەی ئاگر بەسەریاندا بەرز دەبێتەوە، ئاویان دەدرێتێ لە قوڕاوی پیس کە کێمو زوخی (تواوەی لەش)ی خەڵکی ناو ئاگرە)[6].

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٦١ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ

---

[1] الحج (٧٨).

[2] القرطبي (٣٢٧/١٥).

[3] أحمد (٢٦١/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الأحوذي (٣٠٨/٨)، النسائي في الكبرى (٤٠٥/٦)، ابن ماجه (١٢٥٨/٢)، الطبري (٤٠٦/٢١-٤٠٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] أبو داود (١٦١/٢)، تحفة الأحوذي (١٢١/٩)، النسائي في الكبرى (٤٥٠/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[6] أحمد (١٧٩/٢)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکەی حەسەنە.

﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا
وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ
ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ
ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾﴾

**نیشانەکانی خودا لەسەر توانا و تاك و تەنهایی خۆی**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ هەر خودایە شەوی بۆ ئێوە پەیداکردووە کە تێیدا بحەسێنەوە و ڕۆژیشی بۆ دیتن داناوە، خودا چاکەی دەربارەی مەردم کردووە کە شەوی بۆ ڕام کردوون کە تێیدا ئارام بگرن و بحەسێنەوە لەسەر ئەو هاتوچۆ و ماندووبوونەیان کە بە ڕۆژدا تووشی دەبن بە هۆی پەیداکردنی بژێویەوە، وە ڕۆژیشی بۆ ڕووناك کردوونەتەوە بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان بگەڕێن بە وڵاتاندا هەتا پێویستی خۆیان بە دەست بێنن و فێری جۆرەها پیشەسازی ببن و بەکاری بێنن بۆ پێویستی خۆیان، ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ ئەو خودایە ئێوەی پەروەردە کردووە و وەدیهێنی هەموو شتە لە غەیری ئەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێت، دەی چۆن لە هەق لادەدرێن؟ واتە: ئەو خودایەی ئەو هەموو شتەی کردووە، خودایەکی تاك و تەنهایە، وە هەر خۆی وەدیهێنەری هەموو ئەو شتانەیە غەیری ئەو هیچ خودایەك نیە، ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ واتە: کەوایە چۆن ئێوە بت دەپەرستن کە توانای هیچ شتێکی نیە، بەڵکو ئەو بتە خۆی تاشراوە و دروست کراوە. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ هەر بەو تەرزە ئەو کەسانەی لە نیشانەکانی خودا حاشا دەکەن، لەوەی ڕاستە کلا دەکرێن، واتە: وەك چۆن ئەمانە لە ڕێ لادەدەن و گومڕا بوون و غەیری خودا دەپەرستن هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش غەیری خودایان پەرستووە بەبێ هیچ بەڵگەیەك بەڵکو هەر بە ئارەزوو نەفامی خۆیان پەرستوویانن، ئینکاری و دژایەتی نیشانەکانی خودایان کردووە، خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ئەو خودایە سەر زەمینی بۆ ئێوە کردە نیشتەجێ، ئاسمانیشی لەسەر بەرز کردوونەتەوە. ئەو بیچمەی بە

ئێوەی داوە، لە هەموو بیچمێك جوانترە. بژێوی باشی پێداون، هەر ئەوە خوای پەروەردگارتان. بەرزیو پیرۆزی بۆ خودا، کە پەروەردگاری دنیایە. ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا﴾ واتە: ئەو خودای کە سەر زەمینی کردووە بە شوێنی نیشتەجێتانو پانو بەرینی کردووە بۆ ئەوەی لەسەری بژینو بچنو بێنو بگەڕێن بە ناویداو کێوەکانی بۆ داکوتاون لەناو زەمیندا هەتا نەڕواتو بوەستێت، ﴿وَالسَّمَاءَ بِنَاءً﴾ واتە: ئاسمانیشی بەرزکردووەتەوەو پارێزراوە بەسەرتانەوە، ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾ واتە: خودا بە جوانترینو ڕێکترین شێوە ئێوەی وەدی هێناوەو جیای کردوونەتەوە لە هەموو دروستکراوەکانی تر لە وێنەو بەژنو بالادا، ﴿وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ واتە: بژێوی چاکیشی پێداون لە خواردنو خواردنەوە لە دنیادا، خوای مەزن باسی کردووە کە خۆی مرۆڤەکانی نیشتەجێ کردووەو بژێوی پێ داون، کەواتە هەر خۆی وەدیهێنەرو بژێوی دەرە وەك لە سورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (٢١) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[1] واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردووە بەڵکو بەو پەرستشە خۆتان بپارێزن، ئەو (خوایەی) کە زەوی بۆ ڕاخستوونو ئاسمانی بۆ کردوون بە کۆشك (ئاسمانی بۆ گێڕاون بە گومەزی)و ئاوی (بارانی) لە ئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە ئینجا بەو ئاوە هەموو جۆرە میوەو بەرێکی بۆ ڕۆزی ئێوەدەری هێناوە کەواتە هاوتا بۆ خودا پەیدا مەکەن کە ئێوە خۆتان دەزانن (بێ هاوتایە). وە لێرەشدا پاش دروست کردنی ئەم شتانە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾ واتە: پاکیو بێ عەیبیو بەرزیو پیرۆزی بۆ خودا، کە پەروەردگاری هەموو جیهانە، پاشان خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ هەر زیندووەو لە غەیری ئەو هیچ پەرستراوێکی تر نیە. دەسا ئێوە بە دڵپاکی هەر هانا بۆ خودا بەرنو دینی پاکژتان بۆ ئەو بێت، سوپاس بۆ خودای ڕاهێنەری هەموو جیهان. ﴿هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: هەر ئەو زیندووە لە ئەوەڵو لە دوایدا لە ئێستاشداو بەردەوامیشە هەتاهەتایە. لەبەر چاوەو نادیارەو لە هەموو شت ئاگادارە. ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: لە وێنەی نیەو هیچ کەسیش لە ئەو ناکات،

---

[1] البقرة (٢١_٢٢).

﴿فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ واتە: خاوەن باوەڕان بە دڵپاکی دانی پێدا دەنێن کە هیچ خودایەك نیە غەیری ئەوو سوپاسو ستایش بۆ پەروەرینی هەموو جیهان. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لە دوای هەموو نوێژێك کە سەلامی دەدایەوە دەیوت: (لا إله إلاّ الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير، لا حول ولا قوة إلاّ بالله، لا إله إلاّ الله، ولا نعبد إلا إياه له النعمة وله الفضل وله الثناء الحسن، لا إله إلاّ الله مخلصين له الدين ولو كره الكافرون). دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوای هەموو نوێژێك بە دەنگی بەرز ئەمانەی دەفەرموون.[1] موسلیمو ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە[2].

﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾﴾

**نەهی کردن لە هاوەڵ دانان بۆ خوداو فەرماندان بە یەکخوا پەرستی و بەڵگەهێنانەوە لەسەری**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ بڵێ: من پاش ئەو بەڵگانەی لە لایەن پەروەردگارمەوە بۆم هاتووە، ڕێم نەدراوە ئەو شتانە بپەرستم کە (خوا نینو) ئێوە هانایان پێ دەبەن، هەر فەرمانم پێدراوە خۆم بسپێرم بە ڕاهێنەری گشت جیهان. خودای مەزن دەفەرموێت ئەی موحەممەد (ﷺ) !بڵێ بەو کەسانەی کە شەریك بۆ خودا دادەنێن، خودای گەورە ڕێی نەداوە کەسێکی تر بپەرستێت غەیری ئەو. لە بتو دارو بەردو مرۆڤ. وە ڕوونو ئاشکرایە کە هیچ کەس شایەنی پەرستن نیە، ئەو خودا خاوەن دەسەلاتو مەزنە نەبێت. وە دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ يُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗاۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبۡلُۖ وَلِتَبۡلُغُوٓاْ أَجَلٗا مُّسَمّٗى وَلَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ هەر ئەوە ئێوەی دروست کرد لە قوڕێكو پاشان لە تنۆکێكو پاشان لە خوێنێکی بەستوو پاشان دەتانهێنێتەدەر بە ساوایيو پاشان بە خۆدا دێن هەتادەبن بە لاوێکی بەهێزو پاشان بە پیری دەگەنو هێندێکیشتان بەر لەوە پیر ببن دەمرن. هەتا دەگەن بە ئەو کاتەی بۆتان

[1] أحمد (٤/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٤١٥/١/٤١٦)، ابو داود (١٧٣/٢/١٧٤)، النسائي (٦٩/٧٠).

دیاری کراوە، شایەت (لە خۆتان) ڕامێنن. واتە: هەر ئەو خودایە کە بەم هەموو پلەو قۆناغانەدا دەتانبات و تێتان دەپەڕێنێت کە شەریکی نیەو هەر بە فەرمان و بڕیارو بەرنامەی ئەو هەموو شتێك دەبێت، ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ﴾ واتە: هەندێکتان پێش ئەوەی لە دایك ببێت و بێتە سەر ئەم دنیایە دەمرێت و لە باری دایکی دەچێت، وە هەندێکیش بە منداڵی و بە لاوی دەبێتە پیاوێکی تەواو دەمرێت و هەندێکیش بە پیری دەمرێت وەك خوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾[1] واتە: بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە بۆ ئێوەو لە منداڵاندا دەیهێڵینەوە (ڕایدەگرین) ئەو (بێچو)ەی بمانەوێت (لەبارنەچێت) تا کاتێکی دیاریکراو. خوای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ ئیبنو جورەیج دەڵێت: بەشکو قیامەتتان وەبیربێتەوە! پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر خۆیەتی ژین دەدات و دەشمرێنێت. هەر کارێکی بوێت، هەر پێی بڵێ: ببە دەبێت، ﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ واتە: هەر ئەوە دەژێنێت و دەمرێنێت کەسی تر توانای ئەوەی نیە تەنها خودا نەبێت، ﴿فَإِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: هەر فەرمانێك بدا کەس ناتوانێت ڕێی لێ بگرێت بەڵکو مەیلی لە هەر شتێك بێت مەگین دەبێت.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا
بِهِ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ
يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ اللَّهِ ۖ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُو
مِن قَبْلُ شَيْئًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ ﴿٧٤﴾ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ
تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾﴾

**پاشەڕۆژی ئەو خوانەناسانەی چەنەبازی دەکەن**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ﴾ ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە کە لە نیشانەکانی خودا دەمەدەمێ دەکەن، چۆن ڕێ لە خۆ دەگۆڕن؟ خوای گەورە دەفەرموێت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئاخۆ ئەی موحەممەد تۆ بە لاتەوە سەیر نیە ئەو کەسانەی کە خوانەناسن دەمەدەمێ دەکەن دەربارەی نیشانەکانی خودا، دەیانەوێت بە قسەی پڕوپوچ بەرەنگاری

---

[1] الحج (٥).

حەق ببنـەوە، چـەنـدە سـەرلێ شـێواونو ڕێ لێتێکچوونو لـە ڕێـی ڕاسـت تـرازاون، ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ ئـەو کەسـانەی کـە هـەر بڕوایـان نـەهێنا بـەم قورئانـەو بـەو شـتانەی پێغەمبـەرانمان بـۆ نـاردوون، زۆر ناخایـەنێت تێدەگـەن. ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا﴾ واتە: ئەوانەی بڕوایان بە قورئـان نـەهێناو بـەو ئامۆژگاریو ڕێ نیشاندانو ڕوونکردنەوانـەی کـە بـە پێغەمبەرەکانـدا بۆمـان نـاردن، ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ بـەم زووانـە تێدەگەن. ئەمە هەڕەشـەیەکی زۆر توندو بـەڵێنێکی جـەخت لەسـەر کـراوە لـە لایـەن خـودای خاوەن دەسەلاتەوە بۆ ئەوانـە. وەك لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرمووێت: ﴿وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ﴾[1] واتـە: وای بۆ بێبـاوەڕان لـەو ڕۆژەدا. خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ﴾ ئەوساکە هەر یەك چەند تەوقی لە ملدایەو بە زنجیر ڕایاندەکێشن. واتە: وان بە دەستی(زەبانیـە)کانی جەهەنەمەوە ڕایاندەکێشن بـە ڕووداو جارێك لـە ئاوەکوڵیـان هەڵدەکێشنو پاشـان لـەناو جەهەنەمدا دەیانسوتێنن. بۆیە خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ﴾ بۆ نـاو ئـاوێکی زۆر گـەرمو لـە دوای ئـەوە لـەناو ئـاگردا گڕدەدرێن. وەك خـوای گـەورە فەرموویـەتی: ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾[2] واتـە: ئەمـە ئـەو دۆزەخەیـە کـە تاوانباران بە درۆیان دەزانی، هاتوچۆ دەکەن لە نێوان ئەو (دۆزەخە)و ئاوی زۆر گەرمدا. دوای ئـەوەی خوای مەزن باسی خواردنو خواردنـەوەکانی کـردن کـە زەقنـەموتو ئاوەکوڵـە دەفـەرمووێت: ﴿ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ﴾[3] واتە: بێگومـان دواتـر گەڕانـەوەیان بـۆ دۆزەخـە. وە لـە چـەند ئایـەتێکی تـردا دەفـــەرمووێت: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾

---

[1] المرسلات (١٥).

[2] الرحمن (٤٣ـ٤٤).

[3] الصافات (٦٨).

﴿فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾[1] واتە: وە هاوڕێیانی دەستە چەپ، کام هاوڕێیانی لای چەپ؟، لە ناو گڕی دۆزەخو ئاوی لە کوڵ دان، وە لە سێبەری چڕەدوکەڵی ڕەش دان، نەفێنکەو نە کەڵکیشی هەیە، پاشان ئێوە ئەی گومڕایانی بێباوەڕان، بێگومان لە (بەری) درەختی زەقنەمووت (دەخۆن) جا ورگی خۆتانی لێ پڕ دەکەن، ئەنجا کوڵاوی بەسەردا دەخۆنەوە، دەی خۆنەوە وەکو خواردنەوەی (حوشترانی) تینوو، ئەمە میوانداری ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ﴾[2] واتە: بێگومان درەختی زەقنەمووت، خۆراکی تاوانبارە (کافرە)، وەکو خڵتەی ڕۆنو زەیتون لەناو سکەکاندا دەکوڵێت، هەروەکو کوڵانی ئاوی یەکجار گەرم،ئا (ئەو کافرە) بگرنو بە توندی ڕایکێشن تا (دەیبەنە) ناوەڕاستی دۆزەخ، پاشان بیڕژن بەسەر سەریدا هەندێ لە ئاگرو ئاوی زۆر گەرم، (پێی دەوترێت) بیچێژە چونکە بە ڕاستی تۆ بە دەسەڵاتو بەڕێزی (گاڵتەی پێ دەکرێت)، بێگومان ئەمە ئەو سزایەیە ئێوە گومانتان لێی هەبوو. واتە: ئەم قسانەیان پێ دەوترێت بۆ سوکایەتی پێکردن و کەم سەیرکردنو گاڵتەپێکردنو سەرزەنشتکردنیان، ﴿ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾ ئەم جارە لێیان دەپرسن: کوان ئەوانە دەتانوت: شەریکی خودان. واتە پێیان دەڵێن: کوان ئەو بتانەی کە ئێوە دەتانپەرستن غەیری خودا. ئاخۆ ئەمڕۆ فریاتان دەکەون؟ ﴿قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ دەڵێن: لەبەر چاومان ونن، خۆ ئێمە لەسەر دنیاش بووین، غەیری خودامان نەدەپەرست. خودا ئاوا خوانەناسان گومڕا دەکات. ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا﴾ واتە: ڕۆیشتنو هیچ سودێکیان بە ئێمە نەگەیاند، ﴿بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا﴾ واتە: نینکاری دەکەن کە هەرگیز غەیری خودایان پەرستبێت، وەك خوای گەورە لە سورەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[3]. بۆیە خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتە: ئا بەو شێوەیە خودا خوانەناسان گومڕا دەکات، ﴿ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ

---

[1] الواقعة (٤١-٥٦).

[2] الدخان (٤٣-٥٠).

[3] الانعام (٢٣).

تَمْرَحُونَ ﴾ سا ئەمە گڕی گیانتان بێت! چونکە ئێوە لەسەر زەمین لە ناڕەوا کەیفتان دەکرد، بادیی هەواییتان دەنواند. واتە: فریشتەکان پێیان دەڵێن: ئەوەی ئێستا بەسەرتان دێت بە هۆی ئەوەوەیە کە ئێوە لە دنیادا لە خۆتان بایی بووبوونو هۆشتان بە خۆتانەوە نەمابوو بە ناهەق فیزتان دەکردو خۆتان بەزل دەزانی، ﴿ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ لە دەرگاکانی جەهەنەم بچنە ئەودیوو تاهەتایە لەوێدا بمێننەوە، جێگەی خۆبەزلزانەکان چەند ناخۆشەو پڕە لە جەزرەبەی توندو تیژو سوکایەتی پێکردن لەبەر ئەوەی کە بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەدەکردو گاڵتەیان پێدەهاتو فیزیان دەکرد. والله أعلم.

﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ
إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِىَ بِٱلْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾

**فەرماندان بە خۆڕاگریو مژدەدان بە سەرکەوتن**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾ سا بوەستە، چونکە بەڵێنی خودا ڕاستە، یان هێندێکت لەو بەڵێنەی پێیان دەدەین، نیشان دەدەین، یان مەرگت بەسەردا دەێنین (هەرچۆنێك بێت) هەموو لایەك هەر دەهێنینەوە لای خۆمان. خوای گەورە فەرمان دەدان بە پێغەمبەر(ﷺ) کە خۆڕاگرێت لەسەر باوەڕنەهێنانی ئەوانەی کە بڕوای پێ ناکەن لە هۆزەکەی چونکە گومانی تێدا نیە کە خودا ئەو بەڵێنەی کە پێی داوی بۆت جێبەجێ دەکات لە یارمەتیدانو سەرکەوتن بەسەریانداو پەشەڕۆژ هەر بۆ تۆو ئەو کەسانەیە کە شوێنی تۆ کەوتوون لە دنیاو لە قیامەتدا، ﴿فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ﴾ واتە: ڕاوەستە هەندێ لەو بەڵێنانەی کە پێیان دەدەین نیشانی تۆش دەدرێت هەر لە دنیادا، هەر واش بوو خوای هێژا چاوی پێغەمبەرو (ﷺ) خاوەن باوەڕانی ڕۆشن کردەوەو دڵخۆشی کردن بە لەناودانی ئەوانەی خۆیان بە گەورەو پیاو ماقوڵانی ئەوان دەزانی لە جەنگی بەدرداو پاشان خوای مەزن مەککەو دورگەی عەرەبیشی بۆ ڕزگارکردن لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ). وە دەفەرموێت: ﴿أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾ واتە: یان دەیانمرێنینو سزای توندو تیژیان پی دەچێژین لە ڕۆژی قیامەتدا، پاشان خوای مەزن دڵی پێغەمبەر(ﷺ) خۆش دەکات دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِىَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ قُضِىَ

بِٱلۡحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ لەپێش تۆشداگەلێ پێغەمبەرمان ناردن،بەسەرهاتی هێندێکیانمان بۆ باس کردووی، هەیشن کە باسمان نەکردوون. هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ هەتا خودا ئیزنی نەدات، هیچ بەڵگەیەك نیشان بدات. هەر کاتێك فەرمانی خودا هات. دەبێت ڕاستی بە کاری مەردم ڕابگاتو هەرکێ لەسەر پڕوپوچن تێدا دەچن. ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ﴾ وەك خوای گەورە لە سورەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴾[1] واتە: وە پێغەمبەرانێك بێگومان بەسەرهاتەکانیانمان گێڕاوەتەوە بۆت لەمەوپێش و پێغەمبەرانێك بەسەرهاتەکانیانمان نەگێڕاوەتەوە بۆت و خوا قسەی کرد لەگەڵ موسا بە قسەکردن. واتە: هەندێ لەو پێغەمبەرانەمان بۆ باس کردووی کە گەلەکانیان چۆن بڕوایان پێ نەهێناون، پاشان سەرکەوتن و پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەو پێغەمبەرانە بوو (سەلامی خوایان لێ بێت)، ﴿وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَ ﴾ کە زۆر زۆرتر بوون لەو پێغەمبەرانەی (سەلامی خوایان لێ بێت) کە بۆمان باس کردووی. وەك لە سورەتی (النساء)دا کە لە پێشەوە باسمان کردو روونمان کردەوە، ﴿وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ واتە: هەرگیز هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە موعجیزەیەکی هێنابێت بۆ گەلەکەی مەگین خودای گەورە ئیزنی داوە کە ئەو موعجیزەیە بەکاربێنێت و بیکاتە بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون، ﴿فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ هەر وەختێك کە سزاو جەزرەبەی خوا دەوری خوانەناسانی دا، ﴿قُضِيَ بِٱلۡحَقِّ﴾ خودا فەرمانی خۆی بەجێ دەهێنێ و خاوەن باوەڕان ڕزگار دەکات و خوانەناسانیش لەناو دەبات بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی خەریکی شتی پڕوپوچن لەناو دەچن.

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمَ لِتَرۡكَبُواْ مِنۡهَا وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَلِتَبۡلُغُواْ عَلَيۡهَا حَاجَةٗ فِي صُدُورِكُمۡ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَأَيَّ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ ﴾

### ئاژەڵ (مەڕومالات)یش دیسان لە بەهرەو نیشانەکانی خودایە

خوای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمَ لِتَرۡكَبُواْ مِنۡهَا وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴾ هەر خودایە مالآتی بۆ پەیداکردن، هەتا ئێوە سواریان بن و لێیان بخۆن. خوای گەورە منەت دەکات بەسەر

[1] النساء (١٦٤).

عەبدەکانیدا کە ئەو هەموو گیانەوەرەی بۆ دروست کردوون وەك وشترو ڕەشەوڵاغو بزنو مەڕو هەندێ ئەوانە بۆ سواری بەکاریان دێنن‌و هەندێکیشیان لێیان دەخۆن بۆ نموونە وشتر گۆشتەکەی دەخورێت‌و بۆ سواری‌و بار لێنان بەکار دەهێنرێت. لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر با زۆر دووریش بێت ڕەشەوڵاغیش گۆشتی دەخورێت‌و شیریشی دەخورێتەوەو زەمینی پێ دەکێڵرێت. مەڕو بزن گۆشتیان دەخورێت‌و شیریان دەخورێتەوە. ئەمانە هەموویان موو خوریەکەیان لێ دەکرێتەوەو بەکاردەهێنرێت بۆ پێویستی ناو ماڵ‌و جلوبەرگ، وەك چۆن بە درێژی لە سورەتی (الانعام)و (النحل)دا باسکراوەو ڕوون کراوەتەوەو لە چەند شوێنی تریشدا لە قورئاندا باسیان هاتووە. بۆیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ وە دەفەرموێت: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾ گەلێك بەهرەی تریشیان بۆ ئێوە هەیە، ئەو نیازەی لە دڵتاندایە، لەسەریان پێکی دەهێنن‌و لەسەر کەشتیش هەڵدەگیرێن. وە دەفەرموێت: ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾ زۆرێك لە نیشانانی خۆی، دەخاتە بەر چاوی ئێوە، ئێوە حاشا لە کام نیشانەی خودا دەکەن. ﴿وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ﴾ نیشانەکانی خۆی لە بوونەوەرو لە گیانی خۆتاندا، دەخاتە بەر چاوتان، ﴿فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾ واتە: ناتوانن ئینکاری هیچ بەڵگەیەکی خودا بکەن مەگەر بە لاساری‌و خۆبەزلزانین.

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾

### پەندوەرگرتن لە ژیانی پێشینەکان

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ ئاخۆ هەرگیز بە زەمیندا نەگەڕاون کە بزانن ئاکامی پێشینەکانیان بە کوێ گەیشت؟ کە لەمانە زۆرترو بەهێزتریش بوون، شوێنەواریشیان لە زەویدا پتر ماوە. سا هەرچی کۆیان کردەوە، هیچ بەهرەیەکی بۆ نەدان. خوای گەورە باسی گەلە پێشینەکانمان بۆ دەکات کە لە دێرزەمانەوە بڕوایان بە پێغەمبەرەکانیان

نەكردووە، چیان بەسەر هاتووە لە سزاو جەزرەبەی توندی خودا لەگەڵ ئەو هەموو هێزو توانایەدا كە بوویانەو ئەو هەموو سامانەی كە كۆیان كردبووەوەو لەسەر زەمیندا مایەوەو بەجێیان هێشت. هیچی فریایان نەكەوت و بە ئەندازەی قورسی گەردیلەیەك سودی پێی نەگەیاندن و لە سزای خوا لای نەدان، لەبەر ئەوەی كاتێك كە پێغەمبەرانیان بۆ هات (سەلامی خوایان لێ بێت) بە پەیامی ڕوون و نیشانەی ئاشكراو بەڵگەی بەهێزەوە، لایان لێ نەكردنەوەو ڕوویان تێ نەكردن، خۆیان بێنیاز كردبوو لەوەی كە ئەو پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێت) بۆیان هێنابوون، وایان دەزانی ئەمان لەوان شارەزاترن. موجاهید دەڵێت: وتیان ئێمە لەوانە زاناترین و هەرگیز پێغەمبەرمان بۆ ڕەوانە ناكرێت و سزایش نادرێین.[1] سودی دەڵێت: دڵخۆش بوون بەو زانیاریەی كە بوویان بە هۆی نەفامیانەوە.[2] سزایەكی وایان بۆ هات لە لایەن خوداوە كە نەیانتوانی خۆیانی لەبەردا بگرن و شوێن نەبوو ڕووی تێبكەن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ كە پێغەمبەرانی ئێمە بە نیشانەی ئاشكراوە چوونە لایان بەو هۆیە گوایە زۆر دەزانن دڵیان خۆش بوو، كەچی ئەوەی ئەوان گەمەیان پێدەكرد، دەوری لێدان. ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ واتە: دەوری لێدان، ﴿مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ﴾ واتە: بڕوایان نەدەكردو بە دووریان دەزانی شتی وا ڕووبدات هەتا ئەو سزایە دەوری دان، ﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ﴾ كاتێك دیتیان بەڵای ئێمەیان دێتەسەر، وتیان: ئیتر خوای تاقانە دەناسین و لەو شتانەی كەدەمانوت:ئەمانە شەریكی خودان،ئێستا حاشا دەكەین. ﴿فَلَمَّا رَأَوۡاْ بَأۡسَنَا﴾ كاتێك بۆیان دەركەوت كە سزای خودا هاتووەو دەرباز نابن. ﴿قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥ وَكَفَرۡنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشۡرِكِينَ﴾ واتە: دەیانوت: خودا تاك و تەنهایەو حاشایان دەكرد لەو شتانەی كە دەیانپەرست، بەڵام لە كاتێكدا كە جێی پەشیمانی نیەو بڕوبیانوو هیچ سوودێكی نیە. وەك ئەوەی كە فیرعەون كاتێك زانی ئیتر ڕزگاری نابێت و خەریكە دەخنكێت و ئاو دایدەپۆشێت، وتی: ﴿ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾[3] واتە: بڕوام هێنا كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەو (خوایە) نەبێت كە نەوەی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە وە منیش لە موسڵمانانم. خوای مەزنیش فەرموویەتی: ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ

---

[1] الطبري (٤٢٢/٢١).

[2] الطبري (٤٢٢/٢١).

[3] يونس (٩٠).

وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾[١] واتە: ئێستا (باوەڕدێنێت؟) كە بێگومان لەوەپێش سەرپێچیت كردو تۆ لە خراپەكارانو تێكدەران بوویت. واتە: خودا پەشیمانیەكەی لێ قەبوڵ نەكرد، چونكە خودا دوعاكەی موسای قەبوڵ كردبوو كە كردبووی لە فیرعەون وەختێك فەرمووی: ﴿وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[٢] واتە: دڵەكانیان ڕەقو ڕەش بكە چونكە بڕوا ناهێنن هەتا دەبینن سزای سەختی ئازاردەر. وە هەر بەم شێوەیە خوای مەزن لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ پاش دیتنی سزای ئێمە، بڕواهێنان قازانجی نەگەیاند ئەمە ڕێو شوێنی خودایە، دەربارەی هەموو عەبدانی هەر وا بووە، لەو كاتەدا هەر ئەوانەی خوانەناس بوون، زەرەریان كرد. واتە: ئەمە بڕیاری خودایە بۆ هەر كەسێك كاتێك سزا دەبینێتو چاری نامێنێتو پەشیمان دەبێتەوەو دەڵێت (خوایە پەشیمانم) لێی وەرناگیرێت. بۆیە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوای مەزن پەشیمانی (تەوبەی) عەبدی وەردەگرێت هەتا نەگاتە غەرغەرە).[٣] واتە: هەتا ئەو كاتەی كە گیان دەگاتە قوڕقوڕاگەو هیچ چارێكی نامێنێت، خەریكە گیانی دەردەچێتو لە ناڵەی مردندایەو فریشتەی گیان كێشان ئامادەی گیان كێشانیەتی ئا لەو كاتەدا پەشیمانی وەرناگیرێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ واتە: لەو كاتەدا ئەوانەی خوانەناسن، زەرەریان كردووە.

---

[١] یونس (٩١).

[٢] یونس (٨٨).

[٣] ابن ماجه (٢/١٤٢٠)، لە پێشەوە پلەكەی دیاری كراوە.

# تەفسیری سورەتی ( فصلت )

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا
وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ
وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾﴾

### سیفەتی قورئان و ( پەیڤینی ) نەیارەکانی

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿حمٓ﴾ حا، میم. ﴿تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾(ئەم قورئانە) هاتووەتەخوار لەو کەسەوە کە بەسۆزی دلۆڤانە. واتە: ئەو قورئانەی کە هاتووەتەخوار لە خوای بەسۆزی دلۆڤانەوە. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ﴾[1] واتە: بڵێ جوبرەئیل دای بەزاندووە لە لایەن پەروەردگارتەوە بە ڕاستی. وە دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴾[2] واتە: وە بە ڕاستی ئەم (قورئان)ە دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانیانە، جوبرەئیلی ئەمین هێنایە خوارەوە، بۆ سەر دڵی تۆ بۆ ئەوەی لە ترسێنەران بی. پاشان دەفەرموویت: ﴿كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ کتێبێکە نیشانەکانی بە ڕوونی شی کراوەتەوە، بە زمانی عەرەبیە، بۆ خەڵکانێك کەشت دەزانن. ﴿كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ﴾ واتە: کتێبێکە ماناکانی شی کراوەتەوەو بەرنامەکانیش زۆر بەڕێکی دامەزراوە ﴿قُرْءَانًا عَرَبِيًّا﴾ واتە: قورئانێکە بە زمانی عەرەبی هاتووەو ماناکانی ڕوون و ئاشکرایەو بە جوانی شی کراوەتەوە، ڕشتەکانیشی دیارەو هیچ گیروگرفتێکی تێدا نیە. وەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾[3] واتە: ئەمە کتێبێکە ئایەتەکانی داڕێژراوە پاشان ڕوون کراوەتەوە لە لایەن (خوای) کاردروستی زاناوە. واتە: ئەم قورئانە لەڕووی دەستە واژەکانیەوەولەڕووی ماناکانیشیەوە موعجیزەیە، ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ

---

[1] النحل (١٠٢).

[2] الشعراء (١٩٢ـ١٩٤

[3] هود (١).

وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[1] واتە: بەتاڵ ڕووی تێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دواڕۆژدا (نە بە لێ کەم کردن نە بە لێ زیادکردن) چونکە نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن (خوای) کاردروستی ستایش کراوەوە. وە دەفەرموێت: ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ مژدەدەرو ترسێنەرەوکەچی زۆربەیان خۆیان لێ بواردوەو ئامادە نین کە ببیسن. ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾ واتە: جارێك مژدە دەدات بە خاوەن باوەڕان‌و جارێکیش خوانەناسان دەترسێنێت، ﴿فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ واتە: زۆرێك لە قورەیشیەکان لێی تێناگەن‌و خۆیانی لێ لادەدەن لەگەڵ ئەو هەموو ڕوونی‌و ئاشکراییەی قورئاندا، ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَـٰمِلُونَ﴾ وتیان: لەوەی کە تۆ بۆ ئەومان بانگ دەکەی، دڵمان پەردە پۆشە لە ڕوویدا و گوێمان کەڕەو پەردەیەك هەیە لە نێوان ئێمەو تۆدا. ﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ﴾ واتە: دڵمان داپۆشراوەو سەری گیراوە، ﴿مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ﴾یانی:گوێمان کەڕە لە بەرانبەر ئەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی ،(فاعمل اننا عاملون)یانی: تۆ خەریکی کاری خۆت بەوئێمەکارمان بەسەرتەوە نیەو ئێمەش خەریکی کاری خۆمان دەبین وتۆکارت بەسەرمانەوەنەبێ.

﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾﴾

### بانگکردن بۆ یەکخوا پەرستی

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ﴾ بڵێ منیش مرۆڤێکم وەکو ئێوە، خودا فەرمانم پێ دەدا پێتان بڵێم: تەنها خودایەکتان هەیە، ڕووتان هەر بەرەو ئەو بکەن، داوای لێبوردنی لێ بکەن، واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی خودا بە تەنیا نازانن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ﴾ ئەی موحەممەد!(ﷺ) بڵێ بەو خوانەناس‌و موشریکانە: ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ واتە: منیش مرۆڤێکم وەك ئێوە خودا نیگای بۆ کردووم پێتان بڵێم: کە خودای ئێوە تەنیایە، وەك ئەو بتانە نیە کە ئێوە

---

[1] فصلت (٤٢).

دەپەرستن‌و زۆر جیاوازن لە دارو بەردو شتی تر، بەڵکو خودا، خودایەکی تاك‌و تەنهایە، ﴿فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ﴾ بەدڵپاکی عیبادەتی بۆ بکەن بەو شێوەی کە فەرمانی پێکردن لەسەر زمانی پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لێ بێت)، ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ﴾ هاوار بۆ ئەو کەسانە کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن، لەناو بچن‌و نەمێنن، ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوانە نە زەکات دەدەن‌و نە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە. ﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ عەلی کوڕی ئەبو تەلحە دەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە واتە: ئەوانەی کە شایەتی نادەن کە هیچ پەرستراوێك نیە غەیری خودا.[1] عیکریمەش هەر وای وتووە.[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدۡ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾[3] واتە: (سوێند بە هەموو ئەوانە) بە ڕاستی ڕزگاری بوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاك کردەوە، بێگومان نائومێد بوو ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی (بە گوناه) ون‌و تاوانبار کرد. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرمووێت: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ﴾[4] واتە: بە ڕاستی سەرفراز بوو ئەوەی کە خۆی پاك ڕاگرت، وە ناوی پەروەردگاری خۆی دەبات‌و ئەکەوێتە نوێژکردن (پاڕانەوە). وە دەفەرمووێت: ﴿فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ﴾[5] واتە: وە پێی بڵێ: ئایا دەتەوێت پاك ببیتەوە (لە گوناه). مەبەست لە زەکات لێرەدا پاك ڕاگرتنی گیانە لە ڕەوشتی ناپەسەند، گرنگترینیان پاككردنەوەی گیانە لە شیرك‌و بتپەرستی. زەکاتی ماڵیش بۆیە ناونراوە بە زەکات چونکە ئەو ماڵە پاك دەکاتەوە لە حەرام‌و شتی ناڕەواو دەبێتە هۆی زۆربوون‌و زیادکردنی ئەو ماڵەو زیاتر سوود لێ وەرگرتنی‌و یارمەتی خاوەنەکەی دەدات بۆ بەکارهێنانی لە ڕەزامەندی خوای مەزندا. قەتادە دەڵێت: ئەوانەی کە زەکاتی ماڵیان نادەن. ئەم ڕایە باو ئاشکراترە لە لای زۆرینەی زانایانی تەفسیر، ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[6] بەلآم ئەم ڕایە قسەی لەسەرە، چونکە زەکات لەساڵی دووهەمی کۆچیدا فەرز کراوە لەمەدینەدا وەك زۆر کەس باسیان کردووە، ئەم ئایەتە لە مەككەدا هاتووتەخوارەوە. (اللهم ) مەگەر بڵێین: دوور نیە ئەصلی خێرکردن و زەکات هەر لەسەرەتای هاتنی

---

[1] الطبري (٢١/٤٣٠).
[2] الطبري (٢١/٤٣٠).
[3] الشمس (٩ـ١٠).
[4] الاعلى (١٤ـ١٥).
[5] النازعات (١٨).
[6] الطبري (٢١/٤٣١).

پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرمانی پێ کرابێت وپاشان ڕێژەکانی دیاری کرابێت. وەك خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ﴾[1] واتە: وە لە ڕۆژی دروێنەو چنیندا مافەکەی (زەکاتەکەی) لێ بدەن. کەچی لەپاشاندا و لەمەدینەدا (نیصاب) و (ڕێژەی زەکات) دیاری کراوە.بەئەم شێوەیە دەبێت هەردوو قسەکە یەك بخرێن. وەك چۆن ئەسلی نوێژ یەکەمجار کە واجب بوو لە پێش گزنگی خۆرو پێش ئاوابوونیدا واجب بوو،پاشان لە کاتی شەوڕەویەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە بە ساڵو نیوێك خوای گەورە پێنج نوێژی فەرز کرد لەسەر پێغەمبەر(ﷺ)ودرێژەی مەرجو پایەکانی نوێژو ئەو شتانەی پەیوەندی بە نوێژەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ڕوون کردەوە. والله أعلم. پاش ئەوە خوای مەزن فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکار چاکن، پاداشتێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە. موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: ﴿غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ واتە: نەبڕاوەو دوایی نەهاتوو، وەك ئەم ئایەتە کە خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾[2] واتە: لەو (بەهەشتە)دا بێ بڕانەوە دەمێننەوە. وە دەفەرموویێت: ﴿عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ﴾[3] واتە: ئەوە بەخشینێکە بێ بڕانەوە.

﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾﴾

## باسی بەدیهێنانی ئەم بوونەوەرە کەمێك بە درێژی

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئاخۆ ئێوە لە کەسێکی کە بە دوو ڕۆژ ئەم زەمینەی وەدی هێنا، حاشا دەکەنو هاوتای بۆ پەیدا دەکەن؟ ئەوە کە ڕاهێنەری هەموو جیهانە. ئەمە نارەزایی دەربڕینی خودایە لە موشریکەکان ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێنو عەبدایەتی غەیری خودا دەکەن، ئەو خودایەی دروستکەری

[1] الانعام (١٤١).
[2] الكهف (٣).
[3] هود (١٠٨).

هەموو شتەو زاڵە بەسەر هەموو شتداو توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە. ﴿قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗا﴾ واتە: هاوتاو هاوێنەی بۆ دادەنێن لەگەڵ خوا دا دەیپەرستن، ﴿ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: وەدیهێنەری ئەو شتانە هەر پەروەرینی جیهانە. وە لێرەدا جێی خۆیەتی کەمێك بە درێژی برۆینە سەر باسەکە وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ﴾[1] واتە: ئاسمانەکانو زەویی لە شەش رۆژدا دروست کردووە. لەوێدا ئەوەی پەیوەندی بە زەمینەوە هەیە جیای کردووەتەوەو ئەوەیشی پەیوەندی بە ئاسمانەکانەوە هەیە هەر جیای کردووەتەوە. یەکەمجار باسی زەمینە کە دروست کراوە، چونکە بناغەیە، وە دەبێت هەر لە بناغەوە دەست پێ بکرێت پاشان دوای ئەوە بان دروست بکرێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ﴾[2] واتە: خوا ئەو خوایەیە کە هەرچی لە زەویدایە دروستی کردووە بۆ ئێوە لە پاشان رووی کردە ئاسمان ئینجا رێکی خستن بە حەوت ئاسمان. بەڵام ئەو ئایەتەی کە خودا دەفەرموێت: ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾[3] واتە: ئایا دروستکردنی ئێوە گرانترە یان ئاسمان؟ کە دروستی کرد، باڵای بەرزکردەوەو رێکی خستو شەوی ئەوێی تارییك کردو دەری خست (رووناکی رۆژی، لە پاشان زەوی راخست، لێی دەرهێنا ئاوی و لەوەری، وە شاخەکانی پتەو دامەزراند، بۆ بەهرەمەندی خۆتانو ئاژەڵتان. لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە تلاندنەوەو پان بوونەوەی زەمین دوای دروستبوونی ئاسمان بووە. بەڵام دروستکردنی زەمین پێش دروستبوونی ئاسمان بووە. ئیبنو عەباسیش هەر بەو شێوەیە وەڵامی داوەتەوە وەك بوخاری باسی دەکات لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە سەحیحەکەیدا کە ریوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: پیاوێك وتی بە ئیبنو عەباس (رەزای خوای لێ بێت) من هەندێ شت لە قورئاندا دەبینم لێی حاڵی نابمو لێی تێناگەم، خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾[4] واتە: لەو رۆژەدا هیچ خزمایەتیەك

---

[1] الاعراف (٥٤).

[2] البقرة (٢٩).

[3] النازعات (٢٧-٣٣).

[4] المؤمنون (١٠١).

نامێنێت لە نێوانیانداو پرسیاری یەکتری ناکەن (کەس لە کەس ناپرسێت).لەولاشەوە ئەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴾[١] واتە: وە (لەو ڕۆژەدا) ڕوو دەکەنە یەکترو پرسیار لە یەکتر دەکەن. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا ﴾[٢] واتە: وە (لەو ڕۆژەدا) هیچ قسەو باسێك لە خودا ناشارنەوە.کەچی لەولاوە ئەفەرموێ: ﴿ وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾[٣] واتە: سوێند بە خوای پەروەردگارمان ئێمە بە هیچ جۆر هاوبەش دانەر نەبووین بۆ خودا.ئەوەتا لەم ئایەتەدا قسەکانیان دەشارنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿ أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ ۚ بَنَاهَا (٢٧) رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا (٢٨) وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا (٢٩) وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا ﴾[٤] واتە: ئایا دروستکردنی ئێوە گرانترە یان ئاسمان؟ بالای بەرزکردەوەو ڕێکی خستو شەوی ئەوی تاریك کردو دەری خست (ڕووناکی) ڕۆژی، لە پاشان زەوی ڕاخست، لێی دەرهێنا ئاوی‌و لەوەڕی، وە شاخەکانی پتەو دامەزراند، بۆ بەهرەمەندی خۆتان‌و ئاژەڵتان. لێرەدا باسی دروستکردنی ئاسمانی کردووە لە پێش دروستکردنی زەمین کەچی لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ۚ ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ (١٠) ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾ ئەوەتالێرەدا باسی دروست بوونی زەمین دەکات لە پێش دروست بوونی ئاسمان.هەروەها دەفەرمووێت: ﴿ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾، ﴿ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾، ﴿ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾، وەك ئەوەی ئەمانەڕووی دابێت‌و بەسەر چووبێت‌و تێپەڕیبێت، ئیبنو عەباس (ڕەزای خوای لێ بێت)فەرموی: ﴿ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ ﴾ لە فوکردنی یەکەمدا بە کەڵەشاخدایە پاشان فو دەکرێت بە کەڵەشاخدا، ﴿ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ﴾[٥] واتە:یەکسەر هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان‌و زەویدان دەمرن مەگەر کەسانێك خوا بیەوێت (نەمرن). ئا لەوێدا خزمایەتی لە نێواندا نامێنێت‌و کەس لە کەس ناپرسێت. پاشان لە فوەکەی

---

[١] الصافات (٢٧).

[٢] النساء (٤٢).

[٣] الانعام (٢٣).

[٤] النازعات (٢٧ـ٣٠).

[٥] الزمر (٦٨).

ترداپەکە، ﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾ وە ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾، ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾، خوای مەزن دەبوورێت لەوانەی کە بە دڵپاکی خودایان پەرستووە. خوانەناسان (ئەوانەی شەریکیان بۆ خودا دادەنا) دەڵێن: وەرن با ئێمەش بڵێین ئێمە موشریك نەبووین، خوای مەزن مۆر دەنێت بە دەمیانداو دەستیان دێتە وەڵامدانەوە. ئا لەوێدا دەزانرێت هیچ قسەیەك لەخودا ناشاررێتەوەوخوای گەورە هەمووی ئاشکرا دەکات. ئا لەوێدا: ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾[1] واتە: بێباوەڕان دەست ئەکەنە ئاوات خواستن. خوای مەزن لە دوو ڕۆژدا زەمینی دروست کردووە پاشان ئاسمانی دروست کردووە، پاشان ڕووی نا لە ئاسمانەکانو ڕێکی کردن لە دوو ڕۆژی تردا پاشان زەوی ڕاخست وڕاخستنی زەویش یانی ئەوە کە ئاوو لەوەڕگاو شاخ وزیخ و بێگیان و تەپۆڵکەی تێدا دروست کردو هەموو ئەوانەشی دروست کرد کەلەنێوان زەوی وئاسمانەکاندا هەیە ئەمەیە مانای﴿دَحَىٰهَآ﴾کەخوا ئەیفەرموێت..،کەئەشفەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ﴾ زەمینو ئەو هەموو شتەی کە تێیدایە لە چوار ڕۆژدا دروستی کردو ئاسمانەکانیشی بە دوو ڕۆژ دروست کرد ئەوەش کە خوا ئەفەرموێ : ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ خودا ناوی خۆی هێناوە بە لێبوردەو دلۆڤان. واتە: هەتاهەتایە هەر لێبوردەو دلۆڤانە. خوای گەورە هیچ شتێکی نەفەرمووە مەگین، هەر وایەو گومانی تێدا نیە هەروا دێتە دی ،ئیتربا لێت تێك نەچێت چونکە هەموو قورئان لە لایەن خوداوە ڕەوانە کراوە(چ ئەمانەو چ ئەوانەش). بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[2] وە دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ﴾ کەزۆ کۆششی لە زەمین بەرزکردەوەو پیتی تێخست، هەر لە ماوەی چوار ڕۆژاندا، بۆ هەرکێ بژێوی دەوێت (بە یەکسانی) بژێوی بۆ دابین کردن). ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا﴾ واتە: چیای لەسەر داناو پیتو بەرەکەتی خستە سەری‌و تۆو بەروبوومی تیا ڕواندو بژێوی تەواو تێدا دابین کرد بۆ خەڵکی هەتا بە چاکی تێیدا بژینو تۆو بەروبوومی تێدا بچێننو ڕۆزی خۆیان بە دەست بێنن واتە: لە ڕۆژی سێ شەمەو چوارشەمەدا. لەگەڵ دوو ڕۆژەکەی پێشوودا دەکاتە چوار ڕۆژ. بۆیە خوای مەزن فەرموویەتی: ﴿فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ﴾ واتە: بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت پرسیار بکەن لەو بارەیەوە هەتا بیزانن. عیکریمەو

---

[1] النساء (١٠٢).

[2] فتح الباري (٨/٤١٨).

موجاهید دەڵێن: لەم ئایەتەدا: ﴿وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا﴾ واتە: لە هەر سەر زەمینێکدا شتێکی بۆ دانانو ڕاهاتن لەگەڵی کە بۆ ئەو شوێنە نەبێت نەدەشیاو نەدەگونجا، لەوانە مێزەرە بۆ یەمەنیەکانو پۆشاکی ناسكو جوان بۆ سابووریەکان کلێتەو کڵاویش کە لە ناوچەی ڕەی دا بەکار ئەهێنرا.[1] ئیبنو عەباسو قەتادەو سودی لەم ئایەتەدا: ﴿سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ﴾ دەڵێن: واتە: بۆ هەر کەسێك دەیەوێت پرسیار بکات لەو بارەیەوە.[2] ئیبنو زەید دەڵێت: واتە بژێوی تیا دابین کراوە لە چوار ڕۆژ بۆ هەر کەسێك بیەوێت واتە: چۆن بیەوێت بە پێی پێویستی هەر کەسێك خوای مەزن ژیانی بۆ دابین کردووەو ڕۆزی بۆ دیاری کردووە.[3] ئەم قسەیە لەو ئایەتە دەچێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلۡتُمُوهُۚ﴾[4] واتە: وە لە هەموو ئەو شتانەی کە داواتان کردووە پێی داون. والله أعلم. پاشان خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ واتە: پاشان ڕووی نا لە بەرزایی ئاسمان، کە ئەوسا هەر تاریکان بوو، بەوانو بە زەمینی وت:بە خۆشی یان ناخۆشی، دەبێت بێنە بەر فەرمانم. وتیان: وا بە خۆشی هاتین. ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ﴾ واتە: پاشان ڕووی کردە سەرەوەو ئاسمان کە هەر هەڵمی ئاو بوو کە بەرز بووبووەوە لێی لەو کاتەی کە زەمین دروست کرا، ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا﴾ فەرمانم بەجێ بێنن چیتان پێ دەڵێم بەجێی بێنن پێتان خۆشە یان پێتان ناخۆشە، ﴿قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ﴾ واتە: وتیان: بە گوێت دەکەین هەرچی خۆت مەیلت لێیە دروست بکرێت لە فریشتەو جنۆکەو مرۆڤ ئێمە ئامادەینو گوێڕایەڵو بەرفەرمانتین، ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ﴾ ئەوساکە حەوت ئاسمانی لە دوو ڕۆژدا وەدی هێنا، هەر ئاسمانەو فەرمانی کاری خۆی بۆ نارد. نزیکترین ئاسمانیشمان بە چرا ڕازاندەوەو پاراستمان. خاوەن دەسەڵاتی زانا بڕیاری ئەو کارەی داوە. ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ﴾ واتە: لێ بووەوە لە ڕێککردنی حەوت ئاسمانەکە لە دوو ڕۆژی تردا کە ڕۆژی پێنج شەممەو هەینی بوو، ﴿وَأَوۡحَىٰ

---

[1] الطبري (٢١/٤٣٦).

[2] الطبري (٢١/٤٣٨).

[3] الطبري (٢١/٤٣٨).

[4] ابراهيم (٣٤).

﴿فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا﴾ واتە: هەر ئاسمانەو فەرمانی کاری خۆی پێدرا. بە پێی پێویستی لە فریشتەو لەو شتانەی کە خودا خۆی نەبێت کەس نایزانێتو سەری لەبەر دەرناکات. ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾ کە بریتیە لەو ئەستێرە پرشنگدارو ڕووناکانە بۆ خەڵکی سەر زەمین. ﴿وَحِفْظًا﴾ واتە: بۆ پاراستنو چاودێری لە شەیتانەکان هەتا گوێ نەگرن لە کۆمەڵی پایەبەرزان، (الملأ الأعلى)، ﴿ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ واتە: ئەوە بڕیاری خودای خاوەن دەسەڵاتە ئەو خودایەی خاوەن دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکداو زاڵو ملی پێدانەخاتو زانایە بە جوڵەو هەڵسوکەوتی هەموو وەدیهێنراوەکانی.

﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ
خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ
فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ
وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ
صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾﴾

**ئاگادارکردنەوەی بێباوەڕان و وەبیرهێنانەوەی بەسەرهاتی عادو سەموود بۆیان**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ ئەگەر هەر قەبوڵیان نەکرد، بڵێ: بەو هەورەتریشقەیە دەتانترسێنم کە دای لە هۆزەکەی عادو سەمود. خوای مەزن دەفەرموێت ئەی موحەممەد بڵێ بەو موشریکو خوانەناسانە ئەگەر ئەو حەقەی کە بۆتان هاتووە قەبوڵی نەکەن کە من بۆم هێناون لە لایەن خوداوە دەتانترسێنم بە بەلایەك کە تووشی گەلە پێشووەکان هات ئەوانەی کە بڕوایان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان، ﴿صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ﴾ بە وێنەی ئەو هەورەتریشقەی دای لە گەلی عادو سەمود، ﴿إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ ئەوساکە پێغەمبەرەکان (چ ڕووبەڕوو چ پاشملە) لێیان نزیك دەبوونەوە کە غەیری خودا مەپەرستن، وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان مەیلی لێ بووایە فریشتەی دادەبەزاند. ئێمە لەوەی کە ئێوەی پێی ناردراون حاشا دەکەین. ﴿إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای مەزن

دەفـەرمووێت: ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ﴾[1] واتـە: (ئەی موحەممەد -ﷺ-!)یادی برای گەلی عاد کەوە کاتێك گەلەکەی ترساند لـە (وڵاتـی) ئەحقاف بێگومان پێغەمبەرانی زۆر ڕابوردون لە پێش‌و دوای ئەویشەوە. واتە: برای عاد بخـە بیر خـۆت کە لـەو دێیەی دەورووبەر وڵاتی ئەوان هۆزەکەی خۆی ترساند کە خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردن، داوایان لێ کردن کە تەنها خودا بپەرستن‌و هاوەڵی بۆ دانەنێن، مژدەیان دەدانـێ‌و دەیانترساندن لـەو بەڵایانـەی خودای گەورە تووشی ئەو خوانەناسانەی کرد، وە ئەو هـەموو بەهرەیـەی کە خـودا دای بـە دۆستـانی خۆی. دوای ئەو هەموو ئامۆژگاریە، بڕوایان نـەهێناو دژایـەتیان دەکردو لەسەر گومڕایی خۆیـان هـەر بەردەوام بوون‌و دەیانوت: ﴿لَوْ شَاءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً﴾ واتە: ئەگەر خودا پێغەمبـەری ڕەوانـە بکردایـە فریشتەی لە لایەن خۆیەوە ڕەوانە دەکرد، ﴿فَإِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ﴾ یانی :ئەی ئێوەی مرۆڤ ، ﴿كَافِرُونَ﴾ واتە: بڕواتـان پـێ ناکـەین چونکە ئێوەش وەك ئێمە مـرۆڤن. خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ واتـە: جا هـۆزی عـاد لـە نـاڕەوا خۆیـان لـەو سـەر زەمینـەدا بـە زل زانـی. دەیانوت: کوا؟ کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ هەر وا بە نیشانەکانمان بێباوەڕ بوون. ﴿فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ واتە: هۆزی عاد خۆیـان بـە زل دەزانـی لەسـەر زەمینـداو سەرپێـچی‌و لاساریان دەکردو یاخی بوون بەبێ هیچ مافێك، ﴿وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾ واتـە: بـە بـەهێزی خۆیانـدا دەنـازین و وایان دەزانی ئـەو بەهێزییـەیان لـە تۆڵـەی خـوا دەیانپارێزێـت. ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾ واتە: ئاخۆ بیر ناکەنەوەو نـابینن ئـەوەی ئـەوان لـە ڕوویـدا دەوەسـتن، ئـەو خـودا گـەورەو خـاوەن دەسـەڵاتەیە کـە هـەموو شتی دروسـت کـردووەو توانـای هێـزی تیـا وەدی هێنـاوە، بێگومـان هەڵمەت‌و تۆڵەی خودا زۆر توندو بەهێزە. وەك خوای مەزن لـە ئایـەتێکی تـردا فەرموویـەتی: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾[2] واتە: ئاسمانمـان بـە دەسـتی خۆمـان دروسـت کـردووەو ئێمـە فراوانکـەری (ئاسمانین). واتە: ئەمانە دژایەتی خودایان کردو بڕوایـان بـە نیشانەکانی نـەکردو سەرپێـچی فـەرمانی پێغەمبەرەکەیان کرد، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ

---

[1] الاحقاف (٢١).

[2] الذاريات (٤٧).

عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ ئەوسا ئێمە ڕەشەبایەکی بەهێزمان (لەو ڕۆژانەدا کە شوومن) ناردە سەریان، تا ئازاری ئابڕووبەریان (لە ژیانی ئەم دنیایەدا) پێ بچێژن. بێگومان سوکایەتی‌و ئازاری ئەولاش زۆرترەو کەسیش بە هانایانەوە نایەت. ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا ﴾ واتە: ڕەشەبایەکی زۆر توندمان بۆ ناردن. هەندێ دەڵێن: زۆر بەهێز، هەندێکی تر دەڵێن: زۆر سارد. وتراوە (بای صەرصەر) ئەو بایەیە کە دەنگی لێوە دێت. لە ڕاستیدا هەموو ئەو سیفەتانەی تێدا بووە. چونکە ئەوان زۆر بە هێزو توانای خۆیاندا دەنازین. دیارە سزاکەشیان لەو شێوەیە کە بۆ ئەوان بشێت. بۆیە ئەو ڕەشەبایە ئەوەندە توندو ساردو بەهێز بوو لەسەریان، ئەوەتا خوای مەزن لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴾[1] واتە: بە بایەکی سەختی ساردی بە تینی گرمە. واتە: ڕەشەبایەکی زۆر ساردو خاوەن دەنگێکی هەراسانکەر، هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕووبارێکی بەناوبانگ لە وڵاتی ڕۆهەڵاتدا ناونراوە سەرسەر (صرصر) چونکە لەکاتی ڕۆشتنیدا دەنگێکی بەهێزی لێوە دێت. ﴿ فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾ واتە: لە چەند ڕۆژێکی بەردەوامی شومدا، وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا ﴾[2] واتە: حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەبێ وچان (لەناوی بردن). وە دەفەرموێت: ﴿ فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴾[3] واتە: لە ڕۆژێکی سەختدا بە بەردەوامی. واتە: سزا کە دەستی پێکرد لەسەریان لە ڕۆژێکی شومی بەردەوامدا، ئەو شومییەش بەردەوام بوو لەسەریان تا ﴿ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا ﴾ هەتا بنەبڕی کردن‌و هەمووی لەناو بردن‌و ئابڕووی بردن لە دنیاداو سزای قیامەتیش توندترو ئابڕوویەرترە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَخْزَىٰ ﴾ واتە: سزای ڕۆژی دوایی زۆر ئابڕووبەرترە. ﴿ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ واتە: کەس لە ڕۆژی قیامەتدا نایەت بە دەمیانەوەو فریایان ناکەوێت وەك چۆن لە دنیادا بە هانایانەوە نەهات، وە کەسیش لە لای خوداوە نایانپارێزێت لەو سزایەو لێیان دوور ناخاتەوە. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ ئێمە ڕێگەی بەرەو خۆمان نیشانی هۆزی سەمودیش دا. لە باتی شارەزابوونێك حەزیان کرد هەر کوێرو نابینا بن، ئەوسا لە سۆنگەی ئەو کارەی کە

---

[1] الحاقة (٦).

[2] الحاقة (٧).

[3] القمر (١٩).

دەیانکرد، هەورەتریشقە گرتنیو ئازاری ئابڕوبەریان لێ هاتەدی. ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾ ئێمە هۆزی سەمودمان شارەزا کرد، بەڵام لە باتی شارەزایی حەزیان کرد هەر نابینا بن.

﴿فَهَدَيْنَٰهُمْ﴾ ئیبنو عەباسو (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەبولعالیەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو سودیو ئیبنو زەید دەڵێن: بۆمان ڕوون کردنەوە.[1] سەوری دەڵێت: بانگمان کردن. واتە: هۆزی سەمودیش ڕێنمایمان کردنو ڕێگای ڕاستمان بۆ ڕۆشن کردنەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیان (ساڵح) (سەلامی خوای لێ بێت) بڕوایان پێ نەکردو دژایەتیان کردو وشترەکەی خودایان سەربڕی کە خوای مەزن کردبووی بە نیشانەیەکی زۆر دیارو ئاشکرا لەسەر ڕاستی پێغەمبەرەکەیان، ﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ﴾ واتە: خوای گەورە دەنگو لەرزەیەکی وای بۆ ناردن کە سەرشۆڕو زەبوونی کردنو سزایەکی زۆر توندوتیژی دان، ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ واتە: بە هۆی ئەو بێ دینیو لاساریو سەرپێچیانەوە کە دەیانکرد، ﴿وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾ ئەو کەسانەشمان ڕزگار کرد کە بووبوونە خوانەناسو لە گوناه خۆیان دەپاراست. ﴿وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕ بوون لە نێوانیاندا تووشی هیچ ناخۆشیو زیانێك نەبوون لەو بارەیەوە. بەڵکو خوای مەزن ڕزگارو سەرفرازی کردن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا کە ساڵح بوو (سەلامی خوای لێ بێت).

﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾

**لە ڕۆژی قیامەتدا ئەندامەکانی لەشی تاوانباران شایەتن لەسەر خۆیان.**

خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾ لەو ڕۆژەدا کە نەیارەکانی خوا بەرەو ئاگر هەموویان کۆدەکرێنەوەو دەستەدەستە بەڕێ دەکرێن. واتە: بۆ ئەو موشریکانەی باس بکە ڕۆژێك دێت کە گشت خوانەناسان پۆل پۆل بەڕێ دەکرێن بۆ جەهەنەم واتە: گزێرەکانی جەهەنەم هەر لە ئەوەڵەوە هەتا دواین کەس تاوانباران کۆدەکەنەوە. وەك خوای مەزن لە

---

[1] الطبري (٢١/٤٤٨).

ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا﴾[1] واتە: تاوانباریش دەدەینە بەر بۆ دۆزەخ بە تینوویەتی (بە وێنەی گەلە ئاژەڵ). وە دەفەرموویێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ کاتێك دەگەنە لای ئاگر، لە هەر کارێك کردوویانە، گوێچکەو چاوو هەموو پێستی لەشیان، لە دژیان شایەتی دەدەن. واتە: هەرچی کارێك کردوویانە گشت باس دەکەن و یەك پیتی لێ ناشارنەوە، ﴿وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ (بە گلەییەوە) پێستی خۆیان دەدوێنن: چۆن دژمان شایەتیتان دا؟ دەڵێن: خوا بە زمانی هێناین کە دەتوانێ هەموو شت بێنێتە قسە، هەر ئەویش هەوەڵجار ئێوەی دروست کرد، دەشتانگەڕێننەوە لای خۆی. ﴿وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا﴾ واتە: گلەیی لە ئەندامەکانی لەش‌و پێستتان دەکەن کاتێك شایەتیان لێ دەدەن، ئا لەوێدا ئەندامەکانی لەش وەڵامیان دەدەنەوە دەڵێن: ﴿قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ یانی: ئەو خودایە یەکەم جار دروستی کردوون دژایەتی‌و ڕێگری لێ ناکرێت‌و بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە. حافیز ئەبو بەکری بەزار ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێکەنی (بە زەردە خەنەوە) فەرمووی: (ئایا ناپرسن لێم لەبەر چ شتێك پێکەنیم؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبەر چ شتێك پێکەنیت؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سەرم سوڕما لە دەمەدەمێ ی عەبدێك لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا لە ڕۆژی قیامەتدا، عەبدەکە دەڵێت: ئەی پەروەردگارم تۆ بەڵێنت پێ نەدام کە ناهەقیم لەگەڵ نەکەی؟! ئەویش دەفەرموویێت: بەڵێ، دەڵێت: کەوایە من شایەت قەبوڵ ناکەم لە خۆم نەبێت. خوای مەزنیش دەفەرموویێت: ئایا منو ئەو فریشتە بەڕێزانە بۆشایەتی بەس نین کە کردەوەکانی تۆیان نوسیوە. دەڵێت: چەند جارێك خوای گەورە ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە) دەڵێت: پاشان مۆر دەنرێت بەسەر دەمیداو ئەندامەکانی لەش دێنە قسە لەسەر ئەو کردارانەی کە کردوویەتی. ئەمیش دەڵێت: خوا خراپتان بۆ بکات‌و لەناوتان دا لەسەر ئێوە من ئەم هەموو دەمەدەمێیە دەکەم).[2] دیسان ئەنەس‌و ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە.[3] موسلیم‌و نەسائیش هێناویانە.[4] وە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو بوردەوە

---

[1] مريم (٨٦).

[2] الحاكم (٦٠١/٤)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی حەسەنە پیاوەکانی جێی متمانەن.

[3] الطبري (٤٥٢/٢١).

[4] مسلم (٢٢٨٠/٤)، النسائي في الكبرى (٥٠٨/٦).

دەڵێت: ئەبو موسا دەڵێت: خوانەناس‌و دووڕوو بانگ دەکرێن بۆ لێپرسینەوە. پەروەردگار کردەوەکانیی نیشان دەدات ئەونکولی لێ دەکات‌و دەڵێت: پەروەردگارم سوێند بە گەورەیی تۆ ئەوەی ئەو فریشتەیە لەسەری نووسیم من نەمکردووە، فریشتەکە دەڵێت: ئەوەت نەکرد لە فلانە ڕۆژداو لە فلانە شوێندا؟ ئەمیش دەڵێت: نەخێر، سوێند بە گەورەیی تۆ ئەی پەروەردگارم ئەوەم نەکردووە. دەڵێت: وەختێك ئەمەدەکات، مۆر دەنرێت بەسەر دەمیدا. ئەشعەری (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: من وا دەزانم یەکەم شتێك کە دێتە زمان لێی ڕانی ڕاستیەتی. خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾یانی لەو بارەیەوە کە گوێ‌و چاوو گشت پێست‌و ئەندامەکانتان شایەتیان لەسەر بدەن، هیچ خۆتان حاشار نەدەدا، بەڵام ئێوە پێتان وابوو خوا لە زۆرێك لەو کارانەی ئێوە دەیکەن، بێ ئاگایە. ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ واتە: کاتێك ئەوان گلەیی دەکەن لە ئەندامەکانی لەش‌و پێستتان کە شایەتیان لەسەر دەدەن، ئەوانیش پێیان دەڵێن ئێوە هیچێك لەو کارانەتان لە ئێمە نەدەشاردەوە کە دەتانکرد، بەڵکو ئێوە بە ئاشکرا خوانەناس‌و بێ فەرمانی خوداتان دەکردو هیچ بایەخێکتان پێ نەدەدا، چونکە بە لاتانەوە وابوو کە خودا ئاگاداری لە هەموو کردارەکانتان نیە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾، وە دەفەرموێت: ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ئەو ئەوگومانە بوو کەبەپەروەردگاری خۆتانتان بردو بویە مایەی ماڵوێرانی ورەنجەساریتان.یانی: ئەو بۆچوونە خراپەتان بوو، کە واتان دەزانی خودای گەورە ئاگای لە زۆرێك لە ئەو کارانەتان نیە کە دەیکەن. هەر ئەوە بووە هۆی لەناوچوون‌و پەرتەوازەبوون‌و ماڵ وێرانیتان. ﴿فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا خۆتان‌و کەس‌و کارتان تووشی زیان کرد، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: من خۆم داپۆشیبوو بە پەردەکانی کابە (الكعبة) وخۆم شاردبوویەوە. سێ پیاوی قورەیشی هاتن. بەزی ورگیان زۆر زۆر بوو، تێگەیشتنی دڵیان زۆر کەم بوو هەندێ قسەیان کرد باش گوێم لێ نەبوو، یەکێکیان وتی: ئایا دەزانن کە خودا قسەکانمان دەبیستێ؟ یەکێکی تریان وتی: کاتێك کە دەنگ بەرز بکەینەوە دەیبیسێت، وەختێك بەرزی نەکەینەوە نایبیستێ، ئەمی کەشیان وتی: ئەگەر شتێکی لێ ببیستێ، هەمووشی بیستووە، (دەڵێت) ئەوەم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، خوای مەزن ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد: ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ

عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَـٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾.[١] هـەر بـەم شـێوەیە تیرمیـزی ڕیوایەتی کردووە.[٢] ئەحمەدو موسلیمو تیرمیزی دیسان هێناویانە بەو شێوەیە.[٣] بوخـاریو موسـلیمیش ڕیوایەتیان کـردووە.[٤] خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴾ ئەگەر ئەوان خۆڕاگرن، ئەو ئاگر جێگەیانە، ئەگەر داوای لێبوردنیش بکەن، هـەرگیز لێیـان قـەبوڵ ناکرێـت. وەك یەکە بۆیـان، خۆڕاگرن یـاخود خـۆ ڕانـەگرن، ئـەوان لـەناو ئـاگران، ڕێـی دەرچوونیان نیە تێیدا، شوێنیش نیە ڕووی تیٚ بکەن، وە ئەگەر داواش بکەن کە بیانووی خۆیـان بـاس بکەن ڕێیان پیٚ نادرێتو هیچیان لیٚ قەبوڵ ناکرێت. ئیبنو جەریر دەڵێت: مانـای ئـەم ئایەتـە کـە خـودا دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ ﴾ئەگەر داوابکەن بگەڕێنـەوە بۆدونیـا،هیچ وەڵامێکیـان نادرێتـەوە ،جـا ئیبن جەریر ئەفەرمویٚ : ئەمە وەك ئەو ئایەتەی ترە کە خوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَـٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾[٥] واتە: (لە وەڵامدا) دەڵێن ئەی پـەروەردگاری ئێمـە بـەدیو خراپـی خۆمـان زاڵ بووبـوو بەسەرماندا‌و ئێمە کەسانێکی گومرابووین، ئەی پەروەردگارمان لەم (دۆزەخە) دەرمان بێنە جا ئەگـەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ بێباوەڕی) ئەوە بەڕاستی ئێمە ستەمکارین، وە (خـوا) دەفـەرمووێت: بـەبیٚ نرخیو ڕیسوایی بمێننەوە لە دۆزەخداو هیچ قسەیەکم لەگەڵ مەکەن.[٦]

﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُوا۟ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ۖ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾﴾

---

[١] أحمد (١/٣٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] تحفة الأحوذي (٩/١٢٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٣] أحمد (١/٤٠٨)، مسلم (٤/٢١٤٢)، تحفة الأحوذي (٩/١٢٤).

[٤] فتح الباري (٨/٤٢٤/٤٢٥)، مسلم (٤/٢١٤٢:٢١٤١).

[٥] المؤمنون (١٠٦ـ١٠٨).

[٦] الطبري (٢١/٤٦٢).

**دۆستانی موشریکەکان کردارە خراپەکانیان بۆ دەڕازێننەوە**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ دۆستی واشمان (لە دنیا) بۆ پەیدا کردن، کاری ئێستەو ئایندەیان بۆ خەملاندن. بۆ ئەمانو ئەو جنۆکەو مرۆڤانەی بەر لەوان بوونو بەڵێنی خودا هاتە جێ،ئەوانە خەڵکانێکی ڕەنجخەساربوون. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە خۆی موشریکەکانی گومڕا کرد. ئەوەیش بە مەیلو دەسەڵاتی خۆیەتی، چونکە خودا کارزانە لە کردارەکانیدا،ودێت هاوەڵیان بۆ دادەنێ لە شەیاتینی مرۆڤو جنۆکە ﴿فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾ واتە: کردارەکانیان لەبەرچاو شیرین کردونو ڕازاندۆتەوە بۆیان لە ڕابوردوداو وادەزانن لە داهاتووشدا هەر لە چاکە خوازانن وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ﴾[1] واتە: وە هەر کەس پشت لە یادی خوا هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەن کە هەمیشە لە گەڵی بێو لێی جیا نەبێتەوە، وەبێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگای ڕاست بەرگرییان دەکەن واش دەزانن بێگومان هەر ئەوانن ڕێنووێن. وە دەفەرموێت: ﴿وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ﴾ واتە: بەڵێنی خودا هاتە جێو سزا دران وەك گەلەکانی پێش ئەمان چۆن سزادران لە مرۆڤو جنۆکە ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ﴾ واتە: ئەمانو ئەوانیش توشی زیانو لە ناوچون هاتن.

**خوانەناسان یەك ئەوەی تریان ئاگادار دەکات کە گوێ بۆ قورئان نەگرن ،سزای ئەو کارەشیان ئەبێ چی بێت ؟**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ خوانەناسەکان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، قسەی بێتامی خۆتانی تێکەڵ بکەن، بەشکوو بەسەریدا سەر دەکەون یانی: دنەی یەکتریان دا گوێڕایەڵی قورئان نەکەنو شوێنی نەکەونو فەرمانەکانی بەجێ نەهێنن، ﴿وَالْغَوْا فِيهِ﴾ واتە: کاتێ خوێنرا گوێی بۆ نەگرن، وەك موجاهید دەڵێت: ﴿وَالْغَوْا فِيهِ﴾ واتە: دەست بکەن بە قیڕەقیڕو فیکەلێدانو هاوهو کردن کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ، قورئانی ئەخوێنێت، ئەمە کاری قوڕەیشیەکان بوو، ﴿لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ﴾ ئەمە حاڵو ڕەوشتی ئەو نەفامو

[1] الزخرف (٣٦_٣٧).

خوانەناسانە بوو وە هەر کەسیش ڕێو پێی ئەوانی گرتووە لە کاتی گوێگرتنی بۆ قورئان، بۆیە خـودای مەزن فەرمانی داوە کە بە پێچەوانەی ئەوانەوە خاوەن باوەڕان کاتێ قورئان خوێنرا گوێ بیستی بـن‌و بێدەنگ بـن وەك فەرمویـەتی: ﴿وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾[1] واتـە: وە کاتێك کە قورئان خوێندرا دەبێ گوێی لێ بگرن‌و بێ دەنگیش بن بۆ ئەوەی خوا میهرەبانیتان لەگەڵ دا بکات. پاشان خودای گەورە پشتگیری لە قورئان کردووەو تۆڵەش لەو کەسـانە دەسـێنێ کە دژایـەتی دەکەن لـە گـرۆی خوانەناسـان دەفـەرمووێت: ﴿فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ سا مەرج بێ ئەو کەسانەی خوانەناس بوون، لە ئێمەوە جەزرەبەی دژوار بچێژن، لەوەی دەیانکرد، خراپتر ئازاریان دەدەین، ﴿فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا﴾یانی: لە باتی ئەو کارەی کە دەربارەی قورئان کردیان لـە کـاتی بیستندا ﴿وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ واتـە: سـزای تونـدو تیژی دەدرێ بە هۆی ئـەو هەڵسوکەوتە خـراپ‌و ناپەسـندانەیانەوە. ﴿ذَٰلِكَ جَزَاءُ أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ﴾ سزای دوژمنانی خودا هەر ئەمەیە، لە سۆنگەی حاشـاکردنیان لـە نیشانەکانی ئێمە، ئاگری لە بن نەهاتوو شـوێنیانە، ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ﴾ خوانەناســەکان وتیــان: ئــەی پــەروەردگاری هەموومان! ئەو دوو کەسەمان نیشان بدە لە جنۆکـەو مرۆڤـە. کـە ڕێیـان لـە ئێمـە گـۆڕی، تـاژێر پـای خۆمانیان بدەین تا لە ژێری ژێرەوە بن.سوفیان لـە عـەلی یـەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت)ئەگێڕێتـەوە لـە تەفـسیری ﴿الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا﴾دا فەرمویـەتی:ئەودوانـە شـەیتان‌و کوڕەکـەی ئـادەمن کـە براکـەی خـۆی کوشـت.[2] سـودی دەڵێـت: لـە عەلیـەوە (ڕەزای خـوای لـێ بێـت) چـونکە هـەموو بتپەرسـتێ بـە هـۆی شەیتانەوە بۆتە بتپەرست وە هەموو تاوانکارێکی گەورەش ئەو کوڕەی ئادەم بۆتە سـەر مەشق بـۆی. لەبەر ئەوە شەیتان سەرچاوەیە بۆ هەموو خراپەیەك لە شەریك دانانەوە بۆ خودا هەتا دوایـی.هـەروەها یەکەم کوڕی ئادەمیش[3] وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە (هیچ کەسێ بەناهەقی نـاکوژرێ مـەگین یەکەم کوڕی ئادەم بەشێکی هەیە لە خوێنەکەیدا. چونکە یەکەم کەس بووە کـە کوشـتنی داهێنـاوە).[4]

---

[1] الاعراف (٢٠٤).

[2] الطبري (٢٢/٤٦٢).

[3] الطبري (٢٢/٤٦٢).

[4] فتح الباري (٦/٤١٩).

﴿نَجۡعَلۡهُمَا تَحۡتَ أَقۡدَامِنَا﴾ واتە: لە خواری ئێمەوە بن لە جەزرەبەدا بۆ ئەوەی لە ئێمە زیاتر سزا بچێژن. بۆیە گوتویانە ﴿لِيَكُونَا مِنَ ٱلۡأَسۡفَلِينَ﴾ واتە: با لە ژێری ژێرەوە بن لەناو ئاگردا وەك لە سورەتی (الاعراف) لە پێشەوە باسی کرا کە شوێنکەوتووانی ستەمکاران داوا دەکەن لە خودای مەزن کە سزای سەرکردەکانیان زۆر توندترو زیاتربێ لەوان ﴿قَالَ لِكُلٍّ ضِعۡفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ﴾[1] واتە: بۆ هەر کامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن‌و بێ ئاگان. واتە: بێ گومان خودای مەزن هەر کەس شایستەی چ سزایەك بێ بەو پێیە سزای دەدات‌و تۆڵەی لێ دەستێنێ وەك لە ئایەتێکی تردا فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ﴾[2] واتە: ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون‌و بەرگری خەڵکیشیان کردووە لە ڕێگەی خوا جگە لە سزاکەی خۆیان سزای تریان بۆ زیاد دەکەین لەبەر ئەوەی کە خراپەکاریان دەکرد.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴿٣٢﴾﴾

**مژدە بۆ یەکخوا پەرستان ئەوانەی کە لە بەڵێنی خۆیان لایان نەداوە**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ ئەوانەش کە وتوویانە: پەروەردگارمان خودایەو لە گفتیان لایان نەداوە، فریشتە دێنە لایان‌و پێیان ئەڵێن: نە بترسن، نە خەم بخۆن، مژدەتان بێ گەیشتوونەتە ئەو بەهەشتەی کە بەڵێننتان پێدراوە، ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ﴾یانی: ئەوانەی کە گوتویانە پەروەرندەمان خودایە بە دڵپاکی کاردەکەن‌و ئەوەی خودا فەرمانی پێکردون پێی هەڵدەسن، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە سەعیدی کوڕی عیمرانەوە وتی: لەلای ئەبو بەکری سدیقدا (ڕەزای خوای لێبێت) ئەم ئایەتەم خوێند: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ﴾ وتی: ئەو کەسانەن کە لە هیچ شتێکدا هاوەڵیان بۆ خودا دانەناوە.[3] هەروەها ڕیوایەتی

---

[1] الاعراف (٣٨).

[2] النحل (٨٨).

[3] الطبري (٢١/٤٦٤).

کردوە لە فەرموودەکەی ئەسوەدی کوڕی هیلالدا ئەڵێ : ئەبو بەکری سیدیق (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ئێوە چی ئەڵێن لەمانای ئەم ئایەتەدا ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ﴾ دەڵێت: وتیان: ﴿قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ﴾ لە گوناه کردن وازیان هێنا. ئەبو بکر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: بەو شێوەیە مانایەکتان لێ دەرهێناوە کە ئایەتەکە هەڵیناگرێت ، ئەوانە ئەڵێن : پەروەردگاری ئێمە تەنیاهەرخوایە ئیتر دوای خوا ڕوویان لە هیچ پەرستراوێك نەکردوە.[1] هەر بەو شێوەیە موجاهیدو عیکرمەو سودیو کەسانی تریش وتویانە.[2] ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سوفیانی کوڕی عبدالله ی سەقەفییەوە دەڵێت: (وتم) ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی شتێکم بۆ بکە کە هانای پێ ببەم (دەستی پێوە بگرم) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بڵێ خودا پەروەردگاری منەو لە قسەی خۆت لامەدە) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە چ شتێ زیاتر لێم دەترسی؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی گرت بەلایەکی زمانی خۆیەوە پاشان فەرمووی: (ئەمە)[3] هەر بەم شێوەیە تیرمیزیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی(حسن صحيح)ە[4]، موسلم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی نەسائیش لە سوفیانی کوڕی عبدالله ی سەقەفییەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەیەکم پێ بڵێ لە بارەی ئیسلامەوە، دوای تۆ پرسیار لە کەس نەکەم لەو بارەیەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (قل أمنت بالله ثم استقم) پاشان تەواوی فەرموودەکەی باس کرد.[5]

﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ﴾ موجاهیدو سودیو زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێن: واتە لەکاتی مردندا دێنە سەری ئەڵێن: ﴿أَلَّا تَخَافُواْ﴾[6] نە بترسن. موجاهیدو عیکریمەو زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن:مەبەست ئەوەیە مەترسن لە ئەوەی کە دەچن‌و پێی دەگەن لە ڕوداوەکانی ڕۆژی قیامەت.[7]

﴿وَلَا تَحۡزَنُواْ﴾ دڵگرانیش مەبن لەوەی کە بەجێتان هێشتووە لە کاروباری دنیا لە ماڵ‌و منداڵ‌و کەس‌و کارو قەرزاری، ئێمە جێتان پڕدەکەینەوە تیایدا، ﴿وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ مژدەیان دەدەنێ بە نەمانی خراپەو وەدەسهێنانی چاکە ،ئەمە وەك لە فەرموودەکەی بەرائدا هاتووە (ڕەزای

---

[1] الطبري (٢١/٤٦٤).
[2] الطبري (٢١/٤٦٥).
[3] أحمد (٣/٤١٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[4] تحفة الأحوذي (٧/٩١)، ابن ماجه (٢/١٣١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[5] مسلم (١/٦٥).
[6] الطبري (٢١/٤٦٦)، القرطبي (١٥/٣٥٨).
[7] الطبري (٢١/٤٦٧).

خوای لێبێت) فەرمویەتی: (فریشتەکان بە گیانی خاوەن باوەڕ ئەڵێن: ئەی گیانە پاکەکە بێرە دەرەوە لەو لاشە پاکە کە تۆ ئاوەدانت کردووە دەرچۆ بۆ شوێنی حەوانەوەو ئارامیو بۆ لای پەروەردگارێك کە توڕە نیە)[1]. ئەڵێن: فریشتەکان ڕۆژی دەرچونیان لە گۆڕەکان دێنە لایان. زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: فریشتەکان مژدەی دەدەنێ لە کاتی مردنداو لە ناو گۆڕەکەیداو لە کاتی زیندوبونەوەشدا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە، ئەم ڕایە هەموو ڕاکانی لە خۆیدا کۆکردۆتەوەو قسەیەکی زۆر چاکەو لە جێی خۆیدایە. خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴾ ئێمە (لە دنیاو لە قیامەت) دۆستی ئێوەین، لە بەهەشتدا هەر شتێ ئارەزووی بکەنو چی بخوازن، ئامادەیە. ﴿ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ واتە: فریشتەکان ئەڵێن بە خاوەن باوەڕەکان لە کاتی مردندا ئێمە دۆستی ئێوە بوین لە ژیانی دنیادا یارمەتیمان دەدانو ڕاستەڕێمان نیشان دەدانو دەمانپاراستنو کار ئاسانیمان بۆ دەکردن بە فەرمانی خودا. هەر بەهەمان شێوە لە گەڵتان دەبین، سامناکی گۆڕتان لا سوك دەکەینو لە کاتی فوکردن بە کەڵەشاخیشداو لە کاتی زیندوبونەوەو وەستان لە قیامەتیشدا دەتانپارێزینو بەسەر پردی سیراتیشدا دەتانپەڕێنینەوەو دەتانگەیەنینە بەهەشتو خۆشی. ﴿وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ﴾ واتە: لە بەهەشتدا لەو هەموو شتەی کە بەئارەزووی خۆتان داوای دەکەن دەبینن ئامادەیە بۆتان ﴿وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴾ واتە: هەر شتێ داوابکەن بۆتان ئامادە دەکرێ وا لەبەر دەستاندا بە ئارەزووی خۆتان. ﴿ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴾ واتە: ڕێزلێنانە لە لایەن لێبوردەی دلۆڤانەوە میوانداریو بەخششو بەهرەیەکە لەو خودایەی کە خۆش بووە لە گوناهەکانتانو دلۆڤانو بەسۆزە بۆتان. وەك چۆن لە دنیادا تاوانەکانی پۆشیونو بە سۆزو بەزەیی بووە لەگەڵتان.

﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾

---

[1] احمد (٢٨٧/٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

**پلەی بانگ کردن بۆلای خوا**

خـــوای مـــەزن دەفـــەرموویت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ کێ لەو کەسە قسەی بەڕێو جێ ترە، کە بەرەو خوا بانگەواز دەکاتو خۆشی ئاکاری پەسەندەو دەڵێ: منیش یەکێ لە موسڵمانانم؟ ﴿دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: بانگی بەندەکانی خـودا بکات بـۆ لای خودا ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾یانی: ئەو کەسە خۆی بۆ خـۆی ڕێـی نیشاندراوە، چونکە ئەوەی دەیڵێت سودی بۆ خۆیو خەڵکی تـریش هەیە، خـۆی سـودمەندەو خـەڵکیش سـودمەند دەکات، ئەو کەسە لەو پیاوانە نیە کە فەرمان دەدا بەچاکەکردن خۆی پێـی هەڵناسـێ، بـەڵکو فـەرمان دەکات بەچاکەو دوور دەکەوێتەوە لە خراپە، بانگی خەڵکی دەکات بۆ لای خودا کە وەدی هێنەریـەتی، ئـەم ئایەتـە بـۆ هـەموو کەسـێکە کـە بـانگی خـەڵکی بکـات بـۆ چاکەو چاکەخوازی هـەموو کەسـێ دەگرێتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هـەموو کەسـێ لـە پێشترە بـەو بانگەوازە وەك محمدی کـوڕی سیرینو سودیو عبدالرحمنی کوڕی زەیدی کـوڕی ئەسلەم وتویانـە:[١] وتـراوە: مەبەسـت بـەم کەسـانە ئەوبانگ وێژە بۆخوا سوڵحاوانەیە کەبانگ ئەدەن. وەك لـە سـەحیحی موسلیمدا هـاتووە (بـانگ وێژان کەردن بەرزترینی کەسن لە ڕۆژی قیامەتدا)[٢] وە لەسوننەکاندا بەمـەرفوعی هـاتووە: (پێشەوا کەفیلـەو بانگوێژتیش جێی بڕوایە خودای گەورە ڕێنمایی پێشەوایانی کردوەو لە بانگ وێژانیش خـۆش بـووە)[٣] ڕاستتر وایە کە ئەم ئایەتە گشتگیرە بانگ وێژو غـەیری بـانگ وێژیش دەگرێتـەوە، لەبەرئـەوەی کـاتی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە بـانگ نـەدەدرا، چـونکە ئـەم ئایەتـە لـە مەککـەدا هاتووەتـەخوارەوەو بانگدانیش لە مەدینە فەرمانی لە سـەر دراوە دوای کـۆچ کردنـی پێغەمبـەر(ﷺ) (کـاتێ عبـدالله کـوڕی عبدڕەبەی ئەنساری (ڕەزای خوای لێبێت) لە خەویدا بانگدانی نیشان درا، بـۆ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) گێڕایەوە، پێغەمبەری (ﷺ) فـەرمانی پێکرد، بـیلال فێـر بکـات (ڕەزای خـوای لێبێـت) چـونکە بـیلال دەنگی چاکترەو بەرزترە)، کەوایە ڕاستتر ئەوەیە کە بانگەواز بـۆ لای خـودا گـشتگیرە، وەك عبـدالرزاق دەڵێت لە موعەمەرەوە لە حەسەنی بەسریەوە کە ئـەم ئایەتـەی خوێنـد: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾ دەڵێـت:ئـەم کەسـە خۆشەویـستی خودایـە، ئـەوە خۆشەویستترینی خەڵکی سەر زەمینە لەلای خوا، چووە بەدەم بانگەوازی خواوە کـاتێ بـانگی دەکات

[١] القرطبي (١٥/٣٦٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[٢] مسلم (١/٢٩٠).
[٣] ابو داود (١/٣٥٦)، تحفة الأحوذي (١/٦١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

وبانگی خەڵکیشی کردوە بۆ سەر ئەو بانگەوازە، ئاکاری پەسەندیشی کردووە لەم وەڵامدانەوەیەدا و ئەڵێ منیش یەکێ لە موسوڵمانانم، ئەوە خەلیفەی خودایە.[1]

**کارزانی لە بانگەوازو شتی تریشدا**

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ چاکەو خراپە بەرانبەر نین، تۆ هەمیشە وەڵامی چاکتر بدەوە، ئەوسا کەسێ لەگەڵ تۆدا دوژمنە، دەبێتە دۆستی نزیکت ﴿وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ﴾ جیاوازیێکی زۆر گەورە هەیە لە نێوان چاکەو خراپەدا ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ واتە هەر کەسێ خراپەی لەگەڵ کردی تۆ بەچاکە وەڵامی بدەرەوە، وەك عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی:تۆ تۆڵەت نەسەندەوە لە کەسێك کە سەرپێچی خودای کردبێ بەرانبەرت، بە ئەندازەی ئەوەی کەتۆ فەرمانی خودا بەجێ دێنیت لەبەرانبەر ئەودا ، ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾ وەختێ چاکە دەکەی لەگەڵ کەسێکدا کە خراپەی لەگەڵ کردووی، ئەو چاکە پاڵی پێوە دەنێ کە ببێتە دۆستی نزیکتو تۆی خۆش بوێو دڵی هەمیشە لە لات بێ، هەتا وای لێ دێ کە دەبێتە برای گیانی بە گیانی بۆت، زۆر نزیك دەبێت لێتەوەو هەوڵ دەدات چاکەت لەگەڵ بکات، پاشان خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ ئەو کارەش هەر تووشی کەسانێك دەبێ کە ئەتوانێ خۆڕاگربێ، هەر کەسیش ئەو ئاکارەی تووش بێ، دیارە فرە بەختەوەرە واتە: ئەم ئامۆژگاریەش کەسێ وەری دەگرێو کاری پێدەکات کە توانای خۆڕاگرتنی هەیە لەسەری، چونکە وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە زۆر لەسەر دڵ گرانە، ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ هەر کەسێکیش بتوانێ وا بکات دیارە خاوەنی بەشێکی زۆرە، زۆر بەختەوەرە لەدنیاو لە قیامەتدا، عەلی کوڕی ئەبو تەلحەئەڵێ: لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوایان لێبێت ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: خودای مەزن فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان خۆڕاگرین لە کاتی توڕەبووندا، لەسەرخۆ بن لە کاتی هەڵە کردندا، لێبوردە بن لە کاتی خراپەکردندا بەرامبەریان، ئەگەر وایان کرد خودا لە شەیتان دەیانپارێزێ، دوژمنانیان بەر فەرمانیان دەبن وەك دۆستی نزیك،[2] خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ هەر وەختێ لە شەیتانەوە دوچاری خەیاڵاتێك بووی. گورج پەنا بە خوا

---

[1] عبدالرزاق (٢/١٨٧).

[2] فتح الباري (٨/٤١٨).

بەرە، کە خۆی بیسەرو زانایە واتە: شەیتانی مرۆڤ لەوانەیە هەڵخەڵەتێ بە چاکەکردن لەگەڵیدا، بەڵام شەیتانی جنۆکە کاتێ دڵی کرمین کرد چاری نیە مەگین بە هانابردنە لای ئەو خودایەی کە زاڵی کردووە بەسەرتدا، کاتێ هانات برد بۆ خوداو خۆت دایە دەستی خودا، لە کۆڵتی دەکاتەوەو لێت دووردەخاتەوە، هەر کاتێ پێغەمبەر هەڵسایە بۆنوێژ دەیفەرموو: (هانا دەبەم بۆ خودای بیسەرو زانا لە شەیتانی دورخراوە لە بەزەیی خودا، لە دڵە ڕاوکەو دنەدان و فوتێکردنی شەیتان)[1] لە پێشەوە باسمان کرد کە ئەم پلەیە وێنەی نیە لە قورئاندا مەگین لە سورەتی (الاعراف)دا کە خودای مەزن دەفەرموێت:

﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ (١٩٩) وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[2] واتە: دەست بگرە بە لێبوردەییەوە و(چاوپۆشی بکە) فەرمانیش بدە بە چاکەو چاکە کردنو ڕوو وەرگێڕە لە نەفامانو نەزانان وە ئەگەر خەتەرو خەیاڵو وەسوەسەیەکت بۆ هات لە لایەنی شەیتانەوە.یەکسەر پەنا بگرە بە خوا ،بە ڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە، وە لەسورەتی (المؤمنون)دا:

﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ (٩٦) وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ (٩٧) وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾[3] واتە: بە جوانترینو چاکترین شێوە بەرگری بکە لە خراپە ئێمە ئاگادارترین لەوەی ئەوان دەیڵێن (بە خۆتو ئاینەکەت) وەبڵێ ئەی پەروەردگارم پەنا دەگرم بە تۆ لە خەتەر (وپاڵنەر)و وەسوەسەی شەیتانەکان، وە پەنات پێدەگرم لەوەی (شەیتانەکان) ئامادە بن لام (سەرم لێ بشێوێنن).

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ (٣٧) فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْأَمُونَ ۩ (٣٨) وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٣٩)﴾

**لە نیشانەکانی خودای مەزن**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ شەو ڕۆژو خۆرو مانگیش لە

[1] احمد (٥/٢٥٣)، لە پێشەوە پلەکەی دیاری کراوە.

[2] الاعراف (١٩٩ـ٢٠٠).

[3] المؤمنون (٩٦ـ٩٨).

نیشانەکانی ئەون، نە بەرەو خۆر سوژدە بەرن، نە بەرەو مانگ، سوژدە بۆ خودایەك بەرن کە ئەوانی وەدی هێنا، ئەگەر هەر ئەو دەپەرستن خودای گەورە بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لەسەر دەسەڵاتی خۆی کە بێ وێنەیەو توانای هەیە بەسەر هەر شتێکدا مەیلی لێبێ، ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ﴾ واتە: وەدی هێنەری شەوو تاریکایەکەیەتی وەدی هێنەری ڕۆژو ڕوناکیەکەیەتی، کە هەردووکیان بە دوای یەکتردا دێنو جیا نابنەوە لە یەك، خۆرو ڕوناکیو پەرشەیو مانگو تروسکەکەی، هەریەکە لە بازنەی خۆیاندا، دێنو دەچن لە ئاسماندا.، مانگ بەجۆرێ، خۆر بەجۆرێ، بۆ ئەوەی بەو گۆڕانکاریەی مانگو خۆر ئەندازەی شەو ڕۆژو (جومعەکان ) مانگو ساڵ بزانرێ، ساڵانەی ئەو حەقانەی خودا دایناوەو کاتی عەبدەکانو کڕینو فرۆشەکان دیاری بکرێ و دەرکەوێ، پاشان لەبەر ئەوەی خۆرو مانگ دیارترین ئەستێرەن لە جیهانی سەرەوەو خوارەوە کە دەبینرێت، خودای گەورە ئاگاداری داوە کە هەردووکیان دروستکراوو بەندەی ئەون لە ژێر دەسەڵاتی ئەودانو ژێربارن، بۆیە ئەفەرموێت: ﴿لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ واتە: هاوەڵ بۆ خودا دامەنێن، چونکە ئەو عیبادەتەی دەیکەن بۆ خودا لەگەڵ ئەوانەی دەیکەن بە شەریکی خودا هیچ قازانجێکتان پێ ناگەیەنێ، بێگومان خودا خۆش نابێ لە هاوەڵ دانان بۆی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ﴾ ئەگەر ئەوان فیزیان نواند، ئەوانەی لای پەروەردگارتن (بە شەوو ڕۆژ) هەر پەسندی ئەو دەدەنو (بێزار) نابن، ﴿ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ یانی ئەگەر: فیزیان نواندو هەر هاوەڵیان بۆ خودا داناو بە تەنیا نەیانپەرست، ﴿فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾ یانی: فریشتەکان ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ﴾ وەك ئەم ئایەتەی خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا۟ بِهَا بِكَـٰفِرِينَ﴾[1] واتە: جا ئەگەر ئەوانە (قورەیش) بڕوای پێ نەهێنن ئەوە بێگومان بە دەستەیەکی ترمان سپاردوە (چاودێری بکەنو) بێ بڕواش نابن پێی. وە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ لە نیشانەکانی ئەوە زەوی دەبینی مات بووەو هەستی لەبەردا نەماوە، هەر کاتێ بارانمان لێ باراند، (کیف دەکات) دەبوژێتەوە، گیان بەبەر مردوشدا دەکات، خودا توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە

---

[1] الانعام (٨٩).

﴿وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ﴾ واتــە: لــە نیـشانەکانی دەسـتەڵاتی خـودا لەسـەر زیندووکردنـەوەی مـردو ﴿أَنَّكَ تَرَى ٱلۡأَرۡضَ خَٰشِعَةً﴾ واتە: تۆ زەمین دەبینی مات بووەو توانای نەماوە، گیاو گژەی تێدا نـەماوەو مـردوە ﴿فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ﴾ کەبارانمان باراند بەسەریدا ئەکەوێتەجووڵەو کیـف دەکـات یـانی: هەموو جۆرە ڕووەك‌و کشتوکاڵ‌و بەروبومێك لێـی دێتـەدەرو دەڕوێـت ﴿إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ﴾ واتە: ئەوەی زەوی زیندو دەکاتـەوە، مـردوویش زینـدو دەکاتـەوەو توانـای بەسـەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ ﴿٤٣﴾ ﴾

**سزای خوانەناسان‌و وەسفی قورئان**

خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ ئەوانەی کە سەبارەت بـە نیـشانانمان لەڕێگـە لائەدەن ،ناتوانن خۆیان لە ئێمە بشارنەوە. ئاخۆ کێ لە کێ چاکترە؟ ئەو کەسەی دەخرێتە ئـاگر، یـان ئەو کەسەی ڕۆژی قیامەت بێ ترس دێ؟ چی خۆتان حەز دەکەن بیکەن، ئەو لە هەرچی ئێوە دەیکەن چـاوەدێرە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا﴾ ئیبنوعـەباس دەڵێـت: (الالحـاد) (بـێ دینـی) یـانی: دانـانی قسەیەك کە جێی خۆیدا نەبێ،[1] قەتادەو کەسانی تریش دەڵێن: (ئیلحاد) واتـە: بـێ دینـی‌و کەلـلەڕەقی ﴿لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآ﴾ هەڕەشەو بەڵێنی توندی تێدایە. واتە: خودای گەورە ئاگای لەو کەسانەیە کە بڕوا بە نیشانەکان‌و ناوەکـان‌و سیفەتەکانی خـودا ناکـەن‌و خۆیـانی لێ لادەدەن، سـزایان دەدات لەسـەر ئـەو خوانەناسیە زۆر بەتوندی، بۆیە فەرموویەتی: ﴿أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾یانی: ئاخۆ ئەم دوو کەسـە وەك یـەکن؟ نـەخێر وەك یـەك نـین، پاشـان خـودای گـەورە هەڕەشـەی توند لـە خوانەناسان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ﴾چی حەز لێدەکەن بیکەن! موجاهیـدو زەححـاك‌و

---

[1] الطبري (٢١/٤٧٨).

عەتای خۆراسانی دەڵێن: ﴿ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ﴾ هەڕەشەیە.[1] واتە: هەرچی دەکەن لە چاکەو خراپە خـودا ئاگای لێتانەو چاودێرە بەسەرتانەوە. بۆیە فەرمویەتی: ﴿إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ پاشان خـودای مـەزن ئەفەرموویت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ﴾ ئەو کەسانەی ئەو کاتە قورئانیـان بۆ هات، دژی وەستانو بڕوایان پـێ نـەهێنا، کتێبێکـی زۆر بـەرزو جێگـەی ڕێـزە زەححاکو سـودیو قەتادە ئەڵێن:یانی قورئان.[2] ﴿وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ﴾ واتە: پارێزراوە هیچ کـەس نـاتوانێ وێنـەی قورئـان بێنێ، ﴿لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ﴾ پڕوپوچ لە ڕووی ناوەستیّ، (چ ڕوبەڕو، چ پاشملە) ئەمە کارزانێك ناردوویە کە هەر دەبێ پەسنی بدرێ یانی : پڕوپوچ ڕێـی نیـە ڕووی تێبکـات، چـونکە لەلایـەنی پـەروەردگاری جیهانـەوە ڕەوانـەکراوە، بۆیـە خـودای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ﴾ واتـە: کارزانـە لـە کـردارو گفتاریـداو سـوپاس کـراوە لـە گـشت ئەوانـەی کـە فەرمانی پێ دەکاتو قەدەغـەی دەکـات. پاشـان دەفـەرموویت: ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ﴾ ئەوانەی کە بە تۆی ئەڵێن: بە پێغەمبەرانی پێش تۆش هـەر وتراوە. پەروەدگارت بێگومانە کە دەتوانێ گوناهکاران عافوو بکاتو بۆشی هەیە ئازاری بەژانیان بـدات ﴿مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَ﴾ قەتادەو سودیو کەسانی تریش وتویانە: واتە: ئەوەی کە بە تۆ دەوترێ بە پێغەمبەرەکانی پێش تۆش وتراوە، وەك چـۆن بـڕوا بـە تـۆ ناکـەن بڕوایان بـەوانیش نەکردووە، کەواتە چـۆن ئـەوان خـۆڕاگر بـوون بەرانبـەر گەلەکـەیان تـۆش خۆڕاگربـە لەسـەر ئـازاردانی هۆزەکـەت بـۆت.[3] ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ﴾ واتـە: پـەروەردگارت لێبوردەیـە بـۆ ئەوانـەی کـە پەشـیمان دەبنـەوەو دەگەڕێنـەوە ﴿وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ﴾ واتـە: تۆڵـەش دەسـێنێ لەوانـەی کـە بـەردەوامن لەسـەر خوانەناسیو سەر پێچیو لاساریو دژایەتی خوادەکەن.

﴿وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَانًا أَعۡجَمِيّٗا لَّقَالُواْ لَوۡلَا فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥٓۖ ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞۚ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٞ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوۡنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدۡ

---

[1] الطبري (٢١/٤٧٨).

[2] الطبري (٢١/٤٧٩).

[3] الطبري (٢١/٤٨١).

ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾

**نكولی كردنی قورئان لاساریو سەرەڕۆییە**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾ گەر ئێمە ئەم قورئانەمان بە عەجەمی بناردایە، دەیانگوت: چۆن ئایەتەكانی ڕوون نەكراوەتەوە؟ خۆی عەرەبەو نیشانەكانی عەجەمین؟ بڵێ ئەمە بۆ كەسانێكە باوەڕیان پێ هێناوە، ڕێبەرو چارەی دەردەكانە. ئەوانەی بڕواشی پێ ناكەن، گوێ گرانن لە بیستنو چاویان لە دیتنی كوێرە، هەر ئەڵێی لە جێی دورەوە بانگ دەكرێن. كاتێ كە خودای گەورە باسی ڕەوانبێژیو جوانی ووتەو ماناو بڕیارەكانی قورئانی كرد بۆیان، موشریكەكان بڕوایان پێ نەكرد، خودای مەزن پێغەمبەرو موسوڵمانان ئاگادار دەكاتەوە كە بێ دینی ئەمانە بەهۆی لاساریو بێ گوێیەوەیە، وەك خودای مەزن لە ئایەتێكی ترا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ﴾ [1] هەر بەو شێوەیە گەر هەموو قورئان بە زمانی عەجەمی ڕەوانە بكرایە هەر بەلاساریو بێ گوێی دەیانوت: ﴿لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ﴾ واتە: دەیانوت: خۆزگە بە شیكراوەیی بە زمانی عەرەبی ڕەوانەبكرایە، جەختیان لەسەر ئەو قسە دەكردەوەو دەیانوت: خۆی عەرەبەو ئەوەی هێناویەتی عەجەمیە؟ واتە: چۆن دەبێ قورئانێكی عەجەمی ڕەوانە بكرێ بۆ كەسێكی عەرەب كە لێی تێناگات؟ ئەم مانایە هەر بەو شێوەیە لە ئیبنو عەباسو موجاهیدو عیكریمەو سەعیدی كوڕی جوبەیرو سودیو كەسانی تریشەوە ڕیوایەت كراوە.[2] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾ واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پێیان بڵێ: ئەم قەرئانە بۆ ئەوانەی كە باوەڕیان پێ هێناوە ڕێ نیشاندەرو دەوای دەردانە بۆ دڵان لە گومانو دڵە ڕاوكێ، ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ﴾ واتە: ئەوانەشی كە تێی ناگەن گوێیان كەڕە(﴿وهوعليهم عمى﴾ واتە: چاویان كوێرەو ڕێ دەرناكەن تا لەسەر ڕووناكی قورئان بڕۆن، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ

---

[1] الشعراء (١٩٨ـ١٩٩).

[2] الطبري (٢١/٤٨٢).

ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾[1] واتە: وە لەم قورئانەدا دەنێرینە خوارەوە ئەوەی کە هۆی شیفاو میهرەبانیە بۆ بڕواداران بەڵام (هاتنی ئەم قورئانە) بۆ ستەمکاران هیچ زیاد ناکات بۆیان بێجگە لە خەسارەتمەندی. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾ موجاهید دەڵێت:ئەم قورئانە لە دڵیانەوە دوورە.[2] ئیبنو جەریر دەڵێت: واتە: وەك ئەوەوایە ئەو کەسانە یەکێ قسەیان لەگەڵ دەکات لە شوێنێکی زۆر دوورەوەکە تێ ناگەن لەوشتانەی بۆیان باس دەکرێ.[3] منیش دەڵێم ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾[4] واتە: وە نموونەی ئەو بێبڕوایانە وەك یەکێك وایە کە هاوار لە ئاژەڵێك بکات تەنها دەنگو هاوارەکە نەبێ هیچ نابیستێ ئەمانە کەڕنو لاڵن (لە وتنی قسەی دروست)و کوێرن (لە بینینی ڕێی ڕاست) بۆیە تێ ناگەنو ژیر نین.

**( ئامادەکردن بۆچاو کردن لەموسا )**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾ کتێبیشمان دابە موسا، کە لەسەری کێشە کرا. خۆ ئەگەر پەروەردگاری تۆ پێشتر گفتی نەدابا، بە کاریان ڕادەگەیشت بێگومان ئەوانە لێی دوو دڵنو بەدگومانن ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ﴾یانی: ئەو ڕاستیەشمان ڕەوانە کرد بۆ موسا کەچی خەڵکی بڕوایان پێ نەکردودەستیان دایە ئازاردانی ﴿فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾[5] واتە: کەواتە خۆگربە ئەی محمد (ﷺ) هەروەکو پێغەمبەرانی خۆڕاگری بەهێز دانیان بەخۆدا گرت. ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾ واتە: ئەگەر پەروەرینی تۆ پێشتر بڕیاری نەدایە، لێ پرسینەوەیان دوا بخات بۆ ڕۆژی قیامەت ئەوە سزای دەدانو لە ناوی دەبردن ﴿لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾یانی: زۆر بەزوویی تۆڵەی لێ دەسەندن بەڵام خودای گەورە کاتێکی بۆ دیاری کردوونو دەربازبوونیان نیەو ڕزگار نابن ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ واتە: ئەو بێباوەڕیەیان لە شارەزاییەوە نەبو بەڵکو دوو

---

[1] الاسراء (٨٢).
٢ الطبري (٢١/٤٨٥).
[3] الطبري (٢١/٤٨٤).
٤ البقرة (١٧١).
[5] الاحقاف (٣٥).

دڵ و بەدگومان بوون هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەبو لەسەر ئەوەی کە دەیانوت: ئیبنو جەریریش هەر وای وتووەو ڕایەکی گونجاوە.[1] والله اعلم.

## هەر کەسەو بە پێی کردەوەی خۆی پرسیاری لێ دەکرێت و پاداشت دەدرێتەوە

خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ هەر کەسێ کاری چاك دەکات بۆ خۆی دەکات و، کەسێکیش خراپە دەکات، لە دژی خۆی کردوویەتی پەروەرنـدەت غـەدر لـە عەبـدانی ناکـات، ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ﴾ هـەر کەسـێ چـاکە دەکـات قازانجەکـەی بـۆ خـۆی دەگەڕێتـەوە، ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ﴾ هـەر کەسـیش خراپـە دەکـات زیـانی ئـەو خراپەیە بۆ خۆیەتی، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ واتە: خودا ناهەقی لە بەندەکانی ناکات، تۆڵـەش لـە کەس ناسێنێ لەسەر گوناهی خۆی نەبێ، سزای کەسیش نادا هەتا بەڵگەی ڕوونی نەداتێ و پێغەمبەری بۆ ڕەوانە نەکات.

﴿ ۞ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ ﴾

## تەنیا خودا دەزانێ ڕۆژی قیامەت کەی دێت

خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴾ ڕۆژی قیامـەت کەی دەبێ، ئەو دەیزانێ، بەروبومی هەموو ڕووەکێك کە لە شکۆفە دێتە دەرو هـەر مێینەیـەك ئاوسـەو چی لەسکیداو چی لێ دەبێ،هەر ئەو دەیزانی، ئەو ڕۆژەی کە خودا بانگیان لێ دەکات و(دەفـەرموێ)، شەریکەکانی من لە کوێن؟ دەڵێن هەواڵمان پێداوی و لای تـۆ دەی درکێنن، کـەسمان ئاگامـان لێ نیـە.

پاشان خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ واتە: هیچ کەس نـازانێ ڕۆژی قیامـەت کـەی دێت غەیری خودا وەك پێغەمبەر کە بەڕێزترینی مرۆڤە (ﷺ) فەرمووی بە جوبرەئیل (سـەلامی خـوای لێبێ) کە لە فریشتە بەڕێزەکانە کاتێ کە پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەی هاتنی قیامەتـەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (مـن لێپرسـراو نیم لـەو بارەیـەوە، شـارەزاتر نـیم لـەو کەسـەی کە

[1] الطبري (٢١/٤٨٧).

پرسیارەکە دەکات).[1] وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَاهَآ﴾[2] واتە: زانینی ئەوە هەر لای پەروەردگارتە.وە دەفەرموێت: ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾[3] واتە: هیچ کەس ناتوانێ کاتەکەی ئاشکرا بکات جگە لەو. ﴿وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ﴾یانی: هەموو شتێ بە ئاگاداری خودایە لە زەمینو ئاسماندا بە ئەندازەی قورسی گەردیلەیەك لە خودا ون نابێ وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا﴾[4] واتە: وە هەر گەلایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پێی دەزانێ. وە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ وَكُلُّ شَىْءٍ عِندَهُۥ بِمِقْدَارٍ﴾[5] واتە: خوا دەزانێ مێینەیەك (لە مندالدانیدا) چی هەلگرتووە(کوڕ یان کچ) وە هەروەها دەزانێ مندالدان چی لێ کەم دەبێتەوەو چی زیاد دەکات وە هەموو شتێ لای ئەو (خوا) ئەندازەی (دیاری کراوی) هەیە. وە دەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾[6] واتە: وە هیچ تەمەن درێژکراوێ تەمەنی دێژ ناکرێ وە لە تەمەنی کەم ناکرێ مەگەر لە کتێبێکدا نوسراوە بە ڕاستی ئەم کارە بۆ خوا ئاسانە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە موشریکەکان بانگ دەکات لەبەر چاو ئەو هەموو خەلکە پێیان ئەلێ کوان ئەوانەی کە ئێوە لەگەلّ من دەتان پەرستن؟ ﴿قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ﴾ واتە: دەلێن هەوالّمان پێداوی ﴿مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ﴾ واتە: هیچ کەسێ لە ئێمە شایەتی نادا کە تۆ شەریکت هەیە. ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ ئەو شتانەی لە پێشوودا جێگەی هاناو هاواریان بوون، لێیان گوم بوونو تێگەیشتون کە هیچ دەرەتانیان نیە ﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ﴾ واتە: ئەوانەی کە بەتەمایان بوون بە هانایانەوە بێن، ڕۆشتنو قازانجیان پێ نەگەیاندن ﴿وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾ واتە: چاك تێ گەیشتن لە ڕۆژی قیامەت ﴿مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾

[1] فتح الباري (١/١٤٠).
[2] النازعات (٤٤).
[3] الاعراف (١٨٧).
[4] الانعام (٥٩).
[5] الرعد (٨).
[6] الفاطر (١١).

واته هیچ پەنایەکیان نیه له سزای خودا لایان بدات. ﴿ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُواْ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴾[1] واته: وه تاوانباران ئاگری دۆزەخ دەبینن‌و هەموو دەزانن‌و دڵنیادەبن کە دەچنە ناوی وتێی دەکەون وه ڕێگایەکیان دەست ناکەوێ بۆ گەڕانەوە لەو (ئاگرە).

﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾﴾

### له خۆگۆڕانی مرۆڤ وەختێ توشی خۆشیەك دەبێ دوای ناخۆشی

خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾ مرۆڤ هەرچەندە نزا بۆ شتی باش بکات، وەڕز نابێ، هەر کاتێ خراپـەش تووشـی هـات، هیـچ ئـاواتێکی نامینێ‌و نائومێدئەبێ، خودای گەورە باسی مرۆڤ دەکات کە ماندو نابێ لە پاڕانەوە لێـی بـۆ داواکردنـی سامانی زۆرو لەش ساغی‌و منداڵی زۆرو شتی تریش، بەڵام کاتێ توشـی بەڵایـەك هـات وەك هـەژاری یـا نەخۆشی، ﴿فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾ واته: بێ هیوا دەبن‌و وادەزانن هەرگیز لەو بـەڵاو نەخۆشـی‌و لێ قەومانـە ڕزگاریان نابێ ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ ئەگـەر لـە پـاش دەردو مەینەتیـەك کـە تووشـی دێ، تـامی خۆشـیمان پـێ چەشـت، دەڵـێ ئەمـە لـە خۆمەوەیەو باوەڕ ناکەم قیامەت ڕهەڵبسێت، خۆ ئەگەر بشمبەنەوە بۆ نزیك پەروەرندەی خـۆم، سـوور دەزانم پتر چاکەم لەگەڵ دەکات. جا ئەوانەی کافروبەدنەمەکن، لە هەر کارێ کردویانە خۆمان ئاگاداریان دەکەین‌و جەزرەبەی زۆر دژواریـان پـێ دەچـەژین، ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى﴾ واته کاتێ توشی خۆشی‌و دەوڵەمەندی بوو دوای ئەو ناڕەحەتیەی کە تووشـی هـات، دەڵـێ: ئەمـە لـە لێهـاتووی خۆمەوەیـەو مـن شایـستەی ئـەوەم کـە خـودا پێـی داوم، ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾یانی: بڕوای بە ڕۆژی قیامەت نیە، لەبەر ئەوەی کە ڕێی پێدراوەو ئازادە لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەدا فیزی خۆی زل دەکات‌و ماڵ بەبێ هودە سەرف دەکات‌و بێ دینی خۆی ئاشکرا دەکات، وەك

---

[1] الكهف (٥٣).

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ﴾[1] واتە: بە ڕاستی مرۆڤ یاخی ئەبێ، کە خۆی ببینێ وا دەوڵەمەند بووە. ﴿وَلَئِن رُّجِعۡتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلۡحُسۡنَىٰ﴾ واتە: خۆ ئەگەر قیامەتیش هەبوو، ئەوا لای خودا زیاتر چاکەم بۆدانراوە !، بە هیوایە لەگەڵ ئەم هەموو کردارە خراپەو بەدگومانیەی لە هاتنی ڕۆژی قیامەت، هەر خودا چاکەی لەگەڵ بکات. خودای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنۡ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ خودای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسەی ئا بەو شێوەیە کار دەکاتوبەو شێوەیە بیر دەکاتەوە لە سزای توندی خودا. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت ﴿ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ﴾ وەختێ لەگەڵ مرۆڤ چاکە دەکەین، پێی نازانێو فیز دەنوێنێو منیەتی، هەر کاتێکیش خراپەی تووش ببێ، ئەوە نزاو هاواری زۆر دەکات ﴿ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾یانی: فیز لێ دەداتو گوێڕایەڵی فەرمانی خودا ناکاتو لە خۆی بایی دەبێ. وەك ئەم ئایەتەی ترکە دەفەرمووێت:﴿ فَتَوَلَّىٰ بِرُكۡنِهِۦ﴾[2] واتە: فیرعەونیش ڕووی وەرگێڕاو سەرپێچی کرد بەهۆی دەسەڵاتەکەیەوە. ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾ واتە: کاتێکیش نارەحەت بوو ﴿فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ﴾ واتە: زۆر دەپاڕێتەوەو لەسەر شتی دەڕواتو هەر نایبڕێتەوەو (الكلام العريض ) ئەوقسەیە کەلەفزەکانی زۆر بن و ماناکانی کەم بن ، (الكلام الوجيز ) یش بەپێچەوانەوەیە ،وەك ئەوترێ (ماقلّ ودلّ) واتە: قسە هەزارە دووانی بەکارە. خودای مەزنیش فەرمویەتی: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥ﴾[3] واتە: وە کاتێ ئادەمی زیانێکی لێ بکەوێت بە ڕاکشاوی یان بەدانیشتن یان بەپێوە لێمان دەپاڕێتەوە ئینجا کاتێ لامان برد زیانەکەیو نەمانهێشت دەڕوات (دەچێتە سەر حاڵی پێشوی) وەك هاوارو دوعای نەکردبێ لێمان بۆ لابردنی زیانێ کە دووچاری بووە.

﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ٥٢
سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ
شَهِيدٌ ٥٣ أَلَآ إِنَّهُمۡ فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ٥٤ ﴾

---

[1] العلق (٦ـ٧).

[2] الذاريات (٣٩).

[3] يونس (١٢).

**قورئان و نیشانەکانی ڕاستی ئەم قورئانە**

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴾ ئێوە بەس بڵێن، ئەگەر ئەمە لەخواوە بێ و ئێوە باوەڕی پێ نەکەن، دەی کێ لەوە گومڕاترە کە لاساری سەرکەشی بکات، خودای گەورە دەفەرموویت پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ بەو موشریکانەی کە بڕوایان بە قورئان نییە ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ ﴾ ئەم قورئانە ﴿مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ﴾ لەلایەن خوداوە ڕەوانە کرابێ بۆ پێغەمبەرەکەی کەچی ئێوە پێی کافربن چی ئەڵێن و چۆن بیردەکەنەوە؟ بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴾ واتە: کێ لەو کەسە سەرلێشێواو ترەو وێڵترە کە هەر لەسەر بێ دینیو لاساری و دژایەتی هەق بڕواو لە ڕێی ڕاست دوورکەوێتەوە. پاشان خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّۗ أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ هاکا وامان کرد ئەوانە لە ئاسۆکانی زەمین و ئاسماندا و لەناخی خۆشیاندا نیشانەکانمان ببینن، هەتا لێیان ڕوون بێتەوە کە ئەم قورئانە ڕاستە، ئاخۆ هێندە بەس نیە، پەروەردگارت لە هەمووشتێك ئاگادارە؟ ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ واتە: بەم زوانە نیشانەو بەڵگەکانی خۆمانیان نیشان دەدەین کەبەڵگەبن لەسەر ئەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خواوەهاتووەتە سەر پێغەمبەر(ﷺ) . ﴿فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ وەك ئەو سەرکەوتنانەی کە بە دەستی دێنن هەروەها ئەو بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلامە بە هەموو لایەکداو زاڵبونی بەسەر ئاینەکانی ترا، موجاهیدو حەسەنی بەسری ئەڵێن: (نیشانەکان لەناو خۆیاندا) بریتیە لە ڕووداوی بەدرو (فتح)ی مەککەو چەند ڕووداوی تر کە هات بەسەریاندا خودای گەورە پێغەمبەرو (ﷺ) هاوەڵەکانی سەر خستو ناهەقیو پڕوپوچ و شوێنکەوتووانی سەرشۆڕکرد، وە لەوانەشە مەبەست پێی مرۆڤ خۆی بێ کە لەچی پێك هاتووەو چۆن لە هەموو ڕوویەکەوە وەك لە زانستی تەشریحدا بەفراوانی باسی کراوە کە پڕ لە بەڵگەی کارزانی وەدی هێنەرە کە خودای گەورەو خاوەن دەسەڵاتە، وە ئەو سروشتەی کە مرۆڤی لەسەر وەدی هاتووە کەهەر یەکەی جۆرێکە لەچاکی یان خراپیدا. وە ئەو شتانەی کە ڕێی پێدراوە بەئارەزووی خۆی بیکات بەڵام بەو پێیەی کە خودای گەورە بڕیاری داوە نەك بەهێزو تواناو دەسەڵاتی خۆی هەرچی بوێ بیکاتو لە بەری بڕوا ﴿أَوَلَمۡ يَكۡفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوەندەیان بەس نیە کە خودای مەزن ئاگاداری کردارو گرفتاریانە، خودا خۆی شایەتی دەدا کە موحەممەد (ﷺ) ڕاست دەکات لەوەی کە بۆی هێناون وەك فەرموویەتی:

﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ﴾[1] واته بەڵام خوا شایەتی دەدات بۆ (ڕاستی) ئەو قورئانەی ناردویەتیە خوارەوە بۆت لەڕووی زانینی خۆیەوە ناردوویەتیە خوارەوە. خودای مەزن ئەفەموێت: ﴿أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاءِ رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ﴾، باش بزانە کە ئەوانە لە دیداری پەروەردگاریان دوودڵن، باش بزانە خۆی دەوری لە هەموو شتێ داوە ﴿أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاءِ رَبِّهِمْ﴾ واتە: ئەوانە گومانیان هەیە لە هاتنی ڕۆژی قیامەت، هەر بیریشی لێ ناکەنەوەو کاری بۆ ناکەن و لێشی ناترسن، بڕوایان پێی نیەو بەربای گوێیان ناکەوێ. کە گومانی تێدا نیە هەر دێت و ڕوودەدات، خودای مەزن کە ئاگاداری هەموو شتێکەو دەوری هەموو شتێکی داوە، هاتنی ڕۆژی قیامەت لە لای ئەو زۆر ئاسانە ﴿أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ﴾ واتە: خاوەنی دەسەڵاتە بەسەر هەموو دروسکراوەکانیدا هەمووی لە ژێر تواناو دەسەڵاتی ئەودایەو ئاگای لێیەتی، بە مەیلی خۆی بە کاری هەموویان دەگات هەرچی ویست دەبێ ببێت، هەرچیشی نەویست نابێ بێت، هیچ پەرستراوێك نیە غەیری ئەو .

**تەفسیری سورەتی( الشوری )**

**لە مەککە هاتووەتە خوارەوە**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ السَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ وَالْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي الْأَرْضِ أَلَآ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾﴾

**نیگاو گەورەیی خوا**

﴿حمٓ﴾ حا، میم، ﴿عٓسٓقٓ﴾ عەین، سین، قاف. لە پێشەوە و لەسەرەتای سورەتی البقرە دا قسە لەسەر ئەم پیتانە کرا، ﴿كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ خوای گەورەی بەدەسەڵاتی زانا لە کار، فەرمانی خۆی ئاوا بۆ تۆو پێغەمبەرانی بەر لە تۆش بەڕێ دەکات. واتە: وەك چۆن ئەم قورئانەی بۆ تۆ نارد هەر بەو شێوەیەش کتێب و نووسراوی لە پێش تۆوە ڕەوانە کردووە بۆ

[1] النساء (١٦٦).

پێغەمبەرەکان ﴿ٱلۡعَزِيزُ﴾ خاوەنی دەسەڵاتە لە تۆڵەسەندندا ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ کارزانە لە کردارو گفتاردا. ئیمامی مالك ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: حارس(الحارث) کوڕی هیشام پرسیاری کرد لە پێغەمبەر(ﷺ) کە چۆن نیگات(وەحیت) بۆ دێت؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(زۆرجار وەك دەنگی جەرەس ئەم شێوە نیگایە لە هەموو شێوەکانی تری نیگا گرانترو بەهێزترە لەسەر من لە دواییدا ئەو ناڕەحەتیو گرانیەم لەسەر لادەچێت. نیگایەکەچۆنی گوتووە بە تەواوی هاتووەتە بەرم. جاری واش هەیە فریشتەی نیگا دەچێتە شێوەی پیاوێكو قسەم لەگەڵ دەکات. ئەوەی بیڵێ لەبەری دەکەم). عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لە ڕۆژی زۆر ساردو سەرمادا پێغەمبەری خودام(ﷺ) دەبینی کاتێ نیگای بۆ دەهاتە خوارەوە کە گرانیو ناڕەحەتی نیگاکەی لەسەر لادەچوو نێوچەوانی عارەقی پیا دەهاتە خوارەوە.[1] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە وتەکە هی بوخاریە.[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِىُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەکانو هەرچی لە زەمیندا هەیە، گشت بۆ ئەوەو هەر خۆی جێ بەرزو مەزنە. واتە: هەموو بەندەی ئەوەو بەرفەرمانی ئەونو لە ژێر دەسەڵاتی ئەودایەو ئەو هەڵی دەسوڕێنێت، ئایەتی: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِىُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ﴾[3] واتە: گەورەو بەرزە. مەزنو بەرزە. ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِىُّ ٱلۡكَبِيرُ﴾[4] واتە: وە تەنها(خودا) بەرزو بڵندو گەورەیە. ئایەت لەم شێوەیە زۆرە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِى ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ لەوانەیە ئاسمانەکان درز بەرنو بەسەر یەکداخرمە بکەن فریشتانیش بە سوپاسەوە پەسەنی پەروەردگاریان دەدەن، داوای بەخشین بۆ خەڵکی سەر زەمین دەکەن. باش بزانن ئەوەکە لە گوناه دەبوورێتو دلۆڤانە. ﴿تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ﴾ ئیبنو عەباسو زەحاكو سودیو قەتادەو کەعبی ئەحبار وتوویانە: واتە: لەوانەیە ئاسمانەکان پارچە پارچە ببێت لە ترساندا لەبەر مەزنی خودا.[5] ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِى ٱلۡأَرۡضِ﴾ وەك ئەم ئایەتە وایە کە

[1] موطأ(١/٢٠٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.
[2] فتح الباري(١/٢٥)، مسلم(٤/١٨١٦).
[3] الرعد(٩).
[4] سبأ(٢٣).
[5] الطبري(٢١/٥٠١).

دەفەرموویت: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا﴾[1] واتە: ئەو کەسانەی هەلگری عەرشن‌و ئەوانەش بە دەوری دان بە ستایشی پەروەردگاریان تەسبیحات دەکەن‌و باوەڕیان بەو هەیەو داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی ئیماندارن(دەڵێن:) ئەی پەروەردگارمان میهرەبانی‌و زانیاریت هەموو شتێکی گرتووەتەوە.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئاگادارکردنەوەیە بەوەی کە خودا لە گوناه دەبووریت‌و دلۆڤانە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾ ئەو کەسانەی ئەو شتانەی کەغەیری ئەون، بە دۆستی خۆیان زانیون‌و خەریکی پەرستنیانن، خودا ئاگای لە کاریان هەیەو تۆباڵیان لە ئەستۆی تۆ نیە. ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ﴾ واتە: بتپەرستان. ﴿ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ خودا شایەتە لەسەر کردارەکانیان یەکەیەکە لەسەریان دەنووسێت‌و زۆر بە باشی پاداشتیان دەداتەوە. ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾ یانی تۆبریکاری ئەوانە نیت تەنها تۆ ئاگادارکردنەوەت لەسەرە خوای گەورە لە هەموو شتێك دەپرسێتەوەو بریکاری هەموو شتە.

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ ۝٧ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ۝٨﴾

### قورئان هاتووە بۆ ترس وەبەر خەڵکی هێنانەوە

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ﴾هەروەها قورئانێکی عەرەبیمان بۆ تۆ نارد، هەتا تۆ بەوقورئانە ترس وەبەر خەڵکی مەککەو دەوروبەری بێنی‌و لە ڕۆژی کۆبوونەوەشیان بترسێنی. کە بێگومان هەر وەدی دێت، ئەوسا بەشێك بەهەشتین‌و بەشێکیان دەچنە جەهەنەم. واتە: وەك چۆن کتێبمان بۆ ئەوان نارد، ﴿أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا﴾ قورئانێکی عەرەبی ڕەوان‌و ئاشکراو دیارمان بۆ تۆش نارد، ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ﴾ هەتا خەڵکی مەککە(کە دایکی شارەکانە) بترسێنی، ﴿وَمَنۡ حَوۡلَهَا﴾

[1] الغافر(٧).

دەوروبەریشی لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوایەوە. بۆیە مەککە ناوبراوە بە دایکی شارەکان، چونکە بەڕێزتربووە لەو شارو وڵاتانەی کە لەو ناوەدا بوون لەبەر زۆر بەڵگە کە لە شوێنی خۆیدا باس کراوە. کورتترینو بەهێزترین بەڵگە ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەدی حەمرائی زەهریەوە کە بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە وەستابوو لە شوێنێکدا لە بازاڕی مەککەدا دەیفەرموو:(سوێند بە خوا تۆ(یانی مەککە) چاکترین زەمینی خودای وە خۆشەویستترین زەمینی خودای لای خودا. وە ئەگەر من دەرنەکرامایە لە تۆ هەرگیزلێت دەرنەدەچووم).[1] هەر بەم شێوەیە تیرمیزیو نەسائیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە، ترمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی چاکو ڕاستە(حسن صحيح).[2] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ﴾ ڕۆژی قیامەت کە خوای گەورە پێشینانو پاشینان هەموو کۆدەکاتەوە لە یەك شوێندا ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ گومان نیە لە هاتنیداو هەر دێت، ئەم ئایەتە: ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ﴾ وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ﴾[3] واتە:(پاداشتتان دەداتەوە) لە ڕۆژێکدا کە کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە ئەو ڕۆژە ڕۆژی زیانباریە. واتە خەڵکی بەهەشت خۆیان لا دەدەن لە خەڵکی ناو ئاگر. وەك ئەم ئایەتەیش وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ﴾[4] واتە: بە ڕاستی لەوەدا(باس کرا) پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسێك بترسێت لە سزای دواڕۆژ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئادەمی بۆ کۆدەکرێتەوەو ئەوە ڕۆژێکی دیارو بەرچاوە(هەمووان ئامادەن تێیدا)، وە ئێمە دوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو، ئەو ڕۆژە کە دێت هیچ کەس قسە ناکات مەگەر بە مۆڵەتی خودا ئەوسا لەناویاندا هەیە بێ بەختو نەگبەتو هەیە بەختەوەرو ئاسودە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەر هاتە دەرەوە بۆ لامان دوو نامەی بە دەستەوە بوو فەرمووی:(ئایا دەزانن ئەم دوو نامەیە چیە؟) وتمان نەخێر مەگەر تۆ هەواڵمان بدەیتێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی بەوەی کە بە دەستی ڕاستیەوە بوو:(ئەمە

[1] احمد(٤/٣٠٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي(١٠/٤٢٦)، النسائي(٢/٤٧٩)، ابن ماجه(٢/١٠٣٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] التغابن(٩).

[4] هود(١٠٣_١٠٥).

نامەیەکـە لـە لایـەن پـەروەرێنی جیهانـەوە کـە ناوەکـانی خـەڵکی بەهەشـتو بـابو بـاپیرانو هۆزەکانیانـە(پاشـان هـەمووی کـۆکردەوە) هـەرگیز کەسـی لێ زیـاد ناکرێـتو کەسیـشی لێ کـەم ناکرێت(پاشان فەرمووی بەوەی کە لـە لای چەپیەوە بـوو، ئەمـە نامـەی خـەڵکی نـاو ئـاگرە بـە نـاوی خۆیـانو نـاوی بـابو باپیرانیـانو هۆزەکانیـان(پاشـان هـەمووی کـۆکردەوە) هـەرگیز کەسـی لێ زیـاد ناکرێتو کەسیشی لێ کەم ناکرێتەوە). هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان: ئیتر لەسەر چ شتێك ئێمە کار بکەین، ئەگەر ئەمە بڕیارێکەو دراوەو تەواو بووە. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی:(لەسـەر ڕێ ڕاوەستنو خۆتان نزیك بخەنەوە(واتە لە خواوە) چونکە خەڵکی بەهەشت کۆتایی پێ دەهێنرێت بـە کرداری خەڵکی بەهەشت با بە هەر کردارێك کاری کردبێتو خەڵکی جەهەنـەمیش کـرداری کۆتـایی پـێ دەهێنرێت بۆی بە کرداری خەڵکی جەهەنەم با بە هەر کردارێك کاری کردبێت)، پاشـان پێغەمبـەر(ﷺ) دەستی ڕاداو(قوچای) پاشان فەرمووی:(پـەروەردگارتان لێ بووەتـەوە لـە بەنـدەکانی پاشـان دەسـتی ڕلاستی ڕاداو فڕێی دا، فەرمووی: دەستەیەك بۆ بەهەشت. بە چەپیشی فڕێی داو هەمیسان فـەرمووی: دەستەیەکیش لـە ئـاگری بـە کڵپەدایە).[1] هـەر بـەم شێوەیە تیرمیـزیو نەسـائی ڕیوایـەتیان کـردووە. تیرمیزی دەڵێت: چاكو غەریبە(حسن غريـب).[2]ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئـەبو نـەزرەوە دەڵێت: پیاوێك لـە هاوەڵـەکانی پێغەمبـەر(ﷺ) پێیـان دەوت ئـەبو عەبـدوڵڵا، هاوەڵـەکانی چـوونە لای سەریانکرد دەگری. پێیان وت: چـی دەتگرێنـێ؟ ئایـا پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) پێـی نـەوتی:(خُذ من شاربك ثم أقره حتى تلقاني)بەرسمێڵت بکە و لەسەرشایەتومان بەردەوامبە تا پێمدەگەی. وتی: بـەڵێ. بەڵام بیستم لە پێغەمبەری خـوداوە(ﷺ) دەیفـەرموو:(خـوای گـەورە مـشتێکی بـە ڕاسـتی گـرتو ئـەو مشتەکەیشی بە دەستەکەی تری پاشان فەرمووی ئەمە بۆ ئەوێو ئەمەیش بۆ ئـەوێ بـە لامەوە گـرنگ نیە). جامن نازانم کام مشتەیانم[3]. فەرموودە لە باسی قەدەردا(القدر) لە کتێبە سەحیحەکانو سـونەنو موسنەدەکاندا ئێجگـار زۆرە لەوانـە فـەرموودەی عـەلیو ئیبنـو مەسـعودو عائیـشەو کۆمـەڵێکی زۆری تر(ڕەزای خوا لە هەموویان بێـت). خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ ۚ وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ئەگـەر خـودا مـەیلی لێ بووایـە، گـشتی دەکردە بەرەیەك لە ئایندا، بەڵام هەر کەسێك خۆی حـەز بکـات، وەبـەر بـەزەیی دەخـات، ناهـەقانیش دۆستو یاریکاریان نیە. ﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ ئەگـەر خـوا مـەیلی لێ بوایە یـان هـەمووی

---

[1] أحمد(٢/١٦٧)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي(٦/٣٥٠)، النسائي في الكبرى(٦/٤٥٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد(٤/١٧٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

دەخستە سەر ڕاستەڕێ یان هەمووی دەخستە سەر ڕێی گومڕایی. بەڵام خوای گەورە جیاوازی کردووە لە نێوانیاندا. ئەوەی مەیلی لێ بووبێت ڕێی نیشان داوە بۆ سەر هەق و ئەوەیشی مەیلی لێ نەبووبێت ڕێی لێ ون کردووە لە خۆی. لە کارزانی خۆیەتی. هەر خۆشی باشتر دەزانێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ﴾ بەڵام هەر کەسێك خۆی حەز بکات، وەبەر بەزەیی خۆی دەخات، ناهەقانیش دۆست و یاریکاریان نیە. واتە کەس نایەت بە هانایانەوە.

﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٩ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ١٠ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١٢﴾

## هەر خوای گەورە دۆست و فەرمانڕەوا و وەدیهێنەرە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ ئاخۆ کەسیان غەیری خودا دیوەتەوە کە دۆستیان بێت؟ دۆستی ڕاستی هەر خۆیەتی و ئەو دەتوانێت مردووان زیندوو بکاتەوە و توانای هەموو شتی هەیە. خوای گەورە ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بتپەرستان کە لە غەیری خودا کەسێکی تر بکەن بە خودای خۆیان دەفەرمووێت کە هەر ئەو دۆستی ڕاستی بەندەکانیەتی و نابێت بەندایەتی هیچ کەسێك بکرێت ئەو نەبێت بە تەنها، چونکە هەر ئەو دەتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوە توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا. پاشان خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ لەسەر هەرچی پێك نەهاتن، بڕیارلێدانی بەدەنەدەست خوا، ئەو خودایە منی پەروەردە کردووە، من خۆم هەر بەو سپاردووە و هەر ڕوو دەکەمە لای ئەو. یانی: لە هەر شتێکدا ڕێك نەکەوتن. ئەم ئایەتە گشتگیرە و هەموو شتێك دەگرێتەوە، ﴿فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: خودا بڕیاری تێدا دەدات لەڕێگەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾[1] واتە: جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر(ﷺ). ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي﴾ واتە پەروەرندەی من فەرمانڕەوایە لە هەموو

---

[1] النساء(٥٩).

شتێکدا. ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ هەر دەگەڕێمەوە لای ئەو لە هەموو کارو فەرمانێکداو خۆم بە ئەو سپاردووە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ وەدیهێنی ئاسمانەکانو زەمینەو هەر لە خۆتان جووتەی لێ بەرهەم هێنانو لە ماڵاتیش جووتی یەکتری دروست کرد تا زۆرتر پەرەتان پێ بدات، هیچ شتێك وێنەی ئەو نیە، هەر خۆی بیسەرو بینایە. ﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ وەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەمینە ئەوانەش کە لە نێوانیاندایە، ﴿جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا﴾ لە ڕەگەزو وێنەی خۆتان نێرو مێی دروست کردووە وەك ڕێزێك لێتان، ﴿وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا﴾ وە لە ماڵاتیش هەشت جووتەی دروست کردووە، ﴿يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِ﴾ بەو شێوەیە دروستی کردوونو زیاتری کردوون واتە: بەو وێنەیەو بەو سیفەتە بەردەوام بە نێرو مێو ئەوە پاش ئەوەو بنەماڵە پاش بنەماڵەو یەك لە دوای یەك بە مرۆڤو ماڵاتەوە، وەدی هێناون. ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ هیچ شتێك وەك وەدیهێنەری جووتەکان نیەو چونکە ئەو تەنهاو بێ نیازەو جێی نیازەو وێنەی ئەو نیە، ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ بیسەرو بینایە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ کلیلەکانی ئاسمانەکانو ئەم زەمینە لە لای ئەوە، ڕۆزیش هەر بە مەیلی ئەوە بۆ یەکێك فرە دەنێرێتو بۆ یەکێك کەم. ئاگای لە هەموو شت هەیە. لە پێشەوە لە سورەتی(الزمر)دا مانای کراوە، کورتەکەی ئەوەیە واتە: کاربەدەستو خاوەن دەسەڵاتی ئاسمانەکانو زەمین هەر خودایە، ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ﴾ واتە: ڕۆزی فراوان دەکات بۆکەسێك مەیلی لێ بێتو تەنگو کەمی دەکات بۆ کەسێکیتر مەیلی لێبێت. خودا خۆی کارزانەو دادپەروەری بێ هاوتایە، ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ ئاگای لە هەموو شت هەیە.

﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ
أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ
مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ
أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾﴾

## ئایینی پێغەمبەران یەکە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ واتە: ڕێگەیەکی لە دینداری بۆ ئێوە کێشا، کە ئەپساردی نوحیش هەر لەو ڕێگە بڕوات، هەر ئەمەشمان بە فەرمان بە تۆ ڕاگەیاند، ئیبراهیمو موساو عیساشمان ڕاسپارد، کە هەر لەسەر ئەو دینە بنو مەشیکەن بە چەند بەرەکێ. ئەوەی ئێوە بە خەڵکی ڕادەگەیەنن، بۆ ئەوانەی شەریك بۆ خودا پەیدا دەکەن، زۆر دژوارە، خودا هەرکێ خۆی بخوازێت لەناو خەڵکدا هەڵی دەبژێرێتو هەر کەسێکیش بەرەو ئەو بگەڕێتەوە بەرەو خۆی شارەزای دەکات. خوای گەورە دەفەرموێت بەم ئوممەتە: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ﴾ باسی یەکەم پێغەمبەری کردووە دوای ئادەم(سەلامی خوای لێ بێت) کە نوح پێغەمبەرە(سەلامی خوای لێ بێت) دوایین پێغەمبەر کە موحەممەدە(ﷺ) پاشان لە نێوان پێغەمبەرەکاندا باسی پێغەمبەرە لێبڕاوو نەبەزەکان(ألوالعزم) دەکات، ئەوانەیش ئیبراهیمو موساو عیسای کوڕی مەریەم من(سەلامی خوایان لێ بێت) ئەم ئایەتەس باسی هەر پێنج پێغەمبەرە لێبڕاوو نەبەزەکەی کرد وەك چۆن ئایەتێك لە سورەتی(الاحزاب) باسی کردووە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۖ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا﴾[1] واتە: (ئەی موحەممەد (ﷺ) بیریان بخەرەوە) کاتێك کە پەیمانمان وەرگرت لە پێغەمبەران هەروەها لە تۆو نوحو ئیبراهیمو موساو عیسای کوڕی مەریەم. ئەو ئایەتەی کە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) پێی هاتوون هەموویان پەرستنی خودایە بە تەنها بەبێ هاوەڵ وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ﴾[2] واتە: وە ئێمە نەماننادروە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێك مەگەر نیگامان بۆ ناردووە(بەوەی کە) بێگومان جگە لەمن هیچ پەرستراوێك نیە کەواتە تەنها من بپەرستن. لە فەرموودەیەکدا هاتووە واتە: (ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت) منداڵانی پیاوانو زنانینو ئاینمان یەکە)[3]. واتە: ئەوەی کەتیایدا هاوبەشن بەندایەتیو خواپەرستیە بە تەنها بۆ خوداو هاوەڵ دانەنان بۆی. با پرۆگرامو بەرنامەشیان جیا بێت. وەك خوای

[1] الاحزاب(٧).

[2] الانبیاء(٢٥).

[3] فتح الباري(٦/٥٥٠).

گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾[1] واتە: دامانناوە بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەتو ڕێگەیەکی ڕوون. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ واتە: خوای گەورە هەموو پێغەمبەرانی (سەلامی خوایان لێ بێت) ڕاسپاردووە کە پێکەوە بن و یەك بن و قەدەغەی کردووە لێیان کە جیاواز و ناکۆك بن، ﴿كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾ بۆ ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن زۆر گرانو دژوارە تۆ بانگیان دەکەی (ئەی موحەممەد) بۆ یەك خوا پەرستی پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ واتە: هەر ئەوە ڕێگای شارەزایی نیشانی کەسێك دەدات کە شایەنی بێتو گومڕایش دەنوسێت بۆ کەسێك کە گومڕایی هەڵدەبژێرێت بەسەر ڕاستەڕێدا شوێنی ڕێی ڕاست ناکەوێت.

**شێوازی ناکۆکی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ ئەشبوونە دەستەدەستە، مەگین وەختێك باسی ئەم دینەیان زانی، ئیرەیی لەناو خۆیاندا لەبەر یەکی هەڵوەشاندن. خۆ ئەگەر پەروەردگاری تۆ زووتر ماوەی بۆ دیاری نەکردنایە، دەمێك بوو کاریان تەواوکرابوو. ئەوانەی کتێبەکەشیان لە پاش ئەوان بۆ بەجێ ما، لێی کەوتنە بێباوەڕیو گومانەوە.

بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ﴾ واتە: کاتێك باسی ئەم ئاینەیان زانی بوونە کۆمەڵ کۆمەڵو لایانداو دەستیان دایە لاساریو لە یەك جیابوونەوە پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ ئەگەر خوای گەورە پێشتر کاتی بۆ دیاری نەکردنایەو بەندەکانی دوانەخستایە بۆ لێپرسینەوە لە ڕۆژی قیامەتدا دەمێك بوو سزا درابوون لە دنیادا، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ﴾ ئەو نەوەیەش لە دوای ئەوان کتێبەکەیان بۆمایەوە دوای چەرخی یەکەم باوەڕیان پێ نەکرد، ﴿لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾ واتە: باوەڕیان بەکارەکەیان نەبووگومانیان هەبووشوێنی بابو باپیرانیاندەکەوتن بەبێ هیچ بەڵگەیەك و سەریان لێ شێوابوو نەیاندەزانی ڕوو لەکوێ بکەن بە هۆی ئەو دوور لە خواییو بێ دینیانەوە.

---

[1] المائدة(٤٨).

﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾

خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ سا بۆ ئەمە بانگی مـەردم بکـەو هـەر وەك فـەرمانت پێدراوە، هەر سوور بە لەسەر ئەم کارەو شوێن ئارەزوویان مەکەوە. بڵێ من بە یەکسانی بە کاروباریان ڕا بکەم، ئێمەو ئێوە خودا پەروەردگارمانە، کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، لە نێوان ئێمەو ئێوەدا جێ بۆ بەهانە نەماوە، خودا هەموومان لـە یـەکتر کۆدەکاتـەوەو چارەنووسـیش هەر لای ئەوە. ئەم ئایەتە پیرۆزە پێکهاتووە لە(دە) وتەی سەربەخۆ هەر وتەیەك جیاوازە لەوەی پێش خۆی بڕیارێکی تایبەتیە بۆ خۆی. بۆیە وتوویانـە: هـیچ ئایـەتێکی تـر وەك نموونـەی ئـەم ئایەتـە نیـە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُ﴾ سا بۆئەمەتۆبانگی خەڵکی بکـە. واتـە: بۆئـەم ئایینـەی کە بەهەموو پێغەمبەرانمان(سەلامی خوایان لێ بێت) ڕامانسپاردووە لە پێش تـۆوە. خـاوەن شـەریعەتە گەورەکان ئەوانەی شوێنی پێغەمبەرە لێبڕاوو نەبەزەکان کەوتن‌و غەیری ئەوانیش بـانگی خـەڵکی بکـە بـۆی. خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ﴾ واتـە: ڕاوەسـتاوو سـوور بـن خـۆت‌و ئەوانـەی شـوێنت کـەوتوون لەسـەر خواناسـی بـەو شـێوەیەی کـە خـوا فـەرمانی پێـداوی، ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ واتە: شوێنی ئارەزووی بتپەرستان مەکەوە لەوەی کە جیاوازن لـەناو خۆیانـدا کـە بـە درۆوە بتیان داناوەو دەیپەرستن. خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖ﴾ واتـە: بڵـێ: مـن بـاوەڕم هەیـە بـە هـەموو ئـەو کتێبانـەی کـە لـە ئاسمانـەوە نێراوەتـە خـوارەوە بـۆ پێغەمبەرەکان(سەلامی خوایان لێ بێت) جیاوازی ناکەین لە نێـوان هـیچ کەسێکیاندا، ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ﴾ واتە: فەرمانیشم پێکراوە لـە بڕیاردانیـشدا دادپـەروەر بم لـە نێوانتانـدا، ﴿ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ﴾ خودا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەیشە. واتە: هەر ئەو دەپەرستریت‌و هیچ خودایەك نیە ئـەو نـەبێت ئێمـە دان بەوەدا دەنێین بە ئارەزووی خۆمان بەڵام ئێوە بە ئارەزووی خۆتان دانـی پێـدا نـەنێن، ئـەوەی لـە بوونەوەردایە هـەموو سوژدە دەبـات بـۆ خـودا بـە خۆشحاڵی‌و ئـارەزووی خـۆی، ﴿لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ

أَعۡمَٰلُكُمۡ﴾ کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان‌و کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان. ئێمە هیچ پەیوەندیەکمان بە ئێوەوە نیە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ﴾[1] واتە: ئەگەر بڕوایان پێ نەهێنای ئەوە پێیان بڵێ(پاداشتی) کردەوەی خۆم بۆ خۆم‌و(پاداشتی) کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان ئێوە بەرین(بەرپرسیار نین) لەوەی من دەیکەم منیش بەریم(بەرپرسیار نیم) لەوەی ئێوە دەیکەن. وە دەفەرموێت:: ﴿لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ﴾ موجاهید دەڵێت: واتە: هیچ دژایەتیەك لە نێوانماندا نیە.[2] سودی دەڵێت: ئەمە پێش هاتنەخوارەوەی ئایەتی شمشێر بووە ئەمەیش ڕێی تێ دەچێت چونکە ئەم ئایەتە لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە. ئایەتی شمشێریش دوای کۆچکردن هاتووەتە خوارەوە. ﴿ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ﴾ واتە: ڕۆژی قیامەت. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفۡتَحُ بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَهُوَ ٱلۡفَتَّاحُ ٱلۡعَلِيمُ﴾[3] واتە: بڵێ پەروەردگارمان ئێمەو ئێوە کۆدەکاتەوە لە پاشان بڕیار دەدات لە نێوانماندا بە هەق‌و ڕاستی‌و هەر ئەوە دادوەری زانا. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ واتە: گەڕانەوەو پاشەڕۆژو چارەنووس هەر بۆ لای ئەوە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا.

﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾﴾

## ئاگادارکردنەوەیەك بۆ ئەو کەسانەی کە مشتومڕ دەکەن لە بارەی ئاینەوە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی لە بارەی خوداوە بڕو بەهانەیان هەیە، لە پاش ئەوە کە بە دەنگیشیەوە هاتوون، هەموو بڕوبەهانەیان لە لایەن پەروەردگاریان بێ بایەخەو بەر تووڕەیی کەوتوون‌و بە توندی جەزرەبە دەدرێن. خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانە کە دەبنە

---

[1] یونس(٤١).

[2] الطبري(٢١/٥١٨).

[3] سبأ(٢٦).

لەمپەر لە ڕێی خوادا بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە خودا هێناوە دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ﴾ واتە: کشتومڕ دەکەن لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە هاتوون بە دەنگی بانگی خوداو پێغەمبەرەکەیەوە(ﷺ) دەبنە ڕێگری ئەو ڕێگە ڕاستەی کە موسڵمانان گرتوویانەتەبەر، ﴿حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ بڕوبیانوویان بەتاڵەو هیچ بایەخێکی نیە لە لای پەروەردگاریان، ﴿وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ﴾ خودا تووڕەیە لێیان، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ جەزرەبەی توند دەدرێن، لە ڕۆژی قیامەتدا. ئیبنو عەباس‌و موجاهید دەڵێن: ئەوانەی مشتومڕیان کردووە لەگەڵ ئەو موسڵمانانەی کە وەڵامی بانگی خوداو پێغەمبەریان(ﷺ) داوەتەوە، هەوڵ دەدەن لە ڕاستەڕێ لایاندەن بە تەمای ئەوەن کە بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی نەفامی[1]. قەتادە دەڵێت: ئەوانەی گاورو جوولەکەکان بوون دەیانوت بە موسڵمانەکان: ئایینی ئێمە لە ئاینی ئێوە چاکترەو پێغەمبەری ئێمە لە پێش پێغەمبەری ئێوە هاتووەو خۆشمان لە ئێوە چاکترین‌و لەپێشترین لای خودا لە ئێوە.[2] ئەوانە هەموو درۆ بوو دەیانوت. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ الَّذِي أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ ئەو خودایەی ئەم کتێبەی بۆ ڕاستی ناردووەتە خوارەوە، تەرازووش لەگەڵ نارد تۆ چووزانی؟ لەوانەیە هاتنی قیامەت نزیک بێت. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اللَّهُ الَّذِي أَنْزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ﴾ واتە: ئەو خودایەی ئەم کتێبەی ناردوویەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی بەڕاستی﴿وَالْمِيزَانَ﴾ تەرازووشی لەگەڵدا ناردووە بۆ دادپەروەری‌و هەق‌و ناهەق جیاکردنەوە موجاهیدو قەتادە دەڵێن: واتە: هەق‌و دادپەروەری.[3] ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾[4] واتە: سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونەوە وە کتێبی(ئاسمانی)و تەرازووی دادمان لەگەڵدا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەری ڕەفتار بکەن(لەناو خۆیاندا). وە دەفەرمووێت: ﴿وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا

---

[1] الطبري(٢١/٥١٨/٥١٩).

[2] الطبري(٢١/٥١٩).

[3] الطبري(٢١/٥٢٠).

[4] الحديد(٢٥).

ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴾[1] واتـە: وە ئاسمـانی بلّنـدو بـەرز کردووەتـەوەو تـەرازوو(ی عەدالەتی) داناوە،(وە فەرمانی داوە) کە هەرگیز زیادەڕەوی لە تـەرازوودا نەکـەن، وە کێشانەتان ڕێك بکێشن لە تەرازوودا کەمو کوڕی مەکەن. پاشان دەفـەرموێت: ﴿وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ﴾ ئـەم ئایەتە هەڕەشەی تێدایەو هـەڵنانو زۆر گرنگی نـەدانی بـە دنیا تێدایـە. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴾ ئەوانەی باوەڕیان نیە ئەو ڕۆژە دێت، پەلە لە هـاتنی دەکـەن. ئەو کەسانەش کە باوەڕیان هێناوە، لێی دەترسن، دەشزانن کە ئەوە ڕاستە، بـاش بـزانن ئەوانـەی کـە گومانیان هەیە لە ڕۆژی دوایی ئەوە بە ڕاستـی لـە گومڕاییـەکی زۆر دووردان. ﴿ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَا﴾ دەڵێن کوا ئەو بەڵێنـە ئەگـەر ئێوە ڕاست دەکـەن. ئـەو قـسەیەش کـە دەیکـەن لەبـەر ئەوەیە کە بە ڕاستی نـازانن‌و باوەڕیـان نیـە کـە ڕوودەدات چونکه بـێ دیـن‌و لاژگن، ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا﴾ بـاوەڕدارانیش دەترسـن‌و دڵەلەرزەیانـە لـە هـاتنی ئـەو ڕۆژە، ﴿وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ﴾ بەڕاستی دەزانن‌و گومانیـان نیـە کـە دێت بۆیە خۆیـان ئامـادە کـردووەو هـەوڵ‌و کۆشـش دەکـەن لـە پێناویدا. ڕیوایەت کراوە لـە چـەند ڕێگاوە کە گەیشتووەتە پلـەی تـەواتور لـە کتێبـە سـەحیحەکان‌و موسانیدەکاندا و موسنەدەکانداو لە هەندێ لە وتەکانیاندا کە پیاوێك پرسیاری لـە پێغەمبـەری خـودا کرد(ﷺ) بە دەنگێکی بەرز کاتێك کە پێغەمبەر(ﷺ) لە سەفەرێك لە سەفەرەکانیدا بـوو. بـانگی کـردو وتی: ئـەی موحەممـەد(ﷺ) وەرە! پێغەمبـەریش وەك خـۆی وەلامیدایـەوە و فـەرموویی: هانەمـەتام. پیاوەکـە پێـی وت: کـەی قیامـەت دێـت؟ پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی:(هـاوار بـۆ تـۆ قیامـەت بەدڵنیاییەوە دێت، چیت بۆ ئامادە کردووە؟ پیاوەکە وتی: خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشت ویستووە)[2]. وە لـە فەرموودەیـەکی تـردا فەرموویەتی:(هەر مرۆڤێك لەگەڵ ئەو کەسەدایە کـە خۆشـی ویـستووە).[3] ئەمـە موتـەواتیرە و گومـانی تێدا نیە.مەبەست ئەوەیە وەلامی ئەوەی نەداوە کەی قیامەت دێـت. بـەڵکو فـەرمانی پێکـرد کـە خـۆی ئامادە بکات بـۆ ئـەو ڕۆژە. خـودا دەفـەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ﴾ واتـە: بـا بـزانن

---

[1] الرحمن(٧ـ٩).

[2] فتح الباري(١٠/٥٧٣)، مسلم(٤/٢٠٣٣).

[3] ميلم(٤/٢٠٣٤).

ئەوانەی کە دوو دڵن‌و مشتومڕ دەکەن لەسەر ڕۆژی قیامەت‌و بڕوایان بە هاتنی نیە، ﴿لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ﴾ واتە: زۆر تێنەگەیشتوون‌و فامیان نیە. چونکە ئەوەی ئاسمانەکان‌و زەمینی بەدی هێناوە چاکتر دەتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوە زۆر ئاسانترە لە لای، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾[1] واتە: ئەو(خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان(دوای مردن) دووبارە دروستی دەکاتەوە.

﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾﴾

**بژێوی دان و بەخشندەیی خودا لە دنیاو دواڕۆژدا**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾ خودا دەربارەی عەبدانی میهرەبانە بە هەر کەس خۆی مەیلی لێ بێت بژێوی دەدات خاوەن هێزو دەسەلاتیش هەرئەوە. خوای گەورە باسی میهرەبانی خۆی دەکات بەرانبەر بە دروستکراوەکانی کە بژێوی هەمووی دەدات‌و کەسی لەبیر ناچێت. لە بژێوی پێداندا هەموو یەکسانە، چاك‌و خراپ و خواناس‌و خوانەناس وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾[2] واتە: هیچ گیانلەبەرێك نیە لە زەویدا مەگەر لەسەر خودایە ڕزق‌و ڕۆزیەکەی وە(خوا) دەزانێ شوێنی مانەوەی‌و شوێنی لێ دەرچوونی هەمووی نووسراوە لە کتێبی ڕوونکەرەوە(لوح المحفوظ)دایە. نموونەی ئەم ئایەتە زۆرە لە قورئاندا، ﴿يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ﴾ واتە: بۆ هەر کەسێك خۆی ئارەزوو بکات بژێوی بۆ فراوان دەکات، ﴿وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ﴾ هیچ شتێکی لا گران نیەو هەر ئەو خاوەنی هێزو دەسەلاتە. پاشان فەرموویەتی: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ

---

[1] الروم(٢٧).

[2] هود(٦).

ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ هەر کەسێکی داهاتی دواڕۆژی بوێت، داهاتی پتر دەدەینێ، کێش داهاتی لەم دنیادا بوێ، لەم دنیا بەشی دەدەین و لەودنیا بەشێکی نیە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ﴾ کەسێك بەش و کاری دواڕۆژی بوێت ﴿نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦ﴾ واتە: بەهێزی دەکەین و یارمەتی دەدەین لەسەر ئەوەی کە پێوەی خەریکە و بەرەکەت دەخەینە کارەکەیەوە و پاداشتی دەدەینەوە بە دە قات لەوەی خۆی و هەتا حەوت سەد قات بۆ کەسێك کە خودا مەیلی لێ بێت، ﴿وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ﴾ واتە: وە هەر کەسێکیش هەموو هەوڵ و توانایەکی هەر بۆ دنیا و دەستکەوتی دنیا بوێ لە دواڕۆژ هیچی نیە و بێ بەشە و خودا حەرامی دەکات لێی. ئەگەر مەیلی لێ بێت لە دنیا بەشی دەدات و ئەگەر مەیلیشی لێ نەبێت لە دنیاش و دواڕۆژیشدا بێ بەشی دەکات. بۆیە ئەو کەسە بەو نیەتەی خۆی تووشی ئەو هەموو خەسارو ڕەنجەڕۆیە دەکات لە دنیا و لە دواڕۆژیشدا. بەڵگەیش لێرەدا ئەم ئایەتە و ئەو ئایەتەی سورەتی سوبحانەی(الاسراء) یەکە پەیوەندی بەم ئایەتەوەهەیە کە باسمان کرد کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا﴾[1] واتە: هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیای بوێت لەم(دنیا)دا زوو پێی دەدەین ئەوەی بمانەوێت بۆ هەر کەسێك لە پاشان دۆزەخمان بۆ سازداوە دەچێتە ناوی بە لۆمەکراوی و دەرکراوی لە میهرەبانی خودا، هەر کەسێکیش مەبەستی ڕۆژی دوایی بوویێت و هەوڵی بۆ بدات بەو جۆرەی شایستەی ئەوەو باوەڕداریش بێت ئا ئەوانە کردەوەو تێکۆشانیان وەرگیراوە، دەبەخشین بە هەموان ئەوانەی(کە هەر دنیایان دەوێت) و ئەوانەی(ڕۆژی دواییان دەوێت) لە بەخششی پەروەردگارت(لەم دنیایەدا) بێگومان ڕۆزی و بەخشراوی پەروەردگارت هەرگیز قەدەغەکراو نەبووە،(ئەی موحەممەد(ﷺ)) سەرنج بدە چۆن(لە دنیادا) باوی هەندێکیانمان داوە بەسەر هەندێکیاندا و بێگومان پلەکان لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە هەروەها باودانەکانیش گەورەترە. لە ثوبەی کوڕی کەعبەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] الاسراء(١٨_٢١).

فەرمووی:(مژدە بدە بەم ئوممەتە بە پایەبەرزیی و بڵندی و سەرکەوتن و دامەزران لەسەر زەمیندا. هەر کەسێك لەوانە کارێکی دوارۆژی کردبێت لەبەر دنیا ئەوە ئەو کەسە لە دوارۆژدا بەشی نیە)[1].

**دانانی بەرنامەی مرۆڤ لە جێی بەرنامەو ئاینی خودا شەریك دانانە بۆ خودا**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئاخۆ ئەوان شتانی وا بە شەریکی خودا دەزانن، کە دینێکی وەهایان بۆ داهێنابن و خودا ئیجازەی نەدابن؟ ئەگەر بڕیاری یەکجاری دەرنەچووبا، کارەکەیان دەبڕایەوە. ناهەقەکان جەزرەبەی بە ژانیان دەبێت. ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾ واتە: ئەوانە شوێنی ئەو بەرنامەو ئاینە ڕاستە ناکەون کە خودا بۆ تۆدا ناردوویەتی. بەڵکو شوێنی ئەو ڕێگایە دەکەون کە شەیتانەکانیان لە مرۆڤو جنۆکە بۆیان داناون لەو شتانەی کە حەرامیان کردووە بۆیان وەك(بەحیرەو سائیبەو حامو وەصیلە). وە حەڵاڵکردنی گۆشتی مردارەوەبوو خوێن و قومارو لە نموونەی ئەمانە کەشتی پڕوپوچ و بێ سوودە کە لە کاتی نەفامیدا خۆیان بە هۆی نەزانی و کەم ئاوەزیەوە دایانهێنابوو لە حەڵاڵ کردن و حەرام کردن و عیبادەتی نابەجێ و پڕوپوچ و قسەی خراپ و لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(عەمری کوڕی لوحەیی کوڕی (قەمەعەم) بینی ڕیخۆڵەی خۆی لەناو ئاگردا ڕادەکێشا).[2] چونکە یەکەم کەس بوو کە سائیبەی داهێنا. ئەم پیاوە یەکێك بوو لە پاشاکانی خوزاعە یەکەم کەسیش بووە ئەم شتانەی داهێناوە لەناو قورەیشیەکانداو وای لێ کردن کە دەست بکەن بە بتپەرستی. لەعنەتی خوای لێ بێت و خوا ڕووی ڕەش بکات. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ﴾ واتە: ئەگەر بڕیار نەدرایە کەسزایان دوابخرێت بۆ ڕۆژی قیامەت بە زوویی سزا دەدران، ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ واتە: ناهەقیکاران جەزرەبەی بە ژانیان دەبێت لە جەهەنەمداو چارەنووسێکی زۆر خراپ.

**ترسانی بتپەرستان لە گۆڕەپانی مەحشەرداو خۆشی و خۆشگوزەرانی بڕواداران لە بەهەشتدا**

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا۟ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ ۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ ۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ

---

[1] احمد(٥/١٣٤)، ئەم فەرموودەیە حاکم بە سەحیحی داناوەو زەهەبیش هاوڕایەتی.

[2] فتح الباري(٦/٦٣٣).

ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ ئەو ناهەقانە دەبینن. لە ئاکامی کردەوەی خۆیان دەترسن، دیارە هەر تووشیشیان دەبێت. ئەو کەسانەش بوونە خاوەن باوەڕو ئاکارچاك بوون لە سەیرانگای باخەکانداو چی خۆیان ئارەزوو بکەن، لە لایەن پەروەردگاریانەوە پێیان دەگات، ئەمەش بەخششێکی مەزنە. ﴿ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا۟ ﴾ واتە: ئەو ناهەقیکارانە دەبینی لە ئەنجامی کردارەکانی خۆیان دەترسن لە کۆڕەپانی قیامەتدا، ﴿وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ ﴾ واتە: ئەوەی لێی دەترسان تووشیان بووەو دەربازبوونیان نیە. ئەمە ژیانیانە لەو ڕۆژەدا بەو ترسو بەدگوزەرانیەو ژیان بەسەر دەبەن. ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ ۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ ئەم ژیانە لە کوێو ئەو ژیانە لە کوێ؟ واتە: ئەوانە کە لە ساحەی مەحشەردا بە سەرشۆڕیو داماوی ترسێکی زیادو بێ ئەندازەدا کات بەسەر بەدەنو تووشی ئاکامی کردەوەی خراپی خۆیان دەبن. ئەوانەیش کە خاوەن باوەڕو ئاکارچاك بوون وان لە سەیرانگاو باخەکانداو هەرچی ئارەزوو بکەن لە خواردنو خواردنەوەو شوێنی خۆشیو جلوبەرگی جوانو خێزانی جوانو ڕازاوەو ڕابواردن کە نە چاو بینیویەتیو نە گوێ بیستوویەتیو نە بە دڵی کەسیشدا هاتووە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ واتە: ئا ئەوەیە بەخششی گەورەو بەهرەی تەواوو نەبڕاوە بۆ بڕواداران.

﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾﴾

## مژدەدان بە بەهرەکانی بەهەشت بە خاوەنباوەڕان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بەمە خودا مژدە بەو عەبدانەی دەدات، کە بوونە خاوەن باوەڕو ئاکارچاك بوون. بێژە من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێت. مەگین خۆشویستنی خزمە نزیکەکان. هەر کەسیش چاکەیەك بکات، پتر چاکەی لەگەڵ دەکەین، خودا لە گوناه دەبوورێت بە چاکەی عەبدان دەزانێت. کاتێك خوای گەورە باسی سەیرانگاو باخاتی کرد کە ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی خاوەن باوەڕو ئاکارچاکن پاشان دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: ئەمە ئەو مژدە بوو کە خوای گەورە دای بە بەندە خاوەن

باوەڕەكانی كە دێتەدی‌و هیچ گومانی تێدا نیە. وە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بەو بتپەرستانە لە خوانەناسەكانی قورەیش داوای هیچ شتێكیان لێ ناكەم لە ماڵ‌و سامان بەڵكو داواتان لێ دەكەم كە وازم لێ بێنن‌و شەڕی خۆتانم لێ لادەن هەتا ئەم پەیامەی خودای خۆم بگەیەنم. خۆ ئەگەر یارمەتیم نادەن ئازاریشم مەدەن با خزمایەتیەكەمان بمێنێت. بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێت: پرسیار كرا لەم ئایەتە: ﴿إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ سەعیدی كوڕی جوبەیرفەرمووی: واتە: خزمەنزیكەكانی بنەماڵەی پێغەمبەر(ﷺ)، ئیبنو عەباس دەڵێت: پەلەت كرد. هیچ بنەماڵەیەك نیە لەناو قورەیشدا كە خزمایەتی نەبێت لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ)، دەڵێت: مەبەست ئەوەیە كە پەیوەندی‌و خزمایەتی لە نێوان من‌و ئێوەدا با بمێنێت‌و هیچی ترم ناوێت. تەنها بوخاری بەم شێوەیە هێناویەتی.[1] ئیمامی ئەحمەدیش لە ڕێگایەكی ترەوە ڕیوایەتی كردووە.[2] وە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا﴾ واتە: هەر كەسێك چاكەیەك بكات چاكەكەی بۆ زیاد دەكەین، واتە: پاداشتی چاكتری دەدەینەوە. وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَـٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[3] واتە: بە ڕاستی خوا قورسایی گەردیلەیەك ستەم ناكات وە ئەگەر چاكەیەك هەبێت(خودا) چەندانەی دەكاتەوەو دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێكی گەورە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ واتە: لە زۆر تاوان‌و گوناه خۆش دەبێت‌و زۆر لە چاكەكانیش زیاد دەكات‌و دەبوورێت لە گوناهو ئاشكرای ناكات‌و زیادیشی دەكات‌و ستایشی بەندەكانی دەكات لەسەر چاكەكردن.

**دەڵێن پێغەمبەر( ﷺ ) خۆی قورئانی هەڵبەستووە بە دەمی خوداوەو وەڵام دانەوەی خودا بۆئەمە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَـٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ یان دەڵێن درۆ بۆ خودا هەڵدەبەستێت. ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت، مۆر بەسەر دڵتەوە دەنێت. خودا(هەر بە فەرمانی خۆی) پووچ لە ئارادا ناهێڵێت‌و ڕاستی لە جێداجێگیر دەكات، ئەو ئاگادارە لە هەرچی بەناو دڵاندا دەبوورێت. ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾

---

[1] فتح الباري(٨/٤٢٦).

[2] احمد(١/٢٢٩)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] النساء(٤٠).

واتە: ئەگەر بەناوی خوداوە درۆت هەڵبەستایە وەك ئەو نەفامانە دەڵێن، ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە مۆری دەنا بەسەر دڵتداو گرفتاری دەکردی‌و قورئانیشت بۆ نەدەهات.

وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ﴾[1] واتە: ئەگەر(موحەممەد(ﷺ)) بە دەم ئێمەوە هەندێ قسەی هەڵببەستایە، بێگومان بە دەستی خۆمان تۆڵەمان لێ دەسەند، لە پاشان ڕەگی دڵیمان دەبڕی‌و کەس لە ئێوە نەیدەتوانی بەرگری لێ بکات. واتە: بە توندترین شێوە تۆڵەمان لێ دەسەند، هەرگیز کەس ناتوانێت لە دەستی خودا دەربچێت‌و یاخی ببێت، خودا دەفەرمووێت: ﴿وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ﴾ هەق جێگیر دەکات‌و ڕوون‌و ئاشکرای دەکات بە بەڵگەی دیارو بەهێز، ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتە: ئاگادارە بەوەی کە لەناو دڵدا دێت‌و دەچێت‌و شاراوەیە‌و دیار نیە لە خەڵکەوە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟
وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾﴾

### خوای گەورە پەشیمان بوونەوە وەردەگرێت‌و نزایش قەبوڵ دەکات

خوای گەورە منەت دەکات بەسەر بەندەکانیدا بەوەی کە پەشیمان بوونەوە وتوبەیان لێ قەبوڵ دەکات کاتێك بگەڕێنەوە بۆ لای‌و واز لە خراپە بێنن لە بەخشندەیی‌و لێبوردەیی خۆیەتی کە لە گوناهی بەندەکانی خۆش دەبێت‌و چاوپۆشیان لێ دەکات‌و دایدەپۆشێت بۆیان. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[2] واتە: وە هەر کەس کردەوەیەکی خراپ بکات یان ستەم لە خۆی بکات پاشان داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات دەبینێت خوا لێبوردەی میهرەبانە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(خوای گەورە پەشیمان بوونەوەی بەندەی خۆی پێ خۆشترە کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ لای لە یەکێك لە ئێوە کە وڵاغەکەی لە چۆڵەوانیەکدا لە دەستی دەبچێت‌و هەرچی خواردن‌و خواردنەوەی

---

[1] الحاقة(٤٤ـ٤٧).

[2] النساء(١١٠).

هەیە بەو وڵاغەمە بێت، بێ هیوا بێت لێی هاتبێتە بن دارێكو لە ژێر سێبەرەكەیدا پاڵ كەوتبێتو هیچ هیوایەكی نەمابێت بە وڵاغەكەی. وەختێك ئەو كەسە بەو حاڵەوەیە، كاتێك دەزانێت وڵاغەكە بە بارەكەوە لە لایەتی. دەستی گرتووە بە ڕەشۆكەیەوە، پاشان ئەوەندە دڵی خۆشە لە خۆشیاندا وتی: ئەی خوایە تۆ بەندەی منیو من خوای تۆم ئەوەندە دڵی خۆشە لە خۆشیاندا هەڵە دەكات)[1]. وەدیسان لە سەحیحی موسلیمدا لە ڕیوایەتی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوددا بەو شێوەیە هاتووە(ڕەزای خوای لێ بێت)[2]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ هەر ئەویشە پەشیمانی لە عەبدەكانی قەبوڵ دەكاتو لە كارە خراپەكانیان چاو دەپۆشێتو لە هەموو كردەوەكانیان ئاگادارە. زوهری لەم فەرموودەی خوای گەورەدا: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ﴾ دەڵێت: ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خوا زیاتر پەشیمانی بەندەی خۆی پێ خۆشترە لە یەكێك لە ئێوە كە ونبوەكەی دەدۆزێتەوە لەو شوێنەی كە دەترسێت تینوویەتی بیكوژێت تێیدا)[3]. هەممامی كوڕی حارس دەڵێت: پرسیار لە ئیبنو مەسعود كرا كە پیاوێك كاری خراپە لەگەڵ ژنێك بكاتو لە دوایدا مارەی بكات؟ دەڵێت: هیچی تێدا نیەو قەیناكات و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ﴾.[4] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: لەدوای تاوان خوای گەورە پەشیمانی قەبوڵ دەكاتو لە گوناهی ڕابردوویش خۆش دەبێت، ﴿وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ واتە: خودا ئاگادارە لە هەموو ئەو شتانەی كردووتانەو پێی هەڵساونو وتووتانە لەگەڵ ئەوەیشدا دەبوورێت لە هەر كەسێك بگەڕێتەوە بۆ لایو پەشیمان بێتەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَـٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕنو ئاكار چاكن نزایان لێ قەبوڵ دەكاتو لە چاكەی خۆی بەشی زۆریان دەداتێ. بۆ خوانەناسەكانیش جەزرەبەی زۆر دژوار هەیە. ﴿وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ سودی دەڵێت: واتە: نزایان لێ قەبوڵ دەكات، ئیبنو جەریریش هەر وای وتووە. واتە:

---

[1] مسلم(٤/٢١٠٤).

[2] مسلم(٤/٢١٠٣).

[3] عبدالرزاق(٣/١٩١)، فەرموودەیەكی لاوازە.

[4] الطبري(٢١/٥٣٣).

نزایان لێ قەبوڵ دەکات بۆ خۆیانو براکانیانو هاوەڵەکانیان.[1] ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦ﴾ واتە: دوعاکانیان بە زیادیشەوە لێ قەبوڵ دەکات. قەتادەو ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێن: لەم ئایەتەدا: ﴿وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ یانی خوا تکایان وەردەگرێت بۆ براکانیان ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦ﴾ تکاشیان بۆ برای براکانیان هەروەردەگرێت[2] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾ کاتێك خوای گەورە باسی خاوەن باوەڕانو چارەنووسیانی کرد لە پاداشتدانەوەی زۆر لە هەموو ڕوویەکەوە باسی بێدینانو چارەنووسی خراپیان دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا لە جەزرەبەی زۆر بە ژانو پڕ ئازار لە کاتی زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەیاندا.

**لە کارزانی خودالەوەدا کە بژێوی بێ سەروبەری نەداوە**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ ئەگەر خودا(بێ سەروبەر) بژێوی بۆ عەبدانی خۆی بناردایە لە زەمیندا یاخی دەبوون. بەڵام هەر بە مەیلی خۆیو بە ئەندازە بەڕێی دەکات، کە خودا لە عەبدەکانی خۆی ئاگادارو چاودێرە. ﴿وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: ئەگەر زیاد لە ئەندازەی پێویستیان خودا بژێوی بەندەکانی بدایە وایان لێ دەهات کە دەستدرێژی بکەنە سەریەكو دەست بکەنە تاوانکردنو خراپەکاری لەسەر زەمیندا. ﴿وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ واتە: بەڵام بە مەیلی خۆی بە شێوەیەك بژێوی داون کە خێروبێری باشی تێدا بێت بۆیان. خودا خۆی چاکتر دەزانێت چی باشە بۆیان. کێ دەوڵەمەندی بۆ چاکەو کێش هەژاری بۆ چاکە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾ هەر ئەویش پاش نائومێد بوون لە باران، باران دادەبارێنێتو دڵڤانی خۆشی بڵاودەکاتەوە. هەر ئەوە بۆ مەزنایەتی دەشێ بەردەوام پەسەندی بدرێت. ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ﴾ واتە: دوای ئەوەی کەبێ ئومێد بوون لە باران بارین. بارانیان بۆ دەبارێنێت لە کاتێکدا کە زۆر پێویستیان بەو بارانە هەیە. وەك ئەم ئایەتانەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡهِم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمُبۡلِسِينَ﴾[3] واتە: ئەگەرچی پێش ئەوەی باران بەسەریاندا ببارێت بێ هیواو نائومێد بوون. وە

---

[1] الطبري(٢١/٥٣٤).

[2] الطبري(٢١/٥٣٤).

[3] الروم(٤٩).

دەفـەرموویت: ﴿وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥ﴾ واتـە: بـەزەیی خـۆی بڵاودەکاتـەوە بەسـەر خـەڵکی ئـەو وڵاتو ناوچەیەدا. قەتادە دەڵێت: بۆیان گێڕاینەوە کە پیاوێك وتی بە عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) ئـەی گـەورەی موسڵمانان! باران نابارێتو خـەڵکی نائومێد بوون، عومـەر وتـی: دەی بۆتـان ئـەباری! پاشـان ئـەم ئایەتـەی خوێنـد: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ﴾.[1] واتە: هەر خودایە کاروبـاری دروستکراوەکانی دەبـات بـەڕێوە بـۆ ئـەوەی سودی لێ ببینن لە دنیاو لە دوارۆژیانداو هەر ئەوە دەشێت پەسەندی بدرێت لـە هـەموو شتێکدا کە دایدەنێتو دەیکات.

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾﴾

**وەدیهێنانی ئاسمانەکانو زەمین لە نیشانەکانی خودان**

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ﴾ هەر لـە نیشانەکانی ئـەون: داهێنـانی ئـەم ئاسمانانـەو زەمینـەو ئـەو هـەموو جانەوەرانەی(کە لە نێوان ئەو دووانەدا) بڵاوی کردوونەتـەوە. هـەر کـاتێکیش بـۆ خـۆی مـەیلی لێ بێت توانای هەیە هەموویان کۆ بکاتەوە، ﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ﴾ واتە: لەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسـەر مـەزنایی‌و توانای گەورەو دەسەڵاتی بەهێزی خـوای گـەورە، ﴿خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا﴾ واتـە: ئـەو هـەموو گیانەوەرانـەی کـە لـە نێـوان ئاسمانـەکانو زەمینـدا بـڵاوی کردووەتـەوە، ﴿مِن دَآبَّةٖ﴾ ئەمـە فریشتەکانو مرۆڤو جنۆکەو هەموو گیانەوەرەکانی تریش دەگرێتەوە بە هەموو جۆرو شێوەو ڕەنـگو زمانو ڕەگەزو شێوازی ژیانیانەوە. کە بڵاوی کردوونەتەوە لە هەموو ناوچـەو بەشـەکانی ئاسمانـەکانو زەمیندا، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ﴾ لەگەڵ ئەمانەدا هەمووی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوەڵو ئـاخری کۆدەکاتەوە لە تەك هەموو دروستکراوەکانی تردا لە یەك شوێندا دەنگی بانگکەر دەبیستنو دەبینرێنو بڕیاریان بۆ دەدرێت. بە بڕیاری خودا خۆی، بڕیارێکی هەقو دادپەروەرانە.

[1] الطبري(٢١/٥٣٧).

**هۆکاری گرفتاریەکان بێ گوێیی و یاخی بوونە**

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾ هەر کاتێك تووشی بەلایەك بوون. بە هۆی کردەوەی خۆتان، لە زۆر گوناهەکانیشتان چاو دەپۆشێت. واتە: هەرچی بەلاو گرفتێکتان بێتەرێ ئەی خەلکینە بە هۆی ئەو کردەوە خراپەی خۆتانەوەیە کە لە پێشەوە کردووتانە، ﴿وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾ خوای گەورە لە زۆریشیان دەبوورێت‌و چاوپۆشی دەکات‌و تۆلەتان لێ ناسێنێت لەسەری. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٍ﴾[1] واتە: وە ئەگەر خودا قار بگرێت لە خەلکی(تۆلەیان لێ بسێنێت) لەبەر ئەو(خراپانەی) کە کردوویانە هیچ گیاندارێکی بەسەر زەویەوە نەدەهێشت. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرموێت: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، هیچ خاوەن باوەڕێك تووشی نارەحەتی‌و نەخۆشی‌و خەم‌و خەفەتێك نابێت مەگین خودا دەیکاتە کەفارەتی گوناهەکانی تەنانەت دڕکێك کە دەچێت بە پێیدا).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەلێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو:(هیچ شتێك نیە کە تووشی خاوەن باوەڕ ببێت لە جەستەیداو ئازاری بدا مەگین خودا دەیکاتە کەفارەتی تاوان‌و گوناهەکانی)[3]. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەلێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك گوناهی عەبد زۆر بوو چاکەی نەبوو ببێتە کەفارەتی خوای گەورە تووشی دلگرانی‌و خەم‌و خەفەتی دەکات، بۆ ئەوەی بیکاتە کەفارەتی).[4] پاشان خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ ناشتوانن لەم سەر زەمینەدا خۆ لە خودا بدزنەوە غەیری خوداش نە هیچ گەورەیەکتان هەیە. نە کەسیش بە هاناتانەوە دێت.

---

[1] الفاطر(٤٥).

[2] احمد(٢/٣٠٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] احمد(٤/٩٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] احمد(٦/١٥٧)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾﴾

## کەشتی یەکێکە لە نیشانەکانی خودا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ﴾ هەر لە نیشانەکانی ئەون: ئەو کەشتیانەی(کە چیا ئاسا) لە ناو دەریا دێن‌و دەچن. واتە لەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر توانای بێپایان‌و دەسەڵاتی خودای مەزن ڕامهێنانی دەریاکانە کە گەمیەکان بە فەرمانی ئەو دێن‌و دەچن وەك چیا، موجاهیدو حەسەن‌و سودی‌و زەححاك دەڵێن: ئەم گەمیانە لەناو دەریا وەك چیا وان لە وشکانیدا.[1] وە دەفەرموێت: ﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ ئەگەرحەز بکات با ڕادەگرێت‌و لەسەردەریا بەقەتیس دەمێنێتەوە. کە لەمەدا بۆ ئەوانەی خۆڕاگرو سوپاسکارن بەڵگە زۆرن. ﴿إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ﴾ واتە: ئەگەرخودا مەیلی لێ بێت ئەو بایەی کە بەسەر دەریاکاندا دەڕوات دەیوەستێنێت و گەمیەکان ناجوڵێنێت‌و لەجێی خۆیدا دەمێنێتەوە نە دەڕۆن‌و نە دێن. لەسەر دەریا دەوەستن. ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾ ئەمە بۆ ئەوانەی کە خۆڕاگرن لەکاتی لێقەومان‌و ناڕەحەتیدا بەڵگەیەکی چاکە ﴿شَكُورٍ﴾ واتە زۆر سوپاسی خودا دەکەن بۆ ڕامهێنانی دەریاو جوڵانی هەوا بە پێی پێویست بۆ هاتوچۆیان. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەخشندەیی‌و بەهرەی خودا بۆ ئەو کەسانەی کە خۆڕاگرن لە کاتی ناڕەحەتیداو سوپاسکارن لە کاتی خۆشیدا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ یان لە سزای کردەوەیان تووشی نوقمبوونیان بکات. لە زۆرێك لە گوناهانیشیان دەبوورێت. ﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت کەشتیەکە لەناودەبات‌و نوقمی دەکات بە هۆی گوناهی خەڵکەکەیەوە کە لەناویدان. ﴿وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ﴾ واتە: لە زۆرێك لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت، خۆ ئەگەر هەقی هەموو تاوانەکانیان لێ بسێنێت ئەوانەی کە هەموو لەناو گەمێن لە دەریا لەناو دەچن. هەندێ لە زانایانی تەفسیر لە مانای ئەم ئایەتەدا وتوویانە: ﴿أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟﴾ واتە: ئەگەر خودا مەیلی لێ بێت ڕەشەبایەکی زۆر توندی بۆ دەناردن گەمێکەی دەدا بەملاولاداو لە ڕێگای

[1] الطبري (٢١/٥٤١).

خۆی دەیترازاندو نوقمی دەکردو نەدەگەیشتە شوێنی خۆی. واتە گەمیەکەو خۆشیان تیادەچوون. ئەم مانایە گونجاوە لەگەڵ ئایەتی پێشوودا کە خوای گەورە فەرمووی ئەگەر مەیلی لێ بێت بایەکە دەوەستێنێت و ناجوڵێت، لێرەشدا دەفەرموێت لەبەر توندی بایەکە دەکەوتن بەملاولاداو نوقم دەبوون و لەناو دەچوون. بەڵام لە سۆزو بەزەیی خودایە کە هەوا دەنێرێت بە پێی پێویست. وەك چۆن باران دەبارێنێت بە ئەندازەی پێویست. خۆ ئەگەر بە زۆری باران ببارێنێت خانووەکان نوقم دەکات و دەیڕوخێنێت و ئەگەر کەمیش ببارێت گیاوگژەو دارو درەختەکان سەوز دەکات. هەتا ئەوەتا ئاو دەنێرێت بۆ وڵاتی میسر بە شێوەی ڕووبار لەسەر زەمینێکی ترەوە چونکە ئەوان پێویستیان بە باران نیە. ئەگەر بارانی زۆر ببارێت بەسەریاندا دیواری خانووەکانیان بەرگە ناگرێت و خانووەکانیان دەڕووخێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ﴾ ئا ئەوانەش دەربارەی نیشانەکانمان کێشە دەکەن. کە هیچ دەرەتانێکیان نیە. واتە: هیچ شتێك نیە بیکەنە پەنا بۆ خۆیان کە بیانپارێزێت لە سزاو تۆڵەمان و بەزیوو داماوو زەبوون بەرامبەر توانای ئێمەدا.

﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٣٦ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ٣٧ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣٨ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ٣٩﴾

## سیفاتی ئەو کەسانەی شایانی پاداشتن لە لای خودا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ هەرچی بە ئێوە دراوە هۆی ژیانە لە دنیادا، ئەو شتەش کە لە لای خودایە، بۆ ئەو خاوەن باوەڕانەی هەر بە پەروەردگاری خۆیان پشت ئەستوورن، باشترەو بەپێزترشە. خوای گەورە کەباسی سوکی و بێنرخی ژیانی دنیادەکات و باسی جوانیەکانی و ئەو خۆشی و خۆشگوزەرانیەی کە ماوەیەکی زۆر کەمەو نامێنێت دەکات، دەفەرموێت: ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ واتە: هەرچیتان وەدەست هێناو کۆتان کردەوە لە خۆبایی مەبن پێی. ئەوە هۆی ژیان و گوزەرانتانەو ماڵێکی کەم نرخ و دواکۆتایەو مەگین لە دەستتان دەردەچێت، ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ﴾ واتە: پاداشتی خودا چاکترە لە دنیا. چونکە پاداشتی خودا هەتاهەتایەو دەمێنێتەوە. ئەوەی نامێنێت پێشی مەخەن بەسەر ئەوەدا کە هەر دەمێنێتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ واتە: بۆ ئەو خاوەنباوەڕانەی خۆڕاگر بوون لەسەر وازهێنان لە خۆشی و ئارەزووەکانی دنیا، ﴿وَعَلَىٰ

رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ﴾ واتە: پشت ئەستوور بوون بە خوای خۆیان کە یارمەتیان بدات لەسەر خۆڕاگری لە بەجێهێنانی واجبو فەرزەکانداو وازهێنان لە بەزاندنی سنوورەکانیدا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ﴾ ئەوانەش لە تاوانی گەورە دوورن لە کردەوەی شورەیی دووری دەگرن(لە گەرمەی توڕەبوونیاندا عەفو دەکەن). پاشان دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾ لە پێشەوە لە سورەتی(الاعراف)دا باسی تاوانی گەورەو کردەوەی شورەیمان کرد ﴿ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾ وە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ﴾ سروشتو سیفەتیان وایە ئەو خاوەن باوەڕانە دڵ فراوانو لێبوردەن بەرانبەر بە خەڵکی نەك تۆڵەسەندن لێیان لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەرگیز لەبەر خۆی تۆڵەی نەسەندووە مەگەر کاتێك کە سنووری خودای تێدا شکێنرابێتو بەزێنرابێت.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾ ئەو کەسانەش کە بە دەنگی پەروەردگاریانەوە چوونو نوێژ دەکەنو کارەکانیان بە ڕاوێژەو لەو بژێوەی پێمان بەخشیون دەبەخشن. ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ﴾ واتە: شوێنی پێغەمبەرەکەی دەکەونو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی دەکەنو دووردەکەونەوە لەو شتانەی کە قەدەغەی کردووە لێیان. ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ دەکەن کە گەورەترین عیبادەتە بۆ خوای گەورە. ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ﴾ واتە: کارەکانیان بە ڕاوێژ دەکەن. هیچ کارێك ناکەن هەتا ڕاوێژ نەکەن لە نێوان خۆیاندا لەسەری بۆ ئەوەی سوود وەرگرن لە ڕاوبۆچوونی یەکتری لە کاروباری جەنگەکانداو لەو شتانەی تر کە پێویستی بە ڕاوێژکردن هەیە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾[2] واتە: وە ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا. بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕاوێژی دەکرد بە هاوەڵەکانی لە کاروباری جەنگەکانو ئەو شتانەی کە پێویستی بە ڕاوێژکردن بووبێت بۆ ئەوەی دڵەکانیان زیاتر پابەند بکات بە ئیسلامەوەو ئایینیان لە لا زیاتر شیرین بکات. هەر بەو شێوەیە عومەری کوڕی خەتاب کاتێك مردنی نزیك بووەوە پاش ئەوەی کە بریندار کرا. بڕیاری دا کە ڕاوێژ بکرێت لە نێوان شەش کەسدا کە بریتی بوون لە عوسمانی کوڕی عەفانو عەلیو تەلحەو زوبەیرو سەعدو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف(ڕەزای خوایان لێ بێت) ڕای هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەموو هاتەسەرئەوە عوسمان هەڵبژێرنو پێشیان خست بەسەرئەوانی

[1] فتح الباري(١٠/٥٤١).

[2] ال عمران(١٥٩).

تردا(ڕەزای خوایان لێ بێت)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ واتە: لەو ڕۆزییەی پێمان داون دەبەخشنو دەیدەن بە خەڵکی خودا بە پێی دوورو نزیکی لێیانەوە. وە دەفەرموێت:

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾ ئەو کەسانەش ئەگەر زۆریکیان لێ بکرێت، تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە. واتە توانای تۆڵە سەندنیان هەیە لەو کەسانەی کە ناهەقیان پێ دەکاتو دەستدرێژی دەکاتە سەریان. بێ دەسەلات نینو سەرشۆڕ ناکەن بەڵکو توانای سەندنەوەی حەقی خۆیان هەیە لەو کەسانەی کە دەستدرێژیان دەکەنە سەرو ناهەقیان پێ دەکەن. وە لە کاتی دەسەڵاتیشدا خاوەنی لێبوردنن. وەك یوسف وتی بە براکانی: ﴿لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾[1] واتە: ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشتو تەشەرێکتان لەسەر نیە(لە لایەن منەوە) خوا لێتان خۆش بێت. لە کاتێکدا دەیتوانی سزایان بداتو هەقیان لێ بسێنێت لەسەر ئەو کردارە خراپەی لەگەڵیان کرد. یان وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە ئەوانەی عەفو کرد کە هەشتا کەس بوون کە ویستیان پەلاماری پێغەمبەر(ﷺ) بدەن لە چیای تەنعیمەوە لە ساڵی حودەیبییەدا هاتنە خوارەوە لە چیاکەوە. کاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی گرت بەسەریاندا عەفوی کردن کە دەشی توانی تۆڵەیان لێ بسێنێت وە هەر بەو شێوەیە عەفوکردنی غەورەس کوڕی حارس کە ویستی پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێت کاتێك شمشێری ڕاکێشا پێغەمبەر(ﷺ) لە خەودا بوو ویستی لێی بدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاواری کرد بەسەریداو شمشێرەکەی لە دەست کەوتو پێغەمبەری خودا(ﷺ) شمشێرەکەی گرت بە دەستیەوەو هاوەڵەکانی بانگ کردو ئاگاداری کردن لەوەی کە ڕوویدا لە نێوان خۆیو ئەو پیاوەداو پاشان عەفوی کرد. فەرموودەو ڕووداو زۆرە لەو بارەیەوە، والله سبحانه وتعالى أعلم.

﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾﴾

## چاوپۆشی کردن یان تۆڵەسەندن لە ناهەقی کار

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ سزا بۆ هەر خراپەیەك، خراپەیەکی وەك ئەوە، کێش لە تۆڵە چاو بپۆشێتو کۆشش بۆ ئاشتی بکات، پاداشتی لەسەر خودایە، بێگومان خودا ناهەقی کارانی خۆش ناوێت. ئەم ئایەتە وەك

---

[1] یوسف(٩٢).

ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾[1] واتە: جا هەر کەسێك دەستدرێژی کردە سەرتان ئێوەش دەستدرێژی بکەنە سەری بە وێنەی دەستدرێژکردنەکەی ئەو بۆ ئێوە. ئەم ئایەتەش هەر وایە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ﴾[2] واتە: وە ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە ئەوە بە ئەندازەی ئەو ستەمەی دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە. خوای گەورە دادی داناوە کە تۆڵەسەندنە لە تاوانباران بەڵام ئەوەباشو چاکتر لێبوردنە، بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾ واتە: ئەوەی لێبوردن بکات و چاکەبکات ئەوە پاداشتەکەی ئەکەوێتە لای خوا، ئانی ئەو لێبوردنە لای خودا ون نابێت وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە دەفەرمووێت:(خوای گەورە بەندەی خۆی بە هۆی لێبوردن لە خەڵکی زیاتر دەسەلاتدارتر دەکات).[3] وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ واتە: خودا دەستدرێژیکەری خۆش ناوێت ئەوەی کە دەست پێشخەری دەکات لە تاوان کردندا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَٰئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ﴾ ئەو کەسانەی لە پاش ناهەقی لێکردن. تۆڵەی خۆیان دەسێننەوە خەتابار نین. واتە: ئەو کەسانە هیچ تاوانێکیان نیە کە تۆڵە دەسێنن لەو کەسانەی کە ناهەقیان پێ کردوون. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ۚ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ خەتا هەر لەو کەسانەیە ناهەقی لە مەردم دەکەنو ئاکاریان لە وڵاتدا بە ملهوڕیە، ئەوانە ئازارێکی بە ژانیان دەبێت. ﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ﴾ واتە: خەتاو تاوان. ﴿عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ لەسەر ئەوانەیە کە دەست پێشخەری دەکەنو ناهەقی بە خەڵکی دەکەن لەسەر زەمیندا وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتووە دەفەرمووێت:(دوو کەس قسەیان بە یەکتری وتبێت، تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە یەکەمجار قسەی کردووە ئەگەر ستەم لێکراو دەستدرێژی نەکردبێت).[4] ﴿أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەوانە ئازاری توندو بە ژانیان دەبێت. لە موحەمەدی کوڕی واسعەوە دەڵێت: چوومە مەککە کاتێك چوومە سەر ئەو چاڵە کە پردێکی لەسەر کرابوو گیرامو بردمیان بۆ لای مەروانی کوڕی موهەللەب کە

---

[1] البقرة(١٩٤).

[2] النحل(١٢٦).

[3] مسلم(٤/٢٠٠١).

[4] مسلم(٤/٢٠٠٠).

کاریەدەستی شاری بەسرە بوو وتی: چ پێویستیەکت هەیە ئەی باوکی عبدالله؟ وتی: پێویستی من ئەوەیە ئەگەر بۆت کرا، ئەوەم دەوێ کە برای بەنی عەدی وتی. مەروان وتی: کامەیە برای بەنی عەدی؟ وتی: عەلای کوڕی زیاد جارێك داوای لە هاوەڵێکی کرد کارێکی بۆ بکات، نامەیەکی بۆ نووسی وتی: أما بعد. ئەگەر بۆت کرا کە لە ماڵەوە مایتەوە با بارت سووك بێتو سکت خاڵی بێتو دەستت پاك بێتو پیس نەبووبێت بە خوێنو ماڵی موسڵمانان. وەختێك تۆ ئەوەت کرد هیچ خەتاو تاوانێکت لەسەر نیە، ﴿إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ مەروان وتی: بە خوا ڕاست دەکاتو ئامۆژگاریەکی چاکی کردووە. پاشان وتی: پێویستیەکەت چیە ئەی ئەبو عەبدوڵلا. وتم: پێویستی من ئەوەیە ڕەوانەم بکەی بۆ ناو ماڵو منداڵم وتی: بەڵێ باشە[1]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. دوای ئەوەی خوای گەورە باسی خراپیو ناهەقی ئەو کەسانەی ناهەقیکارن کرد، تۆڵەی دانا بۆ خراپەکار، داوا دەکات لە مەردم کە لێبوردەو سنگ فراوان بن لەگەڵ خەڵکی دەفەرموێت: ﴿وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ بۆ کەسێك خۆڕاگر بێتو لە تۆڵە چاوپۆشی بکات. ئەمە یەکێك لە کارە پەسەندەکانە. واتە: خۆڕاگربێت لەسەر ناهەقیو ئازارو چاوپۆشی بکات لە مەردم، ﴿إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: لەو کارە چاكو هەقانەیە کە خوای گەورە فەرمانی پێدەکات. واتە: لەو کارانەیە بەرز نرخێنراوو سوپاسکراوە. چونکە هەموو کارێکی چاكو پەسەند پاداشتی باشو ڕێزی تایبەتی هەیە.

﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن وَلِيٍّ مِّن بَعْدِهِ وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَى مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ (٤٤) وَتَرَاهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَاشِعِينَ مِنَ الذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ وَقَالَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا إِنَّ الظَّالِمِينَ فِي عَذَابٍ مُّقِيمٍ (٤٥) وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَاءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن سَبِيلٍ (٤٦)﴾

## ژیانی ناهەقیکاران لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن وَلِيٍّ مِّن بَعْدِهِ وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَى مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ﴾ هەرکەسێك خوا لێی گۆڕیبێت، ئیترکەس بە شوێن ئەودا نابێت بە دۆست. تۆ دەبینی ئەوانەی ناهەقیکارن کاتێك جەزرەبە دەبینن. دەڵێن: ئاخۆ هیچ دەرەتانێکمان هەیە؟ خوای گەورە باسی خۆی دەکات کە مەیلی لە هەر شتێك ببێت دەبێت و کەس نابێتە ڕێگریو

[1] ابن أبي شيبة(١٤/٦٣).

هەر شتێکیش مەیلی لێ نەبێت نابێتو کەس ناتوانێت بیکات. وە هەر کەسێك ئەو ڕێگەی نیشان بدات کەس ناتوانێت لێی بگوڕێتو هەر کەسیش خودا ڕێی لێ گۆڕی کەس ناتوانێـت ڕێـی نیـشان بـدات. وەك فەرموویـەتی: ﴿وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرۡشِدًا﴾[1] واتـە: وە هـەر کەسـیش گـومڕا بکـات ئـەوە دەستت ناکەوێت بۆی هیچ پشتیوانو ڕێ نیشاندەرێك. پاشان خوای گەورە باسی ناهەقیکاران دەکات ئەوانەی بتپەرستنو هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن دەفەرموێت: ﴿لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ﴾ کاتێك سزا دەبیـنن لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئاواتـەخوازن جـارێکی تـر بگەڕێنـەوە بـۆ دنیـا. ﴿يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ﴾ ئاخۆ هیچ ڕێگایەکمان هەیە خۆمان دەرباز بکەین، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾[2] واتـە: وە ئەگـەر بیانبینیـت کاتێـك کـە لەسـەر قـەراخی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن: خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیاو بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانیو لە بڕواداران دەبووین،(نـەخێر بـە ڕاسـتیان نیـە) بـەڵکو ئـەوەی کـە لـەوەوپێش دەیانـشاردەوە بۆیـان دەرکەوتووەو ئەگەر بگەڕێنرێنەوە(بۆ دنیا) بێگومان دووبارە دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو کارانـەی کـە لێیـان قەدەغەکرابوو وە بە ڕاستی ئەوانە درۆزنن. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ﴾ کە دەیانبەنـە سـەر ئـاگر، دەیـانبینی زۆر بەسەرکزیو داماوی و لە بنەوە چاوەچاویانە. خاوەن باوەڕانیش دەڵێن: زیانبـاران ئـەو کەسـانەن کـە خۆیـانو کـەسو کاریـان ڕۆژی قیامـەت دۆڕانـدووە. بـاش بـزانن کەئەوناهەقیکەرانـە، هەتاسـەر هەرلەئازاردان. ﴿وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا﴾ دەیانبینی کەدەیانبەنە سەر ئـاگر. ﴿خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ﴾ لە ترسـاندا دەلـەرزن بـە هـۆی ئـەو کـارە خراپانـەی کـە لـە ڕابـردوودا کردوویانـەو لـە فـەرمانی خـودا دەرچووبوون، ﴿يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖ﴾ موجاهید دەڵێت: واتە: بەسەرشۆڕی.[3] واتە: لە ژێرەوە بـە دزیەوە دەڕوانن بۆ ئەو ئاگرە. ئەوەی کە لێی دەترسان تووشی هاتوونو هەرگیز ڕزگاریـان نابێـت. زۆر گـەورەو گرانـە لەسـەر دڵیـان خـوای گـەورە بمانپارێزێـت لـەو ئـاگرە. ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ خـاوەن

[1] الكهف(١٧).

[2] الانعام(٢٧ـ٢٨).

[3] الطبري(٥٥٣).

باوەڕان لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێن: ﴿إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ ئەوانەی کە زۆر زیانبارن، ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ ئەو کەسانەن کە خۆیان‌و ماڵ‌و منداڵیان تووشی زیان کرد لە ڕۆژی قیامەتدا خۆشیان‌و ئەوانیشیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ ناو ئاگر هەرچی خۆشی هەبوو لە دەستیان داو جیاش دەکرێنەوە لەگەڵ دۆست‌و هاوڕێ‌و براو خزم‌و کەس‌و کاریشدا، پاش ئەوەی ئەوانیشیان تووشی زیان کرد. ﴿أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ﴾ واتە: ئەو ستەمکارانە باش بزانن کە بە بەردەوامی وان لە سزاو ئازارو هەرگیز ڕزگار نابن‌و ڕێگاشیان نیە بۆ هیچ لایەك دەرباز بن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ﴾ غەیری خودا هیچ کەسێك بە هانایان نایەت، هەر کەس خودا گومڕای بکات هیچ ڕێیەکی بۆ نامێنێت. واتە: هیچ کەس نیە غەیری خودا ڕزگاریان بکات لە سزاو جەزرەبە، ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ﴾ هەر کەسێك خودا سەری لێ تێك بدات ڕزگاربوونی نیە.

﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾﴾

## هەڵنان بۆ خواناسی لە پێش ئەوەی کە قیامەت بێت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ﴾ بەر لەوە ڕۆژێك بێت کە لە لای خوداوە هیچ گەڕانەوەی بۆ نیە، بە فەرمانی پەروەردەی خۆتان بکەن، ئەو ڕۆژە هیچ پەناتان دەست ناکەوێت‌و هیچ حاشاتان پێناکرێت. وەختێك خودای گەورە باسی ئەو گرانی‌و هەموو نارەحەتیە گەورەی ڕۆژی قیامەتی کردو ئاگاداری مەردمی کرد لێی‌و فەرمانی دا بۆ خۆئامادەکردن بۆی پاشان فەرموویەتی: ﴿ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ واتە: بەر لەوەی ڕۆژێك بێت کاتێك خودا فەرمانی دا بێت بە چاوتروکانێك دێت. کەس نیە بەری بگرێت‌و نەهێڵێت بێت. دەفەرموێت: ﴿مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ﴾ واتە: هیچ کۆشك و قەڵاو شوێنێك نیە پەنای پێ بەرن‌و خۆتانی تیا بزر بکەن‌و لەبەرچاوی خودا خۆتان بشارنەوە تێیدا. بەڵکو خوای گەورە بە تواناو دەسەڵاتی دەوری داون‌و چاوی لێتانەو ئاگای لە هەموو شتێکتانەو هیچ پەنایەك نیە لای ئەو نەبێت. ﴿يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ ﴿١٠﴾ كَلَّا

لَا وَزَرَ ﴿١١﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ ٱلْمُسْتَقَرُّ﴾[1] واتـە: ئـەو کاتـە مـرۆڤ دەڵێـت: دەربازگـە لـە کوێوەیـە، نـەخێر هـیچ پەناگەیەك نیە، لەو ڕۆژەدا ئارامگاهەرلای پەروەردگاری تۆیە.خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًاۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ﴾ سائەگەرهەرخۆیان بوارد. ئێمە تۆمان بۆئەوە نەنارد لەسەر ئەوانە پاسدار بی. تەنها ئەوەندەت لەسەرە مەبەستەکە ڕابگەیەنی. ئێمە هەر کاتێك کارێك دەکەین مرۆڤ تامی بەزەیی ئێمە بچێژێت. خۆشیان لێ دێتو ئەگەر بە هۆی کردەوە خراپەکانیان دەکەونە چۆرتمێکەوە. هەر دەزانن پێنەزان بن. واتە: ئەگەر بتپەرستان دژایەتیان کردو خۆیان بوارد ﴿فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ واتە: ئێمە تۆمان نەکردووە بە چاودێر بەسەریانەوە وەك خوای گەورە دەفـەرموێت لـە ئایـەتێکی تـردا: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾[2] واتـە: لەسەر تۆ نیە(ئەی موحەممەد(ﷺ)) ڕێنموونیو موسڵمان کردنی خەڵکی بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت هیدایەتی دەدات. وە دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾[3] واتە: بێگومان تۆ هەر گەیاندنت لەسەرەو لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. لێرەدا دەفەرموێت: ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ﴾ واتـە: ئێمـە تۆمـان ڕاسـپاردووە کـە تەنهاپـەیامی خودایـان پـێ بگەیـەنی.پاشـان خـوای گـەورە دەفــەرموێت:﴿وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا﴾ واتــە: کاتێــك تووشــی خۆشــیو خۆشگوزەرانیان دەکەین زۆر دڵخۆش دەبن، ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ﴾ واتـە: کاتێکیش تووشی کەم بارانیو نەبوونیو بەڵایەکیان دەکەین، ﴿فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ﴾ واتە: ئەو بەزەییو چاکانەی هەموو لە یاد دەچێتو ئینکاری دەکات تەنها هەر ئەو کاتەی لە یادە کە تیایەتی. واتـە: لـە کاتی خۆشیو خۆشگوزەرانیدا لەخۆی بایی دەبێتو لە کاتی نەبوونیشدا بێ هیواو دەستەئەژنۆ دادەنیشێت. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەی ژنگەلینە خێروبێر بکەن، من ئێوەم بینیوە زۆرینەی خەڵکی ئاگر بوون). ژنێك وتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چونکە ئێوە زۆر نارازینو هاوڕێیەتیتان لەبەرچاو نیە ئەگەر بە درێژایی ساڵ چاکە لەگەڵ یەکێکتان بکرێت پاشان

---

[1] القيامة(١٠ـ١٢).

[2] البقرة(٢٧٢).

[3] الرعد(٤٠).

ڕۆژێك نەكرا، دەڵێت: هەرگیز چاكەم لە تۆ نەبینیوە).[1] ئەمە حاڵو كردەوەی زۆری ژنانە مەگەر كەسێك خودا ڕێی نیشان دابێتو شارەزای كردبێت، ئەوانەش ئەو كەسانەن كە لە خاوەن باوەڕانو ئاكارچاكانن. وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر تووشی خۆشی بووە سوپاسگوزار بووە، كە ئەوە خێر بووە بۆی. وە ئەگەر تووشی ناخۆشیش بووە ئارامی گرتووە هەر خێر بووە بۆی. ئەمەش بۆ هیچ كەسێك نیە بۆ خاوەن باوەڕ نەبێت).[2]

﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ لەو ئاسمانانو زەمینە فەرمانڕەوا هەر خودایەو چی بخوازێت دروستی دەكات، بە یەكێك كچ دەبەخشێتو بە یەكێك كوڕ. ئیتر بە مەیلی خۆیەتی. خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەكات كە خۆی ئاسمانەكانو زەمینی بەدی هێناوەو خۆی خاوەنو هەڵسوڕێنەریەتیو دەیبات بەڕێوە، هەرچی مەیلی لێ بێت دەیكاتو هەرچیش مەیلی لێ نەبێت نایكات. دەبەخشێت بە هەر كەسێك حەز بكاتو دەیگرێتەوە لە هەر كەسێكیش حەز بكات. كەس ناتوانێت بەری بەخشیشی بگرێتو ناشتوانێت ببەخشێت بە فەرمانی ئەو نەبێت. هەرچی بخوازێت دروستی دەكات، ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا﴾ بە مەیلی خۆی بە یەكێك تەنها كچ دەدات. بەغەوی دەڵێت: لەو كەسانەی كە هەر كچی پێداون پێغەمبەر لووت(لوط)(سەلامی خوای لێ بێت).[3] ﴿وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ وە هەر بە مەیلی خۆی بە یەكێكی تر تەنها كوڕ دەدات. بەغەوی دەڵێت: وەك پێغەمبەر ئیبراهیمی خەلیل(سەلامی خوای لێ بێت) كە هەر كوڕی بووو كچی نەبوو.[4] وە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾ دوو(كوڕو كچانیان) دەداتێو بە مەیلی خۆی، هێندێكیانیش نەزۆك دەكات. هەر خۆی زانایەو بەتوانایە. واتە: وە بۆ هەر كەسێكیش مەیلی لێ بێت كچیشو كوڕیشی

---

[1] مسلم(٨٦/١).

[2] مسلم(٢٢٩٥/٤).

[3] البغوي(١٣٢/٤).

[4] البغوي(١٣٢/٤).

دەداتیێ. بەغەوی دەڵێت: وەك پێغەمبەر موحەممەد(ﷺ)[1]. ﴿وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا﴾ وە بۆ هەر کەسێکیش بخوازێت هەر منداڵی نابێت، بەغەوی دەڵێت: وەك پێغەمبەر عیساو یەحیا(سەلامی خوایان لێ بێت).[2] خوای گەورە مرۆڤی کردووە بە چوار بەشەوە هەندێکی هەر کوڕی پێداوەو هەندێکی هەر کچی پێداوەو هەندێکی کوڕو کچی پێداوەو هەندێکیشی نەزۆك نە کوڕی دەبێتو نە کچ ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ﴾ واتە: خۆی دەزانێ کێ شیاوی هەر یەکێك لەو بەشانەیە، دەتوانێت بەو شێوەیە جیایان بکاتەوە. ئەم ئایەتە لێرەدا لەو ئایەتە دەچێت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ﴾[3] واتە: وە بۆ ئەوەی بیکەن بە موعجیزەو نیشانەیەك بۆ خەڵکی. واتە: ئەمانە هەموو نیشانەی دەسەڵاتو توانایی خودای گەورەن کە خەڵکی دروست کردووە، بە چوار شێواز هەر جارەی بە شێوەیەك. پێغەمبەر ئادەمی(سەلامی خوای لێ بێت) لە خۆڵ(تراب) دروست کردووەو نە لە نێر بووە نە لە مێیە. حەوایشی لە نێرینە وەدی هێناوە بەبێ مێیە، خەڵکەکەی تریش غەیری عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) لە نێرو مێ دروست کردووە، عیسا پێغەمبەریش(سەلامی خوای لێ بێت) لە مێینە وەدی هێناوە بەبێ نێرینە. بە دروست کردنی عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوایان لێ بێت) نیشانەکان هاتەدی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ﴾[4] واتە:: وە بۆ ئەوەی بیکەن بە موعجیزەو نیشانەیەك بۆ خەڵکی. ئەمە لێرەدا لە بارەی باوکانەوەو لە شوێنی یەکەمیشدا لە بارەی فەرزەندانەوە بووەو هەر یەکێك لەم دووانە بوون بە چوار بەشەوە،بێگەردی بۆ خوای بەرزی بەتوانا.

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴿٥١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحٗا مِّنۡ أَمۡرِنَاۚ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلۡنَٰهُ نُورٗا نَّهۡدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنۡ عِبَادِنَاۚ وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٥٣﴾﴾

---

[1] البغوي(٤/١٣٢).

[2] البغوي(٤/١٣٢).

[3] مريم(٢١).

[4] مريم(٢١).

**باسی شێوازی هاتنەخوارەوەی نیگا (الوحي)**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ ۚ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ هەرگیز خودا هیچ کەسێکی ڕووبەڕوو نەدواندووە، یان فەرمانی لە ڕای دڵیەوە ناردووە، یان لە پشت پەردەوە یان قاسیدێکی ناردووەو ئیزنی داوە چی دەخوازێت بە دڵی ڕابگەیەنێت. هەر ئەو جێ بەرزو کاربزانە. ئەمە جۆرو پلەکانی نیگایە لە لایەن خوای گەورەوە. جاری وا هەبووە خوای گەورە شتێکی خستووەتە ناو دڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە هیچ گومانی نەبووە کە ئەو شتە لە لایەن خوداوە بوە. وەك لە سەحیحی ئیبنو حەیبباندا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(گیانی پیرۆز(روح القدس) نایە دڵمەوە هیچ گیانلەبەرێك نامرێت هەتا ڕۆزیو کاتی خۆی تەواو نەکات. سا لە خودا بترسنو بە جوانی بگەڕێن بە دوای ڕۆزیدا)[1].

﴿أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ﴾ یان لە پشت پەردەوە وەك چۆن قسەی کرد لەگەڵ موسادا(سەلامی خوای لێ بێت) پاشان موسا داوای بینینی خودای کرد، ڕێگای پێنەدرا. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە جابیری کوڕی عەبدوڵلا(ڕەزای خوایان لێ بێت):(خودا قسەی لەگەڵ هیچ کەسێك نەکردووە مەگین لە پشت پەردەوە نەبێت، ئەو خودایە ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ باوکتدا کردووە).[2] وەك لە فەرموودەدا هاتووە کە لە جەنگی ڕۆژی ئوحوددا شەهید کرا. بەلام ئەمە لە عالەمی بەرزەخدا بووە هەرچەندە ئایەتەکە لەم دنیادا هاتووەتەخوارەوە، خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ﴾ وەك چۆن جوبرەئیل یان غەیری ئەو فریشتەیەکی تر دێتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت)، ﴿إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ ئەو خودایە جێ بەرزو زاناو ئاگادارو کاربزانە. وە دەفەرموویت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ هەر بەم جۆرەش. ئێمە لە فەرمانی خۆمان، گیانێکمان ناردە لای دڵت، تۆ لە پێشدا نەتدەتوانی بزانی کتێب کامەیەو بڕوا چیە؟ بەلام ئێمە ئەوەمان کردە مەشخەڵێك کە عەبدانمان(ئەوانەی خۆمان بخوازین) بەوە دەخەینە سەر ڕێگا. تۆش بە ڕاستەڕێ ڕێبەری. ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾ واتە: قورئان. ﴿مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ﴾ واتە: تۆ ئاگات لێ نەبوو کتێبو بڕوا چیە بەو شێوەی کە لە

---

[1] مسند الشهاب(٢/١٨٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] تحفة الأحوذي(٨/٣٦٠)، لە سورەتی(ال عمران)دا پلەکەی دیاری کراوە.

قورئاندا بە درێژی بۆت باس کراوە. ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ﴾ قورئانمان کردە ﴿نُورًا نَّهْدِي بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ مەشخەڵێك بۆ عەبدەکانمان ئەوانەی خۆمان مەیلمان لێ بێت بەوە دەخەینە سەر ڕێگا. وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾[1] واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: قورئان بۆ کەسانێك باوەڕیان پێی هێناوە ڕێبەرو چارەسەری گومانەو ئەوانەی باوەڕی پێ ناهێنن لە گوێیاندا گرانیو کەڕی هەیە(لە بیستنی هەق) هەروەها لە ئاست ئەم قورئانەدا کوێرن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّكَ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) ﴿لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ تۆش لەسەر ڕاستەڕێی کە بریتیە لە خورەوشتی چاكو جوانو ڕاست. پاشان خوای گەورە مانای دەکات دەفەرمووێت: ﴿صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾ ڕێگە بەرەو ئەو خودایەی، هەرچی لە ئاسمانەکانو هەرچی لە زەمینیشدایە هەر بۆ ئەوە. باش بزانن! هەموو کارێك هەر بۆ لای ئەو دەچێتەوە. ﴿صِرَٰطِ ٱللَّهِ﴾ ئەو بەرنامەیەی کە ئەو فەرمانی پێداوە، ﴿ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: خودا پەروەرندەیانەو خاوەنیانەو هەڵیان دەسوڕێنێتو دەیانبات بەڕێوەو دەیانپارێزێت، ئەو کاربەدەستەیە کە هیچ کەس ناتوانێت دەست وەکاریەوە بدات. ﴿أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ﴾ واتە: هەموو کارێك دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو جیای دەکاتەوەو فەرمانی بۆ دەردەکاتو پەسەندی پاکی هەر بۆ خودایە لەوەی کە ناهەقیکارانو خوانەناسان دەیڵێن بەرانبەر بە خودای بەرزو مەزن.

---

[1] فصلت(٤٤).

## تەفسیری سورەتی(الزخرف)

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمًا مُّسۡرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾﴾

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حمٓ﴾ حا، میم. ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ بەم کتێبە کە هەمووشت نیشان دەدات. واتە: ئەم کتێبە ڕوونەو ئاشکرایەو ماناو وتەکانیشی دیارە چونکە بە زمانی عەرەبی هاتووەتەخوارەوە کە ڕەوانترین زمانە بۆ قسەکردن لە نێوان مەردمدا بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ بڕیارمان دا ئەم قورئانە عەرەبی بێت، بەشکو بتوانن تێبگەن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ﴾ واتە: ناردوومانەتە خوارەوە، ﴿قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾ واتە: بە زمانی عەرەبی کە ڕوون‌و ڕەوانە، ﴿لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾ واتە: شاید لێی تێبگەن‌و لێی ورد ببنەوە، وەك ئەم ئایەتەی کە خودا فەرموویەتی: ﴿بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ﴾[1] واتە: بە زمانێکی عەرەبی ڕوون‌و ڕەوان. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ﴾ ئەمەش لە ماڵی کتێبدا کە(لوح المحفوظ)ە(لای ئێمە) گەلێك پایە بەرزەو پڕە لە کارزانی. واتە: خوای گەورە باسی ڕێزو گەورەیی ئەم قورئانەی کردووە لە لای کۆمەڵی پایەبەرزان (الملأ الأعلى) بۆ ئەوەی خەڵکی سەر زەمین زۆر ڕێزی لێ بگرن‌و بە مەزنی سەیری بکەن‌و بەرفەرمانی بن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّهُۥ﴾ واتە: ئەم قورئانە، ﴿فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ واتە: لە(لوح المحفوظ) دایە، ئیبنو عەباس‌و موجاهید وتوویانە.[2] ﴿لَدَيۡنَا﴾ واتە: لای ئێمە. قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە.[3] ﴿لَعَلِيٌّ﴾

---

[1] الشعراء(١٩٥).

[2] الرازي(٢٧/١٦٧).

[3] البغوي(٤/١٣٣).

واتە: خاوەنی ڕێزو پایەبەرزیو مەزنیە. قەتادە دەڵێت.[١] ﴿حَكِيمٌ﴾ پڕە لە كارزانیو دوورە لە لاریو ناڕێكیەكەوە. ئەمە هەمووی بۆ ئاگاداربوونە لە ڕێزو مەزنی ئەم قورئانە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَـٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾[٢] واتە: كە بێگومان ئەمە قورئانێكی گەورەو بەڕێزە، لەناو كتێبێكی شاراوەدایەكە(لوح المحفوظە) جگە لە(فریشتە) پاكەكان كەس دەستی لێ نادات، نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِى صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ ﴿١٣﴾ مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍۭ ﴿١٤﴾ بِأَيْدِى سَفَرَةٍ ﴿١٥﴾ كِرَامٍۭ بَرَرَةٍ﴾[٣] واتە: وا مەكە! بێگومان ئەو ڕێنموونیانەی (كە بۆت هاتووە) بێداركەرەوەی (ئادەمی)یە، ئینجا ئەو كەسەی بیەوێت یادی خودا دەكات،(كە ئەو ڕێنموونیانەش نووسراوەتەوە) لە چەند پەڕەیەكی گەورەی پایەبڵندی پاكدا، كە بە دەست نوێنەرانی، بەڕێزی خێرخواوەن. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ﴾ هەرچەند ئێوە كۆمەڵێ لاساریش بن، ئاخۆ ئێمە لەو بیرەوەریە واز دێنین. واتە: ئێوە وا دەزانن ئێمە واز لە ئێوە دێنینو جەزرەبەتان نادەین كاتێك كە فەرمانتان پێ دەكەین بە كارێك و نایكەنو پێی هەڵناسن. ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو ئەبو سالحو موجاهیدو سودیەو ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[٤] قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا﴾ دەڵێت: سوێند بە خودا ئەگەر ئەم قورئانە بەرزكرایەتەوە كاتێك ئەوەڵی ئەم ئوممەتە باوەڕیان پێ نەكردو گەڕاندیانەوە ئەوە هەموو قڕ دەبوون و هەموویان لەناو دەچوون. بەڵام خوای گەورە بە سۆزو كەرەمی خۆی هەر بەردەوام بوولە باسكردنو ناردنە خوارەوەی بۆماوەی بیست ساڵ یان هەر هەرچەندێ خۆی مەیلی لێی بوو.[٥] ئەم قسەی قەتادەزۆر جوانو پڕ مانایە. كورتەكەی ئەوەیە لەم مانایەدا دەڵێت: لەبەرسۆزیو دلۆڤانی خودایە بەرامبەر بە دروستكراوەكانی كە لە بانگكردنیان بۆ چاكەو بەم قورئانە پڕ لە كارزانیە وازیان لێ ناهێنن. هەرچەندە ئەوانە كۆمەڵێكی زۆر لاساریش بن بەڵكو فەرمانی بەوە

---

[١] الطبري(٢١/٥٦٧).

[٢] الواقعة(٧٧ـ٨٠).

[٣] العبس(١١ـ١٦).

[٤] الطبري(٢١/٥٦٧/٥٦٨).

[٥] الطبري(٢١/٥٦٨).

داوە ڕێگا نیشانی ئەو کەسانە بدرێت کە بڕیار دراوە شارەزا بن‌و ببێتە بەڵگەیش لەسەر ئەوانەی کە بە بەدبەخت نوسراون.

## دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر باوەڕنەهێنانی قورەیشیەکان پێی

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە فرە پێغەمبەرمان ناردووەتە لای کۆمەڵانێك بەر لە ئێوە. پاشان خوای گەورە بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر باوەڕنەهێنانی قورەیشیەکان پێی‌و گاڵتەپێکردنی داوا دەکات لە پێغەمبەر(ﷺ) کە ئارام بگرێت لەسەر ئەو ئازاردانەو دەفەرمووێت: ﴿وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە پێغەمبەری زۆرمان(سەلامی خوایان لێ بێت) ناردلەپێش تۆوە. ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ هەر کەسیشمان بە پێغەمبەری بۆ ناردن هەر گاڵتەیان پێکردووە. واتە: باوەڕیان پێ نەکردووەو گاڵتەیان پێکردووە. ﴿فَأَهْلَكْنَا أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ﴾ ئێمە زۆردارترلەوانمان قڕکردووە، نموونەی(پێشینەکان ڕابوردووە. واتە: ئەوانەی کە باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەرەکانیان (سەلامی خوایان لێ بێت) لە ئەمان زۆردارتر بوون کە باوەڕ بە تۆ ناهێنن ئەی موحەممەد(ﷺ) وەك ئەم ئایەتەیش کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً﴾[1] واتە: دەی ئایا بە زەویدا نەگەڕاون تا ببینن سەرەنجامی کەسانێك کە بەر لەوان بوون چۆن بووە کە لەمان زۆرترو بەهێزتریش بوون. ئایەت لەم بارەیەوە فرە زۆرە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ﴾ موجاهید دەڵێت: ڕەفتاریان.[2] قەتادە دەڵێت: سزاکانیان.[3] کەسانی تریش غەیری ئەمان وتوویانە: پەندو ئامۆژگاری، واتە: ئەوانمان کردە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن ئەوەی تووشی ئەوانە بووە تووشی ئەمانیش دەبێت ئەگەر بەو حاڵە بمێننەوە. وەك خوای گەورەو بەدەسەڵات لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ﴾[4] وە لەئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾[1] وە لە ئایەتی (٥٦)ی ئەم سورەتەدا دەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ﴾[2].

---

[1] الغافر(٨٢).

[2] الطبري(٥٧١).

[3] الطبري(٥٧١).

[4] الغافر(٨٥).

﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴿٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾ وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا
بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَالَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ
﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُوا عَلَىٰ ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا
كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّا إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾

**دانپیانانی بتپەرستان کە دروستکراوەکان هەموو خودا وەدی هێناون، بەڵگەی زۆرتریش لەسەری**

خــوای گــەورە دەفــەرموویت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ ئەگەر تۆ لەوان بپرسی: کێ ئاسمان‌و زەمینی وەدی هێنا؟ دەڵێن بێ شك خودای خاوەن دەسەلاتی زانا دروستی کردوون. واتـە: ئـەی موحەممەد(ﷺ) ئەگـەر تـۆ لـەو بتپەرستە خوانەناس‌و هاوەڵ دانەرانە بۆ خودا بپرسی: ﴿مَّنْ خَلَقَ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ﴾ کـێ ئـەم ئاسمانانەو زەوی خولقاندووە؟ بەدڵنیاییەکەوە دەڵێن: خـودای بەدەسـەڵاتی زانـا، یانی: ئەوانـە دانـی پێدا دەنێن کە وەدیهێنەری ئەوانە هەمووی تەنها خودای بێ شەریکە کەچـی لەگـەڵ ئەوەیشدا غـەیری خودا دەپەرستن‌و دەیکەنە هاوەڵی خودا وەك ئەو بتانەو شتی تریش. وە دەفـەرموویت: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ ئەو کەسێکە ئەم زەمینەی بۆ ئێوە کردە ڕایەخ‌و ڕێگەی بۆ پێداکێشاون، بۆئەوەی شـارەزابن. ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا﴾ واتـە: ئەو خودایە زەمینی وەك ڕایەخ بۆ تەخت کردوون‌و کردوویەتیە شوێنی نیشتەجێتان‌و لەسەری دەچن‌و دێن‌و هەڵدەسن‌و دەخەون‌و دەڕۆن کە زەمینـیش دروسـتکراوێکە وەك ئـاو چـۆن دروسـت کـراوە بـەڵام خودا بە چیاکان دایکوتاوە بۆ ئەوەی بەملاولادا نەچێت، ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا﴾ ڕێگایشی لە نێوان چیاو شیوەکاندا هێشتووەتەوە تاپیایـدا تێپـەڕن، ﴿لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ شایەدشـارەزا بـبن کاتێـك دەچن بۆ سەفەر لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی تر. وە دەفـەرموویت: ﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ هەر ئەویشە کـە ئەنـدازە ئاوی ناردەخوار، سەرزەمینی مردوومان پێ بوژاندەوە، ئێوەش وا دەخرێنە دەرێ. ﴿وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ

---

[1] الاحزاب(٦٢).

[2] الزخرف(٥٦).

ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ﴾ هەر خودایە بە پێی پێویستو بە ئەندازە ئاوی بۆ ناردوون بۆ خۆتانو کشتوکاڵو خواردنەوەو باخو باخاتو مەڕوماڵات. وە دەفەرموێت: ﴿فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ واتە: زەمینی مردووی بێ گیانی پێ زیندوو دەکەینەوەو دەبوژێنینەوە. کاتێك ئاو دەچێت بەسەریدا دەجوڵێتو نەرم دەبێتەوەو هەموو جۆرە گیاوگژەو دارو درەختێك زیندوو دەکاتەوەو دەڕوێنێت. پاشان خوای گەورە بە زیندووکردنەوەی زەمین مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە کە چۆن زەمینی زیندووکردووەتەوە هەر بەو شێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا ئێوەیش پاش مردن زیندوودەکاتەوە، ﴿كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ ئێوەش وا دەخرێنە دەرێ. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مَا تَرْكَبُونَ﴾ هەر ئەویشە ئەم هەموو جووتەی دروست کردووە، گەمیو ئاژەڵی وەهاشی بۆ ئێوە وەدی هێناوە، سواریان دەبن. ﴿وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا﴾ ئەو خودایەی کە جووتەی لە هەموو شتێکدا دروست کردووە لەوەی کە لە زەمیندا دەڕوێت لە هەموو جۆرەکانی ڕووەكو غەیری ڕووەکیش وە لە زیندەوەریشدا بە هەموو جۆرو ڕەگەزیانەوە، ﴿وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مَا تَرْكَبُونَ﴾ واتە: گەمیو ئاژەڵو ماڵاتی بۆ ڕام هێناون ژێرباری کردووە بۆتان شیر و گۆشتی ماڵاتەکان دەخۆنو سواریشیان دەبن، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ﴾ دەبێ هەر کاتێك لەسەر پشتیان حەسانەوە. ئەوسا چاکەی پەروەردگارتان لەبیر نەچێتو بڵێن: پاکیو بێعەیبی بۆ ئەو کەسەیە کە ئەمەی ڕامی ئێمە کرد. دەنا بۆمان ڕام نەدەبوون. ﴿لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ﴾ واتە: هەر کاتێك سوار بوونو چاك لەسەری جێگیر بوون، ﴿ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ﴾ دوای ئەوە چاکەو بەهرەی پەروەردگارتان لە یاد نەچێت لەو شتانەی کە بۆی ڕام کردوون ﴿إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ﴾ واتە: کاتێك بە تەواوی جێگیر بوون لەسەری بڵێن: پاکیو بێگەردی بۆ ئەو کەسەی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناین. ئێمە نەماندەتوانی ڕامی بهێنینو توانامان نەبوو بەسەریدا ئەگەر خوای گەورە ڕامی نەهێنایە. ئیبنو عەباسو قەتادەو سودیو ئیبنو زەید دەڵێن: ﴿مُقْرِنِينَ﴾ واتە: توانامان نەدەبوو بەسەریدا.[1] ﴿وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ﴾ ئێمەش گشتمان بەرەو پەروەردگاری خۆمان دەچینەوە. واتە: هەموومان دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا پاش مراندنمان. ئەم

[1] الطبري(٢١/٥٧٦/٥٧٧).

ئاگاداریە یانی چۆن لە دنیا لە سەفەر دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان. هەر بەو شێوەیەش کە مردن لە قیامەتدا زیندوو دەکرێنەوەو دەچنەوە لای پەروەردەتان وەك چۆن ئاگاداری داوە کە چۆن بۆدنیا خەریکن. توێشوویش ئامادەکەن کە خۆپاراستنە لە گوناە بۆ ڕۆژی قیامەت. ﴿وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَىٰ﴾[1] واتە: وە توێشوو(ی پارێزگاری) هەڵبگرن کە باشترین توێشوو لەخواترسانە. وە چۆن خۆتان دادەپۆشن بە جلوبەرگ لە دنیادا جلوبەرگی خۆپاراستنیش لە گوناە بپۆشن ئەوە زۆر چاکترە بۆتان.

﴿ وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا ۚ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ اتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَاكُم بِالْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا ۚ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَاهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

### وەڵامدانەوەی بتپەرستان لەسەر ئەوەی دەڵێن خودا منداڵی هەیە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا ۚ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴾ فرزەندەیان لە بەندەکانی خوادا بۆ دانا! بە ڕاستی مرۆڤ بە ئاشکرا پێ نەزانە. کە هەندێ ئاژەڵو ماڵاتیان داناوە بۆ بتەکانیانو هەندێکیش بۆ خودا وەك خودای گەورە لە سورەتی (الانعام) باسی کردووە بۆمان: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ الْحَرْثِ وَالْأَنْعَامِ نَصِيبًا فَقَالُوا هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَائِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى اللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَائِهِمْ ۗ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾[2] واتە: وە بڕیاریاندا بۆ خوا لەوەی کە(خودا) دروستی کردو دای هێنا بەشێك لە کشتوکاڵو ئاژەڵو ماڵات جا بە گومانی خۆیان وتیان ئەمە بۆ خودایەو ئەوەش بۆ هاوبەشەکانمان(بتەکانمان) جا ئەوەی بۆ هاوبەشەکانیانە ئەوە بە خوا ناگاتو ئەوەش بۆ خودایە دەگات بە هاوبەشەکانیان(واتە: خوا نایەوێتو دەیداتەوە بەسەریاندا) چ خراپە ئەوەی بڕیاری دەدەن. وە هەر بەو شێوەیە کە کوڕو کچ ئەوەی خۆیان پێی ڕازی نین بە عەیبو عاری دادەنێن بۆ

[1] البقرة(١٩٧).
[2] الانعام(١٣٦).

خۆیان بۆ خوای دادەنێن کە کیژە وەك خوای گەورە دەفـەرموویێت: ﴿أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ۝٢١ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ﴾[1] واتە: ئایا ڕاستە ئێوە کوڕتان ببێتو خودا کچ، ئەگەر وابێـت دابەشـکردنێکی نادروسـت دەبێـت. وە خـوای گـەورە لێـرەدا فەرموویـەتی: ﴿وَجَعَلُوا لَهُ مِنْ عِبَادِهِ جُزْءًا ۚ إِنَّ الْإِنسَانَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾. پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿أَمِ اتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَاكُم بِالْبَنِينَ﴾ ئـاخۆ لەناو ئەوانەدا(کە هەر خۆی دروستیان دەکات) کـچانی داوە بـە خـۆیو کوڕانیـشی کردووەتـە تایبـەتی ئێوە؟ واتە: ئەمەی کە خودا خۆی کوڕو کچی دروست کردووەو کچی بۆ خۆی هەڵبـژاردووە بـە قـسەی ئەو بتپەرستانە ئەمە قسەیەکی پڕوپوچەو خوای گەورە زۆر نارازیە پێیو ڕەدیان دەداتەوە بە توندیو دەفـەرموویێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾ کەچـی هەر کاتێك یەکێك لەوان مژدەی ئەوەی پێ بـدرێت بـەوەی وا خـۆی پێـی وایـە بـۆ خودایە، ڕوخـساری ڕەش دادەگیرێتو لە ڕقان پیش دەخواتەوە. واتە هەر کاتێك یەکێك لەوانە هەواڵی بدرێتێ لەو کیژانەی کە خۆی بۆ خودای داناوە زۆر پێی گرانـەو بـە ڕادەیـەك دەمو چـاوی ڕەش هەڵدەگـەڕێتو لـە خـەڵکی دەشارێتەوە بەعەیبو عاری دەزانێ ڕووی نیە باسی بکات. خوای گەورەیش دەفەرموویێت باشە شـتێك خۆتان پێی ڕازی نین بە عەیبو عاری دادەنێن بۆ خۆتان چۆن دایدەنێن بۆ خودا. پاشان خوای گـەورە دەفەرموویێت: ﴿أَوَمَن يُنَشَّأُ فِي الْحِلْيَةِ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ﴾ ئاخۆ کەسێك بـەخێو کرابێـتو لـە شەڕیشدا نادیار بێت(بۆ خودا دەبێت). واتە: ئایا ئافرەت خۆی ناتەواوەو بەو هەموو ناتەواویەوە خشڵ دەپۆشێت هەر لە کاتی منداڵیەوەو ئەگەر شەڕو هـەراش بـوو خـۆی دەشـارێتەوەو دیـار نیـەو توانـای بەرگری نیە ئاخۆ دەبێت ئەوە بۆ خوا بێت بکرێتە کچی خـودا. مێینـە لـە جەسـتەدا کـەم توانایـەو لـە کاتی شەڕیشدا ناتوانێت بەرگری بکات. بـەڵام جەسـتەی بـە پۆشـاکی جـوان دەڕازێنێتـەوەو ناتـەواوی جەستەی تەواو دەکاتو دەرناکەوێت بەڵام لە کاتی جەنگدا توانای نیـەو بـەرگری پـێ ناکرێت. نـە بـە زمان نە بە کردار. وەك هەندێ لە عەرەبەکان وتوویانە: وەختێك مژدە بە کچ درابێت: کچ وەك نیعمەتی کوڕ نیيە، هەموو هەڵمەتێکی بریتییە لـەگریان و هـەموو چاکەیەکـیشی بریتییـە لـەدزی کـردن! خـوای گــــــەورە دەفـــــــــەرموویێت: ﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا ۚ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾ ئەو فریشتانەی هەموویان بەندەی خودان بـە مێینـەیان داناون. دەبێت خۆیان لەوێ بووبن کاتێك کە ئێمە وەدیمان هێنان! شایەتیەکەیان دەنووسرێتو لێیان دەپرسرێتەوە.

---

[1] النجم(٢١ـ٢٢).

﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ﴾ واتە: وایاندەزانی کە فریشتەکان کە بەندەی خودان مێینەن خوای گەورەش وەلامیان دەداتەوەو دەفەرموێت: ﴿ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ﴾ واتە: ئایا ئەوان چاویان پێیان کەوت کە دروستمان کردن مێینە بوون، ﴿سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ﴾ واتە: شایەتیەکەیان دەنووسرێت لەو بارەیەوە لە رۆژی قیامەتدا لێیان ئەپێچێتەوە. ئەمە هەرەشەیەکی زۆر توندو بەلێنێکی راستە دێتەدی. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾ دەڵێن: ئەگەر خودا حەزی بکردایە ئێمە نەماندەپەرستن، لەمەشدا دوورە زانستن، هەر درۆ هەڵدەبەستن. واتە: ئەمانە دەڵێن: ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە نەیدەهێشت ئێمە ئەم بتانە بپەرستین کە لە شێوەی فریشتەدا بوون ئێمە ئەوانمان بە کچانی خودا دەزانی خودا وای لێ کردووین کە بڕوامان وابێت. ئەمانە کۆمەڵێك هەڵەی زۆریان پێکەوە کۆ کردۆتەوە. یەکەم: منداڵیان بۆ خودا داناوە. خودای گەورەیش پاکو بێعەیبە و دوورە لەوەوە و زۆر پایە بڵندو مەزنە. دووەم: دەڵێن خودا کچانی بۆ خۆی هەڵبژاردووە لە باتی کوڕانو فریشتەکانیش کە بەندەی خودان بە مێینەیان داناون. سێیەم: عیبادەتیشیان بۆ ئەو بتانە لە خۆیانەوە بووە، هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان بە دەستەوە نیەو خودایش ڕێی پێ نەداون بیانپەرستن. بەڵکو تەنها شوێن ئارەزووو ئەو باوو نەریتانەی بابو باپیرانیان کەوتوونو لەناو پاشماوەی نەفامیداوێڵ و سەرگەردان بوون. چوارەم: ئەوە دەکەنە بەڵگە کە ئەگەر خودا مەیلی لێ بووایە نەیاندەپەرستن. خودای گەورەیش بە درۆیان دەخاتەوە زۆر بە توندی ئینکاری ئەو قسانەیان دەکات. هەر لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانەوە(سەلامی خوایان لێ بێت)و ناردنی کتێبەکانەوە فەرمانی داوە بە بەندەکانی کە تەنها ئەو بپەرستنو هاوەڵی بۆ دانەنێن. ڕێگای نەداوە خودا خۆی نەبێت هیچ کەسێکی تر بپەرسترێت. دەفـــــەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِى كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ ۚ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەلو ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خودا بپەرستنو دوورکەونەوە لە(پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر، جا خودا هەندێکی لەو(ئوممەت)انە ڕێنموونی کردو هەندێکیشیان(لەبەر خراپیان) گومڕایی یەخەی گرتن دەی بە زەویدا بگەڕێنو تەماشا بکەن سەرەنجامی بێباوەڕان چۆن بوو. وە دەفەرموێت: ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن

[1] النحل(٣٦).

قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ﴾[1] واتە: تۆ پرسیار بکە لەو پێغەمبەرانەی پێش تۆ ناردوومانن ئایا بێجگە لە خوای میهرەبان بڕیارمان داوە پەرستراوانێك بپەرسترێن. خوای گەورە لەم ئایەتەدا دوای ئەوەی باسی ئەو بەڵگانەی کردن دەفەرموێت: ﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍ﴾ واتە: هیچ شتێکی ڕاستیان بە دەستەوە نیە لەسەر ئەو قسانەی کە کردوویانەو دەیکەنە بەڵگە، ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ واتە: هەر درۆ دەکەن‌و هەڵی دەبەستن لە خۆیانەوە. موجاهید لەم ئایەتەدا: ﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ دەڵێت: واتە: ئاگاداری توانای خودا نین لەو بارەیەوە[2].

﴿ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾

## باسی ئەوەی کە بتپەرستان هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴾ ئاخۆ ئێمە (بەر لە قورئان) کتێبێکمان بەوان داوە کە ئێستا بیکەنە بەڵگە؟ خوای گەورە نارەزایی زۆر دەردەبڕێت بەرامبەر ئەو بتپەرستانە کە عیبادەتی غەیری خودا دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت دەفەرموێت: ﴿ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا مِّن قَبۡلِهِۦ﴾ واتە: لە پێش ئەو بتپەرستانەدا ئایا ئێمە کتێبێکمان بۆ ڕەوانە کردوون، ﴿فَهُم بِهِۦ مُسۡتَمۡسِكُونَ ﴾ دەستی پێوە بگرن‌و بیکەنە بەڵگەو لەسەری بڕۆن؟ واتە: نەخێر بڕیاری وا نەبووە. وەك ئەم ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَمۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُواْ بِهِۦ يُشۡرِكُونَ ﴾[3] واتە: ئایا بەڵگەیەکمان بۆ ناردوون کە دەربارەی ئەوەی ئەوان کردوویانەتە هاوبەشی خودا بدوێت؟ واتە: هەرگیز شتی وا نەبووە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ بَلۡ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴾ بەڵکو دەڵێن باب‌و باپیرانمان لەسەر ئاینێك ڕۆیشتوون. ئێمە پەیڕەوی ئەوانین. واتە: هیچ بەڵگەیەك نیە بە دەستیانەوە

---

[1] الزخرف(٤٥).

[2] الطبري(٢١/٥٨٣).

[3] الروم(٣٥).

لەسەر ئەو بتپەرستیەی کە دەیکەن جگە لە شوێنکەوتنو پەیڕەوی کردنی ئەو شتانەی کە بابو باپیرانیان بۆیان بەجیٚ هێشتوون. بە ئایینی دەزانن. خودا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئا ئەمەیە ئایینی ئێوە کە یەك ئایینە(ئایینی هەموو پێغەمبەران). ئەوانیش دەڵێن: ﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ﴾ ئێمە لەسەر ڕێگای ئەوان دەڕۆین بەبیٚ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت. ئەم قسەی ئەمانە دەیکەن گەلەکانی پێش ئەمانیش هەمان قسەیان کردووە دڵەکانیان لەیەك دەچنو هەر قسەکانی ئەوان دووبارە دەکەنەوە کە باوەڕیان بە پێغەمبەرەکانیان نەکردووە. ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ۝٥٢ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ﴾[2] واتە: بەم شێوەیە بۆ لای ئوممەتانی پێش ئەمان هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە مەگەر وتوویانە(بەو پێغەمبەرە) جادووگەر یان شێت، ئایا(ئەمانو ئەوان) ڕاسپاردەیان بۆ یەکتری کردووە ؟(نەخێر) بەڵکو ئەمان هەموو گەلێکی سەرکەشو یاخین. بۆیە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ﴾ هەر بەم تەرزە بەر لە تۆش هەر پێغەمبەرێکمان ناردووەتە هەر ئاوەدانیەك کە لە ئێمەوە ترسیان وەبەر بنێت. هەموو خۆشگوزەرانەکانی ئەوانە وتوویانە: بابو باپیرانمان لەسەر ئاینێك ڕۆیشتوون. ئێمە پەیڕەوی ئەوانین. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ وتوویەتی: ئەدی ئەگەر من ڕێیەکتان نیشان بدەم کە لە ڕێی بابو باپیرانتان دروستتر بێت؟ وتوویانە: ئێمە ئەوەی ئێوەی بۆ بەڕیٚ کراوە، باوەڕ ناکەین. واتە: خۆ ئەگەر زۆر چاکو تەواویش بزانن ئەوەی کە تۆ بۆت هێناون ڕاستە هەرگیز شوێنی ناکەون. چونکە نیەتیان پیسەو زۆر خۆ بەزل دەزانن بەرانبەر بە هەقو ئەوانەی شوێنی هەق کەوتوون. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ﴾ ئەوسا ئێمە تۆڵەمان لیٚ کردوونەتەوە سا بڕوانە ئاکامی بێباوەڕەکان بە کویٚ گەیشت. واتە: بڕوانە خودا چۆن قڕی کردنو لەناوی دانو چۆنیش خاوەن باوەڕانیشی ڕزگارکرد.

---

[1] الانبياء(٩٢).

[2] الذاريات(٥٢_٥٣).

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا
كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا
جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾
أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ
لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً
لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا
عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾

**ئیبراهیم( خلیل الله ) وتەی یەك خوا پەرستی( لا إله إلا الله ) ئاشكرا دەكات**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴾ ئیبراهیم بە باب و هۆزەكەی خۆی وت: من بێزارم لەوەی ئێوە دەیپەرستن. خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەرو خەلیلی خۆی ئیبراهیم دەكات(سەلامی خوای لێ بێت) كە پێشەوای دڵپاكان و خواناسان و باوكی هەموو ئەو پێغەمبەرانەیە كە دوای خۆی هاتوون كە قورەیشیش یەكێكە لەو گەلانەی كە خۆشیان و ئاینەكەشیان لەسەر ڕێڕەوی ئەو بوون لە دواییدا بوونە بتپەرست. ئیبراهیم بێزاری خۆی دەربڕی لە باوكی و هۆزەكەی لەسەر ئەو بتانەی كە دەیانپەرست. دەیوت: وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾ من بێزارم لەوەی كە ئێوە دەیپەرستن. ﴿إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ﴾ مەگین لە كەسێك منی دروست كردووە، كە خۆی ڕێگەم نیشان دەدات. ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ كارێكی كرد كە ئەم وتارەی لە پاشە خۆی بۆ نەتەوەكەی هەر بمێنێت(بگەڕێنەوە). واتە: ئەم وتارەی كە بریتیە لە عیبادەتی خودا بە تەنهاو كە شەریكی نیەو بێهاوتایەو فرێدان و لابردنی غەیری خودا لە پەرستراوەكانی تر كە بریتیە لە وتەی(لا إله إلا الله) كە بەجێی هێشتووە بۆ نەتەوەكەی كە هەر لەناویاندا بمێنێتەوەو پەیڕەوی بكەن لەو كەسانەی كە خوای گەورە ڕێگەی نیشان داون لە نەوەی ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێت) ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێگەیە. عیكریمەو موجاهیدو زەححاك و قەتادەو سودی و كەسانی تریش لەم ئایەتەدا: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ﴾

وتوویانە: واتە:(لا إله إلا الله) بەردەوام کەسانێك هەن لە نەتەوەکەیدا هەر دەیڵێن.[1] هەر بەم شێوەیە لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەت کراوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) ئیبنو زەیدیش وتوویەتی: واتە: (کلمة الإسلام).[2] ئەمیش هەر ئەو قسەیە دەکات کە ئەوان لە پێشەوە وتیان.

**خەڵکی مەککە دژایەتی پێغەمبەریان دەکردو(ﷺ) ڕەخنەشیان لێ دەگرت، وەڵامدانەوەی ڕەخنەکەیان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰؤُلَاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْحَقُّ وَرَسُولٌ مُبِينٌ ﴾ ئەوانیش‌و باب‌و باپیرانی ئەوانیشم لە ژیان هەر بەهرەوەر کرد. تا ئەم هەقەو پێغەمبەری ڕێنیشاندەریان هاتەلا. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰؤُلَاءِ ﴾ واتە: بتپەرستانمان بەهرەوەر کرد لە دنیادا، ﴿وَآبَاءَهُمْ﴾ مۆڵەتی باب‌و باپیرانیشمان دان ژیانیان لە گومراییدا بەسەر برد. ﴿حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْحَقُّ وَرَسُولٌ مُبِينٌ﴾ هەتا ئەم ڕاستییەو پێغەمبەری ڕێنیشاندەریان هاتەلا. ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِ كَافِرُونَ ﴾ کاتێك ڕاستەکەیان بۆ هات. وتیان: ئەمە جادوویەکە ئێمە بڕوامان پێی نیە. واتە: خۆیان بە زل گرت‌و لاساریان دەکردو بە دڵیان نەبوو حەسادەتیان پێ دەبردو باوەڕیان پێ نەدەکردو سەریان نەوی نەدەکرد. ﴿ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ بۆچی ئەم قورئانە بۆ پیاوێکی مەزنی ناودارو ناسراو لەم دوو شارەدا نەهاتەخوار؟ مەبەستیان مەککەو تایف(طائف) بوو. ئەمە قسەی ئیبنو عەباس‌و عیکریمەو موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی‌و قەتادەو سودی‌و ئیبنو زەیدە.[3] زۆر کەسیش وتوویانە: مەبەستی بتپەرستەکان پیاوێکی گەورە بووە لە یەکێك لەو دوو شارە وەك وەلیدی کوڕی موغیرەو عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی. خوای گەورە لەسەر ئەم ڕەخنەیە وەڵامی داونەتەوەو فەرموویەتی: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ ﴾ ئاخۆ ئەوان بەزەیی پەروەردەی تۆ دابەش دەکەن؟ ئێمە بژێوی ئەوانمان لەسەر دنیا بۆ بەش کردوون هێندێکمان لە چاو هێندێکیان پایەبەرزتر کردووە تا هێندێکیان خزمەت بە هێندێکیان بکەن، بەزەیی پەروەردەی تۆ لەو شتەی کۆی دەکەنەوە گەورەترە. ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾ واتە: ئایا ئەوان ڕەحمەتی خودا

---

[1] الطبري(٢١/٥٨٩)، القرطبي(١٦/٧٧).

[2] القرطبي(١٦/٧٧).

[3] الطبري(٢١/٥٩٢/٥٩٣).

دابەش دەکەن. ئەو کارە پەیوەندی بە ئەوانەوە نیە. بەڵکو خودا خۆی دەزانێت پەیامەکانی لە کوێو بە کێ ڕادەگەیەنێت. ڕەوانەی ناکات بۆ کەسێك نەبێت کە زۆر دڵو گیان پاك نەبێتو خاوەنی بەڕێزترین بنەماڵەو پاکترین ڕەگەز نەبێت. پاشان خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە مەیلی خۆیەتی کە جیاوازی خستووەتە نێوان دروستکراوەکانی لەوەی کە پێی بەخشیون لە ڕۆزیو سامانو عەقڵو تێگەیشتنو چەندەها شتی تریش لەو توانا دیارو نادیارانەو فەرموویەتی: ﴿نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ﴾ ئێمە بژێوی ئەوانمان لەسەر زەمینیدا بۆ دابەش کردوون، ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗا﴾ وتراوە: واتە: بۆ ئەوەی هێندێکیان خزمەتی هێندێکیان بکەنو کارو پێویستی یەکتری تەواو بکەن، سودیو کەسانی تریش وتوویانە.[1] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ﴾ واتە: بەزەیی پەروەرندەی تۆ زۆر چاکترە لەوەی کە ئەوان کۆی دەکەنەوە لەو سامانو خۆشگوزەرانی دنیایە.

### هەرگیز سامان نیشانەی ڕەزامەندی خودا نیە بۆ کەس

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ﴾ خۆ ئەگەر بڕیار وا نەبووایە. نابێت مەردم یەك تیرە بن(بەرەو خوانەناسی بچن) وامان دەکرد سەقفو پلەکانی ماڵەکانی ئەوانەی خوانەناسن، لە زێڕ بووایەو بە ڕێزە پلەکاناندا سەریان کەون. ﴿وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ واتە: ئەگەر زۆرینەی ئەو کەسانەی کە نەفامو تێنەگەیشتوون وایان نەزانیایە کە ئەو کەسانەی ئێمە دەوڵەمەندی دەکەینو سامانی زۆری دەدەینێ نیشانەی ئەوەیە کە خۆشمان دەوێن هەموو دەبوونە خوانەناس لەبەر خاتری ماڵو سامان ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو حەسەنو قەتادەو سودیو کەسانی تریشە[2].

﴿لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ﴾ واتە: ئەوانەی کە خوانەناسن، بنمیچو بانو پلەکانی ماڵەکانیانمان دەکردە زیو. ئیبنو عەباسو موجاهیدو قەتادەو سودیو ئیبنو زەیدو کەسانی تریش وایان وتووە[3]. ﴿عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ﴾ واتە: پیایدا سەردەکەوتن، ﴿وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ﴾ واتە: هەموو قاپیو هەرچی تریش لە ماڵەکانیاندایە دەمانکردە زیو بۆیان. وە

---

[1] الطبري(٢١/٥٩٥).

[2] الطبري(٢١/٥٩٧).

[3] الطبري(٢١/٦٠٠).

دەفەرمووێت: ﴿ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ شتی تری هەمەڕەنگەش، گشت ئەمانە هەر بۆ خۆشگوزەرانی ژینی ئەم دنیان. ماڵی ئەولاش پەروەردەت هەر بۆ ئەوانەی داناوە کە لە خوای خۆیان دەترسن. ﴿ وَزُخْرُفًا ﴾ هەمەڕەنگە لە ئاڵتوون. ئیبنو عەباس و قەتادەو سودی و ئیبنو زەید وتوویانە.[1] ﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: ئەمانە هەموو بۆ خۆشگوزەرانی ئەم ژیانی دنیایە کە زۆر بێ بایەخە لە لای خوداو دەچێت و نامێنێت. واتە: بە هۆی ئەو چاکانەوە کە لە دنیا کردوویانە بۆ خۆشگوزەرانی و خواردن و خواردنەوەی باشیان پێ دەدرێت لە باتی ڕۆژی دوایی. وە لە لای خودا هیچ چاکەیەکیان نامێنێت هەتا پاداشتیان بداتەوە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە.[2] وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێت:(ئەگەر دنیا بە ئەندازەی کێشی باڵی مێشوولەیەك نرخی ببووایە لای خودا هیچ خوانەناسیك لە دنیا جارێك ئاوی لێ نەدەخواردەوە)[3]. بەغەوی ڕیوایەتی کردووە.[4] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ ڕۆژی دوایش خوای گەورە دایناوە بۆ ئەوانەی لە خودای خۆیان دەترسن، واتە: تەنها بۆ ئەوانەو کەس نابێتە هاوبەشیان. بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك چووە لای لەو حاڵەی کە بووی بە دەست خێزانەکانیەوە لەسەر حەسیرێك بوو کە جێگای خەتی حەسیرەکە لە جەستەیدا دیاربوو دەیبینی و گریاو چاوەکانی ئاوی پیا هاتەخوارەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوە ژیانی کیسراو قەیسەرە کە تێیدان و تۆش هەڵبژاردەی بەندەکانی خودای ئەمە ژیانتە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) پاڵی دابووەوە دانیشت و فەرمووی:(ئاخۆ تۆ گومانت هەیە ئەی کوڕی خەتاب؟) پاشان فەرمووی:(ئەوانە خەڵکێك بوون خۆشگوزەرانیەکەیان بۆ پێشخراوە لە ژیانی دنیادا).[5] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:(ئایا ڕازی نابن کە دنیا بۆ ئەوان بێت و ڕۆژی دواییش بۆ ئێمە بێت؟).[6] وەهەروەها لە هەردوو سەحیحەکەداو لە شوێنی تریشدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(لە دەفری زێڕو زیودا مەخۆنەوەو لە تەشتی زێڕو زیویشدا خواردن مەخۆن چونکە ئەوە

[1] الطبري(٢١/٦٠١/٦٠٢).

[2] مسلم(٤/٢١٦٢).

[3] الترمذي(٦/٦١١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] البغوي(٤/١٣٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسلم(٢/١١٣).

[6] مسلم(٢/١١٠).

لە دنیا بۆئەوانەو لە ڕۆژی دوایشدا بۆ ئێمەیە).[1] بۆیە خوای گەورە سەرپشكو ئازادی كردوون لە دنیا لەبەر سووكیو بێنرخی دنیا وەك تیرمیزیو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان كردووە لە ڕێگای ئەبو حازمەوە لە سەهلی كوڕی سەعدەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر دنیا بە قورسایی باڵی مێشوولەیەك بەهاو نرخی ببوایە لە لای خودا هەرگیز خودا قومێك ئاوی بە بێدین نەدەدا). تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەكی چاكو ڕاستە(حسن صحيح).

﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ
أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن
يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن
كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم
مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ
تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾﴾

**شەیتان هاودەمی ئەو كەسانەیە كە حەز لە یادی خودا ناكەن**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾ هەر كەسێك لە ئاست یادی خودا حەز دەكات كوێرایی دابێت هەمدەمێكی شەیتانی لێ پەیدا دەكەین. ﴿وَمَن يَعْشُ﴾ هەر كەسێك چاو بقوچێنێتو خۆی بێ ئاگا بكاتو لادات لە یادیو كوێرایی داهاتبێت، واتە: نەتوانێت باش سەیر بكاتو چاوی كز بێت مەبەست لێرەدا كوێرایی داهاتنی دڵە، ﴿نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴾ واتە: هاوەڵێكی شەیتانی بۆ ئامادە دەكەین. وەك ئەم ئایەتە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ﴾[2] واتە: وە هەر كەسێك دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) بكات پاش ئەوەی كە ڕێبازی ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوەو شوێنی ڕێگایەكی تر بكەوێت بێجگە لە ڕێگای خوا. وەك ئەم ئایەتەش: ﴿وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُوا۟ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾[3] واتە: وە چەند دۆستو هاودەممان لە دنیادا بۆ داناون كە

---

[1] فتح الباري(٩/٤٦٥)، مسلم(٣/١٦٣٧).
[2] النساء(١١٥).
[3] فصلت(٢٥).

خراپەکردنی دنیاو(بیباوەڕی) ڕۆژی دوایی بۆ ڕازاندنەوە. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾ ئیتر ئەو هاودەمانە لە ڕێگە هەڵەیان دەکەن، لاشیان وایە ڕاستەڕێیان دیوەتەوە. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴾ تا ئەو کاتەی دێنە لامان، دەڵێت: خۆزگە مەودای نێوان منو ئەو بە قەد نێوان خۆرهەڵاتو خۆرنشین لە یەکتر دوور بووایە، چەند هاودەمێکی نالەبار بووی. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا ﴾ واتە: ئەو کەسەی کە خۆی گێل کردو ڕاستەڕێی نەگرت هاودەمێکی بۆ پەیدا دەکەین کە سەری لێ بشێوێنێتو گومڕای بکاتو بەرەو ڕێگای جەهەنەم بیبات. کاتێک خوای گەورە هەقی خۆی دایە لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر قەڵسو نارەحەتە لەو شەیتانەی کە هاودەمیەتی، ﴿قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴾ دەڵێت: خۆزگە نێوانی منو تۆ بە ئەندازەی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا بووایە چەند هاودەمێکی خراپ بووی، هەندێکیان وایان خوێندووەتەوە: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا ﴾ واتە: ئەو کەسەو هاودەمەکەی. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾ ئیتر ئەمڕۆ(ئەم قسانە) دادتان نادات، چونکە ئێوە غەدرتان لە خۆتان کردووە دەشێت گشتتان پێکەوە جەزرەبە بدرێن. واتە: کۆبوونەوەتان لەناو ئاگرداو قسەکردنتان هیچ سوودێکی نیەو جەزرەبەدانیشتان بە یەکەوە بارتان سوک ناکات.

**کەسێك لە سکی دایکیدا چارەڕەش بووبێت ڕێ دەرناکات**

خوای خاوەن دەسەڵات دەفەرموویت: ﴿أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِي ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ ئاخۆ دەتەوێت گوێ کپان لێت ببیستن؟ یاخود کوێرانو ئەوانەی ئاشکرا لە گومڕاییدان شارەزای ڕاستەڕێ بکەی؟ واتە: تۆ دەتەوێت ئەوانەی کەڕو کوێرو گومڕان بە ئاشکرا شارەزای ڕێی ڕاست بکەی ئەوە کاری تۆ نیە تۆ تەنها گەیاندنت لەسەرە شارەزاکردنی ئەوان لەسەر تۆ نیە. خودا مەیلی لە هەر کەسێك بێت شارەزای دەکاتو مەیلیشی لە هەر کەسێك بێت گومڕای دەکات هەر خۆی دادوەری ڕێكو ڕاستە لەوەدا.

**تۆڵەی خودا لە دوژمنانی پێغەمبەر( ﷺ ) دێتەدی**

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴾ ئەگەر تۆ لەم ناوە لابەین، ئێمە دیارە تۆڵەیان لێ دەکەینەوە. واتە: بێگومان تۆڵە لەوانە دەسێنینو سزایان دەدەین ئەگەر تۆ ڕۆیشتی. ﴿ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴾ یان ئەو شتەی بەڵێنمان بەوانە

داوە. وا دەکەین بۆ خۆت ببینی. ئێمە باشیان لەسەر زاڵین. واتە: ئێمە توانای ئەوەیش و ئەمەیشمان هەیە، بۆیە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی(ﷺ) نامرێنێت هەتا چاوی ڕوون دەکاتەوە بە لەناوچوونی دوژمنەکانی و دادوەری دەکات لە نێوانیانداو لەو سامانەی کە پشتیان پێ قایم کردووە ئەمە مانای قسەی سودیە و ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە.[1]

## هاندان بۆ دەستگرتن بە قورئانەوە

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ لەسەر ئەوەی بە تۆ ڕاگەیەنراوە پێ دابگرە. تۆ لەسەر ڕێگەی ڕاستی. واتە: دەست بگرە بەو قورئانەی کە دابەزیوەتە سەر دڵت هەر ئەو ڕاستەو یاریدەدەرە بۆ ڕۆیشتن لەسەر ڕێی ڕاست و دەبێتە هۆی چوونە ناو باغاتی خۆش و خێری تەواوو بەردەوام. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ﴾ ئەم قورئانە بۆ تۆش و بۆ هۆزەکەشت دەبێتە هۆی بیرەوەری و لە پاشانیش دەربارەی ئەمە، لێت دەپرسن. وتراوە: ئەم قورئانە ڕێزلێنانێکە بۆ خۆت و هۆزەکەت، ئەمە قسەی ئیبو عەباس و موجاهیدو قەتادەو سودی و ئیبنو زەیدە.[2] واتە: ئەمە ڕێزێکە بۆیان چونکە لەسەر زمانی ئەوان هاتووەتەخوارەوە. لەبەر ئەوەی ئەوان لە هەموو کەس زیاتر بە فەرمانەکانی هەڵسن و جێبەجێی بکەن. وەك چۆن چاکترین و پاکترین و باڵفتەترین کەسیان لەو کۆچەریانەی کە لە پێشەوە هاتن و موسڵمان بوون و ئەو کەسانەیش کە وەك ئەوان بوون و شوێنی ئەوان کەوتن و پێی هەڵسن و بەجێیان هێنا. وە وتراویشە: ﴿وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ﴾ واتە: بیرەوەریەکە بۆ تۆش و بۆ هۆزەکەشت. باسکردنی ئەمان بە تایبەتی مانای ئەوە نیە کەسی ترو هۆزی تر ناگرێتەوە. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾[3] واتە: سوێند بە خوا ناردوومانەتە خوارەوە کتێبێك بۆتێوە کە سەربەرزی و ناوبانگی ئێوەی تێیدایە دەی ئایا بۆ بیرناکەنەوە. وە ئەم ئایەتەش کەدەفەرموێت: ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ﴾[4] واتە: خزم و کەسە زۆر نزیکەکانت بترسێنە. ﴿وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ﴾ واتە: لە پاشان پرسیارتان لێ دەکرێت لە بارەی ئەم قورئانەوە کە ئێوە چۆن بوون لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانیداو چۆن چوون بە دەمیەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ

---

[1] الطبري(٢١/٦٠٩).

[2] الطبري(٢١/٦١٠/٦١١).

[3] الانبياء(١٠).

[4] الشعراء(٢١٤).

أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ﴾ لەو پێغەمبەرانەش بپرسە کە بەر لە تۆ ناردراون: ئاخۆ ئێمە بڕیارمان داوە(غەیری خودا) هیچ شتی تر بپەرستڕێت؟ واتە: هەموو پێغەمبەران بانگیان بۆ ئەوە کردووە کە تۆ بانگی بۆ دەکەی کە خوا بپەرستن بە تەنهاو هاوەڵی بۆ دانەنێن‌و داوایان کردووە لە خەڵکی کە بت‌و شتانی تریش نەکەنەهاوەڵی خوداو بیپەرستن. وەك ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[1] واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل‌و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەمەی تەنها خوا بپەرستن‌و دووركەونەوە لە(پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر. موجاهید دەڵێت: لە خوێندنەوەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوددا هاتووە(ڕەزای خوای لێ بێت):(واسأل الذين أرسلنا إليهم قبلك من رسلنا).[2] هەر بەم شێوەیە قەتادەو زەححاك‌و سودی گێڕاویانەتەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت).[3] ئەم ڕیوایەتە وەك تەفسیر وایە نەك قورئان خوێندن والله أعلم.

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَاۖ وَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُواْ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهۡتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾﴾

**موسا(سەلامی خوای لێ بێت) ڕەوانەکراوە بۆ لای فیرعەون‌و دارودەستەکەی کە بانگیان بکات بۆ پەرستنی خوا بەتاکو تەنهایی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ موساشمان لەگەڵ نیشانەکانمان هەنارده لای فیرعەون‌و پیاوە کاربەدەستەکانی، وتی: من لە ڕاهێنەری گشت دنیاوە نێردراوم. خوای گەورە باسی بەندەو پێغەمبەری خۆی موسامان بۆ دەکات(سەلامی خوای لێ بێت) کاتێك ڕەوانەی کرد بۆ لای فیرعەون‌و وەزیرە کاربەدەستەکانی لە گەورە پیاوان‌و خەڵکی ئەو ناوچەو هەرێمە لە قیبتی‌و نەوەی ئیسرائیل داوای لێکردن کە تەنها خودا بپەرستن‌و هاوەڵی بۆ دانەنێن داوای لێ کردن غەیری خودا هیچ کەس نەپەرستن. وە چەند نیشانەی

---

[1] النحل(٣٦).

[2] الطبري(٢١/٦١١).

[3] الطبري(٢١/٦١١/٦١٢).

گەورەشی لەگەڵ نارد وەك دەستیو گاچۆنەكەی. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ ﴾ كاتێك نیشانەكانی ئێمەی نیشان دان، لە پڕ هەموو لە تریقەی پێكەنینیان دا. پاشان چەند نیشانەی تریشمان لەگەڵ نارد لە لافاوو كوللەو ئەسپێو بۆقو خوێن، ماڵو كشتوكاڵو بەروبوومان كەم كردنەوە لەگەڵ ئەم هەموو بەڵگانەدا دەمار زلیان نواندو شوێنی نەكەوتنو ملیان نەداو گاڵتەیان پێ دەهاتو پێكەنینیان دەهات بەو شتانەی كە بۆی هێنابوون. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَاۖ وَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾ هەر نیشانەیەكی خۆمان نیشانی ئەوان دەدا، لە نیشانەكانی پێشەوە گرنگتر بوو، تووشی ئازاریشمان كردن، بەشكو بگەڕێنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەو گومراییو سەرلێ شێواویو نەفامیو دێوانەیە وازیان نەدەهێنا. هەر كاتێك نیشانەیەك لەو نیشانانەیان بۆ بهاتایە دەچوون بۆ لای موساو دەپاڕانەوە لێی لەسەرخۆو بە هێواشی قسەیان لەگەڵ دەكرد دەیانوت: ئەی جادوگەر، ﴿يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ﴾ واتە: ئەی زانا، ئەمە قسەی ئیبنو جەریرە.[1] چونكە زانایانی ئەو زەمانە بریتی بوو لە جادووگەر. جادوگەریش لە لای ئەوان لەو كاتەدا پیشەیەكی ناشیرین نەبوو. كاتێك ئەو قسەیان دەوت مەبەستیان كەم سەیركردن نەبوو چونكە ئەو حاڵەی ئەوانە تێیدا دەژیان زۆر ناخۆش بوو پێویست بوو داوا لە موسا بكەن(سەلامی خوای لێ بێت) ئەم بە كەم سەیركردنەیش لەوێدا جێگای خۆی نیە. بەڵكو ئەو قسەیە بە بڕوای خۆیان مەبەستیان ڕێزلێنان بووە. هەموو جارێك دەهاتن بۆ لای موسا(سەلامی خوای لێ بێت) بەڵێنیان پێ دەدا ئەگەر ئەو شتەیان لەسەر لابەرێت باوەڕی پێ دەهێننو نەوەی ئیسرائیلی لەگەڵ دەنێرن هەموو جارێكیش ئەو پەیمانەیان دەشكاند كە دەیاندا. ئەمە وەك ئەوە وایە كە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ١٣٣ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٣٤ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴾[2] واتە: ئەوسا ئێمەش ناردمانە سەریان لافاوو كولەو ئەسپێو جۆرەها بۆقو خوێن كە چەند بەڵگەو موعجیزەیەكی ڕوون بوون كەچی خۆیان بە گەورە زانی(لەوەی كە بڕوا بهێنن) بێگومان ئەوانە گەلێكی تاوانبار بوون، كاتێكیش ئەو سزاو بەڵایان بەسەرداهات وتیان: ئەی موسا لە

[1] الطبري(٢١/٦١٥).

[2] الاعراف(١٣٣ـ١٣٥).

پەروەردگارت بپاڕێرەوە بۆمان وەك بەڵێنی بە تۆ داوە سوێند بێت ئەگەر ئەم بەڵاو سزایەمان لەسەر لابەرێت بێگومان باوەڕت پێ دێنین‌و نەوەی ئیسرائیلت لەگەڵدا دەنێرین، بەڵام کاتێك سزاکەمان لەسەریان لابرد تا گەیشتنە ماوەی دیاریکراو(بۆ تیاچوونیان) دەستبەجێ پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوە. لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴾ وتیان: ئەی کاکی جادووگەر لە پەروەرندەت بخوازە. ئەو پەیمانەی بە تۆی داوە پێکی بێنێت، ئەوسا باوەڕت پێ دێنین. وە دەفەرمووێت: ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾ لە پاش ئەوەی بەلامان لەسەر لابردن، ئەوان پەیمان شکێنیان کرد.

﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ
﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَـٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ
ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ
ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَـٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ ﴿٥٦﴾﴾

**قسەکردنی فیرعەون بۆ گەل‌و ژێردەستەکانی‌و تۆڵەسەندنی خودا لێی**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ فیرعەون بۆ ژێردەستەکانی جاڕی کێشاو وتی: کەسەکانم ئاخۆ هەموو زەوی میسرو ئەو چۆمانەی بە بەر مندا فرکەیانە موڵکی من نین؟ ئێوە خۆتان نەتاندیوە؟ خوای گەورە باسی فیرعەون‌و یاخی بوونی‌و ڕکی‌و بێ دینی‌و سەرسەختی دەکات کە گەلەکەی کۆکردووەتەوەو شانازی بە سامان‌و موڵکی میسرو دەسەڵاتی خۆیەوە دەکات لەبەر چاویان‌و ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ﴾ قەتادە دەڵێت: باغات‌و ڕووباری زۆریان هەبوو.[1] ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ واتە: بە چاوی خۆتان ئەم هەموو موڵك‌و سامان‌و دەسەڵاتەی من نابینن. واتە: موساو شوێنکەوتووەکانی هەژارو لاوازو بێ دەسەڵاتن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ﴾[2] واتە: ئینجا(جادوگەرانی) کۆکردەوەو بانگی کردن‌و وتی: من پەروەردگاری هەرە گەورەتانم،

---

[1] الطبري(٢١/٦١٦).

[2] النازعات(٢٣ـ٢٥).

ئینجا خوا گرفتاری کرد بە سزای هەردوو جیهان. خودای هێژا دەفەرموویت: ﴿أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ من چاکتر نیم لەو کابرایە کە هیچ ڕێزێکی نیە باش نازانێ قسەش بە ڕەوانی بکات. سودی دەڵێت: فیرعەون دەڵێت: بەڵکو من چاکترم لەو کەسەی کە هیچ نموونێکی جوانی پێوە دیار نیە.[1] هەندێ لە زانایانی زمانی عەرەبی بەسرە(نحاة البصرة) دەڵێن: ﴿أَمۡ﴾ لێرەدا بە مانای (بل) هاتووە.[2] ئەم قسە دەبێتە پشتگیری ئەو قسەی فەڕاء کە گێڕاویەتیەوە لە هەندێ لەو قورئان خوێنانەی ئەم ئایەتەیان خوێندووەتەوە: ﴿أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ﴾.[3] ئیبنو جەریر دەڵێت: ئەگەر ئەگەر ئەم خوێندنەوەیە ڕاست بێت ئەوا ماناکەی ڕاستو ڕوونە. بەڵام جیاوازی نێوان قورئان خوێنەکان لە شارەکاندا ئەوە بوو کە ﴿أَمۡ﴾یان بە مانای ئیستیفهام خوێندووەتەوە لەم ئایەتەدا.[4] منیش دەڵێم: بە هەموو مانایەك ئەم قسەی فیرعەونە لەعنەتی خوای لێ بێت مەبەستی ئەوەبووە کە ئەو چاکترە لە موسا(سەلامی خوای لێ بێت) کە لەو قەسەیەیدا درۆی کردووە درۆیەکی دیارو ئاشکرا هەی نەفرەتی خوای لێ بێت بە بەردەوامی هەتا ڕۆژی قیامەت. مەبەستی فیرعەون بە وتەی ﴿مَهِينٞ﴾ واتە: بێ بایەخ وەك سوفیان وتوویەتی. قەتادەو سودی دەڵێن: واتە: جیاوازو(بێ دەسەڵات) ئیبنو جەریر دەڵێت: واتە: نە خاوەن مولکەو نە خاوەن دەسەڵاتو سامان. ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ واتە: ناتوانێت بە ڕەوانی قسە بکات لاڵەو زمانی ناتەواوە. ئەمە قسەی فیرعەونە کە دەڵێت: ﴿مَهِينٞ﴾ واتە: موسا هیچ نموونێکی نیە. درۆیەکی ئاشکرایە بەڵکو خۆی بەدفەساڵو نموونو بەدخوو بێ دینەو موسا خاوەن بنەماڵەو شەریفو ڕاستگۆو پیاوی باشو لەسەر ڕاستیە. هەمیسان فیرعەون دەڵێت: وەك خودا دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾ئەم قسەش هەر درۆیە. هەرچەندە لە کاتی منداڵیدا ئەو سکڵەی(جمرة) کەمێك لە زمانی سوتاند بەڵام موسا داوای لە خودا کرد کە زمانی بکاتەوەو ڕەوانی بکات بۆ ئەوەی لە قسەکانی تێبگەن خوای گەورەیش داواکەی وەرگرت فەرمووی: ﴿قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ﴾[5] واتە: بە ڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا ئەی موسا. واتە: هەرچی تۆ ویستت پێ درا.

---

[1] الطبري(٢١/٦١٦).

[2] الطبري(٢١/٦١٨).

[3] الطبري(٢١/٦١٨).

[4] الطبري(٢١/٦١٨).

[5] طه(٣٦).

واتە: هەندێ لە پاشماوەی ئەو سوتانە لە قسەکردنی موسادا مایەوە موسا داوای ئەوەی لە خودا نەکردووە کە نەمێنێت وەك حەسەنی بەسری دەڵێت: بەڵکو داوای کردووە لە خوا کە زمانی وەها لێ بکات کە خەڵکی ئاگادار بکاتو تێیان بگەیەنێت. ئەو شتانەی کە خودا دەیکاتو دەیدات بەسەر بەندەکانیدا هیچ شورەییو خراپ نیەو بەندە هیچ دەسەلاتێکی تێیدا نیە. فیرعەون چاك ئەوەی دەزانیو تێ دەگەیشت بەڵام مەبەستی ئەوە بوو کە ژێردەستەو شوێنکەوتووەکانی ئەوانەی کە بێ ئاگاو نەزان بوون هەڵخەڵەتێنێتو بڕوای پێ بکەن دەیوت وەك خودا دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ ئەدی بۆچی بازنی زێڕی لە حەواوە بەسەردا فڕێ نەدراوە، یان فریشتە بە گەل لەگەڵی نەهاتوون. ﴿أَسْوِرَةٌ﴾ ئەو شتەیە(بازن) کە دەکرێتە دەست لە خشڵو زێڕ، ئیبنوعەبباسو قەتادەو کەسانی تریش وتوویانە[1]. ﴿أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ﴾ یان فریشتە بە کۆمەڵ لەگەڵی نەهاتوون لە دەوری بنو شایەتی بۆ بدەن. فیرعەون تەنها سەیری ڕواڵەتو شێوازی دەرەوەی کردووە. لە شتە مەعنەویە نادیارەکان ئاگادار نەبووەو تێنەگەیشتووە کە لە شتە ئاشکراکان ڕوونترە کە دەیبینی ئەگەر ئارەزووی ببوایە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴾ سا بەم قسانە گەلەکەی هەڵخەڵەتانو ئەوانیش گوێڕایەڵیان کرد بێگومان ئەوان هەمیشە گەلێکی لە سنوور دەرچوو بوون. واتە: زانی ژێردەستەکانی تێنەگەیشتوون بانگی کردن بۆ گومڕایی ئەوانیش هەموو بە گوێیان کرد، ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ﴾ ئەوان گەلێکی لەڕێ لادەر بوون. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ کە هەر ڕقی ئێمەیان هەستاند، تۆڵەی خۆمان لێ کردنەوەو سەرلەبەرمان بە خنکان دان. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: ﴿ءَاسَفُونَا﴾ واتە: کاتێك ڕقی ئێمەیان هەستاند.[2] زەححاك دەڵێت: تووڕەیان کردین. ئیبنو عەباسو موجاهدیو عیکریمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزیو(کعب القرظي) قەتادەو سودیو زۆرێکی تر لە موفەسیرەکان هەر وایان وتووە.[3] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عوقبەی کوڕی عامرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] الطبري(٢١/٦١٩).

[2] الطبري(٢١/٦٢٢).

[3] الطبري(٢١/٦٢٢)، الدر المنثور(٧/٣٨٣).

فەرموویەتی:(کاتێك بینیت خوای گەورە بەندە چی ویست خودا پێی دا ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر بێ گوێیی خودا. ئەوە مۆڵەتدانێکە لە خوداوە بۆ ئەو کەسە). پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾.[1] لە تاریقی(طارق) کوڕی شەهابەوە دەڵێت:لە لای عەبدوڵلا بووم(ڕەزای خوای لێ بێت) باسی مردنی کتوپڕی لە لا کرا وتی: سوك کردنێکە لەسەر خاوەن باوەڕو نەهامەتیو بەدبەختیە لەسەر خوانەناس، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا انتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾.[2] عومەری کوڕی عەبدولعەزیز(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: وا دەبینم تۆڵەی خودا لەگەڵ بێ ئاگایدایە واتە: وەك ئەم ئایەتەی کە خودا دەفەرمووێت: ﴿فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴾ کارێکمان کرد ببنە چیرۆك بۆ ئەوانەی لە دوایی دێن. ئەبو مجلەز(مجلز) دەڵێت: ببنە چیرۆك بۆ ئەو کەسانەی کە کاری وەك ئەوان دەکەن.[3] ئەبو میجلەزو موجاهید دەڵێن: ﴿وَمَثَلًا ﴾ واتە: پەندو ئامۆژگاریە بۆ دوای ئەوان.[4] هەر خودا خۆشی دەزانێتو ڕاستی فەرمووە هەموو شتێکیش دەچێتەوە لای ئەو.

﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾﴾

**پێکەنینی قورەیش بە عیسای کوڕی مەریەمو پلەی عیسا( سەلامی خوای لێبێت ) لەلای خودا**

خوای گەورە باسی ڕۆچوونی قورەیشیەکان دەکات لە بێ دنیاو وەبە ئاوەزو دژایەتیان دەکردو شەڕیان دەفرۆشت بە پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵەکانیو دەفەرمووێت: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا

---

[1] أحمد(١٤٥/٤)، باختلاف يسير، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[2] الدر المنثور(٣٨٤/٧).

[3] القرطبي(١٠٢/١٦).

[4] الطبري(٦٢٤/٢١)، القرطبي(١٠٢/١٦).

قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴾ ئەو كاتەش كە بەسەرهاتی كوڕی مەریەم هاتە گۆڕێ هۆزەكەی تۆ لە خۆشیان كردیان بە هەرا. چەند كەس لە ئیبنو عەباس و(ڕەزای خوایان لێ بێت) موجاهیدو عیكریمەو سودیو زەحاكەوە باسیان كردووە كە وتوویانە: واتە: پێكەنینو سەریان سوڕما بەو قسەیە.[1] قەتادە دەڵێت: پێیان ناخۆش بوو پێكەنینیان دەهات.[2] ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێت: ناڕەزایی دەردەبڕن.[3] هۆكەیشی ئەوە بوو وەك موحەممەدی كوڕی ئیسحاق باسی كردووە لە سیرەتەكەیداو وتوویەتی: وەك پێم گەیشتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژێك لە مزگەوتدا دانیشتبوو لەگەڵ وەلیدی كوڕی موغیرەدا نەزری كوڕی حارس(نضر بن حارث) هاتو لایان دانیشت. خەڵكێكی زۆر لە پیاوانی قورەیش لەوێ بوون. پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەی دەكرد نەزری كوڕی حارس دژی دەوەستاو وەڵامی دەدایەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەی لەگەڵدا كرد هەتا دەم كوتی كردو بێدەنگ بوو پاشان ئەم ئایەتەی بەسەر ئەوو قورەیشیەكاندا خوێندەوە: ﴿إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَارِدُونَ﴾[4] واتە: بە ڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەتانپەرستن جگە لە خودا(دەبنە) سوتەمەنیو هەڵگیرسێنەری دۆزەخ ئێوە(و ئەوان) دەچنە ناویەوە. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵساو عەبدوڵڵای كوڕی زیبەعری تەمیمی(الزِّبَعْري التَّميمي) هاتو دانیشت. وەلیدی كوڕی موغیرە پێی وت: بە خودا نەزری كوڕی حارس لەبەر كوڕی عەبدولموتەلیب(عبدالمطلب) هەڵنەساو دانەنیشت. موحەممەد دەڵێت: ئێمەو ئەوەی دەیپەرستین لە خوداكانمان دەبینە سوتەمەنی جەهەنەم. عەبدوڵڵای كوڕی زیبەعری وتی: سا بە خوا بمدیایە دژی دەوەستامو وەڵامم دەدایەوە پرسیار بكەن لە موحەممەد. ئاخۆ هەرچی دەپەرسترێت بێجگە لە خودا لەگەڵ ئەوەی دەیپەرسترێت لە جەهەنمدایە. خۆ ئێمە فریشتەكان دەپەرستین جوولەكەیش عوزەیر دەپەرستنو گاوریش عیسای مەسیح دەپەرستن. وەلیدو ئەوانەی كە لە مەجلیسەكەدا دانیشتبوون سەریان سوڕماو قسەكەی عەبدوڵڵای كوڕی زیبەعریان پێ خۆش بوو. وایان دەزانی كە عەبدوڵڵای كوڕی زیبەعری بەڵگەكەی بەهێزترەو سەركەوتوو زاڵە. ئەو قسەیە لای پێغەمبەر(ﷺ) باسكرا. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(هەر كەسێك پێی خۆش بێت بپەرسترێت بێجگە لە خودا ئەوە لەگەڵ ئەوە كەسەیە كە دەیپەرستێت. لە ڕاستیدا ئەوان شەیتان دەپەرستنو ئەوانەش كە فەرمانیان پێدەكەن بە پەرستنی شەیتان) خوای گەورە ئەم ئایەتەی

---

[1] القرطبي(١٦/١٠٣).

[2] الطبري(٢١/٦٢٧).

[3] القرطبي(١٦/١٠٣).

[4] الانبياء(٩٨).

نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ﴾[1] واتە: بێگومان ئەوانەی لە لایەن ئێمەوە پێشتر بڕیار دراوە بۆیان بەختەوەری(چاکە هێنانەڕێیان) ئەوانە لە دۆزەخ دوور دەخرێنەوە. واتە ئەو کەسانەی لە پێشوو بڕیارمان دا کە چاکەیان لەگەڵ دەکەین، ئەوان لە دۆزەخ بە دوورن. واتـە: عیـساو عـوزەیرو ئەوانـەیش کـە لەگـەڵ ئـەوان پەرسـتراون لـە زانایـانی گـاورو جوولەکە(الاحبار والرّهبان) کە تەنها خودایان پەرستووەو بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی. پاشان ئەوانەی پاش خۆیان لە خەڵکی گومڕاو سەرلێشێواو کردوویانن بە شەریکی خوداو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ئەوەی کە دەیانوت: کە ئـەوان فریشتەکان دەپەرستن کە کیژی خودان: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ﴾[2] واتـە:(وە بێبـاوەڕان) وتیـان خـوای میهرەبـان منداڵی بۆ خۆی بڕیار داوە(کە فریشتەکانن) پاکو بێگەردە خوا(لەم شتانە) بەڵکو ئەوانە(فریشتە) بەندەی ڕێزگیراوی(خودان).وە ئایەت هاتە خوارەوە لە بارەی عیساوە کە باس دەکرا کە پەرستراوە بێجگە لە خودا. وەلیدو ئەوانەی کە ئامادە بوون ئەو گێچەڵو دەمەقاڵەی عەبدوڵلای کوڕی زیبەعریان پێ چاك بوو. خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ﴾ واتە: ئەو قسەیە دەکەنە بیانوو بۆ ئەوەی دژایەتیت بکەنو ببنە لەمپەر لە ڕێتدا. پاشان خـوای گـەورە باسی عیسای کردووە(سەلامی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ۝٥٩ وَلَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَخۡلُفُونَ ۝٦٠ وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٞ لِّلسَّاعَةِ﴾ واتـــە: یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەو شتانە بوو کە لەسەر دەستی عیسادا(سەلامی خوای لێ بێت) ڕوویدا لە زیندووکردنەوەی مردوو چاککردنەوەی نـەخۆش بەسە کە ببێتە بەڵگە لەسەر هاتنی قیامەت وە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ﴾[3] واتە: کەواتە دەربارەی قیامەت هیچ گومانتان نەبێت ڕاستەو شوێنی من بکەون ئەمە ڕێگای ڕاستە.[4] ئیبنو جەریر باسی کردووە لە ڕیوایەتی عەوفی یەوە لە ئیبنو عەباسەوە کە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ﴾ واتە: قورەیش، کاتێك پێیان وترا: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ

---

[1] الانبياء(١٠١).

[2] الانبياء(٢٦).

[3] الزخرف(٦١).

[4] ابن هشام(١/٣٩٦/٣٩٨)، فەرموودەیەکی موعەزەلە(معضل).

ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەتانپەرستن جگە لە خودا(دەبنە) سوتەمەنیو هەڵگیرسێنەری دۆزەخ ئێوە(و ئەوان) دەچنە ناویەوە. تا كۆتایی ئایەتەكان. قورەیشیەكان دەیانوت بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەی عیسای كوڕی مەریەم چیە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئەو بەندەو پێغەمبەری خودایە). پاشان وتیان: بە خوا تەنها ئەوەی دەوێت كە بیكەین بە خودا وەك چۆن گاورەكان عیسایان كردە خودای خۆیان. خودای مەزنیش فەرمووی: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ﴾[2]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ﴾ وتیان: ئاخۆ ئەوانەی پەرستوومانن لەو چاكتر نین؟ ئەمەیان هەر بۆ كێچەڵێك هێنایە پێش، چونكە ئەمانە كۆمەڵێكن شەڕ دەفرۆشن. قەتادە دەڵێت: واتە: خواكانی ئێمە لەو چاكترن. قەتادە دەڵێت: ئیبنو مەسعود ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە كە قورەیشیەكان وتوویانە: ئاخۆ خواكانی ئێمە چاكتر نیە لەمە؟ مەبەستیان موحەممەد(ﷺ).خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا﴾ واتە: بۆ قسە دروستكردن ئەم باسەیان هێناوەتە پێش، خۆشیان چاك دەزانن ئەم ئایەتە هیچ پەیوەندیەكی بەو قسانەی ئەوانەوە نیە، چونكە ئەم ئایەتە بۆ بێ ئاوەزە وەك ئەم ئایەتە وایە كە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾[3] واتە: بە ڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەتانپەرستن جگە لە خودا دەبنە سوتەمەنی دۆزەخ. پاشان ئەم قسەیە لەگەڵ قورەیشیەكان كە ئەوان بتیان دەپەرستو دەیانكردە هاوەڵی خوداو عیسایان نەدەپەرست هەتا بخرێنە ناوی، دیارە قسەكانیان تەنها كێچەڵ نانەوە بووە خۆشیان بڕوایان بەو قسەیە نەبووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو ئومامە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ گەلێك گومڕا نەبووە دوای شارەزابوون لەسەر ئەو ڕێگای كە لەسەری بوون مەگین دەستیان داوەتە كێچەڵ نانەوە). پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ﴾.[4] تیرمیزیو ئیبنو ماجەو ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان كردووە پاشان تیرمیزی دەڵێت: چاكو ڕاستە(حسن صحيح)، ئاگامان لێی نیە مەگین لەو فەرموودەی ئەبو ئومامەوە

---

[1] الانبياء(٩٨).

[2] الطبري(٢١/٦٢٥).

[3] الانبياء(٩٨).

[4] احمد(٥/٢٥٦)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

نەبێت.[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەو هیچ نەبوو عەبدێك نەبێت، ئێمە چاكەمان لەگەڵ كردو كردمان بە نموونەیەك بۆ وەچەو بەرەی ئیسرائیل. واتە: عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) تەنها بەندەیەك بووە لە بەندەكانی خوداو چاكەمان لەگەڵ كردووە كردوومانە بە پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت)، ﴿وَجَعَلْنَاهُ مَثَلًا لِبَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ واتە: كردمان بە نموونەو نیشانەو بەڵگە لەسەر توانای خۆمان بۆ هەر شتێك مەیلمان لێ بێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنْكُمْ مَلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾ خۆ ئەگەر مەیلمان لێ بووایە، چەند فریشتەیەكمان لە ئێوە وەدی دەهێناو دەمانكردن بە جێنشین لەسەر زەمین. ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَا مِنْكُمْ﴾ واتە: ئەگەر حەزمان بكردایە لە جێی ئێوە. ﴿مَلَائِكَةً فِي الْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾ سودی دەڵێت: بە فریشتەكان دروستمان دەكردن لەسەر زەمیندا.[2] قەتادەو ئیبنو عەباس دەڵێن: دەمانكردنە جێنشینی یەكتری وەك چۆن ئێوەمان كردووە بە جێنشینی یەكتری.[3] ئەم قسەیە تەواوكەری قسەی یەكەمە. موجاهید دەڵێت: سەر زەمینمان ئاوەدان دەكردەوە وەك ئێوە.[4] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَاتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ ئەو یەكێكە لە نیشانەكانی قیامەت. شكت لە هاتنی نەبێتو پەیڕەوی هەر لە من بكەن، ئەمە ڕێگەیەكی ڕاستە. قسەی ڕاست ئەوەیە مەبەست بەوە هاتنەخوارەوەی عیسای كوڕی مەریەمە (سەلامی خوایان لێ بێت) پێش هاتنی قیامەت. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾[5] واتە: وە هیچ كەسێك نیە لە نامەدارەكان مەگەر بڕوای پێ دێنێت (بە عیسا) پێش مردنیو لە ڕۆژی دوایشدا عیسا دەبێت بە شایەت بەسەریانەوە. ئەو خوێندنەوەی تره پشتگیری ئەم مانایە دەكات: ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ﴾ واتە: نیشانەو بەڵگەیە لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت. موجاهید دەڵێت: ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ﴾ واتە: نیشانە بۆ هاتنی ڕۆژی قیامەت. هاتنی عیسای كوڕی مەریەم(سەلامی

---

[1] تحفة الأحوذي(٩/١٣٠)، ابن ماجه(١/١٩)، الطبري(٢١/٦٢٩)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[2] الطبري(٢١/٦٣١).

[3] الطبري(٢١/٦٣٠).

[4] الطبري(٢١/٦٣٠).

[5] النساء(١٥٩).

خوای لێ بێت) پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت.[١] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەو ئیبنو عەباس‌و ئەبول عالیەو ئەبو مالك‌و عیکریمەو حەسەن‌و قەتادەو زەحجاك و کەسانی تریشەوە.[٢] فەرموودەکە گەیشتووەتە پلەی تەواتر لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە هەواڵی داوە بە هاتنەخوارەوەی عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) پێش ڕۆژی قیامەت کە پێشەوایەکی دادپەروەرو ناوبژیوانێکی ڕاست وێژە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا﴾ واتە: گومانتان لە هاتنی نەبێت ئەوە هەر ڕوودەدات، ﴿وَاتَّبِعُونِ﴾ پەیڕەوی هەر لە من بکەن لەوەی کە بۆتان باس دەکەم، ﴿هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ ئەمە ڕێگەیەکی ڕاستە. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ الشَّيْطَانُ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ شەیتانیش ڕێگاتان لێ نەگرێت، ئەو ئاشکرا دوژمنتانە. واتە: شەیتان دەبێتە لەمپەر لە ڕێتانداو نامێڵێت شوێنی هەق بکەون. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَ عِيسَىٰ بِالْبَيِّنَاتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِالْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ ئەوساش عیسا بە چەند بەڵگەی دیاری دەرەوە هاتبوو، وتی: من وا ڕێگەو شوێنی کارزانیم بۆ هێناون، تا بڕێکیش لەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە لەسەری کێشەتانە. سا لە خوا ترستان هەبێت‌و شوێنی من بکەون. ﴿بِالْحِكْمَةِ﴾ واتە: بە پێغەمبەریەتی. ﴿الَّذِي تَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ ئیبنو جەریر دەڵێت: لەو شتانەی کە پەیوەندی بە کاروباری ئاینەوەیە نەك ئەو شتانەی کە پەیوەندن بە کاروباری دنیاوە.[٣] ئەمەی کە ئیبنو جەریر دەڵێت: قسەیەکی جوان‌و چاکە. ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ واتە: لە خوا بترسن لەوەی کە فەرمانتان پێ دەکات. ﴿وَأَطِيعُونِ﴾ شوێنی من بکەون لەوەی کە بۆم هێناون. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ پەروەردگاری من‌و ئێوە هەر خودایە، بیپەرستن ئەمە ڕێگەیەکی ڕاستە. واتە: من‌و ئێوەش بەندەی خوداین‌و پێویستیمان بەو هەیەو هەموومان هاوبەشین لە پەرستنیدا کە بە تەنها بیپەرستین‌و هاوەڵی بۆ دانەنێین، ﴿هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ واتە: ئەوەی کە من پێی هاتووم‌و بۆم هێناون ڕێگەیەکی ڕاستە، کە پەرستنی خودایە بە تاك‌و تەنها. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾ جا کۆمەڵان

---

[١] الطبري(٢١/٦٣٢).

[٢] الطبري(٢١/٦٣٢)، القرطبي(١٦/١٠٦).

[٣] الطبري(٢١/٦٣٥).

کێشەیان لەناو پەیدا بوو، بۆ ئەوانەی غەدرێ دەکەن واوەیلایە لە ئازاری ڕۆژێکی تووش. واتە: کۆمەڵەکان کەوتنە کێشە لەناو یەکداو بوونە چەند دەستەیەك، هەندێکیان دەیوت: بەندەو پێغەمبەری خودایەو ڕاست دەکات، هەندێکی تر دەیانوت: کوڕی خودایەو هەندێکی تریشیان دەیانوت: عیسا(سەلامی خوای لێ بێت) خۆی خودایە. خوای گەورە زۆر مەزنە و دوورە لەو قسانە کە ئەوانە دەیکەن بۆیە خوای بێ هاوتا فەرموویەتی: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾.

﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَا عِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾﴾

**لە ناکاو ڕۆژی قیامەت دێت و ناکۆکی دەکەوێتە نێوان دۆستانی دنیا لە خوانەناسان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ ئاخۆ غەیری ڕۆژی قیامەت چاوەڕوانی چی تر دەکەن، کە لە پڕ لێتان ڕوودەدات و پێش نازانن؟ واتە: ئاخۆ ئەو کەسانەی کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوەو باوەڕیان بە پێغەمبەرەکان نەکردووە غەیری هاتنی ڕۆژی قیامەت بە تەمای چین، ﴿إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ کە گومانی تێدا نیە دێت و ڕوودەدات و ئاگایان لێی نیەو خۆیان بۆ ئامادە نەکردووە. کاتێك دێت ئەوان هەستی پێ ناکەن. ئا لەو کاتەدا زۆر پەشیمان دەبنەوە کە پەشیمانی لەو کاتەدا هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت و ڕزگاریان ناکات. وە دەفەرموێت: ﴿ الْأَخِلَّاءُ يَوْمَئِذٍ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا الْمُتَّقِينَ ﴾ ئەو ڕۆژە یاران هەموو دەبنە نەیاری یەکتری، جا مەگین خۆپارێزەکان. واتە: هەموو برایەتی و دۆستایەتیەك کە لەبەر خودا نەبووبێت لە ڕۆژی قیامەتدا دەگۆڕێت دەبێتە دوژمنایەتی بەڵام ئەو برایەتی و دۆستایەتیەی کە لەبەر خودا بووبێت هەر دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێت. ئەمە وەك ئەوەیە کە ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێت) بە هۆزەکەی وت: ﴿إِنَّمَا اتَّخَذْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ أَوْثَانًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن

نَّـٰصِرِينَ ﴾[1] واتە: بێگومان ئەوەی ئێوە هەڵتانبژاردووە لە جیاتی خودا بتانێکن لەبەر خۆشەویستی نێوانتان لە ژیانی دنیادا(دەیانپەرستن) لە پاشان لە ڕۆژی دوایدا هەندێکتان بێزاری دەردەبڕن لە هەندێکی ترتان(دان نانێن بە یەکتریدا) وە نەفرین لە یەکتری دەکەن جێگاشتان ئاگری دۆزەخەو هیچ یارمەتیدەرێکیشتان نیە.

## دڵخۆشی لەخواترسان لە ڕۆژی قیامەتدا و چوونە ناو بەهەشتیان

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَـٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ ئەی ئەوانەی کە هەر خۆمتان پەرستووە ئەو ڕۆژە نە ترسێکتان لەسەر هەیەو نە خەم دەخۆن. پاشان مژدەی پێداونو فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە نیشانەکانی ئێمەو هەر بەرفەرمانی خۆمان بوون. واتە: ئەوانەی لەناو دڵیانەوە بڕوایان هێناوەو بە کرداریش پابەندن بە شەرعی خوداوە. موعتەمیری کوڕی سولەیمان دەڵێت: لە باوکیەوە: کاتێك ڕۆژی قیامەت دێتو خەڵکی زیندوودەکرێنەوە هیچ کەسێك نیە مەگین ڕادەچڵەکێت و دەترسێت، بانگکەرێك بانگ دەکات: ﴿ يَـٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ بەندەکانم! کەستان ترستان نەبێت و خەفەتیش مەخۆن، لەوێدا هەموو خەڵك ئومێدیان بۆدروست ئەبێت پاشان لە دوایدا ئەوترێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾ ئەو بەندانەی کە بڕوایان بەبەڵگەکانی ئێمەهەبووە و تەسلیمی بوون، دەڵێت: لەوێدا هەموو خەڵکی بێ ئومێد دەبن غەیری خاوەن باوەڕان.[2] ﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴾ بچنە بەهەشت کە ئێوەو هاوسەرانتان خۆش ڕابوێرن. واتە: پێیان دەوترێت بڕۆنە بەهەشت، ﴿أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ ﴾ خۆتانو ئەوانەیش وەك ئێوەن، ﴿تُحْبَرُونَ ﴾ واتە: خۆش دەبەنە سەرو دڵخۆش دەبن، لە سورەتی(الروم)دا لە پێشەوە تەفسیر کراوە، ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ۖ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾ بە سینی و پەرداخی زێڕین لە دەوریاندا دێنو دەچن. هەرچی دڵ ئارەزووی دەکاتو چاو لەزەتی لێ دەبینێت، تێیدا هەیەو ئێوەش لەوێدا نامرن. واتە: چاکترینو بەنرخترین سینیو دەفری زێڕین کە خواردنی لەسەر دەخورێت، ﴿وَأَكْوَابٍ ﴾ واتە: پەرداخی لە زێڕ کە لوتی نیەو بێ عەیبە، ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ ﴾ وە هەندێك

---

[1] العنكبوت(٢٥).

[2] الطبري(٢١/٦٣٩).

لەزانایان وا خوێندوویانەتەوە: ﴿تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ﴾، ﴿وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ﴾ واتە: ئەوەی چاو لەزەتی لێ دەبینێت لە خواردنی چاکو بۆنی خۆشو وێنەی جوان. ﴿وَأَنتُمْ فِيهَا﴾ واتە: لەناو بەهەشتدا، ﴿خَٰلِدُونَ﴾ واتە: دەرناچن لێیو ناتانەوێت بچنە شوێنێکی تر. پاشان بۆ ڕێزلێنان پێیان دەوترێت: ﴿وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەمە هەر ئەو بەهەشتەیە کە بە هۆی کردەوەکانتان وا بۆ ئێوە ماوەتەوە. واتە: کردەوە چاکەکانتان بووە هۆی ئەوەی کە بەر بەزەیی خودا بکەون. چونکە هیچ کەسێك کردەوەکانی نایباتە بەهەشت. بەڵکو بە سۆزو بەزەیی خودا دەچنە بەهەشت. بەڵام پلەکانی بەهەشت جیاوازیان هەیە بە پێی کردارە چاکەکان وەردەگیرێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ میوەی زۆری تێدا هەیەو بۆ ئێوەیەو لێیان دەخۆن. واتە: هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە بە ئارەزووی خۆتان هەڵی دەبژێرن. کاتێك خوای گەورە کە باسی خواردنو خواردنەوەی کردووە دوای ئەوە باسی میوەشی کردووە بۆ ئەوەی بەهرەکەی زیاتر تەواوتر بێت.

﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ
كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ
يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾﴾

### پاشەڕۆی خراپی تاوانباران

کاتێك خوای گەورە باسی ژیانی بەختەوەرانی کرد دێتە سەر باسی بەدبەختانو تاوانبارانو دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾ تاوانبارانیش هەتا سەر لە ئازاری جەهەنەم دانو دەرناچن. ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ هەرگیز وچانیان پێ نادرێتو هەر لەوێدا بە نائومێدی داماون. ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ﴾هیچ مۆڵەتێکیان پێ نادرێت با بۆ کاتژمێرێکیش بێت. ﴿وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ﴾ نائومێدن لە هەموو چاکەیەك لەگەڵیان بکرێت. ﴿وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هیچ غەدرێکیان لێ نەکردن بەڵام خۆیان غەدریان لە خۆیان کرد. واتە: ناهەقیان لە خۆیان کرد بە هۆی ئەو کردەوە خراپانەی خۆیانەوە پاش ئەو هەموو بەڵگەو نیشانانەی کە بۆیان هاتو ناردنی پێغەمبەران بۆیان کە باوەڕیان نەکرد پێیانو بە گوێیان نەکردن. بۆیە خوای گەورە سزای دان لەسەر ئەو کارە خراپەیانو

خودا ناهەقی ناکات لەگەڵ بەندەکانی خۆی. ﴿وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ﴾ هانا دەبەن بۆ گزیری جەهەنەم: داوا بکە پەروەردگارت ئەم ژینە چەرمەسەرەمان بۆ نەهێڵێت. دەڵێت: ئێوەهەر لێرە دەمێنن. ﴿وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ﴾ کە کاربەدەستی ئاگرە. بوخاری دەڵێت: حەجاجی کوڕی مینهال بۆی گێڕاینەوە سوفیانی کوڕی عویەینە بۆی گێڕاینەوە لە عەمری کوڕی عەتاوە لە سەفوانی کوڕی یەعلاوە(یَعلى) ئەویش لە باوکیەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر مینبەر ﴿وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ﴾ی دەخوێند.[1] واتە: ئەم ژیانەمان نەهێڵێ‌و گیانمان بکێشی هەتا ڕزگارمان ببێت لەم حاڵە. ئەمانە وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾[2] واتە: بڕیاری مردن نادرێت بەسەریاندا تا بمرن هەروەها هەندێ لە سزای(دۆزەخ)یان لێ سوك ناکرێت. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيَتَجَنَّبُهَا ٱلْأَشْقَى ﴿١١﴾ ٱلَّذِى يَصْلَى ٱلنَّارَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ﴾[3] واتە: وە ئەوەی زۆر خراپیش بێت خۆی لێ دوور دەخاتەوە، ئەوەی دەچێتە ناو ئاگری هەرە گەورەوە، لە پاشان نە دەمرێت تیایدا(تا ڕزگاری بێت) وە نە دەژی(تێیدا بە ئاسایی). کاتێك کە داوایان کرد کە بمرن‌و نەمێنن مالك وەڵامی دانەوە: ﴿قَالَ إِنَّكُم مَّـٰكِثُونَ﴾ وتی: ئێوە دەمێنن‌و نامرن‌و دەرناچن‌و هیچ دەرەتانێکتان نیە بۆی بڕۆن. پاشان باسی هۆی بەدبەختیان دەکات کە لە ڕێی ڕاست لایان داوەو دژایەتیان کردووە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ جِئْنَـٰكُم بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: ڕاستیمان بۆ هێنان‌و باش بۆمان دەرخستن‌و ڕوونمان کردەوە، ﴿وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ﴾ واتە: بەڵام سروشتی زۆرێك لە ئێوە ئەم ڕاستیەی زۆر پێ ناخۆش بوو ڕووی تێ نەدەکردو نەیدەویست بەڵکو شوێنی پڕوپوچ دەکەوت‌و ڕێزی لێ دەگرت. دەبووە لەمپەر لەڕێی ڕاستداو پشتی تێ دەکردو چاوی بە شوێنکەوتووانی هەقدا نەدەهات. کەوابوو سەرزەنشتی خۆتان بکەن‌و هەر پەشیمانی دەربڕن کە لێرەدا هیچ سوودێکی نیە. ﴿لَقَدْ جِئْنَـٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ﴾ ئێمە ڕاستیمان بۆ هێنان، بەڵام زۆربەی زۆر لە ئێوە ڕاستیتان پێ ناخۆش بوو. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ﴾ ئەگەر ئەوان لەسەر کاری خۆیان

---

[1] فتح الباري(٨/٤٣١).

[2] الفاطر(٣٦).

[3] الأعلى(١١ـ١٣).

سوور بوون، ئەوا ئێمەش لەسەر کاری خۆمان سوورین. موجاهید دەڵێت: دەیانویست کاری خراپ بکەن بە فێڵبازی، ئێمەش کەتنی خۆمان پێ کردن. ئەمە ئەو قسەیە کە موجاهید وتوویەتی.[1] وەك خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾[2] واتە: ئەوان نەخشەو پیلانێکیان دانا بە پیلانێکی خراپ(بۆ کوشتنی صالح) ئێمەش نەخشەمان کێشا(بۆ لەناوبریدنیان) بە نەخشەکێشان لە کاتێکدا ئەوان هەستیان نەدەکرد. چونکە بتپەرستەکان هەمیشە خەریکی کەتن گێڕانو فێڵبازی بوون بۆ وەڵامدانەوەی ڕاستی بە قسەی پڕوپوچو بێ مانا. خوای گەورەیش کەتنەکەی بەتاڵ کردنەوەو ئەو فێڵەیان بە زیان دەگەڕایەوە بۆ خۆیان. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ ئاخۆ ئەوان پێیان وابوو ئێمە نهێنیو سرتەیان لێ نابیسن؟ دەیبیسینو چەندێکیشمان ڕاسپاردوون وان لایانو دەنووسن. واتە: وا دەزانن ئێمە ئاگاداری نهێنیو ئاشکرایان نین. ﴿بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ﴾ واتە: ئێمە دەزانین خەریکی چینو فریشتەکانیش هەر دەزانن هەرچی دەکەن لە گەورەو بچووك هەمووی دەنووسن.

﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾
فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ
الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ
خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِ يَا رَبِّ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ ۚ
فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾﴾

### خودا فەرزندی نییە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾ بلێ: ئەگەر خودا فەرزندی بێت، ئەوە من یەکەم کەسم کە دەیپەرستم. ﴿قُلْ﴾ واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)، ﴿إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ الْعَابِدِينَ﴾ واتە: بلێ: ئەگەر واش بێت من هەر یەکەمین کەسم دەیپەرستم. چونکە من عەبدێکم لە عەبدەکانی گوێڕایەڵم بۆ هەموو کارێك کە فەرمانم پێ بکات لوت بەرزیو بێ فەرمانی ناکەم لە

[1] الطبري(٢١/١٤٦).
[2] النمل(٥٠).

پەرستنیدا. خۆ ئەو فەرزندەی هەبێت من هەر دەیپەرستم. بەلام شتی وا بۆ خودا مومكین نیەو نابێتو شەرتیش بە پێویست نەگێراوە بێتەجیّو هەروەها جەوازیش. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّوْ أَرَادَ اللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا لَّاصْطَفَىٰ مِمَّا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ سُبْحَانَهُ ۖ هُوَ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ﴾[1] واتە: ئەگەر خودا بیویستایە منداڵێك بۆ خۆی بڕیار بدات ئەوە لەناو دروستكراوەكانیدا كامەی بویستایە هەڵی دەبژارد پاكو بێگەردە هەر ئەوە خودای تەنهای زاڵو بە دەسەلات. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سُبْحَانَ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾ پەروەرینی ئاسمانانو زەمینو عەرش. هیچ كەمیەكی نیەو بە دوورە لەو تۆمەتانەی ئەوانە بۆی هەڵدەبەستن. واتە: خوای گەورە پاكو بێگەردەو دوورە لە هەموو كەمیەكەوە. وەدیهێنەری هەموو شتەكانە. ئەو خودا مەزنەو كوڕی نیەو تاكو تەنهایەو جێی نیازەو بیّ نیازە لە هەموو شتێك. بیّ وێنەو بیّ هاوتایەو فەرزندیشی نیە. وە دەفەرمووێت: ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا وَيَلْعَبُوا حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ لێیان گەڕیّ با هەر پڕوپوچ بڵێنو خەریكی گاڵتەكردن بن، هەتا تووشی ئەو ڕۆژە دێن كە بەڵێنیان پێدراوە. ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا﴾ واتە: وازیان لیّ بێنە لەو نەفامیو سەرلێشێواویەدا، ﴿وَيَلْعَبُوا﴾ هەرخەریكی گاڵتەكردن بن لە ژیانی دنیایاندا، ﴿حَتَّىٰ يُلَاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذِي يُوعَدُونَ﴾ هەتا تووشی ئەو ڕۆژە دەبن كە ڕۆژی قیامەتە. واتە: بەم زووانە دەزاننو تێدەگەن پاشەڕۆژو ئاكامو ژیانیان لەو ڕۆژەدا چۆن دەبێت.

### باسی تاكو تەنهایی پەروەردگار

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَٰهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ هەر ئەویشە لە ئاسماندا خودایەو لە زەمینیشدا خودایەو هەر ئەویشە لە كاربزانەو زۆر زانایە. واتە: هەر خودایە لە ئاسمانو لەسەر زەمین بەندەكانی دەیپەرستن هەموو خۆ بە كەم دەزاننو ملكەچو زەبوون لەبەر دەستیدا. ﴿وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایە تە وایە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ﴾[2] واتە: وە تەنها ئەو خودایە(باڵادەستو پەرستراوە) لە ئاسمانەكانو لە زەویدا نهێنیو ئاشكراتان دەزانێتو بە هەموو كردەوەیەكیش كە دەیكەن ئاگادارە. واتە: هەر ئەو بانگ كراوە بە خودا(الله) لە ئاسمانانو زەمیندا،

---

[1] الزمر(٤).

[2] الانعام(٣).

﴿وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ پاکیو گەورەیی بۆ کەسێك کە ئاسمانەکانو زەمینو چی لەناو ئەم دووانەدایە، گشتی بۆ ئەوە، ئەو دەزانێت چ کاتێك قیامەت ڕادەبێتو دەتانهێننەوە بۆ لای ئەو. واتە: ئەو وەدیهێنەرو خاوەنی ئاسمانانو زەمینو ئەوەی کە تیایاندایە هەرچی بوێت دەیکات کەس ناتوانێت ببێتە لەمپەرو بەرگریکەرو پاكو بێعەیبەو فەرزندەی نیە. چونکە خودایەکی پایەبەرزو مەزنو خاوەنی هەموو شتێکەو هەموو شتێك بە مەیلی خۆیەتی ببێت یان نەبێت، ﴿وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ﴾ ئەو دەزانێت کەی قیامەت دێت، غەیری ئەو نازانێت، ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ دەتانگێڕێتەوە بۆ لای خۆی. واتە: پاداشتی هەموو کەس بە پێی کردەوەی دەداتەوە چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندنو سزادان.

### بتەکان ناتوانن ببنە تکاکار

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەوشتانەی غەیری خودانو ئەوانە دەیانپەرستن، ناتوانن ببنە تکاکار مەگەر کەسانێك کەبەڕاستیو زانینەوە شایەتی بدەن. ﴿وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ﴾ واتە: ئەو شتانەی غەیری خودان لە بتو دارو بەردو شتی تر، ﴿ٱلشَّفَٰعَةَ﴾ ناتوانن تکایان بۆ بکەن، ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ ئەمە ئیستیسنای مونقەتیعە واتە: بەڵام کەسێك بە ڕاستیو زانینەوە شایەتی بدات،ئەوەئەوکەسەتکاکەی لەلای خودا سودی دەبێت بەئیزنی خۆی.

### دان پیانانی بتپەرستان کە تەنها خودا وەدیهێنەرە

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ ئەگەر لە خۆیان بپرسن، کێ ئەوانی وەدی هێنا دەڵێن: خودا. دەی چۆن لە هەق کەلا دەبن. واتە: ئەگەر پرسیار بکەی لەو بتپەرستانە کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە لەگەڵ خودا دەیپەرستن: ﴿مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ﴾ دان پێدا دەنێن کە خودا وەدی هێنەری هەموو شتەکانە هیچ کەس هاوەڵی نەبووە لە دروستکردنیاندا. کەچی غەیری خودا دەپەرستن لەگەڵ خودا کە هیچیان بە دەست نیەو توانای هیچ شتێکیشیان نیە. ئەوانە زۆر نەفامو کەم ئاوەزو بێ عەقڵن بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ دەی چۆن لە ڕاستی لا دەدەنو شوێنی ناکەون.

### نزاو پاڕانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە لای خودا

خـوای گـەورە دەفـەرموویّت: ﴿وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ نـزای ئـەویش کـە: ئـەی پەروەرندەی من! ئەمانە دەستە خەڵکێکن ئامادە نین بڕوا بێنن. واتـە: پێغەمبـەر فـەرمووی:(قِيلِهِ) واتە: شکاتیەت کرد لای خودا لە گەلەکەی ئەوانەی کە بڕوایـان پـێ نـەدەکرد فـەرمووی: ئـەی خودایە ئەمانە خەڵکێکن باوەڕ ناهێنن. وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویـەتی: ﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا﴾[1] واتە: وە پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پـەروەردگارم! بـە ڕاسـتی قەومەکەم(قورەیش) ئەم قورئانەیان واز لێ هێناوەو گوێی پێ نادەن. ئەمـەی کـە وتمـان قـسەی ئیبنـو مەسعودو موجاهیدو قەتادەیەو ئیبنو جەریریش هەر بەو شێوەیە تەفسیری کردووە.[2] بوخـاری دەڵێت عەبدوڵلای کوڕی مەسعود- (ڕەزای خوای لێ بێت) ئـەم ئایەتـەی بـەم شـێوەیە خوێندووەتـەوە:(وقـال الرّسـول يـا ربّ).[3] موجاهیـد لـەم ئایەتـەدا: ﴿وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ﴾ دەڵێـت: خـوای گەورە قسەیَ پێغەمبەر ئەگێڕێتەوە[4]. قەتادە دەڵێـت: ئەمـە نـزای پێغەمبـەرە(ﷺ) لـە هۆزەکـەی لای خودا.[5] ﴿فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ﴾ واتە: واز لەو بتپەرستانە بێنە، ﴿وَقُلْ سَلَٰمٌ﴾ واتە: تـۆ وەك ئەوانـە کـە قـسەی خراپت لەگەڵ دەکەن. وەڵامیان مەدەرەوە. گوزەران بکە لەگەڵیان بڵێ ئێستە هیچ ترسێکتان نـەبێت‌و ئەمین بن، ﴿فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ واتە: بەم زووانە دەزانن. ئەمە هەڕەشەیەك بوو لە لایەن خـوداوە بۆیـان. بۆیە خوای گەورە سزای دان‌و ئاییـنی خۆی سەرخست‌و فـەرمانی دا بـە موسڵمانان کـە جیهـاد بکـەن‌و بچن بە گژ دوژمندا هەتا وای لێهات خەڵکی دەستەدەستە دەهاتن موسڵمان دەبوون‌و ئـاییـنی ئیـسلام بڵاوەی کرد بە ڕۆژهەلات‌و ڕۆژئاوادا. والله أعلم.

[1] الفرقان(٣٠).

[2] الطبري(٦٥٦/٢١).

[3] فتح الباري(٤٣١/٨).

[4] الطبري(٦٥٦/٢١).

[5] الطبري(٦٥٦/٢١).

## تەفسیری سورەتی( الدخان )

## لە مەککەدا هاتووەتە خوارەوە

### ڕێزی سورەتی( الدخان )

لە موسنەدی بەزاردا لە ڕیوایەتی ئەبی توفەیلدا عامری کوڕی واسلە و لە زەیدی کوڕی حاریسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە ئیبنو صەیاد: (من شتێکم بۆ لە دڵ گرتووی ئەو شتە چیە؟) پێغەمبەری خودا(ﷺ) سورەتی(الدخان) لێ بەدڵ گرتبوو، ئیبنو صەیاد وتی:(هو الدخ) واتە: ئەوە دووکەڵە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(إخسأ ماشاء الله كان) واتە: چغە! ئەوەی خودا مەیلی لێ بووبێت بووە). پاشان ڕۆیشت[١].

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾﴾

### هاتنەخوارەوەی قورئان لە شەوی قەدردا

خوای گەورە باسی قورئان دەکات کە لە شەوێکی پیرۆزدا ڕەوانەی کردووە کە ئەو شەوەیش، شەوی قەدرە. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ﴾[٢] واتە: بێگومان ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لە شەوی بەفەڕو بەڕێزدا. وە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿حمٓ﴾ حا، میم، ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾ بەم کتێبەی هەموو شت ڕوون دەکاتەوە. ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ لە شەوێکی پڕ لە پیت و پیرۆزیدا ئێمە ناردوومانەتە- خوار ئێمە ویستمان ترس وەبەر مەردم بێنین. وە ئەم هاتنەخوارەوەش لە مانگی ڕەمەزاندا بوو وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ﴾[٣] واتە: مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە. ئەو فەرموودانەی کە لە بارەیەوە هاتبوو باسمان کرد لە سورەتی(البقرة)دا پێویست ناکات

---

[١] الطبري(٥/٨٨).

[٢] القدر(١).

[٣] البقرة(١٨٥).

لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. وە دەفەرموویّت: ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ واتە: مەردممان ئاگاگار کردەوە کە چی بە سوودە بۆیان چیش خراپە بۆیان بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەو نیشانەی خودا لەسەر بەندەکانی. خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾ هەر لەوێشدا هەر کارێکی سەبارەت بە کارزانی لێك جیاکرایەوە. واتە: لە شەوی قەدردا لە(لوح المحفوظ) هەر کارێك کە پەیوەندە بە فەرمانی ئەو ساڵە جیا دەکرێتەوە دەدرێتە ئەو فریشتانەی کە نووسینی ئەو کارانەیان پێ سپێردراوە. لە تەواوبوونی ژیانو بژێویو هەتا دوایی. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عومەرو موجاهیدو ئەبو مالكو زەححاك و کەسانی تریشەوە لە پێشینەکان[1]. ﴿حَكِيمٍ﴾ واتە: زۆر پتەو کە ناگۆڕێتو لانابرێت. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ فەرمانەو لە لایەن ئێمەوەیە ئێمە ڕاسپاردە دەنێرین. واتە: هەرچی دەبێت خودا دەیکاتو ئەوەیشی کەڕەوانەی دەکات بە فەرمانو ئیزنی ئەوەو ئاگای لێییەتی، ﴿إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ﴾ واتە: ئێمە ڕاسپاردە دەنێرین بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی ئایەتەکانی خوا بخوێنێتەوە بۆیان بە ڕوونیو ئاشکرا. چونکە ئەمە زۆر پێویست بوو بۆ مەردم. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ بەزەییەکە لە لایەن پەروەردگارتەوە، هەر خۆی بیسەرو زانایە. ﴿رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ پەروەرێنی ئاسمانەکانو زەمینەو هەرچی لەناویاندایە، ئەگەر باوەڕتان هەیە. واتە: ئەو کەسەی کە قورئانی ناردە خوارەوە. هەر ئەویش پەروەرێنی ئاسمانەکانو زەمینەو وەدیهێنەرو خاوەنیانەو خاوەنی ئەوەیشە کە لەناویاندایە. ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ ئەگەر بەڕاستی بڕواتان هەیە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ لە غەیری ئەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێت، گیان وەبەر بوونەوەر دێنێتو دەشمرێنێت. ئەو ئێوەی پەروەردە کردو پەروەرندەی باوانی پێشینەشتانە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾[2] واتە:(ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ: ئەی خەڵکینە! بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام بۆ ئێوە هەمووتان ئەو(خوایەی) کە تەنها بۆ ئەوە موڵکایەتی هەموو ئاسمانەکانو زەوی و هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو دەژێنێتو دەمرێنێت.

---

[1] الطبري(٢٢/٩).

[2] الاعراف(١٥٨).

﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّى لَهُمُ الذِّكْرَى وَقَدْ جَاءَهُمْ رَسُولٌ مُبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا عَنْهُ وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ ﴿١٦﴾﴾

## ترساندنی بتپەرستان لەو رۆژەی کە ئاسمان دووکەڵێکی لێ پەیدا دەبێت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾ کەچی هێشتا هەر لەناو دوو دڵیدان و گەمە دەکەن. واتە: ئەو بتپەرستانە هەر لە گومان و دوو دڵیدا بوون کاتێك کە ڕاستیان بۆ هات هەر باوەڕیان پێ نەدەکرد پاشان خودای مەزن هەڕەشەیان لێ دەکات و دەیانترسێنێت و دەفەرموێت: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بە ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێ پەیدا دەبێت. مەسروق دەڵێت: ڕۆیشتینە مزگەوت. واتە: مزگەوتی کوفە لە لای دەرگاکانی کیندەوە لەو کاتەدا پیاوێك باسی ئەم ئایەتەی دەکرد بۆ هاوەڵەکانی: ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ دەیوت: دەزانن ئەم دوکەڵە چیە؟ ئەو دوکەڵەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێت کە دەچێتە گوێ و چاوی دووڕووەکانەوە و خاوەن باوەڕانیش تووشی دەبن وەك هەڵامەت. دەڵێت: چوینە لای ئیبنو مەسعودو ئەو باسەمان بۆ گێڕایەوە. پاڵی دابووەوە ڕاچڵەکی و ناڕەحەت بوو پاشان دانیشت و وتی: خوای گەورە فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەتان(ﷺ): ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾[1] واتە:(ئەی موحەممەد (ﷺ)) بڵێ من هیچ کرێ و پاداشتێکم لەسەر گەیاندنی ئەم ئایینە لە ئێوە داوا ناکەم و من لەو کەسانەش نیم کە درۆ هەڵبەستم و زۆر لە خۆم بکەم. واتە: من هیچ پاداشتێکم لە ئێوە ناوێ و لەوانەیش نیم کە درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن. ئەوە لە زانینەوەیە کاتێك پیاوێك شتێك نازانێت بڵێ خودا دەزانێت. ئێستا ئەو باسەتان بۆ دەگێڕمەوە. کاتێك قورەیشیەکان باوەڕیان نەدەهێنا و بە گوێی پێغەمبەریان(ﷺ) نەدەکردو سەرپێچیان دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) دوعای لێ کردن کە قات و قڕی و برسیەتی بێنێت بەسەریاندا وەك ئەو قات و قڕیەی زەمانی یوسف پێغەمبەر(سەلامی خوای لێ بێت) تووشی گرانی و برسیەتی بوون. هەتا وایان لێ هات، مردارەوەبووو ئێسقانیان دەخوارد، لە برساندا وایان لێ هاتبوو سەریان بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان دوکەڵ نەبێت هیچیان نەدەبینی.[2] وە لە

---

[1] ص(٨٦).

[2] مسلم(٤/٢١٥٥).

ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: وایـان لێ هـاتبوو کە کەسێکیان سـەیری ئاسمـانی دەکـرد لـە نێـوان خـۆی‌و ئاسمان وەك دوکەڵ ببینێت وابوو لە برسیەتی‌و ناڕەحەتیدا.[1] خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ۝١٠ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئازارێکی زۆر بە ژانەو هـەموو خـەڵکی دادەپۆشێت. هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای باران بارین بکە لە خودا بۆ موزەڕ ئەوەتا لەناو چوون. پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خـودا کـرد بۆیـان کـە بارانیـان بـۆ ببارێنێت. بارانیان بۆ باری‌و ئـەم ئایەتـە هاتـەخوارەوە: ﴿إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ﴾ ئیبنـو مەسعود(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو جەزرەبـەیان لەسـەر لادەچـێت. ئەوانـەی کە باوەڕیان هێنا. کاتێك کە تووشی خۆشگوزەرانی بوون گەڕانەوە سـەر لاساریەکەی خۆیـان‌و خـوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ﴾[2] ئیبنو مەسعود دەڵێت: پێنج نیشانە تێپەڕیون: دوکەڵ‌و ڕۆژی بەدرو ڕۆم‌و کوشتاری بەدرو لەتبوونی مـانگ، ئـەم فەرموودەیـە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[3] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە لـە موسنەدەکەیدا وە لـە لای تیرمیزی‌و نەسائیش بەو مانایە هێناویانە. ئیبنو جەریر و ئیبنو ئەبی حاتەم لـە چـەند ڕێگـاوە لایانـە.[4] ئیبنو مەسعود هاوڕایە لەگەڵ کۆمەڵێك لـە زانـا پێشینەکان وەك موجاهیـدو ئـەبول عالیـەو ئیبراهیمـی نەخەعی‌و زەححاك و عەتیەی عەوفی کە ئـەو دوکەڵـە ڕابـوردووەو نـەماوە.[5] ئیبنـو جـەریریش هـەمان بۆچوونی هەیە. وە لە فەرموودەی ئەبو سورەیمەوە حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی غەفاریەی(ڕەزای خوای لێ بێـت) دەڵێـت: پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فـەرمووی:(قیامـەت هەڵناسێت هـەتا دە نیـشانە دەبیـنن: دەرکەوتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاواوەو دوکەڵ‌و گیاندارەکەو(الدابة) دەرچوونی یـەئجوج‌و مـەئجوج‌و دەرکـەوتنی عیسای کوڕی مەریەم‌و دەججال‌و سێ ڕۆچوونی زەمین کە ڕۆچوونێکی لـە ڕۆژهـەڵات‌و ڕۆچـوونێکی لـە ڕۆژئاواو ڕۆچوونێکی تـریش لـە نیوەدوورگـەی عـەرەب‌و ئاگرێك کـە دەردەکـەوێت لـەناو یەمـەن کـۆچ دەکات بە خەڵکەکەی کۆیان دەکاتەوە لە هەر شوێنێك بن لەگەڵیانەو بۆ هەر شـوێنێك بـڕۆن لەگـەڵیان دەچـێت). تـەنها موسـلیم لـە سـەحیحەکەیدا هێناویـەتی.[6] وە لـە هـەردوو سەحیحەکەدا هـاتووە کە

---

[1] مسلم(٤/٢١٥٦).

[2] فتح الباري(٨/٤٣٤).

[3] فتح الباري(٨/٤٣٤).

[4] احمد(١/٣٨٠)، تحفة الأحوذي(٩/١٣٣)، النسائي في الكبرى(٦/٤٥٥)، الطبري(٢٢/١٣/١٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] الطبري(٢٢/١٦).

[6] مسلم(٤/٢٢٢٥).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە ئیبنو صەیاد: (من شتێکم بۆ لەدڵ گرتووی) وتی:(هو الدخ) ئەوە دوخە واتە: دوکەڵ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(چغە سا ئیتر بێدەنگ بەو قسە مەکە و لەسەری مەچۆ)، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ): ﴿فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ﴾ی لە دڵ گرتبوو بۆی.[1] ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەمە شتێکی چاوەڕوان کراوە کە ڕوویداوە. ئیبنو صەیادیش لە ڕێگای فاڵگرەکانەوە لەسەر زمانی جنۆکە ئەوەی وەرگرتبوو کە قسە تەواو ناکەن و لێی دەبڕن لەبەر ئەوە ئیبنو سەیاد وتی(ئەوە دوخە) واتە: ئەوە دوکەڵە تا لەوێدی پێغەمبەری خودا(ﷺ) باش ناسی کە مادەیەکی شەیتانیە بۆیە فەرمووی:(إخسأ فلن تعدو قدرتك) واتە: چغە، ئیتر بێدەنگ بەو قسە مەکەو زیاد لەسەری مەڕۆ. فەرموودەی زۆر ڕیوایەت کراوە لە فەرموودەی مەرفوعو مەوقوف لە سەحیحەکانو غەیری ئەوانیشدا کە دڵنیامان دەکاتو بەڵگەی بەهێزیش هەیە کە دوکەڵ لەو نیشانانەیە کە چاوەڕوان دەکرێت، وەك دیارە قورئانیش هەر وا دەفەرموێت، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ﴾ واتە دیارو ئاشکرا دەبێت کە هەموو کەسێك چاوی پێی دەکەوێت. ئەمە وەڵامە بۆ ئەو تەفسیرەی کە ئیبنو مەسعود کردوویەتی کە ئەوە خەڵکانێك بووە کە دوکەڵیان بینیوە لەبەر زۆر ناڕەحەت بوون لە برسانداو هەلاك بوونیان بەو شێوەیان بەسەرهاتووە. خوای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿يَغۡشَى ٱلنَّاسَ﴾ واتە: خەڵکی دادەپۆشێتو داگیریان دەکات. خۆ ئەگەر ئەو ڕوانینە خەیاڵی بووایەو تایبەت بووایە بە بتپەرستەکانی خەڵکی مەککە نەدەوترا: ﴿يَغۡشَى ٱلنَّاسَ﴾، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەمە ئازارێکی زۆر بە ژانە. واتە ئەوەیان پێ دەوترێت بۆ سەرزەنشتو دڵگران کردنیان. وەك ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾[2] واتە: ڕۆژێك پاڵیان پێوە دەنرێت بەرەو ئاگری دۆزەخ چۆن پاڵ پێوەنانێك، (پێیان دەوترێت) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دەزانی. یان بە یەکتر دەڵێن: ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بڕواتان پێ نەدەکرد. پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ﴾ ئەی پەروەردگاری هەموومان ئەو سزایەمان لەسەر لابە، ئێمە باوەڕمان هێنا. واتە: خوانەناسان کاتێك بە چاوی خۆیان ئەو ئازارە بە ژانە دەبینن و دەچنە ناوی داوا دەکەن لە خودا کە لەسەریان لا ببات، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای

---

[1] فتح الباري(٣/٢٥٨)، مسلم(٤/٢٢٤٠).

[2] الطور(١٣ـ١٤).

خاوەن تۆڵە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾[1] واتە: وە ئەگەر بیانبینیت کاتێك کە لەسەر قەراغی دۆزەخ وەستێنراون کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دنیاو بەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانیو لە بڕواداران دەبووین. ئەم ئایەتەش کە خودا دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ ﴾[2] واتە: وە(ئەی موحەممەد (ﷺ)) خەڵکی ئاگادار بکەو بترسێنە لەو ڕۆژەی کە سزایان بۆ دێت ئینجا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان بۆ ماوەیەکی کەم دوامان بخە تا وەڵامی بانگەوازەکەت بدەینەوەو شوێنی پێغەمبەران بکەوین، ئەی ئێوە نەبوون پێشتر سوێندتان خوارد کە هەرگیز لەناو ناچن. وە هەر بەو شێوەیە خوای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴾ کوا ئەوانە گوێ لە ئامۆژگاری دەگرن؟ پێغەمبەرێك هاتە لایان، هەموو شتی تێگەیاندن. ﴿ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ﴾ پاشان ڕوویان لێ وەرگێڕاو وتیان: فێرکراوو شێتە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەوانە چۆن گوێ لە ئامۆژگاری دەگرن. ئێمە پێغەمبەرمان بۆ ناردنو پەیامی ئێمەی بۆ ڕوون کردنەوەو هەڕەشەی لێ کردن ئەگەر بە گوێی نەکەن کەچی پشتیان تێکردو شوێنی نەکەوتنو باوەڕیان پێ نەکردو وتیان فێرکراوەو شێتە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودا دەفەرمووێت: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴾[3] واتە: لەو ڕۆژەدا ئینسان(کردەوەی خۆی) بیر دەکەوێتەوە بەڵام ئەو بیرکەوتنەوەیە چ سودێك بەو دەگەیەنێت. ئەم ئایەتەش کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ فَزِعُواْ فَلَا فَوۡتَ وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانِۢ بَعِيدٖ ﴾[4] واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ))ئەگەر دەبینی کاتێك(بێباوەڕان) زۆر دەترسن ئینجا بە هیچ جۆرێك ڕزگاربوونیان نیەو لە شوێنێکی نزیك(دۆزەخەوە) دەبرێن بۆ ناوی، لەو کاتەدا دەڵێن باوەڕمان هێنا بەو(قورئانە) چۆن(باوەڕیان) دەست دەکەوێت لە شوێنێکی دوورەوە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ﴾ ئێمە تا ماوەیەکی کەم، ئەم سزایە وەلا

---

[1] الانعام(٢٧).

[2] ابراهيم(٤٤).

[3] الفجر(٢٣).

[4] سبأ(٥١_٥٢).

دەنێین، ئێوە دەگەڕێنەوە سەر ڕێی پێشووتان. واتە: ئەگەر ئەو سزاتان لەسەر لابەینو بتانبەینەوە بۆ سەر دنیا، دەگەڕێنەوە سەر ڕێی پێشووتانو دەست دەکەنەوە بە بێ دینیو باوەڕ نەهێنان. وە ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾[١] واتە: وە ئەگەر ڕەحم بەوان (بتپەرستانی قورەیش) بکەینو ئەو ناخۆشی و بەلایەی لەسەریان بوو لاییەینو هەڵیگرین(کە بریتی بوو لە برسێتی بۆ ماوەی حەوت ساڵ) (نەك بیر ناکەنەوە)، بەڵکو بێگومان لە سەرکەشی خۆیان ڕۆدەچنو بە سەرگەردانی دەمێننەوە. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموویت: ﴿وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾[٢] واتە: وە ئەگەر بگەڕێنرێنەوە(بۆ دنیا) بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغەکرابوو وە بە ڕاستی ئەوانە درۆزنن.

**مانای هەڵمەتە گەورەکە(البطشة الكبرى)**

خوای گەورەدەفەرموویت: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ إِنَّا مُنتَقِمُونَ﴾ ئەو ڕۆژە هەڵمەتە گەورەکە دەکەین، ئێمە تۆڵە دەکەینەوە. ئیبنو مەسعود مانای ﴿الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ﴾ی بە ڕۆژی بەدر تەفسیر کردووە.[٣] ئەمە قسەی کۆمەڵێك زانایشە کە لەسەر ڕاکەی ئیبنو مەسعودن لەسەر ئەو تەفسیرە کە بۆ(الدخان) کردی لە پێشەوە. هەمیسان ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە لە ڕیوایەتی عەوفیەوە لە ئیبنو مەسعودەوە.[٤] وە لە ئوبەی کوڕی کەعبیشەوە[٥]. کە هەڵیش دەگرێت وابێ. بەڵام ڕوونترو دیارتر ئەوەیە کە هەڵمەتە گەورەکە ڕۆژی قیامەتە، هەرچەندە ڕۆژی (بەدر)یش ڕۆژی هەڵمەتە گەورەکەیە. ئیبنو جەریر دەڵێت: یەعقوب بۆی گێڕاوەتەوە، ئیبنو عولەییە بۆی گێڕاوەتەوە کە خالیدی حەزاء بۆی گێڕاینەوە لە عیکریمەوە دەڵێت: ئیبنو عەباس دەڵێت: ئیبنو مەسعود دەڵێت: ﴿الْبَطْشَةَ الْكُبْرَىٰ﴾ ڕۆژی بەدرەو منیش دەڵێم: ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەتە. ئەمە سەنەدەکانی ڕاستە لە ئیبنو عەباسەوە. حەسەنی بەسریو عیکریمەیش هەر وا دەڵێن لە ڕاستترین ئەو ڕیوایەتانە لە ئیبنو عەباسەوە، والله أعلم.

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَن لَّا تَعْلُوا عَلَى اللَّهِ إِنِّي آتِيكُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي

---

[١] المؤمنون(٧٥).

[٢] الانعام(٢٨).

[٣] الطبري(٢٢/٢٢).

[٤] الطبري(٢٢/٢٢).

[٥] الطبري(٢٢/٢٣).

فَٱعۡتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ مُّجۡرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسۡرِ بِعِبَادِي لَيۡلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ
رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا
فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾
وَلَقَدۡ نَجَّيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرۡعَوۡنَۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيٗا مِّنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ
ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٞاْ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾﴾

**باسی موساو فیرعەون و ڕزگاربوونی تۆرمەی ئیسرائیل**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ فَتَنَّا قَبۡلَهُمۡ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَ وَجَآءَهُمۡ رَسُولٞ كَرِيمٌ﴾ ئێمە هۆزی فیرعەونیشمان بەر لەمان تاقی کردەوەو پێغەمبەرێکی بەڕێزمان هاتە لایان. واتە: پێش ئەم بتپەرستانە ئێمە هۆزی فیرعەونمان تاقی کردەوە کە قیبتیەکان بوون لە میسر، ﴿وَجَآءَهُمۡ رَسُولٞ كَرِيمٌ﴾ پێغەمبەرێکی بەڕێزمان هاتە لایان کە موسا بوو(سەلامی خوای لێ بێت). وە دەفەرمووێت: ﴿أَنۡ أَدُّوٓاْ إِلَيَّ عِبَادَ ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ﴾ بەندەکانی خودا بە من بسپێرن، من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی جێ باوەڕم. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡۖ قَدۡ جِئۡنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلۡهُدَىٰٓ﴾[1] واتە: وە نەوەی ئیسرائیل بەرەلا بکە(با بێن) لەگەڵ ئێمەداو ئازارو سزایان مەدە بە ڕاستی ئێمە لە لایەن پەروەردگارتەوە بەڵگەو موعجیزەمان بۆ هێناوی سڵاویش لەسەر کەسێك بێت کە شوێن ڕێگای ڕاستی دەکەوێت. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ﴾ من پێغەمبەرێکم لەوەی بۆتان باس دەکەم جێی متمانەم. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَن لَّا تَعۡلُواْ عَلَى ٱللَّهِۖ إِنِّيٓ ءَاتِيكُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾ لە بەرامبەر خودا خۆتان بە زلتر مەبینن، من بۆ ئێوە نیشانەیەکی ئاشکرام. واتە: خۆتان بە گەورەتر مەزانن لە بەرامبەر ئایەتەکانی خوداو باوەڕهێنان بە بەڵگە ئاشکراکانی. وەك لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئەوانەی خۆ بەزل دەزانن کە بمپەرستن لەمەوپاش بەسەرشۆڕی دەچنە دۆزەخەوە. ﴿إِنِّيٓ ءَاتِيكُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾ واتە: بە

---

[1] طه(٤٧).

[2] الغافر(٦٠).

نیشانەی دیارو ئاشکرا کە خوای گەورە ناردوویەتی. وە دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ﴾ من بە پەروەردێنی خۆمو ئێوە پەنا دەبەم لەوە بمکوژن. ئیبنو عەباسو ئەبو سالح دەڵێن: لێدان بە زمان کە قسە پێ وتنو جوێن دانە.[1] قەتادە دەڵێت: لێدانو بەردباران کردنە. واتە: پەنا دەبەم بەو خودایەی کە منو ئێوەی دروست کردووە کە بە خراپە لەگەڵم مامەڵە بکەن بە قسە یان بە کردار.[2] ﴿وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي فَاعْتَزِلُونِ﴾ ئەگەر باوەڕیشم پێ ناکەن، خۆتانم لێ دوور بخەنەوە. واتە: پەلامارم مەدەنو وازم لێ بێنن با ئێمەو ئێوە ئاشتی بکەین تا خودای گەورە بڕیارێکمان بۆ دەدات. کاتێك کە موسا ماوەیەکی زۆر لەناویاندا مایەوەو زۆر لە نیشانەکانی خودای نیشان دان لە باتی ئەوەی باوەڕ بێنن زیاتر بەرەو بێدینیو لاساری دەڕۆیشتن. بۆیە موسا داوای کرد لە خودا کە سزایان بدات وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا﴾[3] واتە: وە موسا وتی: ئەی پەروەردگارمان! بە ڕاستی تۆ بەخشیوتە بە فیرعەونو کۆمەڵەکەی هۆکاری ڕازانەوەو جوانیوماڵو سامانی زۆر لە ژیانی دنیادا، ئەی پەروەردگارمان! بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا بکەن لە ڕێگای تۆ ئەی پەروەردگارمان! لە ناویان بەرەو مەهێڵە ماڵو سامانیان دڵەکانیان ڕەش بکات چونکە بڕوا ناهێنن هەتا دەبینن سزای ئازاردەر،(خوای گەورە) فەرمووی بێگومان داوای هەردووکتان وەرگیرا جا خۆڕاگرو بەردەوام بن(لەسەر ئاینی خودا). هەر بەم شێوەیەش خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنَّ هَٰؤُلَاءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ﴾ دواجار هانای بۆ پەروەردگاری خۆی هێنا. کە ئەوانە کۆمەڵێکی تاوانبارن. ئا لەو کاتەدا خودا فەرمانی دا بە موسا کە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل لەناو ئەوا تا دەرچنو بڕۆن. هیچ پرسو ڕایەك بە فیرعەون نەکەنو گوێی پێ نەدەن. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾ سا تۆ لەگەڵ ئەم عەبدانەی من بە شەو بڕۆ چونکە ئەوان بە دواتان دەکەون. وەك خودا لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا

---

[1] الطبري(٢٢/٢٦).

[2] الطبري(٢٢/٢٧).

[3] يونس(٨٨-٨٩).

تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ ﴾[1] واتە: بە ڕاستی نیگامان نارد بۆ موسا کە بەندەکانم بە شەو ببە(و لە میصر دەرچن) ڕێگەیەکی وشکیان لە دەریادا(ئاوی نیل)دا بۆ بکەرەوە مەترسە(فیرعەون) پێت بگاتو مەترسە(لە خنکان لە دەریادا). وە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴾ بە ئارامی لە دەریاکە بپەڕەوە، کە ئەو لەشکرە خنکان. چونکە کاتێك موسا(سەلامی خوای لێ بێت) لە دەریاکە پەڕیەوە لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل. موسا ویستی بە گاچۆنەکەی بکێشێت بە دەریاکەدا تا وەك خۆی لێ بێتەوە. بۆ ئەوەی ببێتە ڕێگر لە نێوان ئەوانو فیرعەوندا هەتا نەتوانن بگەن پێیان. خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە وازی لێ بێنێت وەك خۆی چۆنە بمێنێتەوە. مژدەی بە موسا دا کە ئەو لەشکرە لەو دەریادا خنکاون. نە نیگەران بەو نە بترسە. ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: ﴿ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ ﴾ واتە: وازی لێ بێنە چۆن وەستاوە با وابێت.[2] موجاهید دەڵێت: ڕێیەکی وشكو برنگیان بۆ ڕەچاو بکە. واتە فەرمان مەدە ئاوەکە بچێتەوە شوێنی خۆی. وازی لێ بێنە هەتا هەموو دێنە ناوی.[3] عیکریمەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو زەححاکو قەتادەو ئیبنو زەیدو کەعبی ئەحبارو سەماکی کوڕی حەربو کەسانی تریش هەر وایان وتووە.[4] پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾ گەلێك کانیو باغاتیان لێ بەجێ مان. واتە: باغو باغات و ڕووبارو چاوانەی زۆریان بەجێ هێشت. ﴿ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴾ فرە کێلگەو کۆشكو سەرسەرای بەنرخیش. واتە: زۆر زەمینی کشتوکاڵیو کۆشكو تەلاری چاکیان بەجێ هێشت. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: ﴿وَمَقَامٖ كَرِيمٖ﴾ واتە: دوانگەکان(شوێنی بەرز بۆ قسەکردن).[5] ﴿وَنَعۡمَةٖ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴾ خێروبێرێکیش کە تێیدا لەوپەڕی خۆشیدا دەژیان. واتە: ژیانێك کە زۆر خۆش بوو تێیدا دەژیان بە ئارەزووی خۆیان حەزیان لە هەر خواردنێك بکردایەو هەر جلوبەرگێکی جوان لەبەریان دەکرد لەگەڵ ئەو هەموو سامانو دەسەڵاتەی کە لە وڵاتدا بوویان. هەمووی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە دەستیان داو دنیایان بەجێ هێشتو بەرەو جەهەنەم بەڕێکەوتن کە چ جێگاو پاشەڕۆژێکی خراپە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴾ ئا بەم جۆرە دامان بە گەلێکی دیکە. واتە: دامان بە

---

[1] طه(٧٧).

[2] الدر المنثور(٧/٤١٠).

[3] الطبري(٢٢/٣٠).

[4] الطبري(٢٢/٣٠).

[5] الطبري(٢٢/٣٢).

نـەوەی ئیـسرائیل. وە دەفـەرمووێت: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾ نـە ئاسمـان شینی بۆ گێڕان، نە زەمینیش، هەر مۆڵەتیشیان پـێ نـەدرا. واتـە: کردەوەی چاکیشیان نـەبوو هـەتا بەرەو ئاسمان بـەرز بێتـەوەو تـا دلگران بێـت بـۆ نـەمانیان‌و بۆیـان بگری لەسـەر زەمینیـشدا پارچـە زەمینێك نەبوو کە خواپەرستی تێدا بکەن هەتا زەمینیش شینیان بۆ بکات. بۆیە شایەنی ئەوە نـەبوون کە مۆڵەت بدرێن لەبەر بێدینی‌و لاساری‌و ملهوڕیان. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لـە سـەعیدی کـوڕی جوبەیرەوە دەڵێت: پیاوێك هاتە لای ئیبنو عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: ئـەی ئـەبو عـەباس ئـەم ئایەتـەت بینیـوە کـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾ ئاخۆ ئاسمان‌و زەمین بۆ کـەس دەگرین؟ ئیبنـو عـەباس وتـی: بـەڵێ. هـیچ دروسـتکراوێك نیـە مـەگین دەرگایـەکی لـە ئاسمانـدا هەیـە لـەو دەرگـاوە ڕۆزی بـۆ دادەبـەزێت‌و کردەوەکانیـشی لـەو دەرگـاوە سـەردەکەوێت. کاتێـك خـاوەن بـاوەڕ دەمرێـت دەرگاکـەی دادەخرێـت(دەگیرێـت) لـەو ئاسمانـەی کـە کردەوەکانی لێ سەردەکەوت‌و ڕۆزی لێوە دادەبەزی. کاتێك کە دەمرێت‌و لـە دەسـتی دەچـێت دەگـری بۆی. وە کاتێك شوێنی نوێژەکەی لەسەر زەمیندا چۆڵ دەبێت‌و جێی دەهێڵێت کە نوێژی تیـا دەکـردو یادی خودای تیا دەکرد بۆی دەگری. هۆزی فیرعـەونیش هـیچ پاشماوەیـەکی چـاکیان لەسـەر زەمینـدا نەبووە‌و هیچ چاکەیەکیشیان بەرز نەبووەتەوە بۆ لای خودا. نە ئاسمان بۆیـان دەگـری‌و نـە زەمینـیش شـینیان بـۆ دەکـات.[1] عـەوفی ڕیوایـەتی کـردووە لـە ئیبنـو عەباسـەوە بـەم شـێوەیە.[2] خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ تـۆرەمـەی ئیسرائیلیـشمان لـەو ئـازاری پـڕ سووکایەتی ڕزگار کرد. ﴿مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ لە فیرعـەونێك کـە خـۆی زۆر بـە زل دەزانی‌و لەوانە بوو کە لە ئەندازە دەردەچن. خوای گەورە منەت دەکات بەسەر تۆرمەی ئیسرائیلدا کە ڕزگاری کردن لەو داماوی‌و سەرشۆڕیەی تێیدا دەژیان بە دەست فیرعەونەوە‌و کردبوونی بە خزمەتکارو هەموو کارێکی گرانی پـێ دەکردن بە سوك سـەیری دەکـردن. وە دەفـەرمووێت: ﴿مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾ واتە: خۆی زۆر بـە زل‌و خـاوەن هێـزو دەسـەلات دەزانی. وەك ئـەم ئایەتـەی کـە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾[3] واتـە: بەڕاسـتی فیرعـەون بـەرزو زاڵ بـوو لـە

---

[1] الطبري(٢٢/٣٤).

[2] الطبري(٢٢/٣٥).

[3] القصص(٤).

زەوی(میصر)دا. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا عَالِينَ﴾[1] واتە: بەلام خۆیان بە گەورە دانا(باوەڕیان نەهێنا)و ئەوان گەلێکی دەسەلاتدار بوون بەسەر خەلکیادا. واتە: لەوانە بوو کە لە ئەندازە دەردەچن. واتە: لە ئەندازە دەردەچوو لە فەرماندانیدا. ئەوەندە خراپ بوو بۆ خۆشی نەدەژیا. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەوانیشمان لە چاو هەموو خەلکی دنیادا بەڕێزتر گرت. موجاهید دەلێت: ﴿وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واتە: ئەوانمان هەلبژارد لەناو هەموو خەلکیدا. قەتادە دەلێت: هەلبژێردران بەسەر خەلکی ئەو زەمانەی خۆیاندا. وە وتراوە: بۆ هەموو چەرخێك زانایەك(هەلبژاردەیەك) هەیە. وەك ئەم ئایەتە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّى ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾[2] واتە:(پەروەردگار) فەرمووی: ئەی موسا بێگومان من تۆم هەلبژاردووە بەسەر هەموو خەلکیدا. واتە: لە خەلکی ئەو زەمانە(چەرخە) ئەمە وەك ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێت لە بارەی مەریەمەوە(سەلامی خوای لێ بێت): ﴿وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[3] واتە: وەرێزی دایت بەسەر هەموو ژنانی جیهاندا. واتە: لە زەمانی خۆیدا. خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) یان بەڕێزترە لەو یان وەك ئەو وایە لە ڕێزدا. هەروەها ئاسیەی کچی موزاحم خێزانی فیرعەون. وە ڕێزی عائیشە لەسەر ژنانی تر وەك ڕێزی گۆشتاو وایە لەسەر خواردنەکانی تر. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ﴾ هێندەشمان نیشانە دانێ، کە ئاشکرا، ببن بە مایەی ئەزموون. واتە: بەلگەی زۆرو چەندین موعجیزەی گەورە، ﴿مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ﴾ واتە: تاقیکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بوو بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێگای پێ دەرکردووە.

﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ (٣٤) إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ (٣٥) فَأْتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ (٣٦) أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَٰهُمْ إِنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ (٣٧)﴾

**وەلامدانەوەی ئەو کەسانە کە بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ﴾ وا ئێستا ئەمانە دەلێن. ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ﴾ هەر بۆ یەکەمجار کە دەمرین، تازە زیندوو نابینەوە. خوای گەورە وەلامی

---

[1] المؤمنون(٤٦).

[2] الاعراف(١٤٤).

[3] ال عمران(٤٢).

بتپەرستان دەداتەوە کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە نەبووە وتوویانە: ژیان تـەنها ژیـانی دنیایەو پاش مردن ژیانێکی تر نیەو خەڵکی نـە زینـدوو دەکرێتـەوەو نـە کۆدەکرێتـەوە، بەڵگـەیش بـە باب و باپیرانیان دێننەوە کە لـە پـێش ئەوانـەوە مـردوون و ڕۆیـشتوون و نەگەڕاونەتـەوە.ئـەڵێن: ئەگـەر زیندووبوونەوە ڕاستە. ﴿ فَأْتُواْ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەگـەر بـە ڕاسـتیتانە باوانـەکانمان بـۆ بێـنن. ئەمـە بەڵگـەیـەکی پڕوپـوچ و گومـانێکی خـراپ بـوو، چـونکە زیندووبوونـەوەو کۆبوونـەوە لـە ڕۆژی قیامەتدایە نەوەك لە ژیانی دنیا بەڵکو پاش نەمانی دنیاو تێکچوونی و کـاولبوونی دێـت. پاشـان خـوای گەورە جارێکی ترو بە شێوەیەکی تـازە خـەڵکی دروسـت دەکاتـەوە. ناهـەقکرەکان بـەرەو جەهەنـەم دەبرێن و دەبنە سوتەمەنی جەهەنـەم. ڕۆژێکە دەبنـە شـایەت بەسـەر خەڵکیـەوە. پێغەمبـەریش(ﷺ) دەبێتە شایەت بەسەر ئەوانەوە(بەسەر ئومەتەکەیەوە) پاشان خوای گـەورە هەڕەشـە لـەو بتپەرسـتانە دەکات و دەیانترسێنێت لە تۆڵەی خۆی ئەو تۆڵەیەی کە گەڕانەوەی نیە وەك چۆن سزای ئـەو گەلانـەی دا کە وەك ئەوان بوون و باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نەبوو وەك هۆزی توببەع کە لە سەبەء بوون کە لەو کاتەدا خودا قڕی کردن و وڵاتەکەی کاول کردن بە هەموو لایەکدا بڵاوەیان کردو تەفروتونا بوون. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَهُمۡ خَيۡرٌ أَمۡ قَوۡمُ تُبَّعٖ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ﴾ئـاخۆ ئەمانـە باشترن یاخود گەلی توببەع و پێشینەکانیان؟ کـە قڕمـان تێخـستوون، چـونکە تاوانبـار بـوون. وەك لـە پێشەوە لە سورەتی(سبأ)دا هاتووە کە خوانەناسەکان نکوڵی یان لە زیندووبوونەوە کردووە بۆیە خودا لێرەدا بە نموونەی ئەمانە وەك ئەو هۆزی توببەعە باسی دەکات و دێنێتـەوە چـونکە هـۆزی توببـەع لـە عەرەبە قەحتانیەکان بوون و ئەمانیش لە عەرەبی عەدنانیەکانن. حومەیر سەبەئە. هـەر کاتێك کەسـێك بووبێت بە کاربەدەستیان بە توببەع ناویان بردووە. وەك بە پاشای فـارس وتـراوە کیـسراو بـە پاشـای ڕۆم وتراوە قەیسەرو بە پاشای بێدینی میسر وتراوە فیرعـەون و بـە پاشـای حەبەشـە وتـراوە نەجاشـی چەند هاوشێوەی تریش لەم ناوانە. بەڵام وا دەردەکەوێت کە هەندێ لەوانـە لـە یەمـەن دەرچـووبن بـە وڵاتاندا بڵاوەیان کردبێت هەتا گەیشتوونەتە سـەمەرقەندو لـەوێ دەسـەڵاتیان پـەیدا کردبێـت و بووبنـە کاربەدەست و سوپایان پێکەوەنابێت و وڵاتەکەیان فراوان کردبێت و خەڵکێکی زۆر لە ژێـر دەسـەڵاتیاندا بووبێت و لەو وەختەدا ئەو کاربەدەستە حیرەی کردبێت بە شوێنی فەرمانڕەوایی خۆی. وا ڕێککـەوتووە بـە لای شـاری مەدینـەدا چـووبێت لـە زەمـانی نەفامیـدا شـەڕی لەگـەڵ خەڵکەکـەی کـردووە ئـەوانیش بەرگریان کـردووەو شـەڕیان کـردووە بـە ڕۆژ بـە شـەویش میوانـداریان کـردوون. ئـەم پیـاوەش شـەرم گرتوویەتی و وازی لێ هێناون. ئەم پیاوە دوو زانای جوولەکەی لەگەڵ بـوو کـە ئامۆژگاریـان دەکـرد کـە هیچ ناکرێت لەگەڵ ئەم شارەدا چونکە شوێنی پێغەمبەرێکە لە ئاخرزەماندا پەیدا دەبێـت. وازی هێنـاو

دوو زانا جوولەکەکەی لەگەڵ خۆی بردووە بۆ وڵاتی یەمەن. کاتێك کە دای بە لای مەککەدا ویستی کەعبە بڕوخێنێت هەمیسان نەیانهێشت بیڕوخێنێتو باسی مەزنیو پیرۆزی کەعبەیان بۆ کردو وتیان ئەم خانووە ئیبراهیمی خەلیل دروستی کردووە(سەلامی خوای لێ بێت) ڕێزو پلەیەکی بەرزو پیرۆزی دەبێت لەسەر دەستی ئەو پێغەمبەرەی کە لە ئاخرزەماندا دێت. ئەو پیاوە زۆر ڕێزی لێگرتو تەوافی کرد بە دەوریداو قوماشی یەمەنی جوانو ناسکی دا بەسەر کەعبەدا. پاشان گەڕایەوە بۆ یەمەنو داوای کرد لە خەڵکەکەی لەگەڵیدا ببنە جوولەکەو ئەو ئاینە وەربگرن. لەو کاتەدا ئایینی موسا بوو(سەلامی خوای لێ بێت) کە لەسەر ڕێگای ڕاست بوون پێش هاتنی عیسای کوڕی مەریەم(سەلامی خوای لێ بێت) هەموو خەڵکی یەمەن بوونە جوولەکەو ئایینی موسایان وەرگرت. عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(نازانم توببەع پێغەمبەر بووە یان پێغەمبەر نەبووە).[1] وە ڕیوایەت کراوەلە تەمیمی کوڕی عەبدورەحمانەوە دەڵێت: عەتای کوڕی ئەبی ڕباح دەڵێت: قسە مەڵێن بە توببەع چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەیهێشتووە قسەی پێ بوترێت.[2] والله تعالی أعلم.

﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾﴾

### ئەم دنیایە بۆ حیکمەتێك ساز دراوە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ ئێمە ئەم ئاسمانانەو ئەم زەمینەو هەرچی لەناو ئەو دووانەدایە بۆ گەمەمان ساز نەداوە. ﴿مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ هەر بۆ ڕاستی هەموومان وەدی هێناون بەڵام زۆربەیان نازانن. خوای گەورە باسی عەدالەتو پاکیو بێ عەیبی خۆی دەکات کە ئەم ئاسمانو زەمینەی بۆ گەمەو بێهودە وەدی نەهێناوە وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[3] واتە: ئێمە ئاسمانو زەویو ئەوەی لە نێوانیاندایە بەبێهودە دروستمان نەکردووە ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە بێباوەڕ بوون سا هاوار بۆ ئەوانەی کە بێباوەڕ لە ئاگری

---

[1] البغوي(٤/١٥٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] عبدالرزاق(٣/٢٠٩)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] ص(٢٧).

دۆزەخ. وە دەفـــەرموویت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ﴾[1] واتە: ئایا ئێوە گومانتان وابووە کە بێگومان ئێوەمان بەبێ هودە دروست کردووەو بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، جا بەرزو بڵندی بۆ خوای پاشای ڕاستو ڕەوا هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو پەروەردگاری عەرشی بەڕێزو بەرزە. پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ ژوانی هەموویان ڕۆژی هەڵاواردنە. ئەو ڕۆژەش ڕۆژی قیامەتە کە خوای گەورە هەموو خەڵکی لە یەك جیادەکاتەوەو سزای خوانەناس دەداتو پاداشتی خاوەن باوەڕیش دەداتەوە. ﴿مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ واتە: هەمووی کۆدەکاتەوە هەر لە ئەوەل کەسەوە هەتا دوایین کەس، ﴿يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ ئەو ڕۆژە دۆست لە مەڕ دۆستی هیچ کارێکی لە دەست نایەتو کەسیش بە هانایان نایەت. هیچ دۆستو نزیکێك سود بە ئەوی تر ناگەیەنێت وەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرموویت: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ﴾[2] واتە: ئینجا کاتێك فوو دەکرێت بە شەیپوردا لەو ڕۆژەدا هیچ خزمایەتیەك نامێنێت لە نێوانیانداو پرسیاری یەکتری ناکەن(کەس لە کەس ناپرسێت). وەك خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿وَلَا يَسْأَلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾ يُبَصَّرُونَهُمْ﴾[3] واتە: وە هیچ کەسێك ناپرسێتەوە لە هیچ کەسێکی خۆشەویستی خۆی، کە نیشانی یەکتر دەدرێن. واتە: برا لە برای خۆی ناپرسێتەوە کاتێك چاوی پێی دەکەوێت. ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ واتە: هیچ کەسێکی نزیك ناچێت بە هاواری کەسێکی خۆیەوە لە هیچ شوێنێکیشەوە یارمەتی بۆ نایەت. پاشان فەرموویەتی: ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ مەگین کەسێك وەبەر بەزەیی خودا بکەوێت، کە هەر خۆی بە دەسەڵاتو دلۆڤانە. واتە: بەزەیی خودا نەبێت هیچ شتێك فریادی ناکەوێت لەو ڕۆژەدا چونکە هەر خودا خاوەنی دەسەڵاتو بەزەیی فراوانە.

---

[1] المؤمنون(١١٥ـ١١٦).

[2] المؤمنون(١٠١).

[3] المعارج(١٠ـ١١).

﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾﴾

## گوزەرانی بتپەرست و جەزرەبەیان لە ڕۆژی قیامەتدا

خوای گەورە باسی شێوازی ئەو سزایە دەکات کە خوانەناسانی پێ سزا دەدرێت ئەوانەی کە باوەڕیان نەبوو کە دەگەڕێنەوە لای دەفەرموێت: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ﴾ بەڕی دارەکەی ژەقنەبووت. ﴿طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ﴾ خواردنی گوناهبارانە. واتە: گوناهبار لە قسەو لە کرداریدا کە خوا نەناسە. زۆر کەس وتوویانە مەبەست بەوتاوانبارە ئەبو جەهلە. گومانی تێدا نیە کە ئەم ئایەتە ئەبوجەهل دەگرێتەوە بەڵام تایبەت نیە بە ئەوە، ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو دەرداءەوە کە ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ﴾ی خوێندەوە بۆ پیاوێك پیاوەکە وتی: ﴿طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ﴾ واتە: خواردنی هەتیوە. ئەبو دەرداء وتی: بەڵێ: خواردنی ژەقنەبووت خواردنی خەڵکی بەرەڵایە[1]. موجاهید دەڵێت: هیچ خواردنێکی بۆ نیە بیخوات جگە لەوە. ئەگەر دڵۆپەیەکی بکەوێتە سەر زەمین ژیانی هەموو خەڵکی سەر زەمین تێك دەدات و خراپی دەکات.[2] هەر بەم مانایە ڕیوایەتی تریش هاتووە. ﴿كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ﴾ لە چەشنی خڵتەی ڕۆن زەیتوون، لەناو سکیاندا دێتە کوڵ. وتراوە: وەك خڵتەی ڕۆن زەیتون. ﴿يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ ٱلْحَمِيمِ﴾ وەك کوڵینی ئاوی گەرم. لە زۆر گەرمی و خراپیدا. وە دەفەرموێت: ﴿خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ بیگرن و ڕایکێشن بۆ ناوەڕاستی جەهەنەم. واتە: خوانەناس بگرن. هاتووە کە وەختێك خوای گەورە فەرمان دەدات بە (زبانیة)ی جەهەنەم کە بیبەن حەفتا هەزار پەلاماری دەدەن، ﴿فَٱعْتِلُوهُ﴾ واتە: ڕایکێشن و بە پاڵ بیبەن. موجاهید دەڵێت: ﴿خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ﴾ واتە: بیگرن و بە پاڵ بیبەن. ﴿إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: بۆ ناوەڕاستی جەهەنەم. ﴿ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ﴾ ئەوساکەش هەر بۆ ئازاردان ئاوەکوڵی بەسەردا بکەن. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُصَبُّ مِن

[1] الطبري(٢٢/٤٣).

[2] الطبري(٢٢/٤٣).

﴿فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ﴾[1] واتە: بەسەریاندا دەڕژێنرێت ئاوی زۆر گەرم، دەتوێنرێتەوەو بەو(ئاوە گەرمە) ئەوەی لە ناو سکیاندایەو پێستەکانیش(یان). فریشتەکان بە ئاسن لێیان دەدەنو مێشکیان دەکرێتەوە پاشان ئاوەکوڵ دەکرێت بەسەریاندا بەناو جەستەیاندا دەچێتە خوارەوە پاشان ناو سکی دەتوێتەوە لە ڕیخۆڵەیەوە دەڕواتە خوار تا لە قولەپێیەوە وەك کێماو دەردەچێت. خوای گەورە بمانپارێزێت لەو سزایە. وە دەفەرمووێت: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ﴾ دە بچێژە تۆیەك کە لە دنیادا هێزای خاوەن دەسەلات بووی. واتە: ئەم قسەی پێ بڵێن بۆ سوکایەتی پێکردنو زیاتر ڕسواکردنی. زەححاك دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) واتە: تۆ نە مەزنیو نە خاوەن دەسەلاتیشی. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ﴾ ئەوە ئەو شتە هاتەدی کە ئێوە لێی بە گومان بوون. وەك ئەم ئایەتە کە دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ﴾[2] واتە: ڕۆژێك پاڵیان پێوە دەنرێت بەرەو ئاگری دۆزەخ چۆن پاڵپێوەنانێك،(پێیان دەوترێت) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دەزانی، ئایا ئەم ئاگرە جادووە یان ئێوە نابینن. بۆیە خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ﴾.

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾﴾

### ژیانی لەخواترسانو ڕابواردنیان لە بەهەشتدا

کاتێك کەخوای گەورە باسی بەدبەختان دەکات بەدوایدا باسی بەختەوەرانیش دەکات، هەر بۆیە قورئان ناو دەبرێت بە(مثاني) خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ﴾ ئەوا خۆپارێزەکانیش وان لە شوێنێکی هێمندا. ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ واتە: ئەوانەی کە خۆپارێزن لەبەر خودا لە دنیادا، ﴿فِى مَقَامٍ أَمِينٍ﴾ واتە: لە ڕۆژی دوایدا لە بەهەشتان. ترسیان لە مردن نیە تێیداو دڵیان تەختە

[1] الحج(١٩ـ٢٠).

[2] الطور(١٣ـ١٥).

کە لێی دەرناچن‌و لە هەموو خەم‌و خەفەت‌و ماندووبوون‌و ناڕەحەتیەك ڕزگاریان بووەو لە شەیتان‌و فرۆفێڵەکانی شەیتانیش ڕزگاریان بووەو جارێکی تریش تووشی بەڵاو کۆسکەوتن نابن. ﴿فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ﴾ لە نێوان کانیاوان‌و باغاندان. ئەمە لە بەرانبەری ئەوانەی کە بەری داری زەقنەبووت دەخۆن لەگەڵ ئاوی کوڵاو. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ پارچەی ناسك‌و ئەستووری ئاوریشم دەپۆشن(هەموو بەرامبەر یەکن). واتە: لە هەوریشمی چاك لەبەر دەکەن وەك کراس‌و شێوەی کراس، ﴿وَإِسۡتَبۡرَقٖ﴾ واتە: ئەو شتانەی کە بەسەر قوماشدا دەردەکەوێت دەپۆشن، ﴿مُّتَقَٰبِلِينَ﴾ واتە: لەسەر قەنەفەیە کە هیچ کەسێك لەمانە پشت لەیەك ناکەن. وە دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ﴾ زۆر کیژی چاو کەژاڵی سپی‌و شۆڵمان بۆ هاوسەری پێ بەخشیون. واتە: ئەمانەمان پێ بەخشیون بۆ هاوسەریەتی لەگەڵ ئەو خێزانە چاك‌و بە شەوکەتانەی کە پێمان داون. ئەو کیژە چاو کەژاڵ‌و سپی‌و ناسکانەی کە﴿لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ﴾[1] واتە: پێش ئەوان دەستی لێ نەکەوتووە نە لە ئادەمی‌و نە لە جنۆکە. ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾[2] واتە: ئەو(حۆریانە) وەك یاقوت‌و مەرجان وان. ﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ﴾[3] واتە: ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نیە؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ﴾ لەوێدا هەر میوەیەکی بە دڵیانە بە ئاسودەیی (دەخوازن) واتە: داوای هەرچەندە میوە بکەن بۆیان ئامادە دەکرێت. بێ ترسن لەوەی کە لێیان ببڕێت یان نەیاندرێتێ. بەڵکو هەر کاتێك داوای بکەن ئامادە کراوە بۆیان. وە دەفەرموێت: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰ﴾ جگە لە مەرگی هەوەڵی، لەو شوێنەدا تامی مردنێك ناچەژن‌و ﴿وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾ لە ئازاری دۆزەخیشی پاراستوون. ئەمە ئیستیسنای تەئکیدی نەفیە کە دەکات ئیستیسنای مونقەتیع واتە: هەرگیز ئەو مردنە ئیتر ناچەژن. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (مردن دەهێنرێت لە وێنەی بەرانێکی سپی کەمێك خوریەکەی ڕەشی تێکەڵە لە نێوان بەهەشت‌و ئاگردا دەوەستێنرێت پاشان سەردەبڕێت، پاشان دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت! هەر

---

[1] الرحمن(٧٤).

[2] الرحمن(٥٨).

[3] الرحمن(٦٠).

دەمێننەوەو مردن نیە. وە ئەی خەڵکی ناو ئاگر! هەر دەمێننەوەو مردن نیە)[1]. ئەم فەرموودەیە لە سورەتی(مریم)دا باسکراوە. عبدالرزاق ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدو ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەڵێن: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(دەوترێت بە خەڵکی بەهەشت، ئێوە هەمیشە لەش ساغ دەبن‌و هەرگیز نەخۆش ناکەون‌و ئێوە هەر دەمێنن‌و هەرگیز نامرن. وە ئێوە هەمیشە لە خۆشی‌و کامەرانیدان هەرگیز نارەحەت نابن‌و هەمیشە لاون هەرگیز پیر نابن). موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[2] وە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(هەر کەسێك لە خودا ترسابێت چووەتە بەهەشت لەناو بەهەشتدا بە خۆشی دەبیاتە سەرو تووشی نارەحەتی نابێت. وە دەژی لە بەهەشتدا و هەرگیز نامرێت. جلوبەرگی نارزێت‌و خراپ نابێت. گەنجیشی ناڕوات)[3]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ﴾ واتە: لەگەڵ ئەو هەموو بەهرە گەورە نەبڕاوەیە خودا پاراستوونی‌و ڕزگاری کردوون‌و لای داون لەو جەزرەبە بەژانە لەناو جەهەنەمدا ئەوەی داوایان کردووە دەستیان کەوتووەو ئەوەیش لێی ترساون ڕزگاریان بووە لێی. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ چاکەیەو پەروەرندەی تۆ کردوویەتی، ئەمەیش بەختەوەریەکی زۆر گرینگە. واتە: ئەمە ڕێزو چاکەیەکی خودایە بۆ بەندە چاکەکانی وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(کار بکەن‌و ڕاست بن‌و نزیك ببنەوە، بشزانن کە هیچ کەسێك کردارەکانی نایباتە بەهەشت). وتیان: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (تەنانەت منیش، مەگەر خودا بە بەزەیی‌و چاکەی خۆی داپۆشێت)[4]. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ هەر بۆیە وا بە ئاساتی بە زمانی تۆمان بەڕێ کرد. کە شایەت بیر بکەنەوە. واتە: ئەم قورئانەمان ئاسان کردو ناردمانە خوارەوە لەسەر زمانی تۆ بە ئاسان‌و ڕەوان‌و ئاشکراو ڕوون کە ڕەوانترین‌و چاکترین‌و دیارترین زمانە ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ واتە: بەڵکو تێبگەن‌و بزانن. پاشان لەگەڵ ئەم هەموو ڕوونکردنەوەو شیکردنەوە هەندێ خەڵکی هەر باوەڕیان نەدەهێناو لارەملیان دەکردو دژی دەوەستان خودای مەزنیش دڵی پێغەمبەری(ﷺ) دەدایەوەو بەڵێنی سەرکەوتنی دەدایەو هەڕەشەی دەکرد لەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ نەدەکرد بە لەناوبردن‌و قڕتێخستنیان.

---

[1] فتح الباري(٢٨٢/٨)، مسلم(٢١٨٨/٤).

[2] مسلم(٢١٨٢/٤).

[3] الطبراني –الاوسط–(٤٨٩٥)، فەرموودەیەکی باشە(جید)، موسلیمیش پشتگیری لێ دەکات.

[4] فتح الباري(٣٠٠/١١)، مسلم(٢١٧٠/٤).

﴿ فَٱرۡتَقِبۡ ﴾ چاوەڕوان بە، ﴿إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴾ واتە: بەم زووانە تێدەگەنو دەزانن سەرکەوتن بۆ کێیەو قسەی کێ لە دنیاو لە قیامەتدا بەرزو زۆر بڵندە. ئەی موحەممەد سەرکەوتنو پایەبڵندی بۆ تۆو براکانتە لە پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێت)و ئەو خاوەن باوەڕانەی کە شوێنی ئێوە کەوتوون وەك خودا فەرموویەتی: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ﴾[1] واتە: خوا نووسیویەتی کە بێگومان منو پێغەمبەرانم سەر دەکەوین. وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[2] واتە: بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە سەرکەوتوو دەکەین لە ژیانی دنیاداو لەو ڕۆژەی(قیامەت) شایەتەکان هەڵدەسنەوە، ڕۆژێك پاکانەکردنی بێباوەڕیان سودیان پێ ناگەیەنێت هەموویان نەفرەتیان لێ کراوەو خراپترین جێگایان هەیە.

## تەفسیری سورەتی( الجاثیة )

## لە مەککەدا هاتووەتەخوارەوە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلۡقِكُمۡ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٥﴾﴾

### ڕێ نیشاندان بۆ تێڕامان لە نیشانەکانی خودا

﴿حمٓ﴾ حامیم، ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ئەم کتێبە خاوەن دەسەڵاتی کارزان ناردوویەتی.

﴿إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ لە ئاسمانانو زەمیندا بەڵگە زۆرن بۆ کەسانی خاوەن باوەڕ.

﴿ وَفِي خَلۡقِكُمۡ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ لە دروستکردنی خۆتانو بڵاوبوونی جانەوەران، چەند بەڵگە هەن، بۆ ئەوانەی لە بڕوادا بێگومانن. خوای گەورە بەندەکانی ڕێنموونی دەکات بۆ تێڕامان لە بەهرەو نیشانەکانیو ئەو دەسەڵاتە مەزنەی کە ئاسمانەکانو زەمینی پێی وەدی هێناوەو ئەو هەموو مەخلوقاتانەی تیا دروست کردوون بە هەموو ڕەگەزو جۆرەکانیەوە لە فریشتەو جنۆکەو مرۆڤو گیانەوەرو بە هەموو جۆرەکانیەوە وەك باڵندەو گیاندارە کەژیەکانو مارو مێروو ئەو زیندەوەرانەش

[1] المجادلة(٢١).

[2] الغافر(٥١_٥٢).

کە لەناو دەریادان لە هەموو چەشنەکانیو هاتوچۆی شەوو ڕۆژ بە دوای یەکدا بە بەردەوامیو بەبێ وەستانو ئەو هەورو بارانەی کە لە کاتی پێویستدا ڕەوانەی دەکاتو دەیبارێنێت کە خوای گەورە ناوی بردووە بە ڕۆزی. چونکە بە هۆی بارانەوە ڕۆزی پەیدا دەکات بۆ گیانەوەر لە نێوانیاندا مرۆڤ. وەك دەفــــەرموێت: ﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزۡقٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾ لە هاتوچۆی شەوو ڕۆژو لەو ڕۆزیەی کە خودا لەو حەوایەوە بەڕێی دەکاتو زەوی مردووی بەو هۆیەوە زیندوو کردەوەو لە هەڵکردنی بایەکان. نیشانە هەن بۆ ئەو کەسانەی کە تێدەگەن. ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا﴾ واتە: دوای ئەوەی کە ئەو زەمینە گیانی تێدا نەبوو مردبوو هیچ ڕووەكو گژوگیایەکی تێدا نەبووە زیندووی کردووەتەوە. ﴿وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ بە هۆی هەڵکردنی بایەکانەوە بەرەو باکوورو باشوورو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو لە وشکانیو لەناو دەریاکانداو بە شەوو بە ڕۆژ هەندێ لەو بایانە بۆ باران بارینو هەندێکی بۆ تۆرمەکردنی درەختو گیاو گژەو هەندێکی بۆ گەشەو نماکردنی گیانەکانو هەندێکیشی بێ بەرهەم وەك لە ئەوەلەوە فەرمویەتی ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿يُوقِنُونَ﴾ دوایش فەرموویەتی: ﴿يَعۡقِلُونَ﴾ ئەمەبەرزبوونەوەیە لە حاڵێکی چاکەوە بۆ حاڵێکی چاکتروبەرزتر لەوی تر. ئەم ئایەتانە لەو ئایەتە دەچێت کە لە سورەتی(البقرة)دا هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلۡفُلۡكِ ٱلَّتِي تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٖ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٖ وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلۡمُسَخَّرِ بَيۡنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾[1] واتە: بە ڕاستی هەیە لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەویو جیاوازی شەوو ڕۆژ(بە کورتیو بە درێژی)و ئەو کەشتیانەی کە دێنو دەچن لە دەریادا بەو شتانە کە قازانج دەگەیەنن بە خەڵکیو ئەوەی کە خودا لە ئاسمانەوە باراندی لە ئاو(باران) پاشان زەوی پێ زیندوو کردەوە پاش مردنیو بڵاوی کردەوە تیایدا لە هەموو جۆرە زیندەوەرێك وەهەڵسوڕاندنی بایەکان(بە هەموو لایەکدا)و ئەو هەورانەی ڕام کراون لە ناوەندی ئاسمانو زەویدا ئەمانەچەند بەڵگەیەکن بۆ کەسانێك کە تێبگەن.

﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٧﴾ يَسۡمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسۡتَكۡبِرٗا كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَاۖ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا شَيۡـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ

---

[1] البقرة(١٦٤).

لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ
عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾﴾

## سیفاتو نیشانەی بوختانكەرو تاوانبار

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ﴾ ئەمانە نیشانەی خودان كە بۆتی دەخوێنینەوەو هەمووی ڕاستە دەی سا لە پاش باسی خوداو نیشانەكانی ئەو، بە كام قسە بڕوا دەكەن. ﴿تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ﴾ واتە: قورئان كە ئەو هەموو بەلگەو ئاگاداریانەی كە تیایەتی. ﴿نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ﴾ واتە: كە بۆتی دەخوێنینەوە ڕاستەو لە لایەن خوداوەیەو كاتێك ئەوان بڕوایان پێ نەدەكردو شوێنی نەدەكەوتن. باشە دوای باسی خوداو نیشانەكانی بە چ قسەیەكی تر بڕوا دەكەن؟ پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾ های لەی كەسەی بوختانكەرو تاوانبارە. واتە: هاوار بۆ ئەو كەسەی درۆ هەلدەبەستێت بۆ خەلكی، كەكەسێكی درۆزن و سوێندخۆرو تاوانبارو ڕیسوایە لە كاتی قسەكردندا و لەكاتی كار و كردەوەشدا دەروون پیسەو باوەڕی بە نیشانەكانی خودا نیە. بۆیە خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ هەر كاتێك نیشانەكانی خودای بەسەردا دەخوێنرێتەوە، خۆی دەبیبستێ، كەچی دوایی بەهۆی لەخۆبایی بوون پێ دادەگرێتوەك ئەوەیكە هەر نەشی بیستووە. سا تۆ مزگێنی پێ بدە كە ئازارێكی بە ژانی بەر دەكەوێت. ﴿يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ﴾ واتە: كاتێك قورئانی بەسەردا دەخوێنرێتەوە، ﴿ثُمَّ يُصِرُّ﴾ بەردەوامە لەسەر بێ دینی خۆیو نۆد لەخۆباییو لاسارو كەلله ڕەقە، ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾ واتە: وەك ئەوەی كە هەر گوێی لێ نەبووە، ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ واتە: هەوالی بدەنێ كە لای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ئازاری بە ئێشو ژانی بۆ ئامادە كراوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ ئەگەر شتێكیش لە نیشانەكانی ئێمە فێر ببێت گالتەی پێ دەكات. ئازارێك بەشی ئەمانە كە تەواو ئابڕوویان دەبات. واتە: ئەگەر شتێك لە قورئان لەبەر بكەنو بزانن باوەڕی پێ ناكەنو گالتەی پێ دەكەنو پێی پێدەكەنن، ﴿أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی كە ئەو كەسانە ئا بەو شێوەیە گالتە بە قورئان دەكەن. سزاو تۆلەیەك بەشیانە كە بە تەواوی ڕیسوایان دەكاتو ئابڕوویان دەبات. بۆیە موسلیم ڕیوایەتی كردووە لە كتێبە سەحیحەكەیدا لە ئیبنو عومەرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) دەلێت:

پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەدەغەی(نەهی) کردووە لەو کەسەی کە دەچێتە سەر زەمینی دوژمن قورئان لەگەڵ خۆی ببات لە ترسی ئەوەی دوژمن دەستی بۆبەرێت[1]. پاشان ئەو جەزرەبە بە ژانە کە تووشیان دەبێت باس دەکات. کاتێك زیندوو دەکرێنەوەو دەفەرموێت: ﴿مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ دۆزەخیشیان وا بە دواوە نە ئەو شتەی لە دنیادا گیریان هێنا، نە دۆستانێك(غەیری خودا) هەڵیانبژارد، بەهرەیان پێ دەگەیەنن، ئازارێکی زۆر سەختیش چاوەڕوانیانە. ﴿مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ﴾ واتە: هەر کەسێك ئەو ڕەوشتانەی هەبێت لە ڕۆژی دوایدا دەچێتە ناو جەهەنەم، ﴿وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا﴾ نە ماڵو نە منداڵ ناگاتە فریای، ﴿وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ﴾ ئەو بتانەو ئەو کەسانەش کە کردبوویان بە هاوەڵی خودا هیچ سودێکیان پێ ناگەیەننو نایەن بە هانایانەوە(کە غەیری خودا پەرستوویانن)، ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ جەزرەبەی زۆر گرانیش دەدرێن. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ ئەمە ڕێ نیشاندەرێکە ئەو کەسانەش حاشا لە نیشانەکانی پەروەردەی خۆیان دەکەن ئازارێکی زۆر دژوارو بە ژانیان هەیە. ﴿هَٰذَا هُدًى﴾ واتە: ئەم قورئانەبەرچاوڕوونییە، ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ﴾ واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە نیشانەکانی خودای خۆیان نیە سزایەکی زۆر گرانو بەژان دەدرێن، والله أعلم.

﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ
وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ
أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ
تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾﴾

**ڕامهێنانی دەریاو ئەو شتانەش کە خودا دروستی کردووە هەمووی نیشانەی دەسەڵاتی خودان**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ خودا ئەو خوایەیە دەریای بۆ ئێوە ڕام کرد کە لە گوێرەی فەرمانی ئەو، گەمی لەناودا بگەڕێتو بۆ چاکەی ئەو تێبکۆشن. بەشکو شوکرانەبژێر بن. خوای گەورە باسی چاکەکانی خۆی

[1] مسلم(٣/١٤٩١).

دەكات لەسەر بەندەكانی لەو شتانەی كە لە دەریادایەو دەریاشی ڕام هێناوە ﴿لِتَجۡرِيَ ٱلۡفُلۡكُ﴾ كەشتی لەناودا هاتوچۆ بكات، ﴿فِيهِ بِأَمۡرِهِۦ﴾ بە فەرمانی ئەو. چونكە خودایە كە فەرمانی داوە بە دەریا كە هەڵی بگرێت. ﴿وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ بۆ ئەوەی كە بەكاری بێنن بۆ بازرگانیو كارو پێویستی تر كە خودا پێی بەخشیون. ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ بەشكو لەسەر ئەو دەستكەوتانەی بە دەستی دێنن لەو كیشوەرو وڵاتە دوورانە شوكرانەبژێر بن. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەكانو زەمیندان، هەمووی هی ئەون، ئەو بۆ ئێوەی ڕام كردوون. كە لەمەدا نیشانە زۆرن بۆ ئەوانەی ڕادەمێنن. واتە: هەرچی لە ئاسمانەكانو زەمیندایە لە ئەستێرەكانو چیاو دەریاو ڕووبارەكانو هەر شتێك ئێوە بەهرەی لێ وەردەگرن. هەمووی چاكەو بەهرە بەخشیش خودایە بۆیە فەرموویەتی: ﴿جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ گشت هی ئەون، شەریكی نیە لەو شتانەدا كە دروستی كردوون. وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ﴾[1] واتە: وە هەر چاكەو بەهرەیەكتان هەبێت ئەوە هەمووی لە خوداوەیە پاشان كاتێك دووچاری زیانو ناڕەحەتیەك ببن ئەوە پەناو هاوار هەر بۆ لای ئەو دەبەن. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ڕێگای عەوفیەوە لە ئیبنو عەباسەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾ هەموو شتێك هەر لە لای خوداوەیە،(الله) ئەم ناوە یەكێكە لە ناوەكانی خودا، هەموو هی ئەون. ئەو كەسانەی كە لە ململانێدانلەناو خۆیاندا ناتوانن بەرامبەر خودا هیچ بڵێنو هیچ بكەن باش بزانە كە هەر وایشە.[2] ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾ لەمانەشدا بەڵگە زۆرن بۆ ئەو كەسانەی كە ڕادەمێنن.

## فەرمان دان بە خۆڕاگری لەسەر ئازاری بتپەرستان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغۡفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجۡزِيَ قَوۡمَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ تۆ بە باوەڕداران بڵێ: با ئەو كەسانە ببەخشن كە بۆ ڕۆژەكانی خودا بە هیوا نین، تا بە هەر گرۆیەك(بەپێی كردەوەیان) پاداشت بدات. واتە: چاوپۆشیان لێ بكەنو خۆڕاگر بن لە بەرامبەر ئازارو ئەشكەنجەیان، ئەمە لە كاتێكدا بوو كە تازە ئیسلام هاتبوو خوای گەورە فەرمانی پێكردن كە

---

[1] النحل(٥٣).

[2] الطبري(٢٢/٦٥).

خۆڕاگرو بە ئارام بن بەرامبەر ئێش و ئازاری خوانەناسان و ئەو کەسانەی کە خاوەن کتێبن بۆ ئەوەی کە لێیان نزیك ببنەوەو سودیان پێ بگەیەنن. بەڵام پاش ئەو هەموو لاساری و خراپەکاریەیان بەرامبەر خاوەن باوەڕان خودای مەزن فەرمانی جیهادو بەرەڵستی کردنی بتپەرست و خوانەناسانی دا. هەر بەم شێوەیە ریوایەت کراوە لە ئیبنو عەباس و قەتادەوە.[1] موجاهید دەڵێت: ﴿لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ﴾ بەهرەی خودا وەدەست ناهێنن.[2] دە فەرموویێت: ﴿لِيَجْزِيَ قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ واتە: کاتێك ئەوان لە دنیادا چاوپۆشیان لە خوانەناسان کرد. خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا هەقیان لێ دەسێنێت بە هۆی ئەو کردەوە خراپانەیانەوە کە کردوویانە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾ هەر کەسێك کارێکی باش دەکات، بۆ خۆیەتی، هەر کەسیش خراپە دەکات، دژی خۆی کردوویەتی، پاشان ئێوە هەر بۆ لای پەروەردگارتان دەبرێنەوە. واتە: دەچنەوە لای خودای مەزن کردەوەکانتان پیشانی خودا دەدرێت و پاداشتتان دەدرێتەوە چاکە بە چاکە و خراپەش بە سزادان و تۆڵە لێ سەندن. والله أعلم.

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴿١٦﴾ وَآتَيْنَاهُم بَيِّنَاتٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾﴾

**ڕێزلێنانی خودا لە نەوەی ئیسرائیل و کێشە پەیدابوون لە نێوانیاندا پاش ئەوە**

خوای گەورە باسی ئەو چاکانە دەکات کە کردی لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل لەناردنی کتێب بۆیان و ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لە ناویانداو کردیە فەرمانڕەوا لەناویاندا بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ ئێمە کتێب و کارزانی و پلەی پێغەمبەرایەتیمان دا بە تۆرمەی ئیسرائیل، بژێوی چاك و چاکیشمان پێ گەیاندن. لە چاو هەموو خەڵکی دنیاش سەرمان خستن. ﴿وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ﴾ لە دنیاشدا ڕێزمان دان

---

[1] الطبري(٢٢/٦٦/٦٧).

[2] الطبري(٢٢/٦٧).

بەسەر خەڵکی ئەو زەمانەشدا ، وە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ سەبارەت بە دینەکەشیان زۆر نیشانەی دیاری دەرمان پێ سپاردن لەناو خۆشیان گرفتاری کێشە نەبوون. مەگین کاتێك کە لەم دینە ئاگادار بوون، ئەویش هەر لەبەر ئێریەی نێوان خۆیان. پەروەردەت ڕۆژی قیامەت بەو کارانەیاندا ڕادەگات. کە لەسەری پێك نەهاتوون. واتە: بەڵگەو نیشانەی تەواومان بۆ ناردن، کاتێك ئاگاداری ئەو بەڵگەو نیشانانە بوون لە نێوان خۆیاندا ناکۆك بوون لەبەر حەسودی بەیەك بردن، ﴿إِنَّ رَبَّكَ﴾ ئەی موحەممەد پەروەردەی تۆ، ﴿يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا هەموو ئەو ناکۆکیەیان بۆ شی دەکاتەوەو بە بڕیاری دادپەروەری خۆی.

## ترساندنی ئەم ئوممەتە ئەگەر لەسەر ڕێ‌و ڕچەی تۆرمەی ئیسرائیل بڕۆن بەڕێوە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ دواجار تۆمان خستە سەر ڕێگەو شوێنێك لەم ئاینە، شوێنی بکەوەو شوێنی ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە. ئەمە هەڕەشەو ترساندنی تیایە بۆ ئەم ئوممەتە کە شوێنی جولەکەو ڕێبازی جولەکە بکەون‌و لێی نزیك ببنەوە بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا﴾ واتە: شوێنی ئەو فەرمانە بکەوە کە لە لایەن خوداوە بۆت هاتووە کە خودا تەنهایەو هاوەڵی نیەو پشت بکەرە ئەو کەسانەی کە هاوەڵ بۆ خودا دادەنێن. وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ ئەوان ناتوانن لە خودات بێ نیاز بکەن، ناهەقان دۆستی یەکترن. خوداش دۆستی خۆپارێزانە. واتە: شوێنی هەواو ئارەزووی ئەوانە مەکەوە. چ بەهرەو قازانجێکیان وەدەست هێناوە بۆ یەکتری جگە لە ماڵ وێرانی‌و زەرەرو زیان‌و لەناوچوون. ﴿وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ﴾ هەر خودا دۆستی خۆپارێزانە کە لە تاریکی دەری هێناون بەرەو ڕووناکی. دۆستی خوانەناسانیش تاغوتە لە ڕۆشنایی دەریان دەخەن بەرەو ڕووی تاریکستانیان بەڕێ دەکەن. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئەم قورئانە سۆمای چاوە بۆ مەردم‌و بەزەیی‌و ڕێ نیشاندەرە بۆ ئەوانەی لە بڕوادا بێگومانن.

﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾

**مردن و ژیانی خاوەن باوەڕو خوانەناسان وەك یەك نیە**

ئەو کەسانەی خواناسن لەگەڵ ئەوانەی کە خوانەناسن وەك یەك نین وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۚ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ﴾[1] واتە: دۆزەخیەکان و بەهەشتیەکان وەك یەك نین بەهەشتیەکان ڕزگارو سەرکەوتوون. خوای گەورە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ ئاخۆ ئەوانەی بەدکارن، وا دەزانن ئێمە لە ژیان و مەرگیاندا وەك ئەوانەیان دادەنێین کە بوونە خاوەن باوەڕو ئاکار چاك بوون، زۆر خراپ تێگەیشتوون. ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ واتە: ئاخۆ ئەوانەی کاری خراپیان کردووە، ﴿أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ﴾ وا تێدەگەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەوانەی کە خاوەن باوەڕ بوون وەك یەك سەیریان دەکەین! ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ واتە: بە ڕاستی خراپ لە ئێمەو دادپەروەری ئێمە تێگەیشتوون کە وا دەزانن جیاوازی ناکەین لە نێوان پیاوچاك و بەدکاردا لەم ژیانی دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا. تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە مەسروقەوە کە تەمیمی داری شەوێك هەڵسا هەتا بەیانی ئەم ئایەتەی دەوتەوە: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾[2].

بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ خوا بە ڕاستی ئەم ئاسمانانەو زەمینی وەدی هێنا، تا هەر کەسێك چی کردووە، پاداشتی وەرگرێتەوەو ناهەقیشیان لێ ناکرێت. ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: خودا ئەم ئاسمانان و زەمینەی بە ڕاستی دروست

---

[1] الحشر(٢٠).

[2] الطبري(٢/٥٠).

کردووە. ﴿وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ هەتا هەر کەسێك چی کردووە پاداشتەکەی وەربگرێتەوەو ستەمیشیان لێ ناکرێت. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ ئاخۆ تۆ ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزووی خۆی دەپەرست؟ خودا(کە ئاگای لێ بوو) ڕێی لێ گۆڕیو گوێچکەو دڵیشی مۆر کردو لێڵایی خستە سەر چاوی. سا کێ هەیە لە پاش خودا، ڕێی نیشان بدات؟ دەی بۆچی بیر ناکەنەوە؟ واتە: ئارەزووی خۆی کردووە بە خوای خۆی، هەرچی ئارەزووی حەزی لێ بکاتو بە چاکی بزانێت وا دەکاتو هەرچیش ئارەزووی حەزی لێ نەکات وازی لێ دێنێت، ﴿وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾ خودایش ڕێگای لێ گۆڕی چونکە دەزانێت ئەو کەسە شایەنی ئەوەیە. یان ڕێی لێ دەگۆڕێت پاش ئەوەی کە ئاگادار کراو بەڵگەی تەواوی بۆ ڕوون کرایەوە. واتە: هەتا خوای گەورە خەڵکی ئاگادار نەکات ڕێی لێ ناگۆڕێت، ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً﴾ واتە: مۆر دەنێت بەسەر گوێو دڵیداو چاوی کوێر دەکات هیچ شتێك نابیستێ کە سوودی لێ وەربگرێتو لە هیچ شتێك تێناگات تا ڕێی پێ دەرکاتو هیچ نیشانەو ڕووناکیەك وەدی ناکات تا لەسەری بڕوات بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾ واتە: هیچ کەسێك لە پاش خودا نیە ڕێی نیشان بدات وەك ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾[1] واتە: هەر کەس خوا گومڕای بکات(بە تاوانی کردەوەی خراپی) ئەوە هیچ ڕێبەرێکی بۆ نیە(خودا) وازیان لێ دێنێت لە گومڕاییو یاخی بوونی خۆیاندا گێژ بخۆن.

﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾﴾

**بیروبڕوای خوانەناس و بڕوبیانووهێنانەوەو وڵامدانەوەیان**

خوای گەورە باسی قسەی سروشت پەرستەکان دەکات لە خوانەناسانو ئەو عەرەبانەش کە هاوڕابوون لەگەڵیان لە موشریکەکان کە باوەڕیان نەبوو بە زیندووبوونەوە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ هەر وا وتیان: بێجگە لە

[1] الاعراف(١٨٦).

ژیانی دنیامان چیتر نیە، هەر دەمرین‌و دەژینەوەو هەر سروشت دەمان مرێنێت. هیچ شتێك لەمەش نازانن، هەر لە خۆوە گومان دەبەن. ﴿وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا﴾ واتە: ئەو سروشت پەرستانە دەڵێن: ژیانێکی تر نیە جگە لەم ژیانی دنیایە کۆمەڵێك دەمرێت‌و کۆمەڵێکی تر لە جێیان دەژی نە زیندووبوونەوە هەیەو نە ڕۆژی قیامەت. ئەم قسەیە بتپەرستانی عەرەبیش هەر وتوویانە، ئەوانەی کە باوەڕیان بە زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی نەبووەو هەندێ لە فەیلەسوفە ئیلاهیەکانیش هەمان قسەیان دەکرد کە باوەڕیان بە وەدیهێنانی یەکەمجارو جارێکی تر گەڕانەوەو زیندووبوونەوە نەبوو. هەروەها ئەو فەیلەسوفانەی کە باوەڕیان بە سروشت‌و سوڕانەوەی گەردوون هەبوو، باوەڕیان بە وەدیهێنەری ئەم بوونەوەرە نەبوو، بڕوایان وابوو کە هەر سی‌و شەش هەزار(٣٦٠٠٠) ساڵی جارێك هەموو شتێك چۆن بووە وەك خۆی لێ دێتەوە، وایان دەزانی کە ئەم ڕووداوە چەند جار دووبارە بووەتەوەو هەتا هەتایشە هەر وا دەبێت. دژایەتی ژیرییان دەکردو باوەڕیشیان بە کتێبە ئاسمانیەکان نەدەکرد، بۆیە دەیانوت وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ واتە: هەر سروشت دەمانمرێنێت. خوای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ واتە: لەم بارەیەوە هیچ شتێك نازانن بەڵکو هەر لە خۆیانەوە قسە دەکەن. بەڵام ئەو فەرموودەی کە بوخاری‌و موسلیم‌و ئەبو داودو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) کە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(خوای گەورە فەرموویەتی نەوەکانی ئادەم ئازارم دەدەن قسە دەڵێن بە سروشت(الدهر) من خۆم سروشتم، فەرمان بە دەستی خۆمە شەوو ڕۆژ هەڵدەسوڕێنم)[1]. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:(قسە مەڵێن بە(الدهر) چونکە خوا خۆی دەهرە).[2] شافعی‌و ئەبو عوبەیدەو کەسانێ تریش لە پێشەوایان وتوویانە لە مانای ئەم فەرموودەیەدا:(قسە مەڵێن بە(الدهر) چونکە خوا خۆی دەهرە)، عەرەبەکان لە کاتی نەفامیدا ئەگەر تووشی ناڕەحەتیەك ببوونایە یان بەڵاو گرفتێك بەسەریاندا بهاتایە دەیانوت ئەی زەمانە(الدهر) تۆ بەسەرت هێنایین. ئەو شتانەیان دەخستە سەر سروشت(الدهر)و قسەیان پێ دەوت. کەچی ئەو شتانە هەموو بە دەستی خودایەو وەك ئەوەیە کە قسە بە خودا بڵێن. چونکە لە ڕاستیدا خودا ئەو شتانە دەکات. بۆیە نەهی کراوە کە قسە بە(الدهر) بوترێت بەو شێوەیە چونکە خوا خۆی ئەو دەهرەیە کە ئەوان مەبەستیانەو ئەو شتانە دەخەنە سەری. ئەمە چاکترین تەفسیرە بۆ(الدهر) کە کراوەو مەبەستیش هەر ئەمەیە والله أعلم. ئیبنو حەزم‌و ئەوانەی کە هاوڕای ئەون لە زاهیرەکان بە هەڵەداچوون کە(الدهر)یان بە یەکێك لە ناوەکانی خودا داناوە، بە پشت بەستن

---

[1] فتح الباري(٤٣٧/٨)، مسلم(١٧٦٢/٤)، ابو داود(٤٢٣/٥)، النسائي في الكبرى(٤٥٧/٦).
[2] مسلم(١٧٦٣/٤).

بەم فەرموودەیە. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ هەر کاتێکیش نیشانە ئاشکراکانی ئێمەیان بۆ دەخوێننەوە بروبیانوو دەهێننەوەو دەڵێن: ئەگەر قسەتان ڕاستە باب و باپیرانمان بۆ بێننەوە. ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾ واتە: کاتێك بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوەو ڕاستیان بۆ ڕوون بکرێتەوە کە خوای گەورە توانای هەیە کە لەشە ڕزاوەکان پاش ئەوەی کە لەناو دەچن و نامێنن جارێکی تر دروستیان بکاتەوە، ﴿مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بروبیانوو دێننەوەو دەڵێن باب و باپیرانمان بۆ بێننەوە ئەگەر ڕاست دەڵێن. خوای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بڵێ: خودا ژیانتان پێ دەدات و لە پاشان دەتانمرێنێت و پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا (کە بێگومان هەر دادێ) هەمووتان کۆدەکاتەوە. بەڵام زۆربەی ئەم مەردمە ئاگای لێ نیە. ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ﴾ بڵێ: خودا دەتانژێنێت و پاشان دەتانمرێنێت وەك بە چاوی خۆتان دەیبینن لە نەبوونەوە دەتانهێنێتە بوون وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَٰتًا فَأَحْيَٰكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ﴾[1] واتە: چۆن بێباوەڕ دەبن بە خودا!؟ لە کاتێکدا کە ئێوە بێ گیان بوون و گیانی بەبەردا کردن لە پاشان دەتانمرێنێت دوای ئەوە زیندووتان دەکاتەوە. واتە: ئەو کەسەی کە توانای وەدیهێنانی هەبێت چاکتر و باشتر دەتوانێت جارێکی تر دروستی بکاتەوە، ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ﴾[2] واتە: ئەو(خوا) زاتێکە بەدیهێنانی دەست پێکردووە لە پاشان(دوای مردنی) دووبارە دروستی دەکاتەوە. ﴿ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەمووتان کۆدەکاتەوە نەك لەدونیادا هەتا بڵێن، ﴿ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾. وەك خودا دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ﴾[3] واتە: (پاداشتتان دەداتەوە) لە ڕۆژێکدا کە کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆکردنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿لِأَىِّ يَوْمٍ أُجِّلَتْ ﴿١٢﴾ لِيَوْمِ ٱلْفَصْلِ﴾[4] واتە: بۆ چ ڕۆژێك دواخراوە؟ بۆ ڕۆژی جیاکردنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ

---

[1] البقرة(٢٨).

[2] الروم(٢٧).

[3] التغابن(٩).

[4] المرسلات(١٢ـ١٣).

﴿إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ﴾[1] واتە: وەئێمەدوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێکی دیارو بەرچاو. لێرەشدا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ﴾ کە هیچ گومانی تێدا نیە. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ واتە: زۆربەی ئەم خەڵکە ئاگای لێ نیە بۆیە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیەو بە دووری دەزانن. ﴿إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَاهُ قَرِيبًا﴾[2] واتە: بەڕاستی ئەو بێباوەڕانە ئەو ڕۆژە بە دوور دەبینن، ئێمەش زۆر بە نزیکی دەبینین. واتە: خوانەناسان بەدووری دەزانن بەلام خاوەنباوەڕان زۆر بە ئاسانو نزیکی دەزانن.

﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾

## هەندێ لە ڕووداوە زۆر گرانو ترسێنەرەکانی ڕۆژی قیامەت

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ﴾ دەسەلاتی ئەم ئاسمانانو زەمینە هەر بۆ خودایە، ڕۆژێ کە قیامەت ڕادەبێت، ئەم تەرزە هەرزە وێژانە زەرەر دەکەن. خوای گەورە باسی خۆی دەکات کە هەر ئەو خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینەو فەرمانڕەوایەتی لە دنیاش و لە قیامەتیشدا. بۆیە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ﴾ واتە: کاتێك کە قیامەت هەڵدەسێت هەر ئەو نەزاندوانەی کە خوانەناسنو باوەڕیان بەو کتێبو نیشانە ئاشکراو ڕوونانە نیە کە هاتووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرانی خودا زەرەرمەندن. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ دەشبینی هەموو تیرەیەك بەڕیز بەسەر چۆکدا هاتووە، هەر تیرەیەکیش بانگ دەکرێت، بۆ دیتنی کردەوەکەی خۆی. ئەوا ئەمڕۆ پاداشتی کردەوەکانتان دەدرێتەوە، ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾ واتە: هەموو دەستەیەك دەبینی بەسەر چۆکدا(ئەژنۆ) کەوتوون لە گرانیو سامناکی ئەو ڕۆژە. وتراوە: کاتێك کە جەهەنەم دەهێنرێتو هەناسەیەك دەدات هیچ کەس نیە خۆی بۆ ڕاگیرێت هەموو بەسەر چۆکدا دەکەوێت. هەتا ئیبراهیمی خەلیلیش(سەلامی خوای لێ بێت) کە لەو کاتەدا دەڵێت: ئەی خودایە خۆم خۆم خۆم جگە لە خۆم ئەمڕۆ داوای هیچی ترت لێ ناکەم. وە عیسای کوڕی مەریەمیش(سەلامی خوای لێ بێت) دەڵێت: جگە لە خۆم ئەی خودا ئەمڕۆ داوای هیچت لێ ناکەم. داوات لێ ناکەم بۆ مەریەم کە منی بووە. خوای

---

[1] هود(١٠٤).

[2] المعارج(٦ـ٧).

گەورە دەفەرموویّت: ﴿كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا﴾ واتە: بۆ سەیرکردنی نامەکانیان کە چی تێدا نووسراوەو چیان کردووە. وەك خوای گەورە دەفەرموویّت: ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِا۟ىٓءَ بِٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾[1] واتە: وە نامەی کردەوە لەبەردەمیان دادەنریّت و زەوی لەو ڕۆژەدا بە نووری پەروەردگاری ڕووناك دەبێتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ ئەوا ئەمڕۆ پاداشتی کردەوەکانتان دەدرێتەوە چاکە بە چاکەو تاوان و خراپەش بەسزای سەخت و گران. وەك خوای گەورەدەفەرموویّت: ﴿يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ﴿١٣﴾ بَلِ ٱلْإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ بَصِيرَةٌ ﴿١٤﴾ وَلَوْ أَلْقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ﴾[2] واتە: لەوڕۆژەدا ئادەمی هەواڵی پیّ دەدریّت لەوەی کە پێشی خستووەو دوای خستووە(لە چاکەو خراپە)، بەڵکو ئادەمی ئاگادارە بە حاڵی خۆی، با بروبیانووی زۆریش بێنێتەوە. بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ئەمە کتێبی ئێمەیە کە بە ڕاستی لەسەر ئێوە دەدویّت، هەرچی کردەوەی ئێوەش بوو، ئێمە هەموومان دەنووسی. ﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ﴾ واتە: ئەمە کتێبی ئێمەیە بە ڕاستی باسی ئێوە دەکات و هەموو کردەوەکانتان ئامادە کراوە بەبیّ کەم و زیاد. وەك خوای گەورەدەفەرموویّت: ﴿وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا﴾[3] واتە: نامەی کردەوەکان دابەش دەکریّت(دەدرێتە دەستی ڕاستی چاکان و دەستی چەپی تاوانباران) ئینجا تاوانباران دەبینی زۆر دەترسن لەو(هەموو تاوان و خراپە)ی کە تێیدایەو دەڵێن ئای هاوار بۆ ئێمە ئەم نامەو دەفتەرە چیە؟ هیچ کردەوەیەکی بچووك و گەورەی بەجیّ نەهێشتووەو تۆماری کردووە هەر کردەوەیەکیان کردبێت(تیایدا) ئامادەیەو پەروەردگارت ستەم لە کەس ناکات. وە دەفەرموویّت: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ واتە: ئێمە فەرمانمان داوە بەو فریشتانەی کە چاودێرن بەسەرتانەوە کردەوەکانتان بنوسن. ئیبنو عەباس و کەسانی تریش وتوویانە: فریشتەکان کردەوەی هەموو بەندەکانی خودا دەنووسن و بەرزی دەکەنەوە بەرەو ئاسمان پاشان ئەو فریشتانەی کە لە بارەگای کردەوەکانن. ئەوەی کە فریشتەکان هێناویانە بەراوردی دەکەن لەگەڵ ئەوەی کە لە(لوح المحفوظ) دایە خوای گەورە بڕیاری داوەو نووسیویەتی لەسەر بەندەکانی پێش دروست کردنیان

---

[1] الزمر(٦٩).
[2] القيامة(١٣ـ١٥).
[3] الكهف(٤٩).

نە پتێکی لێ زیاد دەکرێتو نە لێشی کەم دەکرێت. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾.

﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ (٣٠) وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا
أَفَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَاسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ (٣١) وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا
نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ (٣٢) وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ
يَسْتَهْزِئُونَ (٣٣) وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ (٣٤) ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ
اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ (٣٥) فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ
وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٣٦) وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (٣٧)﴾

خوای گەورە باسی بڕیاری خۆی دەکات بەسەر خەڵکیدا لە ڕۆژی قیامەتداو دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ﴾ سا ئەوانەی بە باوەڕو ئاکار چاك بوون، پەروەرینیان دەیانخاتە بەر بەزەیی، کە ئەمە بەختەوەریەکی زۆر گرینگە. واتە: ئەوانەی خاوەن باوەڕن بە دڵو بە ئەندامەکانی لەشیان ئاکاری چاك دەکەن تەنها لەبەر ڕەزامەندی خواو لە شەرع لانادەن، ﴿فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ﴾ دەیانخاتە بەر بەزەیی خۆی کە بەهەشتە وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خوای گەورە دەفەرمووێت بە بەهەشت تۆڕەحمەتی منی، بەتۆڕەم دەکەم بەهەرکەسێك مەیلم لێ بێت.[1] ﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ﴾ ئا ئەوەیە سەرکەوتنی دیارو ئاشکرا. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا أَفَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَاسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾ بەڵام خوانەناسەکان(پێیان دەوترێت) ئاخۆ نیشانەکانی منتان بۆ نەخوێنرایەوە کە خۆتان بە زل دەزانیو کۆمەڵێکی تاوانبار بوون؟ واتە: خوانەناسەکان پێیان دەوترێت ئایا بەڵگەکانی منتان بەسەردا نەخوێنرایەوە؟ ئەمە بۆ سەرزەنشتکردنو لوت شکاندنە، خۆتان بە زل دەزانیو شوێنی نەدەکەوتنو گوێتان بۆ نەدەگرت. ﴿وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ﴾ ئێوە گرۆیەکی تاوانکار نەبوون بە کردارو دڵیشتان پەنگی خواردبووەوەلە بێ دینیدا. ﴿وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ﴾ هەر کاتێکیش وترا کە بەڵێنی خودا ڕاستەو قیامەت دێتو

---

[1] فتح الباري(٨/٤٦٠).

هیچ گومانی تێدا نیه. ئێوه وتتان: هەر نازانین قیامەت چیه؟ لامان خەیاڵێکی خاوەو دڵمان بڕوای پێ نیه. ﴿وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا﴾ واته: کاتێك خاوەن باوەڕەکان پێیان بڵێن: که بەڵێنی خودا ڕاسته و ڕۆژی دوایی دێت، ﴿قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ﴾ ئێوه وتتان: نازانین قیامەتیش چیه؟ ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا﴾ گومانمان هەیەو خەیاڵه به لامانەوه. بۆیه فەرموویەتی: ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ﴾ واته: به ڕاستی نازانینو دڵمان ئاو ناخواتەوه. خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ هەر کارێکی خراپیان له دەست هاتبوو، ئاشکرا نیشانیان دراو ئەو شتانەش گاڵتەیان پێ دەکرد دەوری لێیان دا. ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا﴾ واته: تۆڵەی کردەوه خراپەکانی خۆیان بۆ دەرکەوت، ﴿وَحَاقَ بِهِم﴾ واته: دەوری لێدان، ﴿مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ﴾ واته: ئەو سزاو جەزرەبەیەی که به گاڵتەیان دەزانی. وه دەفەرمووێت: ﴿وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ پێیان وترا ئەمڕۆ له بیرتان دەکەین، هەر وەك ئێوه تووش هاتنی ئەمڕۆتان نەدەهاتەبیر. جێتان لەناو ئاگردایه، هیچ کەسیش یارمەتیتان ناکات. ﴿وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ﴾ واته: پێیان وترا: ئێمه مامەڵەی خەڵکێکی لەبیرچووتان لەگەڵ دەکەین لەناو ئاگری جەهەنەمدا، ﴿كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾ واته: هەروەك چۆن ئێوه ئەمڕۆتان لەبیرچووبوو. چونکه ئێوه بڕواتان پێی نەبوو. ﴿وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ﴾ جێتان ئاگری جەهەنەمەو کەسیش نایەت به هاوارتانەوه. له فەرموودەی سەحیحدا هاتووه که خوای گەورە دەفەرمووێت به هەندێ له بەندەکانی له ڕۆژی قیامەتدا: ئایا هاوسەرم پێ نەدایت؟ ئایا ڕێزم لێ نەگرتی؟ ئایا وڵاغی سواری(ماینو ئەسپ)و وشترم بۆ ڕام نەهێناوی بەکاریان بهێنیو سوودیان لێ وەربگریت؟ دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، دەفەرمووێت: ئایا دەتزانی دێیتەلام؟ دەڵێت: نەخێر. خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەمڕۆ منیش تۆ لەبیر دەبەمەوه وەك چۆن تۆ منت نەدەهاتە بیر.[1] خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ۚ فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾ چونکه ئێوه نیشانەکانی ئێمەتان کردبووه جێ گەمەی خۆتان. ژینی دنیا ئێوه هەڵخەڵەتاندبوو ئیتر ئەمڕۆ له ئاگر دەریان ناخەنو ڕێگه نیه داوای لێبوردنیش بکەن. ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا﴾ بۆیه ئێمه بەم شێوەیه تۆڵەتان لێ

---

[1] مسلم(٤/٢٢٧٩).

دەسێنین چونکە ئێوە گاڵتەجاڕیتان لێ دەهات بەو نیشانانەی ئێمە پێدەکەنین. ﴿وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا﴾ هەڵخەڵەتان بە ژیانی دنیاو پاڵتان لێ دایەوە تیایدا، تا ئا بەم ئێوەیە ڕەنجەڕۆ بوون. بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُخۡرَجُونَ مِنۡهَا﴾ لە ئاگر ناچنە دەرەوە. ﴿وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ﴾ هیچ بروبیانوویەکتان لێ وەرناگیرێت بەڵکو بەبەردەوامی جەزرەبە دەدرێن. وەك چۆن دەستەیەك لە خاوەن باوەڕان دەچنە بەهەشت بەبێ حیسابو جەزرەبەدان. دوای ئەوەی کە خوای گەورە باسی بڕیاری خۆی کرد بەسەر خاوەن باوەڕانو خوانەناساندا دەفەرمووێت: ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ واتە: سا سوپاس هەر بۆ خودایە، ڕاهێنەری ئاسمانەکانو زەمینو هەموو خەڵکی جیهانیشە. ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: سوپاس بۆ خودا کە خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەیش کە تێیاندایە. بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: خەڵکی جیهانیشە. پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ لە ئاسمانانو زەمینیش، شکۆو گەورەیی بۆ ئەوەو هەر خۆی خاوەن دەسەلاتی لەکارزانە. ﴿وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ موجاهید دەڵێت: لە ئاسمانانو لە زەمین هەر خۆی خاوەن شکۆو دەسەلاتی بێ پایانە کە هەموو شتی پێیەتیو ملکەچی ئەوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە:(خوای گەورە دەفەرمووێت: خاوەن شکۆیی پۆشاکی منە گەورەیش هەر جلوبەرگی خۆمە، هەر کەسێك ململانێم لەگەڵ بکات تێیاندا لە ئاگری خۆمدا دامناوە).[1] موسلیمیش بە هەمان شێوە ڕیوایەتی کردووە.[2] وە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ﴾ کەس دەرەقەتی نایەتو ڕێی لێ ناگرێت. ﴿ٱلۡحَكِيمُ﴾ واتە: لە کارزانە لە گفتارو لە کردارو لە بەرنامەو بڕیارو پیرۆزەو هیچ خودایەك نیە تەنها ئەو نەبێت.

---

[1] ابو داود(٤/٣٥٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم(٤/٢٠٢٣).

# پێـرسـت